ڕووناکی (رَبِّ الْعالَمِينِ)

ڕوونکردنەوەی

# مِنهاج الطّالبين

للإمام النواوي

لە تێگەیشتنی بڕیارەکانی شەریعەتی ئیسلام

لە سەر ڕاڕەوی ئیمامی (الشافعي) رضي الله عنه

دانانی

عبدالله عبدالعزیز هەرتەلی

دار المعرفة

بيروت - لبنان

# ڕووناکی (رَبِّ الْعالَمِين)

## ڕوونکردنەوەی

# ﴿مِنْهَاجِ الطَّالِبِين﴾

للإمام النواوي

له تێگەیشتنی بڕیارەکانی شەریعەتی ئیسلام

له سەر ڕاڕەوی ئیمامی (الشافعی) رضي الله عنه

بەرگی چوارەم


دانانی

عبدالله عبدالعزیز هەرتەلی



چاپی پوختەکراو

دانەر بەخۆی پیّیدا چۆتەوەو چەند مەسەلەیەکی تیّدا زیاد کردون

محـــرم (١٤٣٠)ی کـــۆچـی

بەفـرانبار (٢٧٠٨)ی کـــوردی

کانونیدووەم (٢٠٠٩)ی زایینی

ژمارەی سپاردنی (١٩٤) ساڵی (٢٠٠١)ز، له کتێبخانەیگشتی هەولێر، دراوەتێ

## ناسنامە:

ناوی کیتاب: ڕووناکی (رب العالمین) ڕوونکردنەوەی (منهاج الطالبین).
بابەت: شەریعەتی ئیسلام.
دانەر: عبدالله عبدالعزیز هەرتەلی.
نۆبەتی چاپ: دوایین چاپی پوختەکراو و زێدەکراو.
بڵاوکراوەی: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی، لە هەولێر.
چاپخانە: دارالمعرفة بەیروت

---

## شارەزاکردن:

ئەی خوێنەری بەڕێز، هەر کاتێك دانەر دەڵێ:

* رواه الشیخان، مەبەستی ئیمامی (البخاري و مسلم)ن.
* رواه اصحاب السنن، مەبەستی ئیمامی (أبوداود و النسائي و الترمذي)ن.
* هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە. یان ڕوون کراوەتەوە. مەبەستی ئەم چوار کتێبەنە:

١ –(المجموع: شرح المهذب) دانراوی (الإمام النواوي).
٢ –(تحفةالمحتاج: شرح المنهاج) دانراوی (الإمام إبن حجرالهیتمي).
٣ –(نهایةالمحتاج: شرح المنهاج ) دانراوی (الإمام محمدالرملي).
٤ –(مغنیالمحتاج : شرح المنهاج) دانراوی (الإمام محمد الخطیب الشربیني).

جا ئەگەر یەکێك لەو چوارانە لە گەڵدا نەبێ. ئەو کاتە دەڵێ: هەر وەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا...

---

## ئەی قوتابیی خۆشەویست و ڕێزدار، تکایە:

١– پێشەکیەکەلە بەرگی یەکەمدا بە بیرلێکردنەوەیەکی ورد بخوێنەوە.
٢– بۆ تێگەیشتنی ئەم کتێبە پشت مەبەستە بە تەنها زانستیخۆت، بەڵکو لە لای مامۆستای ئایینی بیخوێنە، چونکە چەند پێناسەو زاراوەیەکی شەرعی هەنە، لە لای مامۆستای ئایینی باشتر لێی تێدەگەی.

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

اَلْحَمْدُ لله رَبِّ الْعَالَمِينَ وَالصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ عَلَى سَيِّدِنَا مُحَمَّدٍ وَآلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِينَ.

ئەمەیە بەرگی چوارەمی ﴿ ڕووناکی(رَبِّ الْعالَمين) ڕوونکردنەوەی(مِنْهاج الطّالِبِين)﴾ خوای گەورە یارمەتیم بدا بۆ تەواوکردنی، آمین.

ئیمامی (النواوی) دەفەرموێ:

﴿ كِتَابُ الْفَرَائِضِ: **ئەمەیە پەرتوكی بەشكردنی میراتەكان** ﴾

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِقْسِمُواالْمالَ بَيْنَ أَهْلِ الْفَرَائِضِ عَلَى كِتَابِ اللهِ تَعَالَى﴾ رواه مسلم وأبوداود، میراتی مردووەكە لە نێوان میراتگرەكانیدا بەش بكەن بەگوێرەی قورئانی پیرۆز. واتە: كە لە سورەتی(النساء)دا خوای گەورە دایناوە.

كەوابو: هەركەسێك بە پێچەوانەی شەریعەتیئیسلام-بە یاسایدەستكرد- میرات بەش بكا، یان وەریبگرێ: ئەگەر باوەڕی بە شەریعەتیئیسلام نەبێ ئەوە كافرە، ئەگەر نا: (ظالم)و (فاسق)ەو ئەو میراتەی بە ناشەرعی وەریگرتوە، نابێتە مولكی خۆیو لێی حەرامە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿(وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَاأَنْزَلَ اللهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ). قال إبن عباس رضي الله عنهما في تفسيرها: (مَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَاأَنْزَلَ اللهُ جَاحِداً بِهِ فَقَدْ كَفَرَ، وَمَنْ أَقَرَّ وَلَمْ يَحْكُمْ فَهُوَ ظَالِمٌ فَاسِقٌ) ﴾ رواه إبن جرير، هەر كەسێك ڕەفتار بە قورئانی پیرۆز نەكاو باوەڕیشی پێی نەبێ ئەوە كافرە، وە هەر كەسێك باوەڕی پێی هەبێ بەڵام ڕەفتاری پێنەكا ئەوە (ظالم)و (فاسق)ە. واتە: هەروەك لە دوو ئایەتەكەیتردا فەرموویەتی، لە (تفسیر إبن كثیر)دا ڕوون كراوەتەوە.

(يُبْدَأُ مِنْ تَرِكَةِ الْمَيِّتِ ) واجبە: پێش هەموو شتێك لە میراتی مردووەكە دەست بكرێ (بِمُؤْنَةِ تَجْهِيزِهِ )بە ئەركی وەڕێكردنی مردووەكە بۆ ناو گۆڕەكەی: وەك شۆردنو كفنو نوێژ لەسەر كردنو ناشتنی بەگوێرەی ئەو ڕوونكردنەوەی لە پەرتووكی مردووەكاندا ڕابرا.

ئینجا بزانە: مەبەست لە میرات: گشت مافێكوگشت پارەو زێرو خواردەمەنیو ملكو ماڵو زەویو خانووە: كە مردووەكە لە دوای خۆی بەجێی دەهێڵێ، هەم خوێنی كوژراوەكەش كە لە مرۆڤكوژەكە وەردەگیرێ، ئەویش بە میرات دادەندرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە، كەواتە: ئەو خوێنەش لە نێوان میراتگرەكانیدا بەش دەكرێ بە گوێرەی بەشە میراتیخۆیان.

دیسان بزانە: ئەركی وەڕێكردنی ژنە مردووەكە-بە فەرموودەی ڕاستتر- لە سەر مێردەكەیەتی، واتە: لە میراتی ژنەكە نادرێ، بەو مەرجەی لە حاڵەتیمردنیدا مێردەكەی

هەبوویی بێو ژنەکەش تەسلیمی مێردەکەی کرابێو (نَاشِزَة) نەبێو تەلاقدراوی (بائن)ش نەبێ، ئەگینا: ئەرکەکەی لە میراتەکەی‌خۆی دەدرێ، هەروەك لە باسی (کفن کردنی مردوو)دا ڕابرا.

(ثُمَّ) ئینجا لە دوای تەواوبوونی وەڕێکردنی مردووەکە بۆ ناو گۆڕەکەی (تُقضَى دُيُونُهُ) ئەو قەرزانەی لە ئەستۆی مردووەکەدانە دەدرێنەوە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿نَفسُ الْمُـــؤْمِنِ مُعَلَّقَةٌ بِدَيْنِه حَتَّى يُقْضَى عَنْهُ﴾ حديث صحيح رواه الترمذي، گیانی مرۆڤی ئیماندار-بە هۆی قەرزەکەی- قەدەغە دەکرێ لە چونە بەهەشت تا قەرزەکەی لەجیاتی دەدرێتەوە.

ئینجا لە دانەوەی قەرزەکانیش قەرزەکانی‌خوای گەورە: وەکو زەکاتو حەجی واجبو کەففارەتو نەزر، وە پێش قەرزی ئادەمیزادان دێخرێن، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿فَدَيْنُ اللهِ أَحَقُّ بِالْقَضَـــاءِ﴾ رواه الشیخان، قەرزی خوای گەورە لە پێشترە بدرێتەوە.

ئینجا بزانە ئەو قەرزەی لە سەر مردووەکەیە پەیوەندی بە میراتەکەیەوە هەیە، واتە: میراتەکە دەبێتە بارمتەیەکی‌شەرعی بۆ گشت قەرزەکانی‌مردووەکە، کەوابو: تا بەشێکی قەرزەکە لە سەر مردووەکە مابێ، هیچ دەستکاریەکی میراتگرەکە- بە بێ‌ئیزنی خاوەن قەرزەکان- لە میراتەکەدا دروست نابێ، کەواتە: مەرجە ئەو زەکاتەی لە ئەستۆی مردووەکەدایە بدرێو حەجی‌واجبی بۆ بکرێ، یان کرێی حەج بۆکردن تەسلیمی یەکێك بکرێ تاکو حەجی بۆ بکا، نەزرو کەففارەتەکانیشی بۆ بدرێن، مارەیی‌ژنەکەی- ئەگەر نەیدابێ-و قەرزەکانی‌تری ئادەمیزادانی بۆ بدرێنەوە، ئینجا دەستکاریەکانی میراتگرەکە لە میراتەکەدا دروست دەبێ، ئەگینا: دروست نابێ.

بەڵام هەر کاتێك میراتگرێك-بەگوێرەی بەشە میراتەکەی‌خۆی- بەشە قەرزەکە بداتەوە، ئەوە بەشە میراتکەی وی لە بارمتەیی بەرهەڵ دەبێو دروستە دەستکاری بەشەکەی‌خۆی بکا، هەروەها ئەگەر میراتگرەکە بە ئیزنی خاوەن قەرزەکان-بۆ قەرزدانەوە- میراتەکە بفرۆشێ، ئەوە فرۆشتنەکەی دروست دەبێ، بەو مەرجەی فرۆشتنەکە بە نرخی هاوێنە بێو بە ئیزنی گشت خاوەن قەرزەکان بێ، جا ئەگەر یەکێکیان ئامادە نەبو، ئەو کاتە بە ئیزنی قازی دەیفرۆشێ، هەروەك لە کۆتایی(رَهْن)دا ڕوونمان کردەوە.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر مردووەکە قەرزی کەسێکی ونبووی لە سەر بوو و لە دۆزینەوەی خاوەن قەرزەکەش بێ‌ئومێد بوین، ئەوە مەسەلەی قەرزەکە دەدرێتە دەست قازی، جا ئەگەر قازی نەبو، یان خائین بوو و بە شەریعەتی‌ئیسلام ڕەفتاری نەدەکرد، ئەو کاتە دەدرێتە دەست باوەڕپێکراوێکی لێزان، تاکو ئەندازەی قەرزەکە لە میراتەکەی بفرۆشێو

ثُمَّ وَصَايَاهُ مِنْ ثُلُثِ الْبَاقِي ثُمَّ يُقْسَمُ الْبَاقِي بَيْنَ الْوَرَثَةِ، قُلْتُ: فَإِنْ تَعَلَّقَ بِعَيْنِ التَّرِكَةِ حَقٌّ كَالزَّكَاةِ وَالْجَانِي وَالْمَرْهُونِ وَالْمَبِيعِ إِذَا مَاتَ الْمُشْتَرِي مُفْلِسًا قُدِّمَ عَلَى مُؤْنَةِ تَجْهِيزِهِ، وَاللهُ أَعْلَمُ.

---

بۆ (بيت المال) سەرفی بکا، یان میراتگرەکە بەخۆی ئەو کارە جێبەجێ دەکاو بۆ هەژاران و بەرژەوەندی موسولمانان سەرفی دەکا، واتە: تا ئەو کارە ئەنجام نەدا دەستکاریی لە میراتەکەدا دروست نابێ.

بەلام دووریش نیە مەسەلەی قەرزی ئەو ونبووەش وەك یەتیمی بێسەرپەرشتکار بێ، واتە: پیاوماقولانی شوێنەکە جێبەجێکردنی ئەو فرۆشتن و سەرف کردنە بخەنە ئەستۆی خۆیان، هەروەك لە کۆتایی(رَهْن)دا بە درێژی ڕوونمان کردەوە.

(ثُمَّ) ئینجا کە هەموو قەرزەکانی درانەوە (وَصَايَاهُ مِنْ ثُلُثِ الْبَاقِي) وەسیەتەکانی مردووەکە جێبەجێ دەکرێن لە سێیەکی ئەو میراتەی لە دوای قەرزدانەوەکە ماوەتەوە.

(ثُمَّ) ئینجا لە دوای جێبەجێکردنی وەسیەتەکانی مردووەکە (يُقْسَمُ الْبَاقِي بَيْنَ الْوَرَثَةِ ) ئەو بەشە میراتەی ماوەتەوە لە نێوان میراتگرەکانی دا بەش دەکرێ بە گوێرەی شەریعەتی ئیسلام: کە لەم پەرتووکەدا ڕوون دەکرێتەوە، إن شاء الله تعالى، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿مِنْ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصَى بِهَا أَوْ دَيْنٍ﴾ میراتەکە دەدرێتە میراتگرەکان لە دوای جێبەجێکردنی وەسیەت و قەرزدانەوە.

(قُلْتُ) ئیمامی(النواوي) دەفەرموێ: ئەو بڕیارەی ڕابردوو لە حاڵەتێکدا بوو: کە قەرزەکە لە ئەستۆی مردووەکەدا بێ، چونکە (فَإِنْ تَعَلَّقَ بِعَيْنِ التَّرِكَةِ حَقٌّ) ئەگەر مافێك بە خودی میراتەکەیەوە بەسترابێ (كَالزَّكَاةِ) وەکو ئەو زەکاتەی ــ پێش مردنی ــ لە خودی ماڵێکیدا واجب بوبێ و زەکاتەکەشی نەدابێ: وەك زەکاتی ئاژەڵەکانی نەدابێ، یان زەکاتی دانەوێڵەکەی نەدابێ، ئەو کاتە واجبە: پێش وەرێکردنی مردووەکە زەکاتەکە بدرێ.

(وَ) هەروەها (الْجَانِي) وەکو کۆیلەی تاوانکار: کە پێش مردنی گەورەکەی تاوانێکی کردبێ و تۆڵەی تاوانەکە بە گەردەنیەوە بەسترابێ، واجبە: پێش وەرێکردنی مردووەکە تۆڵەی تاوانەکە لە خودی ئەو کۆیلەیە بدرێ (وَ) هەروەها (الْمَرْهُونِ) وەکو ماڵی بە بارمتە داندراو بۆ قەرزێك، واجبە: مافی ڕەهنوەرگرەکە ــ پێش وەرێکردنی مردووەکە ــ بدرێتەوە.

(وَ) هەروەها (الْمَبِيعِ) وەکو شتی بە قەرز فرۆشراو (إِذَا مَاتَ الْمُشْتَرِي مُفْلِسًا) هەر کاتێك کڕیارەکە بە نەبوویی بمرێ و بە هۆی نەبوویی پارەکەی نەدابێ، ئەوە مافی فرۆشیارەکەش ــ وەك مافەکانی ڕابردوو ــ (قُدِّمَ عَلَى مُؤْنَةِ تَجْهِيزِهِ) وەپێش وەرێکردنی مردووەکە دێخرێ و ڕێگا دەدرێتە فرۆشیارەکە مامڵەتەکە هەڵبوەشێنێتەوەو خودی فرۆشراوەکەی خۆی بباتەوە (وَاللهُ أَعْلَمُ)، بەلام ئەگەر مردووەکە هەبوویی بێ و پارەکەی نەدابێ، ئەو کاتە

وَأَسْبَابُ الإِرْثِ أَرْبَعَةٌ: قَرَابَةٌ وَنِكَاحٌ وَوَلاءٌ فَيَرِثُ الْمُعْتِقُ الْعَتِيقَ وَلا عَكْسَ، وَالرَّابِعُ: الإِسْلامُ فَتُصْرَفُ التَّرِكَةُ لِبَيْتِ الْمَالِ إِرْثًا إِذَا لَمْ يَكُنْ وَارِثٌ بِالأَسْبَابِ الثَّلاثَةِ.

---

مامڵەتەکە هەڵناوەشێندرێتەوە، بەڵکو لە میراتەکەی پارەکەی دەدرێ، هەروەك لەباسی (قەدەغە دانان لە سەر قەرزدار)دا ڕوونمان کردەوە.

هەروەها ئەرکی نیشتەجێکردنی ژنیمردووەکەش -تا (عِدَّة)ی تەواو دەبێ- وەپێش وەڕێکردنی مردووەکە دێخرێ، هەروەك لە (مغنی)و (الشرواني)دا فەرموویانە.

## ﴿ باسی هۆیەکان و مەرجەکانی میراتگرتن ﴾

١-(وَأَسْبَابُ الإِرْثِ أَرْبَعَةٌ) هۆیەکانی میراتگرتن چوارەن، یەکەم: (قَرَابَةٌ) خزمایەتی‌یە: کە لەم پەڕتووکەدا بە درێژی ڕوون کراوەتەوە.

دووەم: (وَنِكَاحٌ) مارەبڕینێکی دروستو دامەزراوە بەگوێرەی شەریعەتی‌ئیسلام، کەواتە: بە تەنها مارەبڕین ژنو مێرد میرات لە یەکتری دەگرن، هەرچەند مێردەکەش جیماعی لەگەڵ ژنەکەی نەکردبێ، یان هەر هیچێکیان بلوغیان نەبوبێ ﴿عن علقمة عن ابن مسعودﷺ: أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ رَجُلٍ تَزَوَّجَ امْرَأَةً وَلَمْ يَفْرِضْ لَهَا صَدَاقاً وَلَمْ يَدْخُلْ بِهَا حَتَّى مَاتَ ؟ فَقَالَ: لَهَا مِثْلُ صَدَاقِ نِسَائِهَا وَعَلَيْهَا الْعِدَّةُ وَلَهَاالْمِيرَاثُ. فَقَالَ مَعْقِلٌ الأَشْجَعِيُّ: قَضَى رَسُولُ اللهِﷺ مِثْلَ مَا قَضَيْتَ﴾ رواه اصحاب السنن بسند صحيح، لەبارەی پیاوێك کە ژنێکی مارەکردبێو مارەیی بۆ دانەنابێو جیماعیشی لەگەڵ نەکردبێو پیاوەکە مرد بێ، پێغەمبەرﷺ بڕیاری داوە: مارەیی هاوێنەی ژنەکانی بدرێتێو (عِدَّة)شی لە سەر واجبەو میراتی مێردەکەشی دەدرێتێ. واتە: جماعکردن مەرج نیە بۆ میراتگرتنی ژنو مێرد.

سێیەم: (وَوَلاَءٌ) سەرپەرشتکاریەتی ئازادکردنی کۆیلەیە، کەوابو: (فَيَرِثُ الْمُعْتِقُ الْعَتِيقَ) ئازادکەرەکە میرات لە ئازادکراوەکەی دەگرێ، بەڵام (وَلاَ عَكْسَ) بە پێچەوانەوە نابێ.

(وَالرَّابِعُ) هۆیچوارەم: (الإِسْلاَمُ) لایەنی ئیسلامەتی‌یە، کەواتە: (فَتُصْرَفُ التَّرِكَةُ لِبَيْتِ الْمَالِ إِرْثًا) میراتی مردووە موسوڵمانەکە بۆ (بَيْتِ الْمَالِ)ی ئیسلام سەرف دەکرێ بە ناوی میرات -نەك بە ناوی بەرژەوەندی- (إِذَا لَمْ يَكُنْ وَارِثٌ بِالأَسْبَابِ الثَّلاَثَةِ) هەر کاتێك مردووە موسوڵمانەکە هیچ میراتگرێکی -بەو سێ هۆیانەیڕابردوو- نەبێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿أَنَا وَارِثُ مَنْ لاَوَارِثَ لَهُ أَعْقِلُ عَنْهُ وَأَرِثُهُ﴾ صححه إبن حبان، من میراتگری ئەو کەسەم کە هیچ میراتگرێکی نیە، من خوێنی بۆ ئەدەمو میراتی لێ‌دەگرم.

ئینجا بزانە: ئەگەر مردووێکی کافر هیچ میراتگرێکی نەبێ، ئەوە میراتەکەی وی بە ناوی (فَيْء) بۆ (بَيْتِ الْمَالِ)ی ئیسلام سەرف دەکرێ، نەك بە ناوی میرات.

هەروەها بزانە: لەو حاڵەتەی میراتەکە بە ناوی میرات بدرێتە (بَيْتِ الْمَالِ)، دروست نیە بەشی کافرو مرۆڤکوژەکەو کۆیلەی لێبدرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

٢- **مەرجەکانی میراتگرتن چوارن**، یەکەم: بێگومان میراتدەرەکە مردبێ، یان لە لایەن قازی بڕیاری مردنی درابێ بەگوێرەی شەریعەتی ئیسلام. دووەم: بێگومان میراتگرەکە زیندوو بێ لە کاتی مردنی میراتدەرەکەدا، هەر چەند تەنها بە ماوەی چاولێکردنێکیش بێ. سێیەم: بە یەکێك لەو هۆیانەی ڕابردوو میراتگرەکە بگاتەوە مردووەکە. چوارەم: بە درێژی هۆی میراتگرتنەکە بزاندرێ، جا ئەم مەرجە تایبەتە بە قازی، واتە: نابێ شاهیدی لەو کەسە وەربگرێ کە تەنها بڵێ: فلانکەس میراتگری فلانکەسە، هۆیەکەشی نەڵێ، هەروەك لە (مغنی)دا ڕوون کراوەتەوە.

## ﴿ باسی ژمارەی میراتگرەکان ﴾

**پێشەکی** بزانە: سەرجەم میراتگرەکان -نێر و مێ- دوو جۆرن، یەکەم: (ذُوالْفَرْضِ)، واتە: خاوەن بەش، کە لە شەریعەتی ئیسلامدا بەشی بۆ دیاری کراوە، لە (فصل)ی داهاتوودا ڕوون کراونەوە. دووەم: (عَصَبَة)، واتە خزمی لەپشتێ، بەلام لە باسی میراتدا مەبەست ئەو میراتگرەیە: کە لە شەریعەتی ئیسلامدا بەشی بۆ دیاری نەکرابێ، هەروەك لەباسی (بێبەشکردن لە میرات)دا ڕوونی دەکەینەوە، إن شاء الله تعالى.

جا لە دروستکردنی مەسەلەکاندا ئێمە بە (پشتێیە) ناوی (عَصَبَة) دێنین، هەم ئەم نیشانەیەش (×) بۆ لێکدانی ژمارەکان دادەنێین، ئەمەش (+) بۆ کۆکردنەوەیان، ئەمەش (÷) بۆ بەشکردن.

ئینجا بزانە: جگە لە خزمەکانی میراتگر خزمەکانی‌تر پێیان دەگوترێ: (ذَوِي‌الأَرْحَامِ)، واتە: خاوەن ڕەحم. هەروەك لە کۆتایی ئەم باسەدا ڕوون کراونەوە.

(وَالْمُجْمَعُ عَلَى إِرْثِهِمْ مِنَ الرِّجَالِ) ئەو میراتگرانەی بە (إجماع)ی زانایانی ئیسلام میرات دەگرن: لە چینی نێرینەکان (عَشَرَةٌ) دە کەسن:

یەکەم: (الإبن) کوڕی مردووەکە. دووەم: (وَابْنُهُ) کوڕی کوڕی مردووەکە (وَإِنْ سَفَلَ) هەرچەند کوڕی کوڕ بەرەو خوارەوەش بێ: وەك کوڕی کوڕی کوڕ...هتد، بەو مەرجەی بە پوختەی نێرینەکان بگاتە مردووەکە؟ چونکە کوڕی کیژی مردووەکە میراتگر نیە، هەروەك لە (مغنی)و (الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە.

سێیەم: (وَالأَبُ) باوکی مردووەکە. چوارەم: (وَأَبُوهُ) باوکی باوکی مردووەکە، واتە: باپیرە (وَإِنْ عَلاَ) هەرچەند باپیرەکە بەرەو سەرەوەش بێ: وەك باوکی باوکی باوکی باوك...هتد، بەو مەرجەی بە پوختەی نێرینەکان بگاتەوە مردووەکە؟ چونکە باوکی دایك میراتگر نیە، هەروەك لە (القليوبي)و (البجيرمي)دا ڕوون کراوەتەوە.

وَالأَخُ، وَابْنُهُ إلاَّ مِنَ الأُمِّ، وَالْعَمُّ إلاَّ لِلأُمِّ، وَكَذَا ابْنُهُ، وَالزَّوْجُ، وَالْمُعْتِقُ. وَمِنَ النِّسَاءِ سَبْعٌ: اَلْبِنْتُ، وَبِنْتُ الإبْنِ وَإِنْ سَفَلَ، وَالأُمُّ، وَالْجَدَّةُ، وَالأُخْتُ، وَالزَّوْجَةُ، وَالْمُعْتِقَةُ.

---

**پێنجەم:** (وَالأَخُ) برای‌مردووەکە، جیاوازی نیە برایەکە: لە دایك‌وباوکی بێ، یان تەنها لە دایکی بێ، یان تەنها لە باوکی بێ. **شەشەم:** (وَابْنُهُ) کوڕەبرای مردووەکە، هەرچەند کوڕەبرایەکە بەولاوەتریش بێ: وەك کوڕی کوڕی‌برای‌مردووەکە...هتد، هەروەك لە (الشرواني)دا فەرموویەتی، بەو مەرجەی کوڕی برای لە دایك‌وباوکی بێ، یان کوڕی برای تەنها لە باوکی بێ (إلاَّ مِنَ الأُمِّ) تەنها کوڕەبرای تەنها لە دایکی نەبێ؟ چونکە کوڕەبرای تەنها لە دایکی میراتگر نیە.

**حەفتەم:** (وَالْعَمُّ) مامی‌مردووەکە، هەر چەند دووریش بێ: وەك مامی باوکی‌مردووەکە، یان مامی باپیرەی‌مردووەکە، جیاوازی نیە مامەکە: لە دایك‌وباوکی بێ، یان تەنها لە باوکی بێ (إلاَّ لِلأُمِّ) تەنها مامی تەنها لە دایکی نەبێ؟ چونکە مامی تەنها لە دایکی میراتگر نیە. **هەشتەم:** (وَكَذَا ابْنُهُ) کوڕەمامی مردووەکە، هەروەها ئەویش بەو مەرجەی کوڕەمامی تەنها لە دایکی نەبێ، بەڵکو کوڕەمامی لە دایك‌وباوکی بێ، یان کوڕەمامی تەنها لە باوکی بێ، هەرچەند دووریش بێ: وەك کوڕی کوڕی مامی‌مردووەکە...هتد، هەروەك لە (شرح المنهج)دا فەرموویەتی.

**نۆیەم:** (وَالزَّوْجُ) مێردی ژنە مردووەکە. **دەیەم:** (وَالْمُعْتِقُ) ئازادکەری کۆیلە مردووەکە. (وَمِنَ النِّسَاءِ) ئەو میراتگرانەی بە (إجماع)ی زانایانی ئیسلام میرات دەگرن لە چینی ئافرەتان (سَبْعٌ) حەفت کەسن:

**یەکەم:** (اَلْبِنْتُ) کیژی‌مردووەکە. **دووەم:** (وَبِنْتُ الإبْنِ) کیژی کوڕی‌مردووەکە (وَإِنْ سَفَلَ) هەرچەندە کوڕی‌مردووەکە بەرەو خوارەوەش بێ: وەك کیژی کوڕی‌کوڕ...هتد، بەو مەرجەی بە پوختەی نێرینەکان بگاتەوە مردووەکە؟ چونکە کیژی کیژی‌کوڕ میراتگر نیە، هەروەك لە زۆریەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

**سێیەم:** (وَالأُمُّ) دایکی‌مردووەکە. **چوارەم:** (وَالْجَدَّةُ) داپیرەی مردووەکە لە هەردوو لاوە، واتە: هەم دایکی‌دایك‌و بە سەرەوە، هەم دایکی‌باوك‌و بە سەرەوە، بەو مەرجەی داپیرەکە بە هۆی میراتگرێکەوە بگاتەوە مردووەکە، هەروەك لە کۆتایی میراتی باوك دایکدا ڕوونی دەکەینەوە، ان شاء الله تعالی.

**پێنجەم:** (وَالأُخْتُ) خوشکی‌مردووەکە، جیاوازی نیە خوشکەکە: لە دایك‌وباوکی بێ، یان تەنها لە دایکی بێ، یان تەنها لە باوکی بێ. **شەشەم:** (وَالزَّوْجَةُ) ژنی پیاوەمردووەکە. **حەفتەم:** (وَالْمُعْتِقَةُ) ئازادکەری کۆیلە مردووەکە.

فَلَوْ اجْتَمَعَ كُلُّ الرِّجَالِ وَرِثَ الأَبُ وَالإِبْنُ وَالزَّوْجُ فَقَطْ، أَوْ كُلُّ النِّسَاءِ فَالْبِنْتُ وَبِنْتُ الإِبْنِ وَالأُمُّ وَالأُخْتُ لِلأَبَوَيْنِ وَالزَّوْجَةُ، أَوِ الَّذِينَ يُمْكِنُ اجْتِمَاعُهُمْ مِنَ الصِّنْفَيْنِ فَالأَبَوَانِ وَالإِبْنُ وَالْبِنْتُ وَأَحَدُ الزَّوْجَيْنِ.

---

(فَلَوْ اجْتَمَعَ كُلُّ الرِّجَالِ) جا ئەگەر تەنها هەموو ئەو نێرینانەی‌پرابردوو کۆ بونەوە- لەو حاڵەتەی مردووەکە ئافرەتە- ئەو کاتە (وَرِثَ الأَبُ وَالإِبْنُ وَالزَّوْجُ فَقَطْ) تەنها باوك‌و كوڕو مێرد میرات دەگرن، چونکە باپیرە بە باوك بێبەش دەبێ‌و کوڕی کوڕ بە کوڕ بێبەش دەبێ‌و براو برازاو مام‌و مامۆزاو ئازادکەر بە کوڕەکەو هەم بە باوکیش بێبەش دەبن، جا لەم حاڵەتەدا: شەشێکی میراتەکە بۆ باوك، چوارێکی بۆ مێرد، پاشماوەکەشی بۆ کوڕەکەیە، کەوابو: بنچینەی مەسەلەکەیان لە دوانزەیە، بە لێدانی سێ لە چوار، بەم شێوەیە:

٤.    میراتگر ———— باوك،    مێرد،    کوڕ.
٣ ×. بەشەمیرات ———— شەشێك،  چوارێك،  پشتێیە.
١٢ ÷ ———— ٢ + ٣ + ٧ = ١٢.

(أَوْ كُلُّ النِّسَاءِ) یان ئەگەر تەنها هەموو ئەو ئافرەتانەی‌پرابردوو کۆ بونەوە- لەو حاڵەتەی مردووەکە نێرینەیە- ئەو کاتە (فَالْبِنْتُ وَبِنْتُ الإِبنِ وَالأُمُّ وَالأُخْتُ لِلأَبَوَيْنِ وَالزَّوْجَةُ) تەنها کیژو کیژی‌کوڕو دایك‌و خوشکی لە دایك‌وباوکی‌و ژن میرات دەگرن، چونکە داپیرە بە دایك بێبەش دەبێ‌و خوشکی تەنها لە دایکی بە کیژەکە بێبەش دەبێ‌و ئازادکەرو خوشکی تەنها لە باوکی بە خوشکی لە دایك‌وباوکی بێبەش دەبن؟ چونکە خوشك لەگەڵ کیژدا بە میراتگری پشتێ دادەندرێ، جا لەم حاڵەتەدا: نیوە بۆ کیژ، شەشێك بۆ کیژی‌کوڕ، شەشێکێکی‌تر بۆ دایك، هەشتێك بۆ ژن، پاشماوەکەشی بۆ خوشکەکەیە، کەوابو: بنچینەی مەسەلەکەیان لە بیست‌وچوارە، بە لێدانی سێ لە هەشت، بەم شێوەیە:

٨.    میراتگر ———— کیژ،   کیژی‌کوڕ،   دایك،   ژن،   خوشکی لە دایك‌وباوکی.
٣ ×. بەشەمیرات ———— نیوە،   شەشێك،   شەشێك،   هەشتێك،   پشتێیە.
٢٤ ÷ ———— ١٢ + ٤ + ٤ + ٣ + ١ = ٢٤.

(أَوِ الَّذِينَ) یان لەو میراتگرانەی‌پرابردوو، هەموو ئەوانە کۆ بونەوە: کە (يُمْكِنُ اجْتِمَاعُهُمْ مِنَ الصِّنْفَيْنِ) دەگونجا وێکرا کۆ ببنەوە لە هەر دوو جۆرەکەی نێرینەکان‌و ئافرەتەکان، ئەو کاتە (فَالأَبَوَانِ) دایك‌و باوك‌و (وَالإِبنِ وَالْبِنْتُ) کوڕو کیژو (وَأَحَدُ الزَّوْجَيْنِ) یەکێك لە ژنەکەو مێردەکە میرات دەگرن:

جا ئەگەر مێردەکە مردبێ: ئەوە هەشتێکی میرات بۆ ژنەکەیە، شەشێکی بۆ باوك، شەشێکێکی‌تر بۆ دایك، پاشماوەکەشی بۆ کوڕو کیژەکەیە، کەوابو: بنچینەی ئەم

وَلَوْ فُقِدُوا كُلُّهُمْ فَأصْلُ الْمَذْهَبِ أنَّهُ لا يُوَرَّثُ ذَوُوالأَرْحَامِ وَلا يُرَدُّ عَلَى أَهْلِ الْفَـرْضِ بَلِ الْمَالُ لِبَيْتِ الْمَالِ، وَأَفْتَىالْمُتَأَخِّرُونَ إِذَا لَمْ يَنْتَظِمْ أَمْرُ بَيْتِ الْمَالِ:

---

مەسەلەیە لە بیستو چوارە، بە لێدانی سێ لە هەشت، بەڵام لە حەفتاودوو ساغ دەبێتـەوە بە لێدانی سێ— کە ژمارەی سەری کوڕەکەو کیژەکەیە— لە بیستوچوار، بەم شێوەیە:

| | | |
|---|---|---|
| ٨. | میراتگر ———— | ژن، دایك، باوك، کوڕو کیژ. |
| ٣ ×. | بەشەمیرات ———— | هەشتێك، شەشێك، شەشێك، پشتێیە. |
| ٢٤ ÷ | ———— | ٣ + ٤ + ٤ + ١٣ = ٢٤. |
| ٣ × | ———— | ساغکردنەوەی بە سێ هاوبەش. |
| ٧٢ ÷ | ———— | ٩ + ١٢ + ١٢ + ٣٩ = ٧٢. |

وە ئەگەر ژنەکە مردبێ: ئەو کاتەش دایكو باوك— وەك مەسەلەکەیڕابردوو— هـەر یەکـەو شەشێکێك دەگرن، چوارێکیش بۆ مێردەکە، پاشماوەکەشی بۆ کوڕو کیژەکەیـە، کـەوابو: بنچینەی ئەم مەسەلەیە لە دوانزەیە، بە لێدانی سێ لە چوار، بەڵام لە سیو شەش ساغ دەبێتەوە بە لێدانی سێ—کە ژمارەیسەریکوڕەکەو کیژەکەیە— لە دانزە، بەم شێوەیە:

| | | |
|---|---|---|
| ٤. | میراتگر ———— | مێرد، دایك، باوك، کوڕو کیژ. |
| ٣ ×. | بەشەمیرات ———— | چوارێك، شەشێك، شەشێك، پشتێیە. |
| ١٢ ÷ | ———— | ٣ + ٢ + ٢ + ٥ = ١٢. |
| ٣ × | ———— | ساغکردنەوەی بە سێ هاوبەش. |
| ٣٦ ÷ | ———— | ٩ + ٦ + ٦ + ١٥ = ٣٦. |

(وَلَوْ فُقِدُوا كُلُّهُمْ) ئەگەر میراتگرەکان— لە جۆری نێر و مێ— هیچیان نەبون، یان هەنـدێکیان هەبون بەڵام میراتەکە لە بەشی خۆیان زیاد بوو، واتە: هیچ میراتگرێکی لـە پشتێش نـەبو، ئەوە (فَأصْلُ الْمَذْهَبِ) بنچینەی مەزهـەبی(الشـافعي) ئەمەیـە: (أَنَّـهُ لاَ يُـوَرَّثُ ذَوُو الأَرْحَـامِ) میراتەکە هیچی نادرێتە خزمەکانی (ذَوِيالأَرْحَامِ)، واتە: خزمەکانی خاوەن ڕەحم، هـەم (وَلاَ يُرَدُّ عَلَى أَهْلِ الْفَرْضِ) ئەو میراتەی لە بەشەکان زیاد بووە، ئەویش دووبارە بە سەر خـاوەن بەشـەکاندا بـەش ناکرێتـەوە (بَـلِ الْمَـالُ لِبَيْـتِ الْمَـالِ) بـەڵکو گشت میراتەکـە—ئەگـەر هیچ میراتگرێك نەبێ—یان ئەوەندەی لە بەشە میراتەکان زیاد بووە— ئەگەر میراتگر هـەبێ بـەڵام لە پشتێیان لەگەڵدا نەبێ—لە هەردوو حاڵەتدا دەدرێتە (بَيْت الْمَال)، هەرچەند (بَيْـت الْمَـال) ناڕێکیش بێو سەرپەرشتکارکەشی ستەمکار بێ.

بەڵام (وَأَفْتَىالْمُتَأَخِّرُونَ) کۆمەڵە زۆرەکەی زانایانی مەزهەبی(الشافعي) بە پێچەوانەی مەزهـەب فتوایان داوەو فەرموویانە: (إِذَا لَمْ يَنْتَظِمْ أَمْرُ بَيْتِ الْمَالِ) هەر کاتێك کاروباری (بَيْت الْمَال) ڕێك

بِالرَّدِّ عَلَى أَهْلِ الْفَرْضِ غَيْرِ الزَّوْجَيْنِ مَا فَضَلَ عَنْ فُرُوضِهِمْ بِالنِّسْبَةِ، فَإِنْ لَمْ يَكُونُوا صُرِفَ إِلَى ذَوِي الأَرْحَامِ، وَهُمْ مَنْ سِوَى الْمَذْكُورِينَ مِنَ الأَقَارِبِ، وَهُمْ عَشَرَةُ أَصْنَافٍ:

---

نەبو؟ چونکە پێشەوای موسوڵمانان نەبو، یان ستەمکار بوو-وەك سەردەمی ئێستا- (بِالرَّدِّ عَلَى أَهْلِ الْفَرْضِ) دەبی میراتە زیدەکە دووبارە بۆ خاوەن بەشەکان بگەڕێندرێتەوە (غَيْرِ الزَّوْجَيْنِ) جگە لە ژن و مێرد، واتە: هیچ بەشێکی میراتە زیادەکە دووبارە بە سەر ژن و مێرددا بەش ناکرێتەوە، چونکە ئەم دووانە خزمی ڕەحمیو پشتیی نین، جا ئەو میراتەی دووبارە بەش دەکرێتەوە (مَا فَضَلَ عَنْ فُرُوضِهِمْ) ئەوەیە: کە لە بەشی میراتگرەکان زیاد بووە لەو حاڵەتەی هیچ میراتگرێکیپشتیش نیە، کەوابو: (بِالنِّسْبَةِ) هەریەکەیان بەگوێرەی بەشەکەیخۆیان دووبارە بە سەریاندا بەش دەکرێتەوە، هەروەك لە کۆتایی (ساغکردنەوەی مەسەلەکان)دا بە درێژی ڕوونی دەکەینەوە،إن شاء الله تعالى.

(فَإِنْ لَمْ يَكُونُوا) جا ئەگەر هیچ خاوەن بەشێك نەبو، ئەو کاتە (صُرِفَ إِلَى ذَوِي الأَرْحَامِ) واجبە: میراتەکە-بە ناوی میرات- بدرێتە (ذَوِي الأَرْحَامِ)، واتە: خزمە خاوەن ڕەحمەکانی داهاتوو، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿اَلْخالُ وارِثُ مَنْ لاوارِثَ لَهُ﴾ حديث صحيح رواه أبوداود وغيره، خاڵ میراتگری ئەو کەسەیە: کە هیچ میراتگرێکی نیە.

﴿ ئاگاداری ﴾: زانایانی لێکۆڵەرەوە ئەو فتوایەیان بە ڕاستتر داناوە لە بنچینەی مەزهەب، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، کەوابو: دەبی ڕەفتار هەر بەو فتوایە بکرێ، جا ئەگەر مردووەکە هیچ میراتگرێکی نەبو و هیچ خزمێکی (ذَوِي الأَرْحَامِ)شی نەبو، ئەو کاتە واجبە: میراتەکە بدرێتە دەست کاربەدەستێکی ئەمینو باوەڕپێکراوی شوێنەکە، تاکو لە بەرژەوەندی موسوڵمانانی سەرف بکا.

جا ئەگەر کاربەدەست لەو شوێنەدا نەبو، یان خائینو لێنەزان بوو، ئەو کاتە ئەو کەسەی میراتەکەی لە بەردەستدایە بۆی دروستە-بەڵکو واجبە-: هەر بەخۆی لە بەرژەوەندی موسوڵمانان سەرفی بکا، جا ئەگەر بەخۆی نائەمین بوو، یان لێنەزان بوو، ئەو کاتە واجبە: بیداتە دەست یەکێکی ئەمینو لێزان تاکو ئەو لە بەرژەوەندی موسوڵمانان سەرفی بکا.

جا لەو دوو حاڵەتەدا مەرجە: دواڕۆژی ئەو دەستکارییە سەلامەت بێو تووشی ئاژاوە نەبێ، هەروەك لە (تحفە)و (نهایە)و حاشیەکانیاندا ڕوون کراوەتەوە.

## ﴿ باسی (ذَوِي الأَرْحَامِ)و چۆنیەتی میرات گرتنیان ﴾

(وَهُمْ) خزمەکانی(ذَوِي الأَرْحَامِ) لە شەرعدا (مَنْ سِوَى الْمَذْكُورِينَ مِنَ الأَقَارِبِ) خزمەکانیترن جگە لەو حەفدە خزمانەی باسمان کردن لە (ژمارەیمیراتگرەکان)دا(وَهُمْ عَشَرَةُ أَصْنَافٍ) خزمەکانی(ذَوِي الأَرْحَامِ) دە جۆرن:

أَبوالأُمِّ وَكُلُّ جَدٍّ وَجَدَّةٍ سَاقِطَيْنِ، وَأَوْلاَدُالْبَنَاتِ، وَبَنَاتُ الإِخْــوَةِ، وَأَوْلادُ الأَخَــوَاتِ، وَبَنُوالإِخْوَةِ لِلأُمِّ، وَالْعَمُّ لِلأُمِّ، وَبَنَاتُ الأَعْمَامِ، وَالْعَمَّاتُ، وَالأَخْــوَالُ، وَالْخَــالاتُ، وَالْمُدْلُونَ بِهِمْ.

---

یەکەم: (أَبوالأُمِّ) باوکیدایكو، هەم (وَكُلُّ جَدٍّ وَجَدَّةٍ سَاقِطَيْنِ) گشت باپیرەو داپیرەیەکی بێبەش لە میرات: وەك باوکی باوکیدایك، دایکی باوکیدایك. دووەم: (وَأَوْلاَدُالْبَنَاتِ) کوڕو کیژی کیژەکان: جا کیژەکانی خۆی بن، یان کیژەکانیکوڕی بێ. سێیەم: (وَبَنَاتُ الإِخْوَةِ) کیژەکانی برایەکان: جا برای لە دایكوباوکی بن، یان تەنها لە باوکی، یان تەنها لە دایکی. چوارەم: (وَأَوْلاَدُالأَخَوَاتِ) کوڕو کیژی خوشکەکان: جا خوشکی لەدایكوباوکی بن، یان تەنها لە باوکی، یان تەنها لە دایکی. پێنجەم: (وَبَنُوالإِخْوَةِ لِلأُمِّ) کوڕەبرایەکانی تەنها لە دایکی، هەم کیژەکانیشیان هەروەك ڕابرا. شەشەم: (وَالْعَمُّ لِلأُمِّ) مامی لە دایکی کە تەنها لە دایکەوە برای باوك بێ. حەفتەم: (وَبَنَاتُ الأَعْمَامِ) کیژە مامەکان: جا مامی لە دایكوباوکی بێ، یان تەنها لە باوکی، یان تەنها لە دایکی، هەروەها کوڕەمامی تەنها لە دایکیش وەك کیژەمامەکانە. هەشتەم: (وَالْعَمَّاتُ) پورەکانیمردووەکە: کە خوشکیباوکن. نۆیەم: (وَالأَخْوَالُ) خاڵەکانیمردووەکە. دەیەم: (وَالْخَالاَتُ) پورەکانیمردووەکە: کە خوشکیدایکن (وَالْمُدْلُونَ بِهِمْ) هەم ئەوانەی بەو دە جۆرانەش دەگەنەوە مردووەکە ئەوانیش (ذَوِيالأَرْحَامِ)ن.

ئینجا بزانە: لە بارەی میراتگرتنی خزمەکانی (ذَوِيالأَرْحَامِ) دوو مەزهەب هەنە: یەکەم: مەزهەبی (أَهْلِ الْقَرَابَةِ)، کە مەزهەبێکی بێهێزەو دەفەرموێ: کامەیان لە مردووەکە نزیکترە ئەویان میراتەکە دەگرێ. دووەم: مەزهەبی (أَهْلِ التَّنْزِيلِ)، کە مەزهەبێکی ڕاسترەو دەفەرموێ: هەر خزمێك لە خزمەکانی (ذَوِيالأَرْحَامِ) دەهێندرێتە شوێن ئەو میراتگرەی کە بە هۆی ئەویەوە دەگاتەوە مردووەکە، کەوابو: مامی تەنها لە دایكو خوشکیباوك وەکو باوك دادەندرێن، خاڵو خوشکیدایك وەکو دایك دادەندرێن، کوڕو کیژی خوشكو کوڕو کیژی کیژ هەر یەکەیان وەکو دایکیخۆیان دادەندرێن، دیسان بزانە: چۆنیەتی میراتگرتنی خزمەکانی (ذَوِيالأَرْحَامِ) سێ حاڵەتی هەنە:

**حاڵەتییەکەم:** حاڵەتی بە تەنهایی، واتە: هەر یەکێك لە خزمەکانی(ذَوِيالأَرْحَامِ) بە تەنها بێ، ئەوە گشت میراتەکە دەگرێ، جیاوازی نێر و مێ نیە، بۆ وێنە: ئەگەر مردووەکە تەنها کیژەبرایەکی هەبێ، ئەوە میراتەکەی گشتی بۆ کیژەبرایەکەیە، یان ئەگەر تەنها کیژەمامێکی هەبێ، ئەوە میراتەکەی گشتی بۆ کیژەمامەکەیە، هەروەك لە (تحفة)و (الشرواني)دا فەرموویانە.

**حاڵەتی دووەم:** خزمەکانی(ذَوِي الأرحَامِ) لە یەك کەس زیاتر بنو هەندێکیان لە هەندێکیان نزیکتر بن لە میراتگری‌مردووەکە، لەو حاڵەتەدا کامەیان لە میراتگرەکە نزیکتر بێ، ئەویان لەپێشترە بۆ میراتگرتن-نەك ئەوەی لە مردووەکە نزیکترە، هەروەك لە مەزهەبەکەی بێ‌هێزدا ئەوها بوو- چونکە ئەو خزمە لە جێی میراتگرەکە داندراوە، کەوابو: نزیکیی لە میراتگرەکە ڕەچاو دەکرێ، نەك نزیکیی لە مردووەکە:

**بۆ وێنە:** ئەگەر مردووەکە لە پاشی بەجێما: تەنها کیژی‌کیژی‌کوڕو کیژی‌کوڕی‌کیژ، ئەوە میراتەکە گشتی بۆ کیژی کیژی‌کوڕەکەیە؟ چونکە ئەمەیان بە یەك نمرە دەگاتە میراتگرەکە: کە کیژی کوڕی‌مردووەکەیە، بەڵام ئەوەکەی‌تر بە دوو نمرە دەگاتە میراتگرەکە: کە کیژی‌مردووەکەیە.

هەروەها ئەگەر لە پاشی بەجێما: تەنها باوکی‌دایکی‌دایك‌و دایکی‌باوکی‌دایك، ئەوە میراتەکە گشتی بۆ باپیرەکەیە؟ چونکە ئەمەیان بە یەك نمرە دەگاتە میراتگرەکە: کە دایکی دایکی‌مردووەکەیە، بەڵام داپیرەکە بە دوو نمرە دەگاتە میراتگرەکە: کە دایکی مردووەکەیە...هتد.

**حاڵەتی سێیەم:** خزمەکانی(ذَوِي الأرحَامِ) لە یەك کەس زیاتر بنو بە یەکسانیش لە میراتگرەکە نزیك بن، لەو حاڵەتەدا وا دابنێ: مردووەکە خودی ئەو میراتگرانەی لە دوای خۆی بەجێ هێشتون: کە خزمەکانی(ذَوِي الأرحَامِ) بە هۆی ئەوانەوە دەگەنەوە مردووەکە، ئینجا بەشە میراتی هەر یەکێك لەو میراتگرانە تەسلیمی ئەو خزمە دەکرێ: کە بە هۆی ئەو میراتگرەوە دەگاتە مردووەکە، ئینجا ئەو بەشە میراتەش-کە دەدرێتە خزمەکانی (ذَوِي الأرحَامِ)- هەر یەکەیان بەگوێرەی میراتگرتنی‌خۆیەتی لە خودی ئەو میراتگرە، ئەگەر وا دابنێین: خودی‌میراتگرەکە مردوە، جا میراتگرتنەکە بە ڕووی پشتێ بێ، یان بە خاوەن بەشی بێ:

**بۆ وێنە:** ئەگەر مردووەکە لە پاشی بەجێما: تەنها کیژی‌کیژو کیژی‌کیژی‌کوڕ، ئەوە نیوەی میراتەکە بۆ کیژی‌کیژەکەیەو شەشێکیشی بۆ کیژی‌کیژی‌کوڕەکەیە، ئینجا پاشماوەکەش بە سەریاندا بەش دەکرێتەوە: سێ بەشی بۆ کیژی‌کیژەکەو بەشێکیشی بۆ کیژی‌کیژی‌کوڕەکە.

هەروەها ئەگەر لە پاشی بەجێما: تەنها کیژی‌کیژێك‌و کوڕو کیژێکی کیژێکی‌تر، ئەوە نیوەی میراتەکە گشتی بۆ کیژی‌کیژەکەیەو نیوەکەی‌تریش بۆ کوڕو کیژی‌کیژەکەی‌ترە - لە ڕووی پشتێ- واتە: لەم نیوەیە کوڕەکە دوو هەندێ کیژەکەی دەدرێتێ، چونکە ئەگەر دایکی‌خۆیان مردبا: ئەوها میراتیان لێ‌دەگرت.

(فَصْلٌ) اَلْفُرُوضُ الْمُقَدَّرَةُ فِي كِتَابِ اللهِ تَعَالَى سِتَّةٌ: اَلنِّصْفُ فَرْضُ خَمْسَةٍ: زَوْجٍ لَـمْ تُخَلِّفْ زَوْجَتُهُ وَلَدًا وَلاَ وَلَدَ ابْنٍ،

---

ئینجا بزانە بێبەشکردن لە میرات لە خزمەکانی(ذَوِي‌الأَرْحَامِ)دا ڕەچاو دەکرێ بـەگوێرەی بێبەشکردنی ئەو میراتگرانەی کە خزمەکان بە هۆی ئەوانەوە دەگەنە مردووەکە:

بۆ وێنە: ئەگەر مردووەکە لە پاشی بەجێما: کیژەبرایەکی لـەدایکوباوکیو کیژەبرایـەکی تەنها لە دایکیو کیژەبرایەکی تەنها لـە بـاوکی، ئـەوە شەشـێکی میراتەکە بـۆ کیـژەبرای تەنها لە دایکییەو پاشماوەکەش گشتی بۆ کیژەبرای لە دایك وباوکییە، کیـژەبرای تـەنها لە باوکیش بەم کیژەبرایە بێبەش دەبێ لە میرات؟ چونکە برای تەنها لە بـاوکی بـە هـۆی برای لە دایكوباوکی بێبەش دەبێ.

هەروەها ئەگەر لە پاشی بەجێما: پورێك کە تەنها لە دایکەوە خوشکی باوك بوو، لەگـەڵ کیژەبرایەکی لە دایـكو بـاوکی، ئـەوە میراتەکـە گشـتی بـۆ پورەکەیـە، کیـژە برایەکـەش بێبەش دەبێ، چونکە گشت برایەك بە هۆی باوك بێبـەش دەبـێ، هـەروەك لـە (تحفة)دا ڕوونی کردۆتەوە.

﴿ ئاگـاداری ﴾: خزمـەکانی(ذَوِي‌الأَرْحَـامِ) نـاتوانن بەشـی میراتگرەکـانی خـاوەن بـەش – کە ژن، یان مێردە– کەم بکەنەوە، بۆ وێنـە: ئەگەر مردووەکـە تـەنها ژنێـكو کیـژێکی کیژی لە پاش بـەجێما، ئـەوە ژنەکـە چـوارێکی میراتەکـەی بـە تـەواوی دەدرێتـێو سـێ چوارێکەکەیتریش بۆ کیژی کیژەکەیە، واتە: بە هۆی کیژیکیژ بەشیژنەکە کەم نابێتەوە بۆ هەشتێك، هەروەك لە (نهاية)و (مغني)دا ڕوون کراوەتەوە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی بەشە میراتەکانو، خاوەن بەشەکان ﴾

(اَلْفُرُوضُ الْمُقَدَّرَةُ فِي كِتَابِ اللهِ تَعَالَى) ئەو بەشە میراتانەی لە قورئانی پیرۆز لـە سـوڕەتی (النساء)دا دیاری کراون بۆ میراتگرەکان (سِتَّةٌ) شەش بەشن:

(اَلنِّصْفُ) نیوەیی= $\frac{1}{2}$ وَ(الرُّبُعُ) چوارێك= $\frac{1}{4}$ وَ(الثُّمُنُ) هەشتێك= $\frac{1}{8}$ وَ(اَلثُّلُثَانِ) دووسێیەك= $\frac{2}{3}$ وَ(اَلـثُّلُـثُ) سـێیەك= $\frac{1}{3}$ وَ(السُّدُسُ) شەشێك= $\frac{1}{6}$.

١–(اَلنِّصْفُ فَرْضُ خَمْسَةٍ) نیوەیی بەشـی پێـنج میراتگرانـە، یەکەم: (زَوْجٍ) بەشـی مێردی ژنەکەیە، بەو مەرجەی (لَمْ تُخَلِّفْ زَوْجَتُهُ وَلَدًا وَلاَ وَلَدَ ابْـنٍ) ژنەکـەی لـە دوای خـۆی بـەجێی نەهێشتبێ: نە کوڕ و نە کیژ و نە کوڕیکوڕیو نە کیژیکوڕیو نـە بـەرەوخوارتریش، خـوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ إِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُنَّ وَلَدٌ﴾ ئێوە نیـوەی ئـەو میراتەتان هەیە: کە ژنەکانتان بەجێیان هێشتوە، بەو مەرجەی ژنەکان کوڕو کیژیان نەبن.

وَبِنْت، أَوْ بِنْت ابْنٍ، أَوْ أُخْت لأَبَوَيْنِ، أَوْ لأَب مُنْفَرِدَات. وَالرُّبُعُ: فَرْضُ زَوْجٍ لِزَوْجَتِهِ وَلَدٌ أَوْ وَلَدُابْنٍ، وَزَوْجَة لَيْسَ لِزَوْجِهَا وَاحِدٌ مِنْهُمَا. وَالثُّمُنُ: فَرْضُهَا مَعَ أَحَدهِمَا.

---

دووهم: (وَبِنْتٍ) بەشی کیژێکیمردووەکەیە. سێیەم: (أَوْ بِنْتِ ابْنٍ) بەشی کیژێکی کوڕی مردووەکەیە هەرچەند بەرەوخوارتریش بێ، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ كَانَتْ وَاحِدَةً فَلَهَا النِّصْفُ﴾ ئەگەر یەك کیژ بوو، ئەوە نیوەیی هەیە.

چوارەم: (أَوْ أُخْتٍ لأَبَوَيْنِ) بەشی خوشکێکی لە دایكوباوکیيە. پێنجەم: (أَوْ لأَبٍ) بەشی خوشکێکی تەنها لە باوکیيە، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَهُ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ﴾ ئەگەر مردووەکە خوشکێکی هەبوو، ئەوە نیوەی میراتەکەی هەیە.

(مُنْفَرِدَاتٍ) بەو مەرجەی ئەو چوار ئافرەتانەیرابردوو گشتیان بە تەنها بن، واتە: هیچ میراتگرێکی وەهایان لەگەڵدا نەبێ: کە بیانکاتە میراتگرىپشتێ، یان بەشیان کەم بکاتەوە، یان بێبەشیان بکا لە میرات، هەم میراتگرێکی وەکو خۆیشیان لەگەڵدا نەبێ.

٢-(وَالرُّبُعُ) چوارێك بەشی دوو میراتگرانە، یەکەم: (فَرْضُ زَوْجٍ) بەشی مێردی ژنەکەیە لەو حاڵەتەی کە (لِزَوْجَتِهِ وَلَدٌ) ژنەکەی: کوڕ، یان کیژی هەبێ، جیاوازی نیە: کوڕو کیژەکەی لەم مێردە بوبن، یان لە مێردێکیتر، یان لە زینا (أَوْ وَلَدُ ابْنٍ) یان ژنەکەی: کوڕیکوڕی، یان کیژیکوڕی هەبێ، هەرچەند بەرەوخوارتریش بێ، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَ﴾ ئەگەر ژنەکانتان منداڵیان هەبوو، ئێوە چوارێکی میراتتان هەیە.

دووهم: (وَزَوْجَةٍ) چوارێك بەشی ژنێکی مردووەکەو زیاتر لە ژنێکیەتی تا دەگاتە چوار ژن -واتە: چوارێکەکە لە نێوان خۆیاندا بەش دەکەن- بەو مەرجەی (لَيْسَ لِزَوْجِهَا وَاحِدٌ مِنْهُمَا) مێردەکەی: نە کوڕ و نە کیژ و نە کوڕیکوڕیو نە کیژیکوڕیو نە بەرەوخوارتریشی نەبێ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَهُنَّ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ إِنْ لَمْ يَكُنْ لَكُمْ وَلَدٌ﴾ ژنەکانتان چوارێکیان هەیە، ئەگەر منداڵتان نەبێ.

٣-(وَالثُّمُنُ) هەشتێك بەشی یەك میراتگرە، چونکە (فَرْضُهَا) تەنها بەشی ژنی مردووەکەیە لە ژنێکەوە تا دەگاتە چوار ژن- واتە: هەشتێکەکە لە نێوان خۆیاندا بەش دەکەن- لەو حاڵەتەی (مَعَ أَحَدِهِمَا) کوڕیمێردەکەی، یان کیژیمێردەکەی لە گەڵدا بێ، یان کوڕیکوڕیمێردەکەی، یان کیژیکوڕیمێردەکەی، یان بەرەوخوارتری لەگەڵدا بێ، جیاوازی نیە: کوڕو کیژەکەی لەم ژنە بوبن، یان لە ژنێکیتر، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ كَانَ لَكُمْ وَلَدٌ فَلَهُنَّ الثُّمُنُ مِمَّا تَرَكْتُمْ﴾ ئەگەر ئێوە منداڵتان هەبوو، ئەوە ژنەکانتان هەشتێکیان هەیە لە میراتەکەتان.

وَالثُّلُثَان: فَرْضُ بِنْتَيْنِ فَصَاعِدًا، وَبِنْتَيْ ابْنٍ فَأَكْثَرَ، وَأُخْتَيْنِ فَأَكْثَرَ لأَبَوَيْنِ أَوْ لأَبٍ.
وَالثُّلُثُ: فَرْضُ أُمٍّ لَيْسَ لِمَيِّتِهَا وَلَدٌ وَلاَ وَلَدُابْنٍ وَلاَ اثْنَان مِنَ الإِخْوَةِ وَالأَخَوَات،

---

ئینجا بزانه: له گشت ئەو حاڵەتانەیڕابردوودا مەرجه: کوڕو کیژی خۆیو کوڕو کیژی کوڕ میراتگر بن، واته: ئەگەر ئەوانه بە هۆی کوشتن، یان کافربوون، یان کۆیلەیی میرات نەگرن، ئەو کاته هەبوونیان وەك نەبوونه، واته: کار له میراتی ژن و مێردەکه ناکا، بەڵکو مێردەکه نیوەیی هەر دەدرێتێو ژنەکەش چوارێکی هەر دەدرێتێ، هەروەك له زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانه.

ئینجا بزانه له (عِدّة)ی تەڵاقی(الرَّجْعِي)دا ژنو مێرد میرات له یەکتری دەگرن، هەروەك له (کتاب الطلاق)دا ڕوونی دەکەینەوه، إن شاء الله تعالی.

٤-(وَالثُّلُثَانِ) دووسێیەك بەشی چوار میراتگرانه، یەکەم: (فَرْضُ بِنْتَيْنِ فَصَاعِدًا) بەشی دوو کیژو زۆرتر له دوو کیژی مردووەکەیه، خوای گەوره دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ كُنَّ نِسَاءً فَوْقَ اثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ﴾ ئەگەر کیژەکان دوو و بە سەرەوەتر بون، ئەوه دووسێیەکی میراتەکەیان هەیه. دووەم: (وَبِنْتَيْ ابْنٍ فَأَكْثَرَ) بەشی دوو کیژەکوڕو زۆرتر له دوو کیژەکوڕه، بە (إجماع)ی زانایانیئیسلام، جیاوازی نیه ئەو کیژەکوڕانه: هی یەك باوك بن، یان هی زۆر باوکان بن، واته: دووسێیەکه له نێوان خۆیاندا بەش دەکەن.

سێیەم: (وَأُخْتَيْنِ فَأَكْثَرَ لأَبَوَيْنِ) بەشی دوو خوشکی له دایكو باوکیو زۆرتر له دووانه.
چوارەم: (أَوْ لأَبٍ) بەشی دوو خوشکی تەنها له باوکیو زۆرتر له دووانه، خوای گەوره دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ كَانَتَا اثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا الثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ﴾ ئەگەر خوشکەکان دوو بون، ئەوه دووسێیەکی میراتیان هەیه.

ئینجا بزانه: لەو چوارانەشدا مەرجه: هیچ میراتگرێکی وەهایان لەگەڵدا نەبێ: کە بیانکاته میراتگری پشتێ، یان بەشیان کەم بکاتەوه، یان بێبەشیان بکا له میرات، هەروەك له زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانه.

٥-(وَالثُّلُثُ) سێیەك بەشی دوو میراتگرانه، یەکەم: (فَرْضُ أُمٍّ) بەشی دایکی مردووەکەیه، بەو مەرجەی (لَيْسَ لِمَيِّتِهَا وَلَدٌ) کوڕه مردووەکەی هیچ کوڕو هیچ کیژێکی نەبێو هەم (وَلاَ وَلَدُ ابن) هیچ کوڕیکوڕو هیچ کیژیکوڕو هیچ بەرەوخوارتریشی نەبێو هەم (وَلاَ اثْنَانِ مِنَ الإِخْوَةِ وَالأَخَوَاتِ) دوو و زیاتر له دووان خوشكو برای مردووەکەی لەگەڵدا نەبێ، جیاوازی نیه: له دایك وباوکی بن، یان تەنها له باوکی، یان تەنها له دایکی، خوای گەوره دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ وَلَدٌ وَوَرِثَهُ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ الثُّلُثُ﴾ ئەگەر مردووەکه کوڕو کیژی نەبونو دایكو باوکیشی میراتیان لێدەگرت، ئەوه دایکەکەی سێیەکی هەیه.

وَفَرْضُ اثْنَيْنِ فَأَكْثَرَ مِنْ وَلَدِالأُمِّ، وَقَدْ يُفْرَضُ لِلْجَدِّ مَعَ الإِخْوَةِ. وَالسُّدُسُ فَرْضُ سَبْعَة: أَب وَجَدٌّ لِمَيِّتِهِمَا وَلَدٌ أَوْ وَلَدُ ابْنٍ، وَأُمٌّ لِمَيِّتِهَا وَلَدٌ أَوْ وَلَدُ ابْنٍ أَوْ اثْنَـانِ مِـنْ إِخْـوَةٍ وَأَخَوَات،

---

دووهم: (وَفَـرْضُ اثْنَـيْنِ فَـأَكْثَرَ مِـنْ وَلَـدِ الأُمِّ) بەشـی دووان‌و زیـاتر لـه دووانـه لـه‌و خوشـك‌و برایانه‌ی ته‌نها له دایکه‌وه خوشك‌و برای مردووه‌كه‌ن، جیاوازی نێـر و مـێ نیـه، خـوای گـه‌وره دەفـه‌رموێ: ﴿فَإِنْ كَانُوا أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ فَهُمْ شُرَكَاءُ فِي الثُّلُثِ﴾ ئه‌گه‌ر خوشك‌و برایـه‌كانی تـه‌نها له دایکی له یه‌ك كه‌س زۆرتر بون، ئه‌وه گشتیان له سێیه‌كی میراته‌كه‌دا هاوبه‌شن.
(وَقَدْ يُفْرَضُ لِلْجَدِّ مَعَ الإِخْوَةِ) هه‌ندێ جاریش سێیه‌ك بۆ باپیره داده‌ندرێ له‌و حاڵه‌تـه‌ی له‌گـه‌ڵ برایه‌كانی مردووه‌كه‌دا بێ، هه‌روه‌ك له‌باسی (میراتی باپیر)دا ڕوونی ده‌كه‌ینه‌وه،إن شاء الله تعالى.
٦-(وَالسُّدُسُ فَرْضُ سَبْعَةٍ) شه‌شـیێك بەشـی حـه‌فت كه‌سـانه، یه‌كـه‌م: (أَبٍ) بەشـی بـاوكی مردووه‌كه‌یه. دووه‌م: (وَجَدٌّ) بەشـی بـاپیره‌ی مردووه‌كه‌یـه ئه‌گـه‌ر بـاوك نـه‌بێ، هـه‌م بـه‌و مه‌رجه‌ش باپیره‌كه به مێیینه نه‌گاته مردووه‌كه، واته: باوكی باوك‌و به سه‌ره‌وه‌تر بێ، نه‌ك باوكی‌دایـك، ئینجـا لـه‌و حاڵه‌تـه‌دا بـاوك‌و بـاپیره شه‌شـیێك ده‌گـرن: كـه (لِمَيِّتِهِمَـا وَلَـدٌ) مردووه‌كه‌یان كوڕ، یان كیژی هه‌بێ (أَوْ وَلَدُ ابن) یان كوڕی‌كوڕ، یـان كیـژی‌كوڕ، یـان بـه‌ره‌و خوارتری هه‌بێ، خوای‌گـه‌وره ده‌فـه‌رموێ: ﴿وَلِأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَاالسُّدُسُ مِمَّا تَـرَكَ إِنْ كَانَ لَهُ وَلَدٌ﴾ دایك‌و باوكی مردووه‌كـه هـه‌ر یه‌كـه‌یان شه‌شـیێكی میراته‌كـه‌یان هه‌یـه، ئه‌گـه‌ر مردووه‌كه منداڵی هه‌بێ. واته: له‌م ئایاته‌دا باپیره وه‌كو باوكه.
سێیه‌م: (وَأُمٍّ) شه‌شیێك به‌شی دایكی‌مردووه‌كه‌یه، له‌و حاڵه‌ته‌ی (لِمَيِّتِهَا وَلَـدٌ) مردووه‌كـه‌ی: كوڕ، یان كیژی هه‌بێ (أَوْ وَلَدُ ابْن) یان كوڕی‌كوڕ، یان كیژی‌كوڕ، یـان بـه‌ره‌وخوارتری هـه‌بێ (أَوْ اثْنَانِ مِنْ إِخْوَةٍ وَأَخَوَاتٍ) یـان دوو، یـان زیـاتر خوشـك‌و بـرای هـه‌بن، جیـاوازی نیـه: لـه دایك‌وباوكی بن، یان ته‌نها له دایكی، یان ته‌نها له باوكی، هـه‌م جیاوازی نیـه: گشـتیان بـرا بن، یان خوشك بـن، یـان خوشـك‌و بـرا بـن، هـه‌روه‌ها جیـاوازی نیـه لـه‌و خوشـك‌و برایانـه: یه‌كێكیان، یان گشتیان به هۆی كه‌سێكی‌تر بێ‌به‌ش ببن له میرات، یان نا.
بـه‌ڵام لێره‌شـدا-لـه گشـت ئه‌وانـه‌ی‌ڕابردوودا- مه‌رجـه: كـوڕو كیژه‌كـه‌ی‌و كـوڕو كیـژی كوڕه‌كه‌ی‌و خوشك‌و برایه‌كانیش میراتگر بن، واتـه: ئه‌گـه‌ر ئه‌وانـه بـه هـۆی كۆیلـه‌یی، یـان كوشتن، یان كـافربوون مـیرات نـه‌گرن، ئـه‌و كاتـه هـه‌بوونیان وه‌ك نه‌بوونـه، واتـه: كـار لـه میراتی باوك‌و باپیره‌و دایك ناكا، هه‌روه‌ك له (تحفـة)و (نهایـة)دا ڕوون كراوه‌تـه‌وه، به‌ڵگـه‌ش ئایه‌ته‌كه‌ی‌ڕابردووه‌و هه‌م خوای گه‌وره ده‌فـه‌رموێ: ﴿فَإِنْ كَانَ لَهُ إِخْوَةٌ فَلِأُمِّـهِ السُّـدُسُ﴾ ئه‌گه‌ر مردووه‌كه برای هه‌بن، دایكه‌كه‌ی شه‌شیێكی‌هه‌یه.

وَجَدَّة، وَلِبنْتِ ابْنٍ مَعَ بِنْتِ صُلبٍ، وَلأُخْتٍ أَوْ أَخَوَاتٍ لأَبٍ مَعَ أُختٍ لأَبَوَيْنِ، وَلِوَاحِدٍ مِنْ وَلَدِالأُمِّ .

---

چوارەم: (وَجَدَّة) شەشێك بەشی داپیرەیەكو زیاتر لە داپیرەیەكە، بەو مەرجەی دایكی مردووەكە نەمابێ، جیاوازی نیە مردووەكە: براو مندالی هەبن، یان نەیبن، هەروەك لە (شرح الرحبیة)دا فەرموویەتی، هەروەها جیاوازی نیە داپیرەكە: دایكیدایكو بە سەرەوەتر بێ، یان دایكیباوكو بە سەرەوەتر بێ ﴿عَنْ بُرَيْدَةَ: أَنَّ النَّبِيَّﷺ جَعَلَ لِلْجَدَّةِ السُّدُسَ إِذَا لَمْ تَكُنْ دُونَهَا أُمٌّ﴾ رواه أبوداود بسند صالح، پێغەمبەرﷺ شەشێكی بۆ داپیرە داناوە، بەو مەرجەی لە خۆی بەرەوخوارتر دایكێك نەبێ.

جا ئەگەر لە داپیرەیەك زیاتر بون: وەك دایكی دایكیباوكو دایكیباپیرەو دایكی دایكی دایك، ئەو كاتە شەشێكەكە لە نێوان خۆیاندا بەش دەكەن، هەروەك (أصحاب السنن بسند صحیح) گێراویەتیانەوەو، (مغنی)ش فەرموویەتی.

پێنجەم: (وَلِبِنْتِ ابْنٍ) بەشی كیژەكوڕێكو زیاتر لە كیژەكوڕێكە، واتە: لە نێوان خۆیاندا شەشێكەكە بەش دەكەن، جیاوازی نیە گشتیان لە یەك باوك بن، یان لە زۆر باوكان بن، هەر چەند بەرەو خوارتریش بن، جا كیژەكوڕ لەو حاڵەتە شەشێكی هەیە: كە (مَعَ بِنْتِ صُلبٍ) لەگەڵ كیژێكیمردووەكەدا بێ، هەم كوڕی مردووەكەش مردبێ ﴿عَنْ ابْنِ مَسْعُودٍ: قَضَى رَسُولُ اللهِﷺ لِلإِبْنَةِ النِّصْفَ وَلِإِبْنَةِ الإِبْنِ السُّدُسَ-تَكْمِلَةَالثُّلُثَيْنِ- وَمَا بَقِيَ لِلأُخْتِ﴾ رواه البخاري، پێغەمبەرﷺ بڕیاریدا: نیوەی میرات بۆ كیژی مردووكە بێو شەشێكی بۆ كیژیكوڕەكەی بێ- تا ببێتە تەواوكەری دووسێیەك- پاشماوەكەشی بۆ خۆشكەكەی بێ.

شەشەم: (وَلأُخْتٍ أَوْ أَخَوَاتٍ لأَبٍ) بەشی خوشكێكو زیاتر لە خوشكێكە: كە تەنها لە باوكەوە خوشكی مردووەكە بن، واتە: شەشێكەكە لە نێوان خۆیاندا بەش دەكەن، لەو حاڵەتەی (مَعَ أُخْتٍ لأَبَوَيْنِ) لەگەڵ خوشكێكی لە دایكو باوكیدا بێ، بە (قیاس) لە سەر كیژو كیژیكوڕ.

حەفتەم: (وَلِوَاحِدٍ مِنْ وَلَدِ الأُمِّ) بەشی تەنها یەكێكە لەو خوشكو برایانەی تەنها لە دایكەوە خوشكو برای مردووەكەن، جیاوازی نێر و مێ نیە لە شەشێك گرتندا، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَهُ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَاالسُّدُسُ﴾ ئەگەر مردووەكە برایەكی لەدایكی، یان خوشكێكی لەدایكیی هەبوو، ئەوە هەر یەكێك لەوان شەشێكی هەیە.

ئینجا بزانە: لەو میراتگرانەیڕابردوو، هەندێكیان هەندێ جار لە ڕووی پشتێوەش میرات دەگرن: وەك باوكو باپیرە، خوشك، كیژ، كیژیكوڕ.

(فَصْلٌ) اَلأَبُ وَالإِبْنُ وَالزَّوْجُ لاَ يَحْجُبُهُمْ أَحَدٌ، وَابْنُ الإِبْنِ لاَ يَحْجُبُهُ إلاَّ الإِبْنُ أَوْ ابْنُ ابْنٍ أَقْرَبُ مِنْهُ، وَالْجَدُّ لاَ يَحْجُبُهُ إلاَّ مُتَوَسِّطٌ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْمَيِّتِ،

---

﴿ ئاگاداری ﴾ ئەگەر دووکەس لە زگماکدا پێکەوە نوسا بون، ئەوە بە دوو میراتگر دادەندرێن بەو مەرجەی دوو سەریان هەبن، هەروەك لە (تحفة)و (مغني)دا فەرموویانە، واتە:-جگە لە سەر- مەرج نیە ئەندامەکانیتر بەژمارەی دوو کەسان بن، بەڵکو هەر کاتێك بزانین ژیانی هەر سەرکێکیان لەویتر جیایەو سەربەخۆیە، ئەوە بە دووکەس دادەندرێن، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی (حَجْب) قەدەغەکردن لە میراتگرتن ﴾

واتە: قەدەغەکردنی میراتگر لە گرتنی گشت میراتەکەی، یان لە بەشێکی میراتەکەی، کەواتە: (الحجب)=قەدەغەکردن دوو بەشە:

یەکەم: (حَجْبُ النُّقْصَانِ)=قەدەغەکردنیناتەواوی، وەك میراتگرەکە بە هۆی میراتگرێکیتر بەشی کەم ببێتەوە، هەر وەك دایك بە هۆی کوڕ لە سێیەکەوە دێتەوە سەر شەشێك، یان ژن بە هۆی کوڕ لە چوارێکەوە دێتەوە سەر هەشتێك...هتد، جا ئەمەیان لە (فَصْل)یڕابردوودا بە درێژی ڕوون کراوە، والحمد لله تعالى.

دووەم: (حَجْبُ الْحِرْمَانِ)=قەدەغەکردنی بێبەشی، وەك میراتگرەکە بە هۆی میراتگرێکی لە خۆی بەهێزتر بێبەش ببێ لە گشت میراتەکەی- هەر وەك لێرەدا ڕوونی دەکەینەوە- یان بە هۆی سیفەتێك لە گشت میراتگرتن قەدەغە بکرێ، هەروەك لەباسی (هۆیەکانی میرات نەگرتن)دا ڕوونی دەکەینەوە، إن شاء الله تعالى.

(اَلأَبُ وَالإِبنُ وَالزَّوْجُ لاَيَحْجُبُهُمْ أَحَدٌ) لە چینی نێرینەکان باوكو کوڕو مێرد هیچ کەسێك بێبەشیان ناکا لە میرات، بە (إجماع)ی زانایانی ئیسلام، بەڵام وادەبێ: میراتگرێکیتر بەشیان کەم دەکاتەوە، هەروەك لە (فصل)یڕابردوودا ڕوون کراوە.

(وَ) هەر بە (إجماع)ی زانایانیئیسلام (ابْنُ الإِبنِ) کوڕیکوڕو بەرەوخوارتر (لاَ يَحْجُبُهُ إلاَّ الإِبْنُ) هیچ کەسێك بێبەشی ناکا تەنها کوڕی مردووەکە نەبێو (أَوْ إِبْنُ إِبْنٍ أَقْرَبُ مِنْهُ) یان کوڕە کوڕێکی لە خۆی نزیکتر لە مردووەکە، بۆ وێنە: کوڕی کوڕیکوڕ بە کوڕیکوڕ بێبەش دەبێ...هتد.

(وَ) هەر بە (إجماع)ی زانایانی ئیسلام (الْجَدُّ) باپیرە، واتە: باوکیباوكو بە سەرەوەتر (لاَ يَحْجُبُهُ إلاَّ مُتَوَسِّطٌ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْمَيِّتِ) هیچ کەسێك بێبەشی ناکا تەنها ئەو نێرینەیە نەبێ: کە کەوتۆتە نێوان باپیرەکەو مردووەکە، بۆ وێنە: باوکیباوك بە باوك بێبەش دەبێ...هتد، چونکە (قاعِدة)یە: (هەر کەسێك بە هۆی کەسێکیتر بگاتە مردووەکە، بەو کەسەش

وَالأَخُ لأَبَوَيْنِ يَحْجُبُهُ الأَبُ وَالإِبْنُ وَابْنُ الإِبْنِ، وَلأَب يَحْجُبُهُ هَؤُلاَءِ وَأَخٌ لأَبَوَيْنِ، وَلأُمٍّ يَحْجُبُهُ أَبٌ وَجَدٌّ وَوَلَدٌ وَوَلَدُابْنٍ، وَابْنُ الأَخِ لأَبَوَيْنِ يَحْجُبُهُ سِتَّةٌ: أَبٌ وَجَدٌّ وَابْنٌ وَابْنُهُ وَأَخٌ لأَبَوَيْنِ وَلأَب، وَلأَب يَحْجُبُهُ هَؤُلاَءِ وَابْنُ الأَخِ لأَبَوَيْنِ، وَالْعَمُّ لأَبَوَيْنِ يَحْجُبُهُ هَؤُلاَءِ وَابْنُ أَخٍ لأَب، وَلأَب يَحْجُبُهُ هَؤُلاَءِ وَعَمٌّ لأَبَوَيْنِ،

---

بێبەش دەبێ لە میرات). بەلام خوشكو برای تەنها لە دایكی لەو (قاعدة)یە جیا كراونەوەو بە هۆی دایك بێبەش نابن، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَ) هەر بە (إجماع)ی زانایانیئیسلام (الأَخُ لأَبَوَيْنِ) برای لە دایكوباوكی (يَحْجُبُهُ) سێ كەس بێبەشی دەكەن: (اَلأَبُ وَالإِبْنُ وَابْنُ الإِبْنِ) باوكو كوڕو كوڕیكوڕو بەرەوخوارتر.

(وَ) هەروەها (لأَب) برای تەنها لە باوكی (يَحْجُبُهُ هَؤُلاَءِ) ئەو سێیانەیڕابردوو بێبەشی دەكەن، هەم (وَأَخٌ لأَبَوَيْنِ) برایەكی لە دایكوباوكیش بێبەشی دەكا، چونكە ئەمەیان خزمایەتیی بەهێزترە، هەروەها خوشكێكی لە دایكوباوكیش– ئەگەر لەگەڵ كیژی مردووەكە، یان كیژی كوڕیمردووەكەدا بێ– ئەویش برای تەنها لە باوكی بێبەش دەكا، هەروەك لە میراتی(خوشكو برا)دا ڕوونی دەكەینەوە، إن شاء الله تعالى.

(وَلأُمٍّ) برای تەنها لە دایكی (يَحْجُبُهُ) ئەم چوارانە بێبەشی دەكەن: (أَبٌ وَجَدٌّ وَوَلَدٌ وَوَلَدُ إِبْنٍ) باوكو باپیرەو كوڕو كیژی مردووەكەو كوڕو كیژی كوڕیمردووەكەو بەرەوخوارتریش، بە بەلگەی ئایەتی﴿يُورَثُ كَلاَلَةً﴾، واتە: مردووەكە باوكو باپیرەو كوڕو كوڕیكوڕی نەبن.

(وَابن الأَخِ لأَبوَيْنِ) كوڕەبرای لە دایكوباوكی (يَحْجُبُهُ سِتَّةٌ) شەش كەس بێبەشی دەكەن، كە ئەمانەن: (أَبٌ وَجَدٌّ) باوكو باپیرەو بە سەرەوەتر (وَابْنٌ وَابْنُهُ) كوڕو كوڕیكوڕو بەرەوخوارتر، چونكە ئەو چوارانە– بە هۆی لایەنی بابایەتیو كوڕایەتی– لەوی بەهێزترن، هەم (وَأَخٌ لأَبَوَيْنِ وَلأَب) بە برای لە دایك وباوكیو بە برای تەنها لە باوكی بێبەش دەبێ، چونكە ئەوانەش– بە هۆی نزیكتری– لەوی بەهێزترن.

(وَ)هەروەها (لأَب) كوڕەبرای تەنها لە باوكی (يَحْجُبُهُ هَؤُلاَءِ) ئەو شەشانەیڕابردوو بێبەشی دەكەن، هەم (وَابن الأَخِ لأَبَوَيْنِ) كوڕەبرای لە دایك و باوكیش بێبەشی دەكا، چونكە ئەمەیان خزمایەتیی بەهێزترە.

(وَالْعَمُّ لأَبَوَيْنِ) مامی لە دایكوباوكی (يَحْجُبُهُ هَؤُلاَءِ) ئەو حەفت كەسانەیڕابردوو بێبەشی دەكەن، هەم (وَابن أَخٍ لأَب) كوڕەبرای تەنها لە باوكیش بێبەشی دەكا، چونكە لایەنی كوڕەبرایەتی لە لایەنی مامایەتی بەهێزترە (وَ) هەروەها (لأَب) مامی تەنها لە باوكی (يَحْجُبُهُ هَؤُلاَءِ) ئەو هەشت كەسانەیڕابردوو بێبەشی دەكەن، هەم (وَعَمٌّ لأَبَوَيْنِ) مامی لە باوكو دایكیش بێبەشی دەكا، چونكە ئەمەیان خزمایەتیی بەهێزترە.

وَابْنُ عَمٍّ لأَبَوَيْنِ يَحْجُبُهُ هَؤُلاَءِ وَعَمٌّ لأَب، وَلأَب يَحْجُبُهُ هَؤُلاَءِ وَابْنُ عَمٍّ لأَبَوَيْنِ، وَالْمُعْتِقُ يَحْجُبُهُ عَصَبَةُ النَّسَب. وَالْبِنْتُ وَالأُمُّ وَالزَّوْجَةُ لاَ يُحْجَبْنَ، وَبِنْتُ الإبْنِ يَحْجُبُهَا ابْنٌ أَوْ بِنْتَان إِذَا لَمْ يَكُنْ مَعَهَا مَنْ يُعَصِّبُهَا، وَالْجَدَّةُ لِلأُمِّ لاَ يَحْجُبُهَا إِلاَّالأُمُّ، وَلِلأَب يَحْجُبُهَا الأَبُ أَوِ الأُمُّ، وَالْقُرْبَى مِنْ كُلِّ جِهَة تَحْجُبُ الْبُعْدَى مِنْهَا،

---

(وَابن عَمٍّ لأَبَوَيْنِ) کوڕەمامی لە دایكوباوكی (يَحْجُبُهُ هَؤُلاَءِ) ئەو نۆ کەسانەیڕابردوو بێبەشی دەکەن، هەم (وَعَمٌّ لأَبٍ) مامی تەنها لە باوكیش بێبەشی دەکا، چونکە مام لە مامۆزا نزیکترە (وَ) هەروەها (لأَبٍ) کوڕەمامی تەنها لە باوكی (يَحْجُبُهُ هَؤُلاَءِ) ئەو دە کەسانەیڕابردوو بێبەشی دەکەن، هەم (وَابْنُ عَمٍ لأَبَوَيْنِ) کوڕەمامی لە دایكوباوكیش بێبەشی دەکا، چونە خزمایەتیی بەهێزترە.

هەروەها مامی باوکیمردووەکەش بەو یازدە کەسانەیڕابردوو بێبەش دەبێو هەم بە کوڕەمامی تەنها لە باوکیش، هەروەها کوڕەمامی باوکیمردووەکەش بەو دوانزە کەسانەی ڕابردوو بێبەش دەبێو هەم بە مامی باوکیمردووەکەش، هەروەها مامی باپیرەی مردووەکەش بەو سێزدە کەسانەیڕابردوو بێبەش دەبێو هەم بە کوڕەمامی باوکی مردووەکەش، هەروەها کوڕەمامی باپیرەیمردووەکەش بەو چواردە کەسانەیڕابردوو بێبەش دەبێو هەم بە مامی باپیرەیمردووەکەش (وَ) هەروەها (الْمُعْتِقُ) ئازادکەری کۆیلە مردووەکەش (يَحْجُبُهُ عَصَبَةُ النَّسَبِ) پشتێیەکانینەژاد بێبەشی دەکەن.

(وَ) هەروەها لە چینی مێیینەکان: (الْبِنْتُ وَالأُمُّ وَالزَّوْجَةُ لاَ يُحْجَبْنَ) کیژو دایكو ژن بە هیچ کەسێك بێبەش نابن لە میرات بە (إجماع)ی زانایانیئیسلام، بەڵام وا دەبێ: میراتگرێکیتر بەشیان کەم دەکاتەوە، هەروەك لە (فصل)یڕابردوودا ڕوون کراوە.

(وَبِنْتُ الإبن) کیژەکوڕی مردووەکە (يَحْجُبُهَا إبنٌ) کوڕێکی مردووەکە بێبەشی دەکا، جیاوازی نیە کوڕی مردووەکە: باوکیخۆی بێ، یان مامی بێ، هەم (أوْ بِنْتَانِ) یان دوو کیژیمردووەکەو زیاتریش بێبەشی دەکەن (إذَا لَمْ يَكُنْ مَعَهَا مَنْ يُعَصِّبُهَا) بەو مەرجەی کیژەکوڕەکە نێرینەیەکی وەهای لەگەڵدا نەبێ: کە بیکاتە میراتگری پشتێ، واتە: ئەگەر کیژەکوڕەکە برایخۆی، یان کوڕەمامیخۆی لەگەڵدا بێ، ئەو کاتە بە هۆی دوو کیژەکە بێبەش نابێ، بەڵکو لەگەڵ نێرینەکە پاشماوەیمیراتەکە دەگرن.

(وَالْجَدَّةُ لِلأُمِّ) داپیرەی لای دایك، واتە: دایکیدایك (لاَ يَحْجُبُهَا إلاَّ الأُمُّ) تەنها دایك بێبەشی دەکا لە میرات، چونکە بە هۆی دایکەوە گەیشتۆتە مردووەکە، بەڵام (وَلِلأَبِ) داپیرەی لای باوك، واتە: دایکیباوك (يَحْجُبُهَا الأَبُ أوِ الأُمُّ) هەم باوكو هەم دایك بێبەشی دەکەن.

(وَالْقُرْبِى مِنْ كُلِّ جِهَةٍ) داپیرە نزیکترەکەی گشت لایەك (تَحْجُبُ الْبُعْدَى مِنْهَا) داپیرە

وَالْقُرْبَى مِنْ جِهَةِ الأُمِّ كَأُمِّ أُمٍّ تَحْجُبُ الْبُعْدَى مِنْ جِهَةِالأَبِ كَأُمِّ أُمِّ أَبٍ، وَالْقُرْبَى مِنْ جِهَةِ الأَبِ لاَ تَحْجُبُ الْبُعْدَى مِنْ جِهَةِ الأُمِّ فِيالأَظْهَرِ، وَالأُخْتُ مِنَ الْجِهَاتِ كَالأَخِ، وَالأَخَوَاتُ الْخُلَّصُ لأَبٍ يَحْجُبُهُنَّ أَيْضًا أُخْتَانِ لأَبَوَيْنِ، وَالْمُعْتِقَةُ كَالْمُعْتِقِ،

---

دوورترەکەی هەمان لا بێبەش دەکا، بۆ وێنە: دایکیباوك دایکیدایکیباوکو هەم دایکی باوکیباوکیش بێبەش دەکا، هەروەها دایکیدایك دایکیدایکیدایك بێبەش دەکا.

(وَ هەروەها (الْقُرْبَى مِنْ جِهَةِ الأُمِّ) داپیرە نزیکترەکەی لای دایك: (كَأُمِّ أُمٍّ) وەك دایکی دایك (تَحْجُبُ الْبُعْدَى مِنْ جِهَةِ الأَبِ) داپیرە دوورترەکەی لای باوك بێبەش دەکا: (كَأُمِّ أُمِّ أَبٍ) وەك دایکیدایکیباوك.

بەڵام (وَالْقُرْبَى مِنْ جِهَةِ الأَبِ) داپیرە نزیکترەکەی لای باوك: وەك دایکیباوك (لاَ تَحْجُبُ الْبُعْدَى مِنْ جِهَةِ الأُمِّ فِيالأَظْهَرِ) داپیرە دوورترەکەی لایەنی دایك بێبەش ناکا: وەك دایکیدایکیدایك، لە فەرموودەی بەهێزتردا، بەڵکو هەردووکیان لە شەشێکی میراتەکەدا هاوبەشن.

(وَالأُخْتُ مِنَ الْجِهَاتِ كَالأَخِ) خوشك لە هەر سێك لایەوە وەکو برایە، واتە: خوشکی لە دایكوباوکی بە هۆی باوكو کوڕو کوڕیکوڕو بەرەوخوارتریش بێبەش دەبێ، هەروەها خوشکی تەنها لە باوکیش بەو سێیانەو هەم بە برای لە دایكو باوکی بێبەش دەبێ، بەڵام خوشکی تەنها لە دایکی بە باوكو باپیرەو بە کوڕی، یان کیژی مردووەکەو بە کوڕی، یان کیژی کوڕیمردووەکەو بەرەوخوارتریش بێبەش دەبێ.

(وَالأَخَوَاتُ الْخُلَّصُ لأَبٍ) ئەو خوشکانەی تەنها لە باوکەوە خوشکی مردووەکەنو برای خۆیان لەگەڵیاندا نیە بیانکاتە میراتگری پشتێ، ئەوانەش (يَحْجُبُهُنَّ أَيْضًا أُخْتَانِ لأَبَوَيْنِ) دوو خوشکی لە دایكو باوکی بێبەشیان دەکەن هەروەك بە برایەکی لە دایكو باوکیش بێبەش دەبون، بەڵام ئەگەر برای خۆیان لە گەڵیاندا بێ: ئەو کاتە برایەکە دەیانکاتە (عَصَبَة)=میراتگری پشتێو بەو دوو خوشکانە بێبەش نابن، بۆیە بەو برایە دەگوترێ: (الأَخُ الْمُبَارَك)=برای بە بەرەکەت.

هەروەها خوشکێکی لە دایكوباوکیش ئەگەر لەگەڵ کیژی مردووەکە، یان کیژەکوڕی مردووەکەدا بێ، ئەویش خوشکی تەنها لە باوکی بێبەش دەکا، هەروەك لە میرای (خوشكو برا)دا ڕوونی دەکەینەوە،إن شاء الله تعالى.

(وَالْمُعْتِقَةُ) ئەو ئافرەتەی کۆیلەمردووەکەی ئازاد کردوە (كَالْمُعْتِقِ) وەکو ئەو پیاوەیە: کە کۆیلەکەی ئازاد کردوە، واتە: ئەویش بە میراتگرە پشتێیەکان بێبەش دەبێ.

## ﴿ بێبەشبوونی (عَصبَة)=میراتگری پشتێ لە میرات ﴾

(وَكُلُّ عَصبَةٍ) گشت میراتگرێکی پشتێ (يَحْجُبُهُ) بێبەشی دەكا (أَصْحَابُ فُرُوضٍ مُسْتَغْرِقَةٍ) ئـەو خـاوەن بەشـانەی بەشـەكانیان گشـت میراتەكـە دەگرێتـەوە، واتـە: هـەر كاتێـك میراتگرەكانی خاوەن بەش– بەگوێرەی بەشەكانیخۆیان– گشت میراتەكەیان گرت، ئەوە میراتگریپشتێ هیچی بۆ نامێنێتەوەو بێبەش دەبێ، چونكە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿أَلْحِقُوا الْفَرَائِضَ بِأَهْلِهَا فَمَا بَقِيَ فَلأَوْلَى رَجُلٍ ذَكَـرٍ﴾ رواه الشيخان، بەشە میراتـەكان بدەنە خاوەنەكانیان، جا ئەوەندەی دەمێنێتەوە، ئەوە بۆ نزیكترین میراتگری نێرینەیە. واتە: ئەگەر هیچیش نەماوە، ئەو كاتە بێبەش دەبێ.

بۆ وێنـە: ئەگەر مردووەكە لە پاشی بەجێما: برایەكی تەنها لەدایكیو مێردو دایكو مـام، ئـەوە خـاوەن بەشـەكان گشـت میراتەكـە دەگـرنو مامەكـەش بێبـەش دەبـێ، چـونكە بنچینەی مەسەلەكەیان لە شەشە–كە بەشی برایەكەی لێدەردەچێ– بەم شێوەیە:

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ٦. | میراتگر | ———— | برای لەدایكی، | مێرد، | دایك، | مام. |
| ١ ×. | بەشەمیرات | ———— | شـەشێك، | نیوە، | سێیەك، | پشتێیە. |
| ٦ ÷ | | ———— | ١ | + ٣ | + ٢ | + . بێبەشە = ٦. |

## ﴿ پێناسەی (عَصَبَة)=میراتگری پشتێ ﴾

(عَصَبَة)=میراتگریپشتێ ئەو میراتگرەیـە: كـە لـە قورئـانو حەدیسـدا بەشـە میراتـی بـۆ دیاری نەكرابێ، بەڵكو گشت میراتەكە دەگرێ ئەگەر هیچ خاوەن بەشێكی لەگەڵدا نـەبێ، یان ئەوەندە میراتە دەگرێ: كە لە پـاش خـاوەن بەشـەكان دەمێنێتـەوە، لـەو حاڵەتـەی خاوەن بەشی لەگەڵدایە.

ئینجا بزانە: (عَصَبَة)=میراتگریپشتێ سێ جۆرە، یەكەم: (عَصَبَةٌ بِنَفْسِـهِ) كە هـەر بە خودیخۆی میراتگری پشتێ بـێ: وەك ئـەو نێرینەیـەی نـەژادی بگاتـە مردووەكـەو هـیچ مێینەكیش لە نێوان ئەو و مردووەكەدا نەبێ: وەك كوڕو باوكو براو مامو...هتد.

دووەم: (عَصَبَةٌ بِالْغَيْرِ) ئەو مێینەیە: كە بە هۆی نێرێنەیـەك ببێتـە میراتگریپشـتێ: وەك خوشكەكانو كیژەكانی مردووەكە بە هۆی برایخۆیان دەبنە (عَصَبَة)=میراتگری پشتێ.

سێیەم: (عَصَبَةٌ مَعَ الْغَيْرِ) ئەو مێینەیە: كە بە هۆی كۆبوونەوەی لەگەڵ مێینەیەكیتردا دەبێتـە میراتگریپشـتێ: وەك خوشكەكانیمردووەكە بـە هـۆی كۆبوونـەوەیان لەگـەڵ كیژەكانیمردوەكـە، یـان كیژەكوڕەكانیمردووەكـە دەبنـە (عَصَـبَة)=میراتگـری پشـتێ، هەروەك لە (مغني)و (حاشيةالبقري)دا ڕوون كراوەتەوە.

## ﴿ ڕیزی (عَصَبَة)-میراتگرەکانی پشتێ ﴾

بزانە: هەر بە بەڵگەی حەدیسەکەی ﴿فَلأَوْلَى رَجُلٍ ذَكَرٍ﴾ی ڕابردوو: میراتگرەکانی پشتێ بەگوێرەی بەهێزتری‌و نزیکتری‌ی خۆیان یەکتری بێبەش دەکەن، کەواتە: تا لایەنی بەهێزترو نزیکتر هەبێ، لایەنەکەی‌تر میرات ناگرێ، چونکە میراتگرایەتی‌پشتێ شەش لایەنی هەنە:

کوڕایەتی، ئینجا بابایەتی، ئینجا باپیرایەتی‌و برایەتی، ئینجا کوڕەبرایەتی، ئینجا مامایەتی، ئینجا ئازادکردنی کۆیلە.

جا بەگوێرەی ئەو لایەنانە ڕیزی وەپێشخستنیان لە میراتگرتندا بەم شێوەیە بۆ دانراوە: کوڕ، ئینجا کوڕی‌کوڕو بەرەوخوارتر، ئینجا باوك، ئینجا باپیرەو برا– وێکڕا–، ئینجا برای لە دایك‌وباوکی–ئەگەر باپیرە نەبێ–، ئینجا برای تەنها لەباوکی، ئینجا کوڕەبرای لە دایك‌وباوکی، ئینجا کوڕەبرای تەنها لەباوکی، ئینجا مامی لەدایك‌وباوکی، ئینجا مامی تەنها لەباوکی، ئینجا کوڕەمامی لەدایك‌و باوکی، ئینجا کوڕەمامی تەنها لەباوکی، ئینجا مامی باوکی‌مردووەکە، ئینجا کوڕەمامی باوکی‌مردووەکە، ئینجا مامی باپیرەی مردووەکە، ئینجا کوڕەمامی باپیرەی‌مردووەکە– هەر چواریان بەو ڕیزەی لە مامی‌مردوەکەدا ڕابرا–، ئینجا ئازادکەری کۆیلە مردووەکە، ئینجا (بَيْتُ المَال).

جا ئەگەر ئەوانەی‌ڕابردوو هیچیان نەبون، ئەو کاتە میراتەکە بە سەر خاوەن بەشەکاندا بەش دەکرێتەوە، جا ئەگەر خاوەن بەشەکانیش نەبون، ئەو کاتە دەدرێتە (ذَوِي‌الأَرْحَام)، هەروەك لە (شرح الرحبية)و (قطرالعارض)دا ڕوون کراوەتەوە.

جا ئەگەر (ذَوِي‌الأَرْحَام)ش نەبون، ئەو کاتە میراتەکە لە بەرژەوەندی موسوڵمانان سەرف دەکرێ، هەروەك لە ئاگاداریەکەی پێش (ذَوِي‌الأَرْحَام)دا ڕوونمان کردەوە، والحمد لله تعالى.

﴿ پاشکۆ ﴾: ئەگەر کۆمەڵێك کوڕی‌کوڕ، یان کوڕەبرا، یان کوڕەمام لە یەك پلەدا – وێکڕا– کۆ بونەوە، ئەوە گشت میراتەکە، یان پاشماوەکەی بە یەکسانی بە سەر ژمارەی سەرەکانیاندا بەش دەکرێ، بۆ وێنە: ئەگەر چوار کوڕی‌کوڕی لە پاش بەجێمان: یەکێکیان لە کوڕێك بوو، سێیەکانی‌تریش لە کوڕێکی‌تر بون، ئەوە میراتەکە بە سەر هەر چواریاندا بە یەکسانی بەش دەکرێ، نەکەی ئەوەی بە تەنها لە کوڕێکە نیوەی هەبێ‌و سێیەکانی‌تریش وێکڕا نیوەکەی‌تریان هەبێ، چونکە گشتیان لە یەك پلەدانەو بە لایەنی کوڕەکوڕایەتیش میرات لە مردووەکە دەگرن، هەروەها کوڕەبرایەکان‌و کوڕەمامەکانیش بەو شێوەیە بە یەکسانی میراتەکە دەگرن، هەروەك لە (حاشيةالبقري)دا ڕوون کراوەتەوە.

(فَصْلٌ) اَلإبْنُ يَسْتَغْرِقُ الْمَالَ وَكَذَاالْبَنُونَ، وَلِلْبِنْتِ اَلنِّصْفُ وَلِلْبِنْتَيْنِ فَصَاعِدًا الثُّلُثَانِ، وَلَوِ اجْتَمَعَ بَنُونَ وَبَنَاتٌ فَالْمَالُ لَهُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنْثَيَيْنِ،

---

﴿ ئاگاداری ﴾: لێرەو لە باسەكانیڕابردووشدا مەرجی قەدەغەكردن لە میرات ئەوەیە: قەدەغەكەرەكە میراتگر بێ، كەواتە: هەر كەسێك بە هۆی كوشتن، یان كافربوون، یان كۆیلەیی میرات نەگرێ، ئەوە هەبوونی وەك نەبوونەو ناتوانێ هیچ میراتگرێك بێبەش بكا، یان بەشی كەم بكاتەوە.

هەروەها هەر میراتگرێكیش بە هۆی میراتگرێكیتر بێبەش بوبێ، ئەویش ناتوانێ هیچ میراتگرێك بێبەش بكا، یان بەشی كەم بكاتەوە، بەڵام لەم دووەمە ئەم مەسەلانە جیاكراونەوە: كە خوشكو برایەكانی مردووەكە لەگەڵ دایكی مردووەكە كۆ دەبنەوە، چونكە ئەو خوشكو برایانە بەشی دایكەكە كەم دەكەنەوە بۆ شەشێك هەرچەند خۆیشیان بێبەش ببن لە میرات: بە هۆی باوك، یان باپیرە، یان گرتنی گشت میراتەكە لە لایەن خاوەن بەشەكان، بۆ نموونە:

١- دایكو باوكو خوشكێكو برایەك: خوشكو برایەكان بە هۆی باوك بێبەشن، بەڵام ئەوانیش بەشی دایك كەم دەكەنەوە لە سێیەكەوە بۆ شەشێك.

٢- دایكو باپیرەو دوو خوشكی تەنها لە دایكی: خوشكەكان بە هۆی باپیرە بێبەشن، بەڵام ئەوانیش بەشی دایك كەم دەكەنەوە لە سێیەكەوە بۆ شەشێك.

٣- دایكو مێردو خوشكێكی لە دایكیو باوكیو برایەكی تەنها لە باوكی: برایەكە بە هۆی گرتنی گشت میراتەكە بێبەش دەبێ، بەڵام لەگەڵ خوشكەكە هەردووكیان بەشی دایكەكە كەم دەكەنەوە بۆ شەشێك، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا ناوەڕۆكی ئەم ئاگادارییە ڕوون كراوەتەوە، چەند وێنەیەكیتریش هەنە: لە ڕوونكردنەوەی(قطرالعارض)دا ڕوونم كردونەوە.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی میراتی منداڵەكانو منداڵی منداڵەكان ﴾

(اَلإبْنُ يَسْتَغْرِقُ الْمَالَ) تاكە كوڕێك گشت میراتكە دادەگرێ (وَكَذَا الْبَنُونَ) هەروەها دوو كوڕو زیاتریش گشت میراتەكە دادەگرنو گشتی بۆ ئەوانە، بە (إجماع)ی زانایانیئیسلام.

(وَلِلْبِنْتِ اَلنِّصْفُ) تاكە كیژێك نیوەی میراتی هەیە (وَلِلْبِنْتَيْنِ فَصَاعِدًا اَلثُّلُثَانِ) دوو كیژو زیاتریش دووسێیەكی میراتیان هەیە، هەروەك لە بەشە میراتەكاندا ڕابرا.

بەڵام (وَلَوِ اجْتَمَعَ بَنُونَ وَبَنَاتٌ) ئەگەر كوڕەكانو كیژەكان وێكڕا كۆ بونەوە، ئەو كاتە (فَالْمَالُ لَهُمْ) گشتماڵەكە-واتە: میراتەكە- بۆ هەموویانە (لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنْثَيَيْنِ) هەر نێرینەیەك وەك بەشی دوو مێینەی هەیە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يُوصِيكُمُ اللهُ فِي أَوْلاَدِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنْثَيَيْنِ﴾ لە بارەی منداڵەكانتان خوای گەورە ئامۆژگاریتان دەكا: نێرینە وەك بەشی دوو مێینەی هەیە لە میراتەكەتان.

وَأَوْلَادُ الإِبْنِ إِذَا انْفَرَدُوا كَأَوْلَادِ الصُّلبِ، فَلَوْ اجْتَمَعَ الصِّنْفَانِ: فَإِنْ كَانَ مِنْ وَلَدِ الصُّلْبِ ذَكَرٌ حَجَبَ أَوْلَادَ الإِبْنِ،

ئینجا بزانە: بۆیێ نێرینە دوو هەندی مێینەی بۆ داندراوە؟ چونکە نێرینە (جهاد)ی لە سەر واجبەو خوێنی مرۆڤیکوژراوی لە سەرەو دوو ئەرکی بەخێوکردنی-خۆیو ژنەکەشی- لە سەرە، بەڵام مێینە ئەوانەی لە سەر نیە، بەڵکو ئەگەر مێردی هەبێ، بەخێوکردنی خودیخۆیشی لە سەر نیە، هەروەك لە زۆریەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

**﴿ئاگاداری﴾**: ئەو یاسا دەستکردەی ئێستا لە دادگا ستەمکارەکاندا هەیە: کە بە یەکسانی میرات دەداتە نێرینەو مێینە، یاسایەکی دژ بە قورئانیپیرۆزە، مێینەکەش -جگە لە بەشیخۆی- میراتەکەی لێ حەڵاڵ نابێ، بەڵکو ئەگەر ئەو یاسایە بە ڕەوا بزانێو باوەڕی بەو شەریعەتەی ئیسلام نەبێ، ئەوە کافریش دەبێ، ئەگینا: (ظالم)و (فاسق)ە، هەروەك لە سەرەتای ئەم پەڕتووکەدا ڕوونمان کردەوە.

(وَأَوْلَادُ الإِبن) کوڕەکانو کیژەکانی کوڕیمردووکە (إِذَا انْفَرَدُوا) هەر کاتێك منداڵەکانی مردووەکەیان لەگەڵدا نەبێ (كَأَوْلَادِالصُّلْبِ) وەکو کوڕو کیژی خودیمردووەکەنە، بە (إجماع)ی زانایانیئیسلام، واتە: تاکە کوڕەکوڕێكو هەم زیاتریش گشت میراتەکە دەگرن، تاکە کیژەکوڕێك نیوە دەگرێ، دوو کیژەکوڕو زیاتریش دووسێیەك دەگرن، ئەگەر نێرینەو مێینەکانیان وێکڕا کۆ بونەوە، ئەوە هەر نێرینەیەك وەك بەشی دوو مێینەی هەیە.

بەڵام (فَلَوْ اجْتَمَعَ الصِّنْفَانِ) ئەگەر هەردوو چینەکان- واتە: منداڵەکانی خودیمردووەکەو منداڵەکانی کوڕیمردووەکە- وێکڕا کۆ بونەوە، ئەو کاتە ئەم سێ حاڵەتانەیداهاتوویان هەنەو لە هەر حاڵەتێکدا بە شێوەیەك ڕەفتاریان لەگەڵ دەکرێ:

**حاڵەتییەکەم**: (فَإِنْ كَانَ مِنْ وَلَدِالصُّلْبِ ذَكَرٌ) ئەگەر لە منداڵەکانی خودیمردووەکە نێرینەیەك، یان زیاتر هەبوو: بە تەنها، یان لەگەڵ مێینە، ئەو کاتە (حَجَبَ أَوْلَادَ الإِبْنِ) نێرینەکە گشت منداڵەکانی کوڕیمردووەکە بێبەش دەکا -نێرینەکانو مێینەکانیان- بە (إجماع)ی زانایانیئیسلام.

کەوابو: ئەو یاسا دەستکردەی ئێستا لە دادگا ستەمکارەکاندا هەیە: کە ئەگەر منداڵەکانی کوڕیمردووەکە باوکیخۆیان نەمابێ، ئەوان لە جێی باوکیان دادەندرێن، واتە: بە واجبی بەشە میراتیان بۆ دادەندرێ، هەرچەند خودیمردووەکەش کوڕیخۆی هەبێ، جا بەم بەشە ناشەرعییە دەڵێن: (وەسێتی واجب). ئەو یاسایە بە پێچەوانەی شەریعەتیئیسلامەو دژ بە حەدیسەکەی ﴿فَلأَوْلَى رَجُلٍ ذَكَرٍ﴾یڕابردووە، کەوابو: ئەگەر مردووەکە لە ژیانیا وەسێتەکەی نەکردبێ، بەشە میراتەکەش نابێتە ملکی منداڵەکانی کوڕەکەو لێیان حەرامە؟

وَإِلاَّ فَإِنْ كَانَ لِلصُّلْبِ بِنْتٌ فَلَهَا النِّصْفُ وَالْبَاقِي لِوَلَدِالإِبْنِ الذُّكُورِ أَوِ الذُّكُورِ وَالإِنَاثِ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ إِلاَّ أُنْثَى أَوْ إِنَاثٌ فَلَهَا أَوْ لَهُنَّ السُّدُسُ، وَإِنْ كَانَ لِلصُّلْبِ بِنْتَانِ فَصَاعِدًا أَخَذَتَا الثُّلُثَيْنِ وَالْبَاقِي لِوَلَدِالإِبْنِ الذُّكُورِ أَوِ الذُّكُورِ وَالإِنَاثِ، وَلاَ شَيْءَ لِلإِنَاثِ الْخُلَّصِ إِلاَّ أَنْ يَكُونَ أَسْفَلَ مِنْهُنَّ ذَكَرٌ فَيُعَصِّبُهُنَّ،

---

چونكه وەسيّتی واجب بە ئايەتەكانی ميرات (نَسْخ) بۆتەوە، هەروەك لە (تفسير إبن كثير)و (إرشادالساري)دا فەرموويانە.

**حاڵەتیدووەم:** (وَإِلاَّ) ئەگەر لە منداڵەكانی خودیمردووەكە هيچ نێرينەيەك نەبو، ئەوە تەماشا دەكەين: (فَإِنْ كَانَ لِلصُّلْبِ بِنْتٌ) ئەگەر خودیمردووەكە تاكە كيژێكی هەبوو، ئەو كاتە (فَلَهَاالنِّصْفُ) نيوەی ميراتەكەی بۆ ئەو كيژديەو (وَالْبَاقِي لِوَلَدِالإِبنِ) پاشماوەی ميراتەكەشی بۆ منداڵەكانی كوڕیمردووەكەيە: (الذُّكُورِ) نێرينەكانيان (أَوِ الذُّكُورِ وَالإِنَاثِ) يان نێرينەو مێيەكانيان: هەر نێرينەيەك وەك بەشی دوو مێيينەی دەدرێتێ.

(فَإِنْ لَمْ يَكُنْ) جا هەر لەم حاڵەتەدا ئەگەر لە منداڵەكانی كوڕیمردووەكەش هيچ نێرينەيەك نەبو، بەڵكو (إِلاَّ أُنْثَى أَوْ إِنَاثٌ) تەنها مێيينەيەك، يان زياتر لە مێيينەيەك هەبوو، ئەو كاتە (فَلَهَا أَوْ لَهُنَّ السُّدُسُ) كيژەكوڕەكەو زياتريش لە كيژە كوڕێك هەر شەشێكی ميراتەكەی هەيە، واتە: ئەگەر لە كيژەكوڕێك زياتر بون، ئەوە گشتيان لە شەشێكەكەدا هاوبەشن‌و ئەو شەشێكەش لەگەڵ نيوەی كيژەكە دەبێتە (تَكْمِلَةَالثُّلُثَيْنِ) تەواوكەری دووسێيەك، بە (إجماع)ی زانايانیئيسلام‌و هەم حەديسەكەی (إبن مسعود)ی ڕابردوو لە باسی(شەشێك)دا.

**حاڵەتیسێيەم:** (وَإِنْ كَانَ لِلصُّلْبِ بِنْتَانِ فَصَاعِدًا) ئەگەر خودیمردووەكە دوو كيژ، يان زياتری هەبون‌و هيچ نێرينەيكيشی نەبو، ئەو كاتە (أَخَذَتَا الثُّلُثَيْنِ) كيژەكان دووسێيەكی ميراتەكە دەگرن (وَالْبَاقِي لِوَلَدِالإِبنِ) پاشماوەكەش بۆ منداڵەكانی كوڕیمردووەكەيە: (الذُّكُورِ) نێرينەكانيان (أَوِ الذُّكُورِ وَالإِنَاثِ) يان نێرينەو مێيەكانيان: هەر نێرينەيەك وەك بەشی دوومێيينە.

بەڵام (وَلاَ شَيْءَ لِلإِنَاثِ الْخُلَّصِ) پوختەی مێيينەكانی كوڕیمردووەكە -كە نێرينەيان لەگەڵدا نەبێ- هيچ ميراتيان نادرێتێ بە (إجماع)ی زانايانیئيسلام، چونكە بە هۆی دوو كيژەكانیمردووەكە بێبەش دەبن (إِلاَّ أَنْ يَكُونَ أَسْفَلَ مِنْهُنَّ ذَكَرٌ) مەگەر كيژەكانی كوڕیمردووەكە نێرينەيەكی لە خۆيان بەرەوخوارتر لەگەڵيان دابێ: وەك كوڕەبرا، يان لە پلەی خۆيان: وەك برا، يان كوڕەمام، ئەو كاتە بێبەش نابن، بەڵكو (فَيُعَصِّبُهُنَّ) نێرينەكە دەيانكاتە (عَصَبَة)-ميراتگری پشتێ‌و وێكڕا پاشماوەكە دەگرن، جا بزانە: ئەم نێرينەيەش پێی دەگوترێ: (الأَخُ الْمُبَارَك)-برای بە بەرەكەت.

وَأَوْلَادُ ابْنِ الإبْنِ مَعَ أَوْلَادِالإبْنِ كَأَوْلَادِالإبْنِ مَعَ أَوْلَادِالصُّلب، وَكَذَا سَائِرُالْمَنَازِل، وَإِنَّمَا يُعَصِّبُ الذَّكَرُالنَّازِلُ مَنْ فِي دَرَجَتِهِ وَيُعَصِّبُ مَنْ فَوْقَهُ إِنْ لَمْ يَكُنْ لَهَا شَيْءٌ مِنَ الثُّلُثَيْنِ.

(فَصْلٌ) اَلأَبُ يَرِثُ بِفَرْضٍ إِذَا كَانَ مَعَهُ ابْنٌ أَوْ ابْنُ ابْنٍ،

---

(وَأَوْلَادُ إِبْـنِ الإبْـنِ) منداڵـەکانی کـوڕی کوڕیمردووەکـە: کـە (مَـعَ أَوْلَادِ الإبـنِ) لەگـەڵ منداڵـەکانی کوڕیمردووەکـەدا بـن، گشـتیان (کَـأَوْلَادِ الإبـن مَـعَ أَوْلَادِ الصُّـلْبِ) وەکـو منداڵەکانی کوڕی کوڕیمردووەکەنە: کە لەگەڵ منداڵەکانی خودیمردووەکەدا بن.

(وَكَذَا سَائِرُ الْمَنَازِلِ) هەروەها گشت پلەکانیتری بەرەوخوارتریش بـەو شـێوەیەنە، واتـە: پلەی بـەرەوخوارتر وەك منداڵـەکانی کوڕیمردووەکـە دابنـێو پلـەی سـەرەوەتریش وەك منداڵەکانی خودی مردووەکە دابنێ...هتد.

(وَإِنَّمَا يُعَصِّبُ الذَّكَرُ النَّازِلُ مَنْ فِيدَرَجَتِهِ) نێرینەیخوارەوە– واتە: کوڕیکوڕو بـەرەوخوارتر– تەنها ئەو مێیینەی لە پلەیخۆیەتی دەکاتە (عَصَبَة)–میراتگریپشتێ: وەکو خوشکیخۆیو کیژەمامیخۆی، بەڵام مێیینـەی لـە خـۆی بـەرەوخوارتر– وەکـو کیـژەبرای خـۆی– بێبـەش دەکا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَ) هەروەها (يُعَصِّبُ مَنْ فَوْقَهُ) ئەو مێیینەی لە خۆیشـی بـە سـەرەوەترە– وەکـو خوشـکی باوکیخۆی، یان کیژەمامی باوکیخۆی– ئەوەشیان دەکاتە (عَصَبَة)–میراتگری پشتێ، بـەڵام (إِنْ لَمْ يَكُنْ لَهَا شَيْءٌ مِنَ الثُّلُثَيْنِ) بەو مەرجەی ئەم مێینەیە هیچ بەشـێکی لـە دووسێیەکەکە نەبێ: وەك دوو کیژی مردووەکەو کیژەکوڕیمردووەکەو کوڕیکوڕی کـوڕی مردووەکـە، واتـە: دوو کیژەکان دووسێیەك دەگرن، ئەم نێرینەیەش ئەو کیژە کوڕەیە–کە بە پلە یـەك لـە خـۆی بە سەرەوەترە– دەکاتە (عَصَبَة)و وێکڕا پاشماوەکە دەگرن.

بەڵام ئەگەر بەشی لە دووسێیەك هەبوو، ئەو کاتە پێویست ناکا بیکاتـە (عَصَبَة): وەکـو کیژێکیمردووەکەو کیـژەکوڕی مردووەکـەو کوڕیکـوڕی کوڕیمردووەکـە، چـونکە لێـرەدا کیـژی مردووەکـە نیـوەی هەیـە، کیژیکوڕەکـەش شەشـێکی هەیـە–کـە(تَكْمِلَةَ الثُّلُثَيْنِ) تەواوکەری دووسێیەکە– پاشماوەکەش بۆ نێرینەکەیە.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی میراتی باوكو دایكو باپیرەو داپیرە ﴾

(اَلأَبُ) باوکیمردووەکـە لـە مـیرات گرتنـدا سـێ حاڵـەتی هەنـە: **حاڵەتییەکەم**: (يَرِثُ بِفَرْضٍ) تـەنها بـە خـاوەن بەشـی شەشـێکی میراتەکـە دەگـرێ (إِذَا كَـانَ مَعَـهُ إِبْـنٌ أَوْ إِبْـنُ إِبْـنٍ) هـەرکاتێك کـوڕی مردووەکـە، یـان کـوڕی کـوڕی مردووەکـە، یـان بـەرەوخوارتری لەگەڵـدا بـێ، جیـاوازی نیـە لەگـەڵ ئـەو منداڵانـەدا: مێیینەش هەبێ، یان نەبێ.

وَبِتَعْصِيبٍ إِذَا لَمْ يَكُنْ وَلَدٌ وَلاَ وَلَدُ ابْنٍ، وَبِهِمَا إِذَا كَانَ بِنْتٌ أَوْ بِنْتُ ابْنٍ لَـهُ السُّـدُسُ فَرْضًا وَالْبَاقِي بَعْدَ فَرْضَيْهِمَا بِالْعُصُوبَةِ. وَلِلأُمِّ الثُّلُثُ أَوِ السُّدُسُ فِي الْحَالَيْنِ السَّابِقَيْنِ فِي الْفُرُوضِ، وَلَهَا فِي مَسْأَلَتَيْ زَوْجٍ أَوْ زَوْجَةٍ وَأَبَوَيْنِ ثُلُثُ مَا بَقِيَ بَعْدَ الزَّوْجِ أَوِ الزَّوْجَةِ.

---

**حاڵەتی دووەم**: (وَبِتَعْصِيبٍ) تەنها بە میراتگرایەتی پشتێ پاشماوەی میراتەکە دەگرێ (إِذَا لَمْ يَكُنْ وَلَدٌ وَلاَ وَلَدُ ابْنٍ) هەرکاتێك نە کوڕو کیژی مردووەکەو نە کوڕو کیژی کوڕی مردووەکەو نە بەرەوخوارتریشی لەگەڵدا نەبێ.

**حاڵەتی سێیەم**: (وَبِهِمَا) هەم بە خاوەن بەشیو هەم بە مراتگرایەتی پشتێ میرات دەگرێ (إِذَا كَانَ بِنْتٌ أَوْ بِنْتُ إِبْنٍ) هەرکاتێك کیژێکی مردووەکە، یان زیاتر، یان کیژەکوڕێکی مردووەکە، یان زیاتر، یان بەرەوخوارتری لەگەڵدا بێ، بەو مەرجەی لەگەڵ ئەو منداڵانەدا هیچ نێرینەیەك نەبێ، کەوابو: (لَهُ السُّدُسُ فَرْضًا) شەشێکی میراتەکە بە خاوەن بەشی بۆ باوکەکەیەو هەم (وَالْبَاقِي بَعْدَ فَرْضَيْهِمَا بِالْعُصُوبَةِ) لە پاش بەشەکەی باوکو کیژەکە، یان کیژە کوڕەکە، پاشماوەکەش بە میراتگرایەتی پشتێ هەر بۆ باوکەکەیە، بە بەڵگەی حەدیسەکەی ﴿فَمَا بَقِيَ فَلأَوْلَى رَجُلٍ ذَكَرٍ﴾ی ڕابردوو، واتە: ئەوەی دەمێنێتەوە بۆ نزیکترین میراتگری نێرینەیە.

## ﴿ مەسەلەکانی (الْغَرَّاوَيْن): دوو پرشنگدارەکان ﴾

(وَلِلأُمِّ) دایکی مردووەکە سێ حاڵەتی هەنە، **حاڵەتی یەکەم**: (الثُّلُثُ) سێیەکی میراتەکەی هەیە بەو مەرجەی: نە منداڵی مردووەکەو نە منداڵی کوڕی مردووەکەو نە بەرەوخوارترو نە ژمارەی خوشكو برای مردووەکەی لەگەڵدا نەبێ. **حاڵەتی دووەم**: (أَوِ السُّدُسُ) یان شەشێکی هەیە، ئەگەر یەکێك لەوانەی ڕابردووی لەگەڵدا بێ، هەروەك (فِي الْحَالَيْنِ السَّابِقَيْنِ فِي الْفُرُوضِ) لە دوو حاڵەتەکەی ڕابردوو لە بەشە میراتەکاندا ڕوون کراوە.

**حاڵەتی سێیەم**: (وَلَهَا فِي مَسْأَلَتَيْ زَوْجٍ أَوْ زَوْجَةٍ وَأَبَوَيْنِ) لەو دووەمەسەلانەی کە مێردو دایكو باوك، یان ژنو دایكو باوك وێکڕا کۆ دەبنەوە، بەشی دایکەکە (ثُلُثُ مَا بَقِيَ بَعْدَ الزَّوْجِ أَوِ الزَّوْجَةِ) سێیەکی ئەو پاشماوەیە: کە لە پاش بەشی مێردەکە، یان ژنەکە دەمێنێتەوە —نەك سێیەکی هەموو میراتەکە— بە (إجماع)ی (صحابة)ی پێغەمبەرﷺ، چونکە هەر نێرو مێیەك لە یەك پلەدا بن، ئەوە نێرینەکە دوو هەندی مێیەکە دەگرێ، جا لە ڕاستیدا بەشی دایکەکە لێرەدا: یان شەشێکە، یان چوارێکە، بەڵام چونکە لە قورئانی پیرۆزدا بە (ثُلُث)= سێیەك ناوی هاتوە، بۆیێ دەڵێن: (ثُلُثُ ما يَبْقى) سێیەکی پاشماوەکە.

جا بزانە: ئەم دوو مەسەلەیە پێیان دەگوترێ: (الْغَرَّاوَيْن)، چونکە وەك ئەستێرەی پرشنگدار بە ناوبانگن، هەم پێیان دەگوترێ: (الْعُمَرِيَّتَيْن)، چونکە ئیمامی(عمر) ئەوها بڕیاری پێداوە.

وَالْجَدُّ كَالأَب إلاَّ أنَّ الأَبَ يُسْقِطُ الإِخْوَةَ وَالأَخَوَات وَالْجَدُّ يُقَاسِمُهُمْ إنْ كَانُوا لأَبَوَيْنِ أَوْ لأَب، وَالأَبُ يُسْقِطُ أُمَّ نَفْسِهِ وَلاَ يُسْقِطُهَاالْجَدُّ، وَالأَبُ فِي زَوْجٍ أَوْ زَوْجَةٍ وَأَبَــوَيْنِ يَرُدُّالأُمَّ مِنَ الثُّلُثِ إِلَى ثُلُثِ الْبَاقِي وَلاَ يَرُدُّهَاالْجَدُّ.

---

**مەسەلەی‌یەكەم**: مێرد، دایك، باوك، بنچینەی مەسەلەكە لە دووانە: نیوەی بۆ مێردەكەو نیوەكەی‌تریش بە سەر دایك‌و باوكدا بەش ناكرێ‌و كەمترین ژمارە: كە نیوەو سێیەكی پاشماوەی هەبێ: ژمارە شەشە، كەوابو: یەكسەر دەڵێین: بنچینەی مەسەلەكە لە شەشە: سێ بۆ مێردەكەیە، سێیەكی‌پاشماوەكەش-یەكە- بۆ دایكەكەیە، دووش بۆ باوكەكەیە، بەم شێوەیە:

٦. میراتگر ———— مێرد، دایك، باوك.

١ ×. بەشەمیرات ———— نیوە، سێیەكی‌پاشماوە، پشتێیە.

٦ ÷ ———— ٣ + ١ + ٢ = ٦.

**مەسەلەی‌دووەم**: ژن، دایك، باوك. بنچینەكەی لە چوارە-كە بەشی ژنەكەی لێ‌دەردەچێ- چوارێكی بۆ ژنەكەیە، سێیەكی‌پاشماوەكەش-یەكە- بۆ دایكەكەیە، دووش بۆ باوكەكەیە، بەم شێوەیە:

٤. میراتگر ———— ژن، دایك، باوك.

١ ×. بەشەمیرات ———— چوارێك، سێیەكی‌پاشماوە، پشتێیە.

٤ ÷ ———— ١ + ١ + ٢ = ٤.

(وَالْجَدُّ) باپیرە، واتە: باوكی‌باوك‌و بە سەرەوەتر (كَالأَبِ) وەكو باوكە- ئەگەر باوك نەمابێ- (إلاَّ) تەنها لە سێ مەسەلەدا باوك‌و باپیرە لێك جیانە:

یەكەم: (أنَّ الأَبَ يُسْقِطُ الإِخْوَةَ وَالأَخَوَاتَ) باوكی‌مردووەكە گشت خوشك‌و برایەكانی مردووەكە بێ‌بەش دەكا، بەلاّم (وَالْجَدُّ يُقَاسِمُهُمْ إنْ كَانُوا لأَبَوَيْنِ أَوْ لأَبٍ) باپیرە هاوبەشییان لەگەڵ دەكا ئەگەر لە دایك‌و باوكی، یان تەنها لە باوكی بن، بەلاّم ئەگەر تەنها لە دایكی بن، باپیرەش بێ‌بەشیان دەكا.

دووەم: (وَالأَبُ يُسْقِطُ أُمَّ نَفْسِهِ) باوكی‌مردووەكە دایكی‌خۆی-كە داپیرەی‌مردووەكەیە- بێ‌بەش دەكا، چونكە بەویەوە گەیشتۆتە مردووەكە، بەلاّم (وَلاَ يُسْقِطُهَا الْجَدُّ) باپیرە دایكی‌باوكەكە بێ‌بەش ناكا، چونكە ژنی‌خۆیەتی.

سێیەم: (وَالأَبُ فِي زَوْجٍ أَوْ زَوْجَةٍ وَأَبَوَيْنِ) باوكی‌مردووەكە لە مەسەلەی مێرد، یان ژن لەگەڵ دایك‌و باوك-كە بە (الْغَرَّاوَيْن) ناو دەبران- (يَرُدُّ الأُمَّ مِنَ الثُّلُثِ إِلَى ثُلُثِ الْبَاقِي) دایكی مردووەكە لە سێیەكی هەموو میراتەكەوە دەگەڕێنێتەوە بۆ سێیەكی‌پاشماوەكە، هەروەك ڕابرا، بەلاّم (وَلاَ يَرُدُّهَا الْجَدُّ) باپیرە دایكی‌مردووەكە ناگەڕێنێتەوە سەر سێیەكی پاشماوەكە،

وَلِلْجَدَّةِ اَلسُّدُسُ وَكَذَاالْجَدَّاتُ، وَتَرِثُ مِنْهُنَّ أُمُّ الأُمِّ وَأُمَّهَاتُهَا الْمُدْلِيَاتُ بِإِنَاثٍ خُلَّصٍ، وَأُمُّ الأَبِ وَأُمَّهَاتُهَا كَذَلِكَ، وَكَذَا أُمُّ أَبِي الأَبِ وَأُمُّ الأَجْدَادِ فَوْقَهُ وَأُمَّهَاتُهُنَّ عَلَى الْمَشْهُورِ، وَضَابِطُهُ: كُلُّ جَدَّةٍ أَدْلَتْ بِمَحْضِ إِنَاثٍ أَوْ ذُكُورٍ أَوْ إِنَاثٍ إِلَى ذُكُورٍ تَرِثُ، وَمَنْ أَدْلَتْ بِذَكَرٍ بَيْنَ أُنْثَيَيْنِ فَلاَ.
(فَصْلٌ) اَلإِخْوَةُ وَالأَخَوَاتُ لأَبَوَيْنِ إِنْ انْفَرَدُوا وَرِثُوا كَأَوْلاَدِالصُّلْبِ،

---

بەڵکو-ئەگەر باوکی‌مردووەکە نەمابێ- دایکی‌مردووەکە لەگەڵ باپیرەدا سێیەکی هەموو میراتەکە دەگرێ، چونکە پلەیەك لە باپیرە نیزکترە.
(وَلِلْجَدَّةِ اَلسُّدُسُ) یەك داپیرە شەشێکی میراتی هەیە (وَكَذَا الْجَدَّاتُ) هەروەها دوو داپیرەو زیاتریش تەنها شەشێکیان هەیەو لە نێوان خۆیاندا بە یەکسانی بەشی دەکەن: وەك دایکی دایکی‌باوك‌و دایکی‌باپیرەو دایکی دایکی‌دایك، هەروەك لە بەشە میراتەکاندا بەڵگەمان هێناوە (وَتَرِثُ مِنْهُنَّ) لە داپیرەکان ئەمانە میرات دەگرن:
لە لای دایکەوە: (أُمُّ الأُمِّ) دایکی‌دایك‌و هەم (وَأُمَّهَاتُهَا) دایکەکانی‌دایکی‌دایك: کە (الْمُدْلِيَاتُ بِإِنَاثٍ خُلَّصٍ) بە پوختەی مێینەکان بگەنە مردووەکە: وەك دایکی‌دایکی‌دایك‌و بە سەرەوەتر، ئینجا بزانە: لە لای دایکەوە تەنها یەك داپیرە میرات دەگرێ بە بەردەوامی.
(وَ) هەروەها لەلای باوکەوە: (أُمُّ الأَبِ) دایکی‌باوك‌و هەم (وَأُمَّهَاتُهَا كَذَلِكَ) دایکەکانی دایکی‌باوك: کە بە پوختەی مێینەکان بگەنە باوکی‌مردووەکە: وەك دایکی‌دایکی‌باوك (وَكَذَا أُمُّ أَبِي الأَبِ) هەروەها دایکی‌باوکی‌باوکیش‌و هەم (وَأُمُّ الأَجْدَادِ فَوْقَهُ) دایکی باپیرەکانی سەرەوەتری ئەو باپیرەش‌و هەم (وَأُمَّهَاتُهُنَّ) دایکی ئەو داپیرانەش گشتیان میرات دەگرن (عَلَى الْمَشْهُورِ) لە سەر فەرموودەی ناسراوی مەزهەب.
(وَضَابِطُهُ) ئەو (قاعدة)یەی بۆ داپیرە میراتگرەکان داندراوە ئەمەیە: (كُلُّ جَدَّةٍ أَدْلَتْ بِمَحْضِ إِنَاثٍ) هەر داپیرەیەك بە پوختەی مێینەکان بگاتە مردووەکە: وەك دایکی دایکی دایك (أَوْ ذُكُورٍ) یان بە پوختەی نێرینەکان بگاتە مردووەکە: وەك دایکی‌باوکی‌باوك (أَوْ إِنَاثٍ إِلَى ذُكُورٍ) یان بە پوختەی مێینەکان بگاتە نێرینەکان: وەك دایکی‌دایکی‌باوك (تَرِثُ) ئەو جۆرە داپیرەیە میرات دەگرێ، بەڵام (وَمَنْ أَدْلَتْ بِذَكَرٍ بَيْنَ أُنْثَيَيْنِ) هەر داپیرەیەك بە نێرینەیەکی نێوان دوو مێینە بگاتە مردووەکە: وەك دایکی‌باوکی‌دایك (فَلاَ) ئەوە میرات ناگرێ.

### ﴿ فَصْلٌ: لە باسی میراتی خوشك‌و براو مام ﴾

(اَلإِخْوَةُ وَالأَخَوَاتُ لأَبَوَيْنِ) براو خوشکی لەدایك‌وباوکی (إِنْ انْفَرَدُوا) ئەگەر بە تەنها بن، واتە: خوشك‌و برای تەنها لەباوکییان لەگەڵدا نەبێ، ئەو کاتە (وَرِثُوا كَأَوْلاَدِالصُّلْبِ) وەکو منداڵەکانی خودی‌مردووەکە میرات دەگرن، واتە: برایەك‌و زیاتر لە برایەك گشت میراتەکە،

وَكَذَا إِنْ كَانُوا لأَب إِلاَّ فِي الْمُشَرَّكَةِ: وَهِيَ زَوْجٌ وَأُمٌّ وَوَلَدَا أُمٍّ وَأَخٌ لأَبَوَيْنِ، فَيُشَارِكُ الأَخُ وَلَدَيِ الأُمِّ فِي الثُّلُثِ،

---

یان پاشماوەیمیراتەکە دەگریو تەنها خوشکێك نیوەی میراتەکە دەگریو دوو خوشكو زیاتر دووسێیەکی میراتەکە دەگرن، هەروەك لە بەشە میراتەکاندا ڕابرا، بەڵام ئەگەر خوشكو برا وێکڕا کۆ بونەوە، ئەوە هەر برایەك دوو هەندی خوشکێك دەگریٚ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ كَانُوا إِخْوَةً رِجَالاً وَنِسَاءً فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنْثَيَيْنِ﴾ ئەگەر میراتگرەکان خوشكو برا وێکڕا بون، ئەوە نێرینە وەك بەشی دوو مێینەی هەیە.

﴿ مەسەلەی (الْمُشَرَّكَة)=هاوبەشکراو ﴾

(وكَذَا إِنْ كَانُوا لأَبٍ) هەروەها ئەگەر خوشكو برایەکان تەنها لەباوکی بنو خوشكو برای لەدایكوباوکییان لەگەڵدا نەبێ، ئەوانیش بەو شێوەیڕابردوو میرات دەگرن، بە (إجماع)ی زانایانیئیسلام (إِلاَّ فِي الْمُشَرَّكَةِ) تەنها لە مەسەلەی (الْمُشَرَّكَة)=هاوبەشکراودا نەبێ، واتە: لەوێدا لێك جیانە (وَهِيَ) مەسەلەی(الْمُشَرَّكَة) ئەمەیە:

(زَوْجٌ وَأُمٌّ وَوَلَدَا أُمٍّ وَأَخٌ لأَبَوَيْنِ) مێردو دایكو دوو خوشك، یان دوو برای تەنها لەدایکیو برایەکی لەدایكوباوکی، بنچینەیمەسەلەکە لە شەشە-کە شەشێکیدایکی لێدەردەچیٚ-: نیوەی بۆ مێردەکەیە، شەشێکی بۆ دایکەکەیە، سێیەکی بۆ خوشكو برایەکانی تەنها لەدایکییە، جا ئەو بەشانە گشت میراتەکە دادەگرنەوەو هیچ بۆ برای لەدایكوباوکی نامێنێتەوە، چونکە (عَصَبَة)=میراتگری پشتێیەو (قیاس) ئەوهایە: بە هۆی ئەو داگرتنەوەیە بێبەش بیێ، بەڵام لێرەدا دەرهەق برای لەدایكوباوکی خزمایەتیباوکی هەڵدەوەشێندرێتەوەو تەنها خزمایەتیدایکی ڕەچاو دەکرێ، کەوابو: (فَيُشَارِكُ الأَخُ وَلَدَيِ الأُمِّ فِي الثُّلُثِ) برایەکەی لەدایكوباوکی-بە خزمایەتیدایکی- دەبێتە هاوبەشی خوشكو برایەکانی تەنها لەدایکی لەو سێیەکەداو بە یەکسانی لە نێوان خۆیاندا بەشی دەکەن، چونکە گشتیان منداڵی یەك دایکن، بەڵام باوکیان جیایە، واتە: دایکەکەیان-لایکەمی- دوو مێردی کردون، جا لە بەر ئەوەی سێیەکەکە دووەو بە سەر هەرسێك منداڵەکاندا بەش ناکرێ، ژمارەیمنداڵەکان-کە سێیە-لە بنچینەیمەسەلەکە دەدەین-کە شەشە-لە هەژدە ساغ دەبێتەوە، بەم شێوەیە:

٦. میراتگر ——— مێرد، دایك، دوو برای لەدایکی، برایەکی لەدایكوباوکی.

١×. بەشەمیرات ——— نیوە، شەشێك، سێیەك، پشتێیە.

٦ ÷ ——— ٣ + ١ + ٢ + ٠ بێبەشە = ٦.

٣ × ——— ساغکردنەوەی بە سێ هاوبەش.

١٨ ÷ ——— ٩ + ٣ + ٦ بۆ هەرسێك برایەکان = ١٨.

وَلَوْ كَانَ بَدَلَ الأَخِ أَخٌ لأَبٍ سَقَطَ. وَلَوْ اجْتَمَعَ الصِّنْفَانِ فَكَاجْتِمَاعِ أَوْلَادِ صُلْبٍ وَأَوْلَادِ ابْنِهِ

---

ئینجا بزانه: بەم مەسەلەیە دەگوترێ: (المُشَرَّكَة)، چونکه برایەکە کراوەتە هاوبەشی خوشكو برایەكانی تەنها لەدایكی، هەم پێی دەگوترێ: (الْحِمارِيَّة)، چونکە کە ئیمامی (عمرﷺ) ویستی برایەکانی لەدایكو باوكی بێبەش بکا، گوتیان: وا دابنێ باوکمان گوێدرێژێك بوو، خۆ گشتمان مندالّی یەك دایکین؟ هەم بە (الْحَجَرِيَّة)ش ناو دەبرێ، چونکە لە (روایة)یکدا: گوتیان: وا دابنێ باوکمان بەردێك بوو و فڕێماندا ناو دەریا، خۆ گشتمام مندالّی یەك دایکین؟ جا ئیمامی(عمرﷺ) قسەکەی پێ جوان بوو و بە خزمایەتی دایکی کردنیە هاوبەش.

کەوابو: (وَلَوْ كَانَ بَدَلَ الأَخِ أَخٌ لأَبٍ) ئەگەر لەم مەسەلەیەدا لە جیاتی برای لەدایكو باوکی برایەکی تەنها لەباوکی هەبوایە (سَقَطَ) بێبەش دەبو، چونکە (عَصَبَة)یەو هیچی بۆ نەماوەتەوەو دایکیشی جیایەو خزمایەتی دایکی‌ی نیە هاوبەشی‌ی پێ بکا، بەڵکو ئەگەر خوشکێکی خۆی، یان زیاتریشی لەگەڵدا بێ؛ ئەوە خوشکەکانیش بە هۆی ئەویەوە بێبەش دەبن، چونکە دەیانکاتە (عَصَبَة)، بۆیێ بەو برایە دەگوترێ: (الأَخُ الْمَشُوم)= برای بەدیۆم.

ئینجا بزانە: ئەگەر لەو مەسەلەیەدا خوشكو برایەکانی تەنها لەدایکی لە دووان زیاتر بون‌و برای لەدایكو باوکیش دوو، یان زیاتربون، یان خوشکی لە دایكو باوکییان لەگەڵدا بوو، یان لەجیاتی دایکەکە داپیرەیەك هەبوو، لەو حاڵەتانەدا هیچ لە هاوبەشیەکە ناگۆڕێو هیچ جیاوازیش لە نێوان خوشكو برایەکانی لەدایكو باوکی‌دا ناکرێو گشتیان بە یەکسانی دەبنە هاوبەشی خوشكو برایەکانی لەدایکی، بەڵام وا دەبێ: ساغکردنەوەی مەسەلەکە دەگۆڕێ.

هەروەها ئەگەر لەو مەسەلەیەدا لەجیاتی برای لەدایكو باوکی: خوشکێك هەبوو، ئەوە نیوەی میراتەکەی هەیەو مەسەلەکەش (عَوْل) دەکرێ بۆ نۆ، وە ئەگەر دوو خوشك، یان زیاتر بون، ئەو کاتە دووسێیەکیان هەیەو مەسەلەکەش (عَوْل) دەکرێ بۆ دە، واتە: لە هەردوو حاڵەتەدا مەسەلەکە دەگۆڕێو هاوبەشی ناکرێ، جیاوازی خوشکی لەدایكو باوکی‌و تەنها لەباوکیش نیە، هەروەك لە (تحفة)و (مغنی)دا روون کراوەتەوە.

(وَلَوْ اجْتَمَعَ الصِّنْفَانِ) ئەگەر هەردوو چینەکان، واتە: خوشكو برایەکانی لەدایكو باوکی‌و تەنها لەباوکی وێکڕا کۆ بونەوە، ئەوە (فَكَاجْتِمَاعِ أَوْلَادِ صُلْبٍ وَأَوْلَادِ إِبْنِهِ) وەکو کۆبوونەوەی منداڵەکانی خودی‌مردووەکەو منداڵەکانی کوڕی‌مردووەکەیە وێکڕا، واتە: سێ حاڵەتیان هەنە:

**حاڵەتی یەکەم:** ئەگەر برایەکی لەدایکو باوکی، یان زیاتر هەبوو: بە تەنها، یان لەگەڵ خوشکی لەدایکو باوکی، ئەوە گشت خوشکو برایەکانی تەنها لەباوکی بێبەش دەکا، بە (إجماع)ی زانایانی ئیسلام.

**حاڵەتی دووەم:** ئەگەر تەنها خوشکێکی لەدایکو باوکی هەبوو، ئەوە نیوەی میراتەکە بۆ ئەو خوشکەیە، پاشماوەکەش بۆخوشکو برایەکانی تەنها لەباوکییە: هەر برایەك دووهەندی خوشکێك دەگرێ، جا ئەگەر خوشکی تەنها لەباوکی نەبو، ئەوە پاشماوەکە گشتی بۆ برایەکەیە، بەڵام ئەگەر برای تەنها لە باوکییان لەگەڵ نەبو، ئەوە شەشێك -تەواوکەری دووسێیەك- بۆ خوشکی لە باوکییە، جا ئەگەر لە خوشکێك زیاتر بون، ئەوە گشتیان لەو شەشێکەدا هاوبەشن.

**حاڵەتی سێیەم:** ئەگەر تەنها دوو خوشکی لەدایکو باوکی، یان زیاتر هەبون، واتە: برای خۆیان لەگەڵدا نەبو، ئەوە دووسێیەکی میراتەکە بۆ ئەوانە، پاشماوەکەشی بۆ خۆشکو برایەکانی تەنها لە باوکییە: هەر برایەك دوو هەندی خوشکێك دەگرێ، جا ئەگەر خوشك نەبو، ئەوە پاشماوەکە گشتی بۆ برایەکەیە، بەڵام ئەگەر برای تەنها لەباوکی نەبو، ئەوە بە هۆی دوو خوشکی لەدایکو باوکی خوشکەکانی تەنها لەباوکی بێبەش دەبن.

(إلاَّ) بەڵام منداڵەکانی کوڕیمردووەکەو خوشکو برایەکان لەوەدا جیاوازن: (أَنَّ بَنَاتِ الإبْنِ) کیژەکوڕەکان (يُعَصِّبُهُنَّ مَنْ فِي دَرَجَتِهِنَّ أَوْ أَسْفَلُ) ئەو نێرینەی لە پلەی خۆیانە، یان بەرەوخوارترە دەیانکاتە (عَصَبَة)=میراتگری پشتێو پێی دەگوترا: (الأَخْ المُبَارَك)، هەروەك رابرا.

بەڵام (وَالأُخْتُ) خوشکیمردووەکە (لاَ يُعَصِّبُهَا إلاَّ أَخُوهَا) تەنها ئەو برایەی لە پلەیخۆیەتی دەیکاتە (عَصَبَة)، واتە: خوشکی لەدایکو باوکی بە برای لەدایکو باوکی دەبێتە (عَصَبَة)، بەڵام خوشکی لەدایکو باوکی بە برای تەنها لەباوکی نابێتە (عَصَبَة)، بەڵکو خوشکەکە بەشە دیارکراوەکەیخۆی دەگرێو پاشماوەکەش- ئەگەر ماوە- بۆ برایەکەیە، هەروەك لە حاڵەتەکانیرابردوودا ڕوون کراوە.

هەروەها هیچ خوشکێکی مردووەکەش بە هۆی کوڕەبرایخۆی، یان کوڕەمامیخۆی نابێتە (عَصَبَة)، بۆ وێنە: ئەگەر مردووەکە دوو خوشکی لەدایکو باوکیو خوشکێکی تەنها لەباوکیو کوڕەبرایەکی لە پاش بەجێمان، ئەوە دووسێیەکی میراتەکە بۆ دوو خوشکەکانەو پاشماوەکەشی گشتی بۆ کوڕەبرایەکە، خوشکە لە باوکیەکەش بەو دوو خوشکانە بێبەش دەبێو بەو کوڕەبرایە نابێتە (عَصَبَة)، بەڵام هەر لەم مەسەلەیەدا ئەگەر برایەکی لەباوکی هەبێ، ئەوە خوشکەکەیخۆی دەکاتە (عَصَبَة)و پاشماوەکە بۆ هەردووکیانە، بۆیێ بەم

**وَلِلْوَاحِدِ مِنَ الإِخْوَةِ أَوِ الأَخَوَاتِ لأُمٍّ اَلسُّدُسُ وَلِاثْنَيْنِ فَصَاعِدًا اَلثُّلُثُ سَوَاءٌ ذُكُورُهُمْ وَإِنَاثُهُمْ، وَالأَخَوَاتُ لأَبَوَيْنِ أَوْ لأَبٍ مَعَ الْبَنَاتِ وَبَنَاتِ الإِبْنِ عَصَبَةٌ كَالإِخْوَةِ:**

---

برایەش دەگوترێ: (الأَخُ المُبَارَك)=برای بە بەرەکەت، هەروەك لە (تحفه)و (نهایـە)دا ڕوون کراوەتەوە، کەوابو: کوڕەبرایەکەش بەو برایە بێبەش دەبێ، هەروەك ڕابرا.

(وَلِلْوَاحِدِ مِنَ الإِخْوَةِ أَوِ الأَخَوَاتِ لأُمٍّ اَلسُّدُسُ) خوشکێکی تەنها لەدایکی، یان برایەکی تەنها لەدایکی شەشێکی میراتەکەی هەیە (وَلِاثْنَيْنِ فَصَاعِدًا اَلثُّلُثُ) دوو، یان زیاتر لە خوشكو برایەکانی تەنها لەدایکی سێیەکیان هەیە (سَوَاءٌ ذُكُورُهُمْ وَإِنَاثُهُمْ) نێرینەو مێینەکانیان یەکسانن لەو سێیەکەدا، واتە: بە یەکسانی بە سەریاندا بەش دەکرێ بە (إجماع)ی زانایانی ئیسلام، هەروەك لە بەشە میراتەکاندا ڕابرا، چونکە ئەوانە بە خزمایەتی ڕەحمیّ-کە لایەنی دایکە- میرات دەگرن، نەك بە خزمایەتی پشتێ، کەواتە: ئەگەر خوشكو برای لەدایکیو باوکی، یان تەنها لەباوکی لە گەڵیاندا بێ، هیچ بەشەکەیان ناگۆڕێ:

بۆ وێنە: ئەگەر برایەکی لەدایكو باوکیو برایەکی تەنها لەباوکیو برایەکی تەنها لەدایکی وێکڕا کۆ بونەوە، ئەوە برایەکەی تەنها لە دایکی شەشێکی هەیەو برایەکەی لەدایكو باوکیش گشت پاشماوەکەی دەدرێتێ، برای تەنها لەباوکیش بەم برایە بێبەش دەبێ، هەروەها ئەگەر هەر سێك لا خوشك بون، ئەوە خوشکی لە دایكو باوکی نیوەی هەیەو خوشکی تەنها لە باوکی شەشێکی هەیەو خوشکی تەنها لە دایکیش شەشێکی هەیە، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی، واتە: ئەگەر لەو دوو مەسەلانەیڕابردوودا دوو خوشکی تەنها لەدایکی، یان دوو برای تەنها لەدایکی، یان خوشکێكو برایەکی تەنها لەدایکی بون، ئەو کاتە سێیەکیان هەیە.

(وَالأَخَوَاتُ لأَبَوَيْنِ) زۆر خوشك، یان تەنها خوشکێکی لەدایكو باوکی (أَوْ لأَبٍ) یان تەنها لەباوکی، ئەگەر کۆ بونەوە (مَعَ الْبَنَاتِ) لەگەڵ زۆر کیژ، یان تەنها کیژێکیمردووەکە (أَوْ بَنَاتِ الإِبْنِ) یان لەگەڵ زۆر کیژ، یان تەنها کیژێکی کوڕیمردووەکە، ئەوە (عَصَبَةٌ) خوشکەکان دەبنە میراتگری پشتێ (كَالإِخْوَةِ) وەکو برایەکانیان، واتە پاشماوەی میراتەکە دەگرن ﴿عَنْ ابن مسعودﷺ: قَضَى رَسُولُ اللّٰهِﷺ لِلإِبْنَةِ اَلنِّصْفَ وَلِابْنَةِ الإِبْنِ اَلسُّدُسَ وَمَابَقِيَ لِلأُخْتِ﴾ رواه البخاري، پێغەمبەرﷺ بڕیاریدا: نیوەی میراتەکە بۆ کیژی مردووەکە بێو شەشێکی بۆ کیژەکوڕەکەی بێو پاشماوەکەشی بۆ خوشکەکەی بێ. جا بنچینەی ئەم مەسەلەیە لە شەشە-کە بەشی کیژەکوڕەکەی لێدەردەچێ- بەم شێوەیە:

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٦. | میراتگر | کیژ، | کیژەکوڕ، | خوشك. |
| ١ × | بەشەمیرات | نیوە، | شەشێك، | پشتێیە. |
| ÷٦ | | ٣ + | ١ + | ٢ = ٦. |

فَتَسْقطُ أُخْتٌ لأَبَوَيْنِ مَعَ الْبِنْتِ اَلأَخَوَات لأَب، وَبَنُوالإِخْوَة لأَبَوَيْنِ أَوْ لأَب كُلٌّ مِنْهُمْ كَأَبِيه اجْتمَاعًا وَانْفرادًا لَكِنْ يُخَالِفُونَهُمْ: فِيأَنَّهُمْ لاَ يَرُدُّونَ الأُمَّ إِلَىالسُّدُسِ، وَلاَ يَرِثُونَ مَعَ الْجَدِّ، وَلاَ يُعَصِّبُونَ أَخَوَاتِهِمْ، وَيَسْقُطُونَ فِيالْمُشَرَّكَة. وَالْعَمُّ لأَبَوَيْنِ وَلأَب كَأَخٍ مِنَ الْجِهَتَيْنِ اجْتِمَاعًا وَانْفِرادًا، وَكَذَا قِيَاسُ بَنِيالْعَمِّ

---

ئینجا هەر کاتێك خوشك ببێتە (عَصَبَة)، ئەوە (فَتُسْقِطُ أُخْتٌ لأَبَوَيْنِ مَعَ الْبِنْتِ) خوشکی لەدایكو باوکی –ئەگەر لەگەڵ کیژی مردووەکە، یان لەگەڵ کیژەکوڕی مردووەکەدا بێ– بێبەش دەکا: (اَلأَخَوَاتِ لأَبٍ) خوشکەکانو برایەکانی تەنها لەباوکی، هەروەك برای لەدایكو باوکیش بێبەشیان دەکا، هەروەها ئەگەر خوشکی تەنها لەباوکیش لەگەڵ کیژی مردووەکە، یان لەگەڵ کیژەکوڕی مردووەکە ببێتە (عَصَبَة)، ئەویش– وەکو برای تەنها لەباوکی– کوڕەبرایەکانو مامەکانو...هتد، بێبەش دەکا، هەروەك لە (حاشیةالبقري)دا فەرموویەتی.

(وبَنُوالإِخْوَةِ لأَبَوَيْنِ) کوڕەبرایەکانی لەدایكو باوکی (أَوْ لأَبٍ) یان تەنها لەباوکی (كُلٌّ مِنْهُمْ كَأَبِيهِ اجْتِمَاعًا وَانْفِرَادًا) هەر یەکێك لەوان وەکو باوکیخۆیەتی لە حاڵەتی کۆمەڵیو تەنهاییدا، واتە: کوڕەبرایەكو زیاتر لە کوڕەبرایەك گشت میراتەکە، یان پاشماوەی خاوەن بەشەکان دەگرێو، ئەگەر هەردوو لا وێکڕا کۆ بونەوە، ئەوە کوڕەبرای لەدایكو باوکی کوڕەبرای تەنها لەباوکی بێبەش دەکا (لَكِنْ يُخَالِفُونَهُمْ فِي أَنَّهُمْ) بەڵام کوڕەبرایەکان لە چوار مەسەلەدا لە باوکیخۆیان جیاوازن:

یەکەم: (لاَ يَرُدُّونَ الأُمَّ إِلَىالسُّدُسِ) کوڕەبرایەکان دایکیمردووەکە لە سێیەکەوە ناگەڕێننەوە بۆ شەشێك. دووەم: (وَلاَ يَرِثُونَ مَعَ الْجَدِّ) کوڕەبرایەکان لەگەڵ باپیرەدا میرات ناگرن، بەڵکو باپیرە بێبەشیان دەکا. سێیەم: (ولاَ يُعَصِّبُونَ أَخَوَاتِهِمْ) کوڕەبرایەکان خوشکەکانیخۆیان ناکەنە (عَصَبَة)، چونکە کیژەبرا لە (ذَوِيالأَرْحَام)ەکانە. چوارەم: (وَيَسْقُطُونَ فِيالْمُشَرَّكَةِ) کوڕەبرایەکانی لەدایكو باوکی لە مەسەلەی (الْمُشَرَّكَة)دا بێبەش دەبن، چونکە خزمایەتی دایکییان نیە.

## ﴿ میراتی مامەکان ﴾

(وَالْعَمُّ لأَبَوَيْنِ وَلأَبٍ) مامی لەدایكو باوکیو هەم مامی تەنها لەباوکی (كَأَخٍ مِنَ الْجِهَتَيْنِ) وەکو برایە: لە هەردوو لایەوە (اجْتِمَاعًا وَانْفِرَادًا) لە حاڵەتی کۆمەڵیو تەنهاییدا، واتە: مامێكو زیاتر لە مامێك گشت میراتەکە، یان پاشماوەی خاوەن بەشەکان دەگرێو ئەگەر هەردوو لا وێکڕا کۆ بونەوە، ئەوە مامی لەدایكو باوکی مامی تەنها لەباوکی بێبەش دەکا.

(وكَذَا قِيَاسُ بَنِيالْعَمِّ) هەروەهاش (قیاس)ی کوڕەمامەکان دەکرێتە سەر باوکیان، واتە:

وَسَائِرِ عَصَبَةِ النَّسَبِ، وَالْعَصَبَةُ مَنْ لَيْسَ لَهُ سَهْمٌ مُقَدَّرٌ مِنَ الْمُجْمَعِ عَلَى تَوْرِيثِهِمْ، فَيَرِثُ الْمَالَ أَوْ مَا فَضَلَ بَعْدَ الْفُرُوضِ.
(فَصْلٌ) مَنْ لاَ عَصَبَةَ لَهُ بِنَسَبٍ وَلَهُ مُعْتِقٌ فَمَالُهُ أَوِ الفَاضِلُ عَنِ الْفُرُوضِ لَهُ رَجُلاً كَانَ أَوْ امْرَأَةً، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ فَلِعَصَبَتِهِ بِنَسَبِ الْمُتَعَصِّبِينَ بِأَنْفُسِهِمْ لاَ لِبِنْتِهِ وَأُخْتِهِ، وَتَرْتِيبُهُمْ كَتَرْتِيبِهِمْ فِي النَّسَبِ، لَكِنَّ الأَظْهَرَ أَنَّ أَخَا الْمُعْتِقِ وَابْنَ أَخِيهِ يُقَدَّمَانِ عَلَى جَدِّهِ،

---

کوڕەمامێكو زیاتر گشت میراتەكە، یان پاشماوەكە دەگرێو كوڕەمامی لەدایكو باوكی كوڕەمامی تەنها لەباوكی بێبەش دەكا، هەروەها مامی باوكیمردووەكەو مامی باپیرەی مردووەكەو كوڕەكانیانو هەم (وَسَائِرِ عَصَبَةِالنَّسَبِ) گشت (عَصَبَة)كانیتری نەژادی: وەك كوڕەكوڕەبراو كوڕەكوڕەمام، گشتیان لە ڕیزی خۆیدا بەو (قیاس)ەیڕابردوو ڕەفتاریان لەگەڵ دەكرێ، ئینجا بزانە: لە دوای كوڕەمامایەتی هیچ (عَصَبَة)یەكیتری نەژادی نیە، هەروەك لە (تحفة)و (نهایة)دا فەرموویانە.
(وَالْعَصَبَةُ) پێناسەی (عَصَبَة)=میراتگریپشتێ ئەمەیە: (مَنَ لَيْسَ لَهُ سَهْمٌ مُقَدَّرٌ) ئەو كەسەیە: كە هیچ بەشێكی دیاركراوی نەبێ (مِنَ الْمُجْمَعِ عَلَى تَوْرِيثِهِمْ) لەو میراتگرانەی بە (إجماع) میرات دەگرن، بۆیێ (فَيَرِثُ الْمَالَ) یان گشت ماڵی مردووەكە بە میرات دەگرێ (أَوْ مَا فَضَلَ بَعْدَالْفُرُوضِ) یان ئەو پاشماوەیەی لە پاش خاوەن بەشەكان دەمێنێتەوە، ئیتر لە كۆتایی (الحجب)=بێبەشكردندا بەشەكانو ڕیزەكانی (عَصَبَة)كانمان بە درێژی ڕوون كردەوە، والحمد لله تعالى.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی میراتگرایەتی بە هۆی ئازادكردنی كۆیلە ﴾

(مَنْ لاَ عَصَبَةَ لَهُ بِنَسَبٍ) هەر مردووێك میراتگری پشتێی لە نەژادیخۆی نەبێو (وَلَهُ مُعْتِقٌ) ئازادكەرێكی هەبێ–واتە: مردووەكە كاتێ خۆی كۆیلە بوبێو كەسێك ئازادی كردبێ– ئەوە (فَمَالُهُ) گشت ماڵەكەی (أَوِ الْفَاضِلُ عَنِ الْفُرُوضِ) یان ئەو پاشماوەیەی لە پاش خاوەن بەشەكان دەمێنێتەوە (لَهُ) بۆ ئەو ئازادكەرەیە، جیاوازی نیە (رَجُلاً كَانَ أَوْ امْرَأَةً) ئازادكەرەكە: پیاو بێ، یان ئافرەت (فَإِنْ لَمْ يَكُنْ) جا ئەگەر ئازادكەرەكەش نەمابو، ئەوە (فَلِعَصَبَتِهِ بِنَسَبِ الْمُتَعَصِّبِينَ بِأَنْفُسِهِمْ) میراتەكە بۆ (عَصَبَة)كانی نەژادی ئازادكەرەكەیە: كە بە خودیخۆیان (عَصَبَة)=میراتگری پشتێ بن: وەكو كوڕو برا (لاَ لِبِنْتِهِ وَأُخْتِهِ) نەك بۆ كیژی ئازادكەرەكەو خوشكی ئازادكەرەكە (وَتَرْتِيبُهُمْ) ڕیزی (عَصَبَة)كانی ئازادكەرەكەش (كَتَرْتِيبِهِمْ فِي النَّسَبِ) وەكو ڕیزی (عَصَبَة)كانە لە نەژاددا، واتە: ئەگەر ئازادكەرەكە نەمابێ، ئەوە كوڕی وی، ئینجا كوڕیكوڕ...هتد (لَكِنَّ الأَظْهَرَ أَنَّ أَخَا الْمُعْتِقِ وَابْنَ أَخِيهِ يُقَدَّمَانِ عَلَى جَدِّهِ) بەڵام بە فەرموودە بەهێزتر: لێرەدا برای ئازادكەرەكەو كوڕەبرای ئازادكەرەكە وەپێش باپیرەی ئازادكەرەكە دێخرێن.

فَـإِنْ لَـمْ يَكُـنْ لَـهُ عَصَـبَةٌ فَلِلْمُعْتِـقِ الْمُعْتَـقِ، ثُـمَّ عَصَـبَتُهُ كَـذَلِكَ، وَلاَ تَـرِثُ امْـرَأَةٌ بِـوَلاَءٍ إِلاَّ مُعْتَقَهَـا أَوْ مُنْتَمِيًـا إِلَيْـهِ بِنَسَـبٍ أَوْ وَلاَءٍ.
(فَصْلٌ) إِذَا اجْتَمَعَ جَدٌّ وَإِخْوَةٌ وَأَخَوَاتٌ لأَبَوَيْنِ أَوْ لأَبٍ: فَإِنْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُمْ ذُوفَرْضٍ فَلَهُ الأَكْثَرُ مِنْ ثُلُثِ الْمَالِ وَمُقَاسَمَتِهِمْ كَأَخٍ،

---

(فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ عَصَبَةٌ) جا ئەگەر ئازادکەرەکە میراتگری پشتێی لە نەژادی خۆی نەبو، ئەو کاتە (فَلِلْمُعْتِقِ الْمُعْتَقِ) میراتەکە بۆ ئازادکەری ئازادکەرەکەیە (ثُمَّ عَصَبَتُهُ كَذَلِكَ) ئینجا (عَصَبَة)کانی ئازادکەری ئازادکەرەکە وەك ئەو ڕیزەی ڕابرا، ئینجا بۆ (بیت المال).
(وَلاَ تَرِثُ امْرَأَةٌ بِوَلاَءٍ) ئافرەت بە هۆی ئازادکردن میرات لە هیچ کەسێك ناگرێ (إِلاَّ مُعْتَقَهَا) تەنها لە ئازادکراویخۆی نەبێ (أَوْ مُنْتَمِيًا إِلَيْهِ بِنَسَبٍ أَوْ وَلاَءٍ) یان لەو کەسەی دەچێتەوە لای ئازادکراوەکە بە هۆی نەژاد: وەك کوڕو بەرەوخوارتر، یان بە هۆی ئازادکردن: وەکو ئازادکراوی ئازادکراوەکە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی میراتی باپیرە لەگەڵ خوشكو برایەکاندا ﴾

(إِذَا اجْتَمَعَ جَدٌّ وَإِخْوَةٌ وَأَخَوَاتٌ) هەر کاتێك باپیرە، یان باوکی باپیرە لەگەڵ خوشكو برایەکانی مردووەکە وێکڕا کۆ بونەوە (لأَبَوَيْنِ أَوْ لأَبٍ) جا خوشكو برایەکان لەدایكوباوکی بن، یان تەنها لەباوکی بن، ئەوە لە مەزهەبی ئیمام (أبیحنیفة)دا: باپیرە خوشكو برایەکان بێبەش دەکا. بەڵام لە هەرسێك مەزهەبەکەیتردا: بێبەشیان ناکا، بەڵکو هاوبەشییان لەگەڵ دەکا: بەم شێوەیەی لەم باسەدا ڕوون کراوەتەوە، هەروەك لە زۆریەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.
ئینجا باپیرە چۆن قازانجی بێ، ئەوها لەگەڵ خوشكو برایەکاندا میرات دەگرێ، ئینجا میراتگرتنەکەشی چوار حاڵەتی هەنە، گشتیان لە قازانجی خۆیەتی:
**حاڵەتی یەکەمو دووەم:** (فَإِنْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُمْ ذُو فَرْضٍ) ئەگەر لەگەڵ باپیرەو برایەکاندا هیچ میراتگرێکی خاوەن بەش نەبو، ئەوە (فَلَهُ الأَكْثَرُ مِنْ ثُلُثِ الْمَالِ وَمُقَاسَمَتِهِمْ كَأَخٍ) باپیرە بەشە زۆرترەکەی هەیە: لە سێیەکی گشت میراتەکەو لە هاوبەشیکردن لەگەڵیان وەکو برایەك، کەواتە: ئەگەر تەنها خوشکی لەگەڵدا بن، ئەوە– وەکو برایەك– دوو هەندی بەشی خوشکێك دەگرێ.
ئینجا بزانە: ئەگەر ژمارەی خوشكو برایەکان دوو هەندی باپیرە بوو: وەك دوو برا، یان چوار خوشك، یان برایەكو دوو خوشك، ئەوە سێیەکی میراتەکەو هاوبەشیکردن بۆ باپیرە یەکسانن، وە ئەگەر ژمارەکەیان لە دوو هەندی باپیرە کەمتر بوو: وەك برایەك، یان خوشکێك، یان دوو خوشك، یان سێ خوشك، یان خوشکێكو برایەك، ئەوە هاوبەشیکردن

بۆ باپیره به سودتره، وه ئهگهر ژمارهكهیان له دوو ههندی باپیره زیاتر بوو: وهك سێ براو زیاتر، یان پێنج خوشكو زیاتر، یان برایهكو سێ خوشك، یان دوو براو خوشكێك...هتد، ئهوه سێیهكی میراتهكه بۆ باپیره به سودتره، ههروهك له زۆریهی سهرچاوهكاندا فهرموویانه.

ئینجا (فَإِنْ أَخَذَ الثُّلُثَ) ئهگهر باپیره سێیهكی میراتهكهی گرت، ئهوه (فَالْبَاقِي لَهُمْ) پاشماوهكهی بۆ خوشكو برایهكانه به میراتگرایهتی پشتێ، واته: ههر برایهك دوو ههندی بهشی خوشكێكی ههیه.

**حاڵهتی سێیهمو چوارهم:** (وَإِنْ كَانَ ذُو فَرْضٍ) ئهگهر لهگهڵ باپیرهو خوشكو برایهكاندا میراتگری خاوهن بهش ههبێ، ئهوه (فَلَهُ الأَكْثَرُ مِنْ سُدُسِ التَّرِكَةِ وَثُلُثِ الْبَاقِي وَالْمُقَاسَمَةِ) باپیره زۆرترهكهی ههیه: له شهشێكی گشت میراتهكهو له سێیهكی پاشماوهكهو له هاوبهشیكردنهكهیرابردوو.

ئینجابزانه: خاوهن بهشهكان له باسی باپیردا شهش كهسن: كیژ، كیژهكوڕ، دایك، داپیره، ژن، مێرد.

دیسان بزانه: ئهگهر خاوهن بهشهكه نیوه، یان كهمتری دهگرت: وهكو مێرد، یان كیژێك، یان كیژهكوڕێك، یان ژن، یان دایك، ئهو كاته ئهگهر ژمارهی خوشكو برایهكان له دوو ههندی باپیره كهمتر بوو، ئهوه هاوبهشیكردن لهگهڵیان بۆ باپیره به سودتره: وهك باپیرهو برایهكو كیژێك، كیژهكه نیوه دهگرێو نیوهكهیتریش بۆ باپیرهو برایهكه به یهكسانی، وه ئهگهر ژمارهكهیان له دوو ههندی باپیره زیاتر بوو، ئهوه سێیهكی پاشماوهكه بۆ باپیره به سودتره: وهك باپیرهو سێ براو مێرد، مهسهلهكه له شهشه به لێدانی دوو له سێ-كه بهشی مێردهكهو باپیرهیان لێدهردهچێ- سێ بۆ مێردهكهو سێیهكی پاشماوهكهش-یهكه- بۆ باپیرهو دووهكهش بۆ برایهكان، ئینجا ژمارهی برایهكانیش له مهسهلهكه دهدرێو له ههژده ساغ دهبێتهوه. وه ئهگهر ژمارهیان دوو ههندی باپیره بوو، ئهوه هاوبهشیو سێیهكی پاشماوهكه یهكسانن: وهك باپیرهو دوو براو ژنێك، مهسهلهكه له چواره، چونكه ژنهكه چوارێك دهگرێو سێ بهشهكهیتریش بۆ باپیرهو دوو برایهكانه به یهكسانی.

ئینجا بزانه: ههندێ جار هاوبهشیو سێیهكی پاشماوهكهو شهشێك یهكسانن: وهك باپیرهو دوو براو كیژێك، بنچینهی مهسهلهكه له دووهو له شهش ساغ دهبێتهوه به لێدانی ژمارهی باپیرهو برایهكان له مهسهلهكه: له ههر سێك حاڵهتدا یهك بۆ باپیرهیه.

وَقَدْ لاَ يَبْقَى شَيْءٌ كَبِنْتَيْنِ وَأُمٍّ وَزَوْجٍ فَيُفْرَضُ لَهُ سُدُسٌ وَيُزَادُ فِي الْعَولِ،

وه ئەگەر خاوەن بەشەکە دووسێیەکی هەبوو: وەکو دوو کیژ، یان دوو کیژەکوڕ، یان کیژێکو کیژەکوڕێك، ئەو کاتە هاوبەشی بۆ باپیرە بە سودترە بەو مەرجەی تەنها خوشکێکی لەگەڵدا بێ: وەك باپیرەو خوشکێکو دوو کیژ، بنچینەی مەسەلەکەیان لە سێیە -کە بەشی کیژەکانی لێدەردەچێ- بەڵام لە تۆ ساغ دەبێتەوە بە لێدانی سێ-کە ژمارەی باپیرەو خوشککەیە- لە مەسەلەکە: شەش بۆ کیژەکان، سێ بۆ باپیرەو خوشکەکان، بەڵام ئەگەر لە خوشکێك زیاتری لەگەڵدا بێ: وەك برایەکو زیاتر، یان دوو خوشکو زیاتر، ئەو کاتە شەشێك بۆ باپیرە بە سودترە: وەك دوو کیژو برایەکو باپیرە، مەسەلەکە لە شەشە-کە بەشی باپیرەی لێدەردەچێ- دووسێیەکی-چوارە- بۆ کیژەکان، شەشێکی -یەکە- بۆ باپیرە، پاشماوەکەش-یەکە- بۆ برایەکە.

وە ئەگەر خاوەن بەشەکان لە نێوان نیوەو دووسێیەکیان هەبوو: وەك کیژێکو ژنێك-کە نیوەو هەشتێکیان هەیە- ئەوە هاوبەشی بۆ باپیرە بە سودترە، بەو مەرجەی تەنها برایەك، یان تەنها خوشکێك، یان تەنها دوو خوشکی لەگەڵدا بن، کەوابو: بنچینەی مەسەلەکەیان لە هەشتە-کە بەشی ژنەکەی لێدەردەچێ-: نیوەی-چوارە- بۆ کیژەکە، هەشتێکی-یەکە- بۆ ژنەکە، پاشماوەکەشی بۆ باپیرەو خوشکەکە، یان برایەکە، بەڵام ئەگەر لە برایەك، یان لە دوو خوشك زیاتر بون، ئەو کاتە شەشێك بۆ باپیرە بە سودترە: وەك کیژێکو ژنێکو باپیرەو دوو براو خوشکێك، مەسەلەکە لە بیستوچوارە بە لێدانی سێ-کە (وفق)ی بەشی باپیرەیە- لە هەشت-کە بەشی ژنەکەی لێدەردەچێ- نیوەی دوانزیە بۆ کیژەکە، هەشتێکی سێیە بۆ ژنەکە، شەشێکی چوارە بۆ باپیرە، پێنج دەمێنێتەوە بۆ خوشکو برایەکان.

ئینجا بزانە: ئەو وێنانەی ڕابردوو لەو حاڵەتەدا بون: کە خاوەن بەشەکە بەشی خۆی ببا، ئینجا لە شەشێك زیاتر لە پاش خاوەن بەشەکان بمێنێتەوە، بەڵام (وَقَدْ لاَ يَبْقَى شَيْءٌ) هەندێ جار هیچ لە پاش خاوەن بەشەکان نامێنێتەوە: (كَبِنْتَيْنِ وَأُمٍّ وَزَوْجٍ) وەکو دوو کیژو دایکو مێرد لەگەڵ باپیرەو خوشکو برا، لەم مەسەلەیەدا هیچ لە پاش خاوەن بەشەکان نامێنێتەوە، کەوابو: (فَيُفْرَضُ لَهُ سُدُسٌ) شەشێك بۆ باپیرە دادەندرێو (وَيُزَادُ فِي الْعَوْلِ) لە (عَوْلِ)ی مەسەلەکە زیاد دەکرێ، چونکە بنچینەی مەسەلەکە لە دوانزەیە: بە لێدانی سێ لە چوار، دووسێیەکی-هەشتە- بۆ کیژەکان، چوارێکی- سێیە- بۆ مێردەکە، شەشێکی-دووە- بۆ دایکەکە، بەڵام دوو تەواو نەماوەتەوە، کەوابو: بە نیوەی شەشێك (عَوْلِ) دەکرێ بۆ سێزدە، تاکو بەشی دایك تەواو ببێ، جا لە بەر ئەوەی هیچیش بۆ باپیرە نەماوەتەوە، ئەم جارەش بە شەشێك (عَوْلِ)ێکیتر زیاد دەکرێ بۆ پانزە: جا

وَقَدْ يَبْقَى دُونَ سُدُسٍ كَبِنْتَيْنِ وَزَوْجٍ فَيُفْرَضُ لَهُ وَتُعَالُ، وَقَدْ يَبْقَى سُدُسٌ كَبِنْتَيْنِ وَأُمٍّ فَيَفُوزُ بِهِ الْجَدُّ وَتَسْقُطُ الإِخْوَةُ فِي هَذِهِ الأَحْوَالِ،

---

شەشیێکیتر-کە دووە- بۆ باپیرە دادەندرێ، کەوابو: خوشکو برایەکانیش بە داگرتنەوەی خاوەن بەشەکان بێبەش دەبن، بەم شێوەیە:

٤. میراتگر ——— دوو کیژ، دایك، مێرد، باپیرە، خوشكو برا.
٣ ×. بەشەمیرات ——— دووسێیەك، شەشێك، چوارێك، شەشێك، پشتێیە.

١٢ ÷ ——— ٨ + ١ ناتەواوە + ٣ + شەشیێکی کەمە + ٠ بێبەشن= ١٢.
١ + ——— (عَوْل)ێك بە نیوەی شەشێك.
٢ + ——— (عَوْل)ێکیتر بە شەشێك.
١٥ ÷ ——— ٨ + ٢ + ٣ + ٢ + ٠ بێبەشن = ١٥.

(وَقَدْ يَبْقَى دُونَ سُدُسٍ) هەندێ جاریش لە شەشێك کەمتر لە پاش خاوەن بەشەکان دەمێنێتەوە: (كَبِنْتَيْنِ وَزَوْجٍ) وەکو دوو کیژو مێرد لەگەڵ باپیرەو خوشكو برا، لەم مەسەلەیەدا تەنها یەك-کە لە شەشێك کەمترە- لە پاش خاوەن بەشەکان دەمێنێتەوە، کەوابو: (فَيُفْرَضُ لَهُ) شەشیێکی تەواو بۆ باپیرە دادەندرێو (وَتُعَالُ) مەسەلەکە (عَوْل) دەکرێ، چونکە بنچینەی مەسەلەکە لە دوانزەیە: بە لێدانی سێ لە چوار، دووسێیەکی -هەشتە- بۆ کیژەکان، چوارێکی-سێیە- بۆ مێردەکە، شەشیێکی-دووە- بۆ باپیرە، بەڵام دوو تەواو نەماوەتەوە، کەوابو: بە نیوەی شەشێك (عَوْل) دەکرێ بۆ سێزدە، تاکو شەشیێکی باپیرە تەواو بێ، کەوابو: خوشكو برایەکانیش بێبەش دەبن، بەم شێوەیە:

٤. میراتگر ——— دوو کیژ، مێرد، باپیرە، خوشكو برا.
٣ ×. بەشەمیرات ——— دووسێیەك، چوارێك، شەشێك، پشتێیە.

١٢ ÷ ——— ٨ + ٣ + ١ ناتەواوە + ٠ بێبەشن = ١٢.
١ + ——— (عَوْل) بە نیوەی شەشێك.
١٣ ÷ ——— ٨ + ٣ + ٢ + ٠ بێبەشن = ١٣.

(وَقَدْ يَبْقَى سُدُسٌ) هەندێ جاریش تەنها شەشیێك لە پاش خاوەن بەشەکان دەمێنێتەوە: (كَبِنْتَيْنِ وَأُمٍّ) وەکو دوو کیژو دایك لەگەڵ باپیرەو خوشكو برا، کەوابو: (فَيَفُوزُ بِهِ الْجَدُّ) باپیرە بەو شەشێکە بەختەوەر دەبێو وەریدەگرێ، چونکە بنچینەی مەسەلەکە لە شەشە-کەبەشی دایکی لێدەردەچێ-: دووسێیەکی-چوارە- بۆ کیژەکان، شەشیێکی-یەکە- بۆ دایکەکە، شەشیێك ماوەتەوە بۆ باپیرە.

کەوابو: (وَتَسْقُطُ الإِخْوَةُ) بە داگرتنەوەی خاوەن بەشەکان خوشكو برایەکان بێبەش دەبن (فِي هَذِهِ الأَحْوَالِ) لە هەرسێك حاڵەتەکاندا، واتە: لە دوو حاڵەتەکەیڕابردوو- هەروەك ساغمان کردەوە- هەم لەم حاڵەتەشدا بەم شێوەیە:

وَلَوْ كَانَ مَعَ الْجَدِّ إخْوَةٌ وَأَخَوَاتٌ لأَبَوَيْنِ وَلأَب: فَحُكْمُ الْجَدِّ مَا سَبَقَ وَيَعُدُّ أَوْلاَدُ الأَبَوَيْنِ عَلَيْهِ أَوْلاَدَ الأَب فِى الْقِسْمَة، فَإذَا أَخَذَ حِصَّتَهُ: فَإنْ كَانَ فِى أَوْلاَدِ الأَبَوَيْنِ ذَكَرٌ فَالْبَاقِي لَهُمْ وَسَقط أَوْلاَدُ الأَب،

---

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ٦. مراتگر ———— | دوو كیژ، | دایك، | باپیره، | خوشك و برا. | |
| ١ ×. بەشەمیرات ———— | دووسێیەك، | شەشێك، | شەشێك، | پشتێیە. | |
| ٦ ÷ ———— | ٤ + | ١ + | ١ + | ٠ بێبەشن = ٦. | |

## ﴿ مەسەلەکانی (اَلْمُعَادَّة): ژماردراوەکان ﴾

(وَلَوْ كَانَ مَعَ الْجَدِّ إخْوَةٌ وَأَخَوَاتٌ) ئەگەر خوشكو برا لەگەڵ باپیرەدا بون، بەڵام ئەم جارە (لأَبَوَيْنِ وَلأَبٍ) خوشكو برایەكانی لەدایكوباوكیو تەنها لەباوكی گشتیان وێكڕا بون، ئەوە لێرەشدا (فَحُكْمُ الْجَدِّ مَا سَبَقَ) بڕیاری باپیرە هەر بڕیارەكەیڕابردووە لە چوار حاڵەتەكاندا، واتە: چۆنی قازانج بێ، ئەوها میرات دەگرێ، بەڵام لێرەدا (وَيَعُدُّ أَوْلاَدُ الأَبَوَيْنِ عَلَيْهِ أَوْلاَدَالأَب) خوشكو برایەكانی لەدایكوباوكی— لە دژی باپیرە— خوشكو برایەكانی تەنها لەباوكی لەگەڵ خۆیان دەژمێرن (فِى الْقِسْمَة) لە حاڵەتی هاوبەشیكردنی باپیرەدا، ئینجا (فَإذَا أَخَذَ حِصَّتَهُ) هەر كاتێك باپیرە بەشە میراتیخۆی گرت بەگوێرەی ئەو چوار حاڵەتانەیڕابردوو، ئەوە تەماشا دەكەین:

(فَإنْ كَانَ فِى أَوْلاَدِ الأَبَوَيْنِ ذَكَرٌ) ئەگەر لە منداڵەكانی دایكوباوكیدا برایەك، یان زیاتر هەبوو، بە تەنها، یان لەگەڵ خوشكێك، یان زیاتر، یان تەنها خوشكێك، یان زیاتر بون، بەڵام لەگەڵ كیژ، یان كیژەكوڕدا بون، ئەوە (فَالْبَاقِي لَهُمْ) لە دوای بەشی باپیرە، پاشماوەكە گشتی بۆ خوشكو برایەكانی لەدایكوباوكییە: هەر برایەك دوو هەندی خوشكێك دەگرێ— ئەگەر خوشك هەبێ— (وَسَقَطَ أَوْلاَدُ الأَبِ) خوشكو برایەكانی تەنها لە باوكیش — بە هۆی خوشكو برایەكانی لەدایكوباوكی— بێبەش دەبن:

بۆ وێنە: باپیرەو برایەكی لەدایكوباوكیو برایەكی تەنها لەباوكی، لێرەدا برای لەدایكو باوكی بە باپیرە دەڵێ: منو ئەم برا لەباوكیەم هەردووكمان بەرامبەر بە تۆ یەكسانینو هەردووكمان برای مردووەكەینو وێكڕا هاوبەشیت لەگەڵ دەكەین: بەشێك بۆ تۆ، دوو بەشیش بۆ ئێمە. باپیرەش كە بیردەكاتەوە هاوبەشیو سێیەك— لێرەدا— یەكسانن، بۆیێ بەشەكەی خۆی دەباو دەڕوا، ئینجا برای لەدایكوباوكی بە برای تەنها لەباوكی دەڵێ: من لە تۆ خزمایەتیم بەهێزترە، تا من هەبم تۆ هیچ میرات ناگریو من (عَصَبَة)م-میراتگری پشتێم، كەوابو: گشت پاشماوەكە بۆ منەو تۆ بێبەشی، بەڵام لە دژی باپیرە تۆم لەگەڵ خۆمدا ژماردبو...وێنەكانیتریش بەو جۆرەنە.

(وَإِلا) بەڵام ئەگەر لە منداڵەکانی لە دایکو باوکی‌دا هیچ برایەك نەبو، بەڵکو تەنها خوشکێك، یان زیاتر هەبوو، ئەو کاتە (فَتَأْخُذُ الْوَاحِدَةُ إِلَى النِّصْفِ) تاکە خوشکێکی لەدایكوباوکی- بە هۆی ژماردنی خوشكو برایەکانی تەنها لەباوکی- تا نیوەی میراتەکە دەگرێو هەم وا دەبێ: کەمتریش لە نیوە دەگرێو نابێ داوای زیاتر بکا:

**وێنەی یەکەم** کە نیوەیە: باپیرەو خوشکێکی لەدایكوباوکیو برایەکی تەنها لەباوکی، خوشکەکە بە باپیرە دەڵێ: منو ئەم برایەم هەردووکمان بەرامبەر بە تۆ یەکسانینو وێکڕا هاوبەشیت لەگەڵ دەکەین، کەوابو: مەسەلەکەیان لە پێنجە-کە ژمارەی‌سەری‌میراتگرەکانە- چونکە لێرەدا هاوبەشی بۆ باپیرە بە سوودترە: دوو بۆ باپیرە، دوو بۆ برایەکە، یەکێك بۆ خوشکەکە، ئینجا خوشکەکە بە برا لەباوکیەکەی دەڵێ: من خاوەن بەشم تا بەشی من تەواو نەبێ، نابێ تۆ میرات بگری، کەواتە: لە بەشی خۆت نیوەم بۆ تەواو بکە. جا لە بەر ئەوەی پێنج نیوەیی ساغی نیە، بۆیێ دوو- کە نیوەی خوشکەکەی لێدەرچێ- لە مەسەلەکەی دەدەینو لە دە ساغ دەبێتەوە، چواری بۆ باپیرەیە بە هاوبەشی، پێنجی-کە نیوەیە- بۆ خوشکەکەیە بە خاوەن بەشی، یەکێك بۆ برایەکە دەمێنێتەوە بە (عَصَبَة)یی، ئینجا بزانە: ئەم مەسەلەیە پێی دەگوترێ: (عُشْرِيَّة زَيْدٍ).

**وێنەی دووەم:** کە کەمتر لە نیوەیە: خوشکێکی لەدایكوباوکیو خوشکێکی تەنها لەباوکیو باپیرەو ژنێك، بنچینەی‌مەسەلەکەیان لە چوارە-کە بەشی ژنەکەی لێدەردەچێ- چوارێکی بۆ ژنەکەیە، ئینجا خوشکی لەدایكوباوکی بە باپیرە دەڵێ: منو ئەم خوشکە لەباوکیەم بەرامبەر بە تۆ یەکسانینو وێکڕا هاوبەشیت لەگەڵ دەکەین. جا لە بەر ئەوەی پاشماوەکە سێیەو بە سەر چواردا-کە ژمارەی باپیرەو خوشکەکانە- بەش نابێ، بۆیێ ژمارەکەیان لە مەسەلەکە دەدەینو لە شانزە ساغ دەبێتەوە: چواری بۆ ژنەکە، شەشی بۆ باپیرە بە هاوبەشی، شەشەکەی‌تریش بۆ هەردوو خوشکەکان: هەریەکەو سێیان، بەڵام خوشکەکەی لەدایكوباوکی بە خوشکەکەی تەنها لەباوکی دەڵێ: من خزمایتیم لە تۆ بەهێزترە، تا من بەشە میراتی خۆم-کە نیوەیە- نەگرم، نابێ تۆ میرات بگری، بەڵام من لە دژی باپیرە تۆم لەگەڵ خۆمدا ژماردبو، کەوابو: سێیەکەی خۆت بدەوە من، تۆش بێ‌بەشی، کەواتە: بەشی خوشکی لەدایكوباوکی لێرەدا-کە شەشە- لە نیوەیی کەمترەو دەبی پێی ڕازی بێو نابێ داوای زیاتر بکا، خوشکەکەی تەنها لەباوکیش بێ‌بەشە.

(وَ) هەروەها (الثِّنْتَانِ فَصَاعِدًا إِلَى الثُّلُثَيْنِ) دوو خوشکی لەدایكوباوکیو زیاتریش- بە هۆی ژماردنی خوشكو برایەکانی تەنها لەباوکی- تا دووسێیەکی میراتەکە دەگرنو هەم وا دەبێ: کەمتریش لە دووسێیەك دەگرنو دەبی پێی ڕازی بن:

وَلاَ يَفْضُلُ عَنِ الثُّلُثَيْنِ شَيْءٌ، وَقَــدْ يَفْضُــلُ عَــنِ النِّصْــفِ فَيَكُــونُ لأَوْلاَدِالأَب. وَالْجَدُّ مَعَ أَخَوَاتٍ كَأَخٍ فَلاَ يُفْرَضُ لَهُنَّ مَعَهُ إلاَّ فِيالأَكْدَرِيَّةِ: وَهِــيَ زَوْجٌ وَأُمٌّ وَجَــدٌّ وَأُخْتٌ لأَبَوَيْنِ أَوْ لأَب،

---

**وێنەی‌یەکەم** کە دووسێیەکە: باپیرەو برایەکی تەنها لەباوکی‌و دوو خوشکی لەدایك‌و باوکی، لەم مەسەلەیەدا هاوبەشی‌و سێیەك بۆ باپیرە یەکسانن، چونکە خوشکەکان بە باپیرە دەڵێن: ئێمەو ئەم برایەمان وێکڕا هاوبەشیت لەگەڵ دەکەین، کەوابو: مەسەلەکە لە شەشە —کە ژمارەی سەری میراتگرەکانە—: سێیەکی—دووە— بۆ باپیرە، دووسێیەکەکەی‌تریشی —چوارە— خوشکەکان دەیگرن، چونکە بە برایەکە دەڵێن: ئێمە خاوەن بەشین، تا بەشی ئێمە تەواو نەبێ، نابێ تۆ میرات بگری، کەواتە: دووەکەی خۆت بۆ ئێمە واز لێبێنە، تاکو دووسێیەکمان بۆ تەواو بێ، چونکە ئێمە لە دژی باپیرە تۆمان لەگەڵ خۆماندا ژماردبو.

**وێنەی‌دووەم** کە کەمتر لە دووسێیەکە: باپیرەو دوو خوشکی لەدایك‌وباوکی‌و خوشکێکی تەنها لەباوکی، مەسەلەکە لە پێنجە—کە ژمارەی‌سەری‌میراتگرەکانە—: دوو بۆ باپیرە بە هاوبەشی، سێ‌یەکەی‌تریش بۆ خوشکەکانی لەدایك‌وباوکی‌یەو دەبی پێی ڕازی بن، هەرچەند لە دووسێیەکیش کەمترە، واتە: خوشکەکەی لەباوکیش بێ‌بەش دەبێ.

ئینجا بزانە: (وَلاَ يَفْضُلُ عَنِ الثُّلُثَيْنِ شَيْءٌ) هیچ شتێك لە دووسێیەکەکە زیاد نابێ‌و بۆ خوشك‌و برایەکانی تەنها لەباوکی نامێنێتەوە: وەك ئەو دوو وێنەی‌ڕابردوو، بەڵام (وَقَدْ يَفْضُلُ عَنِ النِّصْفِ) هەندێ جار شتێك لە نیوەییەکە زیاد دەبێ‌و دەمێنێتەوە، کەوابو: (فَيَكُونُ لأَوْلاَدِ الأَبِ) ئەویش بۆ خوشك‌و برایەکانی تەنها لەباوکی‌یە: وەك وێنەکەی (عُشْرِيَّةُ زَيْدٍ)ی‌ڕابردوو.

## ﴿ مەسەلەکەی (أَلأَكْدَرِيَّة)﴾

(وَالْجَدُّ مَعَ أَخَوَاتٍ) باپیرە کە لەگەڵ تەنها خوشکەکاندا بێ‌و برایان لەگەڵدا نەبێ (كَأَخٍ) وەکو برایەکە، کەوابو: (فَلاَ يُفْرَضُ لَهُنَّ مَعَهُ) هیچ بەشە میراتێك بۆ خوشکەکان دیاری ناکرێ ئەگەر لەگەڵ باپیرەدا بن— جگە لە مەسەلەکانی(الْمُعَادَّة)=ژماردراوەکانی ڕابردوودا—و هەم بە هۆی خوشکەکانیش مەسەلەکە (عَوْل) ناکرێ (إلاَّ فِيالأَكْدَرِيَّةِ) تەنها لە مەسەلەکەی (الأَكْدَرِيَّة) نەبێ، بۆیێ بە (الأَكْدَرِيَّة) ناو دەبرێ، چونکە مەزهەبەکەی (زید بن ثابت)ی ﷺ لێڵ کردوە بە هۆی بەش دانان بۆ خوشکەکە.

(وَهِيَ) مەسەلەکە ئەمەیە: (زَوْجٌ وَأُمٌّ وَجَدٌّ وَأُخْتٌ لأَبَوَيْنِ أَوْ لأَبٍ) مێردو دایك‌و باپیرەو تاکە خوشکێکی لەدایك‌وباوکی، یان تەنها لەباوکی، بنچینەی مەسەلەکە لە شەشە: بە لێدانی دوو لە سێ—کە بەشی مێردو دایکیان لێ‌دەردەچێ—و بەم شێوەیە بەش دەکرێ:

فَلِلــزَّوْجِ نِصْــفٌ وَلِـــلأُمِّ ثُلُـــثٌ وَلِلْجَــدِّ سُــدُسٌ وَلِلأُخْـــتِ نِصْـــفٌ،
فَتَعُـــولُ ثُـــمَّ يَقْتَسِـــمُ الْجَـــدُّ وَالأُخْـــتُ نَصِـــيبَيْهِمَا أَثْلاثًـــا لَـــهُ الثُّلُثَـــانِ.
(فَصْلٌ) لاَ يَتَوَارَثُ مُسلِمٌ وَكَافِرٌ،

---

(فَلِلزَّوْجِ نِصْفٌ) نیوەی–سێیە– بۆ مێردەکە (وَلِلأُمِّ ثُلُثٌ) سێیەکی–دووە– بۆ دایکەکە (وَلِلْجَدِّ سُدُسٌ) شەشێکی–یەکە– بۆ باپیرە، ئینجا هیچ بۆ خوشکەکە نەماوە، بەڵام چونکە هیچ کەسێك نیە بێبەشی بکاو باپیرەش نایکاتە (عصبة)، بۆیێ (وَلِلأُخْتِ نِصْفٌ) خوشکەکەش نیوەی هەیە–کە سێیە– کەوابو: (فَتَعُولُ) مەسەلەکە بە بەشی خوشکەکە (عَوْل) دەکرێ بۆ نۆ، جا لە بەر ئەوەی بە هیچ ڕێگایەك ناگونجێ خوشکەکە لە باپیرە زیاتر ببا، بۆیێ (ثُمَّ يَقْتَسِمُ الْجَدُّ وَالأُخْتُ نَصِيبَيْهِما أَثْلاثًا) لە دوای بەشکردنی میراتەکە باپیرەو خوشکەکە دەگەڕینەوە سەر (عصبة)یی‌و بەشەکانی خۆیان–کە چوارە– وەکو خوشك‌و برا بە سێ بەشی لە نێوان خۆیاندا بەشی دەکەن (لَهُ الثُّلُثانِ) دووسێیەکی بۆ باپیرەو سێیەکێکی بۆ خوشکەکە، جا لە بەر ئەوەی چوار بە سەر سێدا بەش نابێ، سێ–کە ژمارەی باپیرەو خوشکەکەیە– لە نۆ دەدەین– کە مەسەلە (عَوْل)کراوەکەیە– لە بیست‌و حەفت ساغ دەبێتەوە، بەم شێوەیە:

٣. میراتگر ———— مێرد، دایك، باپیرە، خوشك.
٢ ×. بەشەمیرات ———— نیوە، سێیەك، شەشێك، نیوە.
٦ ÷ ———— ٣ + ٢ + ١ + نیوەی کەمە = ٦.
٣ + ———— (عَوْل) بە نیوەی مەسەلەکە.
٩ ÷ ———— ٣ + ٢ + ١ + ٣ = ٩.
٣ × ———— ساغکردنەوەی بە ژمارەی باپیرەو خوشکەکە.
٢٧ ÷ ———— ٩ + ٦ + ١٢ بۆ باپیرەو خوشکەکە = ٢٧.

ئینجا بزانە: لە هاوبەشی‌کردنەکەدا (عَصَبَة)یی ڕەچاو کراوەو لە بەش دانان بۆ خوشکەکەش خزمایەتی ڕەچاو کراوە، ئینجا بۆیێ باپیرە لە کاتی بەشکردنی میراتەکەدا خوشکەکەی نەکردۆتە (عَصَبَة)؟ نەوەك بەشە شەشێکی خۆی کەم ببێتەوە، چونکە ئەو کات خوشکەکە لە شەشێکەکەدا هاوبەشی لەگەڵ دەکرد، جا ئەگەر لە جێی خوشکەکە–لەم مەسەلەیەدا– برایەك هەبوایە، ئەوە بە داگرتنەوەی خاوەن بەشەکان بێبەش دەبو.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی (مَوَانِعِ الإِرْثِ) هۆیەکانی میرات نەگرتن ﴾

واتە: ئەو ڕوداوانەی قەدەغە دەکەن مرۆڤ ببێتە میراتگر، هەرچەند هۆیەکانی میراتگرتنیشی تێدا هاتبێتە جێ.

**قەدەغەی‌یەکەم:** جیاوازیی ئایین، کەوابو: (لاَ يَتَوارَثُ مُسْلِمٌ وكَافِرٌ) موسوڵمان‌و کافر میرات لە یەکتری ناگرن هەرچەند لە دوای‌مردن پێش بەشکردنی‌میراتیش ببێتە موسوڵمان،

وَلاَ يَرِثُ مُرْتَدٌّ وَلاَ يُورَثُ، وَيَرِثُ الْكَافِرُ الْكَافِرَ وَإِنْ اخْتَلَفَتْ مِلَّتُهُمَا، لَكِنِ الْمَشْهُورُ أَنَّهُ لاَ تَوَارُثَ بَيْنَ حَرْبِيٍّ وَذِمِّيٍّ، وَلاَ يَرِثُ مَنْ فِيهِ رِقٌّ، وَالْجَدِيدُ أَنَّ مَنْ بَعْضُهُ حُرٌّ يُورَثُ، وَلاَ قَاتِلٌ،

---

چونكه پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لاَيَرِثُ الْمُسْلِمُ الْكَافِرَ وَلاَالْكَافِرُ الْمُسْلِمَ﴾ رواه الشيخان، موسوڵمان میرات له كافر ناگرێ، كافریش میرات له موسوڵمان ناگرێ.

**قەدەغەی دووەم:** كافربوون (وَلاَ يَرِثُ مُرْتَدٌّ) مرۆڤی له ئایین وەرگەڕاو میرات ناگرێ: كه له كاتی مردنی میراتلێگراوەكەیدا كافر بێ، هەرچەند له دوای مردنەكەشی ببێتەوە موسوڵمان، هەم (وَلاَ يُورَثُ) مرۆڤی وەرگەڕاو میراتیشی لێناگیرێ ئەگەر به كافربوویی مردبێ، به بەڵگەی حەدیسەكەی ڕابردوو، كەوابو: گشت مڵكو ماڵەكەی به (فَيْء) بۆ (بَيْت الْمَال) سەرف دەكرێ.

بەڵام (وَيَرِثُ الْكَافِرُ الْكَافِرَ) كافر میرات له كافر دەگرێ (وَإِنْ اخْتَلَفَتْ مِلَّتُهُمَا) هەرچەند شەریعەتەكەشیان جیاواز بێ: وەك جولەكەو دیان=گاوڕ، چونكه (اَلْكُفْرُ مِلَّةٌ وَاحِدَةٌ) ڕێبازەكانی كوفر– له پوچەڵیدا– یەك ڕێبازە. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَمَاذَا بَعْدَالْحَقِّ إِلاَّالضَّلاَلُ﴾ ئایا له دوای ڕاستی جگه له گومڕایی هیچیتر هەیە؟.

(لَكِنْ اَلْمَشْهُورُ) بەڵام به فەموودەی ناسراوی مەزهەب: (أَنَّهُ لاَ تَوَارُثَ بَيْنَ حَرْبِيٍّ وَذِمِّيٍّ) میراتگرتن له نێوان كافری جەنگیو كافری پەیمان لەئەستۆدا نیه: وەك یەكێك جەنگ له دژی موسوڵمانان بكاو خزمەكەشی له ناو موسوڵماناندا به دۆستایەتی(ذِمَّة) دانیشتبێ، هەروەها مرۆڤی (زِنْدِيق) بێدین: كه له هیچ ئایینێكدا نەبێ، ئەویش نه میرات دەگرێو نەمیراتی لێدەگیرێ، بەڵكو وەكو وەرگەڕاو ڕەفتاری لەگەڵ دەكرێ، هەروەك له زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

**قەدەغەی سێیەم:** كۆیلەیی، كەوابو: (وَلاَيَرِثُ مَنْ فِيهِ رِقٌّ) هەر كەسێك بەشێكی كۆیلەیی تێدا بێ میرات ناگرێو میراتیشی لێناگیرێ، بەڵام (وَالْجَدِيدُ) بەفەرموودەی نوێ (أَنَّ مَنْ بَعْضُهُ حُرٌّ) ئەو كۆیلەیەی بەشێكی ئازادە، هەر كاتێك مرد، ئەوە (يُورَثُ) ئەو میراتەی لێدەگیرێ كه به بەشه ئازادیەكەی پەیدای كردوه.

**قەدەغەی چوارەم:** كوشتن، كەوابو: (وَلاَ قَاتِلٌ) مرۆڤكوژەكه میرات له كوژراوەكەی خۆی ناگرێ، هەرچەند نەشبێته زامنو تۆڵەی كوشتنەكەی نەكەوێته سەر، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ لِلْقَاتِلِ مِنْ مَقْتُولِهِ شَيْءٌ﴾ صححه إبن عبدالْبَرّ، مرۆڤكوژ هیچ بەشێكی له میراتیكوژراوەكەیخۆی نیه.

ئینجا بزانه: جیاوازی نیه كوشتنەكه: به هەق بێ، یان به ناهەق، به خۆشیخۆی بێ، یان به زۆرلێكردن، به هەڵەبێ، یان به قەسدی، به ویستی خۆی بێ، یان بێویستیخۆی: وەك

وَقِيلَ إِنْ لَمْ يُضْمَنْ وَرِثَ. وَلَوْ مَاتَ مُتَوَارِثَانِ بِغَرَقٍ أَوْ هَدْمٍ أَوْ فِي غُرْبَةٍ مَعًا أَوْ جُهِلَ أَسْبَقُهُمَا لَمْ يَتَوَارَثَا وَمَالُ كُلٍّ لِبَاقِي وَرَثَتِه.

---

یەکێکیخەوتوو بکەوێتە سەر یەکێکو بیکوژێ، ڕاستەوخۆ بێ، یان بە هۆیەکیدەرەکی: وەك شاهیدیی لە سەر بداو بە هۆی شاهیدیەکەی بکوژرێ، هەروەك لە (تحفة)و (شرح الرحبية)و حاشیەکانیاندا ڕوون کراوەتەوە (وَقِيلَ إِنْ لَمْ يُضْمَنْ وَرِثَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: ئەگەر کوشتنەکە زامینیی نەبێ، ئەوە میرات دەگرێ.

﴿ئاگاداری﴾ یەکەم: هەر کەسێك پاراستنی شتێکی لە ئەستۆدا بێ: وەك وولاغێك لێبخوڕێ، یان ڕاییکێشێ، ئەوە ئەگەر بە هۆی ئەو وولاغە کەسێك بکوژێ میراتی لێناگرێ، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی، ئەوەش وادەگەیەنێ: ئەگەر شوفێری ئۆتۆمبیلێك بە ئۆتۆمبیلەکە خزمێکیخۆی بکوژێ، یان لە کاتی لێخوڕین ئۆتۆمبیلەکە وەربگەڕێو خزمەکانی ناو ئۆتۆمبیلەکەی بمرن، ئەوە میرات لەو خزمە مردووانەی ناگرێ هەرچەند کەمتەرخەمیشی نەکردبێ، یان بە خۆیشی بە هۆی ئەم ڕووداوە بمرێ، جیاوازی نیە ئۆتۆمبیلەکە: ملکی خۆی بێ، یان نا، چونکە ئەو بووەتە هۆی کوشتنو زامینیش مەرج نیە.

دووەم: وا دەبێ کوژراوەکە میرات لە بکوژەکەیخۆی دەگرێ: وەك برایەك برایەکیخۆی بریندار بکا، ئینجا یەکسەر بەخۆی بمرێ، یان بکوژرێ، ئینجا لە دوای ماوەیەك ئەم برایە بریندارەش بەو برینە بمرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

**قەدەغەی پێنجەم:** نەزانینی کاتیمردن، کەوابو: (وَلَوْ مَاتَ مُتَوَارِثَانِ) ئەگەر دووکەس، یان زیاتر—کە میرات لە یەکتری دەگرن— وێکڕا مردن (بِغَرَقٍ) بە هۆی نقومبوون لە ئاودا (أَوْ هَدْمٍ) یان بە هۆی ڕوخانیدیوارێك، یان چیایەك، یان بە هۆی سوتان، یان وەرگەڕانی ئۆتۆمبیل، یان تەقینەوەی بۆمبێك، یان بە هەر ڕووداوێکیتری بە کۆمەڵ (أَوْ فِي غُرْبَةٍ مَعًا) یان لە شوێنێکی دوور وولات وێکڕا مردن (أَوْ) یان جیا جیا مردن بەڵام (جُهِلَ أَسْبَقُهُمَا) نەزاندرا کامەیان پێشتر مردوە، لەو حاڵەتانەدا (لَمْ يَتَوَارَثَا) مردووەکان هیچیان میرات لە یەکتری ناگرن، بە (إجماع)ی (صحابة)یپێغەمبەرﷺ، چونکە مەرجێکی میراتگرتن ئەمەیە: لە کاتی مردنیمیراتدەرەکەدا بێگومان میراتگرەکە زیندوو بێ، هەرچەند بە ماوەی چاولێکردنێکیش بێ، هەروەك لە مەرجەکانی میراتگرتندا ڕابرا.

کەواتە: ئەگەر لێرەشدا بزاندرێ کامەیان بە ماوەی چاولێکردنێك، یان زیاتر لە دوای ئەویتر مردوە، ئەوە دواکەوتووەکە میرات لە پێشکەوتووەکە دەگرێ، چونکە مەرجەکە هاتۆتە جێ، ئەگەرنا: نا، کەوابو: (وَمَالُ كُلٍّ لِبَاقِي وَرَثَتِهِ) ماڵی هەر یەکێك لەو وێکڕا مردووانەیڕابردوو بۆ میراتگرەکانیتریەتی: کە لە کاتی مردنیئەواندا زیندوو بونە، چونکە خوایگەورە زیندووی کردونە میراتگری مردووان.

وَمَنْ أُسِرَ أَوْ فُقِدَ وَانْقَطَعَ خَبَرُهُ تُرِكَ مَالُهُ حَتَّى تَقُومَ بَيِّنَةٌ بِمَوْتِهِ أَوْ تَمْضِيَ مُـدَّةٌ يَغْلِـبُ عَلَى الظَّنِّ أَنَّهُ لاَ يَعِيشُ فَوْقَهَا، فَيَجْتَهِدُ الْقَاضِي وَيَحْكُمُ بِمَوْتِهِ

---

**قەدەغەی شەشەم:** (اَلدَّوْرُالْحُكْمِيُّ) خولانەوەی بڕیاری شەرعی، کەوابو: هەر کاتێك برایەك دان بهێنێ بە نەژادی کوڕێکی نەناسراو بۆ برا مردووەکەی، ئەوە ئەم کوڕە- هەرچەند دەبێتە کوڕی مردووەکە- بەڵام میراتی باوکەکەی نادرێتێ، چونکە مەرجی دانهێنەرەکە ئەوەیە: میراتگر بێ، جا ئەگەر کوڕەکە میرات بگرێ ئەوە برایەکە لە میراتگرایەتی بێبەش دەبێ، هەرکاتێکیش بێبەش ببێ دانهێنانەکەی دروست نابێو کوڕەکە نابێتە کوڕی مردووەکە، کەواتە: میراتگرتنی کوڕەکە دەبێتە هۆی میرات نەگرتنی، هەروەك لە باسی (إقرار)دا ڕابراو لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

**قەدەغەی حەفتەم:** نەبوونی نەژادی شەرعی، کەوابو: ئەو منداڵەی- بە هۆی لەعنەتکردنی ژنو میرد- حاشایی لێکراوە، میرات لە لەعنەتکەرەکەو خزمەکانی لەعنەتکەرەکە ناگرێو ئەوانیش میرات لەوی ناگرن، چونکە نەژادی شەرعیی نیە، هەروەها منداڵی بیژی-کە لە زینا پەیدا بووە- ئەویش میرات لە زیناکەرەکەو لە خزمەکانی زیناکەرەکە ناگرێو ئەوانیش میرات لەوی ناگرن، چونکە بە هۆی زینا نەژاد جێگیر نابێ، بەڵام لە دایکی خۆیو لە خوشكو برایەکانی لەدایکیی میرات دەگرێ، هەروەك لە (قطرالعارض)دا فەرموویەتی، واتە: ئەوانیش میرات لەوی دەگرن؟ چونکە نەژادی لای دایکی بێگومانە.

## ﴿ هۆیەکان ڕاگرتنی بەشکردنی میرات چوارن ﴾

**١-هەر کاتێك گومان لە نەژاددا هەبێ:** وەك دووکەس لە منداڵێکی نەناسراودا ببێتە کێشەیانو هیچێکیان بەڵگەی شەرعیی نەبێ، ئەوە واجبە:- لە بارەی منداڵەکە- میراتگرتنو میرات لێگرتن ڕابگیرێ تا ئاشکرا دەبێ منداڵی کامەیانە، هەروەك لە (تحفة)و (مغنی)دا فەرموویانە.

## ٢-﴿ مەسەلەی (اَلْمَفْقُود) گومبوو ﴾

واتە: هەر کاتێك گومان لە هەبووندا هەبێ: وەك مرۆڤی گومبوو، کەواتە: (وَمَنْ أُسِرَ) هەر کەسێك بە دیل گیرا (أَوْ فُقِدَ) یان گوم بوو (وَانْقَطَعَ خَبَرُهُ) هەواڵی مانو نەمانیشی نەما، ئەوە (تُرِكَ مَالُهُ) ماڵەکەی ڕادەگیرێو بە سەر میراتگرەکانیدا بەش ناکرێ (حَتَّى) تا بە یەکێك لەم دوو ڕێگایە مردنی ئاشکرا دەکرێ:

**یەکەم:** (تَقُومَ بَيِّنَةٌ بِمَوْتِهِ) یان دوو پیاو شاهیدی بدەن: بە مردنی گومبووەکە.

**دووەم:** (أَوْ تَمْضِيَ مُدَّةٌ) یان تا ماوەیەکی وەها ڕادەبرێ: کە (يَغْلِبُ عَلَى الظَّنِّ أَنَّهُ لاَ يَعِيشُ فَوْقَهَا) گومان بەهێز ببێ: ئەو گومبووە مردوەو لەو ماوەیە زیاتر ناژیێ، جا ئەگەر ئەو ماوەیە ڕۆیشت (فَيَجْتَهِدُ الْقَاضِي) ئەو کاتە قازی (إجتهاد) دەکاو (وَيَحْكُمُ بِمَوْتِهِ) بڕیار

**ثُمَّ يُعْطَى مَالُهُ مَنْ يَرِثُهُ وَقْتَ الْحُكْمِ. وَلَوْ مَاتَ مَنْ يَرِثُهُ الْمَفْقُودُ وَقَفْنَا حِصَّتَهُ وَعَمِلْنَا فِي الْحَاضِرِينَ بِالأَسْوَإِ.**

---

به مردنیگومبووهكه دهدا (ثُمَّ) ئینجا لهدوای بڕیاری قازی به مردنی، یان له دوای شاهیدیدانهكه (يُعْطَى مَالُهُ مَنْ يَرِثُهُ وَقْتَ الْحُكْمِ) ماڵهكهی به میرات دهدرێته ئهوكهسهی له كاتی بڕیاردانهكهدا، یان له كاتی شاهیدیدانهكهدا میراتی لێدهگرێ، نهك ئهو كهسهی پێش بڕیاردانهكه، یان پێش شاهیدیدانهكه مردوه.

ئینجا بزانه: ئهوهیڕابردوو لهو كاتهدا بوو: كه قازیو شاهیدهكان تهنها باسی مردنهكهی بكهنو هیچ كاتێكیش بۆ مردنهكهی دیاری نهكهن، بهڵام ئهگهر قازی، یان شاهیدهكان كاتێكیڕابراویان بۆ مردنهكهی دیاری كرد، واته: گوتیان به ماوهی ئهوهنده پێش ئێستا مردوه، ئهوه لهو حاڵهتهدا كاته دیاركراوهكه حیساب دهكرێو بۆ میراتگرتنو بڕیارهكانیتر ڕهچاو دهكرێ، كهواته: ههر كهسێك لهو كاته دیاركراوه ڕابراوهدا میراتی لێدهگرت، ئهوه میراتهكهی دهدرێتێ، ههروهك له زۆربهی سهرچاوهكاندا فهرموویانه، كهواته: ئهگهر ئێستا میراتگرهكه بهخۆی نهمابێ، ئهوه بهشه میراتهكهی دهدرێتهوه میراتگرهكانی.

ئینجا بزانه: تا ئێستا باسی گومبوونیمیراتدهرهكه بوو، ئێستاش باسی گومبوونی میراتگرهكه دهكهین، كهوابو: (وَلَوْ مَاتَ مَنْ يَرِثُهُ الْمَفْقُودُ) ئهگهر كهسێكی وهها مرد: كه گومبووهكه میراتی لێدهگرتو به هیچ ڕێگایهكیش مردنی گومبووهكه ئاشكرا نهكرابو، ئهوه (وَقَفْنَا حِصَّتَهُ) بهشهمیراتی گومبووهكه ڕادهگرین تا حاڵی مانو نهمانی ڕوون دهبێتهوه و(وَعَمِلْنَا فِي الْحَاضِرِينَ بِالأَسْوَإِ) دهرههق میراتگرهكانیحازریش به خراپترین حاڵهت ڕهفتار دهكهین، واته: لێرهدا سێ حاڵهت ههنه:

**یهكهم:** ههر میراتگرێك به هۆی گومبووهكه بێبهش ببێ، ئهوه ئێستا هیچی نادهینێ تا حاڵی گومبووهكه ئاشكرا دهبێ.

**دووهم:** ههر میراتگرێك به هۆی مردنی، یان زیندووهتی گومبووكه بهشهمیراتی نهگۆڕێ، ئهوه بهشه میراتهكهیخۆی به تهواوی دهدرێتێ.

**سێیهم:** ههر میراتگرێك به هۆی مردنی، یان زیندووهتی گومبووهكه بهشی كهم ببێتهوه، ئهوه دهرههقی وی گومبووهكه به زیندوو دادهندرێ ئهگهر به زیندووهتیی بهشی كهم ببێتهوه، یان بهمردوو دادهندرێ ئهگهر به مردنیی بهشی كهم ببێتهوه، ئهمهش وێنهكانن:

**حاڵهتییهكهم:** مامێكو مێردو برایهكیگومبووی لهدایكوباوكی، مهسهلهكه له دووه، چونكه له حاڵهتی مردنو زیندووهتی گومبووكهدا: نیوهیی-یهكه- بۆ مێردهكهیه، نیوهكهیتریش ڕادهگیرێ: ئهگهر ئاشكرا بوو له كاتی مردنیمیراتدهرهكهدا برایهكه زیندوو

بووه، ئەوە گشت نیوەکە بۆ ئەوەو مامەکە بێبەشە، وە ئەگەر لەکاتی مردنی میراتدەرەکەدا برایەکەش مردوو بوبێ، ئەوە نیوەکە گشتی بۆ مامەکەیە.

**حاڵەتی دووەم:** مێردو کیژو کوڕێکی گومبوو: بنچینەی مەسەلەکە لە چوارە، چونکە لە حاڵەتی مردن و زیندووەتی گومبووەکەدا مێردەکە چوارێکی هەیە-کە یەکە- بەشەکەی ناگۆڕێ، جا دەرهەق کیژەکەش وەها خراپترە: کوڕەکە زیندوو بێ، کەوابو: لەو سێیەی ماوەتەوە تەنها یەکێك دەدرێتە کیژەکە بە (قاعِدة)ی ﴿لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنْثَيَيْنِ﴾، جا ئەگەر ئاشکرا بوو: کوڕەکە لە کاتی مردنیدایکیدا زیندوو بووە، ئەوە هەر بەو (قاعِدة)یە دووە ڕاگیراوەکەی دەدرێتێ، ئەگەر ئاشکرا بوو: لە کاتی مردنیدایکیدا مردوو بووە، ئەوە-لەو دووانە- یەکێکیتریش بە خاوەن بەشی دەدرێتە کیژەکە، تاکو نیوە میراتی بۆ تەواو ببێ، پاشماوەکەش-ئەگەر (بَيْت المال) نەبێ- هەر بۆ کیژەکە ڕەد دەکرێتەوە، هەروەك ڕابرا.

**حاڵەتی سێیەم:** باپیرەو برایەکی لەدایكوباوکیو برایەکیگومبووی تەنها لەباوکی، لێرەدا پێویستە دوو مەسەلە دروست بکرێن، لە بەر ئەوەی دەرهەق باپیرە وەها خراپترە: برا گومبووەکە زیندوو بێ، چونکە لە دژی وی دەژمێردرێ، جا لە بەر ئەوەی لێرەدا سێیەكو هاوبەشی بۆ باپیرە یەکسانن، مەسەلەی زیندووەتیی لە سێیە-کە بەشی باپیرەی لێدەردەچێ- دەرهەق برایەکەش وەها خراپترە: گومبووەکە مردبێ، چونکە باپیرە هاوبەشی لەگەڵ برا حازرەکە دەکاو تەنها نیوەیی دەدرێتێ، بۆیێ مەسەلەکەی مردنیشی لە دووە-کە بەشی برایەکەی لێدەردەچێ- کەواتە: لێرەدا مەسەلەیەکی مردن و مەسەلەیەکی زیندووەتی دروست بون:

جا لە بەر ئەوەی هەردوو مەسەلەکان (مُتَبايِن)ن: تێکنەکەرەوەن و بە سەر یەکتریدا بەش نابن، بۆیێ یەکێکیان لەویتر دەدەین و لە شەش ساغ دەبنەوە، جا ئەم مەسەلە سێیەمە پێی دەگوترێ: (الْجَامِعَة)=کۆکەرەوەی هەر دوو مەسەلەکان، ئینجا دەڵێین: باپیرە لە مەسەلەیزیندووەتی سێیەکی هەبوو، کەوابو: لە کۆکەرەوەکەش سێیەکی دەدرێتی-کە دووە- برایەکەش لە مەسەلەیمردن نیوەی هەبوو، کەوابو، لە کۆکەرەوەکەش نیوەی دەدرێتێ-کەسێ یە- یەکێك دەمێنێتەوە-کە شەشێکە-: ئەگەر ئاشکرا بوو: گومبووەکە لە کاتی مردنیمیراتدەرەکەدا مردوو بووە، ئەوە شەشێکەکە بۆ باپیرەیە، تاکو وەکو برایەکە نیوە ببا بە هاوبەشی، وە ئەگەر ئاشکرا بوو: گومبووەکە لە کاتی مردنی میراتدەرەکەدا زیندوو بووە، ئەوە شەشێکەکەش دەدرێتە برای لەدایكوباوکی، گومبووەکەش بێبەش دەبێ، چونکە ئەو تەنها لەباوکییە، بەڵام برایەکە لە دژی باپیرە لەگەڵ خۆیدا ژماردبوی.

وَلَوْ خَلَّفَ حَمْلاً يَرِثُ أَوْ قَدْ يَرِثُ: عُمِلَ بِالأَحْوَطِ فِي حَقِّهِ وَحَقِّ غَيْرِهِ، فَإِنْ انْفَصَلَ حَيًّا لِوَقْتٍ يُعْلَمُ وُجُودُهُ عِنْدَ الْمَوْتِ

﴿ئاگاداری﴾ یەکەم: ئەوەی‌ڕابردوو وێنەی ئەوە بوو: کە مەسەلەکانی زیندووەتی‌و مردن (مُتَبَاين) بن، بەڵام ئەگەر مەسەلەکان (مَتَوَافِقْ) بون، ئەو کاتە (وفْق)ی یەکێکیان لەوی‌تر دەدرێ‌و مەسەلە سێیەمەکەی(اَلْجَامِعَة)=کۆکەرەوە دروست دەبێ، وەئەگەر (مُتَدَاخِل) بون، ئەو کاتە زۆرترەکە بە کۆکەرەوە دادەندرێ.

دووەم: ئەو بەشە میراتەی بۆ گومبووەکە ڕاگیراوە، ئەگەر بفەوتێ، لە سەر گشت میراتگرەکان حیساب دەکرێ، کەواتە: هەر کاتێك گومبووەکە هاتەوە، واتە: ئاشکرا بوو لە کاتی مردنی‌میراتدەرەکەدا زیندوو بووە، ئەوە واجبە: سەر لەنوێ لە بەشی هەموو میراتگرەکان-بەگوێرەی میراتەکەیان- بەشە میراتەکەی بۆ دابندرێتەوەو هەم لە گشت بەروبوم‌و زێدەییەکانی میراتەکەش دەبێتە هاویەش، بەڵام ئەگەر گومبووەکە نەگەڕاوەو بە هۆی شاهید، یان بە بڕیاری‌قازی ئاشکرا کرا: کە لە کاتی مردنی‌میراتدەردەکەدا مردوو بووە، ئەوە بەشەمیراتەکەی گومبووەکەش دەدرێتەوە میراتگرەکانی مردووەکەی‌یەکەم، واتە: میراتگرەکانی گومبووەکە هیچ مافێکیان لەو بەشەدا نیە، چونکە دەگونجێ گومبووەکە پێش میراتدەرەکەی مردبێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية) حاشیەکانیاندا ڕوون کراوەتەوە.

## ٣-﴿ مەسەلەی (اَلْحَمْل)-کۆرپەی ناوزگ ﴾

واتە: هەرکاتێك گومان لە کۆرپەی ناو زگدا هەبێ، کەوابو: (وَلَوْ خَلَّفَ حَمْلاً) ئەگەر مردووەکە کۆرپەیەکی ناو زگی بەجێ هێشت: کە (يَرِثُ) کۆرپەکە لە گشت حاڵەتێکدا میراتی دەگرت -ئەگەر بە زیندوویی لە دایکی جیا بوباوە-: وەك ژنی خۆی بە ئاوسی لە پاش بەجێ بمێنێ (أَوْ قَدْ يَرِثُ) یان هەندێ جار میراتی دەگرت‌و هەندێ جاریش نەیدەگرت: وەك ژنەبرایەکی ئاوسی لە پاش بەجێ بمێنێ: ئەگەر کۆرپەکە نێرینە بێ، میرات دەگرێ‌و ئەگەر مێینە بێ، میرات ناگرێ، ئەوە (عُمِلَ بِالأَحْوَطِ) بە پارێزکاریترین ڕێگە ڕەفتار دەکرێ (فِي حَقِّهِ وَحَقِّ غَيْرِهِ) دەرهەق کۆرپەکەو دەرهەق میراتگرەکانی‌تری جگە لە کۆرپەکە-پێش ئەوەی کۆرپەکە لە دایکی جیا ببێتەوە- ئینجا چاوەڕوان دەکەین:

(فَإِنْ انْفَصَلَ حَيًّا) ئەگەر کۆرپەکە هەمووی بە زیندوویی لە دایکی‌جیا بۆوەو بێ‌گومان گیانی جێگیربووی تێدابو: وەك گریان، یان باوشکان، یان جولاندنی ئەندامێك (لِوَقْتٍ) جیابوونەوەشی لە کاتێکی وەها بوو: کە (يُعْلَمُ وُجُودُهُ عِنْدَالْمَوْتِ) بزاندرێ ئەم کۆرپەیە لە کاتی مردنی‌میراتدەرەکەدا لە ناو زگدا هەبوە: وەك لە مردنی‌میراتدەرەکەوە چوار ساڵ کەمتر بڕواو منداڵەکە ببێ، بەو مەرجەی مێردێکی‌تر سەرجێیی ژنە ئاوسەکەی نەکردبێ،

وَرِثَ، وَإِلاَّ فَلاَ، بَيَانُهُ: إِنْ لَمْ يَكُنْ وَارِثٌ سِوَى الْحَمل أَوْ كَانَ مَنْ قَدْ يَحْجُبُهُ وُقِفَ الْمَالُ، وَإِنْ كَانَ مَنْ لاَ يَحْجُبُهُ وَلَهُ مُقَدَّرٌ أُعْطِيَهُ عَائِلاً إِنْ أَمْكَنَ عَوْلٌ كَزَوْجَةٍ حَامِلٍ وَأَبَوَيْنِ، لَهَا ثُمُنٌ وَلَهُمَا سُدُسَانِ عَائِلاَتٌ،

---

یان شەش مانگ کەمتر بڕواو منداڵەکە ببێ هەرچەند مێردێکی‌تریش سەرجێیی کردبێ، ئەوە بەو مەرجانە (وَرِثَ) منداڵەکە میرات دەگرێ (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر کۆرپەکە بە مردوویی لە دایکی جیا بۆوە، یان بەشێکی لاشەی نەهاتبوە دەرەوەو مرد، یان گیانی جێگیربووی تێدا نەبو، یان نەزاندرا لە کاتی مردنی‌میراتدەرەکەیدا لە ناو زگدا هەبوە، ئەوە (فَلاَ) کۆرپەکە میرات ناگرێ، چونکە لە حاڵەتی یەکەم‌و دووەم‌و سێیەمدا بە نەبوو دادەندرێ، لە چوارەمیشدا لە ئەژادی مردووەکە نیە.

(بَيَانُهُ) ڕوونکردنەوەی پارێزکاری لە مەسەلەی‌کۆرپەدا ئەمەیە: (إِنْ لَمْ يَكُنْ وَارِثٌ سِوَى الْحَمْلِ) ئەگەر جگە لە کۆرپەکە هیچ میراتگرێکی‌تر نەبێ (أَوْ كَانَ مَنْ قَدْ يَحْجُبُهُ) یان جگە لە کۆرپەکە میراتگری‌تریش هەبوو، بەڵام بە هۆی کۆرپەکە بێبەش دەبو: وەکو خوشک‌و برای تەنها لەدایکی، کە بە هۆی کۆرپەی‌مردووەکە بێبەش دەبن، یان میراتگرێکی وەها هەبوو: کە بە حاڵەتێك بێبەش دەبوو و بەحاڵەتێکی‌تر بێبەش نابو: وەکو خوشك‌و برایەکانی لەدایك‌وباوکی، یان لەباوکی: ئەگەر کۆرپەکە نێر بێ، ئەوان بێبەش دەبن، ئەگەر مێ بێ، بێبەش نابن، ئەوە لەو هەموو وێنانەی‌ڕابردوودا (وُقِفَ الْمَالُ) گشت میراتەکە ڕادەگیرێ‌و بەش ناکرێ، تا کۆرپەکە لە دایکی جیا دەبێتەوە.

(وَإِنْ كَانَ مَنْ لاَ يَحْجُبُهُ) ئەگەر–جگە لە کۆرپەکە– میراتگری وەها هەبوو: کە کۆرپەکە بێبەشی نەدەکردو (وَلَهُ مُقَدَّرٌ) بەشی دیارکراویشی هەبوو، ئەوە (أُعْطِيَهُ عَائِلا) بەشە دیارکراوەکەی بە (عَوْل)کراوی دەدرێتی (إِنْ أَمْكَنَ عَوْلٌ) ئەگەر (عَوْل) بگونجێ (كَزَوْجَةٍ حَامِلٍ وَأَبَوَيْنِ) وەك ژنێکی‌ئاوس‌و دایك‌و باوکی لە پاش بەجێ بمێنن، مەسەلەکە لە بیست‌و چوارە: بە لێدانی (وِفق)ی بەشی ژنەکە لە بەشی دایکەکە، بەڵام بۆ پارێزکاری (عَوْل) دەکرێ بۆبیست‌وحەفت–ئەوەك کۆرپەکە دوو کیژ، یان زیاتر بن– (لَهَا ثُمُنٌ) ژنەکە هەشتێکی هەیە–کە سێیە– (وَلَهُمَا سُدُسَانِ) دایك‌و باوکیش دوو شەشێکیان هەیە–کە هەر دووکیان دەکەنە هەشت– هەر یەکەو شەشێکیان (عَائِلاَتٌ) هەشتێك‌و شەشێکەکان (عَوْل)کراون، شانزەش ماوەتەوەو ڕادەگیرێ: ئەگەر کۆرپەکە دوو کیژ، یان زیاتر بون، ئەوە گشتی بۆ ئەوانە، وە ئەگەر کۆرپەکە کوڕێك، یان زیاتر، یان کوڕو کیژ بون، ئەو کاتە بەشی ژنەکەو دایك‌و باوك بە بێ (عَوْل) تەواو دەکرێ‌و پاشماوەکەش بۆ منداڵەکانە، بەڵام ئەگەر تەنها کیژێك بێ، ئەوە نیوەی بە بێ (عَوْل) دەدرێتێ.

وَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ مُقَدَّرٌ كَأَوْلَادٍ لَمْ يُعْطَوْا، وَقِيلَ أَكْثَرُ الْحَمل أَرْبَعَةٌ، فَيُعْطَـوْنَ الْـيَقِينَ. وَالْخُنْثَى الْمُشْكِلُ إِنْ لَمْ يَخْتَلِفْ إِرْثُهُ كَوَلَدِ أُمٍّ وَمُعْتِقٍ فَذَاكَ،

---

ئینجا بزانـە: بـەو مەسـەلەیە دەگـوترێ: (اَلْمِنْبَرِيَّـة)، چـونکە ئیمـامی(علی) لـە سـەر مینبەری مزگەوت ووتاری دەداو ئـەو مەسـەلەیان لێپرسـی‌و ئـەوها وەڵامـی‌داوە، دیسـان بزانە: ئەگەر کۆرپەکە- لەو مەسەلەیەدا- بە مردوویی لە دایکی جیا ببێتـەوە، ئـەو کاتـە مەسەلەکە دەبێتە یەکێکی (اَلْغَرَّاوَيْن)، کەواتە: دایکەکە سێیەکی پاشماوەکەی دەدرێتـێ، بەڵام ئەگەر لەو مەسەلەیەدا دایك نەبێ، واتە: تەنها ژنە ئاوسەکەو باوك بن، ئـەو کاتـەش هەر لە بیست‌و چوارە، بەڵام (عَوْل) ناگونجێ، کەوابو: هەشـتێکی- سـێیە- بـۆ ژنەکـەو شەشێکی-چوارە- بۆ باوکەکەو حەقـدەش دەمێنێتـەوە، ئەگـەر کۆرپەکـە نێرێـك، یـان زیاتر، یـان نێـرو مـێ بـون، ئـەوە گشـتی بـۆ ئەوانـە، ئەگـەر دوو کیـژ، یـان زیـاتر بـون، دووسێیەکیان دەدرێتێ، ئەگەر تەنها کیژێك بێ، نیوەی دەدرێتێ، پاشماوەکـەی هـەردوو حاڵەتیش بۆ باوکەکەیە بە (عَصَبَة)یی.

(وَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ مُقَدَّرٌ) ئەگەر میراتگرەکـە هـیچ بەشـێکی دیـارکراوی نـەبو: (كَأَوْلَادٍ) وەك کیژو کورەکانی مردووەکە لەگەڵ کۆرپەی مردووەکـە، ئـەوە (لَـمْ يُعْطَـوْا) ئێسـتا هیچیـان نادرێتێ، چونکە ژمارەی ئەو منداڵانەی بە زینـدوویی دێنـە دەرەوە نازانـدرێ (وَقِيـلَ) لـە فەرموودەیەکی بێهێزدا: (أَكْثَرُالْحَمْلِ أَرْبَعَةٌ) زۆرترینی کۆرپەکانی ناو زگ چوارە، کەوابو: (فَيُعْطَوْنَ الْيَقِينَ) منداڵەکان بەشە بێگومانەکەیان دەدرێتێ‌و میراتی چوار منـداڵی نێـریش ڕادەگیرێ، بۆ وێنە: کوڕێك‌و ژنێکی ئاوسی لـە پـاش بـەجێمان: ئـەوە ژنەکـە هەشـتێکی دەدرێتێ‌و کوڕەکەش تەنها پێنجێکی پاشماوەکەی دەدرێتێ، ئـەوەی‌تریش ڕادەگـیرێ تـا کۆرپەکە دێتەدەرەوە.

ئینجا بزانە: لە سەردەمی ئێستادا ئامێری وەها هەیـە: ژمـارەو نێـرو مێیایـەتی کۆرپەکـە ئاشکرا دەکا، بەڵام بۆیێ میراتەکە ڕادەگیرێ، چونکە-جگـە لـە خـوا- کەسـی‌تر نـازانێ: ئەو کۆرپەیە بە زیندوویی لە دایکی جیا دەبێتـەوە، یـان بـە مردوویـی، واتـە: مەسـەلەی مردن‌و ژینی کۆرپەکەش وەکو گومبووی بێهەواڵە، والله أعلم.

### ٤- ﴿ مەسەلەی (اَلْخُنْثَى)=نێرامۆك ﴾

واتە: هەرکاتێك گومان لە نێرایەتی‌دا هەبێ، کەوابو: (وَالْخُنْثَى الْمُشْكِلُ) نێرامـۆکی نائاشـکرا: وەك ئەندامی نێرو مێی وێکڕا هەبن، یان تەنها کونێکی هەبێ‌و میزی لێبێتە دەرەوە، ئـەوە (إِنْ لَمْ يَخْتَلِفْ إِرْثُهُ) ئەگەر بە نێرو مێیایەتی میراتی نەگۆڕێ (كَوَلَدِ أُمٍّ) وەکو منداڵێکی تـەنها لەدایکی: خوشك بێ، یان برا بێ، هەر شەشێکی هەیە (وَمُعْتِقٍ) هەم ئازادکەری کۆیلە، ئەوە (فَذَاكَ) ئاشکرایە گشت بەشە دیارکراوەکەی‌خۆی دەدرێتێ.

وَإلاَّ فَيُعْمَلُ بِالْيَقِينِ فِي حَقِّهِ وَحَقِّ غَيْرِهِ وَيُوقَفُ الْمَشْكُوكُ فِيهِ حَتَّى يَتَبَيَّنَ.

(وَإلاَّ) بەڵام ئەگەر بە نێرو مێیایەتی میراتی دەگۆڕا، ئەوە (فَيُعْمَلُ بِالْيَقِينِ) بە بێگومانی ڕەفتار دەکرێ (فِي حَقِّهِ وَحَقِّ غَيْرِهِ) دەرھەق خۆیو دەرھەق میراتگرەکانیتر، واتە: گشتیان بەشە بێگومانەکەیخۆیان دەدرێتێو (وَيُوقَفُ الْمَشْكُوكُ فِيهِ حَتَّى يَتَبَيَّنَ) ئەو بەشەش کە گومانی تێدایە ڕادەگیرێ تا نێرایەتی، یان مێیایەتی نێرامۆکەکە ئاشکرا دەبێ: بە هۆی حەیز، یان (مَنِي)هاتن، یان بە حەز بۆچوونی پیاوان، یان ئافرەتان، یان خەبەردانی خۆی، بەڵام ڕیشو مەمك هاتنو جیاوازی ژمارەی پراسووەکان نابێتە نیشانە، هەروەك لە (مغني)دا فەرموویەتی.

جــا ئەمانــەش چــەند وێنەیــەکی ڕەفتــارکردنی بێگومــانن:

**یەکەم**: برایەکو منداڵێکی نێرامۆك، دەرهەق برایەکە بە کوڕ دادەندرێو دەرهەقی خۆی بە کیژ دادەندرێ، کەوابو: مەسەلەکە لە دووە–کە نیوەی لێدەردەچێ– چونکە بێگومان نیوەی میراتەکە بۆ نێرامۆکەکەیە، نیوەکەیتریش ڕادەگیرێ: ئەگەر نێر بوو، ئەوە نیوەکەیتریشی دەدرێتێ، بەڵام ئەگەر مێ بوو، ئەو کاتە نیوەکە بۆ برایەکەیە.

**دووەم**: مامێكو کیژێكو منداڵێکینێرامۆك، دەرهەق مامەکە بە کوڕ دادەندرێو دەرهەقی خۆی بە کیژ دادەندرێو دەرهەق کیژەکەش یەکسانە، کەوابو: مەسەلەکە لە سێیە–کە دووسێیەکی لێدەردەچێ–چونکە بێگومان دووسێیەك بە یەکسانی بۆ کیژەکەو نێرامۆکەکەیە، سسێیەکەیتریش لە نێوان نێرامۆکەکەو مامەکەدا ڕادەگیرێ: ئەگەر کوڕ بوو، ئەوە بۆ خۆیەتی بە (قاعدە)ی ﴿لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنْثَيَيْنِ﴾و، ئەگەر مێ بوو، ئەو کاتە بۆ مامەکەیە بە (عَصَبَة)یی.

**سێیەم**: مێردو باوكو منداڵێکی نێرامۆك، دەرهەق باوکەکە بە کوڕ دادەندرێو دەرهەقی خۆی بە کیژ دادەندرێو دەرهەق مێردەکەش هەردوو لای یەکسانە، کەوابو: مەسەلەکە لە دوانزەیە بە لێدانی (وِفق)ی بەشی مێردەکە لە بەشی باوکەکە: چوارێکی–سێیە– بۆ مێردەکە، شەشێکی–دووە– بۆ باوکەکە، نیوەیشی–شەشە– بۆ نێرامۆکەکە، یەکێکیش دەمێنێتەوەو لە نێوان باوکەکەو نێرامۆکەکەدا ڕادەگیرێ: ئەگەر کوڕ بوو، ئەوە بۆ خۆیەتی بە (عَصَبَة)یی، ئەگەر کیژ بوو، ئەویش بۆ باوکەکەیە بە (عَصَبَة)یی.

ئینجا بزانە: لێرەشدا–وەکو مەسەلەیگومبوو– حاڵەتی واهەیە: دوو مەسەلە دروست دەکرێن: نێر، مێ. ئینجا ئەگەر هەردوو مەسەلەکان (مُتَبَايِن) بون، ئەوە یەکێکیان لەویتر دەدرێ، ئەگەر (مُتَوَافِق) بون، ئەوە (وِفق)ی یەکێکیان لەویتر دەدرێ، ئینجا بەو لێدانە گەیشتنە چەند، ئەوە مەسەلەکەی (اَلْجَامِعَة)-کۆکەرەوە دروست دەبێ، بەڵام ئەگەر (مُتَدَاخِل) بون، ئەو کاتە زۆرترە کە بە کۆکەرەوە دادەندرێ، ئینجا لە مەسەلەی

وَمَنْ اجْتَمَعَ فِيه جِهَتَا فَرْضٍ وَتَعْصِيب كَزَوْجٍ هُوَ مُعْتِقٌ أَوْ ابْنُ عَمٍّ وَرِثَ بِهِمَا. قُلْتُ: فَلَوْ وُجِدَ فِي نِكَاحِ الْمَجُوسِ أَوِ الشُّبْهَةِ بِنْتٌ هِيَ أُخْتٌ

---

كۆكەرەوەش هەر میراتگرێك-بەگوێرەی زەرەر- بەشە میراتە كەمترەكەی دەدرێتێ، هەروەك لە (الأنوار)دا فەرموویەتی.

**بۆ وێنە**: كوڕێكو منداڵێكی نێرامۆك، دەرهەق كوڕەكە بە كوڕ دادەندرێ، كەوابو: مەسەلەی نێرایەتی‌ی لە دووەو بێگومان كوڕەكە نیوەی دەدرێتێ، بەڵام دەرهەقی خۆی بە كیژ دادەندرێ، كەوابو: مەسەلەی مێیایەتی‌ی لە سێیە، چونكە بێگومان نێرامۆكەكە سێیەكی دەدرێتێ، جا لە بەر ئەوەی هەردوو مەسەلەكان (مُتَبَايِن)ن، یەكێكیان لەوی‌تر دەدەیـنو مەسـەلەكەی (الْجَامِعَة)=كۆكـەرەوە لـە شـەش دروست دەبـێ: كوڕەكـە لـە مەسەلەی نێرایەتی نیوەی هەبوو، كەوابو: لە كۆكەرەوەكەش نیوەی دەدرێتێ-كە سێیە- نێرامۆكەكەش لە مەسەلەی مێیایەتی سێیەكی هەبوو، كەوابو لە كۆكەرەوەكەش سێیەكی دەدرێتێ-كە دووە- یەكێكیش دەمێنێتەوە: ئەگەر كوڕ بوو، ئەوە بۆ خۆیەتی تاكو وەكو برایەكەی نیوەیی تەواو ببێ، وە ئەگەر كیژ بوو، ئەو كاتە یەكەكە دەدرێتە كوڕەكە تاكو بەشی ببێتە دووهەندی كیژەكە.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر نێرامۆكەكە بە نائاشكرایی مرد و ڕوون نەبۆوە ئایا نێرە، یان مێیە؟ ئەوە هیچ چارەمان نیە، تەنها سولح كردن نەبێ: لە نێوان میراتگرەكاندا، واتە: هەندێكیان چاوپۆشی لە بەشی‌خۆیان بكەنو بە وانی‌تری ببەخشن، بەڵام لەو حاڵەتەدا بۆ سەرپەرشتكاری شێتو منداڵ دورست نیە: لە ئەندازەی مافی‌خۆیان كەمتریان بۆ وەربگرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

## ﴿ میراتگرتن لە دوو لاوە ﴾

(وَمَنْ اجْتَمَعَ فِيهِ جِهَتَا فَرْضٍ وَتَعْصِيبٍ) هەر میراتگرێك هەردوو لای خاوەن بەشی‌و میراتگرایەتی پشتی‌ی وێكڕا تێداكۆ بونەوە: (كَزَوْجٍ) وەكو مێردێكی وەها: كە (هُوَ مُعْتِقٌ) ئازادكەری ژنە مردووەكەی بێ (أَوْ ابْنُ عَمٍّ) یان كوڕە مامی ژنە مردووەكەی بێ، یان وەك برایەكی تەنها لەدایكی: كە كوڕەمامی‌مردووەكە بێ، ئەوە (وَرِثَ بِهِمَا) بە هەردوو لایەكان میرات لە مردووەكەی دەگرێ، واتە: مێردەكە نیوەیی بە ژنو مێردایەتی‌و پاشماوەكەش بە میراتگرایەتی پشتێ، برایەكەش شەشێك بە خاوەن بەشی‌و پاشماوەكەش بە میراتگرایەتی پشتێ، هەروەك لە دوای ئێرە دێ.

(قُلْت) ئیمامی (النواوی) دەفەرموێ (فَلَوْ وُجِدَ فِي نِكَاحِ الْمَجُوسِ أَوِ الشُّبْهَةِ) ئەگەر لە ژن هێنانی مەگۆشەكاندا، یان لە جیماعی بە هەڵەدا وەها ڕویدا: (بِنْتٌ هِيَ أُخْتٌ) دایكێك كیژێكی هەبوو و لە هەمان كاتیشدا كیژەكە خوشكی‌خۆی بوو تەنها لەباوكی: وەك جیماع

وَرِثَتْ بِالْبُنُوَّةِ، وَقِيلَ بِهِمَا وَاللهُ أَعْلَمُ، وَلَوْ اشْتَرَكَ اثْنَانِ فِي جِهَةِ عُصُوبَةٍ وَزَادَ أَحَدُهُمَا بِقَرَابَةٍ أُخْرَى كَابْنَيْ عَمٍّ أَحَدُهُمَا أَخٌ لِأُمٍّ فَلَهُ السُّدُسُ وَالْبَاقِي بَيْنَهُمَا، فَلَوْ كَانَ مَعَهُمَا بِنْتٌ فَلَهَا نِصْفٌ وَالْبَاقِي بَيْنَهُمَا سَوَاءٌ، وَقِيلَ يَخْتَصُّ بِهِ الأَخُ، وَمَنْ اجْتَمَعَ فِيهِ جِهَتَا فَرْضٍ وَرِثَ بِأَقْوَاهُمَا فَقَطْ، وَالْقُوَّةُ: بِأَنْ تَحْجُبَ إِحْدَاهُمَا الأُخْرَى أَوْ لاَ تُحْجَبَ أَوْ تَكُونَ أَقَلَّ حَجْبًا،

---

لەگەڵ کیژەکەی خۆی بکاو لەو جیماعە کیژێکی لێببێ، ئەم کیژە بچوکە: هەم کیژی کیژەگەورەکەیەو هەم خوشکی تەنها لەباوکیەتی، کەواتە: هەر کاتێك کیژە گەورەکە بمرێ، ئەوە (وَرِثَتْ بِالْبُنُوَّةِ) کیژە بچوکەکە تەنها بە کیژایەتی میرات لە دایکی دەگرێ، چونکە بەهێزترە (وَقِيلَ بِهِمَا) لە فەرمودەیەکی بێهێزدا: بە کیژایەتیو بە خوشکایەتی میرات دەگرێ (وَاللهُ أَعْلَمُ)، بەڵام ئەگەر بچوکەکە بمرێ، ئەو کاتە گەورەکە تەنها بە دایکایەتی میراتی لێدەگرێ، نەك بە خوشکایەتی، واتە: چونکە گەورەکەش دایکی بچوکەکەیەو هەم خوشکی لەباوکیەتی، هەروەك لە (الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَلَوْ اشْتَرَكَ اثْنَانِ) ئەگەر دوو میراتگر هاوبەش بون (فِي جِهَةِ عُصُوبَةٍ) لە لایەکی میراتگرایەتیپشتیدا، بەڵام (وَزَادَ أَحَدُهُمَا بِقَرَابَةٍ أُخْرَى) یەکێکیان خزمایەتیەکی زیاتری لەویتر هەبوو (كَابْنَيْ عَمٍّ أَحَدُهُمَا أَخٌ لِأُمٍّ) وەکو دوو کوڕەمامیمردووەکە یەکێکیان برای لەدایکیی بێ: وەك بێوەژنێك-کوڕێکی هەبێو- مێرد بە برایمێردەکەی بکاتەوە، جا لەم مێردەش کوڕێکیتری ببێ، مێردەکەی دووەمیش کوڕێکیتری لە ژنێکیتر هەبێ، ئینجا کوڕی لە مێردەکۆنەکەی بمرێ، ئەوە لەو مەسەلەیەدا (فَلَهُ السُّدُسُ) لەو دوو کوڕەمامە ئەوەی برای لە دایکیە شەشێکی هەیە بەخاوەن بەشیو (وَالْبَاقِي بَيْنَهُمَا) پاشماوەکەش لە نێوان هەردووکیان-بە یەکسانی- بە میراتگرایەتی پشتێ.

بەڵام (وَلَوْ كَانَ مَعَهُمَا بِنْتٌ) ئەگەر ئەو دوو کوڕەمامە کیژێکیمردووەکەیان لەگەڵدا بێ، ئەو کاتە (فَلَهَا نِصْفٌ) کیژەکە نیوەی هەیەو (وَالْبَاقِي بَيْنَهُمَا سَوَاءٌ) پاشماوەکەش لە نێوان هەردوو کوڕەمامەکەدا بەش دەکرێ بە یەکسانی، چونکە لای برایەتی لەدایکیی بە هۆی کیژەکە بێبەش بووە (وَقِيلَ يَخْتَصُّ بِهِ الأَخُ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: پاشماوەکە تایبەتە بە برایەکە، چونکە هەرچەند بێبەشیش بووە، بەڵام خزمایەتیی بەهێزترە.

(وَمَنْ اجْتَمَعَ فِيهِ جِهَتَا فَرْضٍ) هەر میراتگرێك دوو لای خاوەن بەشیی تێدا کۆ بوبنەوە، ئەوە (وَرِثَ بِأَقْوَاهُمَا فَقَطْ) تەنها بە بەهێزترەکەیان میرات دەگرێ (وَالْقُوَّةُ) بەهێزتریش بە یەکێك لەم سێ کارە دەزاندرێ، یەکەم: (بِأَنْ تَحْجُبَ إِحْدَاهُمَا الأُخْرَى) لایەك لایەکەیتر قەدەغە بکا: لە گشت میراتەکە، یان لە بەشێکیمیراتەکە. دووەم: (أَوْ لاَ تُحْجَبَ) یان لایەکە هیچ کاتێك بێبەش نەبێ، سێیەم: (أَوْ تَكُونَ أَقَلَّ حَجْبًا) یان لایەکە کەمتر بێبەش ببێ:

فَالأَوَّلُ: كَبِنْتٍ هِيَ أُخْتٌ لأُمٍّ بِأَنْ يَطَأَ مَجُوسِيٌّ أَوْ مُسلمٌ بِشُبْهَةٍ أُمَّهُ فَتَلِدُ بِنْتًا. وَالثَّانِي: كَأُمٍّ هِيَ أُخْتٌ لأَبٍ بِأَنْ يَطَأَ بِنْتَهُ فَتَلِدُ بِنْتًا، وَالثَّالِثُ: كَأُمٍّ أُمٍّ هِيَ أُخْتٌ بِأَنْ يَطَأَ هَذِهِ الْبِنْتَ الثَّانِيَةَ فَتَلِدُ وَلَدًا فَالأُولَى أُمُّ أُمِّهِ وَأُخْتُهُ.

(فَصْلٌ) إِنْ كَانَتِ الْوَرَثَةُ عَصَبَاتٍ قُسِّمَ الْمَالُ بِالسَّوِيَّةِ إِنْ تَمَحَّضُوا ذُكُورًا أَوْ إِنَاثًا، وَإِنِ اجْتَمَعَ الصِّنْفَانِ قُدِّرَ كُلُّ ذَكَرٍ أُنْثَيَيْنِ

---

(فَالأَوَّلُ) وێنەی‌یەکەم: (كَبِنْتٍ هِيَ أُخْتٌ لأُمٍّ) وەك كیژێك خوشكی تەنها لەدایكی بێ (بِأَنْ يَطَأَ مَجُوسِيٌّ أَوْ مُسْلِمٌ بِشُبْهَةٍ أُمَّهُ) وەك مەگوشێك بە مارەكردن، یان موسوڵمانێك بە هەڵە جیماع لەگەڵ دایكی‌خۆی بكا (فَتَلِدُ بِنْتًا) ئینجا دایكەكش لەم جیماعە كیژێكی ببێ، ئەم كیژە تەنها بە كیژایەتی میرات لە جیماعكەرەكە دەگرێ- نەك بە خوشكایەتی لەدایكی- چونكە لایەنی‌كیژایەتی لایەنی‌خوشكایەتی لەدایكی بێبەش دەكا.

(وَالثَّانِي) وێنەی‌دووەم: (كَأُمٍّ هِيَ أُخْتٌ لأَبٍ) وەكو دایكێك خوشكی لە باوكی بێ: (بِأَنْ يَطَأَ بِنْتَهُ) وەك مەگوشەكە بە مارەكردن، یان موسوڵمانەكە بە هەڵە جیماع لەگەڵ كیژی خۆی بكا (فَتَلِدُ بِنْتًا) ئینجا كیژەكە لەم جیماعە كیژێكی ببێ، ئەوە كیژە گەورەكە تەنها بە دایكایەتی میرات لەم كیژە دەگرێ- نەك بە خوشكایەتی لەباوكی- چونكە دایك هیچ كاتێك بێبەش نابێ.

(وَالثَّالِثُ) وێنەی‌سێیەم: (كَأُمٍّ أُمٍّ هِيَ أُخْتٌ) وەكو دایكی‌دایك خوشكی لەباوكی بێ (بِأَنْ يَطَأَ هَذِهِ الْبِنْتَ الثَّانِيَةَ) وەك مەگوشەكەی‌رابردوو، یان موسڵمانەكەی‌رابردوو جیماع لەگەڵ ئەم كیژە دووەمەش بكا (فَتَلِدُ وَلَدًا) ئینجا كیژە دووەمەكەش لەم جیماعە منداڵێكی ببێ، ئەوە (فَالأُولَى) كیژە گەورەكە (أُمُّ أُمِّهِ) دایكی‌دایكی ئەم منداڵە سێیەمەیەو هەم (وَأُخْتُهُ) خوشكی لە باوكیەتی، كەواتە: ئەگەر ئەم منداڵە سێیەمە بمرێ، ئەوە یەكەمەكە بە داپیرایەتی میراتی لێدەگرێ- نەك بە خوشكایەتی- چونكە داپیرە كەمتر بێبەش دەبێ.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی دروستكردنی (أُصُولُ الْمَسَائِلِ) بنچینەی مەسەلەكان ﴾

(إِنْ كَانَتِ الْوَرَثَةُ عَصَبَاتٍ) ئەگەر میراتگرەكان گشتیان (عَصَبَة)-میراتگری پشتێ بوون‌و هیچ خاوەن بەشێكیان لەگەڵدا نەبوو، ئەوە(قُسِّمَ الْمَالُ بِالسَّوِيَّةِ) میراتەكە بە یەكسانی لە نێوانیاندا بەش دەكرێ (إِنْ تَمَحَّضُوا ذُكُورًا) ئەگەر تەنها نێرینە بن: وەك سێ كوڕ، یان سێ برا (أَوْ إِنَاثًا) یان مێیینە بن: وەك سێ ئافرەت وێكڕا كۆیلەیەكیان ئازاد كردبێ.

بەڵام (وَإِنِ اجْتَمَعَ الصِّنْفَانِ) ئەگەر هەردوو جۆرەكانی نەژاد وێكڕا كۆ بوونەوە: وەكو خوشك‌و برا، یان كوڕو كیژ، ئەو كاتە (قُدِّرَ كُلُّ ذَكَرٍ أُنْثَيَيْنِ) هەر نێرینەیەك بە دوو مێیینە دادەندرێ، چونكە بە فەرموودەی خوای‌گەورە: ﴿لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنْثَيَيْنِ﴾ نێرینە وەك

وَعَدَدُ رُؤُوسِ الْمَقْسُومِ عَلَيْهِمْ أَصْلُ الْمَسْأَلَةِ، وَإِنْ كَانَ فِيهِمْ ذُو فَرْضٍ أَوْ ذَوَا فَرْضَيْنِ مُتَمَاثِلَيْنِ فَالْمَسْأَلَةُ مِنْ مَخْرَجِ ذَلِكَ الْكَسْرِ: فَمَخْرَجُ النِّصْفِ اثْنَانِ وَالثُّلُثِ ثَلَاثَةٌ وَالرُّبُعِ أَرْبَعَةٌ وَالسُّدُسِ سِتَّةٌ وَالثُّمُنِ ثَمَانِيَةٌ.

---

بەشی دوومێینەی هەیە. ئینجا (وَعَدَدُ رُءُوسِ الْمَقْسُومِ عَلَيْهِمْ) ژمارەی سەری ئەو کەسانەی میراتەکەیان بە سەردا بەش دەکرێ، پێی دەگوترێ: (أَصْلُ الْمَسْأَلَةِ)-بنچینەی مەسەلەکە. بۆ وێنە: کوڕێكو کیژێك، بنچینەی مەسەلەکەیان لە سێیە. دوو کوڕو کیژێك، بنچینەی مەسەلەکەیان لە پێنجە. دوو خوشك و برایەك، بنچینەی مەسەلەیان لە چوارە ...بەو جۆرە.

(وَإِنْ كَانَ فِيهِمْ ذُوفَرْضٍ) ئەگەر لە میراتگرەکاندا خاوەن بەشێك هەبێ (أَوْ ذَوَا فَرْضَيْنِ مُتَمَاثِلَيْنِ) یان دوو خاوەن بەشی هاوێنە هەبون: کە لە لێدەرچووی بەشەکانیاندا هاوێنە بون: وەك مێردو خوشکێکی لەباوکی، هەر یەکەو نیوەیەکیان هەیە، هەم وەك دایكو برایەکی لەدایکیو برایەکی لەباوکی، دایكو برا لەدایکیەکە هەر یەکەو شەشێکیان هەیە، ئەوە (فَالْمَسْأَلَةُ) بنچینەی مەسەلەکە- لە حاڵەتی خاوەن بەشێكو دوو خاوەن بەشی هاوێنەدا- (مِنْ مَخْرَجِ ذَلِكَ الْكَسْرِ) لە لێدەرچووی ئەو پارچەیە دروست دەبێ، واتە: کەمترین ژمارە کە ئەو پارچەیەی بە ساغی لێدەریچێ، ئەوە لێدەرچووی بەشە میراتەکەیەو دەبێتە بنچینەی مەسەلەکە.

جا مەبەستیش بە پارچەکە-لێرەدا- ناوی بەشە میراتەکەیە، کەوابو: (فَمَخْرَجُ النِّصْفِ اثْنَانِ) لێدەرچووی نیوەیی ژمارە دووە، چونکە کەمترەین ژمارە-کە نیوەیی ساغی هەبێ- ژمارە دووە (وَالثُّلُثِ ثَلَاثَةٌ) لێدەرچووی سێیەك ژمارە سێیە، چونکە کەمترین ژمارە-کە سێیەکی ساغی هەبێ- سێیە (وَالرُّبُعِ أَرْبَعَةٌ) لێدەرچووی چوارێك چوارە، چونکە کەمترین ژمارە-کە چوارێکی ساغی هەبێ- چوارە، هەروەها (وَالسُّدُسِ سِتَّةٌ) لێدەرچووی شەشێك شەشە (وَالثُّمُنِ ثَمَانِيَةٌ) لێدەرچووی هەشتێك هەشتە، کەواتە: بنچینەی مەسەلەکەی دایكو برایەکانیڕابردوو، بەم شێوەیە:

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٦. | میراتگر ——— | دایك، | برای لەدایکی، | برای لەباوکی. |
| ١ ×. | بەشەمیرات ——— | شەشێك، | شەشێك، | پشتێیە. |
| ÷٦ | ——— ١ + | ١ + | ٤ | = ٦. |

ئینجا بزانە: وا دەبێ: ئەو ژمارانە زیاتر لە پارچەیەکیان هەیە: وەك ژمارە چوار: نیوەییو چوارێکی هەیە، شەش: نیوەییو سێیەكو شەشێکی هەیە، هەشت: نیوەییو چوارێكو هەشتێکی هەیە، بەڵام بۆ دروستکردنی مەسەلەکان وردترین پارچە ڕەچاو دەکرێ، هەروەك لە (الشرواني)دا فەرموویەتی.

وَإِنْ كَانَ فَرْضَانِ مُخْتَلِفَاالْمَخْرَجِ: فَإِنْ تَدَاخَلَ مَخْرَجَاهُمَا فَأَصْلُ الْمَسْأَلَةِ أَكْثَرُهُمَا كَسُدُسٍ وَثُلُثٍ، وَإِنْ تَوَافَقَا ضُرِبَ وَفْقُ أَحَدِهِمَا فِيالآخَرِ وَالْحَاصِلُ أَصْلُ الْمَسْأَلَةِ كَسُدُسٍ وَثُمُنٍ فَالأَصْلُ أَرْبَعَةٌوَعِشْرُونَ، وَإِنْ تَبَايَنَا ضُرِبَ كُلٌّ فِي كُلٍّ وَالْحَاصِلُ الأَصْلُ

---

(وَإِنْ كَانَ فَرْضَانِ مُخْتَلِفَاالْمَخْرَجِ) ئەگەر لە مەسەلەکەدا دوو بەشە میرات هەبون: کە لێدەرچووەکانیان لێك جیاواز بون: بە زۆری‌و کەمی، ئەو کاتە هەردووك ژمارەکان: یان (مُتَدَاخِل)ن، واتە: تێکڕاچوون، یان (مُتَوَافِق)ن: واتە: تێککەرەوەن، یان (مُتَبایِن)ن، واتە: ڕێکنەکەوتوون.

کەوابو: (فَإِنْ تَدَاخَلَ مَخْرَجَاهُمَا) ئەگەر لێدەرچووی هەردوو بەشەکان (مُتَدَاخِل)-تێکڕاچوو بون -چونکە کەمترەکە دەچووە ناو زۆرترەکە- ئەو کاتە (فَأَصْلُ الْمَسْأَلَةِ أَكْثَرُهُمَا) بنچینەی مەسەلەکە ژمارە زۆرترەکەیە (كَسُدُسٍ وَثُلُثٍ) وەکو شەشێك‌و سێیەك، لە مەسەلەی مام‌و دایك‌و برایەکی لەدایکی‌دا: دایك سێیەکی هەیە، برایەکەش شەشێکی هەیە، شەش‌و سێ (مُتَداخِل)ن، چونکە سێ دەچێتە ناو شەش، شەش ژمارە زۆرترەکەیە، بۆیە شەش دەکرێتە بنچینەی مەسەلەکە، چونکە سێیەکیشی تێدایە، بەم شێوەیە:

٦. میراتگر ———— دایك، برای لەدایکی، مام.

١ ×. بەشەمیراتگر ———— سێیەك، شەشێك، پشتییە.

٦ ÷ ———— ٢ + ١ + ٣ = ٦.

(وَإِنْ تَوَافَقَا) ئەگەر ژمارەکان (مُتَوافِق)-تێککەرەوە بون، واتە: بە بەشێك لە بەشەکانیان تێکیان دەکردەوە، ئەو کاتە (ضُرِبَ وَفْقُ أَحَدِهِمَا فِيالآخَرِ) بەشە تێککەرەوەی یەکێکیان لە تەواوی ئەوی‌تر دەدرێ (وَالْحَاصِلُ) ئەو ژمارەیەی لەو لێدانە دروست دەبێ، ئەوە (أَصْلُ الْمَسْأَلَةِ)-بنچینەی مەسەلەکەیە (كَسُدُسٍ وَثُمُنٍ) وەکو شەشێك‌و هەشتێك لە مەسەلەی دایك‌و ژن‌و کوڕێك: دایك شەشێکی هەیە، ژنەکە هەشتێکی هەیە، شەش‌و هەشت لە نیوەیی‌دا (مُتَوافِق)ن‌و تێك دەکەنەوە، واتە: هەر دووك نیوەی ساغیان هەیە، بۆیە نیوەی یەکێکیان لە تەواوی ئەوی‌تر دەدەین (فَالأَصْلُ أَرْبَعَةٌ وَعِشْرُونَ) بنچینەی مەسەلەکە بیست‌و چوارە، بەم شێوەیە:

٨. میراتگر ———— دایك، ژن، کوڕ.

٣ ×. بەشەمیرات ———— شەشێك، هەشتێك، پشتییە.

٢٤ ÷ ———— ٤ + ٣ + ١٧ = ٢٤.

(وَإِنْ تَبَايَنَا) ئەگەر ژمارەکان (مُتَبايِن)-ڕێکنەکەوتوو بون، واتە: بە هیچ بەشێکیان تێکیان نەدەکردەوە، ئەو کاتە (ضُرِبَ كُلٌّ فِي كُلٍّ) تەواوی یەکێکیان لە تەواوی ئەوی‌تر دەدرێ (وَالْحَاصِلُ الأَصْلُ) ئەو ژمارەیەی لەو لێدانە دروست دەبێ، ئەوە (أَصْلُ الْمَسْأَلَةِ)-

كَثُلُث وَرُبُع فَالأَصْلُ اثْنَاعَشَرَ، فَالأُصُولُ سَبْعَةٌ: اثْنَانِ وَثَلاثَةٌ وَأَرْبَعَةٌ وَسِتَّةٌ وَثَمَانِيَةٌ وَاثْنَاعَشَرَ وَأَرْبَعَةٌوَعِشْرُونَ، وَالَّذِي يَعُولُ مِنْهَا:

---

بنچینەی مەسەلەکەیە (كَثُلُثٍ وَرُبُعٍ) وەکو سێیەکو چوارێك، لە مەسەلەی دایکو ژنو برایەکی لەدایکو باوکیدا: دایك سێیەکیهەیە، ژنەکە چوارێکی هەیە، سێو چوار (مُتَبَاين)نو بە هیچ بەشێکیان تێك ناکەنەوە، بۆیە سێ لە چوار دەدەینو (فَالأَصْلُ اثْنَاعَشَرَ) بنچینەی مەسەلەکە دوانزەیە، بەم شێوەیە:

٤. میراتگر ———— دایك، ژن، برا.

× ٣. بەشەمیرات ———— سێیەك، چوارێك، پشتێیە.

÷ ١٢ ———— ٤ + ٣ + ٥ = ١٢.

(فَالأُصُولُ سَبْعَةٌ) کۆی بنچینەکانی ئەو مەسەلانەی بەشە میراتەکانیان لێدەردەچن حەفتن: (اثْنَانِ) دوو (وَثَلاثَةٌ) سێ (وَأَرْبَعَةٌ) چوار (وَسِتَّةٌ) شەش (وَثَمَانِيَةٌ) هەشت (وَاثْنَاعَشَرَ) دوانزە (وَأَرْبَعَةٌ وَعِشْرُونَ) بیستوچوار.

جا ئەو بنچینانەش: یان لە بەشێکی بە تەنها دروست ددبن، یان لە دوو بەشی هاووێنە، یان تێکڕاچوو، یان تێککەرەوە، یان ڕێکنەکەوتوو، هەروەك ڕابرا.

بەڵام چەند زانایەك دوو بنچینەیتریشیان زیاد کردوە لە مەسەلەکانی باپیرەو برایەکاندا:

یەکەم: هەژدە، وەك پێنج براو دایکو باپیرە، چونکە کەمترین ژمارە کە شەشێکو سێیەکی پاشماوەکەی هەبێ: هەژدەیە.

دووەم: سیو شەش، وەك حەفت براو ژنێکو دایکو باپیرە، چونکە کەمترین ژمارە کە چوارێکو شەشێکو سێیەکی پاشماوەکەی هەبێ: سیو شەشە، کەواتە: هەژدە بنچینەی گشت مەسەلەیەکە: کە شەشێکو سێیەکی پاشماوەکەی تێدابێ، سیو شەشیش بنچینەی گشت مەسەلەیەکە: کە چوارێکو شەشێکو سێیەکیپاشماوەی تێدابێ، جا ئەو فەرموودەیە ڕاستترو هەڵبژاردراوە، هەروەك لە زۆریەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

## ﴿ باسی (عَوْل)ی مەسەلەکان ﴾

**پێناسە**: (عَوْل) زێدەکردنێکە لە ژمارەی بەشە میراتەکانداو کەمکردنێکە لە ئەندازەی بەشی میراتگرەکاندا.

(وَالَّذِي يَعُولُ مِنْهَا) ئەوەی (عَوْل) دەکرێ لەو بنچینانەیڕابردوو، سێیانن: شەش، دوانزە، بیستوچوار. چونکە بەشە میراتەکان لە بنچینەی مەسەلەکان زیاتر دەبن، بۆیە مەسەلەکە بۆ ئەو بەشانە بەرز دەکرێتەوە، بەڵام بە هۆی (عَوْل) گشت میراتگرێك لە مەسەلەکەدا کەمبوونەوەیەکی بەشەکەی دەیگرێتەوە بەگوێرەی بەشەکەی خۆی، واتە: بەشەکەی لە چەند یەك پێك هاتبێ ئەوە هەر یەکێك بە نیسبەتی (عَوْل) پێکراوەکە لێی کەم دەبێتەوە،

اَلسِّتَّةُ إلَى سَبْعَة كَزَوْجٍ وَأُخْتَيْنِ، وَإلَى ثَمَانِيَةِ كَهُمْ وَأُمٍّ، وَإلَى تِسْعَةِ كَهُمْ وَأَخٍ لأُمٍّ، وَإلَى عَشَرَةَ كَهُمْ وَآخَرَ لأُمٍّ.

بۆ وێنە: ئەگەر شەش (عَوْل) بکرێ بۆ حەفت، ئەوە هەر یەکێك لەو شەش یەکانەی ژمارە شەشیان لێ‌پێك دێ بە ئەندازەی حەفتێکێك لێیان کەم دەبێتەوە.

ئینجا بزانە: بە (إجماع)ی (صحابة)کان لە سەردەمی ئیمامی(عمر)دا بە ئاماژەی ئیمامی (عباس)رضی‌الله عنهم ئەو (عَوْل)کردنە داندرا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

**بنچینەی‌یەکەم:** (اَلسِّتَّةُ) شەشە، چوار جار (عَوْل) دەکرێ بە تاکو بە جووت تا دەگاتە دە: (إلَى سَبْعَةٍ) جارێك (عَوْل) دەکرێ بۆ حەفت (كَزَوْجٍ وَأُخْتَيْنِ) وەکو مێردو دوو خوشك، مێردەکە نیوەی هەیە–کە سێیە– خوشکەکانیش دووسێیەکیان هەیە–کە چوارە– جا لە بەر ئەوەی کۆی بەشە میراتەکان لە بنچینەی مەسەلەکە زیاترە، بۆیێ بە شەشێکی مەسەلەکە (عَوْل) دەکرێ بۆ حەفت، کەواتە: شەشێکێك زیاد کراوە، بەلام هەر شەشێکێکیش حەفتێکێکی لێ کەم بۆتەوە، واتە: مێردەکە سێ شەشێکی هەیەو سێ حەفتێکی لێ کەم بۆتەوە، خوشکەکانیش چوار شەشێکیان هەیەو چوار حەفتێکیان لێ کەم بۆتەوە، هەروەك لە (البجيرمي)دا ڕوون کراوەتەوە، ئەمەش شێوەی (عَوْل)کردنەکەیە:

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٣. | میراتگر | ———— | مێرد، دوو خوشك. |
| ٢ ×. | بەشەمیرات | ———— | نیوە، دووسێیەك. |
| ٦ ÷ | | ———— | ٣ + ٢ شەشێکێکی کەمە = ٦. |
| ١ + | | ———— | (عَوْل) بە شەشێکی‌مەسەلەکە. |
| ٧ ÷ | | ———— | ٣ + ٤ = ٧. |

(وَإلَى ثَمَانِيَةٍ) جارێکی‌تر (عَوْل) دەکرێ بۆ هەشت (كَهُمْ وَأُمٍّ) وەکو ئەو سێ میراتگرانەو دایك: مێردەکە نیوەی هەیەو خوشکەکان دووسێیەکیان هەیەو دایکیش شەشێکی هەیە –کە یەکە– جا بەشە میراتەکان لە بنچینەی مەسەلەکە زیاترن، بۆیێ بە سێیەکی مەسەلەکە (عَوْل)ی دەکەین بۆ هەشت، سێیەکێك زیاد دەبێ‌و هەر یەکێکیش هەشتێکێکی لێ کەم دەبێتەوە، وەك ڕوونمان کردەوە.

(وَإلَى تِسْعَةٍ) جارێکی‌تریش (عَوْل) دەکرێ بۆ نۆ (كَهُمْ وَأَخٍ لأُمٍّ) وەکو ئەو چوار میراتگرانەو برایەکی لەدایکی: مێرد نیوەی هەیەو خوشکەکان دووسێیەك‌و دایك شەشێك‌و برایەکەش شەشێك، بەشەمیراتەکان لە بنچینەی مەسەلەکە زیاترن، بۆیێ بە نیوەی مەسەلەکە (عَوْل) دەکرێ بۆ نۆ، جا هەر یەکێك نۆیەکێکی لێ کەم دەبێتەوە.

(وَإلَى عَشَرَةٍ) جارێکی‌تریش (عَوْل) دەکرێ بۆ دە (كَهُمْ وَآخَرَ لأُمٍّ) وەکو ئەو پێنج میراگرانەو برایەکی‌تری لەدایکی: نیوە بۆ مێردەکەو دووسێیەك بۆ خوشکەکان‌و شەشێك

وَالإِثْنَاعَشَرَ إِلَى ثَلاثَةَعَشَرَ كَزَوْجَةٍ وَأُمٍّ وَأُخْتَيْنِ، وَإِلَى خَمْسَةَعَشَـرَ كَهُـمْ وَأَخٍ لأُمٍّ، وَإِلَى سَبْعَةَعَشَرَ كَهُمْ وَآخَرَ لأُمٍّ، وَالأَرْبَعَةُ وَالْعِشْرُونَ إِلَى سَـبْعَةٍ وَعِشْـرِينَ كَبِنْتَـيْنِ وَأَبَوَيْنِ وَزَوْجَةٍ.

---

بۆ دایكو سێیەك بۆ هەردوو برایەكانی لەدایكی، بەشە میراتەكان لە بنچینەی مەسەلەكە زیاترن، بۆیی بە دووسێیەكی مەسەلەكە (عَوْل) دەكرێ بۆ دە، هەر یەكێكیش دەیەكێكی لێ كەم دەبێتەوە.

**بنچینەیدووەم:** (وَالإِثْنَاعَشَرَ) دوانزە، سێ جار (عَوْل) دەكرێ بە تاك تا دەگاتە حەڤدە: (إِلَى ثَلاثَةَعَشَرَ) جارێك (عَوْل) دەكرێ بۆ سێزدە (كَزَوْجَةٍ وَأُمٍّ وَأُخْتَيْنِ) وەكو ژنێكو دایكو دوو خوشكی لەدایكوباوكی، ژنەكە چوارێكیهەیە -كە سێیە- دایكیش شەشێكی هەیە -كە دووە- خوشكەكانیش دووسێیەكیان هەیە -كە هەشتە- بەشەمیراتەكان لە بنچینەكە زیاترن، بۆیێ بە نیوەی شەشێك (عَوْل) دەكرێ بۆ سێزدە.

(وَإِلَـى خَمْسَةَعَشَـرَ) جـارێكیش بـۆ پـانزە (كَهُـمْ وَأَخٍ لأُمٍّ) وەك ئـەو میراتگرانـەو برایـەكی لەدایكی، چـوارێك بـۆ ژنەكـەو شەشـێك بـۆ دایـك، دووسێیەك بـۆ خوشـكەكان، برایەكـەش شەشێكی هەیە -كە دووە- كەوابو: بە چوارێكی مەسەلەكە (عَوْل) دەكرێ بۆ پانزە.

(وَإِلَى سَبْعَةَعَشَرَ) جارێكیش (عَوْل) دەكرێ بۆ حەڤدە (كَهُـمْ وَآخَـرَ لأُمٍّ) وەك ئـەو میراگرانـەو برایەكیتری لەدایكی، چوارێك بـۆ ژنەكـە، شەشـێك بـۆ دایـك، دووسـێیەك بـۆ خوشـكەكان، سێیەكێك -كە چوارە- بـۆ هـەردوو برایـەكان، كـەوابو: بـە چـوارێكو شەشـێكی مەسـەلەكە (عَوْل) دەكرێ بۆ حەڤدە.

**بنچینەیسێیەم:** (وَالأَرْبَعَةُ وَالْعِشْرُونَ) بیستو چوار، تـەنها جارێـك (عَـوْل) دەكـرێ (إِلَـى سَبْعَةٍ وَعِشْرِينَ) بۆ بیستوحەفت (كَبِنْتَـيْنِ وَأَبَوَيْنِ وَزَوْجَـةٍ) وەك دوو كیـژو دایـكو بـاوكو ژن -كـە (الْمِنْبَرِيَـة)ی پـێدەگوترا- كیـژەكان دووسـێیەكیان هەیـە -كـە شـانزەیە- دایـك شەشـێكی هەیـە -كـە چـوارە- بـاوكیش شەشێكێكیتری هەیـە -كـە چـوارە- ژنەكـەش هەشتێكی هەیە -كە سێیە- جا لە بەر ئەوەی بەشەكان لە بنچینەكە زیاترن، بۆیی بە هەشتێكی مەسەلەكە (عَوْل)ی دەكەین بۆ بیستوحەفت، بەم شێوەیە:

٦. میراتگر ———— دوو كیژ، دایك، باوك، ژن.

٤ ×. بەشەمیرات ———— دووسێیەك، شەشێك، شەشێك، هەشتێك.

٢٤ ÷ ———— ١٦ + ٤ + ٤ + هەشتێكی كەمە = ٢٤.

٣ + ———— (عَوْل) بە هەشتێكیمەسەلەكە.

٢٧ ÷ ———— ١٦ + ٤ + ٤ + ٣ = ٢٧.

وَإِذَا تَمَاثَلَ الْعَدَدَانِ فَذَاكَ، وَإِنْ اخْتَلَفَا وَفَنِيَ الأَكْثَرُ بِالأَقَلِّ مَرَّتَيْنِ فَأَكْثَرَ فَمُتَدَاخِلاَنِ كَثَلاَثَةٍ مَعَ سِتَّةٍ أَوْ تِسْعَةٍ، وَإِنْ لَمْ يُفْنِهِمَا إِلاَّ عَدَدٌ ثَالِثٌ فَمُتَوَافِقَانِ بِجُزْئِهِ كَأَرْبَعَةٍ وَسِتَّةٍ بِالنِّصْفِ، وَإِنْ لَمْ يُفْنِهِمَا إِلاَّ وَاحِدٌ تَبَايَنَا كَثَلاَثَةٍ وَأَرْبَعَةٍ،

---

(وَ) هەر کاتێك (مَخَارِجِ الْفُرُوضِ)، واتە: لێدەرچووەکانی بەشەکانت زانی تەماشا بکە: (إِذَا تَمَاثَلَ الْعَدَدَانِ) هەر کاتێك هەردوو ژمارەکان هاووێنە بون: وەك سێ لەگەڵ سێ، یان شەش لەگەڵ شەش، یان نیوە لەگەڵ نیوە (فَذَاكَ) ئەوە دیارە یەکێکیان دەکرێتە بنچینەی مەسەلەکە.

(وَإِنْ اخْتَلَفَا) ئەگەر هەردوو ژمارەکانیش لێك جیاواز بون و (وَفَنِيَ الأَكْثَرُ بِالأَقَلِّ) زۆرترەکەش بە لێدەرکردنی کەمترەکە لە ناو دەچو (مَرَّتَيْنِ فَأَكْثَرَ) بە دوو جار، یان زیاتر، ئەوە (فَمُتَدَاخِلاَنِ) ژمارەکان تێکڕاچوونە، چونکە کەمترەکە دەچێتە ناو زۆرترەکە (كَثَلاَثَةٍ مَعَ سِتَّةٍ أَوْ تِسْعَةٍ) وەك سێ لەگەڵ شەش، یان نۆ، یان پانزە، کەواتە: زۆرترەکە بە بنچینەی مەسەلەکە دادەنرێ.

(وَإِنْ لَمْ يُفْنِهِمَا إِلاَّ عَدَدٌ ثَالِثٌ) بەڵام ئەگەر تەنها لێدەرکردنی ژمارەیەکی سێیەمین کەمترەکەو زۆرترەکەی لە ناو دەبردن، ئەو کاتە (فَمُتَوَافِقَانِ بِجُزْئِهِ) کەمترەکەو زۆرترەکە تێککەرەوەنە بە پارچەی سێیەمەکە (كَأَرْبَعَةٍ وَسِتَّةٍ) وەکو چوارو شەش: تێککەرەوەنە (بِالنِّصْفِ) بە نیوەیی، واتە هەردووك نیوەیی ساغیان هەیە، چونکە ئەگەر چوار لە شەش دەرکەین دوو دەمێنێتەوە، ئەم دووەش ژمارەیەکی سێیەمینەو شەش و چوار لە ناو دەباو هەم نیوەیشی لێدەردەچێ، کەوابو: شەش و چوار لە نیوەییدا تێك دەکەنەوەو نیوەی یەکێکیان لەوی‌تر دەدرێ و مەسەلەکە دروست دەبێ.

جا ئەگەر هەردوو ژمارەکان بە زیاتر لە پارچەیەك تێکیان دەکردەوە، ئەو کاتە تەنها وردترین پارچە ڕەچاو دەکرێ: وەك دوانزە لەگەڵ هەژدە، بە نیوەو بە سێیەك و بە شەشێك تێك دەکەنەوە، جا چونکە شەشێك لە گشتیان وردترە بۆیێ بۆ دروستکردن و ساغکردنەوەی مەسەلەکان ئەویان ڕەچاو دەکرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَإِنْ لَمْ يُفْنِهِمَا إِلاَّ وَاحِدٌ) ئەگەر جگە لە لێدەرکردنی یەك هیچ ژمارەیەکی‌تر زۆرترەکەو کەمترەکەی لە ناو نەدەبردن، ئەو کاتە (تَبَايَنَا) تێك ناکەنەوەو بە ڕێکنەکەتوو ناو دەبرێن (كَثَلاَثَةٍ وَأَرْبَعَةٍ) وەکو سێ لەگەڵ چوار، واتە: ئەگەر سێ لە چوار دەرکەین، یەك دەمێنێتەوە، بەڵام یەك هەردووکیان لە ناو دەبا، کەواتە: یەکێکیان لەوی‌تر دەدرێ و بنچینەی مەسەلەکە دروست دەبێ.

وَالْمُتَــــــــــدَاخِلاَنِ مُتَوَافِقَــــــــــانِ، وَلاَ عَكْــــــــــسَ.
(فَرْعٌ) إِذَا عَرَفْتَ أَصْلَهَا وَانْقَسَمَتِ السِّهَامُ عَلَيْهِمْ فَذَاكَ،

(وَالْمُتَدَاخِلاَنِ مُتَوَافِقَانِ) ئەو دوو ژمارانەی تێکڕاچوونە، لە هەمان کاتیشدا تێککەرەوەنە: وەکو سێ لەگەڵ شەش‌و نۆ، کەمەکە دەچێتە ناو زۆرەکان‌و بە سێیەکیش تێك دەکەنەوە -جا ئاگاداریە: بۆ ساغکردنەوەی مەسەلەکان زۆر پێویستە شارەزای ئەم (قَاعِدَة)یە بی- بەلام (وَلاَ عَكْسَ) بە پێچەوانەوە نیە، واتە: هەردوو ژمارەیەك کە تێککەرەوە بن تێکڕاچوو نینە: وەك شەش‌و هەشت، چونکە مەرجی (مُتَدَاخِل) تێکڕاچوو ئەمەیە: کەمترەکە لە نیوەی زۆرترەکە زیاتر نەبێ، هەروەك ڕابرا.

﴿ فَرْعٌ: لقێك لە باسی (تَصْحِيحُ الْمَسَائِل) ساغکردنەوەی مەسەلەکان ﴾

**پێشەکی بزانە:** (أُصُولُ الْمَسَائِل)، واتە: دروستکردنی بنچینەی مەسەلەکان -بەو چوار حاڵەتانەی‌ڕابردوو- ڕێخۆشکەرێك بوو بۆ (تَصْحِيحُ الْمَسَائِل)، واتە: ساغکردنەوەی مەسەلەکان.

دیسان بزانە: (أُصُولُ الْمَسَائِل)=بنچینەی مەسەلەکان بە لێدانی (مَخْرَج) لە (مَخْرَج) دروست دەبێ- واتە: لێدانی لێدەرچووی بەشەمیراتێك لە لێدەرچووی بەشەمیراتێکی‌تر-بەلام (تَصْحِيحُ الْمَسَائِل)=ساغکردنەوەی مەسەلەکان بە لێدانی (اَلْمُنْكَسَرعَلَيْهِمْ) دەبێ، واتە: بە لێدانی ژمارەی سەری ئەو میراتگرانەی بەشەکانیان بە سەردا دەشکێتەوە، تاکو بە ساغی بە سەریاندا بەش ببێ، هەروەك لە (البجيرمي)دا ڕوونی کردۆتەوە.

﴿ ئاگاداری ﴾: لێرەشدا-وەك بەشکردنی‌میرات- ئەگەر کوڕو کیژ، یان خوشك‌و برا وێکڕا کۆ بونەوە، ئەوە بۆ ساغکردنەوەی مەسەلەکە هەر نێرینەیەك بە دوو مێیینە دەژمێردرێ.

دیسان بزانە: جاری وا هەیە: مەسەلەکە هەر لە بنچینەی خۆی ساغ دەبێتەوە، جاری واش هەیە: بۆ ساغکردنەوە پێویستی بەو لێدانەی‌داهاتوو هەیە:

کەوابو: (إِذَا عَرَفْتَ أَصْلَهَا) هەرکاتێك زانیت بنچینەی مەسەلەکە لە چەندە (وَانْقَسَمَتِ السِّهَامُ عَلَيْهِمْ) هەر لەو بنچینەشدا بەشەمیراتەکان بە ساغی بە سەر میراتگرەکاندا بەش دەبون، چونکە ژمارەی میراتگرەکان لەگەڵ بەشەکانیان (مُتَمَاثِل)=هاووێنە بون، یان (مُتَدَاخِل)=تێکڕاچوو بون، واتە: ژمارەی سەری مێراتگرەکان دەچووە ناو ژمارەی بەشەکانیان (فَذَاكَ) ئەوە ئاشکرایە پێوستی بە هیچ ساغکردنەوەیەك نیە، چونکە بەشەکان بە ساغی بەش دەبن: وەك مێردو سێ کوڕ، مەسەلەکە لە چوارە-کە بەشی مێردەکەی لێ‌دەردەچی-: چوارێك-یەکە- بۆ مێردەکە، پاشماوەکەش-سێیە- بۆ سێ کوڕەکان. هەم وەکو ژنێك‌و سێ کوڕو کیژێك، مەسەلەکە لە هەشتە-کە بەشی ژنەکەی

وَإِنْ انْكَسَرَتْ عَلَى صِنْفٍ قُوبِلَتْ بِعَدَدِهِ: فَإِنْ تَبَايَنَا ضُــرِبَ عَــدَدُهُ فِــي الْمَسْــأَلَةِ بِعَوْلِهَا إِنْ عَالَتْ،

لێدەردەچێ-: هەشتێکی-یەکە- بۆ ژنەکە، پاشماوەکەش-حەفتە- بۆ کیژو کوڕەکان: هەر کوڕێك دوو هەندی کیژەکە.

بەڵام (وَإِنْ انْكَسَرَتْ عَلَى صِنْفٍ) ئەگەر بەشەمیراتەکان بە سەر ژمارەی یەك جۆرە میراتگردا شکانەوە، واتە: میراتگرەکان یەك جۆر بون‌و بەشە میراتەکەیان بە سەردا بەش نەدەبو، ئەوە (قُوبِلَتْ بِعَدَدِهِ) بەشە میراتەکەیان بەرامبەر ژمارەی سەرەکانیان دەکرێ، جیاوازی نیە: میراتگری پشتێ بن، یان خاوەن بەش بن، ئینجا کە تەماشا دەکەین ژمارەی سەری میراتگرەکان‌و بەشەکەیان: یان (مُتَبَايِن)ن، یا (مُتَوَافِق)ن، واتە: چونکە ئەگەر (مُتَمَاثِل)، یان (مُتَدَاخِل) بن، ئەو کاتە بەشەکەیان ناشکێتەوەو بە ساغی بە سەریاندا بەش دەبێ، هەروەك تازە ڕابرا.

ئینجا لە دوای بەرامبەرکردن (فَإِنْ تَبَايَنَا) ئەگەر ژمارەی سەری میراتگرەکانی‌جۆرەکەو بەشەکەیان (مُتَبَايِن)-ڕێکنەکەوتوو بون، ئەوە (ضُرِبَ عَدَدُهُ فِيالْمَسْأَلَةِ) ژمارەی میراتگرەکانی جۆرەکە دەبێتە (جُزْءُ السَّهْمِ)و لە تەواوی مەسەلەکە دەدرێ (بِعَوْلِهَا إِنْ عَالَتْ) بە (عَوْل)ەوە ئەگەر (عَوْل)کرابێ، یان بە بێ(عَوْل) ئەگەر (عَوْل)نەکرابێ، ئینجا بەو لێدانە گەیشتە کام ژمارە، ئەوە لەو ژمارەیە مەسەلەکە ساغ دەبێتەوە:

**وێنەی بێ( عَوْل)**: ژنێك‌و دوو برا، بنچینەی مەسەلەکە لە چوارە-کە بەشی ژنەکەی لێدەردەچێ-: چوارێکی-یەکە- بۆ ژنەکە، پاشماوەکەشی-سێیە- بۆ دوو برایەکان‌و بە سەریاندا بەش نابێ، ژمارەی دوو برایەکان لەگەڵ بەشەکەیان (مُتَبَايِن)ن، بۆیە ژمارەی دوو برایەکان دەبێتە (جُزْء السَّهم)و لە تەواوی مەسەلەکە دەدرێو لە هەشت ساغ دەبێتەوە: دوو بۆ ژنەکە، شەش بۆ برایەکان، بەم شێوەیە:

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٤. میراتگر | ———— | ژن، | دوو برا. |
| ١ ×. بەشەمیرات | ———— | چوارێك، | پشتێیە. |
| ٤ ÷ | ———— | ١ + | ٣ بە سەر دوودا بەش نابێ = ٤. |
| ٢ × | ———— | ساغکردنەوەی بە دوو برا. | |
| ٨ ÷ | ———— | ٢ + | ٦ = ٨. |

**وێنەی (عَوْل)کراو**: مێردو پێنج خوشك، بنچینەی مەسەلەکە شەشە، بە لێدانی دوو لە سێ-کە بەشی مێردەکەو خوشکەکانیان لێدەردەچێ- ئینجا (عَوْل) دەکرێ بۆ حەفت، چونکە نیوەی-سێیە- بۆ مێردەکە، دووسێیەکیشی-چوارە- بۆ پێنج خوشکەکان‌و بە سەریاندا بەش نابێو ژمارەی خوشکەکان لەگەڵ بەشەکەیان (مُتَبَايِن)ن، بۆیە ژمارەی

پێنج خوشکەکان دەبێتە (جُزْء السَّهم)و لـە مەسـەلە (عَوْل)کراوەکـە دەردرێو لـە سـیو پێنج ساغ دەبێتەوە: پانزە بۆ مێردەکە، بیست بۆ خوشکەکان، بەم شێوەیە:

٣. میراتگر ———————— مێرد، پێنج خوشك.

٢ ×. بەشەمیرات ———————— نیوە، دووسێیەك.

٦ ÷ ———————— ٣ + ٣ شەشێکێکی کەمە = ٦.

١ + ———————— (عَوْل) بە شەشێك.

٧ ÷ ———————— ٣ + ٤ بە سەر پێنج دا بەش نابێ = ٧.

٥ × ———————— ساغکردنەوەی بە پێنج خوشك.

٣٥ ÷ ———————— ١٥ + ٢٠ = ٣٥.

(وَإِنْ تَوَافَقَا) ئەگەر ژمارەی سەریمیراتگرەکانو بەشەمیراتەکەیان (مُتَوَافِق)-تێککەرەوە بون (ضُرِبَ وَفْقُ عَدَدِهِ فِيها) ئەو کاتە (وِفْق)ی ژمارەی سەری میراتگرەکان دەبێتە (جُزْءُ السَّهم)و لە تەواوی مەسەلەکە دەدرێ: بە بێ(عَوْل)، یان بە (عَوْل)ەوە ئەگەر (عَوْل)کرابێ (فَمَا بَلَغَ) جا کۆی لێدانەکە گەیشتەکام ژمارە، ئەوە (صَحَّتْ مِنْهُ) لەو ژمارەیە مەسەلەکە ساغ دەبێتەوە.

**وێنەی بێ(عَوْل)**: دایكو چوار مام، بنچینەیمەسەلەکە لە سێیە-کە بەشـی دایکەکـەی لێ دەردەچێ-: سێیەکی-یەکە- بۆ دایکەکە، پاشماوەکەشی- دووە- بۆ چوار مامـەکانو بە سەریاندا بەش نابێو ژمارەی مامەکان لەگەڵ بەشەکەیان (مُتوافِق)-تێککەرەوەن بـە نیوەیی-چونکە گشت (مُتَـداخل)ێك بـە (مُتوافِـق) دادەنـدرێ، هـەروەك ڕابـرا- کـەوابو: نیوەی چوار مامەکان-کە دووە- دەبێتە (جُزْءُ السَّهم)و لە تەواوی مەسەلەکە دەدرێو لە شەش ساغ دەبێتەوە: دوو بۆ دایکەکە، چوار بۆ مامەکان، بەم شێوەیە:

٣. میراتگر ———————— دایك، چوار مام.

١ ×. بەشەمیرات ———————— سێیەك، پشتێیە.

٣ + ———————— ١ + ٢ بە سەر چواردا بەش نابێ = ٣.

٢ × ———————— ساغکردنەوەی بە نیوەی چوار مامەکان.

٦ ÷ ———————— ٢ + ٤ = ٦.

**وێنەی (عَوْل)کراو**: شەش کیژو دایكو باوكو مێرد، بنچینەی مەسـەلەکە لـە دوانزەیـە: بـە لێدانی سێ لە چوار-کە بەشی مێـردو کیـژەکانی لێدەردەچـێ- ئینجـا (عَـوْل) دەکـرێ بـۆ پـانزە، چـونکە دووسێیەك-هەشـتە- بـۆ شـەش کیـژەکان، شەشـێکی-دووە- بـۆ دایـك، شەشێکیتر-دووە- بۆ باوك، چوارێك- سێیە- بۆ مێردەکـە، بـەڵام بەشـی خوشـکەکان

**وَإِنْ انْكَسَرَتْ عَلَى صِنْفَيْنِ قُوبِلَتْ سِهَامُ كُلِّ صِنْف بِعَدَدِه: فَإِنْ تَوَافَقَا رُدَّ الصِّنْفُ إِلَى وَفْقِهِ وَإِلاَّ تُرِكَ، ثُمَّ إِنْ تَمَاثَلَ عَدَدُالرُّءُوسِ ضُرِبَ أَحَدُهُمَا فِي أَصْلِ الْمَسْأَلَةِ**

---

به سەریاندا بەش نابیٖو ژمارەی کیژەکان لەگەڵ بەشەکەیان (متوافق)ن بە نیوەیی، کەوابو: نیوەی شەش کیژەکان-سێیە- دەبێتە (جُزْءُالسَّهم)و لە مەسەلە (عَوْل)کراوەکەی دەدەینو لە چلوپێنج ساغ دەبێتەوە: بیستو چوار بۆ کیژەکان، شەش بۆ دایک، شەش بۆ باوک، نۆ بۆ مێردەکە، بەم شێوەیە:

٤. میراتگر ——— شەش کیژ، دایک، باوک، مێرد.

٣ ×. بەشەمیرات ——— دووسێیەک، شەشێک، شەشێک، چوارێک.

١٢ ÷ ——— ٨ + ٢ + ٢ + چوارێکی کەمە = ١٢.

٣ + ——— (عَوْل) بە چوارێک.

١٥ ÷ ——— ٨ + ٢ + ٢ + ٣ = ١٥.

٣ × ——— ساغکردنەوەی بە نیوەی شەش کیژەکان.

٤٥ ÷ ——— ٢٤ + ٦ + ٦ + ٩ = ٤٥.

(وَإِنْ انْكَسَرَتْ عَلَى صِنْفَيْنِ) ئەگەر بەشەمیراتەکان بە سەر ژمارەی دوو جۆرە میراتگراندا شکانەوە، واتە: میراتگرەکان دوو جۆر بونو بەشەمیراتەکەی هیچێکیان بە سەریاندا بەش نەدەبو، ئەو کاتە (قُوبِلَتْ سِهَامُ كُلُّ صِنْفٍ بِعَدَدِهِ) بەشەمیراتەکانی هەر جۆرێکیان بەرامبەر بە ژمارەی سەرەکانیان دەکرێ، جیاوازی میراتگری پشتێو خاوەن بەش نیە، ئینجا تەماشا دەکەین:

(فَإِنْ تَوَافَقَا) ئەگەر بەشەمیراتەکانو ژمارەی سەریمیراتگرەکانی هەردوو جۆرەکە، یان جۆرێکیان (مُتَوَافِق)=تێککەرەوە بون، ئەوە (رُدَّ الصِّنْفُ إِلَى وَفْقِهِ) ژمارەی میراتگرەکانی جۆرە تێککەرەوەکە دەگەڕێندرێتەوە بۆ (وفق)یخۆی (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر (مُتَوَافِق) نەبون، بەڵکو ژمارەی هەردوو جۆرەکە، یان یەکێکیان لەگەڵ بەشەکانیان (مُتَبَاين)= ڕێکنەکەوتوو بون، ئەو کاتە (تُرِكَ) جۆرەکەی (مُتَبَاين) وەکو خۆی دەهێشترێتەوەو دەستکاری ناکرێ.

جا بزانە: لێرەشدا ئەگەر (مُتَمَاثِل)، یان (مُتَدَاخِل) بن، واتە: ژمارەی میراتگرەکان بچێتە ناو بەشەکانیان، ئەو کاتەش بەشەکان ناشکێنەوەو بە ساغی بەش دەبن.

(ثُمَّ) ئینجا لە دوای گەڕاندنەوەکە بۆ (وفق)و لە دوای هێشتنەوەکە، دیسان کە تەماشای ژمارەی سەری هەردوو جۆرە میراتگرەکان دەکەینەوە، چوار حاڵەتیان هەنە:

**حاڵەتی یەکەم:** (إِنْ تَمَاثَلَ عَدَدُالرُّءُوسِ) ئەگەر ژمارەی سەری میراتگرەکانی هەر دوو جۆرەکان (مُتَمَاثِل) هاووێنە بون، ئەوە (ضُرِبَ أَحَدُهُمَا فِي أَصْلِ الْمَسْأَلَةِ) لە هەر دوو جۆرەکان تەنها یەکێکیان دەبێتە (جُزْءُ السَّهم)و بە تەواوی لە بنچینەی مەسەلەکە

بِعَوْلِهَا، وَإِنْ تَدَاخَلاَ ضُرِبَ أَكْثَرُهُمَا،

---

دەدرێ: بە بێ(عَوْل)، یان (بِعَوْلِهَا) بە (عَوْل)ەوە ئەگەر (عَوْل)کرابێ، ئینجا کۆی لێدانەکە گەیشتە کام ژمارە، ئەوە لەو ژمارەیە مەسەلەکە ساغ دەبێتەوە:

بۆ وێنە: دایكو شەش برای لەدایکیو دوانزە خوشکی لەباوکی، بنچینەی مەسەلەکە لە شەشە-کە بەشی دایکەکەی لێدەردەچێ- جا (عَوْل) دەکرێ بۆ حەفت، چونکە شەشێکی-یەکە- بۆ دایکەکە، سێیەکی-دووە- بۆ شەش برایەکانی لەدایکی، دووسێیەکی-چوارە- بۆ دوانزە خوشکەکان، ئینجا بەشی شەش برایەکان بە سەریاندا بەش نابێو بەشەکەیانو ژمارەکەیان (مُتَوَافِق)ن بە نیوەیی، کەوابو: ژمارەی برایەکان دەگەڕێندرێتەوە بۆ نیوەی شەش-کە سێیە-، هەروەها بەشی دوانزە خوشکەکانیش بە سەریاندا بەش نابێو بەشەکەیانو ژمارەکەیان (مُتَوَافِق)ن بە چوارێك، کەوابو: ژمارەی خوشکەکانیش دەگەڕێندرێتەوە بۆ چوارێکی دوانزە-کە سێیە- ئینجا ئەم سێیەی سەریخوشکەکانو سێیەکەی سەریبرایەکان (مُتَمَاثِل)-هاووێنەن، کەوابو: تەنها یەکێکیان دەبێتە (جُزْءُ السَّهْم)و لە مەسەلە (عَوْل)کراوەکە دەدرێو لە بیستو یەك ساغ دەبێتەوە، بەم شێوەیە:

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٦. | میراتگر | دایك، | شەش برای لەدایکی، | دوانزە خوشکی لەباوکی. |
| ١ ×. | بەشەمیرات | شەشێك، | سێیەك، | دووسێیەك. |
| ٦ ÷ | | شەشێکی کەمە + | ٢ + | ٤ =٦. |
| ١ + | (عَوْل) بە شەشێك. | | | |
| ٧ ÷ | | ١ + | ٢ + | ٤ = ٧. |
| ٣ × | ساغکردنەوەی بە ژمارە سێ- کە (وِفْق) خوشك، یان برایەکانە-. | | | |
| ٢١ ÷ | | ٣ + | ٦ + | ١٢ = ٢١. |

حاڵەتیدووەم: (وَإِنْ تَدَاخَلاَ) ئەگەر ژمارەی سەری میراتگرەکانی هەردوو جۆرەکان (مُتَدَاخِل)-تێکڕاچوو بون، ئەو کاتە (ضُرِبَ أَكْثَرُهُمَا) زۆرترەکەیان دەبێتە (جُزْءُ السَّهْم)و لە بنچینەی مەسەلەکە دەدرێ: بە (عَوْل)، یان بێ(عَوْل)، ئینجا کۆی لێدانەکە گەیشتە کام ژمارە، ئەوە لەو ژمارەیە مەسەلەکە ساغ دەبێتەوە:

بۆ وێنە: دایكو چوار برای لەدایکیو چوار مام، بنچینەی مەسەلەکە لە شەشە-کە بەشی دایکەکەی لێدەردەچێ-: شەشێکی-یەکە- بۆ دایکەکە، سێیەکی-دووە- بۆ چوار برایەکانی لە دایکی، پاشماوەکەشی-سێیە- بۆ چوار مامەکان، ئینجا بەشی چوار برایەکان بە سەریاندا بەش نابێو بەشەکەیانو ژمارەکەیان (مُتَوَافِق)ن بە نیوەیی، کەوابو: ژمارەی برایەکان دەگەڕێندرێتەوە سەر نیوەی چوار-کە دووە-، هەروەها بەشی

چوار مامەکانیش بە سەریاندا بەش نابێ‌و بەشەکەیان‌و ژمارەکەیان (متبـاین)ن، کەوابو: ژمارەی چوار مامەکان وەکو خۆیان دەهێشـترێتەوە، ئینجا ژمـارە دووی سـەری‌برایەکان لەگەڵ ژمـارە چـواری سـەری‌مامەکان (مُتَـداخِل)ن، کـەوابو: زۆرترەکـەیان -کـە چـوارە- دەبێتە (جُزْءُ السَّهمِ)و لە تەواوی مەسەلەکە دەدرێ‌و لـە بیسـت‌و چـوار سـاغ دەبێتــەوە، بەم شێوەیە:

٦. میراتگر ———— دایك، چوار برای لەدایکی، چوار مام.

١ ×. بەشەمیرات ———— شەشێك، سێیەك، پشتێیە.

٦ ÷ ———— ١ + ٢ + ٣ = ٦.

٤ × ———— ساغکردنەوەی بە ژمارەی ٤ مام.

٢٤ ÷ ———— ٤ + ٨ + ١٢ = ٢٤.

**حاڵەتی‌سێیەم**: (وَإِنْ تَوَافَقَا) ئەگـەر ژمـارەی سـەری میراتگرەکـانی هـەردوو جۆرەکـان (مُتَوَافِق)=تێککەرەوە بون، ئەو کاتە (ضُرِبَ وِفْقُ أَحَدِهِمَا فِي الآخَرِ) یەکـەمجار (وِفْـق)ی ژمارەی میراتگرەکانی جۆرێك لە تەواوی ژمـارەی جۆرەکـەی‌تر دەدرێ (ثُمَّ الْحَاصِلُ فِـي الْمَسْأَلَةِ) ئینجا کۆی ئەو ژمارەیەیی لەو لێدانە پەیدا دەبێ، ئەو دەبێتە (جُزْءُ السَّهْمِ)و لـە تەواوی مەسەلەکە دەدرێ: بە (عَوْل)، یان بێ(عَوْل)، ئینجا بـەو لێدانـەش گەیشـتە کـام ژمارە، ئەوە لەو ژمارەیە مەسەلەکە ساغ دەبێتەوە:

بۆ وێنـە: دایك‌و دوانزە برای لەدایکی‌و شانزە خوشکی لەباوکی، بنچینەی مەسـەلەکە لـە شەشـە -کـە بەشـی دایکەکـەی لێ‌دەردەچـێ- جـا (عَـوْل) دەکـرێ بـۆ حـەفت، چـونکە شەشـێکی -یەکـە- بـۆ دایکەکـە، سـێیەکی -دووە- بـۆ دوانـزە برایـەکان، دووسـێیەکی -چوارە- بۆ شانزە خوشکەکان، ئینجا بەشی دوانزە برایەکان بە سەریاندا بـەش نابـێ‌و بەشەکەیان‌و ژمارەکەیان (مُتَوَافِق)ن بەنیوەیی -چونکە گشت (مُتَدَاخِل)ێك بـە (مُتَوافِـق) دادەندرێ- کەوابو: ژمارەی برایەکان دەگەڕێندرێتەوە بۆ نیـوەی دوانـزە -کـە شەشـە-، هەروەها بەشی شانزە خوشکەکانیش بە سەریاندا بەش نابێ‌و بەشـەکەیان‌و ژمارەکـەیان (مُتَوَافِق)ن بە چوارێك، کەوابو: ژمـارەی خوشـکەکانیش دەگەڕێندرێتـەوە بـۆ چـوارێکی شـانزە -کـە چـوارە-، ئینجـا ئـەم چـوارەی سەری‌خوشـکەکانیش لـە گـەڵ شەشـەکەی سەری‌برایەکان (مُتَوَافِـق)ن بـە نیـوەیی، کەوابو: نیـوەی یـەکێکیان لـە تـەواوی ئـەوی‌تر دەدرێ‌و دەگاتـە دوانـزە، ئینجـا ئـەم دوانزەیـە دەبێتـە (جُـزْءُ السَّـهْمِ)و لـە مەسـەلە (عَوْل)کراوەکە دەدرێ‌و لە هەشتاوچوار ساغ دەبێتەوە، بەم شێوەیە:

وَإِنْ تَبَايَنَا ضُرِبَ أَحَدُهُمَا فِي الآخَرِ ثُمَّ الْحَاصِلُ فِي الْمَسْأَلَةِ، فَمَا بَلَغَ صَحَّتْ مِنْهُ،

---

٦ . میراتگر ——— دایك، دوانزه برای لەدایكی، شانزه خوشكی لەباوكی.

١ ×. بەشەمیرات ——— شەشێك، سێیەك، دووسێیەك.

٦ ÷ ——— شەشێكی كەمە + ٢ + ٤ =٦ .

١ + ——— (عَوْل) بە شەشێك.

٧ ÷ ——— ١ + ٢ + ٤ =٧.

١٢ × ——— ساغكردنەوەی بە لێدانی ٣ × ٤ = ١٢.

٨٤ ÷ ——— ١٢ + ٢٤ + ٤٨ =٨٤.

**حاڵەتی چوارەم:** (وَإِنْ تَبَايَنَا) ئەگەر ژمارەی سەری میراتگرەكانی هەردوو جۆرەكان (مُتَبَايِن)=رێكنەكەوتوو بون، ئەو كاتەش (ضُرِبَ أَحَدُهُمَا فِي الآخَرِ) یەكەمجار تەواوی ژمارەی میراتگرەكانی جۆرێك لە تەواوی ژمارەی جۆرەكەیتر دەدرێ (ثُمَّ الْحَاصِلُ فِي الْمَسْأَلَةِ) ئینجا كۆی ئەو ژمارەیەی لەو لێدانە پەیدا دەبێ، ئەو دەبێتە (جُزْءُ السَّهم)و لە تەواوی مەسەلەكە دەدرێ بە (عَوْل)، یان بێ(عَوْل)، ئینجا (فَمَا بَلَغَ صَحَّتْ مِنْهُ) بەو لێدانەش گەیشتە كام ژمارە، ئەوە لەو ژمارەیە مەسەلەكە ساغ دەبێتەوە:

بۆ وێنە: دایكو سێ كیژو دوو برای لەباوكی، بنچینەی مەسەلەكە لە شەشە–كە بەشی دایكەكەی لێدەردەچێ–: شەشێكی–یەكە– بۆ دایكەكە، دووسێیەكی–چوارە– بۆ سێ كیژەكان، پاشماوەكەشی–یەكە– بۆ دوو برایەكان، ئینجا بەشی سێ كیژەكان بە سەریاندا بەش نابێو بەشەكەیانو ژمارەكەیان (مُتَبَايِن)ن، كەوابو: ژمارەی سێ كیژەكان وەكو خۆی دەهێنشترێتەوە، هەروەها بەشی دوو برایەكانیش بە سەریاندا بەش نابێو بەشەكەیانو ژمارەكەیان (مُتَبَايِن)ن، كەوابو: ژمارەی دوو برایەكانیش وەكو خۆی دەهێنشترێتەوە، ئینجا ئەم دووەی سەریبرایەكانیش لەگەڵ سێیەكەی سەریكیژەكان (مُتَبَايِن)ن، كەوابو: تەواوی یەكێكیان لە تەواوی ئەویتر دەدەینو دەگاتە شەش، ئینجا ئەم شەشە دەبێتە (جُزْءُ السَّهْمُ)و لە تەواوی مەسەلەكەی دەدەینو لە سیو شەش ساغ دەبێتەوە، بەم شێوەیە:

٦. میراتگر ——— دایك، سێ كیژ، دوو برا.

١ ×. بەشەمیرات ——— شەشێك، دووسێیەك، پشتییە.

٦ ÷ ——— ١ + ٤ + ١ = ٦.

٦ × ——— ساغكردنەوەی بە لێدانی ٢ × ٣ = ٦.

٣٦ ÷ ——— ٦ + ٢٤ + ٦ = ٣٦.

(وَيُقَاسُ عَلَى هَذَا) هەروەها (قياس) دەكرێتە سەر شكانەوەی سەر دوو جۆرە میراتگر (اَلإِنْكِسَارُ عَلَى ثَلاَثَةِ أَصْنَافٍ وَأَرْبَعَةٍ) شكانەوەی بەشە میراتەكان بە سەر سێ جۆرە میراتگرو چوار جۆرە میراتگردا، واتە: ئەگەر بەشە میراتەكانی سێ جۆرە میراتگر، یان چوار جۆرە میراتگر بە سەریاندا بەش نەدەبو، ئەوە لێرەشدا بە هەمان شێوەی چوار حاڵەتەكەی‌ڕابردوو ڕەفتار دەكرێ:

واتە: ژمارەی سەری هەرسێك جۆرەكان، یان هەر چوار جۆرەكان بەرامبەر بەشە میراتەكانیان دەكرێ: ئەگەر (مُتَوَافِق) بون، سەرەكان دەگەڕێندرێنەوە بۆ (وفق)ی خۆیان، ئەگەر (مُتَبَايِن) بون، سەرەكان وەكو خۆیان دەهێشترێنەوە، ئینجا تەماشا دەكەین: ژمارەی هەرسێك جۆرەكان، یان هەر چوار جۆرەكانیش: ئەگەر (مُتَمَاثِل) بون، ئەوە تەنها یەكێكیان دەبێتە (جُزْءُ السَّهْمِ)و لە مەسەلەكە دەدرێ، ئەگەر (مُتَدَاخِل) بون، ئەوە زۆرترەكەیان دەبێتە (جُزْءُ السَّهْمِ)و لە مەسەلەكە دەدرێ، ئەگەر (مُتَوَافِق) بون، ئەوە (وَفْقِ)ی یەكێكیان لە یەكێكی‌تر دەدرێو كۆی ئەو لێدانەش لە (وَفْقِ)ی ژمارەكەی‌تر دەدەرێ، ئینجا كۆی ئەو لێدانانەش دەبێتە (جُزْءُ السَّهْمِ)و لە مەسەلەكە دەدرێ، ئەگەر (مُتَبَايِن) بون، ئەوە یەكێكیان لەوی‌تر دەدرێ، ئینجا كۆی ئەو لێدانەش لەوی‌تر دەدەرێ، ئینجا كۆی ئەو لێدانانەش دەبێتە (جُزْءُ السَّهْمِ)و لە مەسەلەكە دەدرێ.

(وَلاَ يَزِيدُ الإِنْكِسَارُ عَلَى ذَلِكَ) لە شكانەوەی بەشە میراتەكان بە سەر چوار جۆردا زیاتر نابێ، تەنها لە خزمایەتی كۆیلە ئازادكرندا نەبێ.

**وێنەیەكی سێ جۆری:** دوو داپیرەو سێ برای لەدایكیو دوو مام، بنچینەی مەسەلەكە لە شەشە-كە بەشی داپیرەكانی لێدەردەچێ-: شەشێكی-یەكە- بۆ دوو داپیرەكان، سێیەكی-دووە- بۆ سێ برایەكان، پاشماوەكەشی- سێیە- بۆ دوو مامەكان، ژمارەی هەرسێك جۆرە میراتگرەكان لەگەڵ بەشەكانیان (مُتَبَايِن)ن، كەوابو: ژمارەی سەری گشتیان وەكو خۆی دەهێشترێتەوە، ئینجا ژمارەی سەری دوو داپیرەكەو دوو مامەكە (مُتَمَاثِل)نو لەگەڵ ژمارەی سەری سێ برایەكانیش (مُتَبَايِن)ن، كەوابو: ژمارەی یەكێكیان لە تەواوی ژمارەی سێ برایەكان دەدرێو دەگاتە شەش، ئینجا ئەم شەشە دەبێتە (جُزْءُ السَّهْمِ)و لە تەواوی مەسەلەكە دەدرێو لە سیو شەش ساغ دەبێتەوە: شەش بۆ دوو داپیرەكان، دوانزە بۆ سێ برایەكان، هەژدە بۆ دوو مامەكان.

**وێنەیەكی چوار جۆری:** دوو ژنو چوار داپیرەو سێ برای لەدایكیو دوو مام، بنچینەی مەسەلەكە لە دوانزەیە بە لێدانی سێ لە چوار-كە بەشی ژنەكانو برایەكانیان لێدەردەچێ-: چوارێكی-سێیە- بۆ دوو ژنەكان، شەشێكی-دووە- بۆ چوار داپیرەكان،

**فَإِذَا أَرَدْتَ مَعْرِفَةَ نَصِيبِ كُلِّ صِنفٍ مِنْ مَبْلَغِ الْمَسْأَلَةِ فَاضْرِبْ نَصِيبَهُ مِنْ أَصْلِ الْمَسْأَلَةِ فِيمَا ضَرَبْتَهُ فِيهَا فَمَا بَلَغَ فَهُوَ نَصِيبُهُ، ثُمَّ تَقْسِمُهُ عَلَى عَدَدِ الصِّنْفِ.**

---

سێیەکی-چوارە- بۆ سێ برایەکان، پاشماوەکەشی-سێیە- بۆ دوو مامەکان، ئینجا ژمارەی چوار داپیرەکانو بەشەکەیان (مُتَوَافِق)ن بە نیوەیی، کەوابو: ژمارەی سەری داپیرەکان دەگەڕێندرێتەوە بۆ نیوەی چوار-کە دووە-، ژمارەی سێ جۆرەکانیتریش لەگەڵ بەشەکانیان (مُتَبَايِن)ن، کەوابو: ژمارەی سەری هەرسێکیان وەکو خۆیان دەهێشترێتەوە، ئینجا ژمارەی سەری داپیرەکانو ژنەکانو مامەکان (مُتَمَاثِل)نو لەگەڵ ژمارەی سەری سێ برایەکانیش (مُتَبَايِن)ن، کەوابو: یەکێکیان لە تەواوی ژمارەی سێ برایەکان دەدەینو دەگاتە شەش، ئەم شەشە دەبێتە (جُزْءُ السَّهْمِ)و لە تەواوی مەسەلەکە دەدرێو لە حەفتاو دوو ساغ دەبێتەوە: هەژدە بۆ دوو ژنەکان، دوانزە بۆ چوار داپیرەکان، بیستو چوار بۆ سێ برایەکان، هەژدە بۆ دوو مامەکان.

ئینجا بزانە: لە ساغکردنەوەیمەسەلەکاندا گوتمان: ئەو ژمارەیەی بۆ ساغکردنەوە لە مەسەلەکە دەدرێ پێی دەگوترێ: (جُزْءُ السَّهْمِ)ی مەسەلەکە، واتە: پارچەیەکی بەشە میراتێکیمەسەلەکە پێش ساغکردنەوە.

جا لە بەر ئەوەی لێرەدا مەبەست بەشکردنی بەشە میراتەکانە-بە ساغی- پێویستە (جُزْءُ السَّهْمِ)ی گشت مەسەلەیەکی ساغ دەکرێتەوە بزانین، چونکە (فَإِذَا أَرَدْتَ) هەر کاتێك- لە دوای ساغکردنەوەیمەسەلەکە- ویستت (مَعْرِفَةَ نَصِيبِ كُلِّ صِنْفٍ مِنْ مَبْلَغِ الْمَسْأَلَةِ) بزانی: بەشی گشت جۆرە میراتگرێك چەندە لەو ژمارەیەی مەسەلەکەی لێ ساغ بۆتەوە، ئەوە (فَاضْرِبْ نَصِيبَهُ مِنْ أَصْلِ الْمَسْأَلَةِ) بەشی میراتگرەکە: کە لە بنچینەی مەسەلەکە -بە (عَوْل)، یان بێ(عَوْل) پێش ساغکردنەوە- گرتبوی، لێبدە (فِيمَا) لەو (جُزْءُ السَّهْمِ)ی کە (ضَرَبْتَهُ فِيهَا) لە بنچینەی مەسەلەکەت دابو بۆ ساغکردنەوەکە (فَمَا بَلَغَ) بەو لێدانە گەیشتە چەند، ئەوە (فَهُوَ نَصِيبُهُ) کۆی لێدانەکە بەشە میراتەکەیەتی لە ساغکراوەکە (ثُمَّ تَقْسِمُهُ عَلَى عَدَدِ الصِّنْفِ) ئینجا کۆی لێدانەکەش بە سەر ژمارەی میراتگرەکانی جۆرەکەدا بەش بکە، بەشکردنەکە بە ساغی دەردەچێ:

**ڕوونکردنەوە:** لە وێنەی یەکەمی ئەم لقەدا: بنچینەی مەسەلەکە لە چوار بوو و لە هەشت ساغ بۆتەوەو (جُزْءُ السَّهْمِ)ی مەسەلەکەش دووە، جا لە بنچینەی مەسەلەکە ژنەکە یەکی گرتبو و لە دووەکەی (جُزْءُ السَّهْمِ)ی بدەو لە ساغکراوەکە بەشی دەبێتە دوو، هەروەها دوو برایەکانیش سێیان گرتبو و لە دووەکەی (جُزْءُ السَّهْمِ) دەدرێو لە ساغکراوەکە بەشیان دەبێتە شەش.

هەروەها لە وێنەی دووەمی ئەم لقەدا: بنچینەی مەسەلەکە بە (عَوْل)کراوی لە حەفت بوو و لە سیو پێنج ساغ بۆتەوەو (جُزْءُ السَّهْمِ)ی مەسەلەکەش پێنجە، جا لە بنچینەی مەسەلە (عَوْل)کراوکە: مێردەکە سیّی گرتبو و لە پێنجەکەی (جُزْءُ السَّهْمِ) دەدرێو لە ساغکراوەکە بەشی دەبێتە پانزە، پێنج خوشکەکانیش چواریان گرتبو و لە پێنجەکەی (جُزْءُ السَّهْمِ) دەدرێو لە ساغکراوەکە بەشیان دەبێتە بیست.

هەروەها لە مەسەلەکەی حاڵەتییەکەمیش-کە وێنەی دوو جۆرە میراتگر بوو-: (جُزْءُ السَّهْمِ)ی مەسەلەکە سێ بوو، جا لە بنچینەی مەسەلە (عَوْل)کراوەکە: دایکەکە یەکی گرتبو و لە سێیەکەی (جُزْءُ السَّهْمِ) دەدرێو لە ساغکراوەکە بەشی دەبێتە سێ، شەش برایەکانیش دوویان گرتبو و لە سێیەکەی (جُزْءُ السَّهْمِ) دەدرێو لەساغکراوەکە بەشیان دەبێتە شەش، دوانزە خوشکەکانیش چواریان گرتبو و لە سێیەکەی (جُزْءُ السَّهْمِ) دەدرێو لە ساغکراوەکە بەشیان دەبێتە دوانزە.

هەروەها لە وێنەکەی سێ جۆریش: (جُزْءُ السَّهْمِ)ی مەسەلەکە شەش بوو، لە بنچینەی مەسەلەکەش: دوو داپیرەکان یەکێکیان گرتبو و لە شەشەکەی (جُزْءُ السَّهْمِ) دەدرێو لە ساغکراوەکە بەشیان دەبێتە شەش، سێ برایەکانیش دوویان گرتبو و لەشەشەکەی (جُزْءُ السَّهْمِ) دەدرێو بەشەکەیان لە ساغکراوەکە دەبێتە دوانزە، دوو مامەکانیش سێیان گرتبو و لە شەشەکەی (جُزْءُ السَّهْمِ) دەدرێو بەشەکەیان لە ساغکراوەکە دەبێتە هەژدە.

ئیتر هەر بەو جۆرە: بەشی گشت میراتگرێك-کە پێش ساغکردنەوە لە بنچینەی مەسەلەکە گرتویەتی- لەو (جُزْءُ السَّهْمِ)ە بدە: کە لە بنچینەی مەسەلەکەت داوە، ئینجا کۆی ئەو لێدانە دەبێتە بەشی هەمان میراتگر لە ساغکراوەکە، والحمد لله تعالى.

## ﴿ ساغکردنەوەی (مَسائِلُ الرَّدِّ)=مەسەلەکانی ڕەدکردنەوەی میراتە زێدەکە ﴾

لە باسی ژماردنی میراتگرەکاندا گوتمان: ئەگەر میراتەکە زیاد بوو، میراتگری پشتیو (بَیْت المال)ش نەبو، ئەوە زێدەییەکە بۆ خاوەن بەشەکانی جگە لە ژنو مێرد دەگەڕێندرێتەوە، ئێستاش لێرەدا باسی دروستکردنو ساغکردنەوەی ئەو مەسەلانە دەکەینو دەڵێین: مەسەلەکانی گەڕاندنەوەی میراتە زێدەکە بۆ خاوەن بەشەکان- هەروەك لە (الأنوار)و (قطرالعارض)دا فەرموویانە- دەکرێنە چوار بەش:

**بەشییەکەم:** خاوە بەشەکان یەك جۆر بن، واتە: یەك جۆرە بەشە میرات بگرنو ژنو مێردیشیان لەگەڵدا نەبن، ئەوە ژمارەی سەری خاوەن بەشەکان دەبێتە بنچینەی مەسەلەکە: وەك دوو خوشك، یان دوو کیژ: مەسەلەکە لە سێوە دێتەوە سەر دوو، یان وەکو دوو داپیرە: مەسەلەکە لە شەشەوە دێتەوە سەر دوو، ئەگەر سێ بون دێتەوە سەر سێ...بەو جۆرە.

**بەشی دووەم**: خاوەن بەشەکان لە یەك جۆر زیاتر بن، واتە: دوو جۆرە بەشەمیرات، یان زیاتر بگرن و ژن و مێردیشیان لەگەڵدا نەبێ، ئەو کاتە بنچینەی مەسەلەکە لە کۆی ژمارەی ئەو بەشە میراتانەیان دروست دەبێ: کە لە لێدەرچووی بەشەکان وەردەگیرێ، ئەگەر لە مەسەلەکەدا گەڕاندنەوەی میراتەکە نەبوایە:

بۆ وێنە: داپیرەیەك و برایەکی لەدایکی، هەر یەکەو شەشێکیان هەیەو مەسەلەکەیان لە شەشەوە دێتەوە سەر دوو، چونکە دوو شەشێك دەکاتە دوو، هەریەکەو یەکێکیان.

هەروەها دایك و خوشکێکی لەدایکی: دایکەکە سێیەکی هەیە -کە دووە- خوشکەکەش شەشێك -کە یەکە- کۆی هەردوو بەشەکان دەکاتە سێ، کەوابو: مەسەلەکەیان لە شەشەوە دێتەوە سەر سێ، دوو بۆ دایکەکە، یەکێك بۆ خوشکەکە.

هەروەها دایك و کیژێك: دایکەکە شەشێکی هەیە -کە یەکە- کیژەکەش نیوەی هەیە -کە سێیە- کۆی هەردوو بەشەکان دەکاتە چوار، کەوابو: مەسەلەکە لە شەشەوە دێتەوە سەر چوار، سێ بۆ کیژەکە، یەکێك بۆ دایکەکە.

هەروەها دایك و کیژێك و کیژەکوڕێك: دایکەکەو کیژەکوڕەکە هەر یەکەو شەشێکیان هەیەو کیژەکەش نیوەی هەیە، کۆی بەشەکان دەکاتە پێنج، کەوابو: مەسەلەکە لە شەشەوە دێتەوە سەر پێنج، سێ بۆ کیژەکە، یەکێك بۆ دایکەکە، یەکەکەی تریش بۆ کیژەکوڕەکە...بەو جۆرە.

**بەشی سێیەم**: خاوەن بەشەکان یەك جۆر بن، بەڵام ژن، یان مێرد لەگەڵدا بێ، ئەو کاتە بەشی ژنەکە، یان مێردەکە لە لێدەرچووەکەی بەشەکەی خۆیان دەیاندرێتێ -کە نیوە، یان چوارێك، یان هەشتێکە-، ئینجا پاشماوەکەش دەدرێتە ئەو خاوەن بەشانەی مافی گەڕاندنەوەی میراتە زێدەکەیان هەیە، ئینجا تەماشا دەکەین:

ئەگەر پاشماوەکەش بە ساغی بە سەر ژمارەی سەری ئەو خاوەن بەشانەدا بەش دەبو، ئەوە هەر لێدەرچووەکەی بەشی ژن و مێردەکە بنچینەی مەسەلەکەیە: وەك ژنێك و حەفت کیژ، بنچینەی مەسەلەکە لە هەشتە -کە بەشی ژنەکەی لێدەردەچێ-: هەشتێکی -یەکە- بۆ ژنەکە، پاشماوەکەشی -حەفتە- بۆ حەفت کیژەکان. هەم وەك مێرد و سێ کیژ، بنچینەی مەسەلەکە لە چوارە -کە بەشی مێردەکەی لێدەردەچێ-: یەکی بۆ مێردەکە، پاشماوەکەشی بۆ سێ کیژەکە.

بەڵام ئەگەر پاشماوکە بە ساغی بە سەر خاوەن بەشەکاندا بەش نەدەبو، ئەو کاتە تەماشا دەکەین: ئەگەر پاشماوەکەو ژمارەی سەری خاوەن بەشەکان (مُتَوَافِق) بون، ئەوە (وِفق)ی ژمارەی سەرەکان لە لێدەرچووەکەی بەشی ژن و مێردەکە دەدرێ، بەڵام ئەگەر

پاشماوەکەو ژمارەی سەرەکان (مُتَبَاین) بون، ئەو کاتە تەواوی سەرەکان لە لێدەرچووەکەی بەشی ژنو مێردەکە دەدرێ، ئینجا لە هەردوو حاڵەتدا کۆی لێدانەکە گەیشتە کام ژمارە، ئەو ژمارەیە دەکرێتە بنچینەی مەسەلەکەو لەو ژمارەیە ساغ دەبێتەوە:

وێنەی(تَوَافق): مێردو شەش کیژ، مەسەلەکە لە چوارە -کە لێدەرچووی بەشی مێردەکەیە-: چوارێکی -یەکە- بۆ مێردەکە، پاشماوەکەشی -سێیە- بە سەر شەش کیژەکاندا بەش نابێ، سێو شەش (مُتَوَافق)ن بە سێیەك، کەوابو: سێیەکی شەش کیژەکان -کە دووە- لە لێدەرچووەکەی بەشی مێردەکە دەدەینو بنچینەی مەسەلەکە دەبێتە هەشت: دوو بۆ مێردەکە، پاشماوەکەش شەشە بۆ شەش کیژەکان.

وێنەی(تَبَایُن): مێردو پێنج کیژ، دیسان مەسەلەکە لە چوارە: چوارێکی -یەکە- بۆ مێردەکە، پاشماوەکەشی -سێیە- بە سەر پێنج کیژەکاندا بەش نابێ، سێ لەگەڵ پێنج (مُتَبَاین)ن، کەوابو: ژمارەی پێنج کیژەکان لە لێدەرچووەکەی بەشی مێردەکە دەدەینو بنچینەی مەسەلەکە دەبێتە بیست: پێنج بۆ مێردەکە، پانزەش بۆ کیژەکان.

**بەشی چوارەم:** خاوەن بەشەکان لە یەك جۆر زیاتر بن، بەڵام ژن، یان مێرد لەگەڵدا بێ، ئەو کاتەش بەشی ژنەکە، یان مێردەکە هەر لە لێدەرچووی بەشەکەی خۆیان دەیاندرێتێ -کە نیوە، یان چوارێك، یان هەشتێکە-، هەروەك لە بەشی سێیەمدا رابرا، ئینجا پاشماوەکەشی دەدرێتە ئەو خاوەن بەشانەی مافی گەڕاندنەوەی میراتە زێدەکەیان هەیە، ئینجا تەماشا دەکەین:

ئەگەر پاشماوەکەش بە ساغی بەسەر کۆی بەشە میراتەکانی خاوەن بەشەکاندا بەش دەبو - واتە: ئەو بەشە میراتانەی لە بەشی‌دووەمدا دەکرانە بنچینەی مەسەلەکە-، ئەو کاتە هەر لێدەرچووەکەی بەشی ژنو مێردەکە دەکرێتە بنچینەی مەسەلەکە: وەك چوار داپیرەو ژنێكو شەش خوشکی لەدایکی، بنچینەی مەسەلەکە لە چوارە -کە بەشی ژنەکەی لێدەردەچێ-: چوارێکی -یەکە- بۆ ژنەکە، پاشماوەکەشی -سێیە- بە سەر کۆی بەشەکانی داپیرەکانو خوشکەکاندا بەش دەبێ -کە شەشێکێكو سێیەکێکەو کۆیان دەکاتە سێ-: یەکێك بۆ داپیرەکان، دوو بۆ خوشکەکان، هەروەك لە بەشی‌دووەمدا رابرا، بەڵام بەشی داپیرەکانو خوشکەکان بە ساغی بە سەر سەرەکانیاندا بەش نابێو دووبارە مەسەلەکە لە چلو هەشت ساغ دەکرێتەوە، بەو (قاعدە)یەی لە ساغکردنەوەدا رابرا.

بەڵام ئەگەر پاشماوەکە بە ساغی بە سەر کۆی بەشە میراتەکاندا بەش نەدەبو، ئەو کاتە کۆی بەشە میراتەکانی ئەو خاوەن بەشانەی مافی گەڕاندنەوەی میراتەکەیان هەیە، لە لێدەرچووەکەی بەشی ژنەکە، یان مێردەکە بدە، ئینجا کۆی لێدانەکە گەیشتە کام ژمارە،

ئەو دەکرێتە بنچینەی مەسەلەکە: وەك نۆ کیژو شەش داپیرەو چوار ژن، مەسەلەکە لە هەشتە -کە بەشی ژنەکەی لێدەردەچێ-: هەشتێکی -یەکە- بۆ چوار ژنەکان، پاشماوەکەشی -حەفتە- بە سەر کۆی بەشە میراتەکانی داپیرەکانو کیژەکاندا بەش نابێ -کە شەشێکێکو دووسێیەکەو کۆیان دەکاتە پێنج-، جا پێنجەکەی کۆی بەشەکانو حەفتەکەی پاشماوەکەش (مُتَبايِن)ن، کەوابو: پێنجەکە لە لێدەرچووەکەی بەشی ژنەکە دەدەین- کە هەشتە-، بنچینەی مەسەلەکە دەبێتە چل:

ئینجا کە ساغکردنەوەکەت تەواوکردو حەزت کرد بزانی -لە کۆی مەسەلەکە- گشت میراتگرێك چەندی هەیە، ئەو کاتە بەشە میراتەکەی ژنەکە، یان مێردەکە لەو ژمارەیە بدە: کە لە لێدەرچووی بەشەکەت دابو، ئەوە کۆی لێدانەکە دەبێتە بەشی وی لە بنچینەی مەسەلەکە، بۆ وێنە: لە مەسەلەکەیڕابردوودا بەشی چوار ژنەکان یەك بوو، لەو پێنجەی بدە: کە کۆی بەشە میراتەکان بوو و لە لێدەرچووی بەشی ژنەکانت دابو، ئەو کاتە بەشی ژنەکان- لە چلەکە- دەبێتە پێنج.

هەروەها بەشە میراتی ئەو خاوەن بەشانەش کە مافی گەڕاندنەوەی میراتەکەیان هەیە لە پاشماوەکە بدە: کە لە پاش بەشی ژنەکە، یان مێردەکە ماوەتەوە، ئەوەش دەبێتە بەشی وی، بۆ وێنە: لە مەسەلەکەیڕابردوودا: داپیرەکان یەکێکیان هەبوو لە حەفتەکەی پاشماوەکەی بدەو لە چلەکە بەشیان دەبێتە حەفت، هەم کیژەکانیش چواریان هەبوو، لە حەفتەکەی پاشماوەکەی بدەو لە چلەکە بەشیان دەبێتە بیستو هەشت.

ئینجا ئەگەر لە دوای دیاریکردنی بەشە میرات، بەشە میراتەکانیش بە سەر سەری خاوەنەکانیاندا بە ساغی بەش نەدەبون، ئەوە هەر بەو (قاعدة)ڕابردووانەی لە باسی ساغکردنەوەی مەسەلەکاندا ڕوونمان کردنەوە، لێرەشدا کرداری ساغکردنەوە جێبەجێ بکە، کەواتە: لە مەسەلەکەیڕابردوودا: بەشەکانی ژنەکانو داپیرەکانو کیژەکان گشتیان لەگەڵ سەری خاوەنەکانیان (مُتَبَايِن)ن، کەوابو: سەرەکان وەکو خۆیان دەهێشترێنەوە، ئینجا ژمارەی سەری داپیرەکانو سەری ژنەکان (مُتَوَافِق)ن بە نیوەیی، کەوابو: نیوەی سەری ژنەکان لە تەواوی سەری داپیرەکان دەدەینو دەبێتە دوانزە، ئەم دوانزەیەش لەگەڵ ژمارەی نۆ کیژەکان (مُتَوَافِق)ن بە سێیەك، کەوابو: سێیەکی نۆ -کە سێیە- لە دوانزەکە دەدەینو دەگاتە سیو شەش، جا ئەم سیو شەشە دەبێتە (جُزْءُ السَّهْم)و لە چلەکەی دەدەن، جا لە (١٤٤٠) هەزارو چوار سەدو چل ساغ دەبێتەوە: (١٨٠) سەدو هەشتا بۆ ژنەکان، (٢٥٢) دووسەدو پەنجاو دوو بۆ داپیرەکان، (١٠٠٨) هەزارو هەشت بۆ کیژەکان.

(فَرْعٌ) مَاتَ عَنْ وَرَثَةٍ فَمَاتَ أَحَدُهُمْ قَبْلَ الْقِسْمَةِ فَإِنْ لَمْ يَرِثِ الثَّانِي غَيْرُالْبَاقِينَ وَكَانَ إِرْثُهُمْ مِنْهُ كَإِرْثِهِمْ مِنَ الأَوَّلِ جُعِلَ كَأَنَّ الثَّانِيَ لَمْ يَكُنْ وَقُسِّمَ بَيْنَ الْبَاقِينَ كَإِخْوَةٍ وَأَخَوَاتٍ أَوْ بَنِينَ وَبَنَاتٍ مَاتَ بَعْضُهُمْ عَنِ الْبَاقِينَ، وَإِنْ لَمْ يَنْحَصِرْ إِرْثُهُ فِي الْبَاقِينَ أَوْ انْحَصَرَ وَاخْتَلَفَ قَدْرُالإِسْتِحْقَاقِ فَصَحِّحْ مَسْأَلَةَالأَوَّلِ ثُمَّ مَسْأَلَةَالثَّانِي ثُمَّ

---

## ﴿ فَرْعٌ: له باسی (الْمُنَاسَخَات)=گواستنەوەی میرات لە مردوویك بۆ مردوویكیتر ﴾

واتـــە: پـــێش بەشـــكردنیمیراتەكە یـــەكێك لـــە میراتگرەكـــان بمـــرێ.

كەوابو: هەر كاتێك (مَاتَ عَنْ وَرَثَةٍ) یەكێك مرد و كۆمەڵە میراتگرێكی لە پاش بەجێمان (فَمَاتَ أَحَدُهُمْ قَبْلَ الْقِسْمَةِ) جا پێش بەشكردنی میراتەكە یەكێكیان مرد، ئەوە تەماشا دەكەین:

(فَإِنْ لَمْ يَرِثِ الثَّانِي غَيْرُالْبَاقِينَ) ئەگەر جگە لە میراتگرەكانی مردووەكەییەكەم هیچ میراتگرێكیتر میراتی لە مردووەكەیدووەم نەدەگرتو (وَكَانَ إِرْثُهُمْ مِنْهُ كَإِرْثِهِمْ مِنَ الأَوَّلِ) میراتگرتنەكەشیان لە مردووەكەیدووەم وەك میراتگرتنیان لە مردووەكەییەكەم بوو، ئەوە بۆ دروستكردنی مەسەلەكە (جُعِلَ كَأَنَّ الثَّانِيَ لَمْ يَكُنْ) وا دادەنرێ كە مردووەكەیدووەم لەگەڵ میراتگرەكانی مردووەكەییەكەمدا نەبوەو (وَقُسِّمَ بَيْنَ الْبَاقِينَ) میراتەكە لە نێوان ئەو میراتگرانەدا بەش دەكرێ كە ئێستا ماون:

(كَإِخْوَةٍ وَأَخَوَاتٍ) وەكو یەكێك لە برایەكانو خوشكەكانی لەباوكیی مردووەكە پێش بەشكردنی میراتەكە بمرێ، ئەوە وا دادەنرێ مردووەكەیدووەم هەر نەبوەو ژمارەی ئەو میراتگرانەی ئێستا ماون دەبێتە بنچینەی مەسەلەكە.

(أَوْ بَنِينَ وَبَنَاتٍ) یان وەكو كوڕەكانو كیژەكانی مردووەكە (مَاتَ بَعْضُهُمْ عَنِ الْبَاقِينَ) هەندێكیان بمرنو ئەوانیتریش بمێنن، لێرەشدا هەرچەند كوڕەكانو كیژەكان دەبنە خوشكو برای مردووەكەیدووەم، بەڵام هەر ژمارەكەیان دەبێتەوە بنچینەی مەسەلەكەو وا دادەنرێ مردووەكەیدووەم هەر نەبوە.

(وَإِنْ لَمْ يَنْحَصِرْ إِرْثُهُ فِي الْبَاقِينَ) بەڵام ئەگەر میراتەكەی مردووەكەیدووەم تەنها بۆ ئەو میراتگرانە نەبو: كە ئێستا ماون، بەڵكو میراتگریتر هاوبەشییان لەگەڵ دەكردن، یان تەنها بۆ هەندێك میراتگریتر بوو (أَوْ انْحَصَرَ) یان هەر بۆ ئەو میراتگرانە بوو: كە ئێستا ماون، بەڵام (وَاخْتَلَفَ قَدْرُ الإِسْتِحْقَاقِ) ئەندازەی میراتەكەیان لە مردووەكەی یەكەمو دووەم جیاواز بوو، ئەوە لە هەر سێك حاڵەتدا (فَصَحِّحْ مَسْأَلَةَ الأَوَّلِ) مەسەلەی مردووەكەییەكەم ساغ بكەوە (ثُمَّ مَسْأَلَةَ الثَّانِي) ئینجا مەسەلەی مردووەكەیدووەمیش ساغ بكەوە (ثُمَّ) ئینجا كە هەردوو مەسەلەكانت ساغ كردنەوە تەماشا بكە:

إنْ انْقَسَمَ نَصيبُ الثَّاني منْ مَسْأَلَةالأَوَّل عَلَى مَسْأَلَته فَذَاكَ، وَإلاَّ فَإنْ كَانَ بَيْنَهُمَا مُوَافَقَةٌ ضُرِبَ وَفْقُ مَسْأَلَته في مَسْأَلَةالأَوَّل، وَإلاَّ كُلُّهَا فيهَا فَمَا بَلَغَ صَحَّتَا منهُ، ثُمَّ مَنْ لَهُ شَيْءٌ منَ الأُولَى أَخَذَهُ مَضْرُوبًا فيمَا ضُربَ فيهَا،

---

(إنْ انْقَسَمَ نَصيبُ الثَّاني) ئەگەر ئەو بەشە میراتەی مردووەکەیدووەم- کە (منْ مَسْأَلَة الأَوَّل) لە مەسەلەی مردووەکەییەکەم گرتبوی- بە ساغی بەش دەبو (عَلَى مَسْأَلَته) بە سەر مەسەلەکەیخۆیدا-کە دووەمەکەیە- (فَذَاكَ) ئەوە ئاشکرایەو کاری گواستنەوەکە ئاسانە:
وەك ژنێك بمریو مێردو دوو خوشکی لەباوکیی لە پاش بەجێ بمێنن، ئینجا لەو دوو خوشکانەش-پێش بەشکردنیمیراتەکە-خۆشکێکیان بمریو خوشکەکەیترو کیژێکی لە پاش بەجێ بمێنن، ئەوە مەسەلەکەییەکەم لە شەشە بە لێدانی دوو لە سێ-کە بەشی مێردەکەو خوشکەکانیان لێدەردەچێ-، ئینجا (عَوْل) دەکرێ بۆ حەفت، مەسەلەکەی دووەمیش لە دووە-کە بەشی کیژەکەی لێدەردەچێ-، ئینجا بەشی خوشکە مردووەکە لە مەسەلەکەییەکەم دوو بو، چونکە بە هەر دوو خوشکەکان دووسێیەکیان گرتبو-کە چوارە- دووەکەش بە سەر مەسەلەکەی خۆیدا بەش دەبێ، کەواتە: بەشەکەی مردووەکەیدووم-کە لە مەسەلەکەی یەکەم گرتبوی- یەکسەر دەدرێتە میراتگرەکانیخۆی: یەکێك بۆ کیژەکەی بە خاوەن بەشی، یەکەکەیتریش بۆ خوشکەکەی بە (عصبة)یی.
(وَإلاَّ) بەلام ئەگەر بەشە میراتەکەی مردووەکەیدووەم-کە لە مردووەکەییەکەم گرتبوی- بە سەر مەسەلەکەیخۆیدا بەش نەدەبو، ئەو کاتەش تەماشا بکە: (فَإنْ كَانَ بَيْنَهُمَا مُوَافَقَةٌ) ئەگەر لە نێوان مەسەلەکەی مردووەکەیدووەمو بەشە میراتەکەی (تَوَافُق) هەبو (ضُربَ وَفْقُ مَسْأَلَته في مَسْأَلَة الأَوَّل) ئەوە (وفْق)ی مەسەلەی مردووەکەیدووەم لە تەواوی مەسەلەی مردووەکەییەکەم دەدرێ (وَإلاَّ) بەلام ئەگەر (مُتَوافق) نەبون، بەلکو مەسەلەکەو بەشەکەیدووەمەکە (مُتَبَاين) بون، ئەو کاتە (كُلُّهَا فيهَا) تەواوی مەسەلەی دووەمەکە لە تەواوی مەسەلەییەکەمەکە دەدرێ، ئینجا لە هەر دوو حالەتی لێدانەکاندا (فَمَا بَلَغَ) کۆی لێدانەکان گەیشتە کام ژمارە، ئەوە (صَحَّتَا منهُ) هەردوو مەسەلەی یەکەمەکەو دووەمەکە لە کۆی ئەو لێدانە ساغ دەبنەوە:
(ثُمَّ) ئینجا کە هەردوو مەسەلەکان لە ژمارەیەك ساغ بونەوە، ئەو کاتە بۆ بەشکردنی میراتی هەردوو مردووەکان بلێ:
(مَنْ لَهُ شَيْءٌ منَ الأُولَى) هەر میراتگرێك-جگە لە مردووەکە- بەشە میراتێکی لە مەسەلەکەییەکەم هەیە، ئەوە (أَخَذَهُ مَضْرُوبًا فيمَا ضُربَ فيهَا) کە بەشە میراتەکەی دەگرێ لەو ژمارەیە دەدرێ: کە لە مەسەلەکەییەکەم درابو-کە (وفْق)ی مەسەلەکەیدووەم بوو، یان تەواوەکەی بوو- ئینجا کۆی لێدانەکە گەیشتە کام ژمارە، ئەوە بەشی ئەو میراتگرەیە لە کۆی هەردوو مەسەلەکان.

**وَمَنْ لَهُ شَيْءٌ مِنَ الثَّانِيَةِ أَخَذَهُ مَضْرُوبًا فِي نَصِيبِ الثَّانِي مِنَ الأُولَى أَوْ فِي وَفْقِهِ إِنْ كَانَ بَيْنَ مَسْأَلَتِهِ وَنَصِيبِهِ وَفْقٌ.**

---

هەروەها (وَمَنْ لَهُ شَيْءٌ مِنَ الثَّانِيَةِ) هەر میراتگرێك بەشە میراتێكی لە مەسەلەكەیدووەم هەیە، ئەوە (أَخَذَهُ مَضْرُوبًا فِي نَصِيبِ الثَّانِي) كە بەشە میراتەكەی دەگرێ لە تەواوی بەشی مردووەكەیدووەم دەدرێ-كە (مِنَ الأُولَى) لە یەكەمەكە گرتبوی- ئەگەر بەشەكەیو مەسەلەكەی (مُتَبَاين)بن (أَوْ فِي وَفْقِهِ) یان بەشە میراتەكە لە (وِفْقَ)ی بەشی مردووەكەی دووەم دەدرێ (إِنْ كَانَ بَيْنَ مَسْأَلَتِهِ وَنَصِيبِهِ وَفْقٌ) ئەگەر لە نێوان مەسەلەیدووەمەكەو بەشەكەی (تَوَافُق) هەبێ، ئینجا كۆی لێدانەكە بەشی ئەو میراتگرەیە لە كۆی هەردوو مەسەلەكان، ئینجا ئاگاداربە: لە كۆی مەسەلەكان بەشی مردووەكە دامەنێ.

**وێنەی(تَوَافُق)**: دوو داپیرەو خوشكێكی لەدایكیو خوشكێكی لەباوكیو خوشكێكی لەدایكوباوكی، ئینجا پێش بەشكردنیمیراتەكە خوشكە لەدایكیەكە مرد، لە پاشی بەجێمان: دایكیدایك-كە یەكێك لە دوو داپیرەكانە-و خوشكێكی لەدایكی-كە خوشكە لە دایكو باوكیەكەیە-و دوو خوشكی لەدایكوباوكیی-كە لە یەكەمەكەدا نەبون-: مەسەلەكەی یەكەم لە شەشەو لە دوانزە ساغ دەبێتەوە، مەسەلەكەیدووەمیش لە شەشە، ئینجا بەشی خوشكە مردووەكە لە یەكەمەكە دوو بوو و لە گەڵ مەسەلە دووەمەكەی خۆی (مُتَوَافِق)ن بە نیوەیی، كەوابو: نیوەی مەسەلەكەیدووەم-كە سێیە- لە تەواوی یەكەمەكە دەدرێ-كە دوانزەیە- لە سیو شەش هەردوو مەسەلەكان ساغ دەبنەوە:

ئینجا هەر داپیرەیەك لە یەكەمەكە یەكی هەبو، كەوابو: یەكەكەی هەر داپیرەیەك لە سێیەكە دەدرێو لە كۆی هەردوو مەسەلەكان هەر داپیرەیەك بەشی دەبێتە سێ، هەم داپیرەكەی مەسەلەیدووەمیش لە دووەمەكە یەكی هەبو و لە (وِفْق)ی بەشی خوشكە مردووەكە دەدرێ -كە یەكە-و بەشی ئەم داپیرە ئەمجارەش لە كۆی هەردوو مەسەلەكان هەر دەبێتە یەك، خوشكە لەدایكوباوكیەكەش لە یەكەمەكە شەشی گرتبو و لە سێیەكە دەدرێو لە كۆی هەردوو مەسەلەكان بەشی دەبێتە هەژدە، هەر ئەم خوشكەش لە دووەمەكە یەكێكی گرتبو و لە (وِفْقَ)ی بەشی خوشكە مردووەكەی دەدەینو ئەمجارەش لە كۆی هەردوو مەسەلەكان بەشی هەر دەبێتە یەك، خوشكە لەباوكیەكەش لە یەكەمەكە دووی گرتبو و لە سێیەكە دەدرێو لە كۆی مەسەلەكان بەشی دەبێتە شەش، بەڵام لە دووەمەكە هیچی نیە، دوو خوشكەكانی لەدایكوباوكیش لە دووەمەكە چواریان هەبو و لە (وِفْقَ)ی بەشی خوشكە مردووەكە دەدرێو لە كۆی مەسەلەكان بەشیان هەر دەبێتەوە

چوار، ئەم دووانەش لە یەکەمەکە هیچیان نەگرتبو؟ چونکە لە یەکەمەکەدا هۆیەکی میرات نەگرتن هەبوە، هەروەك لە (نهاية)و (مغنى)دا فەرموویانە.

**وێنەی(تَبَايُن)**: ژنێكو سێ کوڕو کیژێك، ئینجا پێش بەشکردنیمیراتەکە کیژەکە مرد، هەر ئەو میراتگرانەی تازەی لە پاش بەجێمان، بەلاّم لە دووەمەکەدا ژنەکە دەبێتە دایکی کیژە مردووەکەو سێ کوڕەکانیش دەبنە برای کیژە مردووەکە، جا مەسەلەییەکەمەکە لە هەشتە، مەسەلەیدووەمەکەش لە شەشە، بەلاّم لە هەژدە ساغ دەبێتەوە: بەشی کیژە مردووەکە لە مەسەلەکەییەکەم تەنها یەك بوو، واتە: بەشی کیژە مردووەکە لەگەلّ مەسەلە دووەمەکەی خۆی-کە هەژدەیە- ( مُتَبَاين)ن، کەوابو: تەواوی مەسەلەکەی دووەم-کە هەژدەیە- لە تەواوی مەسەلەی یەکەم دەدرێ-کە هەشتە-، لە سەدو چلو چوار ساغ دەبێتەوە: ژنەکە لە یەکەمەکە یەکی هەبو و لە هەژدەکە دەدرێو لە کۆی هەردوو مەسەلەکان بەشی دەبێتە هەژدە، هەم لە دووەمەکەش بە دایکایەتی سێی هەبو و لە بەشی کیژەمردووەکە دەدرێ -کە یەکە- ئەمجارەش لە کۆی هەردوو مەسەلەکان بەشی هەر دەبێتە سێ، هەر کوڕێکیش لە سێ کوڕەکان لە یەکەمەکە دووی هەبو و لە هەژدەکە دەدرێو لە کۆی هەردوو مەسەلەکان بەشی هەر یەکێك دەکاتە سیو شەش، هەم لە دووەمەکەش بە برایەتی هەر یەکەو پێنجی هەبو و لە بەشی کیژەمردووەکە دەدرێ-کە یەکە-، ئەمجارەش بەشی هەر یەکێکیان لە کۆی هەردوو مەسەلەکان هەر دەکاتە پێنج.

ئینجا بزانە: ئەگەر میراتگرێکی سێیەمیش مرد، ئەو کاتە ئەو ژمارەیەی هەردوو مەسەلەکانی لێ ساغ بونەتەوە، وەك مەسەلەیەکییەکەم دادەندرێو مەسەلەکەی مردووەکەیسێیەمیش وەك مەسەلەکەیدووەم دادەندرێ، کەواتە: ئەگەر بەشی مردووەکەیسێیەم-کە لە کۆی یەکەمەکەو دووەمەکە گرتبوی- بە سەر مەسەلەکەی سێیەمدا بەش دەبو، ئەوە ئاسانە، بەلاّم ئەگەر بەش نەدەبو، تەماشابکە: ئەگەر بەشی سێیەمەکەو مەسەلە سێیەمەکە (مُتَبَاين) بون، ئەوە تەواوی سێیەمەکە لە کۆی یەکەمەکەو دووەمەکە بدە، وە ئەگەر بەشی سێیەمەکەو مەسەلە سێیەمەکە (مُتَوَافِق) بون، ئەو کاتە (وِفْق)ی سێیەمەکە لە کۆی یەکەمەکەو دووەمەکە بدە، ئینجا لە هەردوو حالّەتدا کۆی لێدانەکە گەیشتە کام ژمارە، ئەوە لەم ژمارەیە هەرسێکیان ساغ دەبنەوە.

ئینجا هەر میراتگرێك لە کۆی یەکەمەکەو دووەمەکە بەشە میراتێکی هەبێ، ئەوە کە وەریدەگرێ: لە (وِفْق)ی سێیەمەکە دەدرێ-ئەگەر (مُتَوَافِق) بوبێ-، یان لە تەواوی سێیەمەکە دەدرێ -ئەگەر (مُتَبَاين) بوبێ- وە هەر میراتگرێکیش لە سێیەمەکە بەشی هەبێ، ئەوە کە وەریدەگرێ لە تەواوی بەشی مردووەکەیسێیەم دەدرێ: کە لە

مەسەلەکانیتر گرتبوی، یان لە (وِفقَ)ی بەشی مردووەکەیسێیەم دەدرێ ئەگەر (تَوافُق) هەبێ. جا ئەگەر مردوویکیچوارەمیش بمرێ، چوارەمەکە بە دووەم دادەنرێ...ئیتر هەر بەو جۆرە ڕەفتار بکە، هەروەك لە (الانوار)و (مغنی)دا ڕوون کراوەتەوە.

**﴿ پاشکۆ: لەبارەی چۆنیەتی بەشکردنی میرات بەگوێرەی بەشەمیراتەکان ﴾**

ئەم باسە زۆر گرنگەو بەرهەمی زانستیمیراتە، جا ئەگەر میراتەکە، پارە بوو، یان ئەو جۆرە شتانە بون: کە ئەندازەیان وەکو یەکترییە، ئەوە یەکسەر بە یەکێك لەو ڕێگایانەی داهاتوو بەش دەکرێ، ئەگەر نا: ئەو کاتە میراتەکە دەقرسێندرێو بە پارە نرخی بۆ دیاری دەکرێ، ئینجا بە یەکێك لەو ڕێگایانەیداهاتوو بەش دەکرێ، هەروەك لە (الانوار)و (حاشیةالبقري)دا ڕوون کراونەوە:

**ڕێگایەکەم:** بەشەمیراتی گشت میراتگرێك-کە لە مەسەلەکە گرتویەتی- لە هەموو میراتەکە بدە، ئینجا کۆی لێدانەکە گەیشتە کام ژمارە، ئەو ژمارەیە بە سەر مەسەلەکەدا بەش بکە، لەو بەشکردنە چەند دەرچوو، ئەوە بەشی میراتگرەکەیە:

**بۆ وێنە:** میراتگرەکان دایكو ژنێكو مامێك بون، میراتەکەش سەد دینار بوو، ئەوە مەسەلەکە لە دوانزەیە: سێ بۆ ژنەکەیە، چوار بۆ دایکەکەیە، پێنج بۆ مامەکەیە، ئینجا سێیەکەی ژنەکە لە سەد دینارەکە بدە دەگاتە سێسەد، بە سەر دوانزەکەی مەسەلەکەدا بەشی بکە: بیستو پێنج دەردەچێ، کەواتە: بەشی ژنەکە لەو سەد دینارە بیستو پێنج دینارە، ئەمجارەش چوارەکەی دایکەکە لە سەد دینارەکە بدە دەگاتە چوارسەد، بە سەر دوانزەکەدا بەشی بکە: سیو سێو سێیەکێك دەردەچێ، کەواتە: بەشی دایکەکەش سیوسێ دینارو سێیەکە دینارێکە، ئەمجارەش پێنجەکەی مامەکە لە سەد دینارەکە بدە دەگاتە پێنجسەد، بە سەر دوانزەکەدا بەشی بکە: چلویەكو دووسێیەك دەردەچێ، کەواتە: بەشی مامەکەش چلو یەك دینارو دووسێیەکە دینارە.

**ڕێگایدووەم:** بەشی هەر میراتگرێك-کە لە مەسەلەکە گرتویەتی- نیسبەت بدە لای مەسەلەکە، ئینجا بەگوێرەی ئەو نیسبەتە لە میراتەکە وەربگرەو بیدە میراتگرەکە:

**بۆ وێنە:** لە مەسەلەکەیڕابردوودا: سێیەکەی ژنەکە چوارێکی مەسەلەکەیە، کەوابو: چوارێکی سەد دینارەکە بیستو پێنج دینارەو بیدە ژنەکە، چوارەکەی دایکەکەش سێیەکی مەسەلەکەیە، کەوابو: سێیەکی سەد دینارەکە سیوسێ دینارو سێیەکە دینارێکەو بیدە دایکەکە، پێنجەکەی مامەکەش چوارێکێكو شەشێکێکی مەسەلەکەیە، کەوابو: چوارێکی سەد دینارەکە-کە بیستو پێنج دینارە- لە گەڵ شەشێکی سەد دینارەکە-کە شانزە دینارو دووسێیەکە دینارە- دەکاتە چلو یەك دینارو دووسێیەکە دینار، بیدە مامەکە، والحمد لله تعالى.

## (كِتَابُ الْوَصَايَا)

تَصِحُّ وَصِيَّةُ كُلِّ مُكَلَّفٍ حُرٍّ وَإِنْ كَانَ كَافِرًا وَكَذَا مَحْجُورٌ عَلَيْهِ بِسَفَهٍ عَلَى الْمَذْهَبِ، لاَ مَجْنُونٍ وَمُغْمًى عَلَيْهِ وَصَبِيٍّ.

---

### ﴿ كِتَابُ الْوَصَايَا: ئەمەیە پەڕتوکی وەسیێتەکان ﴾

وەسیێت: بەخشینی مافێکە کە لە دوای‌مردن جێبەجێ بکرێ. جا بزانە: لە سەرەتای ئیسلامدا وەسیێتکردنی بە ماڵ بۆ دایکو باوکو خزمان واجب بوو، ئینجا بە ئایەتەکانی میرات واجببوونەکەی (نَسْخ) بۆوە، بەڵام بڕیاری سوننەتیی وەسیێت لە سێیەکی ماڵدا هەر بەردەوام ماوەتەوە، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿مَا حَقُّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ لَهُ شَيْءٌ يُرِيدُ أَنْ يُوصِيَ فِيهِ يَبِيتُ لَيْلَتَيْنِ إِلاَّ وَوَصِيَّتُهُ مَكْتُوبَةٌ عِنْدَهُ﴾ رواه‌الشيخان، باش نیە بۆ مرۆڤی موسوڵمان شتێکی هەبێو بیەوێ لە دوای مردن بیکاتە خێر، دوو شەوی بە سەردا بڕواو وەسیێت نەکا، تەنها وا باشە وەسیێتەکەی لە لای‌خۆی نوسرابێ.

ئینجا بزانە: ئەگەر مرۆڤ مافێکی خوای‌گەورەی لە سەر بوو، یان مافێکی ئادەمیزادانی لە سەر بوو، یان شتێکی کەسێکی‌تری لە لا بوو، لەو حاڵەتانەدا وەسیێتکردن –بۆ دانەوەی ئەو مافە– واجبە ئەگەر هیچ کەسێك نەبێ ئەو مافە ئاشکرا بکا، هەروەك لە (تحفة)و (مغنی)دا فەرموویانە.

دیسان بزانە: حەرامە وەسیێت بۆ ئەو جۆرە کەسە بکا: کە بزانێ لە تاوانکاری سەرفی دەکا، هەروەها حەرامە: بە زێتر لە سێیەکی ماڵی‌خۆی وەسیێت بکا ئەگەر مەبەستی بێبەشکردنی میراتگرەکانی بێ.

جا ئەوەش بزانە: وەسیێت بۆ خزمو کەسەکانی‌خۆی خێری زۆرترە لە وەسیێت بۆ بێگانە. هەروەها خێرکردن لە حاڵەتی‌زیندووەتی‌دا خێری زۆرترە لە خێرکردنی دوای‌مردن، هەروەك هەر دووکیان لە چەند حەدیسێکی(صحیح)دا هاتونو لە (تحفة)و (مغنی)شدا فەرموویانە.

جا بزانە: وەسیێت لەم ڕوکنانە پێك دێ: (اَلْمُوصِي)=وەسیێتکەر. (اَلْمُوصَى لَهُ)=وەسیێت بۆ کراو. (اَلْمُوصَى بِهِ)=وەسیێت پێکراو. (اَلصِّيغَة)=گوتەی وەسیێتکردن.

ڕوکنی‌یەکەم: وەسیێتکەر (تَصِحُّ وَصِيَّةُ كُلِّ مُكَلَّفٍ حُرٍّ) دروستە: وەسیێتکردنی گشت مرۆڤێك کە بالغو عاقڵ بێو ئازاد بێو زۆرلێکراو نەبێ، واتە: وەسیێتەکە بە خۆشی خۆی بێ (وَإِنْ كَانَ كَافِرًا) هەرچەند کافریش بێ (وَكَذَا مَحْجُورٌ عَلَيْهِ بِسَفَهٍ) هەروەها وەسیێتی ئەو کەسەش دروستە کە لە دەستکاری‌کردنی ماڵی‌خۆی قەدەغە کرابێ، بە هۆی بەفیڕۆدانی ماڵی‌خۆی (عَلَى الْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی‌مەزهەب.

(لاَ مَجْنُونٍ وَمُغْمًى عَلَيْهِ) بەڵام وەسیێتی شێتو لە هۆشچوو دروست نیە، هەم (وَصَبِيٍّ) وەسیێتی منداڵیش دروست نیە، چونکە ئەوانە بایەخ بە گوتەکەیان نادرێ.

وَفِي قَوْلٍ تَصِحُّ مِنْ صَبِيٍّ مُمَيِّزٍ، وَلاَ رَقِيقٍ، وَقِيلَ: إِنْ عَتَقَ ثُمَّ مَاتَ صَحَّتْ، وَإِذَا أَوْصَى لِجِهَةٍعَامَّةٍ فَالشَّرْطُ أَنْ لاَ تَكُونَ مَعْصِيَةً كَعِمَارَةِ كَنِيسَةٍ، أَوْ لِشَخْصٍ فَالشَّرْطُ أَنْ يُتَصَوَّرَ لَهُ الْمِلْكُ، فَتَصِحُّ لِحَمْلٍ وَتَنْفُذُ إِنْ انْفَصَلَ حَيًّا

---

بەلام (وَفِي قَوْلٍ تَصِحُّ مِنْ صَبِيٍّ مُمَيِّزٍ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: وەسیێتكردنی منداڵیفامیدە دروستە (وَلاَ رَقِيقٍ) هەروەها وەسیێتی كۆیلەش دروست نیە، بەلام (وَقِيلَ: إِنْ عَتَقَ ثُمَّ مَاتَ صَحَّتْ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: ئەگەر كۆیلەكە پێش مردنی ئازاد كرابێ، وەسیێتەكەی دروست دەبێ.

ڕوكنیدووەم: وەسیێت بۆكراو (وَإِذَا أَوْصَى لِجِهَةٍ عَامَّةٍ) هەر كاتێك وەسیێتی كرد بۆ ڕووێكی گشتی، ئەوە (فَالشَّرْطُ) مەرجی دروستبوونی وەسیێتەكە ئەمەیە: (أَنْ لاَ تَكُونَ مَعْصِيَةً) ڕووەكە گوناهكاری نەبێ (كَعِمَارَةِ كَنِيسَةٍ) وەكو دروستكردنو نوێكردنەوەی كەنێسەو سینەماو مەیخانەو چاپكردنی تەوراتو ئینجیلو گشت پەڕتووكەكانی زانستی حەرامو هەر جۆرە حەرامێكیترو ناپەسندێكیتر.

ئینجا بزانە: بۆ دروستبوونی وەسیێت مەرج نیە ناوی وەسیێت بۆكراوەكە بڵێ، كەوابو: ئەگەر تەنها گوتی: سێیەكی ماڵم وەسیێت بێ. واتە هیچ وەسیێت بۆكراوێكیشی دیاری نەكرد، ئەوە دەبێتە وەسیێتو دەدرێتە گەداو هەژاران، هەروەها ئەگەر بڵێ: سێیەكی ماڵم وەسیێت بێ بۆ خوای گەورە. ئەوەش دروست دەبێو لە ڕووەكانی خێرو چاكە سەرف دەكرێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

(أَوْ لِشَخْصٍ) یان ئەگەر وەسیێتی كرد بۆ مرۆڤێك، واتە: بۆ دیاركراوێك، ئەو كاتە (فَالشَّرْطُ) مەرجی دروستبوونی وەسیێتەكە ئەمەیە: گوناهكاریو ناپەسندیی تێدا نەبێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە، هەم (أَنْ يُتَصَوَّرَ لَهُ الْمِلْكُ) دیاركراوەكە– لە كاتی وەسیێتكردنەكەدا– بگونجێ ببێتە خاوەن مڵك، كەواتە: وەسیێت دروست نیە: بۆ مردوو و بۆ ئاژەڵو بۆ شتی نەبوو، وەك بڵێ: وەسیێت بێ بۆ كوڕەی ئەم ئافرەتە كە لەمەودوا پەیدا دەبێ. یان بۆ مزگەوتێك كە لەمەودوا دروست دەكرێ. ئەوانە دروست نینە.

بەلام ئەگەر نەبووەكە بكرێتە پابەندیهەبووێك، وەك بڵێ: وەسیێت بێ بۆ منداڵەكانی فلانكەس: ئەوانەی ئێستایو ئەوانەی لەمەودواش دەبن. یان بڵێ: وەسیێت بێ بۆ مزگەوتی ئێستای ئەم گوندەو بۆ مزگەوتەكانیتریش كە لەمەودوا لەم گوندەدا دروست دەكرێن. ئەو كاتە وەسیێتەكە دروست دەبێ، هەروەك لە(تحفة)و (نهاية)دا ڕوون كراوەتەوە.

ئینجا (فَتَصِحُّ لِحَمْلٍ) وەسیێت بۆ كۆرپەی ناوزگ دروست دەبێ: كە لە كاتی وەسیێتەكەدا هەبێ (وَتَنْفُذُ) وەسیێتەكەش جێبەجێ دەبێ (إِنْ انْفَصَلَ حَيًّا) بەو مەرجەی كۆرپەكە:

وَعُلِمَ وُجُودُهُ عِنْدَهَا بِأَنْ انْفَصَلَ لِدُونِ سِتَّةِ أَشْهُرٍ، فَإِنْ انْفَصَلَ لِسِتَّةِ أَشْهُرٍ فَأَكْثَرَ وَالْمَرْأَةُ فِرَاشُ زَوْجٍ أَوْ سَيِّدٍ لَمْ يَسْتَحِقَّ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ فِرَاشًا وَانْفَصَلَ لِأَكْثَرَ مِنْ أَرْبَعِ سِنِينَ فَكَذَلِكَ أَوْ لِدُونِهِ اسْتَحَقَّ فِي الأَظْهَرِ، وَإِنْ أَوْصَى لِعَبْدٍ فَاسْتَمَرَّ رِقُّهُ فَالْوَصِيَّةُ لِسَيِّدِهِ، وَإِنْ عَتَقَ قَبْلَ مَوْتِ الْمُوصِي فَلَهُ، وَإِنْ عَتَقَ بَعْدَ مَوْتِهِ ثُمَّ قَبِلَ بُنِيَ عَلَى أَنَّ الْوَصِيَّةَ بِمَ تُمْلَكُ؟

---

بە زیندوویی لە دایکی جیا ببێتـەوەو گیانیجێگیربووشـی تێدابێ (وَعُلِمَ وُجُودُهُ عِنْدَهَا) بشزاندرێ لە کاتی وەسێتکردنەکەدا کۆرپەکە هەبووە: (بِأَنْ انْفَصَلَ لِدُونِ سِتَّةِ أَشْهُرٍ) وەك لە کاتیوەسێتکردنەوە تا ماوەیەکیکەمتر لە شەش مانگ کۆرپەکە لە دایکی جیا ببێتـەوە، هەر چەند ژنە ئاوسەکەش سەرجێیی کرابێ.

(فَإِنْ انْفَصَلَ لِسِتَّةِ أَشْهُرٍ فَأَكْثَرَ) جا ئەگەر لە کاتیوەسێتکردنەوە بـە مـاوەی شـەش مـانگ، یـان زیـاتر کۆرپەکـە لـە دایکـی جیـابۆوەو (وَالْمَرْأَةُ فِرَاشُ زَوْجٍ أَوْ سَيِّدٍ) ژنـە ئاوسـەکەش مێردێـك، یـان گەورەیـەك سـەرجێیی دەکـرد، ئـەو کاتـە (لَمْ يَسْتَحِقَّ) مـافی وەسـێت پێکراوەکەی نیە، چونکە دەگونجێ لە دوایوەسێتکردن لەم مێردە پەیدا بوبێ.

(فَإِنْ لَمْ تَكُنْ فِرَاشًا) جا ئەگەر ئافرەتەکە هیچ سەر جێیی نەدەکراو (وَانْفَصَلَ لِأَكْثَرَ مِنْ أَرْبَعِ سِنِينَ) لە کاتیوەسێتکردنەوە لە ماوەی زیاتر لە چوار ساڵان کۆرپەکـە لـە دایکـی جیـا بۆوە (فَكَذَلِكَ) ئەوەش وەك ئەویتر مافی وەسێت پێکراوەکەی نیە.

بەڵام (أَوْ لِدُونِهِ) ئەگەر لە ماوەی کەمتر لە چوار ساڵ جیابۆوەو سەرجێییشـی نـەدەکرا، ئـەو کاتە (اسْتَحَقَّ فِي الأَظْهَرِ) مافی وەسێت پێکراوەکەی هەیە، لە فەرموودەی بەهێزتردا، کەواتـە: سەرپەرشـتکارەکەی وەسـێتەکەی بـۆ قبـوڵ دەکـا، هـەروەك لـە زۆریەیسەرچـاوەکاندا فەرموویانە.

(وَإِنْ أَوْصَى لِعَبْدٍ) ئەگـەر وەسـێتی کـرد بـۆ کۆیلەیـەك (فَاسْتَمَرَّ رِقُّهُ) ئینجـا تـا مردنـی وەسـێتکەرەکە کۆیلایەتیەکـەی بـەردەوام بـوو، ئـەوە (فَالْوَصِيَّةُ لِسَيِّدِهِ) وەسێتەکە بـۆ گەورەکەیـەتی، بـەڵام (وَإِنْ عَتَقَ قَبْلَ مَوْتِ الْمُوصِي) ئەگـەر کۆیلەکـە پـێش مردنـی وەسێتکەرەکە ئازاد بوو، ئەو کاتە (فَلَهُ) وەسێتەکە بۆ کۆیلە ئازادکراوەکەیە.

(وَإِنْ عَتَقَ بَعْدَ مَوْتِهِ) ئەگـەر کۆیلەکـە لـە دوای مردنیوەسێتکەرەکە ئـازاد بـوو (ثُمَّ قَبِلَ) ئینجا وەسێتەکەی بۆ خۆی قبوڵ کرد، ئەو کاتە (بُنِيَ) مەسەلەکە بنیات دەنـدرێ (عَلَى أَنَّ الْوَصِيَّةَ بِمَ تُمْلَكُ؟) لە سەر ئەوەی ئایا وەسـێتەکە بـە چـی دەبێتـە ملك؟ بـە فـەرموودەی بـەهێزتر: وەسـێتەکە بـە مردنـی وەسـێتکەرەکە دەبێتـە ملکـی وەسـێت بۆکراوەکـە، بـەو مەرجەی قبوڵی بکا، کەوابو: لەم مەسەلەیەشدا وەسێتەکە بۆ گەورەکەیە.

وَإِنْ أَوْصَى لِدَابَّة وَقَصَدَ تَمْلِيكَهَا أَوْ أَطْلَقَ فَبَاطِلَةٌ، وَإِنْ قَالَ لِيُصْرَفَ فِي عَلْفِهَا فَالْمَنْقُولُ صِحَّتُهَا، وَتَصِحُّ لِعِمَارَة مَسْجِد وَكَذَا إِنْ أَطْلَقَ فِي الأَصَحِّ وَتُحْمَلُ عَلَى عِمَارَتِه وَمَصَالِحِه، وَلِذِمِّيٍّ وَكَذَا حَرْبِيٌّ وَمُرْتَدٌّ فِي الأَصَحِّ، وَقَاتِلٍ فِي الأَظْهَرِ، وَلِوَارِثٍ -فِي الأَظْهَرِ- إِنْ أَجَازَ بَاقِي الْوَرَثَة، وَلاَ عِبْرَةَ بِرَدِّهِمْ وَإِجَازَتِهِمْ فِي حَيَاةِ الْمُوصِي،

---

(وَإِنْ أَوْصَى لِدَابَّةٍ) ئەگەر وسێتی كرد بۆ وولاغێكو (وَقَصَدَ تَمْلِيكَهَا) مەبەستیشی ئەوە بوو: بیكاتە ملكی وولاغەكە (أَوْ أَطْلَقَ) یان هیچ مەبەستێكی نەبو، ئەوە (فَبَاطِلَةٌ) وەسێتەكە بەتاڵە، بەلام (وَإِنْ قَالَ) ئەگەر وەسێتكەرەكە گوتی: (لِيُصْرَفَ فِي عَلْفِهَا) وەسێت پێكراوەكە لە ئالیكدانی وولاغەكە سەرف بكرێ، ئەوە (فَالْمَنْقُولُ صِحَّتُهَا) بە فەرموودەی ئاشكرا: وەسێتەكە دروست دەبێو لە ئالیكدانی وولاغەكە سەرف دەكرێ.

ئینجا بزانە: دروستە وەسێت بە مەرجێكەوە هەڵبواسرێ، وەك بڵێ: ئەم شتەم وەسێت بێ بۆ فلانكەس ئەگەر لە سەفەرەكەی بگەڕێتەوە. یان بڵێ: ئەگەر ئەم شتە بووە ملكی من ئەوە وەسێت بێ بۆ فلانكەس. یان بڵێ: ئەو شتەم وەسێت بێ بۆ فلانكەس ئەگەر بەم نەخۆشیەم بمرم. واتە: جیاوازی نیە مەرجەكە: لە ژیانی وەسێتكەرەكەدا بێ، یان لە دوای مردن، هەروەك لە (تحفة)و (الشرواني)دا ڕوون كراوەتەوە.

(وَ) هەروەها (تَصِحُّ لِعِمَارَةِ مَسْجِدٍ) وەسێت دروست دەبێ بۆ نوێكردنەوەو چاككردنەوەی مزگەوت (وَكَذَا إِنْ أَطْلَقَ) هەروەها ئەگەر تەنها بڵێ: وەسێت بێ بۆ ئەم مزگەوتە. ئەوەش هەر دروست دەبێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی راستتردا، كەوابو: (وَتُحْمَلُ عَلَى عِمَارَتِهِ وَمَصَالِحِهِ) وەسێتەكە دەهێندرێتە سەر چاككردنەوەو بەرژەوەندیەكانی مزگەوتەكە، جا سەرپەرشتكاری مزگەوت لە بەرژەوەندیە گرنگترەكان، ئینجا گرنگەكان سەرفی دەكا.

(وَلِذِمِّيٍّ) هەروەها وەسێت دروستە بۆ كافری پەیمان لە ئەستۆ (وَكَذَا حَرْبِيٌّ وَمُرْتَدٌّ) هەروەها بۆ كافری جەنگیو لەدین وەرگەڕاویش دروست دەبێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی راستتردا (وَقَاتِلٌ) وەسێت بۆ مرۆڤكوژەكەش دروست دەبێ، واتە: بۆ ئەو كەسەی وەسێتكەرەكەی كوشتوە (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا.

(وَ) هەروەها وەسێت دروست دەبێ (لِوَارِثٍ) بۆمیراتگریخۆی (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا (إِنْ أَجَازَ بَاقِي الْوَرَثَةِ) بەو مەرجەی میراتگرەكانیتر ڕێگە بدەنو بیڕوێنن، چونكە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لاَ وَصِيَّةَ لِوَارِثٍ إِلاَّ أَنْ يُجِيزَ الْوَرَثَةُ﴾ رواه الدارقطني والبيهقي بإسناد صالح، وەسێت بۆ میراتگر دروست نیە، مەگەر میراگرەكانیتر ڕێگە بدەن. ئینجا بزانە: (وَلاَ عِبْرَةَ بِرَدِّهِمْ وَإِجَازَتِهِمْ فِي حَيَاةِ الْمُوصِي) لە حاڵەتی زیندووەتی وەسێتكەرەكەدا: نە ڕەدكردنەوەو نە ڕێگەدانی میراتگرەكانیتر ڕەچاو ناكرێو ڕەفتار

وَالْعِبْرَةُ فِي كَوْنِهِ وَارِثًا بِيَوْمِ الْمَوْتِ، وَالْوَصِيَّةُ لِكُلِّ وَارِثٍ بِقَدْرِ حِصَّتِهِ لَغْوٌ، وَبِعَيْنٍ هِيَ قَدْرُ حِصَّتِهِ صَحِيحَةٌ وَتَفْتَقِرُ إِلَى الإِجَازَةِ فِي الأَصَحِّ،

---

به هیچێکیان ناکرێ، بەڵکو ڕەدکردنەوەکەو ڕێگەدانەکە لە دوای مردنی وەسێتکەرەکە ڕەچاو دەکرێن.

(وَالْعِبْرَةُ فِي كَوْنِهِ وَارِثًا بِيَوْمِ الْمَوْتِ) هەروەها میراتگرابەتی وەسێت بۆکراوەکەش هەر بە کاتی مردنی وەسێتکەرەکە ڕەچاو دەکرێ، کەواتە: ئەگەر وەسێتی بۆ برایەکیخۆی کرد، ئینجا وەسێتکەرەکە-پێش مردنیخۆی- کوڕێکی بوو، ئەو کاتە وەسێتەکە-بێئیزندانی میراتگرەکان- دروست دەبێ، چونکە لە کاتی مردنی وەسێتکەرەکەدا ئەو برایە بە هۆی کوڕەکە لە میراتگرایەتی قەدەغە کراوەو بە بێگانە دادەندرێ.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر لە نەخۆشیمردنیدا شتێك وەقف بکاتە سەر میراتگرەکەی، یان پێی ببەخشێ، یان لە قەرزێك گەردەنی ئازاد بکا، ئەوانەش گشتی وەکو وەسێتی بۆ میراتگرە، واتە: ئەگەر میراتگرەکان ڕازی نەبن هیچیان جێبەجێ ناکرێن، بەڵام ئەگەر لە حاڵەتیساغیدا ئەوشتانە بکا، ئەوە گشتی جێبەجێ دەبنو گوناهباریش نابێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)و حاشیەکانیاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَالْوَصِيَّةُ لِكُلِّ وَارِثٍ) وەسێتکردن بۆگشت میراتگرێکی خۆی (بِقَدْرِ حِصَّتِهِ) بە ئەندازەی بەشە میراتەکەی خۆی: وەك سێیەكو نیوەو شەشێك...هتد (لَغْوٌ) پوچەڵەو ڕەفتاری پێ ناکرێ، چونکە بە بێوەسێتکردنیش مافی ئەو بەشەی هەیە.

بەڵام (وَبِعَيْنٍ هِيَ قَدْرُ حِصَّتِهِ) وەسێتکردن بۆ گشت میراتگرێکیخۆی بە خودی شتێك کە بە ئەندازەی بەشە میراتەکەی خۆی بێ (صَحِيحَةٌ) دروستە، وەك وەسێت بکا: ئەم خانووەی بۆ ئەم کوڕەی بێ، خانووەکەیتریشی بۆ کوڕەکەیتری بێ، ئۆتۆمبیلەکەشی بۆ کیژەکەی بێ، ئەوە دروستە، بەو مەرجەی نرخی هەردوو خانووەکان بە ئەندازەی یەکتری بێو نرخی ئۆتۆمبیلەکەش بە ئەندازەی نیوەی خانووێك بێ، بەڵام (وَتَفْتَقِرُ إِلَى الإِجَازَةِ) ئەم وەسێتەش پێویستی بە ڕێگەدانی گشت میراتگرەکان هەیە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستردا، چونکە مەبەستەکان لەو جۆرە شتانەدا لێك جیاوازن.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر شتێکی کردە وەسێت بۆ گەداو هەژاران، ئەوە دروست نیە هیچ لە وەسێت پێکراوە بدرێتە میراتگرەکانی وەسێتکەرەکە، هەر چەند هەژاریش بن، هەروەها بۆ سەروەسێتەکەش دروست نیە: هیچ بەشێك لە وەسیت پێکراوەکە بۆ خۆی دابنێ هەرچەند وەسێتکەرەکەش ئیزنی دابێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا لێرەو لە باسی (سەروەسێت)دا فەرموویانە.

وَتَصِحُّ بِالْحَملِ وَيُشْتَرَطُ انْفِصَالُهُ حَيًّا لِوَقْتٍ يُعْلَمُ وُجُودُهُ عِنْدَهَا، وَبِالْمَنَافِعِ وَكَذَا بِثَمَرَةٍ أَوْ حَمْلٍ سَيَحْدُثَانِ فِي الأَصَحِّ، وَبِأَحَدِ عَبْدَيْهِ وَبِنَجَاسَةٍ يَحِلُّ الإِنْتِفَاعُ بِهَا كَكَلْبٍ مُعَلَّمٍ وَزِبْلٍ وَخَمْرٍ مُحْتَرَمَةٍ، وَلَوْ أَوْصَى بِكَلْبٍ مِنْ كِلاَبِهِ أُعْطِيَ أَحَدَهَا، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ كَلْبٌ

---

ڕوكنیسێیەم: وەسێت پێكراو، مەرجە وەسێت پێكراوەكە: قبوڵی گواستنەوە بكاو سود لێوەرگرتنیشی حەڵاڵ بێ، هەرچەند نەزانراویش بێ، كەوابو: (وَتَصِحُّ بِالْحَمْلِ) وەسێتكردن بەم بێچووەی ناو زگ -كە لە كاتی وەسێتكردنەكەدا هەبێ- دروست دەبێ، هەروەها بە گشت شتێكی نەزانراویتریش دروست دەبێ: وەك شیری ناو گوانو خوریی سەر پشتی ئاژەڵ، هەروەك لە (مغني)دا فەرموویەتی.

(وَيُشْتَرَطُ) بۆ دروستبوونی وەسێت بەم بێچووەی ناو زگ بە مەرج دادەنرێ: (إِنْفِصَالُهُ حَيًّا) بە زیندوویی لە دایكی جیا ببێتەوە (لِوَقْتٍ يُعْلَمُ وُجُودُهُ عِنْدَهَا) لە كاتێكیوەها: كە بزاندرێ لە كاتی وەسێتكردنەكەدا لە ناو زگدا هەبوە.

(وَبِالْمَنَافِعِ) هەروەها وەسێت بە سودەكانی حەڵاڵیش بە تەنهایی دروستە، هەرچەند خودی سودلێوەرگیراوەكەش هی كەسێكیتر بێ، وەك بڵێ: سودی ئەم خانووەم كردە وەسێت بۆ فڵانكەس. ئەوە لە دوایمردن خودیخانووەكە بۆ میراتگرەكانەو سودەكەشی بۆ وەسێت بۆكراوەكەیە، بەڵام میراتگرەكان دەتوانن سودەكە بە كرێ بگرن، یان بە حەڵاڵكردن وەریبگرن، یان بە ڕێگایەكیتری شەرعی لە گەڵ وەسێت بۆكراوەكە پێك بێن، هەروەك لە (تحفة)و (مغني)دا فەرموویانە.

(وَكَذَا) هەروەها وەسێت بە شتی نەبوو دروستە: وەك وەسێت بكا (بِثَمَرَةٍ) بە میوەیەكی وەها (أَوْ حَمْلٍ) یان كۆرپەیەكی وەها: كە (سَيَحْدُثَانِ) لە مەودوا پەیدا دەبن، واتە: لە كاتی وەسێتكردنەكەدا نەبن (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەیڕاستتردا.

(وَ) هەروەها وەسێت بە شتی دیارنەكراویش دروستە: وەك وەسێت بكا (بِأَحَدِ عَبْدَيْهِ) بە یەكێك لەو دوو كۆیلانەی، یان بە یەكێك لەو دوو مەڕانەی، یان بە یەكێك لەو چوار پەرتووكانەی، جا لەم حاڵەتەدا میراتگرەكەی یەكێك بۆ وەسێتەكە دیاری دەكا.

(وَبِنَجَاسَةٍ يَحِلُّ الإِنْتِفَاعُ بِهَا) هەروەها وەسێت دروستە بە پیسیەكی وەها: كە سودلێوەرگرتنی حەڵاڵ بێ: (كَكَلْبٍ مُعَلَّمٍ) وەك سەگێكی فێرە ڕاو كراو (وَزِبْلٍ) هەم وەكو زبڵو جیقنەو پیستەیمردارو (وَخَمْرٍ مُحْتَرَمَةٍ) وەكو شەڕابێكی ڕێزدار: كە بۆ كردنە سركە گوشرابێو بەخۆی بوبێتە شەڕاب.

(وَلَوْ أَوْصَى بِكَلْبٍ مِنْ كِلاَبِهِ) ئەگەر وەسێتی كرد بە سەگێك لە سەگەكانی خۆی، ئەوە (أُعْطِيَ أَحَدَهَا) یەكێكیانی دەدرێتە وەسێت بۆكراوەكە (فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ كَلْبٌ) جا ئەگەر لە

لَغَتْ، وَلَوْ كَانَ لَهُ مَالٌ وَكِلاَبٌ وَوَصَّى بِهَا أَوْ بِبَعْضِهَا فَالأَصَحُّ نُفُوذُهَا وَإِنْ كَثُرَتْ وَقَلَّ الْمَالُ، وَلَوْ أَوْصَى بِطَبْلٍ وَلَهُ طَبْلُ لَهْوٍ وَطَبْلٌ يَحِلُّ الإِنْتِفَاعُ بِهِ كَطَبْلِ حَرْبٍ وَحَجِيجٍ حُمِلَتْ عَلَى الثَّانِي، وَلَوْ أَوْصَى بِطَبْلِ اللَّهْوِ لَغَتْ إِلاَّ إِنْ صَلَحَ لِحَرْبٍ أَوْ حَجِيجٍ.
(فَصْلٌ) يَنْبَغِي أَنْ لاَ يُوصِيَ بِأَكْثَرَ مِنْ ثُلُثِ مَالِهِ،

---

کاتی مردنیدا هیچ سەگێکی نەبێ (لَغَتْ) وەسیێتەکە پووچەڵ دەبێتەوە (وَلَوْ كَانَ لَهُ مَالٌ وَكِلاَبٌ) ئەگەر وەسیێتکەرەکە ماڵی هەبوو و هەندێك سەگیشی هەبوونو (وَوَصَّى بِهَا أَوْ بِبَعْضِهَا) وەسیێتی کرد بە هەمو سەگەکان، یان بە هەندێکیان، ئەوە (فَالأَصَحُّ نُفُوذُهَا) بە فەرموودەی ڕاستتر: وەسیێتەکە جێبەجێ دەبێ (وَإِنْ كَثُرَتْ وَقَلَّ الْمَالُ) هەرچەند سەگەکانیش زۆر بنو ماڵەکەش کەم بێ، چونکە ئەوە مەرجە: دوو هەندی وەسیێت پێکراوەکە بۆ میراتگرەکان بمێنێتەوە، واتە: سەگیش بە ماڵ دانانرێ.
(وَلَوْ أَوْصَى بِطَبْلٍ) ئەگەر وەسیێتی کرد بە تەپڵێك (وَلَهُ طَبْلُ لَهْوٍ) لەو حاڵەتەشدا تەپڵێکی گەمەکردنی ناشەرعیی هەبوو، هەم (وَطَبْلٌ يَحِلُّ الإِنْتِفَاعُ بِهِ) تەپڵێکیتریشی هەبوو، کە حەلاڵ بوو سوودی لێوەربگیرێ: (كَطَبْلِ حَرْبٍ وَحَجِيجٍ) وەك تەپڵی جەنگو تەپڵی حاجیەکان، ئەوە (حُمِلَتْ عَلَى الثَّانِي) وەسیێتەکە دەهێندرێتە سەر تەپڵیە حەلاڵەکە، کەوابو: (وَلَوْ أَوْصَى بِطَبْلِ اللَّهْوِ) ئەگەر وەسیێتی کرد بە تەپڵی گەمەی حەرام، یان بە زوڕنا، یان هەر ئامێرێکیتری مۆسیقا، ئەوە (لَغَتْ) وەسیێتەکە پوچەڵ دەبێو دانامەزرێ، چونکە گوناهکارییە (إِلاَّ إِنْ صَلَحَ لِحَرْبٍ أَوْ حَجِيجٍ) مەگەر تەپڵیەکە بۆ جەنگ، یان بۆ حاجیەکان بگونجێ، ئەو کاتە دروستە.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی خێراتەکانی کاتی نەخۆشیی مردن ﴾

(يَنْبَغِي) لە ڕووی سوننەتەوە پێویستە (أَنْ لاَ يُوصِيَ بِأَكْثَرَ مِنْ ثُلُثِ مَالِهِ) بە زیاتر لە سێیەکی ماڵیخۆی وەسیێت نەکا، بەڵکو وەها سونەتە: لە سێیەك کەمتریش بێ ﴿عَنْ سعد بن أبي وقاص ﷺ: مَرِضْتُ عَامَ الْفَتْحِ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ أَأُوصِي بِمَالِي كُلِّهِ؟ قَالَ: لاَ. قُلْتُ: فَثُلُثَيْ مَالِي؟ قَالَ: لاَ. قُلْتُ: فَالشَّطْرِ؟ قَالَ: لاَ. قُلْتُ: فَالثُّلُث؟ قَالَ: اَلثُّلُثُ وَالثُّلُثُ كَثِيرٌ، إِنَّكَ إِنْ تَذَرْ وَرَثَتَكَ أَغْنِيَاءَ خَيْرٌ مِنْ أَنْ تَذَرَهُمْ عَالَةً يَتَكَفَّفُونَ النَّاسَ﴾ رواه الشيخان، لە ساڵی ڕزگارکردنی (مكة)دا نەخۆش کەوتمو گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا هەموو ماڵی خۆم بکەمە خێر؟ فەرمووی: نا. گوتم: دوو بەشی ماڵەکەم بکەمە خێر؟ فەرمووی: نا. گوتم: نیوەی بکەمە خێر؟ فەرمووی: نا. گوتم: سێیەکی بکەمە خێر؟ فەرمووی: سێیەك بکە خێر، سێیەك زۆریشە، چونکە ئەگەر تۆ میراتگرەکانت بە دەوڵەمەندی لە دوای خۆت بهێڵیەوە، باشترە لەوەی هەژارینو دەرۆزە بکەن.

فَإنْ زَادَ وَرَدَّ الْوَارِثُ بَطَلَتْ فِي الزَّائِد، وَإِنْ أَجَازَ فَإجَازَتُهُ تَنفِيذٌ، وَفِي قَوْلٍ عَطِيَّةٌ مُبْتَدَأَةٌ وَالْوَصِيَّةُ بِالزِّيَادَةِ لَغْوٌ، وَيُعْتَبَرُ الْمَالُ يَوْمَ الْمَوْتِ وَقِيلَ يَوْمَ الْوَصِيَّة،

---

(فَإِنْ زَادَ) جا ئەگەر بە زیاتر لە سێیەکی ماڵی خۆی وەسیێتی کرد (وَرَدَّ الْوَارِثُ) میراتگرەکەش ڕازی نەبو و ڕەدی کردەوە، ئەو کاتە (بَطَلَتْ فِي الزَّائِد) وەسیێتەکە لە زیادەکە بە تاڵ دەبێتەوە، واتە: تەنها لە سێیەکەکەدا دروست دەبێ و زیادەکەش دەبێتە میرات بە (إجماع)ی زانایانی ئیسلام، بەڵام (وَإِنْ أَجَازَ) ئەگەر میراتگرەکە ڕازی بوو و ڕێیاندی، ئەوە (فَإجَازَتُهُ تَنْفِيذٌ) ڕێپیاندنەکەی جێبەجێکردنی وەسیێتەکەیە، چونکە ئەو کاتە دەردەکەوێ: وەسیێتەکە لە زیادەکەشدا دروست بووە (وَفِي قَوْلٍ عَطِيَّةٌ مُبْتَدَأَةٌ) لە فەرموودەیەکدا: ڕێپیاندنەکە بەخشینێکی تازەیە لە میراتگرەوە بۆ وەسیێت بۆکراوەکەو (وَالْوَصِيَّةُ بِالزِّيَادَةِ لَغْوٌ) وەسیێت بە زیادەکەش پوچەڵە، چونکە بە هۆی ڕێپیاندنەکە بووەتە بەخشین.

ئینجا بزانە: ئەو میراتگرەی ڕازی دەبێ، مەرجە: بالغ و عاقڵ بێ و دەستکاری ماڵی دروست بێ، جا ئەگەر هەندێك میراتگر ڕازی بون زیادەکەش ببێتە وەسیێت و هەندێکیش ڕازی نەبون، ئەو کاتە بە ئەندازەی بەشی ڕازیبووەکە لە زیادەکەش دەبێتە وەسیێت و هی ڕازینەبووەکەش بەتاڵە، واتە: بە میرات بۆ خۆی دەگەڕێتەوە، هەروەك لە (الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە.

﴿ ئاگاداری ﴾: لێرەدا مەبەست سێیەکی ئەو ماڵەیە: کە لە پاش قەرزدانەوە دەمێنێتەوە، کەواتە: ئەگەر قەرزەکە گشت ماڵی دابگرێتەوە، ئەو کاتەش وەسیێتەکە دادەمەزرێ، بەڵام جێبەجێ ناکرێ، جا ئەگەر خاوەن قەرزەکە گەردەنی ئازاد بکا، یان یەکێك قەرزەکەی لەجیاتی بداتەوە، ئەو کاتە جێبەجێ دەکرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

ئینجا (وَيُعْتَبَرُ الْمَالُ يَوْمَ الْمَوْتِ) ماڵە وەسیێت پێکراوەکەش لە کاتی مردنی وەسیێتکەرەکە ڕەچاو دەکرێ و سێیەکی دەزانرێ، کەواتە: ئەگەر وەسیێتکەرەکە بە هەڵە کوژراو خوێنی وەرگیرا، ئەوە خوێنەکەش وەگەڵ ماڵەکەی ئێخرێ و وەسیێت بۆکراوەکە بە ئەندازەی وەسیێتەکە لە خوێنەکەش وەردەگرێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا ڕوون کراوەتەوە.

بەڵام ئەگەر بە قەسدی کوژرا بێ و لەجیاتی کوشتنەوەی مرۆڤکوژەکە خوێنی وەرگیرابێ، ئەو کاتە خوێنەکە وەگەڵ ماڵەکە ناکەوێ، چونکە لە کاتی مردنیدا نەبوە، بەڵکو بە هۆی لێبوردن پەیدا بووە، هەروەك (الشبراملسي) فەرموویەتی (وَقِيلَ يَوْمَ الْوَصِيَّةِ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: لە کاتی وەسیێتکردنەکەدا ماڵەکە ڕەچاو دەکرێ.

وَيُعْتَبَرُ مِنَ الثُّلُث أَيْضًا عتقٌ عُلِّقَ بِالْمَوْت وَتَبَرُّعٌ نُجِزَ فِي مَرَضِهِ: كَوَقْف وَهِبَة وَعِتْق وَإِبْرَاء، وَإِذَا اجْتَمَعَ تَبَرُّعَاتٌ مُتَعَلِّقَةٌ بِالْمَوْتِ وَعَجزَالثُّلُثُ فَإِنْ تَمَحَّضَ الْعِتْقُ أُقْرِعَ، أَوْ غَيْرُهُ قُسِّطَ الثُّلُث،

---

ئينجا بزانه: گوتمان: وەسێت بەخشینێكە بە مردن هەڵواسراوەو لە دوای مردن لە سێیەكی ماڵ جێبەجێ دەكرێ، كەوابو: هەر خێراتێكو هەر بەخشینێك بە مردنەوە هەڵواسرا بێ، گشتی لە سێیەكی ماڵ جێبەجێ دەكرێ، هەرچەند لە حاڵەتی ساغیشدا وەسێتەكەی كردبێ، هەروەك لە (الانوار)دا فەرموویەتی.

(وَ) هەروەها (يُعْتَبَرُ مِنَ الثُّلُثِ أَيْضًا) وەكو وەسێت لەو سێیەكە ڕەچاو دەكرێو دەژمێردرێ (عِتْقٌ عُلِّقَ بِالْمَوْتِ) ئازادكردنی كۆیلەیەك كە بە مردنەوە هەڵواسرابێ.

هەروەها (وَتَبَرُّعٌ نُجِّزَ فِيمَرَضِهِ) ئەو خێراتەی كە لە نەخۆشیمردنیدا دەستبەجێ بڕاندرابێتەوە، ئەویش وەكو وەسێت لە سێیەكی ماڵەكەی دەژمێردرێ: (كَوَقْفٍ) وەك لە نەخۆشی مردنیدا شتێك وەقف بكا (وَهِبَةٍ) یان شتێك ببەخشێتە كەسێكیتر (وَإِبْرَاءٍ) یان گەردەنی كەسێك لە قەرزێك ئازاد بكا، یان شتێك نەزر بكاتە كەسێكیتر، واتە: هەر یەكێك لەوانە لە نەخۆشیمردنیدا بیكا، ئەوەش وەكو وەسێت لە سێیەكی ماڵەكەی جێبەجێ دەكرێ، جا ئەگەر لە سێیەكی ماڵەكەی زیاتر بون، ئەو كاتە ئەگەر میراتگرەكان ڕازی بن، ئەوە جێبەجێ دەكرێنو ئەگەر ڕازی نەبن جێبەجێ ناكرێن، هەروەك لە (فصل)یداهاتوودا ڕوون كراوەتەوە.

(وَإِذَا اجْتَمَعَ تَبَرُّعَاتٌ مُتَعَلِّقَةٌ بِالْمَوْتِ) هەركاتێك چەند خێرێكیهەڵواسراو بە مردن وێكڕا كۆ بونەوە، واتە: چەند جۆرە وەسێتێكی كردبون (وَعَجزَ الثُّلُثُ) سێیەكی ماڵەكەش بەشی هەموانی نەدەكرد، ئەوە تەماشا دەكەین: (فَإِنْ تَمَحَّضَ الْعِتْقُ) ئەگەر هەمووی كۆیلە ئازادكردن بون، وەك بڵێ: هەركاتێك مردم ئەم پێنج كۆیلەیەم ئازاد بن. ئەوە (أُقْرِعَ) پشكە لە نێوان كۆیلەكاندا دەكرێو هەركامێكیان ناوی دەرچوو ئازاد دەبێ...بەم جۆرە تا سێیەكی ماڵەكە تەواو دەبێ.

(أَوْ غَيْرُهُ) یان ئەگەر وەسێتەكە شتێكیتری جگە لە ئازادكردن بوو: وەك بڵێ: وەسێت بێ: سەد دینار بۆ (محمد)و پەنجا دینار بۆ (خالد)و پەنجا دینار بۆ (محمود). لە هەمان كاتیشدا سێیەكی ماڵەكەی تەنها سەد دینار بوو، ئەو كاتە (قُسِّطَ الثُّلُثُ) سێیەكەكە بە سەر وەسێتەكاندا بەش دەكرێ بەگوێرەی ئەندازەكەیان، یان بەگوێرەی نرخەكانیان، كەواتە: لە وێنەكەیڕابردوودا پەنجا دینار بۆ (محمد)ەو بیستو پێنج بۆ (خالد)ەو بیستو پێنج بۆ (محمود)ە.

أَوْ هُوَ وَغَيْرُهُ قُسِّطَ بِالْقِيمَةِ وَفِي قَوْلٍ يُقَدَّمُ الْعِتْقُ، أَوْ مُنَجَّزَةً قُدِّمَ الأَوَّلُ فَالأَوَّلُ حَتَّى يَتِمَّ الثُّلُثُ، فَإِنْ وُجِدَتْ دُفْعَةً وَاتَّحَدَ الْجِنْسُ كَعِتْقِ عَبِيدٍ أَوْ إِبْرَاءِ جَمْعٍ أُقْرِعَ فِي الْعِتْقِ وَقُسِّطَ فِي غَيْرِهِ، وَإِنْ اخْتَلَفَ وَتَصَرَّفَ وُكَلاءُ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ فِيهَا عِتْقٌ قُسِّطَ، وَإِنْ كَانَ قُسِّطَ، وَفِي قَوْلٍ يُقَدَّمُ الْعِتْقُ،

---

(أَوْ هُوَ وَغَيْرُهُ) یان وەسیەتەکە ئازادکردنو شتیتر بوو، ئەوەش (قُسِّطَ بِالْقِيمَةِ) بەگوێرەی نرخ سێیەکە کە بە سەر ئازادکردنو شتەکەدا بەش دەکرێ، بۆ وێنە: ئەگەر وەسیەتەکە سەد دیناروو ئازادکردنی کۆیلەیەك بێ، نرخی کۆیلەکەش سەد دینار بێ، سێیەکەکەش تەنها سەد دینار بێ، ئەوە نیوەی کۆیلەکە ئازاد دەبێو پەنجا دینارێش دەدرێتە وەسیێت بۆکراوەکە (وَفِي قَوْلٍ يُقَدَّمُ الْعِتْقُ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: ئازادکردنەکە وەپێش دێخرێ.

(أَوْ مُنَجَّزَةً) یان چەند خێراتێکی دەسبەجێی براندرایەوە وێکڕا کۆ بونەوەو ڕیزیان بۆ داندرابو: وەك یەکەمجار وەقفێکی کردبێ، ئینجا بەخشینێك، ئینجا نەزرێك، ئەو کاتە (قُدِّمَ الأَوَّلُ فَالأَوَّلُ) یەکەمەکە، ئینجا دوای یەکەمەکە وەپێش دواوەتر دێخرێ (حَتَّى يَتِمَّ الثُّلُثُ) تا سێیەکەکە تەواو دەبێ، بەڵام (فَإِنْ وُجِدَتْ دُفْعَةً) ئەگەر خێراتەکان وێکڕا بوبونو (وَاتَّحَدَ الْجِنْسُ) ڕەگەزی بەخشینەکانیش یەك ڕەگەز بوو: (كَعِتْقِ عَبِيدٍ) وەك ئازادکردنی چەند کۆیلەیەك وێکڕا (أَوْ إِبْرَاءِ جَمْعٍ) یان گەردەن ئازادکردنی کۆمەڵە قەرزدارێك وێکڕا، یان وەقفکردنی چەند شتێك وێکڕا، ئەو کاتەش (أُقْرِعَ فِي الْعِتْقِ) لە ئازادکردنەکەدا پشکە لە نێوان کۆیلەکاندا دەکرێ، هەروەك ڕابراو (وَقُسِّطَ فِي غَيْرِهِ) لە بەخشینەکانیتریشدا بەگوێرەینرخ سێیەکەکە بە سەریاندا بەش دەکرێ، هەروەك ڕابرا.

بەڵام (وَإِنْ اخْتَلَفَ) ئەگەر ڕەگەزی خێراتەکان لێك جیاواز بوو (وَتَصَرَّفَ وُكَلاءُ) چەند وەکیلێك وێکڕا دەستکارییان لەو بەخشینانەدا کردبو: وەك لە یەك کاتدا: وەکیلێك شتێکی بەخشی بێو وەکیلێکیش شتێکی وەقف کردبێو وەکیلێکیش گەردەنی قەرزدارێکی ئازاد کردبێ، ئەوە (فَإِنْ لَمْ يَكُنْ فِيهَا عِتْقٌ) ئەگەر لەو دەستکاریانەدا ئازادکردن نەبو (قُسِّطَ) سێیەکەکە بە سەر گشتیاندا بەش دەکرێ بەگوێرەینرخ (وَ) هەروەها (إِنْ كَانَ) ئەگەر ئازادکردنیش هەبێ، هەر (قُسِّطَ) سێیەکەکە بە سەر گشتیاندا بەش دەکرێ، هەروەك ڕابرا (وَفِي قَوْلٍ يُقَدَّمُ الْعِتْقُ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: ئازادکردنەکە وەپێش دێخرێ.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر خێراتەکانی براندرایەوەی دەسبەجێ لە نەخۆشیمردندا، لەگەڵ خێراتەکانی هەڵواسراو بە مردن، هەردووکیان وێکڕا کۆ بونەوە، وەك بڵێ: وەسیێت بێ لە

وَلَوْ كَانَ لَهُ عَبْدَانِ فَقَطْ سَالِمٌ وَغَانِمٌ فَقَالَ: إِنْ أَعْتَقْتُ غَانِمًا فَسَالِمٌ حُرٌّ، ثُمَّ أَعْتَقَ غَانِمًا فِي مَرَضِ مَوْتِهِ عَتَقَ وَلاَ إِقْرَاعَ، وَلَوْ أَوْصَى بِعَيْنٍ حَاضِرَةٍ هِيَ ثُلُثُ مَالِهِ وَبَاقِيهِ غَائِبٌ لَمْ تُدْفَعْ كُلُّهَا إِلَيْهِ فِي الْحَالِ، وَالأَصَحُّ أَنَّهُ لاَ يَتَسَلَّطُ عَلَى التَّصَرُّفِ فِي الثُّلُثِ أَيْضًا.

---

دوای مردنم سەد دینار بدەنە (محمد). هەم لە نەخۆشی‌مردنیشی‌دا بە خۆی سەد دینار بداتە (خالد)، ئەوە خێراتەکانی بڕاندرایەوە لە نەخۆشی‌دا وەپێش وەسێتی دوای‌مردن دێخسترێن تا سێیەك تەواو دەبێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلَوْ كَانَ لَهُ عَبْدَانِ فَقَطْ) ئەگەر تەنها دوو کۆیلەی هەبون، ناویان (سَالِمٌ وَغَانِمٌ) بوو (فَقَالَ) جا لە وەسێتەکەی‌دا گوتی: (إِنْ أَعْتَقْتُ غَانِمًا فَسَالِمٌ حُرٌّ) ئەگەر (غانم)م ئازاد کرد (سالم)ش ئازاد بێ (ثُمَّ أَعْتَقَ غَانِمًا فِي مَرَضِ مَوْتِهِ) ئینجا لە نەخۆشی‌مردنی‌دا (غانم)ی ئازاد کرد، ئەوە (عَتَقَ) تەنها (غانم) ئازاد دەبێ‌و (وَلاَ إِقْرَاعَ) پشکەش لە نێوان کۆیلەکاندا ناکرێ.

(وَلَوْ أَوْصَى بِعَيْنٍ حَاضِرَةٍ) ئەگەر وەسێتی کرد بە شتێکی‌حازر: کە (هِيَ ثُلُثُ مَالِهِ) شتەکە -بە تەنها- سێیەکی هەموو مالی‌خۆی بوو، بەلام (وَبَاقِيهِ غَائِبٌ) دوو بەشە ماڵەکەی‌تریشی لە شوێنێکی‌تر بوو و لە ژێر دەستی میراتگرەکەدا نەبو، ئەوە (لَمْ تُدْفَعْ كُلُّهَا إِلَيْهِ فِي الْحَالِ) ئێستا هەموو شتەکە نادرێتە وەسێت بۆکراوەکە نەوەك دوو بەشە ماڵەکەی‌تری نەمابێ‌و میراتگرەکان دوو هەندی وەسێت بۆکراوەکەیان دەست نەکەوێ (وَ) هەروەها (الأَصَحُّ) بە فەرموودەی‌ڕاستتر (أَنَّهُ لاَ يَتَسَلَّطُ عَلَى التَّصَرُّفِ فِي الثُّلُثِ أَيْضًا) وەسێت بۆکراوەکە دەسەلاتی دەستکاری‌ی بە سەر سێیەکی شتەکەشدا نابێ، هەروەك دەسەلاتی بە سەر هەمووشی‌دا نەبو، بەلام ئەگەر میراتگرەکان ئیزنی‌بدەن، ئەو کاتە دروستە دەستکاری لە سێیەکی شتە وەسێت پێکراوەکەدا بکا، هەروەك لە (نهایة)و (مغنی)دا فەرموویانە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی ئەو نەخۆشیەی مەترسی مردنی لێدەکرێ ﴾

**پێشەکی بزانە:** هەر خێراتێك‌و هەر بەخشینێك مرۆڤ لە ژیانیا لە حالەتی‌ساغی‌دا بیکا، ئەوە لە سەرمایەی ماڵەکەی دەژمێردرێ نەك لە سێیەکەکەی، چونکە لە حالەتی لەش ساغی‌دا مرۆڤ ئازادە لە دەستکاری ملك‌ومالی‌خۆی، هەروەك لە (المهذب)دا فەرموویەتی.

هەروەها گشت مامڵەتێکیشی بە پارەی‌حازر لە نەخۆشی‌مردنی‌دا دروستە‌و پێویستی بە ڕازی‌بوونی میراتگرەکان نیە، بەو مەرجەی بە نرخی وێنەی‌خۆی بێ، یان بۆ خاتری کڕیارەکە بە ئەندازەیەکی‌کەمتری فرۆشتبێ کە عادەت بێ وێنەی ئەو ئەندازەیە بۆ خاترانە دابشکێندرێ، جیاوازی نیە کڕیارەکە: میراتگر بێ، یان بێگانە، بەلام ئەگەر بۆ خاترانە بە ئەندازەیەکی زۆر کەمتر لە نرخی‌خۆی فرشتبوی کە عادەت نەبو ئەو ئەندازیە

(فَصْلٌ) إذَا ظَنَنَّا الْمَرَضَ مَخُوفًا لَمْ يَنْفُذْ تَبَرُّعٌ زَادَ عَلَى الثُّلُثِ، فَإِنْ بَرَأَ نَفَذَ، وَإِنْ ظَنَنَّاهُ غَيْرَ مَخُوفٍ فَمَاتَ فَإِنْ حُمِلَ عَلَى الْفَجْأَةِ نَفَذَ، وَإِلاَّ فَمَخُوفٌ،

---

دابشكێندرێ، ئەو كاتە ئەندازەی خاترەكە -وەكو وەسێت- لە سێیەكی ماڵەكەی دەژمێردرێ، هەوەك لە (الانوار)و (المهذب)دا ڕوون كراوەتەوە.

هەروەها بە پارەی قەرزیش هەر دروستە، بەڵام ئەندازەیقەرزەكە لە سێیەكی ماڵەكەی دەژمێردرێ، هەروەك لە (فصل)ىڕابردوودا لە (تحفة)و حاشیەكانیدا ڕوون كراوەتەوە.

جا ئەگەر لە حاڵەتی نەخۆشیدا خێرێكی كرد، یان بە خۆڕایی شتێكی دایە كەسێك، ئەوە تەماشا دەكەین: (إذَا ظَنَنَّا الْمَرَضَ مَخُوفًا) هەر كاتێك گومانمان برد كە نەخۆشیەكە مەترسی مردنی لێدەكرێ، ئەوە (لَمْ يَنْفُذْ تَبَرُّعٌ زَادَ عَلَى الثُّلُثِ) هیچ خێراتێكو هیچ بەخشینێكی نەخۆشەكە: كە لەو نەخۆشیەدا كردبێتیو لە سێیەكی ماڵەكەش زیاتر بێ: وەكو وەقفكردنو نەزركردنو بەخشینی ماڵو گەردەن ئازادكردنیقەرزدار، ئەوانە هیچیان -بێ ئیزنیمیراتگرەكانی- جێبەجێ نابن، بەڵكو ئەو ئەندازەیەی لە سێیەكی ماڵەكە زیاترە ڕادەگیرێ: (فَإِنْ بَرَأَ) جا ئەگەر لەو نەخۆشیە چاك بۆوە، ئەوە (نَفَذَ) گشت خێرو بەخشینەكانی جێبەجێ دەبن، هەرچەند لە سێیەكیش زیاتر بن، بەڵام ئەگەر چاك نەبۆوەو مرد، ئەوە تەنها تا سێیەكیماڵەكەی جێبەجێ دەبێ، بە بەڵگەی حەدیسەكەی (سعد)ىڕابردوو، بەڵام ئەوەی لە سێیەكیش زیاترە: ئەگەر میراتگرەكان ئیزن بدەن، ئەویش جێبەجێ دەبێ، ئەگینا: جێبەجێ نابێو دەبێتە میرات، هەروەك لە (الشرواني)دا ڕوون كراوەتەوە.

جا بزانە: جیاوازی نیە بەو نەخۆشیە بمرێ، یان لەو نەخۆشیەدا بە هۆیەكیتر بمرێ: وەك یەكێك بیكوژێ، هەروەها بزانە: هەر كەسێك گیانی بگاتە حاڵەتی گیانداری سەربڕاو-كە بێگومان بزانین دەمرێ-: وەك سەری بڕابێ، یان كرابێتە دوو لەت، یان نقومی ناو ئاو بوبێو مەلەوانی نەزانێ، ئەوە هیچ گوفتارێكو هیچ دەستكاریەكی دروست نابن، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا ئەو مەسەلانە ڕوون كراونەوە.

(وَإِنْ ظَنَنَّاهُ غَيْرَ مَخُوفٍ) ئەگەر گومانمان برد: نەخۆشیەكە مەترسی مردنی لێناكرێ بەڵام (فَمَاتَ) لەو نەخۆشیەدا مرد، ئەوە (فَإِنْ حُمِلَ عَلَى الْفَجْأَةِ) ئەگەر مردنەكە بە مردنی كتوپڕ دابندرێ: وەك لە حاڵەتی ددان ئێشاندا بمرێ، ئەوە (نَفَذَ) گشت خێراتو بەخشینێكی جێبەجێ دەبێ، هەرچەند لە سێیەكیش زیاتر بێ (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر مردنەكە بە مردنی كتوپڕ دانەندرێ: وەك ڕۆژێكیتەواو زگچوونی توش ببێ، یان تایەكی توش ببێ، ئەوە (فَمَخُوفٌ) بە نەخۆشی بە ترس دادەندرێو هەرخێراتێكی لە سێیەكی ماڵ زیاتر بێ-بێ ئیزنیمیراتگرەكان- جێبەجێ نابێ.

وَلَوْ شَكَكْنَا فِي كَوْنِهِ مَخُوفًا لَمْ يَثْبُتْ إِلاَّ بِطَبِيبَيْنِ حُرَّيْنِ عَدْلَيْنِ، وَمِنَ الْمَخُوفِ قُولَنْجُ، وَذَاتُ جَنْبٍ، وَرُعَافٌ دَائِمٌ، وَإِسْهَالٌ مُتَوَاتِرٌ، وَدِقٌّ، وَابْتِدَاءُ فَالِجٍ، وَخُرُوجُ طَعَامٍ غَيْرَ مُسْتَحِيلٍ أَوْ كَانَ يَخْرُجُ بِشِدَّةٍ وَوَجَعٍ أَوْ وَمَعَهُ دَمٌ، وَحُمَّى مُطْبَقَةٌ أَوْ غَيْرُهَا إِلاَّ الرِّبْعَ، وَالْمَذْهَبُ أَنَّهُ يَلْحَقُ بِالْمَخُوفِ أَسْرُ كُفَّارٍ اعْتَادُوا قَتْلَ الأَسْرَى، وَالْتِحَامُ قِتَالٍ بَيْنَ مُتَكَافِئَيْنِ، وَتَقْدِيمٌ لِقِصَاصٍ أَوْ رَجْمٍ، وَاضْطِرَابُ رِيحٍ وَهَيَجَانُ مَوْجٍ فِي رَاكِبِ سَفِينَةٍ، وَطَلْقُ حَامِلٍ وَبَعْدَ الْوَضْعِ مَا لَمْ تَنْفَصِلِ الْمَشِيمَةُ.

---

(وَلَوْ شَكَكْنَا فِي كَوْنِهِ مَخُوفًا) ئەگەر کەوتینە گومان لەوەدا: ئایا نەخۆشیەکە بە ترسە، یان نا، ئەو کاتە (لَمْ يَثْبُتْ إِلاَّ بِطَبِيبَيْنِ حُرَّيْنِ عَدْلَيْنِ) بە ترسیەکەی ئاشکرا نابێ تەنها بە شاهیدیی دوو پزیشکی پیاو و ئازادو دادپەروەرە نەبێ.

ئینجا بزانە: ئەو نەخۆشیانەی مەترسی مردنیان لێدەکرێ زۆرن، بۆ نمونە: (وَمِنَ الْمَخُوفِ قُولَنْجُ) یەکێك لە نەخۆشیە بە ترسەکان نەخۆشیی قۆلنجە، چونکە خواردەمەنی لە ناو هەندێك ڕیخۆڵەدا دەمێنێتەو دانابەزێتە خوارەوە، هەم (وَذَاتُ جَنْبٍ) نەخۆشیی بەرەنگ، چونکە ئەویش چەند کۆوانێکن لە ناوەوەی تەنیشتی مرۆڤ دەبنە هۆی کۆخەو پشوو تەنگیو تایەکی بەردەوام، هەروەها (وَرُعَافٌ دَائِمٌ) لوت داڕسانی بەردەوام، چونکە بە هۆی خوێن ڕژانەکە مرۆڤ لە هێز دەکەوێ، هەروەها (وَإِسْهَالٌ مُتَوَاتِرٌ) زگچوونێکی بە دوای یەکدا، چونکە تەڕایەتی لە لاشەی مرۆڤدا نامێنێو لە هێز دەکەوێ.

هەروەها (وَدِقٌّ) نەخۆشیی دڵو (وَابْتِدَاءُ فَالِجٍ) سەرەتای شەلەلو (وَخُرُوجُ طَعَامٍ غَيْرَ مُسْتَحِيلٍ) هاتنە دەرەوەی خواردەمەنی بە نەگۆڕاوی (أَوْ كَانَ يَخْرُجُ بِشِدَّةٍ وَوَجَعٍ) یان بە زگچوونێکی بەهێزو ئازارەوە دەهاتە دەرەوە (أَوْ وَمَعَهُ دَمٌ) یان زگچوونەکە خوێنی ئەندامە ڕێزدارەکانی لەگەڵدا بوو، هەروەها (وَحُمَّى مُطْبَقَةٌ) تای بەردەوام (أَوْ غَيْرُهَا) یان تایەکانی تری جگە لە بەردەوام ئەوانیش بە ترسن (إِلاَّ الرِّبْعَ) تەنها تای سێبەڕۆ نەبێ: کە ڕۆژێك دەیگرێو دوو ڕۆژ نایگرێ، ئەمەیان بە ترس نیە.

(وَالْمَذْهَبُ) بەفەرموودەی ڕاستی مەزهەب: (أَنَّهُ يَلْحَقُ بِالْمَخُوفِ) وەك نەخۆشیی بەترس وایە (أَسْرُ كُفَّارٍ اعْتَادُوا قَتْلَ الأَسْرَى) بە دیلگرتنی موسوڵمانێك لە لایەن ئەو جۆرە کافرانەی عادەتیانە دیلەکان دەکوژن، هەم (وَالْتِحَامُ قِتَالٍ بَيْنَ مُتَكَافِئَيْنِ) تێکەڵبوونی جەنگ لە نێوان دوو هێزی هاوتواناداو، هەم (وَتَقْدِيمٌ لِقِصَاصٍ) بردنی مرۆڤ بۆ کوشتنی لە تۆڵە (أَوْ رَجْمٍ) یان بۆ بەردبارانکردنی زینا، هەم (وَاضْطِرَابُ رِيحٍ) ڕەشەباو (وَهَيَجَانُ مَوْجٍ) شەپۆلدانی دەریا (فِي رَاكِبِ سَفِينَةٍ) دەرهەق سوار کەشتی، هەم (وَطَلْقُ حَامِلٍ) ژانی منداڵبوونی ئافرەتی ئاوس، هەم (وَبَعْدَ الْوَضْعِ) لە دوای منداڵ دانانەکەش مەترسی هەر هەیە (مَا لَمْ تَنْفَصِلِ الْمَشِيمَةُ) مادام پیستەکەی وڵاشی کۆرپەکە لە ئافرەتەکە جیا نەبوبێتەوە.

وَصِيغَتُهَا: أَوْصَيْتُ لَهُ بِكَذَا. أَوْ ادْفَعُوا إِلَيْهِ. أَوْ أَعْطُوهُ بَعْدَ مَوْتِي. أَوْ جَعَلْتُهُ لَهُ. أَوْ هُوَ لَهُ بَعْدَ مَوْتِي. فَلَوْ اقْتَصَرَ عَلَى هُوَ لَهُ. فَإِقْرَارٌ، إِلاَّ أَنْ يَقُولَ: هُوَ لَهُ مِنْ مَالِي. فَيَكُونُ وَصِيَّةً، وَتَنْعَقِدُ بِكِنَايَةٍ، وَالْكِتَابَةُ كِنَايَةٌ، وَإِنْ أَوْصَى لِغَيْرِ مُعَيَّنٍ كَالْفُقَرَاءِ لَزِمَتْ بِالْمَوْتِ بِلاَ قَبُولٍ، أَوْ لِمُعَيَّنٍ اشْتُرِطَ الْقَبُولُ، وَلاَ يَصِحُّ قَبُولٌ وَلاَ رَدٌّ فِي حَيَاةِ الْمُوصِي، وَلاَ يُشْتَرَطُ بَعْدَ مَوْتِهِ الْفَوْرُ،

---

ڕوكنیچوارەم: (وَصِيغَتُهَا) گوتەی وەسێت ئەمەیە: (أَوْصَيْتُ لَهُ بِكَذَا) ئەو شتەم كردە وەسێت بۆ فلانكەس (أَوْ) یان بڵێ: (ادْفَعُوا إِلَيْهِ أَوْ أَعْطُوهُ بَعْدَ مَوْتِي) لە دوای مردنم ئەو شتەی بدەنێ (أَوْ) یان بڵێ: (جَعَلْتُهُ لَهُ) ئەو شتەم لەدوای مردنم كردە هی فلانكەس (أَوْ) یان بڵێ: (هُوَ لَهُ بَعْدَ مَوْتِي) ئەو شتە لە دوای مردنم بۆ فلانكەسە (فَلَوْ اقْتَصَرَ عَلَى هُوَ لَهُ) ئەگەر تەنها گوتی: ئەو شتە هی فلانكەسە. واتە نەیگوت لە دوایمردنم، ئەوە (فَإِقْرَارٌ) دانپێدانانە: كە ئێستا شتەكە ملكی فلانكەسەكەیە، واتە: وەسێت نیە (إِلاَّ أَنْ يَقُولَ) مەگەر بڵێ: (هُوَ لَهُ مِنْ مَالِي) ئەو شتە بۆ فلانكەسە لەماڵی من. ئەو كاتە (فَيَكُونُ وَصِيَّةً) گوتەكە دەبێتە كینایەتی وەسێت.

هەروەها ئەگەر بڵێتە قەرزدارەكەی خۆی: هەر كاتێك مردم ئەو قەرزەم كە لە سەر تۆیە بە سەر گەداو هەژارانیدا بەش بكە. ئەوەش دروستە، بەڵام پێویستە لەو حاڵەتەدا قەرزدارەكە شاهیدی هەبێ: كە كراوەتە سەر وەسێتی بەشكردنی قەرزەكە، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی (وَتَنْعَقِدُ بِكِنَايَةٍ) وەسێت دادەمەزرێ بە گوتەی ناڕاشكرا ئەگەر نیەتی لەگەڵدا بێ، وەك بڵێ: ئەم شتەم بۆ فلانكەس دیاری كردوە (وَالْكِتَابَةُ كِنَايَةٌ) نوسینیش بە گوتەی ناڕاشكرا دادەندرێ، واتە: ئەگەر نیەتی لەگەڵدا بێ، وەسێتەكە دادەمەزرێ.

## ﴿ قبولكردنی وەسێت ﴾

(وَإِنْ أَوْصَى لِغَيْرِ مُعَيَّنٍ) ئەگەر وەسێتی كرد بۆ دیارنەكراوێك (كَالْفُقَرَاءِ) وەك گەداو هەژاران، ئەوە (لَزِمَتْ بِالْمَوْتِ بِلاَ قَبُولٍ) وەسێتەكە بە مردنی وەسێتكەرەكە واجب دەبێ، بێئەوەی هیچ كەسێك قبوڵی بكا (أَوْ لِمُعَيَّنٍ) بەڵام ئەگەر وەسێتی كرد بۆ دیاركراوێك: وەك فلانكەس، ئەوە (اشْتُرِطَ الْقَبُولُ) بە مەرج داندراوە: وەسێت بۆكراوەكە قبوڵی بكا، ئینجا وەسێتەكە واجب دەبێ، بەڵام (وَلاَ يَصِحُّ قَبُولٌ وَلاَ رَدٌّ فِي حَيَاةِ الْمُوصِي) تا وەسێتكەرەكە زیندوو بێ: نە قبوڵكردنو نە ڕەدكردنەوە هیچیان دروست نابن، بەڵكو لە دوای مردنی دروست دەبن.

بەڵام (وَلاَ يُشْتَرَطُ بَعْدَ مَوْتِهِ الْفَوْرُ) لە دوای مردنی وەسێتكەرەكەش بە مەرج داناندرێ: یەكسەر بێدواخستن قبوڵی بكا، بەڵام میراتگرەكە مافی هەیە: داوا لە وەسێت بۆكراوەكە

فَإِنْ مَاتَ الْمُوصَى لَهُ قَبْلَهُ بَطَلَتْ أَوْ بَعْدَهُ فَيَقْبَلُ وَارِثُهُ، وَهَلْ يَمْلِكُ الْمُوصَى لَهُ بِمَـوْتِ الْمُوصِي أَمْ بِقَبُولِهِ أَمْ مَوْقُوفٌ: فَإِنْ قَبِلَ بَانَ أَنَّهُ مَلَكَ بِالْمَوْتِ وَإِلاَّ بَانَ لِلْوَارِثِ؟ أَقْوَالٌ أَظْهَرُهَا: اَلثَّالِثُ، وَعَلَيْهَا تُبْنَى الثَّمَرَةُ وَكَسْبُ عَبْدٍ حَصَلاَ بَيْنَ الْمَوْتِ وَالْقَبُولِ وَنَفَقَتُـهُ وَفِطْرَتُهُ،

---

بكا: يان قبولّی بكا، يان ڕەدی بكاتەوە. جا دروستە بەشێكی وەسێت پێكراوەكە قبولّ بكاو بەشێكيش ڕەد بكاتەوە، جا ئەگەر هيچی قبولّ نەكرد، ئەوە بڕياری ڕەدكردنەوەی لە سەر دەدرێ، بەلاّم ئەگەر وەسێت بۆكراوەكە شێت، يان منداڵ بوو، ئەو كاتە سەرپەرشتكارەكەی بۆی قبولّ دەكا، جائەگەر بۆی قبولّ نەدەكرد، ئەو كاتە قازی بۆی قبولّ دەكا، هەروەك لە(تحفة)و (مغني)دا ڕوون كراوەتـەوە، جائەگەر هيچ كەسێك بۆی قبولّ نەكرد، ئەوە هەر كاتێك منداڵەكە بلۆغی بوو، وەسێتەكە بۆ خۆی قبولّ دەكا، هەروەك لە (إبن قاسم)دا ڕوون كراوەتەوە.

(فَإِنْ مَاتَ الْمُوصَى لَهُ قَبْلَهُ) جا ئەگەر وەسێت بۆكراوەكە پێش وەسێتكەرەكە مرد، يان هەردووكيان وێكڕا مردن (بَطَلَتْ) وەسێتەكە بەتاڵ دەبێتەوە، چونكە وەسێتەكە واجب نەبوە (أَوْ بَعْدَهُ) يان ئەگەر وەسێت بۆكراوەكە دوای وەسێتكەرەكە مرد، ئەو كاتە بەتاڵ نابێتەوە، كەوابو: (فَيَقْبَلُ وَارِثُهُ) ميراتگری وەسێت بۆكراوكە وسێتەكە قبولّ دەكا، يان ڕەدی دەكاتەوە، جا ئەگەر ميراتگرەكە شێت، يان منداڵ بوو، ئەو كاتەش سەرپەرشكارەكەی بۆی قبولّ دەكا، بەو جۆرەی ڕابرا.

(وَهَلْ يَمْلِكُ الْمُوصَى لَهُ بِمَوْتِ الْمُوصِي) ئايا وەسێت بۆكراوەكە بە مردنی وەسێتكەرەكە دەبێتە خاوەنی وەسێت پێكراوەكە (أَمْ بِقَبُولِهِ) يان بە قبولكردنی دەبێتە خاوەنی (أَمْ مَوْقُوفٌ) يان ملكايەتيەكە وەستێندراوەو چاوەڕوان دەكەين: (فَإِنْ قَبِلَ بَانَ أَنَّهُ مَلَكَ بِالْمَوْتِ) ئەگەر قبولّی كرد، ئەوە ئاشكرا دەبێ بە مردنی وەسێتكەرەكە بووەتە خاوەن‌و (وَإِلاَّ بَانَ لِلْوَارِثِ؟) ئەگەر قبولّيش نەكاو ڕەدی بكاتەوە ئاشكرا دەبێ: كە لە مردنەوە بووەتە ملكی‌ميراتگرەكە؟ ئەوە (أَقْوَالٌ) سێ فەرموودە هەنە، بەهێزترەكەيان سێيەمەكەيە كە دەفەرموێ: وەستێندراوە تا قبولّ دەكا، يان ڕەد دەكاتەوە.

(وَعَلَيْهَا) هەر لە سەر ئەو سێ فەرموودانە (تُبْنَى الثَّمَرَةُ وَكَسْبُ عَبْدٍ) دادەمەزرێندرێ ميوەی درەختی وەسێت پێكراو و كەسابەتی كۆيلەی وەسێت پێكراو: كە (حَصَلاَ بَيْنَ الْمَوْتِ وَالْقَبُولِ) لە نێوان مردنی وەسێتكەرەكەو قبولكردنی وەسێت بۆكراوەكەدا پەيدا بوبن، هەم (وَنَفَقَتُهُ وَفِطْرَتُهُ) بەخێوكردنی كۆيلەكەو سەر فيترەكەی‌و گشت ئەركێكی‌تری بەخێوكردنی وەسێت پێكراوەكەو گشت سودەكانی‌تريشی، لە سەر فەرموودەكەی

وَنُطَالِبُ الْمُوصَى لَهُ بِالنَّفَقَةِ إِنْ تَوَقَّفَ فِي قَبُولِهِ وَرَدِّهِ. (فَصْلٌ) إِذَا أَوْصَى بِشَاةٍ تَنَاوَلَ صَغِيرَةَ الْجُثَّةِ وَكَبِيرَتَهَا سَلِيمَةً وَمَعِيبَةً ضَأْنًا وَمَعْزًا وَكَذَا ذَكَرٌ فِي الأَصَحِّ، لاَ سَخْلَةٌ وَعَنَاقٌ فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ قَالَ أَعْطُوهُ شَاةً مِنْ غَنَمِي. وَلاَ غَنَمَ لَهُ لَغَتْ، وَإِنْ قَالَ: مِنْ مَالِي. اُشْتُرِيَتْ لَهُ، وَالْجَمَلُ وَالنَّاقَةُ يَتَنَاوَلاَنِ الْبَخَاتِيَّ وَالْعِرَابَ لاَ أَحَدُهُمَا الآخَرَ،

---

سێیەمی بەهێزتر: گشتی وەستێندراون، جا ئەگەر وەسێت بۆکراوەکە قبوڵی کرد، ئەوە میوەی درەختەکەو گشت سودەکانی پەیدابوو بۆ خۆیەتیو گشت ئەرکەکانیشی لە سەرن، ئەگەر ڕەدیشی کردەوە، ئەو کاتە گشت ئەرکەکانیش بۆ میراتگرەکانەو گشتی لە سەر میراتگرەکانە، کەواتە: ئەگەر میوەکە لە کاتی مردنی وەسێتکەرەکەدا بە درەختەکەوە ئاشکرا بوبێ، ئەو کاتە میوەکە گشتی بۆ میراتگرەکانە، نەك بۆ ئەو کەسەی وەسێتی –بە درەختەکە– بۆ کراوە.

(وَنُطَالِبُ الْمُوصَى لَهُ بِالنَّفَقَةِ) داوا لە وەسێت بۆکراوەکە دەکەین کۆیلەکە بەخێو بکا (إِنْ تَوَقَّفَ فِي قَبُولِهِ وَرَدِّهِ) ئەگەر خۆی گیر کرد: نە قبوڵی دەکردو نە ڕەدی دەکردەوە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی بڕیارەکانو ووشەکانی وەسێت ﴾

(إِذَا أَوْصَى بِشَاةٍ) هەر کاتێك لە کارەگەلێك حەیوانێکی دیارینەکراوی کردە وەسێت، ئەوە (تَنَاوَلَ صَغِيرَةَ الْجُثَّةِ وَكَبِيرَتَهَا) هەم حەیوانێکی لاشە بچوكو هەم لاشە گەورەش دەگرێتەوە، هەم (سَلِيمَةً وَمَعِيبَةً) بە عەیبو بێعەیبیش دەگرێتەوە، هەم (ضَأْنًا وَمَعْزًا) بزنو مەڕیش دەگرێتەوە، ئەگەر کارەگەلەکە بزنو مەڕ بون (وَكَذَا ذَكَرٌ) هەروەها نێرینەش دەگرێتەوە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا (لاَ سَخْلَةٌ وَعَنَاقٌ) بەڵام بەرخو چوشتیر ناگرێتەوە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَلَوْ قَالَ أَعْطُوهُ شَاةً مِنْ غَنَمِي) ئەگەر گوتی: لە دوای مردنم حەیوانێك لە کارەگەلەکەی من بدەنە فلانکەس (وَلاَ غَنَمَ لَهُ) لە کاتیمردنیشیدا هیچ کارەگەلی نەبو (لَغَتْ) وەسێتەکە پوچەڵ دەبێتەوە، بەڵام ئەگەر لە کاتیمردن کارەگەلی هەبێ، ئەوە لەو کارەگەلە حەیوانێك دەدرێتە وەسێت بۆکراوەکە (وَ) هەروەها (إِنْ قَالَ) ئەگەر بڵێ: (مِنْ مَالِي) لە ماڵی من حەیوانێکی بدەنێ. ئەوە (اُشْتُرِيَتْ لَهُ) ئەگەر لە کاتیمردن هیچ حەیوانێکی نەبێ، حەیوانێك بە پارە بۆ وەسێت بۆکراوەکە دەکڕدرێ.

(وَ) هەروەها ووشەی (الْجَمَلُ وَالنَّاقَةُ) کە هەردووکیان بۆ ووشتر دەگوترێن (يَتَنَاوَلاَنِ الْبَخَاتِيَّ وَالْعِرَابَ) ووشتری مل درێژو ئەوانیتریش دەگرنەوە، بەڵام (لاَ أَحَدُهُمَا الآخَرَ) ووشەی یەکێکیان ئەویتر ناگرێتەوە، چونکە (الجمل) بۆ ووشتری نێر دەگوترێو

وَالأَصَحُّ تَنَاوُلُ بَعِيرٍ نَاقَةً لاَ بَقَرَةٍ ثَوْرًا وَالثَّوْرُ لِلذَّكَرِ، وَالْمَذْهَبُ حَمْلُ الدَّابَّةِ عَلَى فَرَسٍ وَبَغْلٍ وَحِمَارٍ، وَيَتَنَاوَلُ الرَّقِيقُ صَغِيرًا وَأُنْثَى وَمَعِيبًا وَكَافِرًا وَعُكُوسَهَا، وَقِيلَ: إِنْ أَوْصَى بِإِعْتَاقِ عَبْدٍ وَجَبَ الْمُجْزِئُ كَفَّارَةً، وَلَوْ أَوْصَى بِأَحَدِ رَقِيقِهِ فَمَاتُوا أَوْ قُتِلُوا قَبْلَ مَوْتِـهِ بَطَلَتْ، وَإِنْ بَقِيَ وَاحِدٌ تَعَيَّنَ، أَوْ بِإِعْتَاقِ رِقَابٍ فَثَلاَثٌ، فَإِنْ عَجَزَ ثُلُثُهُ عَنْهُنَّ فَالْمَذْهَبُ أَنَّهُ لاَ يُشْتَرَى شِقْصٌ بَلْ نَفِيسَتَانِ بِهِ، فَإِنْ فَضَلَ عَنْ أَنْفَسِ رَقَبَتَيْنِ شَيْءٌ فَلِلْوَرَثَةِ، وَلَـوْ قَالَ ثُلُثِي لِلْعِتْقِ. اُشْتُرِيَ شِقْصٌ،

---

(الناقة) بۆ مێیینه (وَالأَصَحُّ) به فەرموودەی راستتر: ( تَنَاوُلُ بَعِيرٍ نَاقَـةً) ووشـەی (بعـیر) ووشتری مێ دەگرێتەوە، بەلام (لاَ بَقَرَةٍ ثَوْرًا) ووشەی مانگا گاجووت ناگرێتـەوە، چـونكه (وَالثَّوْرُ لِلذَّكَرِ) گاجووت بۆ نێرینه دەگوترێ.

(وَالْمَذْهَبُ) فەرموودەی راستیمەزهەب (حَمْلُ الدَّابَّةِ) ووشەی وولاغ (عَلَى فَرَسٍ وَبَغْلٍ وَحِمَارٍ) دەهێندرێته سەر ئەسپو هێسترو كەر، واته: بۆ هەر سێكیان دەگوترێ (وَيَتَنَـاوَلُ الرَّقِيـقُ) ووشـەی كۆیلـه (صَـغِيرًا وَأُنْثَـى وَمَعِيبًـا وكـافرًا) كۆیلـەی بچـوكو مێیینـەو عەیبـدارو كـافر دەگرێتـەوە، هـەم (وَعُكُوسَـهَا) پێچەوانەكانیشـیان دەگرێتـەوە (وَقِيـلَ) لـە فەرموودەیـەكی بێهێزدا: (إِنْ أَوْصَى بِإِعْتَاقِ عَبْدٍ) ئەگەر وەسێتی كرد بە ئـازادكردنی كۆیلەیـەك، ئـەو كاتـه (وَجَبَ الْمُجْزِئُ كَفَّارَةً) واجبه: كۆیلەیەكی وەها ئازاد بكرێ كه بۆ كەففارەت دەست بدا.

(وَلَوْ أَوْصَى بِأَحَدِ رَقِيقِهِ) ئەگەر وەسێتی كرد: یەكێك له كۆیلەكانی بدرێته فلانكەس، یان مەڕێك له مەڕەكانی بدرێته فلانكەس (فَمَـاتُوا أَوْ قُتِلُـوا قَبْـلَ مَوْتِـهِ) ئینجا پـێش مردنـی وەسێتكەرەكه گشت كۆیلەكان، یان گشت مەڕەكان مردن، یان كـوژران، یـان فرۆشـتنی، یـان بەخشـینی، ئـەوە (بَطَلَـتْ) وەسـێتەكه بـەتاڵ دەبێتـەوە، چـونكه لـە كـاتیمردنیدا هیچێكیانی نیه، بەلام (وَإِنْ بَقِيَ وَاحِدٌ) ئەگەر تەنها یەكێكیان له كـاتیمردنی مـابو، ئـەوە (تَعَيَّنَ) ئەویان دیاری دەكرێو دەدرێته وەسێت بۆكراوەكه.

(أَوْ بِإِعْتَاقِ رِقَابٍ) یان ئەگەر وەسێتی كرد چەند كۆیلەیەك ئازاد بكرێن (فَثَلاَثٌ) لای كەمی دەبی سێ كۆیلەی بۆ بكڕدرێنو ئازاد بكرێن، بەلام (فَإِنْ عَجَزَ ثُلُثُهُ عَنْهُنَّ) ئەگەر سـێیەكی ماڵەكەی بەشی سێ كۆیلەی نەدەكرد، ئەوە (فَالْمَذْهَبُ) به فـەرموودەی راسـتی مەزهـەب (أَنَّهُ لاَ يُشْتَرَى شِقْصٌ) بەشه كۆیلەیەكی بۆ ناكڕدرێ (بَلْ نَفِيسَتَانِ بِهِ) بەڵكو دوو كۆیلـەی به نرخ به وەسێت پێكراوەكه دەكڕدرێن (فَإِنْ فَضَلَ عَنْ أَنْفَسِ رَقَبَتَيْنِ شَيْءٌ) جا ئەگەر له كڕینی بەنرخترینی دوو كۆیله شتێك زیاد بوو (فَلِلْوَرَثَةِ) شتەكه بۆ میراتگرەكانیەتی.

(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر گوتی (ثُلُثِي لِلْعِتْقِ) سێیەكی ماڵم وەسێت بێ بۆ كۆیلـه ئـازادكردن، ئـەو كاته (اُشْتُرِيَ شِقْصٌ) بەشه كۆیلەیەكیش دەكڕدرێ تا سێیەك تەواو دەبێ.

وَلَوْ وَصَّى لِحَمْلِهَا فَأَتَتْ بِوَلَدَيْنِ فَلَهُمَا، أَوْ بِحَيٍّ وَمَيِّت فَكُلُّهُ لِلْحَيِّ فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ قَالَ: إِنْ كَانَ حَمْلُك ذَكَرًا أَوْ قَالَ أُنْثَى فَلَهُ كَذَا. فَوَلَدَتْهُمَا لَغَتْ، وَلَوْ قَالَ: إِنْ كَانَ بِبَطْنِهَا ذَكَرٌ. فَوَلَدَتْهُمَا اسْتَحَقَّ الذَّكَرُ أَوْ وَلَدَتْ ذَكَرَيْنِ فَالأَصَحُّ صِحَّتُهَا وَيُعْطِيهِ الْوَارِثُ مَنْ شَاءَ مِنْهُمَا، وَلَوْ وَصَّى لِجِيرَانِهِ فَلأَرْبَعِينَ دَارًا مِنْ كُلِّ جَانِبٍ، وَالْعُلَمَاءُ أَصْحَابُ عُلُومِ الشَّرْعِ مِنْ تَفْسِيرٍ وَحَدِيث وَفِقْه، لاَ مُقْرِئٌ وَأَدِيبٌ وَمُعَبِّرٌ

---

(وَلَوْ وَصَّى لِحَمْلِهَا) ئەگەر وەسێتیکرد: ئەو شتە بدرێتە کۆرپەی ناو زگی ئەو ئافرەتە (فَأَتَتْ بِوَلَدَيْنِ) ئینجا ئافرەتەکەش دوو منداڵ، یان زیاتری لەو زگە بون، ئەوە (فَلَهُمَا) وەسێت پێکراوەکە بۆ هەموو منداڵەکانە بە یەکسانی: جیاوازی نێر و مێ نیە (أَوْ بِحَيٍّ وَمَيِّتٍ) بەڵام ئەگەر ئافرەتەکە منداڵێکی زیندوو و منداڵێکی مردووی بون، ئەو کاتە (فَكُلُّهُ لِلْحَيِّ) گشتی بۆ زیندووەکەیە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر وەسێتکەرەکە گوتی (إِنْ كَانَ حَمْلُك ذَكَرًا) ئەگەر کۆرپەکەت نێر بێ، ئەو شتە وەسێت بێ بۆی (أَوْ قَالَ) یان گوتی (إِنْ كَانَ أُنْثَى فَلَهُ كَذَا) ئەگەر کۆرپەکەت مێ بێ، ئەو شتە وەسێت بێ بۆی (فَوَلَدَتْهُمَا) ئینجا ئافرەتەکەش نێرێكو مێیەکی بون (لَغَتْ) وەسێتەکە پۆچەڵ دەبێتەوە، چونکە گشت بارەکەی ناو زگی تەنها نێر و تەنها مێ نەبوە.

(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر گوتی (إِنْ كَانَ بِبَطْنِهَا ذَكَرٌ) ئەگەر نێرینەیەکی لە زگدا بێ، ئەو شتە وەسێت بێ بۆی (فَوَلَدَتْهُمَا) ئینجا ئافرەتەکە نێرێكو مێیەکی بون، ئەوە (اسْتَحَقَّ الذَّكَرُ) تەنها نێرینەکە مافی وەسێتەکەی هەیە (أَوْ وَلَدَتْ ذَكَرَيْنِ) بەڵام ئەگەر دوو نێرینەی بون، ئەوەش (فَالأَصَحُّ صِحَّتُهَا) بە فەرموودەیبەهێزتر وەسێتەکە دروست دەبێو (وَيُعْطِيهِ الْوَارِثُ مَنْ شَاءَ مِنْهُمَا) میراتگرەکە بە حەزکردنیخۆی وەسێت پێکراوەکە دەداتە—تەنها— یەکێکیان نەك هەردووکیان، بەڵام ئەگەر بڵێ: ئەگەر زگەکەت نێر بێ، یان بڵێ: ئەگەر نێرینەت لە زگدا بێ، ئەم شتە وەسێت بێ بۆی. ئینجا دوو نێرینە، یان زیاتری لەو زگە بون، ئەو کاتەش بە یەکسانی دەدرێتە هەموانیان، هەروەك لە (تحفة)و (مغني)دا فەرموویانە.

(وَلَوْ وَصَّى لِجِيرَانِهِ) ئەگەر وەسێتی کرد شتێك بدرێتە جیرانەکانی، ئەوە (فَلأَرْبَعِينَ دَارًا مِنْ كُلِّ جَانِبٍ) وەسێتەکە بۆ دانیشتووانی چل خانووە لە هەر چوار لاوە.

(وَالْعُلَمَاءُ) زانایانیئایینی لە وەسێتدا (أَصْحَابُ عُلُومِ الشَّرْعِ) خاوەن زانستەکانیشەرعی دەگرێتەوە: (مِنْ تَفْسِيرٍ) لە زانستی واتەی قورئانیپیرۆزو (وَحَدِيثٍ) زانستیحەدیسەکانی پێغەمبەرﷺ (وَفِقْهٍ) شەریعەتیئیسلام کە لە (قرآن)و (حديث)و (إجماع)و (قياس) وەرگیراوە (لاَ مُقْرِئٌ) بەڵام خاوەن زانستی خوێندنەوەیقورئان ناگرێتەوە، هەم (وَأَدِيبٌ) خاوەن ڕێزمانی عەرەبی: وەکو (نحو)و (صرف)و (بلاغة)و (وَمُعَبِّرٌ) خاوەن زانستی خەونو

وَطَبِيبٌ وَكَذَا مُتَكَلِّمٌ عِنْدَ الأكْثَرِينَ، وَيَدْخُلُ فِي وَصِيَّةِالْفُقَرَاءِ الْمَسَاكِينُ وَعَكْسُهُ، وَلَوْ جَمَعَهُمَا شُرِّكَ نِصْفَيْنِ، وَأَقَلُّ كُلِّ صِنْفٍ ثَلاَثَةٌ وَلَـهُ التَّفْضِيلُ، أَوْ لِزَيْدٍ وَالْفُقَرَاءِ فَالْمَذْهَبُ أَنَّهُ كَأَحَدِهِمْ فِي جَوَازِ إِعْطَائِهِ أَقَلَّ مُتَمَوَّلٍ لَكِنْ لاَ يُحْرَمُ، أَوْ لِجَمْعٍ مُعَيَّنٍ غَيْرِ مُنْحَصِرٍ كَالْعَلَوِيَّةِ صَحَّتْ فِي الأَظْهَرِ وَلَهُ الاِقْتِصَارُ عَلَى ثَلاَثَةٍ، أَوْ لأَقَارِبِ زَيْدٍ دَخَلَ كُلُّ قَرَابَةٍ وَإِنْ بَعُدَ إِلاَّ أَصْلاً وَفَرْعًا فِي الأَصَحِّ،

---

(وَطَبِيبٌ) پزیشكو (وَكَذَا مُتَكَلِّمٌ عِنْدَالأكْثَرِينَ) هەروەها لە لای زۆربەی زانایان: زانای (عقيدة)ش، واتە: ئەوانەی بە فەلسەفەو مەنتیق باس لە زاتو سیفەتەكانی خوا دەكەن، نەك بە ئایەتو حەدیس، واتە: ئەوانەیڕابردوو— لە باسی وەسیێتدا— بە زانای ئایینی داناندرێنو هیچیان ئەو وەسیێتەیان نادرێتێ كە بۆ زانایانیئایینی كراوە.

(وَيَدْخُلُ فِي وَصِيَّةِ الْفُقَرَاءِ الْمَسَاكِينُ) وەسیێت كردن بۆ هەژاران گەدایەكانیش دەگرێتەوە (وَعَكْسُهُ) بە پێچەوانەش بۆ گەدایان هەژارەكانیش دەگرێتەوە، بەلام (وَلَوْ جَمَعَهُمَا) ئەگەر لە وەسیێتەكەیدا هەردووكی كۆ كردنەوە، واتە گوتی وەسیێت بێ بۆ گەداو هەژاران، ئەو كاتە (شُرِّكَ نِصْفَيْنِ) وەسیێتەكە دەكرێتە هاوبەش بە نیوەیی لە نێوان هەر دوو چینەكەدا، واتە: نیوەی بۆ هەژارەكانو نیوەی بۆ گەدایەكان، ئینجا (وَأَقَلُّ كُلِّ صِنْفٍ ثَلاَثَةٌ) لای كەمی هەر چینێك دەبی سێ كەس بنو كەمتر نەبن، بەلام (وَلَـهُ التَّفْضِيلُ) سەروەسیێتەكە بۆی دروستە لە ئەندامەكانی هەر چینێكدا جیاوازی بكاو لەو نیوەیە هەندێكیان لە هەندێكیان زیاتریان بداتێ.

(أَوْ لِزَيْدٍ وَالْفُقَرَاءِ) یان ئەگەر وەسیێتی كرد بۆ (زەید)و هەژارەكان، ئەوە (فَالْمَذْهَبُ) بە فەرموودەی راستی مەزهەب: (أَنَّهُ كَأَحَدِهِمْ) (زەید)ش وەكو هەژارێك دادەندرێ (فِي جَوَازِ إِعْطَائِهِ أَقَلَّ مُتَمَوَّلٍ) لەوەدا: كە دروستە كەمترین شتێكی وەهای بدرێتێ كە بە مالّ دابندرێ (لَكِنْ لاَ يُحْرَمُ) بەلام دروست نیە بێبەش بكرێ.

(أَوْ لِجَمْعٍ مُعَيَّنٍ غَيْرِ مُنْحَصِرٍ) یان ئەگەر وسیێتی كرد بۆ كۆمەڵێكی دیاركراو: كە سەرژمێر نەدەكران (كَالْعَلَوِيَّةِ) وەك بڵێ: وەسیێت بێ بۆ نەتەوەی ئیمامی(علی ﷺ)، یان بۆ سەیدەكان (صَحَّتْ فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا: وەسیێتەكە دروست دەبێو (وَلَـهُ الاِقْتِصَارُ عَلَى ثَلاَثَةٍ) بۆ سەروەسیێتەكە دروستە: وەسیێتەكە بداتە تەنها سێ كەسیان، هەروەك لە وەسیێتی هەژارانیشدا ئەوها بوو.

(أَوْ لأَقَارِبِ زَيْدٍ) یان ئەگەر وەسیێتی كرد بۆ خزمەكانی (زەید)، ئەوە (دَخَلَ كُلُّ قَرَابَةٍ وَإِنْ بَعُدَ) گشت خزمێكی (زەید) دەگرێتەوە هەرچەند دووریش بێ (إِلاَّ أَصْلاً وَفَرْعًا) بەلام تەنها دایكو باوكو كورو كیژی (زەید) ناگرێتەوە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی راستتردا.

وَلاَ تَدْخُلُ قَرَابَةُ أُمٍّ فِي وَصِيَّةِالْعَرَبِ فِيالأَصَحِّ، وَالْعِبْرَةُ بِأَقْرَبِ جَدٍّ يُنْسَبُ إِلَيْهِ زَيْدٌ وَتُعَدُّ أَوْلاَدُهُ قَبِيلَةً، وَيَدْخُلُ فِي أَقْرَبِ أَقَارِبِهِ الأَصْلُ وَالْفَرْعُ، وَالأَصَحُّ تَقْدِيمُ ابْنٍ عَلَى أَبٍ وَأَخٍ عَلَى جَدٍّ، وَلاَ يُرَجَّحُ بِذُكُورَةٍ وَوِرَاثَةٍ بَلْ يَسْتَوِيالأَبُ وَالأُمُّ وَالإِبْنُ وَالْبِنْتُ وَيُقَدَّمُ ابْنُ الْبِنْتِ عَلَى ابْنِ ابْنِ الإِبْنِ، وَلَوْ أَوْصَى لأَقَارِبِ نَفْسِهِ لَمْ تَدْخُل وَرَثَتُهُ فِيالأَصَحِّ.
(فَصْلٌ) تَصِحُّ بِمَنَافِعِ عَبْدٍ وَدَارٍ وَغَلَّةِ حَانُوتٍ، وَيَمْلِكُ الْمُوصَىلَهُ مَنْفَعَةَالْعَبْدِ

---

(وَلاَ تَدْخُلُ قَرَابَةُ أُمٍّ فِي وَصِيَّةِالْعَرَبِ) لە وەسیێتیعەرەبزمانەکاندا وەسیێتیخزمان خزمایەتی دایکی ناگرێتەوە (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی راستتردا، چونکە عەرەبەکان شانازی بە خزمایەتی دایکیان ناکەنو بە خزمیان دانانێن، بەلام زۆر لە زانایانیش فەرموودەکەیتریان بە بەهێزتر داناوە: کە لە ناو گشت گەلێکدا خزمەکانی دایکیش بە خزم دادەندرێن (وَالْعِبْرَةُ بِأَقْرَبِ جَدٍّ يُنْسَبُ إِلَيْهِ) بۆ ناسینی خزمەکانیش نزیکترین باپیرە رەچاو دەکرێ کە (زَيْدٌ)ی نسبەت بدرێتە پالّو (وَتُعَدُّ أَوْلاَدُهُ قَبِيلَةً) مندالەکانی باپیرەکەش بە بەرەبابێك دابندرێن.

(وَيَدْخُلُ فِي أَقْرَبِ أَقَارِبِهِ) دێتە گەلّ نزیکترین خزمەکانی زەید (الأَصْلُ وَالْفَرْعُ) دایكو باوكو کورو کیژەکانی (زەید)، واتە: ئەگەر بلّێ: وەسیێت بێ بۆ نزیکترین خزمەکانی (زەید). ئەوە دایكو باوك مندالەکانی (زەید)ش دەگرێتەوە(وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی راستتر (تَقْدِيمُ إِبْنٍ عَلَى أَبٍ) کورو کیژو مندالەکانیشیان وەپێش باوك دێخرێنو (وَأَخٍ عَلَى جَدٍّ) هەرسێك جۆرە براو مندالەکانیشیان وەپێش باپیرە دێخرێن (وَلاَ يُرَجَّحُ بِذُكُورَةٍ وَوِرَاثَةٍ) بە هۆی نێرایەتیو میراتگرتن هیچێکیان لە هیچێکیان بەهێزتر ناکرێن (بَلْ يَسْتَوِيالأَبُ وَالأُمُّ وَالإِبن وَالْبِنْتِ) بەلکو دایكو باوكو کورو کیژو خوشكو برا گشتیان یەکسانن‌و (وَيُقَدَّمُ إِبْنُ الْبِنْتِ عَلَى إِبْنِ إِبْنِ الإِبْنِ) کوڕیکیژ وەپێش کوڕی کوڕیکوڕ دێخرێ، چونکە ئەوەیان لە ئەمەیان نزیکترە (وَلَوْ أَوْصَى لأَقَارِبِ نَفْسِهِ) ئەگەر وەسیێتی کرد بۆ خزمەکانی خۆی (لَمْ تَدْخُلْ وَرَثَتُهُ) لە وەسیێتەکەدا میراتگرەکانی نایەنە گەلّ خزمەکانی (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەیراستتردا، چونکە بە ئەغلەبی وەهایە: میراتگر وەسیێتی بۆ ناکرێ.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی چەند بڕیارێکی واتەیی وەسیێت پێکراو ﴾

(تَصِحُّ) وەسیێت دروست دەبێ (بِمَنَافِعِ عَبْدٍ وَدَارٍ) بە سوودەکانی کۆیلەو خانوو و زەویو ئاژەلّ، هەم (وَغَلَّةِ حَانُوتٍ) بە بەرهەمی دوکانو خانوو و بە میوەی باغو بەو جۆرە شتانە، جیاوازی نیە وەسیێتەکە: بۆ ماوەیەکی دیارکراو بێ، یان هەتا هەتایی بێ، جا ئەگەر ماوەکەی دیاری نەکرد، ئەوە دەبێتە هەتا هەتایی.

(وَ) هەر کاتێك وەسیێتی کرد بە سوودی کۆیلە، یان شتەکانیتر، ئەوە (يَمْلِكُ الْمُوصَىلَهُ مَنْفَعَةَ الْعَبْدِ) وەسیێت بۆکراوەکە دەبێتە خاوەنی سوودی کۆیلەکەو سوودەکانی شتەکانیتریش،

وَأَكْسَابَهُ الْمُعْتَادَةَ وَكَذَا مَهْرَهَا فِي الأَصَحِّ، لاَ وَلَدَهَا فِي الأَصَحِّ، بَل هُوَ كَالأُمِّ مَنْفَعَتُهُ لَهُ وَرَقَبَتُهُ لِلْوَارِث، وَلَهُ إِعْتَاقُهُ وَعَلَيْهِ نَفَقَتُهُ إِنْ أُوصِيَ بِمَنْفَعَتِهِ مُدَّةً وَكَذَا أَبَدًا فِي الأَصَحِّ، وَبَيْعُهُ إِنْ لَمْ يُؤَبَّدْ كَالْمُسْتَأْجَرِ،

---

کەواتە: بۆ وەسێت بۆکراوەکە دروستە: ئەو سودانە بە کرێ بداو بە خواستن بداو وەسێتی پێبکا، هەرکاتێکیش مرد لێی بە میرات دەگیرێ.

(وَأَكْسَابَهُ الْمُعْتَادَةَ) هەروەها دەبێتە خاوەنی کەسابەتەکانی کۆیلەکە: کە عادەتن (وَكَذَا مَهْرَهَا فِي الأَصَحِّ) هەروەها دەبێتە خاوەنی مارەیی جاریەکەش (لاَ وَلَدَهَا فِي الأَصَحِّ) بەڵام نابێتە خاوەنی منداڵەکەی جاریەکە (بَلْ هُوَ كَالأُمِّ مَنْفَعَتُهُ لَهُ) بەڵکو منداڵەکەش وەکو دایکەکەی سودەکەی بۆ وەسێت بۆکراوەکەیەو (وَرَقَبَتُهُ لِلْوَارِث) خودی منداڵەکەش -وەکو دایکەکەی- مڵکایەتیەکەی بۆ میراتگرەکەیە، کەوابو (وَلَهُ إِعْتَاقُهُ) بۆ میراتگرەکە دروستە کۆیلە وەسێت پێکراوەکە ئازاد بکا، ئینجا لە دوای ئازادکردنیشی ئەرکی بەخێوکردنیشی لە سەر (بيت المال)ە، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

## ﴿ بەخێوکردن و فرۆشتنی وەسێت پێکراوەکە ﴾

(وَعَلَيْهِ نَفَقَتُهُ) ئەرکی بەخێوکردنی وەسێت پێکراوکە لە سەر میراتگرەکەیە (إِنْ أُوصِيَ بِمَنْفَعَتِهِ مُدَّةً) ئەگەر تا ماوەیەکی دیارکراو وەسێت بە سودەکەی کرابێ، چونکە خودی شتەکە مڵکی میراتگرەکەیە، هەر کاتێکیش ماوەی وەسێتەکە تەواو بوو، سودی شتەکەش هەر بۆ میراتگرەکەیە، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

(وَكَذَا أَبَدًا) هەروەها ئەگەر هەتا هەتایش وەسێت بە سودەکەی کرابێ، بەخێوکردنەکەی هەر لە سەر میراتگرەکەیە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە خودی شتەکە مڵکی میراتگرەکەیە، تەنها سودەکەی بۆ وەسێت بۆکراوەکەیە، میراتگرەکەش دەتوانێ بە فرۆشتن و ئازادکردن و ئەو جۆرە شتانە خۆی لەو زیانە ڕزگار بکا.

بەڵام ئەگەر خودی شتەکە کرابێتە وەسێت، ئەو کاتە ئەرکی بەخێوکردنی لە سەر وەسێت بۆکراوەکەیە، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە، ئینجا بزانە: ئاودانی ئەو باغەی میوەکەی کراوەتە وەسێت لە سەر هیچ لایەکیان واجب نیە، کەوابو: هەر یەکێکیان ئاوی بدا، دروست نیە ئەوی‌تر ڕێگای لێبگرێ، هەروەك لە (نهاية)و (مغنی)دا فەرموویانە.

(وَبَيْعُهُ) بۆ میراتگرەکە دروستە: خودی ئەو شتە بفرۆشێ: کە وەسێت بە سودەکەی کراوە (إِنْ لَمْ يُؤَبَّدْ) بەو مەرجەی وەسێت بە سودەکەی هەتا هەتایی نەبێ (كَالْمُسْتَأْجَرِ) وەك فرشتنی شتێکی بەکرێدراو، واتە: هەروەك لە فرۆشتنی شتی بەکرێدراودا تا ماوەی بەکرێدانەکە تەواو دەبو سودی شتەکە بۆ بەکرێگرەکە بوو، لە فرۆشتنی ئەو شتەشدا کە وەسێت بە سودەکەی کراوە بۆ ماوەیەکی‌دیارکراو، تا ماوەی وەسێتەکە تەواو دەبێ

وَإِنْ أَبَّدَ فَالأَصَحُّ أَنَّهُ يَصِحُّ بَيْعُهُ لِلْمُوصَى لَهُ دُونَ غَيْرِهِ، وَأَنَّهُ تُعْتَبَرُ قِيمَةُ الْعَبْدِ كُلُّهَا مِنَ الثُّلُثِ إِنْ أُوصِيَ بِمَنْفَعَتِهِ أَبَدًا، وَإِنْ أُوصِيَ بِهَا مُدَّةً قُوِّمَ بِمَنْفَعَتِهِ ثُمَّ مَسْلُوبَهَا تِلْكَ الْمُدَّةَ وَيُحْسَبُ النَّاقِصُ مِنَ الثُّلُثِ،

---

سودەکەی هەر بۆ وەسێت بۆکراوەکەیە، ئینجا کە ماوەکە تەواو بوو، سودەکەی بۆ کرپارەکەیە.

بەلاّم (وَإِنْ أَبَّدَ) ئەگەر وەسێت بە سودەکەی هەتا هەتایی بێ، ئەوە (فَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر: (أَنَّهُ يَصِحُّ بَيْعُهُ لِلْمُوصَى لَهُ) دروستە میراتگرەکە خودی شتەکە بفرۆشێتە وەسێت بۆکراوەکە (دُونَ غَيْرِهِ) بەلاّم دروست نیە بیفرۆشێتە کەسێکی‌تر، چونکە بە هۆی وەسێتەکە شتەکە هەتا هەتایی سودەکانی لێداپناوەو جگە لە وەسێت بۆکراوەکە کەسێکی‌تر ناتوانێ سودی لێوەربگرێ.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر میراتگرەکەو وەسێت بۆکراوەکە هەردووکیان ڕێك بکەون خودی شتەکەو سودەکەی وێکڕا بفرۆشنە کەسێکی‌تر، ئەو کاتە فرۆشتنەکە دروست دەبێ‌و پارەکەش بە سەر خودی شتەکەو سودەکەیدا بەش دەکرێ بەگوێرەی نرخی خۆیان، هەروەها بۆ وەسێت بۆکراوەکەش دروستە: سودی شتەکە بفرۆشێتە میراتگرەکەو هەم بیفرۆشێتە خەڵکی‌تریش، هەروەك لە (نهاية)و (مغنى)و حاشيەكانى(تحفة)دا ڕوون کراوەتەوە.

ئینجا بزانە: ئەگەر وەسێتی کرد: هەموو ساڵێك لە بەرهەمی زەویەکەی ئەوەندە بدرێتە فلاّنە مزگەوتە، ئەوە دروست نیە: بەشێکی زەویەکە بفرۆشرێ‌و بە ئەندازەی وەسێتەکەش نەفرۆشرێ، چونکە جاری وا هەیە: ئەندازەیوەسێتەکە بە ئەندازەی هەموو کرێیەکە دەبێ‌و پێویستە گشتی بدرێتە وەسێت بۆکراوەکە، بەلاّم دروستە زەویەکە بفرۆشێتە وەسێت بۆکراوەکە، هەروەك لە (تحفة)دا ڕوون کراوەتە.

(وَأَنَّهُ) هەر بە فەرموودەی ڕاستتر (تُعْتَبَرُ قِيمَةُ الْعَبْدِ كُلُّهَا مِنَ الثُّلُثِ) نرخی کۆیلەکەو نرخی سودەکەشی گشتی لە سێیەکی ماڵ دەژمێردرێ (إِنْ أُوصِيَ بِمَنْفَعَتِهِ أَبَدًا) ئەگەر وەسێت بە سودەکەی کرابێ هەتا هەتایی، هەروەها نرخی خانووەکەو باغەکەو نرخی سودەکان‌و بەرهەمەکەشیان گشتی لە سێیەکی ماڵ دەژمێردرێ ئەگەر وەسێت بە سودەکەیان هەتا هەتایی بێ، بەلاّم (وَإِنْ أُوصِيَ بِهَا مُدَّةً) ئەگەر تا ماوەیەکی دیارکراو وەسێت بە سودەکەیان کرابێ، ئەو کاتە (قُوِّمَ بِمَنْفَعَتِهِ) یەکەمجار بە سودەکەیەوە دەقرسێندرێ (ثُمَّ مَسْلُوبَهَا تِلْكَ الْمُدَّةَ) ئینجا بە بێ‌سود لەو ماوەیەدا دەقرسێندرێ (وَيُحْسَبُ النَّاقِصُ مِنَ الثُّلُثِ) ئەو ئەندازەیەی کەمی کردۆتەوە، ئەویان لە سێیەك دەژمێردرێ، بۆ وێنە: ئەگەر بە سودەوە نرخی سەد دینار بێ‌و بە بێ‌سود نرخی نەوەد دینار بێ، ئەوە دە دینار دەبێتە وەسێت.

وَتَصِحُّ بِحَجٍّ تَطَوُّعٍ فِي‌الأَظْهَرِ، وَيُحَجُّ مِنْ بَلَدِهِ أَوِ الْمِيقَاتِ كَمَا قُيِّدَ، وَإِنْ أَطْلَقَ فَمِنَ الْمِيقَاتِ فِي‌الأَصَحِّ، وَحَجَّةُ‌الإِسْلَامِ مِنْ رَأْسِ الْمَالِ، فَإِنْ أَوْصَى بِهَا مِنْ رَأْسِ الْمَالِ أَوِ الثُّلُثِ عُمِلَ بِهِ،

---

ئینجا بزانە: ئەگەر خانووەكە ڕوخا، ئینجا هەر بە كەلوپەلەكەی خۆی دووبارە دروست كراوە، ئەوە مافی وەسێت بۆكراوەكەش دووبارە دەبێتەوە، هەروەها ئەگەر دروستیش نەكرێتەوە، مافی وەسێت بۆكراوەكە لە بەرهەمی زەویەكەیدا بەردەوامە، بەڵام ئەگەر بە كەلوپەلێكیتر دروست بكرێتەوە، ئەو كاتە وەسێت بۆكراوەكە مافی لە خانووەكەدا نامێنێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)و حاشیەكانیاندا ڕوون كراوەتەوە.

## ﴿ وەسێت بە حەج و خواپەرستیەكانیتر ﴾

(وَتَصِحُّ بِحَجٍّ تَطَوُّعٍ) وەسێتكردن دروستە بە حەج و عومرەی سوننەت (فِي‌الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، ئینجا حەج‌و عومرەی سوننەتیش لە سێیەكی‌ماڵی دەژمێردرێ‌و هەم (وَيُحَجُّ مِنْ بَلَدِهِ) بەو سێیەكە لە شاری‌خۆیەوە حەجی بۆ دەكرێ (أَوِ الْمِيقَاتِ) یان لە شوێنی ئیحرام بەستنەوە (كَمَا قُيِّدَ) چۆن داینابوو ئەوها دەكرێ، بەڵام (وَإِنْ أَطْلَقَ) ئەگەر هیچیانی دانەنابێ، ئەو كاتە (فَمِنَ الْمِيقَاتِ) لە شوێنی ئیحرام بەستنەوە حەجی بۆ دەكرێ (فِي‌الأَصَحِّ) لە فەرموودەی راسترتردا.

(وَحَجَّةُ‌الإِسْلَامِ) حەج و عومرەی ڕوكنی‌ئیسلام (مِنْ رَأْسِ الْمَالِ) لە سەرمایەی هەموو ماڵەكەی دەژمێردرێ، جیاوازی نیە: وەسێتی كردبێ بۆی بكرێ، یان نا، وەكو قەرزەكانی‌تروگشت واجبەكانی‌تری شەرعی: وەك زەكات‌و كەففارەت‌و حەجی‌نەزركراو لە حاڵەتی لەش ساغی‌دا، واتە: ئەوانەش وەكو حەج‌و عومرەی ڕوكنی‌ئیسلام لە سەرمایەی هەموو ماڵەكەی دەژمێردرێن، نەك تەنها لە سێیەك، بەڵكو ئەگەر لە ژیانیا حەج‌و عومرەی لە سەر واجب بوبن، ئەو كاتە واجبە: پێش جێبەجێ‌كردنی وەسێت‌و بەشكردنی میراتەكە حەجی بۆ بكرێ، هەروەك لە سەرەتای (الفرائض)دا ڕوونمان كردەوە.

ئینجا بزانە: مەبەست بە حەج و عومرەی سوننەت ئەوانەیە: كە لە دوای حەج‌و عومرەی ڕوكنی‌ئیسلام دووبارە دەكرێن، بەڵام (حَجَّةُ‌الإِسْلَام)=حەج‌و عومرەی ڕوكنی‌ئیسلام ئەوانەیە: كە بۆ یەكەمجار لە تەمەنیا دەكرێ، هەر چەند لە سەریشی واجب نەبوبێ، واتە: حەج و عومرەكە بۆی بە بەر واجبی ڕوكنی‌ئیسلام دەكەوێ.

(فَإِنْ أَوْصَى بِهَا) جا ئەگەر وەسێتی كرد حەجی ڕوكنی‌ئیسلامی بۆ بكرێ (مِنْ رَأْسِ الْمَالِ) لە سەرمایەی هەموو ماڵەكەی (أَوِ الثُّلُثِ) یان لە سێیەكی ماڵەكەی، ئەوە (عُمِلَ بِهِ) ڕەفتار بە قسەكەی دەكرێ، جا ئەگەر سێیەكی ماڵەكەی بەر وەستی كرێی حەج‌و

**وَإِنْ أَطْلَقَ الْوَصِيَّةَ بِهَا فَمِنْ رَأْسِ الْمَالِ، وَقِيلَ مِنَ الثُّلُثِ وَيُحَجُّ مِنَ الْمِيقَاتِ، وَلِلأَجْنَبِيِّ أَنْ يَحُجَّ عَنِ الْمَيِّتِ بِغَيْرِإِذْنِهِ**

---

عومرەکەی ڕوکنی‌ئیسلامی نەکرد، ئەو کاتە واجبە کرێیەکە لە سەرمایەی هەموو ماڵەکەی تەواو بکرێ، بەڵام ئەگەر سێیەك بەر وەستی حەج‌و عومرەی سوونەت نەکا، ئەو کاتە وەسێتەکە بەتاڵ دەبێتەوەو وەسێت پێکراوەکەش بۆ میراتگرەکان دەگەڕێتەوە، هەروەك لە زۆبەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

بەڵام (وَإِنْ أَطْلَقَ الْوَصِيَّةَ بِهَا) ئەگەر بێ دیارکردن وەسێتی کرد حەجی ڕوکنی‌ئیسلامی بۆ بکرێ، ئەوە (فَمِنْ رَأْسِ الْمَالِ) لە سەرمایەی هەموو ماڵەکەی حەجی بۆ دەکرێ (وَقِيلَ مِنَ الثُّلُثِ) لە فەرموودەیەکی بێ‌هێزدا: لە سێیەکی ماڵەکەی بۆی دەکرێ، جا بە هەردوو فەرموودەکان: (وَيُحَجُّ مِنَ الْمِيقَاتِ) واجبە: لە شوێنی ئیحرام بەستنەوە حەجی بۆ بکرێ، واتە: ئەو کەسەی حەج لەجیاتی ئەو مردووە دەکا، واجبە: لە (میقات)ێکی شەرعیەوە ئیحرام ببەستێ، هەروەك لە پەڕتووکی‌حەجدا بە درێژی ڕوونمان کردەوە.

﴿ **ئاگاداری** ﴾: ئەگەر وەسێتی کردو گوتی فلانکەس بە ئەوەندە پارەیە بنێرن حەجم بۆ بکا. ئەوە دروست نیە لەو ئەندازەیە کەمتری بدرێتێ، هەرچەند کەسێکی‌تریش هەبێ بە کەمتر حەجی بۆ بکا، بەڵام ئەگەر هیچ کەسێکی دیاری نەکرد، بەڵکو تەنها گوتی بە ئەوەندە پارەیە حەجم بۆ بکەن. ئینجا کەسێکیان دەست کەوت بە کەمتر لەو ئەندازەیە حەجی بۆ دەکرد، ئەو کاتە دروستە بە کەمتر بە کرێی بگرن‌و پاشماوەکەش بۆ میراتگرەکان دەگەڕێتەو.

ئینجا بزانە: ئەگەر وەسێتکەرەکە لە وەسێتەکەیدا یەکێکی‌دیاری کرد حەجێ بۆ بکا، ئینجا دیارکراوەکەش ڕەدی کردەوەو گوتی هەرگیز حەجی بۆ ناکەم. ئەو کاتە واجبە یەکێکی‌تری بۆ بەکرێ بگرن تاکو حەجی بۆ بکا، بەڵام ئەگەر دیارکراوەکە گوتی: ئەمساڵ ناتوانم‌و لە دوای ساڵێکی‌تر حەجی بۆ دەکەم. ئەو کاتە تەماشا دەکەین: ئەگەر لە ژیانیا حەجی لە سەر واجب بوبێ‌و بە هۆی کەمتەرخەمی حەجی نەکردبێ، ئەو کاتە واجبە: یەکێکی‌تری بۆ بەکرێ بگرن تاکو ئەمساڵ حەجی بۆ بکا، بەڵام ئەگەر حەجی لە سەر واجب نەبوبێ، ئەو کاتە دوا دێخرێ تاکو دیارکراوەکەی حەجی بۆ بکا، هەروەك لە زۆریەی سەرچاوەکاندا ناوەڕۆکی ئەم ئاگاداریە ڕوون کراوەتەوە.

دیسان بزانە: هەروەك بۆ میراتگرەکە دروستە: بە بێ‌ئیزن حەج‌و عومرە لە جیاتی مردووەکەی بکا، ئەوەهاش (وَلِلأَجْنَبِيِّ) بۆ کەسێکی‌بێگانە دروستە: (أَنْ يَحُجَّ عَنِ الْمَيِّتِ) بە ماڵی‌خۆی لەجیاتی مرۆڤێکی‌مردوو حەج و عومرەی ڕوکنی‌ئیسلام بکا (بِغَيْرِ إِذْنِهِ) بە بێ‌ئیزنی

فِيالأَصَحِّ، وَيُؤَدِّيالْوَارِثُ عَنْهُ الْوَاجِبَ الْمَالِيَّ فِي كَفَّارَةٍمُرَتَّبَةٍ، وَيُطْعِمُ وَيَكْسُو فِيالْمُخَيَّرَةِ، وَالأَصَحُّ أَنَّهُ يُعْتِقُ أَيْضًا، وَأَنَّ لَهُ الأَدَاءَ مِنْ مَالِهِ إِذَا لَمْ تَكُنْ تَرِكَةٌ، وَأَنَّهُ يَقَعُ عَنْهُ لَوْ تَبَرَّعَ أَجْنَبِيٌّ بِطَعَامٍ أَوْ كِسْوَةٍ، لاَ إِعْتَاقٍ فِيالأَصَحِّ،

---

میراتگرەكەو هەم بێئیزنیمردووەكەش، هەر چەند مردووەكەش لە ژیانیا حەجی لە سەر واجب نەبوبێ، هەروەها دروستە حەجو عومورەی نەزركراویشی لەجیاتی بكا (فِیالأصَحِّ) لە فەرموودەیڕاستتردا، هەروەك دروستە زەكاتو قەرزەكانیشی لەجیاتی بداتەوە.

بەڵام حەجی سوننەت-ئەگەر وەسیّتی نەكردبێ- دروست نیە: نە بێگانەو نە میراتگرەكەی بۆی بكا، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە، بەڵام لە فەرموودەیەكی بێهێزدا-ئەگەر مردووەكە وەسیّتیشی نەكردبێ-دروستە: میراتگرەكەی حەجی سوننەتی لەجیاتی بكاو هەم دروستە: بێگانەش بە ئیزنیمیراتگرەكە لە جیاتیی بكا، هەروەك لە (حەجی مردوو و پەككەوتوو)دا ڕوونمان كردەوە.

(وَ) هەروەها (يُؤَدِّيالْوَارِثُ عَنْهُ الْوَاجِبَ الْمَالِيَّ) واجبە: مراتگرەكە-لە میراتیمردووكە- ئەو واجبانەی ماڵین لەجیاتیی بداتەوە (فِي كَفَّارَةٍ مُرَتَّبَةٍ) لەو كەففارەتەی ڕیزی بۆ داندراوە: وەك كەففارەتی كوشتنو (ظهار)و (جماع)ی ڕۆژانی ڕەمەزان.

(وَ) هەروەها (يُطْعِمُ وَيَكْسُو فِيالْمُخَيَّرَةِ) خواردن دەداتە هەژارانو بەرگیان دەكا لەو كەففارەتەی ڕیزی تێدا نیە: وەك كەففارەتیسوێند (وَالأَصَحُّ أَنَّهُ يُعْتِقُ أَيْضًا) بە فەرموودەی ڕاستتر كۆیلەشی لەجیاتی ئازاد دەكا لەو كەففارەتەدا.

(وَ) هەر بە فەرموودەی ڕاستتر (أَنَّ لَهُ الأَدَاءَ مِنْ مَالِهِ) بۆ میراتگرەكە دروستە، بەڵكو سوننەتە: لە ماڵیخۆی كەففارەتەكەی لەجیاتی بدا (إِذَا لَمْ تَكُنْ تَرِكَةٌ) ئەگەر مردووەكە هیچ میراتی نەبێ، هەروەها ئەگەر میراتیشی هەبێ، هەر دروستە: میراتگرەكە لە ماڵیخۆی لەجیاتیی بدا.

(وَ) هەر بەفەرموودەی ڕاستتر: (أَنَّهُ يَقَعُ عَنْهُ) بەر مردووەكە دەكەوێ (لَوْ تَبَرَّعَ أَجْنَبِيٌّ بِطَعَامٍ أَوْ كِسْوَةٍ) ئەگەر بێگانەیەك لەخۆیەوە بە خۆڕایی خواردن، یان جلو بەرگی كەففارەتی لەجیاتی بدا (لاَ إِعْتَاقٍ) بەڵام كۆیلە ئازادكردنی بێگانە بە بەر مردووەكە ناكەوێ (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

ئینجا بزانە: ئەگەر مردووەكە بە قەرزداری مرد، هیچ میراتیشی نەبو، بەڵام میراتگرەكەی قەرزەكەی لەجیاتی داوە خاوەن قەرزەكە، ئەوە واجبە: لێی وەریگرێتەوە، یان گەردەنی مردووەكە ئازاد بكا، بەڵام ئەگەر بێگانەیەك لە جیاتیمردووكە بیداتەوە، ئەو كاتە لە سەر خاوەن قەرزەكە واجب نیە قبوڵی بكاو لێی وەریگرێتەوە، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.

وَتَنْفَعُ الْمَيِّتَ صَدَقَةٌ وَدُعَاءٌ مِنْ وَارِثٍ وَأَجْنَبِيٍّ.
(فَصْلٌ) لَهُ الرُّجُوعُ عَنِ الْوَصِيَّةِ

---

## ﴿ خێرکردن و دوعاکردن بۆ مردوو ﴾

(وَتَنْفَعُ الْمَيِّتَ) سود دەداتە مردووەکە (صَدَقَةٌ) خێر بۆکردن‌و هەم (وَدُعَاءٌ) دوعا بۆکردن، جا دوعایەکەو خێرەکەش (مِنْ وَارِثٍ وَأَجْنَبِيٍّ) لە میراتگرو لە بێگانەوە سودی دەداتێ، بە (إجماع)ی زانایانی‌ئیسلام، دەربارەی دوعاکردنی میراتگر پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إذا مَاتَ ابْنُ آدَمَ إنْقَطَعَ عَمَلُهُ إلاَّ مِنْ ثَلاَثٍ: صَدَقَةٍ جَارِيَةٍ أَوْ عِلْمٍ يُنْتَفَعُ بِهِ أَوْ وَلَدٍ صَالِحٍ يَدْعُو لَهُ﴾ رواه مسلم، هەر کاتێك ئادەمیزاد مرد، پاداشتی کردەوەکەی خۆی دەبڕێتەوە تەنها لە سێ کردەوە نەبێ: خێرێکی نەبڕاوە، یان زانستێکی بە سود، یان منداڵێکی باش کە دوعای بۆ بکا.

هەروەها لە بارەی دوعای بێگانەش پێغەمبەرﷺ -هەر کاتێك مردووی دەناشت- دەیفەرموو: ﴿إسْتَغْفِرُوا لأَخِيكُمْ وَاسْأَلُوا لَهُ التَّثْبِيتَ فَإنَّهُ الآنَ يُسْأَلُ﴾ رواه أبوداود بسند قوي، لە خوا بپاڕێنەوە لەم برایەتان خۆش ببێ‌و دوعای بۆ بکەن وەڵامی فریشتەکان بداتەوە، چونکە ئێستا پرسیاری لێدەکرێ.

هەروەها دەربارەی خێرکردنیش پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إنَّ اللهَ لَيَرْفَعُ دَرَجَةَ الْعَبْدِ فِي الْجَنَّةِ، فَيَقُولُ: يَارَبِّ أَنَّى لِي هَذا؟ فَيُقَالُ: بِإسْتِغْفَارِ وَلَدِكَ لَكَ﴾ رواه الامام أحمد بإسناد صحيح، خوای گەورە لە بەهەشتدا پلەی بەندەکەی بەرز دەکاتەوە، بەندەکەش دەڵێ: خوایە ئەم پلەیەم لەکوێ وەدەست کەوتوە؟ جا پێی دەگوترێ: بە هۆی ئاودانی منداڵەکەت بە خێری تۆ.

ئینجا بزانە: لە مەزهەبی ئیمامی(الشافعي)دا: خێری قورئانخوێندن ناگاتە مردوو، بەڵام لە هەرسێك مەزهەبەکەی‌ترداو لە فەرموودەیەکی بێهێزی مەزهەبی(الشافعي)دا: خێری قورئانخوێندنیش دەگاتە مردووەکەو سودی لێوەردەگرێ، واتە: بەو مەرجەی لە دوای قورئانخوێندنەکە دوعا بکاو بڵێ: خوایە خێری ئەم قورئانخوێندنەم بگەیەنە فلانە مردوە. یان لە سەر گۆڕەکەی قورئان بخوێنێ، یان هەر لە سەرەتاوە نیەتی ئەوەبێ: خێری قورئانخوێندنەکەی بۆ مردووەکە بێ، هەروەك لە (تحفة)و حاشیەکانی‌دا ڕوون کراوەتەوە. ئیتر لە باسی (بە کرێ‌گرتن بۆ خواپەرستی)و لە باسی (زیارەتی گۆڕستان‌و خێرکردن بۆ مردوو) ئەم باسە درێژتر ڕوون کراوەتەوە بگەڕێوە بۆیان.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی پەشیمانبوونەوە لە وەسێت ﴾

(لَهُ الرُّجُوعُ عَنِ الْوَصِيَّةِ) بۆ وەسێتکەرەکە دروستە: لە وەسێتەکەی پەشیمان ببێتەوە، واتە: لە هەموو ئەو خێرو بەخشینانەی بە مردنیەوە هەڵیواسیون، بە (إجماع)ی زانایانی‌ئیسلام

وَعَنْ بَعْضِهَا بِقَوْلِه: نَقَضْتُ الْوَصِيَّةَ أَوْ أَبْطَلْتُهَا أَوْ رَجَعْتُ فِيهَا أَوْ فَسَخْتُهَا أَوْ هَـذَا لِوَارِثِي. وَبِبَيْعٍ وَإِعْتَاقٍ وَإِصْدَاقٍ وَكَذَا هِبَةٌ أَوْ رَهْنٍ مَعَ قَبْضٍ وَكَذَا دُونَهُ فِي الأَصَحِّ، وَبِوَصِيَّةٍ بِهَذِهِ التَّصَرُّفَاتِ، وَكَذَا تَوْكِيلٌ فِي بَيْعِه وَعَرْضِه عَلَيْهِ فِي الأَصَحِّ، وَخَلْطُ حِنْطَةٍ مُعَيَّنَةٍ رُجُوعٌ، وَلَوْ وَصَّى بِصَاعٍ مِنْ صُبْرَةٍ فَخَلَطَهَا بِأَجْوَدَ مِنْهَا فَرُجُوعٌ، أَوْ بِمِثْلِهَا فَلاَ، وَكَذَا بِأَرْدَأَ فِي الأَصَحِّ، وَطَحْنُ حِنْطَةٍ وَصَّى بِهَا وَبَذْرُهَا وَعَجْنُ دَقِيقٍ وَغَزْلُ قُطْنٍ

---

(وَعَنْ بَعْضِهَا) هەم دروستە: لە بەشێكی وەسێتەكەشی پەشیمان ببێتەوەو لە بەشێكیشی پەشیمان نەبێتەوە، بەڵام ئەو خێرو بەخشینانەی لە نەخۆشی‌مردنی‌دا كردونی‌و دەسبەجێ بڕاندونیەوە، دروست نیە لێیان پەشیمان ببێتەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

ئینجا پەشیمانبوونەوەكەش (بِقَوْلِه) بەوە دەبێ بڵێ: (نَقَضْتُ الْوَصِيَّةَ) وەسێتەكەم هەڵوەشاندەوە (أَوْ أَبْطَلْتُهَا) یان بەتاڵم كردەوە (أَوْ رَجَعْتُ فِيهَا) یان لێی پەشیمان بومەوە (أَوْ فَسَخْتُهَا) یان فەسخم كردەوە (أَوْ هَذَا لِوَارِثِي) یان ئەم وەسێت پێكراوە بۆ میراتگرەكەم بێ (وَ) هەروەها پەشیمانبوونەوە دێتە جێ (بِبَيْعٍ) بە فرۆشتنی وەسێت پێكراوەكەو (وَإِعْتَاقٍ) بە ئازادكردنی‌و (وَإِصْدَاقٍ) هەم بەوەی وەسێت پێكراوەكە بكاتە مارەیی ژن (وَكَذَا هِبَةٌ) هەروەها بەوەی وەسێت پێكراوەكە ببەخشێتە كەسێكی‌ترو (أَوْ رَهْنٍ مَعَ قَبْضٍ) یان ڕەهنی بكاو بەخشراوەكەو ڕەهنەكەش وەربگیرێن (وَكَذَا دُونَهُ) هەروەها ئەگەر وەریش نەگیرێن هەر دەبێتە پەشیمانبوونەوە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَ) هەروەها پەشیمانبوونەوە دێتە جێ (بِوَصِيَّةٍ بِهَذِهِ التَّصَرُّفَاتِ) بە وەسێتكردن بە یەكێك لەو دەستكاریانەی‌ڕابردوو، واتە: وەسێت بكا وەسێت پێكراوەكە بفرۆشرێ، یان ببەخشرێ ...هتد (وَكَذَا تَوْكِيلٌ فِي بَيْعِه) هەروەها وەكیلگرتن بۆ فرۆشتنی وەسێت پێكراوەكەو هەم (وَعَرْضِه عَلَيْهِ) وەكیلگرتن بۆ پێشاندانی بۆ فرۆشتن، یان وەكیلگرتن بۆ بەخشین، ئەوانەش گشتی دەبنە پەشیمانبوونەوە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَخَلْطُ حِنْطَةٍ مُعَيَّنَةٍ) تێكەڵكردنی گەنمێكی دیاركراو كە وەسێتی پێ‌كردبێ، ئەوەش (رُجُوعٌ) پەشیمانبوونەوەیە (وَلَوْ وَصَّى بِصَاعٍ مِنْ صُبْرَةٍ) ئەگەر وەسێتی كرد بە ڕپەیەك لە كۆمەڵە گەنمێك (فَخَلَطَهَا بِأَجْوَدَ مِنْهَا) ئینجا تێكەڵی گەنمێكی باشتری كرد (فَرُجُوعٌ) ئەوە بە پەشیمانبوونەوە دادەندرێ (أَوْ بِمِثْلِهَا) بەڵام ئەگەر تێكەڵی گەنمێكی وەكو خۆی كرد (فَلاَ) ئەوە بە پەشیمانبوونەوە داناندرێ (وَكَذَا بِأَرْدَأَ) هەروەها ئەگەر تێكەڵی گەنمێكی خراپتریشی بكا، هەر نابێتە پەشیمانی (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَطَحْنُ حِنْطَةٍ وَصَّى بِهَا) هاڕینی ئەو گەنمەی وەسێتی پێ‌كردوەو، هەم (وَبَذْرُهَا) وەشاندنی بە ناو زەوی‌دا، هەم (وَعَجْنُ دَقِيقٍ) كردنە هەویری ئاردەكە، هەم (وَغَزْلُ قُطْنٍ)

وَنَسْجُ غَزْلٍ وَقَطْعُ ثَوْبٍ قَمِيصًا وَبِنَاءٌ وَغِرَاسٌ فِي عَرْصَةٍ رُجُوعٌ.

(فَصْلٌ) يُسَنُّ الإِيصَاءُ بِقَضَاءِ الدَّيْنِ وَتَنْفِيذِالْوَصَايَا وَالنَّظَرِ فِي أَمْرِالأَطْفَالِ، وَشَرْطُ الْوَصِيِّ: تَكْلِيفٌ وَحُرِّيَّةٌ وَعَدَالَةٌ وَهِدَايَةٌ إِلَيالتَّصَرُّفِ فِيالْمُوصَىبِهِ وَإِسْلاَمٌ، لَكِنَّ الأَصَحَّ جَوَازُ وَصِيَّةِ ذِمِّيٍّ إِلَى ذِمِّيٍّ، وَلاَ يَضُرُّ الْعَمَى فِيالأَصَحِّ، وَلاَ تُشْتَرَطُ الذُّكُورَةُ،

---

ڕستنی پەمۆیەکە، هەم (وَنَسْجُ غَزْلٍ) چنینی داوەکە، هەم (وَقَطْعُ ثَوْبٍ قَمِيصًا) بڕینی قوماشەکە بۆ کردنە جلو بەرگ، هەم (وَبِنَاءٌ) خانوو دروستکردنو (وَغِرَاسٌ) درەخت چاندن (فِي عَرْصَةٍ) لە زەویەکەی وەسێت پێکراودا، ئەوانە گشتی (رُجُوعٌ) دەبنە پەشیمانبوونەوە لە وەسێتەکە.

ئینجا بزانە: ئەگەر شتێکی کردە وەسێت بۆ (محمد)، ئینجا هەمان شتی کردە وەسێت بۆ (خالد)، ئەوە نابێتە پەشیمانی، بەڵکو هەردووکیان دەبنە هاوبەش لە وەسێت پێکراوەکەدا، هەروەك لە (تحفة)و (مغنی)دا فەرموویانە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی دانانی سەرەوسێت ﴾

سەرەوسێت ئەو کەسەیە: وەسێتکەرەکە کاروباری خۆی دەداتە دەست تاکو لە دوای مردنی بۆی جێبەجێ بکا ئەوەش بە (إجماع)ی زانایانی ئیسلامە، هەم ﴿عن ابن مسعودﷺ: أَنَّهُ أَوْصَى إِلَىالزُّبَيْرِ وَابْنِهِ عَبْدِاللهِرضي الله عنهما﴾ رواه البيهقي بإسناد حسن، (عبدالله بن مسعود) حەزرەتی(زبیر)و (عبدالله)ی کوڕی کردنە سەر وەسێتی خۆی.

کەوابو: (يُسَنُّ الإِيصَاءُ) بۆ گشت کەسێك سوننەتە: وەسێت لە لای کەسێك بکاو بیکاتە سەرەوسێت (بِقَضَاءِ الدَّيْنِ) بۆ ئەوەی قەرزەکانی بۆ بداتەوە، جا قەرزی خوای گەورە بن: وەکو زەکاتو کەففارەت، یان قەرزی ئادەمیزاد بن، هەروەها بۆ ئەوەی ئەمانەتەکانی بۆ تەسلیمی خاوەنەکانیان بکاتەوەو مافیستەملێکراوەکانی بداتەوە.

(وَ) هەروەها (تَنْفِيذِ الْوَصَايَا) بۆ ئەوەی وسێتەکانی بۆ جێبەجێبکا، هەم (وَالنَّظَرِ فِي أَمْرِ الأَطْفَالِ) بۆ ئەوەی سەرپەرشتی کاروباری منداڵەکانی بکا.

(وَشَرْطُ الْوَصِيِّ) مەرجی ئەو کەسەی دەکرێتە سەرەوسێت (تَكْلِيفٌ) ئەوەیە: بالغو عاقڵ بێو (وَحُرِّيَّةٌ) ئازاد بێو (وَعَدَالَةٌ) دادپەروەر بێو (وَهِدَايَةٌ إِلَيالتَّصَرُّفِ) شارەزایی هەبێ بۆ دەستکاریکردن (فِيالْمُوصَىبِهِ) لە وەسێت پێکراوەکەدا، هەم (وَإِسْلاَمٌ) موسوڵمانیش بێ (لَكِنَّ الأَصَحَّ) بەڵام بە فەرموودەی ڕاستتر (جَوَازُ وَصِيَّةِ ذِمِّيٍّ إِلَى ذِمِّيٍّ) دروستە: کافرێکی پەیمان لەئەستۆ وەسێتی خۆی لە لای کافرێکی پەیمان لەئەستۆ بکا (وَلاَ يَضُرُّ الْعَمَى) کوێریی سەرەوسێتەکە زیانی نیە (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَلاَ تُشْتَرَطُ الذُّكُورَةُ) هەروەها نێرایەتیش بە مەرج دانانرێ، بە (إجماع)ی زانایان، هەم ئیمامی (عمر)یشﷺ وەسێتی لە لای (حَفصَة)ی کیژیخۆی کرد، هەروەك (أبوداود)

وَأُمُّ الأَطْفَالِ أَوْلَى مِنْ غَيْرِهَا، وَيَنْعَزِلُ الْوَصِيُّ بِالْفِسْقِ وَكَذَاالْقَاضِــي فِيالأَصَــحِّ، لاَ الإِمَامُ الأَعْظَمُ، وَيَصِحُّ الإِيصَاءُ بِقَضَاءِ الدُّيُونِ وَتَنْفِيذِالْوَصِيَّةِ مِنْ كُلِّ حُــرٍّ مُكَلَّــفٍ، وَيُشْتَرَطُ فِي أَمْرِالأَطْفَالِ مَعَ هَذَا: أَنْ يَكُونَ لَهُ وِلاَيَةٌ عَلَيْهِمْ، وَلَيْسَ لِوَصِيٍّ إِيصَاءٌ فَــإِنْ أُذِنَ لَهُ فِيهِ جَازَ لَهُ فِيالأَظْهَرِ،

---

گێڕاویەتیەوە، کەوابو: (وَأُمُّ الأَطْفَالِ) دایکیمنداڵەکان ئەگەر مەرجەکانیڕابردووی لێبێنە جێ (أَوْلَى مِنْ غَيْرِهَا) لەپێشترە لە پیاو و ئافرەتەکانیتر: بۆ ئەوەی بکرێتە سەروەسێتی منداڵەکانی، چونکە زیاتر بەزەیی پێیاندا دێ.

(وَيَنْعَزِلُ الْوَصِيُّ بِالْفِسْقِ) سەروەسێتەکە بە هۆی (فاسق)بوون لە سەروەسێتی دەکەوێ، بەڵکو باوکو باپیرەو ئەو سەرپەرشکارەی لە لای قازییەوە داندراوە، ئەوانیش بە هۆی (فاسق)بوونیان لە سەرپەرشتکارەیەتی دەکەون، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە (وكَذَاالْقَاضِي) هەروەها (قازی)ش بە هۆی (فاسق)بوون لە قازیەتی دەکەوێ (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەیڕاستتردا (لاَ الإِمَامُ الأَعْظَمُ) بەلام پێشەوایگەورەتر بە (فاسق)بوون لە پێشەوایەتی ناکەوێ، چونکە بەرژەوەندیە گشتیەکان بە ویەوە بەستراونەوەو کاروباری وولات تێك دەچێ.

مەرجیوەسێتکەرەکە: (وَيَصِحُّ الإِيصَاءُ) سەروەسێت دانان دروست دەبێ (بِقَضَاءِ الدُّيُونِ) بۆ دانەوەی قەرزەکانو گشت مافەکانیتر، هەم (وَتَنْفِيذِالْوَصِيَّةِ) بۆ جێبەجێکردنی وەسێت: (مِنْ كُلِّ حُرٍّ مُكَلَّفٍ) لە گشت وەسێتکەرێکەوە: کە ئازاد بێو بالغو عاقلێ بێو بە خۆشیخۆی بێ.

(وَ) هەروەها (يُشْتَرَطُ فِي أَمْرِ الأَطْفَالِ) لە دانانی سەروەسێتدا بۆ کاروباری منداڵەکانی بە مەرج دادەندرێ (مَعَ هَذَا) لەگەڵ چوار مەرجەکەیڕابردوو (أَنْ يَكُونَ لَهُ وِلاَيَةٌ عَلَيْهِمْ) وەسێتکەرەکە مافی سەرپەرشیکاریەتی شەرعیی بە سەر ئەو منداڵانەدا هەبێ: وەك باوكو باپیرە، نەك وەکو مامو برا.

بەلام لە فەرموودەی بێهێزی مەزهەبی ئیمامی(الشافعی)دا:-ئەگەر باوکو باپیرە نەبن- دایك دەبێتە سەرپەرشتکاریمنداڵەکانی، هەروەك لە باسی (سەرپەرشکاری منداڵ)دا ڕوونمان کردەوە، کەوابو: بەو فەرموودەیە-ئەگەر باوکو باپیرە نەبون- دایکیش دەتوانێ سەروەسێت بۆ کاروباری منداڵەکانی دابنێ، هەروەك (مغنی)ش ئاماژەی بۆ کردووە.

(وَلَيْسَ لِوَصِيٍّ إِيصَاءٌ) بۆ هیچ سەروەسیەتێك دروست نیە: سەروەسێتێکیتر دابنێ، بەلام (فَإِنْ أُذِنَ لَهُ فِيهِ) ئەگەر سەروەسێتەکە لە لایەن وەسێتکەرەکە ئیزن درابێ سەروەسێتێکیتر دابنێ، ئەو کاتە (جَازَ لَهُ) بۆی دروستە سەر وەسێتێکیتر دابنێ (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەیبەهێزتردا.

وَلَوْ قَالَ: أَوْصَيْتُ إِلَيْكَ إِلَى بُلُوغِ ابْنِي أَوْ قُدُومِ زَيْدٍ فَإِذَا بَلَغَ أَوْ قَدِمَ فَهُوَ الْوَصِيُّ جَازَ، وَلاَ يَجُوزُ نَصْبُ وَصِيٍّ وَالْجَدُّ حَيٌّ بِصِفَةِالْوِلاَيَةِ، وَلاَ الإِيصَاءُ بِتَزْوِيجِ طِفْلٍ وَبِنْتٍ، وَلَفْظُهُ: أَوْصَيْتُ إِلَيْكَ أَوْ فَوَّضْتُ وَنَحْوُهُمَا. وَيَجُوزُ فِيهِ التَّوْقِيتُ وَالتَّعْلِيقُ، وَيُشْتَرَطُ بَيَانُ مَا يُوصِي فِيهِ، فَإِنْ اقْتَصَرَ عَلَى أَوْصَيْتُ إِلَيْكَ. لَغَا، وَالْقَبُولُ

---

ئینجا بزانە: دروستە سەروەسیێت دانانەکە بۆ ماوەیەکی دیارکراو بێ و هەم دروستە: دانانەکەش بە شتێکەوە هەڵبواسرێ، بۆ وێنە: (وَلَوْ قَالَ) ئەگەر وەسیێتکەرەکە گوتی: (أَوْصَيْتُ إِلَيْكَ إِلَى بُلُوغِ ابْنِي أَوْ قُدُومِ زَيْدٍ فَإِذَا بَلَغَ أَوْ قَدِمَ فَهُوَ الْوَصِيُّ) وەسیێتم لە لای تۆ کردو تۆم کردە سەروەسیێت تا کوڕەکەم بلۆغی دەبێ. یان گوتی: تا فلانکەس دێتەوە، جا هەر کاتێك کوڕەکەم بلۆغی بوو ئەو ببێتە سەر وەسیێتم، یان هەرکاتێك فلانکەس هاتەوە ئەو ببێتە سەر وەسیێتم. ئەوە (جَازَ) سەروەسیێت دانانەکە لە هەردوو مەسەلەکەدا دروستە.

(وَلاَ يَجُوزُ نَصْبُ وَصِيٍّ) بۆ باوکی منداڵەکان دروست نیە: سەر وەسیێتێك دابنێ–(وَالْجَدُّ حَيٌّ) لەو حاڵەتەدا کە باپیرەش زیندوو بێ– (بِصِفَةِ الْوِلاَيَةِ) بە ناوی سەرپەرشکاریەتی لە سەر منداڵەکان، چونکە شەرع ئەو مافەی داوەتە باپیرە، کەوابو: باوك ناتوانێ مافەکە بداتە کەسێکیتر (وَلاَ الإِيصَاءُ) هەروەها دانانی سەروەسیێت دروست نیە (بِتَزْوِيجِ طِفْلٍ وَبِنْتٍ) بۆ مارەبڕینی کوڕ، یان کچ، هەرچەند باپیرەش نەمابێ.

(وَلَفْظُهُ) ووشەی دانانی سەروەسیێت: (أَوْصَيْتُ إِلَيْكَ) وەسیێتم لە لای تۆ کرد بۆ ئەوکارە (أَوْ فَوَّضْتُ إِلَيْكَ) یان بڵێ: ئەو کارەم دا بەدەستە تۆ لە دوای مردنم (وَنَحْوُهُمَا) ئەوەی وەکو ئەو دووانەش بێ: وەك بڵێ: تۆم لە جێی خۆم دانا بۆ کاروباری منداڵەکانم لە دوای مردنم (وَيَجُوزُ فِيهِ التَّوْقِيتُ) لە دانانی سەروەسیێتدا دانانی کاتێکی دیارکراویش دروستە، وەك بڵێ: بۆ ماوەی ساڵێك تۆم کردە سەروەسیێت. یان تا کوڕەکەم بلۆغی دەبێ. هەروەك ڕابرا (وَالتَّعْلِيقُ) هەم هەڵواسینیشی بە شتێکەوە دروستە، وەك بڵێ: هەر کاتێك سەروەسیێتەکەم مرد تۆم کردە سەروەسیێت، یان هەرکاتێك کوڕەکەم بلۆغی بوو ئەوم کردە سەر وەسیێت. هەروەك ڕابرا.

(وَيُشْتَرَطُ) بە مەرج دادەندرێ (بَيَانُ مَا يُوصِي فِيهِ) ئەو شتەی وەسیێتی تێدا دەکا ڕوونی بکاتەوە، وەك بڵێ: فلانکەس سەروەسیێتی منە بۆ دانەوەی قەرزەکانم. یان تۆم کردە سەروەسیێت بۆ کاروباری منداڵەکانم (فَإِنْ اقْتَصَرَ عَلَى أَوْصَيْتُ إِلَيْكَ) ئەگەر تەنها گوتی: وەسیێتم لە لای تۆ کرد. یان تۆ سەروەسیێتی منی. ئەوە (لَغَا) دانانی سەروەسیێتەکە پوچەڵ دەبێتەوە (وَالْقَبُولُ) هەروەها بە مەرج دادەندرێ: سەروەسیێتەکەش لە دوای

وَلاَ يَصِحُّ فِى حَيَاتِهِ فِى الأَصَحِّ، وَلَوْ وَصَّى اثْنَيْنِ لَمْ يَنْفَرِدْ أَحَدُهُمَا إلاّ إنْ صَرَّحَ بِهِ، وَلِلْمُوصِى وَالْوَصِيِّ اَلْعَزْلُ مَتَى شَاءَ، وَإِذَا بَلَغَ الطِّفْلُ وَنَازَعَهُ فِى الإِنْفَاقِ عَلَيْهِ صُدِّقَ الْوَصِيُّ،

---

مردنی وەسێتکەرەکە قبولّ بکا ببێتە سەروەسێت (وَلاَ يَصِحُّ فِى حَيَاتِهِ) قبولکردن‌و ڕەدکردنەوە هیچێکیان لە حاڵەتی زیندووەتی وەسێتکەرەکەدا دروست نابن (فِى الأَصَحِّ) لە فەرموودی ڕاستتردا.

(وَلَوْ وَصَّى اثْنَيْنِ) ئەگەر دوو کەسی کردنە سەروەسێت (لَمْ يَنْفَرِدْ أَحَدُهُمَا) نابێ یەکێکیان بە تەنها کارەکە بکا، بەڵکو پێویستە وێکڕا بن (الاّ إنْ صَرَّحَ بِهِ) مەگەر بە ئاشکرا گوتبێتی هەر یەکەتان بە تەنها کارەکە بکا. یان بڵێ: هەر یەکەتان سەروەسێتی من بێ. ئەو کاتە دروستە بە تەنهاش کارەکە بکەن (وَلِلْمُوصِى) بۆ وەسێتکەرەکەو هەم (وَالْوَصِيِّ) بۆ سەرەوەسێتەکەش دروستە (اَلْعَزْلُ مَتَى شَاءَ) سەروەسێتەکە لە کار لابدەن: وەك بڵێ: تۆم لە سەروەسێتی لادا. یان سەروەسێتەکە بە خۆی بڵێ: خۆم لە سەروەسێتی خست.

﴿ ئاگاداری ﴾: هەرکاتێك وەسێتکەرەکە گومانی بەهێز بێ: کە ئەگەر سەروەسێتەکەی لە کار لابدا، ئەمانەتەکانی، یان ماڵی منداڵەکانی لەدەست دەچێ، یان ستەمکارێك دەستیان بە سەردا دەگرێ، ئەو کاتە دروست نیە: سەرەوەسێتەکەی لە کار لابدا، هەروەها ئەگەر سەروەسێتەکەش ترسی هەبێ ماڵی وەسێتکەرەکە، یان ماڵی منداڵەکانی لەدەست بچێ، یان ستەمکارێك دەستیان بە سەردا بگرێ، ئەو کاتەش دروست نیە خودی خۆی لە کار لابدا، واتە: لەو حاڵەتەدا خۆلادانەکەی جێبەجێ نابێ، بەڵام واجب نیە بە خۆڕایی سەر وەسێتیەکە بکا، بەڵکو دروستە: کرێی سەروەسێتیەکەی لە ماڵی وەسێتکەرەکە، یان لە ماڵی منداڵەکان وەریگرێ، جا ئەگەر وەسێتکەرەکە کرێی بۆ دیاری نەکردبو، ئەو کاتە دوو کەسی لێزان‌و دادپەروەر ئەندازەی کرێیەکەی بۆ دیاری دەکەن.

ئینجا بزانە: هەر کارێك عادەت نەبو سەروەسێتەکە بەخۆی بیکا، یان توانای نەبو کارەکە بکا، ئەو کاتە دروستە وەکیلێك بۆ خۆی بگرێ تاکو کارەکەی بۆ بکا، هەروەك لە (تحفة)و (مغنى)دا ناوەڕۆکی ئەم ئاگاداریە ڕوون کراوەتەوە.

(وَإِذَا بَلَغَ الطِّفْلُ) هەر کاتێك منداڵەکە بلۆغی بوو، یان شێتەکە چاك بۆوە (وَنَازَعَهُ) لەگەڵ سەروەسێتەکەی بووە کێشەیان (فِى الإِنْفَاقِ عَلَيْهِ) لەبارەی سەرفکردنی ئەرکی بەخێوکردنی: ئایا ئەندازەی چەندی سەرف کردوە، یان دەیگوت هیچت سەرف نەکردوە. ئەوە (صُدِّقَ الْوَصِيُّ) باوەڕ بە سەروەسێتەکە دەکرێ بەو مەرجەی سوێند بخوا، هەروەها

أَوْ فِـــي دَفْــــعِ إِلَيْـــهِ بَعْــــدَالْبُلُوغِ صُـــدِّقَ الْوَلَــــدُ.

## (كِتَابُ الْوَدِيعَةِ)

مَنْ عَجَزَ عَنْ حِفْظِهَا حَرُمَ عَلَيْهِ قَبُولُهَا، وَمَنْ قَدَرَ وَلَمْ يَثِقْ بِأَمَانَتِهِ كُرِهَ، فَإِنْ وَثِقَ اُسْتُحِبَّ،

---

ئەگەر-لەو مەسەلەیەدا- لەگەڵ باوكو باپیرەش ببێتە كێشەیان بە سوێندخواردن باوەڕ بە باوكو باپیرە دەكرێ.

(أَوْ فِي دَفْعِ إِلَيْهِ بَعْدَالْبُلُوغِ) یان لەبارەی ماڵ وێدانەوەی دوایبلۆغبوون بووە كێشەیان، منداڵەكە دەیگوت: ماڵەكەت نەداومەوەو. سەروەسێتەكەش، یان باوكو باپیرە دیانگوت ماڵەكەتمان تەسلیمی تۆ كردۆتەوە. ئەوە (صُدِّقَ الْوَلَدُ) بە سوێندخواردن باوەڕ بە منداڵەكە دەكرێ، چونكە لەو حاڵەتەدا سەروەسێتو باوكو باپیرە كەمتەرخەمییان كردوە: كە شاهیدیان نەگرتوە بۆ دانەوەی ماڵەكە.

ئینجا بزانە: ئەگەر دەترسا ستەمكارێك دەست بە سەر ماڵەكەدا بگرێو جگە لە بەخشینی ماڵ بە هیچ ڕێگەیەكیتر نەیدەتوانی ماڵەكە ڕزگار بكا، ئەو كاتە بۆ سەروەسێتەكە دروستە بە بۆچوونیخۆی كەمترین ئەندازە لە ماڵەكە سەرف بكا بۆ ڕزگاركردنی ماڵەكە، جا لەم مەسەلەیەدا بە سوێندخواردن باوەڕی پێدەكرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

### ﴿ كِتَابُ الْوَدِيعَةِ: ئەمەیە پەڕتوكی سپاردنی ئەمانەت ﴾

واتە: شتێك بە ئەمانەت لە لای كەسێك دابنێ تاكو بۆی بپارێزێ.

خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ أَمِنَ بَعْضُكُمْ بَعْضاً فَلْيُؤَدِّ الَّذِىاؤْتُمِنَ أَمَانَتَهُ﴾ ئەگەر یەكێكتان یەكێكتانی بە ئەمیندار دانا، با ئەمیندارەكە ئەمانەتەكەی بداتەوە. هەم پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿أَدِّ الْأَمَانَةَ إِلَى مَنِ ائْتَمَنَكَ﴾حدیث حسن رواه أبوداود والترمذی، ئەمانەتەكە بدەوە ئەو كەسەی بە ئەمینداری داناوی.

ئینجا (مَنْ عَجَزَ عَنْ حِفْظِهَا) هەر كەسێك توانای نەبێ ئەمانەتەكە بپارێزێ، ئەوە (حَرُمَ عَلَيْهِ قَبُولُهَا) لە سەری حەرامە قبوڵی بكا، واتە: ئەمانەتەكە وەریگرێ (وَمَنْ قَدَرَ وَلَمْ يَثِقْ بِأَمَانَتِهِ) وە هەر كەسێكیش توانای هەبێ بیپارێزێ، بەڵام باوەڕی بە ئەمینداریەتیخۆی نەبو، واتە: دەترسا خیانەتی تێدا بكا، ئەو كاتە (كُرِهَ) ناپەسندە وەریبگرێ.

بەڵام (فَإِنْ وَثِقَ) ئەگەر باوەڕی بە ئەمینداریەتیخۆی هەبوو و هەم دەیتوانی بیپارێزێ، ئەو كاتە (اُسْتُحِبَّ) سوننەتە: وەریبگرێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿وَاللهُ فِي عَوْنِ الْعَبْدِ مَادَامَ الْعَبْدُ فِي عَوْنِ أَخِيهِ﴾ رواه مسلم، خوایگەورە لە یارمەتیدانی بەندەدایە مادام بەندە لە یارمەتی برایخۆی دابێ.

وَشَرْطُهُمَا: شَرْطُ مُوَكِّلٍ وَوَكِيلٍ، وَيُشْتَرَطُ صِيغَةُ الْمُودِعِ: كَاسْتَوْدَعْتُكَ هَذَا أَوْ اسْتَحْفَظْتُكَ أَوْ أَنَبْتُكَ فِي حِفْظِهِ. وَالأَصَحُّ أَنَّهُ لاَ يُشْتَرَطُ الْقَبُولُ لَفْظًا وَيَكْفِي الْقَبْضُ،

---

جا بزانه: لەو حاڵەتەی سێیەمدا ئەگەر جگە لە خۆی کەسی‌تر نەبو ئەمانەتەکە بپارێزێ، ئەو کاتە لە سەری واجبە وەریبگرێ، بەڵام بۆی دروستە کرێی پاراستنەکەشی وەربگرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَشَرْطُهُمَا) مەرجی ئەمیندارەکەو سپاردەری ئەمانەتەکە (شَرْطُ مُوَكِّلٍ وَوَكِيلٍ) وەك مەرجی وەکیلگرو وەکیلەکەیە، واتە: هیچێکیان منداڵ، یان شێت نەبن، هەر یەکەشیان بۆیان دروست بێ -ڕاستەوخۆ- کارەکە بکەن، کەواتە: ئەمانەت دانان‌و ئەمانەت وەرگرتنی منداڵ‌و شێت دروست نابێ.

(وَ) هەروەها (وَيُشْتَرَطُ صِيغَةُ الْمُودِعِ) بە مەرج دادەنرێ: سپاردەرەکە -واتە: ئەو کەسەی ئەمانەتەکە دادەنێ- گوتەیەك بڵێ کە لێی بفامێتەوە: شتەکە ئەمانەتە (كَـ) وەك بڵێ: (اسْتَوْدَعْتُكَ هَذَا) ئەم شتەم بە سپاردن لە لای تۆ دانا (أَوْ) یان بڵێ: (اسْتَحْفَظْتُكَ) ئەم شتەم بۆ پاراستن لە لای تۆ دانا (أَوْ) یان بڵێ: (أَنَبْتُكَ فِي حِفْظِهِ) تۆم کردە جێگری‌خۆم بۆ پاراستنی ئەم شتە. یان ئەم شتەم ئەمانەت بێ لە لای تۆ. هەروەها بە گوتەی ناڕاشکراو بە نووسینیش دروست دەبێ، ئەگەر نیەتی لەگەڵدا بێ، هەروەها بە ئاماژەکردنی مرۆڤی لاڵێش دروست دەبێ.

بەڵام (وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر (أَنَّهُ لاَ يُشْتَرَطُ الْقَبُولُ لَفْظًا) بە مەرج دانانرێ ئەمیندارەکە بە زوبان بڵێ: قبوڵم کرد. بەڵکو (وَيَكْفِي الْقَبْضُ) ئەوەندە بەسە: ئەمانەتەکە وەربگرێ، یان بە زوبان بڵێ: لەو شوێنە دایبنێ. واتە: بە یەکێك لەوانە دانانی ئەمانەتەکە دادەمەزرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

﴿ ئاگاداری ﴾: کەرماوچی‌و خانچی‌و دوکاندار هیچێکیان نابنە زامینی ئەو جل‌و بەرگو ئەو وڵاغ‌و ئۆتۆمبیلەو ئەو شتەی لە لایان دادەنرێ، بەڵام ئەگەر خاوەنەکە بە زوبان پێیان بڵێ: ئاگاداری ئەم شتەم بە بۆم بپارێزە. ئەوانیش قبوڵ بکەن، یان کرێی پاراستنی ئەو شتانە لە خاوەنەکە وەربگرن، ئەو کاتە- ئەگەر کەمتەرخەمی بکەن- دەبنە زامین، هەروەها ئەگەر ئەمیندارەکە ئەمانەتەکە لە لای خاوەنەکەی بە جێ بهێڵێ‌و بڕوا، ئەوەش وا بڕیار دەدرێ: دابێتیەوە دەست خاوەنەکەی، واتە: ئەگەر فەوتا نابێتە زامین، هەروەها ئەگەر کەسێك شتێکی لە لای دانا، ئەویش بێ‌دەنگ بوو، واتە: نە قبوڵی کردو نە وەریگرت‌و نە ڕەدی کردەوە، ئینجا خاوەنەکەی ڕۆیشت‌و ئەویش ڕۆیشت‌و شتەکەش فەوتا، دیسان نابێتە زامین، هەروەك لە (تحفة)و (الشروانی)دا ناوەڕۆکی ئەم ئاگاداریە ڕوون کراوەتەوە.

وَلَوْ أَوْدَعَهُ صَبِيٌّ أَوْ مَجْنُونٌ مَالاً لَمْ يَقْبَلْهُ فَإِنْ قَبِلَ ضَمِنَ، وَلَوْ أَوْدَعَ صَبِيًّا مَالاً فَتَلِفَ عِنْدَهُ لَمْ يَضْمَنْ، وإِنْ أَتْلَفَهُ ضَمِنَ فِي الأَصَحِّ، وَالْمَحْجُورُعَلَيْهِ بِسَفَهٍ كَصَبِيٍّ، وَتَرْتَفِعُ بِمَوْتِ الْمُودِعِ أَوِ الْمُودَعِ وَجُنُونِهِ وَإِغْمَائِهِ، وَلَهُمَا الإِسْتِرْدَادُ وَالرَّدُّ

---

(وَلَوْ أَوْدَعَهُ صَبِيٌّ أَوْ مَجْنُونٌ مَالاً) ئەگەر منداڵێك، یا شێتێك ماڵێكی بە ئەمانەت لە لا دانا (لَمْ يَقْبَلْهُ) دروست نیە قبوڵی بكا (فَإِنْ قَبِلَهُ) جا ئەگەر ماڵەكەی قبوڵ كردو وەریگرت، ئەوە (ضَمِنَ) دەبێتە زامینی ماڵەكە، چونكە سپاردنی منداڵو شێت دروست نابێ، كەوابو: لەو زامنیە ئازاد نابێ تا ماڵەكە نەداتەوە دەست سەرپەرشكارەكەیان، بەڵام ئەگەر لەوە دەترسا ماڵەكە بفەوتێو لە ڕێگەیخوا ماڵەكەی بە ئامانەت وەرگرت، ئەو كاتە نابێتە زامین، هەروەها ئەگەر منداڵەكە، یان شێتەكە بەخۆیان ئەمانەتەكەیخۆیان لە لای ئەمیندارەكە بفەوتێنن، ئەو كاتەش ئەمیندارەكە نابێتە زامین، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَلَوْ أَوْدَعَ صَبِيًّا مالاً) ئەگەر یەكێكی بالغو عاقڵ ماڵێكی بە ئەمانەت لە لای منداڵێك، یان لە لای شێتێك دانا (فَتَلِفَ عِنْدَهُ) جا ماڵەكەش لە لای منداڵەكە، یان لە لای شێتەكە بەخۆی فەوتا (لَمْ يَضْمَنْ) نە منداڵەكەو نە شێتەكە نابێتە زامین، هەرچەند كەمتەرخەمیشیان كردبێ، بەڵام (وَإِنْ أَتْلَفَهُ) ئەگەر منداڵەكە، یان شێتەكە ماڵەكە بفەوتێنێ، ئەو كاتە (ضَمِنَ فِيالأَصَحِّ) فەوتێنەرەكە دەبێتە زامین، لە فەرموودەی ڕاستتردا.

بەڵام ئەگەر منداڵێك، یان شێتێك ماڵەكە بە ئەمانەت لە لای منداڵێك، یان لە لای شێتێك دابنێ، ئەو كاتە ئەو منداڵو شێتەی ئەمانەتەكەیان وەرگرتوە- ئەگەر فەوتا- دەبنە زامین، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە (وَالْمَحْجُورُ عَلَيْهِ بِسَفَهٍ) ئەو كەسەی قەدەغەی لە سەر داندراوە بە هۆی بەفیڕۆدانی ماڵیخۆی، ئەویش (كَصَبِيٍّ) وەكو منداڵ بڕیاری بۆ دەدرێ: لە ئەمانەت دانانو لە وەرگرتنی ئەمانەتدا.

(وَتَرْتَفِعُ) بڕیاری سپاردنی ماڵەكە كۆتایی دێ (بِمَوْتِ الْمُودِعِ) بە مردنی سپاردەرەكە (أَوِ الْمُودَعِ) یان بە مردنی ئەمیندارەكە، هەم (وَجُنُونِهِ) بە شێتبوونی یەكێكیانو (وَإِغْمَائِهِ) بە بێهۆشبوونی یەكێكیان، واتە: هەر یەكێكیان یەكێكی لەو ڕوداوانە تووش ببێ، ئەوە بڕیاری سپاردن لە سەر ماڵەكە لادەچێو دەبێتە ئەمانەتێكی شەرعیو واجبە: بە پەلە بدرێتەوە میراتگرەكانی مردووەكەو سەرپەرشتكاری شێتەكە، هەرچەند داوای ماڵەكەش نەكەن، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَلَهُمَاالإِسْتِرْدَادُ) بۆ هەردووكیان دروستە: داوای گەڕاندنەوە بكەن، واتە: بۆ سپاردەرەكە دروستە داوای گەڕاندنەوەی ماڵە سپاردراوەكەی بكا، هەم (وَالرَّدُّ) بۆ ئەمیندارەكەش

كُلَّ وَقْت، وَأَصْلُهَا الأَمَانَةُ، وَقَدْ تَصِيرُ مَضْمُونَةً بِعَوَارِضَ: مِنْهَا أَنْ يُودِعَ غَيْرَهُ بِلاَ إِذْنٍ وَلاَ عُذْرٍ فَيَضْمَنُ، وَقِيلَ إِنْ أَوْدَعَ الْقَاضِيَ لَمْ يَضْمَنْ، وَإِذَا لَمْ يَزِلْ يَدَهُ عَنْهَا جَازَتِ الإِسْتِعَانَةُ بِمَنْ يَحْمِلُهَا إِلَى الْحِرْزِ أَوْ يَضَعُهَا فِي خِزَانَةٍ مُشْتَرَكَةٍ، وَإِذَا أَرَادَ سَفَرًا فَلْيَرُدَّ إِلَى الْمَالِكِ أَوْ وَكِيلِهِ

---

دروستە: ماڵەکە بۆ خاوەنەکەی بگەڕێنێتەوە (كُلَّ وَقْتٍ) گشت کاتێك کە حەز بکەن، بەڵام ئەگەر ئەمیندارەکە بترسێ ماڵەکە بفەوتێ و کەسی‌تر نەبێ بیپارێزێ، ئەو کاتە حەڕامە بیگەڕێنێتەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

**﴿ هۆیەکانی زامینیی ئەمانەتەکە ﴾**

(وَأَصْلُهَا الأَمَانَةُ) بنچینەی سپاردن بە ئەمانەت دادەندرێ، هەرچەند لە بەرامبەر پاراستنەکەش کرێی وەرگرتبێ، چونکە –لە ئایەتەکەی ڕابردوودا– خوایگەورە ناوی ناوە: (ئەمانەت). بەڵام (وَقَدْ تَصِيرُ مَضْمُونَةً) هەندێ جار سپاردراوەکە دەبێتە زەمانەتکراو لە سەر ئەمیندارەکە، واتە: ئەمیندارەکە دەبێتە زامینی ئەمانەتەکەو تۆڵەی دەکەوێتە سەر (بِعَوَارِضَ) بە چەند هۆیەك:

(مِنْهَا أَنْ يُودِعَ غَيْرَهُ) یەکێك لەو هۆیانە ئەوەیە: ئەمانەتەکە بە کەسێکی‌تر بسپێرێ: وەك بە ژن و منداڵەکانی خۆی بیسپێرێ، یان بە کەسێکی‌تر (بِلاَ إِذْنٍ وَلاَ عُذْرٍ) بە بێ‌ئیزنی خاوەنەکەو بە بێ‌هیچ عوزرێك (فَيَضْمَنُ) جا ئەگەر –لەوحاڵەتەدا– ئەمانەتەکە فەوتا، ئەوە ئەمیندارەکەی‌یەکەم و ئەمیندارەکەی‌دووەمیش هەردووکیان دەبنە زامین، واتە: خاوەنەکە مافی هەیە تۆڵەی ئەمانەتەکەی لە هەر کامێکیان بستێنێ، بەڵام ئەگەر دووەمەکە نەیزانیبێ ئەوە ماڵی‌یەکەمەکە نیە، ئەو کاتە بۆی دروستە ئەندازەی ئەو تۆڵەیەی لێی‌وەرگیراوە، لە یەکەمەکەی وەربگرێتەوە.

بەڵام ئەگەر خاوەنەکە ئیزنی بدا، یان عوزرێکی هەبێ، وەکو نەخۆشی، یان بە سەفەرچوون، یان ترسی دز و زۆردارێك، ئەو کاتە ئەگەر ئەمانەتەکە بە کەسێکی‌تریش بسپێرێ هەر نابێتە زامین، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێ‌هێزدا (إِنْ أَوْدَعَ الْقَاضِيَ لَمْ يَضْمَنْ) ئەگەر ئەمانەتەکەی بە (قازی)یێکی ئەمین سپاردبێ ئەو کاتەش نابێتە زامین (وَإِذَا لَمْ يَزِلْ يَدَهُ عَنْهَا) هەرکاتێك دەستی خۆی، یان چاودێری خۆی لە سەر ئەمانەتەکە لانەبا (جَازَتِ الإِسْتِعَانَةُ بِمَنْ) دروستە داوای یارمەتی لە کەسێك بکا: کە (يَحْمِلُهَا إِلَى الْحِرْزِ) ئەمانەتەکەی بۆ هەڵبگرێ بۆ شوێنی پاراستنی (أَوْ يَضَعُهَا فِي خِزَانَةٍ مُشْتَرَكَةٍ) یان بۆی لە ناو کۆگایەکی هاوبەش دابنێ.

(وَإِذَا أَرَادَ سَفَرًا) هەر کاتێك ئەمیندارەکە ویستی سەفەرێك بکا (فَلْيَرُدَّ إِلَى الْمَالِكِ) دەبێ ئەمانەتەکە بۆ خاوەنەکەی بگەڕێنێتەوە (أَوْ وَكِيلِهِ) یان بۆ وەکیلی‌خاوەنەکەی، یان بۆ

فَإنْ فَقَدَهُمَا فَالْقَاضِى، فَإنْ فَقَدَهُ فَأمِينٌ، فَإنْ دَفَنَهَا بِمَوْضِعٍ وَسَافَرَ ضَمِنَ، فَإنْ أعْلَمَ بِهَا أَمِينًا يَسْكُنُ الْمَوْضِعِ لَمْ يَضْمَنْ فِىالأَصَحِّ، وَلَوْ سَافَرَ بِهَا ضَمِنَ إلاّ إذَا وَقَعَ حَرِيقٌ أَوْ غَارَةٌ وَعَجزَ عَمَّنْ يَدْفَعُهَا إلَيْهِ كَمَا سَبَقَ، وَالْحَرِيقُ وَالْغَارَةُ فِىالْبُقْعَةِ وَإشْرَافُ الْحِرْزِ عَلَىالْخرَابِ أعْذَارٌ كَالسَّفَرِ،

---

سەرپەرشتكارىخاوەنەكەى بيگەرێنێتەوە (فَإنْ فَقَدَهُمَا) جا ئەگەر هیچێكیانى دەست نەكەوتن (فَالْقَاضِى) دەبى ئەمانەتەكە بداتە دست قازى (فَإنْ فَقَدَهُ) جا ئەگەر (قازى)ێكى ئەمینیشى دەست نەكەوت (فَأمِينٌ) دەبى بیداتە دەست مرۆڤێكىئەمین، ئینجا واجبە شاهیدیش بگرێ: كە ئەمانەتەكەى داوەتە دەست ئەمینەكە.

ئینجا هەركاتێك چووە سەفەرو ئەمانەتەكەشى نەداوە دەست ئەوانەىڕابردوو، ئەوە تەماشا دەكەین: (فَإنْ دَفَنَهَا بِمَوْضِعٍ) ئەگەر ئەمانەتەكەى لە شوێنێكى پاراستندا شاردەوەو (وَسَافَرَ) چووە سەفەرو شتەكە فەوتا، ئەوە (ضَمِنَ) دەبێتە زامین، بەلاَم (فَإنْ أعْلَمَ بِهَا أمِينًا) ئەگەر ئەمانەتەكەى بە مرۆڤێكى ئەمین ناساند: كە (يَسْكُنُ الْمَوْضِعِ) لە شوێنى شاردنەوەكەدا نیشتەجێ بوو و چاودێرى دەكرد، ئەو كاتە (لَمْ يَضْمَنْ فِىالأَصَحِّ) نابێتە زامین لە فەرموودەى ڕاستتردا.

(وَلَوْ سَافَرَ بِهَا) ئەگەر ئەمیندارەكە ئەمانەتەكەى لەگەلّ خۆیا بردە سەفەر (ضَمِنَ) دەبێتە زامین (إلاّ إذَا وَقَعَ حَرِيقٌ أَوْ غَارَةٌ) تەنها ئەگەر سوتانێك، یان تالاَنو ڕاوڕوتێك لەو شوێنە ڕو بداو (وَعَجزَ عَمَّنْ يَدْفَعُهَا إلَيْهِ كَمَا سَبَقَ) نەشیتوانى بیداتە دەست یەكێك بەو ڕیزەى ڕابرا، ئەو كاتە دروستە، بەڵكو –ئەگەر ترسى فەوتانى هەبێ– واجبە: لەگەلّ خۆیا بیباتە سەفەر، واتە: ئەركى هەلگرتنیشى لەو سەفەرەدا لە سەر خاوەنەكەیەتى، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتى.

جا ئەگەر ئەمیندارەكە لە سەفەرەكەدا ترسى فەوتانى تووش بوو، واجبە: لە ماڵەوە داینێ، بەلاَم هەر كاتێك ڕێگر هێرشیان بۆ هێناو نەیتوانى ئەمانەتەكە بپارێزێ، واجبە خۆى ڕابگرێ تا ئەوان لێى دەستێنن، واتە: ئەگەر لە ترسان ئەمانەتەكەى فرێدا شوێنێكو فەوتا، یان لە شوێنێكدا شاردیەوەو شوێنەكەشى نەناسیەوە، ئەو كاتە دەبێتە زامین، هەروەك لە (نهاية)و (مغنى)دا فەرموویانە.

(وَالْحَرِيقُ وَالْغَارَةُ فِىالْبُقْعَةِ) پەیدابوونى سوتانو تالاَنو ڕاوڕوت لە شوێنەكە، هەم (وَإشْرَافُ الْحِرْزِ عَلَىالْخرَابِ) نزیكبوونەوەى شوێنىپاراستن لە خراپبوون، گشتیان (أعْذَارٌ) دەبنە عوزر بۆ ئەوەى ئەمیندارەكە ئەمانەتەكە بە ئەمینێكىتر بسپێرێ (كَالسَّفَرِ) وەكو مەسەلەى سەفەر، واتە: لەو حاڵەتانەشدا نابێتە زامین.

وَإِذَا مَرِضَ مَرَضًا مَخُوفًا فَلْيَرُدَّهَا إِلَى الْمَالِكِ أَوْ وَكِيلِهِ وَإِلاَّ فَالْحَاكِمِ أَوْ إِلَى أَمِينٍ أَوْ يُوصِي بِهَا، فَإِنْ لَمْ يَفْعَلْ ضَمِنَ إِلاَّ إِذَا لَمْ يَتَمَكَّنْ بِأَنْ مَاتَ فَجْأَةً. وَمِنْهَا إِذَا نَقَلَهَا مِنْ مَحَلَّةٍ أَوْ دَارٍ إِلَى أُخْرَى دُونَهَا فِي الْحِرْزِ ضَمِنَ وَإِلاَّ فَلا. وَمِنْهَا أَنْ لاَ يَدْفَعَ مُتْلِفَاتِهَا، فَلَوْ أَوْدَعَهُ دَابَّةً فَتَرَكَ عَلَفَهَا ضَمِنَ، فَإِنْ نَهَاهُ عَنْهُ فَلاَ عَلَى الصَّحِيحِ، وَإِنْ أَعْطَاهُ الْمَالِكُ عَلَفًا

---

(وَإِذَا مَرِضَ مَرَضًا مَخُوفًا) هەرکاتێك ئەمیندارەکە نەخۆش کەوتو مەترسی مردنی لێدەکرا (فَلْيَرُدَّهَا إِلَى الْمَالِكِ) دەبی ئەمانەتەکە بۆ خاوەنەکەی بگەڕێنێتەوە، یان بۆ سەرپەرشتکارەکەی (أَوْ وَكِيلِهِ) یان بۆ وەکیلەکەی (وَإِلاَّ) ئەگەر نەگونجا بۆ ئەوانەی بگەڕێنێتەوە (فَالْحَاكِمِ) دەیداتەوە دەست دادوەرێکی ئەمین (أَوْ إِلَى أَمِينٍ) یان مرۆڤێکی ئەمین (أَوْ يُوصِي بِهَا) یان لە لای کەسێکی ئەمین وەسێتی پێ دەکا تاکو لە دوای مردنی بیداتەوە خاوەنەکەی (فَإِنْ لَمْ يَفْعَلْ) جا ئەگەر ئەمیندارەکە هیچێکی لەوانەیڕابردوو نەکردو مرد، ئینجا ئەمانەتەکەش فەوتا، ئەو کاتە (ضَمِنَ) ئەمیندارەکە دەبێتە زامین، کەواتە: لە میراتەکەی تۆڵەی دەدرێ (إِلاَّ إِذَا لَمْ يَتَمَكَّنْ) مەگەر بۆی نەگونجابێ هیچێکیان بکا (بِأَنْ مَاتَ فَجْأَةً) وەك کتوپڕ مردبێ، ئەو کاتە نابێتە زامین.

(وَمِنْهَا) یەکێکیتر لە هۆیەکانیزامینی: (إِذَا نَقَلَهَا مِنْ مَحَلَّةٍ أَوْ دَارٍ) هەر کاتێك ئەمانەتەکەی گواستەوە لە گەڕەکێکەوە، یان لە خانووێکەوە (إِلَى أُخْرَى) بۆ گەڕەکێکیتر، یان خانووێکیتر: کە (دُونَهَا فِي الْحِرْزِ) لە شوێنەکەییەکەم بێهێزتر بوو بۆ پاراستنی ئەمانەتەکە، ئەوە ئەگەر بفەوتێ (ضَمِنَ) ئەمیندارەکە دەبێتە زامین (وَإِلاَّ) بەلام ئەگە شوێنەکەیدووەم لە یەکەمەکە بێهێزتر نەبو (فَلا) نابێتە زامین.

(وَمِنْهَا) یەکێکیتر لە هۆیەکانیزامینی: (أَنْ لاَ يَدْفَعَ مُتْلِفَاتِهَا) ئەوەیە: فەوتێنەرەکانی ئەمانەتەکە لانەدا بەگوێرەی عادەت، کەواتە: ئەگەر ئاگر بەربوە خانووەکەی، ئەویش بە پەلە کەلوپەلیخۆی دەرباز کردو فریا نەکەوت ئەمانەتەکەش دەرباز بکا، ئەوە نابێتە زامین، هەروەها ئەگەر لەو حاڵەتەدا چەند ئەمانەتێکی جۆراو جۆری لە خانووەکەدا بون و هەندێکی دەرباز کردن و فریا نەکەوت ئەوانیتر دەرباز بکا، دیسان نابێتە زامین، چونکە لە هەردوو مەسەلەدا بەگوێرەی عادەت ڕەفتاری کردوە، لە زۆربەی سەرچاوەکانیشدا ڕوون کراوەتەوە.

(فَلَوْ أَوْدَعَهُ دَابَّةً) ئەگەر ووڵاغێکی پێسپارد (فَتَرَكَ عَلَفَهَا) جا ئەمیندارەکەش ئالیکی نەدا ووڵاغەکە، یان ئاوی نەدا (ضَمِنَ) دەبێـە زامین، بەلام (فَإِنْ نَهَاهُ عَنْهُ) ئەگەر خاوەنەکە طوتی: ئالیکی مەدە، ئەو کاتە (فَلاَ) نابێتە زامین (عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست، ئینجا (وَإِنْ أَعْطَاهُ الْمَالِكُ عَلَفًا) ئەگەر خاوەنەکەی ئالیکی ووڵاغەکەی تەسلیمی

عَلَفَهَا منهُ، وَإِلاَّ فَيُرَاجِعُهُ أَوْ وَكِيلَهُ، فَإِنْ فُقِدَا فَالْحَاكِمُ، وَلَوْ بَعَثَهَا مَعَ مَنْ يَسْقِيهَا لَمْ يَضْمَنْ فِي الأَصَحِّ، وَعَلَى الْمُودَعِ تَعْرِيضُ ثِيَابِ الصُّوفِ لِلرِّيحِ كَيْ لاَ يُفْسِدَهَا الدُّودُ، وَكَذَا لُبْسُهَا عِنْدَ حَاجَتِهَا. وَمِنْهَا أَنْ يَعْدِلَ عَنِ الْحِفْظِ الْمَأْمُورِ وَتَلِفَتْ بِسَبَبِ الْعُدُولِ

---

ئەمیندارەكە كردبێ، ئەوە (عَلَفَهَا منهُ) هەر لەو ئالیكە ئالیكی دەدا (وَإِلا) بەڵام هیچی تەسلیم نەكردبێ، ئەو كاتە (فَيُرَاجِعُهُ أَوْ وَكِيلَهُ) دەگەڕێتەوە لای خاوەنەكەی، یان وەكیلی خاوەنەكەی تاكو ئالیكەكەی بدەن، یان بیبەنەوە (فَإِنْ فُقِدَا) جا ئەگەر خاوەنەكەی و وەكیلەكەی دەست نەكەوتن (فَالْحَاكِمُ) دەچێتە لای دادوەر تاكو ئالیكەكەی بە قەرزی سەر خاوەنەكەی بداتێ، یان بۆی بكڕێ، جا ئەگەر دادوەر نەبو، ئەو كاتە هەر بەخۆی بە قەرزی سەر خاوەنەكەی ئالیكی دەدا، یان بۆی دەكڕێ، بەڵام دەبی شاهیدی هەبێ تاكو بتوانێ لە خاوەنەكەی وەریگرێتەوە.

(وَلَوْ بَعَثَهَا مَعَ مَنْ يَسْقِيهَا) ئەگەر ئەمیندارەكە وڵاغەكەی لەگەڵ كەسێكی ئەمیندا نارد تاكو ئاوی بدا، یان بیلەوەڕێنێ، ئەوە (لَمْ يَضْمَنْ فِي الأَصَحِّ) ئەمیندارەكە نابێتە زامین لە فەرموودەی راستتردا، چونكە ئەو پێدانارینە عادەتە.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر ئەمیندارێك، یان شوانێك دیتی ئاژەڵێك خەریكە بە هیلاك بچێ، ئەوە ئەگەر بە بێماندوویوونێكی زۆر ڕزگاركردنی بگونجێ، واجبە: ڕزگاری بكا، ئەگەر نا: واجبە سەری ببڕێ -ئەگەر گۆشتی بخورێ- تاكو گۆشتەكەی بۆ خاوەنەكە بپارێزێ، ئەگینا: دەبێتە زامین، جا ئەوەش لە حاڵەتێكی وەهادا دەبێتە زامین: كە شاهیدی دەست بكەوێ بۆ ئەوەی هۆیەكەی سەربڕینی پێ باوەڕ بكرێ، واتە: ئەگەر شاهیدی دەست نەكەوتو دەترسا باوەڕی پێنەكرێ بۆیێ سەری نەبڕی، ئەو كاتە نابێتە زامین.

هەروەها ئەگەر كەسێكیتریش -كە شوان و ئەمیندار نەبێ- دیتی حەیوانێك خەریكە بفەوتێ، ئەویش بۆی دروستە سەری ببڕێ تاكو بۆ خاوەنەكەی بیپارێزێ، بەڵام بە بێشاهید هۆیەكەی سەربڕینی پێ باوەڕ ناكرێ، مەگەر نیشانەیەكی ڕاستیی هەبێ، ئەو كاتە لەوانەیە باوەڕی پێبكرێ، هەروەك لە (تحفة) و (نهاية) و حاشیەكانیاندا ڕوون كراوەتەوە.

(وَعَلَى الْمُودَعِ) لە سەر ئەمیندارەكە واجبە: (تَعْرِيضُ ثِيَابِ الصُّوفِ لِلرِّيحِ) جل و بەرگی خوری بداتە بەر با (كَيْ لاَ يُفْسِدَهَا الدُّودُ) نەوەك مۆرانە جلەكە تێك بدا (وَكَذَا لُبْسُهَا عِنْدَ حَاجَتِهَا) هەروەها واجبە: دەبەر خۆیشی بكا ئەگەر- بۆ پاراستن- جلەكە پێویستی بە دەبەركردن هەبێ.

(وَمِنْهَا) یەكێكیتر لە هۆیەكانی زامینی: (أَنْ يَعْدِلَ عَنِ الْحِفْظِ الْمَأْمُورِ) ئەوەیە لابدا لەو پاراستنەی فەرمانی پێكراوە و (وَتَلِفَتْ بِسَبَبِ الْعُدُولِ) بە هۆی لادانەكەش ئەمانەتەكە

فَيضْمَنُ، فَلَوْ قَالَ لاَ تَرْقُدْ عَلَى الصُّنْدُوقِ. فَرَقَدَ وَانْكَسَرَ بِثقَلِه وَتَلفَ مَا فِيهِ ضَمِنَ، وَإنْ تَلفَ بِغَيْرِهِ فَلاَ عَلَى الصَّحِيحِ، وَكَذَا لَوْ قَالَ: لاَ تُقْفِل عَلَيْهِ قُفْلَيْنِ. فَأَقْفَلَهُمَا، وَلَوْ قَالَ: ارْبِط الدَّرَاهِمَ فِي كُمِّك. فَأَمْسَكَهَا فِي يَدِهِ فَتَلفَتْ فَالْمَذْهَبُ أَنَّهَا إنْ ضَاعَتْ بِنَوْمٍ وَنِسْيَانٍ ضَمِنَ، أَوْ بِأَخْذ غَاصِب فَلاَ، وَلَوْ جَعَلَهَا فِي جَيْبِه بَدَلاً عَنِ الرَّبْطِ فِي الْكُمِّ لَمْ يَضْمَنْ، وَبِالْعَكْسِ يَضْمَنُ، وَلَوْ أَعْطَاهُ دَرَاهِمَ بِالسُّوقِ وَلَمْ يُبَيِّنْ كَيْفِيَّةَ الْحِفْظِ فَرَبَطَهَا فِي كُمِّه وَأَمْسَكَهَا بِيَدِهِ أَوْ جَعَلَهَا فِي جَيْبِه لَمْ يَضْمَنْ،

---

بفەوتێ، ئەو کاتە (فَيَضْمَنُ) دەبێتە زامین (فَلَوْ قَالَ) جا ئەگەر خاوەنەکە گوتی (لاَ تَرْقُدْ عَلَى الصُّنْدُوقِ) لە سەر سوندووقەکە مەخەوە (فَرَقَدَ وَانْكَسَرَ بِثِقَلِهِ) ئەویش لە سەری خەوتو بە گرانایەتی وی سوندووقەکە شکا (وَتَلِفَ مَا فِيهِ) ئەو شتەی لە ناوی‌دابو فەوتا (ضَمِنَ) ئەمیندارەکە دەبێتە زامین، بەلام (وَإِنْ تَلِفَ بِغَيْرِهِ) ئەگەر شتەکە بە هۆیەکی‌تری جگە لە شکانەکە فەوتا: وەك بدزرێ (فَلاَ) ئەمیندارەکە نابێتە زامین (عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست (وَكَذَا لَوْ قَالَ لاَ تُقْفِلْ عَلَيْهِ قُفْلَيْنِ) هەروەها ئەگەر خاوەنەکە بڵێ: بە دوو قوفڵ سوندووقەکە کلیل مەدە (فَأَقْفَلَهُمَا) ئەویش بە دوو قوفڵ کلیلی‌دا، هەر نابێتە زامین، چونکە زیاتر پارێزکاری‌ی کردوە.

(وَلَوْ قَالَ: ارْبِطِ الدَّرَاهِمَ فِي كُمِّكَ) دیرهەمەکان لە ناو باسکی‌کراسەکەتدا بپێچە (فَأَمْسَكَهَا فِي يَدِهِ) ئەویش لە ناو دەستی‌خۆی دانان‌و (فَتَلِفَتْ) ئینجا دیرهەمەکان فەوتان، ئەوە (فَالْمَذْهَبُ) بە فەرموودەی ڕاستی‌مەزهەب (أَنَّهَا إِنْ ضَاعَتْ بِنَوْمٍ وَنِسْيَانٍ) ئەگەر دیرهەمەکان بە هۆی خەوتن‌و لەبیرچوون فەوتان (ضَمِنَ) ئەمیندارەکە دەبێتە زامین (أَوْ بِأَخْذِ غَاصِبٍ) بەلام ئەگەر بە لێستاندنی زۆردارێك فەوتان (فَلاَ) نابێتە زامین، چونکە دەست لە باسکی‌کراس بەهێزترە.

(وَلَوْ جَعَلَهَا فِي جَيْبِهِ بَدَلاً عَنِ الرَّبْطِ فِي الْكُمِّ) ئەگەر لە جیاتی پێچانی ناو باسکی‌کراسەکەی دیرهەمەکانی لە ناو بەرکی‌خۆی دانان (لَمْ يَضْمَنْ) نابێتە زامین، چونکە بەرك لە باسك پارێزەرترە (وَبِالْعَكْسِ) بەلام ئەگەر بە پێچەوانەوە گوتی: لە بەرکت دایانبنێ. ئەویش لە باسکی کراسی دانینان (يَضْمَنُ) دەبێتە زامین.

(وَلَوْ أَعْطَاهُ دَرَاهِمَ بِالسُّوقِ) بۆ وێنە: ئەگەر لە بازار چەند دیرهەمێکی دایێ، بەلام (وَلَمْ يُبَيِّنْ كَيْفِيَّةَ الْحِفْظِ) چۆنیەتی پاراستنی بۆ دیاری نەکرد (فَرَبَطَهَا فِي كُمِّهِ) ئەویش لە ناو باسکی کراسەکەی‌دا پێچانی‌و (وَأَمْسَكَهَا بِيَدِهِ) بە دەستی‌خۆیشی گرتنی (أَوْ جَعَلَهَا فِي جَيْبِهِ) یان هەر لە ناو بەرکی‌خۆی دانینان (لَمْ يَضْمَنْ) نابێتە زامین، بەلام ئەگەر بەرکەکەی کون بوو، یان زۆر بەرین بوو و زارکی دانەخستبو، ئەو کاتە دەبێتە زامین، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

وَإِنْ أَمْسَكَهَا بِيَدِهِ لَمْ يَضْمَنْ إِنْ أَخَذَهَا غَاصِبٌ وَيَضْمَنُ إِنْ تَلِفَتْ بِغَفْلَةٍ أَوْ نَــوْمٍ، وَإِنْ قَالَ: احْفَظْهَا فِي الْبَيْتِ. فَلْيَمْضِ إِلَيْهِ وَيُحْرِزْهَا فِيهِ، فَإِنْ أَخَّرَ بِلاَ عُذْرٍ ضَمِنَ. وَمِنْهَا أَنْ يُضَيِّعَهَا بِأَنْ يَضَعَهَا فِي غَيْرِ حِرْزِ مِثْلِهَا أَوْ يَدُلَّ عَلَيْهَا سَارِقًا أَوْ مَنْ يُصَادِرُ الْمَالِكَ، فَلَوْ أَكْرَهَهُ ظَالِمٌ حَتَّى سَلَّمَهَا إِلَيْهِ فَلِلْمَالِكِ تَضْمِينُهُ فِي الأَصَحِّ ثُمَّ يَرْجِعُ عَلَى الظَّالِمِ. وَمِنْهَا أَنْ يَنْتَفِعَ بِهَا بِأَنْ يَلْبَسَ أَوْ يَرْكَبَ

---

(وَإِنْ أَمْسَكَهَا بِيَدِهِ) ئەگەر دیرهەمەکانی بە دەستی خۆی گرتن، ئەو کاتەش (لَمْ يَضْمَنْ إِنْ أَخَذَهَا غَاصِبٌ) نابێتە زامین ئەگەر ستەمکارێك لێی بستێنێ، بەڵام (وَيَضْمَنُ إِنْ تَلِفَتْ بِغَفْلَةٍ أَوْ نَوْمٍ) ئەگەر بە هۆی غافڵبوون، یان خەوتن دیرهەمەکان فەوتان، ئەو کاتە دەبێتە زامین.

(وَإِنْ قَالَ) ئەگەر شتێکی دایێو گوتی: (احْفَظْهَا فِي الْبَيْتِ) بیبەوە لە ماڵەکەتدا بۆم بپارێزە (فَلْيَمْضِ إِلَيْهِ) با بە پەلە بڕواتە ماڵەوەو (وَيُحْرِزْهَا فِيهِ) یەکسەر لە شوێنێکی پارێزەر دایبنێ (فَإِنْ أَخَّرَ بِلاَ عُذْرٍ) ئەگەر بە بێعوزر دوای خستو نەیبردەوە ماڵەوەو فەوتا، ئەو کاتە(ضَمِنَ) دەبێتە زامین.

(وَمِنْهَا) یەکێکیتر لە هۆیەکانیزامینی: (أَنْ يُضَيِّعَهَا) ئەوەیە: ئەمانەتەکە لە دەست بدا (بِأَنْ يَضَعَهَا فِي غَيْرِ حِرْزِ مِثْلِهَا) وەك لە شوێنێکیوەها دایبنێ: کە شوێنی پاراستنی وێنەی ئەو شتە نەبێ (أَوْ يَدُلَّ عَلَيْهَا سَارِقًا) یان شوێنەکەی بە دزێك نیشان بدا (أَوْ مَنْ يُصَادِرُ الْمَالِكَ) یان بە کەسێکی وەهای نیشان بدا: کە ماڵیخاوەنەکەی داگیر دەکا.

(فَلَوْ أَكْرَهَهُ ظَالِمٌ) جا ئەگەر ستەمکارێك زۆری لێکرد (حَتَّى سَلَّمَهَا إِلَيْهِ) تا ئەمانەتەکەی تەسلیمی ستەمکارەکە کرد، یان تەسلیمی کەسێکیتری کرد، ئەوە (فَلِلْمَالِكِ تَضْمِينُهُ) بۆ خاوەنەکەی دروستە: ئەمیندارەکە بکاتە زامینو تۆڵەی لێوەربگرێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا (ثُمَّ يَرْجِعُ عَلَى الظَّالِمِ) ئینجا ئەمیندارەکەش دەگەڕێتەوە سەر ستەمکارەکە بۆ ئەوەی چەند تۆڵەی لێوەرگیراوە ئەویش ئەوەندەی لەوی وەربگرێتەوە، بەڵام ئەگەر ئەمیندارەکە ئەمانەتەکەی تەسلیم نەکردو شوێنەکەشی نیشان نەدا، بەڵکو ستەمکارەکە بەخۆی بردی، ئەو کاتە ئەمیندارەکە نابێتە زامین.

ئینجا بزانە: واجبە ئەمیندارەکە بە هەموو ڕێگایەکیگونجاو ستەمکارەکە لابدا لە بردنی ئەمانەتەکە، هەرچەند بە عەیبدارکردنی ئەمانەتەکەش بێ، یان بە درۆکردن بێ، بەڵکو دروستە: سوێندیش بە درۆ بخوا، بەڵام واجبە کەففارەتیسوێندەکە بدا، بەڵام ئەگەر سوێندی بە درۆ بە تەڵاق بخوا، ئەو کاتە تەڵاقی دەکەوێ، چونکە ژنەکەی کردۆتە قوربانی ئەمانەتەکە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَمِنْهَا) هۆیەکیتری زامینی: (أَنْ يَنْتَفِعَ بِهَا) ئەوەیە ئەمیندارەکە بۆ خۆی سود لە ئەمانەتەکە وەربگرێ (بِأَنْ يَلْبَسَ) وەك جلەکە دەبەر بکا (أَوْ يَرْكَبَ) یان سواری وڵاغەکە

خِيَانَةٌ، أَوْ يَأْخُذَ الثَّوْبَ لِيَلْبَسَهُ أَوِ الدَّرَاهِمَ لِيُنفِقَهَا فَيَضْمَنُ، وَلَوْ نَوَى الأَخْذَ وَلَمْ يَأْخُذْ لَمْ يَضْمَنْ عَلَى الصَّحِيحِ، وَلَوْ خَلَطَهَا بِمَالِه وَلَمْ تَتَمَيَّزْ ضَمِنَ، وَلَوْ خَلَطَ دَرَاهِمَ كِيسَيْنِ لِلْمُودِعِ ضَمِنَ فِي الأَصَحِّ، وَمَتَى صَارَتْ مَضْمُونَةً بِانْتِفَاعٍ وَغَيْرِه ثُمَّ تَرَكَ الْخِيَانَةَ لَمْ يَبْرَأْ، فَإِنْ أَحْدَثَ لَهُ الْمَالِكُ اسْتِئْمَانًا بَرِئَ فِي الأَصَحِّ.

---

ببێ، یان لە سەر ڕایەخەکە دابنیشێ، یان کتێبەکە بخوێنێتەوە، جا لەو حاڵەتەدا دەبێتە زامین: کە (خِيَانَةٌ) ئەو بەکارهێنانەی ڕابردوو بە خیانەتکاری بێ، واتە: هیچ عوزرێکی نەبێ، بەڵام ئەگەر بۆ سودی ئەمانەتەکە بێ، ئەو کاتە نابێتە زامین.

(أَوْ يَأْخُذَ الثَّوْبَ لِيَلْبَسَهُ) یان جلەکە بە دەستی هەڵبگرێ تاکو دەبەری بکا (أَوِ الدَّرَاهِمَ لِيُنفِقَهَا) یان پارەو پولەکە هەڵبگرێ تاکو خەرجی بکا (فَيَضْمَنُ) بەو دەستدانەش دەبێتە زامین، هەرچەند دەبەریشی نەکاو خەرجیشیان نەکا، بەڵام (وَلَوْ نَوَى الأَخْذَ) ئەگەر ئەمیندارەکە نیەتی هێنا ئەمانەتەکە دەست بداتێ‌و بە کاری بێنێ، ئینجا پەشیمان بۆوەو (وَلَمْ يَأْخُذْ) دەستی نەدایێ، ئەو کاتە (لَمْ يَضْمَنْ) نابێتە زامین (عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست.

(وَلَوْ خَلَطَهَا بِمَالِه) ئەگەر ئەمیندارەکە ئەمانەتەکەی تێکەڵی ماڵی‌خۆی کردو (وَلَمْ تَتَمَيَّزْ) لێکیش جیا نەدەبۆوە: وەك گەنم تێکەڵی جۆ بکا، ئەوە (ضَمِنَ) دەبێتە زامین.

(وَ) هەروەها (لَوْ خَلَطَ دَرَاهِمَ كِيسَيْنِ لِلْمُودِعِ) ئەگەر چەند دیرهەمێکی زیو کە لە دوو کیسەدا بون تێکەڵی کردن کە گشتی هی یەك خاوەن بون‌و لێك جیا نەدەکرانەوە، ئەو کاتەش (ضَمِنَ فِي الأَصَحِّ) دەبێتە زامین لە فەرموودەی ڕاستتردا، بەڵام ئەگەر زیوەکەی هەردووك کیسەکان لێك جیا بکرێتەوە، ئەو کاتە نابێتە زامین.

(وَمَتَى صَارَتْ مَضْمُونَةً بِانْتِفَاعٍ وَغَيْرِه) هەر کاتێك ئەمانەتەکە لە سەر ئەمیندارەکە ببێتە زەمانەتکراو: بە هۆی سودلێوەرگرتن، یان بە هۆیەکی‌تر (ثُمَّ تَرَكَ الْخِيَانَةَ) ئینجا ئەمیندارەکە وازی لە خیانەتکاری هێناو هیچی‌تر بە کاری نەهێنا، ئەوە (لَمْ يَبْرَأْ) ئەمیندارەکە لە زامینیەکە ئازاد نابێ‌و ناشبێتەوە ئەمیندار، بەڵکو واجبە: یەکسەر بۆ خاوەنەکەی بیگەڕێنێتەوە.

بەڵام (فَإِنْ أَحْدَثَ لَهُ الْمَالِكُ اسْتِئْمَانًا) ئەگەر خاوەنەکە ئەمینداریەکی‌تری بۆ پەیدا کردەوە: وەك پێی بڵێ: تۆم کردوە ئەمینداری ئەمانەتەکە. یان گوتی: لە زامینیەکە گەردەنت ئازاد بێ. یان گوتی: بیبەوە شوێنی‌خۆی بۆم بپارێزە. ئەو کاتە (بَرِئَ فِي الأَصَحِّ) ئەمیندارەکە لە زامینیءڕابردووی ئەمانەتەکە ئازاد دەبێ، لە فەرموودەی ڕاستتردا، بەڵام ئەگەر وەکیلی‌خاوەنەکە، یان سەرپەرشتکاری‌خاوەنەکە ئەمینداریەکی‌تری بۆ پەیدا بکاتەوە، ئەو کاتە ئەمیندارەکە لە زامینی ئازاد نابێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

وَمَتَى طَلَبَهَاالْمَالِكُ لَزِمَهُ الرَّدُّ بِأَنْ يُخَلِّيَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا، فَإِنْ أَخَّرَ بِلاَ عُذْرٍ ضَمِنَ، وَإِنْ ادَّعَى تَلَفَهَا وَلَمْ يَذْكُرْ سَبَبًا أَوْ ذَكَرَ خَفِيًّا كَسَرِقَةٍ صُدِّقَ بِيَمِينِهِ، وَإِنْ ذَكَرَ ظَاهِرًا كَحَرِيقٍ: فَإِنْ عُرِفَ الْحَرِيقُ وَعُمُومُهُ صُدِّقَ بِلاَ يَمِينٍ، وَإِنْ عُرِفَ دُونَ عُمُومِهِ صُدِّقَ بِيَمِينِهِ، وَإِنْ جُهِلَ

---

## ﴿ گەڕاندنەوەی ئەمانەتەکە ﴾

(وَمَتَى طَلَبَهَا الْمَالِكُ) هەر کاتێك خاوەنەکە داوای ئەمانەتەکەی کرد (لَزِمَهُ الرَّدُّ) لە سەر ئەمیندارەکە واجبە ئەمانەتەکە بگەڕێنێتەوە، بە بەڵگەی ئایەتەکە، جا مەبەست بە گەڕاندنەوە ئەوەیە: (بِأَنْ يُخَلِّيَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا) وازی لێبێنێو ڕێگا بدا خاوەنەکە ئەمانەتەکە بباتەوە، واتە: لە سەر ئەمیندارەکە واجب نیە: بەخۆی بۆی بباتەوە، کەوابو: ئەرکی گەڕاندنەوەی ئەمانەتەکە لە سەر خاوەنەکەیەتی.

بەڵام ئەگەر دوو هاوبەش وێکڕا ئەمانەتێکیان لە لا دانابو، ئەوە دروست نیە: تەنها ئەمانەتەکە بداتەوە هیچێکیان، جا ئەگەر هاوبەشێکیان سوور بوو لە سەر بردنەوەی بەشەکەیخۆی، ئەو کاتە (قازی) بۆیان بەش دەکا، ئینجا بەشەکەی وی دەداتەوە، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە.

ئینجا بزانە: هەر کاتێك خاوەنەکە مرد، یان شێت بوو، واجبە: ئەمیندارەکە-بە پەلە-ئەمانەتەکە بداتەوە میراتگریمردووەکەو سەرپەرشتکاریشێتەکە، هەروەك ڕابرا (فَإِنْ أَخَّرَ بِلا عُذْرٍ) جا ئەگەر ئەمیندارەکە گەڕاندنەوەی ئەمانەتەکەی دوا خست (بِلا عُذْرٍ) بە بێعوزر، ئەوە (ضَمِنَ) دەبێـە زامین، واتە: بەڵام ئەگەر عوزرێکی هەبێ، ئەو کاتە بە هۆی دواخستنەکە نابێتە زامین.

(وَإِنْ ادَّعَى تَلَفَهَا) ئەگەر ئەمیندارەکە گوتی: ئەمانەتەکە فەوتاوە (وَلَمْ يَذْكُرْ سَبَبًا) هیچ هۆیەکی فەوتانەکەشی نەگوت (أَوْ ذَكَرَ خَفِيًّا) یان هۆیەکی پەنهانی گوت (كَسَرِقَةٍ) وەکو بڵێ: دزراوە. یان بڵێ: زۆردارێك بردی. ئەوە (صُدِّقَ بِيَمِينِهِ) بە سوێندخواردن باوەڕی پێ دەکرێ، بەڵام (وَإِنْ ذَكَرَ ظَاهِرًا) ئەگەر هۆیەکی ئاشکرای گوت (كَحَرِيقٍ) وەکو سوتان، یان مردن، ئەوە (فَإِنْ عُرِفَ الْحَرِيقُ وَعُمُومُهُ) ئەگەر سوتانەکەو داگرتنەوەی سوتانەکە لە ناو خەڵکی زاندرابو، یان هەر بەڵایەکی داگرەوەیتری ئاشکرا: وەك بە هۆی بۆمبێك هەموو خانووەکەی وێران ببێ، ئەوە (صُدِّقَ بِلاَ يَمِينٍ) بە بێ سوێند خواردن باوەڕی پێدەکرێ: کە ئەمانەتەکە بەو هۆیە فەوتاوە.

بەڵام (وَإِنْ عُرِفَ) ئەگەر زاندرابو هۆیەکە ڕویداوە (دُونَ عُمُومِهِ) بەڵام داگرتنەوەکەی نەزاندرابو: وەك بەشێکی خانووەکە سوتابێ، ئەو کاتە (صُدِّقَ بِيَمِينِهِ) بە سوێندخواردن باوەڕی پێدەکرێ: کە بەو هۆیە فەوتاوە (وَإِنْ جُهِلَ) ئەگەر هۆیەکە نەزاندرابو، ئەوە

طُولِبَ بِبَيِّنَة، ثُمَّ يُحَلَّفُ عَلَى التَّلَف بِه. وَإِنْ ادَّعَى رَدَّهَا عَلَى مَنْ ائْتَمَنَهُ صُدِّقَ بِيَمِينِـــه، أَوْ عَلَى غَيْرِه كَوَارِثِه أَوْ ادَّعَى وَارِثُ الْمُودَعِ اَلرَّدَّ عَلَى الْمَالِكِ أَوْ أَوْدَعَ عِنْدَ سَفَرِه أَمِينًا فَادَّعَى الأَمِينُ الرَّدَّ عَلَى الْمَالِك طُولِبَ بِبَيِّنَة،

---

(طُولِبَ بِبَيِّنَةٍ) داوای شاهیدی لێدەکرێ: کە ئەو هۆیە ڕویداوە (ثُمَّ يُحَلَّفُ عَلَى التَّلَفِ بِـهِ) ئینجا سوێند دەدرێ: کە ئەمانەتەکە بەو هۆیە فەوتاوە، چونکە دەگونجێ نەفەوتابێ، جا ئەگەر ئەمیندارەکە سوێندی نەخوارد، ئەو کاتە خاوەنەکە سوێند دەخوا: کە نەیزانیوە ئەمانەتەکەی فەوتابێ. ئینجا کە سوێندی خوارد، تۆڵەی ئەمانەتەکەی لە ئەمیندارەکە دەستێنێ، هەروەك لەزۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَإِنْ ادَّعَى رَدَّهَا عَلَى مَنْ ائْتَمَنَهُ) ئەگەر خودی ئەمیندارەکە گوتی: ئەمانەتەکەم گەڕاندۆتەوە بۆ ئەو کەسەی بە ئەمینداری دانابوم‌و ئەمانەتەکەم لێوەرگرتبو. جا کەسەکە: خاوەنی ئەمانەتەکە بێ، یان سەرپەرشتکاری خاوەنەکەی بێ، یان قازی بێ، ئەوە (صُدِّقَ بِيَمِينِهِ) بە سوێندخواردن باوەڕی پێدەکرێ، چونکە گشت ئەمیندارێك بە سوێندخواردن باوەڕی گەڕاندنەوەی پێدەکرێ: وەك وەکیل‌و هاوبەش‌و...هتد.

هەروەها ئەگەر میراتگری ئەمیندارەکەش بڵێ: ئەمیندارەکە پێش مردنی بەخۆی ئەمانەتەکەی بۆ خاوەنەکەی گەڕاندۆتەوە. یان گوتی: هەر لە سەردەمی‌خۆیدا ئەمانەتەکە لە لای وی فەوتاوە. ئەویش بە سوێندخواردن باوەڕی پێدەکرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(أَوْ عَلَى غَيْرِهِ) بەلام ئەگەر ئەمیندارەکە بڵێ: ئەمانەتەکەم داوەتەوە دەست کەسێکی‌تری جگە لەو کەسەی لێم وەرگرتبو (كَوَارِثِـهِ) وەك بڵێ: داومەتەوە میراتگرەکەی (أَوْ ادَّعَى وَارِثُ الْمُودَعِ اَلرَّدَّ عَلَى الْمَالِكِ) یان میراتگری ئەمیندارەکە گوتی: من بەخۆم ئەمانەتەکەم داوەتەوە دەست خاوەنەکەی (أَوْ أَوْدَعَ عِنْدَ سَفَرِهِ أَمِينًا) یان لە کاتی چوونە سەفەر ئەمیندارەکە ئەمانەتەکەی بە ئەمیندارێکی‌تر سپاردبو (فَادَّعَى الأَمِينُ اَلرَّدَّ عَلَى الْمَالِكِ) جا ئەمیندارەکەی‌دووەمیش گوتی: ئەمانەتەکەم بۆ خاوەنەکەی گەڕاندۆتەوە. ئەوە لە هەر سێك مەسەلەدا (طُولِبَ بِبَيِّنَةٍ) ئەوەی دەڵێ: گەڕاندوتمەوە. داوای شاهیدی لێدەکرێ‌و بە سوێندخوادن باوەڕی پێناکرێ، چونکە لەو مەسەلانەدا ئەوەی ئەمامەنەتەکەی تەسلیم کراوەتەوە، تەسلیمکەرەکەی نەکردۆتە ئەمیندار.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر دوو کەس داوای ئەمانەتەکەیان کردو هەردووك گوتیان: هی منە. ئەمیندارەکەش تەنها یەکێکیانی بە ڕاستگۆ دانا، ئەو کاتە بۆ ئەوی‌تریان دروستە: ئەمیندارەکە سوێند بدا، ئینجا کە ئەمیندارەکە سوێندی خوارد، داوای ئەوی‌تر لە کار

وَجُحُودُهَا بَعْدَ طَلَبِ الْمَالِكِ مُضَمِّنٌ.

## (كِتَابُ قَسْمِ الْفَيْءِ وَالْغَنِيمَةِ)

اَلْفَيْءُ مَالٌ حَصَلَ مِنْ كُفَّارٍ بِلاَ قِتَالٍ وَإِيجَافِ خَيْلٍ وَرِكَابٍ: كَجِزْيَةٍ وَعُشْرِ تِجَارَةٍ وَمَا جَلَوْا عَنْهُ خَوْفًا وَمَالِ مُرْتَدٍّ قُتِلَ أَوْ مَاتَ وَذِمِّيٍّ مَاتَ بِلاَ وَارِثٍ، فَيُخَمَّسُ:

---

دەكەوێ، بەڵام ئەگەر ئەمیندارەكە سوێندی نەخوارد، ئەو كاتە ئەویتر سوێند دەخوا، ئینجا دەبێ ئەمیندارەكە تۆڵەی ئەمانەتەكەی بۆ بژمێرێ، هەروەك لە (نهایة)و (مغنی)دا فەرموویانە.

ئینجا بزانە: ئەگەر یەكێك ئەمانەتێكی كەسێكی لە لا بوو، ئینجا خاوەنەكەی گوم بوو و لە دۆزینەوەی بێئومێد بوو، ئەو كاتەش وەك مالی بێخاوەن دەبێتە ملكی(بَيْتُ الْمَالِ)، كەواتە: بۆ ئەمیندارەكە دروستە لە بەرژەوەندی موسوڵمانانو دروستكردنی مزگەوتو ئەو جۆرە شتانە سەرفی بكا، هەروەك لە (تحفة)و (نهایة)دا فەرموویانە.

(وَجُحُودُهَا بَعْدَ طَلَبِ الْمَالِكِ) داننەهێنان بە ئەمانەتەكە بە بێعوزر لە دوای داواكردنی خاوەنەكەی (مُضَمِّنٌ) دەبێتە هۆی زامینی، بەڵام ئەگەر بۆ داننەهێنانەكە عوزرێكی هەبێ: وەك لە كاتیداواكردنی خاوەنەكەی ستەمكارێك لەوێ بێو ترسی هەبێ ئەمانەتەكەی لێبستێنێ، ئەویش لە ترسی وی گوتی: هیچ ئەمانتێكی تۆم لە لا نیە. ئەو كاتە نابێتە زامین، هەروەك لە زۆریەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

**﴿ كِتَابُ قَسْمِ الْفَيْءِ وَالْغَنِيمَةِ: ئەمەیە پەرتوكی بەشكردنی دەسكەوتوو و تالانی كافران ﴾**

**پێناسە:** (اَلْفَيْءُ)-دەسكەوتووی كافران (مَالٌ حَصَلَ مِنْ كُفَّارٍ بِلاَ قِتَالٍ وَإِيجَافِ خَيْلٍ وَرِكَابٍ) شتێكە لە كافرەكانەوە بە دەست موسوڵمانان كەوتبێ بێ جەنگو بێ وەكارخستنی ئەسپو ووڵاغو هەلگرەكانیتری وەكو كەشتیو ئۆتۆمبیلو فرۆكەو ئەو جۆرە شتانە:

(كَـ) وەكو (جِزْيَةٍ)-ئەو سەرانەی لە جولەكەو دیانەكان وەردەگیرێ، هەم (وَعُشْرِ تِجَارَةٍ) دەیەكی ئەو بازرگانیەی لە بازرگانە كافرەكان وەردەگیرێ، هەم (وَمَا جَلَوْا عَنْهُ خَوْفًا) ئەوشتەی لە ترسی موسوڵمانان كافرەكان بەجێی دەهێلنو هەڵدێن، هەم (وَمَالِ مُرْتَدٍّ قُتِلَ أَوْ مَاتَ) مالی ئەو كەسەی لە ئیسلامەوە بوەتە كافرو هەر بەكافریش كوژرابێ، یان مردبێ، هەم (وَذِمِّيٍّ مَاتَ بِلاَ وَارِثٍ) مالی ئەو كافرەی پەیمان لە ئەستۆیە، یان ئەمین كراوەو بە بێمیراتگر دەمرێ.

(فَيُخَمَّسُ) جا گشت ئەو دەسكەوتووەیرابردوو دەكرێتە پێنج بەشو بەو شێوەیداهاتوو بەش دەكرێ، بەڵام لە مەزهەبی هەرسێك ئیمامەكانیتردا: ناكرێتە پێنج بەش، بەڵكو گشتی بۆ بەرژەوەندیموسوڵمانان سەرف دەكرێ، هەروەك لە زۆریەیسەرچاوەكاندا فەرموویانە.

وَخُمُسُهُ لخَمْسَة: أَحَدُهَا: مَصَالِحُ الْمُسلمينَ كَالثُّغُورِ وَالْقُضَاة وَالْعُلَمَاء يُقَدَّمُ الأَهَــمُّ. وَالثَّاني: بَنُوهَاشَمٍ وَالْمُطَّلب يَشتَرِكُ الْغَنِيُّ وَالْفَقِيرُ وَالنِّسَاءُ وَيُفَضَّلُ الذَّكَرُ كَالإِرْثِ.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەو گومرگەی لە بازرگانە موسوڵمانەکان وەردەگیرێ، بە (إجماع)ی زانایانی ئیسلام حەرامەو هەر کەسێکیش بە حەڵاڵی دابنێ کافر دەبێ، هەروەك سەرچاوەکان لە باسی کافربووندا فەرموویانە، کەوابو: ئەوەی وەرگیراوە، واجبە: بدرێتەوە خودی بازرگانەکان، کەواتە: دروست نیە وەریگیرێو وەکو (فَيْء) بەش بکرێو بۆ بەرژەوەندی موسوڵمانان بەکار بێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَاالْعُشُورُ عَلَى الْيَهُودِ وَالنَّصَارَى، وَلَيْسَ عَلَىالْمُسْلِمِينَ عُشُورٌ﴾ رواه أبوداود بسندصالح، دەیەکیبازرگانی تەنها لە سەر جولەکەو دیانەکانە، موسوڵمانەکان هیچ دەیەکەکیبازرگانییان لە سەر نیە.

(وَخُمُسُهُ لخَمْسَة) پێنجیکی گشت دەستکەوتووەکەش دەکرێتە پێنج بەش: بۆ پێنج جۆر سەرف دەکرێ (أَحَدُهَا) یەکێکیان: (مَصَالِحُ الْمُسْلِمِينَ) بەرژەوەندی موسوڵمانانە: (كَالثُّغُورِ) وەکو سەنگەرەکانی سنوری شارەکانیموسوڵمانان، واتە: لە چەکو موچەی پاسەوانەکانی ناو ئەو سەنگەرانە سەرف دەکرێ، هەم بۆ دروستکردنی مزگەوتو پردو رێگەو بان، هەم (وَالْقُضَاة) بۆ موچەی قازیەکانو (وَالْعُلَمَاءِ) زانایانیئایینیو قوتابیانیئایینی سەرف دەکرێ، ئینجا لەوانەش (يُقَدَّمُ الأَهَمُّ) هەرە گرنگترەکە وەپێش گرنگەکە دیخرێ.

جا بزانە: ئەم بەشە-کە پێنجیکیپێنجێکە- کاتی خۆی بە تایبەتی بۆ پێغەمبەرﷺ بوو، هەروەها چوار پێنجێکەکەیتریش هەمووی هەر بۆ پێغەمبەرﷺ بوو، واتە: لە بیستو پێنج بەشی دەسکەوتووەکە: بیستو یەك بەشی بۆ پێغەمبەرﷺ بوو بۆ خۆیو بۆ بەرژەوەندی موسوڵمانان سەرفی دەکرد، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

کەواتە: تەنها چوار پێنجیکیپێنجیێك دەدرا ئەو چوار کەسانەیداهاتوو، بە بەڵگەی ئایەتی ﴿مَا أَفَاءَ اللهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْ أَهْلِ الْقُرَى فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِيالْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ﴾ هەر شتێك لە دانیشتووانی ئەو دێیە کافرانە دەست پێغەمبەرﷺ دەکەوێ، ئەوە بۆ خواو پێغەمبەرەوﷺ بۆ خزمە موسوڵمانەکانی پێغەمبەرەوﷺ بۆ یەتیمانەو بۆ هەژارانەو بۆ رێبوارانە.

(وَالثَّـانِي) جۆریدووەم-کە (خُمُسُ الْخُمُس)=پێنجیکیپێنجێکی دەسکەوتووەکەیان دەدرێتی-: (بَنُوهَاشِمٍ وَالْمُطَّلِبِ) نەتەوەی (هاشم)و نەتەوەی (المطّلب)ن: کە هەردووکیان خزمە موسوڵمانەکانی پێغەمبەرنﷺ،-ئیمامی(الشافعي) لە نەتەوەی (المطّلب)ەو سەیدەکانی کوردستانیش لە نەتەوەی (هاشم)ن-(يَشْتَرِكُ الْغَنِيُّ وَالْفَقِيرُ) دەوڵەمەندو هەژارەکانیان دەبنە هاوبەش لەو پێنجێکە پێنجێکەدا، هەم (وَالنِّسَاءُ) ژنەکانیشیان، بەڵام (وَيُفَضَّلُ الذَّكَرُ كَالإِرْثِ) نێرینە دوو هەندی مێینەی دەدرێتێ وەکو میرات.

وَالثَّالِثُ: اَلْيَتَامَى وَهُوَ صَغِيرٌ لاَ أَبَ لَهُ، وَيُشْتَرَطُ فَقْرُهُ عَلَى الْمَشْهُورِ. وَالرَّابِعُ وَالْخَامِسُ: الْمَسَاكِينُ وَابْنُ السَّبِيلِ، وَيَعُمُّ الأَصْنَافَ الأَرْبَعَةَ الْمُتَأَخِّرَةَ، وَقِيلَ يَخُصُّ بِالْحَاصِلِ فِي كُلِّ نَاحِيَةٍ مَنْ فِيهَا مِنْهُمْ. وَأَمَّاالأَخْمَاسُ الأَرْبَعَةُ فَالأَظْهَرُ أَنَّهَا لِلْمُرْتَزِقَةِ، وَهُمُ الأَجْنَادُ الْمُرْصَدُونَ لِلْجِهَادِ فَيَضَعُ الإِمَامُ دِيوانًا، وَيَنْصِبُ لِكُلِّ قَبِيلَةٍ أَوْ جَمَاعَةٍ عَرِيفًا وَيَبْحَثُ عَنْ حَالِ كُلِّ وَاحِدٍ وَعِيَالِهِ وَمَا يَكْفِيهِمْ فَيُعْطِيهِ كِفَايَتَهُمْ،

---

(وَالثَّالِثُ) جۆری سێیەمیش-کە (خُمُسُ الْخُمُسِ) پێنجیکی پێنجیکی دەستکەوتووەکەیان دەدرێتێ-: (اَلْيَتَامَى) یەتیمەکانن (وَهُوَ) یەتیم لە شەرعدا (صَغِيرٌ لاَ أَبَ لَهُ) منداڵێکە بلۆغی نەبوبێ‌و باوکی نەبێ، هەرچەند باپیرەشی هەبێ، یان لە زینا بوبێ، کەواتە: جیاوازی کوڕو کچ نیە، بەڵام (وَيُشْتَرَطُ فَقْرُهُ عَلَى الْمَشْهُورِ) بە مەرج دادەندرێ: منداڵە بێ‌باوکەکە هەژار بێ، لە سەر فەرموودەی ناسراوی‌مەزهەب.

(وَالرَّابِعُ وَالْخَامِسُ) چوارەم‌و پێنجەم-کە پێنجیکی‌پێنجیکی دەستکەوتووەکەیان دەدرێتێ-: (اَلْمَسَاكِينُ وَابْنُ السَّبِيلِ) گەداو هەژارەکان‌و رێبوارەکانن.

(وَيَعُمُّ الأَصْنَافَ الأَرْبَعَةَ الْمُتَأَخِّرَةَ) پێشەوای‌موسوڵمانان-لەو دەستکەوتووە- دەداتە گشت ئەو چوار جۆرانەی دوای جۆری‌یەکەم، جیاوازی نیە: لە شوێنی دەستکەوتووەکەدا ئامادە بن، یان لە شوێنێکی‌تر بن، بەڵام مەرجە هەر چوار جۆرەکان: موسوڵمان بن، ئینجا بۆ کاربەدەستەکە دروستە: جیاوازی لە نێوان ئەندامەکانی سێ جۆرەکەی دوای جۆری‌دووەم بکاو هەندێکیان لە هەندێکیان زیاتریان بداتێ (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێ‌هێزدا: (يَخُصُّ بِالْحَاصِلِ فِي كُلِّ نَاحِيَةٍ مَنْ فِيهَا مِنْهُمْ) دەستکەوتووی هەر ناوچەیەك بە تایبەتی دەداتە ئەوانەی لەو ناوچەیەدانە لەو چوار جۆرانە.

(وَأَمَّا الأَخْمَاسُ الأَرْبَعَةُ) بەڵام چوار پێنجیکەکەی‌تری دەستکەوتووەکە-کە گشتی لەگەڵ پێنجیکی‌پێنجیکەی‌رابردووش بۆ پێغەمبەر بووﷺ- (فَالأَظْهَرُ) بە فەرموودەی بەهێزتر: (أَنَّهَا لِلْمُرْتَزِقَةِ) ئەو چوار پێنجیکە لە دوای وەفاتی‌پێغەمبەرﷺ گشتی بۆ جەنگاوەرانی ئیسلامە (وَهُمُ الأَجْنَادُ الْمُرْصَدُونَ لِلْجِهَادِ) جەنگاوەرەکان ئەو سەربازانەن کە بۆ (جهاد)- بۆ غەزاکردن ئامادە کراون.

کەوابو: (فَيَضَعُ الإِمَامُ دِيوانًا) واجبە: پێشەوای موسوڵمانان دەفتەرێکی تۆمارکردن بۆ ئەو سەربازانە دابنێ‌و ناوەکانیان تێدا بنوسێ، هەروەك ئیمامی(عمرؓ) داینابو، ئینجا (وَيَنْصِبُ لِكُلِّ قَبِيلَةٍ أَوْ جَمَاعَةٍ عَرِيفًا) سوننەتە بۆ گشت هۆزێك، یان بۆ گشت کۆمەڵێك حاڵناسێك دابنێ، چونکە (وَيَبْحَثُ عَنْ حَالِ كُلِّ وَاحِدٍ وَعِيَالِهِ) واجبە: پێشەوا-بەخۆی، یان بە جێگرێکی- لە حاڵی گشت سەربازێك‌و حاڵی دایك‌و باوك‌و منداڵەکانی بکۆڵێتەوە، هەم(وَمَا يَكْفِيهِمْ) دەبێ بزانێ چەند موچە بەشیان دەکا (فَيُعْطِيهِ كِفَايَتَهُمْ) جا چەند بەشی

وَيُقَدَّمُ فِي إِثْبَاتِ الإِسْمِ وَالإِعْطَاءِ قُرَيْشًا وَهُمْ وَلَدُالنَّضْرِ بنِ كِنَانَةَ، وَيُقَدَّمُ مِنْهُمْ بَنِيهَاشِمٍ وَالْمُطَّلِبِ ثُمَّ عَبْدِشَمْسٍ ثُمَّ نَوْفَلٍ ثُمَّ عَبْدِالْعُزَّى ثُمَّ سَائِرَالْبُطُونِ الأَقْرَبَ فَالأَقْرَبَ إِلَى رَسُولِ اللهِﷺ ثُمَّ الأَنْصَارَ ثُمَّ سَائِرَالْعَرَبِ، ثُمَّ الْعَجَمَ، وَلاَ يُثْبِتُ فِيالدِّيوَانِ أَعْمَى وَلاَ زَمِنًا وَلاَ مَنْ لاَ يَصْلُحُ لِلْغَزْوِ، وَلَوْ مَرِضَ بَعْضُهُمْ أَوْ جُنَّ وَرُجِيَ زَوَالُهُ أُعْطِيَ، فَإِنْ لَمْ يُرْجَ فَالأَظْهَرُ أَنَّهُ يُعْطَى،

---

خۆیو منداڵەکانی دەکا: بۆ جلو بەرگو خواردەمەنیو خانوو و گشت پێویستیەکانیتری خۆیو دایكو باوكو منداڵەکانی گشتی دەدرێتە سەربازەکە، هەرچەند دەوڵەمەندیش بێو پێویستی پێی نەبێ، جا ئەگەر منداڵیزیاتری پەیدا بون، یان لە ژنێك زیاتری هێنا، واجبە: موچەکەی بۆ زیاد بکرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

کەواتە: ئەو سەربازەی ژنی هەیە زیاتری دەدرێتێ لەوەی ژنی نیە ﴿عَنْ عوف بن مالكؓ: كَانَ النَّبِيُّﷺ إِذَا أَتَاهُ الْفَيْءُ قَسَمَهُ فِي يَوْمِهِ: فَأَعْطَى الآهِلَ حَظَّيْنِ وَأَعْطَى الْعَزَبَ حَظًّا﴾ رواه أبوداود بسندصالح، هەرکاتێك پێغەمبەرﷺ (فَيء)ی بۆ هاتبا، هەر لە ڕۆژەکەی خۆیدا بەشی دەکرد: دوو بەشی دەدا خاوەن ژن، بەشێکی دەدا بێژن.

(وَيُقَدَّمُ فِي إِثْبَاتِ الإِسْمِ وَالإِعْطَاءِ قُرَيْشًا) سوننەتە: لە تۆمارکردنی ناو و لە بەخشیندا (قریشی)یەکان وەپێش بێخێ، چونکە لە هۆزە بەڕێزەکەی پێغەمبەرنﷺ (وَهُمْ وَلَدُ النَّضْرِ بنِ كِنَانَةَ) قورەیشیەکان نەتەوەی (نضر)ی کوڕی (کنانة)نە، ئینجا (وَيُقَدَّمُ مِنْهُمْ بَنِي هَاشِمٍ وَالْمُطَّلِبِ) لە قورەیشیەکانیش بەرەبابی (هاشم )و(المطّلب) وەپێش دێخێ (ثُمَّ عَبْدِشَمْسٍ ثُمَّ نَوْفَلٍ ثُمَّ عَبْدِالْعُزَّى) ئینجا بەرەبابی (عبدشمس) ئینجا بەرەبابی (نوفل)، ئینجا بەرەبابی (عبدالعزّى) وەپێش دێخێ (ثُمَّ سَائِرَ الْبُطُونِ الأَقْرَبَ فَالأَقْرَبَ إِلَى رَسُولِ اللهِﷺ) ئینجا بەرەبابەکانیتری (قریش) بەگوێرەی نزیکتریان لە پێغەمبەرﷺ وەپێش دێخێ (ثُمَّ الأَنْصَارَ) ئینجا (أَنْصَارِي)یەکانی(مەدینە)ی پیرۆز (ثُمَّ سَائِرَ الْعَرَبِ) ئینجا عەرەبەکانیتر (ثُمَّ الْعَجَمَ) ئینجا گەلەکانیتری جگە لە عەرەب: کامەیان پێشدا هاتونەتە ناو ئیسلام تۆماریان دەکا.

(وَلاَ يُثْبِتُ فِيالدِّيوَانِ أَعْمَى وَلاَ زَمِنًا) نابێ لە دەفتەرەکەدا کوێرو پەککەوتوو و منداڵو شێتو ئافرەت تۆمار بکا، هەم (وَلاَ مَنْ لاَ يَصْلُحُ لِلْغَزْوِ) نابێ ئەو کەسەش تۆمار بکا: کە بۆ غەزاکردن بە کەڵك نایێ لە بەر ترسەنۆکی، یان بێدەستی، یان بێقاچی.

(وَلَوْ مَرِضَ بَعْضُهُمْ أَوْ جُنَّ) ئەگەر سەربازێك نەخۆش بوو، یان شێت بوو (وَرُجِيَ زَوَالُهُ) چاوەڕوانی لاچوونی نەخۆشیو شێتیەکەشی دەکرا، ئەوە (أُعْطِيَ) موچەکەی هەر دەدرێتێو ناوەکەی ناسڕێتەوە، بەلام (فَإِنْ لَمْ يُرْجَ) ئەگەر چاوەڕوانی چاکبوونەوەی نەدەکرا، ئەو کاتەش (فَالأَظْهَرُ أَنَّهُ يُعْطَى) بە فەرموودەی بەهێزتر: موچەکەی هەر

وَكَذَا زَوْجَتُهُ وَأَوْلَادُهُ إذَا مَاتَ: فَتُعْطَى الزَّوْجَةُ حَتَّى تَنْكِحَ وَالأَوْلَادُ حَتَّى يَسْتَقِلُّوا، فَإِنْ فَضَلَت الأَخْمَاسُ الأَرْبَعَةُ عَنْ حَاجَات الْمُرْتَزِقَة وُزِّعَ عَلَيْهِمْ عَلَى قَدْرِ مُؤْنَتِهِمْ، وَالأَصَحُّ أَنَّهُ يَجُوزُ أَنْ يُصْرَفَ بَعْضُهُ فِي إِصْلَاحِ الثُّغُورِ وَالسِّلَاحِ وَالْكُرَاعِ، هَذَا حُكْمُ مَنْقُولِ الْفَيْءِ، فَأَمَّا عَقَارُهُ: فَالْمَذْهَبُ أَنَّهُ يُجْعَلُ وَقْفًا وَتُقَسَّمُ غَلَّتُهُ كَذَلِكَ.
(فَصْلٌ) اَلْغَنِيمَةُ مَالٌ حَصَلَ مِنْ كُفَّارٍ بِقِتَالٍ وَإِيجَافٍ،

---

دەدرێتێ، بەڵام ناوەکەی لە دەفتەری سەربازەکان دەسڕێتەوە (وَكَذَا زَوْجَتُهُ وَأَوْلَادُهُ إذَا مَاتَ) هەروەها هەرکاتێك سەربازەکە مرد، ژنەکانو منداڵەکانیشی بەشە موچەکەیخۆیان هەر دەدرێتێ، هەروەها دایكو باوکیشی ئەگەر بەخێوکردنیان لە سەر سەربازەکە بوبێ، ئەوانیش بەشە موچەکەیان هەر دەدرێتێ:
کەوابو: (فَتُعْطَى الزَّوْجَةُ حَتَّى تَنْكِحَ) ژنەکەی هەر دەیدرێتێ تا مێردێکیتر دەکا، بەڵام ئەگەر دەوڵەمەند بوو نایدرێتێ (وَالأَوْلَادُ حَتَّى يَسْتَقِلُّوا) منداڵەکانیشی هەر دەیاندرێتێ تا سەربەخۆ دەبن، واتە: یان دەوڵەمەند دەبن، یان بلۆغیان دەبێو توانای کەسابەتیان دەبێ، یان تا کیژەکان مێرد دەکەن.
(فَإِنْ فَضَلَتِ الأَخْمَاسُ الأَرْبَعَةُ عَنْ حَاجَاتِ الْمُرْتَزِقَةِ) جا ئەگەر چوار پێنجێکەکە لە پێویستیەکانیسەربازەکان زیاد بوو، ئەوە (وُزِّعَ عَلَيْهِمْ عَلَى قَدْرِ مُؤْنَتِهِمْ) زێدەکەش هەر بە سەر سەربازەکاندا بەش دەکرێتەوە بەگوێرەی ئەرکیبەخێوکردنی خۆیانو منداڵەکانیان، بەڵام (وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەیڕاستتر (أَنَّهُ يَجُوزُ أَنْ يُصْرَفَ بَعْضُهُ فِي إِصْلَاحِ الثُّغُورِ) دروستە بەشێکی ئەو زێدەییە سەرف بکرێ بۆ چاککردنەوەیسەنگەرەکان، هەم (وَالسِّلَاحِ) بۆ چەکو هەم (وَالْكُرَاعِ) بۆ وولاغی سواری، بەڵام ئێستا لە جیاتیوولاغ: ئۆتۆمبیلو فڕۆکەو زرێپۆش لە جەنگدا بە کار دێن، کەوابو: بۆ ئەوانە سەرف دەکرێ.
(هَذَا) ئەوەی ڕابرا (حُكْمُ مَنْقُولِ الْفَيْءِ) بڕیاری ئەو دەستکەوتووە بوو: کە دەگواستراوە (فَأَمَّا عَقَارُهُ) بەڵام زەویو باغو خانوویدەستکەوتووەکە (فَالْمَذْهَبُ: أَنَّهُ يُجْعَلُ وَقْفًا) بە فەرموودەی ڕاستیمەزهەب: هەر دەستکەوتوویکی نەگواسترێتەوە دەکرێتە وەقفو (وَتُقَسَّمُ غَلَّتُهُ كَذَلِكَ) هەموو ساڵێك بەرهەمەکەشی وەك گواستراوەیڕابردوو دەکرێتە پێنج بەشو بەش دەکرێ.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی (اَلْغَنِيمَةُ) تالانی کافرەکان ﴾

**پێناسە**: (اَلْغَنِيمَةُ) تالان (مَالٌ حَصَلَ مِنْ كُفَّارٍ بِقِتَالٍ وَإِيجَافٍ) شتێکە لە کافرەکانەوە بە دەست موسوڵمانان کەوتبێ بە جەنگو بەکارهێنانی ئەسپو وولاغو هەڵگرەکانیتر: وەکو کەشتیو ئۆتۆمبیلو فڕۆکەو ئەو جۆرە شتانە.

فَيُقَدَّمُ مِنْهُ السَّلَبُ لِلْقَاتِلِ وَهُوَ ثِيَابُ الْقَتِيلِ وَالْخُفُّ وَالرَّانُ وَآلاَتُ الْحَرْبِ كَدِرْعٍ وَسِلاَحٍ وَمَرْكُوبٍ وَسَرْجٍ وَلِجَامٍ،

---

ئینجا بزانە: ئەو شتەی کافرەکانی‌جەنگی لە موسوڵمانێك، یان لە کافرێکی پەیمان لەئەستۆ بە ناهەق سەندوویانە ئینجا بە هۆی جەنگ، یان بە هۆیەکی‌تر لێیان دەستێندرێتەوە، ئەوە نابێتە تالآن، بەڵکو واجبە: بدرێتەوە خاوەنەکەی، هەروەك لە زۆریەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

بەڵام ئەو شتەی موسوڵمانێك، یان کۆمەڵە موسوڵمانێك لە (دارالْحَرْب)، یان لە کافرەکانی جەنگی دەیدزن، یان دەیرفێنن، یان دەیدۆزنەوە، ئەوە لە فەرموودەی ڕاستتردا: بە تالآن دادەندرێ، بەڵام لە فەرموودەیەکی‌تردا: نابێتە تالآن، بەڵکو بۆ ئەو کەسەیە کە دزیویەتی، یان ڕفاندویەتی، یان دۆزیویەتیەوە، جا (إمام الحرمين)و (الإمام الغزالي)ش پشتگیری ئەم فەرموودە دووەمەیان کردوە، هەروەك لە (شرح المَحلّي) لە باسی بە دیلگرتنی کافرەکاندا روون کراوەتەوە.

دیسان بزانە: ماڵی ئەو موسوڵمانانەی کافر دەبن‌و لە جەنگدا دەکوژرێن، ئەوە ماڵەکەیان ڕادەگیرێ: جا هەر یەکێکیان بۆوە موسوڵمان، ماڵەکەی دەدرێتەوە، ئەگەر نا: لە دوای مردنی، یان کوژرانی، ئەویش دەبێتە (فَيْء)، هەروەك ئیمامی(الماوردی) لە (الأحكام السلطانية)دا ڕوونی کردۆتەوە.

ئینجا تالآنەکەش بەم شێوەیە بەش دەکرێ: سەرەتا (فَيُقَدَّمُ مِنْهُ السَّلَبُ لِلْقَاتِلِ) پێش هەموو دەستکارییەك لەو تالآنە کە لوپەلی کوژراوەکە دەدرێتە ئەو کەسەی کوشتویەتی، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿مَنْ قَتَلَ قَتِيلاً لَهُ عَلَيْهِ بَيِّنَةٌ فَلَهُ سَلَبُهُ﴾ رواه الشيخان، هەر کەسێك لە جەنگدا کافرێك بکوژێ‌و شاهیدی هەبێ، ئەوە کەلوپەلی کوژراوەکە بۆ خۆیەتی. ئیتر جیاوازی نیە بکوژەکە: منداڵ بێ، یان بالغ بێ، نێر بێ، یان مێ بێ، بەڵام مەرجە: موسوڵمان بێ، واتە: ئەوکافرەی یارمەتی موسوڵمانان دەداو کافرێك دەکوژێ، مافی کەلوپەلەکەی نیە، هەروەها جاسوس‌و خائین‌و ئەو کەسەی ترس لە ناو موسوڵماناندا بڵاو دەکاتەوە، یان لە جەنگکردن ساردیان دەکاتەوە، ئەوانەش ئەگەر کافرێك بکوژن مافی کەلوپەلەکەیان نیەو هەم هیچ بەشێکیشیان لە تالآنەکە نادرێتێ، هەروەك لە زۆریەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَهُوَ) کەلوپەلەکە (ثِيَابُ الْقَتِيلِ) جل‌و بەرگی کوژراوەکەیە، هەم (وَالْخُفُّ) خوف‌و گۆرەوی‌و (وَالرَّانُ) بەلەکپێچ، هەم (وَآلاَتُ الْحَرْبِ) کەرستەی جەنگ: (كَدِرْعٍ) وەکو زرێ‌و (وَسِلاَحٍ) چەك‌و (وَمَرْكُوبٍ) وولآغی سواری‌و (وَسَرْجٍ) زینی وولآغەکەو (وَلِجَامٍ) دەستە

وَكَذَا سِوَارٌ وَمِنْطَقَةٌ وَخَاتَمٌ وَنَفَقَةٌ مَعَهُ وَجَنِيبَةٌ تُقَادُ مَعَهُ فِي الْأَظْهَرِ، لَا حَقِيبَةٌ مَشْدُودَةٌ عَلَى الْفَرَسِ عَلَى الْمَذْهَبِ، وَإِنَّمَا يَسْتَحِقُّ بِرُكُوبِ غَرَرٍ يَكْفِي بِهِ شَرَّ كَافِرٍ فِي حَالِ الْحَرْبِ، فَلَوْ رَمَى مِنْ حِصْنٍ أَوْ مِنَ الصَّفِّ أَوْ قَتَلَ نَائِمًا أَوْ أَسِيرًا أَوْ قَتَلَهُ وَقَدْ انْهَزَمَ الْكُفَّارُ فَلَا سَلَبَ، وَكِفَايَةُ شَرِّهِ أَنْ يُزِيلَ امْتِنَاعَهُ بِأَنْ يَفْقَأَ عَيْنَيْهِ أَوْ يَقْطَعَ يَدَيْهِ وَرِجْلَيْهِ، وَكَذَا لَوْ أَسَرَهُ أَوْ قَطَعَ يَدَيْهِ أَوْ رِجْلَيْهِ فِي الْأَظْهَرِ،

---

جلەوەکەی (وَكَذَا سِوَارٌ) هەروەها بازنی دەستی کوژراوەکەو (وَمِنْطَقَةٌ) پشتێندو قایشی پشتیو (وَخَاتَمٌ) ئەنگوستیلەو (وَنَفَقَةٌ مَعَهُ) ئەو خواردەمەنیەی لەگەڵ خۆیەتیو (وَجَنِيبَةٌ تُقَادُ مَعَهُ) هەم ئەو وولاغەش کە بە یەدەك لەگەڵی لێدەخوڕدرێ تاکو لە کاتی پێویستی سواری ببێ (فِي الْأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا.

(لَا حَقِيبَةٌ مَشْدُودَةٌ عَلَى الْفَرَسِ) بەڵام ئەو جانتایەی لە سەر ئەسپەکەی بەستراوە، ئەوەی نادرێتێ (عَلَى الْمَذْهَبِ) لەسەر فەرموودەی راستی مەزهەب، بەڵام بە فەرموودەکەیتر: ئەو جانتایەو ئەوەی لە ناو جانتایەکەشدایە گشتی دەدرێتێ، کۆمەڵە زانایەکیش یارمەتی ئەم فەرموودە دووەمەیان داوە، هەروەك لە (تحفة)و (مغنی)دا فەرموویانە.

(وَإِنَّمَا يَسْتَحِقُّ) بکوژەکە تەنها بەوە مافی کەلوپەلی کوژراوەکەی هەیە: کە (بِرُكُوبِ غَرَرٍ) بە سورای مەترسیەك بێ: کە (يَكْفِي بِهِ شَرَّ كَافِرٍ) بەو مەترسی‌یە خراپەی کافرێکی جەنگی لە موسوڵمانان لابدا (فِي حَالِ الْحَرْبِ) لە حاڵەتی جەنگدا، کەوابو: (فَلَوْ رَمَى مِنْ حِصْنٍ) ئەگەر لە قەڵایەکەوە، یان لە سەنگەرێکەوە چەکی بۆ کوژراوەکە هاویشتبو (أَوْ مِنَ الصَّفِّ) یان لە ریزی موسوڵمانانەوە بۆی هاویشتبو (أَوْ قَتَلَ نَائِمًا) یان کافرێکی خەوتووی کوشتبو (أَوْ أَسِيرًا) یان دیلێکی کافری کوشتبو (أَوْ قَتَلَهُ وَقَدْ انْهَزَمَ الْكُفَّارُ) یان لەو حاڵەتەدا کافرەکەی کوشتبو: کە کافرەکان بەزیبونو هەڵاتبون، ئەوە (فَلَا سَلَبَ) مافی کەلوپەلەکەی نیە، چونکە لەو حاڵەتانەدا سواری هیچ مەترسیەك نەبوە.

کەوابو: ئەو کوژراوەنەی لەم سەردەمەدا بە تفەنگو تۆپ دەکوژرێن، کەلوپەلەکەیان وەگەڵ تاڵانەکە دەخسترێو هیچی بە تایبەتی نادرێتە تۆپتەقێنەکەو تفەنگهاوێژەکە، والله أعلم.

(وَكِفَايَةُ شَرِّهِ) لادانی خراپەی کافرەکەش ئەوەیە (أَنْ يُزِيلَ امْتِنَاعَهُ) هێزی خۆپاراستنی کافرەکە لا ببا (بِأَنْ يَفْقَأَ عَيْنَيْهِ) وەك هەردوو چاوەکانی دەربێنێ، یان هەدووکیان کوێر بکا (أَوْ يَقْطَعَ يَدَيْهِ وَرِجْلَيْهِ) یان هەردووك دەستو قاچەکانی گشتی لێبکاتەوە (وَكَذَا لَوْ أَسَرَهُ) هەروەها ئەگەر بە دیل بیگرێ (أَوْ قَطَعَ يَدَيْهِ) یان تەنها هەردوو دەستی لێبکاتەوە (أَوْ رِجْلَيْهِ) یان تەنها هەردوو قاچی لێبکاتەوە، یان دەستێکو قاچێکی لێبکاتەوە، ئەو کاتەش کەلوپەلەکەیی دەدرێتێ (فِي الْأَظْهَرِ) لە فەرموودەیبەهێزتردا.

وَلاَ يُخَمَّسُ السَّلَبُ عَلَى الْمَشْهُورِ، وَبَعْدَ السَّلَب تُخرَجُ مُؤْنَةُالحفظ وَالنَّقْلِ وَغَيْرِهِمَا، ثُمَّ يُخَمَّسُ الْبَاقِي: فَخُمُسُهُ لأَهْلِ خُمُسِ الْفَيْءِ يُقَسَّمُ كَمَا سَبَقَ، وَالأَصَحُّ أَنَّ النَّفَلَ يَكُونُ مِنْ خُمُسِ الْخُمُسِ الْمُرْصَدِ لِلْمَصَالِحِ إِنْ نَفَلَ مِمَّا سَيُغْنَمُ فِي هَذَاالْقِتَالِ، وَيَجُوزُ أَنْ يُنَفِّلَ مِنْ مَالِ الْمَصَالِحِ الْحَاصِلِ عِنْدَهُ، وَالنَّفَلُ زِيَادَةٌ يَشْتَرِطُهَا الإِمَامُ أَوِ الأَمِيرُ لِمَنْ يَفْعَلُ مَا فِيهِ

---

(وَلاَ يُخَمَّسُ السَّلَبُ عَلَىالْمَشْهُورِ) كەلوپەلی کوژراوەکە ناکرێتە پێنج بەش لە سەر فەرموودەیناسراویمەزهەب، بەڵکو گشتی بۆ بکوژەکەیەتی، هەروەك ڕابرا.

ئینجا (وَبَعْدَ السَّلَبِ) لە دوای جێبەجێکردنی کەلوپەلی کوژراوەکە (تُخْرَجُ مُؤْنَةُ الْحِفْظِ وَالنَّقْلِ وَغَيْرِهِمَا) ئەرکی پاراستنو گواستنەوەی تالانەکەو ئەرکەکانیتریش گشتی لە تالانەکە دەردەکرێ (ثُمَّ يُخَمَّسُ الْبَاقِي) ئینجا لە دوای دەردەکردنی کەلوپەلو ئەرکەکانیڕابردوو، پاشماوەکەی گشت تالانەکە دەکرێتە پێنج بەش:

(فَخُمُسُهُ) جا پێنجیێکی گشت پاشماوەکە (لأَهلِ خُمُسِ الْفَيْءِ) بۆ ئەو پێنج جۆرانەیە کە (فَيْء)-دەستکەوتووەکەیان دەدرایێ (يُقَسَّمُ كَمَا سَبَقَ) لە نێوانیاندا بەش دەکرێ، هەروەك لە باسی(فَيْء)دا ڕابرا، واتە: چوار بەشەکەیتریش گشتی بۆ ئامادەبووەکانی جەنگەکەیە، هەروەك لەمەودوا ڕوونی دەکەینەوە، إن شاء الله تعالى، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُمْ مِنْ شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِيالْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ﴾ بزانن هەر شتێکتان لە کافرەکان بە تالان گرت، ئەو پێنجیێکی بۆ خواو پێغەمبەرەوﷺ بۆ خزمەکانی پێغەمبەرەو بۆ یەتیمانەو بۆ هەژارانەو بۆ ڕێبوارانە.

ئینجا بزانە: بەشەکەی خواو پێغەمبەرﷺ هەر یەك بەشە، جا ئێستا وەکو (فَيْء) لە بەرژەوەندی موسوڵمانان سەرف دەکرێ هەروەك ڕابرا.

﴿ زێدە بەشی جەنگاوەرەکان ﴾

(وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر: (أَنَّ النَّفَلَ) زێدەبەشی جەنگاوەرەکان (يَكُونُ مِنْ خُمُسِ الْخُمُسِ الْمُرْصَدِ لِلْمَصَالِحِ) لەو پێنجیێکە پێنجیێکە دەدرێ کە بۆ بەرژەوەندیەکان دانراوە (إِنْ نَفَلَ مِمَّا سَيُغْنَمُ فِي هَذَا الْقِتَالِ) ئەگەر سەرکردەکە زێدەبەشەکەی بە مەرج دانابێ: لەو تالانە بیدا کە لەو جەنگەدا دەست دەکەوێ، بەڵام (وَيَجُوزُ أَنْ يُنَفِّلَ مِنْ مَالِ الْمَصَالِحِ الْحَاصِلِ عِنْدَهُ) دروستیشە زێدەبەشەکە هەر لە ماڵی بەرژەوەندیەکان بدا: کە ئێستا لە (بیت المال)دا هەیە.

**پێناسە:** (وَالنَّفَلُ) زێدەبەش لە شەرعدا: (زِيَادَةٌ) بەشە ماڵێکی زیادە سەرەڕای بەشە تالانەکە (يَشْتَرِطُهَا الإِمَامُ أَوِ الأَمِيرُ) پێشەوا، یان ئەمیر بە مەرجی دادەنێ (لِمَنْ يَفْعَلُ مَا فِيهِ

نكَايَةُ الْكفَّار، وَيَجْتَهِدُ فِي قَدْرِه، وَالأَخْمَاسُ الأَرْبَعَةُ عَقَارُهَا وَمَنْقُولُهَا لِلْغَانِمِينَ: وَهُمْ مَنْ حَضَرَ الْوَقْعَةَ بِنيَّة الْقتَال وَإِنْ لَمْ يُقَاتِل، وَلاَ شَيْءَ لِمَنْ حَضَرَ بَعْدَ انْقضَاء الْقتَال، وَفِيمَا قَبْلَ حِيَازَةِ الْمَال وَجْهٌ، وَلَوْ مَاتَ بَعْضُهُمْ بَعْدَ انْقِضَائِه وَالْحِيَازَة فَحَقُّهُ لِوَارِثِه وَكَذَا بَعْدَ الإِنْقِضَاء وَقَبْلَ الْحِيَازَة

---

(نكَايَةُ الْكفَّار) بۆ ئەو كەسەی چالاكیەكی وەها دەكا: كە شكستیەكی كافرەكانی تێدا بێ: وەك هەواڵ هێنانێك، یان ڕێگە نیشاندانێك، یان سەركردەیەكیان بكوژێ...هتد.

(وَيَجْتَهِدُ فِي قَدْرِه) ئەوەی زێدە بەشەكە بە مەرج دادەنێ: بە بۆچوونی خۆی ئەندازەكەشی دیاریدەكا ﴿عن ابن عمر رضي الله عنهما: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُنَفِّلُ بَعْضَ مَنْ يَبْعَثُ مِنَ السَّرَايَا لأَنْفُسِهِمْ خاصَّةً سِوى قِسْمَةِ عَامَّةِ الْجَيْشِ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ زێدەبەشێكی ئەدا چەند كەسێكی ئەو تیپانەی ئەیناردنە جەنگ جگە لەو بەشە تاڵانەی خۆیان: كە لەگەڵ بەشكردنی گشت لەشكرەكەدا ئەیاندرایێ.

(وَالأَخْمَاسُ الأَرْبَعَةُ) چوار پێنجێكەكەیتریش: (عَقَارُهَا وَمَنْقُولُهَا) زەویەكەیو باغەكەیو خانووەكەیو ئەوەی دەگوازرێتەوەش گشتی (لِلْغَانِمِينَ) بۆ تاڵانگرەكانە (وَهُمْ) تاڵانگرەكان (مَنْ حَضَرَ الْوَقْعَةَ بِنِيَّةِ الْقتَال) ئەو كەسانەن پێش كۆتایی هاتنی جەنگ ئامادەی جەنگەكە بوبن بە نیەتی جەنگكردن (وَإِنْ لَمْ يُقَاتِل) هەر چەند جەنگیشی نەكردبێ.

كەوابو: (وَلاَ شَيْءَ لِمَنْ حَضَرَ بَعْدَ انْقضَاءِ الْقتَال) ئەو كەسەی لە دوای تەواوبوونی جەنگ ئامادە بووە هیچ شتێكی لە تاڵاناكە نیە، چونكە ئیمامی(أبوبكر)و ئیمامی(عمر) رضي الله عنهما فەرموویانە: ﴿إِنَّمَا الْغَنِيمَةُ لِمَنْ شَهِدَ الْوَقْعَةَ﴾ رواه الشافعي رحمه الله تعالى، تاڵان تەنها بۆ ئەو كەسەیە كە ئامادەی جەنگەكە بوبێ.

(وَفِيمَا قَبْلَ حِيَازَةِ الْمَال) لەبارەی ئامادەبوونی جەنگاوەرەكە لە دوای تەواوبوونی جەنگەكەو پێش كۆكردنەوەی هەموو تاڵانەكە (وَجْهٌ) فەرموودەیەكی بێهێز هەیە: كە تاڵانەكەی دەدرێتێ، هەروەك مەزهەبی(حنفي)ش ئەوهایە، ئینجا بزانە: ئەوەی لە جەنگ هەڵدێ، یان خۆی دەشارێتەوە، ئەوەی ترس لە ناو لەشكردا بڵاو دەكاتەوە، یان لە جەنگ ساردیان دەكاتەوە، ئەوەی خیانەت دەكاو جاسوسی بۆ دوژمن دەكا، ئەوانە هیچ بەخشیشو هیچ بەشێكیان لە تاڵانەكە نادرێتێ، بەڵكو واجبە: قەدەغەبكرێنو ڕێگەیان نەدرێتێ بێنە بەرەی جەنگ، هەروەك لە (مغني)دا ڕوون كراوەتەوە.

(وَلَوْ مَاتَ بَعْضُهُمْ) ئەگەر یەكێك لە ئامادەبووانی جەنگەكە مرد (بَعْدَ انْقِضَائِه وَالْحِيَازَة) لە دوای تەواوبوونی جەنگەكەو كۆكردنەوەی تاڵانەكە، ئەوە (فَحَقُّهُ لِوَارِثِه) ماڵی وەرگرتنی تاڵانەكە بۆ میراتگرەكەیەتی (وَكَذَا بَعْدَ الإِنْقِضَاء وَقَبْلَ الْحِيَازَة) هەروەها ئەگەر لە دوای

فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ مَاتَ فِي الْقِتَالِ فَالْمَذْهَبُ أَنَّهُ لاَشَيْءَ لَهُ، وَالأَظْهَرُ أَنَّ الأَجِيرَ لِسِيَاسَةِ الدَّوَابِّ وَحِفْظِ الأَمْتِعَةِ وَالتَّاجِرَ وَالْمُحْتَرِفَ يُسْهَمُ لَهُمْ إِذَا قَاتَلُوا، وَلِلرَّاجِلِ سَهْمٌ وَلِلْفَارِسِ ثَلاَثَةٌ، وَلاَ يُعْطَى إِلاَّ لِفَرَسٍ وَاحِدٍ عَرَبِيًّا كَانَ أَوْ غَيْرَهُ، لاَ لِبَعِيرٍ وَغَيْرِهِ، وَلاَ يُعْطَى لِفَرَسٍ أَعْجَفَ وَمَا لاَغَنَاءَ فِيهِ، وَفِي قَوْلٍ يُعْطَى إِنْ لَمْ يُعْلَمْ نَهْيُ الأَمِيرِ عَنْ إِحْضَارِهِ،

---

تەواوبوونی جەنگەكەو پێش كۆكردنەوەی تاڵانەكەش بمرێ، مافی وەرگرتنی تاڵانەكە هەر بۆ میراتگرەكەیەتی (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی راستتردا.

بەڵام (وَلَوْ مَاتَ فِي الْقِتَالِ) ئەگەر لە ناو جەنگەكەدا بمرێ، یان شێت ببێ، ئەوە (فَالْمَذْهَبُ أَنَّهُ لاَ شَيْءَ لَهُ) بە فەرموودەی راستی مەزهەب: هیچ بەشێكی لە تاڵانەكە نیە، بەڵام ئەگەر لە ناو جەنگەكەدا بریندار ببێ، یان بێهۆش ببێ، یان نەخۆش ببێ، ئەو كاتە مافی لە تاڵانەكە هەر دەبێ، هەروەك لە (مغني)دا فەرموویەتی.

(وَالأَظْهَرُ) بە فەرموودەی بەهێزتر (أَنَّ الأَجِيرَ لِسِيَاسَةِ الدَّوَابِّ وَحِفْظِ الأَمْتِعَةِ) ئەو كەسەی بە كرێ گیراوە بۆ سەرپەرشتی وڵاغەكانو بۆ پاراستنی كەلوپەل، هەم (وَالتَّاجِرَ وَالْمُحْتَرِفَ) بازرگانو پیشەساز: وەك بەرگدروو و ئاسنگر (يُسْهَمُ لَهُمْ إِذَا قَاتَلُوا) ئەوانیش بەشیان لە تاڵانەكە بۆ دادەندرێ هەر كاتێك جەنگ بكەن.

(وَلِلرَّاجِلِ سَهْمٌ) جەنگاوەری پیادە تەنها بەشێكی لە تاڵانەكەمەیە (وَلِلْفَارِسِ ثَلاَثَةٌ) سوار ئەسپیش سێ بەشی هەنە: یەكێكی بۆ خۆیو دووی بۆ ئەسپەكەی ﴿عن ابن عمر رضي الله عنهما: قَسَمَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَوْمَ خَيْبَرَ لِلْفَرَسِ سَهْمَيْنِ وَ لِلرَّاجِلِ سَهْماً﴾ رواه الشيخان، لە غەزای خەیبەردا پێغەمبەرﷺ لە تاڵانەكە دوو بەشی بۆ ئەسپ داناو بەشێكی بۆپیادە دانا.

ئینجا بزانە: ئەگەر دووكەس بە ئەسپێكی هاوبەش ئامادەی جەنگ بون، ئەو كاتە بەشی ئەسپەكە بە هاوبەشی دەدرێتە هەردووكیان، دیسان بزانە: كەشتیو ئۆتۆمبیل بڕیاری ئەسپیان بۆ دەدرێ، هەر چەند بە سواری ئۆتۆمبیلو كەشتیەكەش جەنگ نەكا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكان دەفامێتەوە.

(وَلاَ يُعْطَى إِلاَّ لِفَرَسٍ وَاحِدٍ) سوار ئەسپەكە دوو بەشەكەی تەنها بۆ یەك ئەسپ دەدرێتێ، هەر چەند زۆر ئەسپیشی لەگەڵ خۆیا هێنابن (عَرَبِيًّا كَانَ أَوْ غَيْرَهُ) جیاوازی نیە ئەسپەكە: عەرەبی بێ، یان جۆرێكیتر بێ (لاَ لِبَعِيرٍ وَغَيْرِهِ) بەڵام بەشی تاڵان بۆ ووشترو وڵاغەكانیتر داناندرێ، بەڵكو هەر جۆرە وڵاغێك بەگوێرەی خۆی بەخششێكی بۆ دادەندرێ (وَلاَ يُعْطَى لِفَرَسٍ أَعْجَفَ) بەشە تاڵان بۆ ئەسپێكی لاواز داناندرێ، هەم (وَمَا لاَ غَنَاءَ فِيهِ) بۆ ئەسپی بێسودیش داناندرێ (وَفِي قَوْلٍ يُعْطَى) لە فەرموودەیەكدا: ئەو ئەسپەش دەیدرێتێ (إِنْ لَمْ يُعْلَمْ نَهْيُ الأَمِيرِ عَنْ إِحْضَارِهِ) بەو مەرجەی نەزاندرابێ ئەمیر

وَالْعَبْدُ وَالصَّبِيُّ وَالْمَرْأَةُ وَالذِّمِّيُّ إذَا حَضَرُوا فَلَهُمْ الرَّضْخُ، وَهُوَ دُونَ سَهْمٍ يَجْتَهِدُ الإِمَامُ فِي قَدْرِهِ، وَمَحَلُّهُ الأَخْمَاسُ الأَرْبَعَةُ فِي الأَظْهَرِ، قُلْتُ: إِنَّمَا يُرْضَخُ لِذِمِّيٍّ حَضَرَ بِلاَ أُجْرَةٍ وَبِإِذْنِ الإِمَامِ عَلَى الصَّحِيحِ وَاللهُ أَعْلَمُ.

---

قەدەغەی کردبێ ئەو ئەسپە بهێندرێتە جەنگ، هەم کەڵکی سواریشی هەبێ، جا ئەگەر ئەسپەکەی ساغ بوو، بەڵام لە جەنگدا نەخۆش بوو، یان بریندار بوو، یان مرد، یان بە ملکایەتی دایە کەسێکیتر، ئەو کاتە دوو بەشەکەی ئەسپەکەی هەر دەدرێتێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَالْعَبْدُ) کۆیلەو (وَالصَّبِيُّ) منداڵو شێتو (وَالْمَرْأَةُ) ئافرەتو (وَالذِّمِّيُّ) کافری پەیمان لەئەستۆ (إِذَا حَضَرُوا) هەر کاتێك ئامادەی جەنگەکە بونو سودێکیان هەبوو (فَلَهُمْ الرَّضْخُ) مافی بەخشیشیان هەیە (وَهُوَ) بەخشیشەکە (دُونَ سَهْمٍ) لە بەشێکی جەنگاوەرێکی پیادە کەمترەو (يَجْتَهِدُ الإِمَامُ فِي قَدْرِهِ) ئیمام بە بۆچوونی خۆی ئەندازەکەی دادەنێ ﴿عن ابن عباس رضي الله عنهما: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَغْزُو بِالنِّسَاءِ فَيُدَاوِينَ الْجَرْحَى وَيُحْذَيْنَ مِنَ الْغَنِيمَةِ، وَأَمَّا بِسَهْمٍ فَلاَ﴾ رواه مسلم وأصحاب السنن، پێغەمبەر ﷺ ئافرەتی لەگەڵ خۆیا دەبردنە غەزا، جا ئافرەتەکان بریندارەکانیان دەرمان دەکردنو بەخشیشێکیان لە تاڵان دەدرایێ، بەڵام وەکو پیاوان بەشێکیتەواویان نادرایێ.

(وَمَحَلُّهُ الأَخْمَاسُ الأَرْبَعَةُ) ئەو بەخشیشە لە چوار پێنجێکەکەی تاڵان دەدرێ کە بۆ جەنگاوەرەکان داندراوە (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا.

(قُلْتُ) ئیمامی (النواوي) دەفەرموێ (إِنَّمَا يُرْضَخُ لِذِمِّيٍّ) بەخشیشەکە تەنها لەو حاڵەتەدا دەدرێتە کافری پەیمان لە ئەستۆ: کە(حَضَرَ بِلاَ أُجْرَةٍ) بە بێکرێ ئامادەی جەنگەکە بوبێ، هەم (وَبِإِذْنِ الإِمَامِ) بە ئیزنی پێشەوا، یان ئەمیری جەنگەکەش هاتبێ (عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست (وَاللهُ أَعْلَمُ).

﴿ پاشکۆ ﴾: خیانەتکردن لە تاڵاندا حەرامە، جا هەر چەند شاردنەوەی دەرزیو داوێکیش بێ لێی حەرامەو واجبە: بیگەڕێنێتەوە بۆ ناو تاڵانەکە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ هەرکەسێك خیانەت لە تاڵاندا بکاو شتێك بە دزی ببا، ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا شتەکە لە سەر ملی خۆی دادەنێو دێتە مەیدانی مەحشەر.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿لاَ تَغُلُّوا فَإِنَّ الْغُلُولَ نَارٌ وَعَارٌ عَلَى أَصْحَابِهِ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ﴾ رواه الامام أحمد، هیچ شتێك لە تاڵان مەشارنەوەو بە دزی مەبەن، چونکە خیانەت لە تاڵاندا سزایەکەی ئاگرو شەرمەزارییە لە دونیاو قیامەت.

## (كِتَابُ قَسْمِ الصَّدَقَاتِ)

اَلْفَقِيرُ مَنْ لاَ مَالَ لَهُ وَلاَ كَسْبَ يَقَعُ مَوْقِعًا مِنْ حَاجَتِهِ، وَلاَ يَمْنَعُ الْفَقْرَ مَسْكَنُهُ وَثِيَابُهُ وَمَالُهُ الْغَائِبُ فِي مَرْحَلَتَيْنِ وَالْمُؤَجَّلُ وَكَسْبٌ لاَ يَلِيقُ بِهِ،

---

**﴿ كِتَابُ قَسْمِ الصَّدَقَاتِ: ئەمەیە پەرتوكی بەشكردنی زەكاتەكان ﴾**

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللهِ وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِنَ اللهِ وَاللهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ زەكاتەكان تەنها بۆ هەژارەكانەو بۆ گەدایەكانەو بۆ كرێكارەكانیزەكاتەو بۆ نوێموسوڵمانەكانەو بۆ كۆیلەكانەو بۆ قەرزارەكانەو بۆ جەنگاوەرانی ڕێگەیخوایەو بۆ ڕێبوارەكانە.

ئینجا ئیمامی (النواوي) بە ڕیزی ئایەتەكە پێناسەی ئەو هەشت چینانە دەكاو دەفەرموێ:

١-(اَلْفَقِيرُ) هەژار: (مَنْ لاَ مَالَ لَهُ) ئەو كەسەیە ماڵێكی وەهای نەبێو هەم (وَلاَ كَسْبَ) كەسابەتێكی وەهاشی نەبێ: كە ماڵەكە، یان كەسابەتەكە، یان هەردووكیان (يَقَعُ مَوْقِعًا مِنْ حَاجَتِهِ) شوێنێكی پێویستیەكانی بۆ پڕ بكاتەوە: لە خواردنو جلو بەرگو شوێنی نیشتەجێبوون بۆ خۆیو بۆ ئەو كەسانەی ئەركی بەخێوكردنیانی لە ئەستۆیەتی، هەرچەند بە ڕادەی زەكاتیش ماڵی هەبێ، چونكە مرۆڤی وەها هەیە: ئەوەندە ماڵەی هەیە: كە زەكاتی لێبدا، بەڵام بەروەستی بەخێوكردنی خۆیو منداڵەكانی ناكا، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.

بۆ وێنە: ئەگەر هەژارەكە پێویستی بە دە دیرهەم هەبێ، ئەو تەنها دوو، یان سێ، یان چوار دیرهەمی دەست بكەوێ، واتە: لە نیوەی پێویستیەكەی كەمتر بێ، كەواتە: ئەگەر كەسێك توانای كەسابەتی هەبێو كەسابەتەكەشی دەست بكەوێو بەشی بەخێوكردنی بكا، ئەوە بە هەژار دانانرێ، بەڵام ئەگەر هەر توانای نەبو، یان كەسابەتەكەی دەست نەدەكەوت، یان دەستی دەكەوت بەڵام توانای ئەو جۆرە كەسابەتەی نەبو، یان توانای هەبو، بەڵام بەشی بەخێوكردنەكەی نەدەكرد، ئەوەش بە هەژار دادەندرێ، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَلاَ يَمْنَعُ الْفَقْرَ مَسْكَنُهُ) هەبوونی شوێنی نیشتەجێبوونیو (وَثِيَابُهُ) جلو بەرگەكەی هچێكیان ڕێگەی هەژاری ناگرن، بەو مەرجەی شیاوی خۆی بن (وَ) هەروەها (مَالُهُ الْغَائِبُ فِي مَرْحَلَتَيْنِ) ئەو ماڵەیی كە دوو قۆناغ لێی دورە، یان نزیكە بەڵام نایكەوێتە دەست، هەم (وَالْمُؤَجَّلُ) ئەو قەرزەی لە سەر خەڵكیەو كاتی دانەوەی نەهاتوە، هەم (وَكَسْبٌ لاَ يَلِيقُ بِهِ) ئەو كەسابەتەی شیاوی ئەو نیە، ئەوانە هیچیان ڕێگەی هەژاری ناگرنو هەر بە هەژار دادەندرێو دروستە بە ئەندازەی پێویست زەكات وەربگرێ.

وَلَوْ اشْتَغَلَ بِعِلْمٍ وَالْكَسْبُ يَمْنَعُهُ فَفَقِيرٌ، وَلَوْ اشْتَغَلَ بِالنَّوَافِلِ فَلاَ، وَلاَ يُشْتَرَطُ فِيهِ الزَّمَانَةُ وَلاَالتَّعَفُّفُ عَنِ الْمَسْأَلَةِ عَلَىالجَدِيدِ، وَالْمَكْفِيُّ بِنَفَقَةِ قَرِيبٍ أَوْ زَوْجٍ لَيْسَ فَقِيرًا فِيالأَصَحِّ.

---

(وَلَوْ اشْتَغَلَ بِعِلْمٍ) ئەگەر یەکێك خەریکی خوێندنی زانستێکیشەرعی بوو، بەڵام (وَالْكَسْبُ يَمْنَعُهُ) کەسابەتەکە ڕێگای خوێندنی لێدەگرت، ئەوەش (فَفَقِيرٌ) بە هەژار دادەندرێو زەکاتی دەدرێتیو با کەسابەت نەکا، بەو مەرجەی لێیبێ فێرە زانست ببێ، چونکە وەدەستهێنانی زانستی ئایینی (فَرْض الْكِفَايَة)یە، واتە: ئەگەر لێنەیێ فێرە زانست ببێ، ئەوە زەکاتی نادرێتێ، هەروەك لە (المجموع)و (مغنی)دا فەرموویانە.

بەڵام (وَلَوْ اشْتَغَلَ بِالنَّوَافِلِ) ئەگەر خەریکی خواپەرستیەسوننەتەکان بوو و کەسابەتیش ڕێگای لێدەگرت، ئەوە (فَلاَ) نابێ زەکاتی بدرێتێ، چونکە سودی خواپەرستیەکەی تەنها بۆ خۆیەتی (وَلاَ يُشْتَرَطُ فِيهِ الزَّمَانَةُ) بە مەرج داناندرێ: هەژارەکە لە کارکەوتوویێو توانای کارکردنی نەبێ، هەم (وَلاَ التَّعَفُّفُ عَنِ الْمَسْأَلَةِ) بە مەرج داناندرێ خۆی لە دەرۆزە بپارێزێ، یان بەخۆی داوای زەکات نەکا (عَلَىالْجَدِيدِ) لە سەر فەرموودەی نوێی ئیمامی(الشافعي).

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر بەشی خواردنو جلو بەرگی خۆی کەسابەتی دەکرد، بەڵام پێویستی بە ژن هێنان هەبوو، هیچیشی نەبو ژنی پێبێنێ، ئەوەش دروستە: بە ئەندازەی مەسرەفی ژن هێنانەکە زەکاتی بدرێتی، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَالْمَكْفِيُّ بِنَفَقَةِ قَرِيبٍ) هەر کەسێك بە تەواوی بەخێو بکرێ: بە بەخێوکردنی خزمێکی: وەك دایكو باوكو بە سەرەوەتر، یان کوڕو کیژو بەرەوخوارتر (أَوْ زَوْجٍ) یان بە بەخێوکردنی مێرد، ئەوە (لَيْسَ فَقِيرًا) نە هەژارەو نە گەدایە، واتە: دروست نیە بە ناوی هەژاریو گەدایی زەکات وەربگرێ: نە لەوانەو نە لە بێگانە (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، بەڵام بە ناوێکیتری جگە لە هەژاریو گەدایی دروستە زەکات وەربگرێ.

هەروەها ئەگەر بەخێوکردنەکەشی بە تەواوی نەبو و بەشی نەدەکرد: وەك مێردەکەی، یان خزمەکەی نەبوویی بێ، یان خزمەکەی، یان مێردەکەی ئەرکی بەخێوکردنی نەئەدایێو ئەویش نەیدەتوانی لێیان وەربگرێ، یان کەسیخۆی بەخێوی نەدەکرد بەڵکو بێگانەیەك بە پیاوەتی لە ڕێگایخوا بەخێوی دەکرد، ئەوە لەو حاڵەتانەدا دروستە زەکات وەربگرێ، بەڵام ئەگەر ژنەکە (ناشِزَة) بوو لە فەرمانی مێردەکەی دەرچوبو، بۆیێ بەخێو نەدەکرا، ئەوە بۆی دروست نیە زەکات وەربگرێ، بەڵکو واجبە تۆبە بکا تاکو بەخێوی بکا، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

﴿ ئاگاداری ﴾: هەرکەسێك بەخێوکردنی لە سەر زەکاتدەرەکە واجب بێ: وەك ژنو دایكو باوكو کوڕو کیژ، دروست نیە: زەکاتدەرەکە زەکاتیخۆی بداتێ بە ناوی گەداو

وَالْمِسْكِينُ مَنْ قَدَرَ عَلَى مَالٍ أَوْ كَسْبٍ يَقَعُ مَوْقِعًا مِنْ كِفَايَتِهِ وَلاَ يَكْفِيهِ. وَالْعَامِلُ سَاعٍ وَكَاتِبٌ وَقَاسِمٌ وَحَاشِرٌ يَجْمَعُ ذَوِي الأَمْوَالِ، لاَ الْقَاضِي وَالْوَالِي. وَالْمُؤَلَّفَةُ مَنْ أَسْلَمَ وَنِيَّتُهُ ضَعِيفَةٌ أَوْ لَهُ شَرَفٌ يُتَوَقَّعُ بِإِعْطَائِهِ إِسْلاَمُ غَيْرِهِ،

---

هەژاری، چونکە بەم زەکاتدانە بەخێوکردنەکە لە سەر خۆی لادەبا، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی، بەڵام (ابن الرفعة) ئەوەی باس کردوە: ئەگەر کوڕەکە منداڵو خێزانی هەبێ، دروستە باوکەکەی ئەندازەی مەسەرفی ژنو منداڵەکانی لە زەکاتەکەی بداتێ، چونکە بەخێوکردنی ژنو منداڵەکانیوی لە سەر باوکەکەی واجب نیە، هەروەك لە حاشیەکانی( تحفة)دا گێڕاویەتیانەوە.

هەروەها ئەگەر ژنەکەش ماڵی هەبێ، وەها سوننەتە: زەکاتیخۆی بداتە مێردەکەی، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، چونکە بەخێوکردنی مێرد لە سەر ژنەکەی واجب نیە، هەروەك بەخێوکردنی براو خزمەکانیتریش لە سەر براو خزمەکانیتر واجب نیە، کەواتە: وەها خێرترە براش زەکاتەکەی خۆی بداتە براو خزمەکان، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی، بە بەڵگەی: ﴿عَنْ زَيْنَبَ امْرَأَةِ ابن مَسْعُودٍ رضي الله عنهما: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: زَوْجُكِ وَوَلَدُكِ أَحَقُّ مَنْ تَصَدَّقْتِ بِهِ عَلَيْهِمْ﴾ رواه البخاري، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: مێردەکەتو منداڵەکەت لە هەمووکەس مافیان زیاترە: کە زەکاتو خێرەکەتیان بدەیتێ.

٢-(وَالْمِسْكِينُ) گەدا: (مَنْ قَدَرَ عَلَى مَالٍ أَوْ كَسْبٍ) ئەوەیە توانای وەدەستهێنانی ماڵێکی وەها، یان کەسابەتێکی وەهای هەبێ: کە (يَقَعُ مَوْقِعًا مِنْ كِفَايَتِهِ) شوێنێکی پێویستیەکانی بۆ پڕ بکاتەوە: لە خواردنو جلو بەرگو نیشتەجێبوون، بەڵام (وَلاَ يَكْفِيهِ) بە تەواویش بەرەوەست نەکا پێویستیەکانی خۆیو ئەو کەسانەی ئەرکی بەخێوکردنیانی لە سەرە پڕ بکاتەوە، هەرچەند ئەوەندە ماڵەشی هەبێ: کە زەکاتی لێبدا، وەك پێویستی بە دە دیرهەم هەبێ، بەڵام ئەو تەنها هەشت، یان حەفت دیرهەمی دەست بکەوێ.

٣-(وَالْعَامِلُ) کرێکاری زەکات: (سَاعٍ) ئەو کەسەیە: زەکاتەکە لە خەڵکی وەردەگرێو هەم (وَكَاتِبٌ) نوسەری زەکاتەکەیەو هەم (وَقَاسِمٌ) بەشکەری زەکاتەکەیەو هەم (وَحَاشِرٌ يَجْمَعُ ذَوِي الأَمْوَالِ) کۆکەرەوەی خاوەن ماڵەکانە (لاَ الْقَاضِي وَالْوَالِي) بەڵام قازیو کاربەدەستی شوێنەکە بە کرێکار دانانرێن.

٤-(وَالْمُؤَلَّفَةُ) نوێموسوڵمان: (مَنْ أَسْلَمَ وَنِيَّتُهُ ضَعِيفَةٌ) ئەو کەسەیە: تازە موسوڵمان بووەو هێشتا نیەتەکەی بێهێزە (أَوْ) یان نیەتەکەی بەهێزە، بەڵام (لَهُ شَرَفٌ) مرۆڤێکی بە شەرەفو ڕێزدارە، ئەگەر زەکاتی بدرێتێ (يُتَوَقَّعُ بِإِعْطَائِهِ إِسْلاَمُ غَيْرِهِ) چاوەڕوان دەکرێ بە هۆی ئەو زەکات پێدانەیوی خەڵکیتریش چاوی لێبکاو موسوڵمان ببێ.

وَالْمَذْهَبُ أَنَّهُمْ يُعْطَوْنَ مِنَ الزَّكَاةِ. وَالرِّقَابُ الْمُكَاتَبُونَ. وَالْغَارِمُ إِنْ اسْتَدَانَ لِنَفْسِهِ فِي غَيْرِ مَعْصِيَةٍ أُعْطِيَ، قُلْتُ: الْأَصَحُّ يُعْطَى إِذَا تَابَ وَاللهُ أَعْلَمُ، وَالْأَظْهَرُ اشْتِرَاطُ حَاجَتِهِ دُونَ حُلُولِ الدَّيْنِ، قُلْتُ: الْأَصَحُّ اشْتِرَاطُ حُلُولِهِ وَاللهُ أَعْلَمُ، أَوْ لِإِصْلَاحِ ذَاتِ الْبَيْنِ أُعْطِيَ مَعَ الْغِنَى،

---

(وَالْمَذْهَبُ أَنَّهُمْ يُعْطَوْنَ مِنَ الزَّكَاةِ) بە فەرموودەی ڕاستی مەزهەب: ئەو نوێموسوڵمانانە بەشێکیان لە زەکات دەدرێتێ، واتە: هەرچەند دەوڵەمەندیش بن، هەروەك لە (الشرواني)دا فەرموویەتی.

٥-(وَالرِّقَابُ) کۆیلەکان: (الْمُكَاتَبُونَ) ئەو کۆیلانەنە کە نووسراویان دراوەتێ: ئەگەر ئەندازەیەکی پارە بۆ گەورەکەیان بێنن ئازاد دەبن، هەروەك لە پەرتووکی کۆیلە ئازادکردندا ڕوونی دەکەینەوە، إن شاء الله تعالی.

٦-(وَالْغَارِمُ) قەرزدار دوو جۆرە، یەکەم: (إِنْ اسْتَدَانَ لِنَفْسِهِ فِي غَيْرِ مَعْصِيَةٍ) ئەگەر بۆ مەبەستێکی خۆی شتەکەی قەرز کردبوو، قەرزکردنەکەش گوناهکاری نەبوو: وەك بەخێوکردنی خۆیو منداڵەکانی، یان ژن هێنان، یان حەج کردن، یان خانوو دروستکردن، یان بە بێویستی خۆی شتێکی لە دەست فەوتابێو تۆڵەی لێسەندرابێ، ئەوە (أُعْطِيَ) زەکاتی دەدرێتێ.

(أَوْ لِمَعْصِيَةٍ) بەڵام ئەگەر بۆ گوناهکاری قەرزی کردبێ: وەك بۆ زێدەڕۆیی مەسەرف، یان بۆ کڕینی شتێکی حەرام قەرزی کردبێ، یان بە تاوانکاری قەرزدار بوبێ: وەك بە ناهەق شتێکیکەسێك بفەوتێنێو تۆڵەکەی لێبسەندرێ، ئەوە (فَلَا) دروست نیە زەکاتی بدرێتێ (قُلْتُ) ئیمامی (النواوي) دەفەرموێ (الْأَصَحُّ يُعْطَى إِذَا تَابَ) بە فەرموودەی ڕاستتر: هەر کاتێك قەرزدارەکە تۆبەیەکی بەڕاستی بکا، زەکاتی دەدرێتێ، چونکە تۆبەکردن تاوانی پێشە خۆی لا دەبا (وَاللهُ أَعْلَمُ).

(وَالْأَصَحُّ اشْتِرَاطُ حَاجَتِهِ) بە فەرموودەی ڕاستتر مەرجە: قەرزدارەکە پێویستی بە زەکات هەبێو توانای قەرزدانەوەی نەبێ، یان توانای هەبێ، بەڵام ئەگەر قەرزەکەی بداتەوە، تووشی گەدایی ببێ، ئەو کاتە بە ئەندازەی قەرزەکەی زەکاتی دەدرێتێ (دُونَ حُلُولِ الدَّيْنِ) بەڵام مەرج نیە کاتی قەرزدانەوەکەی هاتبێ (قُلْتُ) ئیمامی (النواوي) دەفەرموێ (الْأَصَحُّ اشْتِرَاطُ حُلُولِهِ) بە فەرموودەی ڕاستتر مەرجە: کاتی قەرزدانەوەکەی هاتبێ (وَاللهُ أَعْلَمُ) چونکە پێش کاتی قەرزدانەوەکە پێویستیی نیە.

دووەم: (أَوْ لِإِصْلَاحِ ذَاتِ الْبَيْنِ) یان ئەگەر قەرزەکەی وەرگرتبوو بۆ ئاشتکردنەوەی نێوان دوو کەس، یان دوو کۆمەڵ: کە ناکۆکییان لە نێوانیاندایەو مەترسی فیتنەی لێدەکرێ، ئەو کاتەش (أُعْطِيَ مَعَ الْغِنَى) بە ئەندازەی قەرزکە زەکاتی دەدرێتێ هەرچەند دەوڵەمەندیش

وَقِيلَ إِنْ كَانَ غَنِيًّا بِنَقْد فَلاَ. وَسَبِيلُ اللهِ تَعَالَى غُزَاةٌ لاَ فَيْءَ لَهُمْ فَيُعْطَوْنَ مَعَ الْغِنَى. وَابْنُ السَّبِيلِ مُنْشِئُ سَفَرٍ أَوْ مُجْتَازٌ، وَشَرْطُهُ الْحَاجَةُ وَعَدَمُ الْمَعْصِيَةِ. وَشَرْطُ آخذالزَّكَاة مِنْ هَذِه الأَصْنَاف الثَّمَانِيَة: اَلإِسْلاَمُ وَأَنْ لاَ يَكُونَ هَاشِمِيًّا وَلاَ مُطَّلِبِيًّا

---

بێ، تاكو خەڵك واز لەم كارە باشە نەهێنێ، بەڵام ئەگەر هیچی قەرز نەكردبو، بەڵكو لە ماڵیخۆی پارەكەی دابو، یان لە ماڵیخۆی قەرزەكەی دابۆوە، ئەو كاتە زەكاتی نادرێتێ، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە. (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا (إِنْ كَانَ غَنِيًّا بِنَقْدٍ) ئەگەر قەرزدارەكە دەوڵەمەند بێ: بە پارەو پوولو زەویو باغ (فَلاَ) زەكاتی نادرێتێ، بەڵام ڕەفتار بەم بێهێزە ناكرێ.

٧-(وَسَبِيلُ اللهِ) جەنگاوەرانی ڕێگایخوا: (غُزَاةٌ لاَ فَيْءَ لَهُمْ) ئەو كەسانەن كە لە ڕێگای خوا غەزا دەكەنو هیچ بەشێكیان لە (فَيْء) نیە، چونكە ناویان لە دەفتەری سەربازانی ئیسلامدا نەنوسراوە، بەڵكو هەر كاتێك حەز بكەن دەچنە غەزا، ئەگەر نا: بە كارو باری خۆیان خەریك دەبن، كەوابو: (فَيُعْطَوْنَ مَعَ الْغِنَى) ئەوانە زەكاتیان دەدرێتێ هەرچەند دەوڵەمەندیش بن، بەڵام نابێ (فَيْء) وەربگرن، هەروەها ئەوانی ناویان لە دەفتەری سەربازانی ئیسلامدا تۆمار كراوەو (فَيْء) وەردەگرن، ئەوانیش نابێ زەكات وەربگرن، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

ئینجا بزانە: بە هیچ مەزهەبێك دروست نیە: زەكات بۆ بەرژوەندیەكان سەرف بكرێ: وەكو مزگەوتو ڕێگەو پردو...هتد: ئەو جۆرە شتانە، هەروەك لە كۆتایی زەكاتدا بەڵگەمان بۆ هێناوە.

٨-(وَابْنُ السَّبِيلِ) ڕێبوار: (مُنْشِئُ سَفَرٍ) ئەو كەسەیە: لە شوێنی زەكاتەكەوە دەست بە سەفەر دەكا (أَوْ مُجْتَازٌ) یان بە شوێنی زەكاتەكەدا تێدەپەڕێ بۆ شوێنێكیتر (وَشَرْطُهُ) مەرجی زەكات پێدانی ڕێبوار (اَلْحَاجَةُ) ئەوەیە پێویستی بەو زەكاتە هەبێ لەو سەفەرەیدا، هەر چەند لە شوێنێكیتریش مڵكو ماڵی هەبێ، هەم (وَعَدَمُ الْمَعْصِيَةِ) سەفەرەكەشی بۆ گوناهكاری نەبێ، واتە: ئەگەر سەفەرەكەی گوناهكاری بوو، دروست نیە زەكاتی بدرێتێ.

(وَشَرْطُ آخِذِ الزَّكَاةِ مِنْ هَذِهِ الأَصْنَافِ الثَّمَانِيَةِ) مەرجی زەكاتوەرگر لەو هەشت جۆرانە: یەكەم: (اَلإِسْلاَمُ) دەبی موسوڵمان بێ، چونكە بە (إجماع)ی زانایانیئیسلام دروست نیە زەكات بدرێتە كافر.

دووەم: (وَأَنْ لاَ يَكُونَ هَاشِمِيًّا وَلاَ مُطَّلِبِيًّا) نابێ زەكاتوەرگرەكە لە نەتەوەی (هاشم)و (المُطَّلب) بێ، چونكە ئەوانە بە هۆی خزمایەتی پێغەمبەرﷺ پاكنو زەكاتیش چڵكی

وَكَــــــــــذَا مَــــــــــوْلَاهُمْ فِي الأَصَـــــــــحِّ .

(فَصْلٌ) مَنْ طَلَبَ زَكَاةً وَعَلِمَ الإِمَامُ اسْتِحْقَاقَهُ أَوْ عَدَمَهُ عَمِلَ بِعِلْمِهِ، وَإِلَّا فَإِنْ ادَّعَى فَقْرًا أَوْ مَسْكَنَةً لَمْ يُكَلَّفْ بَيِّنَةً، فَإِنْ عُرِفَ لَهُ مَالٌ وَادَّعَى تَلَفَهُ كُلِّفَ، وَكَذَا إِنْ ادَّعَى

---

خەڵكییە، هەروەها دروست نییە: نەزرو کەففارەتو خوێنەکانی حەجو عومرەو قوربانی واجبیش وەربگرن، بەڵام ئیمامی (الاصطخري)و چەند زانایەکیتر فەرموویانە: ئەگەر لە (خُمْسُ الْخُمْسِ) بێبەش کرابن دروستە زەکان وەربگرن، هەروەك لە (المجموع)و (الشروانی)دا ڕوون کراوەتەوە، کەوابو: دروستە (سیِّد)ەکانی کوردستان (تَقْلِید)ی ئەو ئیمامانە بکەنو زەکات وەربگرن (وَكَذَا مَوْلَاهُمْ) هەروەها ئەو کۆیلانەی ئەو دوو نەتەوەیەش ئازادیان کردون نابێ زەکات وەربگرن (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

سێیەم: نابێ زەکاتوەرگرەکە ئەرکی بەخێوکردنی لە سەر زەکاتدەرەکە بێ، هەروەك لە کۆتایی باسی (فقیر)دا ڕوون کراوە، چوارەم: بالغو عاقڵ بێ، واتە دروست نییە زەکات بدرێتە دەست شێتو منداڵ، بەڵکو مەرجە: سەرپەرشتکارەکەیان بۆیان وەربگرێ، هەروەها ئەو کەش کە بلۆغی دەبێ نوێژ نەکەرە، ئەویش دروست نییە زەکات وەربگرێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهایة) دا ڕوون کراوەتەوە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی ئەو ئەندازە زەکاتەی دەدرێتە زەکاتوەرگرەکان ﴾

(مَنْ طَلَبَ زَكَاةً) هەر کەسێك داوای زەکاتی کرد (وَعَلِمَ الإِمَامُ اسْتِحْقَاقَهُ) پێشەوا، یان زەکاتدەرەکە دەیزانی مافی لە زەکات هەیە (أَوْ عَدَمَهُ) یان دەیزانی مافی لە زەکات نییە، ئەوە (عَمِلَ بِعِلْمِهِ) بەگوێرەی زانستەکەیخۆی ڕەفتار دەکا، واتە: ئەگەر دەیزانی: زەکاتی پێدەچێ، ئەوە زەکاتەکەی دەداتێ، ئەگەر زەکاتی پێناچێ دروست نییە بیداتێ، هەروەها ئەگەر داوای زەکاتیش نەکا، بەڵام زەکاتدەرەکە دەیزانی زەکاتی پێدەچێ، ئەو کاتەش دروستە زەکاتەکەی بداتێ.

(وَإِلَّا) بەڵام ئەگەر زەکاتدەرەکە نەیدەزانی: زەکاتی پێدەچێ، یان نا، ئەو کاتە ( فَإِنْ ادَّعَى فَقْرًا أَوْ مَسْكَنَةً) ئەگەر زەکاتوەرگرەکە گوتی: من هەژارم، یان گەدامە. ئەوە (لَمْ يُكَلَّفْ بَيِّنَةً) داوای شاهیدی لێناکرێو سوێندیش نادرێ، چونکە ئەو کەسانەی داوای زەکاتیان دەکرد، پێغەمبەرﷺ بێشاهیدو بێسوێندان زەکاتی دەدانێ، هەروەك لە زۆیەی سەرچاوەکاندا فەرموویانەو (أبوداود بسندصحیح) حەدیسەکەی گێڕاوەتەوە.

(فَإِنْ عُرِفَ لَهُ مَالٌ) جا ئەگەر زاندرابو: زەکاتوەرگرەکە بە ئەندازەیەکی وەها ماڵی هەیە: کە زەکاتی پێنەدەچو، بەڵام (وَادَّعَى تَلَفَهُ) زەکاتوەرگرەکە گوتی: ماڵەکەم نەماوەو ئێستا هەژارم. ئەو کاتە (كُلِّفَ) داوای شاهیدی لێدەکرێ: کە ماڵەکەی فەوتاوە(وَكَذَا إِنْ ادَّعَى

عِيَالاً فِي الأَصَحِّ، وَيُعْطَى غَازٍ وَابْنُ سَبِيلٍ بِقَوْلِهِمَا، فَإِنْ لَمْ يَخْرُجَا اُسْتُرِدَّ، وَيُطَالَبُ عَامِلٌ وَمُكَاتَبٌ وَغَارِمٌ بِبَيِّنَةٍ: وَهِيَ إِخْبَارُ عَدْلَيْنِ، وَيُغْنِي عَنْهَا الإِسْتِفَاضَةُ وَكَذَا تَصْدِيقُ رَبِّ الدَّيْنِ وَالسَّيِّدِ فِي الأَصَحِّ، وَيُعْطَى الْفَقِيرُ وَالْمِسْكِينُ كِفَايَةَ سَنَةٍ، قُلْتُ: اَلأَصَحُّ الْمَنْصُوصُ وَقَوْلُ الْجُمْهُورِ كِفَايَةَ الْعُمْرِ الْغَالِبِ، فَيَشْتَرِي بِهِ عَقَارًا يَسْتَغِلُّهُ وَاللهُ أَعْلَمُ.

---

عِيالاً) هەروەها ئەگەر بڵێ: ئەوەندە منداڵم هەنە ماڵەكەم بەرەوەستی بەخێوكردنیان ناكا. ئەو كاتەش داوای شاهیدی لێدەكرێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی راستتردا.

(وَ هەروەها (يُعْطَى غَازٍ وَابْنُ سَبِيلٍ بِقَوْلِهِمَا) جەنگاوەری رێگایخواو، هەم رێبوار زەكاتیان دەدرێتێ بە تەنها قسەی خۆیان، واتە: سوێند نادرێنو داوای شاهیدیشیان لێناكرێ (فَإِنْ لَمْ يَخْرُجَا) جا ئەگەر سێ رۆژ تەواو بونو ئەوان بۆ غەزاو بۆ سەفەر نەرۆیشتن (اُسْتُرِدَّ) زەكاتەكەیان لێوەردەگیرێتەوە.

(وَيُطَالَبُ عَامِلٌ وَمُكَاتَبٌ وَغَارِمٌ بِبَيِّنَةٍ) كرێكاری زەكاتو كۆیلەی نوسراوپێدراو و قەرزدار، هەرسێكیان داوای شاهێدیان لێدەكرێ (وَهِيَ) شاهیدی (إِخْبَارُ عَدْلَيْنِ) خەبەردانی دوو پیاویدادپەروەرە، یان پیاوێكو دوو ژنیدادپەروەر (وَيُغْنِي عَنْهَا الإِسْتِفَاضَةُ) بلاوبوونەوەی هەواڵی گەدایی‌و هەژاری‌و سیفەتەكانیتری زەكاتوەرگرتن لەجیاتی شاهید بەسەو بە بەر شاهیدیدانەكە دەكەوێ (وَكَذَا تَصْدِيقُ رَبِّ الدَّيْنِ) هەروەها ئەگەر خاوەن قەرزەكەش قەرزدارەكە بە راستگۆ دابنێو بڵێ: قەرزدارە. بە بەرشاهیدی‌و سوێندخواردن دەكەوێ، هەم (وَالسَّيِّدِ) ئەگەر گەورەیكۆیلەكەش بڵێ: راست دەكا نوسراویئازادكردنم داوەتێ. ئەوەش بە بەر شاهیدی دەكەوێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی راستتردا.

(وَيُعْطَى الْفَقِيرُ وَالْمِسْكِينُ كِفَايَةَ سَنَةٍ) هەژارو گەدا، هەر یەكەیان ئەندازەی مەسرەفی ساڵێكیان دەدرێتێ: بۆ بەخێوكردنی خۆیانو ئەو كەسانەی بەخێوكردنیان لە سەریەتی (قُلْتُ) ئیمامی(النـواوی) دەفەرموێ (اَلأَصَحُّ الْمَنْصُوصُ وَقَوْلُ الْجُمْهُورِ) بە دەقی فەرموودەی راستترو بە فەرموودەی كۆمەڵە زۆرترەكەی زانایان: (كِفَايَةَ الْعُمْرِ الْغَالِبِ) بەشی تەمەنی ئەغڵەبیی دەدرێتێ، واتە: بەشی مەسرەفی شەست ساڵی دەدرێتێ، جا ئەگەر تەمەنی لە شەست ساڵ زیاتر بوو، ئەو كاتە ساڵ بەساڵ زەكاتی دەدرێتێ.

كەوابو: (فَيَشْتَرِي بِهِ عَقَارًا يَسْتَغِلُّهُ) زەكاتوەرگرەكە بەو ئەندازە زەكاتە زەمینێك، یان باغێك دەكرێو بەرهەمەكەی وەدەست دێنێو خۆیو منداڵەكانی پێبەخێو دەكا (وَاللهُ أَعْلَمُ) هەروەها ئەگەر بازرگانی بزانێ، سەرمایەی بازرگانیەكی وەهای دەدرێتێ: كە قازانجەكەی بەشی بەخێوكردنی بكا، ئەگەر پیشەیەك بزانێ، ئەو كاتە پارەی كەرەستەی پیشەكەی دەدرێتێو ئەگەر شوانی بزانێ مێگەلێكی پێدەكرێ...بەو جۆرە.

وَالْمُكَاتَبُ وَالْغَارِمُ قَدْرَ دَيْنِه، وَابْنُ السَّبِيلِ مَا يُوَصِّلُهُ مَقْصِدَهُ أَوْ مَوْضِعَ مَالِه، وَالْغَازِي قَدْرَ حَاجَتِه نَفَقَةً وَكِسْوَةً ذَاهِبًا وَرَاجِعًا وَمُقِيمًا هُنَاكَ وَفَرَسًا وَسِلاَحًا، وَيَصِيرُ ذَلِكَ مِلْكًا لَهُ، وَيُهَيَّأُ لَهُ وَلاِبْنِ السَّبِيلِ مَرْكُوبٌ إِنْ كَانَ السَّفَرُ طَوِيلاً أَوْ كَانَ ضَعِيفًا لاَ يُطِيقُ الْمَشْيَ، وَمَا يَنْقُلُ عَلَيْهِ الزَّادَ وَمَتَاعَهُ إِلاَّ أَنْ يَكُونَ قَدْرًا يَعْتَادُ مِثْلُهُ حَمْلَهُ بِنَفْسِه،

---

(وَالْمُكَاتَبُ وَالْغَارِمُ) کۆیلەی نوسراوپێدراو و قەرزدار (قَدْرَ دَيْنِه) هەر یەکەیان بە ئەندازەی قەرزەکەی زەکاتی دەدرێتێ (وَابْنُ السَّبِيلِ مَا يُوَصِّلُهُ مَقْصِدَهُ) ڕێبواریش ئەندازەیەکی وەها زەکاتی دەدرێتێ کە بیگەینێتە شوێنی مەبەست (أَوْ مَوْضِعَ مَالِه) یان شوێنی ماڵەکەی خۆی.

(وَالْغَازِي) جەنگاوەری ڕێگای‌خودا (قَدْرَ حَاجَتِه) بە ئەندازەی پێویستی خۆی‌و منداڵەکانی زەکاتی دەدرێتێ (نَفَقَةً وَكِسْوَةً) بۆ خواردن وجل‌و بەرگ‌و پێویستیەکانی‌تر (ذَاهِبًا وَرَاجِعًا وَمُقِيمًا هُنَاكَ) بۆ ئەو ماوەیەی دەڕواتە غەزاو دەگەڕێتەوەو لەوێ دەمێنێتەوە، هەم (وَفَرَسًا وَسِلاَحًا) نرخی ئەسپێك‌و چەکێك زەکاتی دەدرێتێ بۆ جەنگکردن (وَيَصِيرُ ذَلِكَ مِلْكًا لَهُ) ئەسپەکەو چەکەکە دەبنە‌ملکی جەنگاوەرەکە.

(وَيُهَيَّأُ لَهُ وَلاِبْنِ السَّبِيلِ مَرْكُوبٌ) هەروەها ئامادە دەکرێ بۆ جەنگاوەرەکەو بۆ ڕێبوارەکە: شتێکی سواری تاکو بە سواری بۆ غەزایەکەو بۆ سەفەرەکە بڕۆن (إِنْ كَانَ السَّفَرُ طَوِيلاً) ئەگەر سەفەرەکەیان درێژ بێ (أَوْ كَانَ ضَعِيفًا لاَ يُطِيقُ الْمَشْيَ) یان سەفەرەکە کورت بوو، بەڵام هیچێکیان توانای ڕۆیشتنیان نەبو (وَمَا يَنْقُلُ عَلَيْهِ الزَّادَ وَمَتَاعَهُ) هەم ئەو شتەشیان بۆ ئامادە دەکرێ: کە خواردن‌و کەلوپەلەکەیانی پێ بگوازنەوە (إِلاَّ أَنْ يَكُونَ قَدْرًا يَعْتَادُ مِثْلُهُ حَمْلَهُ بِنَفْسِه) مەگەر کەلوپەلەکە ئەوەندە کەم بێ: کە عادەت بوو وێنەی ئەو مرۆڤە بەخۆی هەڵی‌بگرێ، ئەو کاتە بۆیان ئامادە ناکرێ.

﴿ ئاگاداری ﴾: هەرکاتێك خاوەنەکە زەکاتەکەی بداتە کەسێك، ئەگەر بە زوبانیش نەڵێ ئەمە زەکاتەو هیچ ووشەیەکی‌تریش نەڵێ، زەکاتەکەی هەر دروستەو قبوڵ دەبێ.

بەڵام ئەگەر زەکاتەکەی دابوە کەسێك کە وایتێگەیشتبو زەکاتی پێ‌دەچێ، ئینجا ئاشکرابو زەکاتی پێ‌ناچێ؟ چونکە کافرە، یان دەوڵەمەندە...هتد، ئەو کاتە زەکاتەکەی قبوڵ نابێ‌و واجبە: دووبارە زەکاتێکی‌تر بداتەوە کەسێکی وەها: کە زەکاتی پێ‌بچێ.

جا ئەگەر لە کاتی زەکاتدانەکەی‌یەکەم بە زەکاتوەرگرەکەی‌یەکەمی گوتبێ: ئەمە زەکاتە. ئەوە دروستە زەکاتە دروستنەبووەکەی لێوەربگرێتەوە، یان تۆڵەی زەکاتەکەی لێوەربگرێتەوە، بەڵام ئەگەر پێی نەگوتبێ: ئەمە زەکاتە. ئەو کاتە دروست نیە لێی وەربگرێتەوە، کەواتە: زەکاتەکەی‌دووەمیش هەر لە ماڵی‌خۆی دووبارە دەداتەوە، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوون کراوەتەوە.

وَمَـــنْ فِيـــهِ صِـــفَتَا اسْـــتِحْقَاقٍ يُعْطَـــى بِإِحْـــدَاهُمَا فَقَـــطْ فِي الأَظْهَـــرِ.
(فَصْلٌ) يَجِبُ اسْتِيعَابُ الأَصْنَافِ إِنْ قَسَمَ الإِمَامُ وَهُنَاكَ عَامِلٌ، وَإِلاَّ فَالْقِسْمَةُ عَلَى سَبْعَةٍ، فَإِنْ فُقِدَ بَعْضُهُمْ فَعَلَى الْمَوْجُودِينَ، وَإِذَا قَسَمَ الإِمَامُ إِسْتَوْعَبَ مِنَ الزَّكَوَاتِ الْحَاصِلَةِ عِنْدَهُ آحَـادَ كُلِّ صِنْفٍ، وَكَذَا يَسْتَوْعِبُ الْمَالِكُ إِنِ انْحَصَرَ الْمُسْتَحِقُّونَ فِي الْبَلَدِ وَوَفَى بِهِمُ الْمَـالُ، وَإِلاَّ فَيَجِبُ إِعْطَاءُ ثَلاَثَةٍ، وَتَجِبُ التَّسْوِيَةُ بَيْنَ الأَصْنَافِ لاَ بَيْنَ آحَادِ الصِّنْفِ، إِلاَّ أَنْ يَقْسِمَ الإِمَامُ

---

(وَمَنْ فِيهِ صِفَتَا اسْتِحْقَاقٍ) هەر كەسێك بە دوو جۆر مافی زەكاتوەرگرتنی هەبوو: وەك هەژار بێو قەرزاداریش بێ، یان جەنگاوەری رێگای خودا بێ، ئەوە (يُعْطَى بِإِحْدَاهُمَا فَقَطْ) تەنها بە جۆرێكیان زەكاتی دەدرێتێ (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا.
جا بزانە: ئەوە لە حاڵەتێكدا بوو: كە لە یەك زەكات بە یەك جار بیدرێتێ، بەڵام ئەگەر لە دوو زەكات بیدرێتێ، یان لە یەك زەكات بە دوو جار بیدرێتێ، واتە: زەكاتەكەیەكەمی سەرف كردبو، ئینجا جاریدووەمیش لە هەمان زەكات درایێ، ئەو كاتە لە هەردوو حاڵەتدا دروستە بە هەردوو جۆر بیدرێتێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی بەشكردن و گواستنەوەی زەكات ﴾

(يَجِبُ اسْتِيعَابُ الأَصْنَافِ) واجبە: لە زەكاتدانەكە هەر هەشت جۆرەكان دابگرێتەوەو بدرێتە گشتیان (إِنْ قَسَمَ الإِمَامُ وَهُنَاكَ عَامِلٌ) ئەگەر پێشەوای موسوڵمانان زەكاتەكە بەش بكاو كرێكاری زەكاتیشی هەبێ (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر كرێكار نەبێ (فَالْقِسْمَةُ عَلَى سَبْعَةٍ) ئەو كاتە بەشكردن بە سەر حەفت كەسانە (فَإِنْ فُقِدَ بَعْضُهُمْ) جا ئەگەر هەندێكیان نەبون، ئەو كاتە (فَعَلَى الْمَوْجُودِينَ) بە سەر ئەوانەدا بەش دەكا: كە ئێستا هەنە.
(وَإِذَا قَسَمَ الإِمَامُ) جا هەر كاتێك پێشەوای موسوڵمانان زەكاتەكە بەش بكا (إِسْتَوْعَبَ مِنَ الزَّكَوَاتِ الْحَاصِلَةِ عِنْدَهُ آحَادَ كُلِّ صِنْفٍ) واجبە: تاكە تاكەی گشت جۆرێك لەو زەكاتە دابگرێتەوە كە لە لایەتی (وَكَذَا يَسْتَوْعِبُ الْمَالِكُ) هەروەها واجبە: خاوەنەكەش گشتیان لە زەكاتەكەی دابگرێتەوە (إِنِ انْحَصَرَ الْمُسْتَحِقُّونَ فِي الْبَلَدِ) ئەگەر ئەو كەسانەی مافی زەكاتوەرگرتنیان هەیە لەو شارەدا سەرژمێر بكرێن‌و (وَوَفَى بِهِمُ الْمَالُ) زەكاتەكەش بەروەستیان بكا (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر زەكاتەكە بەروەست نەكا، یان زەكاتوەرگرەكان سەرژمێر نەدەكران، ئەو كاتە (فَيَجِبُ إِعْطَاءُ ثَلاَثَةٍ) واجبە لای كەمی زەكاتەكە بدرێتە سێ كەسان لە هەر جۆرێك لەو هەشت جۆرانە.
(وَتَجِبُ التَّسْوِيَةُ بَيْنَ الأَصْنَافِ) واجبە: بە یەكسانی زەكاتەكە بداتە هەموو جۆرەكان (لاَ بَيْنَ آحَادِ الصِّنْفِ) بەڵام واجب نیە: بە یەكسانی بیداتە تاكە تاكەی جۆرەكان، چونكە ئەندازەی پێویستیەكانیان لێك جیاوازە (إِلاَّ أَنْ يَقْسِمَ الإِمَامُ) مەگەر پێشەوای موسوڵمانان

فَيَحْرُمُ عَلَيْهِ التَّفْضِيلُ مَعَ تَسَاوِي الْحَاجَاتِ، وَالأَظْهَرُ مَنْعُ نَقْلِ الزَّكَاةِ، وَلَوْ عُدِمَ الأَصْنَافُ فِي الْبَلَدِ وَجَبَ النَّقْلُ، أَوْ بَعْضُهُمْ وَجَوَّزْنَا النَّقْلَ وَجَبَ، وَإِلاَّ فَيُرَدُّ عَلَى الْبَاقِينَ، وَقِيلَ يُنْقَلُ،

---

زەکاتەکە بەش بکا، ئەو کاتە (فَيَحْرُمُ عَلَيْهِ التَّفْضِيلُ) لە سەر وی حەرامە هەندێکیان لە هەندێکیان زیاتریان بداتێ (مَعَ تَسَاوِي الْحَاجَاتِ) لەگەڵ ئەوەش کە پێویستیەکانیان یەکسان بێ، بەڵام ئەگەر پێویستیەکانیان لێك جیاواز بن، ئەو کاتە دروستە بەگوێرەی پێویستیەکانیان زەکاتیان بداتێ.

(وَالأَظْهَرُ) بە فەرموودەی بەهێزتر (مَنْعُ نَقْلِ الزَّكَاةِ)دروست نیە زەکات لە شوێنێکەوە بگوازرێتەوەو بدرێتە زەکاتوەرگرەکانی شوێنێکیتر، بەڵام (وَلَوْ عُدِمَ الأَصْنَافُ فِي الْبَلَدِ) ئەگەر هیچ جۆرێکی زەکاتوەرگرەکان لەو شارەدا نەبون، ئەو کاتە (وَجَبَ النَّقْلُ) واجبە: بگوازرێتەوە بۆ شوێنێکیترو بدرێتە زەکاتوەرگرەکانی شوێنەکە.

(أَوْ بَعْضُهُمْ) یان هەندێك جۆری زەکاتوەرگرەکان نەبونو (وَجَوَّزْنَا النَّقْلَ) لەو حاڵەتەشدا گواستنەوەکە دروست بکەین، ئەو کاتەش (وَجَبَ) گواستنەوەکە واجبە (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر بە فەرموودەی راستتر بڵێین: گواستنەوە دروست نیە، ئەو کاتە (فَيُرَدُّ عَلَى الْبَاقِينَ) زەکاتەکە دووبارە دەدرێتەوە ئەوانەی لە شوێنی زەکاتەکەدا ماون (وَقِيلَ يُنْقَلُ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: دەگوازرێتەوە.

ئینجا بزانە: ئەگەر زەکاتوەرگرەکە دانیشتووی شوێنی زەکاتدانەکە نەبێ، بەڵکو لە شوێنێکیترەوە هاتبێو لێرە زەکات وەربگرێ، ئەوە دروستەو بە گواستنەوەی زەکات داناندرێ، هەروەك لە (مغنی)و (الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە.

دیسان بزانە: وەقفی سەر هەژاران ئەگەر دیاری نەکرابن، هەم وەسێتو کەففارەتو نەزر –جگە لە نەزری دیاریکراو بۆ شوێنێكو قوربانیینەزرکراو– ئەوانە دروستە بگواسترێنەوە بۆ شوێنێکیتر، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

﴿ ئاگاداری ﴾ یەکەم: چەند زانایایەك فەرموویانە: دروستە زەکاتی سەرفیترە بدرێتە تەنها یەك کەس، زەکاتیماڵیش بدرێتە تەنها سێ کەس، هەروەك لە (تحفة )و(نهایة)دا فەرموویانە، بەڵکو لە مەزهەبی ئیمامی(حنفي)دا دروستە: زەکاتیسەرفیترەو زەکاتی ماڵیش بدرێتە تەنها یەك کەس، هەروەك لە (المجموع)و کتێبەکانیخۆیاندا فەرموویانە.

دووەم: لە مەزهەبی ئیمامی(حنفي)داو لە فەرموودەیەکی بێهێزی مەزهەبی(الشافعي)دا دروستە: زەکات بگوازرێتەوە، واتە: بۆ گەداو هەژارەکانی شوێنێکیتر بنێردرێ، هەروەك لە (المجموع )و کتێبەکانی(حنفی )دا ڕوون کراوەتەوە.

ئینجابزانە: ئەرکیگواستنەوەی زەکاتو هێنانی تا زەکاتوەرگرەکە وەریدەگرێ، لە سەر زەکاتدەرەکەیە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

وَشَرْطُ السَّاعِي: كَوْنُهُ حُرًّا عَدْلاً فَقِيهًا بِأَبْوَابِ الزَّكَاةِ، فَإِنْ عُيِّنَ لَهُ أَخْذٌ وَدَفْعٌ لَمْ يُشْتَرَطِ الْفِقْهُ، وَلْيُعْلِمْ شَهْرًا لأَخْذِهَا، وَيُسَنُّ وَسْمُ نَعَمِ الصَّدَقَةِ وَالْفَيْءِ فِي مَوْضِعٍ لاَ يَكْثُرُ شَعَرُهُ، وَيُكْرَهُ فِي الْوَجْهِ، قُلْتُ: اَلأَصَحُّ يَحْرُمُ وَبِهِ جَزَمَ الْبَغَوِيُّ، وَفِي صَحِيحِ مُسْلِمٍ لَعْنُ فَاعِلِهِ وَاللهُ أَعْلَمُ.

---

سێیەم: ئەگەر خاوەنەکە بە یەکێکی گوت: ئەم زەکاتە بە سەر هەژاراندا بەشی بکە. ئەوە دروست نیە هیچ بەشێك لەو زەکاتە بۆ خۆی دابنێ، هەم دروست نیە بۆ ئەوکەسانەش دایبنێ: کە ئەرکی بەخێوکردنیانی لە سەرە، هەر چەند خاوەنەکەش ئیزنی بدا، بەلام ئەگەر خاوەنەکە ئەندازەیەکی بۆ جیا بکاتەوە، ئەو کاتە دروستە ئەندازەکە بۆ خۆی وەریگرێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)و حاشیەکانیاندا فەرموویانە.

(وَشَرْطُ السَّاعِي) مەرجی کرێکاری زەکات: (كَوْنُهُ حُرًّا عَدْلاً) دەبی ئازاد بێو دادپەروەر بێو (فَقِيهًا بِأَبْوَابِ الزَّكَاةِ) شەرعزان بێ لە باسەکانی زەکاتدا، بەلام (فَإِنْ عُيِّنَ لَهُ أَخْذٌ وَدَفْعٌ) ئەگەر بۆ کرێکارەکە دیاری کرابو: زەکات لە کێ وەریگرێو بیداتە کێ، ئەو کاتە (لَمْ يُشْتَرَطِ الْفِقْهُ) شەرعزانی بە مەرج داناندرێ.

بەلکو دروستە نەخوێندەوارو ئافرەتو کۆیلەش بکرێنە وەکیل بۆ زەکاتوەرگرتنو بۆ زەکات بەشکردن، هەروەها دروستە منداڵیش بکرێتە وەکیل بۆ زەکات بەشکردن، هەروەك لە باسی (وەکیلایەتی)دا ڕابرا.

(وَلْيُعْلِمْ شَهْرًا لأَخْذِهَا)سوننەتە پێشەوای موسوڵمانان مانگێك دیاری بکا بۆ وەرگرتنی زەکات (وَيُسَنُّ وَسْمُ نَعَمِ الصَّدَقَةِ وَالْفَيْءِ) سوننەتە: مەڕو ئاژەڵەکانیتری زەکاتو (فَيْء) نیشاندار بکرێن، واتە: بە ئاسنێکی سورکراوە داغ بکرێن (فِي مَوْضِعٍ لاَ يَكْثُرُ شَعَرُهُ) لە ئەندامێکی لاشەیان کە مووی زۆر نەبێ: وەکو ڕانو گوێ (وَيُكْرَهُ فِي الْوَجْهِ) بەلام لە ڕوخساردا ناپەسندە (قُلْتُ) ئیمامی (النواوي) دەفەرموێ (الأَصَحُّ يَحْرُمُ) بە فەرموودەی ڕاستتر: داغکردنی ڕوخساری ئاژەڵ حەرامە (وَبِهِ جَزَمَ الْبَغَوِيُّ) ئیمامی (البغوي)ش فەرموویەتی حەرامە، هەم (وَفِي صَحِيحِ مُسْلِمٍ لَعْنُ فَاعِلِهِ) لە حەدیسێکدا کە (مسلم) گێڕاویەتیەوە: (پێغەمبەرﷺ بە لای گوێدرێژێکدا ڕابرد کە ڕوخساری داغ کرابو، فەرمووی: لەعنەت لەو کەسەی داغی کردوە). (وَاللهُ أَعْلَمُ).

﴿ پاشکۆ: لەبارەی خەساندنو ئاوسکردنی دەستکرد ﴾

بۆ کشت کەسێك دروستە: ئاژەڵەکانیان بە داغکردن نیشانە بکەن، هەر چەند زەکاتو (فَيْء)ش نەبن، هەروەها خەساندنی ئەو ئاژەڵەی گۆشتی دەخورێ لە حاڵەتی بچوکیدا دروستە، بەلام لەحاڵەتی گەورەییدا دروست نیە، هەروەها خەساندنی ئەو ئاژەڵەی گۆشتی ناخورێ لە هیچ حاڵەتێکدا دروست نیە.

ئینجا بزانە: ناپەسندە: کەر بپەڕێندرێتە سەر ماین، چونکە دەرهەق ئەو کارە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا يَفْعَلُ ذَلِكَ الَّذِينَ لاَيَعْلَمُونَ﴾ رواه أبوداود بسند صحيح، تەنها ئەو کەسانە ئەو کارە دەکەن کە نازانن. واتە: چونکە لەم پەڕاندنە هێستر دروست دەبێو ئەسپو ماین کەم دەبن، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ناوەڕۆکی ئەو پاشکۆیە ڕوون کراوەتەوە.

هەم لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە: حەرامە: ئەسپ بپەڕێندرێتە سەر مانگا، چونکە ئەندامەکەی ئەسپ گەورەیەو زیان لە مانگایەکە دەدا-واتە: نەك لە بەر ئەوەی ڕەگەزی جیایە- کەوابو: هەر پەڕاندنێك زیان بە مێیینە بگەیەنێ حەرامە، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی، ئەوەش وا ئەگەیەنێ: کە (التَّلْقِيحُ الإِصْطِنَاعِي)-واتە: ئاوسکردنی ئاژەڵ لە ئاوی نێرەیەك بە ئامێرێکی دەستکرد- دروستە، بەو مەرجەی -ئەگەر بۆ گۆشت خواردن بێ- نێرەکەو مێیەکە هەردووکیان گۆشتیان بخورێ، چونکە هیچ زیان بە مێیەکە ناگاو نەژادیش لە ئاژەڵدا ڕەچاو ناکرێ، والله أعلم.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی خێرکردن ﴾

(صَدَقَةُالتَّطَوُّعِ) خێرکردن بە ماڵ (سُنَّةٌ) سوننەتێکی (مُؤَكَّدَة)یە، چونکە لە قورئانی پیرۆزو لە حەدیسەکانی پێغەمبەرداﷺ زۆر بایەخی پێدراوە، بەڵام ئەگەر مرۆڤ بزانێ خێروەرگرەکە لە گوناهکاری سەرفی دەکا، ئەو کاتە حەرامە خێرەکەی بداتێ، هەروەك لە (تحفة)و (مغني)دا فەرموویانە، بەڵام (وَتَحِلُّ لِغَنِيٍّ وَكَافِرٍ) حەڵاڵە خێرەکەی بداتە دەوڵەمەندو کافر، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿فِي كُلِّ كَبِدٍرَطْبَةٍ أَجْرٌ﴾ رواه الشيخان، لە گشت خاوەن جەرگێکی تەڕدا پاداشتێك هەیە.

(وَدَفْعُهَا سِرًّا) بە نهێنی خێرەکە بداتە خێروەرگرەکە خێری گەورەترە، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللهُ فِي ظِلِّهِ يَوْمَ لاَ ظِلَّ إِلاَّ ظِلُّهُ...وَرَجُلٌ تَصَدَّقَ بِصَدَقَةٍ فَأَخْفَاهَا حَتَّى لاَ تَعْلَمَ شِمَالُهُ مَا تُنْفِقُ يَمِينُهُ﴾ رواه الشيخان، حەفت کەس هەنە خوای گەورە لە سێبەری خۆیدا دایاندەنێ لە ڕۆژی قیامەت کە جگە لە سێبەریخۆی هیچ سێبەرێکیتر نیە...یەکێکیشیان ئەو کەسەیە کە بە نهێنی خێرێکی کردبێو بە شێوەیەکی وەها بیشارێتەوە: کە چەپەکەی نەزانێ ڕاستەکەی چی دەبەخشێ. بەڵام زەکاتدان بە ئاشکرایی خێرترە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَ) هەروەها (فِي رَمَضَانَ) خێرکردن لە ڕەمەزاندا خێری زۆرترە، چونکە پێغەمبەرﷺ لە ڕەمەزاندا زۆر خێری دەکردن، هەروەك لە (پەڕتووکی ڕۆژوو)دا ڕوونمان کردەوە.

وَلِقَرِيبٍ وَجَارٍ أَفْضَلُ، وَمَنْ عَلَيْهِ دَيْنٌ أَوْ وَلَهُ مَنْ تَلْزَمُهُ نَفَقَتُهُ يُسْتَحَبُّ أَنْ لاَ يَتَصَدَّقَ حَتَّى يُؤَدِّيَ مَا عَلَيْهِ، قُلْتُ: اَلأَصَحُّ تَحْرِيمُ صَدَقَتِهِ بِمَا يَحْتَاجُ إِلَيْهِ لِنَفَقَةِ مَنْ تَلْزَمُهُ نَفَقَتُهُ أَوْ لِدَيْنٍ لاَ يَرْجُو لَهُ وَفَاءً وَاللهُ أَعْلَمُ، وَفِي اسْتِحْبَابِ الصَّدَقَةِ بِمَا فَضَلَ عَنْ حَاجَتِهِ أَوْجُهٌ، أَصَحُّهَا: إِنْ لَمْ يَشُقَّ عَلَيْهِ الصَّبْرُ

---

(وَلِقَرِيبٍ) هەروەها خێرکردن بە خزم خێری زۆر گەورەترە، چونکە دەرهەق خێرکردن بە خزم پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿لَهُ أَجْرَانِ: أَجْرُالْقَرَابَةِ وَأَجْرُالصَّدَقَةِ﴾ رواه الشيخان، خێرکردن بە خزم دوو پاداشتی هەنە: پاداشتی خزمایەتیو پاداشتی خێرکردنەکە.

(وَجَارٍ أَفْضَلُ) هەروەها خێرکردن بە دراوسێ خێری گەورەترە لە کەسێکی کە دراوسێ نەبێ، چونکە خواو پێغەمبەرﷺ زۆر بایەخیان بە چاکەکردنی لە گەڵ دراوسێ داوە.

ئینجا سوننەتە باشترینو خۆشەویسترین شت بکاتە خێر، هەروەها چەند حەدیسێکیش دەرهەق ئاودان هاتون، بۆ نمونە: ﴿أَيُّمَا مُسْلِمٍ سَقَى مُسْلِماً عَلَى ظَمَأٍ سَقَاهُ اللهُ عَزَّوَجَلَّ مِنَ الرَّحِيقِ الْمَخْتُومِ﴾ رواه أبوداود بإسناد جيد، هەر موسوڵمانێك ئاو بداتە موسوڵمانێکی تینوو، خوای گەورە لە شەرابە مۆرکراوەکەی بەهەشت ئاوی دەدا.

(وَمَنْ عَلَيْهِ دَيْنٌ) هەرکەسێك قەرزێکی لە سەر بێ، جا قەرزی خوا بێ: وەکو زەکاتو کەففارەت، یان قەرزی ئادەمیزاد بێ (أَوْ وَلَهُ مَنْ تَلْزَمُهُ نَفَقَتُهُ) یان کەسێکی وەهای هەبێ: کە بەخێوکردنی لە سەر واجب بێ: وەکو دایكو باوكو ژنو منداڵەکانی، ئەوە لە هەردوو حاڵەتدا (يُسْتَحَبُّ أَنْ لاَ يَتَصَدَّقَ) وەها سوننەتە: هیچ شتێك نەکاتە خێر (حَتَّى يُؤَدِّيَ مَاعَلَيْهِ) تا ئەو قەرزەو ئەو بەخێوکردنەی لە سەریەتی بە تەواوی دەیدا.

بەلام (قُلْتُ) ئیمامی (النواوي) دەفەرمویێ (اَلأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر (تَحْرِيمُ صَدَقَتِهِ بِمَا يَحْتَاجُ إِلَيْهِ) حەرامە ئەو شتە بکاتە خێر: کە پێویستیی پێ هەیە (لِنَفَقَةِ مَنْ تَلْزَمُهُ نَفَقَتُهُ) بۆ بەخێوکردنی ئەو کەسەی بەخێوکردنیی لە سەر واجبە (أَوْ) یان پێویستیی پێ هەیە (لِدَيْنٍ لاَيَرْجُو لَهُ وَفَاءً) بۆ قەرزێکی وەها: کە جگە لەئەوەندە شتە تەمای بە هیچیتر نەبێ قەرزەکەی پێ بداتەوە، چونکە دانەوەیقەرز واجبە، خێرکردنیش سوننەتە (وَاللهُ أَعْلَمُ) هەم پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿كَفَى بِالْمَرْءِ إِثْماً أَنْ يَحْبِسَ عَمَّنْ يَمْلِكُ قُوتَهُ﴾ رواه مسلم، ئەوەندە گوناهە بۆ سزادانی مرۆڤ بەسە: بەخێوکردنی ئەوکەسە ڕابگرێ کە بەخێوکردنی لە ئەستۆیەتی.

(وَفِي اسْتِحْبَابِ الصَّدَقَةِ) لەبارەی خێرکردن (بِمَا فَضَلَ عَنْ حَاجَتِهِ) بە گشت ئەوشتەی کە لە پێویستی خۆیو منداڵەکانی زیادە (أَوْجُهٌ) چەند فەرموودەیەك هەنە (أَصَحُّهَا) لە هەموانیان ڕاستتر: (إِنْ لَمْ يَشُقَّ عَلَيْهِ الصَّبْرُ) ئەگەر خۆڕاگرتنی لە سەر نەبوونی لە لای

زەحمەت نەبێ، ئەوە (اُستُحِبَّ) سوننەتە گشت ماڵە زیادەکەی بکاتە خێر، چونکە (ئیمامی (ابوبکر) جارێك هەموو ماڵیخۆی کردە خێر، پێغەمبەریشﷺ لێی قبوڵ کرد). هەروەك (الترمذی) گێڕاویەتەوە.

(وَإِلاَّ فَلاَ) بەڵام ئەگەر لە سەر نەبوونی خۆی پێڕانەدەگیرا ئەو کاتە (فَلاَ) سوننەت نیە، بەڵکو ناپەسندە، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿خَيْرُ الصَّدَقَةِ مَاكَانَ عَلَى ظَهْرِغِنًى وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ﴾ رواه الشيخان، چاکتر خێرکردن ئەوەیە لە سەر دەوڵەمەندی بێو پێویستی ی پێ نەبێ، پێشدا مافی ئەو کەسانە بدە: کە بەخێوکردنیان لە ئەستۆی تۆیە.

﴿ پاشکۆ ﴾: سوننەتە هەموو ڕۆژێك خێرێك بکا، هەر چەند کەمیش بێ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْراً يَرَهُ﴾ هەر کەسێك بە گرانایی زەڕەیەك خێرێك بکا لە ڕۆژی قیامەت دەیبینێ. هەروەها سوننەتە خێرەکەشی بداتە هەژارو پیاوچاکان، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لاَيَأْكُلْ طَعَامَكَ إِلاَّ تَقِيٌّ﴾ رواه أبوداود بسندصحيح، هیچ کەسێك خواردەمەنی تۆ نەخوا تەنها مرۆڤی لە خواترس نەبێ.

هەروەها ئەو خێرانەی بەردەوامنو سودەکەیان گشتی‌یە لە هەموو خێرێك گەورەترن: وەك (وَقف)کردنو ئاوی خێرات، هەم پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لاَيَغْرِسُ الْمُسْلِمُ غَرْساً فَيَأْكُلُ مِنْهُ إِنْسَانٌ وَلاَ دَابَّةٌ وَلاَ شَيْءٌ إِلاَّ كَانَ لَهُ صَدَقَةٌ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ﴾ رواه مسلم، هەر موسوڵمانێك درەختێك بچێنێ-بڕوێنێ، جا هەر ئادەمیزادێكو هەر ئاژەڵێكو هەر شتێکیتر لەو درەختە بخوا، ئەوە بۆ داچێنەکە دەبێتە خێر تا ڕۆژی قیامەت.

ئینجا ئەو کەسەی خێرەکەی دەدرێتێ سوننەتە: دوعای چاك بۆ خێرکەرەکە بکا، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿مَنْ صُنِعَ إِلَيْهِ مَعْرُوفٌ فَقَالَ لِفَاعِلِهِ: جَزَاكَ اللهُ خَيْراً. فَقَدْ أَبْلَغَ فِي الثَّنَاءِ﴾ رواه الترمذی بسند صحیح، هەرکەسێك چاکەیەکی لەگەڵ کرا، ئینجا ئەویش بە چاکەکەرەکەی گوت: خوا پاداشتی چاکەت بداتەوە. ئەوە بەڕاستی سوپاسێکی زۆری کردوە. بەڵام حەڕامە: خێرکەرەکەش منەت بکاو ئازاری ئەو کەسە بدا کە خێرەکەی داوەتێ، یان کارێکی پێبکا، چونکە بەو ڕەفتارانە خێرەکەی دەسڕێتەوەو نانووسرێ، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿لاَتُبْطِلُوا صَدَقَاتِكُمْ بِالْمَنِّ وَالأَذَى﴾ خێرەکانیخۆتان بە منەتکردنو ئازاردان بەتاڵ مەکەنەوە.

هەروەها پێویستە بە دوای هەر گوناهێکدا خێرێك، یان چاکەیەکیتر بکا، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ﴾ بەڕاستی چاکەکان خراپەکان لادەبەن. دیسان بزانە: حەڕامە بە خاتریخوا لە خەڵك بپاڕێتەوە، حەڕامە خۆی سوك بکاو دەرۆزە

## (كِتَابُ النِّكَاحِ)

**هُـوَ مُسْتَحَـبٌّ لِمُـحْتَاجٍ إِلَـيْهِ يَجِـدُ أُهْـبَتَهُ، فَـإِنْ فَقَـدَهَا اُسْـتُحِبَّ تَرْكُـهُ**

بكا، بەلام ئەگەر كەسێك لەخۆیەوە شتێكی بداتێ، ئەو كاتە با وەریبگرێ، هەروەك لە حەدیسێكی(صحیح)دا هاتوە، هەروەها لە بارەی خێركردن‌و چۆنیەتی‌و سودەكانی خێركردن چەند حەدیسێكی‌تر هەنە لەبەر درێژی نەماننوسین، پێویستە لە كتێبەكانی حەدیس لێیان ئاگادارین، وَصَلَّى اللهُ وَسَلَّمَ عَلَى سَيِّدِنَا مُحَمَّدٍ وَآلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِينَ وَالْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ.

### ﴿ كِتَابُ النِّكَاحِ: ئەمەیە پەرتوكی ژن مارەكردن ﴾

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَأَنْكِحُوا الْأَيَامَى مِنْكُمْ وَالصَّالِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَائِكُمْ إِنْ يَكُونُوا فُقَرَاءَ يُغْنِهِمُ اللهُ مِنْ فَضْلِهِ وَاللهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ﴾ ژن بۆ پیاوە بێ‌ژنەكانتان بێنن‌و ژنە بێ‌مێردەكانتان بدەنە شوو، هەم كۆیلەو جاریە سالحەكانیشتان، ئەگەر ژن‌و پیاوەكان هەژار بن، خوای‌گەورە لە گەورەیی‌خۆی دەوڵەمەندیان دەكا. واتە لە ترسی بەخێوكردن واز لە ژن هێنان‌و مێردكردن مەهێنن. پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿أَرْبَعٌ مِنْ سُنَنِ الْمُرْسَلِينَ: اَلْحَيَاءُ وَالتَّعَطُّرُ وَالسِّوَاكُ وَالنِّكَاحُ﴾ رواه أحمد والترمذی بسند حسن، چوار سیفەت ڕەوشتی پێغەمبەرانن علیهم الصلاة والسلام: شەرم كردن‌و خۆ بۆنخۆشكردن‌و سیواك كردن‌و ژن هێنان. جگە لەوانەش چەند ئایەت‌و حەدیسێكی‌تر لەبارەی ژن هێنان هاتون پێویستە لە كتێبەكانی حەدیسدا بیانخوێنیەوە، چونكە ژن هێنان تاكە خواپەرستیەكە–لە دوای ئیمان– كە لە سەردەمی باب (آدم)ەوەو تا لە بەهەشتیشدا بەردەوامە، هەروەك لە زۆریەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(هُوَ) ژن هێنان (مُسْتَحَبٌّ) سوننەتێكی زۆر خۆشەویستە (لِمُحْتَاجٍ إِلَيْهِ) بۆ ئەو پیاوەی پێویستی بە ژن هێنان هەیە: وەك حەزی بۆ جیماع بچێ، بەو مەرجەی (يَجِدُ أُهْبَتَهُ) ئەركی ژن هێنانی دەست بكەوێ: وەك مارەیی‌و جل‌و بەرگی وەرزەكەی بوك گواستنەوە، هەرچەند هەژاریش بێ، بە بەڵگەی ئایەتەكەی‌رابردوو. پێغەمبەریشﷺ دەفەرموێ: ﴿يَامَعْشَرَ الشَّبَابِ مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمُ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ﴾ رواه الشيخان، هۆ كۆمەڵی لاوەكان هەر كەسێك لە ئێوە توانای ژن هێنانی هەبو با ژن بهێنێ، چونكە ژن هێنان باشتر چاوی لە حەرام دەنوقێنێ‌و باشتر داوێنی لە حەرام دەپارێزێ، وە هەر كەسێكیش توانای نەبو، با بەڕۆژوو بێ، چونكە ڕۆژوو–وەك خەساندن– شەهوەتەكەی دەبڕێ.

(فَإِنْ فَقَدَهَا) جا ئەگەر پیاوەكە ئەركی ژن هێنانی نەبو (اُسْتُحِبَّ تَرْكُهُ) سوننەتە: واز لە ژن هێنان بێنێ تا ئەركی ژن هێنانی دەست دەكەوێ، خوای گەورە دەفەرموێ:

وَيَكْسِرُ شَهْوَتَهُ بالصَّوْمِ، فَإِنْ لَمْ يَحتَجْ كُرِهَ إنْ فَقَدَ الأُهْبَةَ، وَإلاّ فَلاَ لَكِنِ الْعِبَادَةُ أَفْضَلُ، قُلْتُ: فَإِنْ لَمْ يَتَعَبَّدْ فَالنِّكَاحُ أَفْضَلُ فِي الأَصَحِّ، فَإِنْ وَجَدَ الأُهْبَةَ وَبِهِ عِلَّةٌ كَهَرَمٍ أَوْ مَرَضٍ دَائِمٍ أَوْ تَعْنِينٍ كُرِهَ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَيُسْتَحَبُّ دَيِّنَةٌ

---

﴿وَلْيَسْتَعْفِفِ الَّذِينَ لاَيَجِدُونَ نِكَاحاً حَتَّى يُغْنِيَهُمُ اللهُ مِنْ فَضْلِهِ﴾ ئەو کەسانەی ئەرکی ژن هێنانیان دەست ناکەوێ با خۆیان بە داوێنپاکی ڕابگرن تا خودا لە گەورەیی خۆی دەوڵەمەندیان دەکا، واتە: ئەرکی ژن هێنانیان دەداتێ.

کەوابو: (وَيَكْسِرُ شَهْوَتَهُ بِالصَّوْمِ) لەو ماوەیەدا پیاوەکە حەزلێچوونیجیماعی بە ڕۆژووگرتن دەشکێنێ، بە بەڵگەی حەدیسەکەیڕابردوو، بەڵام ناپەسندە: بە دەرمان شەهوەتەکەی بشکێنێ، بەڵکو ئەگەر بە یەکجاری شەهوەتەکەی بشکێنێ، ئەو کاتە حەرامەو گوناهبار دەبێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(فَإِنْ لَمْ يَحْتَجْ) جا ئەگەر پێویستی بە ژن هێنان نەبو، واتە: حەزی بۆ جیماع نەدەچو، ئەو کاتە (كُرِهَ إِنْ فَقَدَ الأُهْبَةَ) ناپەسندە ژن بهێنێ ئەگەر ئەرکی ژن هێنانی نەبێ (وَإِلا) بەڵام ئەگەر پێویستی بە ژن هێنان نەبو و ئەرکی ژن هێنانیشی هەبو، ئەو کاتە (فَلاَ) ناپەسند نیە (لَكِنِ الْعِبَادَةُ أَفْضَلُ) بەڵام لەو حاڵەتەدا خواپەرستی خێرترە لە ژن هێنانەکە.

(قُلْتُ) ئیمامی (النواوي) دەفەرموێ (فَإِنْ لَمْ يَتَعَبَّدْ) ئەگەر خواپەرستی نەدەکرد، ئەو کاتە (فَالنِّكَاحُ أَفْضَلُ) ژن هێنانەکە خێرترە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، نەوەك توشی بێشەرعی ببێ (فَإِنْ وَجَدَ الأُهْبَةَ) جا ئەگەر ئەرکی ژن هێنانی هەبوو، بەڵام (وَبِهِ عِلَّةٌ) لە سەرەتاوە نەساغیەکی هەبو: (كَهَرَمٍ) وەکو پیری (أَوْ مَرَضٍ دَائِمٍ) یان نەخۆشیەکی بەردەوام (أَوْ تَعْنِينٍ) یان نەمێردی، واتە توانای جیماعکردنی نەبێ، ئەو کاتە (كُرِهَ) ناپەسندە: ژن بهێنێ، چونکە پێویستیی نیەو ژنەکەشی داوێنپاك ناکاو سەر دەکێشێتە لای بێشەرعی (وَاللهُ أَعْلَمُ).

ئینجا بزانە: ئەو بڕیارانەیڕابردوو-جگە لە بەرۆژوو بوون- گشتی لە ئافرەتیشدا ڕەچاو دەکرێن، کەواتە: ئەگەر حەزی لە جیماع بوو، یان پێویستی بە بەخێوکردنیخۆی هەبوو، یان دەترسا بێناموسەکان تووشی ببن، لەو حاڵەتانەدا سوننەتە شوو بکا، بەڵام ئەگەر ئەو پێویستیانەی نەبنو بشزانێ ئەرکی مێردەکەی پێ جێبەجێ ناکرێ، ئەو کاتە حەرامە شوو بکا، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

### ﴿ سیفەتەکانی ژن و مێردی باش ﴾

(وَيُسْتَحَبُّ دَيِّنَةٌ) سوننەتە: ژنێکی ئایین پەرەوەرو خواپەرست بهێنێ، چونکە ئایینەکەی ڕێگەی خیانەتو بێناموسیو لە فەرماندەرچوونی لێدەگرێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ:

بِكْرٌ نَسِيبَةٌ لَيْسَتْ قَرَابَةًقَرِيبَةً.

﴿تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ لأَرْبَعٍ: لِمَالِهَا وَلِحَسَبِهَا وَلِجَمَالِهَا وَلِدِينِهَا، فَاظْفَرْ بِذَاتِ الدِّينِ تَرِبَتْ يَدَاكَ﴾ رواه الشيخان، بۆ چوار مەبەست ژن مارە دەكرێ: بۆ ماڵەكەیو بۆ خزمەكانیو بۆ جوانیەكەیو بۆ ئایینەكەی، جا ئەتۆ خاوەن ئایینەكە بگرە، ئەگەر وانەكەی هەژار ببی.

ئینجا بزانە: لەبارەی ئافرەتی نوێژنەكەر دوو فەرموودەی جیاواز هەنە، بۆیێ لە فەرموودەیەكدا: هێنانی ژنێكی جولەكە، یان دیان باشترە لە هێنانی ژنێكی نوێژنەكەر، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

(بِكْرٌ) سوننەتە: ژنێكی كچ بهێنێ، پێغەمبەرﷺ بە (جابر)ی فەرموو: ﴿هَلاَّ بِكْراً تُلاَعِبُهَا وَتُلاَعِبُكَ﴾ رواه الشيخان، بریا ئەو ژنەی هێناوتە كچ بوایە تاكو گەمەی لەگەڵ بكەیو گەمەت لەگەڵ بكا. جگە لە مەش كچ لە بێوەژن بێفێڵترەو قسەی خۆشترەو بە مەسرەفی كەمو بە جیماعیكەم رازیترە.

(نَسِيبَةٌ) هەم نەژادێكی پاكو بە شەرەفی هەبێ، بە بەڵگەی حەدیسەكەی چوار سیفەتیرابردوو (لَيْسَتْ قَرَابَةً قَرِيبَةً)خزمێكی نزيك نەبێ، چونكە بە هۆی شەرمی خزمایەتی شەهوەتەكەیان بێهێز دەبێو دەبێتە هۆی بێهێزبوونی منداڵەكە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا منداڵێكی رێزدار دەبێ، چونكە لە هەر دوو لایەوە تەبیعەتی بنەماڵەكەی تێدا كۆ دەبێتەوە.

هەروەها سوونەتە: لەو جۆرە ژنانە بێ: كە بە زۆری زاوزگ دەكەن، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿تَزَوَّجُوا الْوَدُودَ الْوَلُودَ فَإِنِّي مُكَاثِرٌ بِكُمُ الأُمَمَ﴾ رواه أبوداود وصححه الحاكم، ئەو جۆرە ژنە مارە بكەن كە مێردی خۆی زۆر خۆش دەوێو بە زۆری منداڵی دەبن، چونكە من شانازی بە زۆریی ئێوە لە سەر ئوممەتانیتر دەكەم. جا بزانە: ئەم سیفەتە بە هۆی دایكو خوشكو خزمەكانی كچەكە دەزاندرێ.

هەروەها سوننەتە: مارەییەكەی كەم بێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿أَعْظَمُ النِّسَاءِ بَرَكَةً أَيْسَرُهُنَّ مُؤْنَةً﴾ صححه الحاكم، لە هەموو ژنەكان بە پیتو بەرەكەتتر ئەو ژنانەن كە مارەییو مەسرفیان سوكو ئاسانە. هەروەها سوننەتە: ژنەكە بە دڵیخۆی بێ، واتە: لە بەرچاویخۆی جوانو دڵگیر بێ، چونكە لە بارەی ژنیباش پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿خَيْرُ النِّسَاءِ الَّتِي تَسُرُّهُ إِذَا نَظَرَ وَتُطِيعُهُ إِذَا أَمَرَ ولاَ تُخَالِفُهُ فِي نَفْسِهَا وَلاَ مَالِهَا بِمَا يَكْرَهُ﴾ رواه أصحاب السنن بسند صحيح، باشترین ژن ئەوەیە: هەر كاتێك مێردەكەی تەماشای بكا دڵخۆشی بكا—واتە: لەگەڵ مێردەكەی روخۆشو بە زەردەخەنە بێو رازاوەو پاكو خاوێن بێ— هەم هەر كاتێك فەرمانیشی پێبكا فەرمانەكەی جێبەجێ بكاو لە خودی خۆیو لە ماڵی مێردەكەشدا خیانەت نەكا. واتە: بێناموسیو دزی نەكا.

وَإِذَا قَصَدَ نِكَاحَهَا سُنَّ نَظَرُهُ إِلَيْهَا قَبْلَ الْخِطْبَةِ وَإِنْ لَمْ تَأْذَنْ، وَلَهُ تَكْرِيرُ نَظَرِهِ، وَلاَ يَنْظُرُ غَيْرَ الْوَجْهِ وَالْكَفَّيْنِ، وَيَحْرُمُ نَظَرُ فَحْلٍ بَالِغٍ إِلَى عَوْرَةِ حُرَّةٍ كَبِيرَةٍ أَجْنَبِيَّةٍ

---

ئینجا بزانە: هەروەك بۆ پیاوكە سوننەتە: ئەو سیفەتانەی ڕابردوو لە ژنەكەدا ڕەچاو بكا، ئەوهاش بۆ ژنەكەو بۆ (وَلی)یەكەی سوننەتە: ئەو سیفەتانە لە مێردەكەدا ڕەچاو بكەن، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

## ﴿ باسی (نَظَر)=تەماشاكردنی ئافرەت و پیاو ﴾

**پێشەكی** بزانە: تەماشاكردنی یەكتری‌ی ئافرەتو پیاو سێ بڕیاری هەنە: سوننەتە، حەرامە، حەڵاڵە. جا لەبارەی تەماشاكردنی سوننەت دەفەرموێ (وَإِذَا قَصَدَ نِكَاحَهَا) هەر كاتێك ویستی ژنێك بۆ خۆی مارە ببڕێ (سُنَّ نَظَرُهُ إِلَيْهَا) سوننەتە: تەماشای ژنەكە بكا (قَبْلَ الْخِطْبَةِ) پێش داخوازی‌كردنی (وَإِنْ لَمْ تَأْذَنْ) هەرچەند ژنەكەو وەلیەكەشی ئیزنی نەدەن، هەروەها لە دوای داخوازیش دروستە: تەماشای بكا، چونكە پێغەمبەرﷺ ئیزنی داوە، بە بەڵگەی ﴿عَنِ المغيرةﷺ: أَنَّهُ خَطَبَ امْرَأَةً، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّﷺ: أُنْظُرْ إِلَيْهَا فَإِنَّهُ أَحْرَى أَنْ يُؤْدَمَ بَيْنَكُمَا﴾ رواه الترمذي وحسنه، پێغەمبەرﷺ بە (المغيرة)ی فەرموو: ئەو ژنەی داخوازت كردوە تەماشای بكە، چونكە ئەو تەماشاكردنە باشتر دەبێتە هۆی بەردەوامی خۆشەویستی لە نێوانتاندا.

(وَلَهُ تَكْرِيرُ نَظَرِهِ) بۆی دروستە زیاتر لە سێ جاریش تەماشای بكا، تا دڵی جێگیر دەبێو قەناعەتی تەواو دەبێ، بەڵام ئەگەر بە یەك جار قەناعەتی تەواو بوو، ئەو كاتە حەرامە دوو جار تەماشای بكا.

(وَ) هەروەها (لاَ يَنْظُرُ غَيْرَ الْوَجْهِ وَالْكَفَّيْنِ) جگە لە ڕوو و هەردوو لەپەدەستەكانی نابێ تەماشی هیچ شوێنێكی‌تری بكا، چونكە جوانی‌ی لە ڕووەكەی دیارەو قەڵەوی‌و نەرمو نۆڵی لاشەكەشی لە لەپەدەستەكانی دیارە. ئینجا ئەگەر نەگونجا بەخۆی تەماشای بكا، ئەو كاتە سوننەتە: ژنێكی مەحەڕەمی خۆی بنێرێ لە جیاتی‌ی تەماشای بكا، ئینجا بۆی باسی جوانی‌و قەڵەویەكەی بكا، جا ئەگەر ژنەكەی بە دڵ نەبو، سوننەتە بێ‌دەنگ بێو عەیبەكانی نەڵێ، هەم نەڵێ: نامەوێ. چونكە دڵشكاندنی تێدایە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

هەروەها بۆ ئافرەتەكەی داخوازكراویش سوننەتە: تەماشای هەموو لاشەی پیاوە داخوازكەرەكە بكا–جگە لە عەوڕەتەكەی– هەروەك لە (مغنی)و (الشروانی)دا فەرموویانە.

هەروەها لەبارەی تەماشاكردنی حەرام دەفەرموێ (وَيَحْرُمُ نَظَرُ فَحْلٍ بَالِغٍ) حەرامە: نێرێكی بالغو عاقڵ تەماشا بكاتە (إِلَى عَوْرَةِ حُرَّةٍ كَبِيرَةٍ أَجْنَبِيَّةٍ) عەوڕەتی ئافرەتێكی گەورەی بێگانە، هەرچەند شەهوەتیشی نەجوڵێو لە بێ‌شەرعیش نەترسێ.

جا بزانە: مەبەست بە بێگانە ئەو ئافرەتەیە: کە مارەیی لێبێ: ئێستا، یان لەمەودوا، هەم مەبەست بە عەورەتیئافرەت: هەموو لاشەیەتی-جگە لە ڕوو و لەپەدەستەکانی- هەروەك لە باسی نوێژدا ڕابرا، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿قُلْ لِلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ﴾ بە پیاوە ئیماندارەکان بڵێ: چاویخۆیان بنوقێنن لە تەماشاکردنی حەرامو داوێنیخۆیان بپارێزن لە حەرام بە کاری نەهێنن.

(وَكَذَا وَجْهِهَا وَكَفَيْهَا) هەروەها حەرامە تەماشا بکاتە ڕوو و لەپەدەستەکانی ئافرەتی بێگانە (عِنْدَ خَوْفِ فِتْنَةٍ) ئەگەر لە ڕودانی بێشەرعیەك بترسێ، بە (إجماع) زانایانی ئیسلام (وَكَذَا عِنْدَالأَمْنِ) هەروەها ئەگەر لە ڕودانی بێشەرعیش نەترسێو دەماریشی هەڵنەستێ، هەر حەرامە تەماشای لەپەدەستو ڕووی ئافرەتی بێگانە بکا (عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست ﴿عَنْ ابْنِ عَبَاسٍ رضي الله عنهما: كَانَ الْفَضْلُ رَدِيفَ النَّبِيِّ ﷺ فَجَاءَتْ امْرَأَةٌ مِنْ خَثْعَمَ، فَجَعَلَ الْفَضْلُ يَنْظُرُ إِلَيْهَا وَتَنْظُرُ إِلَيْهِ، فَجَعَلَ النَّبِيُّ ﷺ يَصْرِفُ وَجْهَ الْفَضْلِ إِلَى الشِّقِّ الآخَرِ...وَذَلِكَ فِي حَجَّةِالْوَدَاعِ﴾ رواەالشیخان، لە حەجیماڵئاواییدا (فضل) لە پشت پێغەمبەرﷺ سواری وولاغ بوبو، جا ئافرەتێك هات، (فضل)ش تەماشای ئافرەتەکەی دەکردو ئافرەتەکەش تەماشای(فضل)ی دەکرد، جا پێغەمبەرﷺ ڕووی (فضل)ی دەبردە لایەکەیتر تاکو تەماشای ئافرەتەکە نەکا. واتە: چونکە حەرامە پیاو تەماشای ڕووی ئافرەتیبێگانە بکا.

﴿ ئاگاداری ﴾: هەر ئافرەتێك بزانێ پیاوی بێگانە تەماشای دەکا، واجبە: ڕووی خۆی داپۆشێ، ئەگەر نا: دەبێتە یارمەتیدەری بێگانەکە لەو گوناهەداو گوناهبار دەبێ، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَلاَ يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلاَّ لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِنَّ أَوْ آبَاءِ بُعُولَتِهِنَّ﴾...إلى آخرالآية، بە ژنە ئیماندارەکان بڵێ: جوانی خۆیان بۆ هیچ کەسێك ئاشکرا نەکەن، تەنها بۆ مێردیخۆیان، یان بۆ باوکیخۆیان، یان باوکی مێردەکەیان...تا کۆتایی مەحرەمەکان. هەم ﴿عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِيبَكْرٍ رضي الله عنهما: كُنَّا نُغَطِّي وُجُوهَنَا مِنَ الرِّجَالِ...﴾ الحديث رواه الحاكم-فيالحج-على شرط البخاري ومسلم، (أسماء) دەفەرموێ: لە سەردەمی پێغەمبەرﷺ ڕووی خۆمان دادەپۆشی لە پیاوانی بێگانە.

جا شتێکی ئاشکرایە ڕوخساریئافرەت جوانترین ئەندامیەتی، کەوابو: واجبە: ئەو جوانیەی لە پیاویبێگانە بشارێتەوە، چونکە تازە ڕابرا: کە-بە فەرموودەیڕاست- حەرامە: تەماشای ڕوخساری ئافرەتیبێگانە بکا، هەرچەند دەماریشی هەڵنەستێ.

جا ئەو فەرموودە ڕاستە بەوەش بەهێزتر دەبێ: کە (إمام الحرمين) دەفەرموێ: زانایانی ئیسلام یەکدەنگن: کە بۆ کاربەدەست دروستە: ئافرەتان قەدەغە بکا لەوەی بە ڕووی

وَلاَ يَنْظُرُ مِنْ مَحْرَمِهِ بَيْنَ سُرَّةٍ وَرُكْبَةٍ، وَيَحِلُّ مَا سِوَاهُ، وَقِيلَ مَا يَبْدُو فِي الْمِهْنَةِ فَقَطْ، وَالأَصَحُّ حِلُّ النَّظَرِ بِلاَ شَهْوَةٍ إِلَى الأَمَةِ إِلاَّ مَا بَيْنَ سُرَّةٍ وَرُكْبَةٍ، وَإِلَى صَغِيرَةٍ إِلاَّ الْفَرْجَ، وَأَنَّ نَظَرَ الْعَبْدِ إِلَى سَيِّدَتِهِ وَنَظَرَ مَمْسُوحٍ كَالنَّظَرِ إِلَى مَحْرَمٍ، وَأَنَّ الْمُرَاهِقَ كَالْبَالِغِ،

---

دانەپۆشراو لە ماڵ بێنە دەرەوە، هەم تەماشاکردنی ئافرەتی بێگانەش لەوانەیە دەماری پیاو دەجوڵێنێو مەترسی بێشەرعیی لێدەکرێ، کەوابو: لە شەرعدا وا جوانە دەرگەی تەماشاکردنی حەرام بە یەکجاری دابخرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

ئینجا بزانە: کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلاَ يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلاَّ مَا ظَهَرَ مِنْهَا﴾ بە ئافرەتان بڵێ: جوانی خۆیان ئاشکرا نەکەن تەنها ئەو جوانیە نەبێ: کە ئاشکرا دەبێ. مەبەست ئەوەیە: کە عادەتە لە کاتی کارکردنو پێویستیەکانی‌تردا ئاشکرا دەبێ، هەروەك لە (تفسیر)ەکاندا ڕاڤە کراوە.

(وَلاَ يَنْظُرُ مِنْ مَحْرَمِهِ بَيْنَ سُرَّةٍ وَرُكْبَةٍ) نابێو حەرامە: پیاو تەماشای نێوان ناوكو ئەژنۆی ئافرەتە مەحرەمەکانی‌خۆی بکا، واتە: ئەو ئافرەتانەی بە یەکجاری مارەیان لێنایێ، بەڵام (وَيَحِلُّ مَاسِوَاهُ) حەڵاڵە: تەماشای شوێنەکانی‌تری–جگە لە نێوان ناوكو ئەژنۆ– بکا، بەو مەرجەی شەهوەتی نەجولێ (وَقِيلَ مَا يَبْدُو فِي الْمِهْنَةِ فَقَطْ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: دروستە تەماشای تەنها ئەو شوێنانەبکا: کە لە کاتی کارکردن بەدەرکەون.

(وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر (حِلُّ النَّظَرِ بِلاَ شَهْوَةٍ إِلَى الأَمَةِ) حەڵاڵە بە بێشەهوەت تەماشای ئافرەتی کۆیلە بکا (إِلاَّ مَا بَيْنَ سُرَّةٍ وَرُكْبَةٍ) تەنها نێوان ناوكو ئەژنۆی نەبێ (وَإِلَى صَغِيرَةٍ) هەروەها دروستە تەماشای کیژۆڵەیەکی بچکۆلە بکا، واتە: ئەوەندە بچوك بێ: پیاو حەزی لێنەکاو شەهوەتی بۆ نەجولێ (إِلاَّ الْفَرْجَ) بەڵام دروست نیە تەماشای ئەندامی میزکردنی کیژۆڵە بچوکەکە بکا (وَ) هەر بە فەرموودەی ڕاستتر (أَنَّ نَظَرَ الْعَبْدِ إِلَى سَيِّدَتِهِ) تەماشاکردنی کۆیلە بۆ ئافرەتە گەورەکەی‌خۆیو هەم (وَنَظَرَ مَمْسُوحٍ) تەماشکاکردنی ئەو پیاوەی گونو ئەندامی میزکردنی گشتی لێکراونەوەو دڵی بۆ ئافرەتان ناچێ (كَالنَّظَرِ إِلَى مَحْرَمٍ) وەك تەماشاکردنی پیاوی مەحەڕەمە بۆ ئافرەتە مەحرەمەکەی‌خۆی.

﴿ ئاگاداری ﴾: هەر تەماشاکردنێك بە شەهوەت بێ، یان مەترسی بێشەرعیی لێبکرێ، گشت ئافرەتێکی مەحرەمو نامەحرەم دەگرێتەوە، جگە لە ژنەکەی‌خۆیو جاریەکەی‌خۆی، هەروەها گشت شتێکی بێگیانیش دەگرێتەوە، کەواتە: بە شەهوەتەوە تەماشاکردنی گشت شتێك حەرامە، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)و حاشیەکانیاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَ)هەر بە فەرموودەی ڕاستتر (أَنَّ الْمُرَاهِقَ) ئەو منداڵەی لە بلۆغبوون نزیك بۆتەوەو شەهەوەتی دەجولێ (كَالْبَالِغِ) وەکو پیاوی‌بالغ بڕیاری بۆ دەدرێ، واتە: واجبە سەرپەرشتکارەکەی لە تەماشاکردنی‌حەرام قەدەغەی بکا، هەم واجبە ئافرەتی‌نامەحرەمیش

وَيحلُّ نَظَرُ رَجُلٍ إلَى رَجُلٍ إلاَّ مَا بَيْنَ سُرَّةٍ ورُكْبَةٍ، وَيحرُمُ نَظَرُ أمْرَدَ بشَهْوَةٍ، قُلْتُ: وَكَذَا بغَيْرِهَا فِى الأَصَحِّ الْمَنصُوصِ، وَالأَصَحُّ عِنْدَالْمُحقِّقِينَ أنَّ الأَمَةَ كَالْحُرَّةِ وَاللهُ أعْلَمُ. وَالْمَرْأَةُ مَعَ امْرأَةٍ كَرَجُلٍ ورَجُلٍ، وَالأَصَحُّ تَحْرِيمُ نَظَرِ ذمِّيَّةٍ إلَى مُسْلِمَةٍ، وَجَوازُ نَظَرِ الْمَرْأَةِ إلَى بَدَنِ أجْنَبِيٍّ سِوَى مَا بَيْنَ سُرَّتِه وَرُكْبَتِه إنْ لَمْ تَخَفْ

---

خۆی لێداپۆشێ، هەروەك واجبە: لە پیاوێکی شێتیش خۆی داپۆشێ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿أوِ الطِّفْلِ الَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا عَلَى عَوْرَاتِ النِّسَاءِ﴾ یان ئەو مندالانەی شارەزای عەورەتی ئافرەتان نەبونە -واتە: بۆ جیماعکردن شەهوەتیان ناجولێ- دروستە ئافرەتان جوانیی خۆیان بۆیان ئاشکرا بکەن.

(وَيحلُّ نَظَرُ رَجُلٍ إلَى رَجُلٍ) حەلاڵە: پیاو تەماشای پیاو بکا بەو مەرجەی بە بێشەهوەت بێ (إلاّ مَا بَيْنَ سُرَّةٍ ورُكْبَةٍ) تەنها تەماشاکردنی نێوان ناوكو ئەژنۆی دروست نیە.

(وَ) هەروەها (يَحْرُمُ نَظَرُ أمْرَدَ بِشَهْوَةٍ) بە (إجماع)ی زانایانیئیسلام حەرامە: تەماشاکردنی ئەو کوڕەی کاتی مووی ڕیشی نەهاتوە، ئەگەر تەماشاکردنەکەی بە شەهوەت بێ.

(قُلْتُ) ئیمامی (النواوي) دەفەرموێ (وكَذَا بِغَيْرِهَا) هەروەها بە بێشەهوەتیش تەماشاکردنی کوڕی ڕیش نەهاتوو هەر حەرامە (فِيالأَصَحِّ الْمَنْصُوصِ) لە دەقی فەرموودەی ڕاستتردا، چونك مەترسی بێشەرعیی لێدەکرێ، هەروەها تەماشاکردنی پیاوی ڕیش هاتووش بە شەهوەت هەر حەرامە، هەروەك تەماشاکردنی ژنی مەحرەمیش بە شەهوەت حەرامەو: لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَالأَصَحُّ عِنْدَ الْمُحَقِّقِينَ) فەرمودەی ڕاستتر لە لای زانایانی لێکۆلەرەوە: (أنَّ الأمَةَ كَالْحُرَّةِ) ئافرەتی کۆیلە وەکو ئافرەتی ئازاد تەماشاکردنی حەرامە (وَاللهُ أعْلَمُ).

(وَالْمَرْأةُ مَعَ امْرَأةٍ) ئافرەت لەگەڵ ئافرەتدا (كَرَجُلٍ ورَجُلٍ) وەکو پیاوە لەگەڵ پیاودا: لە حەرامیو حەلاڵی تەماشاکردندا، واتە: بە بێشەهەوەت دروستە: ئافرەتان تەماشای یەکتری بکەن جگە لە نێوان ناوكو ئەژنۆیان، بەلام بە شەهوەت حەرامە.

(وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەیڕاستتر (تَحْرِيمُ نَظَرِ ذِمِّيَّةٍ إلَىمُسْلِمَةٍ) حەرامە ئافرەتێکی جولەکە، یان دیان تەماشای ئافرەتێکیموسوڵمان بکا، چونکە خوایگەورە لە ئایەتەکەیڕابردوودا دەفەرموێ: ﴿أوْ نِسَائِهِنَّ﴾ یا ئافرەتی موسوڵمان جوانی خۆیان ئاشکرا نەکەن تەنها بۆ ئافرەتانیخۆیان نەبێ، واتە: بۆ ئافرەتە موسوڵمانەکان.

هەر بەم ئایەتەش ئیمامی (عمرﷺ) قەدەغەی کرد: ئافرەتیموسوڵمانو ئافرەتیکافر وێکڕا بچنە گەرماو بۆ خۆشوشتن، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَ) هەر بە فەرموودەی ڕاستتر (جَوازُ نَظَرِ الْمَرْأةِ إلَى بَدَنِ أجْنَبِيٍّ سِوَى مَابَيْنَ سُرَّتِهِ ورُكْبَتِهِ) دروستە ئافرەت تەماشای پیاوی بێگانە بکا، جگە لە نێوان ناوكو ئەژنۆی (إنْ لَمْ تَخَفْ

فِتْنَةً، قُلْتُ: اَلأَصَحُّ اَلتَّحْرِيمُ كَهُوَ إِلَيْهَا وَاللهُ أَعْلَمُ. وَنَظَرُهَا إِلَى مَحْرَمِهَا كَعَكْسِهِ، وَمَتَى حَرُمَ النَّظَرُ حَرُمَ الْمَسُّ،

---

فِتْنَةً) بەو مەرجەی لە بێشەرعی نەترسێو شەهوەتی نەجولێ، مەبەست بە بێگانە ئەوەیە مارەیی لێبێ.

(قُلْتُ) ئیمامی (النـواوي) دەفـەرموێ (الأَصَحُّ) بـە فـەرموودەی ڕاسـتتر (اَلتَّحْرِيمُ كَهُوَ إِلَيْهَا) حەرامە ئافرەت تەماشای پیاویبێگانە بکا، هەر چەند شەهوەتیشی نەجولێو لـە بێشـەرعیش نەترسێ، هەروەك حەرام بوو پیاویش تەماشای ئافرەتیبێگانە بکـا هـەر چـەند شەهوەتیشـی نەجولێ (وَاللهُ أَعْلَمُ) چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَـارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ﴾ بە ئافرەتە ئیماندارەکان بڵـێ: چـاوی خۆیـان بنـوقێنن لـە تەماشـاکردنی حەرام، داوێنیخۆیان بپارێزن لە حەرام بە کاری نەهێنن.

﴿وَعَنْ أُمِّ سلمةرضي الله عنها: كُنْتُ عِنْدَ رَسُولِ اللهِﷺ وَعِنْدَهُ مَيْمُونَةُ، إِذْ أَقْبَلَ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ فَقَـالَ النَّبِيُّﷺ: إِحْتَجِبَا مِنْهُ. فَقُلْتُ: أَلَيْسَ هُوَ أَعْمَى لاَيُبْصِرُنَا؟ فَقَالَﷺ: أَفَعَمْيَاوَانِ أَنْتُمَـا أَلَسْـتُمَا تُبْصِـرَانِهِ؟﴾ رواه أبـوداود والترمـذي بسندصـحيح، (ام سـلمة)و (مَيْمُونَـة) هـەردووکیان لـە خزمەت پێغەمبەرﷺ بون، کاتێك (عبـدالله ابـن أُمِّ مَكْتُـوم) هاتـە لایان، جا پێغەمبـەرﷺ فەرمووی: هەردووکتان خۆتانی لێداپۆشن. جا (أم سلمة) گوتی: ئەدی ئەو کـوێر نیـە، خۆ نامانبینێ؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: خۆ ئێوە کوێر نین، ئەدی ئێوە ئەوی نابینن؟.

(وَنَظَرُهَا إِلَى مَحْرَمِهَا) تەماشاکردنی ئافرەت بۆ پیاوە مەحرەمەکانی خۆی (كَعَكْسِـهِ) وەك پێچەوانەکەیەتی، واتە: دروستە ئافرەت تەماشـای گشـت ئەنـدامی پیـاوە مەحرەمـەکانی خۆی بکا جگە لە نێـوان نـاوكو ئـەژنۆ، بـەو مەرجـەی بـە بێشـەهوەت بـێ، هـەروەك لـە (نهاية)و (مغني)دا فەرمویانە، واتە: بەڵام تەماشاکردنی بە شەهوەت حەرامە.

## ﴿ (مُصَافَحَة) تۆقە کردنی حەرام ﴾

(وَمَتَى حَرُمَ النَّظَرُ حَرُمَ الْمَسُّ) هەر کاتێك تەماشاکردنی ئافرەتو پیـاو حـەرام بـێ، دەسـت لێدانی گشت ئەندامێکی یەکتریشیان بە ڕووتی حەرامە، کەوابو: دەست لێدانی کوڕی ڕیش نەهاتووش حەرامە، چونکە بۆ جولاندنیشەهوەتو بێشەرعی دەست لێدان لە تەماشاکردن بەهێزترە، کەوابو: ئەگەر لە سەر جلو بەرگیشەوە دەست لێدانەکە شەهوەت بجولێنێ ئـەو کاتەش هەر حەرامە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاند ڕوون کراوەتەوە.

کەوابو: تۆقـەکردن حەرامـە: لـە گـەڵ ئـافرەتی نامـەحرەمو کـوڕی مـوو لێنـەهاتوو، چـونکە تەماشاکردنیان حەرامـە ﴿عن عائشةرضي الله عنها: مَامَسَّتْ يَدُ رَسُولِ اللهِﷺ يَـدَ إِمْـرَأَةٍ إِلاَّ إِمْـرَأَةً يَمْلِكُهَا﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ دەستی لە دەستی هیچ ئافرێك نـەداوە، تـەنها دەسـتی ئەو ئافرەتە نەبێ: کە حەڵاڵی خۆی بێ. (بگەڕێوە بۆ پاشکۆی نوێژی جەژنەکان).

وَيُبَاحَانِ لفَصْدٍ وَحِجَامَةٍ وَعِلاَجٍ، قُلْتُ: وَيُبَاحُ النَّظَرُ لِمُعَامَلَةٍ وَشَهَادَةٍ وَتَعْلِيمٍ وَنَحْوِهَا بِقَدْرِالْحَاجَةِ وَاللّٰهُ أَعْلَمُ. وَلِلزَّوْجِ النَّظَرُ إِلَى كُلِّ بَدَنِهَا.

---

هەروەها لەبارەی تەماشا کردنی‌حەلاڵ دەفەرموێ: (وَيُبَاحَانِ) تەماشاکردن‌و دەست لێدانی ئافرەت‌و پیاوی نامەحرەم حەلاڵن (لِفَصْدٍ وَحِجَامَةٍ وَعِلاَجٍ) بۆ خوێن لێگرتن‌و چارەسەرکردنی بریندارو نەخۆش، واتە: دروستە: ئافرەت پیاو دەرمان بکا، پیاویش ئافرەت دەرمان بکا، بەڵام بەو مەرجەی مێرد، یان مەحرەمێك، یان ئافرەتێك لەگەڵ ئافرەتەکەدا بێ، هەم بەو مەرجەش پزیشکی ئافرەت بۆ ئەو جۆرە نەخۆشیەی ئافرەتەکە دەست نەکەوێ‌و پزیشکی پیاویش بۆ ئەو جۆرە نەخۆشیەی پیاوەکە دەست نەکەوێ، ئەگینا: دروست نیە.

هەروەها ئەگەر پزیشکەکە کافر بێ، مەرجە: پزیشکێکی موسوڵمان بۆ ئەو جۆرە نەخۆشیە دەست نەکەوێ، مەگەر پزیشکە کافرەکە لێزانتر بێ، ئەو کاتە دروستە: پزیشکە کافرەکە ئافرەتەکە دەرمان بکا، هەرچەند پزیشکێکی مێینەی موسوڵمانیش هەبێ کە نەگاتە پلەی کافرە لێزانەکە، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)و حاشیەکانیاندا فەرموویانە.

هەروەها ئەگەر بۆ چارەسەری ئافرەتەکە پزیشکێکی نێرینەی موسڵمان‌و پزیشکێکی مێینەی کافریش هەبوو، ئەو کاتە بۆ دەرمانکردنی ئافرەتەکە مێینەکافرەکە وەپێش دێخرێ، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.

(قُلْتُ) ئیمامی (النواوي) دەفەرموێ (وَيُبَاحُ النَّظَرُ لِمُعَامَلَةٍ) تەماشاکردنی ڕووی ئافرەت دروستە: بۆ کڕین‌و فرۆشتن‌و مامڵەکانی‌تر، هەم (وَشَهَادَةٍ) بۆ کردنە شاهیدو بۆ شاهیدی‌دان، هەم (وَتَعْلِيمٍ) بۆ فێرکردنی زانستی پێویست‌و کاروپیشەکانی پێویست، بەو مەرجەی ئافرەتەکەو پیاوەکە بە تەنها نەبن، هەم بەو مەرجەی لە پشت پەردەوە فێرکردنەکە نەگونجێ، هەم بەو مەرجە مامۆستایەکی‌مەحرەم، یان مامۆستایەکی لە ڕەگەزی‌خۆی دەست نەکەوێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

(وَنَحْوِهَا) هەم بۆ کارەکانی‌تریش کە وەکو ڕابردووەکانن: وەك قازی تەماشای ئافرەت بکا لە کاتی دادکردن‌و سوێندان، ئینجا ئەو تەماشاکردنانەی‌ڕابردووش (بِقَدْرِ الْحَاجَةِ وَاللّٰهُ أَعْلَمُ) بە ئەندازەی پێویستیەکە دروستەو زیاتر دروست نیە.

(وَلِلزَّوْجِ) بۆ مێردی‌ژنەکە دروستە: (النَّظَرُ إِلَى كُلِّ بَدَنِهَا) تەماشای گشت لاشەو ئەندامەکانی ژنەکەی بکا لە حاڵەتی زیندووەتی‌دا، هەوەها بۆ ژنەکەش دروستە: تەماشای گشت لاشەو ئەندامەکانی مێردەکەی بکا لە حاڵەتی زیندووەتی‌دا، بەڵام بۆ هەردووکیان حەرامە تەماشای عەورەتی یەکتری بکەن لە حاڵەتی‌مردووەتی‌دا، کەواتە: بۆ هەردووکیان دروستە:

به زیندوویی تەماشای ئەندامی جیماعی یەكتری بكەن و دەستیشی لێبدەن، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِحْفَظْ عَوْرَتَكَ إِلاَّ مِنْ زَوْجَتِكَ﴾ رواه اصحاب السنن بسند حسن، عەورەتی‌خۆت بپارێزە: كەس نەیبینێ و دەستی لێنەدا جگە لە ژنەكەی‌خۆت.

**پاشكۆ**: پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿اَلْعَيْنَانِ زِنَاهُمَا النَّظَرُ﴾ رواه الشيخان، زینای چاوەكان تەماشاكردنی حەرامە. ﴿وعن جرير: سَأَلْتُ النَّبِيَّﷺ عَنْ نَظَرِ الْفَجْأَةِ؟ فَقَالَ: إِصْرِفْ بَصَرَكَ﴾ رواه مسلم، پرسیارم لە پێغەمبەرﷺ كرد لەبارەی تەماشاكردنی كتوپڕ -كە بە ویستی‌خۆم نەبێ-؟ لە وەلامدا فەرمووی: چاوی خۆت لابدە. واتە: چونكە ئەگەر بەردەوام بی بە تاوان لە سەرت دەنوسرێ.

هەروەها حەرامە: دوو پیاوی‌ڕووت، یان دوو ئافرەتی‌ڕووت وێكڕا پاڵ بدەنەوە، هەرچەند باوك و كوڕ، یان دایك و كیژ، یان دوو خۆشك، یان دوو برا بن.

جا هەر كاتێك تەمەنی منداڵەكان گەیشتە دە ساڵان، واجبە: جێگەی‌خەوتنیان لێك جیا بكرێتەوە، هەروەك لە حەدیسەكەی‌نوێژدا پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی و، لە (باسی پەروەردەكرنی منداڵ)دا ڕوون كراوەتەوە.

هەروەها پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِيَّاكُمْ وَالدُّخولَ عَلَى النِّسَاءِ، فَقَالَ رَجُلٌ أَرَأَيْتَ الْحَمْوَ؟ قال: اَلْحَمْوُ اَلْمَوْتُ﴾ رواه الشيخان، ئاگادار بن بە تەنها مەچوونە لای ئافرەتانی نامەحرەم، پیاوێك گوتی: پێم بڵێ: ئەگەر خزمێكی‌مێردەكەی -وەك برای مێردەكەی، یان برازای، یان مامی، یان مامۆزا، یان خاڵ، یان خاڵۆزای- لەگەڵ ژنەكەی بە تەنها كۆ ببنەوە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: كۆبوونەوەی ژن بە تەنها لەگەڵ خزمێكی مێردەكەی وەكو مردنە. واتە: زیانی زۆرە و مەترسی بێناموسیی لێدەكرێ، چونكە لە ژێر پەردەی خزمایەتی‌دا دەتوانن گشت كارێكی بێناموسی ئەنجام بدەن.

ئیتر ئەی خوشك و برایانی موسوڵمان تەماشاكردنی‌حەرام تیرێكی ژەهراوییە لە تیرەكانی شەیتان: جەرگی مرۆڤ بریندار دەكا و ئایین و هۆشی تێك دەدا، هەروەها هەر پیاوێك و ئافرەتێكی نامەحرەمیش وێكڕا بە تەنها بن بێگومان شەیتان هاوڕێی سێیەمیانە، خوای‌گەورە بمانپارێزێ.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی خوازبێنی ﴾

پێشەكی بزانە: پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِذَا جَاءَكُمْ مَنْ تَرْضَوْنَ دِينَهُ وَخُلُقَهُ فَأَنْكِحُوهُ، إِلاَّ تَفْعَلُوهُ تَكُنْ فِتْنَةٌ فِي الأَرْضِ وَفَسَادٌ﴾ رواه الترمذي وحسنه، هەر كاتێك یەكێك هاتە لاتان بۆ خوازبێنیی ئافرەتێك و لە ئایین و ڕەووشتەكەشی ڕازی بون، ئافرەتەكەی لێمارەبكەن، ئەگەر لێی مارەنەكەن دەبێتە فیتنە و بێشەرعی.

(فَصْلٌ) تَحِلُّ خِطْبَةُ خَلِيَّةٍ عَنْ نِكَاحٍ وَعِدَّةٍ، لاَ تَصْرِيحٌ لِمُعْتَدَّةٍ وَلاَ تَعْرِيضٌ لِرَجْعِيَّةٍ، وَيَحِلُّ تَعْرِيضٌ فِي عِدَّةِوَفَاةٍ وَكَذَا لِبَائِنٍ فِيالأَظْهَرِ، وَتَحْرُمُ خِطْبَةٌ عَلَى خِطْبَةِ مَنْ صُرِّحَ بِإِجَابَتِهِ

---

(تَحِلُّ خِطْبَةُ خَلِيَّةٍ عَنْ نِكَاحٍ وَعِدَّةٍ) حەڵاڵە داخوازیکردنی ئافرەتێکی وەها: کە مارەبڕاو نەبێ‌و لە (عدّة)شدا نەبێ، واتە: بە (إجماع)ی زانایانی‌ئیسلام حەرامە: ژنی مارەبڕاو داخواز بکرێ، چونکە دڵی لە سەر مێردەکەی تێك دەچێ، جیاوازی نیە: بۆ مێردەکەی گوازرابێتەوە، یان نا، کەواتە: مارەکردنیشی دروست نابێ‌و جیماع لەگەڵکردنیشی زینایە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ مِنَّا مَنْ خَبَّبَ امْرَأَةً عَلَى زَوْجِهَا﴾ رواه أبوداود بسند صالح، ئەو کەسە لە ئوممەتی ئێمە نی‌یە کە دڵی ژنێك تێك بدا لە سەر مێردەکەی خۆی.

(لاَ تَصْرِيحٌ لِمُعْتَدَّةٍ) بە (إجماع) زانایانی‌ئیسلام دروست نیە: بە گوتەیەکی‌ئاشکرا داخوازی ئەو جۆرە ئافرەتە بکا: کە لە (عدّة)دایە: جا مێردی مردبێ، یان تەڵاقی دابێ، وەك پێی بڵێ: شووم پێ بکە. هەم (وَلاَ تَعْرِيضٌ لِرَجْعِيَّةٍ) بە بەڵگەی حەدیسەکەی‌رابردوو دروست نیە بە پێچەوپەنا داخوازی ئەو ئافرەتەش بکا: کە (رَجْعِيَّة)یە، واتە: تەڵاقێك، یان دوو تەڵاقی کەوتوەو بە یەکجاری لە مێردەکەی جیا نەبۆتەوە، چونکە تا لە (عدّة)دا بێ، هەر بە ژنی مێردەکەی دادەندرێ.

بەڵام (وَيَحِلُّ تَعْرِيضٌ) حەڵاڵە: بە پێچەوپەنا ئەو ئافرەتە داخوازیبکا: کە (فِي عِدَّةِ وَفَاةٍ)لە (عـدّة)ی مێردمردندایە (وَكَذَا لِبَائِنٍ) هەروەها پێچەوپەنا بۆ داخوازی ئەو ئافرەتەش دروستە کە (بائن)ە، واتە بە یەکجاری لە مێردەکەی جیا بۆتەوە: وەك سێ‌بەسێ تەڵاق درابێ (فِيالأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، وەك پێی بڵێ: تۆ ئافرەتێکی جوانی، زۆر کەس تەماع لە تۆ دەکا، تۆ بە بێ‌مێرد نامێنیتەوە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا عَرَّضْتُمْ بِهِ مِنْ خِطْبَةِالنِّسَاءِ﴾ هیچ گوناهێکتان لە سەر نیە لەو پێچەوپەنایەی لە داخوازی ژنان دەیکەن.

﴿ ئاگاداری ﴾: هەرچەند بە فەرموودەی‌بەهێزتر: بە پێچەوپەنا داخوازی ئەو دوو جۆرە ئافرەتانە دروست بوو: کە لە (عـدّة)دا بون، بەڵام بە (إجماع)ی زانایانی‌ئیسلام مارەبڕینی هیچێکیان دروست نابێ تا (عدّة)کەی تەواو دەبێ، خوای‌گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَعْزِمُوا عُقْدَةَالنِّكَاحِ حَتَّى يَبْلُغَ الْكِتَابُ أَجَلَهُ﴾ نەکەن لە (عدّة)دا ژن مارە ببڕن تا ئەو چاوەڕوانکردنەی خوا لە سەر ئافرەتی نووسیوە، دەگاتە کۆتایی‌خۆی. کەواتە: هەر ئافرەتێك (عدّة)ی تەواو نەبوبێ‌و مارە ببڕێ، ئەوە مارەبڕینەکەی دروست نابێ‌و جیماع لەگەڵکردنیشی زینایە.

(وَتَحْرُمُ خِطْبَةٌ عَلَى خِطْبَةِ مَنْ صُرِّحَ بِإِجَابَتِهِ) حەرامە داخوازی بە سەر داخوزیی ئەو کەسەدا کە بە ئاشکرایی وەڵامی دراوەتەوە، واتە: پێی گوتراوە داخوازیەکەت جێبەجێ دەکەین. یان کیژەکەمت دەدەمێ. یان شووت پێ دەکەم...هتد.

إلاَّ بإذْنه، فَإنْ لَمْ يُجَبْ وَلَمْ يُرَدَّ لَمْ تَحْرُمْ فِي الأَظْهَرِ، وَمَنْ اُسْتُشِيرَ فِي خَاطِبٍ ذَكَـرَ مَسَاوِيَهُ بِصِدْقٍ،

---

(إلاَّ بإذْنه) تەنها بە ئیزنی داخوازیکەرەکە دروستە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لاَيَخْطُبُ الرَّجُلُ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ حَتَّى يَتْرُكَ الْخَاطِبُ قَبْلَـهُ أَوْ يَـأْذَنَ﴾ رواه الشيخان، نابێ پیاوی موسوڵمان داخوازی بە سەر داخوازیی برایخۆیدا بکا، تا داخوازیکەرەکەی پێشـوی واز دێنێ، یان ئیزنی دەدا.

بەلام (فَإنْ لَمْ يُجَبْ) ئەگەر وەلامی داخوازیکەرەکە نەدرابۆوەو (وَلَمْ يُرَدَّ) ڕەدیش نەکرابۆوە، واتە: پێی نەگوترابو داخوازیەکەت جێبەجێ نابێ. ئەو کاتە (لَمْ تَحْرُمْ) داخوازیەکەی دووەمەکە حەرام نابێ (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا.

﴿ ئاگاداری ﴾: بۆ ئافرەتەکەو هەم بۆ سەرپەرشتکارەکەشی سوننەتە: داخوازی پیاوێکی ئایین پەروەرو ڕێزدار بکەن و هیچ شەرمیش لە ئەنجامدانی ئەو سوننەتە نەکەن ﴿عن ابن عمر رضي الله عنهما: عَرَضَ عُمَرُ حَفْصَةَ عَلَى عُثْمَانَ، فَقَالَ: لاَ أَتزَوَّجُ يَوْمِي هَذَا. ثُمَّ عَرَضَهَا عَلَى أَبِي بَكْرٍ فَصَمَتَ أَبُوبَكْرٍ، ثُمَّ خَطَبَهَا رَسُولُ اللهِﷺ فَأَنْكَحَهَا إيَّاهُ﴾ رواه البخاري، ئیمامی(عمر) بە ئیمامی(عثمان)ی گوت: وەرە (حَفْصَة)ی کیژی خۆمت لێ مارە بکەم. ئەویش گوتی: لەم کاتەدا من ژن ناهێنم. ئینجا بە ئیمامی(أبوبکر)ی گوت: وەرە (حَفْصَة)ی کیژی خۆمت لێمارەبکەم. ئەویش بێدەنگ بوو، ئینجا پێغەمبەرﷺ بۆ خۆی داخوازی (حَفْصَة)ی کردو ئیمامی(عمر) لە پێغەمبەریﷺ مارە کرد.

هەم ﴿وعن سهلﷺ: جَاءَتْ إمْرَأَةٌ تَعْرِضُ نَفْسَهَا عَلَى النَّبِيِّﷺ﴾ رواه الشيخان، ئافرەتێك هات خۆی پێشکەش بە پێغەمبەرﷺ کرد تاکو لەخۆی مارە بکا.

(وَمَنْ اُسْتُشِيرَ فِي خَاطِبٍ) هەر کەسێك پرس وڕای پێکرا لە بارەی داخوازیکەرێك، یان لەبارەی داخوازکراوێك: ئایا ئەو پیاوە، یان ئەو ئافرەتە چۆنە بۆ ژن و مێردایەتی کەڵکی هەیە، یان نا. ئەوە (ذَكَرَ مَسَاوِيَهُ بِصِدْقٍ) واجبە: بە ڕاستی بە ئەندازەی پێویست عەیبو خراپەکانی پیاوەکەو ئافرەتەکە باس بکا، بە مەبەستی ئامۆژگاری نەك غەیبەتکردن، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿اَلْمُسْتَشَارُ مُؤْتَمَنٌ﴾ رواه أصحاب السنن بسند حسن، ڕاوێژپێکراو بە ئەمیندار داندراوە، واتە: نابێ لە ئامۆژگاریدا خیانەت بکا.

ئینجا بزانە: ئەو بڕیارە تایبەت نیە تەنها بە ڕاوێژکاری ژن و مێرد، بەڵکو هەر کەسێك لە بارەی مامۆستایەك، یان خوێندکارێك، یان زانایەکی ئایینی، یان فرۆشیارێك، یان کڕیارێك، یان هاوبەشێك، یان هەر کەسێکیتر کە بیەوێ لە کارکردنێکدا لەگەڵیدا بێ، پرسی بە کەسێکیتر کرد، واجبە: پرس پێکراوکە بەگوێرەی پێویست عەیبو خراپەکانی بڵێ، چونکە ئامۆژگاری موسوڵمان واجبە، هەروەك لە زۆریەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

وَيُسْتَحَبُّ تَقْدِيمُ خُطْبَةٍ قَبْلَ الْخِطْبَةِ وَقَبْلَ الْعَقْدِ، وَلَوْ خَطَبَ الْوَلِيُّ فَقَالَ الزَّوْجُ: اَلْحَمْدُ لِلَّهِ وَالصَّلاَةُ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ قَبِلْتُ، صَحَّ النِّكَاحُ عَلَى الصَّحِيحِ، بَلْ يُسْتَحَبُّ ذَلِكَ، قُلْتُ: اَلصَّحِيحُ لاَ يُسْتَحَبُّ وَاللهُ أَعْلَمُ. فَإِنْ طَالَ الذِّكْرُ الْفَاصِلُ لَمْ يَصِحَّ.

---

## ﴿ چەند سوننەتێكی مارەبڕین و ژن هێنان ﴾

(وَيُسْتَحَبُّ) بۆ داخوازیكەرەكە، یان جێگرەكەی سوننەتە: (تَقْدِيمُ خُطْبَةٍ قَبْلَ الْخِطْبَةِ) پێش داخوازیكردنەكە ووتارێك بخوێنێتەوەو بڵێ: (اَلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ والصَّلاَةُ والسَّلاَمُ عَلَى سَيِّدِنَا مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِينَ، أُوصِيكُمْ بِتَقْوَى اللهِ وَطَاعَتِهِ إِنَّ اللهَ مَعَ الَّذِينَ اتَّقَوْا وَالَّذِينَ هُمْ مُحْسِنُونَ). ئینجا بڵێ: هاتومە بۆ خوازبێنی فلانە ئافرەتە ڕێزدارەی ئێوە: بۆ خۆم، یان بۆ فلانكەس.

(وَ) هەروەها ووتارێكیتریش سوننەتە: (قَبْلَ الْعَقْدِ) پێش مارەبڕینەكە بخوێندرێتەوە، جیاوازی نیە: سەرپەرشتكارەكە، یان مێردەكە، یان جێگرێكی ئەوان، یان بێگانەیەك بیخوێنێتەوە، جا گەورەترین ووتار، ئەم (خُطْبَةُ الْحَاجَةِ)یە كە پێغەمبەرﷺ فێری (صحابة)كانی كردوە:

﴿اَلْحَمْدُ لِلَّهِ نَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوذُ بِهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا، مَنْ يَهْدِ اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لاَإِلَهَ إِلاَّاللهُ وَحْدَهُ لاَشَرِيكَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، (يَا أَيُّهَاالنَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِى خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاءً وَاتَّقُوااللهَ الَّذِى تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً)، (يَا أَيُّهَاالَّذِينَ آمَنُوااتَّقُوااللهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلاَ تَمُوتُنَّ إِلاَّ وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ)، (يَا أَيُّهَاالَّذِينَ آمَنُوااتَّقُوااللهَ وَقُولُوا قَوْلاً سَدِيداً يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزاً عَظِيماً)﴾رواه أصحاب السنن بأسانيد صحيحة.

(وَلَوْ خَطَبَ الْوَلِيُّ) ئەگەر سەرپەرشتكاری ژنەكە ووتارەكەی خوێندەوە، ئینجا لە دوای ووتارەكە ووشەی مارەبڕینەكەی گوتو (فَقَالَ الزَّوْجُ) جا لە دوای ویش مێردەكە گوتی: (اَلْحَمْدُ لِلَّهِ وَالصَّلاَةُ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ). ئینجا گوتی: (قَبِلْتُ) مارەبڕینەكەم قبوڵ كرد. ئەوە (صَحَّ النِّكَاحُ) مارەبڕینەكە دروست دەبێ (عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست (بَلْ يُسْتَحَبُّ ذَلِكَ) بەڵكو ئەو ووتارە كورتە سوننەتیشە (قُلْتُ) ئیمامی (النواوي) دەفەرموێ: (اَلصَّحِيحُ لاَ يُسْتَحَبُّ) بە فەرموودەی ڕاست: ووتارەكە سوننەت نیە لە نێوان ووشەی سەرپەرشتكارەكەو مێردەكەدا بگوترێ (وَاللهُ أَعْلَمُ)، بەڵكو (فَإِنْ طَالَ الذِّكْرُ الْفَاصِلُ) ئەگەر ئەو زیكرو ووتارەی نێوان ووشەكەی سەرپەرشتكارەكەو مێردەكە درێژ بێ، ئەو كاتە (لَمْ يَصِحَّ) مارەبڕینەكەش دروست نابێ، كەوابو: سوننەتە هیچ زیكرێك لە نێوان ووشەكانیاندا نەگوترێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

## ﴿پاشکۆ: لەبارەی جیماع کردن﴾

سوننەتە: مارەبڕینو بە زاوابوونەکە لە مانگی (شوال)=شەشەڵاندا بێ، حەزرەتی(عائشة) دەفەرموێ: ﴿تَزَوَّجَنِي رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي شَوَّالٍ وَبَنَى بِي فِي شَوَّالٍ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ لە مانگی شەشەڵاندا لە خۆی مارە کردمو لە شەشەڵانیشدا لێم بووە زاوا.

هەروەها پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿أَعْلِنُوا هَذَاالنِّكَاحَ وَاجْعَلُوهُ فِي الْمَسَاجِدِ وَاضْرِبُوا عَلَيْهِ بِالدُّفُوفِ﴾ رواه أحمد والترمذي وحسنه، ئەم مارەبڕینە ئاشکرا بکەنو لە مزگەوتدا مارەبڕینەکە بکەنو دەف لێبدەن. کەواتە: دروستە سرودی حەڵاڵیش بگوترێن، ئینجا کە مارەبڕینەکە تەواو بوو، بۆ گشت کەسێك سوننەتە: پیرۆزبایی لە ژنەکەو لە مێردەکە بکاو بڵێ: ﴿بَارَكَ اللهُ لَكَ وَبَارَكَ عَلَيْكَ وَجَمَعَ بَيْنَكُمَا فِي خَيْرٍ﴾ رواه اصحاب السنن بسند صحيح، خوا لە یەکتریتان پیرۆز بکاو بە خێرو خۆشی لەگەڵ یەکتریتان کۆ بکاتەوە.

ئینجا کە زاوا دەچێتە شوێنی بە زاوابوون، سوننەتە: سەلام بکاو دوو ڕەکعەت بە نیەتی (سُنَّةُالزِّفَافِ)=سوننەتی بووکگواستنەوە بکا، ئینجا مووەکانی پێشەسەری ژنەکەی بە دەستە ڕاستەیخۆی بگرێو بڵێ: (بَارَكَ اللهُ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِنَّا فِي صَاحِبِهِ وَجَمَعَ بَيْنَنَا فِي خَيْرٍ) خوا لە یەکتریمان پیرۆز بکاو بە خێروخۆشی لە گەڵ یەکتریمان کۆ بکاتەوە.

ئینجا ئەم دوعایە بکا: ﴿اَللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ خَيْرَهَا وَخَيْرَ مَاجَبَلْتَهَا عَلَيْهِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا وَشَرِّ مَاجَبَلْتَهَا عَلَيْهِ﴾ رواه أبوداود بإسناد حسن.

ئینجا هەر جارێك ویستیان جیماع بکەن سوننەتە: هەردووکیان خۆیان بۆنخۆش بکەنو جلو بەرگی جوان دەبەر بکەنو یەکتری ماچ بکەن، بەڵکو دروستە مێردەکە دەرمانی بەهێزبوون بۆ جیماعکردن بەکار بێنێ بەو مەرجەی زیانی پێ نەگەیەنێ.

ئینجا هەر کاتێك ویستیان دەست بە جیماع بکەن بۆ هەردووکیان سوننەتە بڵێن: ﴿بِسْمِ اللهِ، اَللَّهُمَّ جَنِّبْنَاالشَّيْطَانَ وَجَنِّبِ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا﴾ رواه الشيخان، (بِسْمِ اللهِ)، خوایە لە شەیتانمان بپارێزەو ئەومنداڵەی دەماندەیێ ئەویش لە شەیتان بپارێزە. پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ئەگەر ئەو دوعایە بکەنو منداڵێکیان لەم جیماعە ببێ، شەیتان زیانی لێ نادا.

جا ئەگەر پیاوەکە پێشدا ئاوی هاتو ڕەحەت بوو، وەها سوننەتە: هەڵنەستێ، بەڵکو مۆڵەت بدا تا ژنەکەشی ئاوی دێو ڕەحەت دەبێ.

ئینجا بزانە: دروستە ژنو مێرد بە گشت ئەندامێکییەکتری لەزەت وەربگرن، بەڵکو دروستە: ئەندامی جیماعکردنی یەکتریش بمژن، بەڵکو دوروستە مێردەکە لە لای پشتەوەی ژنەکەش لەزەت وەربگرێ بەو مەرجەی ئەندامەکەی دەناو کونەکە نەنێ، چونکە دەناونانی کونی پشتەوە حەرامە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿مَلْعُونٌ مَنْ أَتَى

(فَصْلٌ) إِنَّمَا يَصِحُّ النِّكَاحُ بِإِيجَابٍ: وَهُوَ زَوَّجْتُكَ أَوْ أَنْكَحْتُكَ. وَقَبُـولٍ: بِـأَنْ يَقُـولَ الزَّوْجُ: تَزَوَّجْتُ، أَوْ نَكَحْتُ،

---

إِمْرَأَةً فِي دُبُرِهَا﴾رواه أصحاب السنن بسند صالح، بەرلەعنەتکراوە ئەو کەسەی لە کونی پشتەوەدا جیماع لەگەڵ ژن دەکا.

هەروەها حەرامە: ڕوداوی جیماعکردنیان بۆ خەڵك باس بکەن، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ أَشَرَّالنَّاسِ عِنْدَاللهِ مَنْزِلَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ: اَلرَّجُلُ يُفْضِي إِلَىامْرَأَتِهِ وَتُفْضِي إِلَيْـهِ ثُـمَّ يَنْشُـرُ سِرَّهَا﴾ رواه مسلم، خراپترین کەس لە لای خوایگەورە ئەو ژنو مێردەنە: کە جیماع دەکەن نهێنی یەکتری بڵاو دەکەنەوە.

بیسان بزانە: هەر کاتێك پیاو چاوی بە ئافرەتێکی بیگانە کەوتو دڵی گرت، وەها سوننەتە: بڕواتەوە جیماع لەگەڵ ژنەکەی خۆی بکا تاکو لەبیری بچێتەوە. ئینجا پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِذَا دَعَاالرَّجُلُ إِمْرَأَتَهُ إِلَى فِرَاشِهِ فَأَبَتْ أَنْ تَجِيءَ لَعَنَتْهَاالْمَلاَئِكَـةُ حَتَّى تُصْبِحَ﴾رواه الشيخان، هەرکاتێك پیاو داوای جیماعی لە ژنەکەی کردو ژنەکەش بە بێعوزر خۆی لێقەدەغەکرد، ئەوە تا بەیانی مەلائیکە لەعنەتی لێدەکەن.

هەروەها سوننەتە: لە شەوی هەینی، یان لە ڕۆژی هەینی پێش ڕۆیشتن بۆ جومعە جیماع بکا، جا بزانە: ناوەڕۆکی ئەم پاشکۆیە لە (تحفة)و (نهاية)و حاشیەکانیانو لە (إعانة) وەرگیراوە، هەروەها باسی خۆڕەحەتکردنو چەند باسێکیتری جیماعیش لە باسی (حەیض)دا بە درێژی ڕوون کرانەوە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی ڕوکنەکانی ژن مارەکردن ﴾

مارەکردنی ژن لەم پێنج ڕوکنانە پێك دێ: (اَلصِّيغَةُ) گفتوگۆی مارەبڕین. (اَلشَّاهِدَانِ) دوو شاهید. (اَلْوَلِيّ) سەرپەرشتکاری ژنەکە. (اَلزَّوْج) مێردەکە. (اَلزَّوْجَة) ژنەکە.

ئینجا بزانە: مەرجە لە دانیشگەی مارەبڕینەکەدا چوار کەس ئامادە بن: یەکێکیان (وَلِي) سەرپەرشتکاریژنەکە، یان وەکیلەکەی. یەکێکیان (زَوْج) مێردەکە، یان وەکیلەکەی. دووانیان دوو شاهیدەکە، تاکو گوێ لە گفتوگۆی سەرپەرشتکارەکەو مێردەکە ڕابگرن.

**ڕوکنییەکەم:** گفتوگۆ، (إِنَّمَا يَصِحُّ النِّكَاحُ بِإِيجَابٍ) مارەبڕین دروست نابێ تەنها بە گوتەی کردنە ژن نەبێ (وَهُوَ) گوتەی کردنە ژن ئەوەیە سەرپەرشتکاری ژنەکە بڵێتە مێردەکە: (زَوَّجْتُكَ) فلانە کیژیخۆم جووت کرد لەگەڵ تۆ. (أَوْ) یان بڵێ: (أَنْكَحْتُكَ) فلانە خوشکیخۆم کردە ژنی تۆ.

(وَقَبُولٍ) هەم لەگەڵ گوتەی قبولکردنیش (بِأَنْ يَقُولَ الزَّوْجُ) وەك مێردەکە یەکسەر بە دوای گوتەی سەرپەرشکارەکەدا بڵێ: (تَزَوَّجْتُ) فلانە کیژیتۆم کردە جووت لەگەڵ خۆم. (أَوْ) یان بڵێ: (نَكَحْتُ) فلانە خوشکیتۆم کردە ژنی خۆم.

أَوْ قَبِلْتُ نِكَاحَهَا أَوْ تَزْوِيجَهَا. وَيَصِحُّ تَقَدُّمُ لَفْظِ الزَّوْجِ عَلَى الْوَلِيِّ، وَلاَ يَصِحُّ إلاَّ بِلَفْظِ التَّزْوِيجِ أَوِ الإِنْكَاحِ، وَيَصِحُّ بِالْعَجَمِيَّةِ فِي الأَصَحِّ، لاَ بِكِنَايَةٍ قَطْعًا،

---

(أَوْ) یان بڵێ: (قَبِلْتُ نِكَاحَهَا) قبوڵم كرد فلانە كیژیتۆ بە ژن بۆ خۆم. (أَوْ) یان بڵێ: (تَزْوِيجَهَا) قبوڵم كرد فلانە كیژی تۆ بە جووت لەگەڵ خۆم. واتە: بە تەنها ووشەی (قبوڵم كرد). مارەبڕینەكە دروست نابێ.

هەروەها ئەگەر بێدەنگبوونێكی درێژ، یان قسەیەكیبیگانە -كە پەیوەندی بە مارەبڕینەوە نەبێ- بكەوێتە نێوان گوتەی (وَلی)و مێردەكە، ئەو كاتەش مارەبڕینەكە دروست نابێ، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

(وَيَصِحُّ تَقَدُّمُ لَفْظِ الزَّوْجِ عَلَى الْوَلِيِّ) دروستە گوتەیمێردەكە وەپێش گوتەیسەرپەرشتكارەكە بكەوێ، وەك بڵێ: فلانە كیژەتم قبوڵ كرد بە ژنی خۆم. ئینجا سەرپەرشتكارەكەش بڵێ: فلانەكیژەی خۆم كردە ژنی تۆ.

(وَلاَ يَصِحُّ) مارەبڕینیژن دروست نابێ (إلاَّ بِلَفْظِ التَّزْوِيجِ أَوِ الإِنْكَاحِ) تەنها بە ووشەی لەگەڵ جووتكردن، یان كردنە ژن نەبێ، چونكە لە قورئانی پیرۆزدا تەنها (تَزْوِيج)و (إنْكَاح) هاتون، پێغەمبەریشﷺ دەفەرموێ: ﴿إتَّقُوا اللهَ فِي النِّسَاءِ فَإِنَّكُمْ أَخَذْتُمُوهُنَّ بِأَمَانَةِ اللهِ وَاسْتَحْلَلْتُمْ فُرُوجَهُنَّ بِكَلِمَةِ اللهِ﴾ رواه مسلم، لە خوا بترسن لەبارەی ژنەكانتان، چونكە بە ئەمینداریەتی خوایگەورە ئەوانتان وەرگرتونو بە ووشەی خوایگەورە داوێنی ئەوانتان لەخۆتان حەڵاڵ كردوە.

كەواتە: ئەگەر ووشەكانیمارەبڕینەكە نەگوترێن، ئەوە مارەبڕینەكە دروست نابێ، هەروەها بە ووشەی فرۆشتنو بەخشینو پێشكەشو دامە تۆ. مارەبڕینەكە دروست نابێ.

بەلام (وَيَصِحُّ بِالْعَجَمِيَّةِ فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا: بە زمانەكانیتری جگە لە عەرەبیش مارەبڕین دروست دەبێ، بەو مەرجەی ووشەكە -لەو زمانەدا- بە ئاشكرایی هەمان واتەی (إنْكَاح)، یان (تَزْوِيج) بگەیەنێ، هەروەك تازە بە كوردی ڕوونمان كردەوە.

كەوابو: بە ووشەی مارەكردن مارەبڕینەكە دروست نابێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهایة) لە (شرح)ی (قَبِلْتُ نِكَاحَهَا) ڕوون كراوەتەوە (لاَ بِكِنَايَةٍ) هەم بە گوتەیناشكرا مارەبڕین دروست نابێ، وەك بڵێ: كیژەكەم لە تۆ حەڵاڵ كرد (قَطْعًا) بە فەرموودەیەكی بڕاوەوە.

﴿ئاگاداری﴾: مارەبڕین بە نووسین دروست نابێ، هەرچەند مێردەكەو سەرپەرشتكارەكەش وێكڕا لە یەك شوێندا نەبن، هەروەك لە (مغنی)و (الشرواني)دا فەرموویانە.

بەلام دروستە: پیاوی لاڵ بە ئاماژەیەكیتێگەیەنەر ژن لەخۆی مارە بكاو هەم لە كەسێكیتریش مارەیبكا، جا ئەگەر كەس لە ئاماژەكەی تێنەدەگەیشت، ئەو كاتە دەبێ

وَلَوْ قَالَ: زَوَّجْتُكَ. فَقَالَ: قَبِلْتُ. لَمْ يَنْعَقِدْ عَلَى الْمَذْهَبِ، وَلَوْ قَالَ: زَوِّجْنِي. فَقَالَ: زَوَّجْتُكَ. أَوْ قَالَ الْوَلِيُّ: تَزَوَّجْهَا. فَقَالَ: تَزَوَّجْتُ. صَحَّ، وَلاَ يَصِحُّ تَعْلِيقُهُ، وَلَوْ بُشِّرَ بِوَلَدٍ فَقَالَ: إِنْ كَانَ أُنْثَى فَقَدْ زَوَّجْتُكَهَا. أَوْ قَالَ:

---

به ئاماژه، یان به نووسین کەسێك بکاتە وەکیل: تاکو ژنی لێ مارە بکا، یان کیژەکەی لە کەسێك مارە بکا، جا ئەگەر هیچ وەکیلێکی دەست نەکەوتو کەسیش لە ئاماژەکەی تێنەدەگەیشت، ئەو کاتە لە بەر ناچاری مارەبڕینەکەی بە نووسین دروست دەبێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهایة)و حاشیەکانیاندا ڕوون کراوەتەوە.

ئینجا بزانە: چۆنیەتی مارەبڕینی وەکیل لە (باسی ڕێگرەکانی سەرپەرشتکاریەتی)دا ڕوون دەکەینەوە، إن شاء الله تعالى.

(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر سەرپەرشتکارەکە گوتی: (زَوَّجْتُكَ) فلانە کیژیخۆم کردە جووت لەگەڵ تۆ.(فَقَالَ) مێردەکەش یەکسەر گوتی: (قَبِلْتُ) قبوڵم کرد. واتە لەمە زیاتری نەگوت (لَمْ يَنْعَقِدْ) مارەکردنەکە دانامەزرێو دروست نابێ (عَلَى الْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب، چونکە لە لای مێردەکەوە ووشەی (إنکاح)و (تزویج)و واتەکەیان نەگوتراوە.

بەڵام (وَلَوْ قَالَ) ئەگەر پێشدا مێردەکە گوتی (زَوِّجْنِي) کیژەکەت بکە جووت لەگەڵم (فَقَالَ) ئینجا باوکەکەش گوتی (زَوَّجْتُكَ) کیژەکەم کردە جووت لەگەڵت (أَوْ قَالَ الْوَلِيُّ) یان سەرپەرشتکارەکە گوتی (تَزَوَّجْهَا) کیژەکەم بکە جووت لەگەڵ خۆت (فَقَالَ) مێردەکەش گوتی (تَزَوَّجْتُ) کردمە جووت لەگەڵ خۆم. ئەوە (صَحَّ) مارەبڕینەکە دروست دەبێ، چونکە داواکردنەکە نیشانەی ڕازیبوونەو لە هەردوو لایەوەش ووشەکان بە دروستی گوتراونو وەپێشکەوتنی ووشەی مێردەکەش دروستە، هەروەك ڕابرا.

ئینجا بزانە: لە گشت ئەو حاڵەتانەیڕابردوودا ئەگەر ووشەکانی مارەکردنو قبوڵکردن–لە لای دوو شاهید– بە گاڵتەش بگوترێن، مارەبڕینەکە هەر دروست دەبێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهایة)دا فەرموویانە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿ثَلاَثٌ جِدُّهُنَّ جِدٌّ وَهَزْلُهُنَّ جِدٌّ: اَلنِّكَاحُ وَالطَّلاَقُ وَالرَّجْعَةُ﴾ رواه أبوداود والترمذي وصححه الحاكم، سێ شت هەنە ڕاستییان هەر ڕاستییە، گاڵتە پێکردنیشیان هەر ڕاستییە: ژن مارەکردن، ژن تەڵاقدان، تەڵاق چاککردنەوە.

(وَلاَ يَصِحُّ تَعْلِيقُهُ) دروست نیە: هەڵواسینی مارەبڕین بە کاتێکەوە، یان بە مەرجێکەوە، وەك بڵێ: هەرکاتێك ڕۆژ هەڵات دامە تۆ بە ژنایەتی. هەم (وَلَوْ بُشِّرَ بِوَلَدٍ) ئەگەر مژدەی درایێ کە منداڵێکی بووە (فَقَالَ) ئەویش گوتیە پیاوێك: (إِنْ كَانَ أُنْثَى فَقَدْ زَوَّجْتُكَهَا) ئەگەر منداڵەکە کیژ بێ، ئەوە لەگەڵ تۆم جووت کرد. پیاوەکەش قبوڵی کرد (أَوْ قَالَ)

إنْ كَانَتْ بِنْتِي طُلِّقَتْ وَاعْتَدَّتْ فَقَدْ زَوَّجْتُكَهَا. فَالْمَذْهَبُ بُطْلاَنُهُ، وَلاَ تَوْقِيتُهُ، وَلاَ نِكَاحُ الشِّغَارِ: وَهُوَ زَوَّجْتُكَهَا عَلَى أَنْ تُزَوِّجَنِي بِنْتَكَ وَبُضْعُ كُلِّ وَاحِدَةٍ صَدَاقُ الأُخْرَى.

---

یان باوکێك گوتی: (إنْ كَانَتْ بِنْتِي طُلِّقَتْ وَاعْتَدَّتْ فَقَدْ زَوَّجْتُكَهَا) ئەگەر کیژەکەم تەلاق درابێ‌و (عِدَّة)ی تەواو بوبێ، ئەوە لەگەڵ تۆم جووت کرد. پیاوەکەش قبوڵی کرد، ئەوە (فَالْمَذْهَبُ بُطْلاَنُهُ) بە فەرموودەی ڕاستیمەزهەب لە هەر سێك مەسەلەکەدا مارەبڕینەکە بەتاڵەو دروست نیە، چونکە هەڵواسینی تێدایە.

بەڵام ئەگەر موژدەی بدرێتێ کە کیژێکی بووە، ئەویش باوەڕی کرد، ئینجا گوتی ئەگەر موژدەدەرەکە ڕاست بکا، ئەوە کیژەکەم لەگەڵ تۆ جووت کرد، ئەو کاتە مارەبڕینەکە دروست دەبێ، هەروەك لەزۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

## ﴿ ژن هێنانی بە (الْمُتْعَة) تا ماوەیەك ﴾

(وَلاَ تَوْقِيتُهُ)دروست نیە: مارەبڕینی ژن تا ماوەیەکی زاندراو، یان نەزاندراو، واتە: مارەبڕینەکە بەتاڵە، جا ئەگەر بە (وَلِي)و دوو شاهید مارەبڕینەکەی کردبێ، ئەوە مارەیی ژنەکەی لە سەر واجب دەبێ‌و هەر منداڵێکیش لەو ژن هێنانە پەیدا ببێ دەبێتە منداڵی خۆی‌و سزای زیناشی ناکەوێتە سەر، هەروەك لە (الشروانى)دا ڕوون کراوەتەوە، واتە: بەڵام میرات لە یەکتری ناگرن، چونکە مارەبڕینەکە دروست نەبووە ﴿عن سبرةﷺ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِﷺ قَائماً بَيْنَ الرُّكْنِ وَالْبَابِ وَهُوَ يَقُولُ: يَا أَيُّهَاالنَّاسُ إِنِّي قَدْ كُنْتُ أَذِنْتُ لَكُمْ فِي الإستِمْتَاعِ مِنَ النِّسَاءِ، وَإِنَّ اللهَ حَرَّمَ ذَلِكَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، فَمَنْ كَانَ عِنْدَهُ مِنْهُنَّ شَيْءٌ فَلْيُخَلِّ سَبِيلَهَا، وَلاَ تَأْخُذُوا مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئاً﴾ رواه مسلم وأبوداود والنسائي، لە (حَجَّةُ الْوِدَاع)دا پێغەمبەرﷺ لە نێوان قوڕنەی (حَجَرالأَسْوَد)و دەرگەی (كَعْبَة)دا ڕاوەستابو و دەیفەرموو: هۆ خەڵکینە لە مەوپێش ئیزنم دابو بە (مُتْعَة) بۆ ماوەیەك ژن بهێنن، ئێستاش خوایگەورە ئەو جۆرە ژن هێنانەی بە یەکجاری حەرام کرد تا دونیا وێران دەبێ حەڵاڵ نابێتەوە، جا هەر کەسێك ئافرەتێکی لەو جۆرە ئافرەتانەی لە لایە با وازی لێبێنێ‌و هەر شتێکیشی داوەتێ نابێ لێی بستێنێتەوە.

واتە: ئەو جۆرە ژن هێنانە لە سەرەتای ئیسلامدا بە هۆی ناچاری حەڵاڵ بوو، ئینجا لە (حَجَّةُ الْوِدَاع)دا بە یەکجاری حەرام کرا.

## ﴿ ژن بە ژنەی نادروست ﴾

(وَ) هەروەها ﴿لاَ نِكَاحُ الشِّغَارِ﴾رواه مسلم، ژن بە ژنەی بێ‌مارەییش دروست نابێ (وَهُوَ) ئەو (نِكاح الشِّغار)ەی قەدەغە کراوە، ئەوەیە سەرپەرشتکارەکە بڵێ: ﴿زَوَّجْتُكَهَا عَلَى أَنْ تُزَوِّجَنِي بِنْتَكَ وَبُضْعُ كُلِّ وَاحِدَةٍ صَدَاقُ الأُخْرَى﴾ رواه الشيخان، کیژەکەی خۆم لەگەڵ

فَيقْبَلُ، فَإِنْ لَمْ يُجْعَلِ الْبُضْعُ صَدَاقًا فَالأَصَحُّ الصِّحَّةُ، وَلَوْ سَمَّيَا مَالاً مَعَ جَعْلِ الْبُضْعِ صَدَاقًا بَطَلَ فِي الأَصَحِّ، وَلاَ يَصِحُّ إِلاَّ بِحَضْرَةِ شَاهِدَيْنِ،

---

تۆ جووت كرد له سەر ئەو مەرجەی تۆش كیژەكەت لەگەڵ من جووت بكەی‌و داميّنی هەر كیژێكیش مارەیی كیژەكەی‌تر بێ (فَيقْبَلُ) جا مێردەكەش قبوڵ بكا.

جا هۆی دروست نەبوونەكەش ئەوەیە: دامێنی هەر ئافرەتێكیان دەبێتە هاوبەش لە نێوان مێردەكەو ئافرەتەكەی‌تر، ئەوەش ناگونجێ، كەوابو: (فَإِنْ لَمْ يُجْعَلِ الْبُضْعُ صَدَاقًا) ئەگەر دامێنەكە نەكرێتە مارەیی‌و هیچ مارەیی‌تریش دانەندرێ، ئەوە (فَالأَصَحُّ الصِّحَّةُ) بە فەرموودەی ڕاستتر: مارەبڕینەكەی هەردوو ئافرەتەكان دروست دەبێ‌و بۆ هەر یەكێكیشیان (مَهْرُالمثل)، واتە: مارەیی هاووێنە لە سەر مێردەكەی واجب دەبێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

بەڵام (وَلَوْ سَمَّيَا مَالاً مَعَ جَعْلِ الْبُضْعِ صَدَاقًا) ئەگەر بۆ هەر ئافرەتێك هەندێك ماڵ لەگەڵ دامێنی ئافرەتەكەی‌تر وێكڕا كردنیانە مارەیی، ئەوە (بَطَلَ فِي الأَصَحِّ) مارەبڕینەكە بەتاڵ دەبێ لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونكە هاوبەشیەكەی‌ڕابردووی تێدایە.

جا ئەوەش وا دەگەیەنێ: ئەگەر بۆ هەر ئافرەتێكیان مارەییەكی سەربەخۆ دابندرێ‌و باسی دامێنەكە نەكرێ، ئەو كاتە مارەبڕینەكەی هەردووكیان دروست دەبێ، وەك ئەو ژن بە ژنەی كوردەواریش ئەوهایە.

**ئامۆژگاری**: ئەی موسوڵمانی ڕێزدار، هەر چەند ژن بەژنە‌ـبەو شێوەی ڕابرا‌ـ حەلاڵە، بەڵام لە كۆمەڵگەی‌ئێستادا كارێكی ناپەسندە، چونكە بە زۆری وا ڕوودەدا: ئەگەر لایەنێك ناكۆك بن‌و بە یەكەوە نەگونجێن، ئەو ناكۆكیە كار دەكاتە سەر لایەنەكەی‌تریش‌و وای لێدێ شیرازەی هەر دوو خێزانەكان تێك دەچێ، ڕاستە: ژن بەژنە ئەركی ژن هێنان كەم دەكاتەوە، بەڵام ئەگەر بە فەرمانەكانی‌پێغەمبەرﷺ ڕەفتار بكەین‌و مارەیی كەم دابنێین‌و لە سەر بنچینەی ئایین ژن بهێنین‌و كیژ بە شوو بدەین، ئەو كاتەش ئەركی ژن هێنان كەم دەبێتەوەو بارەكە لە سەر شانی لاوەكانمان سوكتر دەبێ.

## ﴿ شاهیدەكانی مارەبڕین ﴾

**ڕوكنی‌دووەم**: شاهیدەكان (وَلاَ يَصِحُّ إِلاَّ بِحَضْرَةِ شَاهِدَيْنِ) مارەبڕین دروست نابێ تەنها بە ئامادەبوونی دوو شاهید نەبێ: لە دانیشتگەی مارەبڕینەكەدا، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لاَنِكَاحَ إِلاَّ بِوَلِيٍّ وَشَاهِدَيْ عَدْلٍ، وَمَا كَانَ مِنْ نِكَاحٍ عَلَى غَيْرِ ذَلِكَ فَهُوَ بَاطِلٌ﴾ حديث صحيح رواه ابن حبان، هیچ مارەبڕینێك دروست نابێ تەنها بە سەرپەرشتكارێك‌و دوو شاهیدی دادپەروەر نەبێ، هەر مارەبڕینێك بێ‌سەرپەرشتكارو دوو شاهید بێ، ئەوە بەتاڵە.

وَشَرْطُهُمَا: حُرِّيَّةٌ وَذُكُورَةٌ وَعَدَالَةٌ وَسَمْعٌ وَبَصَرٌ، وَفِي الأَعْمَى وَجْهٌ، وَالأَصَحُّ انْعِقَادُهُ بِابْنَي الزَّوْجَيْنِ وَعَدُوَّيْهِمَا، وَيَنْعَقِدُ بِمَسْتُورَيِ الْعَدَالَةِ عَلَى الصَّحِيحِ، لاَ مَسْتُورِ الإِسْلاَمِ وَالْحُرِّيَّةِ،

---

(وَشَرْطُهُمَا) مەرجی هەردووشاهیدەکان: (حُرِّيَّةٌ) دەبی ئازاد بن کۆیلە نەبن (وَذُكُورَةٌ) پیاو بن‌و بالغ‌و عاقڵ بن، ئافرەت‌و منداڵ‌و شێت نەبن (وَعَدَالَةٌ) دادپەروەرین‌و فاسق نەبن.

(وَ) هەروەها مەرجە: (سَمْعٌ وَبَصَرٌ) شاهیدەکان ببیسن‌و لە زمانی (ولي)و مێردەکە تێبگەن‌و هەم ببینن، بەڵام (وَفِي الأَعْمَى وَجْهٌ) لەبارەی کوێر فەرموودەیەکی بێهێزەیە: کە دروستە ببێتە شاهێد، واتە: بە فەرموودەی راستتر دروست نیە کوێر ببێتە شاهید، هەرچەند ژن ومێردەکەش بناسێ، هەروەك ئەگەر لە تاریکاییەکی بەهێزیشدا بێ دروست نیە چاوساغ ببێتە شاهید، هەروك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

ئینجا بزانە: لە مەزهەبی ئیمام (أبي‌حنيفة)دا دروستە: هەردوو شاهیدەکان (فاسق) بن، هەم دروستە: هەردووکیان کوێر بن، هەم دروستە: پیاوێك‌و دوو ئافرەتیش ببنە شاهیدی مارەبڕینەکە، هەرەوك لە (مجمع الانهر)دا فەرموویەتی، کەوابو: لە حاڵەتی پێویستی‌دا دروستە: لە هەرسێك مەسەلەدا (تقلید)ی مەزهەبی(حنفی) بکرێ.

﴿ئاگاداری﴾: مەرجە لە دانیشگەی مارەبڕینەکەدا هەردوو شاهیدەکان ژنەکەو مێردەکە ببینن، یان بە ناو و نەژادا بیانناسن، هەروەك لە (تحفة)دا ڕوون کراوەتەوە.

هەروەها دروست نیە خودی سەرپەرشتکارێکی‌دیارکراویش ببێتە شاهید، واتە: وەك باوکەکە، یان تاکە برایەکە، یان تاکە مامەکە، یەکێك بکاتە وەکیل بۆمارەبڕینەکەو بە خۆیشی ببێتە شاهید، بەڵام ئەگەر لە سێ برایان یەکێکیان ببێتە سەر پەرشتکارو دووانیشیان ببنە شاهید، ئەو کاتە دروست دەبێ، چونکە تەنها دوو برایەکە دیارکراو نین بۆ سەرپەرشکاریەتی، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

کەوابو: (وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی راستتر: (انْعِقَادُهُ بِابْنَي الزَّوْجَيْنِ) مارەبرینەکە دادەمەزرێ بە شاهیدی دوو کوڕی ژن‌و مێردەکە، یان دوو کوڕی تەنها یەکێکیان، یان بە هەردوو باپیرەی ژن‌و مێردەکە، یان بە براو باوکی مێردەکە، هەم (وَعَدُوَّيْهِمَا) بە شاهیدی دوو دوژمنی ژن‌و مێردەکە (وَ) هەروەها (يَنْعَقِدُ بِمَسْتُورَيِ الْعَدَالَةِ) مارەبڕینەکە دادەمەزرێ بە دوو شاهیدی وەها: کە دادپەروەریەکەیان داپۆشراو بێ‌و هیچ فاسقییان نەزاندرابێ (عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست (لاَ مَسْتُورِ الإِسْلاَمِ وَالْحُرِّيَّةِ) نەك بە دوو شاهیدی وەها: کە ئیسلامیەتی، یان ئازادیەتییان داپۆشراو بێ‌و نەزاندرێ: ئایا موسوڵمانن، یان ئازادن، یان نا.

وَلَوْ بَانَ فِسْقُ الشَّاهِدَيْنِ عِنْدَالْعَقْدِ فَبَاطِلٌ عَلَى الْمَذْهَبِ، وَإِنَّمَا يَبِينُ بِبَيِّنَةٍ أَوْ اتِّفَاقِ الزَّوْجَيْنِ، وَلاَ أَثَرَ لِقَوْلِ الشَّاهِدَيْنِ: كُنَّا فَاسِقَيْنِ. وَلَوْ اعْتَرَفَ بِهِ الزَّوْجُ وَأَنْكَرَتْ فُرِّقَ بَيْنَهُمَا وَعَلَيْهِ نِصْفُ الْمَهْرِ إِنْ لَمْ يَدْخُلْ بِهَا وَإِلاَّ فَكُلُّهُ، وَيُسْتَحَبُّ الإِشْهَادُ عَلَى رِضَاالْمَرْأَةِ حَيْثُ يُعْتَبَرُ رِضَاهَا وَلاَ يُشْتَرَطُ.

---

(وَلَوْ بَانَ فِسْقُ الشَّاهِدَيْنِ عِنْدَ الْعَقْدِ) ئەگەر ئاشكرابو: لە كاتی مارەبڕینەكەدا هەردوو شاهیدەكان (فاسق) بونو (تَقْلِيد)شیان نەكردبو، ئەوە (فَبَاطِلٌ عَلَى الْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب مارەبڕینەكە بەتاڵە، بەلام ئەگەر گشتیان (تَقْلِيد)ی ئەو زانایانەیان كردبو: كە ڕێگەیان داوە بە شاهیدو (وَلِي)یفاسق ژن مارە بكرێ. ئەو كاتە بەتاڵ نابێو مارەبڕینەكە دروست بووە، هەروەك لە (فصل)یداهاتوودا ڕوونی دەكەینەوە،إن شاءالله تعالى (وَإِنَّمَا يَبِينُ بِبَيِّنَةٍ أَوْ اتِّفَاقِ الزَّوْجَيْنِ) فاسقیی شاهیدەكانیش تەنها بە دوو شاهید، یان بە ڕێككەوتنی ژنو مێردەكە ئاشكرا دەبێ، كەواتە: (وَلاَ أَثَرَ لِقَوْلِ الشَّاهِدَيْنِ: كُنَّا فَاسِقَيْنِ) ئەگەر شاهیدەكان بڵێن: لە كاتی مارەبڕینەكەدا ئێمە فاسق بوین، ئەوە هیچ كار لە مارەبڕینەكە ناكا.

(وَلَوْ اعْتَرَفَ بِهِ الزَّوْجُ) ئەگەر مێردەكە دانیپنا: كە هەردوو شاهیدەكان فاسق بون، بەلام (وَأَنْكَرَتْ) ژنەكەش گوتی: ڕاست ناكا، ئەوە ئەگەر لە كاتیمارەبڕینەكەدا (تقليد) نەكرابێ (فُرِّقَ بَيْنَهُمَا) واجبە: ژنەكەو مێردەكە لێك جیا بكرێنەوە، هەم (وَعَلَيْهِ نِصْفُ الْمَهْرِ إِنْ لَمْ يَدْخُلْ بِهَا) لە سەر مێردەكەش واجبە نیوەی مارەییەكە بداتە ژنەكە ئەگەر جیماعی لەگەڵ نەكردبێ (وَإِلاَّ فَكُلُّهُ) بەلام ئەگەر جیماعی لەگەڵ كردبێ، ئەو كاتە واجبە: هەموو مارەییەكەی بداتێ.

(وَيُسْتَحَبُّ الإِشْهَادُ عَلَى رِضَاالْمَرْأَةِ) سوننەتە لە سەر ڕازیبوونیژنەكەش شاهید بگیرێ، واتە: لە لای دوو شاهید بڵێ: من ڕازییمە، یان ئێزنم دا مارەم بكا (حَيْثُ يُعْتَبَرُ رِضَاهَا) لەو حاڵەتەی كە ڕازیبوونی پێویست بێ: وەك بێوەژن بێ، یان باوكی نەمابێو برایەكەی، یان مامی مارەی بكا، بەلام (وَلاَ يُشْتَرَطُ) شاهیدگرتنەكە مەرج نیە بۆ دروستبوونیمارەبڕینەكە، بەڵكو تەنها ڕازیبوونی ئافرەتەكە مەرجە، كەوابو: ئەگەر باوەڕپێكراوێك بڵێ: ئافرەتەكە ڕازییە. دروستە مارە بكرێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا ڕوون كراوەتەوە.

**ڕوكنیسێیەم**: (وَلِي) سەرپەرشتكار، مەرجە: موسوڵمان بێ، ئازاد بێ، بالغ بێ، عاقڵ بێ، نێرینە بێ، دادپەروەربێ، لە ئیحرامدا نەبێ، بە خۆشیخۆی بێو بە زۆرلێكردن مارەبڕینەكەی پێنەكەن، هەروەك لە هەردوو (فصل)یداهاتوودا بە درێژی ڕوونی دەكەینەوە، إن شاء الله تعالى.

**ڕوكنی چوارەم**: مێردەکە، مەرجە: بە خۆشیی خۆی بێ، بە زۆرلێکردن ژنەکەی لێمارە نەکەن، لە ئیحرامدا نەبێ، دیارکراو بێ، واتە: بە دیتن، یان بە نەژاد بناسرێ و بزاندرێ ئەو ژنەی لێحەڵاڵە.

**ڕوكنی پێنجەم**: ژنەکە، مەرجە: لە ژێر مارەی کەسێکیتردا نەبێ، لە (عِدَّة)ی کەسێکیتردا نەبێ، لە ئیحرامدا نەبێ، دیارکراو بێ، واتە: بە دیتن، یان بە نەژاد بناسرێ، کەواتە: دروست نابێ ئەو جۆرە ئافرەتە مارە بکرێ: کە لە ژێر مارەی کەسێکیتردایە، یان لە (عِدَّة)ی کەسێکیتردایە، بەڵام ئەگەر ژنەکە لە (عِدَّة)یخۆیدا بێ: وەك تەڵاقێك، یان دووی کەوتبێ، یان بە هەڵە جیماعی لەگەڵ کردبێ، ئەو کاتە دروستە لەو (عِدَّة)یەدا لە خۆی مارە بکا، هەروەك لە (بغية المسترشدين)دا فەرموویەتی.

هەروەها ئەگەر باوکێك بڵێ: لە کیژەکانیخۆم یەکێکیانم کردە ژنی تۆ. ئینجا مێردەکەش یەکێکیانی قبوڵ کرد، ئەوە ئەگەر هەردووکیان لە دڵدا مەبەستیان کیژێکی دیارکراوبێ، ئەوە مارەبڕینەکە دروست دەبێ، بەڵام ئەگەر مەبەستیان لێك جیاوازی بێ، یان کیژێکی دیارکراویان مەبەست نەبێ، ئەو کاتە مارەبڕینەکە بەتاڵەو دروست نابێ.

هەروەها ئەگەر باوکەکە بڵێتە دوو پیاوان: ئەم کیژەم کردە ژنی یەکێکتان. ئینجا یەکێکیان قبوڵیکرد، ئەوە بە هیچ جۆرێك دروست نابێ، هەروەك لە (تحفة)و(نهاية)و حاشیەکانیاندا ڕوون کراوەتەوە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی ئەو سەرپەرشتکارانەی ژن مارە دەکەن ﴾

(لاَتُزَوِّجُ امْرَأَةٌ نَفْسَهَا بِإِذْنٍ) دروست نیە: هیچ ئافرەتێك بەخۆی خۆی لە پیاوێك مارە بکا: نە بە ئیزنی سەرپەرشتکارەکەیو نە بە بێ ئیزن.

هەم (وَلاَغَيْرَهَا بِوَكَالَةٍ) دروست نیە: ئافرەتێکیتری جگە لە خۆیشی لە پیاوێك مارە بکا: نە بە وەکیلایەتیو نە بە سەرپەرشتکاریەتی، هەم (وَلاَتَقْبَلُ نِكَاحًا لأَحَدٍ) دروست نیە هیچ مارەبڕینێکیش بۆ هیچ پیاوێك قبوڵ بکا: نە بە وەکیلایەتیو نە بە سەرپەرشتکاریەتی، بە بەڵگەی حەدیسەکەی﴿لاَ نِكَاحَ إِلاَّ بِوَلِيٍّ﴾یڕابردوو، هەم لە حەدیسێکیتردا پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لاَ تُزَوِّجُ الْمَرْأَةُ الْمَرْأَةَ وَلاَالْمَرْأَةُ نَفْسَهَا﴾ رواه الدارقطني على شرط الشيخين، دروست نیە ئافرەت ئافرەت مارە بکا، هەم دروست نیە: خودیخۆیشی مارەبکا.

ئینجا بزانە: دروستە سەرپەرشکارەکە ئافرەتێك بکاتە وەکیلیخۆی تاکو ئافرەتەکە پیاوێك بکاتە وەکیلی سەرپەرشتکارەکە بۆ ئەوەی کیژەکەی، یان خۆشکەکەی لە پیاوێك مارە بکا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَالْوَطْءُ فِي نِكَاحٍ بِلاَ وَلِيٍّ) جیماعکردنی مێرد لەگەڵ ئەو ژنەی بە بێسەرپەرشتکار خۆی لێمارەکردوەو (تَقْلِید)ی هیچ زانایەکیشی نەکردوە (يُوجِبُ مَهْرَالْمِثْلِ) مارەیی هاووێنە لە سەر مێردەکەی واجب دەکا، نەك مارەیی ناوبراو، چونکە مارەبڕینەکە بەتاڵەو دروست نەبوە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿أَيُّمَا اِمْرَأَةٍ نَكَحَتْ بِغَيْرِ إِذْنِ وَلِيِّهَا فَنِكَاحُهَا بَاطِلٌ، فَإِنْ دَخَلَ بِهَا فَلَهَا الْمَهْرُ بِمَااسْتَحَلَّ مِنْ فَرْجِهَا﴾ صححه ابن حبان وغيره، هەر ئافرەتێك بە بێئیزنی سەرپەرشتکارەکەی خۆی مارە بکا، ئەوە مارەبڕینەکەی بەتاڵە، جا ئەگەر مێردەکە جیماعی لەگەڵ کرد، ئەوە مافی مارەییی هەیە بە هۆی حەڵاڵکردنی دامێنەکەی.

(لاَ الْحَدَّ) بەڵام سزای زینا لە سەر هیچێکیان واجب نابێ، چونکە لە حەدیسەکەدا باسی نەکراوە، زانایانیش فەرموودەی جیاوازیان هەیە لەبارەی دروستبوونیمارەبڕینەکە.

کەوابو: ئەگەر ژنەکەو مێردەکە بۆ ئەو مارەبڕینە (تَقْلِید)ی زانایەکیان کردبێ، یان دادوەرێکیشەرعی بڕیاری دروستبوونی بۆ دابن، ئەو کاتە مارەبڕینەکە بە مەزهەبی (شافعي)ش دروست دەبێ، هەروەك لە (تحفة)و حاشیەکانیدا فەرموویانە.

﴿ ئاگاداری ﴾ یەکەم: لە مەزهەبی ئیمام (أبیحنیفة)دا: دروستە ئافرەت بە بێئیزنی سەرپەرشتکارەکەی لە لای دووشاهید خودیخۆی لە پیاوێك مارە بکا، بەو مەرجەی ئافرەتەکە بلۆغی بوبێو عاقڵیش بێ، هەروەها دروستە ئافرەتەکە پیاوێك بکاتە وەکیلی خۆی تاکو لە پیاوێکیتری مارە بکا، هەروەك لە کتێبەکانی خۆیاندا فەرموویانە.

جا بۆ دروستبوونی ئەو جۆرە مارەبڕینە پێویستە: مێردەکەو ژنەکەو هەردوو شاهیدەکان (تَقْلِید)ی ئیمام (أبیحنیفة) بکەن، ئەگینا: مارەبڕینەکە دروست نابێ، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی، جا ئەگەر ئافرەتەکە بۆ مارەبڕینیخۆی وەکیلی گرت، ئەو کاتە واجبە: وەکیلەکەش (تَقْلِید) بکا، والله أعلم.

دووەم: زانایان لە سەر ئەوە ڕێککەوتون: کە-جگە لە (مُجْتَهِد)- بۆ هیچ کەسێکیتر دروست نیە هیچ کردارێك بکا تا (تَقْلِید)ی ئەو زانایە دەکا: کە ڕێگای داوە، کەواتە: هەر مارەبڕینێك زانایان فەرموودەی جیاوازیان لەبارەی هەبێ، بۆ هیچ کەسێك دروست نیە ئەو مارەبڕینەبکا تا (تَقْلِید)ی ئەو زانایە دەکا کە دروستی کردوە.

واتە: ئەگەر (تَقْلِید) نەکرێ مارەبڕینەکە دروست نابێ، کەواتە: ئەگەر (وَلِـي)و شاهیدەکان (فاسق) بن و بە مەزهەبی(الشافعي) مارەبڕینەکە بکەن، پێویستە: (وَلِـي)و مێردەکەو شاهیدەکان گشتیان (تَقْلِید)ی ئەو زانایانە بکەن کە ڕێگایان داوە: بە (وَلِـي)ی (فاسق)و شاهیدی (فاسق) ژن مارە بکرێ، هەروەك لە (تحفة)دا ناوەڕۆکی ئەم ئاگاداریە ڕوون کراوەتەوەو، لە (فصل)ی داهاتووشدا ناوی زانایەکان دەڵێین،إن شاء الله تعالى.

وَيُقبَلُ إقرَارُالوَلِيِّ بِالنِّكَاحِ إنْ استَقَلَّ بالإنْشاء وَإلاَّ فَلاَ، وَيُقبَلُ إقرَارُ البَالِغَةِالعَاقِلَة بالنِّكَاحِ عَلَى الجَديد، وَللأَب تَزوِيجُ البِكْرِ صَغيرَةً أَوْ كَبيرَةً بغَيرِ إذْنِهَا، وَيُستَحَبُّ اسْتئذَانُهَا،

---

(وَيُقبَلُ إقْـرَارُ الـوَلِيِّ بِالنِّكَـاحِ) دانهێنـانی سەرپەرشـتکارەکە بـە مارەبڕینی ژنەکـە قبـوڵ دەکـرێ: (إنْ اسْـتَقَلَّ بِالإنْشَـاءِ) ئەگـەر سەرپەرشـتکارەکە لـە کـاتی دانپێداهێنانەکـەدا سەربەخۆ بێ بۆ مارەکردنەکە، وەك باوك، یان باپیرە بڵێ: ئەم کیژەم لە فلانکەس مـارە کردوە. بەو مەرجەی فلانکەسەکەش هاوچەشنی ژنەکـەبێ، هـەر چـەند کیژەکـەش بڵـێ: ڕاست ناکا (وَإلاَّ) بەڵام ئەگەر سەرپەرشتکارەکە بـۆ مارەکردنەکـە سـەربەخۆ نـەبێ: وەك مێردەکە هاوچەشن نەبێ، یان کیژەکە بێوەژن بێ، یان سەرپەرشتکارەکە: مام، یان بـرا بێ، ئەوە (فَلاَ) دانپێداهێنانەکەی قبوڵ ناکرێ.

(وَ) هەروەها (یُقبَلُ إقْرَارُ البَالِغَةِ العَاقِلَةِ بِالنِّكَاحِ) دانهێنانی ژنەکەش بە مارەبڕینەکە قبـوڵ دەکرێ ئەگەر بلۆغی بوبێو عاقڵیش بێ، جیاوازی کـچو بێـوەژن نیـە، وەك بڵـێ: مـن لـە فلانە پیاوە مارە کراوم. بـەڵام بـەو مەرجـەی مێردەکـەش بڵـێ: ڕاسـت دەکـا. هەرچـەند سەرپەرشـتکارەکەو شـاهیدە دیارکراوەکانیشـی بڵـێن: ڕاسـت ناکـا (عَلَى الجَدِیدِ) لەسـەر فەرموودەی نوێی ئیمامی (الشافعي).

﴿ مارەکردنی کچو بێوەژن ﴾

(وَللأَبِ تَزوِیجُ البِكْرِ) بۆ باوك دروستە کیژەکەی خۆی مارە بکا بەو مەرجـەی کیژەکـە کـچ بـێ ـبێوەژن نەبێ ـ جا کچەکەش: (صَغیرَةً أَوْ كَبیرَةً) بچوك بێ، یان گـەورە بـێو بلـۆغی بوبـێ (بِغَیرِ إذْنِهَا) بێئەوەی کچەکە ئیزنی بدا، بەڵام (وَیُستَحَبُّ اسْتِئذَانُهَا) سـوننەتە ئیزنـی کچەکە وەربگیرێ ئەگەر بلۆغی بوبێو عەقڵی هەبێ، چونکە پێغەمبـەرﷺ دەفـەرموێ: ﴿الثَّیِّبُ أَحَقُّ بِنَفْسِهَا مِنْ وَلِیِّهَا، وَالْبِكْرُ تُستَأمَرُ وَإذْنُهَا سُـكُوتُهَا﴾ رواه مسلم، بێـوەژن مـافی زیـاترە ـبـۆ ڕازیبـوون ـ لـە سەرپەرشـتکارەکەیخۆی، کچـیش ئیزنـی وەردەگـیرێو ئیزندانەکەشـی بێدەنگبوونیەتی.

هەروەها ئیمامی(أبوبکرﷺ) حەزرەتی (عائشة)ی لە تەمـەنی شـەش سـاڵی لـە پێغەمبـەرﷺ مـارە کـرد. کەواتـە: ئـەو ئیـزن وەرگرتنـەی لـە حەدیسـەکە فـەرمانی پـێکراوە، زانایان بـە سوننەتیان داناوە، هەروەك لە (مغني)دا فەرموویەتی.

﴿ ئاگـاداری ﴾: بـەم حـەفت مەرجانـە دروسـتە بـاوك بـە بـێئیزن کچـەکەی مـارە بکـا: یەکەم: هیچ دوژمنایەتی لە نێوان کچەکەو مێردەکەدا نەبێ. دووەم: دوژمنایەتیی ئاشکرا لـە نێـوان کچـەکەو باوکەکـەیدا نـەبێ. سـێیەم: لـە پیـاوێکی هاوچەشـنیخۆی مـارەی بکـا. چوارەم: لە کاتی مارەبڕینەکەدا بە ئەندازەی مارەیی هاوێنەیکچەکە مێردەکە ماڵی هەبێ.

وَلَيْسَ لَهُ تَزْوِيجُ ثَيِّب إلاَّ بِإذْنِهَا، فَإنْ كَانَتْ صَغِيرَةً لَمْ تُزَوَّجْ حَتَّى تَبْلُغَ، وَالْجَدُّ كَالأَب عِنْدَ عَدَمِه، وَسَوَاءٌ زَالَتِ الْبَكَارَةُ بِوَطْءٍ حَلاَلٍ أَوْ حَرَامٍ، وَلاَ أَثَرَ لِزَوَالِهَا بِلاَ وَطْءٍ كَسَقْطَةٍ فِي الأَصَحِّ.

---

جا ئەوانە مەرجی دروستبوون بون، هەروەها بۆ ئەوەش باوکەکە گوناهبار نەبێ، مەرجی **پێنجەم**: بە مارەیی هاوێنە بێ. **شەشەم**: بە پارەی شارەکە بێ. **حەفتەم**: بە مارەیی حازر-نەك قەرز- مارەی بکا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

ئینجا بزانە: ئەگەر ئافرەتەکە ئیزنی وەربگیرێ‌و ڕازی ببێ، ئەو حەفت مەرجانە هیچیان پێویست نابن، هەروەها مەرجەکەی‌چوارەم لە سەر فەرموودەی‌بەهێزتر بوو، بەڵام چەند زانایەك فتوایان داوە: کە ئەگەر مێردەکە لە کاتی‌مارەبڕیندا بە ئەندازەی مارەییەکەش ماڵی نەبێ، مارەبڕینەکە هەر دروست دەبێ، هەروەك لە (فتح المعین)و (بغیةالمسترشدین)دا فەرموویانە.

کەوابو: دروستە لەم مەسەلەیەدا: (تَقْلِید)ی ئەو زانایانە بکرێ، بەڵام ئەگەر بە (فتوای) ئەو زانایانە نەکرێ‌و مێردەکەش بە ئەندازەی مارەییەکە ماڵی نەبێ، ئەو کاتە پێویستە-بۆ دروستبوونی‌مارەبڕینەکە-: بە ئەندازەی مارەییەکە شتێك بە بەخشین، یان بە قەرز بدرێتە مێردەکە، هەروەك لە (الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَلَيْسَ لَهُ تَزْوِيجُ ثَيِّبٍ) بۆ باوك دروست نیە: کیژە بێوەژنەکەی مارە بکا (إلاَّ بِإذْنِهَا) تەنها بە ئیزنی بێوەژنەکە نەبێ، بە بەڵگەی حەدیسەکەی‌ڕابردو، کەوابو: (فَإنْ كَانَتْ صَغِيرَةً) ئەگەر بێوەژنەکە بچوك بوو، واتە: بلوغی نەبوبێ، ئەوە (لَمْ تُزَوَّجْ حَتَّى تَبْلُغَ) دروست نیە مارە بکرێ تا بلۆغی دەبێ، بەڵام ئەگەر بێوەژنەکە شێت بێ، ئەوە دروستە مارە بکرێ، جا بلۆغی بوبێ، یان نا (وَالْجَدُّ كَالأَبِ عِنْدَ عَدَمِهِ) باپیرە، واتە: باوکی‌باوك وەکو باوکە، ئەگەر باوکەکە نەمابێ، یان کەڵکی مارەبڕینی نەبێ.

(وَسَوَاءٌ زَالَتِ الْبَكَارَةُ بِوَطْءٍ حَلاَلٍ أَوْ حَرَامٍ) یەکسانەو جیاوازی نیە بێوەژنەکە: کچینیەکەی بە جیماعێکی حەڵاڵ نەمابێ، یان بە جیماعێکی حەرام: وەکو زینا، هەروەها یەکسانە جیماعەکە: بە خۆشی‌خۆی بوبێ، یان بە زۆرلێکردن، یان لە خەودا بوبێ.

بەڵام (وَلاَ أَثَرَ لِزَوَالِهَا بِلاَ وَطْءٍ) هیچ کار لە کچایەتی ناکا ئەگەر کچینیەکەی بێ‌جیماع لاچوبێ: (كَسَقْطَةٍ) وەك بە کەوتنێك، یان بە پەنجە، یان بە خوێنی‌حەیز کچێنیەکەی لاچوبێ، واتە: ئەمە هەر بە کچ دادەندرێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

﴿ **ئاگاداری** ﴾: ئەگەر لە ئیزن وەرگرتندا فێڵ لە ئافرەتەکە کراو پێی گوت: ڕازی دەبی لە فلانکەس مارەت بکەم؟ ئەویش وەڵامی داوەو گوتی: بەڵێ ڕازیمە لە فلانکەس مارەم

وَمَنْ عَلَى حَاشِيَةِ النَّسَبِ كَأَخٍ وَعَمٍّ لاَ يُزَوِّجُ صَغِيرَةً بِحَالٍ، وَتُزَوَّجُ الثَّيِّبُ الْبَالِغَةُ بِصَرِيحِ الإِذْنِ، وَيَكْفِي فِي الْبِكْرِ سُكُوتُهَا فِي الأَصَحِّ، وَالْمُعْتِقُ وَالسُّلْطَانُ كَالأَخِ،

بکەی. جا لە ڕاستیشدا ئەم ناوە ناوی کەسەکە نەبو، ئەوە ئەگەر ئافرەتەکە لە ئیزندانەکەیدا ئامـاژەی بـۆ پیاوەکـە کردبـێ، وەك بڵـێ: لـەم پیـاوە مـارەم بکـە. ئـەوە مارەبڕینەکە دروست دەبێ، بەڵام ئەگەر ئاماژەی بۆ نەکردبێو ناوەکەشی بە هەڵە گوترابێ، ئەوە مارەبڕینەکە دروست نابێ، جا مەسەلەی فێڵکردن لە مێردەکەش هەر ئەوهایە، هـەروەك لە (تحفة)دا لێرەو لە باسی پەشیمانیی مارەبڕیندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَمَنْ عَلَىحَاشِيَةِالنَّسَبِ) ئەو سەرپەرشتکارەی لە سەر ڕۆخی نەژادە: (كَأَخٍ وَعَمٍ) وەکو براو مامو برازاو مامۆزا...هتد (لاَ يُزَوِّجُ صَغِيرَةً بِحَالٍ) بۆ هیچێکیان دروست نیە بە هیچ جۆرێك ئافرەتی بچوك مارە بکا، واتە: کـە بلـۆغی نـەبوبێ، جیـاوازی کـچو بێـوەژن نیـە، هەروەها ئەگـەر ئافرەتەکـە بلۆغیشـی بوبـێ -بـە بـێئیزن- بـۆ هیچێکیان دروسـت نیـە مارەی بکا، بەڵام بە ئیزنی ئافرەتەکە دروستە.

کەوابو: (وَتُزَوَّجُ الثَّيِّبُ الْبَالِغَةُ بِصَرِيحِ الإِذْنِ) بێـوەژنێکی بالغوعاقـڵ بـە ئیزندانێکیئاشـکرا دروستە مارە بکرێ، جا بـاوکی مـارەی بکـا، یـان سەرپەرشـتکارێکیتر، وەك بڵـێ: بـاوکی خۆم، یان برای خۆم، یان مامم ئیزندا لە فڵانکەس مـارەم بکـا. هـەروەها دروستیشـە بڵـێ: باوکم، یان برام کردە وەکیلی خۆم مارەم بکا، یان ڕازیمە مارەم بکـا. جـا ئەگـەر لاڵ بـوو، پێویستە بە ئاماژە بڵێ: ڕازیمە مارەم بکا.

بـەڵام (وَيَكْفِـي فِىالْبِكْرِ سُكُوتُهَا) لـەبارەی ئیزنـدانی کـچ بێدەنگبوونەکـەی بەسـە، واتـە: هەرکاتێك ئیزنی لێوەرگیرا، ئەگەر بێدەنگ بوو، ئەوە نیشانەی ڕازیبوونیـەتی (فِىالأَصَحِّ) لـە فەرموودەیڕاسـتتردا، بـە بەڵگـەی حەدیسـەکەیڕابردوو، جـا بـاوکی مـارەی بکـا، یـان سەرپەرشتکارێکیتر.

ئینجا بزانە: کچی شێتو بێوەژنی شێت وەکـو منـداڵن، واتـە: ئیزندانەکـەیان بـە کـەڵك نایێ، هەروەها بێدەنگبوونی کچ تەنها بۆمارەبڕینەکە بەسەو بە ڕازیبوون دادەنـدرێ، بەڵام بۆ کەمکردنەوەی مارەییهاوێنە بەس نیە، واتە: مەرجە بـە زوبـان بڵـێ: ڕازیمـە بەو مارەییە کەمترە مارە بکرێم. هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَالْمُعْتِقُ وَالسُّلْطَانُ كَالأَخِ) ئازادکەرو کاربەدەست وەکو برانە، واتـە: بە بێئیزن ناتوانن: نە کچو نە بێوەژن مارە بکەن.

﴿ ئاگـــاداری ﴾: لــە مەزهـــەبی ئیمـــام (أبـــیحنیفـــة)دا: بـــاوكو بـــاپیرەو گشـــت سەرپەرشتکارێکیتریش بۆیان دروستە: بێوەژنی شێت مارە بکەن: جا گەورە بێ، یـان بچـوك

وَأَحَقُّ الأَولِيَاءِ أَبٌ ثُمَّ جَدٌّ ثُمَّ أَبوهُ ثُمَّ أَخٌ لأَبَوَيْنِ أَوْ لأَبٍ ثُمَّ ابْنُهُ وَإِنْ سَفَلَ ثُمَّ عَمٌّ ثُمَّ سَائِرُ الْعَصَبَةِ كَالإِرْثِ، وَيُقَدَّمُ أَخٌ لأَبَوَيْنِ عَلَى أَخٍ لأَبٍ فِي الأَظْهَرِ،

---

بێ، هەروەها بۆ گشت سەرپەرشتكارێك دروستە: ئافرەتی‌بچوك -كە بلۆغی نەبوبێ- مارە بكەن، هەر چەند بێوەژنیش بێ، جا ئەگەر باوكو باپیرە مارەی كردبێ، ئەوە مارەبڕینەكەی دەچەسپێو ئەگەر بلۆغیشی ببێ مافی پەشیمانی‌ی نیە، هەر چەند مێردەكەشی هاوچەشنی‌خۆی نەبێو بە كەمتریش لە مارەیی‌هاوێنە مارە كرابێ، بەلام ئەگەر -جگە لە باوكو باپیرە- سەرپەرشتكارەكانی‌تر مارەیان كرد، ئەوە ئەگەر لە هاوچەشنی‌خۆی مارە كرابێو بە مارەیی‌هاوێنەش مارە كرابێ، ئەوە مارەبڕینەكەی دروستە، بەلام هەركاتێك ئافرەتەكە بلۆغی بوو، یان لە دوای بلۆغبوون هەواڵی مارەبڕینەكەی زانی، بۆی دروستە: پەشیمان ببێتەوەو مارەبڕینەكە -لە لای قازی- هەڵبوەشێنێتەوە، بەلام ئەگەر لە هاوچەشنی‌خۆی مارە نەكرابێ، یان بە كەمتر لە مارەیی‌هاوێنە مارە كرابێ، ئەو كاتە مارەبڕینەكە بەتاڵەو دروست نابێ.

هەر لە مەزهەبی ئیمام (أبي‌حنیفة)دا: بۆ گشت سەرپەرشتكارێكیش دروستە: ژن لە كوڕێكی نەبالغ مارە بكا، بەلام ئەگەر ئافرەت بلۆغی بوبێو عەقڵیشی هەبێ، ئەوە نە بۆ باوكو باپیرەو نە بۆ هیچ سەرپەرشتكارێكی‌تر دروست نیە بە بێ‌ئیزن مارەی بكەن، جا ئافرەتەكە: كچ بێ، یان بێوەژن بێ، ئینجا بۆ ئیزن وەرگرتنەكەش مەرجە: مێردەكەی پێ بناسێندرێو ناوی بگوترێو بە زوبانیش بڵێ: من ڕازیمە. یان بڵێ: ئیزنمدا لە فلانكەس مارەم بكەی. هەروەك لە (مجمع الأنهر)و (الدرالمنتقي)دا ناوەڕۆكی ئەم ئاگاداریە ڕوون كراوەتەوە.

## ﴿ لە پێشترین ( وَلِي )-سەرپەرشتكار بۆ مارەبڕین ﴾

(وَأَحَقُّ الأَولِيَاءِ) لەپێشترین سەرپەرشتكار بۆ مارەبڕین (أَبٌ) باوكی ئافرەتەكەیە (ثُمَّ جَدٌّ) ئینجا باپیرە: باوكی‌باوك (ثُمَّ أَبوهُ) ئینجا باوكی‌باپیرەو بە سەرەوەتر (ثُمَّ أَخٌ لأَبَوَيْنِ) ئینجا برای لەدایك‌وباوكی (أَوْ لأَبٍ) ئینجا برای تەنها لەباوكی (ثُمَّ ابْنُهُ وَإِنْ سَفَلَ) ئینجا كوڕە برا، هەر چەندبەرەو خواریش بێ (ثُمَّ عَمٌّ) ئینجا مامی لەدایك‌وباوكی، ئینجا تەنها لەباوكی، ئینجا كوڕە مام (ثُمَّ سَائِرُ الْعَصَبَةِ) ئینجا خزمە نێرینەكانی‌تری لە پشتێ (كَالإِرْثِ) وەكو ڕیزی میراتگرتن.

كەوابو: (وَيُقَدَّمُ أَخٌ لأَبَوَيْنِ عَلَى أَخٍ لأَبٍ) بۆ مارەبڕینەكە برای لەدایك‌وباوكی وەپێش برای تەنها لەباوكی دێخسترێ (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، هەروەها كوڕەبرای لەدایك‌وباوكی وەپێش كوڕەبرای تەنها لەباوكی دێخسترێ، هەروەها مامی لەدایكو باوكیش وەپێش مامی تەنها لەباوكی دێخسترێو كوڕە مامی لەدایك‌وباوكیش وەپێش كوڕەمامی تەنها لەباوكی دێخسترێ.

وَلاَ يُزَوِّجُ ابْنٌ بِبُنُوَّة، فَإِنْ كَانَ ابْنَ ابْنِ عَمٍّ أَوْ مُعْتِقًا أَوْ قَاضِيًا زَوَّجَ بِه، فَإِنْ لَمْ يُوجَدْ نَسِيبٌ زَوَّجَ الْمُعْتِقُ ثُمَّ عَصَبَتُهُ كَالإِرْثِ، وَيُزَوِّجُ عَتِيقَةَ الْمَرْأَة مَنْ يُزَوِّجُ الْمُعْتِقَةَ مَا دَامَتْ حَيَّةً، وَلاَ يُعْتَبَرُ إِذْنُ الْمُعْتِقَة فِي الأَصَحِّ، فَإِذَا مَاتَتْ زَوَّجَ مَنْ لَهُ الْوَلاَءُ، فَإِنْ فُقِدَ الْمُعْتِقُ وَعَصَبَتُهُ زَوَّجَ السُّلْطَانُ، وَكَذَا يُزَوِّجُ إِذَا عَضَلَ الْقَرِيبُ وَالْمُعْتِقُ،

---

(وَلاَ يُزَوِّجُ ابْنٌ بِبُنُوَّة) نابىَ هيچ كورێك دايكىخۆى بە كوڕايەتى مارە بكا، بەڵام (فَإِنْ كَانَ ابْنَ ابْنِ عَمٍّ) ئەگەر كوڕەكە كوڕى كوڕەمامى ژنەكە بێ: وەك ژنەكە لە كوڕەمامێكىخۆى كوڕێكى بوبێ (أَوْ مُعْتِقًا)يان كوڕەكە ئازادكەر بێ (أَوْ قَاضِيًا) يان كوڕەكە قازى بێ، ئەو كاتە (زَوَّجَ بِه) بە كوڕەمامايەتى، يان بە قازيايەتى دايكىخۆى مارە دەكا.

بەڵام لە هەرسێك مەزهەبەكەىتردا: دروستە: كوڕ بە كوڕايەتى دايكىخۆى لە پياوێك مارە بكا، بەڵكو لە مەزهەبى(حنفي)دا: كوڕى ئافرەتەكە لە باوكىئافرەتەكەش لەپێشترە بۆ مارەبڕين، هەروەك لە (الدرالمنتقي)دا فەرموويەتى.

(فَإِنْ لَمْ يُوجَدْ نَسِيبٌ) جا ئەگەر هيچ سەرپەرشتكارێكى نەژادى ئافرەتەكە نەبو (زَوَّجَ الْمُعْتِقُ) ئازادكەرەكەى مارەى دەكا (ثُمَّ عَصَبَتُهُ) ئينجا خزمە لە پشتيێەكانى ئازادكەرەكە (كَالإِرْثِ) وەكو ميراتگرتن (وَيُزَوِّجُ عَتِيقَةَ الْمَرْأَة مَنْ) جاريە ئازادكراوەكەى ئافرەتەكە ئەو كەسە مارەى دەكا: كە (يُزَوِّجُ الْمُعْتِقَةَ مَا دَامَتْ حَيَّةً) ئافرەتە ئازادكەرەكە مارە دەكا مادام ئافرەتەكە زيندوو بێ: وەك باوكو باپيرەى ئازادكەرەكە.

(وَلاَ يُعْتَبَرُ إِذْنُ الْمُعْتِقَة فِي الأَصَحِّ) ئيزندانى ئافرەتە ئازادكەرەكە ڕەچاو ناكرێ بۆ مارەكردنەكە، بەڵام (فَإِذَا مَاتَتْ) هەر كاتێك ئافرەتە ئازادكەرەكە مرد، ئەوە (زَوَّجَ مَنْ لَهُ الْوَلاَءُ) ئەو پياوەى خزمايەتى ئازادكردنى هەيە، هەر ئەويش ئازادكراوەكە مارە دەكا: وەكو كوڕى ژنە مردووەكەو كوڕى كوڕو، ئينجا باوك...هتد.

(فَإِنْ فُقِدَ الْمُعْتِقُ وَعَصَبَتُهُ) جا ئەگەر ئازادكەرو خزمەكانى ئازادكەرەكەش نەبون، ئەو كاتە (زَوَّجَ السُّلْطَانُ) كاربەدەستى شوێنەكە ئافرەتەكە-بە ئيزن- لە كەسێكىتر مارە دەكا، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿اَلسُّلْطَانُ وَلِيُّ مَنْ لاَوَلِيَّ لَهُ﴾ صححه ابن حبان وغيره، كاربەدەست سەرپەرشتكارى ئەو كەسەيە: كە هيچ سەرپەرشتكارێكى نيە.

ئينجا بزانە لە مەزهەبى ئيمام (أبىحنيفة)دا: ئەگەر هيچ سەرپەرتكارێكى نێرينە نەبێ، دروستە: دايك كيژەكەى خۆى مارە بكا، هەروەك لە (ملتقىالابحر)دا فەرموويەتى.

(وَكَذَا يُزَوِّجُ) هەروەها كاربەدەستەكە ئافرەتەكە مارە دەكا (إِذَا عَضَلَ الْقَرِيبُ) هەركاتێك سەرپەرشتكارەكەى نزيك خۆى گير كردو ئافرەتەكەى مارە نەكرد، هەم (وَالْمُعْتِقُ) ئازادكەرەكەش مارەى نەكرد.

وَإِنَّمَا يَحْصُلُ الْعَضْلُ إِذَا دَعَتْ بَالِغَةٌ عَاقِلَةٌ إِلَى كُفْءٍ وَامْتَنَعَ، وَلَوْ عَيَّنَتْ كُفُئًا وَأَرَادَ الأَبُ غَيْرَهُ فَلَهُ ذَلِكَ فِي الأَصَحِّ.

---

(وَإِنَّمَا يَحْصُلُ الْعَضْلُ) خۆگیرکردن بەوە دەبێ: (إِذَا دَعَتْ بَالِغَةٌ عَاقِلَةٌ إِلَى كُفْءٍ) هەر کاتێك ئافرەتێکی بالغو عاقڵ داوا لە سەرپەرشتکارەکەی بکا: لە پیاوێکی هاوچەشنیخۆی مارەی بکاو (وَامْتَنَعَ) سەرپەرشتکارەکەش بە بێهیچ عوزرێکیشەرعی خۆی گیر بکاو بڵێ: مارەی ناکەم.

بەڵام (وَلَوْ عَيَّنَتْ كُفُؤًا) ئەگەر کیژێکیکچ پیاوێکی هاوچەشنیخۆی دیاری کردو گوتی: لەم پیاوە مارەم بکە (وَأَرَادَ الأَبُ غَيْرَهُ) باوك، یان باپیرەش هاو چەشنێکیتری دیاری کرد، ئەوە (فَلَهُ ذَلِكَ) باوكو هەم باپیرەش ئەو مافەی هەیەو دیارکراوی ئەوان ڕەچاو دەکرێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی راستتردا، چونکە باوكو باپیرە لێزانترن، بەڵام ئەگەر سەرپەرشتکارەکە باوكو باپیرە نەبو، یان ئافرەتەکە بێوەژن بوو، ئەوە لە هەر دوو حاڵەتدا دیارکراوی ئافرەتەکە ڕەچاو دەکرێ، چونکە ئەگەر لەم دوو حاڵەتەدا مارەبڕینەکە بێئیزنی ئافرەتەکە بێ، ئەوە هەر دروست نابێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

کەوابو: ئەگەر لە ئیزن وەرگرتندا فێڵ لە ئافرەتەکە بکرێو ناوی پیاوێکی بە هەڵە پێ بگوترێ، ئەو کاتەش مارەبڕینەکە دروست نابێ، هەروەك لە (مارەبڕینی بێوەژن)دا ڕوونمان کردەوە، ئینجا بزانە: ئەگەر دیارکراوی کیژەکە جوانتر بوو، یان دەوڵەمەندتر بوو، یان زاناتر بوو...ئەو کاتە–بە فەرموودەکەیتری بێهێز – دیارکراوی کیژەکە ڕەچاو دەکرێو واجبە: باوكو باپیرەش ڕازی بن، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

﴿ باسی شیربایی ﴾

هەر کاتێك سەرپەرشتکارەکە بڵێ: تا ئەوەندە ماڵە نەدەیتە من ئەو ئافرەتە لە تۆ مارە ناکەم–هەروەك ئێستا ئەوهایە– ئەوەش بێگومان بە خۆگیرکردن دادەنرێ، هەروەك لە (الانوار)دا فەرموویەتی، جا ئەو ماڵەی–بەو ناوە– لە مێردەکە، یان لە باوکی مێردەکە وەردەگیرێ حەرامە، هەرچەند بەو مەبەستەش وەریبگرتبێ: تاکو بۆ خۆی، یان بۆ کوڕەکەی ژنی پێبهێنێ، جا لە کوردەواریدا بەو ماڵوەرگرتنە دەگوترێ: (شیربایی).

کەوابو: واجبە ماڵەکە بۆ خاوەنەکەی بگەڕێندرێتەوە، واتە: دروست نیە بیداتەوە ئافرەتەکە، جگە لەمەش ئەو ڕەفتارە ناشیرینە وەك فرۆشتنی ئافرەتێکی ئازادە، پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: ﴿قال الله تعالى: ثَلاثَةٌ أَنَا خَصْمُهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ: رَجُلٌ أَعْطَى بِي ثُمَّ غَدَرَ، وَرَجُلٌ بَاعَ حُرّاً فَأَكَلَ ثَمَنَهُ، وَرَجُلٌ إِسْتَأْجَرَ أَجِيراً فَاسْتَوْفَى مِنْهُ وَلَمْ يُعْطِهِ أَجْرَهُ﴾

(فَصْلٌ) لاَ وِلاَيَةَ لِرَقِيقٍ وَصَبِيٍّ وَمَجْنُونٍ وَمُخْتَلِّ النَّظَرِ بِهَرَمٍ أَوْ خَبَلٍ، وَكَذَا مَحْجُورٌ عَلَيْهِ بِسَفَهٍ عَلَى الْمَذْهَبِ، وَمَتَى كَانَ الأَقْرَبُ بِبَعْضِ هَذِهِ الصِّفَاتِ

---

رواه البخاري، خوای گەورە لە حەدیسێکی(قدسي)دا دەفەرموێ: سێ کەس هەنە من بەخۆم لە ڕۆژی قیامەت کێشەیان لەگەڵ دەکەم، یەکەم: ئەوکەسەی بە ناوی من پەیمانێك بداو جێبەجێی نەکا. دووەم: ئەوکەسەی ئادەمیزادێکی ئازاد بفرۆشێ‌و پارەکەی بخوا. سێیەم: ئەوکەسەی کرێکارێك بگرێ‌و کارەکەی پێ بکاو کرێیەکەی نەداتێ.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئێستاش زۆرداری‌و ستەمێکی (جاهلي)ی پێش ئیسلام لە کوردستاندا هەیە کە ئەمەیە: ﴿عن ابن عباس رضي الله عنهما: كَانُوا إِذَا مَاتَ الرَّجُلُ كَانَ أَوْلِيَاؤُهُ أَحَقَّ بِامْرَأَتِهِ: إِنْ شَاءَ بَعْضُهُمْ تَزَوَّجَهَا، وَإِنْ شَاؤُا زَوَّجُوهَا، وَإِنْ شَاؤُا لَمْ يُزَوِّجُوهَا فَهُمْ أَحَقُّ بِهَا مِنْ أَهْلِهَا، فَنَزَلَتْ: (يَاأَيُّهَاالَّذِينَ آمَنُوا لاَيَحِلُّ لَكُمْ أَنْ تَرِثُواالنِّسَاءَ كَرْهاً وَلاَ تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُوا بِبَعْضِ مَاآتَيْتُمُوهُنَّ)﴾رواه‌البخاري، لە سەر دەمی (جاهلي) پێش ئیسلام عادەتیان ئەوەبو: ئەگەر پیاوێك دەمردو ژنەکەی لە پاش بەجێ دەما، ئەوە خزمەکانی مێردەکە خۆیان بە خاوەن مافتر دادەناو دەستیان بە سەر ژنەکەیدا دەگرت: ئەگەر یەکێکیان ویستبای لە خۆی مارە دەکرد، ئەگەر حەزیان کردبا لە کەسێکی‌تریان مارە دەکرد، ئەگەر حەزیان کردبا مارەیان نەدەکردو لە مێردکردن قەدەغەیان دەکرد، ئینجا خوای گەورە ئەو ئایەتەی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا يَحِلُّ لَكُمْ أَنْ تَرِثُواالنِّسَاءَ كَرْهاً﴾ی ناردە خوارەوەو ئەو عادەتەی حەرام کرد، واتە: هۆ ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە بە خواو پێغەمبەرﷺ بۆ ئێوە حەڵاڵ نیە ئافرەتان بە زۆرداری بە میرات بگرن‌و لە شووکردن قەدەغەیان مەکەن تاکو بەشێکی ئەو ماڵەی داوتانە ئەوان بۆ خۆتان ببەن.

کەواتە: هەر شتێك لە بەرامبەر شووکردنەوەی ژنەکە وەربگیرێ، ئەویش وەکو شیربایی حەرامە، چونکە لە دوای مردنی‌مێردەکە ژنەکە ئازادو سەربەخۆیە: بە خۆشی‌خۆی بە ئیزنی سەرپەرشتکاری‌خۆی مێرد بە هەر کەسێك بکا.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی قەدەغەکەرەکانی سەرپەرشتکارییەتی ژن مارەکردن ﴾

(لاَوِلاَيَةَ لِرَقِيقٍ) سەرپەرشتکارییەتی ژن مارەکردن: بۆ کۆیلە نیە، هەم (وَصَبِيٍّ وَمَجْنُونٍ) بۆ منداڵ‌و شێتیش نیە، هەم (وَمُخْتَلِّ النَّظَرِ بِهَرَمٍ أَوْ خَبَلٍ) بۆ ئەو کەسەش نیە کە بیرو هۆشی ناتەواو بێ: بە هۆی پیری، یان گێلەکەیی (وَكَذَا مَحْجُورٌ عَلَيْهِ بِسَفَهٍ) هەروەها بۆ ئەو کەسەش نیە: کە بە هۆی ماڵ بەفیڕۆدان قەدەغەی لە سەر داندراوە (عَلَى الْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی‌مەزهەب.

(وَمَتَى كَانَ الأَقْرَبُ بِبَعْضِ هَذِهِ الصِّفَاتِ) هەر کاتێك سەرپەرشتکاری‌نزیکتر یەکێکی لەو قەدەغەکەرانەی تێدابو، واتە: یان کۆیلە، یان منداڵ، یان شێت بوو، یان بیرو هۆشی ناتەواو

فَالْوِلاَيَةُ لِلأَبْعَدِ، وَالإِغْمَاءُ إِنْ كَانَ لاَ يَدُومُ غَالِبًا أُنْتُظِرَ إِفَاقَتُهُ، وَإِنْ كَانَ يَدُومُ أَيَّامًا أُنْتُظِرَ وَقِيلَ لِلأَبْعَدِ، وَلاَ يَقْدَحُ الْعَمَى فِي الأَصَحِّ، وَلاَ وِلاَيَةَ لِفَاسِقٍ عَلَى الْمَذْهَبِ،

بوو، یان قەدەغەکراوی ماڵ بەفیڕۆدان بوو، ئەوە (فَالْوِلاَيَةُ لِلأَبْعَدِ) سەرپەرشتكاریەتی مارەبڕینەکە بۆ سەرپەرشتكارە دوورترەکە دەگوازرێتەوە، چونکە ئەوانەیڕابردوو هەبوونیان وەك نەبوونە، کەواتە: ئەگەر قەدەغەکەرەکە نەما، ئەو کاتە سەرپەرشتكاریەکەی بۆ دەگەڕێتەوە، هەروەك لە زۆریەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَالإِغْمَاءُ) بێهۆشی (إِنْ كَانَ لاَيَدُومُ غَالِبًا) ئەگەر بە ئەغڵەبی بەردەوام نەبێ، ئەوە (أُنْتُظِرَ إِفَاقَتُهُ) چاوەڕوانی چاکبوونەوەی دەکرێ (وَ) هەروەها (إِنْ كَانَ يَدُومُ أَيَّامًا) ئەگەر چەند ڕۆژێکیش بەردەوام دەبو (أُنْتُظِرَ) بە فەرموودەی ڕاستتر: چاوەڕوانی چاکبوونەوەی دەکرێ، بەڵام (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: چاوەڕوان ناکرێ، بەڵکو (لِلأَبْعَدِ) بۆ سەرپەرشتكارە دوورەترەکە دەگوازرێتەوە (وَلاَيَقْدَحُ الْعَمَى) کوێری نابێتە عەیب لە سەرپەرشتكاریدا، هەم لاڵیش نابێتە عەیب (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

بەڵام (وَلاَ وِلاَيَةَ لِفَاسِقٍ) سەرپەرشتكاریەتی ژن مارەکردن بۆ پیاوی فاسق نیە (عَلَى الْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لاَنِكَاحَ إِلاَّ بِوَلِيٍّ مُرْشِدٍ﴾ رواه الشافعي وأحمد والطبراني بسند صحيح، هیچ مارەبڕینێك دروست نابێ تەنها بە سەرپەرشتكارێکی دادپەروەر نەبێ.

﴿ ئاگاداری ﴾: لە فەرموودەیەکی تریئیمامی(الشافعي)داو لە مەزهەبی ئیمام (أبیحنیفة)و ئیمام (مالك)دا دروستە: فاسق ببێتە سەرپەرشتكاری ژن مارەکردن، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی، جا ئیمامی(الغزالی)ش فتوای داوە: ئەگەر هاتو سەرپەرشتكارە فاسقەکە مارەی نەکردبا، کارەکە دەکەوتە دەست دادوەرێکی فاسق، ئەو کاتە دروستە: سەرپەرشتكارە فاسقەکە ئافرەتەکە مارە بکا، ئیمام (ابن الصلاح)و (السُّبْكي)و (الأنرعي)و چەند زانایەکیتریش فتوایان داوە: ئەگەر فاسقی بڵاو بۆوە-لە بەر پێویستی- دروستە: پیاوی فاسق ببێتە سەرپەرشتكاری ژن مارەکردن، بەڵکو فەرموودەیەکی ئیمامی (الشافعي)ش هەیە: کە دروستە هەردوو شاهیدەکانی مارەبڕینەکەش فاسق بن، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

کەوابو: بۆ ئەم سەردەمە-ئەگەر بە مەزهەبی(الشافعي) ژن مارە بکرێ- پێویستە: سەرپەرشتكارەکەو مێردەکەو هەم وەکیلەکەیانو هەم هەردوو شاهیدەکان لەو فەرموودانە ئاگادار بکرێنەوە، تاکو (تَقْلِيد)ی ئەو زانایانە بکەن: کە ڕێگایان داوە: (بە (وَلِي)ی فاسقو شاهیدی فاسق ژن مارە بکرێ). چونکە ئەگەر (تَقْلِيد) نەکەن مارەبڕینەکە

دروست نابێ، هەروەك لە سەرەتای (فصل)ی‌ڕابردوودا ڕوونمان کردەوە، بەڵام مەرج نیە: لە (تَقْلِيد)کردنەکەدا ناوی زانایەکان بگوترێ، والله أعلم.

﴿تێبینی﴾: مامۆستا (عبدالكريم المدرس)رحمه الله تعالى، لە (جواهرالفتاوی)دا لە چەند زانایەکی پایەبەرزی کورد گێڕاویەتیەوە: کە (بۆ دروستبوونی مارەبڕینی‌مەزهەبی(الشافعي) بە (ولي)ی فاسق و شاهیدی فاسق، مەرجە: ژنەکەش-وەکو مێردەکە-(تَقْلِيد) بکا).

منیش لە (ڕۆژی پرشنگدار)دا شوێن ئەو بەڕێزانە کەوتوم، بەڵام مامۆستای (المدرس) بەخۆی دەفەرموێ: ئەگەر ژنەکە (مُجْبَرَة) بێ-واتە: کچ بێ‌و باوکی، یان باپیرەی مارەی ببڕێ- ئەوە (تَقْلِيد)کردنی مەرج نیە.

جا ئەو بەڕێزانە پشتیان بە فەرموودەی (تحفة) بەستوە کە دەفەرموێ: (فَمَنْ نَكَحَ مُخْتَلَفاً فِيهِ فَإِنْ قَلَّدَ الْقَائِلَ بِصِحَّتِهِ...إلخ). بەڵام حاشیەکەی(ابن قاسم) لە سەری نووسیوە: (كَنِكَاحٍ بِلا وَلِيٍّ). ئەوەش وا دەگەیێنێ: کە (تَقْلِيد)کردنی ژنەکە-بۆ دروستبوونی‌مارەبڕین- تەنها لەو حاڵەتەدا مەرجە: کە مارەبڕینەکە بە مەزهەبی(حنفي) بکرێ.

جا منیش لێرەدا شوێن (ابن قاسم) کەوتوم؟ چونکە فەرموودەکەی(ابن قاسم) بەوە بەهێز دەبێ: کە لە هەمان لاپەڕەدا (تحفة) دەفەرموێ: (قَالَ الْمَاوَرْدِي: وَلَيْسَ لِلزَّوْجَيْنِ الإِسْتِبْدَادُ بِعَقْدٍ مُخْتَلَفٍ فِيهِ إلاَّ إِنْ كَانَا مِنْ أَهْلِ الإِجْتِهَادِ...إلخ)، واتە: بۆ ژن‌و مێرد دروست نیە سەربەخۆ بن بۆ مارەبڕینێکی‌وەها: کە زانایان فەرموودەی جیاوازیان لە دروستبوونی‌دا هەبێ، مەگەر هەردووکیان خاوەنی(اِجْتِهَاد) بن...تا کۆتایی.

جا ئاشکرایە بە مەزهەبی(الشافعي): ژن سەربەخۆ نیە بۆ مارەبڕین هەرچەند سەرپەرشتکارەکەشی (فاسق) بێ، کەواتە: (تَقْلِيد)کردنی مەرج نیە، بەڵام بە مەزهەبی (حنفي): ژن سەربەخۆیە، بۆیێ (تَقْلِيد)کردنی مەرجە، بەو جۆرەی لە سەرەتای (فصل)ی‌ڕابردوودا ڕوونمان کردەوە، والله أعلم بالصواب.

ئینجا بزانە: بە (إجماع)ی زانایانی‌ئیسلام: هیچ جۆرە کافرێك نابێتە سەرپەرشتکاری ئافرەتی‌موسوڵمان، کەوابو: ئەگەر سەرپەرشتکارەنزیکەکە کافر بێ، ئەو کاتە سەرپەرشتکارە دوورەکە ئافرەتە موسوڵمانەکە مارە دەکا.

هەروەها موسوڵمانیش نابێتە سەرپەرشتکاری ئافرەتی‌کافر، بەڵام (وَيَلِي الْكَافِرُ الْكَافِرَةَ) پیاوی‌کافر دەبێتە سەرپەرشتکاری ئافرەتی‌کافرو مارەی دەکا، بەو مەرجەی لە بنچینەی‌دا کافر بێ، چونکە موسوڵمانی‌کافربوو -هەروەك نابێتە سەرپەرشتکاری موسوڵمان- نابێتە سەرپەرشتکاری هیچ جۆرە کافرێکیش، هەروەك لە (تحفة)و(نهاية)و حاشیەکانیاندا ئەو مەسەلەیە ڕوون کراوەتەوە.

وَإِحْرَامُ أَحَدِالْعَاقِدَيْنِ أَوِ الزَّوْجَةِ يَمْنَعُ صِحَّةَالنِّكَاحِ وَلاَ يَنْقُلُ الْوِلاَيَةَ فِي‌الأَصَحِّ، فَيُزَوِّجُ السُّلْطَانُ عِنْدَ إِحْرَامِ الْوَلِيِّ لاَالأَبْعَدُ، قُلْتُ: وَلَوْ أَحْرَمَ الْوَلِيُّ أَوِ الزَّوْجُ فَعَقَدَ وَكِيلُهُ الْحَلاَلُ لَمْ يَصِحَّ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَلَوْ غَابَ الأَقْرَبُ إِلَى مَرْحَلَتَيْنِ زَوَّجَ السُّلْطَانُ، وَدُونَهُمَا لاَ يُزَوِّجُ إِلاَّ بِإِذْنِهِ فِي‌الأَصَحِّ، وَلِلْمُجْبِرِ اَلتَّوْكِيلُ فِي‌التَّزْوِيجِ بِغَيْرِ إِذْنِهَا،

---

(وَإِحْـرَامُ أَحَدِالْعَاقِـدَيْنِ أَوِالزَّوْجَـةِ) ئیحـرام بەسـتنی یـەکێك لـە مارەبڕەکـان: وەك سەرپەرشتکارەکە، یان مێردەکە، یان وەکیلی یـەکێکیان، یـان ژنەکـە لـە ئیحرامـدا بـێ، ئـەوە (یَمْنَـعُ صِـحَّةَالنِّكَاحِ) دروستبوونی مارەبڕینەکـە قەدەغـە دەکـا، واتـە: بەتاڵـەو دانامەزرێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لاَيَنْكِحُ الْمُحْـرِمُ وَلاَيُـنْكِحُ﴾ رواه مسلم، نابـێ ئیحرامدار ژن لە خۆی مارە بکاو نابێ لە کەسێکی‌تریشی مارەبکا.

(وَلاَ يَنْقُـلُ الْوِلاَيَـةَ) ئیحـرام بەسـتن سەرپەرشـتکاریەتی ناگوازێتـەوە بـۆ دوورترەکـە (فِـي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی راستتردا، کەوابو: (فَيُزَوِّجُ السُّلْطَانُ عِنْدَ إِحْرَامِ الْوَلِيِّ) کاربەدەست مارەی ئافرەتەکە دەبڕێ لـەو کاتـەی سەرپەرشـتکارەکە لـە ئیحرامدایـە (لاَ الأَبْعَدُ) نـەك دوورترەکـە (قُلْـتُ) ئیمـامی (النـواوي) دەفـەرموێ: (وَلَـوْ أَحْـرَمَ الْـوَلِيُّ أَوِ الـزَّوْجُ) ئەگـەر سەرپەرشتکارەکە، یان مێردەکـە ئیحرامـی بەسـت (فَعَقَدَ وَكِيلُـهُ الْحَلاَلُ) ئینجا وەکیلـی سەرپەرشتکارەکە، یان مێردەکە-کە لە ئیحرامدا نەبێ- مارەبڕینەکـەی کـرد، ئـەوە (لَمْ يَصِحَّ) مارەبڕینەکە دروست نابێ (وَاللهُ أَعْلَمُ).

(وَلَـوْ غَـابَ الأَقْـرَبُ إِلَـى مَـرْحَلَتَيْنِ) ئەگـەر سەرپەرشـتکارە نزیکترەکـە ئەنـدازەی دوو قۆنـاغ -واتە: هەشتا کیلۆمەتر، یان زیاتر- لـە شـوێنی ژنەکـە دوور بـوو- ئـەو کاتـە (زَوَّجَ السُّلْطَانُ) کاربەدەسـت مـارەی ئافرەتەکـە دەبـڕێ، بـەڵام لـە فەرموودەیـەکی بـێ‌هێزی مەزهـەبی (الشافعي)دا: دوورترەکە مارەی دەکا.

هەروەها لە مەزهەبی ئیمامی (حنفی)ش ئەگەر ئەوەندە دوور بوو چاوەڕوانی نـەدەکرا، هـەم لـە فەرموودەیەکدا: ئەگـەر ئەنـدازەی سـێ ڕۆژیـش دوور بـێ، ئـەوە لـە هەردووەمسـەلەدا دوورترەکە مارەی دەکا، هەروەك لە (مجمع الانهر)دا فەرموویـەتی، بـەڵام ( وَدُونَهُمَـا) ئەگـەر دیارنەبوونەکەی لە ئەندازەی دوو قۆناغ کـەمتر بـوو، ئـەوە (لاَ يُـزَوِّجُ إِلاَّ بِإِذْنِـهِ) کاربەدەسـت نابێ مارەی ببڕێ تەنها بە ئیزنی سپەرشتکارەکە نەبێ (فِي‌الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

## ﴿ باسی وەکیلگرتن بۆ مارەبڕین ﴾

(وَلِلْمُجْبِرِ) بۆ وەلی موجبیر، واتە: ئەو سەرپەرشتکارەی-بێ‌ئیزن- دەتوانـێ کیژەکـەی مـارە بکا: وەك باوكو باپیرە-ئەگەر کچ بـێ- بـۆی دروسـتە: (اَلتَّوْكِيـلُ فِي‌التَّـزْوِيجِ) پیاوێـك بکاتـە وەکیل بـۆ مـارەبڕینی کیژەکـەی (بِغَيْـرِ إِذْنِهَـا) بـێ‌ئیزنی کیژەکـەی، هـەروەك بـۆی دروسـتە بێ‌ئیزن کیژەکەش مارە بکا.

وَلاَ يُشْتَرَطُ تَعْيِينُ الزَّوْجِ فِي‌الأَظْهَرِ، وَيَحْتَاطُ الْوَكِيلُ فَلاَ يُزَوِّجُ غَيْرَ كُفْءٍ، وَغَيْرُالْمُجْبِرِ إِنْ قَالَتْ لَهُ: وَكِّلْ، وَكَّلَ، وَإِنْ نَهَتْهُ فَلاَ، وَإِنْ قَالَتْ: زَوِّجْنِي، فَلَهُ التَّوْكِيلُ فِي‌الأَصَحِّ، وَلَوْ وَكَّلَ قَبْلَ اسْتِئْذَانِهَا فِي‌النِّكَاحِ لَمْ يَصِحَّ عَلَى الصَّحِيحِ، وَلْيَقُلْ وَكِيلُ الْوَلِيِّ: زَوَّجْتُكَ بِنْتَ فُلاَنٍ.

---

بەلاَم ئاگاداریە: ئەگەر سەرپەرشتکارەکە (فاسق) بێ، پێویستە پێش وەکیلگرتن: (تَقلید)ی ئەو زانایانە بکا: کە ڕێگەیان داوە سەرپەرشتکاری فاسق ئافرەت مارە بکا، ئینجا دروست دەبێ وەکیل بگرێ، هەروەها پێویستە وەکیلەکەش بۆ مارەبڕینەکە خۆی (تَقلید) بکا، ئەگینا: وەکیلگرتنەکەو مارەبڕینەکە دروست نابن، هەروەك لە (مغنی) لە سەرەتای وەکیلایەتی‌دا فەرموویەتی، ئێمەش لە وێدا ڕوونمان کردەوە.

بەلاَم (وَلاَ يُشْتَرَطُ تَعْيِينُ الزَّوْجِ) بۆ دروستبوونی وەکیلگرتنەکە بە مەرج دانانرێ: سەرپەرشتکارەکە مێردەکە بۆ وەکیلەکە دیاری بکا (فِي‌الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، کەوابو: (وَيَحْتَاطُ الْوَكِيلُ) واجبە: وەکیلەکە پارێزکاری بکا ئەگەر مێردەکەی بۆ دیاری نەکرابێ، واتە: (فَلاَ يُزَوِّجُ غَيْرَ كُفْءٍ) نابێ ژنەکە لە کەسێکی وەها مارە بکا کە هاوچەشنی ژنەکە نەبێ، چونکە ئەگەر مێردەکە هاوچەشن نەبێ، مارەبڕینەکە دروست نابێ.

بەلاَم ئەگەر مێردەکە پیاوێك بکاتە وەکیل بۆ ئەوەی ژنێکی لێ‌مارە بکا، ئەو کاتە –بە فەرموودەی بەهێزتر– مەرجە: مێردەکە ژنەکە بۆ وەکیلەکە دیاری بکا، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە،

(وَغَيْرُ الْمُجْبِرِ) ئەو سەرپەرشتکارەی بێ‌ئیزن ناتوانێ ژنەکە مارەبکا: وەك براو مام، هەم باوكو باپیرەش ئەگەر بێوەژن بێ، ئەوە (إِنْ قَالَتْ لَهُ) ئەگەر ژنەکە بە سەرپەرشتکارەکەی گوت: (وَكِّلْ) ئیزنمدای وەکیل بگرە بۆ مارەبڕینم، ئەو کاتە (وَكَّلَ) دروستە سەرپەرشتکارەکە وەکیل بگرێ‌و (وَإِنْ نَهَتْهُ) ئەگەر ژنەکە گوتی: وەکیل مەگرە ئەو کاتە (فَلاَ) دروست نیە سەرپەرشتکارەکە وەکیل بگرێ، بەلاَم (وَإِنْ قَالَتْ) ئەگەر ژنەکە بە سەرپەرشتکارەکەی گوت (زَوِّجْنِي) ئیزنمدای مارەم بکە، ئەو کاتە (فَلَهُ التَّوْكِيلُ فِي‌الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا وەکیلگرتنیشی بۆ دروستە.

کەوابو: (وَلَوْ وَكَّلَ قَبْلَ اسْتِئْذَانِهَا فِي‌النِّكَاحِ) ئەگەر سەرپەرشتکارەکە وەکیلی گرت بۆ مارەبڕینەکە، پێش ئەوەی ئافرەتەکە ئیزنی بدا مارەی ببڕێ، ئەوە (لَمْ يَصِحَّ عَلَى‌الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست مارەبڕینەکە دروست نابێ، هەم وەکیلگرتنەکەش دروست نابێ، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.

(وَلْيَقُلْ وَكِيلُ الْوَلِيِّ) لە کاتی مارەبڕینەکەدا با وەکیلی‌سەرپەرشتکارەکە بڵێتە مێردەکە: (زَوَّجْتُكَ بِنْتَ فُلاَنٍ) فلاَنە کیژی‌فلاَنکەسی کوڕی‌فلاَنکەسم لەگەڵ تۆ جووت کردو

وَلْيَقُلِ الْوَلِيُّ لِوَكِيلِ الزَّوْجِ: زَوَّجْتُ بِنْتِي فُلاَنًا. فَيَقُولُ وَكِيلُهُ: قَبِلْتُ نِكَاحَهَا لَهُ. وَيَلْزَمُ الْمُجْبِرَ تَزْوِيجُ مَجْنُونَةٍ بَالِغَةٍ وَمَجْنُونٍ ظَهَرَتْ حَاجَتُهُ، لاَ صَغِيرَةٍ وَصَغِيرٍ، وَيَلْزَمُ الْمُجْبِرَ وَغَيْرَهُ إِنْ تَعَيَّنَ إِجَابَةُ مُلْتَمِسَةِ التَّزْوِيجِ،

---

**کردمە ژنی تۆ بە وەکیلایەتی.** ئینجا مێردەکەش قبوڵ بکاو بڵی: **فلانە کیژی فلانکەسم قبوڵ کرد بە جووت لەگەڵ خۆم‌و بە ژن بۆخۆم.**

هەروەها (وَلْيَقُلِ الْوَلِيُّ لِوَكِيلِ الزَّوْجِ) با سەرپەرشتکارەکەش بڵێتە وەکیلی مێردەکە: (زَوَّجْتُ بِنْتِي فُلاَنًا) **فلانە کیژی‌خۆم جووت کرد لەگەڵ فلانکەسی کوڕی فلانکەس‌و کردمە ژنی ئەوی کە وەکیلگری تۆیە.** (فَيَقُولُ وَكِيلُهُ) ئینجا وەکیلی مێردەکەش قبوڵ بکاو بڵێ: (قَبِلْتُ نِكَاحَهَا لَهُ) **قبوڵم کرد فلانە کیژی‌تۆ بە ژن بۆ فلانەکەس‌و بە جووت لەگەڵ فلانکەس بە وەکیلایەتی.**

جا ئەگەر وەکیلەکە نەڵێ: بۆ فلانکەس، ئەو کاتە مارەبڕینەکە دروست نابێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، کەوابو: ئەگەر باوکێك بیەوێ ژنێك لە کوڕە نەبالغەکەی خۆی مارە بکا، پێویستە سەرپەرشتکاری ژنەکە بڵێ: (**فلانە ئافرەتم کردە ژنی فلانە کوڕی تۆو لەگەڵ فلانە کوڕی تۆم جووت کرد**). باوکەکەش قبوڵ بکاو بڵێ: (**قبوڵم کرد فلانە ئافرەتە بە ژن بۆ فلانە کوڕی‌خۆم‌و بە جووت لەگەڵ فلانە کوڕی‌خۆم**). هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.

(وَيَلْزَمُ الْمُجْبِرَ) لە سەر باوك وباپیرە واجبە: (تَزْوِيجُ مَجْنُونَةٍ بَالِغَةٍ) کیژە شێتەکەی خۆی مارە بکا ئەگەر بلۆغی بوبێ‌و پێویستی بە جیماع، یان بە بەخێوکردن هەبێ، هەرچەند بێوەژنیش بێ، هەم (وَمَجْنُونٍ) واجبە ژنێکیش لە کوڕە شێتەکەی خۆی مارە بکا ئەگەر بلۆغی بوبێ، بەو مەرجەی (ظَهَرَتْ حَاجَتُهُ) کوڕە شێتەکە پێویستی بە ژن هەبێ: وەك بە دەورەی ئافرەتاندا بگەڕێ، یان دوو پزیشکی‌دادپەروەر بڵێن: بە ژن هێنان چاك دەبێتەوە.

بەڵام (لاَ صَغِيرَةٍ وَصَغِيرٍ) لە سەر باوك‌و باپیرە واجب نیە: کیژی نەبالغ مارە بکەن‌و، ژن لە کوڕی نەبالغ مارە بکەن، جا هەرچەند واجب نیە، بەڵام مارەکردنەکەو لێمارەکردنەکە هەردووکی دروست دەبن، ئەگەر هەردووکیان عاقڵ بن، هەروەك لە باسی ژن مارەکردن لە مرۆڤی قەدەغەکراودا ڕوونی دەکەینەوە، إن شاء الله تعالى.

(وَ) هەروەها (يَلْزَمُ الْمُجْبِرَ) لە سەر باوك‌و باپیرە واجبە، هەم (وَغَيْرَهُ إِنْ تَعَيَّنَ) لە سەر سەرپەرشتکارەکانی‌تری جگە لە باوك‌و باپیرەش واجبە ئەگەر بە تەنها بێ: وەك یەك برا، یان یەك مام (إِجَابَةُ مُلْتَمِسَةِ التَّزْوِيجِ) وەڵامی ئەو ئافرەتە بداتەوە: کە داوای لێدەکا لە پیاوێکی هاوچەشنی‌خۆی مارەی بکا، واتە: واجبە لە پیاوەکەی مارە بکا.

فَإنْ لَمْ يَتعَيَّنْ كَإخوَة فَسألَتْ بَعْضَهُمْ لَزِمَهُ الإجَابَةُ فِي الأَصَحِّ، وَإذَا اجْتَمَعَ أولِيَاءُ فِـي دَرَجَة اُسْتُحبَّ أنْ يُزَوِّجَهَا أفقَهُهُمْ وَأَسَنُّهُمْ برِضَاهُمْ، فَإنْ تَشَاحُّوا أُقْرِعَ، فَلَوْ زَوَّجَ غيرُ مَنْ خَرَجَتْ قُرْعَتُهُ وَقَدْ أذِنَتْ لِكُلٍّ مِنهُمْ صَحَّ فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ زَوَّجَهَا أحَـدُهُمْ زَيْـدًا وَآخَرُ عَمْرًا: فَإنْ عُرِفَ السَّابِقُ فَهُوَ الصَّحِيحُ،

---

(فَإنْ لَمْ يَتَعَيَّنْ) جا ئەگەر سەرپەرشتكارەكە بە تەنها نەبو: (كَإخْوَة) وەك چەند برايەك، يان چـەند مامێـك (فَسَـألَتْ بَعْضَـهُمْ) جـا ئافرەتەكـەش داواى لـە يـەكێكيان كـرد: كـە لـە هاوچەشنەكە مارەى بكا، ئەو كاتە (لَزِمَهُ الإجَابَـةُ) لـە سـەر داواليكراوەكـە واجبـە: وەلامـى بداتەوەو لە هاوچەشنەكە مارەى بكا (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەى ڕاستتردا، ئـەگينا: هـەموو سەرپەرشتكارەكان گوناهبار دەبن.

(وَإذَا اجْتَمَعَ أوْلِيَاءُ فِي دَرَجَة) هەر كاتێك چەند سەرپەرشتكارێك لە يەك پلـەدا كۆ بونـەوە: وەك دوو براى لەدايكوباوكىو زياتر، يان دوو مامو زياتر...هتد، ئـەوە (اُسْتُحِبَّ أنْ يُزَوِّجَهَـا أفْقَهُهُـمْ) وەهــا ســوننەتە: شــەرعزانترەكەيان مــارەى بــبڕى، ئينجـا (وَأسَـنُّهُمْ) بـە تەمەنترەكەيان، بەلام (بِرِضَاهُمْ) بە ڕازىبوونى گشتيان، جا بزانە: ئەوە لە حالەتێكدا بـوو: كە ئافرەتەكە گشتيانى ئيزن دابێ مارەى بكەن، بەلام ئەگەر تەنها يـەكێكيانى ئيـزن دابـێ، ئەو كاتە تەنها بۆ ئيزندراوەكە دروستە مارەى ببڕێ، هەر چـەند نـەزانترو كـەم تەمـەنتريش بێ، واتە: ئەگەر سەرپەرشتكارێكىترىئيزننەدراو مارەى بكـا، مارەبڕينەكـە دروسـت نابـێ، هەروەك (الشبراملسي) فەرموويەتى.

ئينجا (فَإنْ تَشَاحُّوا) ئەگەر گشتيان سووربونو هەر يەكەيان دەيگوت: من مـارەى دەبڕم. ئەو كاتە (أُقْرِعَ) پشكە لە نێوانياندا دەكرێ: جا كامەيان ناوى دەرچو، ئەو مارەى دەبـڕێ، بەلام (فَلَوْ زَوَّجَ غَيْرُ مَنْ خَرَجَتْ قُرْعَتُهُ) ئەگەر جگە لـە ناودەرچووەكە سەرپەرشـتكارێكىتر مارەى كرد (وَقَدْ أذِنَتْ لِكُلٍّ مِنْهُمْ) لەو حالەتـەش ئافرەتەكـە گشـتيانى ئيـزن دابـون، ئـەوە (صَحَّ) مارەبڕينەكە دروست دەبێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەى ڕاستتردا، چونكە پشـكەكردن كێشەكە دەبڕێنێتەوە، بەلام سەرپەرشتكاريەتى لانابا.

(وَ) هەر لەو حالەتەى ئافرەتەكە گشت سەرپەرشـتكارەكانى ئيـزن دان (لَـوْ زَوَّجَهَـا أحَدُهُمْ زَيْدًا) ئەگەر سەرپەرشتكارێك لە (زەيد)ى مارە كرد (وَآخَرُ عَمْرًا) سەرپەرشتكارێكىتريش لە (عەمر)ى مارە كرد، ئەوە تەماشا دەكـەين: (فَـإنْ عُـرِفَ السَّـابِقُ) ئەگـەر زانـدرا پێشـدا لـە كامەيان مارە كراوە، ئەوە (فَهُوَالصَّحِيحُ) پێشكەوتووەكە دروست بـووەو دواكەوتووەكـەش بەتالـە، پێغەمبـەرﷺ دەفـەرموێ: ﴿أيُّمَا إمْرَأة زَوَّجَهَا وَلِيَّان فَهِيَ لِلأَوَّلِ مِنْهُمَا﴾ رواه أحمـد وحسنه الترمذي، هەر ئافرەتێك دوو سەرپەرشتكار مارەى ببڕن، ئەوە بۆ يەكەمەكەيانە.

وَإِنْ وَقَعَا مَعًا أَوْ جُهِلَ السَّبْقُ وَالْمَعِيَّةُ فَبَاطِلاَنِ، وَكَذَا لَوْ عُرِفَ سَبْقُ أَحَدِهِمَا وَلَمْ يَتَعَيَّنْ عَلَى الْمَذْهَبِ، وَلَوْ سَبَقَ مُعَيَّنٌ ثُمَّ اشْتَبَهَ وَجَبَ التَّوَقُّفُ حَتَّى يَتَبَيَّنَ، فَإِنْ ادَّعَى كُلُّ زَوْجٍ عِلْمَهَا بِسَبْقِهِ سُمِعَتْ دَعْوَاهُمَا بِنَاءً عَلَى الْجَدِيدِ: وَهُوَ قَبُولُ إِقْرَارِهَا بِالنِّكَاحِ، فَإِنْ أَنْكَرَتْ حُلِّفَتْ، وَإِنْ أَقَرَّتْ لأَحَدِهِمَا ثَبَتَ نِكَاحُهُ،

---

بەلام (وَإِنْ وَقَعَا مَعًا) ئەگەر لە یەك كاتدا وێكرا مارەبڕینەكان كرابون (أَوْ جُهِلَ السَّبْقُ وَالْمَعِيَّةُ) یان نەزاندرا كامەیان پێشدا بووە، یان وێكرا بووە، ئەو كاتە (فَبَاطِلاَنِ) هەردوو مارەبڕینەكان لە هەردوو مەسەلەدا بەتاڵن‌و دروست نەبوونە.

(وَكَذَا لَوْ عُرِفَ سَبْقُ أَحَدِهِمَا) هەروەها ئەگەر زاندرا: یەكێك پێشدا مارەی بڕیوە، بەلام (وَلَمْ يَتَعَيَّنْ) دیار نەبو كامەیانە؟ ئەو كاتەش مارەبڕینەكە دروست نابێ (عَلَى الْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب (وَلَوْ سَبَقَ مُعَيَّنٌ) ئەگەر پێشدا یەكێكی دیاركراو مارەی بڕیبو (ثُمَّ اشْتَبَهَ) ئینجا دیاركراوەكە شێوراو لە بیر چوو كامە بووە، ئەو كاتە (وَجَبَ التَّوَقُّفُ حَتَّى يَتَبَيَّنَ) واجبە: ڕابگیرێ تا ڕوون دەبێتەوە پێشدا لە كامەیان مارە براوە:

كەواتە: نابێ ئەو دوو مێردانە هیچێكیان لەزەتی لێوەربگرن‌و نابێ ئافرەتەكەش مێردێكی‌تر بكا تا هەردوو مێردەكان دەمرن، یان تا هەردووكیان تەلاقی دەدەن، یان تا یەكێكیان دەمرێ‌و ئەوی‌تریش تەلاقی دەدا، بەلام ئەگەر لە ڕوونبوونەوە بێئومێد بوو، ئەو كاتە بۆی دروستە: داوا لە قازی بكا: مارەبڕینەكەی بۆ (فسخ) بكاتەوە، واتە: هەڵبوەشێنێتەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(فَإِنْ ادَّعَى كُلُّ زَوْجٍ عِلْمَهَا بِسَبْقِهِ) ئەگەر هەردوو مێردەكان داوایان كردو گوتیان: ئافرەتەكە دەزانێ پێشدا لە كامەیان مارە كراوە، ئەوە (سُمِعَتْ دَعْوَاهُمَا) داوایەكەی هەردووكیان وەردەگیرێ‌و لە سەر ئافرەتەكە تۆمار دەكرێ (بِنَاءً عَلَى الْجَدِيدِ) لە سەر فەرموودەی نوێی‌ئیرابردوو (وَهُوَ) فەرموودە نوێیەكە ئەمە بوو: (قَبُولُ إِقْرَارِهَا بِالنِّكَاحِ) دانهێنانی ئافرەتەكە بە مارەبڕینەكە بۆ هەر كەسێك بێ: قبوڵ دەكرێ، ئەگەر بلۆغی بووبێ‌و عەقڵی هەبێ، هەروەك لە سەرتای (فصل)ی‌ڕابردوودا ڕوونمان كردەوە.

(فَإِنْ أَنْكَرَتْ) جا ئەگەر ئافرەتەكە گوتی: نازانم كامەیان پێشدا بووە، ئەو كاتە (حُلِّفَتْ) ئافرەتەكە سوێند دەدرێ: كە نازانێ. جا هەر كاتێك ئافرەتەكە بۆ هەردوو پیاوەكان سوێندی خوارد، ئەو كاتە شێوران‌و نەزانینەكە هەر بەردەوام دەبێ، بەلام (ابن الرفعة) دەفەرموێ: هەردوو مارەبڕینەكان بەتاڵ دەبن، جیاوازی نیە لە دوای سوێندی ئافرەتەكە هەردوو پیاوەكانیش سوێند بخۆن، یان نا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

بەلام (وَإِنْ أَقَرَّتْ لأَحَدِهِمَا) ئەگەر بۆ یەكێكیان دانی بە پێشكەوتنی مارەبڕینەكەدا هێنا، ئەوە (ثَبَتَ نِكَاحُهُ) مارەبڕینەكە بۆ ئەو پیاوە جێگیر دەبێ‌و دەبێتە ژنی وی، ئینجا

وَسَمَاعُ دَعْوَىٰ الآخَرِ وَتَحْلِيفُهَا لَهُ يَنْبَنِي عَلَى الْقَوْلَيْنِ فِيمَنْ قَالَ: هَذَا لِزَيْدٍ بَلْ لِعَمْرٍو. هَلْ يَغْرَمُ لِعَمْرٍو؟ إِنْ قُلْنَا نَعَمْ. فَنَعَمْ، وَلَوْ تَوَلَّى طَرَفَيْ عَقْدٍ فِي تَزْوِيجِ بِنْتِ ابْنِهِ بِابْنِ ابْنِهِ الآخَرِ صَحَّ فِي الأَصَحِّ، وَلاَ يُزَوِّجُ ابْنُ الْعَمِّ نَفْسَهُ بَلْ يُزَوِّجُهُ ابْنُ عَمٍّ فِي دَرَجَتِهِ، فَإِنْ فُقِدَ فَالْقَاضِي، فَلَوْ أَرَادَ الْقَاضِي نِكَاحَ مَنْ لاَ وَلِيَّ لَهَا زَوَّجَهُ مَنْ فَوْقَهُ مِنَ الْوُلاَةِ أَوْ خَلِيفَتُهُ،

---

(وَسَمَاعُ دَعْوَىٰ الآخَرِ) وەرگرتنی داوایەکەی پیاوەکەیترو، هەم (وَتَحْلِيفُهَا لَهُ) سوێنددانی ئافرەتەکە بۆ پیاوەکە (يَنْبَنِي عَلَى الْقَوْلَيْنِ فِيمَنْ قَالَ) لە سەر ئەو دوو فەرموودانە بنیات دەندرێ کە فەرموودەکان دەرهەق ئەو کەسە هاتون کە دەڵێ: (هَذَا لِزَيْدٍ بَلْ لِعَمْرٍو) ئەمە ملکی (زەید)ە، نا، بەڵکو ملکی (عەمر)ە. (هَلْ يَغْرَمُ لِعَمْرٍو) ئایا بەو دانهێنانە تۆڵەی شتەکەی-بۆ عەمر-دەکەوێتەسەر؟ (إِنْ قُلْنَا نَعَمْ) ئەگەر بە فەرموودەی بەهێزتر بڵێین: بەڵێ دەیکەوێتەسەر، ئەوە لێرەشدا (فَنَعَمْ) بەڵێ داوایەکەی پیاوەکەیتریش وەردەگیرێ تاکو ئافرەتەکە سوێند بدا، جا ئەگەر ئافرەتەکە بۆ ئەویش دانی هێنا، یان دانی نەهێناو سوێندیشی نەخوارد، بەلام پیاوەکە سوێندی خوارد، ئەو کاتە تۆڵەی مارەیی هاووێنە دەکەوێتە سەر ئافرەتەکە بۆ ئەم پیاوە دووەمە.

### ﴿ سەرپەرشتکارێك بۆ هەردوو لای مارەبڕین ﴾

(وَلَوْ تَوَلَّى طَرَفَيْ عَقْدٍ) ئەگەر باپیرە بووە سەرپەرشتکاری هەردوو لای مارەبڕینێك (فِي تَزْوِيجِ بِنْتِ ابْنِهِ بِابْنِ ابْنِهِ الآخَرِ) لە مارەبڕینی کیژەکوڕێکیخۆی لە کوڕی کوڕێکیتری خۆی: وەك باپیرە لە لای دووشاهید بڵێ: فلانەکیژەکوڕیخۆم کردە ژنی فلانەکوڕیکوڕی خۆمو بۆ ئەویم قبوڵ کرد بە ژنایەتی. ئەوە (صَحَّ) مارەبڕینەکە دروست دەبێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

بەلام -جگە لە باپیرە- هیچ سەرپرشتکارێکیتر ناتوانێ ببێتە سەرپەرشتکاری هەردوو لای مارەبڕینەکە، کەوابو: (وَلاَ يُزَوِّجُ ابْنُ الْعَمِّ نَفْسَهُ) دروست نیە: کوڕەمام کیژەمامی خۆی لە خودیخۆی مارە ببڕێ (بَلْ يُزَوِّجُهُ ابْنُ عَمٍّ فِي دَرَجَتِهِ) بەڵکو کوڕەمامێکیتری لە پلەیخۆی لێی مارە دەبڕێ (فَإِنْ فُقِدَ فَالْقَاضِي) جا ئەگەر هیچ کوڕەمامێکی لە پلەی خۆی نەبو، ئەو کاتە قازی لێی مارە دەبڕێ، بەلام دروستیشە بە (تَقْلِيد)ی مەزهەبی (حنفي): کیژەمامەکە وەکیلێك بگرێ، یان هەر بەخۆی خۆی لێمارە بکا، هەروەك لە (فصل)ی ڕابردوودا ڕوونمان کردەوە.

(فَلَوْ أَرَادَ الْقَاضِي نِكَاحَ مَنْ لاَوَلِيَّ لَهَا) جا ئەگەر قازی ویستی ئافرەتێك لە خۆی مارە بکاو ئافرەتەکەش هیچ سەرپەرشتکارێکی نەبو، ئەو کاتە (زَوَّجَهُ مَنْ فَوْقَهُ مِنَ الْوُلاَةِ) کاربەدەستێکی لە خۆی بە سەرەوەتر ئافرەتەکەی لێ مارە دەکا (أَوْ خَلِيفَتُهُ) یان جێگرێکی کاربەدەستەکە لێی مارە دەکا.

وَكَمَا لاَ يَجُوزُ لِوَاحِدٍ تَوَلِّي الطَّرَفَيْنِ لاَ يَجُوزُ أَنْ يُوَكِّلَ وَكِيلاً فِي أَحَدِهِمَا أَوْ وَكِيلَيْنِ فِيهِمَا فِي الأَصَحِّ.
(فَصْلٌ) زَوَّجَهَا الْوَلِيُّ غَيْرَ كُفْءٍ بِرِضَاهَا أَوْ بَعْضُ الأَوْلِيَاءِ الْمُسْتَوِينَ بِرِضَاهَا وَرِضَا الْبَاقِينَ صَحَّ، وَلَوْ زَوَّجَهَا الأَقْرَبُ بِرِضَاهَا فَلَيْسَ لِلأَبْعَدِ اعْتِرَاضٌ، وَلَوْ زَوَّجَهَا أَحَدُهُمْ بِهِ بِرِضَاهَا دُونَ رِضَاهُمْ

---

(وَكَمَا لاَيَجُوزُ لِوَاحِدٍ تَوَلِّي الطَّرَفَيْنِ) هەروەك دروست نیە یەك كەس ببێتە سەرپەرشتكاری هەردوو لای مارەبڕینەكە، ئەوەش (لاَيَجُوزُ أَنْ يُوَكِّلَ وَكِيلا فِي أَحَدِهِمَا) دروست نیە: وەكیلێك بۆ لایەكی مارەبڕینەكە بگرێو بە خۆیشی سەرپەرشتكاری لایەكەیتر بێ (أَوْ وَكِيلَيْنِ فِيهِمَا) یان دوو وەكیل بۆ هەردوو لای مارەبڕینەكە بگرێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی راستتردا.
ئینجا بزانە: بۆ باپیرە دروستە دوو وەكیل بۆ هەردوو لای مارەبڕینەكە بگرێ لەو كاتەی كیژەكوڕەكەی لە كوڕیكوڕەكەی مارە دەبڕێ، بەڵام دروست نیە بۆ هەردوو لا تەنها یەك وەكیل بگرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی هاوچەشنیی ژن و مێرد ﴾

بزانە: هاوچەشنیی ژن و مێرد مافی ژنەكەو سەرپەرشتكارەكەیەتی، واتە: دروستە هەردووكیان وێكڕا واز لەو مافە بێنن، بەڵام ئەگەر ژنەكە، یان سەرپەرشتكارێكی نزیك ڕازی نەبێ، ئەو كاتە مارەبڕینەكە دروست نابێ.
كەوابو: (لَوْ زَوَّجَهَا الْوَلِيُّ غَيْرَ كُفْءٍ بِرِضَاهَا) ئەگەر سەرپەرشتكارێكی تاك: وەك باوك، یان تاكە برایەك بە ڕەزامەندی ئافرەتەكە ئافرەتەكەی لە مێردێكیوەها مارە كرد: كە هاوچەشن نەبو (أَوْ بَعْضُ الأَوْلِيَاءِ الْمُسْتَوِينَ) یان یەكێك لە سەرپەرشتكارە یەكسانەكان —وەك برایەك لە برایەكان— ئافرەتەكەی مارە كرد لە مێردێكی وەها: كە هاوچەشن نەبو، بەڵام (بِرِضَاهَا وَرِضَا الْبَاقِينَ) بە ڕەزامەندی ئافرەتەكەو سەرپەرشتكارەكانیتر، ئەوە (صَحَّ) لە هەردوو مەسەلەدا مارەبڕینەكە دروستە.
(وَ) هەروەها (لَوْ زَوَّجَهَا الأَقْرَبُ بِرِضَاهَا) ئەگەر سەرپەرشتكارێكی نزیكتر بە ڕەزامەندی ئافرەتەكە ئافرەتەكەی لە كەسێك مارە كرد كە هاوچەشن نەبو، ئەوە مارەبڕینەكە دروستە، كەوابو: (فَلَيْسَ لِلأَبْعَدِ اعْتِرَاضٌ) سەرپەرشتكارە دوورترەكە مافی ڕەخنەی نیە، چونكە بە هۆی نزیكەكە ئێستا مافی سەرپەرشتكاریی نیە.
(وَلَوْ زَوَّجَهَا أَحَدُهُمْ بِهِ بِرِضَاهَا) ئەگەر یەكێك لە سەرپەشتكارە یەكسانەكان —بە ڕەزامەندی ئافرەتەكە— ئافرەتەكەی مارە كرد لە مێردێكی وەها: كە هاوچەشن نەبو (دُونَ رِضَاهُمْ) بەڵام سەرپەرشتكارەكانیتر ڕازی نەبون: وەك یەكێك لە برایەكانی ڕازی

لَمْ يَصِحَّ، وَفِي قَوْلٍ يَصِحُّ وَلَهُمُ الْفَسْخُ، وَيَجْرِي الْقَوْلاَنِ فِي تَزْوِيجِ الأَبِ بِكْرًا صَغِيرَةً أَوْ بَالِغَةً غَيْرَ كُفْءٍ بِغَيْرِ رِضَاهَا: فَفِي الأَظْهَرِ بَاطِلٌ، وَفِي الآخَرِ يَصِحُّ وَلِلْبَالِغَةِ الْخِيَارُ وَلِلصَّغِيرَةِ إِذَا بَلَغَتْ، وَلَوْ طَلَبَتْ مَنْ لاَ وَلِيَّ لَهَا أَنْ يُزَوِّجَهَا السُّلْطَانُ بِغَيْرِ كُفْءٍ فَفَعَلَ لَمْ يَصِحَّ فِي الأَصَحِّ، وَخِصَالُ الْكَفَاءَةِ: سَلاَمَةٌ مِنَ الْعُيُوبِ الْمُثْبِتَةِ لِلْخِيَارِ، وَحُرِّيَّةٌ فَالرَّقِيقُ لَيْسَ كُفْئًا لِحُرَّةٍ

---

نەبێ، ئەوە (لَمْ يَصِحَّ) مارەبڕینەکە دروست نابێ، بەڵام (وَفِي قَوْلٍ) لە فەرموودەیەکیتردا (يَصِحُّ وَلَهُمُ الْفَسْخُ) مارەبڕینەکە دروست دەبێو سەرپەرشتکارەکانی ناڕازیش مافی (فَسْخ) هەڵوەشاندنەوەی مارەبڕینەکەیان هەیە.

ئینجا بزانە: ئەگەر گشت سەرپەرشتکارەکان ڕازی بونو ژنەکە لە مێردێکی وەها مارە کرا: کە هاوچەشن نەبو، ئینجا بە هۆیتەڵاق ژنەکە لەو مێردە جیا بۆوە، ئینجا سەرپەرشتکارێکی یەکسان بە ڕەزامەندی ژنەکە ژنەکەی دووبارە لە خودیمێردەکەی مارە کردەوە، ئەوە مارەبڕینەکەی دووەمیش بێڕەزامەندی ئەوانیتر دروست دەبێ، چونکە لە سەرەتاوە بۆ یەکەمەکە ڕازی بونە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوکاندا فەرموویانە.

(وَيَجْرِي الْقَوْلاَنِ) ئەم دوو فەرموودە بەهێزو بێهێزە دێنە جێ: (فِي تَزْوِيجِ الأَبِ بِكْرًا صَغِيرَةً أَوْ بَالِغَةً) لەو مەسەلەیەی کە باوك، یان باپیرە کچێکی نەبالغ، یان بالغ مارە بکەن (غَيْرَ كُفْءٍ) لە مێردێکی وەها کە هاوچەشن نەبێ (بِغَيْرِ رِضَاهَا) بە بێڕەزامەندی کچەکە، ئەوە (فَفِي الأَظْهَرِ بَاطِلٌ) لە فەرموودەی بەهێزتردا مارەبڕینەکە بەتاڵو دروست نیە، بەڵام (وَفِي الآخَرِ) لە فەرموودەکەیتردا: (يَصِحُّ) مارەبڕینەکەی بالغەکەو نەبالغەکە هەردووکی دروستەو (وَلِلْبَالِغَةِ الْخِيَارُ) کچە بالغەکە هەر ئەو دەمە بۆی دروستە (فَسْخ) مارەبڕینەکە هەڵبوەشێنێتەوە، هەم (وَلِلصَّغِيرَةِ إِذَا بَلَغَتْ) کچە نەبالغەکەش هەر کاتێك بلوغی بوو، بۆی دروستە مارەبڕینەکە هەڵبوەشێنێتەوە.

(وَلَوْ طَلَبَتْ مَنْ لاَ وَلِيَّ لَهَا) ئەگەر ئافرەتێك هیچ سەرپەرشتکارێکی نەبو و داوای کرد: (أَنْ يُزَوِّجَهَا السُّلْطَانُ) کاربەدەست مارەی بکا (بِغَيْرِ كُفْءٍ) لە پیاوێکی کە هاوچەشن نەبێ (فَفَعَلَ) کاربەدەستەکەش لێی مارەکرد (لَمْ يَصِحَّ فِي الأَصَحِّ) مارەبڕینەکە دروست نابێ، لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَخِصَالُ الْكَفَاءَةِ) ئەو سیفەتانەی لە هاوچەشنیدا ڕەچاو دەکرێن پێنجن: یەکەم: (سَلاَمَةٌ مِنَ الْعُيُوبِ الْمُثْبِتَةِ لِلْخِيَارِ) ساغیی مێردەکەیە لەو عەیبانەی مافی پەشیمانی جێگیر دەکەن، واتە: مێردەکە شێت نەبێو گروو نەبێو بەڵەك نەبێو...هتد.

دووەم: (وَحُرِّيَّةٌ) ئازادیی مێردەکەیە، کەوابو: (فَالرَّقِيقُ لَيْسَ كُفْئًا لِحُرَّةٍ) کۆیلە

وَالْعَتِيقُ لَيسَ كُفئًا لِحُرَّة أَصْلِيَّة، وَنَسَبٌ فَالْعَجَمِيُّ لَيس كُفْءَ عَرَبِيَّة وَلاَ غَيْرُقُرشِيٍّ قُرَشِيَّةً وَلاَ غَيْرُ هَاشِمِيٍّ وَمُطَّلِبِيٍّ لَهُمَا، وَالأَصَحُّ اعْتِبَارُالنَّسَب فِي الْعَجَم كَالْعَرَب، وَعِفَّةٌ فَلَيْسَ فَاسِقٌ كُفْءَ عَفِيفَة، وَحِرْفَةٌ فَصَاحِبُ حِرْفَة دَنِيئَة لَيْسَ كُفْءَ أَرْفَعَ مِنْهُ: فَكَنَّاسٌ وَحَجَّامٌ وَحَارِسٌ وَرَاعٍ وَقَيِّمُ الْحَمَّامِ لَيسَ كُفْءَ بِنْت خَيَّاط، وَلاَ خَيَّاطٌ بِنْتَ تَاجِرٍ أَوْ بَزَّازٍ، وَلاَ هُمَا بِنْتَ عَالِمٍ وَقَاضٍ، وَالأَصَحُّ أَنَّ الْيَسَارَ لاَ يُعْتَبَرُ، وَأَنَّ بَعْضَ الْخِصَالِ لاَ يُقَابَلُ

---

هاوچەشنی ئافرەتی‌ئازاد نیە، هەم (وَالْعَتِيقُ لَيْسَ كُفْئًا لِحُرَّةٍ أَصْلِيَّةٍ) ئازادکراویش هاوچەشنی ئافرەتی ئازادی بنچینە نیە.

سێیەم: (وَنَسَبٌ) نەژادی مێردەکەیە، کەوابو: (فَالْعَجَمِيُّ لَيْسَ كُفْءَ عَرَبِيَّةٍ) پیاوی عەجەم-کە عەرەب نەبێ- هاوچەشنی ئافرەتی عەرەبی‌ڕاستەقینە نیە، چونکە ئەوان بەهۆی پێغەمبەرﷺ ڕێزدارترن (وَلاَ غَيْرُ قُرَشِيٍّ قُرَشِيَّةً) هەروەها عەرەبێك کە قورەیشی نەبێ هاوچەشنی ئافرەتێکی‌قورەیشی نیە، هەم (وَلاَ غَيْرُ هَاشِمِيٍّ وَمُطَّلِبِيٍّ لَهُمَا) قورەیشی‌یەك کە لە بەرەبابی (هاشم)و (المطّلب) نەبێ، ئەویش هاوچەشنی ئافرەتەکانی ئەو دوو بەرەبابە نیە، چونکە ئەوانەش بە هۆی نزیکتریيان لە پێغەمبەرﷺ لە ئەوانی‌تر ڕێزدارترن (وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی‌ڕاستتر (اعْتِبَارُ النَّسَبِ فِي الْعَجَمِ كَالْعَرَبِ) نەژاد لە عەجەم - واتە لە گەلەکانی‌تری جگە لە عەرەبیش- ڕەچاو دەکرێ، هەروەك لە عەرەبەکانیش ڕەچاو دەکرێ.

چوارەم: (وَعِفَّةٌ) ئایین پەروەری‌ی مێردەکەیە، کەوابو: (فَلَيْسَ فَاسِقٌ كُفْءَ عَفِيفَةٍ) پیاوی فاسق هاوچەشنی ئافرەتی بێگوناه نیە: وەك مێردێکی بالغی گوناهبارو ئافرەتێکی نەبالغ، یان مێردێکی بیدعەکار: وەك (شیعة)و (خوارج)و ئافرەتێکی(أهل السنة)، یان پیاوێکی زیناکەرو ئافرەتێکی داوێنپاك...هتد.

پێنجەم: (وَحِرْفَةٌ) پیشەی مێردەکەیە، کەوابو: (فَصَاحِبُ حِرْفَةٍ دَنِيئَةٍ) خاوەن پیشەیەکی ناشیرن‌و بێنرخ (لَيْسَ كُفْءَ أَرْفَعَ مِنْهُ) هاوچەشنی ئافرەتێکی وەها نیە کە پیشەکەی لەوی بەرزتر بێ، بۆ وێنە: (فَكَنَّاسٌ) زبلماڵی کۆلانان‌و (وَحَجَّامٌ) خوێنگر (وَحَارِسٌ) پاسەوان‌و (وَرَاعٍ) شوان‌و (وَقَيِّمُ الْحَمَّامِ) بەڕێوەبەری گەرماو، هیچێکیان (لَيْسَ كُفْءَ بِنْتِ خَيَّاطٍ) هاوچەشنی کیژی بەرگدروو نین (وَ) هەروەها (لاَ خَيَّاطٌ بِنْتَ تَاجِرٍ أَوْ بَزَّازٍ) بەرگدرووش هاوچەشنی کیژی بازرگان، یان کوتاڵفرۆش نیە (وَلاَ هُمَا بِنْتَ عَالِمٍ وَقَاضٍ) هەروەها بازرگان‌و کوتاڵفرۆش هاوچەشنی کیژی زانای‌ئایینی‌و کیژی(قازی) نین.

(وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر (أَنَّ الْيَسَارَ لاَيُعْتَبَرُ) دەوڵەمەندی ڕەچاو ناکرێ‌و بە سیفەتی هاوچەشنی دانانرێ (وَ) هەر بە فەرموودەی‌ڕاستتر (أَنَّ بَعْضَ الْخِصَالِ لاَيُقَابَلُ

بِبَعْضٍ، وَلَيْسَ لَهُ تَزْوِيجُ ابْنِهِ الصَّغِيرِ أَمَةً، وَكَذَا مَعِيبَةً عَلَى الْمَذْهَبِ، وَيَجُوزُ مَنْ لاَ تُكَافِئُهُ بِبَاقِي الْخِصَالِ فِي الأَصَحِّ.
(فَصْلٌ) لاَ يُزَوَّجُ مَجْنُونٌ صَغِيرٌ وَكَذَا كَبِيرٌ إِلاَّ لِحَاجَةٍ فَوَاحِدَةً، وَلَهُ تَزْوِيجُ صَغِيرٍ عَاقِلٍ أَكْثَرَ مِنْ وَاحِدَةٍ، وَيُزَوِّجُ الْمَجْنُونَةَ أَبٌ أَوْ جَدٌّ إِنْ ظَهَرَتْ مَصْلَحَةٌ، وَلاَ تُشْتَرَطُ الْحَاجَةُ وَسَوَاءٌ صَغِيرَةٌ وَكَبِيرَةٌ ثَيِّبٌ وَبِكْرٌ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ أَبٌ وَجَدٌّ لَمْ تُزَوَّجْ فِي صِغَرِهَا،

---

بِبَعْضٍ) هەندێك سیفەتیهاوچەشنی بەرامبەر هەندێكیتر ناكرێن، كەوابو: پیاوێكیگرووی خاوەن نەژاد هاوچەشنی كیژە زیلمالێكی ساغ نیە.
(وَلَيْسَ لَهُ تَزْوِيجُ ابْنِهِ الصَّغِيرِ أَمَةً) بۆ باوكو باپیرە دروست نیە ئافرەتێكیكۆیلە لە كوڕە نەبالغەكەیخۆیان مارە بكەن (وَكَذَا مَعِيبَةً) هەروەها بۆیان دروست نیە ژنێكیعەیبداریشی لێ مارە بكەن (عَلَى الْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی راستیمەزهەب، بەلام (وَيَجُوزُ مَنْ لاَتُكَافِئُهُ بِبَاقِي الْخِصَالِ) دروستە: ئافرەتێكی وەها لە كوڕە نەبالغەكە مارە بكەن كە لە سیفەتەكانیتردا هاوچەشنی نەبێ: وەك نەژادو پیشە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی راستتردا، چونكە هەر كاتێك كوڕەكە بلۆغی بوو دەتوانێ مارەبڕینەكە هەڵبوەشێنێتەوە، هەروەك لە زۆربەیسەرچاوەكاندا فەرموویانە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی ژن مارەكردن لە مرۆڤی قەدغەكراو ﴾

واتە: بە هۆی شێتی، یان منداڵی، یان قەرزداری، یان ماڵ بەفیڕۆدان، یان كۆیلەیی.
(لاَ يُزَوَّجُ مَجْنُونٌ صَغِيرٌ) نابێ ژن لە شێتێكی نەبالغ مارە بكرێ، واتە: مارەبڕینەكە دروست نابێ (وَكَذَا كَبِيرٌ) هەروەها دروست نیە ژن لە شێتێكی بالغیش مارە بكرێ (إِلاَّ لِحَاجَةٍ) تەنها لە بەر پێویستی نەبێ: وەك دڵی بۆ جیماع بچێو بە دەورەی ئافرەتاندا بگەڕێ، یان دوو پزیشكیدادپەروەر بڵێن: بە ژن هێنان چاك دەبێتەوە، ئەو كاتە (فَوَاحِدَةً) دروستە تەنها یەك ژنی لێمارە بكەن، نەك زیاتر.
بەلام (وَلَهُ) بۆ باوكو باپیرە درستە (تَزْوِيجُ صَغِيرٍ عَاقِلٍ أَكْثَرَ مِنْ وَاحِدَةٍ) زیاتر لە ژنێك—تا دەگاتە چوار ژن— لە كوڕی نەبالغی عاقڵ مارە بكەن.
(وَيُزَوِّجُ الْمَجْنُونَةَ أَبٌ أَوْ جَدٌّ) ئافرەتی شێت باوكی، یان باپیرەی مارەی دەبڕێ (إِنْ ظَهَرَتْ مَصْلَحَةٌ) ئەگەر بەرژەوەندی لە مارەبڕینەكەیدا هەبێ، بەلام (وَلاَ تُشْتَرَطُ الْحَاجَةُ) بە مەرج دانانرێ ئافرەتە شێتەكە پێویستی بە مێرد هەبێ، كەوابو: (وَسَوَاءٌ) بۆ دروستبوونی مارەبڕینەكە یەكسانە: (صَغِيرَةٌ وَكَبِيرَةٌ ثَيِّبٌ وَبِكْرٌ) ئافرەتە شێتەكە: بالغ بێ، یان نەبالغ بێ، بێوەژن بێ، یان كچ بێ، بەلام (فَإِنْ لَمْ يَكُنْ أَبٌ وَجَدٌّ) ئەگەر باوكو باپیرە نەبون، ئەو كاتە (لَمْ تُزَوَّجْ فِي صِغَرِهَا) دروست نیە ئافرەتە شێتەكە بە نەبالغی مارە بكرێ، بەڵكو

فَإنْ بَلَغَتْ زَوَّجَهَا السُّلطَانُ فِى الأَصَحِّ لِلْحَاجَةِ لاَ لِمَصلَحَة فِى الأَصَحِّ، وَمَنْ حُجِرَ عَلَيْهِ بِسَفَهٍ لاَ يَستَقِلُّ بِنِكَاحٍ بَلْ يَنْكِحُ بِإِذْنِ وَلِيِّهِ أَوْ يَقْبَلُ لَهُ الْوَلِيُّ، فَإنْ أَذِنَ لَهُ وَعَيَّنَ امْرَأَةً لَمْ يَنْكِحْ غَيْرَهَا وَيَنْكِحُهَا بِمَهْرِ الْمِثْلِ أَوْ أَقَلَّ، فَإِنْ زَادَ فَالْمَشْهُورُ صِحَّةُ النِّكَاحِ بِمَهْرِ الْمِثْلِ مِنَ الْمُسَمَّى، وَلَوْ قَالَ انْكِحْ بِأَلْفٍ وَلَمْ يُعَيِّنْ امْرَأَةً نَكَحَ بِالأَقَلِّ مِنْ أَلْفٍ وَمَهْرِ مِثْلِهَا، وَلَوْ أَطْلَقَ الإِذْنَ فَالأَصَحُّ صِحَّتُهُ وَيَنْكِحُ بِمَهْرِ الْمِثْلِ مَنْ تَلِيقُ بِهِ،

---

(فَإنْ بَلَغَتْ زَوَّجَهَا السُّلطَانُ) ئەگەر بلۆغی بوو، ئەو کاتە کاربەدەست مارەی دەبڕێ (فِى الأَصَحِّ) لە فەرموودەی راستتردا، بەلام (لِلْحَاجَةِ) لە بەر پێویستی (لاَ لِمَصلَحَة) نەك لە بەر بەرژەوەندی (فِى الأَصَحِّ) لە فەرموودەی راستتردا.

﴿ ئاگـــاداری ﴾: لـــە مەزهـــەبی ئیمـــامی(حنفـــي)دا: بـــۆ بـــاوكو بـــاپیرەو بـــۆ سەرپەرشتكارەكانیتریش-بەگوێرەی ڕیزیمیراتگرتن- دروستـە: ژن لـە كوڕی نـەبالغ مارە بكەن، هەم ئافرەتی شێت مارە بـبڕن، هەرچەند بێوەژنیش بێو بلۆغیشی بوبێ، هەروەك (الدر المنقى)دا فەرموویەتی.

(وَمَنْ حُجِرَ عَلَيْهِ بِسَفَهٍ) هەركەسێك بە هۆی ماڵ بە فیڕۆدان قەدەغەی لە سەر داندرابێ (لاَ يَستَقِلُّ بِنِكَاحٍ) دروست نیە سەربەخۆ ژن لە خۆی مارە بكا (بَلْ يَنْكِحُ بِإِذْنِ وَلِيِّهِ) بەڵكو بە ئیزنی سەرپەرشتكارەكەی ژن مارە دەكا (أَوْ يَقْبَلُ لَهُ الْوَلِيُّ) یان سەرپەرشتكارەكەی بۆی قبولْ دەكـا (فَـإنْ أَذِنَ لَـهُ) جـا ئەگـەر سـەر پەرشـتكارەكەی ئیزنـیدا (وَعَـيَّنَ امْـرَأَةً) ئافرەتێكیشی بۆ دیاری كرد لە خۆی مارە بكا، ئەو كاتە (لَمْ يَنْكِحْ غَيْرَهَا) دروست نیە جگە لەو ئافرەتە هیچ ئافرەتێكیتر لە خۆی مارە بكا، ئینجا (وَيَنْكِحُهَا بِمَهْرِ الْمِثْلِ أَوْ أَقَلَّ) كە ئافرەتە دیاركراوەكەش لە خۆی مارە دەكا، دەبێ بە مارەیی هاووێنە، یان بـە كـەمتر بێ (فَإنْ زَادَ) جا ئەگەر بە زیاتر لە مارەیی هاووێنە مارەی كرد، ئەوە (فَالْمَشْهُورُ صِحَّةُ النِّكَاحِ بِمَهْرِ الْمِثْلِ مِنَ الْمُسَمَّى) بە فەرموودەی ناسراوی مەزهەب: مارەبڕینەكەی دروست دەبێ بـە ئەندازەی مارەیی هاووێنە لەو مارەییە ناوبراوە.

(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر سەرپەرشتكارەكەی گوتی (انْكِحْ بِأَلْفٍ) بـە هـەزار دینـار ژنێك لـە خـۆت مارەبكە، بەلام (وَلَمْ يُعَيِّنْ امْرَأَةً) هیچ ئافرەتێكی بۆ دیاری نەكرد، ئەو كاتە (نَكَحَ بِالأَقَلِّ مِنْ أَلْفٍ وَمَهْرِ مِثْلِهَا) ژنێك لە خۆی مارە دەكا بە مارەییەكیكەمتر: لـە هـەزارەكـەو لـە مارەییـە هاووێنەكەی ئافرەتەكە (وَلَوْ أَطْلَقَ الإِذْنَ) ئەگەر بێدیـاریكردنی ئـافرەتو مـارەیی ئیزنـیدا ژنێـك لـە خـۆی مـارە بكـا، ئـەوە (فَالأَصَحُّ صِحَّتُهُ) بـە فـەرموودەی راسـتتر: ئیزندانەكـە دروستەو (وَيَنْكِحُ بِمَهْرِ الْمِثْلِ مَنْ تَلِيقُ بِهِ) بـە مـارەیی هاووێنـە ئـافرەتێكی شـیاویخۆی لەخۆی مارە دەكا.

فَإِنْ قَبِلَ لَهُ وَلِيُّهُ اشْتُرِطَ إِذْنُهُ فِي الأَصَحِّ، وَيَقْبَلُ بِمَهْرِ الْمِثْلِ فَأَقَلَّ، فَإِنْ زَادَ صَحَّ النِّكَاحُ بِمَهْرِ الْمِثْلِ، وَفِي قَوْلٍ يَبْطُلُ، وَلَوْ نَكَحَ السَّفِيهُ بِلاَ إِذْنٍ فَبَاطِلٌ، فَإِنْ وَطِئَ لَمْ يَلْزَمْهُ شَيْءٌ، وَقِيلَ مَهْرُ مِثْلٍ، وَقِيلَ أَقَلُّ مُتَمَوَّلٍ، وَمَنْ حُجِرَ عَلَيْهِ لِفَلَسٍ يَصِحُّ نِكَاحُهُ، وَمُؤَنُ النِّكَاحِ فِي كَسْبِهِ، لاَ فِيمَا مَعَهُ، وَنِكَاحُ عَبْدٍ بِلاَ إِذْنِ سَيِّدِهِ بَاطِلٌ وَبِإِذْنِهِ صَحِيحٌ، وَلَهُ إِطْلاَقُ الإِذْنِ، وَلَهُ تَقْيِيدُهُ بِامْرَأَةٍ أَوْ قَبِيلَةٍ أَوْ بَلَدٍ، وَلاَ يَعْدِلُ عَمَّا أَذِنَ فِيهِ، وَالأَظْهَرُ أَنَّهُ لَيْسَ لِلسَّيِّدِ إِجْبَارُ عَبْدِهِ عَلَى النِّكَاحِ

---

(فَإِنْ قَبِلَ لَهُ وَلِيُّهُ) جا ئەگەر سەرپەشتكارەكەی مارەبڕینەكەی بۆ قبوڵ كرد، ئەو كاتە (اشْتُرِطَ إِذْنُهُ فِي الأَصَحِّ) بە مەرج داندراوە ماڵ بە فیڕۆدەرەكە ئیزنی بدا، ئینجا (وَيَقْبَلُ بِمَهْرِ الْمِثْلِ فَأَقَلَّ) سەرپەرشتكارەكەش بە مارەیی هاووێنەو بە كەمتر مارەبڕینەكە قبوڵ دەكا (فَإِنْ زَادَ) جا ئەگەر بە زیاتر لە مارەیی هاووێنە قبوڵی كرد، ئەو كاتەش (صَحَّ النِّكَاحُ بِمَهْرِ الْمِثْلِ) مارەبڕینەكە هەر بە مارەیی هاووێنە دروست دەبێ (وَفِي قَوْلٍ يَبْطُلُ) لە فەرموودەیەكیشدا بەتاڵ دەبێ.

(وَلَوْ نَكَحَ السَّفِيهُ بِلاَإِذْنٍ) ئەگەر ماڵ بە فیڕۆدەرەكە بێئیزنی سەرپەرشتكارەكەی ژنی لە خۆی مارە كرد، ئەوە (فَبَاطِلٌ) مارەبڕینەكە بەتاڵەو دروست نابێ (فَإِنْ وَطِئَ) جا ئەگەر لەو مارەبڕینە بەتاڵەدا جیماعی لەگەڵ ژنەكە كرد، ئەوە (لَمْ يَلْزَمْهُ شَيْءٌ) هیچی لە سەر نیە، واتە: نە سزای زیناو نە مارەیی ژنەكە، كەوابو: ئەگەر لەم جیماعە منداڵێكی ببێ، منداڵەكەش دەبێتە منداڵیخۆی (وَقِيلَ مَهْرُ مِثْلٍ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: مارەیی هاووێنەی دەكەوێتەسەر (وَقِيلَ أَقَلُّ مُتَمَوَّلٍ) لە فەرموودەیەكیتری بێهێزدا كەمترین ماڵی دەكەوێتە سەر.

(وَمَنْ حُجِرَ عَلَيْهِ بِفَلَسٍ) ئەو كەسەی بە هۆی قەرزداری قەدەغەی لە سەر داندراوە (يَصِحُّ نِكَاحُهُ) دروستە سەربەخۆ ژن لە خۆی مارە بكا ( وَمُؤَنُ النِّكَاحِ فِي كَسْبِهِ) ئەركی ژن هێنانەكەش-وەك مارەییو بژێویی ژنەكە- لە كەسابەتەكەی دەدرێ (لاَ فِيمَا مَعَهُ) نەك لەو ماڵەی لە بەردەستیەتی، چونكە ئەو بۆ خاوەن قەرزەكانە.

(وَنِكَاحُ عَبْدٍ بِلاَ إِذْنِ سَيِّدِهِ بَاطِلٌ) ژن مارەكردنی كۆیلە لە خۆی بە بێئیزنی گەورەكەی بەتاڵەو (وَبِإِذْنِهِ صَحِيحٌ) بە ئیزنیگەورەكەیشی دروستە (وَلَهُ إِطْلاَقُ الإِذْنِ) بۆ گەورەكەی دروستە: بێدیاركردنی ئافرەتو مارەیی كۆیلەكە ئیزن بدا، هەم (وَلَهُ تَقْيِيدُهُ بِامْرَأَةٍ أَوْ قَبِيلَةٍ أَوْ بَلَدٍ) بۆ گەورەكەش دروستە: لە ئیزندانەكەدا ئافرەتێك، یان هۆزێك، یان شارێك دیاری بكا (وَ) هەركاتێك یەكێكیانی بۆ دیاری كرد (لاَ يَعْدِلُ عَمَّا أَذِنَ فِيهِ) دروست نیە كۆیلەكە لابدا لە ئیزندانی گەورەكەی (وَالأَظْهَرُ) بەفەرموودەی بەهێزتر (أَنَّهُ لَيْسَ لِلسَّيِّدِ إِجْبَارُ عَبْدِهِ عَلَى النِّكَاحِ) بۆ گەورەكە دروست نیە: بە زۆرلێكردنو بێئیزن ژن لە كۆیلەكەی

وَلاَ عَكْسُهُ، وَلَهُ إجْبَارُ أَمَته بأَيِّ صفَة كَانَتْ، فَإِنْ طَلَبَتْ لَمْ يَلْزَمْهُ تَزْوِيجُهَا، وَقِيلَ إنْ حَرُمَتْ عَلَيْه لَزِمَهُ، وَإِذَا زَوَّجَهَا فَالأَصَحُّ أَنَّهُ بالْملك لاَ بالْوِلاَيَة فَيُزَوِّجُ مُسْلمٌ أَمَتَهُ الْكَافِرَةَ وَفَاسِقٌ وَمُكَاتَبٌ، وَلاَ يُزَوِّجُ وَلِيٌّ عَبْدَ صَبِيٍّ، وَيُزَوِّجُ أَمَتَهُ فِي الأَصَحِّ.

## (بَابُ مَا يَحْرُمُ مِنَ النِّكَاحِ)

---

ماره بكا، هەم (وَلاَ عَكْسُهُ) گەورەكەش زۆری لێناكرێ تاكو ژن بۆ كۆیلەكەی مارەبكا، بەلام (وَلَهُ إجْبَارُ أَمَته) بۆ گەورەكە دروستە: بۆئێزن جاریەكەیخۆی لە كەسێكیتر مارە بكا (بأَيِّ صفَة كَانَتْ) بە هەر سیفەتێكەوە بێ، واتە: كچ بێ، بێوە ژن بێ، بالغ بێ، نەبالغ بێ، بەلام (فَإِنْ طَلَبَتْ) ئەگەر جاریەكە بەخۆی داوای بەشوودانی لە گەورەكەی كرد، ئەوە (لَمْ يَلْزَمْهُ تَزْوِيجُهَا) لە سەری واجب نیە بیداتە شوو (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: (إنْ حَرُمَتْ عَلَيْه) ئەگەر بە هۆی شیر، یان نەژاد جاریەكە لە گەورەكەی حەرام بێ، ئەو كاتە (لَزِمَهُ) واجبە: بیداتە شوو.

(وَإِذَا زَوَّجَهَا) جا هەركاتێك گەورەكەی مارەی ببڕی، ئەوە (فَالأَصَحُّ أَنَّهُ بالْملك لاَ بالْوِلاَيَة) مارەبڕینەكەی بە هۆی ملكایەتی‌یە، نەك بە سەرپەرشتكاری، كەوابو: (فَيُزَوِّجُ مُسْلمٌ أَمَتَهُ الْكَافِرَةَ) موسولمان (جاریة) كافرەكەیخۆی مارە دەبڕێ، هەم (وَفَاسِقٌ) فاسقیش مارەی دەبڕێو (وَمُكَاتَبٌ) نوسراوپێدراویش مارەی دەبڕێ (وَلاَ يُزَوِّجُ وَلِيٌّ عَبْدَ صَبِيٍّ) دروست نیە: سەرپەرشتكاریمندالێ ژن لە كۆیلەیمندالەكە مارە بكا، بەلام (وَيُزَوِّجُ أَمَتَهُ) دروستە جاریەكەی مارە ببڕێو بیداتە شوو (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

﴿ بَابُ مَا يَحْرُمُ مِنَ النِّكَاحِ: **باسی ئەو ئافرەتانەی حەڕامە پیاو لە خۆی مارەیان بكا** ﴾

**پێشەكی** بزانە: هۆیەكانی حەڕامبوونیئافرەت هەتاهەتایی بە بەردەوامی سێنە: خزمایەتی، شیرخواردن، زاواوخەزورایەتی. واتە: مارەكردنی هیچێكیان دروست نابێو ئەگەر بە مارەكراویش جیماعیان لەگەڵ بكا، هەر زینایەو واجبە سزای زینای لە سەر جێبەجێ بكرێ، هەروەك لە (باسی زینا)دا ڕوون كراوەتەوە.

ئینجا بزانە: ئەم یانزە ئافرەتانەیداهاتوو: كە هەتاهەتایی بە بەردەوامی حەڕامن-لە نەژادو لە شیر- گشتیان دەبنە مەحرەمی پیاو، واتە: دەستنوێژیان لە یەكتری ناشكێو تەماشاكردنی یەكتریشیان -بە بێشەهوەت- حەلالە.

**هۆیەكەم**: ئەوانەی بە هۆیخزمایەتی هەتاهەتایی حەڕامن، حەفتن، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَاتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَاتُكُمْ وَعَمَّاتُكُمْ وَخَالاَتُكُمْ وَبَنَاتُ الأَخِ وَبَنَاتُ الأُخْتِ﴾ لە سەر ئێوە حەڕام كراوە: دایكەكانتانو كیژەكانتانو خوشكەكانتانو خوشكەكانیباوكەكانتانو خوشكەكانیدایكەكانتانو كیژەكانیبراو كیژەكانیخوشك.

تَحْرُمُ الأُمَّهَاتُ: وَكُلُّ مَنْ وَلَدَتْكَ أَوْ وَلَدَتْ مَنْ وَلَدَكَ فَهِيَ أُمُّك، وَالْبَنَاتُ: وَكُلُّ مَنْ وَلَدْتَهَا أَوْ وَلَدْتَ مَنْ وَلَدَهَا فَبِنْتُك، قُلْتُ: وَالْمَخْلُوقَةُ مِنْ زِنَاهُ تَحِلُّ لَهُ، وَيَحْرُمُ عَلَى الْمَرْأَةِ وَلَدُهَا مِنْ زِنًا وَاللهُ أَعْلَمُ. وَالأَخَوَاتُ، وَبَنَاتُ الإِخْوَةِ وَالأَخَوَاتِ، وَالْعَمَّاتُ وَالْخَالاَتُ: وَكُلُّ مَنْ هِيَ أُخْتُ ذَكَرٍ وَلَدَكَ فَعَمَّتُك، أَوْ أُخْتُ أُنْثَى وَلَدَتْكَ

---

کەوابو: (تَحْرُمُ الأُمَّهَاتُ) حەرامە: پیاو دایکەکانیخۆی لە خۆی مارەبکا (وَكُلُّ مَنْ وَلَدَتْكَ) هەر ئافرەتێك ڕاستەوخۆ تۆی لێبوبی (أَوْ وَلَدَتْ مَنْ وَلَدَكَ) یان ئەوکەسەی لێبوبێ کە تۆی لێبوبی: وەك دایکیدایکتو بە سەرەوەتر، یان دایکیباوکتو بە سەرەوەتر (فَهِيَ أُمُّك) ئەو ئافرەتە لە هەردوو حاڵەتدا دایکی تۆیە.

(وَ) هەروەها (الْبَنَاتُ) حەرامە: پیاو کیژەکانیخۆی لە خۆی مارە بکا (وَكُلُّ مَنْ وَلَدْتَهَا) هەر ئافرەتێك لە تۆ بوبێ (أَوْ وَلَدْتَ مَنْ وَلَدَهَا) یان ئەو کەسە لە تۆ بوبێ کە ئافرەتەکەی لێبوە: وەك کیژیکیژو بەرەوخوارتر، یان کیژیکوڕو بەرەوخوارتر (فَبِنْتُك) ئەوەش لە هەردوو حاڵەتدا کیژی تۆیە.

(قُلْتُ) ئیمامی(النواوی) دەفەرموێ (وَالْمَخْلُوقَةُ مِنْ زِنَاهُ) ئەو ئافرەتەی لە ئاوی زینای پیاو دروست بووە (تَحِلُّ لَهُ) بۆ پیاوە زیناکارەکە حەڵاڵە لە خۆی مارە بکا، چونکە ئافرەتەکە بیژییەو نەژادی ناچێتەوە سەر پیاوە زیناکارەکە، بەڵام ناپەسندە، هەر چەند بێگومانیش بزاندرێ لە ئاوی زیناکارەکە دروست بووە، کەوابو: میراتیش لە یەکتری ناگرن، بەڵام (وَيَحْرُمُ عَلَى الْمَرْأَةِ وَلَدُهَا مِنْ زِنًا) لە سەر ئافرەتە زیناکارەکەو لە سەر مەحرەمەکانیشی حەرامە: خۆی لە کوڕە بیژییەکەیخۆی مارە بکا: کە لە زینا دروست بووە (وَاللهُ أَعْلَمُ) چونکە پارچەیەکیخۆیەتیو بێگومان لە یەك نەژادن، بۆیێ میراتیش لە یەکتری دەگرن، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَ) هەروەها (الأَخَوَاتُ) حەرامە: پیاو خوشکەکانیخۆی لە خۆی مارە بکا، جا خوشکەکە: لەدایكوباوکی بێ، یان تەنها لەباوکی، یان تەنها لەدایکی (وَ) هەروەها (بَنَاتُ الإِخْوَةِ) کیژەکانیبرایەکانو، هەم (وَالأَخَوَاتِ) کیژەکانیخوشکەکانیش حەرامە پیاو لە خۆیان مارە بکا، هەرچەند کیژەبراو کیژەخوشکەکانیش بەرەو خوارەوە بن، هەم جیاوازی نیە خوشكو برایەکانیش: لەدایکیوباوکی بن، یان تەنها لەباوکی، یان تەنها لەدایکی.

(وَ) هەروەها (الْعَمَّاتُ) خوشکەکانیباوكو، هەم (وَالْخَالاَتُ) خوشکەکانیدایك، ئەوانەش حەرامە پیاو لە خۆیان مارە بکا (وَكُلُّ مَنْ هِيَ أُخْتُ ذَكَرٍ وَلَدَكَ) هەر ئافرەتێك خوشکی ئەو پیاوە بێ کە تۆی لێبوی: وەك باوكو باپیرەو بە سەرەوەتر (فَعَمَّتُك) ئەوە پوری تۆیەو خوشکیباوکتە (أَوْ أُخْتُ أُنْثَى وَلَدَتْك) یان ئافرەتەکە خوشکی ئەو ئافرەتەبێ کە تۆی

فَخَالَتُكَ، وَيَحْرُمُ هَؤُلاَءِ السَّبْعُ بِالرَّضَاعِ أَيْضًا: وَكُلُّ مَنْ أَرْضَعَتْكَ أَوْ أَرْضَعَتْ مَنْ أَرْضَعَتْكَ أَوْ مَنْ وَلَدَكَ أَوْ وَلَدَتْ مُرْضِعَتَكَ أَوْ ذَا لَبَنِهَا فَأُمُّ رَضَاعٍ، وَقِسِ الْبَاقِيَ،

---

لێبوی: وەك دایكو داپیرەو بە سەرەوەتر (فَخَالَتُكَ) ئەوەش پوری تۆیەو خوشكی‌دایكتە، جیاوازی نیە ئەو دوو پورانە: لەدایكوباوكی بن، یان تەنها لەدایكی، یان تەنها لەباوكی.

**هۆی دووەم:** ئەوانەی بە هۆی‌شیرخواردن هەتاهەتایی حەرامن، حەفتن، واتە: (وَيَحْرُمُ هَؤُلاَءِ السَّبْعُ بِالرَّضَاعِ أَيْضًا) ئەو حەفتانەی‌رابردوو بە هۆی شیرخواردنیش هەتاهەتای حەرامن، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿يَحْرُمُ مِنَ الرَّضَاعِ مَا يَحْرُمُ مِنَ النَّسَبِ﴾ رواه الشيخان، ئەو ئافرەتانەی بە هۆی‌خزمایەتی حەرام دەبن، بەهۆی‌شیرخواردنیش حەرام دەبن.

كەوابو: (وَكُلُّ مَنْ أَرْضَعَتْكَ) هەر ئافرەتێك شیری‌خۆی دابێتە تۆ (أَوْ أَرْضَعَتْ مَنْ أَرْضَعَتْكَ) یان شیری‌خۆی دابێتە ئەو ئافرەتەی كە شیری‌خۆی داوەتە تۆ (أَوْ مَنْ وَلَدَكَ) یان شیری‌خۆی دابێتە ئەو پیاوەی، یان ئەو ئافرەتەی تۆی لێبوی (أَوْ وَلَدَتْ مُرْضِعَتَكَ) یان ئەو ئافرەتەی لێبوێ: كە شیری‌خۆی داوەتە تۆ (أَوْ ذَا لَبَنِهَا) یان ئەو پیاوەی لێبوبێ كە خاوەن شیری ئافرەتەشیردەرەكەیە: وەك مێردی‌شیردەرەكە، ئەوە (فَأُمُّ رَضَاعٍ) لە گشت ئەو وێنانەدا ئافرەتەكە دەبێتە دایكی‌شیری‌و هەتاهەتای حەرام دەبێ (وَقِسِ الْبَاقِيَ) شەشەكانی‌تریش كە ماون‌و بە هۆی‌شیرخواردن حەرامن، ئەوها (قِیاس) بكە:

**روونكردنەوە:** هەر ئافرەتێك شیری خواردبێ: لە ژنی‌تۆ، یان لە ژنی كوڕی‌تۆو بەرەو خوارتریش، یان لە كیژی‌تۆ، یان لە كیژی كوڕی‌تۆو بەرەوخوارتریش، یان لە كیژی كیژی تۆو بەرەوخوارتریش، ئەوە دەبێتە كیژە شیری‌ی تۆ.

وە هەر ئافرەتێك شیری خواردبێ: لە دایكت، یان لە دایكە شیریەكەت، یان لە ژنی باوكت، یان لە دایكە شیریەكەت بوبێ، یان لە باوكە شیریەكەت بوبێ، ئەوەش دەبێتە خوشكە شیری‌ی تۆ.

وە هەر ئافرەتێك شیری خواردبێ: لە خوشكی‌تۆ، یان لە ژنی برای‌تۆ، یان لە كوڕو كیژی دایكە شیریەكەت بوبێ، یان لە كوڕو كیژی باوكە شیریەكەت بوبێ، یان لەو شیرخۆرە بوبێ: كە دایكت شیری داوەتێ، یان ژنی باوكت شیری داوەتێ، ئەوەش بە خۆی‌و بە كیژەكانیەوەو بەرەوخوارتریش دەبنە: یان كیژەبرای شیری، یان كیژەخوشكی شیری.

وە هەر ئافرەتێك خوشكی دایكە شیریەكەت بێ، یان خوشكی باوكە شیریەكەت بێ، یان خوشكی داپیرەی لای دایكە شیری، یان لای باوكە شیری بێ، یان خوشكی باپیرەی لای دایكە شیری، یان لای باوكە شیری بێ، یان شیری لە داپیرەی لای دایكی، یان لای باوكی خواردبێ، ئەوەش دەبێـە پورت: یان خوشكی باوكت، یان خوشكی دایكت. ئیتر لە باسی شیرخواردن ئەم (قاعِدة)یە درێژتر ڕوون دەكەینەوە، إن شاء الله تعالى.

وَلاَ يَحْرُمُ عَلَيْكَ مَنْ أَرْضَعَتْ أَخَاكَ وَنَافِلَتَكَ، وَلاَ أُمُّ مُرْضِعَةِ وَلَدِكَ وَبِنْتُهَا، وَلاَ أُخْتُ أَخِيكَ مِنْ نَسَبٍ أَوْ رَضَاعٍ: وَهِيَ أُخْتُ أَخِيكَ لأَبِيكَ لأُمِّهِ وَعَكْسُهُ، وَتَحْرُمُ زَوْجَةُ مَنْ وَلَدْتَ أَوْ وَلَدَكَ

---

بەلاّم (وَلاَ يَحْرُمُ عَلَيْكَ مَنْ أَرْضَعَتْ أَخَاك) ئەو ئافرەتە لە تۆ حەرام نیە: كە شیری داوەتە خۆشكو برای تۆ، جا خوشكو برایەكەت: لە تۆ بچوكتر بن، یان گەورەتر بن، بەلاّم لە نەژاددا ئەو ئافرەتە حەرام بوو؟ چونكە یان دایكیخۆتە، یان ژنیباوكتە.

هەم (وَنَافِلَتَك) ئەو ئافرەتەش لە تۆ حەرام نیە: كە شیری داوەتە نەوّیەكانت، واتە مندالّی منداڵەكانت، بەلاّم لە نەژاددا ئەو ئافرەتە حەرام بوو؟ چونكە یان كیژیخۆتە، یان ژنی كوڕیخۆتە، هەم (وَلاَ أُمُّ مُرْضِعَةِ وَلَدِك) دایكی ئەو ئافرەتەی كە شیریخۆی داوەتە منداڵەكەیتۆ، ئەویش لە تۆ حەرام نیە، بەلاّم لە نەژاددا حەرام بوو؟ چونكە خەسووی خۆتە، هەم (وَبِنْتُهَا) كیژی ئەو ئافرەتەش كە شیری داوەتە منداڵیتۆ، ئەویش لە تۆ حەرام نیە، بەلاّم لە نەژاددا حەرام بوو؟ چونكە كیژیخۆتە، یان كیژی ژنەكەتە.

(وَلاَ أُخْتُ أَخِيك مِنْ نَسَبٍ أَوْ رَضَاعٍ) هەروەها ئەو ئافرەتەی لە نەژاد، یان لە شیر خوشكی برایەكەتە، ئەویش لە تۆ حەرام نیە؟ (وَهِيَ) ئەو خوشكەبرایە (أُخْتُ أَخِيك لأَبِيك) خوشكی ئەو برایەتە: كە تەنها لە باوكتەوە برایتۆیە (لأُمِّه) خوشكەكەش لە دایكیەوە خوشكی برایەكەتە: وەك بێوەژنێك كیژێكی هەبێو باوكت بێوەژنەكە لە خۆی مارە بكاو كوڕێكی لێبێ، ئەوە دروستە: تۆش كیژەكە لە خۆت مارە بكەی، هەرچەند لە دایكیەوە خوشكی ئەم برایەشتە (وَعَكْسُهُ) هەم بە پێچەوانەوەش: وەك خوشكیبرایەكی تەنها لەدایكیت كە تەنها لە باوكیەوە خوشكی بێ: وەك بێوەژنێك كوڕێكی هەبێو ئەم كوڕەش خوشكێكی تەنها لەباوكیی هەبێ، ئینجا باوكت بێوەژنەكە لە خۆی مارە بكاو تۆی لێبێ، ئەوە بۆ تۆش حەلاّلە: خوشكە لە باوكیەكەی ئەم برایە لەدایكیەت لە خۆت مارە بكەی.

﴿ هۆی سێیەم: ئەوانەی بە زاواو خەزورایەتی هەتا هەتای حەرامن، چوارن: ﴾

یەكەم: (وَتَحْرُمُ زَوْجَةُ مَنْ وَلَدْتَ) ژنی ئەو پیاوەت لێحەرامە كە لە تۆ بووە: وەك ژنیكوڕو ژنیكوڕیكوڕو بەرەوخوارتر، ژنی كوڕیكیژو بەرەوخوارتر، واتە: بە تەنها مارەبڕین ژنی ئەو كوڕانە لە تۆ حەرام دەبێ، هەرچەند كوڕەكانیش جیماعیان لەگەڵ نەكردبن، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَحَلاَئِلُ أَبْنَائِكُمُ الَّذِينَ مِنْ أَصْلاَبِكُم﴾ ژنەكانی ئەو كوڕانەی لە نەژادی خۆتانن حەرامە لە خۆتان مارەیان بكەن.

دووەم: (أَوْ وَلَدَكَ) ژنی ئەو پیاوەشت لێحەرامە كە تۆی لێبوی: وەك ژنی باوكتو باپیرەتو بە سەرەوەتر، جیاوازی نیە باپیرەكە: باوكیباوك بێ، یان باوكیدایك، واتە:

مِنْ نَسَبٍ أَوْ رَضَاعٍ، وَأُمَّهَاتُ زَوْجَتِكَ مِنْهُمَا، وَكَذَا بَنَاتُهَا إِنْ دَخَلْتَ بِهَا، وَمَنْ وَطِئَ امْرَأَةً بِمِلْكٍ حَرُمَ عَلَيْهِ أُمَّهَاتُهَا وَبَنَاتُهَا وَحَرُمَتْ عَلَى آبَائِهِ وَأَبْنَائِهِ،

---

به تەنها مارەبڕین ژنی ئەو باوکانە لە تۆ حەرام دەبێ، هەرچەند باوکەکانیش جیماعیان لەگەڵ نەکردبن، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَلا تَنْكِحُوا مَا نَكَحَ آبَاؤُكُمْ مِنَ النِّسَاءِ﴾ ئەو ژنانە لە خۆتان مارە مەکەن کە باوکەکانتان لە خۆیان مارە کردوون.

ئینجا بزانە: جیاوازی نیە ئەو کوڕو باوکانە: (مِنْ نَسَبٍ أَوْ رَضَاعٍ) بە هۆی نەژاد کوڕو باوک بن، یان بە هۆی شیرخواردن.

سێیەم: (وَأُمَّهَاتُ زَوْجَتِكَ مِنْهُمَا) دایکەکانیژنەکەت–لە نەژادو لە شیر– لە تۆ حەرامن: وەك دایکو داپیرەی ژنەکەت، جیاوازی نیە داپیرەکە: دایکیدایکو بە سەرەوەتر بێ، یان دایکیباوکو بە سەرەوەتر بێ، واتە: بە تەنها مارەبڕینیژنەکەت ئەو دایکو داپیرانەیت لێ حەرام دەبن، هەرچەند جیماعیشت لەگەڵ ژنەکەت نەکردبێ.

چوارەم: (وَكَذَا بَنَاتُهَا) هەروەها کیژەکانیژنەکەتو کیژەکانی کوڕیژنەکەتو بەرەو خوارترو کیژەکانی کیژیژنەکەتو بەرەوخوارتر– لە نەژادو لە شیر– لە تۆ حەرامن، بەڵام (إِنْ دَخَلْتَ بِهَا) بەو مەرجەی جیماعت لەگەڵ ژنەکەت کردبێ، جیاوازی نیە کیژەکانی ئەم ژنە: لە مێردێکیتری پێش تۆ بوبن، یان لە مێردێکیتری دوای تۆ ببن، یان لە زینا بن، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَأُمَّهَاتُ نِسَائِكُمْ وَرَبَائِبُكُمُ اللاتِي فِي حُجُورِكُمْ مِنْ نِسَائِكُمُ اللاتِي دَخَلْتُمْ بِهِنَّ فَإِنْ لَمْ تَكُونُوا دَخَلْتُمْ بِهِنَّ فَلا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ﴾ دایکەکانیژنەکانتان لێتحەرامن، هەم کیژەکانی ئەو ژنانەشتان کە جیماعتان لەگەڵ کردون لێتان حەرامن، بەڵام ئەگەر جیماعتان لەگەڵ ژنەکان نەکردبو، ئەو کاتە هیچ گوناهێکتان لە سەر نیەو دروستە کیژی ژنەکە مارە بکەن. واتە لە دوای تەڵاقدانیژنەکە، یان مردنی.

﴿ ئاگاداری ﴾: مارەکردنی ئەم ئافرەتانە لە خۆت حەرام نیە: کیژی مێردیدایکت، دایکی مێردیدایکت، کیژی مێردیکیژت، دایکی مێردیکیژت، دایکی ژنیباوکت، کیژی ژنیباوکت، دایکی ژنیکوڕت، کیژی ژنیکوڕت، ژنی کوڕیژنت، ژنی مێردیدایکت، هەروەك لە (الانوار)و (مغنی)دا فەرموویانە.

(وَمَنْ وَطِئَ امْرَأَةً بِمِلْكٍ) هەر پیاوێك جیماع لەگەڵ ئافرەتێك بکا بە ملکایەتیکۆیلەیی: وەك جیماع لەگەڵ (جارية)یخۆی بکا، ئەوە (حَرُمَ عَلَيْهِ أُمَّهَاتُهَا وَبَنَاتُهَا) دایکەکانو کیژەکانی ئەو ئافرەتەی هەتاهەتای لێی حەرام دەبن، هەم (وَحَرُمَتْ عَلَى آبَائِهِ وَأَبْنَائِهِ) ئافرەتەکەش هەتا هەتای لە باوکەکانو لە کوڕەکانیپیاوەکە حەرام دەبێ، چونکە جیماعکردن بە مولکایەتیکۆیلەیی وەك جیماعکردنی بە مارەبڕینە.

## ﴿ منداڵی جیماعی به هەڵەو تێکردنی (مَنِي)ی به هەڵە ﴾

(وَكَذَا الْمَوْطُوءَةُ بِشُبْهَةٍ) هەروەها ئەو ئافرەتەش کە بە هەڵە جیماعی لەگەڵ کراوە، یان بە هەڵە (مَنِي)ی پیاوێکی بێگانەی تێکراوە (فِيحَقِّهِ) هەڵەکەش لە لایپیاوەکەوە بێ: وەك وایتێگەیشتبێ ژنیخۆیەتی، یان بە مارەبڕینێکیناڕوست جیماعی لەگەڵ بکا، واتە: بە هۆی ئەو جیماعە بە هەڵەیەو تێکردنی ئەو (مَنِي)یە بە هەڵەیە: دایکەکانو کیژەکانی ئەو ئافرەتە هەتا هەتای لە پیاوە جیماعکەرەکەو لە خاوەن (مَنِي)یەکە حەرام دەبن، هەم ئافرەتەکەش لە باوکەکانو لە کوڕەکانی پیاوە جیماعکەرەکەو لە خاوەن (مَنِي)یەکە هەتا هەتای حەرام دەبێ، هەم ئەگەر لەم جیماعە بە هەڵەیە، یان لە (مَنِي)یەکە منداڵێك دروست ببێ، ئەوە دەبێتە منداڵی پیاوە جیماعکەرەکەو خاوەن (مَنِي)یەکە، هەم (عِدَّة)ش لە سەر ئافرەتەکە واجب دەبێ، بەڵام ئافرەتەکە نابێتە مەحرەمی باوکەکانو کوڕەکانی جیماعکەرەکەو خاوەن (مَنِي)یەکە، جیماعکەرەکەو خاوەن (مَنِي)یەکەش نابنە مەحرەمی دایکەکانو کیژەکانی ئافرەتەکە.

جا لەو بڕیارانەیڕابردوودا جیاوازی نیە: ژنەکەش وا تێبگا مێردیخۆیەتی، یان بزانێ بێگانەیە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(قِيلَ أَوْ حَقِّهَا) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: ئەگەر هەڵەکە تەنها لە لایئافرەتەکەش بێ، هەر ئەوهایە، بەڵام بە فەرموودەی ڕاست: ئەگەر تەنها ئافرەتەکە بە هەڵەدا بچێو وا تێبگا مێردی خۆیەتی، ئەوە تەنها مارەیی لە سەر جیماعکەرەکە واجب دەبێ، واتە: بڕیارەکانیتری ڕابردوو هیچێکیان نایەنەجێ، بەڵام ئەگەر بە هەڵەداچوونەکە لە هەردووکیانەوەبێ، ئەو کاتە: هەم مارەیی بۆ ئافرەتەکەو هەم بڕیارەکانیتریڕابردووش گشتی دێنەجێ.

کەواتە: ئەگەر ئافرەتەکە بزانێ ئەم پیاوە مێردیخۆی نیەو بە خۆشیخۆی ڕێگای بدا جیماعی لەگەڵ بکا، ئەو کاتە ئافرەتەکە زیناکەرەو مافی هیچ مارەیی‌ی نیە، هەروەك لە (البجيرمی)دا فەرموویەتی.

## ﴿ باسی منداڵی بیژی ﴾

(لاَ الْمَزْنِيُّ بِهَا) بەڵام ئەو ئافرەتەی زینای لەگەڵ کراوە، ئەوها نیە، واتە: دایكو کیژەکانی ئافرەتەکە لە زیناکەرەکە حەرام نابنو ئافرەتەکەش لە باوكو کوڕەکانی زیناکەرەکە حەرام نابێو منداڵەکەش بیژییە: نابێتە منداڵی پیاوە زیناکەرەکەو ناشبێتە منداڵی مێردی ئافرەتەکە، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەموێ: ﴿اَلْوَلَدُ لِلْفِرَاشِ وَلِلْعَاهِرِ اَلْحَجَرُ﴾ رواه الشيخان، منداڵەکە بۆ ئەو کەسەیە کە بە حەڵاڵی سەرجێیی ژنەکەی کردوە، بۆ زیناکەرەکەش سزای زینا داندراوە.

جا بزانه ئافرەتەکەش (عِدّة)ی زینای لە سەر واجب نابیٚ و مارەیی ئافرەتەکەش لە سەر زیناکەرەکە واجب نابیٚ، بەڵام ئەگەر بە زۆرلێکردن زینا لەگەڵ ئافرەتەکە کرابیٚ، ئەو کاتە مارەیی هاووێنە بۆ ئافرەتەکە لە سەر پیاوە زیناکەرەکە واجب دەبیٚ، هەروەك لە باسی (مارەیی هاووێنە)دا ڕوون کراوەتەوە.

هەر بە بەڵگەی حەدیسەکەی ڕابردوو: ئەگەر (مَنِي)ی پیاوێکی بێگانە –بە قەسدی– دەناو منداڵدانەی ئافرەتێك بکریٚ، ئەوەش هەمان بڕیارەکانی ڕابردووی زینای بۆ دەدریٚ، واتە: ئەو منداڵەی لەو (مَنِي)یە دروست دەبیٚ، ئەویش بیژییە: نابێتە منداڵی خاوەن (مَنِي)یەکە، چونکە بە حەڕامی دروست بووە، هەم نابێتە منداڵی مێردیژنەکە، چونکە لە خۆی نیە، بەڵام ئەگەر (مَنِي)تێکردنەکە بە هەڵە بیٚ، ئەو کاتە دەبێتە منداڵی خاوەن (مَنِي)یەکە، هەروەك تازە ڕابراو هەم ئێستاش ڕوونتری دەکەینەوە.

﴿ ئاگاداری ﴾: باسی لادانی منداڵیٚ بیژی لە نەژادیخۆی، لە باسی (لەعنەتکردنی ژن و مێرد)دا ڕوون دەکەینەوە –إن شاءالله تعالى– زۆر پێویستە لیٚی ئاگادار بی.

ئینجا بزانە: ئەگەر ژنێك (مَنِي)ی مێردیخۆی دەناو منداڵدانەی بکریٚ، یان بە هەڵە (مَنِي)ی پیاوێکیبێگانەی تیٚبکریٚ، ئەو کاتە لە هەردوو حاڵەتدا وەکو جیماعی حەلاڵ بڕیاری (عِدّة)و نەژادو حەڕامی زاواو خەزووڕایەتیڕابردووی بۆ دەدریٚ، واتە: منداڵەکە دەبێتە منداڵیمێردەکە، یان خاوەن(مَنِي)یەکە، چونکە لە هەردوو حاڵەتدا منداڵەکە بە حەلاڵی دروست بووە.

بەڵام ئاگاداریە: لە حاڵەتی دەرهێنانی(مَنِي)ی مێردەکەو بێگانەکەو هەم لە حاڵەتی (مَنِي)تێکردنە ناو منداڵدانەیژنەکەدا مەرجە: (مَنِي)یمێردەکەو بێگانەکە ڕێزدار بیٚ –واتە: بە حەلاڵی هاتبێتە دەرەوە– هەروەك لە (تحفة)و (مغنی)دا فەرموویانە، هەم لە کاتی هاتنەدەرەوەی (مَنِي)یمێردەکەدا مەرجە: ژن و مێردایەتیەکەیان هەبیٚ و بەردەوام بیٚ تا تێکردنی(مَنِي)یەکە، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.

ئینجا بزانە: لە لای ئیمامی(البغوي) مەرج نیە: (مَنِي)یمێردەکە بە حەلاڵی لە مێردەکە هاتبێتە دەرەوە، هەروەك (تحفة)و (مغنی) گێڕاویەتیانەوەو ڕەدیشیان کردۆتەوە.

(وَلَيسَتْ مُبَاشَرَةٌ بِشَهْوَةٍ كَوَطْءٍ) دەستبازیی بە شەهوەت: وەك ماچ کردن و مەمك گرتن و ڕان بەڕان، وەکو جیماع بڕیاری بۆ نادریٚ (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، جیاوازی نیە ئەو دەستبازییە: لەگەڵ ژنیخۆی بیٚ، یان لەگەڵ ئافرەتێکیبێگانە: کە وایتێبگا ژنیخۆیەتی، کەواتە: بە هۆی دەستبازی هیچ بڕیارێك لەوانەیڕابردوو نایەتەجیٚ.

بەڵام لە مەزهەبی ئیمامی(حنفي)دا: بە هۆی زیناو بە هۆی دەستبازیی بە شەهوەت حەڕامی زاواو خەزووڕایەتی دێتە جیٚ، هەروەك لە (مجمع الأنهر)دا فەرموویەتی.

وَلَوْ اخْتَلَطَتْ مَحْرَمٌ بِنِسْوَةِ قَرْيَةٍ كَبِيرَةٍ نَكَحَ مِنْهُنَّ، لاَ بِمَحْصُورَاتٍ، وَلَوْ طَـرَأَ مُؤَبِّـدُ تَحْرِيمٍ عَلَى نِكَاحٍ قَطَعَهُ: كَوَطْءِ زَوْجَةِ ابْنِهِ بِشُبْهَةٍ، وَيَحْرُمُ جَمْعُ الْمَـرْأَةِ وَأُخْتِهَـا أَوْ عَمَّتِهَا أَوْ خَالَتِهَا مِنْ رَضَاعٍ أَوْ نَسَبٍ، فَإِنْ جَمَعَ بِعَقْدٍ بَطَلَ،

---

(وَلَوْ اخْتَلَطَتْ مَحْرَمٌ) ئەگەر ئافرەتێکی مەحرەمی پیاوێك -بە هۆی خزمایەتی، یان شیرخواردن- تێکەڵ بوو (بِنِسْوَةِ قَرْيَةٍ كَبِيرَةٍ) بە ئافرەتەکانی گوندێکی گەورە، یان شارێك: کە سەرژمێر نەدەکران، واتە: نەزاندرا مەحرەمەکەی کامەیە، ئەوە (نَكَحَ مِنْهُنَّ) بۆی دروستە ئافرەتێك لەو ئافرەتانە لە خۆی مارە بکا، بەڵام (لاَ بِمَحْصُورَاتٍ) نەك ئەگەر مەحرەمەکەی تێکەڵی چەند ئافرەتێك بوبێ: کە سەرژمێر دەکران، واتە: لەو حاڵەتەدا بۆی دروست نیە هیچێکیان لە خۆی مارە بکا، مارەبڕینەکەش دروست نابێ.
(وَلَوْ طَرَأَ مُؤَبِّدُتَحْرِيمٍ عَلَى نِكَاحٍ) ئەگەر هۆیەکیحەرامی هەتاهەتایی هاتە سەر مارەبڕینێك، ئەو هۆیە (قَطَعَهُ) مارەبڕینەکە دەپچڕێنێو ژنو مێردەکە هەتاهەتای لە یەکتری حەرام دەبن (كَوَطْءِ زَوْجَةِ أَبِيهِ بِشُبْهَةٍ) وەك بە هەڵە: جیماع لەگەڵ ژنی باوکی خۆی بکا-هەر چەند دایکیخۆیشی بێ- یان جیماع لەگەڵ ژنی کوڕیخۆی بکا-هەر چەند مەحرەمی خۆیشی بێ: وەك کیژە برا- یان جیماع لەگەڵ دایکی ژنیخۆی بکا، یان جیماع لەگەڵ کیژی ژنیخۆی بکا، واتە: لە گشت ئەو وێنانەیڕابردوودا مارەبڕینەکە هەڵدەوەشێتەوەو ژنو مێردەکەش بە یەکجاری لە یەکتری حەرام دەبن.
بەڵام ئەگەر جیماعەکە بە زینا بێ، ئەوە کار لە مارەبڕینەکە ناکا، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی، ئیتر لە (باسیشیرخواردن)دا چەند وێنەیەکیتری لەم بابەتە ڕوون دەکەینەوە، إن شاء الله تعالى.
(وَيَحْرُمُ جَمْعُ الْمَرْأَةِ وَأُخْتِهَا) حەرامە: کۆکردنەوەی ئافرەتێكو خوشکەکەی لە ژێر مارەی یەك پیاودا-لە یەك کاتدا-جیاوازی نیە: بە خزمایەتی خوشك بن، یان بە شیرخواردن، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَأَنْ تَجْمَعُوا بَيْنَ الأُخْتَيْنِ﴾ لێتان حەرام کراوە دوو خوشك کۆ بکەنەوە لە ژێر پیاوێکدا.
(أَوْ عَمَّتِهَا أَوْ خَالَتِهَا) هەم حەرامە: کۆکردنەوەی ئافرەتێكو پورەکەی لە ژێر مارەی یەك پیاودا، جیاوازی نیە پورەکە: (مِنْ رَضَاعٍ أَوْ نَسَبٍ) بە شیرخواردن بێ، یان بە خزمایەتی، هەم جیاوازی نیە پورەکە: خوشکیباوك بێ، یان خوشکیدایك، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لاَيُجْمَعُ بَيْنَ الْمَرْأَةِ وَعَمَّتِهَا وَلاَ بَيْنَ الْمَرْأَةِ وَخَالَتِهَا﴾ رواه الشيخان، دروست نابێ ئافرەتو پورەکەی کۆ بکرێنەوە لە ژێر پیاوێکدا.
کەوابو: (فَإِنْ جَمَعَ بِعَقْدٍ) ئەگەر بە یەك مارەبڕین هەردووکیانی وێکڕا مارەکردن، واتە: هەردوو خوشکەکە، یان ئافرەتەکەو پورەکەی، ئەوە (بَطَلَ) مارەبڕینی هەردووکیان

أَوْ مُرَتَّبًا فَالثَّانِي، وَمَنْ حَرُمَ جَمْعُهُمَا بِنِكَاحٍ حَرُمَ فِي الْوَطْءِ بِمِلْكٍ، لاَ مِلْكُهُمَا، فَإِنْ وَطِئَ وَاحِدَةً حَرُمَتِ الأُخْرَى حَتَّى يُحَرِّمَ الأُولَى كَبَيْعٍ أَوْ نِكَاحٍ أَوْ كِتَابَةٍ لاَ حَيْضٍ وَإِحْرَامٍ، وَكَذَا رَهْنٌ فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ مَلَكَهَا ثُمَّ نَكَحَ أُخْتَهَا أَوْ عَكَسَ حَلَّتِ الْمَنْكُوحَةُ دُونَهَا، وَلِلْعَبْدِ امْرَأَتَانِ وَلِلْحُرِّ أَرْبَعٌ فَقَطْ، فَإِنْ نَكَحَ خَمْسًا مَعًا

---

بەتاڵ دەبێ‌و دروست نابێ (أَوْ مُرَتَّبًا) یان یەکێکیانی لە دوایەوی‌تر مارە کرد، ئەوە (فَالثَّانِي) مارەبڕینەکەی‌دووەم بەتاڵەو دروست نابێ، جیماعی دروست نەبووەکەش زینایەو سزای زیناشی لە سەر واجب دەکا، بەڵام هەرکاتێك ژنەکەی بمرێ، یان بە (بائن)ی تەڵاقی بدا، بۆی دروستە: خوشکی‌ژنەکەی، یان پوری‌ژنەکەی لە خۆی مارە بکا.

(وَمَنْ حَرُمَ جَمْعُهُمَا بِنِكَاحٍ) هەر ئافرەتێك کۆکردنەوەی لەگەڵ یەکێکی‌تردا بە مارەبڕین حەرام بێ، ئەوە (حَرُمَ فِي الْوَطْءِ بِمِلْكٍ) کۆکردنەوەیان لە جیماعکردنی بە ملکایەتیشدا حەرامە، واتە: حەرامە جیماع لەگەڵ ئەو دوو (جاریە)یەی بکا کە هەردووك خوشکن، یان پورو برازان، یان پورو خوشکەزان، بەڵام (لاَ مِلْكُهُمَا) کۆکردنەوەیان بە ملکایەتی حەرام نیە: وەك دوو خوشك وێکڕا بکاتە (جارية)ی‌خۆی‌و جیماع لەگەڵ هەردووکیان نەکا.

کەوابو: (فَإِنْ وَطِئَ وَاحِدَةً) ئەگەر جیماعی لەگەڵ (جارية)یەك کرد، ئەوە (حَرُمَتِ الأُخْرَى) حەرامە جیماع لەگەڵ خوشکەکەی‌تری، یان پورەکەی بکا (حَتَّى يُحَرِّمَ الأُولَى) تا یەکەمەکە لە خۆی حەرام دەکا: (كَبَيْعٍ أَوْ نِكَاحٍ أَوْ كِتَابَةٍ) وەك بیفرۆشێ، یان لە کەسێکی‌تری مارەبکا، یان نووسراوی بداتێ (لاَ حَيْضٍ وَإِحْرَامٍ وَكَذَا رَهْنٌ فِي الأَصَحِّ) نەك بە هۆی حەیزو ئیحرام بەستن‌و ڕەهنکردن (وَلَوْ مَلَكَهَا ثُمَّ نَكَحَ أُخْتَهَا) ئەگەر (جارية)یەکی کڕی، ئینجا خوشکەکەیشی لە خۆی مارە کرد (أَوْ عَكَسَ) یان بە پێچەوانەوە: ژنێکی لە خۆی مارە کرد، ئینجا خوشکەکەیشی کڕی، ئەوە (حَلَّتِ الْمَنْكُوحَةُ دُونَهَا) تەنها مارەبراوەکەی بۆ حەڵاڵە جیماعی لەگەڵ بکا، نەك (جارية)کڕاوەکە.

## ﴿ ژمارەی ئەو ژنانەی بۆ پیاو حەڵاڵن لە یەك کاتدا ﴾

(وَلِلْعَبْدِ امْرَأَتَانِ) بۆ پیاوی کۆیلە دوو ژن لە یەك کاتدا حەڵاڵن بە (إجماع)ی (صحابة)ی پێغەمبەرﷺ (وَلِلْحُرِّ أَرْبَعٌ فَقَطْ) بۆ پیاوی ئازاد—تەنها—چوار ژن حەڵاڵن لە یەك کاتدا لە ژێر مارەی‌خۆی‌دا کۆیان بکاتەوە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَانْكِحُوا مَا طَابَ لَكُمْ مِنَ النِّسَاءِ مَثْنَى وَثُلاثَ وَرُبَاعَ﴾ لە خۆتان مارە بکەن ئەوەی پێتان خۆشە لەو ئافرەتانەی لێتان حەڵاڵن: دوو، یان سێ، یان چوار. ﴿وعن غيلانؓ: أَنَّهُ أَسْلَمَ وَلَهُ عَشْرُ نِسْوَةٍ فَأَمَرَهُ النَّبِيُّﷺ أَنْ يَتَخَيَّرَ مِنْهُنَّ أَرْبَعًا﴾ رواه أحمد والترمذي وصححه الحاكم وابن حبان، (غيلان) موسوڵمان بوو، دە ژنی هەبون، پێغەمبەرﷺ فەرمانی پێکرد: چوار ژنیان لێ‌هەڵبژێرێ‌و ئەوانی‌تر واز لێبێنێ.

کەوابو: (فَإِنْ نَكَحَ خَمْسًا مَعًا) ئەگەر بە یەك مارەبڕین پێنج ژن، یان زیاتری وێکڕا

بَطَلْنَ، أَوْ مُرَتَّبًا فَالْخَامِسَةُ، وَتَحِلُّ الأُخْتُ وَالْخَامِسَةُ فِي عِدَّةِ بَائِنٍ لاَ رَجْعِيَّةٍ، وَإِذَا طَلَّقَ الْحُرُّ ثَلاَثًا أَوِ الْعَبْدُ طَلْقَتَيْنِ لَمْ تَحِلَّ لَهُ حَتَّى تَنْكِحَ وَتَغِيبَ بِقُبُلِهَا حَشَفَتُهُ أَوْ قَدْرُهَا

---

له خۆی مارەکردن، ئەوە (بَطَلْنَ) مارەبڕینی گشتیان بەتاڵ دەبێ (أَوْ مُرَتَّبًا) یان پێنج ژن، یان زیاتری یەك لە دوای یەك لە خۆی مارە کردن، ئەو کاتە (فَالْخَامِسَةُ) مارەبڕینی پێنجەمەکەو هەم زیاترەکەش بەتاڵ دەبێ، ئەگەر جیماعیشی لەگەڵ بکا، ئەوە زینایەو سزای زینای لە سەر واجب دەبێ، هەروەك لە (باسی زینا)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَتَحِلُّ الأُخْتُ) خوشك، یان پوری ژنەکەی لێحەلاڵ دەبێو، هەم (وَالْخَامِسَةُ) ژنی پێنجەمیشی لێحەلاڵ دەبێ (فِي عِدَّةِ بَائِنٍ) لەو کاتەی ژنەکەی، یان ژنێك لە چوار ژنەکانی لە (عِدَّة)ی (بائن)دایە، واتە: سێبەسێ تەلاقی داوە، یان بە پارە تەلاقێکی داوە.

بەڵام لە مەزهەبی ئیمام (أبيحنيفة)دا: نە خوشکەکەو نە پێنجەمەکە دروست نابێ تا (عِدَّة)کەی تەواو دەبێ، هەروەك لە (مجمع الانهر)دا فەرموویەتی، کەواتە: ئاگاداربە: ئەم جۆرە مارەبڕینە بە مەزهەبی (أبيحنيفة) نەکەی.

(لاَ رَجْعِيَّةٍ) نەك لە (عِدَّة)ی (رَجْعِيَّة)دا بێ: وەك تەنها تەلاقێك، یان دوو تەلاقی دابێ بە خۆڕاییو هێشتاش (عِدَّة)ی تەواو نەبوبێ، ئەوە دروست نیە: نە خوشكو پوری ئەو ژنە تەلاقدراوەی، نە ژنێکی پێنجەمیش لە خۆی مارە بکا، تا (عِدَّة)ی تەلاقدراوەکە تەواو دەبێ، یان تا بە(بائن)ی تەلاقی دەدا، یان تا لە (عِدَّة)دا دەمرێ.

## ﴿ مارە بەجاش ﴾

(وَإِذَا طَلَّقَ الْحُرُّ ثَلاَثًا) هەر کاتێك پیاوێکی ئازاد سێبەسێ ژنەکەی تەلاق دا (أَوِ الْعَبْدُ طَلْقَتَيْنِ) یان کۆیلە دووبەدوو ژنەکەی تەلاق دا (لَمْ تَحِلَّ لَهُ) ئەو تەلاقدراوەی لێحەلاڵ نابێتەوە، واتە: ئەگەر جیماعیشی لەگەڵ بکا، ئەوە زینایەو واجبە سزای زینای بدرێ، هەروەك لە (باسی زینا) زۆربەی سەرچاوەکان فەرموویانە.

کەواتە: تەلاقی چاك نابێتەوەو لێشی مارە ناکرێتەوە (حَتَّى تَنْكِحَ) تا تەلاقدراوەکە (عِدَّة)ی تەواو دەبێ ئینجا مێردێکیتر دەکا، جیاوازی نیە: مێردە تەلاقدەرەکە جیماعی لەگەڵ ئەم تەلاقدراوە کردبێ، یان هەر کچ بێو جیماعی لەگەڵ نەکردبێ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ طَلَّقَهَا فَلاَ تَحِلُّ لَهُ مِنْ بَعْدُ حَتَّى تَنْكِحَ زَوْجاً غَيْرَهُ﴾ ئەگەر ژنەکەی سێبەسێ تەلاق دا، ئەوە لە دوای تەلاقیسێیەم بۆی حەلاڵ نابێتەوە تا مێردێکیتر دەکا.

ئینجا جیاوازی نیە ئەم مێردە: بالغ بێ، یان نەبالغ بێ، عاقڵ بێ، یان شێت بێ، بەڵام مەرجە جیماعی لەگەڵ بکا، واتە: (وَتَغِيبَ بِقُبُلِهَا حَشَفَتُهُ أَوْ قَدْرُهَا) سەری (ذكر)ەکەی، یان ئەندازەکەی بچێتە ناو (فَرْج)ی ژنە تەلاقدراوەکە، هەم ئەگەر کچ بێ، مەرجە بەم جیماعە کچێنیەکەی لابچێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

بِشَرْطِ الإِنْتِشَارِ وَصِحَّةِالنِّكَاحِ وَكَوْنِهِ مِمَّنْ يُمْكِنُ جِمَاعُهُ لاَ طِفْلاً عَلَى الْمَذْهَبِ فِيهِنَّ، وَلَوْ نَكَحَ بِشَرْطِ إِذَا وَطِئَ طَلَّقَ أَوْ بَانَتْ أَوْ فَلاَ نِكَاحَ بَطَلَ، وَفِي التَّطْلِيقِ قَوْلٌ.

---

هەم (بِشَرْطِ الإِنْتِشَارِ) بەو مەرجەش (ذكر)ی ئەم مێردە ڕەپبووبێ، واتە: هەڵساو بێ، نەك پووچ بێ، هەم (وَصِحَّةِ النِّكَاحِ) مەرجە: مارەبڕینەکەیدووەمیش دروستبوو بێ، هەم (وَكَوْنِهِ مِمَّنْ يُمْكِنُ جِمَاعُهُ) مەرجە ئەم مێردە لەو تەمەنەدا بێ: کە بگونجێ جیماع بکا (لاَ طِفْلاً) نەك منداڵێکی وەها بێ: کە جیماعی پێنەکرێ (عَلَى الْمَذْهَبِ فِيهِنَّ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب لە هەر سێك مەسەلەکەدا.

ئینجا بزانە: ئەگەر منداڵێك لە جیماعی ئەم مێردە دروست ببێ، ئەوە دەبێتە منداڵی خۆی، نابێتە منداڵی مێردە تەڵاقدەرەکە، هەروەها بزانە: ئەگەر ئەم مێردەش لە دوای جیماعکردن ژنەکەی تەڵاق داو (عِدَّة)ی لەویش تەواو بوو، ئەو کاتە بۆ مێردەکەییەکەم حەڵاڵ دەبێ مارەی بکاتەوە، هەروەك لە زۆربەیسەرچاوەکاندا فەرموویانە ﴿عَنْ عائشة رضي الله عنها: أَنَّ امْرَأَةَ رِفَاعَةَ قَالَتْ: يَارَسُولَ اللهِ إِنَّ رِفَاعَةَ طَلَّقَنِي فَبَتَّ طَلاَقِي، وإِنِّي نَكَحْتُ بَعْدَهُ عَبْدَالرَّحْمَنِ الْقُرَظِيِّ، وإِنَّمَا مَعَهُ مِثْلُ الْهُدْبَةِ، فَقَالَ رسولُ اللهِ ﷺ: لَعَلَّكِ تُرِيدِينَ أَنْ تَرْجِعِي إِلى رِفَاعَةَ؟ لاَ، حَتَّى يَذُوقَ عُسَيْلَتَكِ وَتَذُوقِي عُسَيْلَتَهُ﴾ رواه الشيخان وأصحاب السنن، ژنی (ریفاعة) بە پێغەمبەری ﷺ گوت: (ریفاعة) بە یەکجاری سێبەسێ تەڵاقیدام، منیش شووم بە (عبدالرحمن) کرد، بەڵام (ذكر)ی (عبدالرحمن) وەك پارچە پەڕۆك شلو نەرمەو جیماعی لەگەڵ نەکردوم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: وا دیارە دەتەوێ بگەڕێیەوە لای (ریفاعة)؟ نا، ئەوە دوروست نابێ، تا (عبدالرحمن) هەنگوینۆکەت تام دەکاو تۆش هەنگوینۆکەی ئەوی تام دەکەی. واتە: تا لەزەتی جیماع لە یەکتری تام دەکەن.

جا بزانە: ئەم جیماعەش بۆیێ داندراوە تاکو پیاو نەفرەت لە تەڵاقی سێبەسێ بکا، هەر لە بەر ئەوەش لە کوردستاندا ئەم مەسەلەیە بە (مارە بە جاش) ناو دەبرێ.

(وَلَوْ نَكَحَ) ئەگەر مێردەکەیدووەم ژنە تەڵاقدراوەکەی مارە کرد (بِشَرْطِ إِذَا وَطِئَ طَلَّقَ) بەو مەرجەی هەر کاتێك جیماعی لەگەڵ کرد تەڵاقی بدا (أَوْ بَانَتْ) یان لێی جیا بێتەوە (أَوْ فَلاَ نِكَاحَ) یان هچیتر مارەبڕییەکتری نەبن، ئەوە (بَطَلَ) بە هۆی ئەو مەرج دانانە مارەبڕینەکە بەتاڵەو دروست نابێ، بۆیێ پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿لَعَنَ اللهُ الْمُحَلِّلَ وَالْمُحَلَّلَ لَهُ﴾ رواه أصحاب السنن بسند صحيح، لەعنەتی خوا لەو کەسەی ژنێك مارە دەکا تاکو بۆ مێردەکەی حەڵاڵی بکاو لەعنەت لەو مێردەش کە بۆی حەڵاڵ دەکرێ.

ئینجا بزانە: ئەو بەتاڵبوونو لەعنەتە لەو حاڵەتەدایە: کە لە ناو مامڵەتی مارەبڕینەکەدا ئەو مەرجە دابنێن، چونکە ئەگەر لە مارەبڕینەکەدا مەرجەکە دانەنێن، بەڵکو لە پێش مارەبڕینەکەدا لە سەر مەرجەکە ڕێك بکەون، ئەو کاتە مارەبڕینەکە دروست دەبێ، بەڵام

(فَصْلٌ) لاَ يَنْكِحُ مَنْ يَمْلِكُهَا أَوْ بَعْضَهَا، وَلَوْ مَلَكَ زَوْجَتَهُ أَوْ بَعْضَهَا بَطَلَ نِكَاحُـــهُ، وَلاَ تَنْكِحُ مَنْ تَمْلِكُهُ أَوْ بَعْضَهُ، وَلاَالْحُرُّ أَمَةَ غَيْرِهِ إِلاَّ بِشُرُوطٍ: أَنْ لاَ يَكُونَ تَحْتَــهُ حُــرَّةٌ تَصْلُحُ لِلاسْتِمْتَاعِ قِيلَ وَلاَ غَيْرُصَالِحَةٍ. وَأَنْ يَعْجِزَ عَنْ حُرَّةٍ تَصْلُحُ قِيلَ أَوْ لاَ تَصْــلُحُ، فَلَوْ قَدَرَ عَلَى غَائِبَةٍ حَلَّتْ لَهُ أَمَةٌ إِنْ لَحِقَهُ مَشَقَّةٌ ظَاهِرَةٌ فِي قَصْدِهَا أَوْ خَافَ زِنًا مُدَّتَهُ، وَلَوْ وَجَدَ حُرَّةً بِمُؤَجَّلٍ أَوْ بِدُونِ مَهْرِالْمِثْلِ فَالأَصَحُّ حِلُّ أَمَةٍ فِيالأُولَى دُونَ الثَّانِيَةِ. وَأَنْ يَخَافَ زِنًا فَلَوْ أَمْكَنَهُ تَسَرٍّ

---

ناپەسندە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە، كەوابو: لەعنـەتی حەدیسەكەش نایگرێتەوە (وَفِي التَّطْلِيقِ قَوْلٌ) لەبارەی مەرجی تەلاقدان فەرموودەیەك هەیە: كە زیانی نیە.

## ﴿ فَصْلٌ: لەبارەی مارەكردنی ئافرەتێكی كۆیلە ﴾

(لاَ يَنْكِحُ مَنْ يَمْلِكُهَا) دروست نابێ ئـەو (جاریـة)یـە لـە خـۆی مـارە بكـا كـە هـەمووی ملكـی خۆیەتی (أَوْ بَعْضَهَا) یان بەشێكی ملكیخۆیەتی (وَلَوْ مَلَكَ زَوْجَتَهُ أَوْ بَعْضَهَا) ئەگەر ژنـی خۆی بووە ملكیخۆی: هەمووی، یان بەشێكی (بَطَلَ نِكَاحُهُ) مارەبڕینەكە بەتاڵ دەبێتەوە.

(وَلاَ تَنْكِحُ مَنْ تَمْلِكُهُ أَوْ بَعْضَهُ) هەروەها دروست نیە ئـافرەت شـوو بـەو كۆیلەیە بكـا كـە ملكیخۆیەتی: هەمووی، یان بەشێكی.

(وَلاَ الْحُرُّ أَمَةَ غَيْرِهِ) هەروەها دروست نیە پیاویئازادیش (جاریـة)ی كەسێكیتر لـە خـۆی مارە بكا (إِلاَّ بِشُرُوطٍ) تەنها بە چوار مەرج دروستە: یەكەم (أَنْ لاَ يَكُونَ تَحْتَهُ حُرَّةٌ تَصْلُحُ لِلاسْتِمْتَاعِ) نابێ ژنێكیئازادی وەهای هەبێ: كە بـۆ لـەزەتوەرگرتن دەسـت بـدا (قِيـلَ وَلاَ غَيْرُ صَالِحَةٍ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: ئەگەر دەستیش نەدا هەر نەیبێ.

دووەم: (وَأَنْ يَعْجِزَ عَنْ حُرَّةٍ تَصْلُحُ) پیاوەكە توانای هێنانی ژنێكی ئـازادی نـەبێ: كـە بـۆ لەزەت لێدیتن بگونجێ (قِيلَ أَوْ لاَ تَصْلُحُ) لە فەرموودەیەكی بـێهێزدا ئـەوەی ناشـگونجێ هەر توانای هێنانی نەبێ: وەك مارەیی دەست نەكەوێ (فَلَوْ قَدَرَ عَلَى غَائِبَةٍ) ئەگەر توانای هێنانی ژنێكی لە شارێكیتر هەبو، ئەو كاتەش (حَلَّتْ لَـهُ أَمَـةٌ) مـارەكردنی (جاریـة)ی بـۆ حەلاڵە لە خۆی (إِنْ لَحِقَهُ مَشَقَّةٌ ظَاهِرَةٌ فِي قَصْدِهَا) ئەگەر ماندووبوونێكی ئاشكرای تووش ببێ لە بەدواداگەڕانیدا (أَوْ خَافَ زِنًا مُدَّتَـهُ) یـان لـە مـاوەی بەدواداگەڕانیدا مەترسی تووشبوونی زینای هەبێ (وَلَوْ وَجَدَ حُرَّةً بِمُؤَجَّلٍ) ئەگەر ژنێكیئازادی دەسـت كـەوت بـە مارەییەكیقەرز (أَوْ بِدُونِ مَهْرِ الْمِثْلِ) یان بە كەمتر لە مارەییهاوێنە، ئەوە (فَالأَصَحُّ حِلُّ أَمَةٍ فِي الأُولَى) لە مەسەلەییەكەمدا (جاریە)ی بۆ حەلاڵە (دُونَ الثَّانِيَةِ) بـەلام لـە دووەمـدا بۆی حەلاڵ نیە.

سێیەم: (وَأَنْ يَخَافَ زِنًا) پیاوەكە لەتوشبوونی زینا بترسێ، كەوابو: (فَلَوْ أَمْكَنَهُ تَسَرٍّ) ئەگەر بۆی گونجا بە (جاریة)یـەكی حـەلاڵ شـەهوەتی خـۆی تێـر بكـا: وەك (جاریـة)كی

فَلاَ خَوْفَ فِيالأَصَحِّ. وَإِسْلاَمُهَا، وَتَحِلُّ لِحُرٍّ وَعَبْدٍ كِتَابِيَّيْنِ أَمَةٌ كِتَابِيَّةٌ عَلَىالصَّحِيحِ، لاَ لِعَبْدٍ مُسْلِمٍ فِيالْمَشْهُورِ، وَمَنْ بَعْضُهَا رَقِيقٌ كَرَقِيقَةٍ، وَلَوْ نَكَحَ حُرٌّ أَمَةً بِشَرْطِهِ ثُمَّ أَيْسَرَ أَوْ نَكَحَ حُرَّةً لَمْ تَنْفَسِخِ الأَمَةُ، وَلَوْ جَمَعَ مَنْ لاَ تَحِلُّ لَهُ الأَمَةُ حُرَّةً وَأَمَةً بِعَقْدٍ بَطَلَتِ الأَمَةُ لاَ الْحُرَّةُ فِيالأَظْهَرِ.

---

هەبێ، یان بە پارەیەکی هەرزان دەستی بکەوێ، ئەو کاتە (فَلاَ خَوْفَ فِيالأَصَحِّ) مەترسی زینای نیەو دروست نیە (جاریة)ی کەسێکیترمارە بکا.

**چوارەم:** (وَإِسْلاَمُهَا) (جاریـة)کـەش موسـوڵمان بـێ، واتـە: مـارەکردنی (جاریـة)یکـافر دروست نیە، خوای گەورە دەفـەرموێ: ﴿وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ مِنْكُمْ طَوْلاً أَنْ يَنْكِحَ الْمُحْصَنَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ فَمِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ مِنْ فَتَيَاتِكُمُ الْمُؤْمِنَاتِ﴾ إلى قولـه: ﴿ذَلِكَ لِمَنْ خَشِيَ الْعَنَتَ مِنْكُمْ﴾ هەر یەکێك لە ئێوە نەیتوانی ئافرەتێکی ئازادی ئیماندار لە خۆی مـارە بکـا، بـۆی دروستە: یەکێك لە جاریەکانی ئیماندار مارە بکا...ئەویش بـۆ ئـەو کەسـە حەڵاڵـە کـە لـە زینا بترسێ.

(وَتَحِلُّ لِحُرٍّ وَعَبْدٍ كِتَابِيَّيْنِ) حەڵاڵە بۆ پیـاوی ئـازادی کـافری خـاوەن کیتـابو بـۆ کۆیلـەی کافری خاوەن کیتاب، واتە: جولەکەو دیان (أَمَةٌ كِتَابِيَّةٌ عَلَىالصَّحِيحِ) جاریەیـەکی کـافری خـاوەن کیتـاب لـە خۆیـان مـارە بکـەن (لاَ لِعَبْدٍ مُسْلِمٍ فِيالْمَشْهُورِ) بـەڵام بـۆ کۆیلـەی موسوڵمان دروست نیە (جاریة)یەکی کافری خاوەن کیتاب لە خۆی مارە بکا.

(وَمَنْ بَعْضُهَا رَقِيقٌ) هەر ئافرەتێك بەشێکی کۆیلـە بـێو بەشێکیشـی ئـازاد بـێ، ئـەوەش (كَرَقِيقَةٍ) وەك هـەمووی کۆیلـە بـێ ئەوهایـە (وَلَوْ نَكَحَ حُرٌّ أَمَةً) ئەگـەر پیاوێکیئـازاد (جاریة)یەکی لە خۆی مارە کرد (بِشَرْطِهِ) بـەو چوار مەرجـەیڕابردوو (ثُمَّ أَيْسَرَ) ئینجـا دەوڵەمەند بوو و توانای هێنانی ئافرەتێکیئازادی پەیدا بوو (أَوْ نَكَحَ حُرَّةً) یان ئافرەتێکی ئازادی لە خۆی مارە کرد، ئەوە (لَمْ تَنْفَسِخِ الأَمَةُ) مارەبڕینی (جاریة)کە هەڵناوەشێتەوە.

(وَلَوْ جَمَعَ مَنْ لاَ تَحِلُّ لَهُ الأَمَةُ) ئەگەر ئەو پیاوەی مارەکردنی جاریەی بۆ حەڵاڵ نیە کۆی کردەوە (حُرَّةً وَأَمَةً) ژنێکیئازادو (جاریة)یەك (بِعَقْدٍ) بە یەك مارەبڕین، ئەوە (بَطَلَتِ الأَمَةُ) مارەبڕینیجاریەکە بەتاڵ دەبێ (لاَ الْحُرَّةُ فِيالأَظْهَرِ) بەڵام مارەبڕینی ژنە ئازادەکـە بـەتاڵ نابێ بەڵکو دروست دەبێ.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی هێنانی ژنێکی کافر ﴾

**پێشەکی بزانە:** بە هیچ جۆرێك حەڵاڵ نیە ئافرەتیموسوڵمان لە پیاویکافر مـارە بکرێ، جا کافرەکە: جولەکە بێ، یان دیـان-گـاور بـێ، یـان بتپەرست بـێ، یـان موسـوڵمانێکی کافربوو بێ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تُنْكِحُواالْمُشْرِكِينَ حَتَّى يُؤْمِنُوا﴾ ئـافرەتی موسوڵمان لە پیاوە کافرەکان مارە مەکەن تا ئیمان دێنن.

(فَصْلٌ) يَحْرُمُ نِكَاحُ مَنْ لاَ كِتَابَ لَهَا كَوَثَنِيَّةٍ وَمَجُوسِيَّةٍ، وَتَحِلُّ كِتَابِيَّةٌ لَكِنْ تُكْرَهُ حَرْبِيَّةٌ وَكَذَا ذِمِّيَّةٌ عَلَى الصَّحِيحِ، وَالْكِتَابِيَّةُ: يَهُودِيَّةٌ أَوْ نَصْرَانِيَّةٌ لاَ مُتَمَسِّكَةٌ بِالزَّبُورِ وَغَيْرِهِ، فَإِنْ لَمْ تَكُنِ الْكِتَابِيَّةُ إِسْرَائِيلِيَّةً فَالأَظْهَرُ حِلُّهَا إِنْ عُلِمَ دُخُولُ قَوْمِهَا فِي ذَلِكَ الدِّينِ قَبْلَ نَسْخِهِ وَتَحْرِيفِهِ،

---

هەروەها (يَحْرُمُ نِكَاحُ مَنْ لاَ كِتَابَ لَهَا) حەرامە پیاوی‌موسوڵمان ئەو ئافرەتە لە خۆی مارەبکا: کە (أَهْلُ الْكِتَاب)نیە، واتە: لە لای خواوە هیچ کتابێکیان بۆ دانەندراوە ڕەفتاری پێ بکەن (كَوَثَنِيَّةٍ) وەکو ئافرەتی‌بتپەرستو (وَمَجُوسِيَّةٍ) ئافرەتی‌مەگوش، واتە: ئاگرپەرستو...هتد، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَنكِحُواالْمُشْرِكَاتِ حَتَّى يُؤْمِنَّ﴾ ئافرەتە کافرەکان لە خۆتان مارە مەکەن تا ئیمان دێنن.

بەلام (وَتَحِلُّ كِتَابِيَّةٌ) بۆ پیاوی‌موسوڵمان حەلالە: ئافرەتی کافری (أهل الكتاب) لە خۆی مارە بکا، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ الَّذِينَ أُوتُواالْكِتَابَ مِنْ قَبْلِكُمْ﴾ حەلاڵە ئافرەتە ئازادەکانی ئەو کافرانە لە خۆتان مارە بکەن کە پێش ئێوە لە لای خواوە کتێبیان دراوەتێ ڕەفتاری پێ‌بکەن.

(لَكِنْ تُكْرَهُ حَرْبِيَّةٌ) بەلام ئەو ئافرەتە کافرانەی جەنگ لە دژی موسوڵمانان دەکەن، ناپەسندە لە خۆیان مارە بکا (وَكَذَا ذِمِّيَّةٌ عَلَى الصَّحِيحِ) هەروەها ئافرەتە کافرەکانی پەیمان لە ئەستۆش هەر ناپەسندە لە خۆی مارەبکا، هەر چەند (أهل الكتاب)ش بن، لە سەر فەرموودەی ڕاست، نەوەك باوەڕی خۆی، یان منداڵەکانی تێك بدا.

(وَالْكِتَابِيَّةُ) مەبەست بە ئافرەتی(أهل الكتاب) کە مارەکردنی حەلالە: (يَهُودِيَّةٌ أَوْ نَصْرَانِيَّةٌ) تەنها ئافرەتی جولەکەیە، یان دیانە=گاورە (لاَ مُتَمَسِّكَةٌ بِالزَّبُورِ) نەك ئەو ئافرەتەی دەستی گرتوە بە (زَبوری) حەزرەتی(داود)پێغەمبەرعلیه الصلاةوالسلام (وَغَيْرِهِ) یان بە کتێبەکانی‌تری وەك (صحف)ی (شیث و إدریس و إبراهیم) علیهم الصلاةوالسلام، واتە: ئەوانە حەلال نین.

(فَإِنْ لَمْ تَكُنِ الْكِتَابِيَّةُ إِسْرَائِيلِيَّةً) جا ئەگەر ئەو ئافرەتە (أهل الكتاب)ە لە (بنی‌إسرائیل) نەبو، واتە: لە نەتەوەی حەزرەتی (يَعْقُوب)پێغەمبەر نەبوعلیه الصلاةوالسلام (فَالأَظْهَرُ حِلُّهَا) ئەوەش بە فەرموودەی بەهێزتر حەلاڵە، بەلام (إِنْ عُلِمَ دُخُولُ قَوْمِهَا فِي ذَلِكَ الدِّينِ) بەو مەرجەی بێ‌گومان بزاندرێ: باپیرە گەورەی ئەو ئافرەتە هاتۆتە ناو ئەو ئایینەی جولەکە، یان دیان (قَبْلَ نَسْخِهِ وَتَحْرِيفِهِ) پێش ئەوەی ئایینەکە (نسخ) بوبێتەوەو گۆڕدرا بێ، واتە: بزاندرێ پێش گۆڕینی ئایینەکەو پێش هاتنی حەزرەتی(عیسی)پێغەمبەرﷺ یەکەم باپیرەی بوبێتە جولەکە، یان پێش گۆڕینو پێش هاتنی پێغەمبەرمان(محمد)ﷺ یەکەم باپیرەی بوبێتە دیان=گاور.

وَقِيلَ يَكْفِي قَبْلَ نَسْخِه، وَالْكِتَابِيَّةُ الْمَنْكُوحَةُ كَمُسْلِمَةٍ فِي نَفَقَةٍ وَقَسْمٍ وَطَلَاقٍ، وَتُجْبَرُ عَلَى غُسْلِ حَيْضٍ وَنِفَاسٍ وَكَذَا جَنَابَةٍ وَتَرْكِ أَكْلِ خِنْزِيرٍ فِي الْأَظْهَرِ، وَتُجْبَرُ هِيَ وَمُسْلِمَةٌ عَلَى غَسْلِ مَا نَجُسَ مِنْ أَعْضَائِهَا، وَتَحْرُمُ مُتَوَلِّدَةٌ مِنْ وَثَنِيٍّ وَكِتَابِيَّةٍ، وَكَذَا عَكْسُهُ فِي الْأَظْهَرِ، وَإِنْ خَالَفَتِ السَّامِرَةُ الْيَهُودَ وَالصَّابِئُونَ النَّصَارَى فِي أَصْلِ دِينِهِمْ حَرُمْنَ وَإِلَّا فَلَا، وَلَوْ تَهَوَّدَ نَصْرَانِيٌّ أَوْ عَكْسُهُ لَمْ يُقَرَّ فِي الْأَظْهَرِ،

---

**﴿ئاگاداری﴾**: ئەو ئاژەڵەی جولەکەو دیان سەری دەبڕن، ئەویش بەو مەرجەی‌ڕابردوو حەڵاڵ دەبێ، واتە: ئەگەر گومان لەو مەرجەی‌ڕابردوودا هەبو- وەك ئەم سەردەمە- ئەو کاتە ئافرەتەکەیان حەڵاڵ نابێ‌و ئاژەڵە سەربڕاوەکەشیان حەڵاڵ نابێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، کەوابو: لەم سەردەمەدا-بە هۆی ئەو مەرجە- زۆر زەحمەتە ئافرەتی دیان، یان جولەکە لە پیاوی‌موسوڵمان حەڵاڵ بێ، هەروەك لە (مغنی)دا فەرمویەتی. (وَقِيلَ يَكْفِي قَبْلَ نَسْخِهِ) لە فەرموودەیەکی بێ‌هێزدا: ئەوەندە بەسە: بزاندرێ پێش (نسخ)بوونەوە یەکەم باپیرەی هاتبێتە ناو ئایینەکە.

(وَالْكِتَابِيَّةُ الْمَنْكُوحَةُ كَمُسْلِمَةٍ) ئەو ژنە کافرەی (أهل الكتاب)-کە مارە کراوە- وەکو ژنی موسوڵمان ڕەفتاری لەگەڵ دەکرێ: (فِي نَفَقَةٍ) لە بەخێوکردن‌و (وَقَسْمٍ) لە نۆبەتی شەوی‌و (وَطَلَاقٍ) لە تەڵاقدان، هەم (وَتُجْبَرُ عَلَى غُسْلِ حَيْضٍ وَنِفَاسٍ) لە لای مێردەکەیەوە زۆری لێدەکرێ: بۆ غوسلی حەیزو زەیسانی‌و (وَكَذَا جَنَابَةٍ وَتَرْكِ أَكْلِ خِنْزِيرٍ فِي الْأَظْهَرِ) هەروەها بۆ غوسلی جەنابەت‌و بۆ وازهێنان لە خواردنی گۆشتی بەراز.

(وَتُجْبَرُ هِيَ وَمُسْلِمَةٌ عَلَى غَسْلِ مَا نَجُسَ مِنْ أَعْضَائِهَا) ژنی‌موسوڵمان‌و ژنی‌کافر هەردووکیان لە لای‌مێردەکەیانەوە زۆریان لێدەکرێ: هەر ئەندامێکیان پیس بوبێ، دەبی بیشۆن.

(وَتَحْرُمُ مُتَوَلِّدَةٌ مِنْ وَثَنِيٍّ وَكِتَابِيَّةٍ) حەرامە ئەو ئافرەتەی لە نێوان پیاوێکی‌بتپەرست‌و ژنێکی(أهل الكتاب)دا بوبێ (وَكَذَا عَكْسُهُ فِي الْأَظْهَرِ) هەروەها بە پێچەوانەش حەرامە، لە فەرموودەی بەهێزتردا (وَإِنْ خَالَفَتِ السَّامِرَةُ الْيَهُودَ) ئەگەر سامیریەکانی گوێلك پەرست لەگەڵ جولەکەکان جیا بون لە بنچینەی ئایینەکەیاندا، هەم (وَالصَّابِئُونَ النَّصَارَى فِي أَصْلِ دِينِهِمْ) سابیئیەکانیش لەگەڵ دیانەکان جیا بون لە بنچینەی ئایینەکانیاندا، ئەوە (حَرُمْنَ) مارەکردنی ژنەکانیان حەرامە، چونکە بە ئایینی خۆیانیش هەر کافرن (وَإِلَّا فَلَا) بەڵام ئەگەر جیاواز نەبن‌و مەرجەکەی‌ڕابردووش بێتە جێ، ئەو کاتە (فلا) مارەکردنی ژنەکانیان حەرام نیە.

(وَلَوْ تَهَوَّدَ نَصْرَانِيٌّ) ئەگەر دیانێك=گاورێك ببوە جوو (أَوْ عَكْسُهُ) یان بە پێچەوانەوە: جولەکەیەك بووە دیان (لَمْ يُقَرَّ) لە سەر ئەو ئایینە دووەمە جێگیر ناکرێ، واتە: لێی قبوڵ ناکرێ (فِي الْأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ يَبْتَغِ

فَإنْ كَانَتْ امْرَأَةً لَمْ تَحِلَّ لِمُسْلِمٍ، فَإنْ كَانَتْ مَنْكُوحَتَهُ فَكَرِدَّةِ مُسْلِمَةٍ، وَلاَ يُقْبَلُ مِنْهُ إلاَّالإسْلاَمُ، وَفِي قَوْلٍ أَوْ دِينُهُ الأَوَّلُ، وَلَوْ تَوَثَّنَ لَمْ يُقَرَّ، وَفِيمَا يُقْبَلُ الْقَوْلاَنِ، وَلَوْ تَهَوَّدَ وَثَنِيٌّ أَوْ تَنَصَّرَ لَمْ يُقَرَّ وَيَتَعَيَّنُ الإسْلاَمُ كَمُسْلِمٍ ارْتَدَّ، وَلاَ تَحِلُّ مُرْتَدَّةٌ لأَحَدٍ، وَلَوْ ارْتَدَّ زَوْجَانِ أَوْ أَحَدُهُمَا قَبْلَ دُخُولٍ تَنَجَّزَتِ الْفُرْقَةُ،

---

غَيْرَالإسْلاَمِ دِيناً فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ﴾ هەركەسێك جگە لە ئیسلام ئاینێكیتری بوێ لێی قبوڵ ناكرێ. كەوابو: (فَإنْ كَانَتْ امْرَأَةً) ئەگەر ئەوەی لە ئایینێكەوە چووەتە سەر ئاینێكیتر ئافرەت بوو (لَمْ تَحِلَّ لِمُسْلِمٍ) ئەو ئافرەتە بۆ پیاوی موسوڵمان حەڵاڵ نابێ، چونكە بە ئایینەكەی خۆیشی كافربووە، كەوابو: (فَإنْ كَانَتْ مَنْكُوحَتَهُ) ئەگەر ئەو جۆرە ئافرەتە مارەبڕاوی موسوڵمانێك بێ، ئەوەش (فَكَرِدَّةِ مُسْلِمَةٍ) وەك كافربوونی ئافرەتیموسوڵمانە: كە لە دوای ئێرە ڕوون كراوەتەوە.

(وَ) هەر كاتێك یەكێك لە ئاینێك چووە سەر ئایینێكیتر، ئەوە (لاَ يُقْبَلُ مِنْهُ إلاَّ الإسْلاَمُ) جگە لە ئیسلام هیچ ئایینێكیتری لێقبوڵ ناكرێ، واتە: نە ئایینە كۆنەكەیو نە ئایینە تازەكەی، بە بەڵگەی ئایەتەكەیڕابردوو، بەڵام (وَفِي قَوْلٍ) لە فەرموودەیەكدا: (أَوْ دِينُهُ الأَوَّلُ) یان ئەگەر نەبۆوە موسوڵمانو بەخۆی گەڕاوە سەر ئایینە كۆنەكەی، ئەو كاتە لێی قبوڵ دەكرێ (وَ) هەروەها (لَوْ تَوَثَّنَ) ئەگەر جولەكەیەك، یان دیانێك بووە بتپەرست (لَمْ يُقَرَّ) لە سەر بتپەرستیەكە جێگیر ناكرێ، ئینجا (وَفِيمَا يُقْبَلُ الْقَوْلاَنِ) لە بارەی ئەو ئایینەی لێی قبوڵ دەكرێ، هەردوو فەرموودەكەیڕابراوو هەنە، بەهێزترەكەیان: تەنها ئایینیئیسلامی لێقبوڵ دەكرێ، لە بێهێزەكەشدا: هەم ئایینەكۆنەكەیشی لێقبوڵ دەكرێ.

(وَلَوْ تَهَوَّدَ وَثَنِيٌّ أَوْ تَنَصَّرَ) ئەگەر بتپەرستێك بوە جولەكە، یان بوە دیان، ئەوە (لَمْ يُقَرَّ) جێگیر ناكرێ، بەڵكو (وَيَتَعَيَّنُ الإسْلاَمُ) تەنها ئیسلامی بۆ دیاری دەكرێ (كَمُسْلِمٍ ارْتَدَّ) وەك موسوڵمانێكی كافربوو، ئەگەر نەبێتەوە موسڵمان دەكوژرێ.

## ﴿(فَسْخ)= هەڵوەشانەوەی مارەبڕین بە هۆی كافربوونی ژنو مێردی موسوڵمان﴾

(وَلاَ تَحِلُّ مُرْتَدَّةٌ لأَحَدٍ) ئافرەتی لە دین وەرگەڕاو-واتە: لە ئیسلامەتیەوە بوبێتە كافر- بۆ هیچ كەسێك حەڵاڵ نیە مارەی بكا: نە بۆ پیاویموسوڵمانو نە بۆ پیاویكافر.

(وَلَوْ ارْتَدَّ زَوْجَانِ) ئەگەر ژنو مێردێك وێكڕا كافر بون (أَوْ أَحَدُهُمَا) یان تەنها یەكێكیان كافر بوو (قَبْلَ دُخُولٍ) كافربوونەكەشی پێش جیماعكردن بوو، ئەوە (تَنَجَّزَتِ الْفُرْقَةُ) دەسبەجێ لێك جیا دەبنەوەو مارەبڕینەكە هەڵدەوەشێتەوە.

واتە: ئەگەر ژنێك مارەبڕاوی مێردەكەی بێو هێشتا جیماعی لەگەڵ نەكردبێ، ئینجا تەنها ژنەكە، یان تەنها مێردەكە، یان هەردووكیان وێكڕا، تەنها كوفرێك بكەن، ئەوە مارەبڕینەكەیان هەڵدەوەشێتەوەو لە یەكتری حەرام دەبن، بە (إجماع)ی زانایانیئیسلام،

أَوْ بَعْدَهُ وُقِفَتْ: فَإِنْ جَمَعَهُمَا الإِسْلاَمُ فِي الْعِدَّةِ دَامَ النِّكَاحُ، وَإِلاَّ فَالْفُرْقَةُ مِنَ الرِّدَّةِ، وَيَحْرُمُ الْوَطْءُ فِي التَّوَقُّفِ وَلاَ حَدَّ.

(بَابُ نِكَاحِ الْمُشْرِكِ)

أَسْلَمَ كِتَابِيٌّ أَوْ غَيْرُهُ وَتَحْتَهُ كِتَابِيَّةٌ

---

جا ئەگەر کافریووەکە بۆوە موسوڵمان، ئەو کاتە پێویستە سەرلەنوێ ژنەکە لە مێردەکە مارە بکرێتەوە، هەروەك لە (فَصْل)ی‌داهاتووشدا ڕوونی دەکەینەوە.

﴿ ئاگاداری ﴾: لە ماوەی‌دەستگیرانی‌دا ئەم حاڵەتەی‌کوفرکردن زۆر ڕوو دەدا، بۆیە پێویستە مامۆستایانی‌ئایینی خەڵکی لەم مەسەلەیە ئاگادار بکەنەوە، ئەوەك لە دوای کوفرکردنەکە-بێ‌مارەکردنەوە-ژنەکە بگوازێتەوەو بە حەرامی جیماعی لەگەڵ بکا.

جا بزانە: هەر کاتێك ژنەکە، یان مێردەکە بە بیرو باوەڕەوە ببێتە ئەندامێکی ئەو گرۆهە (علمانی)یانەی باوەڕیان بە شەریعەتی‌ئیسلام نیە، ئەوەش بە کافربوونەوە دادەنرێ‌و مارەبڕینەکە هەڵدەوەشێتەوە، هەروەها ئەو مەزهەبانەی لە ئیسلام لایانداوە: وەکو (ئێزیدی)و (کاکەیی)و (سارەلی)و...هتد، ئەوانەش گشتی بە موسوڵمانی‌کافربوو دادەنرێن‌و ئافرەتەکانیان‌و ئاژەڵە سەربڕاوەکانیان حەڵاڵ نین.

(أَوْ بَعْدَهُ) یان ئەگەر لە دوای جیماعکردن ژنەکە، یان مێردەکە، یان هەردووکیان بونە کافر، ئەو کاتە (وُقِفَتْ) جیابوونەوەکە ڕادەگیرێ‌و چاوەڕوان دەکرێ: (فَإِنْ جَمَعَهُمَا الإِسْلاَمُ فِي الْعِدَّةِ) ئەگەر لە ماوەی(عِدَّة)دا ئیسلامەتی هەردووکیانی کۆ کردەوە، واتە: کافربووەکە بۆوە موسوڵمان، ئەوە (دَامَ النِّكَاحُ) مارەبڕینەکە هەر بەردەوام دەبێ‌و پێویست بە مارەکردنەوەیەکی نوێ ناکا.

(وَإِلَّا) بەڵام ئەگەر (عِدَّة)ی‌ژنەکە تەواو بوو و کافربووەکەش نەبۆوە موسوڵمان، یان لە ماوەی(عِدَّة)دا کافربووەکە بە کافری مرد، ئەو کاتە (فَالْفُرْقَةُ مِنَ الرِّدَّةِ) لێکجیابوونەوەکەیان لە کافربوونەوە حیساب دەکرێ، واتە: وا دادەنرێ لە کاتی‌کافربوونەوە مارەبڕینەکە هەڵوەشاوەتەوەو ژن‌و مێردایەتییان لە نێواندا نەماوەو میرات لە یەکتری ناگرن.

(وَيَحْرُمُ الْوَطْءُ فِي التَّوَقُّفِ) لە ماوەی‌ڕاگرتنی لێکجیابوونەوەدا حەرامە: جیماع لەگەڵ ژنەکە بکا، بەڵام (وَلاَ حَدَّ) ئەگەر جیماعی کرد سزای زینای لە سەر نیە، جا ئەگەر لە دوای تەواوبوونی(عِدَّة) کافربووەکە بۆوە موسوڵمان، ئەو کاتە بە مارەبڕینێکی نوێ ژنەکەی لێ حەڵاڵ دەبێتەوە.

﴿ بَابُ نِكَاحِ الْمُشْرِكِ: **باسی مارەبڕینی کافر کە موسوڵمان دەبێ** ﴾

(أَسْلَمَ كِتَابِيٌّ) ئەگەر کافرێکی(أهل الكتاب) موسوڵمان بو (أَوْ غَيْرُهُ) یان کافرێکی‌تری بتپەرست، یان ئاگرپەرست...هتد، موسوڵمان بو (وَتَحْتَهُ كِتَابِيَّةٌ) لە کاتی موسوڵمانبوونی‌دا

دَامَ نِكَاحُهُ، أَوْ وَثَنِيَّةٌ أَوْ مَجُوسِيَّةٌ فَتَخَلَّفَتْ قَبْلَ دُخُـولٍ تَنَجَّـزَتِ الْفُرْقَـةُ، أَوْ بَعْـدَهُ وَأَسْلَمَتْ فِي الْعِدَّةِ دَامَ نِكَاحُهُ، وَإِلاَّ فَالْفُرْقَةُ مِنْ إِسْلاَمِهِ. وَلَوْ أَسْلَمَتْ وَأَصَرَّ فَكَعَكْسِهِ، وَلَوْ أَسْلَمَا مَعًا دَامَ النِّكَاحُ، وَالْمَعِيَّةُ بِآخِرِ اللَّفْظِ.

---

ژنێکیمارەبڕاوی (أهل الكتاب)ی لە ژێردا بوو، ئەوە (دَامَ نِكَاحُهُ) لە دوای موسوڵمانبوونیش مارەبڕینەکەی هەر بەردەوام دەبێو پێویست بە نوێکردنەوەی مارەبڕینەکە ناکا.

بەڵام (أَوْ وَثَنِيَّةٌ أَوْ مَجُوسِيَّةٌ) ئەگەر ژنێکیمارەبڕوای بتپەرست، یان ئاگرپەرستی لە ژێردا بوو (فَتَخَلَّفَتْ) ژنەکەش دواکەوتو لەگەڵ مێردەکەی موسوڵمان نەبو (قَبْلَ دُخُولٍ) دواکەوتنەکەشی پێش جیماعکردن بو، ئەوە (تَنَجَّزَتِ الْفُرْقَةُ) دەستبەجێ لێك جیا دەبنەوەو مارەبڕینەکە هەڵدەوەشێتەوە.

(أَوْ بَعْدَهُ) یان لە دوای جیماعکردن ژنەکە دواکەوت، بەڵام (وَأَسْلَمَتْ فِي الْعِدَّةِ) ژنەکە لە (عِدَّة)دا موسوڵمان بوو، ئەو کاتە (دَامَ نِكَاحُهُ) مارەبڕینەکە هەر بەردەوام دەبێ، بە (إجماع)ی زانایانیئیسلام (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر (عِدَّة)ی تەواو بوو و ژنەکەش نەبۆوە موسوڵمان، ئەوە (فَالْفُرْقَةُ مِنْ إِسْلاَمِهِ) لێکجیابوونەوەکەیان لە موسوڵمانبوونی مێردەکەوە حیساب دەکرێ، بە(إجماع)ی زانایانیئیسلام، واتە: لە کاتی موسوڵمانبوونی مێردەکەوە مارەبڕینەکە هەڵوەشاوەتەوەو ئیستا دەتوانێ مێردێکیتر بکا.

(وَلَوْ أَسْلَمَتْ) ئەگەر ژنەکە موسوڵمان بوو، بەڵام (وَأَصَرَّ) مێردەکە سوور بوو لە سەر کافرایەتی (فَكَعَكْسِهِ) ئەوەش وەك پێچەوانەکەیەتی، واتە: ئەگەر موسوڵمانبوونی ژنەکە پێش جیماعکردن بێ، ئەوە دەسبەجێ مارەبڕینەکەی هەڵدەوەشێتەوەو ژنەکە دەتوانێ مێردێکیتر بکا، بەڵام ئەگەر لە دوای جیماعکردن ژنەکە بووە موسوڵمان، ئەوە چاوەڕوان دەکرێ: ئەگەر لە ماوەی(عِدَّة)دا مێردەکەش موسوڵمان بوو، ئەوە مارەبڕینەکە بەردەوام دەبێ، وە ئەگەر (عِدَّة)ی تەواو بوو و مێردەکەش نەبۆوە موسوڵمان، ئەوە لە موسوڵمانبوونی ژنەکەوە لێکجیابوونەوەیان حیساب دەکرێو ئێستا دەتوانێ مێردێکیتر بکا (وَلَوْ أَسْلَمَا مَعًا) ئەگەر ژنو مێردەکە وێکڕا موسوڵمان بون، ئەو کاتەش (دَامَ النِّكَاحُ) مارەبڕینەکە هەر بەردەوام دەبێ، بە (إجماع)ی زانایانیئیسلام (وَالْمَعِيَّةُ بِآخِرِ اللَّفْظِ) وێکڕایی موسوڵمانبوونەکەش بە وێکڕایی ئاخیر ووشەی ئیسلامبوون ڕەچاو دەکرێ، واتە: وێکڕا ووشەی شادەوئیمان تەواو بکەن.

﴿ئاگاداری﴾: هەر یەکێك لە ژنەکە، یان لە مێردەکە موسوڵمان ببێ، ئەوە بە پابەندی ئەو موسوڵمانە بڕیاریئیسلامیەتی بۆ منداڵە نەبالغەکانیشیان دەدرێ، هەروەك لە باسی (اللَّقِيط)=منداڵی فڕێدراودا ڕوونمان کردەوە.

وَحَيْثُ أَدَمْنَا لاَ تَضُرُّ مُقَارَنَةُ الْعَقْد لمُفْسد هُوَ زَائِلٌ عِنْدَالإِسْلاَمِ وَكَانَتْ بِحَيْثُ تَحِلُّ لَهُ الآنَ، وَإِنْ بَقِيَ الْمُفْسِدُ فَلاَ نِكَاحَ، فَيُقَرُّ فِي نِكَاحٍ بِلاَ وَلِيٍّ وَشُهُود، وَفِي عِدَّة هِيَ مُنْقَضِيَةٌ عِنْدَالإِسْلاَمِ، وَمُؤَقَّت إِنْ اعْتَقَدُوهُ مُؤَبَّدًا، وَكَذَا لَوْ قَارَنَ الإِسْلاَمَ عِدَّةُ شُبْهَة عَلَى الْمَذْهَبِ، لاَ نِكَاحُ مَحْرَمٍ. وَلَوْ أَسْلَمَ ثُمَّ أَحْرَمَ ثُمَّ أَسْلَمَتْ وَهُوَ مُحْرِمٌ أُقِرَّ عَلَى الْمَذْهَبِ،

---

جا بزانه: (فَسْخ)=هەڵوەشانەوەی‌مارەبڕین به هۆی‌کافربوون، یان بـه هۆی‌موسوڵمانبوون وەکو تەڵاق نیه، واته: هەڵوەشانەوەکە ژمارەی‌تەڵاق کەم ناکاتەوە، هەروەك (الشبراملسی) فەرموویەتی، کەواته: ئەگەر له دوای‌هەڵوەشانەوەکە ئەوەکەی‌تریش موسوڵمان ببێ، ئەوه له هەموو حاڵەتەکاندا به مارەبڕینێکی‌نوێ ژنەکە له مێردەکەی حەڵاڵ دەبێـەوە.

ئینجا (وَحَيْثُ أَدَمْنَا النِّكَاحَ) هـەر کاتێك مارەبڕینەکـه هەڵنەوەشێتەوەو بـه بـەردەوامی دابنێین، ئەوه (لاَ تَضُرُّ مُقَارَنَةُ الْعَقْد لِمُفْسِدٍ) زیانی نیه ئەگەر مارەبڕینەکەی سـەردەمی‌کوفر تێکدەرێکی لەگەڵدا بوبێ: که (هُوَ زَائِلٌ عِنْدَ الإِسْلاَمِ) تێکدەرەکە لـه کـاتی موسوڵمانبووندا نەمابێ‌و هەم (وَكَانَتْ بِحَيْثُ تَحِلُّ لَهُ الآنَ) ژنەکەشی ئێستا لێی حەڵاڵ دەبو ئەگەر لێی ماره کرابا، بەڵام (وَإِنْ بَقِيَ الْمُفْسِدُ) ئەگەر تێکدەرەکەی سەردەمی کوفر تا کاتی موسوڵمانبوون مابو، ئەو کاته (فَلاَ نِكَاحَ) مارەبڕینەکە له نێوانیاندا بەردەوام نابێ.

جا هەر لەسەر ئەو بڕیارەی‌ڕابردوو (فَيُقَرُّ فِي نِكَاحٍ بِلاَ وَلِيٍّ وَشُهُودٍ) بـەردەوام دەکـرێ لـه سەر مارەبڕینێکی بێ(وَلِي)و بێ‌شاهید، هەم (وَفِي‌عِدَّةٍ هِيَ مُنْقَضِيَةٌ عِنْدَالإِسْلاَمِ) لـه سـەر ئەو مارەبڕینەش که له (عِدَّة)دا کراوەو (عِدَّة)کەش لـه کاتی‌موسوڵمانبوون تـەواو بوبـێ، هەم (وَمُؤَقَّتٍ إِنْ اعْتَقَدُوهُ مُؤَبَّدًا) له سەر ئەو مارەبڕینەش که بۆ ماوەیـەك کراوه، ئەگـەر به باوەڕی ئەوان بەردەوام دەبو (وَكَذَا لَوْ قَارَنَ الإِسْلاَمَ عِدَّةُ شُبْهَةٍ) هـەروەها بـەردەوام دەکـرێ ئەگـەر (عِـدَّة)ی جیمـاعی بـه هەڵـه لەگـەڵ موسوڵمانبوونی هـەردووکیان، یـان یەکێکیان بەرامبەر بێ، واته: له (عِدَّة)ی جیماعی به هەڵەدا موسوڵمان ببن (عَلَى‌الْمَذْهَبِ) له سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب.

بـەڵام (لاَ نِكَاحُ مَحْرَمٍ) بـەردەوام نـاکرێ لـه سـەر مـارەبڕینی ئافرەتێکی‌مـەحرەم: بـه خزمایەتی، یان به شیر، یان به زاواو خەزورایەتی: وەك کیژی‌خۆی، یان ژنـی بـاوکی‌خۆی له خۆی ماره کردبێ، چونکه تێکدەرەکە تا کاتی موسوڵمانبوون هەر ماوە.

(وَلَوْ أَسْلَمَ) ئەگەر مێردەکە موسوڵمان بوو (ثُمَّ أَحْرَمَ) ئینجا ئیحرامی بەست: به حـەج، یان به عومرە (ثُمَّ أَسْلَمَتْ وَهُوَ مُحْرِمٌ) ئینجا ژنەکـەش موسوڵمان بـوو و مێردەکـەش هـەر لـه ئیحرامدا بوو، ئەوه (أُقِرَّ) لـه سـەر مارەبڕینەکـه بـەردەوام دەکرێ (عَلَى‌الْمَذْهَبِ) لـه سـەر فەرموودەراستی مەزهەب.

وَلَوْ نَكَحَ حُرَّةً وَأَمَةً وَأَسْلَمُوا تَعَيَّنَت الْحُرَّةُ وَانْدَفَعَت الأَمَةُ عَلَى الْمَذْهَب، وَنِكَاحُ الْكُفَّار صَحِيحٌ عَلَى الصَّحِيح، وَقِيلَ فَاسِدٌ، وَقِيلَ إنْ أَسْلَمَ وَقُرِّرَ تَبَيَّنَّا صِحَّتَهُ وَإِلاَّ فَلاَ، فَعَلَى الصَّحِيحِ لَوْ طَلَّقَ ثَلاَثًا ثُمَّ أَسْلَمَا لَمْ تَحِلَّ إلاَّ بِمُحَلِّلٍ، وَمَنْ قُرِّرَتْ فَلَهَا الْمُسَمَّى الصَّحِيحُ، وَأَمَّا الْفَاسِدُ كَخَمْرٍ: فَإِنْ قَبَضَتْهُ قَبْلَ الإِسْلاَمِ فَلاَ شَيْءَ لَهَا، وَإِلاَّ

---

(وَلَوْ نَكَحَ حُرَّةً وَأَمَةً) ئەگەر ئافرەتێکی ئازادو ئافرەتێکی کۆیلەی لە خۆی مارە کردبون، ئینجا (وَأَسْلَمُوا) هەرسێکیان موسوڵمان بون، ئەوە (تَعَيَّنَتْ الْحُرَّةُ) تەنها ئازادەکە بە ژنی بەردەوام دیاری دەکرێو (وَانْدَفَعَتْ الأَمَةُ) جاریەکەشی لە ژنایەتی لادەچێ (عَلَى الْمَذْهَبِ) لەسەر فەرموودەی ناسراوی مەزهەب.

(وَنِكَاحُ الْكُفَّارِ صَحِيحٌ) مارەبڕینی کافرەکان بە دروستبوو دادەندرێ (عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست ﴿عن غيلان: أَنَّهُ أَسْلَمَ وَلَهُ عَشْرُ نِسْوَةٍ فَأَمَرَهُ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يَتَخَيَّرَ مِنْهُنَّ أَرْبَعًا﴾ صححه الحاكم وابن حبان، کە (غیلان) موسوڵمان بوو، دە ژنی هەبون، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکرد: لەو دە ژنانە چواریان هەڵبژێرێ. واتە: فەرمانی پێنەکرد سەرلەنوێ مارەیان بکاتەوە؟ چونکە مارەبڕینەکەی سەردەمی کوفری دروستبووە.

(وَقِيلَ فَاسِدٌ) لەفەرموودەیەکی بێهێزدا: بەتاڵە (وَقِيلَ) لەفەرموودەیەکی تری بێهێزدا: (إنْ أَسْلَمَ وَقُرِّرَ تَبَيَّنَّا صِحَّتَهُ) ئەگەر مێردەکە موسوڵمان بوو و لە سەر مارەبڕینەکەش بەردەوام کرا، ئەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە مارەبڕینەکە دورستبووە (وَإِلاَّ) بەلام ئەگەر موسوڵمان نەبێ (فَلاَ) ئەوە دروست نەبووە.

(فَعَلَى الصَّحِيحِ) جا لە سەر فەرموودەی ڕاست: کە مارەبڕینەکەیان دروستبووە (لَوْ طَلَّقَ ثَلاَثًا) ئەگەر کافرەکە لە حاڵەتیکافریدا ژنەکەی سێبەسێ تەلاق دا (ثُمَّ أَسْلَمَا) ئینجا لە دوایتەلاقدانەکە هەردووکیان موسوڵمان بون، ئەوە (لَمْ تَحِلَّ إلاَّ بِمُحَلِّلٍ) لێی حەلاڵ نابێتەوە تەنها بە مارەبەجاش نەبێ، بەو شێوەی ڕابرا، چونکە مارەبڕینەکەی دروست بووە، کەوابو: تەلاقدانەکەشی دروست دەبێ.

(وَمَنْ قُرِّرَتْ) هەر ژنێك لە سەر مارەبڕینەکەیکوفر بەردەوام بکرێ، ئەوە (فَلَهَا الْمُسَمَّى الصَّحِيحُ) مافی ئەو مارەییە ناوبراوەشی هەیە: کە دروستە بکرێتە مارەیی، واتە: چەندی مارەیی بۆ داندراوە، بۆی حەلاڵە کشتی لە مێردەکەی وەربگرێ.

بەلام (وَأَمَّا الْفَاسِدُ) ئەو مارەییەی دروست نیە بکرێتە مارەیی: (كَخَمْرٍ) وەکو شەڕابو سەگو زبل...هتد (فَإِنْ قَبَضَتْهُ قَبْلَ الإِسْلاَمِ) ئەگەر پێش موسوڵمانبوون ئەو مارییە نادروستەی وەرگرتبێ، ئەوە (فَلاَ شَيْءَ لَهَا) لە دوای موسوڵمانبوون مافی هیچ بەشە مارەییێکیتری نیە (وَإِلاَّ) بەلام ئەگەر مارەییە نادروستەکەی وەرنەگرتبێو موسوڵمان بوبێ،

فَمَهْرُمِثْلٍ، وَإِنْ قَبَضَتْ بَعْضَهُ فَلَهَا قِسْطُ مَا بَقِيَ مِنْ مَهْرِمِثْلٍ، وَمَنْ انْدَفَعَتْ بِإِسْلَامٍ بَعْدَ دُخُولٍ فَلَهَا الْمُسَمَّى الصَّحِيحُ إنْ صُحِّحَ نِكَاحُهُمْ، وَإِلاَّ فَمَهْرُمِثْلٍ، أَوْ قَبْلَهُ وَصُحِّحَ: فَإِنْ كَانَ الإِنْدِفَاعُ بِإِسْلاَمِهَا فَلاَ شَيْءَ لَهَا، أَوْ بِإِسْلاَمِه فَنِصْفُ مُسَمًّى إنْ كَانَ صَحِيحًا، وَإِلاَّ فَنِصْفُ مَهْرِمِثْلٍ. وَلَوْ تَرَافَعَ إِلَيْنَا ذِمِّيٌّ وَمُسْلِمٌ وَجَبَ الْحُكْمُ، أَوْ ذِمِّيَّانِ وَجَبَ فِي الأَظْهَرِ،

---

ئەوە (فَمَهْرُ مِثْلٍ) مافی مارەیی هاوێنەی هەیە (وَإِنْ قَبَضَتْ بَعْضَهُ) ئەگەر بەشێکی مارەییە نادروستەکەی وەرگرتبێ‌و بەشێکی مابێ، ئەوە (فَلَهَا قِسْطُ مَا بَقِيَ مِنْ مَهْرِ مِثْلٍ) مافی بەشی پاشماوەکەی لە مارەیی هاوێنە هەیە.

(وَمَنْ انْدَفَعَتْ بِإِسْلَامٍ) هەر ژنێك بە هۆی موسوڵمانبوونی خۆی، یان مێردەکەی لە ژنایەتی لابچێ، واتە: مارەبڕینەکەی هەڵبوەشێتەوە (بَعْدَ دُخُولٍ) موسوڵمانبوونەکەش لە دوای جیماعکردن بوو، ئەوە (فَلَهَا الْمُسَمَّى الصَّحِيحُ) مافی مارەییە ناوبراوە دروستەکەی هەیە لە مێردەکەی وەریگرێ (إنْ صُحِّحَ نِكَاحُهُمْ) ئەگەر بە فەرموودەی ڕاست: مارەبڕینەکەیان بە دروستبوو دابنێین (وَإِلاَّ) بەلام ئەگەر بە فەرموودەی بێ‌هێز: بە دروستبووی دانەنێین، ئەوە (فَمَهْرُ مِثْلٍ) مافی مارەیی هاوێنەی هەیە بە هۆی جیماعەکە.

(أَوْ قَبْلَهُ) بەلام ئەگەر پێش جیماعکردن موسوڵمانبوونەکە ڕوو بداو (وَصُحِّحَ) بە فەرموودەی ڕاست: مارەبڕینەکەش بە دروستبوو دابنێین، ئەوە تەماشا دەکەین: (فَإِنْ كَانَ الإِنْدِفَاعُ بِإِسْلاَمِهَا) ئەگەر هەڵوەشانەوەی مارەبڕینەکە بە هۆی موسوڵمانبوونی ژنەکەبێ، ئەوە (فَلاَ شَيْءَ لَهَا) مافی هیچ مارەیی نیە لە مێردەکەی وەریگرێ؟ چونکە هۆی هەڵوەشانەوەکە لە لای خۆیەتی (أَوْ بِإِسْلاَمِه) بەلام ئەگەر هەڵوەشانەوەکە بە هۆی موسوڵمانبوونی مێردەکە بێ، ئەو کاتە (فَنِصْفُ مُسَمًّى إنْ كَانَ صَحِيحًا) مافی نیوەی مارەییە ناوبراوەکەی هەیە، ئەگەر ناوبراوەکە دروست بێ (وَإِلاَّ) بەلام ئەگەر ناوبراوەکە دروست نەبێ: وەکو شەڕاب، ئەوە (فَنِصْفُ مَهْرِ مِثْلٍ) مافی نیوەی مارەیی هاوێنە هەیە؟ چونکە هۆیەکە لە لای مێردەکەوەیە.

## ﴿ دادکردن لە نێوان کافرەکاندا ﴾

(وَلَوْ تَرَافَعَ إِلَيْنَا ذِمِّيٌّ وَمُسْلِمٌ) ئەگەر موسوڵمانێك‌و کافرێکی پەیمان لەئەستۆ–وەکو جولەکەو دیان– کێشەیەکیان هەبوو و هاتنە دادگای ئێمە (وَجَبَ الْحُكْمُ) واجبە: بە شەریعەتی‌ئیسلام داد لە نێوانیاندا بکرێ، جیاوازی نیە موسوڵمانەکە: داواکار بێ، یان داوالێکراو بێ (أَوْ ذِمِّيَّانِ) یان دوو کافری پەیمان لەئەستۆ هاتنە دادگای ئێمەو ئایینی هەردووکیشیان یەك ئایین بوو: وەك دوو جولەکە، یان دوو دیان ببێتە کێشەیان، ئەوە (وَجَبَ فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا واجبە: بە شەریعەتی ئیسلام داد لە نێوانیاندا

وَنُقِـــرُّهُمْ عَلَـــى مَـــا نُقِــرُّ لَــوْ أَسْــلَمُوا، وَنُبْطِــلُ مَــا لاَ نُقِــرُّ.
(فَصْلٌ) أَسْلَمَ وَتَحْتَهُ أَكْثَرُ مِنْ أَرْبَعٍ وَأَسْلَمْنَ مَعَهُ أَوْ فِي الْعِدَّةِ أَوْ كُنَّ كِتَابِيَّــاتٍ لَزِمَــهُ اخْتِيَارُ أَرْبَعٍ وَيَنْدَفِعُ مَنْ زَادَ، وَإِنْ أَسْلَمَ مَعَهُ قَبْلَ دُخُولٍ أَوْ فِي الْعِدَّةِ أَرْبَعٌ فَقَطْ تَعَيَّنَّ،

---

بکرێ: خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَأَنِ احْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ﴾ داد لە نێوانیاندا بکە بەو قورئانەی خوا ناردویەتیە خوارەوە. واتە: بەم ئایەتە ئایەتی﴿فَاحْكُمْ بَيْنَهُمْ أَوْ أَعْرِضْ عَنْهُمْ﴾ یان داد لە نێوانیاندا بکە، یان وازیان لێبێنەو مەیکە. (نَسْخ) بۆتەوە.
هەروەها داد لە نێوان جولەکەو دیانەکانیشدا هەر واجبە (وَ) هەرکاتێك بە شەریعەتی ئیسلام دادمان لە نێوانیاندا کرد، ئەوە (نُقِرُّهُمْ عَلَى مَا نُقِرُّ لَوْ أَسْلَمُوا) کافرەکان جێگیر دەکەین لە سەر ئەو بڕیارانەی لە سەرمان جێگیر دەکردن ئەگەر موسوڵمان بوبان، هەرچەند ئێستاش کافرن (وَنُبْطِلُ مَا لاَ نُقِرُّ) ئەو بڕیارەش هەڵدەوەشێنینەوە: کە لە ئیسلامەتی‌دا لە سەری جێگیر ناکرێن، هەر چەند ئێستاش کافرن.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی ژنەکانی پیاوی کافر لە دوای موسوڵمانبوون ﴾

(أَسْلَمَ وَتَحْتَهُ أَكْثَرُ مِنْ أَرْبَعٍ) هەر کاتێك کافرێکی‌ئازاد موسوڵمان بوو و زیاتر لە چوار ژنی لە ژێر مارەبڕیندا بون‌و (وَأَسْلَمْنَ مَعَهُ أَوْ فِي الْعِدَّةِ) هەموو ژنەکانیش لەگەڵ مێردەکە، یان لە (عِدَّة)دا موسوڵمان بون (أَوْ كُنَّ كِتَابِيَّاتٍ) یان ژنەکان لەو (أهل الكتاب)ە بون کە بۆ پیاوی موسوڵمان حەلاڵن، ئەوە (لَزِمَهُ اخْتِيَارُ أَرْبَعٍ) لە سەری واجبە: لەو ژنانە چواران هەڵبژێرێ‌و (وَيَنْدَفِعُ مَنْ زَادَ) ئەوەی لەو چوارانەش زیادن بەو هەڵبژاردنە لە ژنایەتی لادەچن، بە بەڵگەی حەدیسەکەی (غیلان)ڕابردوو، کەواتە: دروست نیە: نە کەمتر لە چواران‌و نە زیاتر لە چواران هەڵبژێرێ، چونکە لە کاتی‌کافری‌دا مارەبڕینی چوار ژنانی دروست بووە، بەڵام دیار نیە کامەیانن، هەروەك لە (تحفة)و (الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە.
ئینجا کە چوار ژنی هەڵبژاردن، مەرج نیە بە بەردەوامی بیانهێڵێتەوە، بەڵکو بۆی دروستە: یەکێکیان، یان گشتیان تەلاق بدا، هەروەك لە (مغنی)دا ڕوون کراوەتەوە.
جا ئەگەر ژنێك موسوڵمان بوو و دوو مێرد، یان زیاتری هەبون‌و ئەوانیش لە گەڵی موسوڵمان بون، ئەوە دەدرێتەوە مێردەکەی‌یەکەم، ئەگەر مارەبڕینێك پێش ئەوی‌تر کرابێ، چونکە ئەگەر هەردوو مارەبڕینەکان وێکڕا کرابن، ئەوە هەر دووکیان بەتاڵ‌و نادروستن، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.
(وَإِنْ أَسْلَمَ مَعَهُ قَبْلَ دُخُولٍ أَوْ فِي الْعِدَّةِ أَرْبَعٌ فَقَطْ) ئەگەر پێش جیماعکردن، یان لە (عِدَّة)دا تەنها چوار ژنی لەگەڵ موسوڵمان بون، ئەوە (تَعَيَّنَّ) هەر ئەو چوارانەی بۆ ژنایەتی دیاری دەکرێن‌و ئەو زیادانەی لە ئیسلام دوا کەوتون لە ژنایەتی لادەچن.

وَلَوْ أَسْلَمَ وَتَحْتَهُ أُمٌّ وَبِنْتُهَا كِتَابِيَّتَان أَوْ أَسْلَمَتَا فَإِنْ دَخَلَ بِهِمَا حَرُمَتَا أَبَدًا، أَوْ لاَ بِوَاحِدَةٍ تَعَيَّنَت الْبِنْتُ وَفِي قَوْلٍ يَتَخَيَّرُ، أَوْ بِالْبِنْت تَعَيَّنَتْ، أَوْ بِالأُمِّ حَرُمَتَا أَبَدًا وَفِي قَوْلٍ تَبْقَى الأُمُّ، أَوْ وَتَحْتَهُ أَمَةٌ أَسْلَمَتْ مَعَهُ أَوْ فِي الْعِدَّةِ أُقِرَّ إِنْ حَلَّتْ لَهُ الأَمَةُ، وَإِنْ تَخَلَّفَتْ قَبْلَ دُخُولٍ تَنَجَّزَت الْفُرْقَةُ، أَوْ إِمَاءٌ

---

جا بزانە: ئەگەر یەکێك مسوڵمان بوو و دوو خوشکی لە ژێر مارەبڕیندا بون، ئەوە بۆی دروستە: تەنها یەکێکیان هەڵبژێرێ، هەروەك لە باسی ڕابردوودا لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە ﴿عن فيروزالديلمي ﷺ قُلْتُ: يَارَسُولَ الله أَسْلَمْتُ وَتَحتِي أُخْتَانِ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: إِخْتَرْ أَيَّتَهُمَا شِئْتَ﴾ رواه الترمذي وصححه ابن حبان، ئەی پێغەمبەری خوا من موسوڵمان بوم و دوو خوشك لە ژێر مارەبڕینمدانە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کامەیان حەز دەکەی هەڵیبژێرە.

(وَلَوْ أَسْلَمَ وَتَحْتَهُ أُمٌّ وَبِنْتُهَا) ئەگەر کافرێك موسوڵمان بوو و دایك و کیژێکی لە ژێر مارەبڕیندا بون (كِتَابِيَّتَانِ أَوْ أَسْلَمَتَا) دایك و کیژەکەش (أهل الكتاب) بون، یان لەگەڵ مێردەکە موسوڵمان بون، ئەوە چوار حاڵەتی هەنە:

یەکەم: (فَإِنْ دَخَلَ بِهِمَا حَرُمَتَا أَبَدًا) ئەگەر جیماعی لەگەڵ دایکەکە و کیژەکە کردبێ، ئەوە هەردووکی هەتاهەتای لێ حەرام دەبن؟ چونکە دایکەکە بۆتە خەسووی و کیژەکەش بۆتە کیژە ژن. دووەم: (أَوْ لاَ بِوَاحِدَةٍ تَعَيَّنَتِ الْبِنْتُ) ئەگەر جیماعی لەگەڵ هیچێکیان نەکردبو، ئەوە تەنها کیژەکە بۆ ژنایەتی دیاری دەکرێ؟ چونکە بە تەنها مارەبڕین خەسوو حەرام دەبێ، بەلام کیژە ژن بە جیماعکردن حەرام دەبێ، هەروەك ڕابرا (وَفِي قَوْلٍ يَتَخَيَّرُ) لە فەرمودەیەکی بێهێزادا: یەکێکیان هەڵدەبژێرێ. سێیەم: (أَوْ بِالْبِنْتِ تَعَيَّنَتْ) ئەگەر تەنها جیماعی لەگەڵ کیژەکە کردبو، ئەوە تەنها کیژەکە دەبێتە ژنی و دایکەکەی بە یەکجاری بە خەسووایەتی لێی حەرام دەبێ. چوارەم: (أَوْ بِالأُمِّ حَرُمَتَا أَبَدًا) ئەگەر جیماعی لەگەڵ دایکەکە کردبو، ئەوە هەردووکیان هەتا هەتای لێ حەرام دەبن؟ چونکە خەسوو بە تەنها مارەبڕین حەرام دەبێ و کیژە ژنیش بە جیماعی دایکەکەی حەرام دەبێ (وَفِي قَوْلٍ تَبْقَى الأُمُّ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا دایکەکە بە ژنایەتی دەمێنێتەوە.

(أَوْ) یان پیاوێك موسوڵمان بو (وَتَحْتَهُ أَمَةٌ) جاریەکی لە ژێر مارەبڕیندا بوو (أَسْلَمَتْ مَعَهُ أَوْ فِي الْعِدَّةِ) جاریەکەش لەگەڵ مێردەکە، یان لە (عِدَّة)دا موسوڵمان بوو، ئەوە (أُقِرَّ إِنْ حَلَّتْ لَهُ الأَمَةُ) مارەبڕینەکە بەردەوام دەبێ، ئەگەر لە کاتی موسوڵمانبووندا جاریەی لێ حەلال بێ، بەلام (وَإِنْ تَخَلَّفَتْ قَبْلَ دُخُولٍ) ئەگەر پێش جیماعکردن جاریەکە لە ئیسلامەتی دوا بکەوێ، ئەوە (تَنَجَّزَتِ الْفُرْقَةُ) دەسبەجێ مارەبڕینەکە هەڵدەوەشێتەوە (أَوْ إِمَاءٌ) یان کە

وَأَسْلَمْنَ مَعَهُ أَوْ فِي الْعِدَّةِ اخْتَارَ أَمَةً إِنْ حَلَّتْ لَهُ عِنْدَ اجْتِمَاعِ إِسْلَامِهِ وَإِسْلَامِهِنَّ، وَإِلَّا انْدَفَعْنَ، أَوْ حُرَّةٌ وَإِمَاءٌ وَأَسْلَمْنَ مَعَهُ أَوْ فِي الْعِدَّةِ تَعَيَّنَتْ وَانْدَفَعْنَ، وَإِنْ أَصَرَّتْ فَانْقَضَتْ عِدَّتُهَا اخْتَارَ أَمَةً، وَلَوْ أَسْلَمَتْ وَعَتَقْنَ ثُمَّ أَسْلَمْنَ فِي الْعِدَّةِ فَكَحَرَائِرَ فَيَخْتَارُ أَرْبَعًا، وَالإِخْتِيَارُ: اخْتَرْتُكِ أَوْ قَرَّرْتُ نِكَاحَكِ أَوْ أَمْسَكْتُكِ أَوْ ثَبَّتُّكِ. وَالطَّلَاقُ اخْتِيَارٌ، لَا الظِّهَارُ وَالإِيلَاءُ فِي الأَصَحِّ، وَلَا يَصِحُّ تَعْلِيقُ اخْتِيَارٍ وَلَا فَسْخٍ، وَلَوْ حَصَرَ الإِخْتِيَارَ فِي خَمْسٍ انْدَفَعَ مَنْ زَادَ

---

موسوڵمان بوو چەند جاریەكی لە ژێر مارەبڕیندا بونو (وَأَسْلَمْنَ مَعَهُ أَوْ فِی الْعِدَّةِ) گشتیان لەگەڵ مێردەكە، یان لە (عِدَّة)دا مووسڵمان بون، ئەوەش (اِخْتَارَ أَمَةً) تەنها جاریەیەكیان هەڵدەبژێرێ (إِنْ حَلَّتْ لَهُ عِنْدَاجْتِمَاعِ إِسْلَامِهِ وَإِسْلَامِهِنَّ) بەو مەرجەی لە كاتیكۆبوونەوەی ئیسلامیەتی خۆیو جاریەكان جاریەی لێ حەڵاڵ بێ (وَإِلَّا) بەڵام ئەگەر لەو كاتدا جاریەی لێ حەڵاڵ نەبێ: وەك ژنێكیئازادی هەبێ، یان تواناێهێنانی هەبێ...هتد، ئەوە (اِنْدَفَعْنَ) هەموو جاریەكان لە ژنایەتی لادەچنو مارەبڕینەكەیان هەڵدەوەشێتەوە.

(أَوْ حُرَّةٌ وَإِمَاءٌ) یان ژنێكیئازادو چەند ژنێكیكۆیلەی لە ژێردا بون (وَأَسْلَمْنَ مَعَهُ أَوْ فِی الْعِدَّةِ) هەموویان لەگەڵ مێردەكە، یان لە (عِدَّة)دا موسوڵمان بون، ئەوە (تَعَيَّنَتْ وَانْدَفَعْنَ) تەنها ئازادەكە دیاری دەكرێ بۆ ژنایەتی، هەموو جاریەكانیش لە ژنایەتی لادەچن (وَإِنْ أَصَرَّتْ فَانْقَضَتْ عِدَّتُهَا) ئەگەر ژنە ئازادەكە سوور بوو لە سەر كافرایەتیو (عِدَّة)كەشی تەواو بون، ئەو كاتە (اِخْتَارَ أَمَةً) تەنها جاریەیەكیان بۆ ژنایەتی هەڵدەبژێرێ (وَلَوْ أَسْلَمَتْ) ئەگەر ژنە ئازادەكە موسوڵمان بو (وَعَتَقْنَ ثُمَّ أَسْلَمْنَ فِی الْعِدَّةِ) ژنە كۆیلەكانیش ئازاد كران، ئینجا لە (عِدَّة)دا موسوڵمان بون، ئەوە (فَكَحَرَائِرَ) گشتیان وەك ژنەكانی ئازادن، كەواتە: (فَيَخْتَارُ أَرْبَعًا) واجبە: چوارانیان هەڵبژێرێ، هەروەك ڕابرا.

(وَالإِخْتِيَارُ) ووشەكانی هەڵبژاردنی ژن: (اِخْتَرْتُكِ) تۆم هەڵبژارد بە ژنیخۆم (أَوْ قَرَّرْتُ نِكَاحَكِ) یان بڕیارم دا تۆ ژنی من بی (أَوْ أَمْسَكْتُكِ) یان تۆم ڕاگرت بە ژنایەتی (أَوْ ثَبَّتُّكِ) یان تۆم هێشتەوە بە ژنایەتی. (وَالطَّلَاقُ اِخْتِيَارٌ) تەڵاقدانی ژنێك بە هەڵبژاردنی ژنە تەڵاقدراوەكە دادەنرێ، چونكە تەڵاقدان بۆ ژنیمارەبڕاو بەكار دێ (لَا الظِّهَارُ وَالإِيلَاءُ فِی الأَصَحِّ) بەڵام (ظهار)و سوێندخواردنی جیماع نەكردن بە هەڵبژاردن دانانرێن، لە فەرموودەی ڕاستتردا (وَلَا يَصِحُّ تَعْلِيقُ اِخْتِيَارٍ وَلَا فَسْخٍ) دروست نیە: نە هەڵبژاردنەكەو نە هەڵوەشاندنەوەكە هەڵبواسێ، وەك بڵێ: ئەگەر بچیە ژوورەوە تۆم هەڵبژارد.

(وَلَوْ حَصَرَ الإِخْتِيَارَ فِی خَمْسٍ) ئەگەر هەڵبژاردنەكەی لە پێنجاندا كورت كردەوە، واتە: پێنج ژنی هەڵبژاردن (اِنْدَفَعَ مَنْ زَادَ) ئەوانی لە پێنجان زیادن لە ژنایەتی لادەچن، بەڵام

وَعَلَيْهِ التَّعْيِينُ وَنَفَقَتُهُنَّ حَتَّى يَخْتَارَ، فَإِنْ تَرَكَ الإِخْتِيَارَ حُبِسَ، فَإِنْ مَاتَ قَبْلَهُ اعْتَدَّتْ حَامِلٌ بِهِ، وَذَاتُ أَشْهُرٍ وَغَيْرُ مَدْخُولٍ بِهَا بِأَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ وَعَشْرٍ، وَذَاتُ أَقْرَاءٍ بِالأَكْثَرِ مِنَ الأَقْرَاءِ وَأَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ وَعَشْرٍ، وَيُوقَفُ نَصِيبُ زَوْجَاتٍ حَتَّى يَصْطَلِحْنَ. (فَصْلٌ) أَسْلَمَا مَعًا اسْتَمَرَّتِ النَّفَقَةُ، وَلَوْ أَسْلَمَ وَأَصَرَّتْ حَتَّى انْقَضَتِ الْعِدَّةُ فَلاَ، وَإِنْ أَسْلَمَتْ فِيهَا لَمْ تَسْتَحِقَّ لِمُدَّةِ التَّخَلُّفِ فِي الْجَدِيدِ،

---

(وَعَلَيْهِ التَّعْيِينُ) له سەری واجبه: لەو پێنجانەش چواران دیاری بکا، هەم (وَنَفَقَتُهُنَّ حَتَّى يَخْتَارَ) واجبه هەموانیان بەخێو بکا، تا چوارەکان هەڵدەبژێرێ.

(فَإِنْ تَرَكَ الإِخْتِيَارَ) جا ئەگەر مێردەکە هەڵبژاردنەکە، یان دیاریکردنەکەی نەکرد، ئەو کاتە (حُبِسَ) بەند دەکرێ تا دەیکا (فَإِنْ مَاتَ قَبْلَهُ) جا ئەگەر پێش هەڵبژاردنەکە مێردەکە مرد، ئەو کاتە (اعْتَدَّتْ حَامِلٌ) ئەو ژنەی ئاوسە (عِدَّة)ی مردن تەواو دەکا (بِهِ) بە دانانی کۆرپەی ناو زگی (وَذَاتُ أَشْهُرٍ) ئەو ژنەیشی کە ئاوس نیەو (عِدَّة)ی بە مانگە، هەم (وَغَيْرُ مَدْخُولٍ بِهَا) ئەو ژنەیشی کە جیماعی لەگەڵ نەکردوە، هەردووکیان (عِدَّة)کەیان تەواو دەکەن (بِأَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ وَعَشْرٍ) بە چوار مانگو دە شەو و ڕۆژ لە مردنی مێردەکەوە (وَذَاتُ أَقْرَاءٍ) ئەو ژنەیی کە خاوەن حەیزە ئەویش (عِدَّة)کەی تەواو دەکا (بِالأَكْثَرِ) بە زۆرترەکە: (مِنَ الأَقْرَاءِ) لە سێ پاکبوونەوەی حەیز: کە لە موسوڵمانبوونەوە دەست پێ دەکاو (وَأَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ وَعَشْرٍ) لە چوار مانگو دە شەو و ڕۆژ: لە مردنی مێردەکەوە.

(وَيُوقَفُ نَصِيبُ زَوْجَاتٍ) بەشە میراتی هەموو ژنەکانیش -کە چوارێکە، یان هەشتێکە- ڕادەگیرێ (حَتَّى يَصْطَلِحْنَ) تا سولح دەکەن و لە نێوان خۆیاندا پێك دێن، چونکە ئێمە نازانین کامەیان چوار ژنی ڕاستەقینەن.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی بەخێوکردنی ژنی موسوڵمانبوو، یان کافربوو ﴾

(أَسْلَمَا مَعًا) ئەگەر ژنەکەو مێردەکە وێکڕا موسوڵمان بون، ئەوە (اسْتَمَرَّتِ النَّفَقَةُ) بەخێوکردنی ژنەکە لە سەر مێردەکە هەر بەردەوام دەبێ، بەڵام (وَلَوْ أَسْلَمَ) ئەگەر مێردەکە موسوڵمان بوو (وَأَصَرَّتْ حَتَّى انْقَضَتِ الْعِدَّةُ) ژنەکەش سوور بوو لە سەر کافرایەتیی تا (عِدَّة)ی تەواو بوو، ئەو کاتە (فَلاَ) هیچ مافی بەخێوکردنی لە سەر مێردەکەی نیە، چونکە بە دواکەوتنی لە ئیسلامەتی خراپەی کردوە.

(وَ) هەروەها (إِنْ أَسْلَمَتْ فِيهَا) ئەگەر ژنەکە لە (عِدَّة)دا موسوڵمان بوو، ئەو کاتەش (لَمْ تَسْتَحِقَّ لِمُدَّةِ التَّخَلُّفِ) مافی بژێوی ماوەی دواکەوتنی نیە (فِي الْجَدِيدِ) لە فەرموودەی نوێدا، بەڵام لە فەرموودەی کۆندا: مافی بژێوی ماوەی دواکەوتنیشی هەیە، چونکە بە موسوڵمانبوونەکەی ئاشکرا بوو: هەر ژنی مێردەکەیەتی.

وَلَوْ أَسْلَمَتْ أَوَّلاً فَأَسْلَمَ فِي الْعِدَّةِ أَوْ أَصَرَّ فَلَهَا نَفَقَةُ الْعِدَّةِ عَلَى الصَّحِيحِ، وَإِنِ ارْتَدَّتْ فَلاَ نَفَقَةَ وَإِنْ أَسْلَمَتْ فِي الْعِدَّةِ، وَإِنِ ارْتَدَّ فَلَهَا نَفَقَةُ الْعِدَّةِ.

## (بَابُ الْخِيَارِ وَالإِعْفَافِ وَنِكَاحِ الْعَبْدِ)

وَجَدَ أَحَدُالزَّوْجَيْنِ بِالآخَرِ جُنُونًا أَوْ جُذَامًا أَوْ بَرَصًا، أَوْ وَجَدَهَا رَتْقَاءَ أَوْ قَرْنَاءَ، أَوْ وَجَدَتْهُ عِنِّينًا أَوْ مَجْبُوباً ثَبَتَ الْخِيَارُ فِي فَسْخِ النِّكَاحِ،

---

بەلام (وَلَوْ أَسْلَمَتْ أَوَّلاً)ئەگەر ژنەکە پێشدا موسوڵمان بوو (فَأَسْلَمَ فِيالْعِدَّةِ أَوْ أَصَرَّ) ئینجا مێردەکەش لە (عِدَّة)دا موسوڵمان بوو، یان هەر سوور بوو لە سەر کافرایەتیی، ئەو کاتە لە هەردوومەسەلەکەدا (فَلَهَا نَفَقَةُ الْعِدَّةِ) ژنەکە مافی بەخێوکردنی ماوەی (عِدَّة)ی لە سەر مێردەکەیەتی (عَلَىالصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست، چونکە مێردەکە بە دواکەوتنی لە ئیسلامەتی خراپەی کردوە.

ئەم جارە: (وَإِنِ ارْتَدَّتْ) ئەگەر ژنەکە لە دین وەرگەڕاو بوە کافر، ئەوە (فَلاَ نَفَقَةَ وَإِنْ أَسْلَمَتْ فِيالْعِدَّةِ) مافی بەخێوکردنی ماوەی کافربوونەکەی لە سەر مێردەکەی نیە، هەرچەند لە (عِدَّة)شدا موسوڵمان ببێتەوە، چونکە وەك ژنی (ناشزة)یە، بەلام (وَإِنِ ارْتَدَّ) ئەگەر تەنها مێردەکە کافر بوو، ئەو کاتە (فَلَهَا نَفَقَةُ الْعِدَّةِ) ژنەکە مافی بەخێوکردنی ماوەی (عِدَّة)ی لە سەر مێردە کافربووەکەیە، چونکە هۆیەکەی لە مێردەکەوەیە.

## ﴿(بَابُ الْخِيَارِ) باسی پەشیمانبوونەوە لە مارەبڕینو (وَالإِعْفَافِ) داوێن پاککردنیباوكو باپیرمو (وَنِكَاحِ الْعَبْدِ) ژن هێنانی کۆیلە ﴾

١- **پەشیمانبوونەوە لە مارەبڕین:** (وَجَدَ أَحَدُ الزَّوْجَيْنِ بِالآخَرِ جُنُونًا) هەر کاتێك یەکێك لە ژنو مێردەکە زانی هاوسەرەکەی شێتیی هەیە (أَوْ جُذَامًا) یان گرویی هەیە (أَوْ بَرَصًا) یان بەڵەکیی هەیە (أَوْ وَجَدَهَا رَتْقَاءَ) یان مێردەکە زانی ژنەکە شوێنیجیماعکردنی بە زێدە گۆشت گیراوە (أَوْ قَرْنَاءَ) یان بە ئێسقانێك گیراوە (أَوْ وَجَدَتْهُ عِنِّينًا) یان ژنەکە زانی مێردەکەی نەمێردەو توانای جیماعکردنی نیە، هەرچەند لە ژنێکیتریش نەمێرد نەبێ (أَوْ مَجْبُوباً) یان هەموو ئەندامەکەی جیماعکردنی لێکراوەتەوە، ئەوە بە تەنها یەکێك لەو پێنج عەیبانە (ثَبَتَ الْخِيَارُ فِي فَسْخِ النِّكَاحِ) مافیپەشیمانی بۆ ژنەکەو بۆ مێردەکە جێگیر دەبێ: کە مارەبڕینەکە هەڵبوەشێنێتەوە بەو مەرجەی پێش مارەبڕینەکە نەیزانیبێ ئەو عەیبەی هەیە، ئەگینا: مافی هەڵوەشاندنەوەی نیە، هەروەك لە (تحفة)و (مغني)دا فەرموویانە.

﴿عن عُمَرﷺ: أَيُّمَا رَجُلٍ تَزَوَّجَ امْرَأَةً فَدَخَلَ بِهَا فَوَجَدَهَا بَرْصَاءَ أَوْ مَجْنُونَةً أَوْ مَجْذُومَةً فَلَهَا الصَّدَاقُ بِمَسِيسِهِ إِيَّاهَا وَهُوَ لَهُ عَلَى مَنْ غَرَّهُ﴾ رواه مالك وابن أبيشيبه ورجاله ثقات، هەر پیاوێك ژنێکی مارە کردو جیماعی لەگەڵ کردو زانی ژنەکە بەڵەکە، یان شێتە، یان کرووە،

وَقِيلَ إِنْ وَجَدَ بِهِ مِثْلَ عَيْبِهِ فَلاَ، وَلَوْ وَجَدَهُ خُنْثَى وَاضِحًا فَلاَ فِي الأَظْهَرِ، وَلَوْ حَدَثَ بِهِ عَيْبٌ تَخَيَّرَتْ إِلاَّ عُنَّةً بَعْدَ دُخُولٍ، أَوْ بِهَا تَخَيَّرَ فِي الْجَدِيدِ، وَلاَ خِيَارَ لِوَلِيٍّ بِحَادِثٍ

---

ئەوە بە هۆی جیماعەکە مارەیی تەواو دەداتە ژنەکەو ئەویش تۆڵەی مارەییەکە لەو کەسە وەردەگرێتەوە: کە فریوی داوە. واتە: ئەگەر مارەبڕینەکەی هەڵوەشاندەوە.

(وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: (إِنْ وَجَدَ بِهِ مِثْلَ عَيْبِهِ) ئەگەر هاوسەرەکەش هەمان عەیبی هاوسەرەکەی هەبو (فَلاَ) مافی پەشیمانیی نیە.

﴿ ئاگاداری ﴾: جگە لەو عەیبانە بە هیچ عەیبێکیتر -نە ژنەکەو نە مێردەکە- مافی هەڵوەشاندنەوەی مارەبڕینی نیە: وەك کەچەڵیو کوێریو خوێنچڕکەو چۆڕمیزکەو بۆگەنیی دەمو بن هەنگڵو گێلەکەیی...هتد، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

هەروەها ئەگەر مێردەکە توانای بەخێوکردنی ژنەکەی نەبێ، ئەو کاتەش ژنەکەی دەتوانێ مارەبڕینەکە هەڵبوەشێنێتەوە، هەر وەك لە (پەڕتوکیبژیوەکان)دا ڕوونی دەکەینەوە، إن شاءالله تعالى.

کەوابو: ئەو ژنانەی لە دادگا ستەمکارەکانی ئەم سەردەمەدا -بە پێچەوانەی شەریعەتی ئیسلام- بە یاسایدەستکرد خۆیان لە مێردەکەیان جیا دەکەنەوە، ئەوانە مارەبڕینەکەیان هەڵناوەشێتەوەو تەڵاقیشیان ناکەوێو هەر ژنی مێردیخۆیانن، کەوابو: ئەگەر بە بڕیاری ئەو یاسا دەستکردە مێردێکیتر بکەن، لەو مێردە حەڵاڵ نابنو زینایە، والله أعلم.

(وَلَوْ وَجَدَهُ خُنْثَى وَاضِحًا) ئەگەر ژنەکە، یان مێردەکە زانی هاوسەرەکەی نێرامۆکێکی ئاشکرایە (فَلاَ فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا: مافی پەشیمانیی نیە، بەڵام ئەگەر نێراموکێکینائاشکرا بێ، ئەو کاتە مارەبڕینەکە بەتاڵەو دروست نەبووە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلَوْ حَدَثَ بِهِ عَيْبٌ) ئەگەر لە دوای مارەبڕین مێردەکە عەیبێکی -لەو عەیبانەیڕابردوو- لێپەیدا بوو، ئەو کاتەش (تَخَيَّرَتْ) ژنەکە سەرپشکە، واتە: مافی هەڵوەشاندنەوەی مارەبڕینەکەی هەیە، جیاوازی نیە: جیماعی لەگەڵ کردبێ، یان نا (إِلاَّ عُنَّةً بَعْدَ دُخُولٍ) تەنها ئەو نەمێردییە نەبێ: کە لە دوایجیماعکردن هیچیتر توانای جیماعکردنی نەمێنێ، واتە: بەم نەمێردییە مافی پەشیمانیی نیە.

(أَوْ بِهَا) یان ژنەکە عەیبێکی -لەو عەیبانەیڕابردوو- لێپەیدا بوو، ئەو کاتەش (تَخَيَّرَ) مێردەکە سەرپشکەو مافی هەڵوەشاندنەوەی مارەبڕینەکەی هەیە، جیاوازی نیە: جیماعی کردبێ، یان نا (فِي الْجَدِيدِ) لە فەرموودەی نوێدا.

(وَلاَ خِيَارَ لِوَلِيٍّ) هیچ سەرپەشکارێکی ژنەکە مافی هەڵوەشاندنەوەی مارەبڕینەکەی نیە (بِحَادِثٍ) بە هۆی پەیدابوونی یەکێك لەو عەیبانەیڕابردوو: کە لە دوایمارەبڕینەکە تووشی

وَكَذَا بِمُقَارِنِ جَبٍّ وَعُنَّةٍ، وَيَتَخَيَّرُ بِمُقَارِنِ جُنُونٍ، وَكَذَا جُذَامٌ وَبَرَصٌ فِي الأَصَحِّ، وَالْخِيَارُ عَلَى الْفَوْرِ، وَالْفَسْخُ قَبْلَ دُخُولٍ يُسْقِطُ الْمَهْرَ، وَبَعْدَهُ الأَصَحُّ: أَنَّهُ يَجِبُ مَهْرُ مِثْلٍ إِنْ فُسِخَ بِمُقَارِنٍ أَوْ بِحَادِثٍ بَيْنَ الْعَقْدِ وَالْوَطْءِ جَهْلَهُ الْوَاطِئُ،

---

مێردەکە ببێ (وَكَذَا بِمُقَارِنِ جَبٍّ وَعُنَّةٍ) هەروەها ئەگەر لە کاتیمارەبڕینیشدا مێردەکە ئەندامیجیماعکردنی لێکرابێتەوە، یان نەمێرد بێ، سەرپەرشتکاریژنەکە مافی هەڵوەشاندنەوەی مارەبڕینەکەی نیە، چونکە زیانەکە تایبەتە بە ژنەکە.

بەڵام (وَيَتَخَيَّرُ بِمُقَارِنِ جُنُونٍ) سەرپەشتکارەکە مافی هەڵوەشاندنەوەی مارەبڕینەکەی هەیە بە هۆی ئەو شێتییەی لە کاتی مارەبڕینەکەدا مێردەکە هەیبووە، هەرچەند ژنەکەش ڕازی بێ (وَكَذَا جُذَامٌ وَبَرَصٌ) هەروەها ئەگەر گروویی، یان بەڵەکیشی لە کاتیمارەبڕیندا هەبوبێ، سەرپەرشکارەکە مافی هەڵوەشاندنەوەیمارەبرینەکەی هەیە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستردا، چونکە سەرپەرشتکارەکەش بەو سێ عەیبانە شەرمەزار دەبێ.

(وَالْخِيَارُ عَلَى الْفَوْرِ) پەشیمانبوونەوەی مارەبڕین بە پەلەیە، واتە: مەرجە بە پەلە داوایەکەی بۆ لای قازی بەرز بکاتەوەو داوای هەڵوەشاندنەوەی مارەبڕینەکە بکا، ئەگینا: مافەکەی لەدەست دەچێ، بەڵام ئەگەر ژنەکە، یان مێردەکە گوتی: نەمزانی مافیپەشیمانیم هەیە، یان نەمزانی پەشیمانیەکە بە پەلەیە، ئەوە بە سوێندخواردن باوەڕی پێدەکرێو مافەکەی لەدەست ناچێ، بەو مەرجەی تێکەڵی لەگەڵ زانایانی ئەم مەسەلەیە نەبێ، هەروەك لە زۆریەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

ئینجا بزانە: هەڵوەشاندنەوەی مارەبڕین–بە یەکێك لەو عەیبانە– ژمارەی تەڵاقەکان کەم ناکاتەوە (وَ) هەروەها (الْفَسْخُ قَبْلَ دُخُولٍ) هەڵوەشاندنەوەی مارەبڕینەکە ئەگەر پێش جیماعکردن بێ (يُسْقِطُ الْمَهْرَ) هەموو مارەییەکە لە سەر مێردەکە لادەبا، جیاوازی نیە هەڵوەشاندنەوەکە: لە لایەن مێردەکەوە بێ، یان لە لایەن ژنەکەوە بێ.

بەڵام (وَبَعْدَهُ) هەڵوەشاندنەوەی مارەبڕینەکە لە دوای جیماعکردن (الأَصَحُّ: أَنَّهُ يَجِبُ مَهْرُ مِثْلٍ) بە فەرموودەی ڕاستتر: مارەیی هاوێنە لە سەر مێردەکە واجب دەبێ (إِنْ فُسِخَ بِمُقَارِنٍ) ئەگەر مارەبڕینەکە هەڵوەشاندرابێتەوە بەو عەیبەی لە کاتی مارەبڕینەکەدا هەبووە (أَوْ بِحَادِثٍ بَيْنَ الْعَقْدِ وَالْوَطْءِ) یان لە کاتێکی نێوان مارەبڕینەکەو جیماعکردندا پەیدا بووە، بەو مەرجەی لەو دوو مەسەلەیەدا (جَهْلَهُ الْوَاطِئُ) جیماعکەرەکە–پێش جیماعکردن– نەیزانیبێ هاوسەرەکەی ئەو عەیبەی هەیە.

واتە: ئەگەر ژنەکە، یان مێردەکە زانی هاوسەرەکەی ئەو عەیبەی هەیە، ئینجا بە خۆشی خۆی جیماعی کرد، ئەو کاتە مافیهەڵوەشاندنەوەی نیە، چونکە پێی ڕازی بووە، هەروەك لە (شرح المحلی)و (تحفة)و (نهاية)و حاشیەکانیاندا ڕوون کراونەتەوە.

وَالْمُسَمَّى إِنْ حَدَثَ بَعْدَ وَطْءٍ، وَلَوْ انْفَسَخَ بِرِدَّةٍ بَعْدَ وَطْءٍ فَالْمُسَمَّى، وَلاَ يَرْجِعُ الزَّوْجُ بَعْدَ الْفَسْخِ بِالْمَهْرِ عَلَى مَنْ غَرَّهُ فِي الْجَدِيدِ، وَيُشْتَرَطُ فِي الْعُنَّةِ رَفْعٌ إِلَى حَاكِمٍ، وَكَـذَا سَائِرُ الْعُيُوبِ فِي الأَصَحِّ،

---

(وَالْمُسَمَّى) هەروەها هەموو مارەیی ناوبراو لە سەر مێردەکە واجب دەبێ (إِنْ حَدَثَ بَعْدَ وَطْءٍ) ئەگەر عەیبەکە لە دوای جیماعکردن پەیدا ببێ: لە ژنەکە، یان مێردەکە.

(وَلَوْ اِنْفَسَخَ بِرِدَّةٍ بَعْدَ وَطْءٍ) ئەگەر مارەبڕینەکە هەڵوەشاوە بە هۆی کافربوونێکی دوای جیماعکردن، ئەوە (فَالْمُسَمَّى) مارەییە ناوبراوەکە لە سەر مێردەکە واجب دەبێ بۆ ژنەکە، جیاوازی نیە ژنەکە کافر بوبێ، یان مێردەکە، بەڵام بە کافربوونی پێش جیماعکردن: ئەگەر ژنەکە کافر بوبێ ئەوە مافی هیچ بەشە مارەییەکی نیە، ئەگەر مێردەکە کافر بوبێ ئەوە نیوەی مارەییناوبراوی لە سەرە بۆ ژنەکەی، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

(وَلاَ يَرْجِعُ الزَّوْجُ بَعْدَالْفَسْخِ بِالْمَهْرِ) نابێ مێردەکە لە دوایهەڵوەشاندنەوەی مارەبڕینەکە-بۆ وەرگرتنەوەیمارەییەکە- بگەڕێتەوە (عَلَى مَنْ غَرَّهُ) بۆ سەر ئەو کەسەی فریوی داوە بە عەیبیژنەکە (فِي الْجَدِيدِ) لە فەرمودەینوێدا، جیاوازی نیە فریودەرەکە: سەرپەرشتکاری ژنەکە بێ: وەك بێدەنگ بێو عەیبیژنەکە نەڵێ، یان خودیژنەکە بێ: وەك بەخۆی عەیبەکەیخۆی نەڵێو وەها نیشانی سەرپەشتکارەکەی بدا: کە داخوازیکەرەکەی ئاگاداری عەیبەکەیە.

ئینجا بزانە: لە فەرمودەی کۆندا: مێردەکە مافی هەیە بۆ وەرگرتنەوەی مارەییەکە بگەڕێتەوە سەر فریودەرەکە، بە بەڵگەی فەرمودەیئیمامی(عمر)یڕابردوو لەم باسەدا، بەڵام بەڵگەی فەرمودەکەی نوێ بەهێزترە: کە حەدیسەکەی ﴿أَيُّمَا امْرَأَةٍ نَكَحَتْ﴾ی ڕابردووە لە (باسیسەرپەرشتکارەکان)دا، واتە: هەرچەند لە وێدا بێسەرپەرشتکار مارەبڕینەکەشی بەتاڵ بوو، بەڵام فریودراوەکە مافی وەرگرتنەوەی مارەییەکەی نیە.

## ﴿ چۆنیەتی هەڵوەشاندنەوەی مارەبڕین ﴾

(وَيُشْتَرَطُ فِي الْعُنَّةِ) بە مەرج دادەندرێ:لە هەڵوەشاندنەوەی مارەبڕین بە هۆی نەمێردی: (رَفْعٌ إِلَى حَاكِمٍ) داوایەکە بەرز بکرێتەوە بۆ لای دادوەر، واتە: قازی (وَكَذَا سَائِرُ الْعُيُوبِ) هەروەها لە گشت عەیبەکانیتریشدا مەرجە: داوایەکە بەرز بکرێتەوە بۆلای دادوەر (فِي الأَصَحِّ) لە فەرمودەی ڕاستتردا، واتە: نە بۆ ژنەکەو نە بۆ مێردەکە دروست نابێ: ڕێك بکەونو بە بێقازی هەڵیبوەشێننەوە.

بەڵام ئەگەر شوێنێك (قازی)ی شەرعی لێنەبو، یان هەڵوەشاندنەوەی لای قازی پارەی دەویا، ئەو کاتە لە بەر ناچاری: هەم بۆ ژنەکەو هەم بۆ مێردەکە دروستە پیاوێکی لێزان

وَتَثْبُتُ الْعُنَّةُ بِإِقْرَارِهِ أَوْ بَيِّنَةٍ عَلَى إِقْرَارِهِ وَكَذَا بِيَمِينِهَا بَعْدَ نُكُولِهِ فِي الأَصَحِّ، وَإِذَا ثَبَتَتْ ضَرَبَ الْقَاضِي لَهُ سَنَةً بِطَلَبِهَا، فَإِذَا تَمَّتْ رَفَعَتْهُ إِلَيْهِ: فَإِنْ قَالَ وَطِئْتُ حُلِّفَ، فَإِنْ نَكَلَ حُلِّفَتْ فَإِنْ حَلَفَتْ أَوْ أَقَرَّ اسْتَقَلَّتْ بِالْفَسْخِ،

---

بکاتە (المحكَّمْ)–واتە: دادوەری‌مەسەلەکەو– لە لای وی مارەبڕینەکە هەڵبوەشێنێتەوە بە ووشەکانی‌داهاتوو، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)و حاشیەکانیاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَتَثْبُتُ الْعُنَّةُ) نەمێردی‌ی پیاوەکە ئاشکرا دەبێ: یان (بِإِقْرَارِهِ) بە دانپێداهێنانی مێردەکە لە لای قازی (أَوْ بَيِّنَةٍ عَلَى إِقْرَارِهِ) یان بە شاهیدی‌ی دوو پیاو لە سەر دانپێداهێنانەکەی (وَكَذَا بِيَمِينِهَا بَعْدَ نُكُولِهِ) هەروەها ئاشکرا دەبێ بە سوێندخواردنی ژنەکە لە دوای سوێندنەخواردنی مێردەکە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

ئینجا (وَإِذَا ثَبَتَتْ) هەر کاتێك نەمێردی‌ی مێردەکە ئاشکرا بوو: بە یەکێك لەو سێ ڕووانەی‌ڕابردوو (ضَرَبَ الْقَاضِي لَهُ سَنَةً) قازی ماوەی ساڵێك بۆ مێردەکە دادەنێ (بِطَلَبِهَا) بە داواکردنی ژنەکە–واتە: نە بە داواکردنی سەرپەرشتکارەکەو نە سەربەخۆ قازی ساڵەکە دانانێ–جا ئەگەر ژنەکە لە بەر نەزانین، یان سەرلێشێوان بێ‌دەنگ بوو، دروستە قازی ئاگاداری بکاتەوە ﴿عن سعيد بن الْمُسَيِّبِ؄: قَضَى عُمَرُ؄: أَنَّ الْعِنِّينَ يُؤَجَّلُ سَنَةً﴾ أخرجه سعيد بن منصور ورجاله ثقات، ئیمامی(عمر) بڕیاری داوە: نەمێرد مۆڵەتی ساڵێکی بۆ دابندرێ. واتە: تا هەر چوار وەرزەکەی ساڵ ببینێ؟ نەوەك نەمێردیەکەی بە هۆی گەرمی، یان ساردی، یان تەڕی، یان ووشکی بێ، ئینجا ساڵەکەش لە دانانی قازی‌یەوە دەست پێ‌دەکا.

(فَإِذَا تَمَّتْ) جا هەر کاتێك ساڵەکە تەواو بوو و جیماعی پێ‌نەکرا (رَفَعَتْهُ إِلَيْهِ) دووبارە –بە پەلە– بەرزی دەکاتەوە بۆ لای قازی تاکو مارەبڕینەکە هەڵبوەشێنێتەوە (فَإِنْ قَالَ وَطِئْتُ) جا ئەگەر مێردەکە گوتی: لە ماوەی ئەو ساڵەدا جیماعم کردوە. ئەوە (حُلِّفَ) مێردەکە سوێند دەدرێ کە جیماعی کردوە، بەو مەرجەی ژنەکە لەو کاتدا بێوەژن بێ، بەڵام ئەگەر کچ بوو، ئەو کاتە بە سوێندخواردن باوەڕ بە ژنەکە دەکرێ کە جیماعی نەکردوە، هەروەها (فَإِنْ نَكَلَ) ئەگەر مێردەکە سوێندی نەخوارد، ئەو کاتەش (حُلِّفَتْ) ژنەکە سوێند دەدرێ کە مێردەکەی جیماعی لەگەڵ نەکردوەو باوەڕی پێ‌دەکرێ.

(فَإِنْ حَلَفَتْ) جا ئەگەر ژنەکە سوێندی خوارد (أَوْ أَقَرَّ) یان مێردەکە دانی هێنا: کە جیماعی نەکردوە، ئەو کاتە (اسْتَقَلَّتْ بِالْفَسْخِ) ژنەکە سەربەخۆ دەبێ بۆ هەڵوەشاندنەوەی مارەبڕینەکە، بەڵام بەو مەرجەی پێشدا قازی، یان (مُحَكَّمْ) بڵێ: مافی هەڵوەشاندنەوەی مارەبڕینەکەت جێگیر بوو. ئینجا ژنەکەش بڵێ: ئەوا بە هۆی ئەم عەیبە مارەبڕینەکەی

وَقِيلَ يَحْتَاجُ إِلَى إِذْنِ الْقَاضِي أَوْ فَسْخِهِ، وَلَوْ اعْتَزَلَتْهُ أَوْ مَرِضَتْ أَوْ حُبِسَتْ فِي الْمُدَّةِ لَمْ تُحْسَبْ، وَلَوْ رَضِيَتْ بَعْدَهَا بِهِ بَطَلَ حَقُّهَا، وَكَذَا لَوْ أَجَّلَتْهُ عَلَى الصَّحِيحِ، وَلَوْ نَكَحَ وَشُرِطَ فِيهَا إِسْلَامٌ أَوْ فِي أَحَدِهِمَا نَسَبٌ أَوْ حُرِّيَّةٌ أَوْ غَيْرُهُمَا فَأُخْلِفَ فَالأَظْهَرُ صِحَّةُ النِّكَاحِ، ثُمَّ

---

خۆم هەڵوەشاندەوە. (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: (يَحْتَاجُ إِلَى إِذْنِ الْقَاضِي) پێویستی بە ئیزندانی قازی هەیە (أَوْ فَسْخِهِ) یان بە هەڵوەشاندنەوەی قازی، وەك بڵێ: بە هۆی ئەم عەیبە مارەبڕینی ئەم ژنو مێردەم هەڵوەشاندەوە.

ئینجا بزانە: لە مەسەلەی دانانی (مُحَكَّمْ)ی‌ڕابردوودا دەردەكەوێ: كە لە عەیبەكانی‌تریشدا مەرجە: پێشدا قازی، یان (مُحَكَّمْ) بڵێ: مافی هەڵوەشاندنەوەی مارەبڕینەكەت جێگیر بوو. ئینجا ژنەكەش، یان مێردەكەش بڵێ: ئەوا بە هۆی ئەم عەیبە مارەبڕینەكەی خۆم هەڵوەشاندەوە.

(وَلَوْ اعْتَزَلَتْهُ) ئەگەر لە تەواوی ساڵەكەدا ژنەكە خۆی لە مێردەكەی جیا كردەوە (أَوْ مَرِضَتْ) یان ژنەكە نەخۆش كەوت (أَوْ حُبِسَتْ فِي الْمُدَّةِ) یان لە تەواوی ساڵەكەدا ژنەكە بەندكرابو (لَمْ تُحْسَبْ) ئەم ساڵە حیساب ناكرێو ساڵێكی‌تر دەست پێدەكاتەوە، جا ئەگەر ئەو ڕووداوانە لە بەشێكی ساڵەكەدا بون، ئەو كاتە تەنها هەمان وەرز لە ساڵی داهاتوودا چاوەڕوان دەكرێ، بەڵام ئەگەر ڕووداوەكان لە لای مێردەكەوە بن، ئەوە كاتە ساڵەكەی لە سەر دەژمێردرێو ساڵێكی‌تر دوو بارە ناكرێتەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە.

(وَلَوْ رَضِيَتْ بَعْدَهَا بِهِ) ئەگەر ژنەكە لە دوای تەواوبوونی ساڵەكە بە مێردەكەی ڕازی بوو، ئەوە (بَطَلَ حَقُّهَا) مافی هەڵوەشاندنەوەكەی بەتاڵ دەبێتەوە (وَكَذَا لَوْ أَجَّلَتْهُ) هەروەها ئەگەر هەڵوەشاندنەوەكەشی دواخست بۆ ماوەیەكی‌تر، مافەكەی بەتاڵ دەبێتەوە (عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست.

## ﴿ دانانی مەرجێك لە ژنەكەدا، یان لە مێردەكەدا ﴾

(وَلَوْ نَكَحَ) ئەگەر ژنێكی لە خۆی مارە كرد (وَشُرِطَ فِيهَا إِسْلَامٌ) لە ناو مارەبڕینەكەدا بە مەرج داندرا: ژنەكە موسوڵمان بێ (أَوْ فِي أَحَدِهِمَا نَسَبٌ) یان بە مەرج داندرا: ژنەكە، یان مێردەكە خاوەن نەژاد بێ (أَوْ حُرِّيَّةٌ) یان ئازاد بێ (أَوْ غَيْرُهُمَا) یان جگە لەو سیفەتانە: وەك بە مەرج دابندرێ ژنەكە كچ بێ، یان مێردەكە كوڕ بێ، واتە: لە ژیانی‌دا ژنی نەهێنابێ، یان جاحێڵو گەنجی، یان ڕەنگ، یان باڵا بەرزی بە مەرج دابندرێ، ئینجا (فَأُخْلِفَ) مەرجەكەش نەهێندرا جێ، ئەوە (فَالأَظْهَرُ صِحَّةُ النِّكَاحِ) بە فەرموودەی بەهێزتر: مارەبڕینەكە دروست دەبێ (ثُمَّ) ئینجا تەماشا دەكەین:

إنْ بَانَ خَيْرًا مِمَّا شُرِطَ فَلاَ خِيَارَ، وَإِنْ بَانَ دُونَهُ فَلَهَا الْخِيَارُ، وَكَذَا لَهُ فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ ظَنَّهَا مُسْلِمَةً أَوْ حُرَّةً فَبَانَتْ كِتَابِيَّةً أَوْ أَمَةً وَهِيَ تَحِلُّ لَهُ فَلاَ خِيَارَ فِي الأَظْهَرِ، وَلَوْ أَذِنَتْ فِي تَزْوِيجِهَا بِمَنْ ظَنَّتْهُ كُفْئًا فَبَانَ فِسْقُهُ أَوْ دَنَاءَةُ نَسَبِهِ وَحِرْفَتِهِ فَلاَ خِيَارَ لَهَا،

---

(إنْ بَانَ خَيْرًا مِمَّا شُرِطَ) ئەگەر دەركەوت: ژنەكە، یان مێردەكە باشترە لە بە مەرج داندراوەكە: وەك لە جیاتی بێوەژن دەركەوێ كچە، یان لە جیاتی بێوەمێرد دەركەوێ كوڕە، ئەوە (فَلاَ خِيَارَ) بۆ هیچێكیان پەشیمانی نیە، بەڵام (وَإِنْ بَانَ دُونَهُ) ئەگەر دەركەوت كەمترە لە بە مەرج داندراوەكە: وەك لە جیاتی كچ بێوەژن بێ، یان لە جیاتی كوڕ بێوەمێرد بێ، ئەو كاتە (فَلَهَا الْخِيَارُ) بۆ ژنەكە مافی پەشیمانی هەیە (وَكَذَا لَهُ) هەروەها بۆ مێردەكەش مافی پەشیمانی هەیە، واتە: هەردووكیان مافیان هەیە مارەبڕینەكە هەڵبوەشێننەوە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

﴿ ئاگاداری ﴾ یەكەم: ئەم هەڵوەشاندنەوەیە-بۆ هەردووكیان- بە پەلەو دەسبەجێیەو پێویستی بە قازی نیە، كەواتە: هەر یەكێك لە ژنەكەو لە مێردەكە زانی مەرجە داندراوەكەی نەهاتۆتە جێ، ئەوە یەكسەر دەڵێ: مارەبڕینەكەم هەڵوەشاندەوە. هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)و حاشیەكانیاندا فەرموویانە.

جا بزانە: ئەگەر لە ناو مارەبڕینەكەدا مەرجەكە دانەندرابێ، بەڵكو لە پێش مارەبڕینەكە، یان لە دوای مارەبڕینەكە داندرابوو، ئەوە هیچ كاری پێ ناكرێ‌و هیچێكیان مافی پەشیمانیی نیە، هەروەك لە دوای ئێرە- لە شەرحی (وَالْمُؤَثِّرُ)- ڕوونی دەكەینەوە، إن شاء الله تعالى.

دووەم: ئەگەر پیاوە دیاركراوەكە، یان ئافرەتە دیاركراوەكە بگۆڕدرێ: وەك بڵێ: لە (زەید) مارەم بكە، ئەویش لە (عەمر) مارەی كرد، یان بڵێ: فڵانە كیژەت لێم مارە بكە، ئەویش خوشكێكی ئەو كیژەیی لێ مارە كرد، ئەوە لە هەردوو مەسەلەدا مارەبڕینەكە بەتاڵ دەبێ‌و دروست نابێ، هەروەك لە (تحفة)و (البجيرمي)دا فەرموویانە.

(وَلَوْ ظَنَّهَا مُسْلِمَةً) ئەگەر مێردەكە-بە بێ‌مەرج- وای تێگەیشتبوو ژنەكە موسوڵمانە (أَوْ حُرَّةً) یان ئازادە (فَبَانَتْ كِتَابِيَّةً أَوْ أَمَةً) ئینجا دەركەوت: ژنەكە (أهل الكتاب)ە، یان (جارية)یە (وَهِيَ تَحِلُّ لَهُ) جاریەكەشی بۆ حەڵاڵ بوو، ئەوە (فَلاَخِيَارَ) مافی پەشیمانیی نیە (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، چونكە مەرجی دانەناوەو كەمتەرخەمیی كردوە.

(وَلَوْ أَذِنَتْ) ئەگەر ئافرەتێك سەرپەرشتكارەكەی‌خۆی ئیزندا (فِي تَزْوِيجِهَا بِمَنْ ظَنَّتْهُ كُفْئًا) لە پیاوێكی مارە بكا: كە وای‌تێگەیشتبوو هاوچەشنی خۆیەتی (فَبَانَ فِسْقُهُ) ئینجا دەركەوت: پیاوەكە فاسقە (أَوْ دَنَاءَةُ نَسَبِهِ وَحِرْفَتِهِ) یان نەژادەكەی، یان پیشەكەی ناڕێكو خراپە، ئەوە (فَلاَ خِيَارَ لَهَا) ئافرەتەكە مافی پەشیمانیی نیە، چونكە مەرجی دانەناوەو كەمتەرخەمیی كردوە: كە لێی نەكۆڵیوەتەوە.

قُلْتُ: وَلَوْ بَانَ مَعِيبًا أَوْ عَبْدًا فَلَهَاالْخِيَارُ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَمَتَى فُسِخَ بِخُلْف فَحُكْمُ الْمَهْرِ وَالرُّجُوعِ بِه عَلَىالْغَارِّ مَا سَبَقَ فِيالْعَيْب، وَالْمُؤَثِّرُ تَغْرِيرٌ قَارَنَ الْعَقْدَ، وَلَوْ غُرَّ بِحُرِّيَّةِ أَمَةٍ وَصَحَّحْنَاهُ فَالْوَلَدُ قَبْلَ الْعِلْمِ حُرٌّ وَعَلَى الْمَغْرُورِ قِيمَتُهُ لِسَيِّدِهَا وَيَرْجِعُ بِهَا عَلَى الْغَارِّ، وَالتَّغْرِيرُ بِالْحُرِّيَّةِ لاَ يُتَصَوَّرُ مِنْ سَيِّدِهَا بَلْ مِنْ وَكِيلِه أَوْ مِنْهَا، فَإِنْ كَانَ مِنْهَا

---

(قُلْتُ) ئیمامی (النواوي) دەفەرموێ (وَلَوْ بَانَ مَعِيبًا) ئەگەر دەرکەوت مێردەکە عەیبدارە، واتە: لەو پێنج عەیبانەیڕابردوو عەیبێکی هەبوو (أَوْ عَبْدًا) یان کۆیلە بوو، ئەو کاتە (فَلَهَا الْخِيَارُ) ژنەکە مافی پەشیمانیی هەیە، هەروەك ڕابرا (وَاللهُ أَعْلَمُ).

(وَمَتَى فُسِخَ بِخُلْفٍ) هەر کاتێك مارەبڕینەکە هەڵوەشێندراوە بە هۆی نەهاتنەجێی مەرجێك، ئەوە (فَحُكْمُ الْمَهْرِ وَالرُّجُوعِ بِهِ عَلَىالْغَارِّ) بڕیاری مارەییەکەو گەڕانەوەی مێردەکە بۆ سەر فریودەرەکە تاکو تۆڵەی مارەییەکەی لێبستێنێ (مَا سَبَقَ فِيالْعَيْبِ) هەر ئەو بڕیارەیڕابردووە لە باسی هەڵوەشاندنەوەی عەیبداریدا، واتە: لێرەشدا: ئەگەر پێش جیماعکردن مارەبڕینەکە هەڵبوەشێندرێتەوە، ئەوە مارەییەکە لە سەر مێردەکە لادەچێ، بەڵام ئەگەر لە دوای جیماعکردن هەڵبوەشێندرێتەوە، ئەو کاتە مارەیی هاوێنە بۆ ژنەکە لە سەر مێردەکە واجب دەبێ، مێردەکەش هیچ مافی نیە تۆڵەی مارییەکە لە فریودەرەکە وەربگرێتەوە.

(وَالْمُؤَثِّرُ) ئەو فریودانەی کار دەکا لە هەڵوەشاندنەوەی مارەبڕینەکەدا بە هۆی نەهاتنەجێی مەرجێك (تَغْرِيرٌ قَارَنَ الْعَقْدَ) ئەو فریودانەیە کە لە ناو مارەبڕینەکەدا بە مەرج دابندرێ، ئینجا نەهێندرێتە جێ، وەك بڵێ: ئەم ئافرەتە کچە کردمە ژنی تۆ. ئینجا ئەویش قبوڵ بکا، واتە: ئەگەر مەرجەکە لە پێش مارەبڕینەکە دابندرێ، ئەوە هیچ کار ناکا، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.

(وَلَوْ غُرَّ بِحُرِّيَّةِأَمَةٍ) ئەگەر پیاوێك فریودرا بە ئازادیی (جارية)ك، واتە: لە ناو مارەبڕینەکەدا بە مەرج داندرا ئازاد بێ، بەڵام دەرکەوت ئافرەتەکە کۆیلەیە (وَصَحَّحْنَاهُ) مارەبڕینەکەشمان بە دروستبوو دانا، ئەوە (فَالوَلَدُ قَبْلَ الْعِلْمِ حُرٌّ) پێش ئەوەی بزانێ ژنەکە کۆیلەیە، ئەو منداڵەی لەو ژنەی پەیدا دەبێ ئازادە (وَعَلَىالْمَغْرُورِ قِيمَتُهُ لِسَيِّدِهَا) فریودراوەکەش لە سەری واجبە نرخی منداڵەکە بداتە گەورەی ژنە کۆیلەکەو، هەم (وَيَرْجِعُ بِهَا عَلَى الغَارِّ) دەشگەڕێتەوە سەر فریودەرەکەو تۆڵەی نرخەکەی لەوی وەردەگرێتەوە، بەڵام دوای زانینی منداڵەکە کۆیلەیە.

(وَالتَّغْرِيرُ بِالْحُرِّيَّةِ لاَ يُتَصَوَّرُ مِنْ سَيِّدِهَا) فریودان بە ئازادیی (جارية)کە لە گەورەکەیەوە ناگونجێ، چونکە ئەگەر بڵێ: ئەم ئافرەتە ئازادە. یەکسەر ئازاد دەبێ (بَلْ مِنْ وَكِيلِهِ أَوْ مِنْهَا) بەڵکو لە وەکیلی گەورەکەی، یان لە (جارية)کەوە دەگونجێ (فَإِنْ كَانَ مِنْهَا) جا

تَعَلَّقَ الْغُرْمُ بِذِمَّتِهَا، وَلَوْ انْفَصَلَ الْوَلَدُ مَيِّتًا بِلاَ جِنَايَةٍ فَلاَ شَيْءَ فِيهِ، وَمَنْ عَتَقَتْ تَحْتَ رَقِيقٍ أَوْ مَنْ فِيهِ رِقٌّ تَخَيَّرَتْ فِي فَسْخِ النِّكَاحِ، وَالأَظْهَرُ أَنَّهُ عَلَى الْفَوْرِ، فَإِنْ قَالَتْ جَهِلْتُ الْعِتْقَ صُدِّقَتْ بِيَمِينِهَا إِنْ أَمْكَنَ: بِأَنْ كَانَ الْمُعْتِقُ غَائِبًا، وَكَذَا إِنْ قَالَتْ جَهِلْتُ الْخِيَارَ بِهِ فِي الأَظْهَرِ، فَإِنْ فَسَخَتْ قَبْلَ وَطْءٍ فَلاَ مَهْرَ، وَبَعْدَهُ بِعِتْقٍ بَعْدَهُ وَجَبَ الْمُسَمَّى، أَوْ قَبْلَهُ فَمَهْرُ مِثْلٍ، وَقِيلَ الْمُسَمَّى، وَلَوْ عَتَقَ بَعْضُهَا أَوْ كُوتِبَتْ أَوْ عَتَقَ عَبْدٌ تَحْتَهُ أَمَةٌ فَلاَ خِيَارَ.

---

ئەگەر فریودانەکە لە (جارية)کەوە بێ، ئەوە (تَعَلَّقَ الْغُرْمُ بِذِمَّتِهَا) تۆڵەی منداڵەکە بە ئەستۆیەوە دەبەسترێتەوە، هەر کاتێك ئازاد کرا لێی وەردەگیرێ (وَلَوْ انْفَصَلَ الوَلَدُ مَيِّتًا بِلاَ جِنَايَةٍ) ئەگەر منداڵەکە بە بێ دەستدرێژیکردنە سەردایکەکە بە مردوویی لێی جیا بۆوە (فَلاَ شَيْءَ فِيهِ) هیچ تۆڵەی واجب نیە.

(وَمَنْ عَتَقَتْ) هەر ژنێك هەمووی ئازاد بکرێ لەو حاڵەتەی کە (تَحْتَ رَقِيقٍ أَوْ مَنْ فِيهِ رِقٌّ) لە ژێر مارەبڕینی کۆیلەیەکدایە، یان ئەوەی بەشێکی کۆیلەیە، ئەوە (تَخَيَّرَتْ فِي فَسْخِ النِّكَاحِ) دەبێتە سەرپشك لە هەڵوەشاندنەوەی مارەبڕینەکە، هەروەك لە (البخاري)و (مسلم)دا گێڕدراوەتەوە.

ئینجا (وَالأَظْهَرُ أَنَّهُ عَلَى الْفَوْرِ) بە فەرموودەی بەهێزتر پەشیمانبوونەوەکەش دەمودەستەو بە پەلەیە (فَإِنْ قَالَتْ جَهِلْتُ العِتْقَ) ئەگەر ژنەکە گوتی نەمزانی ئازاد کراوم بۆیێ دواکەوتم (صُدِّقَتْ بِيَمِينِهَا إِنْ أَمْكَنَ) بە سوێندخواردنەکەی باوەڕی پێ دەکرێ ئەگەر بگونجێ: (بِأَنْ كَانَ المُعْتِقُ غَائِبًا) وەك ئازادکەرەکەی لە شوێنێکی نادیار بوبێ (وَكَذَا إِنْ قَالَتْ جَهِلْتُ الخِيَارَ بِهِ فِي الأَظْهَرِ) هەروەها لە فەرموودەی بەهێزتردا: باوەڕی پێ دەکرێ ئەگەر بڵێ: نەمزانی بەم ئازادبوونەم مافی پەشیمانیم هەیە.

ئینجا (فَإِنْ فَسَخَتْ قَبْلَ وَطْءٍ) ئەگەر پێش جیماعکردن مارەبڕینەکەی هەڵوەشاندەوە، ئەوە (فَلاَ مَهْرَ) مافی هیچ مارەیی نیە (وَبَعْدَهُ بِعِتْقٍ بَعْدَهُ) بەڵام ئەگەر لە دوای جیماعکردن بە ئازادبوونێکی دوای جیماعکردن هەڵیوەشاندەوە، ئەوە (وَجَبَ المُسَمَّى) مارەییە ناوبراوەکە –بۆ گەورەکەی– واجب دەبێ لە سەر مێردەکەی (أَوْ قَبْلَهُ) یان بە ئازادبوونێکی پێش جیماعکردن هەڵیوەشاندەوە، ئەوە (فَمَهْرُ مِثْلٍ) مارەیی هاوێنە –بۆ گەورەکەی– واجب دەبێ لە سەر مێردەکەی (وَقِيلَ المُسَمَّى) لە فەرموودەیەکی بێهێزادا: مارەییە ناوبراوەکەی بۆ واجب دەبێ (وَلَوْ عَتَقَ بَعْضُهَا أَوْ كُوتِبَتْ) ئەگەر ژنەکە تەنها بەشێکی ئازاد کرا، یان نووسراوی درایێ (أَوْ عَتَقَ عَبْدٌ تَحْتَهُ أَمَةٌ) یان کۆیلەیەك ئازاد کرا کە جاریەکی لە ژێردا بوو، ئەوە (فَلاَ خِيَارَ) لە هەرسێك مەسەلەدا هیچیێکیان مافی پەشیمانیی نیە.

(فَصْلٌ) يَلْزَمُ الْوَلَدَ إِعْفَافُ الأَبِ وَالأَجْدَادِ عَلَى الْمَشْهُورِ: بِأَنْ يُعْطِيَهُ مَهْرَ حُرَّةٍ، أَوْ يَقُولَ: انْكِحْ وَأُعْطِيكَ الْمَهْرَ، أَوْ يَنْكِحَ لَهُ بِإِذْنِهِ وَيُمْهِرَ، أَوْ يُمَلِّكَهُ أَمَةً أَوْ ثَمَنَهَا، ثُمَّ عَلَيْهِ مُؤْنَتُهُمَا، وَلَيْسَ لِلأَبِ تَعْيِينُ النِّكَاحِ دُونَ التَّسَرِّي وَلاَ رَفِيعَةٍ، وَلَوْ اتَّفَقَا عَلَى مَهْرٍ فَتَعْيِينُهَا لِلأَبِ، وَيَجِبُ التَّجْدِيدُ إِذَا مَاتَتْ أَوْ انْفَسَخَ بِرِدَّةٍ أَوْ فَسَخَهُ بِعَيْبٍ، وَكَذَا إِنْ طَلَّقَ بِعُذْرٍ فِي الأَصَحِّ،

---

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی (الإِعْفَاف)= ژن هێنان بۆ باوکو باپیرە ﴾

(يَلْزَمُ الْوَلَدَ) لە سەر کوڕو کیژ –بەگوێرەی میراتگرتن– واجبە (إِعْفَافُ الأَبِ وَالأَجْدَادِ) باوکو باپیرەکانی لای دایکو باوکیان داوێنپاك بکەن، بەڵام بەو مەرجەی کوڕو کیژەکە هەبوویی بن (عَلَى الْمَشْهُورِ) لە سەر فەرموودەی ناسراوی مەزهەب، ئینجا داوێنپاککردنەکەش بەوە دەبێ: (بِأَنْ يُعْطِيَهُ مَهْرَ حُرَّةٍ) مارەیی ژنێکی ئازاد بداتە باوکو باپیرە تاکو بەو مارەییە ژنێك لە خۆی مارە بکا (أَوْ يَقُولَ انْكِحْ وَأُعْطِيكَ الْمَهْرَ) یان بڵێتە باوکو باپیرە: ژنێك لە خۆت مارە بکە، من مارەییەکەیت دەدەمێ (أَوْ يَنْكِحَ لَهُ بِإِذْنِهِ وَيُمْهِرَ) یان بە ئیزنی باوکو باپیرە ژنەکەیان لێ مارە بکاو مارییەکەشی بداتێ (أَوْ يُمَلِّكَهُ أَمَةً أَوْ ثَمَنَهَا) یان جاریەیەك بداتە باوکو باپیرە، یان پارەی جاریەکە بدا، جا لەو حاڵەتانەشدا مەرجە: ژنەکە شەهوەتی باوکو باپیرە تێر بکا، نەك پیرەژنێکی شێوراو بێ.

(ثُمَّ) ئینجا کە ژنی بۆ باوکو باپیرە هێنا (عَلَيْهِ مُؤْنَتُهُمَا) ئەرکی بەخێوکردنی‌خۆیان‌و ژنەکانیشیان لە سەر کوڕەکان‌و کیژەکانە بەگوێرەی میراتگرتن، واتە: نێرینە بە دووهەندی مێینە ئەرکی ژنهێنانەکەو بەخێوکردنەکە دەدا، هەروەك لە زۆریەی سەرچاوەکاندافەرموویانە.

(وَلَيْسَ لِلأَبِ تَعْيِينُ النِّكَاحِ دُونَ التَّسَرِّي) باوك ئەو مافەی نیە: تەنها ژنهێنان دیاری بکاو بە ئافرەتی کۆیلە ڕازی نەبێ (وَلاَ رَفِيعَةٍ) هەم مافی نیە ژنێکی پلەو پایە بەرز دیاری بکا: کە ئەرکو مارەیی زۆر بێ بە هۆی جوانی، یان نەژاد، بەڵام (وَلَوْ اتَّفَقَا عَلَى مَهْرٍ) ئەگەر باوكو منداڵەکەی لە سەر ئەندازەیەکی مارەیی ڕێك کەوتن، ئەو کاتە (فَتَعْيِينُهَا لِلأَبِ) دیاریکردنی ژنەکە مافی باوکەکەیە.

(وَيَجِبُ التَّجْدِيدُ إِذَا مَاتَتْ) لە سەر کوڕو کیژەکە واجبە: سەرلەنوێ ژنێکی‌تر بۆ باوکو باپیرە بێنن هەر کاتێك ئەوژنەی بۆیان هێنابو مرد (أَوْ انْفَسَخَ بِرِدَّةٍ) یان بە هۆی کافربوونی ژنەکە مارەبڕینەکە هەڵوەشاوە (أَوْ فَسَخَهُ بِعَيْبٍ) یان باوکەکە بە هۆی عەیبێك هەڵیوەشاندەوە (وَكَذَا إِنْ طَلَّقَ بِعُذْرٍ) هەروەها ئەگەر باوکەکە بە هۆی عوزرێکیش ژنەکەی تەڵاق بدا، هەر واجبە: ژنێکی‌تری بۆ بێنن (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، بەڵام ئەگەر بە بێ‌عوزر تەڵاقی بدا، ئەو کاتە واجب نیە ژنێکی‌تری بۆ بێنن.

وَإِنَّمَا يَجِبُ إِعْفَافُ فَاقِدِ مَهْرٍ مُحْتَاجٍ إِلَى نِكَاحٍ وَيُصَدَّقُ إِذَا ظَهَرَتِ الْحَاجَةُ بِلاَ يَمِينٍ، وَيَحْرُمُ عَلَيْهِ وَطْءُ أَمَةِ وَلَدِهِ، وَالْمَذْهَبُ وُجُوبُ مَهْرٍ لاَ حَدٌّ، فَإِنْ أَحْبَلَ فَالْوَلَدُ حُرٌّ نَسِيبٌ، فَإِنْ كَانَتْ مُسْتَوْلَدَةً لِلإِبْنِ لَمْ تَصِرْ مُسْتَوْلَدَةً لِلأَبِ، وَإِلاَّ فَالأَظْهَرُ أَنَّهَا تَصِيرُ وَأَنَّ عَلَيْهِ قِيمَتَهَا مَعَ مَهْرٍ، لاَ قِيمَةَ وَلَدٍ فِي الأَصَحِّ، وَيَحْرُمُ نِكَاحُهَا، فَلَوْ مَلَكَ زَوْجَةَ وَالِدِهِ الَّذِي لاَ تَحِلُّ لَهُ الأَمَةُ لَمْ يَنْفَسِخِ النِّكَاحُ فِي الأَصَحِّ، وَلَيْسَ لَهُ نِكَاحُ أَمَةِ مُكَاتَبِهِ، فَإِنْ مَلَكَ مُكَاتَبٌ زَوْجَةَ سَيِّدِهِ انْفَسَخَ النِّكَاحُ فِي الأَصَحِّ.

---

(وَإِنَّمَا يَجِبُ إِعْفَافُ فَاقِدِ مَهْرٍ) ژنهێنان تەنها بۆ ئەو باوكو باپیرەیە واجبە كە بە خۆی مارەیی ژنهێنانی نەبێو هەم (مُحْتَاجٍ إِلَى نِكَاحٍ) پێویستیشی بە ژنهێنان هەبێ: وەك حەزی بۆ جیماع بچێ، هەر چەند ژنێكی پیری شێواویشی هەبێ، یان لە بەر نەخۆشی پێویستی بە خزمەتكردن هەبێ، ئینجا (وَيُصَدَّقُ إِذَا ظَهَرَتِ الْحَاجَةُ بِلاَ يَمِينٍ) باوك، هەم باپیرەش بە بێسوێندخواردن باوەڕی پێدەكرێ، هەر كاتێك ئاشكرا ببێ پێویستیی بە ژنهێنان هەیە.

(وَيَحْرُمُ عَلَيْهِ وَطْءُ أَمَةِ وَلَدِهِ) حەرامە: باوكو هەم باپیرە جیماع لەگەڵ جاریەی منداڵی خۆی بكا، بەڵام ئەگەر جیماعی لەگەڵ كرد، ئەوە (وَالْمَذْهَبُ وُجُوبُ مَهْرٍ) واجبە: مارەیی جاریەكە بداتە منداڵەكە (لاَ حَدٌّ) بەڵام سزای زینای لە سەر نیە، چونكە شوبهەی هەیە (فَإِنْ أَحْبَلَ) جا ئەگەر بەو جیماعە جاریەكەی ئاوس كرد، ئەوە (فَالْوَلَدُ حُرٌّ نَسِيبٌ) ئەو منداڵەی لەم جیماعە دروست بووە، ئازادەو دەبێتە منداڵی باوكە جیماعكەرەكە.

(فَإِنْ كَانَتْ مُسْتَوْلَدَةً لِلإِبْنِ) جا ئەگەر جاریەكە (أم الولد) بێ بۆ كوڕەكە، ئەوە (لَمْ تَصِرْ مُسْتَوْلَدَةً لِلأَبِ) نابێتە (أم الولد) بۆ باوكە جیماعكەرەكە (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر (أم الولد) نەبێ بۆ كوڕەكە، ئەوە (فَالأَظْهَرُ أَنَّهَا تَصِيرُ) دەبێـە (أم الولد) بۆ باوكەكە، هەم (وَأَنَّ عَلَيْهِ قِيمَتَهَا مَعَ مَهْرٍ) لە سەر باوكەكە واجبە: نرخی جاریەكە لەگەڵ مارەییەكەی بداتە كوڕەكە (لاَ قِيمَةَ وَلَدٍ فِي الأَصَحِّ) بەڵام نرخی ئەو منداڵەی لێی بووە، لە سەری واجب نیە.

(وَيَحْرُمُ نِكَاحُهَا) حەرامە جاریەی منداڵەكەیخۆی لە خۆی مارە بكا (فَلَوْ مَلَكَ زَوْجَةَ وَالِدِهِ الَّذِي لاَ تَحِلُّ لَهُ الأَمَةُ) جا ئەگەر كوڕەكە ببێتە خاوەنی ژنی ئەو باوكەی كە جاریەی بۆ حەڵاڵ نیە: وەك ژنی باوكەكە (جارية) بێو كوڕەكەیشی بیكڕێ، ئەوە (لَمْ يَنْفَسِخِ النِّكَاحُ فِي الأَصَحِّ) مارەبڕینەكە هەڵناوەشێتەوە (وَلَيْسَ لَهُ نِكَاحُ أَمَةِ مُكَاتَبِهِ) بۆ گەورەكە حەرامە جاریەی كۆیلە نوسراوپێدراوەكەی لە خۆی مارە بكا (فَإِنْ مَلَكَ مُكَاتَبٌ زَوْجَةَ سَيِّدِهِ) جا ئەگەر نوسراوپێدراوێك بووە خاوەنی ژنی گەورەكەیخۆی، ئەوە (انْفَسَخَ النِّكَاحُ فِي الأَصَحِّ) مارەبڕینەكە هەڵدەوەشێـەوە.

(فَصْلٌ) السَّيِّدُ بِإِذْنِهِ فِي نِكَاحِ عَبْدِهِ لاَ يَضْمَنُ مَهْرًا وَنَفَقَةً فِي الْجَدِيدِ، وَهُمَا فِي كَسْبِهِ بَعْدَ النِّكَاحِ الْمُعْتَادِ وَالنَّادِرِ، فَإِنْ كَانَ مَأْذُونًا لَهُ فِي تِجَارَةٍ فَفِيمَا بِيَدِهِ مِنْ رِبْحٍ وَكَذَا رَأْسُ مَالٍ فِي الأَصَحِّ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ مُكْتَسِبًا وَلاَ مَأْذُونًا لَهُ فَفِي ذِمَّتِهِ، وَفِي قَوْلٍ عَلَى السَّيِّدِ، وَلَهُ الْمُسَافَرَةُ بِهِ وَيَفُوتُ الإِسْتِمْتَاعُ، وَإِذَا لَمْ يُسَافِرْ لَزِمَهُ تَخْلِيَتُهُ لَيْلاً لِلإِسْتِمْتَاعِ، وَيَسْتَخْدِمُهُ نَهَارًا إِنْ تَكَفَّلَ الْمَهْرَ وَالنَّفَقَةَ، وَإِلاَّ فَيُخَلِّيهِ لِكَسْبِهِمَا، وَإِنْ اسْتَخْدَمَهُ بِلاَ تَكَفُّلٍ لَزِمَهُ الأَقَلُّ مِنْ أُجْرَةِ مِثْلٍ وَكُلِّ الْمَهْرِ وَالنَّفَقَةِ.

---

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی ژن هێنانی کۆیلەو مێردکردنی جاریە ﴾

(السَّيِّدُ بِإِذْنِهِ فِي نِكَاحِ عَبْدِهِ) گەورە بە هۆی ئیزندانی: کە کۆیلەکەی ژن بهێنێ (لاَ يَضْمَنُ مَهْرًا وَنَفَقَةً فِي الْجَدِيدِ) نابێتە زامینی مارەیی و بەخێوکردنی ژنی کۆیلە ئیزندراوەکەی، بەڵکو (وَهُمَا) مارەیی و بەخێوکردنەکە (فِي كَسْبِهِ بَعْدَ النِّكَاحِ) لە کەسابەتی کۆیلەکە دەدرێن کە لە دوای مارەبڕینەکە دەیکا (الْمُعْتَادِ وَالنَّادِرِ) ئەو کەسابەتەی عادەتەو ئەوەی کەم کەمە دەیکا، بەڵام (فَإِنْ كَانَ مَأْذُونًا لَهُ فِي تِجَارَةٍ) ئەگەر کۆیلەکە لە بازرگانیشدا ئیزندراو بوو، ئەو کاتە (فَفِيمَا بِيَدِهِ مِنْ رِبْحٍ) مارەیی و بەخێوکردنەکە واجبە: لەو قازانجە بدرێن: کە لە دەستیدایە (وَكَذَا رَأْسُ مَالٍ فِي الأَصَحِّ) هەروەها لە سەرمایەی بازرگانیەکەش دەدرێن (وَإِنْ لَمْ يَكُنْ مُكْتَسِبًا وَلاَ مَأْذُونًا لَهُ) ئەگەر کۆیلەکە کەسابەتی نەدەکردو لە بازرگانیشدا ئیزن نەدرابو، ئەو کاتە (فَفِي ذِمَّتِهِ) مارەیی و بەخێوکردنەکە دەبێتە قەرز لە ئەستۆی کۆیلەکەدا، ئەگەر ژنەکەی ڕازی ببێ بە بێبەخێوکردن لەگەڵی بمێنێتەوە (وَفِي قَوْلٍ عَلَى السَّيِّدِ) لە فەرموودەیەکدا: مارەیی بەخێوکردنەکە –لەم حاڵەتەدا– لە سەر گەورەکەیەتی.

(وَلَهُ الْمُسَافَرَةُ بِهِ) بۆ گەورەکە دروستە: کۆیلەکەی لەگەڵ خۆیا بباتە سەفەر بەو مەرجەی ببێتە کەفیلی مارەیی و بەخێوکردنەکە (وَيَفُوتُ الإِسْتِمْتَاعُ) بەم سەفەرە کۆیلەکە لەزەتوەرگرتنی لە ژنەکەی لە دەست دەچێ، بەڵام (وَإِذَا لَمْ يُسَافِرْ) ئەگەر نەیباتە سەفەر، ئەو کاتە (لَزِمَهُ تَخْلِيَتُهُ لَيْلاً لِلإِسْتِمْتَاعِ) واجبە: بە شەوێ وازی لێ بێنێ بۆ ئەوەی لەزەت لە ژنەکەی وەربگرێو (وَيَسْتَخْدِمُهُ نَهَارًا) بە ڕۆژێش خزمەتی خۆی پێ دەکا (إِنْ تَكَفَّلَ الْمَهْرَ وَالنَّفَقَةَ) بەو مەرجەی گەورەکە ببێتە کەفیلی مارەیی و بەخێوکردنەکە (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر نەبێتە کەفیلی مارەیی و بەخێوکردنەکە، ئەو کاتە (فَيُخَلِّيهِ لِكَسْبِهِمَا) دەبێ وازی لێبێنێ تاکو بۆ مارەیی و بەخێوکردنەکە کەسابەت بکا.

(وَإِنْ اسْتَخْدَمَهُ بِلاَ تَكَفُّلٍ) ئەگەر خزمەتی خۆی بە کۆیلەکەی کردو نەشبوە کەفیلی مارەیی و بەخێوکردن، ئەو کاتە (لَزِمَهُ الأَقَلُّ مِنْ أُجْرَةِ مِثْلٍ وَكُلِّ الْمَهْرِ وَالنَّفَقَةِ) لە سەر گەورەکە واجبە

وَقِيلَ يَلْزَمُهُ الْمَهْرُ وَالنَّفَقَةُ، وَلَوْ نَكَحَ فَاسِدًا وَوَطِئَ فَمَهْرُ مِثْلٍ فِي ذِمَّتِهِ، وَفِي قَوْلٍ فِي رَقَبَتِهِ، وَإِذَا زَوَّجَ أَمَتَهُ اسْتَخْدَمَهَا نَهَارًا وَسَلَّمَهَا لِلزَّوْجِ لَيْلًا، وَلَا نَفَقَةَ عَلَى الزَّوْجِ حِينَئِذٍ فِي الْأَصَحِّ، وَلَوْ أَخْلَى فِي دَارِهِ بَيْتًا وَقَالَ لِلزَّوْجِ تَخْلُو بِهَا فِيهِ لَمْ يَلْزَمْهُ فِي الْأَصَحِّ، وَلِلسَّيِّدِ السَّفَرُ بِهَا وَلِلزَّوْجِ صُحْبَتُهَا، وَالْمَذْهَبُ أَنَّ السَّيِّدَ لَوْ قَتَلَهَا أَوْ قَتَلَتْ نَفْسَهَا قَبْلَ دُخُولٍ سَقَطَ مَهْرُهَا، وَأَنَّ الْحُرَّةَ لَوْ قَتَلَتْ نَفْسَهَا أَوْ قَتَلَ الْأَمَةَ أَجْنَبِيٌّ أَوْ مَاتَتْ

---

کەمترەکە بدا: لە کرێی هاوێنەی کۆیلەکەو لە هەموو مارەیی و بەخێوکردنەکە (وَقِيلَ يَلْزَمُهُ الْمَهْرُ وَالنَّفَقَةُ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: مارەیی و بەخێوکردنەکەی لە سەر واجب دەبێ.

(وَلَوْ نَكَحَ فَاسِداً وَوَطِئَ) ئەگەر کۆیلەکە بە مارەبڕینێکی نادروست ژنی هێناو جیماعیشی کرد، ئەو کاتە (فَمَهْرُ مِثْلٍ فِي ذِمَّتِهِ) مارەیی هاوێنە دەبێتە قەرز لە ئەستۆی کۆیلەکەدا: هەرکاتێك ئازاد بوو داوای لێدەکا (وَفِي قَوْلٍ فِي رَقَبَتِهِ) لە فەرموودەیەکدا: لە گەردەنیدا واجب دەبێ، واتە: هەر ئێستا کۆیلەکە بۆ مارەییەکە بفرۆشرێ.

(وَإِذَا زَوَّجَ أَمَتَهُ) هەر کاتێك گەورەکە جاریەکەی خۆی لە پیاوێك مارە کرد، ئەوە (اسْتَخْدَمَهَا نَهَارًا) بە ڕۆژێ خزمەتی خۆی پێدەکاو (وَسَلَّمَهَا لِلزَّوْجِ لَيْلًا) بە شەوێش تەسلیمی مێردەکەی دەکا تاکو لەزەتی لێوەربگرێ (وَلَا نَفَقَةَ عَلَى الزَّوْجِ حِينَئِذٍ فِي الْأَصَحِّ) بەخێوکردنی ئەو جاریەیە لە سەر مێردەکەی نیە لەو کاتەی تەنها شەوێ تەسلیمی دەکرێ، بەڵام ئەگەر بە شەو و بە ڕۆژ تەسلیمی بکرێ ئەو کاتە بەخێوکردنی لە سەر مێردەکەیەتی.

(وَلَوْ أَخْلَى فِي دَارِهِ بَيْتًا) ئەگەر گەورەکە لە خانووی خۆی ژوورێکی چۆڵ کردو (وَقَالَ لِلزَّوْجِ تَخْلُو بِهَا فِيهِ) بە مێردەکەی گوت: وەرە لەم ژوورە لەگەڵ جاریەکە بمێنەوە، ئەوە (لَمْ يَلْزَمْهُ فِي الْأَصَحِّ) لە سەر مێردەکە واجب نابێ بەقسەی بکا، چونکە شەرمو پیاوەتی ڕێگای نادەن (وَلِلسَّيِّدِ السَّفَرُ بِهَا) بۆ گەورەکە دروستە: جاریەکە لەگەڵ خۆیا بباتە سەفەر، هەم (وَلِلزَّوْجِ صُحْبَتُهَا) بۆ مێردەکەش دروستە: لەگەڵیا بڕواتە سەفەر تاکو لەزەتی لێوەربگرێ.

(وَالْمَذْهَبُ أَنَّ السَّيِّدَ لَوْ قَتَلَهَا أَوْ قَتَلَتْ نَفْسَهَا قَبْلَ دُخُولٍ) ئەگەر پێش جیماعکردن: گەورەکە جاریەکەی بکوژێ، یان جاریەکە بەخۆی خۆی بکوژێ، ئەوە (سَقَطَ مَهْرُهَا) مارەییەکەی لە سەر مێردەکەی لادەچێ، هەروەها ئەگەر پێش جیماعکردن ژنێکی ئازاد مێردی خۆی بکوژێ، ئەوەش مافی هیچ مارەییی نیە، هەروەك لە (نهاية)و (مغنى)دا فەرموویانە، بەڵام (وَأَنَّ الْحُرَّةَ لَوْ قَتَلَتْ نَفْسَهَا) ئەگەر ژنێکی ئازاد -پێش جیماعکردن- بەخۆی خۆی بکوژێ (أَوْ قَتَلَ الْأَمَةَ أَجْنَبِيٌّ أَوْ مَاتَتْ) یان بێگانەیەك جاریەکەی کوشت،

فَلاَ، كَمَا لَوْ هَلَكَتَا بَعْدَ دُخُولٍ، وَلَوْ بَاعَ مُزَوَّجَةً فَالْمَهْرُ لِلْبَائِعِ فَإِنْ طُلِّقَتْ قَبْلَ دُخُولٍ فَنِصْفُهُ لَهُ، وَلَوْ زَوَّجَ أَمَتَهُ بِعَبْدِهِ لَمْ يَجِبْ مَهْرٌ.

## (كِتَابُ الصَّدَاقِ)

---

يان بەخۆی مرد (فَلاَ) مارەییەکە لە سەر مێردەکە لاناچێ (كَمَا لَوْ هَلَكَتَا بَعْدَ دُخُولٍ) هەروەك ئەگەر ژنە ئازادەکە، یان جاریەکە لە دوای جیماعکردن بمرێ بە هیچ جۆرێك مارەییەکە لاناچێ، کەوابو: مارەیی جاریەکە بۆ گەورەکەیەتی.

(وَ) هەروەها (لَوْ بَاعَ مُزَوَّجَةً) ئەگەر گەورەکە (جاریة)کی مارەبڕاوی فرۆشت (فَالْمَهْرُ لِلْبَائِعِ) ئەو کاتەش مارەییەکەی هەر بۆ فرۆشیارەکەیە: کە گەورەکەیەتی، جیاوازی نیە: جیماعی لەگەڵ کرابێ، یان نا (فَإِنْ طُلِّقَتْ قَبْلَ دُخُولٍ) ئەگەر (جاریة)کە پێش جیماعکردن تەلاق درا، ئەوە (فَنِصْفُهُ لَهُ) نیوەی مارەیی بۆ گەورەکەیە (وَلَوْ زَوَّجَ أَمَتَهُ بِعَبْدِهِ) ئەگەر گەورەکە جاریەکەی خۆی لەکۆیلەکەی خۆی مارەبکا، ئەوە (لَمْ يَجِبْ مَهْرٌ) هیچ مارەیی لە سەر کۆیلەکە واجب نابێ‌و، بەخێوکردنی هەردووکێشیان لە سەر گەورەکەیە.

### ﴿ كِتَابُ الصَّدَاقِ: **ئەمەیە پەرتوکی مارەیی ژن** ﴾

واتە: ئەو شتەی بۆ ئافرەت لە سەر پیاو واجب دەبێ: بە هۆی مارەبڕین، یان بە هۆی جیماعکردنی بە هەڵە، یان جیماعی بە زۆرداری. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَآتُوا النِّسَاءَ صَدُقَاتِهِنَّ نِحْلَةً فَإِنْ طِبْنَ لَكُمْ عَنْ شَيْءٍ مِنْهُ نَفْساً فَكُلُوهُ هَنِيئاً مَرِيئاً﴾ بە دڵخۆشی مارەیی ئافرەتان بدەنە ئافرەتەکان، جا ئەگەر ئافرەتەکان لە شتێکی‌مارەیی چاوپۆشییان لە ئێوە کرد، ئێوەش بیخۆن نۆشی گیانتان بێ.

کەواتە: بە بەڵگەی ئەم ئایەتە: ئەگەر ژنەکە بالغو عاقڵ بێ، دروستە: گەردەنی‌مێردەکەی ئازاد بکا: لە هەموو مارەییەکەی، یان لە بەشێکی‌ی-بەو مەرجەی بزانێ مارەییەکەی چەندە- وەك بڵێ: (گەردەنت ئازاد بێ لە مارەییەکەم). یان (لە مارەییەکەم لێم بووردی). هەروەك لە (فتح المعین)دا ڕوون کراوەتەوە،

بەڵام ئاگاداربە: ئەگەر مارەیی ژنەکە زەکاتی تێدا واجب بوبێ‌و ساڵێك، یان زیاتری بە سەردا سوڕابۆوەو زەکاتی مارەییەکەشی نەدابو، ئەو کاتە-تەنها- لە ئەندازەی زەکات گەردەنی ئازاد نابێ‌و واجبە: ژنەکە زەکاتەکەی‌ڕابردووی مارەییەکەی بدا، هەروەك لە (زەکاتی‌مارەیی ژن)دا ڕوونمان کردەوە.

هەروەها دروستە: ژنەکە لەگەڵ مێردەکەی پێك بێ‌و لەجیاتی مارەییەکەی شتێکی‌تری کەمتر، یان زۆرتر لە مێردەکەی وەربگرێ، بەڵام ئاگاداربە: ئەگەر مارەییەکەی زێڕ، یان زیو بوو و لەجیاتی زێڕو زیوەکەش پارەی ئەم سەردەمەی لە مێردەکەی وەرگرت، ئەوە

مەرجە: پارەكە لە دانيشگەى پێكهاتنەكەدا وەربگرێ، ئەگينا: دەبێتە ڕيبا، بەڵام ئەگەر وەرگيراوەكە پارە نەبو، بەڵكو شتێكى‌تر بوو، ئەو كاتە تەنها قبوڵكردن مەرجە، واتە: وەرگتن مەرج نيە، هەروەك لە (كتاب البيع، لە باسى گۆڕينەوەى‌قەرز)دا ڕوونمان كردەوە.

ئينجا بزانە: پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿خَيْرُالصَّدَاقِ أَيْسَرُهُ﴾ صححه الحاكم، باشترين مارەيى ئاسانترەكەيەتى لە سەر مێردەكە. هەروەها ئيمامى(عمرﷺ) فەرمووى: ﴿أَلاَ لاَ تُغَالُوا بِصَدَاقِ النِّسَاءِ فَإِنَّهَا لَوْ كَانَتْ مَكْرُمَةً فِي الدُّنْيَا أَوْ تَقْوَى عِنْدَاللهِ تعالى كَانَ أَوْلاَكُمْ بِهَا النَّبِيُّﷺ مَا أَصْدَقَ رَسُولُ اللهِﷺ امْرَأَةً مِنْ نِسَائِهِ وَلاَ أُصْدِقَتْ إِمْرَأَةٌ مِنْ بَنَاتِهِ أَكْثَرَ مِنْ ثِنْتَيْ عَشَرَةَ أُوقِيَّةً﴾ رواه أصحاب السنن بسند صحيح، ئاگادارين: مارەيى زۆر بۆ ژنان دامەنێن، چونكە ئەگەر مارەيى‌زۆر ڕێزدارى بايە لەو دونيايەدا، يان لە خواترسان بايە، ئەوە پێغەمبەرﷺ لە هەمووتان لەپێشتر بوو مارەيى‌زۆر دابنێ، لەگەڵ ئەوەشدا مارەيى ژنەكانى پێغەمبەروﷺ مارەيى كيژەكانى پێغەمبەرﷺ لە دوانزە ئۆقيە زياتر نەبو، واتە: نزيكەى پێنجسەد ديرهەمى زيو، كە دەكاتە (٣٥٠) سێسەدو پەنجا ميسقالى زيو.

ئينجا بزانە: ئەگەر مێردەكە بمرێ‌و مارەيى‌ژنەكەى نەدابێ، ئەوە واجبە: لە ميراتى مردووەكە-پێش بەشكردنى‌ميرات- مارەيى‌ژنەكە بدرێ، هەروەك لە سەرەتاى ميراتدا ڕوونمان كردەوە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿نَفْسُ الْمُؤْمِنِ مُعَلَّقَةٌ بِدَيْنِهِ حَتَّى يُقْضَى عَنْهُ﴾ حديث صحيح رواه الترمذي، گيانى مرۆڤى ئيماندار بە هۆى قەرزەكەى قەدەغە دەكرێ لە چوونە بەهەشت تا قەرزەكەى لەجياتى دەدرێتەوە.

(يُسَنُّ تَسْمِيَتُهُ فِي الْعَقْدِ) سوننەتە لە ناو مارەبڕينەكەدا ناوى مارەييەكە بگوترێ، چونكە پێغەمبەرﷺ لە ناو مارەبڕيندا ناوى مارەيى دەهێنا، بەڵام (وَيَجُوزُ إِخْلاَؤُهُ مِنْهُ) دروستە مارەبڕينەكە ناوبردنى مارەييەكەى تێدا نەبێ، بە (إجماع)ى زانايانى‌ئيسلام، بەڵام ناپەسندە، كەواتە: ئەگەر لە ناو مارەبڕينەكەدا ناوى مارەييەكەى نەگوترا، ئەو كاتە مارەبڕينەكە دروست دەبێ‌و هەم بە خودى مارەبڕينەكەش مارەيى هاوێنە بۆ ژنەكە لە سەر مێردەكەى واجب دەبێ، هەروەك لە (الإقناع)دا فەرموويەتى.

﴿عَنْ عَلْقَمَةَ عن ابن مسعودﷺ وَقَدْ سُئِلَ عَنْ رَجُلٍ تَزَوَّجَ امْرَأَةً وَلَمْ يَفْرِضْ لَهَا صَدَاقاً وَلَمْ يَدْخُلْ بِهَا حَتَّى مَاتَ؟ فَقَالَ: لَهَا مِثْلُ صَدَاقِ نِسَائِهَا لاَ وَكْسَ وَلاَ شَطَطَ وَلَهَاالْمِيرَاثُ وَعَلَيْهَا الْعِدَّةُ، فَقَالَ مَعْقِلٌ الأَشْجَعِيﷺ: قَضَى رَسُولُ اللهِﷺ فِي بَرْوَعَ بِنْت واشِقٍ مِثْلَ الَّذِي قَضَيْتَ﴾ رواه اصحاب السنن بسند صحيح، لەبارەى پياوێك كە ژنێكى لە خۆى مارە كردبو، هيچ مارەييى بۆ دانەنابو و جيماعيشى لەگەڵ نەكردبو و مێردەكە مرد؟ (ابن مسعود) فەرمووى:

وَمَا صَحَّ مَبِيعًا صَحَّ صَداقًا، وَإِذَا أَصْدَقَهَا عَيْنًا فَتَلفَتْ فِي يَدِهِ ضَمِنَهَا ضَمَانَ عَقْدٍ، وَفِي قَوْلٍ ضَمَانَ يَدٍ، فَعَلَى الأَوَّلِ لَيْسَ لَهَا بَيْعُهُ قَبْلَ قَبْضِهِ،

---

ژنەکە مافی مارەییهاووێنەی ئافرەتانیخۆی هەیە-بێ کەم و زیاد- میراتیش لە مێردەکەی دەگرێو (عِدَّة)ی مێرد مردنیشی لە سەرە. ئینجا (صحابة)یەك فەرمووی: پێغەمبەرﷺ لەبارەی (بَرْوَع)ی کیژی (واشق) ئەوها بڕیاری دابو.

واتە: ئەگەر مارەبڕینەکە دروست نەبووایە، بە هۆی مردن مارەییەکەی جێگیر نەدەبو و میراتیشی لە مێردەکەی نەدەگرت.

ئینجا بزانە: بۆ ئەوەی مارەیی ناوبراو لە سەر مێردەکەی واجب ببێ، مەرجە: لە هەردوو گوتەی مارەبڕینەکەدا ناوی مارەییەکە بگوترێ، وەك سەرپەرشتکارەکە بڵێ: (فلانە کیژی خۆم کردە ژنی تۆ لە سەر ئەوەندە مارەییە). ئینجا مێردەکەش قبوڵ بکاو بڵێ: (قبوڵم کرد فلانەکیژەی تۆ بە ژنی خۆم لە سەر ئەوەندە مارەییە). کەوابو: ئەگەر مێردەکە ئەوها قبوڵ نەکا، ئەو کاتە مارەییهاووێنە لە سەر مێردەکە واجب دەبێ، نەك ناوبراوەکە، هەروەك لە (تحفة)و(مغني)دا لە سەرەتایڕوکنەکانیمارەبڕیندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَمَا صَحَّ مَبِيعًا) هەر شتێك دروست ببێ بفرۆشرێ، یان بکرێتە پارەی فرۆشراو، ئەوە (صَحَّ صَدَاقًا) دروست دەبێ: بکرێتە مارەیی، هەرچەند کەمیش بێ ﴿عن عامر بن ربيعةﷺ: أَنَّ امْرَأَةً تَزَوَّجَتْ عَلَى نَعْلَيْنِ فَأَجَازَهُ النَّبِيُّﷺ﴾ رواه الترمذي وصححه، ئافرەتێك لە سەر جووتە نەعلێك مێردی کرد، پێغەمبەرﷺ مارەبڕینەکەی بە دروستبوو دانا. هەم پێغەمبەرﷺ فەرموویە پیاوێك: ﴿الْتَمِسْ وَلَوْ خَاتَماً مِنْ حَدِيدٍ﴾ رواه الشيخان، هەوڵ بدە هەرچەند ئەنگوستیلەیەکی ئاسنیش بێ بۆ مارەییژنەکەت پەیدای بکە.

(وَإِذَا أَصْدَقَهَا عَيْنًا) هەر کاتێك شتێکی دیارکراوی کردە مارەیی ژنەکەی: وەك ئەو باغە، یان ئەم خانووە (فَتَلِفَتْ فِي يَدِهِ) شتەکەش لە دەستیمێردەکەدا -پێش ئەوەی ژنەکە وەریبگرێ- فەوتا، ئەوە (ضَمِنَهَا ضَمَانَ عَقْدٍ) مێردەکە دەبێتە زامینی مارەییەکە بە زامینیی مامڵەتبەستن، واتە: مارەیی هاووێنەی دەکەوێتە سەر، هەرچەند بە ژنەکەشی گوتبێ: ئەمە مارەییەکەتە وەریبگرە. ژنەکەش بە ڕقەکاری وەرینەگرتبێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندافەرموویانە (وَفِي قَوْلٍ ضَمَانَ يَدٍ) لە فەرموودەیەکدا: بەزامینیی دەست دەبێتە زامین، واتە: وێنەی مارەییەکەی دەکەوێتەسەر، جا ئەگەر وێنەی نەبو: نرخەکەی دەکەوێتە سەر.

(فَعَلَى الأَوَّلِ) جا لە سەر فەرموودەیەکەمیبەهێزتر: (لَيْسَ لَهَا بَيْعُهُ) بۆ ژنەکە دروست نیە: مارییە دیارکراوەکەی بفرۆشێ (قَبْلَ قَبْضِهِ) پێش وەرگرتنی، هەروەها هیچ

وَلَوْ تَلفَ فِي يَده وَجَبَ مَهْرُمثْلٍ، وَإنْ أتْلَفَتْهُ فَقَابضَةٌ، وَإنْ أتْلَفَـهُ أجْنَبـيٌّ تَخَيَّـرَتْ عَلَى الْمَذْهَب: فَإنْ فَسَخَت الصَّدَاقَ أخَذَتْ منَ الزَّوْجِ مَهْرَمثْلٍ وَإلاَّ غَرَّمَت الْمُتْلـفَ، وَإنْ أتْلَفَهُ الزَّوْجُ فَكَتَلَفه وَقيلَ كَأجْنَبيٍّ، وَلَوْ أصْدَقَ عَبْدَيْنِ فَتَلفَ أحَدُهُمَا قَبْلَ قَبْضِـهِ انْفَسَخَ فِيهِ لاَ فِي الْبَاقِي عَلَى الْمَذْهَب وَلَهَا الْخيَارُ: فَإنْ فَسَخَتْ فَمَهْرُ مثْلٍ،

---

دەسـتكاريەكى‌تريش لـە مارەيـيـە وەرنەگيراوەكـەدا بـۆى دروسـت نيـە، بـەڵام لـە فەرموودەكەى‌تردا دروستە، هەروەك لە (مغنى)دا فەرموويەتى، هـەروەها ئەگـەر مارەييەكـەى قـەرز بـێ، ئـەو كاتـە دروسـتە شـتێكى‌تر لـەجياتىى وەربگـرێ، هـەروەك لـە زۆربـەى سەرچاوەكاندا فەرموويانەو لە سەرەتاى ئەم باسەدا ڕوونمان كردەوە.

(وَلَوْ تَلفَ فِي يَدِهِ) جا ئەگەر مارەييە دياركراوەكە لەخۆيـەوە لـە دەستى‌مێردەكەدا فـەوتا (وَجَبَ مَهْرُ مثْلٍ) مارەيى هاوێنە لە سەر مێردەكە بۆ ژنەكە واجب دەبێ، هەروەك ڕابرا.

بـەڵام (وَإنْ أتْلَفَتْـهُ) ئەگـەر ژنێكى بالغـەو عاقلـە بـەخۆى مارەييەكـەى -پـێش وەرگـرتن- فەوتاند، ئەوە (فَقَابِضَةٌ) وا بڕيار دەدرێ مارەييەكەى وەرگرتوەو مێردەكـەش مارەييەكـەى لە سەر لادەچێ.

(وَإنْ أتْلَفَـهُ أجْنَبِـيٌّ) ئەگـەر بێگانەيـەك مارەييەكـەى -پـێش وەرگـرتن- فـەوتانـد، ئـەو كاتـە (تَخَيَّـرَتْ عَلَى الْمَـذْهَبِ) ژنەكـە لـەو دوو مافـەى‌داهاتوودا سەرپشـكە لـە سـەر فـەرموودەى ڕاستى‌مەزهەب: (فَإنْ فَسَخَتِ الصَّدَاقَ) جا ئەگـەر مارەييەكـەى هەڵوەشـاندەوە (أخَـذَتْ مِـنَ الـزَّوْجِ مَهْرَمِثْـلٍ) ئـەوە مـارەيى هاوێنـە لـە مێردەكـەى وەردەگـرێ، مێردەكـەش تۆڵـەى فەوتاوەكە لە فەوتێنەرەكە وەردەگرێ (وَإلاَّ) بەڵام ئەگەر هەڵنەوەشاندەوە ئەو كاتە (غَرَّمَـتِ الْمُتْلفَ) يەكسەر ژنەكە تۆڵەى مارەييەكەى لە فەوتێنەرەكە وەردەگرێ.

(وَإنْ أتْلَفَهُ الزَّوْجُ) ئەگەر مێردەكە مارەييەكەى -پـێش وەرگـرتن- فـەوتانـد، ئـەوە (فَكَتَلَفِـهِ) وەك لەخۆيەوە فەوتابێ ئەوهايە، كەواتە: مارەيى هاوێنە لـە سـەر مێردەكـە واجـب دەبـێ (وَقِيـلَ كَـأجْنَبِيٍّ) لـە فەرموودەيـەكى بـێ‌هێزدا: وەك فەوتانـدنى بێگانەيـە، واتـە: ژنەكـە سەرپەشكە لەو دوو مافانەى‌ڕابردوودا.

(وَلَوْ أصْدَقَ عَبْدَيْنِ) بۆ وێنە: ئەگەر دوو كۆيلە، يان دوو مەڕى كردبە مارەيى‌ژنەكەى (فَتَلِـفَ أحَدُهُمَا قَبْلَ قَبْضِهِ) ئينجا يەكێكيان -پـێش وەرگـرتن- لەخۆيـەوە فـەوتا، يـان مێردەكـە فەوتاندى، ئـەوە (انْفَسَـخَ فِيـهِ) مارەييەكـە -تـەنها- لـە فەوتاوەكـەدا هەڵدەوەشێـەوە (لاَ فِي الْبَاقِي عَلَى الْمَذْهَبِ) نەك لەوەى ماوەتەوە، لە سەر فەرموودەى ڕاستى مەزهەب، كەوابو: (وَلَهَا الْخيَارُ) ژنەكە مافى‌سەرپشكى‌ى هەيە لەوەى ماوەتەو: (فَإنْ فَسَخَتْ فَمَهْرَمِثْـلٍ) ئەگـەر مارەييەكـەى هەڵوەشـاندەوە، ئـەوە مـارەيى هاوێنـە لـە سـەر مێردەكـەى واجـب دەبـێ

وَإِلاَّ فَحِصَّةُ التَّالِف مِنْهُ، وَلَوْ تَعَيَّبَ قَبْلَ قَبْضِهِ تَخَيَّرَتْ عَلَى الْمَذْهَب: فَإِنْ فَسَخَتْ فَمَهْرُ مِثْلٍ وَإِلاَّ فَلاَ شَيْءَ لَهَا، وَالْمَنَافِعُ الْفَائِتَةُ فِي يَدِ الزَّوْجِ لاَ يَضْمَنُهَا وَإِنْ طَلَبَت التَّسْلِيمَ فَامْتَنَعَ عَلَى ضَمَانِ الْعَقْد، وَكَذَا الَّتِي اسْتَوْفَاهَا بِرُكُوبٍ وَنَحْوِه عَلَى الْمَذْهَب،

---

(وَإِلاَّ) بەلاَم ئەگەر هەڵینەوەشاندەوە، ئەوە (فَحِصَّةُ التَّالِف مِنْهُ) لەگەڵ ئەوەی ماوەتەوە بەشی فەوتاوەکەشی لە مارەیی‌هاوویْنە لە سەر میْردەکەی هەیە.

ئینجا بزانە: ئەگەر ژنەکە بەخۆی-پێش وەرگرتن- یەکێکیان بفەوتێنێ، ئەوە وا بڕیار دەدرێ ئەو بەشە مارەییەی وەرگرتوەو میْردەکەش ئەو بەشە مارەییەی لە سەر لادەچێ، بەلاَم ئەگەر بێگانەیەك یەکێکیان بفەوتێنێ، ئەو کاتەش ژنەکە سەرپشکە لە دوو مافەکانی‌ڕابردوودا.

(وَلَوْ تَعَيَّبَ قَبْلَ قَبْضِهِ) ئەگەر مارەییەکە-پێش وەرگرتن- عەیبێکی لێ پەیدا بوو: لەخۆیەوە، یان بە دەستی میْردەکە، یان بە دەستی بیگانە، ئەو کاتەش (تَخَيَّرَتْ عَلَى الْمَذْهَبِ) ژنەکە سەر پشکە لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب: (فَإِنْ فَسَخَتْ فَمَهْرُمِثْلٍ) ئەگەر مارەییەکەی هەڵوەشاندەوە، ئەوە مارەیی هاوویْنە لە سەر میْردەکەی واجب دەبێ (وَإِلاَّ فَلاَ شَيْءَ لَهَا) بەلاَم ئەگەر هەڵینەوەشاندەوە، ئەو کاتە-جگە لە عەیبدارەکە- مافی هیچی‌تری نیە، بەلاَم ئەگەر بێگانە عەیبەکەی پەیدا کردبێ، ئەوە دەتوانێ تۆڵەی عەیبەکە لە بێگانەکە وەربگرێ.

ئینجا بزانە: ئەو زیدەییانەی-پێش وەرگرتن- لە مارەییەکە پەیدا دەبن، گشتی ملکی ژنەکەنەو ئەمانەتن لە لای میْردەکە، واتە: ئەگەر زیدەییەکان بفەوتێن میْردەکە نابێتە زامین، تەنها لەو حاڵەتەدا دەبێتە زامین: کە ژنەکەی داوای لێکردبێ‌و ئەویش تەسلیمی نەکردبێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە، مەبەستیش بە زێدەییەکان: خوری‌و بێچوو و میوەو هێلکەو...هتد.

بەلاَم (وَالْمَنَافِعُ الْفَائِتَةُ فِي يَدِ الزَّوْجِ) ئەو سودانەی مارەییەکە-کە پێش وەرگرتن- لە دەستی میْردەکەدا فەوتاون، واتە: سودەکانی لێوەرنەگیراون: وەك دانیشتن‌و سواری‌و...هتد، ئەوانە (لاَ يَضْمَنُهَا وَإِنْ طَلَبَتِ التَّسْلِيمَ فَامْتَنَعَ) میْردەکە نابێە زامینی ئەو سودانە، هەر چەند ژنەکەش داوای تەسلیمکردنی لێکردبێ‌و میْردەکەش تەسلیمی نەکردبێ، جا ئەو زامین نەبوونەش (عَلَى ضَمَانِ الْعَقْدِ) لە سەر فەرموودەی زامینی مامڵەت بەستنی‌ڕابردووە: کە بەهێزترەکەیە (وَكَذَا الَّتِي اسْتَوْفَاهَا) هەروەها میْردەکە نابێتە زامینی ئەو سودانەش کە بەخۆی لە مارەییەکە وەری‌گرتون (بِرُكُوبٍ وَنَحْوِهِ) بە هۆی سواری‌و شتی وەکو سواری: وەك دانیشتن‌و دەبەرکردن (عَلَى الْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب.

وَلَهَا حَبْسُ نَفْسِهَا لِتَقْبِضَ الْمَهْرَ الْمُعَيَّنَ وَالْحَالَّ لاَ الْمُؤَجَّلَ، فَلَوْ حَلَّ قَبْلَ التَّسْلِيمِ فَلاَ حَبْسَ فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ قَالَ كُلٌّ: لاَ أُسَلِّمُ حَتَّى تُسَلِّمَ. فَفِي قَوْلٍ يُجْبَرُ هُوَ وَفِي قَوْلٍ لاَ إِجْبَارَ فَمَنْ سَلَّمَ أُجْبِرَ صَاحِبُهُ، وَالأَظْهَرُ يُجْبَرَانِ فَيُؤْمَرُ بِوَضْعِهِ عِنْدَ عَدْلٍ وَتُؤْمَرُ بِالتَّمْكِينِ، فَإِذَا سَلَّمَتْ أَعْطَاهَا الْعَدْلُ الْمَهْرَ، وَلَوْ بَادَرَتْ فَمَكَّنَتْ طَالَبَتْهُ، فَإِنْ لَمْ يَطَأْ امْتَنَعَتْ حَتَّى يُسَلِّمَ،

---

(وَلَهَا حَبْسُ نَفْسِهَا) بۆ ژنەکە دروستە: خۆی تەسلیمی مێردەکەی نەکا (لِتَقْبِضَ الْمَهْرَ الْمُعَيَّنَ) بۆ ئەوەی هەموو مارەییە دیارکراوەکەی وەربگرێ، هەم (وَالْحَالَّ) بۆ ئەوەی هەموو ئەو مارەییە وەربگرێ کە دیار نەکراوەو لە ئەستۆی مێردەکەدا بە حازر داندراوەو کاتی دانی هاتوە: وەك بە نۆزدە میسقال زێڕی حازر مارەی بکا (لاَ الْمُؤَجَّلَ) نەك بۆ وەرگرتنی مارەییەکەی قەرز، واتە: ئەگەر مارەییەکەی بە قەرز داندرابو تا کاتێکی دیارکراو، ئەو کاتە بۆی دروست نیە: تەسلیمی مێردەکەی نەبێ.

(فَلَوْ حَلَّ قَبْلَ التَّسْلِيمِ) جا ئەگەر مارەییە قەرزەکە کاتی دانی هات پێش ئەوەی خۆی تەسلیم بکا، ئەو کاتەش (فَلاَ حَبْسَ) بۆی دروست نیە خۆی گیر بکاو تەسلیمی مێردەکەی نەبێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی راستتردا.

(وَلَوْ قَالَ كُلٌّ) ئەگەر ژنەکەو مێردەکە هەردووکیان گوتیان: (لاَ أُسَلِّمُ حَتَّى تُسَلِّمَ) تەسلیم ناکەم تا تۆ تەسلیم نەکەی (فَفِي قَوْلٍ يُجْبَرُ هُوَ) لە فەرموودەیەکدا: مێردەکە زۆری لێدەکرێ (وَفِي قَوْلٍ لاَ إِجْبَارَ) لە فەرموودەیەکدا هیچێکیان زۆری لێناکرێ، بەڵکو (فَمَنْ سَلَّمَ أُجْبِرَ صَاحِبُهُ) کامەیان تەسلیمی کرد، هاوسەرەکەشی زۆری لێدەکرێ، بەڵام (وَالأَظْهَرُ) بە فەرموودەی بەهێزتر: (يُجْبَرَانِ) هەردووکیان زۆریان لێدەکرێ: (فَيُؤْمَرُ بِوَضْعِهِ عِنْدَ عَدْلٍ) مێردەکە فەرمانی پێدەکرێ مارییەکە لە لای دادپەروەرێك دابنێ‌و (وَتُؤْمَرُ بِالتَّمْكِينِ) ژنەکەش فەرمانی پێدەکرێ خۆی بگونجێنێ بۆ مێردەکەی (فَإِذَا سَلَّمَتْ) جا هەر کاتێك خۆی تەسلیمی مێردەکەی کرد (أَعْطَاهَا الْعَدْلُ الْمَهْرَ) دادپەروەرەکە مارەییەکەی دەداتێ، هەر چەند مێردەکەش جیماعی لەگەڵ نەکردبێ، بەو مەرجە ژنەکە خۆی لێ قەدەغە نەکردبێ، واتە: ئەگەر ژنەکە ڕێگای نەدا جیماعی لەگەڵ بکا، ئەو کاتە مارەییەکەی لێوەردەگیرێتەوە، هەروەك لە زۆربەی‌سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلَوْ بَادَرَتْ فَمَكَّنَتْ) ئەگەر ژنەکە پەلەی کردو پێشدا خۆی گونجاند بۆ مێردەکەی، ئەو کاتە (طَالَبَتْهُ) ژنەکە داوای مارەییەکەی لە مێردەکە دەکا، جا ئەگەر مارەییەکەی نەدایێ، ئەو کاتە تەماشا دەکەین: (فَإِنْ لَمْ يَطَأْ) ئەگەر مێردەکە جیماعی لەگەڵ نەکرد، ئەو کاتە (امْتَنَعَتْ حَتَّى يُسَلِّمَ) بۆ جارێکی‌تر ژنەکە خۆی لێقەدەغە دەکا تا مارەییەکەی

وَإِنْ وَطِئَ فَلاَ، وَلَوْ بَادَرَ فَسَلَّمَ فَلْتُمَكِّنْ، فَإِنْ امْتَنَعَتْ بِلاَ عُذْرٍ اسْتَرَدَّ إِنْ قُلْنَا إِنَّهُ يُجْبَرُ، وَلَوْ إِسْتَمْهَلَتْ لِتَنَظُّف وَنَحْوِه أُمْهِلَتْ مَا يَرَاهُ قَاضٍ، وَلاَ يُجَاوِزُ ثَلاَثَةَ أَيَّام، لاَ لِيَنْقَطِعَ حَيْضٌ، وَلاَ تُسَلَّمُ صَغِيرَةٌ وَلاَ مَرِيضَةٌ حَتَّى يَزُولَ مَانِعُ وَطْء، وَيَسْتَقِرُّ الْمَهْرُ بِوَطْء

---

تەسلیم دەكا، بەڵام (وَإِنْ وَطِئَ) ئەگەر بەو گونجاندنە جیماعی لەگەڵ كرد (فَلاَ) بۆ جارێكیتر بۆی دروست نیە خۆی لێقەدەغە بكا، چونكە بەم جیماعە مافی خۆقەدەغەكردنی لە دەست دەچێ.

(وَ) هەروەها (لَوْ بَادَرَ فَسَلَّمَ) ئەگەر مێردەكە پەلەی كردو پێشدا مارەییەكەی تەسلیمی ژنەكەی كرد (فَلْتُمَكِّنْ) واجبە ژنەكەش خۆی بۆ مێردەكەی بگونجێنێ (فَإِنْ امْتَنَعَتْ بِلاَ عُذْرٍ) جا ئەگەر ژنەكە بە بێعوزر خۆی قەدەغە كرد لە مێردەكەی، ئەو كاتە (اسْتَرَدَّ) مێردەكە مارەییەكەی لێوەردەگرێتەوە (إِنْ قُلْنَا إِنَّهُ يُجْبَرُ) ئەگەر بە فەرموودەی بێهێز بڵێین: مێردەكە زۆری لێدەكرێ، بەڵام بە فەرموودەی راستتر: زۆری لێناكرێو مافی وەرگرتنەوەشی نیە، چونكە بەخۆشیخۆی تەسلیمی كردوە.

ئینجا بزانە: شوێنی خۆ تەسلیمكردنی ژنەكە ماڵی مێردەكەیەتی، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندافەرموویانە.

(وَلَوْ إِسْتَمْهَلَتْ) ئەگەر ژنەكە، یان سەرپەرشتكارەكەی داوای كرد مۆڵەتی بدرێ (لِتَنَظُّفٍ وَنَحْوِهِ) بۆ خۆپاككردنەوەو شتی وەها: وەك لابردنی چڵكو موو، ئەوە (أُمْهِلَتْ مَا يَرَاهُ قَاضٍ) بە واجبی مۆڵەتی دەدرێتێ ئەوەندەی قازی ڕەئی لە سەرە: وەك ڕۆژێك، یان دوو ڕۆژ، بەڵام (وَلاَ يُجَاوِزُ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ) نابێ مۆڵەتەكە لە سێ ڕۆژ و شەو زیاتر بێ، هەم (لاَ لِيَنْقَطِعَ حَيْضٌ) نابێ بۆ وەستانی حەیز مۆڵەتی بدرێتێ، چونكە حەیزداریش هەندێك لەزەتی لێوەردەگیرێ (وَلاَ تُسَلَّمُ صَغِيرَةٌ) ژنێكی بچوك-كە بەروەستی جیماع نەكا- دروست نیە تەسلیمی مێردەكەی بكرێ، هەم (وَلاَ مَرِيضَةٌ) ژنێكی نەخۆش، یان زۆر لاواز-كە بە جیماعكردن تووشی زیان ببێ- نابێ تەسلیمی مێردەكەی بكرێ (حَتَّى يَزُولَ مَانِعُ وَطْءٍ) تا ڕێگری جیماع لادەچێ.

### ﴿ جێگیربوونی مارەیی لە سەر مێردەكە ﴾

بزانە: مارەییەكە ناوبراو بێ، یان مارەیی هاوێنە بێ، بە دوو شت هەمووی لە سەر مێردەكە جێگیر دەبێو واجبە بە تەاوی بیداتە ژنەكە:

**یەكەم:** (وَيَسْتَقِرُّالْمَهْرُ بِوَطْءٍ) هەموو مارەیی لە سەر مێردەكە جێگیر دەبێ بە جیماعكردن لە گەڵ ژنەكە: وەك ئەندازەی سەری ئەندامەكەیخۆی بباتە ناو ئەندامی ژنەكە، هەرچەند كچێنیشی لانەچێ، هەروەك لە(تحفة)دا فەرموویەتی.

وَإِنْ حَـــرُمَ كَحَـــائِض، وَبِمَـــوْتِ أَحَـــدِهِمَا، لاَ بِخَلْـــوَةٍ فِيالْجَدِيـــد. (فَصْلٌ) نَكَحَهَا بِخَمْرٍ أَوْ حُرٍّ أَوْ مَغْصُوبٍ وَجَبَ مَهْرُالْمِثْلِ، وَفِـــي قَـــوْلٍ قِيمَتُـــهُ، أَوْ بِمَمْلُوكٍ وَمَغْصُوبٍ بَطَلَ فِيهِ وَصَحَّ فِيالْمَمْلُوكِ فِيالأَظْهَرِ،

---

(وَإِنْ حَرُمَ) هەرچەند جیماعەکەش حەرام بێ: (كَحَائِضٍ) وەك جیماعیحەیزدار، یان لە کونی پشتەوەدا جیماعی لەگەڵ بکا، جا ئەگەر لە دوای جیماعکردن ژنەکەش تەڵاق بدا، یان مارەبڕینەکە هەڵبوەشێندرێتەوە، هیچی لە مارەییەکە لە سەر لا ناچێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە ﴿عَنْ بصرةالأنصاريﷺ: تَزَوَّجْتُ إِمْرَأَةً بِكْراً فَدَخَلْتُ عَلَيْهَا فَإِذَا هِيَ حُبْلَى، فَقَالَ النَّبِيُّﷺ: لَهَاالصَّدَاقُ بِمَا اسْتَحْلَلْتَ مِنْ فَرْجِهَا...﴾ الحديث رواه ابوداود بسند صالح، ژنێك کچ بوو لەخۆم مارە کرد، ئینجا کە جیماعم لەگەڵ کرد زانیم ئاوسەو کچ نیە؟ جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ژنەکە تەواوی مارەیی لە سەر تۆ هەیە بە هۆی ئەو جیماعەی بە حەلالی لەگەڵت کردوە.

**دووەم**: (وَبِمَوْتِ أَحَدِهِمَا) بە مردنی یەکێکیان پێش جیماعکردن، واتە: ئەگەر تەنها ژنەکە بمرێ، یان تەنها مێردەکە بمرێ، تەواوی مارەییەکە لە سەر مێردەکە واجب دەبێ، هەرچەند جیماعیشی لەگەڵ نەکردبێ، بە بەڵگەی حەدیسەکەی (بروع بنت واشق)ی‌ڕابردوو لە سەرەتای ئەم باسەدا، جیاوازی نیە ژن‌و مێردەکە: هەردووکیان گەورە بن، یان منداڵ بن، بەڵام ئەگەر ژنەکە-پێش جیماعکردن- مێردەکەی خۆی بکوژێ، ئەو کاتە مارەییەکە لە سەر مێردەکە لا دەچێ، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.

(لاَ بِخَلْوَةٍ فِيالْجَدِيدِ)بەڵام بە لەگەڵدابوونی ژنەکە-کە بە تەنها بن- هەموو مارەیی واجب نابێ، لە فەرموودەی نوێدا، هەروەها بە لەزەتوەرگرتن‌و بە تێکردنی (مَنِي)ش هەموو مارەیی واجب نابێ، هەروەك لە(تحفه)دا فەرموویەتی.

**﴿ فَصْلٌ: لە باسی مارەیی دروست‌و نادروست ﴾**

(نَكَحَهَا بِخَمْرٍ) ژنەکەی لە خۆی مارەکرد: بە شەراب (أَوْ حُرٍّ) یان بە ئادەمیزادێکی ئازاد (أَوْ مَغْصُوبٍ) یان بەشتێکیزەوتکراو؛ یان بە هەر شتێکیتر کە ملکی خۆی نەبێ، ئەوانە هیچێکیان دروست نابن ببنە مارەیی، بەڵام مارەبڕینەکە دروست دەبێ‌و هەم (وَجَبَ مَهْرُ الْمِثْلِ) لەجیاتی مارەییە دروست نەبووەکەش مارەیی هاوێنە لە سەر مێردەکە واجب دەبێ بۆ ژنەکە (وَفِي قَوْلٍ قِيمَتُهُ) لە فەرموودەیەکدا: نرخی مارەییە دروست نەبووەکەی لە سەر واجب دەبێ.

(أَوْ بِمَمْلُوكٍ وَمَغْصُوبٍ) یان مارەی کرد بە شتێك کەملکیخۆی بوو لەگەڵ شتێکی زەوتکراویش، ئەوە (بَطَلَ فِيهِ) مارەییەکە لە زەوتکراوەکەدا بەتاڵ دەبێ‌و (وَصَحَّ فِي الْمَمْلُوكِ) لەوەش کە ملکیخۆیەتی دروست دەبێ (فِيالأَظْهَرِ) لەفەرموودەی بەهێزتردا،

وَتَتَخَيَّرُ: فَإِنْ فَسَخَتْ فَمَهْرُ مِثْلٍ، وَفِي قَوْلٍ قِيمَتُهُمَا، وَإِنْ أَجَازَتْ فَلَهَا مَعَ الْمَمْلُوكِ حِصَّةُ الْمَغْصُوبِ مِنْ مَهْرِمِثْلٍ بِحَسَبِ قِيمَتِهِمَا، وَفِي قَوْلٍ تَقْنَعُ بِهِ. وَلَوْ قَالَ: زَوَّجْتُكَ بِنْتِي وَبِعْتُكَ ثَوْبَهَا بِهَذَاالْعَبْدِ. صَحَّ النِّكَاحُ وَكَذَا الْمَهْرُ وَالْبَيْعُ فِيالأَظْهَرِ، وَيُوَزَّعُ الْعَبْدُ عَلَىالثَّوْبِ وَمَهْرِمِثْلٍ، وَلَوْ نَكَحَ بِأَلْفٍ عَلَى أَنَّ لأَبِيهَا أَوْ أَنْ يُعْطِيَهُ أَلْفاً فَالْمَذْهَبُ فَسَادُالصَّدَاقِ وَوُجُوبُ مَهْرِ الْمِثْلِ،

---

كەوابو: (وَتَتَخَيَّرُ) ژنەكە سەر پشكە: (فَإِنْ فَسَخَتْ) جا ئەگەر مارەييەكەی هەڵوەشاندەوە، ئەوە (فَمَهْرُ مِثْلٍ) مارەيی هاووێنەی بۆ لە سەر مێردەكە واجب دەبێ (وَفِي قَوْلٍ قِيمَتُهُمَا) لە فەرموودەيەكیشدا نرخی هەردووكيان واجب دەبێ، بەلاّم (وَإِنْ أَجَازَتْ) ئەگەر مارەييەكەی ڕۆياندو هەڵنیەوەشاندەوە، ئەوە (فَلَهَا مَعَ الْمَمْلُوكِ) ژنەكە لەگەڵ ئەوەی بەشە مارەييەكەی ملكی مێردەكەی هەيە (حِصَّةُ الْمَغْصُوبِ مِنْ مَهْرِ مِثْلٍ) بەشی زەوتكراوەكەشی لە مارەيی هاووێنە هەيە (بِحَسَبِ قِيمَتِهِمَا) بەگوێرەی نرخی هەردووكيان (وَفِي قَوْلٍ تَقْنَعُ بِهِ) لە فەرموودەيەكدا: دەبی بە تەنها ملكەكەی مێردەكە قەناعەت بكاو داوای هيچیتر نەكا.

(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر باوكێك گوتی: (زَوَّجْتُكَ بِنْتِي وَبِعْتُكَ ثَوْبَهَا بِهَذَا الْعَبْدِ) كيژەكەی خۆم كردە ژنی تۆو جلەكەيشم فرۆشتتە تۆ بەم كۆيلەيە. ئەوە (صَحَّ النِّكَاحُ) مارەبڕینەكە دروست دەبێ (وَكَذَا الْمَهْرُ وَالْبَيْعُ فِيالأَظْهَرِ) هەروەها مارەييەكەو فرۆشتنەكەش دروست دەبن لە فەرموودەی بەهێزتردا، كەوابو: (وَيُوَزَّعُ الْعَبْدُ عَلَىالثَّوْبِ وَمَهْرِمِثْلٍ) كۆيلەكە بەش دەكرێ بە سەرجلەكەیو مارەييە هاووێنەكەیدا.

(وَلَوْ نَكَحَ بِأَلْفٍ) ئەگەر ژنێكی لە خۆی مارە كرد بە هەزار دينار مارەيی بەو مەرجەی: (عَلَى أَنَّ لأَبِيهَا أَوْ أَنْ يُعْطِيَهُ أَلْفًا) هەزار ديناریتریش بۆ باوكی ژنەكە بێ، يان بۆ كەسێكیتر بێ، يان بەو مەرجەی هەزار ديناریتریش بداتە باوكی ژنەكە، يان كەسێكیتر، ئەوە مارەبڕینەكە دروست دەبێ، بەلاّم (فَالْمَذْهَبُ فَسَادُ الصَّدَاقِ) بە فەرموودەیڕاستیمەزهەب: لەو دوو مەسەلانەدا مارەييە ناوبراوەكە تێك دەچێو (وَوُجُوبُ مَهْرِ الْمِثْلِ) مارەيی هاووێنە لە سەر مێردەكە واجب دەبێ بۆ ژنەكە، هەزار دينارەكەش شيربايیيەو لە باوكەكە حەرامە، چونكە هيچ مافی ئەو مەرجەی نيە.

﴿ئاگاداری﴾: ئەگەر بگوترێ: (مارەيی هەزار دينار بێ: نيوەی ئێستا بدرێو نيوەيشی قەرز بێ). بەلاّم ماوەی قەرزەكە دیاری نەكرێ، يان بگوترێ: (نيوەی ئێستا بدرێو نيوەيشی قەرز بێ تا مردن، يان تا تەڵاقدان). ئەوە لە هەردوومەسەلەدا مارەبڕینەكە دروست دەبێ، بەلاّم مارەييە ناوبراوەكە تێك دەچێو دروست نابێ، كەوابو: مارەيی هاووێنە لە سەر مێردەكە واجب دەبێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموويانە.

وَلَوْ شَرَطَ خِيارًا فِي النِّكَاحِ بَطَلَ النِّكَاحُ، أَوْ فِي الْمَهْرِ فَالأَظْهَرُ صِحَّةُ النِّكَاحِ لاَ الْمَهْرِ، وَسَائِرُ الشُّرُوطِ إِنْ وَافَقَ مُقْتَضَى النِّكَاحِ أَوْ لَمْ يَتَعَلَّقْ بِهِ غَرَضٌ لَغَا وَصَحَّ النِّكَاحُ وَالْمَهْرُ، وَإِنْ خَالَفَ وَلَمْ يُخِلَّ بِمَقْصُودِهِ الأَصْلِيِّ كَشَرْطِ أَنْ لاَ يَتَزَوَّجَ عَلَيْهَا أَوْ لاَ نَفَقَةَ لَهَا صَحَّ النِّكَاحُ وَفَسَدَ الشَّرْطُ وَالْمَهْرُ، وَإِنْ أَخَلَّ كَأَنْ لاَ يَطَأَ أَوْ يُطَلِّقَ بَطَلَ النِّكَاحُ،

---

بەلام لەمەزهەبی ئیمامی(حنفي)دا: بە قەرز دانانی مارەیی تا کاتێکی نەزاندراویش دروستە، چونکە کۆتاییەکەی دەزاندرێ: کە مردنە، یان تەلاقدانە، هەروەك لە (مجمع الانهر)دا فەرموویەتی، جا ئەگەر مارەبڕینەکە بە مەزهەبی(الشافعي) بکرێ، ئاگاداریە: بە هەڵەدا نەچی.

(وَلَوْ شَرَطَ خِيَارًا فِي النِّكَاحِ) ئەگەر ژنەکە، یان مێردەکە لە ناو مارەبڕینەکەدا بە مەرجی دانا: مافی پەشیمانیی لە مارەبڕینەکەدا هەبێ، ئەوە (بَطَلَ النِّكَاحُ) مارەبڕینەکە بەتاڵ دەبێ (أَوْ فِي الْمَهْرِ) یان بە مەرجی دانا: مافی پەشیمانیی لە مارەییەکەدا هەبێ، ئەوە (فَالأَظْهَرُ) بە فەرموودەی بەهێزتر: (صِحَّةُ النِّكَاحِ لاَ الْمَهْرِ) مارەبڕینەکە دروست دەبێ، بەلام مارەییەکە دروست نابێ، کەوابو: مارەیی هاوێنە واجب دەبێ.

ئینجا بزانە: هەر مەرجێك لە ناو مارەبڕینەکەدا دانەندرێ، بەڵکو لە دوای مارەبڕین، یان لە پێش مارەبڕین دابندرێ، ئەوەکار لە مارەبڕینو لە مارەیی ناکا، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

(وَسَائِرُ الشُّرُوطِ) گشت مەرجەکانیتریش کە لە ناو مارەبڕینەکەدا دابندرێن: (إِنْ وَافَقَ مُقْتَضَى النِّكَاحِ) ئەگەر لەگەڵ خوازراوی مارەبڕینەکە تێك بکاتەوە: وەك بە مەرجی بەخێوکردن (أَوْ لَمْ يَتَعَلَّقْ بِهِ غَرَضٌ) یان هیچ مەبەستێکی پەیوەست نەبێ: وەك بەو مەرجەی تەنها ئەو شتە بخوا، ئەوە (لَغَا) مەرجەکە پوچەڵ دەبێ (وَصَحَّ النِّكَاحُ وَالْمَهْرُ) مارەبڕینەکەو مارەییەکە هەردووکیان دروست دەبن.

(وَإِنْ خَالَفَ) بەلام ئەگەر مەرجەکە لەگەڵ خوازراوی مارەبڕینەکە جیابو و (وَلَمْ يُخِلَّ بِمَقْصُودِهِ الأَصْلِيِّ) زیانیشی بە مەبەستی ژنهێنان نەدەگەیاند: کە جیماعکردنە (كَشَرْطِ أَنْ لاَ يَتَزَوَّجَ عَلَيْهَا) وەك بە مەرجی ژنی بە سەر نەهێنێ (أَوْ لاَ نَفَقَةَ لَهَا) یان بە مەرجی بەخێوی نەکا، ئەوە (صَحَّ النِّكَاحُ) مارەبڕینەکە دروست دەبێ، بەلام (وَفَسَدَ الشَّرْطُ وَالْمَهْرُ) مەرجەکەو مارەییەکە تێك دەچنو دروست نابن، کەوابو: مارەیی هاوێنە واجب دەبێ (وَإِنْ أَخَلَّ) ئەگەر مەرجەکە زیانی دەگەیاندە مەبەستی ژنهێنان: (كَأَنْ لاَ يَطَأَ) وەك بە مەرجی جیماعی لەگەڵ نەکا (أَوْ يُطَلِّقَ) یان بە مەرجی تەلاقی بدا، ئەوە (بَطَلَ النِّكَاحُ) مارەبڕینەکە بەتاڵەو دروست نابێ.

وَلَوْ نَكَحَ نِسْوَةً بِمَهْرٍ فَالأَظْهَرُ فَسَادُ الْمَهْرِ وَلِكُلٍّ مَهْرُمِثْلٍ، وَلَوْ نَكَحَ لِطِفْلٍ بِفَوْقِ مَهْرِ مِثْلٍ أَوْ أَنْكَحَ بِنْتًا لاَرَشِيدَةً أَوْ رَشِيدَةًبِكْرًا بِلاَ إِذْنٍ بِدُونِه فَسَدَ الْمُسَمَّى وَالأَظْهَرُ صِحَّةُ النِّكَاحِ بِمَهْرِ مِثْلٍ، وَلَوْ تَوَافَقُوا عَلَى مَهْرٍ كَانَ سِرًّا وَأَعْلَنُوا زِيَادَةً، فَالْمَذْهَبُ وُجُوبُ مَا عُقِدَ بِه، وَلَوْ قَالَتْ لِوَلِيِّهَا: زَوِّجْنِي بِأَلْف. فَنَقَصَ عَنْهُ بَطَلَ النِّكَاحُ، فَلَوْ أَطْلَقَتْ فَنَقَصَ عَنْ مَهْرِمِثْلٍ بَطَلَ، وَفِي قَوْلٍ يَصِحُّ بِمَهْرِمِثْلٍ، قُلْتُ: اَلأَظْهَرُ صِحَّةُالنِّكَاحِ فِيالصُّورَتَيْنِ بِمَهْرِ الْمِثْلِ وَاللهُ أَعْلَمُ.

---

(وَلَوْ نَكَحَ نِسْوَةً بِمَهْرٍ) ئەگەر پیاوێك دوو ژن، یان زیاتری مارە کردن‌و تەنها یەك مارەییشی بۆ هەموویان دانا، ئەوە (فَالأَظْهَرُ) بە فەرموودەی بەهێزتر (فَسَادُ الْمَهْرِ) مارەییە ناوبراوەکە تێك دەچێ‌و (وَلِكُلٍّ مَهْرُمِثْلٍ) هەر ژنێك مارەییێکی هاوێنەی بۆ دادەندرێ.

(وَلَوْ نَكَحَ لِطِفْلٍ) ئەگەر باوك، یان باپیرە ژنێکی لە کوڕێکی نەبالغ مارە کرد (بِفَوْقِ مَهْرِ مِثْلٍ) بە زیاتر لە مارەیی هاوێنە (أَوْ أَنْكَحَ بِنْتًا لاَ رَشِيدَةً) یان کیژێکی کچی نەبالغ، یان شێتی بە کەمتر لە مارەیی هاوێنە مارە کرد (أَوْ رَشِيدَةً بِكْرًا) یان کیژێکی کچی بالغ‌و عاقڵەی مارە کرد (بِلاَ إِذْنٍ) بێ ئەوەی ئیزن بدا لە مارەیی هاوێنەی کەمتر بێ (بِدُونِه) بە کەمتر لە مارەیی هاوێنە مارەی کرد، ئەوە (فَسَدَ الْمُسَمَّى) لە هەر سێك مەسەلەکەدا مارەییە ناوبراوەکە تێك دەچێ، ئینجا (وَالأَظْهَرُ) بە فەرموودەی بەهێزتر لە هەر سێك مەسەلەکەدا (صِحَّةُ النِّكَاحِ بِمَهْرِ مِثْلٍ) مارەبڕینەکە بە مارەیی هاوێنە دروست دەبێ.

(وَلَوْ تَوَافَقُوا عَلَى مَهْرٍ كَانَ سِرًّا) ئەگەر لە نێوان خۆیاندا بە نهێنی لە سەر مارەییەك ڕێك کەوتن: وەك سەد دینار، بەڵام (وَأَعْلَنُوا زِيَادَةً) مارەییەکی‌تری زیاتر لە نهێنیەکەیان ئاشکرا کرد: وەك دوو سەد دینار، ئەوە (فَالْمَذْهَبُ) بە فەرموودەی ڕاستی مەزهەب: (وُجُوبُ مَا عُقِدَ بِهِ) ئەو مارەییەی یەکەمجار مارەبڕینەکەی پێ‌کراوە، ئەویان واجب دەبێ، واتە: ئەگەر یەکەمجار بە کەمترەکە کرابێ، کەمترەکە واجب دەبێ، ئەگەر یەکەمجار بە زۆرترەکە کرابێ: زۆرترەکە واجب دەبێ، نهێنی‌و ئاشکرایی ڕەچاو ناکرێ.

(وَلَوْ قَالَتْ لِوَلِيِّهَا) ئەگەر ئافرەتێکی بالغ‌و عاقڵە بە سەرپەرشتکارەکەی گوت: (زَوِّجْنِي بِأَلْفٍ) مارەم بکە بە هەزار دینار مارەیی (فَنَقَصَ عَنْهُ) سەرپەرشتکارەکەش بە کەمتر لە هەزار دینارەکە مارەی کرد، ئەوە (بَطَلَ النِّكَاحُ) مارەبڕینەکە بەتاڵ دەبێ (فَلَوْ أَطْلَقَتْ) ئەگەر ئافرەتەکە ئیزنی‌دا مارەی‌بکا‌و باسی مارەیی نەکرد (فَنَقَصَ عَنْ مَهْرِ مِثْلٍ) سەرپەرشتکارەکەش بە کەمتر لە مارەیی هاوێنە مارەی کرد (بَطَلَ) مارەبڕینەکە بەتاڵ دەبێ (وَفِي قَوْلٍ يَصِحُّ بِمَهْرِ مِثْلٍ) لە فەرموودەیەکدا: بە مارەیی هاوێنە مارەبڕینەکە دروست دەبێ (قُلْتُ) ئیمامی (النواوي) دەفەرموێ (الأَظْهَرُ صِحَّةُ النِّكَاحِ فِي الصُّورَتَيْنِ بِمَهْرِ الْمِثْلِ، وَاللهُ أَعْلَمُ) بە فەرموودەی بەهێزتر: مارەبڕینەکە لە هەردوو مەسەلەکەدا

(فَصْلٌ) قَالَتْ رَشِيدَةٌ: زَوِّجْنِي بِلاَ مَهْرٍ. فَزَوَّجَ وَنَفَى الْمَهْرَ أَوْ سَكَتَ فَهُوَ تَفْوِيضٌ صَحِيحٌ، وَكَذَا لَوْ قَالَ سَيِّدُ أَمَةٍ زَوَّجْتُكَهَا بِلاَ مَهْرٍ. وَلاَ يَصِحُّ تَفْوِيضُ غَيْرِ رَشِيدَةٍ، وَإِذَا جَرَى تَفْوِيضٌ صَحِيحٌ فَالأَظْهَرُ أَنَّهُ لاَ يَجِبُ شَيْءٌ بِنَفْسِ الْعَقْدِ، فَإِنْ وَطِئَ فَمَهْرُ مِثْلٍ، وَيُعْتَبَرُ بِحَالِ الْعَقْدِ فِي الأَصَحِّ،

---

به مارەیی هاوێنه دروست دەبێ، هەروەك له تێكدەرەكانیتری مارەییشدا به مارەیی هاوێنه دروست دەبو.

﴿ فَصْلٌ: له باسی (تَفْوِيض)﴾

**واته: ئافرەت كاری خۆی بداته دەست سەرپەرشتكارەكەی تاكو به بێمارەیی مارەی بكا،**

(قَالَتْ رَشِيدَةٌ) ئەگەر ئافرەتێكی بالغەو عاقڵه گوتیه سەرپەرشتكارەكەی: (زَوِّجْنِي بِلاَ مَهْرٍ) به بێمارەیی مارەم بكه (فَزَوَّجَ وَنَفَى الْمَهْرَ) جا سەرپەرشتكارەكەش مارەی كردو گوتی: هیچ مارەییشی نەبێ (أَوْ سَكَتَ) یان بێدەنگ بوو و باسی مارەیی نەكرد (فَهُوَ تَفْوِيضٌ صَحِيحٌ) ئەوە كاردانەدەستێكی دروستبووە، بەلام ئەگەر ژنەكە تەنها گوتی: مارەم بكە، واته: باسی مارەیی نەكرد، ئەوە نابێته كاردانەدەست، كەوابو: لەم حاڵەتەدا به خودی مارەبڕینەكە مارەیی هاوێنە لە سەر مێردەكە واجب دەبێ، هەروەك ئەگەر كاردانەدەستەكەش دروست نەبێ ئەو كاتەش به خودی مارەبڕینەكە مارەیی هاوێنه واجب دەبێ، هەروەك له (مغنی)دا فەرموویەتی.

(وكَذَا لَوْ قَالَ سَيِّدُ أَمَةٍ) هەروەها ئەگەر گەورەیجاریەیەك بڵێ: (زَوَّجْتُكَهَا بِلاَ مَهْرٍ) جاریەكەمم كردە ژنی تۆ به بێمارەیی. ئەوەش كاردانەدەستێكی دروستبووە (وَلاَ يَصِحُّ تَفْوِيضُ غَيْرِ رَشِيدَةٍ) كاردانەدەست له ئافرەتێكی شێتەوە، یان نەبالغەوە دروست نابێ.

جا بزانه: لەو كاردانەدەستەدا جیاوازی كچو بێوەژن نیە، هەروەك له زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە. (وَإِذَا جَرَى تَفْوِيضٌ صَحِيحٌ) هەر كاتێك كاردانەدەستێكی دروستبوو هاتەجێو سەرپەرشتكارەكه به بێمارەیی ئافرەتەكەی مارە كرد، ئەوە (فَالأَظْهَرُ أَنَّهُ لاَ يَجِبُ شَيْءٌ بِنَفْسِ الْعَقْدِ) به فەرموودەی بەهێزتر: به خودی مارەبڕینەكە هیچ مارەیی له سەر مێردەكە واجب نابێ، بۆیێ ئەگەر پێش جیماعكردن ژنەكەش تەلاق بدا نیوەی مارەیی ناكەوێتە سەر، بەلام (فَإِنْ وَطِئَ) ئەگەر جیماعی لەگەڵ ژنەكە كرد، ئەو كاتە (فَمَهْرُ مِثْلٍ) مارەیی هاوێنه له سەر مێردەكە واجب دەبێ بۆ ژنەكە، چونكە به حەڵاڵی جیماعی لەگەڵ كردوە، بەڵگەی حەدیسەكەی (بصرةالانصاري)ىڕابردوو له (باسی جێگیربوونیمارەیی)دا (وَيُعْتَبَرُ بِحَالِ الْعَقْدِ) مارەییهاوێنه-بۆ ئەو جۆرە ئافرەتە- ڕەچاو دەكرێ به حاڵەتی مارەبڕینەكە (فِي الأَصَحِّ) له فەرموودەی ڕاستتردا.

وَلَهَا قَبْلَ الْوَطْءِ مُطَالَبَةُ الزَّوْجِ بِأَنْ يَفْرِضَ مَهْرًا، وَحَبْسُ نَفْسِهَا لِيَفْرِضَ، وَكَذَا لِتَسْلِيمِ الْمَفْرُوضِ فِي الأَصَحِّ، وَيُشْتَرَطُ رِضَاهَا بِمَا يَفْرِضُهُ الزَّوْجُ، لاَ عِلْمُهُمَا بِقَدْرِ مَهْرِ الْمِثْلِ فِي الأَظْهَرِ، وَيَجُوزُ فَرْضُ مُؤَجَّلٍ فِي الأَصَحِّ، وَفَوْقَ مَهْرِ مِثْلٍ، وَقِيلَ لاَ إِنْ كَانَ مِنْ جِنْسِهِ، وَلَوْ امْتَنَعَ مِنَ الْفَرْضِ أَوْ تَنَازَعَا فِيهِ فَرَضَ الْقَاضِي نَقْدَ الْبَلَدِ حَالاًّ، قُلْتُ: وَيَفْرِضُ مَهْرَ مِثْلٍ، وَيُشْتَرَطُ عِلْمُهُ بِهِ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَلاَ يَصِحُّ فَرْضُ أَجْنَبِيٍّ مِنْ مَالِهِ فِي الأَصَحِّ، وَالْفَرْضُ الصَّحِيحُ كَمُسَمًّى

---

(وَلَهَا قَبْلَ الْوَطْءِ مُطَالَبَةُ الزَّوْجِ) ژنەکە بۆی دروستە -لە دوای مارەبڕینەکە- پێش جیماعکردن داوا لە مێردەکەی بکا: (بِأَنْ يَفْرِضَ مَهْرًا) کە مارەییەکی بۆ دابنێ، هەم (وَحَبْسُ نَفْسِهَا لِيَفْرِضَ) بۆی دروستە: خۆی لە مێردەکەی قەدەغە بکا بۆ ئەوەی مارەییەکەی بۆ دابنێ (وكَذَا لِتَسْلِيمِ الْمَفْرُوضِ) هەروەها بۆی دروستە خۆی لێقەدەغە بکا بۆ ئەوەی مارەییە داندراوەکەشی تەسلیم بکا (فِي الأَصَحِّ) لەفەرموودەی ڕاستتردا.

(وَيُشْتَرَطُ رِضَاهَا بِمَا يَفْرِضُهُ الزَّوْجُ) بە مەرج دادەندرێ: ژنەکە بەو مارەییە ڕازی ببێ کە مێردەکەی بۆی دادەنێ (لاَ عِلْمُهُمَا بِقَدْرِ مَهْرِ الْمِثْلِ) بەڵام مەرج نیە: ژن و مێردەکە بزانن مارەیی هاوێنەی ژنەکە چەندە (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا (وَيَجُوزُ فَرْضُ مُؤَجَّلٍ فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا دروستە: مارەییەکی قەرزی بۆ دابنێ، ئەگەر ژنەکە ڕازی بێ، هەم (وَفَوْقَ مَهْرِ مِثْلٍ) دروستە زیاتر لە مارەییهاوینەی بۆ دابنێ (وَقِيلَ لاَ إِنْ كَانَ مِنْ جِنْسِهِ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: ئەگەر داندراوەکەو هاوینەکە یەك ڕەگەز بن دروست نیە زیاتر دابنێ.

(وَلَوْ امْتَنَعَ مِنَ الْفَرْضِ) ئەگەر مێردەکە ڕەقەکاری کردو مارەییەکەی بۆ ژنەکە دانەنا (أَوْ تَنَازَعَا فِيهِ) یان لە ئەندازەی مارەییە داندراوەکەدا بوە کێشەیان، ئەو کاتە (فَرَضَ الْقَاضِي نَقْدَ الْبَلَدِ حَالاًّ) قازی لە پارەی شارەکە مارەییەکی حازر بۆ ژنەکە لە سەر مێردەکە دادەنێ (قُلْتُ) ئیمامی (النواوي) دەفەرموێ: (وَيَفْرِضُ مَهْرَ مِثْلٍ) قازی مارەیی هاوێنەی حازر لە سەر مێردەکە دادەنێ، کەواتە: (وَيُشْتَرَطُ عِلْمُهُ بِهِ) مەرجە: قازی بزانێ مارەیی هاوێنەی ژنەکە چەندە (وَاللهُ أَعْلَمُ) نەوەك زیاتر، یان کەمتر دابنێ (وَلاَ يَصِحُّ فَرْضُ أَجْنَبِيٍّ مِنْ مَالِهِ) دروست نیە بێگانەیەك لە ماڵیخۆی -بە بێئیزنیمێردەکە- مارەییەکە بۆ ژنەکە دابنێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، بەڵام ئەگەر مێردەکە ئیزنی بدا، ئەو کاتە دروستە، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.

(وَالْفَرْضُ الصَّحِيحُ) مارەییە دانرداوەکەی دروستبوو لە لایەن قازی، یان لە لایەن ژن و مێردەکەوە (كَمُسَمًّى) وەك ئەو مارەییەیە کە لە ناو مارەبڕینەکەدا داندرابێ، کەوابو:

فَيَتَشطَّرُ بِطَلاَقٍ قَبْلَ وَطْءٍ، وَلَوْ طَلَّقَ قَبْلَ فَرْضٍ وَوَطْءٍ فَلاَ شَطْرَ، وَإِنْ مَاتَ أَحَدُهُمَا قَبْلَهُمَا لَمْ يَجِبْ مَهْرُ مِثْلٍ فِي الأَظْهَرِ، قُلْتُ: اَلأَظْهَرُ وُجُوبُهُ، وَاللهُ أَعْلَمُ.

(فَصْلٌ) مَهْرُالْمِثْلِ مَا يُرْغَبُ بِهِ فِي مِثْلِهَا، وَرُكْنُهُ الأَعْظَمُ نَسَبٌ، فَيُرَاعَى أَقْرَبُ مَنْ تُنْسَبُ إِلَى مَنْ تُنْسَبُ إِلَيْهِ، وَأَقْرَبُهُنَّ أُخْتٌ لأَبَوَيْنِ ثُمَّ لأَبٍ ثُمَّ بَنَاتُ أَخٍ ثُمَّ عَمَّاتٌ كَذَلِكَ، فَإِنْ فُقِدَ نِسَاءُ الْعَصَبَةِ أَوْ لَمْ يَنْكِحْنَ أَوْ جُهِلَ مَهْرُهُنَّ فَأَرْحَامٌ كَجَدَّاتٍ وَخَالاَتٍ،

---

(فَيَتَشطَّرُ بِطَلاَقٍ قَبْلَ وَطْءٍ) ئەو داندراوەی دوایمارەبڕین بە هۆی تەلاقدانی پێش جیماعکردن دەبێتە نیوە، واتە: نیوەی بۆ مێردەکە دەگەڕێتەوە، بەلاَم (وَلَوْ طَلَّقَ قَبْلَ فَرْضٍ وَوَطْءٍ) ئەگەر پێش دانانەکەو پێش جیماعکردن ژنەکەی تەلاَق دا، ئەو کاتە (فَلاَ شَطْرَ) نابێتە نیوە؟ چونکە هیچ مارەیی بە هۆی مارەبڕینەکە لە سەر مێردەکە واجب نەبوە.

(وَإِنْ مَاتَ أَحَدُهُمَا قَبْلَهُمَا) ئەگەر ژنەکە، یان مێردەکە پێش دانانەکەو پێش جیماعکردن مرد (لَمْ يَجِبْ مَهْرُ مِثْلٍ فِيالأَظْهَرِ) مارەیی هاووێنە واجب نابێ، بەلاَم (قُلْتُ) ئیمامی (النواوي) دەفەرموێ (الأَظْهَرُ وُجُوبُهُ) بە فەرموودەی بەهێزتر بە مردنی تەنها یەکێکیان مارەیی هاووێنە واجب دەبێ لە سەر مێردەکە (وَاللهُ أَعْلَمُ)، بە بەڵگەی حەدیسەکەی (بَرْوَع بنت واشق)ىڕابردوو لە سەرەتای ئەم باسەی مارەییدا.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی پێناسەی مارەیی هاووێنە ﴾

(مَهْرُ الْمِثْلِ) پێناسەی مارەیی هاووێنە: (مَا يُرْغَبُ بِهِ فِي مِثْلِهَا) ئەوەیە کە –بەگوێرەی عادەت– بەو مارەییە وێنەی ئەو ئافرەتەیان بوێ (وَرُكْنُهُ الأَعْظَمُ نَسَبٌ) بەشە هەرە گەورەکەی مارەیی هاووێنە: نەژادە، کەوابو: (فَيُرَاعَى) ڕەچاو دەکرێ لە خزمەکانی ئافرەتەکە: (أَقْرَبُ مَنْ تُنْسَبُ إِلَى مَنْ تُنْسَبُ إِلَيْهِ) نزیکترین ئافرەت کە نەژادی بچێتەوە سەر ئەو کەسەی کە ئەم ئافرەتەش نەژادی دەچێتەوە سەر هەمان کەسەکە، چونکە لە حەدیسەکەی (بروع بنت واشق)ىڕابردوودا فەرمووی: ﴿لَهَا مِثْلُ صَدَاقِ نِسَائِهَا﴾ ژنەکە مافی مارەیی هاووینەی ئافرەتەکانیخۆی هەیە.

ئینجا (وَأَقْرَبُهُنَّ) نزیکترین ئافرەتی نەژاد: (أُخْتٌ لأَبَوَيْنِ) خوشکی لەدایکوباوکییە (ثُمَّ لأَبٍ) ئینجا خوشکی تەنها لەباوکی (ثُمَّ بَنَاتُ أَخٍ) ئینجا کیژەکانی برای لەدایکوباوکی، ئینجا لەباوکی (ثُمَّ عَمَّاتٌ كَذَلِكَ) ئینجا خوشکەکانی باوك لەدایکوباوکی، ئینجا لەباوکی (فَإِنْ فُقِدَ نِسَاءُ الْعَصَبَةِ) جا ئەگەر ئافرەتەکانی لە پشتێ نەبون (أَوْ لَمْ يَنْكِحْنَ) یان مێردیان نەکردبو (أَوْ جُهِلَ مَهْرُهُنَّ) یان نەزاندرا مارەییان چەندە، ئەو کاتە (فَأَرْحَامٌ) ئافرەتەکانی لە ڕەحمێ ڕەچاو دەکرێن (كَجَدَّاتٍ) وەکو داپیرەکانیو (وَخَالاَتٍ) خوشکەکانیدایكو...هتد، چونکە ئەوانە لە بێگانە لە پێشترن.

وَيُعْتَبَرُ سِنٌّ وَعَقْلٌ وَيَسَارٌ وَبَكَارَةٌ وَثُيُوبَةٌ وَمَا اخْتَلَفَ بِهِ غَرَضٌ، فَإِنْ اخْتَصَّتْ بِفَضْلٍ أَوْ نَقْصٍ زِيدَ أَوْ نُقِصَ لائِقٌ فِي الْحَالِ، وَلَوْ سَامَحَتْ وَاحِدَةٌ لَمْ تَجِبْ مُوَافَقَتُهَا، وَلَوْ خَفَضْنَ لِلْعَشِيرَةِ فَقَطْ اُعْتُبِرَ، وَفِي وَطْءِ نِكَاحٍ فَاسِدٍ مَهْرُ مِثْلٍ يَوْمَ الْوَطْءِ، فَإِنْ تَكَرَّرَ فَمَهْرٌ فِي أَعْلَى الأَحْوَالِ، قُلْتُ: وَلَوْ تَكَرَّرَ وَطْءٌ بِشُبْهَةٍ وَاحِدَةٍ فَمَهْرٌ، فَإِنْ تَعَدَّدَ جِنْسُهَا تَعَدَّدَ الْمَهْرُ،

---

(وَيُعْتَبَرُ) لەگەڵ ئەوەیڕابردووش ڕەچاو دەکرێ (سِنٌّ) تەمەن‌و (وَعَقْلٌ) عاقڵی‌و (وَيَسَارٌ) دەوڵەمەندی‌و (وَبَكَارَةٌ وَثُيُوبَةٌ) کچایەتی‌و بێوەژنایەتی‌و (وَمَا اخْتَلَفَ بِهِ غَرَضٌ) هەر سیفەتێکی کە مەبەستێکی پێبگۆڕێ: وەکو خوێندەواری‌و زانست‌و جوانی‌و داوێنپاکی‌و... هتد، کەواتە: ئەو ئافرەتانەی لە یەکێك لەو سیفەتانەدا هاوبەشی ئەم ئافرەتەنە وێنەی مارەیی ئەوان بۆ ئەمەش ڕەچاو دەکرێ، جا (فَإِنْ اخْتَصَّتْ بِفَضْلٍ) ئەگەر تەنها ئەم ئافرەتە سیفەتێکی لەو سیفەتە چاکانەیڕابردووی هەبو (أَوْ نَقْصٍ) یان دژێکی ئەو سیفەتە چاکانەی هەبو، ئەو کاتە (زِيدَ) بەشێکی مارەیی زیاد دەکرێ (أَوْ نُقِصَ) یان کەم دەکرێ: کە (لائِقٌ فِي الْحَالِ) لە حاڵی ئەم ئافرەتە بوەشێتەوە.

(وَلَوْ سَامَحَتْ وَاحِدَةٌ) ئەگەر یەکێك لەو ئافرەتانەیخزم چاوپۆشیی لە مارەییەکەدا کرد، ئەوە (لَمْ تَجِبْ مُوَافَقَتُهَا) لە سەر ئافرەتەکانی‌تر واجب نیە: وەکو وی چاوپۆشی بکەن، بەلام (وَلَوْ خَفَضْنَ لِلْعَشِيرَةِ فَقَطْ) ئەگەر ئافرەتەکان تەنها بۆ خزمەکانی‌خۆیان مارەییان کەم دەکردەوە، ئەو کاتە (اُعْتُبِرَ) لە هەموانیاندا ئەو کەمکردنەوەیە بۆ خزمەکانیان ڕەچاو دەکرێ.

## ﴿ مارەیی جیماعی بە هەڵەو، زینای بە زۆرداری ﴾

(وَفِي وَطْءِ نِكَاحٍ فَاسِدٍ) لە جیماعی مارەبڕینێکی‌نادروستدا (مَهْرُ مِثْلٍ يَوْمَ الْوَطْءِ) مارەیی هاووێنەی کاتی‌جیماعکردن لە سەر جیماعکەرەکە واجب دەبێ بۆ ئافرەتەکە (فَإِنْ تَكَرَّرَ) جا ئەگەر جیماعکردنەکەی مارەبڕینی‌نادروست زۆر دووبارە بۆوە، ئەو کاتە (فَمَهْرٌ فِي أَعْلَى الأَحْوَالِ) یەك مارەیی هاووێنە لە بەرزترین حاڵەتدا واجب دەبێ.

(قُلْتُ) ئیمامی (النواوي) دەفەرموێ (وَلَوْ تَكَرَّرَ وَطْءٌ بِشُبْهَةٍ وَاحِدَةٍ) ئەگەر جیماعێکی یەك جۆرە هەڵە زۆر دووبارە بۆوە: وەك لە گشت جیماعێکدا وایتێگەیشتبێ ژنی‌خۆیەتی، ئەو کاتەش (فَمَهْرٌ) یەك مارەیی لە بەرزترین حاڵەتدا لە سەر جیماعکەرەکە واجب دەبێ، بەلام (فَإِنْ تَعَدَّدَ جِنْسُهَا) ئەگەر ڕەگەزی بەهەڵەداچوونەکە لە یەکێك زیاتر بوو: وەك جارێکیان وایتێبگا ژنی‌خۆیەتی‌و جیماعی لەگەڵ بکا، جارێکیشیان بە مارەبڕینێکی نادروست جیماعی لەگەڵ بکا، ئەو کاتە (تَعَدَّدَ الْمَهْرُ) مارەیی هاووێنەش دووبارە دەبێتەوە بە ژمارەی ڕەگەزەکان.

وَلَوْ كَرَّرَ وَطْءَ مَغْصُوبَةٍ أَوْ مُكْرَهَةٍ عَلَى زِنًا تَكَرَّرَالْمَهْرُ، وَلَوْ تَكَرَّرَ وَطْءُ الأَبِ وَالشَّرِيكِ وَسَيِّدِ مُكَاتَبَةٍ فَمَهْرٌ، وَقِيلَ مُهُورٌ، وَقِيلَ إِنْ اتَّحَدَ الْمَجْلِسُ فَمَهْرٌ، وَإِلاَّ فَمُهُورٌ وَاللهُ أَعْلَمُ.
(فَصْلٌ) اَلْفُرْقَةُ قَبْلَ وَطْءٍ مِنْهَا أَوْ بِسَبَبِهَا كَفَسْخِهِ بِعَيْبِهَا

---

ئینجا بزانه: لەو بەهەڵەداچوونانەیڕابردوودا مەرجە: ئافرەتەکەش بە هەڵەدا بچێ‌و وا تێبگا پیاوەکە مێردیخۆیەتی، چونکە ئەگەر ئافرەتەکە بزانێ پیاوەکە مێردیخۆی نیەو بە خۆشیخۆی ڕێگای بدا جیماعی لەگەڵ بکا، ئەو کاتە ئافرەتەکە زیناکەرەو مافی هیچ مارەیی‌ی نیە، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی، هەم لە باسی (ئەو ئافرەتانەی بە زاواو خەزورایەتی حەرام بون) ڕوونمان کردەوە.
(وَلَوْ كَرَّرَ وَطْءَ مَغْصُوبَةٍ) ئەگەر پیاوێك جیماعکردنی لەگەڵ (جاریـة)کیزەوتکراو دووبارە کردەوە (أَوْ مُكْرَهَةٍ عَلَى زِنًا) یان جیماعی لەگەڵ ئافرەتێکی زۆرلێکراو بۆ زینا دووبارە کردەوە، یان زینای لەگەڵ ئافرەتێکی خەوتوو، یان بێهۆش دووبارە کردەوە، ئەوە لە گشت جیماعێکی ئەو جۆرە ئافرەتانەدا (تَكَرَّرَ الْمَهْرُ) مارەیی هاوێنە دووبارە دەبێتەوە بۆ ئافرەتەکە بە ژمارەی جیماعکردنەکان، واتە: بەڵام ئەگەر تەنها یەك جار جیماع لەگەڵ ئەو ئافرەتانە بکا، ئەوە تەنها یەك مارەیی هاوێنەی لە سەر واجب دەبێ.
ئینجا لە هەموو حاڵەتێکدا سزای زیناشی دەکەوێتە سەر، وە ئەگەر کچێنیەکەشی لابردبێ تۆڵەی کچێنیەکشی دەکەوێتە سەر، بەڵام ئەگەر ئافرەتەکە بە خۆشیخۆی ڕێگا بدا پیاوەکە جیماعی لەگەڵ بکا، ئەو کاتە مافی هیچ مارەیی‌و تۆڵەی نیە، چونکە ئەویش زیناکەرە، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.
(وَلَوْ تَكَرَّرَ وَطْءُ الأَبِ) ئەگەر جیماعکردنی باوك لەگەڵ جاریەی منداڵی خۆی دووبارە بۆوە (وَالشَّرِيكِ) هەم ئەگەر جیماعی لەگەڵ جاریە هاوبەشەکەدا دووبارە بۆوە (وَسَيِّدِ مُكَاتَبَةٍ) هەم ئەگەر جیماعی گەورەیەك لەگەڵ جاریە نوسراو پێدراوەکە دووبارە بۆوە، ئەوە (فَمَهْرٌ) تەنها یەك مارەیی واجب دەبێ (وَقِيلَ مُهُورٌ ) لە فەرموودەیەکیتری بێهێزدا: زۆر مارەیی‌و (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکیتری بێ هێزدا: (إِنْ اتَّحَدَ الْمَجْلِسُ فَمَهْرٌ) ئەگەر لە یەك شوێندا جیماعەکەی کردبێ، ئەوە یەك مارەیی واجب دەبێ (وَإِلاَّ فَمُهُورٌ) بەڵام ئەگەر لە دوو شوێن، یان زیاتر جیماعی لەگەڵ کردبێ، ئەوە زۆر مارەیی واجب دەبن (وَاللهُ أَعْلَمُ).

**﴿ فَصْلٌ: لە باسی لاچوون و بە نیوەکردنی مارەیی ﴾**

(اَلْفُرْقَةُ قَبْلَ وَطْءٍ) لێکجیابوونەوەی ژن‌و مێرد ئەگەر پێش جیماعکردن بێ‌و (مِنْهَا) جیابوونەوەکەش لە ژنەکەوە بێ: وەك ژنەکە بە هۆی عەیبێکی مێردەکە مارەبڕینەکە هەڵبوەشێنێتەوەوە، یان بە هەر هۆیەکیتر (أَوْ بِسَبَبِهَا كَفَسْخِهِ بِعَيْبِهَا) یان بە هۆی

تُسْقِطُ الْمَهْرَ، وَمَا لاَ: كَطَلاَقٍ وَإِسْلاَمِهِ وَرِدَّتِهِ وَلِعَانِهِ وَإِرْضَاعِ أُمِّهِ أَوْ أُمِّهَا يُشَطِّرُهُ، ثُمَّ قِيلَ: مَعْنَى التَّشْطِيرِ أَنَّ لَهُ خِيَارَ الرُّجُوعِ، وَالصَّحِيحُ عَوْدُهُ بِنَفْسِ الطَّلاَقِ، فَلَوْ زَادَ بَعْدَهُ فَلَهُ، وَإِنْ طَلَّقَ وَالْمَهْرُ تَالِفٌ فَنِصْفُ بَدَلِهِ مِنْ مِثْلٍ أَوْ قِيمَةٍ، وَإِنْ تَعَيَّبَ فِي يَدِهَا: فَـإِنْ قَنِعَ بِهِ، وَإِلاَّ فَنِصْفُ قِيمَتِهِ سَلِيمًا،

---

ئافرەتەکە بێ: وەك مێردەکە بە هۆی عەیبێکی ئافرەتەکە مارەبڕینەکە هەڵبوەشێنێتەوە، ئەو جیابوونەوەیە (تُسْقِطُ الْمَهْرَ) هەموو مارەیی لە سەر مێردەکە لادەدا.
بەڵام (وَمَا لاَ) ئەو جیابوونەوەی بە هۆی ژنەکە نیەو لە ژنەکەشەوە نیە: (كَطَلاَقٍ) وەك تەلاقدان، هەم (وَإِسْلاَمِهِ) وەك موسوڵمانبوونی مێردەکەو (وَرِدَّتِهِ) کافربوونی مێردەکەو (وَلِعَانِهِ) لەعنەتکردنی مێردەکەو (وَإِرْضَاعِ أُمِّهِ) شیردانی دایکی مێردەکە بە ژنە شیرخۆرەکەی و (أَوْ أُمِّهَا) یان شیردانی دایکی ژنەکە بە مێردە شیرخۆرەکە، ئەو جیابوونەوەیەش (يُشَطِّرُهُ) مارەییەکە دەکاتە نیوە.
(ثُمَّ قِيلَ مَعْنَى التَّشْطِيرِ) ئینجا لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: واتەی کردنە نیوە ئەمەیە: (أَنَّ لَهُ خِيَارَ الرُّجُوعِ) مێردەکە مافی هەیە ئەگەر حەزیکا نیوەی مارەییەکە وەریگرێتەوە، بەڵام (وَالصَّحِيحُ) بە فەرموودەی ڕاست: (عَوْدُهُ بِنَفْسِ الطَّلاَقِ) بە خودی تەلاقدانەکەی پێش جیماع نیوەی مارەییەکە بۆ مێردەکە دەگەڕێتەوە، خوای گەورە دفەرموێ: ﴿وَإِن طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ وَقَدْ فَرَضْتُمْ لَهُنَّ فَرِيضَةً فَنِصْفُ مَا فَرَضْتُمْ﴾ ئەگەر ژنەکانتان تەلاق دان پێش ئەوەی جیماعیان لەگەڵ بکەن و مارەییشتان بۆ دانابون، ئەوە نیوەی ئەو مارەییەی بۆتان داناون لە سەرتان واجبە بیاندەنێ. ئنیجا هۆیەکانی تریش (قیاس) کراونە سەر تەلاقدان، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.
(فَلَوْ زَادَ بَعْدَهُ) جا ئەگەر لە دوای لێکجیابوونەوە مارەییەکە زیادی کرد، ئەوە (فَلَهُ) زێدەییەکە گشتی بۆ مێردەکەیە ئەگەر هەموو مارەییەکەی لە سەر لاچوبێ، یان نیوەی بۆ مێردەکەیە ئەگەر نیوەی بۆ گەڕابێتەوە، جیاوازی نیە زێدەییەکە: لە مارەییەکە جیا ببێتەوە، یان نا، بەڵام (وَإِنْ طَلَّقَ وَالْمَهْرُ تَالِفٌ) ئەگەر ژنەکەی پێش جیماعکردن تەلاق دا، مارەییەکەش لە دەست ژنەکەدا فەوتابو، ئەوە (فَنِصْفُ بَدَلِهِ مِنْ مِثْلٍ أَوْ قِيمَةٍ) نیوەی تۆڵەی مارەییەکە بۆ مێردەکەیە، جا ئەو تۆڵەیەش: وێنەی مارەییەکە بێ، یان نرخەکەی.
(وَإِنْ تَعَيَّبَ فِي يَدِهَا) ئەگەر مارەییەکەی عەیبێ لێپەیدا بوو لە دەستی ژنەکەدا، ئەو کاتە (فَإِنْ قَنِعَ بِهِ) ئەگەر مێردەکە بە عەیبداریەوە بە نیوەییەکەی ڕازی بوو، ئەوە باشەو تۆڵەی عەیبەکەشی نادرێتێ (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر ڕازی نەبو، ئەو کاتە (فَنِصْفُ قِيمَتِهِ سَلِيمًا) نیوەی نرخی مارەییەکەی لە حاڵەتی بێعەیبیدا دەدرێتێ.

وَإِنْ تَعَيَّبَ قَبْلَ قَبْضِهَا فَلَهُ نِصْفُهُ نَاقِصًا بِلاَ خِيَارٍ، فَإِنْ عَابَ بِجِنَايَةٍ وَأَخَذَتْ أَرْشَهَا فَالأَصَحُّ أَنَّ لَهُ نِصْفَ الأَرْشِ، وَلَهَا زِيَادَةٌ مُنْفَصِلَةٌ، وَلَهَا خِيَارٌ فِي مُتَّصِلَةٍ، فَإِنْ شَحَّتْ فَنِصْفُ قِيمَةٍ بِلاَ زِيَادَةٍ، وَإِنْ سَمَحَتْ لَزِمَهُ الْقَبُولُ، وَإِنْ زَادَ وَنَقَصَ كَكِبَرِ عَبْدٍ وَطُولِ نَخْلَةٍ وَتَعَلُّمِ صَنْعَةٍ مَعَ بَرَصٍ: فَإِنِ اتَّفَقَا بِنِصْفِ الْعَيْنِ، وَإِلاَّ فَنِصْفُ قِيمَةٍ،

---

(وَإِنْ تَعَيَّبَ قَبْلَ قَبْضِهَا) ئەگەر مارەییەکە بە خۆی عەیبی لێپەیدا بوو پێش ئەوەی ژنەکە وەری بگرێ، ئەوە (فَلَهُ نِصْفُهُ نَاقِصًا بِلاَ خِيَارٍ) نیوەی مارەییەکە بە عەیبەوە بۆ مێردەکەیەو مافی پەشیمانیشی نیە.

بەڵام (فَإِنْ عَابَ بِجِنَايَةٍ) ئەگەر بە دەستدرێژی کەسێك عەیبێکی لێپەیدا بوو (وَأَخَذَتْ أَرْشَهَا) ژنەکەش تۆڵەی عەیبەکەی وەرگرت، ئەوە (فَالأَصَحُّ أَنَّ لَهُ نِصْفَ الأَرْشِ) مێردەکە نیوەی تۆڵەی عەیبەکەشی لەگەڵ نیوەی مارەییەکە هەیە.

(وَلَهَا زِيَادَةٌ مُنْفَصِلَةٌ) ئەو زێدەییەی لە مارەییەکە جیا دەبێتەوە –ئەگەر لە دوای دانانی مارەیەکەو پێش لێکجیابوونەوەی ژن‌و مێردەکە لە مارەییەکە پەیدا بوبێ– گشتی بۆ ژنەکەیە: وەك میوەو بێچوو و خوری‌و کرێی زەوی‌و ئاژەڵ‌و خانوو، واتە: مێردەکە تەنها خودی‌مارەییەکە، یان نیوەییەکەی وەردەگرێتەوە.

بەڵام زێدەییەکانی دوای لێکجیابوونەوەی ژن‌و مێردەکە بۆ مێردەکەنە: بەو جۆرەی ڕابرا (وَلَهَا خِيَارٌ فِي مُتَّصِلَةٍ) ژنەکە سەرپشکی هەیە لەو زێدەییانەی بە مارەییەکەوەن‌و لێی جیا نابنەوە: وەك قەڵەوی‌و گەورەبوون:

(فَإِنْ شَحَّتْ) جا ئەگەر ژنەکە بەخیلی کردو چاوپۆشی لەو زێدەییە نەکرد، ئەوە (فَنِصْفُ قِيمَةٍ بِلاَ زِيَادَةٍ) نیوەی نرخی‌مارەییەکە –لە حاڵەتی بێ‌زێدەییدا– بۆ مێردەکەیە، بەڵام (وَإِنْ سَمَحَتْ لَزِمَهُ الْقَبُولُ) ئەگەر ژنەکە چاوپۆشی لە زێدەییەکە کرد، واجبە: مێردەکەش قبوڵی بکا.

(وَإِنْ زَادَ وَنَقَصَ) ئەگەر مارەییەکە لە ڕوویێکەوە زیادی کردبو، لە ڕوویێکی‌ترەوە کەمی کردبو: (كَكِبَرِ عَبْدٍ) وەکو گەورەبوونی کۆیلە: بە گەورەبوون بەهێز دەبێ بۆ کارکردن، بەڵام خزمەتی ئافرەتی نامەحرەمی لێقەدەغە دەبێ (وَطُولِ نَخْلَةٍ) وەك درێژبوونی دارخورما: کە بەری کەم دەکاتەوەو داری زۆر دەبێ (وَتَعَلُّمِ صَنْعَةٍ مَعَ بَرَصٍ) وەکو فێربوونی پیشەیەك‌و بەڵەکبوونی کۆیلە، ئەوە لەو حاڵەتەدا (فَإِنِ اتَّفَقَا بِنِصْفِ الْعَيْنِ) ئەگەر هەردووکیان ڕازی بون نیوەی خودی مارەییەکە بۆ مێردەکە بگەڕێتەوە، ئەوە باشە (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر ڕازی نەبون ئەوە (فَنِصْفُ قِيمَةٍ) نیوەی نرخی مارەییەکە –بێ زیادەو کەمی– بۆمێردەکە دەگەڕێتەوە.

وَزِرَاعَةُ الأَرْضِ نَقصٌ وَحَرْثُهَا زِيَادَةٌ، وَحَمْلُ أَمَةٍ وَبَهِيمَةٍ زِيَادَةٌ وَنَقصٌ، وَقِيلَ: الْبَهِيمَةِ زِيَادَةٌ، وَإِطْلاَعُ نَخْلٍ زِيَادَةٌ مُتَّصِلَةٌ، وَإِنْ طَلَّقَ وَعَلَيْهِ ثَمرٌ مُؤَبَّرٌ لَمْ يَلزَمْهَا قَطْفُهُ، فَإِنْ قَطَفَتْ تَعَيَّنَ نِصْفُ النَّخْلِ، وَلَوْ رَضِيَ بِنِصْفِ النَّخْلِ وَتَبْقِيَةِالثَّمَرِ إِلَى جِدَادِهِ أُجْبِرَتْ فِي الأَصَحِّ وَيَصِيرُ النَّخْلُ فِي يَدِهِمَا، وَلَوْ رَضِيَتْ بِهِ فَلَهُ الإِمْتِنَاعُ وَالْقِيمَةُ، وَمَتَى ثَبَتَ خِيَارٌ لَهُ أَوْ لَهَا لَمْ يَمْلِكْ نِصْفَهُ حَتَّى يَخْتَارَ ذُوالإِخْتِيَارِ،

---

(وَزِرَاعَةُ الأَرْضِ نَقصٌ) داچاندنی زەوی کەمکردنەویە (وَحَرْثُهَا زِيَادَةٌ) کێڵانیشی زیادکردنە (وَحَمْلُ أَمَةٍ وَبَهِيمَةٍ) ئاوسبوونی جاریەو ئاژەڵ (زِيَادَةٌ وَنَقصٌ) زێدەبوون و کەمکردنەوەیە ویکرا (وَقِيلَ: الْبَهِيمَةِ زِيَادَةٌ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: ئاوسبوونی ئاژەڵ تەنها زێدەبوونە (وَإِطْلاَعُ نَخْلٍ) دەرکەوتنی هێشوی میوەی دارخورما -لە دوای کردنە مارەیی- کە هێشوەکەشی لەت نەبوبێ (زِيَادَةٌ مُتَّصِلَةٌ) زێدەییەکە بە مارەییەکەوەیەو هەمووی بۆ ژنەکەیە، کەواتە: ژنەکە سەرپشکە لە بەخیلی و چاوپۆشیەکەی پابردوودا.

جا بزانە: گوتمان میوەی درەختی مارەیی -لە دوای کردنە مارەیی- بۆ ژنەکەیە، ئینجا (وَإِنْ طَلَّقَ وَعَلَيْهِ ثَمرٌ مُؤَبَّرٌ) ئەگەر ژنەکەی تەلاق دا، لەو کاتیش هێشوی میوەی دارخورمایەکەی مارەیی لەتبوویی بوو، ئەوە (لَمْ يَلزَمْهَا قَطْفُهُ) لە سەر ژنەکە واجب نیە میوەکەی لێبکاتەوە، بەڵکو مافی هەیە تا کاتی پێگەیشتن بیهێڵێتەوە، بەلام (فَإِنْ قَطَفَتْ) ئەگەر میوەکەی لێکردەوە، ئەو کاتە (تَعَيَّنَ نِصْفُ النَّخْلِ) تەنها نیوەی دارخورمایەکە بۆ مێردەکە دەگەڕێتەوەو میوەکەش هەمووی بۆ ژنەکەیە.

(وَلَوْ رَضِيَ بِنِصْفِ النَّخْلِ وَتَبْقِيَةِ الثَّمَرِ إِلَى جِدَادِهِ) ئەگەر مێردەکە ڕازی بوو نیوەی دارخورمایەکەی بۆ بگەڕێتەوەو میوەکەش تا کاتی لێکردنەوە بە درەختەکەوە بمێنێتەوە (أُجْبِرَتْ فِي الأَصَحِّ) ژنەکە زۆری لێدەکرێ بەو مامڵەتە ڕازی ببێ، لە فەرموودەی ڕاستتردا، جا ئەو کاتە (وَيَصِيرُ النَّخْلُ فِي يَدِهِمَا) هەموو دارخورمایەکە بە هاوبەشی دەکەوێتە دەستی هەردووکیان، بەلام (وَلَوْ رَضِيَتْ بِهِ) ئەگەر ژنەکە بەو مامڵەتەی ڕابردوو ڕازی بوو، ئەوە (فَلَهُ الإِمْتِنَاعُ) مێردەکە بۆی دروستە ڕازی نەبێ و (وَالْقِيمَةُ) داوای نرخی نیوەی دارخورمایەکە بکا.

ئینجا بزانە: هەر درەختێک -لە دوای کردنە مارەیی و پێش تەلاقدان- میوەکەی دەربکەوێ، ئەویش وەکو میوەی لە تبووی دارخورما ئەو بڕیارانەی بۆ دەدرێن، هەروەک لە (تحفة)و (نهاية)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَمَتَى ثَبَتَ خِيَارٌ لَهُ أَوْ لَهَا) هەر کاتێك سەرپشکی بۆ پیاوەکە، یان بۆ ژنەکە هەبێ بە هۆی زێدەو کەمیی مارەییەکە، ئەوە (لَمْ يَمْلِكْ نِصْفَهُ حَتَّى يَخْتَارَ ذُو الإِخْتِيَارِ) مێردەکە نابێتەوە خاوەنی نیوەی مارەییەکە تا خاوەنی سەرپشکیەکە لایەکیان هەڵدەبژێرێ.

وَمَتَى رَجَعَ بِقِيمَةٍ أُعْتُبِرَ الأَقَلُّ مِنْ يَوْمَيِ الإِصْدَاقِ وَالْقَبْضِ، وَلَوْ أَصْدَقَ تَعْلِيمَ قُرْآنٍ وَطَلَّقَ قَبْلَهُ فَالأَصَحُّ تَعَذُّرُ تَعْلِيمِهِ وَيَجِبُ مَهْرُ مِثْلٍ بَعْدَ وَطْءٍ وَنِصْفُهُ قَبْلَهُ، وَلَوْ طَلَّقَ وَقَدْ زَالَ مِلْكُهَا عَنْهُ فَنِصْفُ بَدَلِهِ، فَإِنْ كَانَ زَالَ وَعَادَ تَعَلَّقَ بِالْعَيْنِ فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ وَهَبَتْهُ لَهُ ثُمَّ طَلَّقَ فَالأَظْهَرُ أَنَّ لَهُ نِصْفَ بَدَلِهِ،

---

ئینجا (وَمَتَى رَجَعَ بِقِيمَةٍ) هەر کاتێك مێردەکە نرخی مارەییەکەی وەربگرێتەوە، ئەوە (أُعْتُبِرَ الأَقَلُّ مِنْ يَوْمَيِ الإِصْدَاقِ وَالْقَبْضِ) کەمترەکە ڕەچاو دەکرێ: لە نرخی ڕۆژی کردنە مارەیی‌و نرخی ڕۆژی وەرگرتنی.

(وَلَوْ أَصْدَقَ تَعْلِيمَ قُرْآنٍ) ئەگەر مێردەکە فێرکردنی بەشێکی‌قورئانی کردە مارەیی ژنەکەی، ئەوە دروست دەبێ، چونکە پێغەمبەرﷺ ژنێکی لە پیاوێك مارە کردو فەرمووی: ﴿زَوَّجْتُكَهَا بِمَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ﴾ رواه الشيخان، کردمە جووت لەگەڵ تۆ فێرکردنی ئەوەندە قورئانەی بە خۆت دەیزانی مارەییی بێ.

(وَ) هەر کاتێك (طَلَّقَ قَبْلَهُ) ژنەکەی تەڵاق دا پێش ئەوەی بەشە قورئانەکەی فێر بکا، ئەوە (فَالأَصَحُّ تَعَذُّرُ تَعْلِيمِهِ) بە فەرموودەی ڕاستتر: فێرکردنەکەی زەحمەتەو ناگونجێ؟ چونکە ژنەکە بۆتە بێگانەو تەماشاکردن‌و لەگەڵ مانەوەیی بە تەنها حەرامە، کەوابو: (وَيَجِبُ مَهْرُ مِثْلٍ بَعْدَ وَطْءٍ) لەو حاڵەتەدا لە دوای جیماعکردن مارەیی هاوێنە لە سەر مێردەکە بۆ ژنەکە واجب دەبێ‌و (وَنِصْفُهُ قَبْلَهُ) پێش جیماعکردنیش نیوەیی واجب دەبێ.

ئینجا بزانە: ئەوە لەحاڵەتێکدا بوو وای‌دانابێ بە خۆی فێری بکا، بەڵام ئەگەر فێرکردنەکەی خستبێتە ئەستۆی خۆی، ئەو کاتە واجبە: ئافرەتێك، یان مەحرەمێکی بۆ بەکرێ بگرێ تاکو بەشە قورئانەکەی واجببووی فێر بکا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلَوْ طَلَّقَ) ئەگەر پێش جیماعکردن ژنەکەی تەڵاق دا، ژنەکەش مارەییەکەی وەرگرتبو، هەم (وَقَدْ زَالَ مِلْكُهَا عَنْهُ) مارەییەکەش لە ملکایەتی ژنەکەدا نەمابو: وك فرۆشتبێتی، یان بەخشیبێتی، ئەو کاتە (فَنِصْفُ بَدَلِهِ) نیوەی تۆڵەی مارەییەکە دەدرێتەوە مێردەکە، بەڵام (فَإِنْ كَانَ زَالَ وَعَادَ) ئەگەر لە ملکایەتی ژنەکە لاچوبێ‌و دووبارە گەڕابێتەوە ملکایەتی ژنەکە، ئەو کاتە (تَعَلَّقَ بِالْعَيْنِ فِي الأَصَحِّ) مێردەکە دەست بە خودی مارەییەکەوە دەگرێ‌و نیوەیی وەردەگرێتەوە لە فەرموودەی‌ڕاستتردا.

(وَلَوْ وَهَبَتْهُ لَهُ ثُمَّ طَلَّقَ) ئەگەر مارەییە دیارکراوەکەی بەخشی‌بوە مێردەکەی، ئینجا مێردەکەش لە دوای وەرگرتنی مارەییەکە ژنەکەی تەڵاق دا، ئەوە (فَالأَظْهَرُ أَنَّ لَهُ نِصْفَ بَدَلِهِ) بە فەرموودەی بەهێزتر: مێردەکە نیوەی تۆڵەی مارەییەکەشی لە سەر ژنەکە

وَعَلَى هَذَا لَوْ وَهَبَتْهُ النِّصفَ فَلَهُ نِصْفُ الْبَاقِي وَرُبْعُ بَدَلِ كُلِّه، وَفِي قَوْلٍ النِّصْفُ الْبَاقِي، وَفِي قَوْلٍ يَتَخَيَّرُ بَيْنَ بَدَلِ نِصْفِ كُلِّه أَوْ نِصْفِ الْبَاقِي وَرُبْعِ بَدَلِ كُلِّه، وَلَوْ كَانَ دَيْنًا فَأَبْرَأَتْهُ لَمْ يَرْجِعْ عَلَيْهَا عَلَى الْمَذْهَبِ، وَلَيْسَ لِوَلِيٍّ عَفْوٌ عَنْ صَدَاقٍ عَلَى الْجَدِيدِ.
(فَصْلٌ) لِمُطَلَّقَةٍ قَبْلَ وَطْءٍ مُتْعَةٌ إِنْ لَمْ يَجِبْ شَطْرُ مَهْرٍ،

---

هەیە، چونکە پێش تەڵاقدان مێردەکە بووەتەوە خاوەنی مارەییەکە، کەوابو: بە هۆی تەڵاقدانیش نیوەی مارەییەکەی بۆ دەگەڕێتەوە، مارەییەکەش بە فەوتاو دادەندرێ، کەواتە: نیوەی تۆڵەی مارەییەکەشی لە سەر ژنەکەیە.

(وَعَلَى هَذَا) جا لەسەر ئەم فەرموودە بەهێزترە: (لَوْ وَهَبَتْهُ النِّصْفَ) ئەگەر ژنەکە نیوەی مارەییە دیارکراوەکەی بەخشیبێتە مێردەکەی، ئەو کاتەش (فَلَهُ نِصْفُ الْبَاقِي وَرُبْعُ بَدَلِ كُلِّه) مێردەکە نیوەی ئەو بەشەی ماوەتەوەو چوارێکی تۆڵەی هەموو مارەییەکەشی دەدرێتێ (وَفِي قَوْلٍ النِّصْفُ الْبَاقِي) لە فەرموودەیەکدا: ئەو نیوەیەی ماوەتەوە هەمووی دەدرێتێ (وَفِي قَوْلٍ يَتَخَيَّرُ) لە فەرموودەیەکیشدا مێردەکە سەرپشکە: (بَيْنَ بَدَلِ نِصْفِ كُلِّه أَوْ نِصْفِ الْبَاقِي وَرُبْعِ بَدَلِ كُلِّه) لە نێوان تۆڵەی نیوەی هەموو مارەییەکەو نیوەی ئەو بەشەی ماوە لەگەڵ چوارێکی تۆڵەی هەمووی.

جا بزانە: ئەوەیڕابردوو لە حاڵەتێکدا بوو کە مارەییەکە دیارکراو بێ، بەڵام (وَلَوْ كَانَ دَيْنًا) ئەگەر مارەییەکە قەرز بوو (فَأَبْرَأَتْهُ) ژنەکەش گەردەنی لە مارەییە قەرزەکە ئازاد کرد، ئینجا لە دوای گەردەن ئازادکردنەکە پێش جیماعکردن تەڵاقیدا، ئەوە (لَمْ يَرْجِعْ عَلَيْهَا عَلَى الْمَذْهَبِ) نابێ مێردەکە بگەڕێتەوە سەر ژنەکە، واتە: دروست نیە هیچیتری لێوەربگرێ لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب، چونکە مێردەکە هیچی لەدەست نەچوەو، ژنەکەش هیچی لێوەرنەگرتوە.

(وَلَيْسَ لِوَلِيٍّ عَفْوٌ عَنْ صَدَاقٍ) هیچ سەرپەرشتکارێك بۆی دروست نیە: لە مارەیی ژنەکە مێردەکەی عەفو بکاو لێی وەرنەگرێ (عَلَى الْجَدِيد) لە سەر فەرموودەی نوێ، چونکە ئەو مافە مافی ژنەکەیە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِلاَّ أَنْ يَعْفُونَ أَوْ يَعْفُوَا الَّذِي بِيَدِهِ عُقْدَةُ النِّكَاحِ﴾ مەگەر ژنەکان مێردەکە عەفو بکەن‌و هیچ مارەیی لێوەرنەگرن، یان ئەو مێردەی مارەبڕینی بە دەستە ژنەکە عەفو بکاو نیوەمارەیی‌ی لێوەرنەگرێتەوە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی (الْمُتْعَةُ)، واتە: بەخشیشی تەڵاقدان ﴾

(لِمُطَلَّقَةٍ قَبْلَ وَطْءٍ مُتْعَةٌ) ئەو ژنەی پێش جیماعکردن تەڵاقدراوە، مافی (مُتْعَة)ی هەیە، واتە: واجبە: مێردەکەی بەخشیشێکی بداتێ بە هۆی ئەو دڵتەنگکردنە (إِنْ لَمْ يَجِبْ شَطْرُ مَهْرٍ) بەو مەرجەی ژنەکە نیوە مارەیی‌ی بۆ واجب نەبوبێ لە سەر مێردەکەی: وەك کاری

وَكَـــذَا لِمَوْطُـــوءَةٍ فِي الأَظْهَـــرِ، وَفُرْقَـــةٌ لاَ بِسَـــبَبِهَا كَطَـــلاَقٍ، وَيُسْتَحَبُّ أَنْ لاَ تَـنْقُصَ عَـنْ ثَلاَثِـينَ دِرْهَمًـا، فَـإِنْ تَنَازَعَـا قَـدَّرَهُ الْقَاضِـي بِنَظَـرِهِ مُعْتَبِـرًا حَالَهُمَـا، وَقِيـلَ حَالَـهُ، وَقِيـلَ حَالَهَـا، وَقِيـلَ أَقَـلُّ مَـالٍ.

(فَصْلٌ) اخْتَلَفَا فِي قَدْرِ مَهْرٍ أَوْ صِفَتِهِ تَحَالَفَا،

---

خۆی دابێـته دەست سەرپەرشتكارەكەی‌و پێش جیماعكردن تـەڵاق درابـێ، واتـە: ئەگـەر پـێش جیمـاعكردن نیـوە مـارەیی بـۆ واجـب بوبـێ، ئینجـا تـەڵاق بـدرێ ئـەوە مـافی بەخشیشەكەی نیە (وَكَذَا لِمَوْطُوءَةٍ) هەروەها ئـەو ژنـەی پـاش جیمـاع لـە گـەڵ كردنیش تـەڵاق دراوە، واجبـە: بەخشیشـی تەڵاقدانەكـەی بـدرێتێ (فِي الأَظْهَرِ) لـە فـەرموودەی بەهێزتردا، خوای‌گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلِلْمُطَلَّقَاتِ مَتَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ﴾ تەڵاقدراوەكان مـافی بەخشیشی تەڵاقدانیان هەیە بەگوێرەی هەبوویی مێردەكەو لێوەشانەوەی ژنەكە.

(وَفُرْقَةٌ لاَ بِسَبَبِهَا) ئەو لێكجیابوونەوەیەی كە بە هۆی ژنەكە نەبێ، ئەویش (كَطَلاَقٍ) وەك تەڵاقدان بڕیاری بەخشیشەكەی بۆ دەدرێ.

(وَيُسْتَحَبُّ أَنْ لاَ تَنْقُصَ عَنْ ثَلاَثِينَ دِرْهَمًا) سوننەتە: بەخشیشـەكە لـە نرخـی سـی دیرهـەم، واتە: بیست‌و یەك میسقالی زیو كەمتر نەبێ، بەڵام لای كەمی كە دروست بێ: شتێكە بە ماڵ دابنـدرێ، ئینجـا (فَـإِنْ تَنَازَعَـا) ئەگـەر ژن‌و مێردەكـە لـە ئەنـدازەی بەخشیشـەكەدا بـووە كێشەیان، ئەو كاتە (قَدَّرَهُ الْقَاضِي بِنَظَرِهِ) قازی بـە بۆچـوونی‌خۆی ئەنـدازەی بەخشینەكە دادەنێ (مُعْتَبِرًا حَالَهُمَا) لـەو دانانەشـدا حـاڵی ژنەكـەو مێردەكـە ڕەچـاو دەكـا، بەبەڵگـەی ئایەتەكەی‌ڕابردوو (وَقِيلَ حَالَهُ) لە فەرموودەیەكی بێ‌هێزدا: حاڵی مێردەكە (وَقِيلَ حَالَهَا) لە بێ‌هێزێكی‌تردا: حاڵی ژنەكە (وَقِيلَ أَقَلُّ مَالٍ) لە بێ‌هێزێكی‌تردا: كەمترین ماڵ دادەنێ.

جا بزانە: لە (فتاوی)ی ئیمامی (النـواوی)دا هـاتوە: پێویستە ئافرەتـان لـە بڕیـاری ئـەم بەخشیشـە ئاگـادار بكرێنـەوە، چونكە نـازانن ئـەم بەخشیشـەیان لـە سـەر مێردەكـەیان واجبە، هەروەك لە (مغنی)دا گێڕاویەتیەوە.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی كێشەی ژن‌و مێرد لە مارەییدا ﴾

(اخْتَلَفَا فِي قَدْرِ مَهْرٍ) هەر كاتێك ژنەكەو مێردەكە بووە كێشەیان لە ئەندازەی مارەییەكـەدا: وەك مێردەكە بڵێ: هەزار دینارە. ژنەكەش بڵێ: دوو هەزارە (أَوْ صِفَتِهِ) یان بـوە كێشـەیان لە چۆنیەتی مارەییەكەدا: وەك مێردەكە بڵێ: پانزە میسـقاڵ زیـوە. ژنەكـەش بڵـێ: پـانزە میسقاڵ زێڕە. یان مێردەكە بڵێ: بە قەرزە. ژنەكەش بڵێ بە حازرە. لـەو كێشەیەشـدا هـیچ لایـەكیان شـاهیدی نـەبو، ئـەوە (تَحَالَفَا) هـەردووكیان سـوێند بـۆ یـەكتری دەخـۆن، بـەو شێوەیەی لە كێشەی كڕیارو فرۆشیاردا ڕابرا.

وَيَتَحَالَفُ وَارِثَاهُمَا أَوْ وَارِثُ وَاحِد وَالآخَرُ ثُمَّ يُفسَخُ الْمَهْرُ وَيَجِبُ مَهْرُمِثْلٍ، وَلَوْ ادَّعَتْ تَسْمِيَةً فَأَنْكَرَهَا تَحَالَفَا فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ ادَّعَتْ نِكَاحًا وَمَهْرَمِثْلٍ فَأَقَرَّ بِالنِّكَاحِ وَأَنْكَرَ الْمَهْرَ أَوْ سَكَتَ فَالأَصَحُّ تَكْلِيفُهُ الْبَيَانَ، فَإِنْ ذَكَرَ قَدْرًا وَزَادَتْ تَحَالَفَا، وَإِنْ أَصَرَّ مُنْكِرًا حَلَفَتْ وَقَضَى لَهَا، وَلَوْ اخْتَلَفَ فِي قَدْرِهِ زَوْجٌ وَوَلِيُّ صَغِيرَةٍ أَوْمَجْنُونَةٍ تَحَالَفَا فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ قَالَتْ نَكَحَنِي يَوْمَ كَذَا بِأَلْف وَيَوْمَ كَذَا بِأَلْف،

---

هەم (وَيَتَحَالَفُ وَارِثَاهُمَا) میراتگرەكانی هەردووكیشیان-ئەگەر بووە كێشەیان- ئەوانیش سوێند بۆ یەكتری دەخۆن (أَوْ وَارِثُ وَاحِدٍ وَالآخَرُ) یان میراتگری یەكێكیانو لایەكەیتر سوێند بۆ یەكتری دەخۆن (ثُمَّ) ئینجا لە هەموو ئەو مەسەلانەدا لە دوایسوێندخواردنەكە (يُفسَخُ الْمَهْرُ) مارەییەكە هەڵدەوەشێندرێتەوەو (وَيَجِبُ مَهْرُ مِثْلٍ) مارەیی هاووێنە لە سەر مێردەكە بۆ ژنەكە واجب دەبێ، هەر چەند لە داواكراوەكەی ژنەكەش زۆرتر بێ.

(وَلَوْ ادَّعَتْ تَسْمِيَةً) ئەگەر ژنەكە داوای ناوهێنانی مارەییەكی زیاتر لە مارەیی هاووێنەی دەكرد (فَأَنْكَرَهَا) مێردەكەش گوتی ناوی نەهێندراوە. ئەو كاتەش (تَحَالَفَا) هەردووكیان سوێند بۆ یەكتری دەخۆن (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونكە ئەنجامی كێشەكە لە ئەندازەی مارەییەكەدایە، كەواتە: مارەیی هاووێنە واجب دەبێ.

(وَلَوْ ادَّعَتْ نِكَاحًا وَمَهْرَ مِثْلٍ) ئەگەر ژنەكە داوای مارەبڕینو مارەیی هاووێنەی كرد (فَأَقَرَّ بِالنِّكَاحِ) مێردەكەش دانی بە مارەبڕینەكەدا هێنا، بەڵام (وَأَنْكَرَ الْمَهْرَ أَوْ سَكَتَ) دانی بە مارەییەكەدا نەهێنا، یان بێدەنگ بوو، ئەوە (فَالأَصَحُّ تَكْلِيفُهُ الْبَيَانَ) بە فەرموودەی ڕاستتر: مێردەكە داوای ڕوونكردنەوەی مارەییەكەی لێدەكرێ، چونكە مارەبڕین مارەیی دەوێ، جا (فَإِنْ ذَكَرَ قَدْرًا) ئەگەر مێردەكە ئەندازەیەكی مارەییەكەی گوتو (وَزَادَتْ) ژنەكەش گوتی: لەو ئەندازەیە زیاترە، ئەو كاتە (تَحَالَفَا) هەردووكیان سوێند بۆ یەكتری دەخۆن، واتە: ئینجا مارەیی هاووێنە واجب دەبێ، چونكە ئەم كێشەیەش لە ئەندازەی مارەییەكەدایە، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

بەڵام (وَإِنْ أَصَرَّ مُنْكِرًا) ئەگەر مێردەكە سوور بوو لە سەر داننەهێنانەكەی، یان هەر بێدەنگ بوو، ئەو كاتە (حَلَفَتْ وَقَضَى لَهَا) ژنەكە سوێندی گەڕاندرایەوە دەخواو بڕیاری مارەیی هاووێنەی بۆ دەدرێ لە سەر مێردەكەی (وَلَوْ اخْتَلَفَ فِي قَدْرِهِ زَوْجٌ وَوَلِيُّ صَغِيرَةٍ أَوْمَجْنُونَةٍ) ئەگەر مێردەكەو سەرپەرشتكاری ژنێكی منداڵ، یان شێت بووە كێشەیان لە ئەندازەی مارەییەكەدا، ئەوانەش (تَحَالَفَا فِي الأَصَحِّ) سوێند بۆ یەكتری دەخۆن لە فەرموودەی ڕاستتردا، واتە: ئینجا مارەیی هاووێنە واجب دەبێ.

(وَلَوْ قَالَتْ نَكَحَنِي يَوْمَ كَذَا بِأَلْفٍ وَيَوْمَ كَذَا بِأَلْفٍ) ئەگەر ژنەكە گوتی: فلانە ڕۆژە لە خۆی مارە كردم بە هەزار دینار مارەیی، فلانە ڕۆژەش لە خۆی مارەكردم بە هەزار دینار مارەیی. ئینجا

وَثَبتَ الْعَقْدَان بِإقْرَارِه أَوْ بَيِّنَة لَزِمَهُ أَلْفَان، فَإنْ قَالَ لَمْ أَطَأْ فِيهِمَا أَوْ فِي أَحَدِهِمَا صُدِّقَ بِيَمينه وَسَقَطَ الشَّطْرُ، وَإِنْ قَالَ كَانَ الثَّاني تَجْديدَ لَفْظٍ لاَ عَقْدًا لَمْ يُقْبَل. (فَصْلٌ) وَلِيمَةُ الْعُرْسِ سُنَّةٌ، وَفِي قَوْلٍ أَوْ وَجْه وَاجِبَةٌ،

---

(وَثَبتَ العَقْدَانِ بِإقْرَارِه أَوْ بَيِّنَةٍ) هەردوو مارەبڕینەكانیش ئاشكرا بون: بە دانپێداهێنانی خۆی، یان بە شاهیدیی دوو پیاو، یان بە سوێندخواردنی ژنەكە پاش ئەوەی مێردەكە سوێندی نەخوارد، ئەوە(لَزِمَهُ أَلْفَانِ) هەردوو هەزارەكانی لە سەر واجب دەبن بۆ ژنەكە، چونكە دەگونجێ تەڵاقێكی كەوتبێ‌و لە دوای تەواوبوونی(عِدَّة) مارەی كردبێتەوە.

بەڵام (فَإِنْ قَالَ لَمْ أَطَأْ فِيهِمَا أَوْ فِي أَحَدِهِمَا) ئەگەر مێردەكە گوتی: لەو دوو مارەبڕینانەدا لە هیچێكیان جیماعم لەگەڵ نەكردوە. یان گوتی: لە یەكێكیاندا جیماعم لەگەل نەكردوە. ئەو كاتە (صُدِّقَ بِيَمِينِه) بە سوێندخواردن باوەڕی پێدەكرێ‌و (وَسَقَطَ الشَّطْرُ) نیوەی مارەیی لە سەر لادەچێ: لە هەردووكیاندا، یان لە یەكێكیاندا (وَإِنْ قَالَ كَانَ الثَّانِي تَجْدِيدَ لَفْظٍ) ئەگەر مێردەكە گوتی: مارەبڕینەكەی دووەم نوێكردنەوەی ووشەی مارەبڕینەكە بوو (لاَ عَقْدًا) مارەبڕینی بە ڕاستی نەبو، ئەوە (لَمْ يُقْبَل) لێی قبوڵ ناكرێ.

﴿ پاشكۆ ﴾: ئەگەر شتێكی دابوە ژنەكەی، ئینجا گوتی: ئەوە مارەیی بوو. ژنەكەش گوتی: نا، بەڵكو دیاری بوو. ئەوە بە سوێندخواردن باوەڕ بە مێردەكە دەكرێ هەر چەند شتەكەش لە ڕەگەزی مارەیی نەبێ، هەروەك لە زۆربەی سەر چاوەكاندافەرموویانە.

ئینجا بزانە: ئەگەر ئافرەتێكی داخواز كرد، جا پێش مارەبڕین چەند شتێكی ناردە ماڵی ئافرەتەكە، یان لەگەڵ خۆیا بردی بە مەبەستی مارەبڕین، نەك بە خۆڕایی، بەڵام داخوازیەكە سەری نەگرت‌و لایەنێكیان، یان هەردووكیان پەشیمان بونەوە، ئەوە بۆی دروستە: هەموو دیاریەكان بۆ خۆی بگەڕێنێتەوە، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

ئیتر لە سەرەتای (بەخشین)دا چەند كێشەكمان لەم بابەتە باس كردن، لە باسی (بەخێوكردنی ژن)دا -إن شاءالله- چەند مەسەلەیەكی‌تر باس دەكەین، پێویستە لێیان ئاگادار بن.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی زیافەتی بوك گواستنەوە ﴾

(وَلِيمَةُ الْعُرْسِ سُنَّةٌ) زیافەتی بوك گواستنەوە سوننەتێكی (مُؤَكَّدَة)یە، چونكە پێغەمبەرﷺ بەخۆی كردویەتی‌و فەرمانیشی پێكردوە (وَفِي قَوْلٍ أَوْ وَجْهٍ وَاجِبَةٌ) لە فەرمودەیەكدا: زیافەتی بوك گواستەوە واجبە.

جا بزانە: لای كەمی زیافەتەكە بە هەر جۆرە خواردنێك بێ پێك دێ ﴿عن صفية بنت شيبة رضي الله عنها: أَوْلَمَ النَّبِيُّﷺ عَلَى بَعْضِ نِسَائِه بِمُدَّيْنِ مِنْ شَعِيرٍ﴾ رواه البخاري، پێغەمبەرﷺ لە بوك گواستنەوەیەكیخۆیدا بە دوو مستە جۆ زیافەتی كرد. هەروەها لای كەمی زیافەتی تەواو مەڕێكە ﴿عن أنسﷺ: لَمَّا تَزَوَّجَ عَبْدُالرَّحْمن بن عوف قال لَهُ النَّبِيُّﷺ: بَارَكَ اللهُ لَكَ، أَوْلِمْ

وَالإِجَابَةُ إِلَيْهَا فَرْضُ عَيْنٍ، وَقِيلَ كِفَايَةٍ وَقِيلَ سُنَّةٌ، وَإِنَّمَا تَجِبُ أَوْ تُسَنُّ بِشَـرْطِ أَنْ لاَ يَخُصَّ الأَغْنِيَاءَ،

---

وَلَوْ بِشَاةٍ﴾ رواه الشيخان، كه (عبدالرحمن) ژنی مارەكرد پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوا لێتی پیرۆز بكا، زیافەتی بوك گواستنەوە بكە هەر چەند بە یەك مەڕیش بێ.
ئینجا بزانە: كاتی ئەم زیافەتە لە مارەبڕینەوە دەست پێدەكا، بەڵام سوننەتە: لە دوای بە زاوابوون زیافەتەكە بكرێ، كاتی ئەم زیافەتەش هەر بەردەوامەو بە درێژایی تەمەن كۆتایی نایێ، جا ئەگەر دوو ژن، یان زیاتری وێكڕا گواستنەوە، ئەوە ئەگەر بە یەك زیافەت هەموویانی مەبەست بێ، لە لای ئیمامی(الأذرعي) سوننەتەكە پێك دێ، ئەگەر نا، سوننەتە: هەر بوكێك زیافەتێكی سەربەخۆی بۆ بكرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە.
(وَالإِجَابَةُ إِلَيْهَا فَرْضُ عَيْنٍ) وەڵامدانەوە، واتە: چوون بۆ زیافەتی بوك گواستنەوە بە (فَرْض الْعَيْن) واجبە: لە سەر هەر كەسێكی دەعوەت كرابێ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿شَرُّالطَّعَامِ طَعَامُ الْوَلِيمَةِ يُدْعَى إِلَيْهَاالأَغْنِيَاءُ وَيُتْرَكُ الْفُقَرَاءُ وَمَنْ تَرَكَ الدَّعْوَةَ فَقَدْ عَصَى اللهَ وَرَسُولَهُ﴾ رواه الشيخان، خراپترین خواردەمەنی خواردەمەنیی بوك گواستنەوەیە؟ چونكە دەوڵەمەندەكان دەعوەت دەكرێنو هەژارەكانیش دەعوەت ناكرێن، جا هەركەسێك وەڵامی دەعوەتی بوك گواستنەوە نەداتەوە، بە ڕاستی بەرامبەر خواو پێغەمبەر ﷺ گوناهی كردوە.
(وَقِيلَ كِفَايَةٍ) لە فەرمودەیەكی بێهێزدا: چونەكە (فرض الكفاية)یە (وَقِيلَ سُنَّةٌ) لە بێهێزێكیتردا: چوونەكە سوننەتە.
ئینجا بزانە:-جگە لە زیافەتی بوك گواستنەوە- زیافەتی قورئان ختمكردنو كتێب تەواوكردنیش سوننەتە: بە ناوی (اَلْحَذاق)، هەم زیافەتی گەڕانەوە لە سەفەر: بە ناوی (النَّقِيعَة)، هەروەك لە پاشكۆیەكانی بێدەستنوێژیو نوێژی ڕێبواردا ڕابران، هەم زیافەتی خانوو دروستكردنو كڕین: بە ناوی (اَلْوَكِيرَة)، هەم زیافەتی منداڵبوون: بە ناوی (اَلْعَقِيقَة)، هەم زیافەتی كوڕ سوننەتكردن: بە ناوی (الأعذار)، جگە لەوانەش: كە لە (مغنی)دا ژماردونی، دیسان بزانە: وەڵامدانەوەی دەعوەتەكانیتری جگەلە بوك گواستنەوە واجب نیە، بەڵكو سوننەتە، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.
(وَإِنَّمَا تَجِبُ أَوْ تُسَنُّ) چوون بۆ زیافەتی بوك گواستنەوە-كە واجبە، یان سوننەتە- بە چەند مەرجێكە: (بِشَرْطِ أَنْ لاَ يَخُصَّ الأَغْنِيَاءَ) بەو مەرجەی بە تایبەتی دەوڵەمەندەكان دەعوەت نەكا، چونكە لە حەدیسەكەیڕابردوودا ئەو جۆرە زیافەتە بە خراپترین زیافەت داندراوە، بەڵام ئەگەر دەعوەتی دەوڵەمەندەكان بە هۆی دەوڵەمەندی نەبو؟ بەڵكو بە تایبەتی: هاوپیشەكانیخۆی، یان دراوسێكانی، یان خزمو عەشیرەتەكەیخۆی دەعوەت

وَأَنْ يَدْعُوَهُ فِي الْيَوْمِ الأَوَّلِ، فَإِنْ أَوْلَمَ ثَلاَثَةً لَمْ تَجِبْ فِي الثَّانِي، وَتُكْرَهُ فِي الثَّالِثِ، وَأَنْ لاَ يُحْضِرَهُ لِخَوْفٍ أَوْ طَمَعٍ فِي جَاهِهِ، وَأَنْ لاَ يَكُونَ ثَمَّ مَنْ يَتَأَذَّى بِهِ أَوْ لاَ يَلِيقُ بِهِ مُجَالَسَتُهُ وَلاَ مُنْكَرٌ،

---

کردن، ئەوانەش گشتی دەوڵەمەند بون، ئەو کاتە خراپ نیەو واجبە: بچێتە سەر زیافەتەکە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە:

(وَ) هەروەها مەرجە: (أَنْ يَدْعُوَهُ) بە تایبەتی دەعوەتی بکا: بەخۆی یان بە نووسراوێك، یان ناردنی باوەڕپێکراوێك، واتە: ئەگەر دەرگەی ماڵیخۆی کردەوەو گوتی: هەر کەسێك حەز دەکا با بێتە سەر زیافەت، ئەو کاتە دروستە نەچێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

هەروەها مەرجە: دەعوەتکردنەکەش (فِي الْيَوْمِ الأَوَّلِ) لە ڕۆژییەکەمی زیافەتەکە بێ (فَإِنْ أَوْلَمَ ثَلاَثَةً) ئەگەر بە بێعوزر سێ ڕۆژان زیافەتی کرد، ئەو کاتە (لَمْ تَجِبْ فِي الثَّانِي) لە ڕۆژیدووەمدا لە سەری واجب نیە بچێ، بەڵکو سوننەتە، بەڵام (وَتُكْرَهُ فِي الثَّالِثِ) ناپەسندە لە ڕۆژیسێیەمدا بچێ، ئینجا بزانە: ئەگەر سێ ڕۆژەکان بە هۆی زۆریی خەڵكو بەرتەنگی ماڵەکەی بوو، یان لە هەر ڕۆژێکدا بە تایبەتی جۆرە خەڵکێکیدەعوەت دەکرد، ئەو کاتە ناپەسند نیە، بەڵکو واجبە بچێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)و حاشیەکانیاندا فەرموویانە.

(وَ) هەروەها مەرجە (أَنْ لاَ يُحْضِرَهُ لِخَوْفٍ) بە هۆی لێترسان دەعوەتی نەکا (أَوْ طَمَعٍ فِي جَاهِهِ) یان تەماع لە سودوەرگرتنی پلەو پایەی نەکا، بەڵکو تەنها لە بەر لێك نزیکبوونەوەو خۆشویستن بێ، ئینجا بزانە: پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِذَا اجْتَمَعَ الدَّاعِيَانِ فَأَجِبْ أَقْرَبَهُمَا بَاباً، وَإِنْ سَبَقَ أَحَدُهُمَا فَأَجِبِ الَّذِي سَبَقَ﴾ رواه احمد وابوداود بسند صالح، هەر کاتێك دوو کەس وێکڕا دەعوەتیان کردی، ئەوە کامەیان نزیکترە: بە خزمایەتی، یان بە دراوسێیی، وەڵامی ئەویان بدەوە، بەڵام ئەگەر یەکێکیان پێشتر دەعوەتی کردی، ئەو کاتە وەڵامی پێشکەوتووەکە بدەوە.

هەروەها مەرجە: زیافەتکەرەکە موسوڵمان بێو ستەمکارو فاسقو پیاوخراپ نەبێو هەم دەعوەتکراوەکەش عوزرێکی نوێژ بە جەماعەتنەکردنی نەبێ.

هەم (وَأَنْ لاَ يَكُونَ ثَمَّ مَنْ يَتَأَذَّى بِهِ) مەرجە شوێنی زیافەتەکەش کەسێکی وەهای لێنەبێ کە دەعوەتکراوەکە پێی توشی ئازارو دڵتەنگی ببێ: بە هۆی دوژمنایەتی، یان سوکایەتیی پێ بکا (أَوْ لاَ يَلِيقُ بِهِ مُجَالَسَتُهُ) یان دانیشتن لەگەڵ ئەو جۆرەکەسانەدا شیاوی دەعوەتکراوەکە نەبێ: وەك گاڵتەچیو گۆرانیبێژو سوكوچروکەکانیتر.

هەم (وَلاَ مُنْكَرٌ) لە شوێنی زیافەتەکەشدا شتی بێشەرعی نەبێ: وەك تێکەڵبوونی ئافرەتو پیاوی نامەحرەم، یان تەنها تەماشای یەکتری بکەن، یان تەپڵو زوڕناو موسیقاو ئەو جۆرە

فَإِنْ كَانَ يَزُولُ بِحُضُورِهِ فَلْيَحْضُرْ، وَمِنَ الْمُنْكَرِ: فِرَاشُ حَرِيرٍ وَصُورَةُ حَيَوَانٍ عَلَى سَقْفٍ أَوْ جِدَارٍ أَوْ وِسَادَةٍ أَوْ سِتْرٍ أَوْ ثَوْبٍ مَلْبُوسٍ،

---

شتانه بەکار بێ، بەڵام (فَإِنْ كَانَ يَزُولُ بِحُضُورِهِ) ئەگەر بە ئامادەبوونی وی ئەو بێشەرعی‌یە لادەچو، ئەوکاتە (فَلْيَحْضُرْ) واجبە: ئامادە ببێ، تاکو وەڵامدانەوەی دەعوەت‌و لابردنی بێشەرعی وەدەست بێنێ، جا ئەگەر نەیزانی ئەو بێشەرعی‌یە هەیە تا لە شوێنەکە ئامادە بوو، ئەوکاتە قەدەغەیان دەکا لە بێشەرعیەکە، جا ئەگەر وازیان لێنەهێنا، ئەوکاتە واجبە: لە شوێنەکە بڕواتە دەرەوە، مەگەر لە خۆی بترسێ، ئەوکاتە با بمێنێتەوەو بە دڵیش ڕقی لێی ببێتەوەو لەگەڵ ئەوانش دانەنیشێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

## ﴿ باسی هەبوونی وێنەو، وێنە دروستکردن ﴾

(وَمِنَ الْمُنْكَرِ) هەندێك لە بێشەرعیەکانی‌دەعوەت (فِرَاشُ حَرِيرٍ) ڕایەخی ئاوریشمە، هەروەك لە باسی (جل‌وبەرگ)دا ڕوونمان کردوە، هەم (وَصُورَةُ حَيَوَانٍ) هەبوونی وێنەی گیانلەبەرە: وەکو ئادەمیزادو ئاژەڵ‌و باڵندە -کە بە شێوەی ڕێزلێنانەوە داندرابێ-: وەك (عَلَى سَقْفٍ) بە سەر بانێکەوە بێ (أَوْ جِدَارٍ) یان بە دیوارێکەوە (أَوْ وِسَادَةٍ) یان بالیفی پاڵوێدان (أَوْ سِتْرٍ) یان پەردەیەکی هەڵواسراو (أَوْ ثَوْبٍ مَلْبُوسٍ) یان جلێکی دەبەرکراو، هەرچەند لە سەر زەویش داندرا بێ ﴿عن عائشةرضي‌الله عنها: قَدِمَ النَّبِيُّ ﷺ مِنْ سَفَرٍ وَقَدْ سَتَرْتُ عَلَى بَابِي دُرْنُوكاً فِيهِ الْخَيْلُ ذَوَاتُ الأَجْنِحَةِ فَأَمَرَنِي فَنَزَعْتُهُ﴾ وفي‌رواية: ﴿فَقَطَعْنَا مِنْهُ وِسَادَةً أَوْ وِسَادَتَيْنِ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ لە سەفەر هاتەوە، منیش پەردەیەکەم بە سەر دەرگاکەم دادابو، وێنەی ئەسپی بە باڵی تێدابو، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردم: پەردەکەم لێکردەوە، ئینجا پەردەکەمان [illegible] پارچە، سەرینێك، یان دوو سەرینمان لێدروست کردن. هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْمَلاَئِكَةَ لاَتَدْخُلُ بَيْتاً فِيهِ الصُّوَرُ﴾ رواه الشيخان، مەلائیکەی ڕەحمەت ناچنە ناو ئەو ژوورەی وێنەی تێدایە.

ئینجا بزانە: (شرح مسلم)و (تحفة) لە سەر ئەو فەرموودەنە: کە ئەگەر وێنەکە حەرامیش نەبێ، (ملائکة)ی ڕەحمەت هەر ناچنە ژوورەکە، ئەم حەدیسەش پاڵپشتیانە، بەڵام ئیمامی (الخطابي)و قازی (عیاض)و ئیمام (أحمدالرملی) لە سەر ئەو فەرموودەنە: کە ئەگەر وێنەکە حەرام نەبێ، (مەلائیکە)ی ڕەحمەت دەچنە ژوورەکە، جا حەدیسەکەی (جُبْرائیل)ی داهاتوو ئەم فەرموودەیە بەهێز دەکا، بەڵام لە (شرح مسلم)دا فەرموودەی ئەوانەی بە بێهێز داناوە، دیسان بزانە: بۆ ئیمەی ئادەمیزاد ناپەسندە بچینە ناو ئەو ژوورەی وێنەی -بە ڕێزلێنانەوە- تێدا داندراوە، هەروەك لە (نهایة)و (مغنی)دا فەرموویانە، بەڵام لە (تحفة)دا لای حەرامیی گرتوە.

(وَيَجُوزُ) دروسته له شوێنی ئەو وێنانه ئاماده ببێ، که به شێوەی ڕێزلێنان دانەندراون: وەك (مَا عَلَى أَرْضٍ وَبِسَاطٍ وَمِخَدَّةٍ) ئەو وێنانەی سەر زەوی‌و ڕایەخ‌و سەرینی خەوتن‌و ئەو جۆره شتانەی زەلیل دەکرێن، چونکه ئەو جۆره وێنانه دروستن به بەڵگەی حەدیسەکەی (عائشة)ی‌ڕابردوو و حەدیسەکەی‌داهاتوو.

هەم (وَمَقْطُوعُ الرَّأْسِ) وێنەی سەر لێکرایەوەش دروسته، هەروەها ئەو وێنەیەش دروسته که لای خوارەوەی به ئەندازەیەکی وەها لێکراوەتەوە: که به بێ ئەو ئەندازەیه ناژیێ، هەروەك له (تحفة)و (الشرواني)دا فەرموویانه ﴿عن أبي‌هريرة‌ﷺ: إِسْتَأْذَنَ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السلام عَلَى النَّبِيِّ‌ﷺ فَقَالَ: أُدْخُلْ. فَقَالَ: كَيْفَ أَدْخُلُ وَفِي بَيْتِكَ سِتْرٌ فِيهِ تَصَاوِيرُ؟ فَإِمَّا أَنْ تُقْطَعَ رُءُوسُـــها أَوْ تُجْعَلَ بِساطاً يُوطَـــأُ﴾ رواه اصحاب السنن بسند صحيح، پێغەمبەرﷺ به حەزرەتی جوبرائیلی فەرموو: وەره ژوورەوە. حەزرەتی‌جوبرائیل عليه السلام فەرمووی: چۆن بێمه ژوورەوە، له ژوورەکەتدا پەردەیەك هەیه وێنەی تێدانه؟ جا: یان دەبێ سەری وێنەکان لێبکرێتەوە، یان پەردەکه بکرێته ڕایەخ‌و به سەری بکەون.

(وَصُورَةُ شَجَرٍ) هەروەها وێنەی درەخت‌و گشت ئەو شتانەش دروسته که گیانلەبەر نیه: وەك چیاو ڕۆژو مانگ...هتد، هەوەها بوکڵە‌و گشت ئەو وێنانەی کیژەکان یاری پێ دەکەن دروسته، چونکه حەزرەتی(عائشة) له بەر چاوی پێغەمبەرﷺ یاری‌ی پێ‌دەکردن، هەروەك له (صحيح مسلم)دا گێڕدراوەتەوە، واته: تاکو بۆ پەروەردەکردنی ماڵ‌و منداڵ لێڕابێن.

ئینجا بزانه: تا ئێره باسی هەڵگرتنی وێنه بوو، بەڵام (وَيَحْرُمُ تَصْوِيرُحَيَوَانٍ) دروستکردنی وێنەی گیانلەبەر حەڕامه‌و له گوناهه گەورەکانه، هەروەك له (شرح مسلم)و (تحفة)دا فەرموویانه، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ أَشَدَّ النَّاسِ عَذَاباً يَوْمَ الْقِيَامَةِ الْمُصَوِّرُونَ﴾ رواه الشيخان، له هەموو کەسێك که سزایەکەی بەهێزتره له ڕۆژی قیامەت وێنەکەرەکانن.

ئینجا بزانه: جیاوازی نیه وێنەکه: له سەر دیوار دروست بکرێ، یان له سەر زەوی‌و جل‌و بەرگ، یان هەر شتێکی‌تر که ڕێزی لێنەندرێ، بەڵام دروستکردنی وێنەی درەخت‌و چیاو هەر شتێکی که گیانلەبەر نەبێ دروسته، هەروەها دروستکرنی وێنەی به بێ‌سەرو به بێ‌نیوەی لای خوارەوەش دروسته، هەروەك له (تحفة)و (الشرواني)دا فەرموویانه.

دیسان بزانه: له مەسەلەی وێنەدانان‌و وێنەکردندا جیاوازی نیه وێنەکه: سێبەری هەبێ —وەك له بەردو قوڕو نایلۆن دروست کرابێ— یان نەیبێ: وەك له سەر کاغەزو دیوارو ئەو جۆره شتانه دروست کرابێ، هەروەك له (شرح مسلم)دا ڕوون کراوەتەوە.

بەڵام زۆربەی زانایانی ئەم سەردەمه وێنەگرتنی به کامێرا به حەڵاڵ دەزانن، چونکه کامێرایەکه وێنەکه وەردەگرێ، نەك مرۆڤەکه، والله أعلم.

وَلاَ تَسْقُطُ إجَابَةٌ بِصَوْمٍ، فَإِنْ شَقَّ عَلَى الدَّاعِي صَوْمُ نَفْلٍ فَالْفِطْرُ أَفْضَلُ، وَيَأْكُلُ الضَّيْفُ مِمَّا قُدِّمَ لَهُ بِلاَ لَفْظٍ، وَلاَ يَتَصَرَّفُ فِيهِ إلاَّ بِالأَكْلِ، وَلَهُ أَخْذُ مَا يَعْلَمُ رِضَاهُ بِهِ، وَيَحِلُّ نَثْرُ سُكَّرٍ وَغَيْرِهِ فِي الإِمْلاَكِ، وَلاَ يُكْرَهُ فِي الأَصَحِّ، وَيَحِلُّ الْتِقَاطُهُ، وَتَرْكُهُ أَوْلَى.

## ﴿ باسی چەند ڕەووشتێکی خواردن ﴾

(وَلاَ تَسْقُطُ إجَابَةٌ بِصَوْمٍ) وەلامدانەوەی زیافەتی بوك گواستنەوە لە سەر دەعوەتکراوەکە لاناچێ بە هۆی ڕۆژوو، پێغەمبەرﷺ دفەرموێ: ﴿إِذَا دُعِيَ أَحَدُكُمْ فَلْيُجِبْ، فَإِنْ كَانَ صَائِماً فَلْيُصَلِّ وَإِنْ كَانَ مُفْطِراً فَلْيَطْعَمْ﴾ رواه مسلم، هەر کاتێك یەکێکتان دەعوەت کرا، با بچێتە دەعوەتەکە، جا ئەگەر بەڕۆژوو بوو با دوعا بۆ زیافەتکەرەکەبکا، ئەگەر بە ڕۆژوو نەبو با بخوا. (فَإِنْ شَقَّ عَلَى الدَّاعِي صَوْمُ نَفْلٍ) جا ئەگەر بەڕۆژووبوونی سوننەت ئازاری زیافەتکەرەکەی دەدا، ئەو کاتە (فَالْفِطْرُ أَفْضَلُ) ڕۆژووەکەی بشکێنێ خێرترە، تاکو دڵی زیافەتکەرەکە خۆش بکا، بەلام حەرامە ڕۆژووی واجب بشکێنێ.

(وَيَأْكُلُ الضَّيْفُ مِمَّا قُدِّمَ لَهُ بِلاَ لَفْظٍ) دروستە: میوان لەو خواردنە بخوا کە لە پێشی داندراوە بێئەوەی بە زوبان پێی بلێن: بخۆ. بەلام ئەگەر چاوەڕوانی کەسێکیتر دەکرا، ئەو کاتە دروست نیە بە بێئیزن بخوا.

(وَلاَ يَتَصَرَّفُ فِيهِ إلاَّ بِالأَكْلِ) دروست نیە میوان جگە لە خواردن هیچ دەسکاریەکیتر لە خواردەمەنیەکەدا بکا: وەك فرۆشتن‌و بەخشین‌و دەرخوارددانی کەسێکیتر، چونکە خواردەمەنیەکە ملکیخۆی نیە، بەلکو بە قوتدان دەبێتە ملکیخۆی، بەلام دروستە: پارو بۆ ئەوکەسە بکا کە لەگەلیدایە، هەروەك لە زۆریەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلَهُ أَخْذُ مَا يَعْلَمُ رِضَاهُ بِهِ) بۆ میوان دروستە: بە بێئیزن ئەو جۆرە شتە لە مالی خانەخۆی ببا: کە دەزانێ خانەخۆیەکە بە بردنی ڕازیەو پێی ناخۆش نیە، جیاوازی نیە شتەکە: پارە بێ، یان خواردەمەنی، هەروەها بۆ مرۆڤ دروستە: بە بێئیزن کەلوپەلی دۆستیخۆی بە کار بێنێ‌و سواری وولاغەکەی ببێ‌و هەم خواردەمەنیەکەی بخواو لەگەلٚ خۆیا بیباتەوە بۆ مالیخۆی، هەم پارە بردن‌و گشت دەستکاریەکانیتریشی بۆ دروستن بەو مەرجەی بزانێ دۆستەکەی ڕازیەو پێی ناخۆش نیە، هەروەك لە (شرح مسلم)دا فەرموویەتی.

(وَيَحِلُّ نَثْرُ سُكَّرٍ وَغَيْرِهِ) حەلالە شەکرو شتیتریش: وەکو پارەو چواله بە بلاوی فرێ بدرێ (فِي الإِمْلاَكِ) لە مارەبرین‌و گشت دەعوەتەکانیتردا (وَلاَ يُكْرَهُ) ئەو فرێدانەی بە بلاوی ناپەسند نیە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، بەلکو نەکرێ باشترە، بەلام وا باشترە لە دانیشگەی مارەبریندا شیرنایەتی بەش بکرێ، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی (وَيَحِلُّ الْتِقَاطُهُ) حەلالە شتە فرێدراوەکە هەلبگریتەوە، بەلام (وَتَرْكُهُ أَوْلَى) وازی لێبێنی باشترە.

## (كِتَابُ الْقَسْمِ وَالنُّشُوزِ)

**يَخْتَصُّ الْقَسْمُ بِزَوْجَاتٍ، وَمَنْ بَاتَ عِنْدَ بَعْضِ نِسْوَتِهِ لَزِمَهُ عِنْدَ مَنْ بَقِيَ،**

---

﴿ **پاشكۆ**﴾: سوننەتە پێش خواردن دەستەكانی بشواو لە سەرەتای خواردن‌و خواردنەوەدا (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) بكا، جا ئەگەر لە سەرەتادا لە بیری چوو، با لە كاتی خواردن‌و خواردنەوەدا بڵێ: ﴿بِسْمِ اللهِ أَوَّلَهُ وَآخِرَهُ﴾ رواه أبوداود بسندصحيح، ئینجا لە دوای خواردن‌و خواردنەوە بڵێ: ﴿اَلْحَمْدُ للهِ الَّذِي أَطْعَمَنَا وَسَقَانَا وَجَعَلَنَا مُسْلِمِينَ﴾ حديث حسن رواه أصحاب السنن، ئینجا دوعا بۆ خانەخۆیەكە بكاو بڵێ: ﴿أَفْطَرَ عِنْدَكُمُ الصَّائِمُونَ وَأَكَلَ طَعَامَكُمُ الأَبْرَارُ وَصَلَّتْ عَلَيْكُمُ الْمَلاَئِكَةُ﴾ رواه أبوداود بسند صالح.

هەروەها پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَأْكُلْ بِيَمِينِهِ وَإِذَا شَرِبَ فَلْيَشْرَبْ بِيَمِينِهِ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَأْكُلُ وَيَشْرَبُ بِشِمَالِهِ﴾ رواه مسلم، بە دەستی‌ڕاستەتان بخۆن‌و بخۆنەوە، چونكە شەیتان بە دەستی‌چەپەی دەخواو دەخواتەوە.

جا بزانە: حەرامە بێ‌دەعوەتكردن بۆ خواردن بڕواتە شوێنی زیافەتەكە، هەم حەرامە دەعوەتكراوەكەش بە بێ‌ئیزنی زیافەتكەرەكە خەڵكی‌تر لەگەڵ خۆیا ببا، هەروەها سوننەتە خاوەن ماڵ زۆر بەخێرهاتنی میوان بكاو ڕێزی لێبنێ، ئیتر بۆ گشت كەسێك ناپەسندە: پارووی گەورە بكاو لە سەر خواردن چلمو بەڵغەم هەڵكەنێ‌و قرپ بكاو دەستی خۆی بوەشێنێتە ناو خواردنەكەو لەو لاو لەو لای قاپەكە بخوا، بەڵكو لە لای پێشەخۆی بخوا، مەگەر میوەی جۆراو جۆری تێدابێ، ئەو كاتە ناپەسند نیە لە هەر لایەك بخوا، ئینجا كە مێوانەكە ڕۆیشت سوننەتی تا دەرگەی‌خانووەكە لەگەڵی بڕوا بۆ خواحافیزی، ئیتر چەند ڕەووشتێكی‌تریش ماون لە بەر درێژی نەماننووسین، ئەوەندەشمان لە (مغني) وەرگرتون.

### ﴿ كِتَابُ الْقَسْمِ: پەرتوكی نۆبەتی شەوێ‌و (وَالنُّشُوزِ) گوێڕایەڵنەبوونی ژن ﴾

(يَخْتَصُّ الْقَسْمُ بِزَوْجَاتٍ) واجببوونی نۆبەتی شەوێ تایبەتە بە دوو ژن و زیاتر، كەواتە: (وَمَنْ بَاتَ عِنْدَ بَعْضِ نِسْوَتِهِ) هەر كەسێك ئەندازەیەك لە لای ژنێكی بمێنێتەوە (لَزِمَهُ عِنْدَ مَنْ بَقِيَ) لە سەری واجبە: بەو ئەندازەیەش لە لای ژنەكانی‌تری بمێنێتەوە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ كَانَتْ لَهُ امْرَأَتَانِ فَمَالَ إِلَى إِحْدَاهُمَا دُونَ الأُخْرَى جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَشِقُّهُ مَائِلٌ﴾ رواه اصحاب السنن بسند صحيح، هەر كەسێك دوو ژنی هەبن‌و بە تایبەتی ڕووی خۆی بداتە یەكێكیان‌و نەیداتە ئەوەی‌تریش، ئەوە كە لە ڕۆژی قیامەت دێتە مەیدانی مەحشەر لاتەنیشتەكەی خوارە.

ئینجا بزانە: یەكسانی تەنها لە هاتوچۆ و مانەوەی شەوێ‌و ڕۆژێدا واجبە، بەڵام لە خۆشویستن‌و لە جیماعكردن‌و لە لەزەتەكانی‌تردا یەكسانی واجب نیە؟ چونكە

وَلَوْ أَعْرَضَ عَنْهُنَّ أَوْ عَنِ الْوَاحِدَةِ لَمْ يَأْثَمْ، وَيُسْتَحَبُّ أَنْ لاَ يُعَطِّلَهُنَّ، وَتَسْتَحِقُّ الْقَسْمَ مَرِيضَةٌ وَرَتْقَاءُ وَحَائِضٌ وَنُفَسَاءُ، لاَ نَاشِزَةٌ، فَإِنْ لَمْ يَنْفَرِدْ بِمَسْكَنٍ دَارَ عَلَيْهِنَّ فِي بُيُوتِهِنَّ، وَإِنِ انْفَرَدَ فَالأَفْضَلُ الْمُضِيُّ إِلَيْهِنَّ، وَلَهُ دُعَاؤُهُنَّ،

---

خۆشویستن‌و حەزبۆچوونی جیماع لە دەستەڵاتی پیاودا نیە، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَنْ تَسْتَطِيعُوا أَنْ تَعْدِلُوا بَيْنَ النِّسَاءِ وَلَوْ حَرَصْتُمْ فَلا تَمِيلُوا كُلَّ الْمَيْلِ فَتَذَرُوهَا كَالْمُعَلَّقَةِ﴾ ئێوە ناتوانن لە هەموو ڕوویەکەوە دادپەروەری بکەن لە نێوان ژنەکاندا هەرچەند زۆریش هەوڵ بدەن، کەوابو: هەموو ڕووی‌خۆتان مەدەنە یەکێکیان‌و ئەوی‌تریش بە هەڵواسراوی وەك بێ‌مێرد بهێڵنەوە.

هەروەها پێغەمبەرﷺ بە یەکسانی لە لای ژنەکانی دەمایەوەو دەیفەرموو: ﴿اَللَّهُمَّ هَـذا قَسْمِي فِيمَا أَمْلِكُ، فَلاَ تَلُمْنِي فِيمَا تَمْلِكُ وَلاَ أَمْلِكُ﴾ رواه أصحاب السنن بسند صالح، خوایە ئەمە بەشکردنی خۆمە کە لە دەسەڵاتمدایە، خوایە لێم مەگرە لەوەی لە دەسەڵاتی تۆ دایەو لە دەسەڵاتی مندا نیە. واتە: کە بەلاداچوونی دڵی پیاوە.

(وَلَوْ أَعْرَضَ عَنْهُنَّ) ئەگەر مێردەکە وازی لە هەموو ژنەکانی هێناو لە لای هیچیان نەماوە (أَوْ عَنِ الْوَاحِدَةِ) یان وازی لە تەنها ژنەکەی هێنا لەو حاڵەتەی جگە لەو ژنە هیچ ژنێکی‌تری نەبێ، ئەوە (لَمْ يَأْثَمْ) گوناهبار نابێ، بەڵام (وَيُسْتَحَبُّ أَنْ لاَ يُعَطِّلَهُنَّ) سوننەتە: لە کاری ژن‌و مێردایەتیان نەخا، واتە: لە لایان بمێنێتەوەو جیماعیشیان لەگەڵ بکا، تاکو داوێنپاکی‌ی گشت لایەك پارێزراو بێ، هەروەها ئەگەر تاکە ژنێکی هەبو، سوننەتە لای کەم لە چوار شەوان شەوێکی لە لا بمێنێتەوە، هەم سوننەتە ژن‌و مێرد وێکڕا لە یەك نوێندا بخەون، هەروەك لە زۆربەی سەر چاوەکاندا فەرموویانە.

(وَتَسْتَحِقُّ الْقَسْمَ) مافی لە لا مانەوەی هەیە (مَرِيضَةٌ) ژنە نەخۆشەکەی‌و هەم (وَرَتْقَاءُ) ئەم ژنەی شوێنی جیماعی گیراوەو هەم (وَحَائِضٌ وَنُفَسَاءُ) حەیزدارو زەیسانی‌و پیرەژن‌و شێت، بەو مەرجەی لە شێتەکە نەترسێ (لاَ نَاشِزَةٌ) بەڵام ژنی ناشیزە: کە لە گوێڕایەڵی مێردەکەی دەرچووە، مافی لە لا مانەوەی نیە: وەك بە بێ‌ئیزنی مێردەکە لە ماڵ بڕواتە دەرەوە، یان دەرگە لە ڕووی مێردەکە کلیل بدا، یان ڕێگا نەدا ماچی بکا، یان جیماعی لەگەڵ بکا...هتد: کە لە (باسی بژێوەکان)دا ڕوون کراوەتەوە.

(فَإِنْ لَمْ يَنْفَرِدْ بِمَسْكَنٍ) جا ئەگەر مێردەکە بە تەنها لە شوێنێکدا نیشتە جێ نەبو، ئەوە (دَارَ عَلَيْهِنَّ فِي بُيُوتِهِنَّ) واجبە: بە سەر ژنەکانی‌دا بگەڕێ لە ماڵەکانی خۆیاندا، بەڵام (وَإِنِ انْفَرَدَ) ئەگەر مێردەکە بە تەنها لە شوێنێکدا نیشتەجێ بوو، ئەو کاتە (فَالأَفْضَلُ الْمُضِيُّ إِلَيْهِنَّ) وەها خێرترە ئەو بڕواتە لای ژنەکان، هەم (وَلَهُ دُعَاؤُهُنَّ) بۆیشی دروستە: ژنەکان داوا بکا بۆ شوێنی نیشتەجێبوونی.

وَالأَصَحُّ تَحْرِيمُ ذَهَابِهِ إِلَى بَعْضٍ وَدُعَاءِ بَعْضٍ إِلاَّ لِغَرَضٍ: كَقُرْبِ مَسْكَنِ مَنْ مَضَى إِلَيْهَا أَوْ خَوْفٍ عَلَيْهَا، وَيَحْرُمُ أَنْ يُقِيمَ بِمَسْكَنِ وَاحِدَةٍ وَيَدْعُوهُنَّ إِلَيْهِ، وَأَنْ يَجْمَعَ بَيْنَ ضَرَّتَيْنِ فِي مَسْكَنٍ إِلاَّ بِرِضَاهُمَا، وَلَهُ أَنْ يُرَتِّبَ الْقَسْمَ عَلَى لَيْلَةٍ وَيَوْمٍ قَبْلَهَا أَوْ بَعْدَهَا، وَالأَصْلُ اللَّيْلُ وَالنَّهَارُ تَبَعٌ، فَإِنْ عَمِلَ لَيْلاً وَسَكَنَ نَهَارًا كَحَارِسٍ فَعَكْسُهُ،

---

بەلام (وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاست: (تَحْرِيمُ ذَهَابِهِ إِلَى بَعْضٍ وَدُعَاءِ بَعْضٍ) حەرامە: بڕواتە لای هەندێکیان‌و هەندێکیشیان داوا بکا بۆ شوێنەکی خۆی (إِلاَّ لِغَرَضٍ) تەنها لە بەر مەبەستێکی‌ئاشکرا نەبێ (كَقُرْبِ مَسْكَنِ مَنْ مَضَى إِلَيْهَا) وەك ماڵی ئەو ژنەی دەڕواتە لای نزیك بێ‌و ئەوەکەی‌تریش دوور بێ (أَوْ خَوْفٍ عَلَيْهَا) یان مەترسییێك لە سەر ئەمە هەبێ: وەك گەنج بێ، یان زۆر جوان بێ‌و ئەوەکەی‌تر وا نەبێ، واتە: عوزرێکی‌ئاشکرای بە دەستەوە بێ: تاکو لێی دەرنەکەوێ ڕووی خۆی بە تایبەتی دەداتە ئەم ژنە.

(وَيَحْرُمُ أَنْ يُقِيمَ بِمَسْكَنِ وَاحِدَةٍ) حەرامە مێردەکە لە ماڵی‌ژنێکی بمێنێتەوەو (وَيَدْعُوهُنَّ إِلَيْهِ) ژنەکانی‌تریشی داوا بکا بۆ ماڵی ئەم ژنەی بە بێ‌ڕەزامەندی هەموویان، چونکە هاتن بۆ ماڵی‌هەوێ لە سەر دڵی‌هەوێ زۆر گرانە، جیاوازی نیە ماڵەکە: ملکی هەوێیەکە بێ، یان نا، بەلام بە ڕەزامەندی‌ی هەموویان دروستە.

(وَ) هەروەها حەرامە: (أَنْ يَجْمَعَ بَيْنَ ضَرَّتَيْنِ فِي مَسْكَنٍ) دوو هەوێ، یان زیاتر وێکڕا کۆ بکاتەوە لە یەك ماڵدا (إِلاَّ بِرِضَاهُمَا) تەنها بە ڕەزامەندی هەموو هەوێیەکان دروستە، بەلام لە دوای ڕازی‌بوونیش بۆیان دروستە پەشیمان ببنەوە.

ئینجا بزانە: ئەگەر یەك خانوو بکاتە دوو بەش‌و هەر بەشێك ئاودەستخانەو سەرشۆرگەو چێشتخانەو پەیژەو سەربان‌و ئاوی سەربەخۆی هەبێ، ئەو کاتە بۆی دروستە: هەر یەکەیان لە بەشێکدا نیشتەجێ بکا، هەر چەند ڕازیش نەبن.

دیسان بزانە: ناپەسندە بە ئامادەبوونی‌ژنێکی جیماع لە گەڵ ژنەکەی‌تری بکا، بەڵکو ئەگەر ژنەکان عەوڕەتی‌یەکتری ببینن ئەو کاتە حەرامە، هەروەك لە زۆربەی‌سەرچاوەکاندا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە.

(وَلَهُ) بۆ مێردەکە دروستە (أَنْ يُرَتِّبَ الْقَسْمَ) نۆبەتی نێوان ژنەکان دابمەزرێنێ (عَلَى لَيْلَةٍ وَيَوْمٍ قَبْلَهَا أَوْ بَعْدَهَا) لە سەر شەوێك‌و ڕۆژێك: جا ڕۆژەکە لە پێشدا بێ، یان لە دوادا بێ (وَالأَصْلُ اللَّيْلُ) بنچینەی نۆبەتەکە شەوە (وَالنَّهَارُ تَبَعٌ) ڕۆژیش پابەندی شەوەکەیە، بەلام (فَإِنْ عَمِلَ لَيْلاً وَسَكَنَ نَهَارًا) ئەگەر مێردەکە شەوێ ئیش‌وکاری دەکردو بە ڕۆژێ دەحەساوەو کاری نەدەکرد (كَحَارِسٍ) وەك پاسەوان، ئەوە (فَعَكْسُهُ) بە پێچەوانەکەیەتی، واتە: ڕۆژ دەبێتە بنچینەی نۆبەتەکەی‌و شەویش دەبێتە پابەندی ڕۆژەکەی.

وَلَيسَ للأوَّلِ دُخُولٌ فِي نَوبَةِ عَلَى أُخرَى لَيْلاً إلاَّ لِضَرُورَةِ كَمَرَضِهَاالْمَخُوفِ، وَحِينَئِذ إنْ طَالَ مُكْثُهُ قَضَى وَإلاَّ فَلاَ، وَلَهُ الدُّخُولُ نَهَارًا لِوَضْعِ مَتَاعٍ وَنَحْـوِهِ وَيَنْبَغِـي أَنْ لاَ يَطُولَ مُكْثُهُ، وَالصَّحِيحُ أَنَّهُ لاَ يَقْضِي إذَا دَخَلَ لِحَاجَةٍ وَأَنَّ لَهُ مَـا سِـوَى وَطْءٍ مِـنْ اسْتِمْتَاعٍ، وَأَنَّهُ يَقْضِي إنْ دَخَلَ بِلاَ سَبَبٍ، وَلاَ تَجِبُ تَسْوِيَةٌ فِي الإقَامَةِ نَهَارًا،

---

(وَلَيسَ للأوَّلِ) ئەو مێردەی بنچینەی نۆبەتەکەی شەوە، بۆی دروست نیە (دُخُولٌ فِي نَوبَةٍ عَلَى أُخرَى لَيْلاً) لە نۆبەتی ژنێکدا شەوێ بچێتە لای ژنێکیتر (إلاَّ لِضَرُورَةٍ) تەنها لە بەر ناچاری دروستە (كَمَرَضِهَاالْمَخُوفِ) وەك ژنەکەیتر نەخۆش بێو مەترسی مردنی لێبکرێ، یان بە ئازاری منداڵبوونەوە بێ، یان کاتی دزو تاڵان بێ، ئینجا (وَحِينَئِذٍ) هەرکاتێك بە هۆی ناچاریەك شەوێ چووە لای ژنەکەیتر (إنْ طَالَ مُكْثُهُ) ئەگەر بەگوێرەی عادەت ماوەیەکی درێژ لە لای مایەوە، ئەوە (قَضَى) واجبە لە نۆبەتی ئەو ژنە بۆ ژنەکەی خاوەن نۆبەت ئەو ماوەیە قەزا بکاتەوە (وَإلاَّ) بەڵام ئەگەر زۆر نەمایەوە (فَلاَ) واجب نیە قەزای بکاتەوە.

(وَلَهُ الدُّخُولُ نَهَارًا) بۆ مێردەکە دروستە: لە نۆبەتیژنێك ڕۆژێ بڕواتە لای ژنەکانیتر (لِوَضْعِ مَتَاعٍ) بۆ دانانی، یان هێنانی کەلوپەلێكو (وَنَحْوِهِ) شتی وەها: وەك تەسلیمکردنی بژێو و خواردەمەنیترو هەواڵ وەرگرتن، بە بەڵگەی حەدیسەکەیداهاتوو، بەڵام (وَيَنْبَغِي أَنْ لاَيَطُولَ مُكْثُهُ) پێویستە مانەوەی لە لای ژنەکەیتر درێژ نەبێ، ئینجا (وَالصَّحِيحُ) بە فەرموودەی ڕاست: (أَنَّهُ لاَ يَقْضِي إذَا دَخَلَ لِحَاجَةٍ) ئەگەر ڕۆژێ بۆ پێویستیەك ماوەیەك چووە لای ژنەکەیتر، واجب نیە ئەو ماوەیە بۆ خاوەن نۆبەتەکە قەزابکاتەوە، هەر چەند ماوەیەکی درێژیش مابێتەوە.

(وَ) هەر بە فەرموودەی ڕاست: (أَنَّ لَهُ) ئەو مێردەی ڕۆژێ دەچێتە لای ژنەکانیتری بۆی دروستە: (مَاسِوَى وَطْءٍ مِنْ اسْتِمْتَاعٍ) جگە لە جیماعکردن گشت لەزەتێکیتر لە ژنەکەی وەربگرێ ﴿عن عائشة رضي الله عنها: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَطُوفُ عَلَيْنَا جَمِيعاً فَيَدْنُو مِنْ كُلِّ امْـرَأَةٍ مِنْ غَيْرِمَسِيسٍ حَتَّى يَبْلُغَ الَّتِي هُوَ يَوْمُهَا فَيَبِيـتُ عِنْـدَهَا﴾حديث صحيح رواه أبوداود، پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێ بە سەر هەموو ژنەکانیدا دەسوڕاوەو لە گشت ژنێکی نزیك دەبۆوە بۆ لەزەت وەرگرتن بە بێجیماعکردن، تا دەگەیشتە لای ئەوژنەی نۆبەتیەتیو شەوێ لەلای ئەویان دەماوە.

(وَأَنَّهُ يَقْضِي) هەر بە فەرموودەی ڕاستتر واجبە: بۆ خاوەن نۆبەتەکە قەزا بکاتەوە (إنْ دَخَلَ بِلاَ سَبَبٍ) ئەگەر بە بێهیچ هۆیەك ڕۆژێ چوبێتە لای ژنەکەیترو ماوەیەکیدرێژ مابێتەوە (وَلاَ تَجِبُ تَسْوِيَةٌ فِي الإقَامَةِ نَهَارًا) واجب نیە یەکسانی بکا لە نێوان ژنەکانیدا لە مانەوەی ڕۆژێدا، بەڵکو تەنها لە مانەوەیشەوێدا یەکسانی واجبە.

وَأَقَلُّ نُوَبِ الْقَسْمِ لَيْلَةٌ وَهُوَ أَفْضَلُ، وَيَجُوزُ ثَلاَثًا، لاَ زِيَادَةَ عَلَى الْمَذْهَبِ، وَالصَّحِيحُ وُجُوبُ قُرْعَةٍ لِلإِبْتِدَاءِ، وَقِيلَ يَتَخَيَّرُ، وَلاَ يُفَضِّلُ فِي قَدْرِ نَوْبَةٍ لَكِنْ لِحُرَّةٍ مِثْلاَ أَمَةٍ، وَتَخْتَصُّ بِكْرٌ جَدِيدَةٌ عِنْدَ زِفَافٍ بِسَبْعٍ بِلاَ قَضَاءٍ وَثَيِّبٌ بِثَلاَثٍ،

---

(وَأَقَلُّ نُوَبِ الْقَسْمِ لَيْلَةٌ) لای کەمی نۆبەتەکانی مانەوە: شەوێکە لە لای هەر ژنێك، جا ئەگەر شەوێ کار بکا، ئەو کاتە ڕۆژێکە، واتە: کەمتر دروست نیە (وَهُوَ أَفْضَلُ) نۆبەتی شەوێك خێرترە لە زیاتر، تاکو زوو زوو ژنەکانی بەسەر بکاتەوە، هەروەك پێغەمبەرﷺ وای‌دەکرد، بەلام (وَيَجُوزُ ثَلاَثًا) سێ شەو سێ شەویش‌و دوو شەو دوو شەویش دروستە (لاَ زِيَادَةَ) بەلام لە سێ شەوان زیاتر دروست نیە، بە بێ ڕەزامەندی ژنەکانی (عَلَى الْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب، هەرچەند ژنەکانیش لە چەند شارێکی لێك دوور بن.

بەلام لە لای ئیمام (مالك)و (إمام الحرمين) ئەو ژنەی لە شوێنی مێردەکەدا نیشتەجێ نەبێ مافی نۆبەتی نیە، هەروەك لە (البجيرمی)دا فەرموویەتی، هەروەها ئەگەر ژنەکان ڕازی بن ئەو کاتەش زیاتر لە سێ شەوان دروستە، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.

(وَالصَّحِيحُ وُجُوبُ قُرْعَةٍ لِلإِبْتِدَاءِ) بە فەرموودەی ڕاست: بۆ دەستپێکردنی نۆبەت پشکە کردن لە نێوان ژنەکانی‌دا واجبە، جا ناوی کامەیان دەرچو، لەوێوە دەست پێ‌دەکا، جا ئەگەر لە دوو ژن زیاتر بون، ئەو کاتە بۆ ئەوانی‌تریش پشکە دەکا، تا نۆبەتەکە تەواو دەبێ، ئینجا لە سەر ئەو ڕیزە بەردەوام دەبێ، بەلام ئەگەر ژنەکان ڕازی بن لە ژنێکەوە دەست پێ‌بکا، ئەو کاتە پشکە واجب نیە (وَقِيلَ يَتَخَيَّرُ) لە فەرموودەیەکی بێ‌هێزدا: بە خۆی سەرپشکە: لە هەر کامەیانەوە دەست پێ‌بکا، بۆی دروستە.

(وَلاَ يُفَضِّلُ فِي قَدْرِ نَوْبَةٍ) حەرامەو نابێ ئەندازەی نۆبەتی‌ژنێك لە ئەندازەی نۆبەتی ژنێکی‌تر زیاتر بکا: وەك شەوێك لە لای یەکێك، دوو شەو، یان زیاتر لە لای یەکێکی‌تر بمێنێتەوە (لَكِنْ لِحُرَّةٍ مِثْلاَ أَمَةٍ) بەلام ژنێکی ئازاد دووهەندی ژنێکی کۆیلە مافی لە لا مانەوەی هەیە.

(وَتَخْتَصُّ بِكْرٌ جَدِيدَةٌ عِنْدَ زِفَافٍ) ئەگەر ژنێکی نوێی کچی بە سەر ژنە کۆنەکەی‌دا هێنا، واجبە کچەکە تایبەت بێ (بِسَبْعٍ بِلاَ قَضَاءٍ) بە لە لا مانەوەی حەفت شەوی بە دوای یەکتردا بە بێ‌قەزاکردنەوە (وَثَيِّبٌ بِثَلاَثٍ) ژنی نوێی بێوەژنیش واجبە تایبەت بێ بە سێ شەوی بە دوای یەکتردا بە بێ‌قەزاکردنەوە ﴿عن أنس‌ﷺ: مِنَ السُّنَّةِ إِذَا تَزَوَّجَ الرَّجُلُ الْبِكْرَ عَلَى الثَّيِّبِ أَقَامَ عِنْدَهَا سَبْعاً ثُمَّ قَسَمَ، وَإِذَا تَزَوَّجَ الثَّيِّبَ أَقَامَ عِنْدَهَا ثَلاَثًا ثُمَّ قَسَمَ﴾ رواه الشيخان، بڕیاری پێغەمبەرﷺ ئەوەهایە: هەر کاتێك پیاو کچێك بە سەر ژنە کۆنەکەی‌دا بێنێ حەفت شەوان لە لای دەمێنێتەوە، ئینجا دەست بە نۆبەت دەکا، وە هەر کاتێك بێوەژن بێنێ سێ شەوان لە لای دەمێنێتەوە، ئینجا دەست بە نۆبەت دەکا.

وَيُسَنُّ تَخْيِيرُهَا بَيْنَ ثَلاَث بِلاَ قَضَاء وَسَبْعٍ بِقَضَاء، وَمَنْ سَافَرَتْ وَحْدَهَا بِغَيْرِ إِذْنِه فَنَاشِزَةٌ، وَبِإِذْنِه لِغَرَضِه يَقْضِي لَهَا، وَلِغَرَضِهَا لاَ فِي الْجَدِيدِ، وَمَنْ سَافَرَ لِنُقْلَة حَرُمَ أَنْ يَسْتَصْحِبَ بَعْضَهُنَّ،

---

(وَيُسَنُّ تَخْيِيرُهَا) سوننەتە: مێردەکە بێوەژنە نوێیەکە بکاتە سەرپشك (بَيْنَ ثَلاَثٍ بِلاَ قَضَاءٍ وَسَبْعٍ بِقَضَاءٍ) لە نێوان سێ شەوی بێقەزاکردنەوەو حەفت شەوی بە قەزاکردنەوە بۆ ژنەکاتی‌تر: بۆ هەر ژنێك حەفت شەو، چونکە پێغەمبەرﷺ (أم سلمه)ی ژنی‌خۆی ئەوها کردە سەرپشك، هەروەك لە (صحيح مسلم)دا گێردراوەتەو.

بەڵام ئەگەر لە حەفت شەوان زیاتر لە لای ژنە کچەکە مایەوە، ئەو کاتە واجبە: تەنها زیادەکە قەزا بکاتەوە، نەك حەفتەکەش، هەروەك لە زۆربەی‌سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

﴿ ئاگاداری ﴾: ناپەسندە: دوو ژن وێکڕا بۆ خۆی بگوێزێتەوە، جا ئەگەر دوو ژنی وێکڕا گواستنەوە، ئەو کاتە واجبە: پشکە لە نێوانیاندا بکا، جا کامەیەن ناوی دەرچو، واجبە: حەفت شەوەکەی کچ بە تەواوی، یان سێ شەوەکەی بێوەژن بە تەواوی لە لای بمێنێتەوە، ئینجا لە لای ئەوەکەی‌تریش حەفت، یان سێ شەو دەمێنێتەوە، بەڵام ئەگەر یەکێکی پێش ئەوی‌تر گواستەوە، ئەو کاتە مافی پێشکەوتووەکە تەواو دەکا، ئینجا دەست بە دواکەوتووەکە دەکا.

ئینجا بزانە: ئەگەر حەفت شەوەکە، یان سێ شەوەکە بە دوای یەکتری‌دا نەبن، ئەوە دروست نابن‌و واجبە لە سەرەتاوە دەست پێ‌بکاتەوە، ئینجا کە بە دوای یەکتری‌دا تەواوی کردن، لە نۆبەتی ژنە نوێیەکە شەوە دروست نەبووەکان بۆ ژنەکانی‌تر قەزا دەکاتەوە، هەروەك لە زۆبەی سەر چاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَمَنْ سَافَرَتْ وَحْدَهَا بِغَيْرِ إِذْنِه) هەر ژنێك بە تەنها بێ‌ئیزنی‌مێردەکەی بڕواتە سەفەر (فَنَاشِزَةٌ) ئەوە (ناشیزە)یە، واتە: لە گوێڕایەڵی‌مێردەکەی دەرچووە، کەواتە: مافی نۆبەتی نیە، بەڵام (وَبِإِذْنِه لِغَرَضِه) هەر ژنێك بە ئیزنی‌مێردەکەی بۆ کارێکی‌مێردەکەی بڕواتە سەفەر، ئەوە مافی نۆبەتی هەیە، کەوابو: (يَقْضِي لَهَا) مێردەکە ماوەی سەفەرەکەی بۆ قەزا دەکاتەوە، بەڵام (وَلِغَرَضِهَا) ئەگەر ژنەکە بە ئیزنی‌مێردەکەی بۆ کارێکی‌خۆی بڕواتە سەفەر: وەك بۆ حەج کردن‌و سەردانی‌کەسێك، ئەوە (لاَ) بۆی قەزا ناکاتەوە (فِي الْجَدِيدِ) لە فەرموودەی نوێ‌دا، چونکە ئیزنی‌مێردەکە تەنها تاوانەکە لە سەر ژنەکە لادەبا.

(وَمَنْ سَافَرَ لِنُقْلَة) هەر کەسێك بە مەبەستی ماڵگواستنەوە لە شوێنێك بڕواتە شوێنێکی‌تر (حَرُمَ أَنْ يَسْتَصْحِبَ بَعْضَهُنَّ) حەرامە هەندێك لە ژنەکانی لەگەڵ خۆیا ببا‌و هەندێکیشیان نەبا، هەروەها حەرامە: هەموو ژنەکانیشی بەجێ بهێڵێ ئەگەر ڕازی نەبن؟ چونکە

وَفِي سَائِرِالأَسْفَارِالطَّوِيلَةِ-وَكَذَا الْقَصِيرَةُ فِي الأَصَحِّ-يَسْتَصْحِبُ بَعْضَهُنَّ بِقُرْعَـةٍ، وَلاَ يَقْضِي مُدَّةَ سَفَرِهِ، فَإِنْ وَصَلَ الْمَقْصِدَ وَصَارَ مُقِيمًا قَضَى مُدَّةَالإِقَامَـةِ لاَ الرُّجُوعِ فِي الأَصَحِّ، وَمَنْ وَهَبَتْ حَقَّهَا لَمْ يَلْزَمِ الزَّوْجَ الرِّضَا، فَإِنْ رَضِيَ وَوَهَبَتْ لِمُعَيَّنَةٍ بَاتَ عِنْدَهَا لَيْلَتَيْهِمَا،

---

بـەو بەجێهێشـتنە تـەماعی جیماعکردنیـان لـەو مێـردە دەبـڕێ، هـەروەك لـە زۆربـەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە، ئەوەش وا دەگەیەنێ لـەم مەسـەلەیەدا: جیـاوازی تـەنها ژنێـكو دوو ژنو زیاتر نیە، كەوابو: واجبە: یان گشتیان لەگەڵ خۆیا ببا، یان تەڵاقیان بدا، هەروەك لە (مغني)دا فەرموویەتی.

(وَفِي سَائِرِ الأَسْفَارِ الطَّوِيلَةِ) لە گشت سەفەرە درێژەكانیتردا: كە بـە مەبەسـتی هاتنـەوە بڕواتە سەفەر (وَكَذَا الْقَصِيرَةُ فِي الأَصَحِّ) هەروەها لە سـەفەرە كورتەكانیشـدا (يَسْتَصْحِبُ بَعْضَهُنَّ بِقُرْعَةٍ) بۆی دروستە: ژنێك، یان زیاتر لەگەڵ خۆیا ببا بە پشكەكردن لە نێوانیاندا ﴿عن عائشةرضي الله عنها: كَانَ رَسُولُ اللهِﷺ إِذا أَرَادَ سَفراً أَقْرَعَ بَيْنَ نِسَائِه فَأَيَّتُهُنَّ خَرَجَ سَهْمُهَا خَرَجَ بِهَا مَعَهُ﴾ رواه الشيخان، هەر كاتێك پێغەمبەرﷺ ویستبای بڕواتە سـەفەر، پشـكەی لە نێوان ژنەكانیدا دەكرد، جا كامەیان پشكەی دەرچوبا ئەویانی لەگەڵ خۆیا دەبرد.

بەڵام ئەگەر ژنەكان ڕازی بن ژنێكی دیاركراو لەگەڵ خۆیا ببا، ئەو كاتە پشكە واجب نیـەو گوناهباریش نابێ.

(وَ) هەركاتێك بە پشكە ژنێكی لەگـەڵ خۆیـا بـردە سـەفەر (لاَ يَقْضِي مُدَّةَ سَفَرِهِ) مـاوەی سەفەرەكە بۆ ژنەكانی ماڵەوە قەزا ناكاتەوە، بەڵام (فَإِنْ وَصَلَ الْمَقْصِدَ وَصَارَ مُقِيمًا) ئەگـەر گەیشتە شوێنی مەبەستو بە نیەتی مانەوەی چوار ڕۆژان، یـان زیـاتر لـەوێ مایـەوە، ئـەو كاتە (قَضَى مُدَّةَ الإِقَامَةِ) ماوەی مانەوەكە بۆ ژنەكانی ماڵەوە قەزا دەكاتـەوە، بـەڵام ئەگـەر نیەتی مانـەوەی نـەبو، بـەڵكو چاوەڕوانی پێكهاتنیكارێكی دەكـرد، ئـەو كاتـە تـا مـاوەی هەژدە ڕۆژان چاوپۆشـی لێدەكـرێو زیاتر لـە هـەژدە ڕۆژەكـەش واجبـە: قـەزا بكاتـەوە، هەروەها ئەگەر لـە مـاوەی مانەوەكـەدا خـۆی لـە ژنەكـە جیـا بكاتـەوەو نەچێتە لای، ئـەو كاتەش قەزا ناكاتەوە، هەروەك لە (تحفة)دا ڕوون كراوەتەوە (لاَ الرُّجُوعِ فِي الأَصَحِّ) مـاوەی گەڕانەوەش لە سەفەر قەزا ناكاتەوە، لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَمَنْ وَهَبَتْ حَقَّهَا) هـەر ژنێـك مـافی نۆبەتەكـەی بەخشـیە هەوێیەكـەی خـۆی، ئـەوە دروستە، بەڵام (لَمْ يَلْزَمِ الزَّوْجَ الرِّضَا) لە سەر مێردەكە واجب نیە ڕازی ببـێ (فَإِنْ رَضِيَ) جـا ئەگـەر مێردەكـە ڕازی بـوو (وَوَهَبَتْ لِمُعَيَّنَةٍ) هەوێیەكـەش مـافی نۆبەتەكـەی خـۆی بەخشـیە هەوێیـەكیدیاركراو، ئـەوە (بَاتَ عِنْدَهَا لَيْلَتَيْهِمَا) مێردەكـە دوو شـەوەكەی

وَقِيلَ يُوَالِيهِمَا، أَوْ لَهُنَّ سَوَّى، أَوْ لَهُ فَلَهُ التَّخْصِيصُ، وَقِيلَ يُسَوِّى.
(فَصْلٌ) ظَهَرَتْ أَمَارَاتُ نُشُوزِهَا وَعَظَهَا

---

هەردووكيان لە لای پێبەخشراوەكە دەمێنێتەوە ﴿عن عائشةرضي الله عنها: أَنَّ سَوْدَةَ وَهَبَتْ يَوْمَهَا لِعَائِشَةَ، فَكَانَ النَّبِيُّﷺ يَقْسِمُ لَهَا يَوْمَهَا وَيَوْمَ سَوْدَةَ﴾ رواه الشيخان، كە (سَوْدَة) پیر بوو، نۆبەتیخۆی بەخشییە (عائشة)، جا پێغەمبەرﷺ دوو شەو لە لای (عائشة) دەمایەوە: نۆبەتیخۆیو نۆبەتی(سودة).
جا بزانە: هەر شەوێك لە نۆبەتیخۆیدا لە لای دەمێنێتەوە (وَقِيلَ يُوَالِيهِمَا) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: بە دوای یەكتردا لە لای دەمێنێتەوە. (أَوْ لَهُنَّ) یان ئەگەر ژنێك مافی نۆبەتەكەی خۆی بەخشییە هەموو ژنەكانیتر، یان گوتی: مافینۆبەتەكەم ناوێ، ئەو كاتە (سَوَّى) واجبە: مێردەكە بە یەكسانی لە لای ئەوانیتر بمێنێتەوە (أَوْ لَهُ) یان ژنێك مافی نۆبەتەكەی خۆی بەخشییە مێردەكەی، ئەو كاتە (فَلَهُ التَّخْصِيصُ) بۆی دروستە: لە نۆبەتەكەدا بە تایبەتی لە لایژنێك بمێنێتەوە (وَقِيلَ يُسَوِّى) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: واجبە: بە یەكسانی لە لای هەموو ئەوانیتر بمێنێتەوە.
ئینجا بزانە: بۆ ژنە بەخشەرەكە دروستە: هەر كاتێك حەز بكا لە بەخشینەكەی پەشیمان ببێتەوە، بەڵام ئەگەر ژنە بەخشەرەكە مرد، یان تەڵاق درا، یان (ناشزە) بوو، ئەو كاتە پێبەخشراوەكە مافە بەخشراوەكەی لە دەست دەچێ، هەروەك لە (مغني)و حاشیەكانی (تحفة)دا ڕوون كراوەتەوە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی ناكۆكیی نێوان ژنو مێرد ﴾

(ظَهَرَتْ أَمَارَاتُ نُشُوزِهَا) هەر كاتێك نیشانەكانی (ناشزة)بوونی ژنەكە بەدەركەوتن: وەك بە ڕەقی وەڵامی بداتەوە، یان ڕووگرژ بێ، یان لووت لەو لای بكا بە بێعوزرێكی شەرعی، پێشداش ئەو ڕەووشتانەی نەبووبێ (وَعَظَهَا) سوننەتە مێردكە ئامۆژگاریی بكاو دواڕۆژی ڕەشی لێكجیابوونەوەی لە دونیادا بۆ ڕوون بكاتەوەو هەم لە سزای ڕۆژی قیامەتیش بە ئاگری دۆزەخو بەم حەدیسە بیترسێنێ: كە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِذَا دَعَاالرَّجُلُ امْرَأَتَهُ إِلَى فِرَاشِهِ فَأَبَتْ أَنْ تَجِيءَ لَعَنَتْهَا الْمَلَائِكَةُ حَتَّى تُصْبِحَ﴾ رواه الشيخان، هەر كاتێك مێرد داوای سەرجێیی لە ژنەكەی بكاو ژنەكەش نەچێتە لای، ئەوە مەلائیكە لەعنەتی لێدەكەن تا دەگاتە بەیانی.
خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَاللاَّتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلا تَبْغُوا عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً﴾ ئەو ژنانەی لە ناشیزەبوونیان دەترسن ئامۆژگارییان بكەن، جا ئەگەر ئامۆژگارییان وەرنەگرتو ناشیزە بون، ئەو كاتە جێگەی

بلاَ هَجْرٍ، فَإِنْ تُحُقِّقَ نُشُوزٌ وَلَمْ يَتَكَرَّرْ وَعَظَ وَهَجَرَ فِي الْمَضْجَعِ وَلاَ يَضْرِبُ فِي الأَظْهَرِ، قُلْتُ: اَلأَظْهَرُ يَضْرِبُ وَاللهُ أَعْلَمُ. فَإِنْ تَكَرَّرَ ضَرَبَ، فَلَوْ مَنَعَهَا حَقًّا كَقَسْمٍ وَنَفَقَةٍ أَلْزَمَهُ الْقَاضِي تَوْفِيَتَهُ، فَإِنْ أَسَاءَ خُلُقَهُ وَآذَاهَا بِلاَ سَبَبٍ نَهَاهُ، فَإِنْ عَادَ عَزَّرَهُ،

---

خەوتنیان لەگەڵ جیا بکەنەوە، جا ئەگەر سوور بون لە سەر ناشیزەبوون، ئەو کاتە لێیان دەن، جا ئەگەر گوێڕایەڵی ئێوە بون هیچ ڕێگایەکی‌تر لە دژی ئەوان داوا مەکەن.

(بلاَ هَجْرٍ) بەڵام جێگای خەوتنی لێ جیا ناکاتەوەو لێی‌نادا، بەڵکو (فَإِنْ تُحُقِّقَ نُشُوزٌ وَلَمْ يَتَكَرَّرْ) ئەگەر ناشیزەبوونەکەی بە ڕاستی هاتە جێ‌و دووبارەش نەبۆوە، ئەو کاتە (وَعَظَ وَهَجَرَ فِي الْمَضْجَعِ) ئامۆژگاری‌ی دەکاو جێگای خەوتنیشی لێ جیا دەکاتەوەو جیماعیشی لەگەڵ ناکا، بەڵام دروست نیە قسەی لەگەڵ نەکا، هەم (وَلاَ يَضْرِبُ فِي الأَظْهَرِ) لێی نادا (قُلْتُ) ئیمامی (النواوي) دەفەرموێ (الأَظْهَرُ يَضْرِبُ وَاللهُ أَعْلَمُ) بە فەرموودەی بەهێزتر: دروستە لێی‌بدا، بەو مەرجە ئاژاوەو دوژمنایەتی ڕوو نەداو لێدانەکەش سوودی هەبێ، ئەگینا: لێی‌نادا.

هەروەها (فَإِنْ تَكَرَّرَ) ئەگەر ناشیزەبوونەکەی دووبارە بۆوە، ئەو کاتە (ضَرَبَ) دروستە لێی بدا، بە بەڵگەی ئایەتەکە، بەڵام دروست نیە لێدانێکی وەها: کە خوێنی لێبێنێ، یان شوێنێکی بشکێنێ، یان ڕەش‌وشینی بکا، هەم دروست نیە لە دەم‌وچاو و شوێنە بەترسەکانیشی بدا، بەڵکو وا باشترە لە لێدانەکە لێی ببورێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

ئینجا بزانە: خوای گەورە دەفەرموێ ﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ﴾ ژنەکان مافیان لە سەر مێردەکانیان هەیە، وەك ئەو مافەی مێردەکان لە سەر ژنەکانیان هەیە بەگوێرەی شەرع، بەڵام پیاوەکان پلەیەك زیاتر مافیان لە سەر ژنەکان هەیە. کەوابو: (فَلَوْ مَنَعَهَا حَقًّا) ئەگەر مێردەکە مافێکی لە ژنەکە قەدەغەکرد (كَقَسْمٍ وَنَفَقَةٍ) وەك نۆبەتی شەوی‌و بژێوی ڕۆژانە، ئەوە (أَلْزَمَهُ الْقَاضِي تَوْفِيَتَهُ) قازی لە سەر مێردەکە واجبی دەکا مافەکە بە تەواوی بداتە ژنەکەی.

(فَإِنْ أَسَاءَ خُلُقَهُ وَآذَاهَا بِلاَ سَبَبٍ) جا ئەگەر مێردەکە خوڵقی لەگەڵ ژنەکەی خراپ بوو و بە بێ‌هیچ هۆیەك ژنەکەی ئازار دەدا، ئەو کاتە (نَهَاهُ) قازی پێی دەڵێ: وا نەکا، ئینجا (فَإِنْ عَادَ) ئەگەر دووبارە–بە بێ‌هیچ هۆیەك– گەڕاوە سەر سزادانی ژنەکەی، ئەو کاتە (عَزَّرَهُ) قازی تەمبێی دەکا: بە بۆچوونی‌خۆی.

بەڵام ئەوەش بزانە: مێردەکە بۆی دروستە: ژنەکەی قەدەغە بکا لە سەردانی دایك‌و باوك، هەرچەند نەخۆشیش بن، بەڵکو بۆی دروستە لە چوونە سەر جەنازەکەشیان قەدەغەی بکا، بەڵام وا باشترە ئەوها نەکا، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.

وَإِنْ قَالَ كُلٌّ: إِنَّ صَاحِبَهُ مُتَعَدٍّ. تَعَرَّفَ الْقَاضِي الْحَالَ بِثِقَةٍ يَخْبُرُهُمَا وَمَنَعَ الظَّالِمَ، فَإِنْ اشْتَدَّ الشِّقَاقُ بَعَثَ حَكَمًا مِنْ أَهْلِهِ وَحَكَمًا مِنْ أَهْلِهَا،

---

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر مێردەکە ستەمی لە ژنەکەی نەدەکرد، بەلام پێی ناخۆش بوو لەگەڵی بمێنێتەوە لە بەر نەخۆشیی، یان پیریی، یان هەر شتێکیتر، ئەوە مێردەکە هیچی لە سەر نیە، بەلام بۆ ژنەکە وەها سوننەتە: دڵی مێردەکەی ڕابگرێو واز لە هەندێك مافیخۆی بێنێ، هەروەك لە حەدیسەکەی باسەکەیڕابردوودا حەزرەتی(سَوْدة) وازی لە نۆبەتیخۆی هێنا بۆ حەزرەتی(عائشة)و، لە (نهاية)و (مغني)دا ڕوون کراوەتەوە.

هەم ﴿عن عائشة رضي الله عنها في تفسير قوله تعالى: (وَإِنِ امْرَأَةٌ خَافَتْ مِنْ بَعْلِهَا نُشُوزاً أَوْ إِعْرَاضاً فَلا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا أَنْ يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحاً وَالصُّلْحُ خَيْرٌ). قالَتْ: هِيَ الْمَرْأَةُ تَكُونُ عِنْدَ الرَّجُلِ لايَسْتَكْثِرُ مِنْهَا فَيُرِيدُ طَلاَقَهَا وَزَوَاجَ غَيْرِهَا، فَتَقُولُ لَهُ: أَمْسِكْنِي وَلاَ تُطَلِّقْنِي ثُمَّ تَزَوَّجْ غَيْرِي فَأَنْتَ فِي حِلٍّ مِنَ النَّفَقَةِ وَالْقِسْمَةِ لِي﴾ رواه البخاري، وا دەبێ مێرد دڵی بۆ ژنەکەی ناچێ بە هۆی پیربوونی ژنەکە، یان ناشیرنیی، یان هەر هۆیەکیتر، جا دەیەوێ تەلاقی بداو ژنێکیتر بێنێ، جا ئەم ژنە پێی دەڵێ: تەلاقم مەدەو بمهێڵەوەو ژنێکیتریش بۆ خۆت بێنە، منیش لە نۆبەتی شەوێو لە بژێوەکەم گەردەنت ئازاد دەکەم. جا حەزرەتی(عائشة) فەرمووی: ئەوە مەبەستی فەرموودەکەی خوای گەورەیە، واتە: کە لە ئایەتەکەیڕابردوودا فەرمووی: (ئەگەر ژنێك لە لالووتیو وازلێهێنانی مێردەکەیترسا، هیچ گوناهیان لە سەر نیە کە بۆ خۆیان پێك بێن بە سولحکردنێك، سولحکردنیش باشترە).

(وَإِنْ قَالَ كُلٌّ) ئەگەر ژنەکەو مێردەکە هەردووکیان گوتیان: (إِنَّ صَاحِبَهُ مُتَعَدٍّ) هاوسەرەکەی دوژمنکاری دەکا، ئەو کاتە (تَعَرَّفَ الْقَاضِي الْحَالَ) قازی هەوڵ دەدا حاڵی نێوان ژنەکەو مێردەکە بزانێ (بِثِقَةٍ يَخْبُرُهُمَا) بە هۆی باوەڕپێکراوێك کە بە ڕاستی لە هەواڵی هەردووکیان بکۆڵێتەوە، ئینجا (وَمَنَعَ الظَّالِمَ) کامەیان ستەمکارە، قازی قەدەغەی دەکا.

(فَإِنْ اشْتَدَّ الشِّقَاقُ) جا ئەگەر ناکۆکی نێوان ژنو مێردەکە هەر بەردەوام دەبو، ئەو کاتە (بَعَثَ حَكَمًا مِنْ أَهْلِهِ وَحَكَمًا مِنْ أَهْلِهَا) واجبە قازی (حَكَم)ێك لە خزمەکانی مێردەکەو (حَكَم)ێکیش لە خزمەکانی ژنەکە بنێرێ تاکو لە هۆیەکانی ناکۆکیەکە بکۆڵنەوە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُوا حَكَماً مِنْ أَهْلِهِ وَحَكَماً مِنْ أَهْلِهَا إِنْ يُرِيدَا إِصْلاحاً يُوَفِّقِ اللهُ بَيْنَهُمَا﴾ ئەگەر لە ناکۆکی نێوان ژنو مێردەکە ترسان، ئەوە(حَكَم)ێك لە خزمەکانی مێردەکەو (حَكَم)ێکیش لە خزمەکانی ژنەکە بنێرن بۆ چارەسەری ناکۆکیەکە، ئەگەر بیانەوێ نێوانیان چاك بکەن خوایگەورەش نێوانیان ڕێك دەکاو سەرکەوتوویان دەکا.

وَهُمَا وَكِيلاَنِ لَهُمَا، وَفِي قَوْلٍ مُوَلَّيَانِ مِنَ الْحَاكِمِ، فَعَلَى الأَوَّلِ يُشْتَرَطُ رِضَاهُمَا فَيُوَكِّلُ حَكَمَهُ بِطَلاَقٍ وَقَبُولِ عِوَضِ خُلْعٍ، وَتُوَكِّلُ حَكَمَهَا بِبَذْلِ عِوَضٍ وَقَبُولِ طَلاَقٍ بِهِ.

(كِتَابُ الْخُلْعِ)

---

ئینجا بزانه: هەر (حَكَم)ێك به تەنها كۆبوونەوە لەگەڵ خزمەكەی خۆی دەكاو هۆیەكانی ناكۆكیەی لێوەردەگرێ، ئینجا هەردوو (حَكَم)ەكانیش وێكرا دادەنیشنو هەوڵی پێكهاتنەوەیان دەدەن، جا ئەگەر سەركەوتوو نەبون، ئەو كاتە لێكیان جیا دەكەنەوە.

(وَهُمَا وَكِيلاَنِ لَهُمَا) هەردوو (حَكَم)ەكان وەكیلی ژنەكەو مێردەكەنە (وَفِي قَوْلٍ مُوَلَّيَانِ مِنَ الْحَاكِمِ) لە فەرموودەیەكدا: لە لای قازی كراونەتە دادوەر لەم كارەدا (فَعَلَى الأَوَّلِ) جا لە سەرفەرموودەیەكەمی بەهێزتر: (يُشْتَرَطُ رِضَاهُمَا) بە مەرج دادەندرێ: ژنەكەو مێردەكە بە ناردنی(حَكَم)ەكان ڕازی بن، كەوابو: (فَيُوَكِّلُ حَكَمَهُ) مێردەكە (حَكَم)ی خۆی دەكاتە وەكیل (بِطَلاَقٍ وَقَبُولِ عِوَضِ خُلْعٍ) بۆ تەڵاقدانی ژنەكەو بۆ وەرگرتنی پارەی تەڵاقدانەكە، هەم (وَتُوَكِّلُ حَكَمَهَا) ژنەكەش (حَكَم)یخۆی دەكاتە وەكیل (بِبَذْلِ عِوَضٍ وَقَبُولِ طَلاَقٍ بِهِ) بۆ دانی پارەی تەڵاقەكەو قبولكردنی تەڵاقەكە بە پارە، ئینجا (حَكَم)ەكانیش كام لایان پێ پاشتر بوو: لە پێكهێنانەكەو تەڵاقدانەكە ئەو لایە دەكەن، بەڵام تەڵاقدانەكە دەبی تەنها یەك تەڵاق بێ، هەروەك لە (الشرواني)دا فەرموویەتی.

﴿ كِتَابُ الْخُلْعِ: **پەڕتوكی خولع، واتە: كڕینەوەی تەڵاق لە مێردەكە** ﴾

**پێشەكی بزانە**: ژنیتەڵاقدراو دوو جۆرن، یەكەم: (اَلرَّجْعِيَّةَ). دووەم: (اَلْبَائِن).

١-(اَلرَّجْعِيَّة) ئەو ژنەیە: مێردەكەی جیماعی لەگەڵ كردبێ، ئینجا بە خۆڕایی بە تەڵاقێك، یان بە دوو تەڵاق تەڵاقیدابێو (عِدَّة)شی تەواو نەبوبێ، جا ئەم تەڵاقدراوە پێی دەگوترێ: (اَلرَّجْعِيَّة)-گەڕاوەوەیی. تەڵاقەكەش پێی دەگوترێ: (اَلرَّجْعِيّ)- گەڕاندنەوەیی. چونكە-تا ژنەكە لە (عِدَّة)دا مابێ- مێردەكەی دەتوانێ بێمارەبڕین بیگەڕێنێتەوەو میراتیش لە یەكتری دەگرنو تەڵاقیتریشی دەكەوێ، هەروەك لە (كِتَابُ الطَّلاَق)دا ڕوونی دەكەینەوە، إن شاءالله تعالى.

٢-(اَلْبَائِن) ئەو ژنەیە: سێبەسێ تەڵاق درابێ، یان لە بەرامبەر وەرگرتنی شتێك تەڵاق درابێ، یان پێش ئەوەی مێردەكەی جیماعیلەگەڵ بكا تەڵاقی بدا، یان لە دوای جیماع لەگەڵ كردن تەڵاقی بداو (عِدَّة)ی تەواو ببێ.

جا بزانە: هەر ژنێك بە (بائِن)ی تەڵاقی بكەوێ، لەگەڵ مێردەكەی میرات لە یەكتری ناگرن، جا ئەگەر ژنەكە سێبەسێ تەڵاق بدرێ پێی دەگوترێ: (اَلْبَائِنُ الْكُبْرَى)- جیابووەوەیگەورە. جیاوازی نیە سێبەسێیەكە: بە پارەی بێ، یان بە خۆڕایی، پێش

جیماع لەگەڵكردن بێ، یان لە دوای جیماع لەگەڵكردن، هەم تەڵاقدانەكەش پێی دەگوترێ: (اَلبَيْنُونَةُ الْكُبْرَى)-جیابوونەوەی گەورە. چونكە تەنها بە(مارە بەجاش) لە مێردەكەی حەڵاڵ دەبێتەوە، هەروەك ڕابرا.

هەروەها جگە لە تەڵاقدراوی سێبەسێ، ئەوانیتر پێیان دەگوترێ: (اَلْبَائِنُ الصُّغْرَى)-جیابووەوەی بچوك. تەڵاقدانەكەش پێی دەگوترێ: (اَلْبَيْنُونَةُ الصُّغْرَى)-جیابوونەوەی بچووك. چونكە ئەمەیان بە مارەبرینێكی نوێ لە مێردەكەی حەڵاڵ دەبێتەوە، هەروەك لە باسی تەڵاقدا ڕوونی دەكەینەوە، إن شاء الله تعالى، ئیتر زانستی خولعو تەڵاق دەریایەكی قووڵەو مەلەوانێكی لێزانی دەوێ، بۆیێ تكات لێدەكەم زۆر وریا بەو لە (فتـوا)ی خولعو تەڵاق لە خوا بترسە.

(هُوَ) خولع لـە شـەرعدا: (فُرْقَةٌ بِعِوَضٍ) لێكجیابوونـەوەی ژنو مێردەكەیە لـە بەرامبەر وەرگرتنی شتێك بۆ لایەنی مێردەكە. ئینجا لێكجیابوونەوەكەش: (بِلَفْظِ طَلاَقٍ) بە ووشەی تەڵاق بێ، وەك بڵێ: تەڵاقم دای بە سەد دینار (أَوْ خُلْعٍ) یان بە ووشەی خولع بێ، وەك بڵێ: خولعم لەگەڵت كرد بە سەد دینار. ئینجا لایەنی ژنەكە قبوڵ بكاو پارەكە بدا.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ يُقِيمَا حُدُودَاللهِ فَلا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِـهِ﴾ ئەگەر ترسان لەوەی ژنو مێرد سنووری خوا لە نێوان خۆیاندا نەپارێزن، ئەوە هیچ گوناهیان ناگاتێ لەوەی ژنەكە خۆی بە پارە ڕزگار بكا لە مێردەكەی. ﴿عن ابن عباس رضی الله عنهما: أَنَّ امْرَأَةَ ثابت بن قيس قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ مَا أَعْتِبُ عَلَيْهِ -أي ثابت- فِي خُلُقٍ وَلاَ دِينٍ وَلَكِنِّي أَكْرَهُ الْكُفْرَ فِي الإِسْلاَمِ. فَقَالَ أَتَرُدِّينَ عَلَيْهِ حَدِيقَتَهُ؟ قَالَتْ نَعَمْ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ لِثَابِتٍ: إِقْبَلِ الْحَدِيقَةَ وَطَلِّقْهَا تَطْلِيقَةً﴾ رواه البخاري، ژنەكەی(ثابت) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، هیچ ڕەخنەم لە ڕەووشتو ئایینی (ثابت)ی مێردم نیە، بەڵام دەترسم تووشی بێشەرعی ببم، بۆیێ دەمەوێ لێی جیا ببمەوە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر مێردەكەت تەڵاقت بدا ئەو باغەی بە مارەیی لێت وەرگرتبو دەیدەیەوە؟ گوتی: بەڵێ. پێغەمبەر ﷺ فەرموویە (ثابت): باغەكەی لێقبوڵ بكەوەو بە تەڵاقێك تەڵاقی بدە.

**﴿ئاگاداریەكی گرنگ﴾**: هەر كاتێك مێردەكە سوێندی بە هەرسێك تەڵاقی خوارد: كە ئەم كارە بكا. یان نەیكا. ئینجا دوایێ پێویست بوو كارەكە بكا، یان نەیكا، ئەوە بە خولعكردن لە كەوتنی هەرسێك تەڵاقەكە ڕزگاری دەبێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە، بۆ وێنە: بە دە دینار-بە ووشەیڕابردوو- خولع لەگەڵ ژنەكەی دەكا، ئینجا دووبارە بە مارەبرینێكی نوێ بە مەزهەبی(الشافعي) ژنەكە لە خۆی مارە دەكاتەوە، واتە:

شَرْطُهُ زَوْجٌ يَصِحُّ طَلَاقُهُ، فَلَوْ خَالَعَ عَبْدٌ أَوْ مَحْجُورٌ عَلَيْهِ بِسَفَهٍ صَحَّ وَوَجَبَ دَفْعُ الْعِوَضِ إِلَى مَوْلَاهُ وَوَلِيِّهِ،

---

بەم خولعکردنە تەنها تەڵاقێکی دەکەوێو بە دوو تەڵاقەکەیتر ژنەکەی لێماره دەکرێتەوە، ئینجا لە دوای ئەم مارەکردنەوەیە ئەگەر شتە سوێند لەسەرخواروەکە بکا، یان نەیکا، سێ تەڵاقەکەی ناکەوێ، هەروەك لە باسی (دەسەڵاتی مێرد بە سەر شوێنی تەڵاقدا) ڕوونی دەکەینەوە، إن شاءالله تعالى .

**بەڵام زۆر ئاگادار بە:** هەر خولعێك بکرێ پێویستە مارەکردنەوەکەیدووەم بە مەزهەبی (الشافعي) بێ، هەروەك گوتمان، چونکە ئەگەر بە مەزهەبی(حنفي) بێ-واتە: بێئیزنی سەرپەرشتکارەکە ژنەکە وەکیلێك بگرێو بە مەزهەبی(حنفي) دووبارە لە مێردەکەی مارە بکرێتەوە- ئەو کاتە پێویستە لە دوای خولعکردن (عِدَّة)ی تەواو ببێ، ئینجا لە دوای تەواوبوونی (عِدَّة)ش شتە سوێند لەسەرخوارەکە بکرێ، ئینجا دووبارە لە مێردەکەی مارە بکرێتەوە، هەروەك لە حاشیەکانی (الجمل)و (البجيرمي)و (إعانة)دا ڕوون کراوەتەوە.

واتە: چونکە لە مەزهەبی(حنفي)دا: ئەگەر شتە سوێندلەسەرخوراوەکە لە (عِدَّة)دا بکرێ، یان لە دوای(عِدَّة) لە مارەبڕینەکەیدووەمدا بکرێ، لە هەردوو حاڵەتدا سێ تەڵاقی دەکەوێ، هەروەك لە لاپەرە (٤٢٠)ی بەرگییەکەمی (مجمع الانهر)ی خۆیاندا ڕوون کراوەتەوە.

جا تکات لێدەکەم لە خوا بترسەو بە نەزانی خولع مەکە، ژنی بێتەڵاق مەنێرەوە لای مێردەکەی، هەروەها هەر کاتێك خولع بۆ کەسێك دەکەی پێشدا لێی بپرسە: ئایا چەند جار ژنەکەی تەڵاق داوە؟ چونکە ئەگەر تەنها تەڵاقێکی مابێ، ئەو کاتە بە فەرموودەی بەهێزتر خولعەکەی دەبێتە تەڵاقی سێبەسێو مارە بەجاشی دەوێ، والله أعلم.

(شَرْطُهُ) مەرجی دروستبوونی خولع ئەوەیە: (زَوْجٌ يَصِحُّ طَلَاقُهُ) لە لایەن مێردێکی ئەوهاوە بکرێ: کە تەڵاقدانەکەی دروست ببێ، واتە: بالغو عاقڵو بە خۆشیخۆی بێ، کەوابو: خولعی منداڵو شێتو زۆرلێکراو دروست نابێ، بەڵام لە مەزهەبی ئیمام(مالك)دا: بۆ باوکی مێردێکی منداڵ، یان شێت دروستە: خولعیان بۆ بکا، هەروەك لە (شرح الموطأ)دا فەرموویەتی، واتە: بە پارە ژنەکانیان تەڵاق بدا، بەو مەرجەی خولعکردنەکە لە بەرژەوەندی منداڵەکەو شێتەکەدا بێ، کەوابو: ئەگەر حاڵەتێکی وەها ڕویدا دروستە: باوکەکە بۆ ئەو مەسەلەیە (تقليد)ی مەزهەبی ئیمام (مالك) بکا، والله أعلم.

(فَلَوْ خَالَعَ عَبْدٌ أَوْ مَحْجُورٌ عَلَيْهِ بِسَفَهٍ) ئەگەر کۆیلەیەك، یان قەدەغەکراوێك بە هۆی ماڵ بەفیڕۆدان خولعی کرد (صَحَّ) خولعەکە دروست دەبێ، بەڵام (وَوَجَبَ دَفْعُ الْعِوَضِ إِلَى مَوْلَاهُ وَوَلِيِّهِ) واجبە پارەی خولعەکە بدرێتە دەست گەورەی کۆیلەکەو سەرپەرشتکاری قەدەغەکراوەکە.

وَشَرْطُ قَابِله إِطْلَاقُ تَصَرُّفه فِي الْمَالِ، فَإِنْ اخْتَلَعَتْ أَمَةٌ بِلاَ إِذْنِ سَيِّدٍ بِدَيْنٍ أَوْ عَيْنِ مَالِه بَانَتْ وَلِلزَّوْجِ فِي ذِمَّتِهَا مَهْرُمِثْلٍ فِي صُورَةِالْعَيْنِ وَفِي قَوْلٍ قِيمَتُهَا، وَفِي صُـــورَةِالدَّيْنِ الْمُسَمَّى وَفِي قَوْلٍ مَهْرُمِثْلٍ، وَإِنْ أَذِنَ وَعَيَّنَ عَيْنًا لَهُ أَوْ قَدَّرَ دَيْنًا فَامْتَثَلَتْ تَعَلَّقَ بِـــالْعَيْنِ وَبِكَسْبِهَا فِي الدَّيْنِ، وَإِنْ أَطْلَقَ الإِذْنَ اقْتَضَى مَهْرَالْمِثْلِ مِنْ كَسْبِهَا، وَإِنْ خَالَعَ سَفِيهَةً أَوْ قَالَ طَلَّقْتُكِ عَلَى أَلْفٍ

---

ئینجا بزانە: گوتمان: ئەو شتەی خولعی پێدەکرێ مەرجە: بۆ لایەنی مێردەکە بێ، کەوابو: ئەگەر بە ژنەکەی خۆی گوت: هەر کاتێك گەردەنی فلانکەس ئازاد بکەی لە قەرزەکەت، یان ئەگەر ئەو شتە بدەیتە فلانکەس، تەلاقت بکەوێ. ئەوە نابێتە خولع، بەڵکو تەلاقەکەی بە (رجعي) دەکەوێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَشَرْطُ قَابِلِه) مەرجی ئەو کەسەش کە خولعەکە قبوڵ دەکا: جا ژنەکە بێ، یان بێگانەیەك، بۆ ئەوەی پارەی خولعەکەی لە سەر واجب ببێ، ئەوە یە: (إِطْلَاقُ تَصَرُّفِه فِي الْمَالِ) سەربەخۆ دەستکاریی لە ماڵیخۆیدا دروست بێ، واتە: بالغو عاقڵ بێو قەدەغەکراو و زۆرلێکراو نەبێ، کەوابو: (فَإِنْ اخْتَلَعَتْ أَمَةٌ بِلاَ إِذْنِ سَيِّدٍ) ئەگەر جاریەیەك بێئیزنی گەورەکەی قبوڵی خولعی کرد (بِدَيْنٍ) بە قەرزێك (أَوْ عَيْنِ مَالِه) یان بە خودی ماڵی گەورەکەی، ئەوە (بَانَتْ) جاریەکە بە (بائن)ی تلاقی دەکەوێ، بەلام (وَلِلزَّوْجِ فِي ذِمَّتِهَا مَهْرُ مِثْلٍ فِي صُورَةِ الْعَيْنِ) مێردەکە مارەیی هاوێنەی بە قەرز دەکەوێتە ئەستۆی جاریەکە، لەو وێنەیەی کە بە ماڵیگەورەکەی خولعی قبوڵ کردەو (وَفِي قَوْلٍ قِيمَتُهَا) لە فەرموودەیەکدا: نرخی ماڵەکە بە قەرز دەکەوێتە ئەستۆی جاریەکە (وَفِي صُورَةِ الدَّيْنِ الْمُسَمَّى) لە وێنەی قەرزەکەشدا ناوبراوەکە دەکەوێتە ئەستۆیجاریەکە (وَفِيقَوْلٍ مَهْرُمِثْلٍ) لە فەرموودەیەکدا: مارەییهاوێنەی دەکەوێتە ئەستۆ.

(وَإِنْ أَذِنَ) ئەگەر گەورەکەی ئیزنیدا خولع قبوڵ بکاو (وَعَيَّنَ عَيْنًا لَهُ أَوْ قَدَّرَ دَيْنًا) لە خودی ماڵیخۆیشی شتێکی بۆ خولعەکە دیاری کرد، یان ئەندازەی قەرزێکی لە ئەستۆی جاریەکەدا دانا (فَامْتَثَلَتْ) جاریەکەش بە قسەی گەورەکەی کرد، ئەوە (تَعَلَّقَ بِالْعَيْنِ) مێردەکە دەست بە خودی ماڵە دیارکراوەکەوە دەگرێ ئەگەر بە ماڵەکە خولعی کردبێ (وَبِكَسْبِهَا فِي الدَّيْنِ) یان دەست بە کەسابەتی جاریەکەوە دەگرێ ئەگەر بە قەرزەکەی کرابێ، بەلام (وَإِنْ أَطْلَقَ الإِذْنَ) ئەگەر گەورەکە تەنها ئیزنیداو باسی هیچیتری نەکرد، ئەو کاتە (اقْتَضَى مَهْرَالْمِثْلِ مِنْ كَسْبِهَا) خولعەکە مارەیی هاوێنە واجب دەکا لە کەسابەتی جاریەکە بدرێ.

(وَإِنْ خَالَعَ سَفِيهَةً) ئەگەر مێردەکە خولعی کرد لەگەڵ ژنێکی قەدەغەکراو بە هۆی ماڵ بە فیڕۆدان بە سەد دینار (أَوْ قَالَ طَلَّقْتُكِ عَلَى أَلْفٍ) یان پێی گوت: تۆم تەلاق دا لە سەر هەزار

فَقبِلَتْ طَلَقَتْ رَجْعِيًّا، فَإِنْ لَمْ تَقبل لَمْ تَطْلُقْ، وَيَصِحُّ اخْتِلاَعُ الْمَرِيضَةِ مَرَضَ الْمَوْتِ وَلاَ يُحْسَبُ مِنَ الثُّلُثِ إلاَّ زَائِدٌ عَلَى مَهْرِمِثْلٍ، وَرَجْعِيَّةٍ فِي الأَظْهَرِ، لاَ بَائِنٍ، وَيَصِحُّ عِوَضُهُ قَلِيلاً وَكَثِيراً دَيْنًا وَعَيْنًا وَمَنْفَعَةً،

---

دینار (فَقبِلَتْ) ژنەکەش قبوڵی کرد، ئەوە (طَلَقَتْ رَجْعِيًّا) لە هەردوو مەسەلەکەدا ژنەکە بە (رَجْعِي) تەڵاقی دەکەوێ، نە سەد دینارەکەو نە هەزارەکەی ناکەوێتە سەر؟ چونکە قەدەغەکراوە، بەڵام (فَإِنْ لَمْ تَقبل) ئەگەر ژنەکە خولعەکەو تەڵاقەکەی قبوڵ نەکرد، ئەو کاتە (لَمْ تَطْلُقْ) تەڵاقی ناکەوێ، چونکە ووشەکە قبولکردنی دەوێ.

(وَيَصِحُّ اخْتِلاَعُ الْمَرِيضَةِ مَرَضَ الْمَوْتِ) ئەو ژنەی بە نەخۆشیی مردن نەخۆش کەوتوە دروستە خولعی خۆی قبوڵ بکاو (وَلاَيُحْسَبُ مِنَ الثُّلُثِ إلاَّ زَائِدٌ عَلَىمَهْرِمِثْلٍ) ئەو ماڵەی خولعی پێکردوە لە سێیەکی ماڵەکەی حیساب ناکرێ تەنها ئەو ئەندازەیە نەبێ: کە لە مارەیی هاووێنەی زیاترە.

هەروەها ئەگەر مێردەکەش نەخۆشیءمردنی بێ دروستە خولع بکا، چونکە بە خۆڕاییش تەڵاقدانی دروستە، هەروەها ئەو بێگانەیەی نەخۆشیی مردنیەتی دروستە بە ماڵیخۆی خولعی ژنەکە لە مێردەکەی قبوڵ بکا، بەڵام ئەمەیان هەموو ماڵە خولع پێکراوەکە لە سێیەکی ماڵەکەی حیساب دەکرێ، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

(وَرَجْعِيَّةٍ فِي الأَظْهَرِ) هەروەها ئەو ژنەی بە (رجعي) تەڵاقدراوە، دروستە خولعی خۆی قبوڵ بکا، لە فەرموودەی بەهێزتردا، چونکە تا لە (عِدَّة)دا بێ وەکو ژنی مێردیخۆی بڕیاری بۆ دەدرێ (لاَ بَائِنٍ) بەڵام ئەو ئەو ژنە تەڵاقدراوەی بووەتە (بائن)، خولعی دروست نابێ، جیاوازی نیە: بە خولع بوبێتە (بائن)، یان بە تەواوبوونی (عِدَّة)، یان بە تەڵاقدانی پێش جیماع، چونکە تەڵاقدراوی(بائن) بێگانەیەو لە ژێر دەسەڵاتی مێردەکەیدا نەماوە.

## ﴿ پارەی خولع ﴾

(وَيَصِحُّ عِوَضُهُ) پارەی خولع دروست دەبێ، جا پارەکە: (قَلِيلاً وَكَثِيراً) کەم بێ، یان زۆر بێ، پولو دراو بێ، یان شتێکیتر بێ (دَيْنًا وَعَيْنًا وَمَنْفَعَةً) قەرز بێ، یان ماڵێکی دیارکراو بێ، یان سودێك بێ، بەڵام مەرجە: پارەکە ماڵ بێو زاندراو بێو توانای تەسلیمکردنی هەبێ، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.

کەواتە: ئەگەر خولع لەگەڵ کوێرێك بکا بە شتێکیدیارکراو، ئەو شتە دیارکراوەی لە سەر جێگیر نابێ، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی، بەڵکو تەڵاقەکەی بە (مهرالمثل) دەکەوێ، بۆیێ پێویستە: بۆ خولعکردن کوێرەکە وەکیلێك بگرێ، هەروەك لە کڕین و فرۆشتندا رابرا.

وَلَوْ خَالَعَ بِمَجْهُولٍ أَوْ خَمْرٍ بَائَتْ بِمَهْرِ مِثْلٍ، وَفِي قَوْلٍ بِبَدَلِ الْخَمْرِ،

هەروەها (وَلَوْ خَالَعَ بِمَجْهُولٍ) ئەگەر مێردەکە خولعی لەگەڵ ژنەکەی کرد بە شتێکی نەزانراو: وەك پارچە جلێك، یان مەڕێك، یان یەکێك لەو دوو مانگایە (أَوْ خَمْرٍ) یان بە کوپێك شەراب، یان بە سەگێك، یان بە کەلاکێکی مرداریوو، یان بە شتێکی زەوتکراو، ئەوە لەو حاڵەتانەدا ئەگەر ژنەکە قبوڵ بکا (بَائَتْ بِمَهْرِ مِثْلٍ) ژنەکە بە (بائن)ی تەڵاقی دەکەوێ بە مارەیی هاووێنەی کە بیداتە مێردەکەی، چونکە پارەی خولعەکە دروست نەبووە، بەڵام ئەگەر ژنەکە قبوڵ نەکا تەڵاقەکە ناکەوێ (وَفِي قَوْلٍ بِبَدَلِ الْخَمْرِ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا بە پارەی شەرابەکە تەڵاقی دەکەوێ.

جا بزانە: ئەگەر خولعەکە جگە لە ژنەکە لەگەڵ کەسێکیتر بکرێ: بەم سەگە، یان بەم کەلاکە مرداریووە، یان بەم زەوتکراوە، ئەوە پێویست بە قبوڵکردن ناکا، چونکە تەڵاقەکە بە(رجعی) دەکەوێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەوەیڕابردوو لە حاڵەتێکدا بوو: کە ئەو شتە پیسەی دەکرێتە پارەی خولع، شتێکی مەبەست بێو بایەخێکیپێبدرێ هەروەك ڕابرا، بەڵام ئەگەر شتە پیسەکە مەبەست نەبێ: وەك بڵێ: خولعم لەگەڵ کردی، یان تەڵاقم دای بە پیاڵە خوێنێك. یا بە قشپلێك. یان بە مێشێك. ئەو کاتە –ئەگەر سێ تەڵاقی مەبەست نەبوبێ– بە (رجعي) تەڵاقی دەکەوێو هیچ ماڵیش ناکەوێتە سەر ژنەکە، جیاوازی نیە: خولعەکەی قبوڵ کردبێ، یانا؟ چونکە وەك بە خۆڕایی تەڵاقی دابێ ئەوهایە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

بەڵام ئەگەر شتە خولع پێکراوەکە پاكو بێنرخ بێ: وەك بڵێ: بە دوو دەنکە گەنم تەڵاقم دای. یان بە فلسێك تەڵاقت کەوتبێ. ئەو کاتە –ئەگەر ژنەکە قبوڵ بکا– بە مارەیی هاووێنە بە (بائن)ی تەڵاقی دەکەوێ، هەروەك لە (الشبراملسی)دا لە دوای باسەکەی داهاتوودا ڕوون کراوەتەوە، بەڵام ئەگەر ژنەکە قبوڵ نەکا، ئەوە تەڵاقی ناکەوێ، هەروەك لە (جواهرالفتاوی)دا ڕوون کراوەتەوە.

## ﴿ خولع بە مارەیی ژنەکە ﴾

ئەگەر مێردەکە خولع لەگەڵ ژنەکەی بکا بە مارەییژنەکەی کە بە قەرز لە ئەستۆیدا ماوە، یان بە هەر قەرزێکیتری ژنەکەی کە لە سەریەتی، ئەوە مەرجە: ژنەکەو مێردکە هەردووکیان بزانن مارەییەکەو قەرزەکە چەندە، هەم مەرجە: مارەییەکەو قەرزەکە زەکاتی تێدا واجب نەبوبێ، چونکە ئەندازەی زەکات دەبێتە ملکی هەژارەکانو گەردەنی مێردەکە لەو ئەندازەیە ئازاد نابێ، هەم مەرجە: لە دانیشگەی خولعەکەشدا گەردەنی مێردەکەی ئازاد بکا لە مارەییەکەی، یان لە قەرزەکەی:

وَلَهُمَا التَّوْكِيلُ، فَلَوْ قَالَ لِوَكِيلِهِ: خَالِعْهَا بِمِأَةٍ. لَمْ يَنْقُصْ مِنْهَا، وَإِنْ أَطْلَقَ لَمْ يَنْقُصْ عَنْ مَهْرِ مِثْلٍ، فَإِنْ نَقَصَ فِيهِمَا لَمْ تَطْلُقْ، وَفِي قَوْلٍ يَقَعُ بِمَهْرِ مِثْلٍ، وَلَوْ قَالَتْ لِوَكِيلِهَا: اخْتَلِعْ بِأَلْفٍ. فَامْتَثَلَ نَفَذَ،

---

بۆ وێنە: مێردەکە دەڵێ: ئەگەر گەردەنت ئازاد کردم لە مارەییەکەت تەڵاقت بکەوێ. ژنەکەش یەکسەر لەم دانیشگەدا بڵێ: گەردەنت ئازاد بێ لە مارەییەکەم. کەوابو: ئەگەر ژن‌و مێردەکە، یان تەنها یەکێکیان نەیدەزانی مارەییەکە، یان قەرزەکە چەندە، یان مارەییەکەو قەرزەکە زەکاتی تێدا واجب بوبێ، یان گفتوگۆیەکی‌زۆری بێگانە، یان بێدەنگبوونێکی درێژ کەوتە نێوان قسەی ژن‌و مێردەکە، ئەوە لە هیچ حاڵەتێکدا تەڵاقەکە ناکەوێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

جا ئەگەر ژنەکە -لەجیاتی گەردەن ئازادکردن- گوتی: مارەییەکەم نەزری تۆ بێ. ئەو کاتە ئەگەر مەبەستی لادانی قەرزەکە بێ لە ئەستۆی مێردەکەی، ئەوە تەڵاقی دەکەوێ، ئەگەر نا: نا، هەروەك لە (تحفه)دا فەرموویەتی، جا ئەگەر ژنەکە لە دانیشگەی خولعەکەدا نەبو، ئەو کاتە مەرجە: هەر کاتێك خەبەرەکەی زانی یەکسەر گەردەنی مێردەکەی ئازاد بکا، هەروەك لە (تحفه)و (الشروانی)دا فەرموویانە، هەروەها مەرجە ژنەکەو مێردەکە: بالغو عاقڵ بن‌و زۆرلێکراو و قەدەغەکراو نەبن، هەروەك ڕابرا.

(وَلَهُمَا التَّوْكِيلُ) بۆ ژنەکەو بۆ مێردەکە دروستە: لە خولعکردنەکەدا وەکیل بگرن ( فَلَوْ قَالَ لِوَكِيلِهِ) جا ئەگەر مێردەکە بە وەکیلەکەی خۆی گوت: (خَالِعْهَا بِمِأَةٍ) خولع لەگەڵ ژنەکەم بکە بە سەد دینار. ئەوە (لَمْ يَنْقُصْ مِنْهَا) نابێ لە سەددینارەکە بە کەمتر خولع بکا، بەڵام بە زیاتر دروستە (وَإِنْ أَطْلَقَ) ئەگەر مێردەکە تەنها گوتی: خولعی لەگەڵ بکە. واتە: هیچماڵێکی نەگوت، ئەو کاتە (لَمْ يَنْقُصْ عَنْ مَهْرِ مِثْلٍ) نابێ لە مارەیی هاووێنە بە کەمتر خولع بکا (فَإِنْ نَقَصَ فِيهِمَا) جا ئەگەر لە هەردوو مەسەلەکەدا کەمی کردەوە، واتە: لە سەدەکەو لە مارەییی هاووێنە، ئەو کاتە (لَمْ تَطْلُقْ) تەڵاقی ناکەوێ، چونکە دژایەتی‌ی کردوە (وَفِي قَوْلٍ يَقَعُ بِمَهْرِ مِثْلٍ) لە فەرمودەیەکی بێ‌هێزدا: بە مارەیی هاووێنە تەڵاقەکەی دەکەوێ.

ئینجا بزانە: ئەگەر ژنەکەش تەنها ئەوەندە بڵێتە وەکیلەکەی: خولعم بۆ قبوڵ بکە. واتە: باسی هیچ ماڵێکیشی نەکرد، ئەو وەکیلەش نابێ لە مارەیی هاووێنە بە زیاتر بۆی قبوڵ بکا، جا ئەگەر بە زیاتر بۆی قبوڵ کرد، ئەوکاتە مارەیی هاووێنە دەکەوێتە سەر ژنەکەو زیادەکەش دەکەوێتە سەر وەکیلەکە، هەروەك لە (تحفة)و (مغنى)دا فەرموویانە.

(وَلَوْ قَالَتْ لِوَكِيلِهَا) ئەگەر ژنەکە بە وەکیلەکەی‌خۆی گوت: (اخْتَلِعْ بِأَلْفٍ) خولعم بۆ قبوڵ بکە بە هەزار دینار (فَامْتَثَلَ) وەکیلەکەش بە قسەی کرد، واتە: بە هەزارەکە، یان بە

وَإِنْ زَادَ فَقَالَ: اخْتَلَعْتُهَا بِأَلْفَيْنِ مِنْ مَالِهَا بِوَكَالَتِهَا. بَانَتْ وَيَلْزَمُهَا مَهْرُمِثْلٍ، وَفِي قَوْلٍ الأَكْثَرُ مِنْهُ وَمِمَّا سَمَّتْهُ، وَإِنْ أَضَافَ الْوَكِيلُ الْخُلْعَ إِلَى نَفْسِهِ فَخُلْعُ أَجْنَبِيٍّ وَالْمَالُ عَلَيْهِ، وَإِنْ أَطْلَقَ فَالأَظْهَرُ أَنَّ عَلَيْهَا مَا سَمَّتْ وَعَلَيْهِ الزِّيَادَةُ، وَيَجُوزُ تَوْكِيلُهُ ذِمِّيًّا وَعَبْدًا وَمَحْجُورًاعَلَيْهِ بِسَفَهٍ، وَلاَ يَجُوزُ تَوْكِيلُ مَحْجُورٍعَلَيْهِ فِي قَبْضِ الْعِوَضِ، وَالأَصَحُّ صِحَّةُ تَوْكِيلِهِ امْرَأَةً بِخُلْعِ زَوْجَتِهِ أَوْ طَلاَقِهَا،

---

کەمتر خولعی بۆ قبولّ کرد، ئەوە (نَفَذَ) خولعەکە جێبەجێ دەبێ، بەلاّم (وَإِنْ زَادَ فَقَالَ: اخْتَلَعْتُهَا بِأَلْفَيْنِ مِنْ مَالِهَا بِوَكَالَتِهَا) ئەگەر لە هەزارەکە بە زیاتری کردو گوتی: خولعی ئەو ژنەم قبولّ کرد بە دوو هەزار دینار لە ماڵی ژنەکە بە وەکیلایەتی ژنەکە. ئەوە (بَانَتْ وَيَلْزَمُهَا مَهْرُ مِثْلٍ) ژنەکە بە (بائن)ی تەلاّقی دەکەوێو مارەیی هاوێنەیشی دەکەوێتە سەر بۆ مێردەکە، بەلاّم وەکیلەکە هیچی ناکەوێتە سەر، هەروەك لە (تحفة)و (نهایة)دا فەرموویانە (وَفِي قَوْلِ الأَكْثَرُ مِنْهُ وَمِمَّا سَمَّتْهُ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: لە مارەیی هاوێنەو لە ناوبراوەکە کامەیان زۆرترە، ئەوەی دەکەوێتە سەر.

بەلاّم هەر لەم مەسەلەیەدا (وَإِنْ أَضَافَ الْوَكِيلُ الْخُلْعَ إِلَى نَفْسِهِ) ئەگەر وەکیلەکە خولعەکەی نیسبەت دا لای‌خۆیو گوتی: بە ماڵی‌خۆم ئەم خولعەم قبولّ کرد بە دوو هەزار دینار. ئەوەش (فَخُلْعُ أَجْنَبِيٍّ) خولعی بێگانەیەو دروست دەبێ، هەم (وَالْمَالُ عَلَيْهِ) ماڵە خولع پێکراوەکەش هەمووی دەکەوێتەسەر خۆی، هیچی ناکەوێتەسەر ژنەکە.

بەلاّم (وَإِنْ أَطْلَقَ) ئەگەر باسی هیچ لایەکی نەکردو تەنها گوتی خولعی فلاّنە ژنەم قبولّ کرد بە دوو هەزار دینار. ئەو کاتەش (فَالأَظْهَرُ أَنَّ عَلَيْهَا مَا سَمَّتْ) بە فەرموودەی بەهێزتر: ژنەکە ناوی چەند ماڵی هێناوە ئەوەندە دەکەوێتەسەر خۆی: کە هەزارەکەیەو (وَعَلَيْهِ الزِّيَادَةُ) زیادەکەش دەکەوێتە سەر وەکیلەکە: کە هەزاەکەی‌ترە، بەلاّم بۆ مێردەکە دروستە: هەردوو هەزارەکە لە وەکیلەکە بستێنێ، ئینجا وەکیلەکەش هەزارێك لە ژنەکە وەردەگرێتەوە.

(وَيَجُوزُ تَوْكِيلُهُ ذِمِّيًّا وَعَبْدًا وَمَحْجُورًا عَلَيْهِ بِسَفَهٍ) دروستە مێردەکە: جولەکەو گاوور کۆیلەو قەدەغەکراوی ماڵ بەفیڕۆدەر بکاتە وەکیل بۆ خولعکردن، بەلاّم (وَلاَ يَجُوزُ تَوْكِيلُ مَحْجُورٍ عَلَيْهِ فِي قَبْضِ الْعِوَضِ) دروست نیە قەدەغەکراوێك بکاتە وەکیلی‌خۆی لە وەرگرتنی پارەی خولعەکەدا (وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر (صِحَّةُ تَوْكِيلِهِ امْرَأَةً) دروستە مێردەکە ئافرەتێك بکاتە وەکیلی خۆی (بِخُلْعِ زَوْجَتِهِ أَوْ طَلاَقِهَا) بۆ خولعکردن لەگەلّ ژنەکەی، یان بۆ تەلاّقدانی ژنەکەی، هەروەها دروستە: ژنەکەش ئافرەتێك بکاتە وەکیلی خۆی تاکو خولعی بۆ قبولّ بکا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

وَلَوْ وَكَّلاَ رَجُلاً تَوَلَّى طَرَفًا، وَقِيلَ الطَّرَفَيْنِ.

(فَصْلٌ) اَلْفُرْقَةُ بِلَفْظِ الْخُلعِ طَلاَقٌ، وَفِي قَوْلٍ فَسْخٌ لاَ يَنْقُصُ عَدَدًا، فَعَلَى الأَوَّلِ لَفْظُ الْفَسْخِ كِنَايَةٌ، وَالْمُفَادَاةُ كَخُلْعٍ فِي الأَصَحِّ، وَلَفْظُ الْخُلْعِ صَرِيحٌ، وَفِي قَوْلٍ كِنَايَةٌ، فَعَلَى الأَوَّلِ لَوْ جَرَى بِغَيْرِ ذِكْرِ مَالٍ وَجَبَ مَهْرُمِثْلٍ فِي الأَصَحِّ،

---

(وَلَوْ وَكَّلاَ رَجُلاً) ئەگەر ژنەکەو مێردەکە بە هەردووکیان پیاوێکیان کردە وەکیلی خۆیان، ئەوە (تَوَلَّى طَرَفًا) پیاوەکە تەنها یەك لای خولعەکە سەرپەرشتی دەکا: یان لای ژنەکە، یان لای پیاوەکە، واتە: لایەکەیتریش بە خۆی، یان وەکیلێکیتری لایەکە سەرپەرشتیی دەکا (وَقِيلَ الطَّرَفَيْنِ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: پیاوەکە سەرپەرشتی هەردوولایەکان دەکا.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی گوتەی خولع ﴾

(اَلْفُرْقَةُ بِلَفْظِ الْخُلْعِ) لێکجیابوونەوەی ژنومێرد بە ووشەیخولع (طَلاَقٌ) تەلاقدانەو ژمارەی تەلاقەکان کەم دەکاتەوە (وَفِي قَوْلٍ فَسْخٌ لاَ يَنْقُصُ عَددًا) لە فەرموودەیەکیتری ئیمامی (الشافعی)دا: لێکجیابوونەوەیان بە ووشەیخولع، هەڵوەشاندنەوەی مارەبڕینەکەیەو ژمارەی تەلاقەکان کەم ناکاتەوە، زۆر لە زانایانیش ئەم فەرموودە دووەمەیان هەڵبژاردوە. کەواتە: بەم فەرموودەیە: لە سێ جار زیاتریش دروستە خولع بکاو ژنەکەی لە خۆی مارە بکاتەوە.

بەلام لێکجیابوونەوەی بە ووشەیتەلاق هەر تەلاقدانەو ژمارەی تەلاقیش کەم دەکاتەوە، هەرچەند بە پارەش بێ، هەروەك لە زۆریەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(فَعَلَى الأَوَّلِ) جا لە سەر فەرموودەیەکەمیبەهێزتر (لَفْظُ الْفَسْخِ كِنَايَةٌ) ووشەی (فَسْخ) واتە: هەڵوشاندنەوە، وەك بڵێ: مارەبڕینەکەتم هەڵوەشاندەوە بە هەزار دینار. ژنەکەش قبوڵ بکا، ئەوە گوتەیەکی نائاشکرای خولعکردنەو پێوستە نیەتی خولعکردنی لەگەڵدا بێ.

بەلام (وَالْمُفَادَاةُ) ووشەیڕزگارکردن (كَخُلْعٍ فِي الأَصَحِّ) وەکو خولع ووشەیەکیناشکرایە لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَلَفْظُ الْخُلْعِ صَرِيحٌ) ووشەیخولعیش ووشەیەکی ئاشکرای تەلاقەو پێوستی بە نیەت نیە (وَفِيقَوْلٍ كِنَايَةٌ) لە فەرموودەیەکدا: خولعیش نائاشکرایە (فَعَلَى الأَوَّلِ) جا لە سەر فەرموودەی یەکەمی بەهێزتر: (لَوْ جَرَى بِغَيْرِ ذِكْرِ مَالٍ) ئەگەر مێردەکە ووشەیخولعی بە کار هێنا لە گەڵ ژنەکەیو باسی هیچ ماڵێکیشی نەکرد، وەك تەنها بڵێ: خولعم لەگەڵ تۆ کرد.—بەلام ئەو نیەتەشی هەبێ کە ژنەکە قبوڵ بکا—ئینجا ئەگەر ژنەکە گوتی: قبوڵم کرد. ئەو کاتە بە (بائن)ی تەلاقی دەکەوێو هەم (وَجَبَ مَهْرُ مِثْلٍ فِي الأَصَحِّ) لە بەرامبەر تەلاقکەوتنەکەش مارەیی هاوێنە لە سەر ژنەکە واجب دەبێ بۆ مێردەکەی، لە فەرموودەی ڕاستتردا، بەلام ئەگەر ژنەکە قبوڵ نەکا، ئەو کاتە تەلاقی ناکەوێ.

وَيَصِحُّ بِكِنَايَاتِ الطَّلَاقِ مَعَ النِّيَّةِ، وَبِالْعَجَمِيَّةِ، وَلَوْ قَالَ: بِعْتُكِ نَفْسَكِ بِكَذَا. فَقَالَتْ: اشْتَرَيْتُ. فَكِنَايَةُ خُلْعٍ، وَإِذَا بَدَأَ بِصِيغَةِ مُعَاوَضَةٍ: كَطَلَّقْتُكِ أَوْ خَالَعْتُكِ بِكَذَا -وَقُلْنَا: اَلْخُلْعُ طَلَاقٌ- فَهُوَ مُعَاوَضَةٌ فِيهَا شَوْبُ تَعْلِيقٍ وَلَهُ الرُّجُوعُ قَبْلَ قَبُولِهَا، وَيُشْتَرَطُ قَبُولُهَا بِلَفْظٍ غَيْرِ مُنْفَصِلٍ،

---

(وَيَصِحُّ بِكِنَايَاتِ الطَّلَاقِ مَعَ النِّيَّةِ) خولع بە ووشە نائاشكرايەكانی تەلاقیش دروست دەبێ ئەگەر نیەتی تەلاقی لەگەڵدا بێ: لە لایەن ژنەكەو مێردەكەوە، واتە: ئەگەر ژنەكە، یان مێردەكە لەگەڵ ووشە نائاشكرایەكەدا نیەتی تەلاقی نەبێ، خولعەكە دروست نابێ، هەروەك لە (مغنی)و (الشروانی)دا فەرموویانە.

(وَبِالْعَجَمِيَّةِ) هەروەها بە زمانەكانیتری جگە لە عەرەبیش خولع دروست دەبێ، كەوابو: (وَلَوْ قَالَ) ئەگەر مێردەكە بە ژنەكەی گوت: (بِعْتُكِ نَفْسَكِ بِكَذَا) خودی تۆم فرۆشتە تۆ بە ئەوەندە پارەیە. یان گوتی: تەلاقەكەتم فرۆشتە تۆ بە ئەوەندە پارەیە (فَقَالَتْ اشْتَرَيْتُ) ژنەكەش یەكسەر گوتی: لێتم كڕی بەو پارەیە. یان گوتی: قبوڵم كرد. ئەوە (فَكِنَايَةُ خُلْعٍ) ووشەی نائاشكرای خولعەو پێویستی بە نیەتی خولع هەیە، هەروەك لە (الشرواني)دا فەرموویەتی.

(وَإِذَا بَدَأَ بِصِيغَةِ مُعَاوَضَةٍ) هەر كاتێك لە سەرەتاوە مێردەكە ووشەیەكی وەرگرتنی شتێكی لە بەرامبەر شتێك بۆ خولعەكە بە كار هێنا (كَطَلَّقْتُكِ أَوْ خَالَعْتُكِ بِكَذَا) وەك بلێتە ژنەكەی: تەلاقم دای بە ئەوەندە پارەیە. یان خولعم لەگەڵت كرد بەو شتە. ژنەكەش قبوڵی كرد (وَقُلْنَا: اَلْخُلْعُ طَلَاقٌ) بە فەرمودەی بەهێزتریش بلێین: خولع تەلاقدانە (فَهُوَ مُعَاوَضَةٌ فِيهَا شَوْبُ تَعْلِيقٍ) ئەو مامڵەتە وەرگرتنیشتێكە لە بەرامبەر شتێكو هەڵواسینی تەلاقەكەشی تێكەڵ كراوە؟ چونكە تا ژنەكە قبوڵ نەكا تەلاقەكە ناكەوێ، كەوابو: (وَلَهُ الرُّجُوعُ قَبْلَ قَبُولِهَا) مێردەكەی بۆی دروستە پەشیمان ببێتەوە پێش ئەوەی ژنەكە قبوڵ بكا، واتە: هەر كاتێك ژنەكە قبوڵی كرد، ئەوە خولعەكە جێگیر دەبێو مافی پەشیمانیی نیە.

كەوابو: ئەگەر مێردەكە پێی گوت: ئەگەر ماوەی ساڵێك شیر بدەیتە كوڕەكەم تەلاقت كەوتبێ. ژنەكەش بە زویان گوتی: قبوڵم كرد. ئەوە دەسبەجێ تەلاقەكەی دەكەوێ، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی، كەواتە: شیردانەكەشی لە سەر واجب دەبێ.

(وَيُشْتَرَطُ قَبُولُهَا) بە مەرج داندراوە: ژنەكەش خولعەكە قبوڵ بكا (بِلَفْظٍ غَيْرِ مُنْفَصِلٍ) بە ووشەیەكی جیانەبووەوە لە گۆتەی مێردەكە، واتە: هیچ قسەیەكی زۆری بێگانەو هیچ بێدەنگبوونێكی درێژ نەكەوێتە نێوان گفتوگۆی مێردەكەو ژنەكە، وەك یەكسەر بە دوای تەواوبوونی گۆتەی مێردەكەدا بلێ: قبوڵم كرد. یان قبوڵی خولعەكەم كرد. بەڵام ئافرەتی لاڵ بە ئاماژەكردن خولعەكە قبوڵ دەكا.

فَلَوْ اخْتَلَفَ إِيجَابٌ وَقَبُولٌ: كَطَلَّقْتُك بِأَلْف فَقبلَتْ بِأَلْفَيْنِ وَعَكْسُهُ أَوْ طَلَّقْتُك ثَلاَثًا بِأَلْف فَقبلَتْ وَاحدَةً بِثُلُث أَلْف فَلَغْوٌ، وَلَوْ قَالَ طَلَّقْتُك ثَلاَثًا بِأَلْف فَقبلَتْ وَاحـدَةً بـأَلْف، فَالأَصَحُّ وُقُوعُ الثَّلاَث وَوُجُوبُ أَلْف، وَإِنْ بَدَأَ بصيغَة تَعْليقٍ: كَمَتَى أَوْ مَتَىمَا أَعْطَيْتنِي فَتَعْلِيقٌ فَلاَ رُجُوعَ لَهُ، وَلاَ يُشْتَرَطُ الْقَبُولُ لَفظًا وَلاَ الإِعْطَاءُ فِي الْمَجْلِسِ، وَإِنْ قَالَ: إِنْ أَوْ إِذَا أَعْطَيْتنِي. فَكَذَلكَ لَكِنْ يُشْتَرَطُ إعْطَاءٌ عَلَى الْفَوْرِ،

---

(فَلَوْ اخْتَلَفَ إِيجَابٌ وَقَبُولٌ) جا ئەگەر گوتەی مێردەکەو قبولکردنی ژنەکە لێك جیاواز بون: (كَطَلَّقْتُك بِأَلْفٍ) وەك بڵێ: تەڵاقم دای بە یەك هەزار دینار (فَقبلَتْ بِأَلْفَيْنِ) ژنەکەش بڵێ: قبوڵم کرد بە دوو هەزار دینار. هەم (وَعَكْسُهُ) وەك بە پێچەوانەی ئەو وێنەیە مێردەکە بڵێ: بە دوو هەزار. ژنەکەش بڵێ: بە یەك هەزار (أَوْ) یان بڵێ: (طَلَّقْتُك ثَلاَثًا بِأَلْفٍ) سێبەسێ تەڵاقم دای بە هەزار دینار (فَقبلَتْ وَاحدَةً بِثُلُثِ أَلْفٍ) ژنەکەش گوتی: یەك تەڵاقم قبوڵ کرد بە سێیەکی هەزارەکە (فَلَغْوٌ) ئەوە لە هەرسێك مەسەلەکەدا خولعەکە بەتاڵەو تەڵاقەکە ناکەوێو ماڵەکەش ناکەوێتە سەر ژنەکە.

بەڵام (وَلَوْ قَالَ) ئەگەر مێردەکە گوتی: (طَلَّقْتُك ثَلاَثًا بِأَلْفٍ) سێبەسێ تەڵاقم دای بە هەزار دینار (فَقبلَتْ وَاحدَةً بِأَلْفٍ) ژنەکەش گوتی: یەك تەڵاقم قبوڵ کرد بە هەزرا دینارەکە، ئەو کاتە (فَالأَصَحُّ وُقُوعُ الثَّلاَثِ وَوُجُوبُ أَلْفٍ) بە فەرموودەی ڕاستتر: سێ تەڵاقەکەی دەکەوێو ژنەکەش هەزارەکەی لە سەر واجب دەبێ بۆ مێردەکەی، چونکە جیاوازییان لە ئەندازەی ماڵەکەدا نیە.

(وَإِنْ بَدَأَ بِصِيغَةِ تَعْلِيقٍ) ئەگەر لە سەرەتاوە مێردەکە ووشەیەکی هەڵواسینی بۆ خولعەکە بە کار هێنا: (كَمَتَى أَوْ مَتَىمَا أَعْطَيْتِنِي) وەك بڵێتە ژنەکەی: هەر کاتێکیداهاتوو ئەو شتەم بدەیتێ تەڵاقت بکەوێ. ئەوە (فَتَعْلِيقٌ) هەڵواسینیتەڵاقە لە لایەن مێردەکەوە، کەوابو: (فَلاَ رُجُوعَ لَهُ) مێردەکە بۆی دروست نیە پەشیمان ببێتەوە، هەم (وَلاَ يُشْتَرَطُ الْقَبُولُ لَفْظًا) بە مەرج دانانرێ: ژنەکە بە زوبان قبوڵ بکاو هەم (وَلاَ الإِعْطَاءُ فِي الْمَجْلِسِ) مەرجیش نیە لە دانیشگەی خولعەکەدا شتەکە بداتە مێردەکەی، بەڵکو ئەگەر لە دوای لێکجیابوونەوەی دانیشگەکەو لە دوای ماوەیەکی زۆر درێژیش شتەکەی بداتێ تەڵاقەکە هەر دەکەوێ، واتە: بەڵام تا شتەکەی نەداتێ تەڵاقەکەی ناکەوێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَإِنْ قَالَ) ئەگەر مێردەکە بە ژنەکەی گوت (إِنْ) ئەگەر (أَوْ إِذَا) یان هەر کاتێ (أَعْطَيْتِنِي) ئەو شتەم بدەیتێ تەڵاقت کەوتبێ، ئەوەش (فَكَذَلِكَ) وەك ئەوەکەیتر بۆی دروست نیە پەشیمان ببێتەوە، هەم مەرج نیە: ژنەکە بە زوبان قبوڵ بکا (لَكِنْ يُشْتَرَطُ إِعْطَاءٌ عَلَى الْفَوْرِ) بەڵام

وَإنْ بَدَأَتْ بِطَلَبِ طَلاَقٍ فَأجَابَ فَمُعَاوَضَةٌ فِيهَا شَوْبُ جَعَالَةٍ فَلَهَاالرُّجُوعُ قَبْلَ جَوَابِــه، وَيُشْتَرَطُ فَوْرٌ لِجَوَابِهِ، وَلَوْ طَلَبَتْ ثَلاَثًا بِألْفٍ فَطَلَّقَ طَلْقَةً بِثُلُثِه فَوَاحِدَةً بِثُلُثِه، وَإذَا خَالَعَ أوْ طَلَّقَ بِعِوَضٍ فَلاَ رَجْعَةَ، فَإنْ شَرَطَهَا فَرَجْعِيٌّ وَلاَ مَالَ،

---

به مەرج دانـدراوه: یەكسـەر لـە دانیشـگەی خولعەكـەدا شـتەكە بداتـە مێردەكـەی بێ ئـەوەی گفتوگۆیەكی‌درێژی بیگانە، یـان بێ‌دەنگبوونێكی‌درێـژ بكەوێتـە نێـوان گوتـەی مێردەكـەو وێدانی شتەكە.

(وَإنْ بَدَأَتْ بِطَلَبِ طَلاَقٍ) ئەگەر لە سەرەتاوە ژنەكە داوای تەلاقی لە مێردەكەی كردو گوتی: بە ئەوەندە پارەیە تەلاقم بدە. یان گوتی: ئەگـەر تـەلاقم بـدەی ئـەو شـتەم لـە سـەر بـێ بتدەمێ (فَأجَابَ) مێردەكەش یەكسەر وەلامی داوەو گوتی: تـەلاقم دای. ئـەوە (فَمُعَاوَضَةٌ فِيهَا شَوْبُ جَعَالَةٍ) ئەو مامڵەتە وەرگرتنی شتێكە لـە بەرامبـەر شـتێكو (جعالـة)شـی تێكـەڵ كراوە، واتە: تەلاقەكەی دەكەوێ‌و واجبە: شتەكەش بداتە مێردەكـەی، هەرچـەند مێردەكـە لە تەلاقدانەكەدا ناوی شتەكەشی دووبـارە نەكردبێتـەوە، هـەروەك لـە (فصـل)یداهـاتوودا ڕوون كراوەتەوە.

كـەوابو: (فَلَهَـا الرُّجُـوعُ قَبْـلَ جَوَابِـه) ژنەكـە بـۆی دروسـتە پەشـیمان ببێتـەوە پـێش ئـەوەی مێردەكە لە وەلامی‌دا تەلاقی بدا، بەلام (وَيُشْتَرَطُ فَـوْرٌ لِجَوَابِـه) لێـرەدا بـە مـەرج دادەنـدرێ: مێردەكە یەكسەر لە دانیشگەی خولعەكەدا وەلامی ژنەكە بداتەوەو تەلاقی بدا، چـونكە ئەگـەر پاش ماوەیەك تەلاقی بدا، ئەو كاتە بە (رجعي) تـەلاقی دەكـەوێ‌و هـیچ شـتێكیش ناكەوێتـە سەر ژنەكە، مەگەر ژنەكە بڵێ: بە ئەوەندە پارەیە تـەلاقم بـدە هـەر چـەند دوای ماوەیـەكیش بێ. ئەو كاتە پەلەكردن واجب نیە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَلَوْ طَلَبَتْ ثَلاَثًا بِألْفٍ) ئەگەر ژنەكە داوای هەرسێك تەلاقی كردو گوتی: بـە هـەزار دینـار سێ‌بەسـێ تـەلاقم بـدە (فَطَلَّـقَ طَلْقَـةً بِثُلُثِـه) مێردەكـەش یـەك تـەلاقی‌دا بـە سـێیەكی هەزارەكە، ئەوە (فَوَاحِدَةً بِثُلُثِه) یەك تەلاقی دەكەوێ بە سێیەكی هەزارەكە.

(وَإذَا خَالَعَ أوْ طَلَّقَ بِعِوَضٍ) هـەر كاتێـك مێردەكـە خـولعی لەگـەڵ ژنەكـەی كـرد، یـان لـە بەرامبەر وەرگرتنی شتێك تەلاقی‌دا، ئەوە دەبێتە (بائن)، هـەر چـەند شـتەكەش دروسـت نەبوبێ بكرێـە پارە: وەك شەڕابو سەگ، كەوابو: (فَلاَ رَجْعَـةَ) مێردەكـە مـافی (رِجْعَـة)= گەڕاندنەوەی لە سەر ژنەكە نیە، بەڵكو مەرجە: ژنەكە ڕازی ببێ، ئینجا بـە مـارەبڕینێكی نوێ‌و بە مارەییەكی‌تر لە خۆی مارە بكاتەوە.

(فَإنْ شَرَطَهَا) جا ئەگەر مێردەكە (رِجْعَة)ی بە مەرج داناو گوتی: خولعم لەگەڵ كردی، یان بە هەزار دینار تەلاقم دای بەو مەرجەی مافی گەڕاندنەوەتم هەبێ. ئەوە (فَرَجْعِيٌّ وَلاَ مَالَ)

وَفِي قَوْلٍ بَائِنٌ بِمَهْرِ مِثْلٍ، وَلَوْ قَالَتْ: طَلِّقْنِي بِكَذَا. وَارْتَدَّتْ، فَأَجَابَ، إِنْ كَانَ قَبْلَ دُخُولٍ أَوْ بَعْدَهُ وَأَصَرَّتْ حَتَّى انْقَضَتْ الْعِدَّةُ بَانَتْ بِالرِّدَّةِ وَلاَ مَالَ، وَإِنْ أَسْلَمَتْ فِيهَا طُلِّقَتْ بِالْمَالِ، وَلاَ يَضُرُّ تَخَلُّلُ كَلاَمٍ يَسِيرٍ بَيْنَ إِيجَابٍ وَقَبُولٍ.
(فَصْلٌ) قَالَ: أَنْتِ طَالِقٌ وَعَلَيْكِ أَوْ وَلِي عَلَيْكِ كَذَا. وَلَمْ يَسْبِقْ طَلَبُهَا بِمَالٍ وَقَعَ رَجْعِيًّا قَبِلَتْ أَمْ لاَ وَلاَ مَالَ، فَإِنْ قَالَ: أَرَدْتُ مَا يُرَادُ بِطَلَّقْتُكِ بِكَذَا. وَصَدَّقَتْهُ

---

به (رجْعي) تەلاقی دەکەوێ‌و هیچ ماڵیش لە سەر ژنەکە واجب نابێ (وَفِي قَوْلٍ بَائِنٌ بِمَهْرِ مِثْلٍ) لە فەرموودەیەکدا: بە (بائن)ی تەلاقی دەکەوێ‌و مارەیی هاوێنەش دەکەوێتە سەر ژنەکە بۆ مێردەکەی.

(وَلَوْ قَالَتْ طَلِّقْنِي بِكَذَا) ئەگەر ژنەکە گوتی: تەلاقم بدە بەو شتە. ئینجا(وَارْتَدَّتْ) ژنەکەش کافر بوو (فَأَجَابَ) ئینجا مێردەکەش یەکسەر وەڵامی داوەو تەلاقی‌دا، ئەوە تەماشا دەکەین: (إِنْ كَانَ قَبْلَ دُخُولٍ) ئەگەر کافربوونەکەی پێش جیماعکردن بێ (أَوْ بَعْدَهُ وَأَصَرَّتْ حَتَّى انْقَضَتِ الْعِدَّةُ) یان لە دوای جیماعکردن بوو، بەڵام ژنەکە سوور بوو لە سەر کافربوونەکەی تا (عِدَّة)ی تەواو بوو، ئەوە (بَانَتْ بِالرِّدَّةِ وَلاَ مَالَ) لە هەر دوو حاڵەتدا بە کافربوونەکە مارەبڕینەکەی هەڵدەوەشێتەوەو تەلاقی ناکەوێ‌و ماڵیش لە سەر ژنەکە واجب نابێ، بەڵام (وَإِنْ أَسْلَمَتْ فِيهَا) ئەگەر ژنەکە لە (عِدَّة)دا بۆوە موسوڵمان، ئەو کاتە (طُلِّقَتْ بِالْمَالِ) بە ماڵە ناوبراوەکە تەلاقی دەکەوێ.

(وَلاَ يَضُرُّ) زیان لە دروستبوونی خولع نادا: (تَخَلُّلُ كَلاَمٍ يَسِيرٍ بَيْنَ إِيجَابٍ وَقَبُولٍ) قسەکردنێکی‌کەم بکەوێتە نێوان گفتوگۆی مێردەکەو ژنەکە، بەڵام ئەگەر قسەکردنەکە زۆر بێ زیانی‌هەیە، هەروەك ڕابرا.

**﴿ فَصْلٌ: لە باسی ئەو ووشانەی پارە لە سەر ژنەکە واجب دەکەن ﴾**

(قَالَ) هەرکاتێك مێردەکە بە ژنەکەی گوت: (أَنْتِ طَالِقٌ وَعَلَيْكِ أَوْ وَلِي عَلَيْكِ كَذَا) تەلاقت کەوتبێ‌و ئەوەندە پارەیەشت لە سەر بێ. یان تەلاقت کەوتبێ‌و ئەوەندە پارەیە بۆ من لە سەر تۆ بێ. یان ئەوەندە پارەیەت لە سەر بێ‌و تەلاقت کەوتبێ (وَلَمْ يَسْبِقْ طَلَبُهَا بِمَالٍ) پێشداش ژنەکە داوای تەلاقدانی بە ماڵی نەکردبو، ئەوە (وَقَعَ رَجْعِيًّا)– ئەگەر نیەتی سێ تەلاقی نەبوبێ– بە (رجعي) تەلاقی دەکەوێ، جیاوازی نیە (قَبِلَتْ أَمْ لاَ) ژنەکە قبوڵ بکا، یان نا (وَلاَ مَالَ) هیچ ماڵێکیش ناکەوێتە سەر ژنەکە، چونکە بە خۆڕایی تەلاقی داوە، ئینجا لەخۆیەوە باسی هەندێك ماڵیشی کردوەو تەلاقەکەشی بەو ماڵە نەبەستوە.

بەڵام (فَإِنْ قَالَ أَرَدْتُ مَا يُرَادُ بِطَلَّقْتُكِ بِكَذَا) ئەگەر مێردەکە گوتی: مەبەستم بە ووشەی ڕابردوو ئەوە بوو: بە ئەوەندە پارەیە تەلاقم دای (وَصَدَّقَتْهُ) ژنەکەش باوەڕی کردو گوتی:

فَكَهُوَ فى الأَصَحِّ، وَإِنْ سَبَقَ بَانَتْ بِالْمَذْكُورِ، وَإِنْ قَالَ: أَنْتِ طَالِقٌ عَلَى أَنَّ لِى عَلَيْكِ كَذَا. فَالْمَذْهَبُ أَنَّهُ كَطَلَّقْتُكِ بِكَذَا، فَإِذَا قَبِلَتْ بَانَتْ وَوَجَبَ الْمَالُ، وَإِنْ قَالَ: إِنْ ضَمِنْتِ لِى أَلْفًا فَأَنْتِ طَالِقٌ. فَضَمِنَتْ فِى الْفَوْرِ

---

ڕاست دەکاو قبوڵیشی کرد، ئەوە (فَكَهُوَ) وەك گوتبیتی: بە ئەوەندە پارەیە تەڵاقم دای، ئەوها بڕیاری بۆ دەدرێ، واتە: ئەگەر ژنەکە یەکسەر گوتی قبوڵم کرد، ئەوە بە (بائن)ی تەڵاقی دەکەوێو پارە ناوبراوەکەش لە سەر ژنەکە واجب دەبێ بۆ مێردەکە (فِى الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستردا، بەڵام ئەگەر ژنەکە قبوڵ نەکا تەڵاقەکەی ناکەوێ، جیاوازی نیە: ژنەکە باوەڕ بکا کە ئەو مەبەستەی هەبوە، یان باوەڕ نەکا، بەڵام لەو حاڵەتەی ژنەکە باوەڕ ناکاو سوێندیش ناخوا پێویستە مێردەکە سوێندی گەڕاندرایەوە بخوا: کە ئەو مەبەستەی هەبوە. چونکە ئەگەر لەو حاڵەتەدا سوێندەکە نەخوا تەڵاقەکەی بە (رجعي) دەکەوێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا روون کراوەتەوە.

جا بزانە: ئەوەیڕابردوو لە حاڵەتێکدا بوو: کە ژنەکە داوای تەڵاقی نەکردبێ، بەڵام (وَإِنْ سَبَقَ) ئەگەر پێشدا ژنەکە داوای کرد بە ماڵێکی دیارکراو تەڵاقی بدا، مێردەکەش لە وەڵامیدا گوتی: تەڵاقت کەوتبێ. یان تەڵاقم دای. ئەوە (بَانَتْ بِالْمَذْكُورِ) بە (بائن)ی تەڵاقی دەکەوێ بەو ماڵە ناوبراوە، هەر چەند مێردەکەش لە تەڵاقدانەکەدا ناوی ماڵەکە دووبارە نەڵێتەوە، جا ئەگەر ژنەکە گوتی: بە ماڵێ، یان بە پارە تەڵاقم بدە. هیچ ماڵێکیشی دیاری نەکرد، بەڵام مێردەکە گوتی: بە هەزار دینار تەڵاقم دای، ئەو کاتە ئەگەر ژنەکە یەکسەر قبوڵ بکا تەڵاقی بەو هەزار دینارە دەکەوێ، ئەگەر قبوڵیش نەکا ناکەوێ.

بەڵام ئەگەر هیچێکیشان ماڵەکە دیاری نەکا: وەك تەنها بڵێ: بە پارە تەڵاقم بدە. مێردەکەش تەنها بڵێ: تەڵاقم دای. ئەو کاتە بە مارەیی‌هاووێنە بە (بائن)ی تەڵاقی دەکەوێو واجبە: بیداتە مێردەکەی، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا روون کراوەتەوە.

(وَإِنْ قَالَ) ئەگەر مێردەکەی گوتی: (أَنْتِ طَالِقٌ عَلَى أَنَّ لِى عَلَيْكِ كَذَا) تەڵاقت کەوتبێ، یان تەڵاقم دای لە سەر ئەو مەرجەی ئەوەندە پارەیە بۆ من لە سەر تۆ بێ. ئەوە (فَالْمَذْهَبُ أَنَّهُ كَطَلَّقْتُكِ بِكَذَا) بە فەرموودەی ڕاستی مەزهەب: وەك ئەوەیە بڵێ: بە ئەوەندە پارەیە تەڵاقم دای. کەوابو: (فَإِذَا قَبِلَتْ) هەر کاتێك یەکسەر لە دانیشگەکەدا گوتی: قبوڵم کرد. ئەوە (بَانَتْ وَوَجَبَ الْمَالُ) بە (بائن)ی تەڵاقی دەکەوێو واجبە: ماڵە ناوبراوەکە بداتە مێردەکەی.

(وَإِنْ قَالَ) ئەگەر مێردەکە گوتی (إِنْ ضَمِنْتِ لِى أَلْفًا فَأَنْتِ طَالِقٌ) ئەگەر تۆ بۆ من ببیە زامینی هەزار دینار تەڵاقت کەوتبێ (فَضَمِنَتْ فِى الْفَوْرِ) ژنەکەش یەکسەر لە دانیشگەکەدا

بَانَتْ وَلَزِمَهَا الأَلْفُ، وَإِنْ قَالَ: مَتَى ضَمِنْت. فَمَتَى ضَمِنَتْ طَلَقَتْ، وَإِنْ ضَمِنَتْ دُونَ الأَلْفِ لَمْ تَطْلُقْ، وَلَوْ ضَمِنَتْ أَلْفَيْنِ طَلَقَتْ، وَلَوْ قَالَ: طَلِّقِي نَفْسَكِ إِنْ ضَمِنْتِ لِي أَلْفًا. فَقَالَتْ: طَلَّقْتُ وَضَمِنْتُ. أَوْ عَكْسَهُ بَانَتْ بِأَلْفٍ، فَإِنْ اقْتَصَرَتْ عَلَى أَحَدِهِمَا فَلاَ، وَإِذَا عَلَّقَ بِإِعْطَاءِ مَالٍ فَوَضَعَتْهُ بَيْنَ يَدَيْهِ طَلَقَتْ، وَالأَصَحُّ دُخُولُهُ فِي مِلْكِهِ،

---

گوتی: بومە زامینی هەزارەکە. ئەوە (بَانَتْ وَلَزِمَهَا الأَلْفُ) بە (بائن)ی تەلاقی دەکەوێو هەزارەکەشی لە سەر واجب دەبێ بیداتە مێردەکەی، بەلام (وَإِنْ قَالَ) ئەگەر مێردەکە گوتی (مَتَى ضَمِنْت) لە هەر کاتێکیداهاتوودا تۆ بۆ من ببیە زامینی هەزار دینار تەلاقت کەوتبێ. ئەو کاتە پەلەکردنی ناوێ، بەڵکو (فَمَتَى ضَمِنَتْ طَلَقَتْ) هەر کاتێك ژنەکە گوتی: بومە زامین. تەلاقی دەکەوێ.

(وَإِنْ ضَمِنَتْ دُونَ الأَلْفِ) ئەگەر–لە هەردوو مەسەلەکەدا– ژنەکە بووە زامینی کەمتر لە هەزار دینارەکە، ئەوە (لَمْ تَطْلُقْ) تەلاقی ناکەوێ، چونکە پێهەڵواسراوەکە نەهاتۆتە جێ، بەلام (وَلَوْ ضَمِنَتْ أَلْفَيْنِ) ئەگەر بووە زامینی دوو هەزار، ئەو کاتە (طَلَقَتْ) تەلاقەکەی دەکەوێ، بەلام هەزارە زیادەکە لە مێردەکە حەڵاڵ نابێو ئەگەر وەریشی بگرێ واجبە بیداتەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە .

(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر مێردەکە گوتی: (طَلِّقِي نَفْسَكِ إِنْ ضَمِنْتِ لِي أَلْفًا) خۆت تەلاق بدە ئەگەر بۆ من ببیە زامینی هەزار دینار (فَقَالَتْ) ژنەکەش یەکسەر لە دانیشگەکەدا گوتی (طَلَّقْتُ وَضَمِنْتُ) خۆمم تەلاق داو بومە زامینی هەزارەکە (أَوْ عَكْسَهُ) یان بە پێچەوانەکەی گوتی: بومە زامینی هەزارەکەو خۆمم تەلاق دا. ئەوە (بَانَتْ بِأَلْفٍ) بە (بائن)ی تەلاقی دەکەوێو واجبە هەزار دینارەکەش بداتە مێردەکە، بەلام (فَإِنْ اقْتَصَرَتْ عَلَى أَحَدِهِمَا) ئەگەر لە زامینیو لە تەلاقدانەکە ژنەکە تەنها یەکێکیانی گوت (فَلاَ) تەلاقی ناکەوێ؟ چونکە تەلاقدانو مەرجەکە پێکەوە بەستراون.

(وَإِذَا عَلَّقَ بِإِعْطَاءِ مَالٍ) هەر کاتێك مێردەکە تەلاقەکەی هەڵواسی بە پێدانی ماڵێکی زانراو: وەك ئەگەر ئەوەندە ماڵەم بدەیتێ، یان ئەگەر ئەوەندە ماڵەم بۆ بێنی تەلاقت بکەوێ (فَوَضَعَتْهُ بَيْنَ يَدَيْهِ) ژنەکەش یەکسەر ماڵەکەی لەبەردەست مێردەکەی دانا، ئەوە (طَلَقَتْ) تەلاقی دەکەوێ، هەرچەند مێردەکەش وەرینەگرێ، چونکە (وَالأَصَحُّ دُخُولُهُ فِي مِلْكِهِ) بە فەرموودەی ڕاستتر: بە تەنها دانانەکە ماڵەکە دەبێتە ملکی مێردەکە.

بەلام ئەگەر هەڵواسینەکە بۆ کاتێکیداهاتوو بێ: وەك هەر کاتێك لە مەودوا، یان لە هەر کاتێکی داهاتوودا ئەو شتەم بدەیتێ، یان بۆم بێنی تەلاقت بکەوێ. ئەو کاتە پەلەکردنی ناوێو مێردەکەش بۆی دروست نیە پەشیمان ببێتەوە، کەواتە: هەر کاتێکیداهاتوو–تا مردن– ئەگەر شتەکەی بداتێ تەلاقی دەکەوێ، هەروەك لە باسەکەیڕابردوودا ڕوونمان کردەوە.

وَإِنْ قَالَ إِنْ أَقْبَضْتِنِي. فَقِيلَ كَالإِعْطَاءِ، وَالأَصَحُّ كَسَائِرِ التَّعْلِيقِ فَلاَ يَمْلِكُهُ، وَلاَ يُشْتَرَطُ لِلإِقْبَاضِ مَجْلِسٌ، قُلْتُ: وَيَقَعُ رَجْعِيًا، وَيُشْتَرَطُ لِتَحَقُّقِ الصِّفَةِ أَخْذُهُ بِيَدِهِ مِنْهَا وَلَوْ مُكْرَهَةً وَاللهُ أَعْلَمُ. وَلَوْ عَلَّقَ بِإِعْطَاءِ عَبْدٍ وَوَصَفَهُ بِصِفَةِ سَلَمٍ فَأَعْطَتْهُ لاَ بِالصِّفَةِ لَمْ تَطْلُقْ أَوْ بِهَا مَعِيبًا فَلَهُ رَدُّهُ وَمَهْرُ مِثْلٍ، وَفِي قَوْلٍ قِيمَتُهُ سَلِيمًا،

---

(وَإِنْ قَالَ) ئەگەر مێردەكە گوتی (إِنْ أَقْبَضْتِنِي) ئەگەر ئەوشتەت دەقەبەڵی من كرد، یان وێتدام، یان تەسلیمت كردم تەڵاقت كەوتبێ، ئەوە (فَقِيلَ كَالإِعْطَاءِ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: وەك پێدانە، بەڵام (وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر: ئەوەش (كَسَائِرِ التَّعْلِيقِ) وەك وێنەكانی هەڵواسینیترە، كەوابو: (فَلاَ يَمْلِكُهُ) مێردەكە نابێتە خاوەنی شتە وەرگیراوەكە، هەم (وَلاَ يُشْتَرَطُ لِلإِقْبَاضِ مَجْلِسٌ) بۆ وێدانو تەسلیمكردنی شتەكە دانیشگەی مامڵەتەكە بە مەرج داناندرێ.

بەڵام ئەگەر نیشانەیەك هەبێ: كە ژنەكەو مێردەكە بە ووشەی دەقەبەڵكردن مەبەستیان كردنە ملك بێ، ئەو كاتە وەكو ووشەی پێدانیڕابردوو بڕیای بوونە ملكو وێدانی بە پەلەی بۆ دەدرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

جا لەوحاڵەتەی مەبەستیان كردنە ملك نەبێ، ئەوە (قُلْتُ) ئیمامی (النواوي) دەفەرموێ (وَيَقَعُ رَجْعِيًا) هەر كاتێك شتەكەی وەرگرت تەڵاقەكەش بە (رجعي) دەكەوێ، چونكە پێهەڵواسراوەكە هاتۆتە جێ، بەڵام شتەكە نابێتە ملكی مێردەكە، هەروەها هەر كاتێك مێردەكە گوتی: ئەگەر ئەو شتەم لێوەرگرتی تەڵاقت بكەوێ. ئەوە (وَيُشْتَرَطُ لِتَحَقُّقِ الصِّفَةِ) بە مەرج دادەندرێ بۆ هاتنە جێی ئەو پێهەڵواسراوە: (أَخْذُهُ بِيَدِهِ مِنْهَا) مێردەكە بە دەستی خۆی شتەكە لە ژنەكە وەربگرێ (وَلَوْ مُكْرَهَةً) هەر چەند ژنەكەش زۆرلێكراو بێ (وَاللهُ أَعْلَمُ) كەوابو: لەم مەسەلەیەشدا تەڵاقەكە بە (رجعي) دەكەوێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە، واتە: چونكە شتەكە نابێتە ملكی مێردەكە.

(وَلَوْ عَلَّقَ بِإِعْطَاءِ عَبْدٍ) ئەگەر مێردەكە تەڵاقەكەی هەڵواسی بە پێدانی كۆیلەیەك، یان جلێك، یان ئاژەڵێك، یان هەر شتێكیتر (وَوَصَفَهُ بِصِفَةِ سَلَمٍ) مەرجەكانی شتەكەشی ڕوون كردەوە بە ڕوونكردنەوەی سەلەم، وەك بڵێ: شتەكە ئەوها بێو ئەوها بێ (فَأَعْطَتْهُ لاَ بِالصِّفَةِ) ژنەكەش شتەكەی دایێ بەڵام مەرجە باسكراوەكانی لێنەهاتنەجێ، ئەوە (لَمْ تَطْلُقْ) تەڵاقی ناكەوێ، چونكە پێهەڵواسراوەكە نەهاتۆتە جێ (أَوْ بِهَا) یان یەكسەر شتەكەی دایێو مەرجە باسكراوەكانیشی لێهاتنەجێ، بەڵام (مَعِيبًا) عەیبێكیكۆنی هەبو، ئەو كاتە تەڵاقی دەكەوێ، جا بە هۆی عەیبەكە (فَلَهُ رَدُّهُ وَمَهْرُ مِثْلٍ) مێردەكە بۆی دروستە شتە عەیبدارەكە بۆ ژنەكە بگەڕێنێتەوەو مارەیی هاوێنەی لە جیاتی لێوەربگرێ (وَفِي قَوْلٍ قِيمَتُهُ سَلِيمًا) لە فەرموودەیەكدا: نرخی شتەكەی لە حاڵەتی بێعەیبیدا لێوەردەگرێ.

وَلَوْ قَالَ: عَبْدًا. طَلَقَتْ بِعَبْدٍ إِلاَّ مَغْصُوبًا فِي الأَصَحِّ وَلَهُ مَهْرُ مِثْلٍ، وَلَوْ مَلَكَ طَلْقَةً فَقَطْ فَقَالَتْ: طَلِّقْنِي ثَلاَثًا بِأَلْفٍ. فَطَلَّقَ الطَّلْقَةَ فَلَهُ أَلْفٌ، وَقِيلَ ثُلُثُهُ، وَقِيلَ إِنْ عَلِمَتِ الْحَالَ فَأَلْفٌ وَإِلاَّ فَثُلُثُهُ، وَلَوْ طَلَبَتْ طَلْقَةً بِأَلْفٍ فَطَلَّقَ بِمِأَةٍ وَقَعَ بِمِأَةٍ، وَقِيلَ بِأَلْفٍ، وَقِيلَ لاَ تَقَعُ، وَلَوْ قَالَتْ: طَلِّقْنِي غَدًا بِأَلْفٍ. فَطَلَّقَ غَدًا أَوْ قَبْلَهُ بَانَتْ بِمَهْرِ مِثْلٍ، وَقِيلَ فِي قَوْلٍ بِالْمُسَمَّى،

---

(وَلَوْ قَالَ عَبْدًا) ئەگەر مێردەکە گوتی: ئەگەر کۆیلەیەك، یان جلێك، یان مەڕێکم بدەیتێ تەلاقت کەوتبێ، واتە: باسی مەرجەکانی شتەکەشی نەکرد، ئەوە (طَلَقَتْ بِعَبْدٍ) هەر جۆرە کۆیلەیەکی بداتێ، یان هەر جۆرە جلێك‌و هەر جۆرە مەڕێکی بداتێ، تەلاقی دەکەوێ (إِلاَّ مَغْصُوبًا فِي الأَصَحِّ) تەنها زەوتکراو نەبێ، لە فەرموودەی ڕاستتردا، جا هەرچەند تەلاقەکەش دەکەوێ، بەلام نە کۆیلەکەو نە جلەکەو نە مەڕەکە نابنە ملکی مێردەکە؟ چونکە نەزاندراون، کەوابو: (وَلَهُ مَهْرُ مِثْلٍ) مێردەکە مارەیی هاوێنەی بۆ واجب دەبێ لە سەر ژنەکە.

(وَلَوْ مَلَكَ طَلْقَةً فَقَطْ) ئەگەر مێردەکە تەنها تەلاقێك، یان دوو تەلاقی لە ژنەکەی مابو (فَقَالَتْ طَلِّقْنِي ثَلاَثًا بِأَلْفٍ) ژنەکەش گوتی: سێ‌بەسێ تەلاقم بدە بە هەزار دینار (فَطَلَّقَ الطَّلْقَةَ) مێردەکەش یەکسەر بەو تەلاقەی مابوی، یان بەو دوو تەلاقەی مابوی ژنەکەی تەلاق دا، ئەوە (فَلَهُ أَلْفٌ) مێردەکە بە تەواوی هەزارەکەی بۆ واجب دەبێ لە سەر ژنەکە، هەر چەند ژنەکەش نەیزانیبێ تەنها تەلاقێك، یان دوو تەلاقی ماوە؟ چونکە مەبەستی ژنەکە: کە (اَلْبَيْنُونَةَ الْكُبْرَى)-جیابوونەوەی گەورە بوو، هاتۆتە جێ (وَقِيلَ ثُلُثُهُ) لە فەرموودەیەکی بێ‌هێزدا: سێیەکی هەزارەکەی بۆ هەیە (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی‌تری بێ‌هێزدا (إِنْ عَلِمَتِ الْحَالَ فَأَلْفٌ وَإِلاَّ فَثُلُثُهُ) ئەگەر ژنەکە زانیبێتی تەنها تەلاقێك، یان دوو تەلاقی ماوە ئەوە هەزارەکەی لە سەر واجب دەبێ، ئەگەر نا: سێیەکی هەزارەکەی لە سەر واجب دەبێ.

(وَلَوْ طَلَبَتْ طَلْقَةً بِأَلْفٍ) ئەگەر ژنەکە یەك تەلاقی داوا کرد بە هەزار دینار (فَطَلَّقَ بِمِأَةٍ) مێردەکەش یەکسەر یەك تەلاقی‌دا بە سەد دینار، ئەوە (وَقَعَ بِمِأَةٍ) بە سەد دینار تەلاقەکەی دەکەوێ، چونکە دەتوانێ بە خۆڕاییش تەلاقی بدا (وَقِيلَ بِأَلْفٍ) لە فەرموودەیەکی بێ‌هێزدا: بە هەزارەکە تەلاقی دەکەوێ (وَقِيلَ لاَ تَقَعُ) لە بێ‌هێزێکی‌تردا تەلاقەکە ناکەوێ.

(وَلَوْ قَالَتْ) ئەگەر ژنەکە گوتی (طَلِّقْنِي غَدًا بِأَلْفٍ) سبەینێ تەلاقم بدە بە هەزار دینار (فَطَلَّقَ غَدًا أَوْ قَبْلَهُ) مێردەکەش سبەینێ، یان پێش سبەینێ تەلاقی‌دا، ئەوە (بَانَتْ بِمَهْرِ مِثْلٍ) بە (بائن)ی تەلاقی دەکەوێ بە مارەیی هاوێنە-نەك بە هەزارەکە- چونکە ژنەکە پارەکەی کردۆتە سەلەم لە تەلاقدا، تەلاقیش نابێتە قەرز (وَقِيلَ فِي قَوْلٍ بِالْمُسَمَّى) لە فەرموودەیەکی بێ‌هێزدا: بە ناوبراوەکە تەلاقی دەکەوێ.

وَإِنْ قَالَ: إِذَا دَخَلت الدَّارَ فَأَنْت طَالِقٌ بِأَلْف. فَقبلَتْ وَدَخَلَتْ طَلقَتْ عَلَى الصَّحِيحِ بِالْمُسَمَّى، وَفِي وَجْه أَوْ قَوْل بِمَهْرِالْمِثْلِ، وَيَصحُّ اخْتِلاَعُ أَجْنَبِيٍّ وَإِنْ كَرِهَت الزَّوْجَةُ، وَهُوَ كَاخْتِلاَعِهَا لَفظًا وَحُكْمًا، وَلِوَكِيلِهَا أَنْ يَخْتَلِعَ لَهُ، وَلِلأَجْنَبِيِّ تَوْكِيلُهَا فَتَتَخَيَّرُ هِيَ، وَلَوْ اخْتَلَعَ رَجُلٌ وَصَرَّحَ بِوَكَالَتِهَا كَاذِبًا لَمْ تَطْلُقْ، وَأَبُوهَا كَأَجْنَبِيٍّ فَيَخْتَلِعُ بِمَالِهِ،

---

(وَإِنْ قَالَ) ئەگەر مێردەكە گوتی (إِذَا دَخَلتِ الدَّارَ فَأَنْت طَالِقٌ بِأَلْفٍ) هەر كاتێك، یان ئەگەر بچێتە ناو خانووەكە تەڵاقت بكەوێ بە هەزار دینار (فَقَبِلَتْ) ژنەكەش یەكسەر گوتی قبوڵم كرد، ئینجا (وَدَخَلَتْ) لە دوای ماوەیەك چووە ناو خانووەكە، ئەوە (طَلقَتْ عَلَى الصَّحِيحِ بِالْمُسَمَّى) لە سەر فەرموودەی ڕاست: بە(بائن)ی بە پارە ناوبراوەكە تەڵاقی دەكەوێ (وَفِي وَجْهٍ أَوْ قَوْلٍ بِمَهْرِ الْمِثْلِ) لە فەرموودەیەكدا: بە مارەیی هاوێنە تەڵاقەكەی دەكەوێ.

## ﴿ خولعی بێگانە ﴾

(وَيَصِحُّ اخْتِلاَعُ أَجْنَبِيٍّ) دروستە بێگانەیەك بە ماڵی خۆی خولع لە مێردەكە قبوڵ بكا (وَإِنْ كَرِهَتِ الزَّوْجَةُ) هەر چەند ژنەكەش پێی ناخۆش بێ؟ چونكە تەڵاق لە دەست مێردەكەدایە، جا ئەگەر بەو مەبەستە خولعەكە قبوڵ بكا: تاكو ژنەكەی لەخۆی مارە بكا، ئەوە خولعەكە دروست دەبێ بەڵام گوناهباریش دەبێ، بەڵكو ئەگەر ژنەكەش لەو مەبەستە ئاگادار بكا، ئەو كاتە (فاسق)ش دەبێ، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی، چونكە پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێ: ﴿لَيْسَ مِنَّا مَنْ خَبَّبَ إِمْرَأَةً عَلَى زَوْجِهَا﴾ رواه أبوداود بسند صالح، ئەوكەسە لە ئوممەتی ئێمە نیە كە دڵی ژنێك تێك بدا لە سەر مێردەكەی.

(وَهُوَ كَاخْتِلاَعِهَا) قبوڵكردنی خولعی بێگانەش وەك قبوڵكردنی خولعی ژنەكەیە (لَفظًا وَحُكْمًا) لە ڕووی ووشەو بڕیاریبڕابردوو، كەواتە: واجبە بێگانەكە لە ماڵیخۆی پارەی خولعەكە بداتە مێردەكەو مافی نیە هیچ لە ژنەكە وەربگرێتەوە.

هەروەها (وَلِوَكِيلِهَا أَنْ يَخْتَلِعَ لَهُ) بۆ وەكیلی ژنەكەش دروستە: خولعەكە بۆ خۆی قبوڵ بكا، جا لەو حاڵەتەشدا دەبێتەخولعیبێگانەو ماڵەكە لە سەر خۆی واجب دەبێ بۆ مێردەكە (وَلِلأَجْنَبِيِّ تَوْكِيلُهَا) بۆ مرۆڤێكی بێگانە دروستە: ژنەكە بكاتە وەكیلی خۆی بۆ قبوڵكردنی خولع، جا لەو حاڵەتەدا (فَتَتَخَيَّرُ هِيَ) ژنەكە سەرپشكە: ئەگەر حەز دەكا: خولعەكە بە پارەی خۆی بۆ خۆی قبوڵ بكا، یان بە پارەی بێگانەكە لەجیاتی بێگانەكە قبوڵی دەكا (وَلَوْ اخْتَلَعَ رَجُلٌ) ئەگەر پیاوێكی بێگانە خولعەكەی قبوڵ كردو (وَصَرَّحَ بِوَكَالَتِهَا كَاذِبًا) بە درۆ گوتی: من وەكیلی ژنەكەم. ئەوە (لَمْ تَطْلُقْ) تەڵاقی ناكەوێ، چونكە ژنەكە پارەكەی نەخۆستۆتە ئەستۆی خۆی.

(وَأَبُوهَا كَأَجْنَبِيٍّ) باوكی ژنەكەش وەك بێگانەیە، كەوابو (فَيَخْتَلِعُ بِمَالِهِ) بە ماڵی خۆی خولعەكە قبوڵ دەكا -نەك بە ماڵی كیژەكەی- هەرچەند كیژەكەشی نەبالغ بێ، كەوابو:

فَإِنْ اخْتَلَعَ بِمَالِهَا وَصَرَّحَ بِوَكَالَةٍ أَوْ وِلاَيَةٍ لَمْ تَطْلُقْ، أَوْ بِاسْتِقْلاَلٍ فَخُلْعٌ بِمَغْصُوبٍ. (فَصْلٌ) ادَّعَتْ خُلْعًا فَأَنْكَرَهُ صُدِّقَ بِيَمِينِهِ، وَإِنْ قَالَ: طَلَّقْتُكِ بِكَذَا. فَقَالَتْ: مَجَّانًا. بَانَتْ وَلاَ عِوَضَ، وَإِنِ اخْتَلَفَا فِي جِنْسِ عِوَضِهِ أَوْ قَدْرِهِ وَلاَ بَيِّنَةَ تَحَالَفَا وَوَجَبَ مَهْرُمِثْلٍ،

---

(فَإِنِ اخْتَلَعَ بِمَالِهَا) ئەگەر باوکەکە بە ماڵی کیژەکەی خولعەکەی قبوڵ کردو (وَصَرَّحَ بِوَكَالَةٍ أَوْ وِلاَيَةٍ) بە دڕۆ گوتی: من وەکیلی کیژەکەم. یان گوتی سەرپەرشتکاری کیژەکەمم. ئەوە (لَمْ تَطْلُقْ) تەڵاقی ناکەوێ؟ چونکە وەکیل نیەو لە خولعیشدا سەرپەرشکاری نیە (أَوْ بِاسْتِقْلاَلٍ) یان باوکەکە گوتی: سەربەخۆم خولعەکەم بە ماڵی کیژەکەم قبوڵ کرد، ئەو کاتە (فَخُلْعٌ بِمَغْصُوبٍ) دەبێتە خولع بە زەوتکراو، واتە: ماڵەکە نابێتە ملکی مێردەکە، کەوابو: بە (بائن)ی تەڵاقی دەکەوێو مارەیی هاووێنەش لە سەر باوکەکە بۆ مێردەکە واجب دەبێ، چونکە باوك بۆی دروست نیە ماڵی کیژەکەی لە خولع سەرف بکا، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

**﴿ فَصْلٌ: لە باسی کێشەی ژن و مێرد لە خولعەکەدا ﴾**

(ادَّعَتْ خُلْعًا) هەر کاتێك ژنەکە گوتی: مێردەکەم خولعی لەگەڵ کردوم (فَأَنْكَرَهُ) مێردەکەش گوتی: خولعم لەگەڵ نەکردوە. هیچ شاهیدیش نەبو، ئەوە (صُدِّقَ بِيَمِينِهِ) باوەڕ بە مێردەکە دەکرێ ئەگەر سوێند بخوا، بەلاَم ئەگەر دوو پیاو شاهیدی بدەن: کە خولعی لەگەڵ کردوە. ئەو کاتە تەڵاقی ژنەکە بە (بائن)ی ئاشکرا دەبێو مێردەکەش مافی نیە داوای هیچ ماڵێك لە ژنەکە بکا، چونکە ئەو دەڵێ: وا نیە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَإِنْ قَالَ) ئەگەر مێردەکە گوتی (طَلَّقْتُكِ بِكَذَا) بەوەندە پارەیە تۆم تەڵاق داوە (فَقَالَتْ مَجَّانًا) ژنەکەش گوتی: بە خۆڕایی تەڵاقت داوم. ئەوە (بَانَتْ) ژنەکە بە (بائن)ی تەڵاقی دەکەوێ بە هۆی دانپێداهێنانی مێردەکە (وَلاَ عِوَضَ) هیچ ماڵیکیش ناکەوێتە سەر ژنەکە بەو مەرجەی سوێند بخوا، بەلاَم ئەگەر مێردەکە شاهیدی هەبێ، ئەو کاتە ماڵەکە دەکەوێتە سەر ژنەکە.

(وَإِنِ اخْتَلَفَا فِي جِنْسِ عِوَضِهِ) ئەگەر ژنەکەو مێردەکە لە ڕەگەزی پارەی خولعەکەدا بووە کێشەیان (أَوْ قَدْرِهِ) یان لە ئەندازەکەی، وەك یەکێکیان بڵێ: پارەی خولعەکە دیرهەمە. ئەویتریش بڵێ: تومەنە. یان یەکێکیان بڵێ: هەزارە. ئەویتریش بڵێ پێنجسەدە. یان بڵێ: تەڵاقەکە سێبەسێ یە. ئەویش بڵێ: یەك تەڵاقە (وَلاَ بَيِّنَةَ) هیچ شاهیدیش نەبو، ئەوە (تَحَالَفَا) هەردووکیان سوێند بۆ یەکتری دەخۆن-وەك لە (کێشەی کڕیارو فرۆشیار)دا ڕابرا- ئینجا یەکێکیان پارەی خولعەکە (فَسخ) دەکاتەوەو تەڵاقەکەش بە (بائن)ی دەکەوێ، کەوابو: (وَوَجَبَ مَهْرُ مِثْلٍ) مارەیی هاووێنەش لە سەر ژنەکە بۆ مێردەکە واجب دەبێ.

وَلَوْ خالَعَ بِأَلْف وَنَوَيَا نَوْعًا لَزِمَ، وَقِيلَ مَهْرُ مِثْلٍ، وَلَوْ قَالَ أَرَدْنَا دَنَانِيرَ فَقَالَتْ بَل دَرَاهِمَ أَوْ فُلُوسًا تَحَالَفَا عَلَى الأَوَّلِ، وَوَجَبَ مَهْرُ مِثْلٍ بِلاَ تَحَالُف فِي الثَّانِي.

(كِتَابُ الطَّلاَقِ)

---

ئینجا بزانه: له ژنەكەو له مێردەكە: هەركامەیان شاهیدی هەبێ، ئەویان بڕیاری بۆ دەدرێ.
نیسان بزانه: له ژمارەی تەلاقەكان-ئەگەر شاهید نەبێ- بە سوێند خواردن باوەڕ بە مێردەكە دەكرێ، هەروەك له (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانه.

(وَلَوْ خَالَعَ بِأَلْفٍ) ئەگەر خولعی لەگەڵ ژنەكەی كرد بە هەزارێك، لە شوێنەكەشدا دوو جۆرە دینار هەبون (وَنَوَيَا نَوْعًا) ژنەكەو مێردەكە هەردووكیان نیەتیان یەك جۆر بوو، ئەوە (لَزِمَ) جۆرەكە واجب دەبێ (وَقِيلَ مَهْرُ مِثْلٍ) له فەرموودەیەكی بێهێزدا: مارەییی هاووێنە واجب دەبێ، بەڵام (وَلَوْ قَالَ أَرَدْنَا دَنَانِيرَ) ئەگەر مێردەكە گوتی: مەبەستمان بە هەزارەكە: هەزار دینار بوو (فَقَالَتْ بَل دَرَاهِمَ أَوْ فُلُوسًا) ژنەكەش گوتی: مەبەستمان هەزار دیرهەم، یان هەزار فلوس بوو. ئەو كاتە (تَحَالَفَا عَلَى الأَوَّلِ) له سەر فەرموودەی یەكەمی بەهێز: سوێند بۆ یەكتری دەخۆن‌و بە مارەییی هاووێنەش تەلاقەكە دەكەوێ، بەڵام (وَوَجَبَ مَهْرُ مِثْلٍ بِلاَتَحَالُفٍ فِي الثَّانِي) له فەرموودەی دووەمی بێهێزدا: بە بێ‌سوێندخواردن مارەییی هاووێنه واجب دەبێ.

## ﴿ كِتَابُ الطَّلاَقِ: پەرتوكی ژن تەلاقدان ﴾

واتە: لێككردنەوەی زنجیری‌مارەبڕین بە یەكێك لە ووشەكانی داهاتوو.
جا بزانه: تەلاقدان هەندێ جار واجبە: وەك ئەو كەسەی سوێندی خواردبێ جیماع لەگەڵ ژنەكەی نەكا، هەروەك لە باسی(إيلاء)دا ڕوون كراوەتەوە. هەندێ جاریش حەرامە: وەك تەلاقی (بِدْعِي)ی‌داهاتوو. هەندێ جاریش سوننەتە: وەك ئەو كەسەی توانای نەبێ مافی ژنەكەی بدا، یان ژنەكەی بێ‌ناموس بێ، یان ئەوەندە بەد ڕەوشت بێ: نەتوانێ ژیانی لەگەڵدا بباتە سەر ﴿عن ابن عباس رضي الله عنهما: أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنَّ امْرَأَتِي لاَ تَرُدُّ يَدَ لاَمِسٍ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: غَرِّبْهَا. فَقَالَ: أَخَافُ أَنْ تَتْبَعَهَا نَفْسِي. قَالَ: فَاسْتَمْتِعْ بِهَا﴾ حديث صحيح رواه أبوداود وغيره، پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ژنەكەم دەستی هیچ كەسێك ناگەڕێنێتەوە كە دەستی بۆ درێژ بكا؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: تەلاقی بدە. پیاوەكە گوتی: دەترسم دڵم بۆی بچێ. فەرمووی: كەوابو: لە گەڵی ڕابوێرە. واتە: بیهێڵەوە؟ نەوەك له دوای‌تەلاقدانی-بە هۆی‌دڵبۆچوونەكەی- زینای لە گەڵ بكا.

جا ئەگەر ئەو حاڵەتانەی‌ڕابردوو هیچیان نەبون، ئەو كاتە (مَكْرُوه) ناپەسندە، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا ڕوون كراوتەوە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿أَبْغَضُ الْحَلاَلِ إِلَى اللهِ

يُشْتَرَطُ لِنُفُوذِهِ اَلتَّكْلِيفُ إِلاَّالسَّكْرَانَ، وَيَقَعُ بِصَرِيحِهِ بِلاَ نِيَّةٍ وَبِكِنَايَةٍ بِنِيَّــةٍ، فَصَــرِيحُهُ: اَلطَّلاَقُ وَكَذَا الْفِرَاقُ وَالسَّرَاحُ عَلَىالْمَشْهُورِ،

---

اَلطَّلاَقُ﴾ حديث صحيح رواه أبوداود وغيره، لە هەموو حەلاَڵێك ڕق لێهاتووتر لە لای خوایگەورە تەلاَقدانە.

**جا تكایە بگەڕێوە بۆ (پێشەكی)یخولع چونكە پێویستیت پـێی ئەبـێ.**

(يُشْتَرَطُ لِنُفُوذِهِ) بە مەرج دادەندرێ بۆ جێبەجێبوونی تـەلاَق: (اَلتَّكْلِيفُ) تەلاَقدەرەكـە داوالێكراوی شەرع بێ، واتە: مێردەكە بالغو عاقڵو بەهۆشو بەخۆشیخۆی بـێ، كـەوابو: تەلاَقی منداڵو شێتو بێهۆشو خەوتوو و زۆرلێكراو ناكەوێ، پێغەمبەرﷺ دەفـەرموێ: ﴿رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلاَثَةٍ: عَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ وَعَنِ الصَّبِيِّ حَتَّى يَحْتَلِمَ وَعَنِ الْمَجْنُونِ حَتَّى يَعْقِــلَ﴾ حـديث صـحيح رواه اصـحاب السـنن، نووسـین لـە سـەر سـێ جـۆرە كەسـان هەڵگیراوە: لە سەر خەوتوو تا هەشیار دەبێتەوە، لە سەر منداڵ تا بلۆغی دەبێ، لە سەر شێت تا چاك دەبێتەوە.

(إِلاَّ السَّكْرَانَ) تەنها سەرخۆش نەبێ-كە بە قەسدیو بە خۆشی خۆی سەرخۆشكەرەكەی بە كار هێنابێ- ئەوە تەلاَقی دەكەوێ، جیاوازی نیە سەرخۆشكەرەكە: خـواردن بـێ، یـان خواردنـەوە بـێ ، یـان دەرمـان بـێ، هـەروەك لـە (باسـی تەلاَقـدانی سـەرخۆش)دا ڕوونـی دەكەینەوە، إن شاءالله تعالى.

جا بزانە: ووشەكانی تەلاَقدان دوو جۆرن: ئاشكرا، نائاشكرا، ئینجا (وَيَقَعُ بِصَرِيحِهِ بِلاَ نِيَّةٍ) تەلاَق بە ووشەی ئاشكرا دەكەوێ بێ ئەوەی نیـەتی كـەوتنی تـەلاَقی هـەبێ، بـەڵكو تـەنها ئەوەندە بەسە: بزانـێ ئـەم ووشـەیە بـۆ لێككردنـەوەی پەیوەنـدی ژنو مێـرد بـە كـار دێ، هەروەك لە (البجيرمي)و(الشرواني)دا ڕوون كراوەتەوە (وَبِكِنَايَةٍ) هەم بە ووشەی نائاشكراش تەلاَق دەكەوێ، بەلاَم (بِنِيَّةٍ) دەبی نیەتی كەوتنی تەلاَقیشی لەگەڵدا بێ.

(فَصَرِيحُهُ) جـا ووشەیئاشـكرای تەلاَقـدان ئەوەیـە جگـە لـە واتـەی تـەلاَق هیچـیتری لێنەفامێتەوە: وەك (اَلطَّلاَقُ) ئەو ڕستانەیداهاتوو كە لە ووشەی تەلاَق دادەڕژێن.

(وَكَذَا الْفِرَاقُ وَالسَّرَاحُ) هەروەهاش ووشەی جیابوونەوەو بەرەهەڵدان (عَلَىالْمَشْهُورِ) لە سـەر فەرموودەیناسراوی مەزهەب، چونكە ئەو سێ ووشەیە لە قورئانیپیرۆزدا بۆتەلاَق بە كـار هاتون، جا ئەوەش دەرهەق كەسێكی وەهایە كە بزانـێ: ئـەم دووانـەش ووشەیئاشـكرای تەلاَقن، بەلاَم بۆ ئەوكەسانەی نازانن-وەك گەلی كوردزمان- ئەوە تەنها ووشەی تەلاَق بـە ووشەیئاشكرای تەلاَقدانی ئەوان دادەندرێو ئـەوانیتر نائاشـكران، هـەروەك لـە (تحفة)و (نهاية)دا ڕوون كراوەتەوە.

كَطَلَّقْتُكَ وَأَنْتِ طَالِقٌ وَمُطَلَّقَةٌ وَيَا طَالِقُ، لاَ أَنْتِ طَلاَقٌ وَالطَّلاَقُ فِي الأَصَحِّ، وَتَرْجَمَةُ الطَّلاَقِ بِالْعَجَمِيَّةِ صَرِيحٌ عَلَى الْمَذْهَبِ، وَأَطْلَقْتُكِ وَأَنْتِ مُطْلَقَةٌ كِنَايَةٌ، وَلَوْ اشْتَهَرَ لَفْظٌ لِلطَّلاَقِ: كَالْحَلاَلُ أَوْ حَلاَلُ اللهِ عَلَيَّ حَرَامٌ، فَصَرِيحٌ فِي الأَصَحِّ، قُلْتُ: الأَصَحُّ أَنَّهُ كِنَايَةٌ، وَاللهُ أَعْلَمُ.

---

ئینجا ڕستەكانیئاشكرای تەلاقدان: (كَ) وەك بڵێتە ژنەكەی: (طَلَّقْتُكَ) تۆم تەلاق دا، یان تەلاقم دای (وَأَنْتِ طَالِقٌ) تۆ تەلاقكەوتووی (وَمُطَلَّقَةٌ) تۆ تەلاقدراوی (وَيَاطَالِقُ) هۆ تەلاقكەوتوو، یان تەلاقم خستە سەر تۆ، یان تەلاقم لە سەر تۆ دانا.

جا ئەگەر شوێنی تەلاقەكەش -كە ژنەكەیە- نەڵێ، وەك تەلاقم لە سەر بێ، یان تەلاقم لە سەر واجب بێ، ئەوەش ئاشكرایە، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

ئەوەش وا دەگەیەنێ: ئەگەر باسی ژنەكەی نەكاو بە ناسیاری بڵێ: تەلاقم بكەوێ. یان بڵێ: تەلاقم كەوتبێ. ئەوەش هەر ووشەیئاشكرای تەلاقەو تەلاقی دەكەوێ.

واتە: هەرچەند هەبوونی شوێنیتەلاق لە ڕاستیدا پێویستە هەبێ -چونكە ڕوكنێكیتەلاقە- بەلام باسكردنیشوێنەكە لە ووشەیتەلاقداندا مەرج نیە بۆ تەلاق كەوتن، هەروەك لە (جواهرالفتاوی)دا ڕوون كراوەتەوە.

(لاَ أَنْتِ طَلاَقٌ وَالطَّلاَقُ) نەك بڵێ: تۆ تەلاقی، چونكە ئەمە ووشەیەكی نائاشكرایە ئەگەر نیەتی تەلاقكەوتنی نەبێ تەلاقی ناكەوێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر بڵێ: بە تەلاقم ئەو كارە ناكەم. یان بە هەرسێك تەلاقم ئەو كارەم نەكردوە. ئەوەش نابێتە سوێند، واتە: كارەكە بكا، یان نەیكا، یان كردبێتی، بە هیچ جۆرێك تەلاقی ناكەوێ، هەر چەند نیەتی تەلاقدانیشی هەبێ، هەروەك لە (الأنوار)و (تحفه)دا ڕوون كراوەتەوە، بەلام ئاگادار بە: لێرەدا لە (تحفة) چاپكراوەكاندا نزیكەی چوار دێڕ چاپ نەكراون، بەلكو لە دەستنوسەكاندا هەنە، والله أعلم.

(وَتَرْجَمَةُ الطَّلاَقِ بِالْعَجَمِيَّةِ) گۆڕینی ووشەی (طلاق) لە زمانی عەرەبیەوە بۆ هەر زمانێكیتری جگە لە عەرەبی (صَرِيحٌ عَلَى الْمَذْهَبِ) ئەویش هەر بە ووشەیئاشكرای تەلاق دادەندرێ، لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب (وَأَطْلَقْتُكِ) تۆم بەرهەلّ دا (وَأَنْتِ مُطْلَقَةٌ) تۆ بەرهەڵدراوی (كِنَايَةٌ) هەردووكیان نائاشكرانو ئەگەر نیەتی تەلاقكەوتنی نەبێ تەلاقیان پێ ناكەوێ.

(وَلَوْ اشْتَهَرَ لَفْظٌ لِلطَّلاَقِ) ئەگەر ووشەیەك بۆ تەلاقدان بلاو بۆوە: (كَ) وەك (اَلْحَلاَلُ) حەلاڵم لێحەرام بێ (أَوْ حَلاَلُ اللهِ عَلَيَّ حَرَامٌ) یان حەلالیخوا لە سەر من حەرام بێ (فَصَرِيحٌ فِي الأَصَحِّ) ئەوەش ئاشكرایە (قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) دەفەرموێ (الأَصَحُّ أَنَّهُ كِنَايَةٌ)

وَكِنَايَتُهُ: كَأَنْتِ خَلِيَّةٌ بَرِيَّةٌ بَتَّةٌ بَتْلَةٌ بَائِنٌ اعْتَدِّي اسْتَبْرِئِي رَحِمَكِ إِلْحَقِي بِأَهْلِكِ حَبْلُكِ عَلَى غَارِبِكِ لاَ أَنْدَهُ سَرْبَكِ اُعْزُبِي اُغْرُبِي دَعِينِي وَدِّعِينِي وَنَحْوِهَا، وَالإِعْتَاقُ كِنَايَةُ طَلاَقٍ وَعَكْسُهُ، وَلَيْسَ الطَّلاَقُ كِنَايَةَ ظِهَارٍ وَعَكْسُهُ، وَلَوْ قَالَ: أَنْتِ عَلَيَّ حَرَامٌ أَوْ حَرَّمْتُكِ. وَنَوَى طَلاَقًا

---

به فەرموودەی ڕاستتر: ئەو ووشەیە لە هەر دوو ڕستەکاندا نائاشکرایە، واتە: ئەگەر نیەتی تەلاقدانی نەبێ تەلاقی ناکەوێ (وَاللهُ أَعْلَمُ).

هەروەها تۆم حەرام کرد. یان تۆ لە من حەرامی. یان تۆ لە من حەرامی وەك دایکم. ئەوانەش گشتی ووشەینائاشکرای تەلاقن، هەروەك لە (تحفة) لێرەو لە (ظهار)دا فەرموویەتی، ئێستاش لە دوای (أَنْتِ عَلَيَّ حَرَامٌ) ڕوونی دەکەینەوە، إن شاء الله تعالى.

(وَكِنَايَتُهُ) ووشەینائاشکرای تەلاق ئەوەیە: جگە لە تەلاق واتەیتریشی لێبفامێتەوە: (کـ) وەك (أَنْتِ خَلِيَّةٌ) تۆ بێمێردی (بَرِيَّةٌ) لێکبوویەوەی لە مێردت (بَتَّةٌ) لە مێردت بڕایەوە (بَتْلَةٌ) بێمارەبڕینی (بَائِنٌ) جیابووەوەی (اعْتَدِّي) عیددەت ببینە (اسْتَبْرِئِي رَحِمَكِ) منداڵدانەکەت دڵنیا بکە (إِلْحَقِي بِأَهْلِكِ) بگەوە ناو خزمو کەسەکانت (حَبْلُكِ عَلَى غَارِبِكِ) پەتکەکەت لە سەر ملیخۆتە (لاَ أَنْدَهُ سَرْبَكِ) لە ڕەوێیەکەت ناخوڕمەوە=کارم بە تۆ نەماوە (اُعْزُبِي) لێم دوورکەوە (اُغْرُبِي) لێم ببە بێگانە (دَعِينِي) وازم لێبێنە (وَدِّعِينِي) خوا حافیزیم لێبکە (وَنَحْوِهَا) هەرچی وەك ئەو ووشانە بێ: وەك خوا حافیزت بێ، خۆت لە من داپۆشە، بڕۆوە ماڵیباوکت، تۆ ژنی من نی، من مێردی تۆ نیم، بۆ خۆت شوو بکە=مێرد بکە.

(وَالإِعْتَاقُ) ووشەی ئازادم کردی کە بەرامبەر بە ژنەکەی بەکار بێنێ (كِنَايَةُ طَلاَقٍ) ووشەی نائاشکرای تەلاقدانە (وَعَكْسُهُ) پێچەوانەکەیشی کە تەلاقە ووشەی نائاشکرای ئازادکردنی کۆیلەیە، کەواتە: بە هەر یەکێك لە ووشە نائاشکرایەکانی تەلاقدانی تەلاق نیەتی هەبێ تەلاقی دەکەوێ.

بەلام ئەگەر ژنەکەی بە (رَجْعِي) بە تەلاقێك تەلاق دابێ، ئینجا تەنها بلێ: کردمە سێبەسێ، واتە: هیچ ووشەیەکی ئاشکراو نائاشکرا دووبارە نەکاتەوە، ئەوە هیچیتر تەلاقی ناکەوێ، هەرچەند نیەتیتەلاقیشی هەبێ، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

(وَلَيْسَ الطَّلاَقُ كِنَايَةَ ظِهَارٍ) ووشەیئاشکرای تەلاقدان نابێتە ووشەینائاشکرای زیهار (وَعَكْسُهُ) پێچەوانەکەشی نابێ، واتە: ووشەیئاشکرای زیهار نابێتە ووشەینائاشکرای تەلاقدان، بەلام ووشەیناشکرای هەردووکیان دەبێتە ووشەیناشکرای ئەویتریان، هەروەك (الشبراملسی) فەرموویەتی.

کەوابو: (فَلَوْ قَالَ) ئەگەر گوتیە ژنەکەیخۆی (أَنْتِ عَلَيَّ حَرَامٌ) تۆ لە سەر من حەرامی (أَوْ حَرَّمْتُكِ) یان تۆم حەرام کرد، یان تۆ وەك دایکم لە من حەرامی (وَنَوَى طَلاَقًا) ئەوە ئەگەر

أَوْ ظِهَارًا حَصَلَ، أَوْ نَوَاهُمَا تَخَيَّرَ وَثَبَتَ مَااخْتَارَهُ، وَقِيلَ طَلاَقٌ وَقِيلَ ظِهَارٌ، أَوْ تَحْرِيمَ عَيْنِهَا لَمْ تَحْرُمْ وَعَلَيْهِ كَفَّارَةُ يَمِينٍ، وَكَذَا إِنْ لَمْ تَكُنْ نِيَّةٌ فِي الأَظْهَرِ، وَالثَّانِي لَغْــوٌ، وَإِنْ قَالَهُ لأَمَتِهِ وَنَوَى عِتْقًا ثَبَتَ، أَوْ تَحْرِيمَ عَيْنِهَا أَوْ لاَ نِيَّةَ

---

به یه‌كێك له‌و سێ ووشانه‌ی‌ڕابردوو: مه‌به‌ستی یه‌ك ته‌ڵاق، یان دوو ته‌ڵاق، یان سێ تـه‌ڵاق بێ، ئـه‌وه‌ بـه‌گوێره‌ی نیه‌ته‌كـه‌ی ده‌بێتـه‌ ته‌ڵاقـدان (أَوْ ظِهَـارًا) یـان ئه‌گـه‌ر بـه‌و ووشـانه‌ مه‌به‌ستی زیهار بێ، ئه‌وه‌(حَصَلَ) ده‌بێته‌ زیهار.

(أَوْ نَوَاهُمَا) یان ئه‌گه‌ر نیـه‌تی ته‌ڵاقـدان‌و زیهـاری وێكڕا هـه‌بو، ئـه‌وه‌ هـه‌ردووكیان وێكڕا دروست نابن؟ چونكه‌ ته‌ڵاقدان ماره‌بڕین لا ده‌با، زیهاریش جێگیری ده‌كا، كه‌وابو: (تَخَيَّرَ) مێرده‌كه‌ ده‌بێتـه‌ سه‌رپشك: (وَثَبَتَ مَااخْتَارَهُ) له‌ ته‌ڵاق‌و له‌ زیهار كامه‌یانی هه‌ڵبژارد ته‌نها ئه‌وی بۆ جـێگیر ده‌بـێ (وَقِيـلَ طَـلاَقٌ وَقِيـلَ ظِهَـارٌ) لـه‌ فه‌رمووده‌یـه‌كی بـێهێزدا: تـه‌ڵاقی ده‌كه‌وێ‌و، له‌ بێهێزێكدا: ده‌بێته‌ زیهار.

(أَوْ) یان ئه‌گه‌ر به‌و سێ ووشانه‌ی‌ڕابردوو مه‌به‌ستی ته‌ڵاق‌و زیهار نه‌بو، به‌ڵكو (تَحْرِيمَ عَيْنِهَا) مه‌به‌ستی حه‌ڕامكردنی خودی‌ژنه‌كه‌ بوو، یان مه‌به‌ستی حـه‌ڕامكردنی جیمـاعی ژنه‌كه‌ بـوو، ئـه‌و كاتـه‌ (لَـمْ تَحْـرُمْ) ژنه‌كـه‌ی لێحـه‌ڕام نابـێ، بـه‌ڵام (وَعَلَيْـهِ كَفَّـارَةُ يَمِـينٍ) هـه‌ر ئـه‌و ده‌م كه‌ففاره‌تێكی وه‌ك كه‌ففاره‌تی سوێندخواردنی له‌ سه‌ر واجب ده‌بێ، هه‌ر چـه‌ند جیماعیشـی له‌گه‌ڵ نه‌كردبێ (وكَذَا إِنْ لَمْ تَكُنْ نِيَّةٌ) هه‌روه‌ها ئه‌گه‌ر نیه‌تی هیـچ حه‌ڕامكردنێكیشی نـه‌بێ، ژنه‌كه‌ی لێحه‌ڕام نابێ، به‌ڵام كه‌ففاره‌ته‌كه‌ی‌سوێندی هه‌ر له‌ سه‌ر واجـب ده‌بـێ (فِي الأَظْهَرِ) له‌ فه‌رمووده‌ی به‌هێزتردا ﴿عن ابن عباس رضي الله عنهما: إِذَاحَرَّمَ الرَّجُلُ عَلَيْهِ إمْرَأَتَهُ فَهِيَ يَمِـينٌ يُكَفِّرُهَا. وَقَالَ: لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللهِ أُسْـوَةٌ حَسَـنَةٌ﴾ رواه الشيخان، (إبـن عبـاس) فه‌رمووی: هه‌ر كاتێك پیاو ژنه‌كه‌ی‌خۆی له‌ خۆی حه‌ڕام كرد، ئه‌وه‌ لێی حه‌ڕام نابـێ، بـه‌ڵكو وه‌كو سوێندێك كه‌ ففاره‌تی ده‌دا. جا فه‌رمووی: لـه‌و كه‌ففاره‌تـه‌دا شـوێنكه‌وتنێكی جـوانی پێغه‌مبه‌رﷺ بۆ ئێـوه‌ هه‌یـه‌. واتـه‌: كـه‌ لـه‌ سوره‌تی (التَّحْريم)دا خـوای گـه‌وره‌ فـه‌رمانی پێكرد: له‌و ڕووداوه‌دا كه‌ففاره‌ت بدا.

جا بزانه‌: ئه‌گه‌ر بڵێته‌ هـه‌ر چوار ژنـه‌كانی: ئێـوه‌ لـه‌ مـن حـه‌ڕامن. ئـه‌و كاتـه‌ش–ئه‌گـه‌ر مه‌به‌ستی ته‌ڵاق‌و زیهار نه‌بێ– ته‌نها یه‌ك كه‌ففاره‌تی له‌ سه‌ر واجبه‌، هـه‌روه‌ها ئه‌گـه‌ر زۆر جاریش ڕسته‌كه‌ دووباره‌ بكاته‌وه‌، تـه‌نها یـه‌ك كـه‌ففاره‌تی لـه‌ سـه‌ر واجبـه‌، هـه‌روه‌ك لـه‌ زۆربه‌ی سه‌رچـاوه‌كاندا فه‌رموویانـه‌ (وَالثَّـانِي لَغْـوٌ) بـه‌ فـه‌رمووده‌ی‌دووه‌می بـێهێز: ئـه‌و حه‌ڕامكردنه‌كه‌ به‌تاڵه‌و كه‌ففاره‌ت واجب ناكا.

(وَإِنْ قَالَـهُ لأَمَتِـهِ) ئه‌گـه‌ر بـه‌ جاریه‌كـه‌ی خـۆی گـوت: تـۆ لـه‌ مـن حـه‌ڕامی (وَنَـوَى عِتْقًـا) مه‌به‌ستیشی ئازادكردن بوو (ثَبَتَ) ئازادبوونه‌كه‌ جـێگیر ده‌بـێ (أَوْ تَحْـرِيمَ عَيْنِهَـا أَوْ لاَ نِيَّـةَ)

فَكَالزَّوْجَةِ، وَلَوْ قَالَ: هَذَاالثَّوْبُ أَوِ الطَّعَامُ أَوِالْعَبْدُ حَرَامٌ عَلَيَّ. فَلَغْوٌ، وَشَرْطُ نِيَّةِ الْكِنَايَةِ اقْتِرَانُهَا بِكُلِّ اللَّفْظِ، وَقِيلَ يَكْفِي بِأَوَّلِهِ، وَإِشَارَةُ نَاطِقٍ بِطَلَاقٍ لَغْوٌ، وَقِيلَ كِنَايَةٌ، وَيُعْتَدُّ بِإِشَارَةِ أَخْرَسَ فِي الْعُقُودِ وَالْحُلُولِ، فَإِنْ فَهِمَ طَلَاقَهُ بِهَا كُلُّ أَحَدٍ فَصَرِيحَةٌ، وَإِنِ اخْتَصَّ بِفَهْمِهِ فَطِنُونَ فَكِنَايَةٌ،

---

یان مەبەستی حەڕامکردنی خودیجاریەکە بوو، یان هیچ نیەتێکی نەبو، ئەوە (فَكَالزَّوْجَةِ) وەك حەڕامکردنی ژنەکەیەتی، واتە: کەففارەتی لە سەر واجب دەبێ.

(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر پیاوەکە گوتی (هَذَا الثَّوْبُ أَوِ الطَّعَامُ أَوِ الْعَبْدُ حَرَامٌ عَلَيَّ) ئەم جلە، یان ئەم خواردەمەنیە، یان ئەم کۆیلەیە لە سەر من حەڕام بێ، ئەوە (فَلَغْوٌ) بەتاڵەو کەففارەتیش واجب نابێ.

(وَشَرْطُ نِيَّةِ الْكِنَايَةِ) مەرجی کارکردنی نیەتی ووشەکانی نائاشکرای تەڵاق ئەوەیە: (اقْتِرَانُهَا بِكُلِّ اللَّفْظِ) نیەتەکە بەرامبەر بێ لەگەڵ تەواوی ووشەکەی نائاشکرادا (وَقِيلَ يَكْفِي بِأَوَّلِهِ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: نیەتەکە لەگەڵ سەرەتای ووشەکەدا بەرامبەر بێ بەسە، بەڵام بە فەرموودەی بەهێز-لە لای چەند زانایەك- ئەوەندە بەسە: لەگەڵ بەشێکی ووشەکەدا نیەتی تەڵاقدانی هەبێ: جا لە سەرەتای ووشەکە بێ، یان ناوەند، یان کۆتایی، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاند فەرموویانە.

## ﴿ نوسین و ئاماژەکردن بۆ تەڵاقدان ﴾

(وَإِشَارَةُ نَاطِقٍ بِطَلَاقٍ) ئاماژەکردنی پیاوی زمانساغ-کە لاڵ نەبێ- بۆ تەڵاقدانی ژنەکەی (لَغْوٌ) بەتاڵە، وەك ژنەکەی بڵێ: تەڵاقم بدە. ئەویش بە دەست ئاماژە بکا: بڕۆ. ئەوە تەڵاقی ناکەوێ، بەڵام ئەگەر ئاماژە بۆ شوێنی تەڵاقەکە بکا، ئەوکاتە دروست دەبێ: وەك دوو ژنی هەبێ و بڵێ: تەڵاقی ژنەکەم کەوتبێ. ئاماژەش بۆ یەکێکیان بکا، ئەوە تەڵاقی ئاماژە بۆکراوەکە دەکەوێ، بەڵام ئەگەر گوتی: ئەوە نا، مەبەستم ژنەکەیتر بوو. ئەوەشی لێقبوڵ دەکرێ، هەروەك لە (مغنی)و (حاشية عميرة)دا فەرموویانە (وَقِيلَ كِنَايَةٌ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: ئاماژەکردنی زمانساغ وەك ووشەی نائاشکریە.

بەڵام (وَيُعْتَدُّ بِإِشَارَةِ أَخْرَسَ) ئاماژەکردنی مرۆڤی لاڵ ڕەفتاری پێدەکرێ: (فِي الْعُقُودِ) لە مامڵەتبەستنەکاندا: وەك کڕین و فرۆشتن و مارەبڕین، هەم (وَالْحُلُولِ) لە لێککردنەوەکاندا: وەك تەڵاق و هەڵوەشاندنەوەی مامڵەتەکان و مارەبڕین، هەر چەند لاڵەکە توانای نوسینیشی هەبێ، ئینجا (فَإِنْ فَهِمَ طَلَاقَهُ بِهَا كُلُّ أَحَدٍ) ئەگەر گشت کەسێك بە ئاماژەکەی لە تەڵاقدانەکەی تێدەگەیشت، ئەوە (فَصَرِيحَةٌ) ئاماژەکەی ئاشکرایەو پێویست بە نیەتی تەڵاقدان ناکا، بەڵام (وَإِنِ اخْتَصَّ بِفَهْمِهِ فَطِنُونَ) ئەگەر بە تایبەتی زیرەکەکان لە ئاماژەکەی تێدەگەیشتن، ئەوکاتە (فَكِنَايَةٌ) ئاماژەکەی نائاشکرایەو پێویستە نیەتی

وَلَوْ كَتَبَ نَاطِقٌ طَلَاقًا وَلَمْ يَنْوِهِ فَلَغْوٌ، وَإِنْ نَوَاهُ فَالأَظْهَرُ وُقُوعُهُ، فَإِنْ كَتَبَ إِذَا بَلَغَكِ كِتَابِي فَأَنْتِ طَالِقٌ. فَإِنَّمَا تَطْلُقُ بِبُلُوغِهِ، وَإِنْ كَتَبَ إِذَا قَرَأْتِ كِتَابِي. وَهِيَ قَارِئَةٌ فَقَرَأَتْهُ طَلُقَتْ، وَإِنْ قُرِئَ عَلَيْهَا فَلَا فِي الأَصَحِّ،

---

تەلاقدانیشی لەگەڵدا بێ، هەروەها ئەگەر بە نووسینیش ژنەکەی تەلاق بدا، پێویستە نیەتی تەلاقدانی هەبێ، جا نیەتەکەشی لە هەردوو حاڵەتدا: یان بە نووسینێکیتر، یان بە ئاماژەیەکیتر دەزاندرێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

(وَلَوْ كَتَبَ نَاطِقٌ طَلَاقًا) ئەگەر زمانساغێك، یان لاڵێك تەلاقدانێکی نووسی (وَلَمْ يَنْوِهِ) نیەتی تەلاقدانیشی نەبو (فَلَغْوٌ) ئەوە بەتاڵەو تەلاقی ناکەوێ، چونکە نووسین وەك ووشەی نائاشکرایە، بەلام (وَإِنْ نَوَاهُ) ئەگەر لەگەڵ نووسینەکەدا نیەتی تەلاقدانی هەبو، ئەو کاتە (فَالأَظْهَرُ وُقُوعُهُ) بە فەرموودەی بەهێزتر: تەلاقەکەی دەکەوێ.

جا ئەگەر لە حاڵەتینووسینەکەدا بە زوبانیش نووسراوەکەی دەگوت، یان لە دوای نووسینەکە نووسراوەکەی خوێندەوە، ئەوە ووشەیەکیئاشکرایە، بەلام ئەگەر بڵێ: تەنها مەبەستم خوێندنەوەی نووسراوەکە بوو و نیەتی تەلاقدانم نەبو، ئەو کاتە بە سوێندخواردن باوەڕی پێدەکرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

بەلام ئەگەر بەخۆی تەلاقەکەی نەنووسی، بەڵکو فەرمانی بە یەکێکیتر کرد: تەلاقدانی ژنەکەی بۆ نووسیو بەخۆیشی نیەتی تەلاقدانەکەی هێنا، ئەوە تەلاقی ناکەوێ، بەڵکو مەرجە: فەرمانی نووسینو نیەتی تەلاقدانی وێکڕا پێبکاو نووسەرەکەش لەگەڵ نووسینەکەدا نیەتی تەلاقدانەکەی هەبێ، تاکو تەلاقی فەرمانکەرەکە بکەوێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)و حاشیەکانیاندا ڕوون کراوەتەوە.

(فَإِنْ كَتَبَ) جا ئەگەر مێردەکە بۆ ژنەکەی نووسی: (إِذَا بَلَغَكِ كِتَابِي فَأَنْتِ طَالِقٌ) هەر کاتێك نووسراوەکەی من بە دەستت گەیشت، یان پێت گەیشت، تۆ تەلاقکەوتووی= تەلاقت بکەوێ. لە گەڵ نووسینەکەشدا نیەتی تەلاقدانی هەبو، ئەوە (فَإِنَّمَا تَطْلُقُ بِبُلُوغِهِ) تەنها بە گەیشتنی نووسراوەکەی تەلاقی ژنەکەی دەکەوێ، کەواتە: ئەگەر نووسراوەکە پێش گەیشتن هەمووی ڕەش بۆوە، یان تەنها دێڕەکەی تەلاقدان ڕەش بۆوە، ئەو کاتە تەلاقی ناکەوێ.

(وَإِنْ كَتَبَ) ئەگەر بۆ ژنەکەی نووسی (إِذَا قَرَأْتِ كِتَابِي) هەر کاتێك نووسراوەکەمت خوێندەوە تەلاقت بکەوێ (وَهِيَ قَارِئَةٌ) ژنەکەش خوێندەوار بوو (فَقَرَأَتْهُ) ئینجا نووسراوەکەشی خوێندەوە (طَلُقَتْ) تەلاقی دەکەوێ، هەرچەند بە زوبانیش نەیخوێندبێتەوە، بەلام (وَإِنْ قُرِئَ عَلَيْهَا) ئەگەر نووسراوەکەی بۆ خوێندرایەوە (فَلَا فِي الأَصَحِّ) تەلاقی ناکەوێ لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە بەخۆی نەیخوێندۆتەوە، بەلام

وَإِنْ لَـــمْ تَكُـــنْ قَارِئَـــةً فَقُـــرِئَ عَلَيْهَـــا طَلَقَـــتْ.
(فَصْلٌ) لَهُ تَفْوِيضُ طَلَاقِهَا إِلَيْهَا، وَهُوَ تَمْلِيكٌ فِي الْجَدِيدِ فَيُشْـتَرَطُ لِوُقُوعِـهِ تَطْلِيقُهَـا عَلَى الْفَوْرِ، وَإِنْ قَالَ: طَلِّقِي بِأَلْفٍ. فَطَلَّقَتْ بَانَتْ وَلَزِمَهَا أَلْفٌ، وَ فِي قَوْلٍ تَوْكِيلٌ فَـلاَ يُشْتَرَطُ فَوْرٌ فِي الأَصَحِّ، وَفِي اشْتِرَاطِ قَبُولِهَا خِلَافُ الْوَكِيلِ،

---

(وَإِنْ لَمْ تَكُنْ قَارِئَةً) ئەگەر ژنەکە خوێندەوار نەبێو (فَقُرِئَ عَلَيْهَا) نووسراوەکەی بۆ بخوێندرێتەوە، ئەو کاتە (طَلَقَتْ) تەڵاقی دەکەوێ، چونکە مەبەست بە خوێندنەوەی نەخوێندەوار: تێگەیشتنو زانینی ناو نووسراوەکەیە.

**﴿ فَصْلٌ: له باسی تەڵاق دانە دەست ژن ﴾**

(لَهُ تَفْوِيضُ طَلَاقِهَا إِلَيْهَا) بە (إجماع)ی زانایانیئیسلام دروستە: مێردەکە تەڵاقی ژنەکەی بداتە دەست ژنەکە، وەك بڵێ: خۆت تەڵاق بدە ئەگەر حەز دەکەی ﴿عن عائشة رضي الله عنها: خَيَّرَنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ فَاخْتَرْنَا اللهَ وَرَسُولَهُ، فَلَمْ يُعَدَّ ذَلِكَ عَلَيْنَا شَيْئاً﴾ رواه الشيخان، حەزرەتی (عائشة) فەرمووی: پێغەمبەرﷺ ئێمەی-ژنەکانیخۆی- کردە سەرپشك: لە خۆ تەڵاقدانو مانەوە بە ژنایەتی، ئێمەش خواو پێغەمبەرمانﷺ هەڵبژارد، جا ئەو سەرپشکیەش بە تەڵاق نەژمێردرا.

(وَهُوَ تَمْلِيكٌ) تەڵاق دانە دەست ژنەکە بڕیاری کردنە مڵکایەتیی بۆ دەدرێ (فِي الْجَدِيدِ) لە فەرموودەینوێدا، کەوابو: (فَيُشْتَرَطُ لِوُقُوعِهِ) بە مەرج دادەندرێ بۆ کەوتنیتەڵاقەکە (تَطْلِيقُهَا عَلَى الْفَوْرِ) ژنەکە لە دوای قسەی مێردەکەی یەکسەر خۆی تەڵاق بدا، کەواتە: ئەگەر قسەیەکی زۆری بێگانە، یان بێدەنگبوونێکیدرێژ کەوتە نێوان قسەی مێردەکەو ژنەکە، ئەوە تەڵاقەکەی ناکەوێ، هەروەك لە (نهاية)و (مغني)دا فەرموویانە.

(وَإِنْ قَالَ) ئەگەر مێردەکە گوتیە ژنەکەی: (طَلِّقِي بِأَلْفٍ) خۆت تەڵاق بدە بە هەزار دینار (فَطَلَّقَتْ) ژنەکەش یەکسەر گوتی: خۆم تەڵاق دا، ئەوە (بَانَتْ وَلَزِمَهَا أَلْفٌ) بە (بائن)ی تەڵاقی دەکەوێو هەزار دینارەکەشی لە سەر واجب دەبێ بۆ مێردەکەی، هەرچەند ناوی هەزار دینارەکەشی نەگوتبێتەوە.

(وَفِي قَوْلٍ تَوْكِيلٌ) لە فەرموودەیەکیتردا: تەڵاق دانە دەست ژنەکە وەکیلگرتنە بۆ تەڵاقدان، وەك تەڵاق دانە دەست بێگانە، کەوابو: (فَلاَ يُشْتَرَطُ فَوْرٌ فِي الأَصَحِّ) بە مەرج دانانرێ بە پەلە خۆی تەڵاق بدا، لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَفِي اشْتِرَاطِ قَبُولِهَا خِلَافُ الْوَكِيلِ) لەبارەی بە مەرج دانانی قبولکردنی ژنەکە هەمان فەرموودە جیاوازەکانی ڕابردووی وەکیل لێرەشدا هەنە، کەواتە: بە فەرموودەی ڕاستتر: مەرج نیە بە زوبان بڵێ: قبوڵم کرد.

وَعَلَى الْقَوْلَيْنِ لَهُ الرُّجُوعُ قَبْلَ تَطْلِيقِهَا، وَلَوْ قَالَ: إِذَا جَاءَ رَمَضَانُ فَطَلِّقِي. لَغَا عَلَى التَّمْلِيكِ، وَلَوْ قَالَ: أَبِينِي نَفْسَكِ. فَقَالَتْ: أَبَنْتُ. وَنَوَيَا وَقَعَ وَإِلاَّ فَلاَ، وَلَوْ قَالَ: طَلِّقِي. فَقَالَتْ: أَبَنْتُ. وَنَوَتْ أَوْ أَبِينِي. وَنَوَى، فَقَالَتْ: طَلَّقْتُ. وَقَعَ، وَلَوْ قَالَ طَلِّقِي. وَنَوَى ثَلاَثًا، فَقَالَتْ: طَلَّقْتُ. وَنَوَتْهُنَّ فَثَلاَثٌ وَإِلاَّ فَوَاحِدَةٌ فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ قَالَ: ثَلاَثًا. فَوَحَّدَتْ أَوْ عَكْسُهُ فَوَاحِدَةٌ.

---

(وَعَلَى الْقَوْلَيْنِ) لە سەر هەردوو فەرموودەکانی ملکایەتی‌و وەکیلایەتی (لَهُ الرُّجُوعُ قَبْلَ تَطْلِيقِهَا) بۆ مێردەکە دروستە پەشیمان ببێتەوە پێش ئەوەی ژنەکە خۆی تەڵاق بدا.

(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر مێردەکە گوتیە ژنەکەی (إِذَا جَاءَ رَمَضَانُ فَطَلِّقِي) هەر کاتێك ڕەمەزان هات خۆت تەڵاق بدە. ئەوە (لَغَا عَلَى التَّمْلِيكِ) لە سەر فەرموودەی‌یەکەمی کردنە ملك بەتاڵەو تەڵاقەکەی ناکەوێ، بەڵام لە سەر فەرموودەی‌دووەمی وەکیلگرتن دروست دەبێ

(وَلَوْ قَالَ) ئەگە مێردەکە گوتیە ژنەکەی (أَبِينِي نَفْسَكِ) خۆت جیا بکەوە (فَقَالَتْ أَبَنْتُ) ژنەکەش یەکسەر گوتی: خۆم جیا کردەوە (وَنَوَيَا) مێردەکە نیەتی دانە دەستی هێناو ژنەکەش نیەتی تەڵاقدانی هێنا، ئەوە (وَقَعَ) تەڵاقەکەی دەکەوێ (وَإِلاَّ فَلاَ) بەڵام ئەگەر هەردووکیان، یان تەنها یەکێکیان نیەتی نەهێنا، تەڵاقەکە ناکەوێ.

(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر مێردەکە گوتی (طَلِّقِي) خۆت تەڵاق بدە (فَقَالَتْ أَبَنْتُ) ژنەکەش گوتی خۆم جیا کردەوە (وَنَوَتْ) نیەتی تەڵاقیشی هێنا (أَوْ أَبِينِي وَنَوَى) یان مێردەکە گوتی: خۆت جیا بکەوەو نیەتی تەڵاقیشی هێنا (فَقَالَتْ طَلَّقْتُ) ژنەکەش گوتی: خۆم تەڵاق دا، ئەوە (وَقَعَ) لە هەر دوو حاڵەتدا تەڵاقەکەی دەکەوێ.

(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر مێردەکە گوتی (طَلِّقِي وَنَوَى ثَلاَثًا) خۆت تەڵاق بدە. نیەتی سێ تەڵاقیشی هێنا (فَقَالَتْ طَلَّقْتُ وَنَوَتْهُنَّ) ژنەکەش گوتی خۆم تەڵاق دا. ئەویش نیەتی سێ تەڵاقی هێنا، ئەوە (فَثَلاَثٌ) سێ تەڵاقی دەکەون (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر هەردووکیان، یان تەنها یەکێکیان نیەتی سێ تەڵاقەکەی نەهێنا، ئەو کاتە (فَوَاحِدَةٌ) یەك تەڵاق دەکەوێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا. (وَلَوْ قَالَ ثَلاَثًا) ئەگەر مێردەکە گوتی: سێ‌بەسێ خۆت تەڵاق بدە (فَوَحَّدَتْ) ژنەکەش بە یەك تەڵاق خۆی تەڵاق دا (أَوْ عَكْسُهُ) یان بە پێچەوانەوە مێردەکە گوتی: یەك تەڵاق. ژنەکەش بە سێ تەڵاق خۆی تەڵاق دا، ئەوە (فَوَاحِدَةٌ) لە هەردوو حاڵەتدا تەنها یەك تەڵاقی دەکەوێ.

کەوابو: ئەگەر مێردەکە بڵێتە پیاوێك: ژنەکەم تەڵاق بدە. ژمارەی تەڵاقەکەشی نەگوت، ئینجا وەکیلەکەش سێ‌بەسێ تەڵاقی‌دا، ئەوە تەنها یەك تەڵاقی دەکەوێ؟ چونکە بۆ زیاتر لە یەك تەڵاق ئیزن نەدراوە، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

(فَصْلٌ) مَرَّ بِلِسَانِ نَائِمٍ طَلَاقٌ لَغَا، وَلَوْ سَبَقَ لِسَانُهُ بِطَلَاقٍ بِلاَ قَصْدٍ لَغَـــا، وَلاَ يُصَـــدَّقُ ظَاهِرًا إِلاَّ بِقَرِينَةٍ، وَلَوْ كَانَ اسْمُهَا طَالِقًا فَقَالَ: يَا طَالِقُ. وَقَصَدَ النِّدَاءَ لَمْ تَطْلُقْ، وَكَذَا إِنْ أَطْلَقَ فِي الأَصَحِّ، وَإِنْ كَانَ اسْمُهَا طَارِقًا أَوْ طَالِبًا فَقَالَ: يَا طَالِقُ،

**﴿ فَصْلٌ: له باسی چەند مەرجێکی تەلاقدەرو گوتەی تەلاقەکە ﴾**

(مَرَّ بِلِسَانِ نَائِمٍ طَلَاقٌ) هەر کاتێك پیاوی‌خەوتوو تەلاقی بە زماندا هات (لَغَا) تەلاقدانەکە بەتاڵە، چونکە نەیویستوە ووشەی تەلاق بۆ تەلاقدان بە کار بێنێ، بۆیێ نووسین لە سەر خەوتوو لادراوە، بە بەڵگەی حەدیسەکەی سێ کەسەکانی‌ڕابردوو.

(وَلَوْ سَبَقَ لِسَانُهُ بِطَلَاقٍ بِلاَ قَصْدٍ) ئەگەر پیاوێك زوبانەکەی پێشبڕکەی لێکرد بە ووشەی تەلاقدان، بێ ئەوەی بیەوێ ووشەکە بۆ تەلاقدان بە کار بێنێ (لَغَا) تەلاقدانەکە بەتاڵە، هەروەها ئەگەر یەکێك ڕستەی تەلاقدانی‌کەسێکی‌تر بگێڕێتەوە، یان مامۆستا لە کاتی دەرس گوتنەوەدا ووشەی تەلاقدان زۆر دووبارە بکاتەوە، ئەوانەش تەلاقیان ناکەوێ، چونکە نەیانویستوە ووشەی تەلاقەکە بۆ تەلاقدان بە کار بێنن، هەروەك لە زۆربەی سەر چاوەکاندا فەرموویانە.

بەلام (وَلاَ يُصَدَّقُ ظَاهِرًا إِلاَّ بِقَرِينَةٍ) ئەوەی دەڵێ زوبانەکەم پێشبڕکەی کردوە، لە ئاشکرایی‌دا باوەڕی پێ‌ناکرێ تەنها بە نیشانەیەك نەبێ: وەك بیەوێ بڵێتە ژنەکەی: ئیزنم دای. یان بیەوێ بڵێ: نیشانم دای. بەلام زمانەکەی پێشبڕکە بکاو بڵێ: تەلاقم دای. ئەوە ئەگەر نیشانەیەك هەبێ باوەڕی پێ‌دەکرێ.

**﴿ ئاگاداری ﴾**: ئەگەر بڵێتە ژنەکەی: تۆ لە من حەڕام بی. ئینجا واتێبگا بەم ووشەیە سێ‌بەسێ تەلاقی کەوتوە، بۆیێ بە ژنەکەی بڵێ: من سێ‌بەسێ تۆم تەلاق داوە. ئەوەش تەلاقی ناکەوێ، هەروەها ئەگەر فتوادەرێك پێی بڵێ: تەلاقت کەوتوە. ئەویش بە هۆی ئەم فتوایە بڵێ: ژنەکەم تەلاق داوە. ئینجا فتوادەرێکی زاناتر پێی بڵێ: تەلاقت نەکەوتووەو فتوایەکەی‌تر هەڵە بووە. ئەوەش تەلاقی ناکەوێ، چونکە ئەوانە هەردووکیان مەبەستیان خەبەردانی تێگەیشتنێکی بە هەڵە بووە، نەك تەلاقدان، هەروەك لە (تحفة)و (الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَلَوْ كَانَ اسْمُهَا طَالِقًا) ئەگەر ژنەکە ناوی تەلاقکەوتوو بوو (فَقَالَ يَا طَالِقُ) مێردەکەش گوتی هۆ تەلاقکەوتوو (وَقَصَدَ النِّدَاءَ) مەبەستیشی بانگکردن بوو، ئەوە (لَمْ تَطْلُقْ) تەلاقی ناکەوێ (وَكَذَا إِنْ أَطْلَقَ) هەروەها ئەگەر هیچیشی مەبەست نەبێ تەلاقی ناکەوێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا (وَإِنْ كَانَ اسْمُهَا طَارِقًا أَوْ طَالِبًا) ئەگەر ژنەکە ناوی (طارق)، یان (طالب) بوو (فَقَالَ يَا طَالِقُ) مێردەکەش گوتی هۆ (طالق)، واتە:

وَقَالَ: أَرَدْتُ النِّدَاءَ فَالْتَفَّ الْحَرْفُ. صُدِّقَ، وَلَوْ خَاطَبَهَا بِطَلَاقٍ هَازِلاً أَوْ لَاعِبًا أَوْ وَهُوَ يَظُنُّهَا أَجْنَبِيَّةً بِأَنْ كَانَتْ فِي ظُلْمَةٍ أَوْ أَنْكَحَهَا لَهُ وَلِيُّهُ أَوْ وَكِيلُهُ وَلَمْ يَعْلَمْ وَقَعَ، وَلَوْ لَفَظَ أَعْجَمِيٌّ بِهِ بِالْعَرَبِيَّةِ وَلَمْ يَعْرِفْ مَعْنَاهُ لَمْ يَقَعْ، وَقِيلَ إِنْ نَوَى مَعْنَاهَا وَقَعَ،

---

تەلاقکەوتوو، بەلام (وَقَالَ أَرَدْتُ النِّدَاءَ فَالْتَفَّ الْحَرْفُ) گوتی مەبەستم بانگکردن بوو و پیتەکە تێکەڵ بە زوبانم بوو، ئەوە (صُدِّقَ) پێی باوەڕ دەکرێ.

## ﴿ گاڵتەکردن بە تەلاق ﴾

(وَلَوْ خَاطَبَهَا بِطَلَاقٍ هَازِلاً أَوْ لَاعِبًا) ئەگەر بە گاڵتە بڵێتە ژنەکەی: تەلاقم دای. یان تەلاقم کەوتبێ. ئەوە تەلاقی دەکەوێ بە (إجماع)ی زانایانی‌ئیسلام، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿ثَلَاثٌ جِدُّهُنَّ جِدٌّ وَهَزْلُهُنَّ جِدٌّ: اَلطَّلَاقُ وَالنِّكَاحُ والرَّجْعَةُ﴾ رواه أبوداود والترمذي وصححه الحاكم، سێ شت هەنە ڕاستییان هەر ڕاستیە، گاڵتە پێکردنیشیان هەر ڕاستیە: تەلاقدان‌و مارەبڕین‌و تەلاق چاککردنەوە.

(أَوْ) یان مێردەکە بە ژنەکەی‌خۆی گوت: تەلاقت کەوتبێ. بەلام نەیزانی ژنی خۆیەتی، بەلکو (وَهُوَ يَظُنُّهَا أَجْنَبِيَّةً) وای‌تێدەگەیشت ژنەکە بێگانەیە (بِأَنْ كَانَتْ فِي ظُلْمَةٍ) وەك ژنەکە لە تاریکاییدا بێ (أَوْ أَنْكَحَهَا لَهُ وَلِيُّهُ أَوْ وَكِيلُهُ وَلَمْ يَعْلَمْ) یان سەرپەرشتکارەکەی، یان وەکیلەکەی ئەو ژنەی بۆ مارە بڕیبوو و ئەویش نەیزانیبو لێی مارە کراوە، یان لە بیری چوبو کە ژنی هەیە، ئینجا گوتی: تەلاقی ژنەکەم کەوتبێ. ئەوە (وَقَعَ) لە هەردوو مەسەلەدا لە ئاشکراییدا تەلاقی دەکەوێ، بەلام لە پەنهانیی نێوان خۆی‌و خوادا ناکەوێ، هەروەك لە (تحفة)و (مغنی)دا فەرموویانە.

﴿ئاگاداری﴾: ئەگەر بێ‌زانینی مێردەکە ژنەکەی بچێتە شارێك، ئینجا بە مێردەکەی بڵێن: ژنەکەت لەم شارەیە. ئەویش نازانێ ژنەکەی هاتۆتە شارەکە، بۆیێ دەڵێ: ئەگەر من هیچ ژنێکم لەم شارەدا بێ تەلاقی کەوتبێ. ئەوە-بە فەرموودەی بەهێزتر- تەلاقی ناکەوێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلَوْ لَفَظَ أَعْجَمِيٌّ بِهِ بِالْعَرَبِيَّةِ) بۆ وێنە: ئەگەر عەرەبزمان نەبێ‌و ووشەی تەلاقدان بە عەرەبی بڵێ‌و (وَلَمْ يَعْرِفْ مَعْنَاهُ) واتەکەشی نەزانێ: وەك کوردزمانێك بە زمانێکی‌تری جگە لە کوردی ووشەی تەلاقدان بڵێ‌و واتەکەشی نەزانێ، ئەوە (لَمْ يَقَعْ) تەلاقی ناکەوێ، هەروەك ئەگەر ووشەیەکی کافربوون بڵێ‌و واتەی نەزانێ کافر نابێ، واتە: بەلام ئەگەر واتەکەی بزانێ، تەلاقی دەکەوێ.

(وَقِيلَ إِنْ نَوَى مَعْنَاهَا) لە فەرموودەیەکی بێ‌هێزدا: ئەگەر نیەتی واتەکەی لای ئەوخاوەنزمانانەی هەبێ (وَقَعَ) تەلاقی دەکەوێ.

وَلاَ يَقَعُ طَلاَقُ مُكْرَه، فَإِنْ ظَهَرَتْ قَرِينَةُ اخْتِيَارٍ بِأَنْ أُكْرِهَ عَلَى ثَلاَثٍ فَوَحَّدَ أَوْ صَرِيحٍ أَوْ تَعْلِيقٍ فَكَنَّى أَوْ نَجَزَ أَوْ عَلَى طَلَّقْتُ فَسَرَّحَ أَوْ بِالْعُكُوسِ وَقَعَ،

## ﴿ تەلاقدانی تورەبوو و زۆرلێکراو ﴾

**بزانه**: زانایانی ئیسلام هیچ جیاوازییکیان لەوەدا نیە: کە تەلاقی پیاوی تورەبوو دەکەوێ، چونکە کۆمەڵێك (صَحَابَة) ئەو فتوایەیان داوەو هیچ (صحابة)یەکیتریش رەخنەی لێنەگرتونو بووەتە (إجماع)ێکی بێدەنگی، هەروەك لە (تحفة)و (الشرواني)دا فەرموویانە.

بەلام (وَلاَ يَقَعُ طَلاَقُ مُكْرَهٍ) تەلاقی پیاوی زۆرلێکراوی بە ناهەق ناکەوێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لاَطَلاَقَ وَلاَعَتَاقَ فِـي إِغْـلاَقٍ﴾حديث صحيح رواه أبوداود، تەلاقدانو ئازادکردن بە زۆرلێکردن نابێ.

بەلام ئەگەر زۆرلێکردنەکە بە هەق بێ: وەك بە باوککوژەکەی خۆی بلێ: ژنەکەت تەلاق بدە، ئەگەر نا: لە تۆڵەی باوکم دەتکوژم. ئەوە نابێتە زۆرلێکردنی بە ناهەق، واتە: ئەگەر ژنەکەی تەلاق بدا تەلاقی دەکەوێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

ئینجا بزانە: زۆرلێکردنی شەرعیش وەکو زۆرلێکردنی هەستکراوە، واتە: ئەگەر بلێ: هەرسێك تەلاقم بکەوێ ئەمشەو جیماع لەگەڵ ژنەکەم دەکەم. یان بلێ: لەم مانگەدا قەرزەکەت دەدەمەوە. ئینجا کە تەماشای کرد: ژنەکەی حەیزدار بوو، یان بە بێویستی خۆی خەوی بە سەرداهاتو تا بەیانی هەشیار نەبۆوە، یان کەسێکی وەها لە لای بوو شەرمی لێدەکردو بۆی نەگونجا جیماعەکە بکا، یان لە تەواوی مانگەکەدا هیچ ملكو ماڵی نەما قەرزەکەی لێبداتەوە، ئەوە لەو حاڵەتانەدا تەلاقی ناکەوێ، هەروەك لە (تحفە)و (نهایە)دا روون کراوەتەوە.

(فَإِنْ ظَهَرَتْ قَرِينَةُ اخْتِيَارٍ) جا ئەگەر زۆرلێکراوەکە نیشانەی سەرپشکیی بۆ تەلاقدانەکە لێدەرکەوت: (بِأَنْ أُكْرِهَ عَلَى ثَلاَثٍ فَوَحَّدَ) وەك زۆری لێکرابێ سێبەسێ تەلاق بدا، بەلام ئەو بە یەك تەلاق تەلاقی بدا (أَوْ صَرِيحٍ أَوْ تَعْلِيقٍ) یان زۆری لێکرابێ بە ووشەیەکی ئاشکرا، یان بە هەڵواسراوی تەلاقی بدا، بەلام (فَكَنَّى أَوْ نَجَّزَ) بە ووشەیەکی نائاشکرا نیەتی تەلاقدانی هێنا، یان بێهەڵواسین دەسبەجێ تەلاقیدا (أَوْ عَلَى طَلَّقْتُ فَسَرَّحَ) یان زۆری لێکرابێ بلێ: تەلاقم دا، بەلام ئەو بلێ: بەرم هەڵدا (أَوْ بِالْعُكُوسِ) یان بە پێچەوانەکانی ئەوانە: وەك زۆری لێکرابێ بۆ یەك تەلاق، یان بۆ تەنها تەلاقدان، بەلام ئەو سێبەسێ تەلاق بدا، یان زۆری لێکرابێ دەسبەجێ بێهەڵواسین، بەلام ئەو بە هەڵواسین تەلاقی بدا...هتد، یان زۆری لێکرابێ لە هەردوو ژنەکانی ژنێکیان تەلاق بدا، ئینجا ئەو بەخۆی یەکێکیان دیاری بکاو تەلاقی بدا، ئەوە لەو هەموو حاڵەتانەدا (وَقَعَ) تەلاقی دەکەوێ، چونکە سەرپشکی لە تەلاقدانەکەیدا دەردەکەوێ، بەلام ئەگەر لە مەسەلەکەی

وَشَرْطُ الإِكْرَاه: قُدْرَةُ الْمُكْرِه عَلَى تَحْقِيقِ مَا هَدَّدَ بِه بِوِلاَيَةٍ أَوْ تَغَلُّبٍ، وَعَجْزُالْمُكْـرَه عَنْ دَفْعِه بِهَرَبٍ وَغَيْرِه، وَظَنُّه أَنَّهُ إِنْ امْتَنَعَ حَقَّقَهُ، وَيَحْصُلُ بِتَخْوِيفٍ بِضَرْبٍ شَدِيدٍ أَوْ حَبْسٍ أَوْ إِتْلاَفِ مَالٍ وَنَحْوِهَا،

---

ووشەی نائاشکرادا نیەتی تەلاقدانی نەبێ، تەلاقەکەی ناکەوێ، هەروەك لە (إبن قاسم)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَشَرْطُ الإِكْرَاهِ) مەرجی هاتنەجێی زۆرلێکردن ئەوەیە: (قُدْرَةُ الْمُكْرِهِ عَلَى تَحْقِيقِ مَا هَدَّدَ بِهِ) زۆرلێکەرەکە توانای هەبێ: ئەو هەڕەشەیەی کردویەتی زوو ئەنجامی بدا (بِوِلاَيَةٍ أَوْ تَغَلُّبٍ) بە هۆی کاریەدستی، یان خۆسەپاندن (وَعَجْزُ الْمُكْرَهِ عَنْ دَفْعِهِ بِهَرَبٍ وَغَيْرِهِ) زۆرلێکراوەکەش توانای نەبێ بەرگری لە خۆی بکا: بە هەڵاتن، یان بە ڕێگایەکیتر: وەك پاڕانەوە، یان شکایەت کردن، هەم (وَظَنُّه أَنَّهُ إِنْ امْتَنَعَ) زۆرلێکراوەکەش وا تێبگا: ئەگەر کارە زۆرپێکراوەکە جێبەجێ نەکا (حَقَّقَهُ) زۆرلێکەرەکە هەر ئەو دەم هەڕەشەکەی ئەنجام دەدا.

بەڵام ئەگەر بڵێ: ئێستا ژنەکەت تەلاق بدە، ئەگەر نا: سبەینێ دەتکوژم. ئەوە نابێتە زۆرلێکردنو تەلاقی دەکەوێ، چونکە بێگومان نازاندرێ تا سبەینێ دەمێنن، یان نا، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر دز پێیان گوت: وازت لێناهێنین تا سوێند بە تەلاق دەخۆی کە لە لای هیچ کەسێك باسمان نەکەی. ئەوەش دەبێتەزۆرلێکردنو ئەگەر باسیشیان بکا تەلاقی ناکەوێ، بەڵام ئەگەر بێداواکاری دزەکان—لە خۆیەوە— سوێند بە تەلاق بخوا، ئەو کاتە ئەگەر باسیان بکا تەلاقی دەکەوێ، هەروەك لە (نهاية) دا فەرموویەتی.

هەروەها ئەگەر ستەمکارێك زۆری لێبکا تاکو فلانکەسی نیشان بدا، یان ماڵی فلانکەسی نیشان بدا، زۆرلێکراوەکەش گوتی: نازانم لە کوێیە. زۆردارەکەش گوتی وازت لێناهێنم تا سوێند بە تەلاق دەخۆی کە نازانی. ئەویش بە درۆ سوێندی بە تەلاق خوارد: شوێنەکەی نازانێ. ئەوە تەلاقی دەکەوێ؟ چونکە لە ڕاستیدا کراوەتە سەرپشك لە نێوان نیشاندانو سوێندخواردن، هەروەك لە (مغني)دا فەرموویەتی.

(وَيَحْصُلُ بِتَخْوِيفٍ) زۆرلێکردن دێتەجێ بە ترساندنێك: وەك هەڕەشەی لێبکا: (بِضَرْبٍ شَدِيدٍ) بە لێدانێکی توند (أَوْ حَبْسٍ) یان بە بەندکردن (أَوْ إِتْلاَفِ مَالٍ) یان بە لەناوبردنی ماڵێك (وَنَحْوِهَا) شتیوەها: وەك سوکایەتی پێکردن لە بەر چاویخەڵك، یان زۆرلێکەرەکە بڵێ: ژنەکەت تەلاق بدە، ئەگەر نا: ئێستا بێناموسیی لەگەڵ دەکەم، یان ئێستا ئەم خزمەت دەکوژم. یان ژنەکە بڵێتە مێردەکەی: تەلاقم بدە، ئەگەرنا: ژەهرت دەرخوارد دەدەم. هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)و حاشیەکانیاندا ڕوون کراوەتەوە.

وَقِيلَ يُشْتَرَطُ قَتْلٌ، وَقِيلَ قَتْلٌ أَوْ قَطْعٌ أَوْ ضَرْبٌ مَخُوفٌ، وَلاَ تُشْتَرَطُ التَّوْرِيَةُ بِأَنْ يَنْوِيَ غَيْرَهَا، وَقِيلَ إِنْ تَرَكَهَا بِلاَ عُذْرٍ وَقَعَ. وَمَنْ أَثِمَ بِمُزِيلِ عَقْلِهِ مِنْ شَرَابٍ أَوْ دَوَاءٍ نَفَذَ طَلاَقُهُ وَتَصَرُّفُهُ لَهُ وَعَلَيْهِ قَوْلاً وَفِعْلاً عَلَى الْمَذْهَبِ، وَفِي قَوْلٍ لاَ، وَقِيلَ عَلَيْهِ، وَلَوْ قَالَ: رُبُعُكِ أَوْ بَعْضُكِ أَوْ جُزْؤُكِ أَوْ كَبِدُكِ أَوْ شَعْرُكِ أَوْ ظُفْرُكِ طَالِقٌ،

---

(وَقِيلَ يُشْتَرَطُ قَتْلٌ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا بە مەرج دادەنرێ: هەڕەشەکە بە کوشتن بێ (وَقِيلَ قَتْلٌ أَوْ قَطْعٌ أَوْ ضَرْبٌ مَخُوفٌ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا مەرجە: هەڕەشەکە بە کوشتن، یان بە لێکردنەوەی ئەندامێك، یان بە لێدانێکی بە ترس بێ.

(وَلاَ تُشْتَرَطُ التَّوْرِيَةُ) بە مەرج دانانرێ زۆرلێکراوەکە (تَوْرِيَة) بکا، واتە: مەبەستێکی نائاشکرا لە دڵی بگرێ: (بِأَنْ يَنْوِيَ غَيْرَهَا) وەك نیەتی تەڵاقدانی ئافرەتێکیتری جگە لە ژنەکەی خۆی بێ، کە هەردووکیان ناویان (زێنەبە)، یان لە دوای تەڵاقدانەکە بە نهێنی بڵێ: إن شاء الله. (وَقِيلَ إِنْ تَرَكَهَا بِلاَ عُذْرٍ وَقَعَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: ئەگەر بە بێ عوزر (تَوْرِيَة) نەکا تەڵاقی دەکەوێ.

## ﴿ تەڵاقی سەرخۆش ﴾

(وَمَنْ أَثِمَ بِمُزِيلِ عَقْلِهِ) هەر کەسێك گوناهبار بوبێ بە هۆی بەکارهێنانی شتێك کە هۆشەکەی لاببا (مِنْ شَرَابٍ أَوْ دَوَاءٍ) لابەرەکە: شەڕاب بێ، یان دەرمان بێ، واتە: بە قەسدیو بە خۆشیخۆی شەڕابی خواردبێتەوەو سەر خۆش بوبێ، یان بە بێهیچ عوزرێك دەرمانێکی وەهای بەکار هێنابێ کە هۆشی لاببا، ئەوە (نَفَذَ طَلاَقُهُ) تەڵاقدانەکەی جێبەجێ دەبێ، هەم (وَتَصَرُّفُهُ لَهُ وَعَلَيْهِ) دەستکاریەکەشی جێبەجێ دەبێ: جا لە سودی خۆی بێ، یان لە دژی خۆی بێ (قَوْلاً وَفِعْلاً) گوفتار بێ، یان کردار بێ: وەکو کافربوونو کوشتنو کڕینو فرۆشتنو بەخیشینو...هتد (عَلَى الْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب.

بەڵام ئەگەر بە زۆرلێکردن شەڕابیان پێخواردەوە، یان نەیدەزانی شلەکە شەڕابەو خواردیەوە، یان-جگە لە شەڕاب- لە بەر پێویستی دەرمانێکی بێهۆشکەری بە کار هێنا، ئەوە لەوحاڵەتانەدا تەڵاقی ناکەوێو دەستکاریەکەشی جێبەجێ نابێ، بەڵام لە حاڵەتی نەزانیندا ئەگەر سوێند نەخوا باوەڕی پێناکرێ، هەروەك لە (تحفة)و (مغنی)دا فەرموویانە.

(وَفِي قَوْلٍ لاَ) لە فەرموودەیەکدا: هیچێك لەوانەیڕابردوو جێبەجێ نابێ (وَقِيلَ عَلَيْهِ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: هەر دەستکاریەکی لە دژی خۆی بێ-وەکو تەڵاقدان- جێبەجێ دەبێ.

(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر مێردەکە گوتی: (رُبُعُكِ أَوْ بَعْضُكِ أَوْ جُزْؤُكِ أَوْ كَبِدُكِ أَوْ شَعْرُكِ أَوْ ظُفْرُكِ طَالِقٌ) چوارێکت، یان بەشێکت، یان پارچەیەکت، یان جگەرت، یا مووەکەت، یان

وَقَعَ، وَكَذَا دَمُك عَلَى الْمَذْهَب، لاَ فَضْلَةٌ كَرِيقٍ وَعَرَقٍ وَكَذَا مَنِيٌّ وَلَبَنٌ فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ قَالَ لِمَقْطُوعَةِ يَمِينٍ: يَمِينُك طَالِقٌ. لَمْ يَقَعْ عَلَى الْمَذْهَب، وَلَوْ قَالَ: أَنَا مِنْك طَالِقٌ. وَنَوَى تَطْلِيقَهَا طَلَقَتْ، وَإِنْ لَمْ يَنْوِ طَلاَقًا فَلاَ، وَكَذَا إنْ لَمْ يَنْوِ إضَافَتَهُ إلَيْهَا فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ قَالَ أَنَا مِنْك بَائِنٌ اُشْتُرِطَ نِيَّةُ الطَّلاَق، وَفِي الإِضَافَةِ الْوَجْهَان، وَلَوْ قَالَ أَسْتَبْرِئُ رَحِمِي مِنْك فَلَغْوٌ، وَقِيلَ إنْ نَوَى طَلاَقَهَا وَقَعَ.

(فَصْلٌ) خِطَابُ الأَجْنَبِيَّةِ بِطَلاَقٍ وَتَعْلِيقُهُ بِنِكَاحٍ وَغَيْرِه

---

نینۆکەکەت تەلاقکەوتوو بێ، ئەوە (وَقَعَ) تەلاقی دەکەوێ، چونکە لەو بەشەوە تەلاقەکە پێدا دەڕواتە لای هەموو لاشەکەی (وَكَذَا دَمُكِ عَلَى الْمَذْهَبِ) هەروەها: خوێنەکەت، یان گیانەکەت تەلاقکەوتوو بێ، تەلاقی دەکەوێ، لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب.

(لاَ فَضْلَةٌ كَرِيقٍ وَعَرَقٍ) نەك ئەو زێدەییانەی جیا دەبنەوە: وەك تفو ئارەقەو (وَكَذَا مَنِيٌّ وَلَبَنٌ فِي الأَصَحِّ) هەروەها (مني)و شیر، لە فەرموودەی ڕاستتردا، واتە: بەتەلاقدانی ئەوانە تەلاق ناکەوێ (وَلَوْ قَالَ لِمَقْطُوعَةِ يَمِينٍ) ئەگەر ژنەکەی دەستی ڕاستەی بڕابوێوە و مێردەکەش گوتی (يَمِينُك طَالِقٌ) دەستی ڕاستەت تەلاقکەوتوو بێ، ئەوە (لَمْ يَقَعْ عَلَى الْمَذْهَبِ) تەلاقی ناکەوێ، لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب، چونکە ئەندامەکە نەماوە، بۆیێ تەلاقەکە پێدا ناڕواتە لای تەواوی لاشەکەی.

(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر مێردەکە گوتی (أَنَا مِنْكِ طَالِقٌ وَنَوَى تَطْلِيقَهَا) من لە تۆ تەلاقکەوتووم. نیەتیشی تەلاقدان بی (طَلَقَتْ) تەلاقی دەکەوێ، بەلام (وَإِنْ لَمْ يَنْوِ طَلاَقًا فَلاَ) ئەگەر نیەتی تەلاقدان نەبێ ناکەوێ (وَكَذَا) هەروەها تەلاقی ناکەوێ (إنْ لَمْ يَنْوِ إضَافَتَهُ إلَيْهَا) ئەگەر نیەتی تەلاقدانی ژنەکەی نەبێ، بەلکو نیەتی تەلاقدانیخۆی بێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا (وَلَوْ قَالَ) ئەگەر گوتی (أَنَا مِنْكِ بَائِنٌ) من لە تۆ جیابوویەوەم. ئەو کاتەش (اُشْتُرِطَ نِيَّةُ الطَّلاَقِ) بە مەرج داندراوە: نیەتی تەلاقدانی هەبێ (وَفِي الإِضَافَةِ الْوَجْهَانِ) لە بارەی نیەتی تەلاقدانی ژنەکەش دوو فەرموودەکەیڕابردوو هەنە، بە فەرموودەکەی ڕاستتر مەرجە: نیەتی ژنەکەی هەبێ (وَلَوْ قَالَ) ئەگەر گوتی (أَسْتَبْرِئُ رَحِمِي مِنْكِ) من منداڵدانەی خۆی لە تۆ دڵنیا دەکەم (فَلَغْوٌ) ئەوە بەتاڵەو نابێتە تەلاق (وَقِيلَ إنْ نَوَى طَلاَقَهَا) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: ئەگەر نیەتی تەلاقی هەبێ (وَقَعَ) تەلاقی دەکەوێ.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی دەستەڵاتی مێرد بە سەر شوێنی تەلاقدا: کە ژنەکەیە ﴾

(خِطَابُ الأَجْنَبِيَّةِ بِطَلاَقٍ) تەلاقدانی ژنێکیبێگانە ڕوویەڕوو، وەك بە ژنە بێگانەکە بڵێ: تەلاقت کەوتبێ. یان تەلاقم دای. هەم (وَتَعْلِيقُهُ بِنِكَاحٍ وَغَيْرِهِ) هەڵواسینی تەلاقی ژنە بێگانەکە بە مارەکردنو شتیتر: وەك ئەگەر ئەم ژنەم مارە کرد تەلاقی کەوتبێ. یان هەر کاتێك ژنم مارە کرد تەلاقی کەوتبێ. یان هەر کاتێك بچیتە ژوورەکە تەلاقت کەوتبێ. ئینجا

لَغْوٌ، وَالأَصَحُّ صِحَّةُ تَعْلِيقِ الْعَبْدِ ثَالِثَةً كَقَوْلِهِ: إِنْ عَتَقْتُ أَوْ إِنْ دَخَلْتِ فَأَنْتِ طَالِقٌ ثَلاَثًا، فَيَقَعْنَ إِذَا عَتَقَ أَوْ دَخَلَتْ بَعْدَ عِتْقِهِ، وَيَلْحَقُ رَجْعِيَّةً لاَ مُخْتَلِعَةً، وَلَوْ عَلَّقَهُ بِدُخُولٍ فَبَانَتْ ثُمَّ نَكَحَهَا ثُمَّ دَخَلَتْ لَمْ يَقَعْ إِنْ دَخَلَتْ فِي الْبَيْنُونَةِ وَكَذَا إِنْ لَمْ تَدْخُلْ فِي الأَظْهَرِ، وَفِي ثَالِثٍ يَقَعُ إِنْ بَانَتْ بِدُونِ ثَلاَثٍ،

---

له خۆی ماره بکا، ئەوه (لَغْوٌ) گشتی بەتاڵەو ئەگەر مارەشی بکا، یان لە دوای مارەکردن بڕواتە ژوورەکەش تەلاقی ناکەوێ، چونکە لە کاتیتەلاقدان پیاوەکە خاوەنی شوێنی تەلاقەکە نیە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لاَطَلاَقَ لَهُ فِيمَا لاَيَمْلِكُ﴾ رواه أبوداود والترمذي وصححه، پیاو هیچ تەلاقێکی نیە- واتە: تەلاقی ناکەوێ- لەو ژنەی کە ژنیخۆی نیە.

(وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر: (صِحَّةُ تَعْلِيقِ الْعَبْدِ ثَالِثَةً) دروستە کۆیلە تەلاقەکەی سێیەمی هەڵبواسێ (كَقَوْلِهِ) وەك بڵێ: (إِنْ عَتَقْتُ) ئەگەر ئازاد ببم سێ تەلاقت بکەوێ (أَوْ إِنْ دَخَلْتِ فَأَنْتِ طَالِقٌ ثَلاَثًا) یان بڵێ: ئەگەر بچیتە ناو خانووەکە سێ تەلاقت کەوتبێ (فَيَقَعْنَ) سێ تەلاقەکەی دەکەون (إِذَا عَتَقَ) هەرکاتێك ئازاد بوو (أَوْ دَخَلَتْ بَعْدَ عِتْقِهِ) یان لە دوای ئازادبوون ژنەکە چووە ناو خانووەکە.

## ﴿ ڕزگاربوون بە خولعکردن لە کەوتنی تەلاقی سێبەسێ ﴾

(وَيَلْحَقُ رَجْعِيَّةً) تەلاق دەگاتە تەلاقدراوی (رَجْعِية)، واتە: ئەو ژنەی لە دوای جیماع لەگەڵکردن بە خۆڕایی بە تەلاقێك، یان بە دوو تەلاق تەلاقدراوە-تا (عِدَّة)ی تەواو دەبێ- ئەگەر جارێکیتریش تەلاق بدرێ تەلاقیتریشی دەکەوێ.

(لاَ مُخْتَلِعَةً) بەڵام تەلاق ناگاتە ئەو ژنەی بە (بائن)ی تەلاقی کەوتوە: وەك خولعی لەگەڵ کرابێ، یان (عِدَّة)ی تەواو بوبێ، یان پێش جیماع لەگەڵکردن تەلاق درابێ، یان مارەبڕینەکەی هەڵوەشاندرابێتەوە.

کەوابو: (وَلَوْ عَلَّقَهُ بِدُخُولٍ) ئەگەر هەرسێك تەلاقەکەی هەڵواسی بە چوونە ناو خانوو، وەك بە ژنەکەی بڵێ: ئەگەر بچیە ناو خانووەکە سێ تەلاقت کەوتبێ (فَبَانَتْ) جا لە دوای هەڵواسینەکە ژنەکە بووە (بائن): بە خولعکردن، یان بە سێ هۆیەکانیتریڕابردوو (ثُمَّ نَكَحَهَا) ئینجا دووبارە مێردەکە لە خۆی مارە کردەوە (ثُمَّ دَخَلَتْ) ئینجا لە دوای مارەکردنەوەکەیدووەم ژنەکە چووە ناو خانووەکە، ئەوە (لَمْ يَقَعْ) تەلاقی ناکەوێ (إِنْ دَخَلَتْ فِي الْبَيْنُونَةِ) ئەگەر پێشداش لە حاڵەتی (بائن)یدا چووبێتە ناو خانووەکە.

(وَكَذَا إِنْ لَمْ تَدْخُلْ) هەروەها تەلاقی ناکەوێ ئەگەر لە حاڵەتی(بائن)یدا نەشچوبێتە ناو خانووەکە-بەڵکو تەنها لە دوای مارەبڕینەکەیدووەم چوبێتە ناو خانووەکە- (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا (وَفِي ثَالِثٍ) لە فەرموودەیەکیسێیەمدا: (يَقَعُ إِنْ بَانَتْ بِدُونِ ثَلاَثٍ) تەلاقی دەکەوێ، ئەگەر بە کەمتر لە سێ تەلاق بوبێتە (بائن)، بەڵام بێهێزە.

وَلَوْ طَلَّقَ دُونَ ثَلاَث وَرَاجَعَ أَوْ جَدَّدَ وَلَوْ بَعْدَ زَوْجٍ عَادَتْ بِبَقِيَّةِ الثَّلاَث، وَإِنْ ثَلَّثَ عَادَتْ بِثَلاَثٍ، وَلِلْعَبْدِ طَلْقَتَانِ فَقَطْ، وَلِلْحُرِّ ثَلاَثٌ، وَيَقَعُ فِي مَرَضِ مَوْتِهِ، وَيَتَوَارَثَانِ فِي عِدَّةِ رَجْعِيٍّ

---

﴿ ئاگاداری ﴾: سوێندخواردنی به تەڵاق هەمان بڕیاری هەڵواسینی بۆ دەدرێ، وەك بڵێ: هەرسێك تەڵاقم کەوتبێ نابی بچیتە ماڵی باوکت. یان دەبی لەم مانگەدا ئەم کارە بکەی. یان بڵێ: ئەگەر جیماعت لەگەڵ بکەم سێ‌بەسێ تەڵاقت کەوتبێ. واتە: ئەوانەش بە خولعکردن لە کەوتنی سێ تەڵاقەکە ڕزگاری دەبێ، لە سەر فەرموودەی بەهێزتر، هەروەك لە (مغنی)و (الشروانی)دا فەرموویانە، لە سەرەتای (خُلْع)شدا ڕوونمان کردەوە.

(وَلَوْ طَلَّقَ دُونَ ثَلاَث) ئەگەر ژنەکەی سێ‌بەسێ تەڵاق نەدا، بەڵکو بە یەك ، یان بە دوو تەڵاقی‌دا، ئینجا (وَرَاجَعَ) ژنەکەی گەڕاندەوە (أَوْ جَدَّدَ) یان بە مارەبڕینێکی نوێ مارەی کردەوە (وَلَوْ بَعْدَ زَوْجٍ) هەرچەند لە دوای مێردکردنێکی‌تریش مارەی بکاتەوە (عَادَتْ بِبَقِيَّةِ الثَّلاَث) هەر بە پاشماوەکەی سێ تەڵاقەکەی دێتەوە لای مێردەکەی، واتە: ئەگەر دوو تەڵاقی مابن بە دوو تەڵاق دێتەوە ژێر مارەی مێردەکەی، ئەگەر یەکێکی مابێ بە یەك تەڵاق دێتەوە، بە (إجماع)ی زانایانی‌ئیسلام ئەگەر مێردێکی‌تری نەکردبێ، هەم بە فەرموودەی گەورەکانی(صحابة) ئەگەر مێردێکی‌تری کردبێ.

بەڵام (وَإِنْ ثَلَّثَ) ئەگەر سێ‌بەسێ تەڵاقی بدا، ئینجا– وەك مارە بەجاش– مێردێکی‌تر بکاو ئەم مێردەش جیماعی لەگەڵ بکاو تەڵاقی بدا، ئینجا مێردە کۆنەکە سەرلەنوێ مارەی بکاتەوە، ئەو کاتە (عَادَتْ بِثَلاَث) بە هەرسێك تەڵاق دێتەوە لای، بە (إجماع)ی زانایانی ئیسلام.

(وَلِلْعَبْدِ طَلْقَتَانِ فَقَطْ) مێردی‌کۆیلە تەنها خاوەنی دوو تەڵاقە، هەرچەند ژنەکەشی ئازاد بێ (وَلِلْحُرِّ ثَلاَثٌ) مێردی‌ئازادیش خاوەنی سێ تەڵاقە، هەرچەند ژنەکەشی جاریە بێ ﴿عن أنس وأبي رُزَين رضي الله عنهما: سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنْ قَوْلِهِ تَعَالَى: (اَلطَّلاَقُ مَرَّتَانِ). فَأَيْنَ الثَّالِثَةُ؟ قالَ: (إِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ)﴾ رواه أحمد وأبوداود وصححه ابن القطان، پرسیار لە پێغەمبەرﷺ کرا: کە خوای گەورە دەفەرموێ: (ئەو تەڵاقدانەی گەڕاندنەوەی بە دوادا دەبێ دوو جارە). ئەدی بڕیاری سێیەمەکە لە کوێیە؟ فەرمووی: ئەوەیە کە دەفەرموێ: (یان بە یاسای شەرع ژنەکە ڕابگرە، یان بە جوانی بەرێ‌بەڵدە).

(وَيَقَعُ فِي مَرَضِ مَوْتِهِ) مێردەکە لە نەخۆشی‌مردنیدا تەڵاقی دەکەوێ، هەرچەند تەڵاقدانەکەی سێ‌بەسێش بێ.

(وَيَتَوَارَثَانِ) مێردو ژنی تەڵاقدراو مێرات لە یەکتری دەگرن: (فِي عِدَّةِ رَجْعِيٍّ) لە (عِدَّة)ی تەڵاقی(رَجْعِي)دا: کە لە دوای جیماع لەگەڵکردن بە خۆڕایی بە تەڵاقێك، یان بە دوو تەڵاق

لاَ بَـــــــائِنٍ، وَفِي الْقَـــــــدِيمِ تَرِثُــــــهُ.
(فَصْلٌ) قَالَ طَلَّقْتُكِ أَوْ أَنْتِ طَالِقٌ وَنَوَى عَدَدًا وَقَعَ، وَكَذَاالْكِنَايَةُ، وَلَوْ قَالَ: أَنْتِ طَالِقٌ وَاحِدَةً، وَنَوَى عَدَدًا فَوَاحِدَةٌ، وَقِيلَ الْمَنْوِيُّ، قُلْتُ:

---

درابێو (عِدَّة)ی تەواو نەبوبێ: جا ژنەکە، یان مێردەکە بمرێ، ئەوە میرات لە یەکتری دەگرن، بە (إجماع)ی زانایانیئیسلام (لاَ بَائِنٍ) بەڵام لە (عِدَّة)ی تەڵاقی (بائن)دا میرات لە یەکتری ناگرن (وَفِي الْقَدِيمِ تَرِثُـهُ) لە فەرموودەیکۆنی ئیمامی(الشافعي)و لە هەرسێك مەزهەبەکەیتردا: لە (عِدَّة)ی (بائن)دا ژنەکە میرات لە مێردەکەی دەگرێ، چونکە ئیمامی (عثمان) ئەوها بڕیاری داوە، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی نیەتی ژمارەی تەڵاق ﴾

(قَـالَ) مێردەکە گوتیە ژنەکەیخۆی: (طَلَّقْتُـكِ) تـۆم تـەڵاق دا (أَوْ أَنْـتِ طَـالِقٌ) یان تـۆ تەڵاقەکەوتووی. یان بڵێ: ژنی خۆم تەڵاق دا. یان تەڵاقم کەوتبێ (وَنَوَى عَدَدًا) لەگەڵ ئەو تەڵاقدانەش نیەتی ژمارەیەکی هەبو: وەك دوو، یان سێ، ئەوە (وَقَعَ) نیەتی چەند تەڵاقی هەبوە، ئەوەندەی دەکەوێ، هەرچەند ژمارەکەش بە زوبان نەڵێ، یان جیماعی لەگەڵ ژنەکەش نەکردبێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرمویانە.

بەڵام ئەگەر نیەتی هیچ ژمارەیەکی لە دڵدا نەبێو بە زوبانیش هیچ ژمارەیەك نەڵێ، ئەو کاتە بە خودیتەڵاقدانەکە یەك تەڵاقی دەکەوێ، هەروەك لە (مغني)دا فەرموویەتی.

(وَكَذَاالْكِنَايَةُ) هەروەها ووشەی ناڕاشکرای تـەڵاقیش هـەمان بڕیـاری ووشـەی ئاشکرای بۆ دەدرێ ﴿عن رُكانةﷺ: أَنَّهُ طَلَّقَ إِمْرَأَتَهُ اَلْبَتَّةَ، فَحَلَّفَهُ النَّبِيُّﷺ: وَاللهِ مَا أَرَدْتُ إِلاَّ وَاحِــدَةً، فَرَدَّهَا عَلَيْهِ﴾ حديث صحيح رواه أبوداود، (رُكانة) ژنەکەی خـۆی بـە بڕاوەیـی=بـە یـەکجاری تەڵاق دا، جا پێغەبەرﷺ سوێندیدا: کە مەبەستم تەنها یەك تەڵاق بووە. ئینجا ژنەکەی بۆ گەڕاندەوە. واتە: ئەگەر بە زوبان سێ تەڵاقی گوتبان، یان لـە دڵدا سێ تـەڵاقی مەبەست بووانە، هەرسێك تەڵاقی دەکەوتن، ئەگەر نا: سوێنددانەکەی بێسود بوو.

کەوابو: ئەگەر بە هەردوو ژنەکانی بڵێ: هەردووکتان سێ تەڵاقتان کـەوتبێ، ئـەوە ئەگـەر مەبەستی ئەوە بێ: هەر یەکەیان سێ تـەڵاقی بکـەوێ، ئـەوە هەریەکـەو سـێ تەڵاقەکـەی دەکەوێ، بەڵام ئەگەر هیچ مەبەستێکی نەبێ، ئەو کاتە هەر ژنێكو دوو تـەڵاقی دەکـەون، هەروەك لە (تحفة)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَلَوْ قَالَ: أَنْتِ طَالِقٌ وَاحِدَةً) ئەگەر گوتی: تۆ تەڵاقکەوتووی یەك تەڵاق (وَنَـوَى عَـدَدًا) لـە دڵدا نیەتی دوو، یان سێ تەڵاقی هێنا، ئەوە (فَوَاحِدَةٌ) یەك تەڵاقی دەکەوێ، بەڵام (وَقِيـلَ الْمَنْوِيُّ) لە فەرموودەیەکدا: نیەتی چـەند تـەڵاقی هـەبێ ئەوەنـدە دەکـەوێ، لـە زۆربـەی سەرچاوەکاندا ئەم فەرموودەیە پشت پێبەستراوە (قُلْـتُ) ئیمـامی(النـواوي) دەفـەرموێ:

وَلَوْ قَالَ أنْت وَاحدَةً. وَنَوَى عَدَدًا فَالْمَنْويُّ، وَقيلَ وَاحدَةٌ، وَاللهُ أعْلَمُ. وَلَوْ أَرَادَ أنْ يَقُولَ أنْت طَالقٌ ثَلاَثًا. فَمَاتَتْ قَبْلَ تَمَام طَالقٌ لَمْ يَقعْ، أَوْ بَعْدَهُ قَبْلَ ثَلاَثًا فَثَلاَثٌ، وَقيلَ وَاحدَةٌ، وَقيلَ لاَ شَيْءَ، وَإنْ قَالَ: أنْت طَالقٌ أنْت طَالقٌ أنْت طَالقٌ. وَتَخَلَّلَ فَصْلٌ فَثَلاَثٌ، وَإلاَّ فَإنْ قَصَدَ تَأْكيدًا فَوَاحدَةٌ أَوْ اسْتئْنَافًا فَثَلاَثٌ، وَكَذَا إنْ أَطْلَقَ فِي الأَظْهَر،

---

(وَلَوْ قَالَ أنْت وَاحدَةً) ئەگەر گوتی: تۆ یەکی (وَنَوَى عَدَدًا) نیەتیشی تەلاقدان بوو بە دوو، یان بە سێ تەلاق، ئەوە (فَالْمَنْويُّ) نیەتی چەند تەلاقی هەبێ، ئەوەندە دەکەوێ (وَقيلَ وَاحدَةٌ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: یەك تەلاقی دەکەوێ(وَاللهُ أعْلَمُ).

هەروەها ئەگەر بڵێ: پڕ بە دونیا، یان پڕ بە ئاسمان، یان بە قەد ئەم چیایە تەلاقت بکەوێ، ئەوە–ئەگەر نیەتی هیچ ژمارەیەکی نەبێ– یەك تەلاقی دەکەوێ، هەروەك لە (نهاية)و (مغني)و (إبن قاسم)دا فەرموویانە.

(وَلَوْ أَرَادَ أنْ يَقُولَ أنْت طَالقٌ ثَلاَثًا) ئەگەر ویستی بڵێ: تۆ تەلاقکەوتووی سێبەسێ (فَمَاتَتْ قَبْلَ تَمَام طَالقٌ) ئینجا پێش ئەوەی ووشەی (تەلاقکەوتووی) تەواو بکا، ژنەکە مرد، یان یەکێك دەمی مێردەکەی گرت، ئەوە (لَمْ يَقعْ) تەلاقی ناکەوێ (أَوْ بَعْدَهُ قَبْلَ ثَلاَثًا) یان لەدوای تەواوبوونی ووشەی(تەلاقکەوتووی)و پێش تەواوبوونی ووشەی (سێبەسێ) ژنەکە مرد، یان دەمی مێردەکەی گرت، ئەوە (فَثَلاَثٌ) سێ تەلاقی دەکەون، چونکە لەگەڵ ووشەی تەلاقدانەکە نیەتی سێ تەلاقەکەی هەبوە (وَقيلَ وَاحدَةٌ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: یەك تەلاقی دەکەوێ (وَقيلَ لاَ شَيْءَ) لە بێهێزێکیتردا: هیچ تەلاقێکی ناکەوێ.

﴿ دووبارەکردنەوەی وشەی تەلاقدان ﴾

(وَإنْ قَالَ) ئەگەر مێردەکە گوتیە ژنەکەی: (أنْت طَالقٌ أنْت طَالقٌ) تۆ تەلاقکەوتووی تۆ تەلاقکەوتووی تۆ تەلاقکەوتووی. یان تەلاقم دای تەلاقم دای تەلاقم دای (وَتَخَلَّلَ فَصْلٌ) بێدەنگبوونێکی زیاتر لە هەناسەدان، یان گفتوگۆیەکی بێگانە کەوتە نێوان ڕستەکان، ئەوە (فَثَلاَثٌ) سێ تەلاقی دەکەون.

(وَإلاَّ) بەلام هیچ نێوانێك نەبو، ئەوە تەماشا دەکەین: (فَإنْ قَصَدَ تَأْكيدًا) ئەگەر مەبەستی تەئکید=بەهێزکردنی ڕستەکەی یەکەم بوبێ، ئەوە (فَوَاحدَةٌ) یەك تەلاقی دەکەوێ (أَوْ اسْتئْنَافًا) یان ئەگەر مەبەستی بنیاتنانەوە بوبێ، ئەوە (فَثَلاَثٌ) سێ تەلاقی دەکەون (وَكَذَا إنْ أَطْلَقَ) هەروەها ئەگەر هیچێکیانیشی مەبەست نەبوبێ، هەر سێ تەلاقی دەکەون (فِي الأَظْهَر) لە فەرموودەی بەهێزتردا، بەلام لە فەرموودەکەیتردا: لەو حاڵەتەشدا تەنها یەك تەلاقی دەکەوێ، هەروەك لە (نهاية)و (مغني)دا فەرموویانە.

وَإِنْ قَصَدَ بِالثَّانِيَةِ تَأْكِيدًا وَبِالثَّالِثَةِ اسْتِئْنَافًا أَوْ عَكَسَ فَثِنْتَانِ أَوْ بِالثَّالِثَةِ تَأْكِيدَ الأُولَى فَثَلاثٌ فِي الأَصَحِّ، وَإِنْ قَالَ: أَنْتِ طَالِقٌ وَطَالِقٌ وَطَالِقٌ. صَحَّ قَصْدُ تَأْكِيدِ الثَّانِي بِالثَّالِثِ لاَ الأَوَّلِ بِالثَّانِي، وَهَذِهِ الصُّوَرُ فِي مَوْطُوءَةٍ، فَلَوْ قَالَهُنَّ لِغَيْرِهَا فَطَلْقَةٌ بِكُلِّ حَالٍ، وَلَوْ قَالَ لِهَذِهِ إِنْ دَخَلْتِ الدَّارَ فَأَنْتِ طَالِقٌ وَطَالِقٌ. فَدَخَلَتْ فَثِنْتَانِ فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ قَالَ لِمَوْطُوءَةٍ: أَنْتِ طَالِقٌ طَلْقَةً مَعَ أَوْ مَعَهَا طَلْقَةٌ. فَثِنْتَانِ، وَكَذَا غَيْرُ مَوْطُوءَةٍ فِي الأَصَحِّ،

---

(وَإِنْ قَصَدَ بِالثَّانِيَةِ تَأْكِيداً) ئەگەر بە ڕستەکەی دووەم مەبەستی بەهێزکردنی یەکەمەکە بوبێو (وَبِالثَّالِثَةِ اسْتِئْنَافًا) بە سێیەمەکەش مەبەستی بنیاتنان بوبێ (أَوْ عَكَسَ) یان بە پێچەوانەی کرد: بە دووەمەکە بنیاتنانو بە سێیەمەکە بەهێزکردنی دووەمەکە بوو، ئەوە (فَثِنْتَانِ) لە هەردووحاڵەتدا دوو تەڵاقی دەکەون (أَوْ بِالثَّالِثَةِ تَأْكِيدَ الأُولَى) یان بە سێیەمەکە مەبەستی بەهێزکردنی یەکەمەکە بوو، ئەوە (فَثَلاثٌ فِي الأَصَحِّ) سێ تەڵاقی دەکەون، لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە نێوان کەوتۆتە بەینی بەهێزکەرو بەهێزکراو.

(وَإِنْ قَالَ: أَنْتِ طَالِقٌ وَطَالِقٌ وَطَالِقٌ) ئەگەر گوتی: تۆ تەڵاقکەوتویو تەڵاقکەوتوویو تەڵاقکەوتووی (صَحَّ قَصْدُ تَأْكِيدِ الثَّانِي بِالثَّالِثِ) دروستە مەبەستی ئەوە بێ: دووەمەکە بە سێیەمەکە بەهێز بکا (لاَ الأَوَّلِ بِالثَّانِي) نەك بەهێزکردنی یەکەمەکە بە دووەمەکە.

(وَهَذِهِ الصُّوَرُ) ئەو وێنانەیڕابردوو گشتی (فِي مَوْطُوءَةٍ) لەبارەی ئەو ژنە بوون کە جیماعی لەگەڵ کردوە، کەواتە: (فَلَوْ قَالَهُنَّ لِغَيْرِهَا) ئەگەر ئەو ڕستانەیڕابردووی بەو ژنەی گوتبن کە جیماعی لەگەڵ نەکردبێ، ئەوە (فَطَلْقَةٌ بِكُلِّ حَالٍ) لە هەموو حاڵەتێکدا تەنها یەك تەڵاقی دەکەوێ، چونکە هەر بە ڕستەییەکەم دەبێتە (بائن)، تەڵاقدراوی (بائن)ش تەڵاقیتری ناگاتێ، جا بزانە: ئەوەش لەو حاڵەتەدایە کە بە ڕستەییەکەم نیەتی سێ تەڵاقی نەبێ، چونکە ئەگەر نیەتی سێ تەڵاقی هەبێ، ئەو کاتە هەرسێك تەڵاقی دەکەون، هەروەك لە سەرەتای ئەو باسەدا ڕابرا.

(وَلَوْ قَالَ لِهَذِهِ) ئەگەر گوتیە ئەو ژنەی کە جیماعی لەگەڵ نەکردبێ: (إِنْ دَخَلْتِ الدَّارَ فَأَنْتِ طَالِقٌ وَطَالِقٌ) ئەگەر بچیتە ناو خانووەکە تۆ تەڵاقکەوتوویو تەڵاقکەوتووی (فَدَخَلَتْ) ژنەکەش چووە ناو خانووەکە (فَثِنْتَانِ فِي الأَصَحِّ) دوو تەڵاقی دەکەون لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە هەردووکیان بە چوونە ناوخانووەکە هەڵواسراون.

(وَلَوْ قَالَ لِمَوْطُوءَةٍ) ئەگەر گوتیە ئەو ژنەی جیماعی لەگەڵ کردوە: (أَنْتِ طَالِقٌ طَلْقَةً مَعَ أَوْ مَعَهَا طَلْقَةٌ) تۆ تەڵاقکەوتووی بە تەڵاقێك لەگەڵ تەڵاقێك، یان تەڵاقێکی لەگەڵدا بێ. ئەوە (فَثِنْتَانِ) دوو دەکەون (وَكَذَا غَيْرُ مَوْطُوءَةٍ) هەروەها ئەگەر جیماعیش لەگەڵ نەکردبێ، دوو تەڵاقی دەکەون (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

وَلَوْ قَالَ طَلْقَةً قَبْلَ طَلْقَة أَوْ بَعْدَهَا طَلْقَةٌ. فَثنْتَان فِي مَوْطُوءَة، وَطَلْقَةٌ فِي غَيْرِهَا، وَلَوْ قَالَ طَلْقَةً بَعْدَ طَلْقَة أَوْ قَبْلَهَا طَلْقَةٌ. فَكَذَا فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ قَالَ طَلْقَةً فِي طَلْقَة. وَأَرَادَ مَعَ فَطَلقَتَان أَوِ الظَّرْفَ أَوِ الْحسَابَ أَوْ أَطْلَقَ فَطَلْقَة، وَلَوْ قَالَ نصْفَ طَلْقَة فِي نصْف طَلْقَة. فَطَلْقَةٌ بِكُلِّ حَال، وَلَوْ قَالَ طَلْقَةً فِي طَلْقَتَيْنِ. وَقَصَدَ مَعِيَّةً فَثَلاثٌ، أَوْ ظَرْفًا فَوَاحدَةٌ، أَوْ حسَابًا وَعَرَفَهُ فَثنْتَان، وَإِنْ جَهلَهُ وَقَصَدَ مَعْنَاهُ فَطَلْقَة، وَقيلَ ثنْتَان، وَإِنْ لَمْ يَنْوِ شَيْئًا فَطَلْقَةٌ، وَفِي قَوْلٍ ثنْتَان إِنْ عَرَفَ حسَابًا، وَلَوْ قَالَ بَعْضَ طَلْقَة فَطَلْقَةٌ،

---

(وَلَوْ قَالَ طَلْقَةً قَبْلَ طَلْقَةٍ) ئەگەر گوتی تەلاقت کەوتبێ بە تەلاقێکی پێش تەلاقێك (أَوْ بَعْدَهَا طَلْقَةٌ) یان بە تەلاقێك کە تەلاقێکی لە دوابێ، ئەوە (فَثِنْتَانِ فِي مَوْطُوءَةٍ) دوو تەلاقی لەو ژنەی دەکەون کە جیماعی لەگەڵ کردوە (وَطَلْقَةٌ فِي غَيْرِهَا)یەك تەلاقیشی لەو ژنەی دەکەوێ کە جیماعی لەگەڵ نەکردبێ، چونکە بە تەلاقی‌یەکەم دەبێتە (بائن).

هەروەها (وَلَوْ قَالَ طَلْقَةً بَعْدَ طَلْقَةٍ أَوْ قَبْلَهَا طَلْقَةٌ) ئەگەر بڵێ: تەلاقت کەوتبێ بە تەلاقێکی دوای تەلاقێك، یان بەتەلاقێك کە تەلاقێکی لە پێشدا بێ (فَكَذَا) ئەوەش وەك ئەوەکەی‌تر دوو تەلاقی دەکەون لە وەی جیماعی لەگەڵ کردوەو، یەك تەلاقی دەکەوێ لەوەی جیماعی لەگەڵ نەکردبێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَلَوْ قَالَ طَلْقَةً فِي طَلْقَةٍ) ئەگەر گوتی: تەلاقت کەوتبێ بە تەلاقێکی لە تەلاقێکدا (وَأَرَادَ مَعَ) واتەی لەگەڵی مەبەست بوو، ئەوە (فَطَلْقَتَانِ) دوو تەلاقی دەکەون (أَوِ الظَّرْفَ أَوِ الْحِسَابَ أَوْ أَطْلَقَ) یان ئەگەر چوونە ناو، یان ژماردنی مەبەست بوو، یان هیچی مەبەست نەبو (فَطَلْقَةٌ) یەك تەلاقی دەکەوێ (وَلَوْ قَالَ نِصْفَ طَلْقَةٍ فِي نِصْفِ طَلْقَةٍ) ئەگەر گوتی: تەلاقت کەوتبێ بە نیو تەلاق لە نیو تەلاقدا، ئەوە (فَطَلْقَةٌ بِكُلِّ حَالٍ) یەك تەلاقی دەکەوێ لە هەموو حاڵەتێکدا (وَلَوْ قَالَ طَلْقَةً فِي طَلْقَتَيْنِ) ئەگەر گوتی: تەلاقت کەوتبێ بە تەلاقێك لە دوو تەلاقدا (وَقَصَدَ مَعِيَّةً فَثَلاثٌ) ئەگەر مەبەستی لەگەڵ بێ، ئەوە سێ تەلاقی دەکەون (أَوْ ظَرْفًا فَوَاحِدَةٌ) ئەگەر مەبەستی چوونە ناو بێ، یەك تەلاقی دەکەوێ (أَوْ حِسَابًا وَعَرَفَهُ) ئەگەر مەبەستی لێکدانی ژمارەی بێ‌و لێکدانەکەش بزانێ (فَثِنْتَانِ) دوو تەلاقی دەکەون (وَإِنْ جَهِلَهُ وَقَصَدَ مَعْنَاهُ) جا ئەگەر نەشیدەزانی بەڵام واتەکەی مەبەست بوو (فَطَلْقَةٌ) یەك تەلاقی دەکەوێ (وَقِيلَ ثِنْتَانِ) لە فەرموودەیەکی بێ‌هێزدا: دوو تەلاقی دەکەون (وَإِنْ لَمْ يَنْوِ شَيْئًا فَطَلْقَةٌ) ئەگەر نیەتی هیچیشی نەبێ، یەك تەلاقی دەکەوێ (وَفِي قَوْلٍ ثِنْتَانِ إِنْ عَرَفَ حِسَابًا) لە فەرموودەیەکدا: دووتەلاقی دەکەون ئەگەر لێکدانی ژمارە بزانێ.

(وَلَوْ قَالَ بَعْضَ طَلْقَةٍ) ئەگەر گوتی: بەشێکی تەلاقێکت کەوتبێ، یان نیو تەلاقت بکەوێ. ئەوە (فَطَلْقَةٌ) تەلاقێکی تەواوی دەکەوێ، بە (إجماع)ی زانایانی‌ئیسلام، چونکە تەلاقێك

أَوْ نِصْفَيْ طَلْقَة فَطَلْقَةٌ إلاَّ أَنْ يُرِيدَ كُلَّ نِصْف مِنْ طَلْقَة، وَالأَصَحُّ أَنَّ قَوْلَهُ نِصْفَ طَلْقَتَيْنِ طَلْقَةٌ، وَثَلاَثَةَ أَنْصَاف طَلْقَة أَوْ نِصْفَ طَلْقَة وَثُلُثَ طَلْقَة طَلْقَتَان، وَلَوْ قَالَ نِصْفَ وَثُلُثَ طَلْقَة فَطَلْقَةٌ، وَلَوْ قَالَ لأَرْبَع: أَوْقَعْت عَلَيْكُنَّ أَوْ بَيْنَكُنَّ طَلْقَةً أَوْ طَلْقَتَيْنِ أَوْ ثَلاثًا أَوْ أَرْبَعًا. وَقَعَ عَلَى كُلٍّ طَلْقَةٌ، فَإِنْ قَصَدَ تَوْزِيعَ كُلِّ طَلْقَة عَلَيْهِنَّ وَقَعَ فِي ثِنْتَيْنِ ثِنْتَان، وَفِي ثَلاث وَأَرْبَع ثَلاَثٌ، فَإِنْ قَالَ أَرَدْتُ بَيْنَكُنَّ بَعْضَهُنَّ لَمْ يُقْبَلْ ظَاهِرًا فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ طَلَّقَهَا ثُمَّ قَالَ لِلأُخْرَى أَشْرَكْتُك مَعَهَا أَوْ أَنْت كَهِيَ. فَإِنْ نَوَى طَلَقَتْ،

---

ناکرێته بەش بەش (أَوْ) یان گوتی (نِصْفَيْ طَلْقَةٍ) دوو نیوەی تەلاقێکت کەوتبێ، یان بکەون. ئەوەش (فَطَلْقَةٌ) یەك تەلاقی دەکەوێ، چونکە دوو نیوە دەکاتە یەك (إلاَّ أَنْ يُرِيدَ كُلَّ نِصْفٍ مِنْ طَلْقَةٍ) مەگەر مەبەستی ئەوە بێ: هەر نیوەیەك لە تەلاقێك بکەوێ، ئەو کاتە دوو تەلاقی دەکەون.

(وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر: (أَنَّ قَوْلَهُ نِصْفَ طَلْقَتَيْنِ) گوتەی مێردەکە: تەلاقت کەوتبێ بە نیوەی دوو تەلاقان. ئەوە (طَلْقَةٌ) یەك تەلاقی دەکەوێ، چونکە یەك نیوەی دووە (وَ) ئەگەر بڵێ تەلاقت کەوتبێ (ثَلاَثَةَ أَنْصَافِ طَلْقَةٍ) بە سێ نیوەی تەلاقێك (أَوْ) یان بڵێ (نِصْفَ طَلْقَةٍ وَثُلُثَ طَلْقَةٍ) بە نیوەی تەلاقێكو سێیەکی تەلاقێك. ئەوە (طَلْقَتَانِ) دوو تەلاقی دەکەون، بەلام (وَلَوْ قَالَ نِصْفَ وَثُلُثَ طَلْقَةٍ) نیوەو سێیەکیتەلاقێك. ئەوە (فَطَلْقَةٌ) یەك تەلاقی دەکەوێ.

(وَلَوْ قَالَ لأَرْبَعٍ) ئەگەر مێردەکە گوتیە هەر چوار ژنەکانیخۆی: (أَوْقَعْت عَلَيْكُنَّ أَوْ بَيْنَكُنَّ طَلْقَةً أَوْ طَلْقَتَيْنِ أَوْ ثَلاثًا أَوْ أَرْبَعًا) خستمە سەر هەر چوارتان، یان خستمە نێوان هەر چوارتان: تەلاقێك، یان دوو تەلاق، یان سێ تەلاق، یان چوار تەلاق. ئەوە لە هەر چوار وێنەدا (وَقَعَ عَلَى كُلٍّ طَلْقَةٌ) هەر ژنێكو تەلاقێکی دەکەوێ، بەلام (فَإِنْ قَصَدَ تَوْزِيعَ كُلِّ طَلْقَةٍ عَلَيْهِنَّ) جا ئەگەر مەبەستی بوو: گشت تەلاقێك بە سەر هەموانیاندا بەش بکا، ئەو کاتە (وَقَعَ فِي ثِنْتَيْنِ ثِنْتَانِ) لە وێنەی دوو تەلاقدا هەر ژنێك دوو تەلاقی دەکەون (وَفِي ثَلاَثٍ وَأَرْبَعٍ ثَلاَثٌ) لە وێنەی سێو چواردا سێ تەلاقیان دەکەون (فَإِنْ قَالَ) جا ئەگەر گوتی (أَرَدْتُ بِبَيْنَكُنَّ بَعْضَهُنَّ) مەبەستم بە ووشەی نێوانەکە هەموو ژنەکان نەبو، بەڵکو مەبەستم هەندێکیان بوو، ئەوە (لَمْ يُقْبَلْ ظَاهِرًا فِي الأَصَحِّ) لە ئاشکراییدا لێ قبوڵ ناکرێ، لە فەرموودەیڕاستردا.

(وَلَوْ طَلَّقَهَا) ئەگەر ژنێکیخۆی تەلاق دا (ثُمَّ قَالَ لِلأُخْرَى أَشْرَكْتُكِ مَعَهَا) ئینجا گوتیە ژنەکەیتریش: تۆم کردە هاوبەش لەگەڵ تەلاقدراوەکە (أَوْ أَنْتِ كَهِيَ) یان تۆ وەك تەلاقدراوەکەی. ئەوە (فَإِنْ نَوَى) ئەگەر نیەتی تەلاقدانیدووەمەکە بێ (طَلَقَتْ) تەلاقی

وَإلاَّ فَـــلاَ، وَكَـــذَا لَـــوْ قَـــالَ آخَـــرُ ذَلِـــكَ لإمْرَأَتِـــهِ.

(فَصْلٌ) يَصِحُّ الإِسْتِثْنَاءُ بِشَرْطِ اتِّصَالِه، وَلاَ يَضُرُّ سَكْتَةُ تَنَفُّسٍ وَعِيٍّ، قُلْتُ: وَيُشْتَرَطُ أَنْ يَنْوِيَ الإِسْتِثْنَاءَ قَبْلَ فَرَاغِ الْيَمِينِ فِي الأَصَحِّ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَيُشْتَرَطُ عَدَمُ اسْتِغْرَاقِه، وَلَـوْ قَالَ: أَنْتِ طَالِقٌ ثَلاَثًا إلاَّ ثِنْتَيْنِ وَوَاحِدَةً. فَوَاحِدَةٌ، وَقِيلَ ثَلاَثٌ،

---

دووەمەكە دەكەوێ (وَإلاَّ) بەڵام ئەگەر نیەتی تەڵاقدان نەبێ (فَلاَ) تەڵاقی ناكەوێ (وَكَذَا لَوْ قَالَ آخَرُ ذَلِكَ لإمْرَأَتِهِ) هەروەها ئەگەر پیاوێكیتریش بڵێتە ژنەكەی خۆی: تۆم كردە هاوبەش لەگەڵ تەڵاقدراوەكەی فڵانكەس. یان تۆ وەك ئەو تەڵاقدراوەی. ئەوە ئەگەر نیەتی تەڵاقدان بێ، ئەوەیش تەڵاقی دەكەوێ، ئەگەرنا: ناكەوێ، چونكە ووشەكە نائاشكرایە.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی (إسْتِثْنَاء): جیاكردنەوە لە تەڵاقدان ﴾

**پێشەكی** بزانە: (إسْتِثْنَاءُ)=جیاكردنەوە دوو بەشە: بەشێكیان ژمارەی تەڵاق كەم دەكاتەوە، جا ئەمەیان پیتی (إلاَّ)، واتە: (تەنها)و ئەو جۆرە پیتانەی بۆ بەكار دێ. بەشەكەیتریش كەوتنی بنچینەی تەڵاقەكە لادەباو ڕێگا نادا تەڵاقەكە بكەوێ: وەك (إن شاءَ الله)، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(يَصِحُّ الإِسْتِثْنَاءُ) جیاكردنەوە لە تەڵاق دروست دەبێ، وەك بڵێ: هەرسێك تەڵاقت كەوتبێ تەنها یەك تەڵاق نەبێ. یان بڵێ: هەرچوارتان تەڵاقتان بكەوێ تەنها (زینب) نەبێ. بەڵام (بِشَرْطِ اتِّصَالِه) بەو مەرجەی جیاكردنەوەكە بە لێجیاكراوەكەوە بێو نێوانیان نەبێ (وَلاَ يَضُرُّ سَكْتَةُ تَنَفُّسٍ وَعِيٍّ) زیان نادا بێدەنگبوونی هەناسەدانو ماندووبوونو كۆخە بكەوێتە نێوانیان، بەڵام ئەگەر قسەیەكی بێگانە بكەوێتە نێوانیان جیاكردنەوەكە دروست نابێ، هەرچەند كەمیش بێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) دەفەرموێ (وَيُشْتَرَطُ أَنْ يَنْوِيَ الإِسْتِثْنَاءَ قَبْلَ فَرَاغِ الْيَمِينِ) بە مەرج دادەنرێ: تەڵاقدەرەكە نیەتی جیاكردنەوە بێنێ پێش ئەوەی ڕستەی سوێندەكە=تەڵاقدانەكە كۆتایی بێ، واتە: پێش ئەوەی ووشەی (كەوتبێ)، (یان بكەوێ) تەواو ببێ، مەرجە نیەتی جیاكردنەوە بێنێ (فِي الأَصَحِّ وَاللهُ أَعْلَمُ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَيُشْتَرَطُ عَدَمُ اسْتِغْرَاقِه) بە مەرج دادەنرێ: جیاكردنەوەكە هەموو لێجیاكراوەكە دانەگرێتەوە، ئەگینا: جیاكردنەوەكە دروست نابێ بە (إجماع)ی زانایان، كەواتە: ئەگەر بڵێ: هەرسێك تەڵاقت بكەوێ تەنها سێ تەڵاق نەبێ. ئەوە بەتاڵەو هەرسێك تەڵاقی دەكەوێ.

بەڵام (وَلَوْ قَالَ: أَنْتِ طَالِقٌ ثَلاَثًا إلاَّ ثِنْتَيْنِ وَوَاحِدَةً) ئەگەر گوتی: تۆ تەڵاقكەوتووی سێبەسێ تەنها دوو تەڵاق نەبێو یەك تەڵاق نەبێ. ئەو كاتە (فَوَاحِدَةٌ) یەك تەڵاقی دەكەوێ، چونكە دووەكەو یەكەكە بە پیتی واو لێك پەرت كراونو كۆ ناكرێنەوەو داگرتنەوەكە نایەتە جێ (وَقِيلَ ثَلاَثٌ) لە فەرموودەیەكیبێهێزدا: سێ تەڵاقی دەكەوێ.

أَوْ اثْنَتَيْنِ وَوَاحِدَةً إِلاَّ وَاحِدَةً. فَثَلاَثٌ، وَقِيلَ ثِنْتَانِ، وَهُوَ مِنْ نَفْيٍ إِثْبَاتٌ وَعَكْسُهُ، فَلَوْ قَالَ ثَلاَثًا إِلاَّ ثِنْتَيْنِ إِلاَّ طَلْقَةً. فَثِنْتَانِ، أَوْ ثَلاَثًا إِلاَّ ثَلاَثًا إِلاَّ اثْنَتَيْنِ. فَثِنْتَانِ، وَقِيلَ ثَلاَثٌ، وَقِيلَ طَلْقَةٌ، أَوْ خَمْسًا إِلاَّ ثَلاَثًا. فَثِنْتَانِ، وَقِيلَ ثَلاَثٌ، أَوْ ثَلاَثًا إِلاَّ نِصْفَ طَلْقَةٍ. فَثَلاَثٌ عَلَى الصَّحِيحِ، وَلَوْ قَالَ: أَنْتِ طَالِقٌ إِنْ شَاءَ اللَّهُ. أَوْ إِنْ لَمْ يَشَأِ اللَّهُ. وَقَصَدَ التَّعْلِيقَ لَمْ يَقَعْ،

---

(أَوْ) یان گوتی (اثْنَتَيْنِ وَوَاحِدَةً إِلاَّ وَاحِدَةً) تەڵاقت کەوتبێ بە دوو تەڵاق‌و یەك تەڵاق تەنها یەك تەڵاق نەبێ (فَثَلاَثٌ) سێ تەڵاقی دەکەون، چونکە یەکەکە لە یەکەکە جیاکراوەتەوەو دایگرتۆتەوەو جیاکردنەوەکە دروست نەبوە (وَقِيلَ ثِنْتَانِ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: دوو تەڵاقی دەکەون.

(وَهُوَ مِنْ نَفْيٍ إِثْبَاتٌ) جیاکردنەوە لە نەبوون دەبێتە هەبوون (وَعَكْسُهُ) بە پێچەوانەش: لە هەبوون دەبێتە نەبوون، کەوابو: (فَلَوْ قَالَ) ئەگەر مێردەکە گوتی: (ثَلاَثًا إِلاَّ ثِنْتَيْنِ إِلاَّ طَلْقَةً) تەڵاقت کەوتبێ سێ‌بەسێ تەنها دوو تەڵاق نەبێ تەنها یەك تەڵاق نەبێ. ئەوە (فَثِنْتَانِ) دوو تەڵاقی دەکەون؟ چونکە هەر ڕستەیەك لە ڕستەی پێشەخۆی جیا دەکرێتەوەو وای لێدێ: سێ تەڵاق بکەون، دوو نەکەون، یەك بکەوێ.

(أَوْ) یان گوتی (ثَلاَثًا إِلاَّ ثَلاَثًا إِلاَّ ثِنْتَيْنِ) سێ تەڵاقت بکەون تەنها سێ تەڵاق نەبێ تەنها دوو تەڵاق نەبێ. ئەوە (فَثِنْتَانِ) دوو تەڵاقی دەکەون، چونکە داگرتنەوەکە بە ڕستەی دوای خۆی لەکار کەوتوەو وای لێدێ: سێ بکەون، سێ نەکەون، دوو بکەون (وَقِيلَ ثَلاَثٌ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: سێ تەڵاقی دەکەون (وَقِيلَ طَلْقَةٌ) لە بێهێزێکی‌تردا: یەك تەڵاقی دەکەوێ (أَوْ) یان گوتی (خَمْسًا إِلاَّ ثَلاَثًا) پێنج تەڵاقت بکەون تەنها سی نەبێ، ئەوە (فَثِنْتَانِ) دوو تەڵاقی دەکەون (وَقِيلَ ثَلاَثٌ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: سێ تەڵاقی دەکەون (أَوْ) یان گوتی: (ثَلاَثًا إِلاَّ نِصْفَ طَلْقَةٍ) سێ تەڵاقت بکەون تەنها نیو تەڵاق نەبێ، ئەوە (فَثَلاَثٌ) سێ تەڵاقی دەکەون (عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست، چونکە تەڵاق ناکرێ بەش بەش.

(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر مێردەکە گوتی (أَنْتِ طَالِقٌ إِنْ شَاءَ اللَّهُ) تۆ تەڵاقکەوتووی إن شاء الله، یان تەڵاقت بکەوێ إن شاء الله، واتە: ئەگەر خوا حەزی کرد (أَوْ إِنْ لَمْ يَشَأِ اللَّهُ) یان گوتی: تەڵاقت بکەوێ ئەگەر خوا حەزی نەکرد (وَقَصَدَ التَّعْلِيقَ) مەبەستیشی هەڵواسینی تەڵاق بێ بە حەزکردنەکە، ئەوە (لَمْ يَقَعْ) تەڵاقی ناکەوێ، چونکە حەزکردن‌و حەز نەکردنی خوا نازاندرێ، جیاوازی نیە: إن شاء الله لە دواوە بگوترێ وەك ڕابرا، یان لە پێشەوە بگوترێ وەك إن شاء الله تەڵاقت کەوتبێ، یان بکەوێ، هەروەك لە (نهاية)و (مغنى)دا فەرمویانە.

ئینجا بزانە: جیاوازی نیە بڵێ: تەڵاقت کەوتبێ إن شاء الله. یان هەرسێك تەڵاقت کەوتبن إن شاء الله.؟ چونکە هەڵواسین بە إن شاء الله ڕێگا لە کەوتنی بنچینەی تەڵاقەکە دەگرێ

وَكَذَا يَمْنَعُ انْعِقَادَ تَعْلِيقٍ وَعِتْقٍ وَيَمِينٍ وَنَذْرٍ وَكُلِّ تَصَرُّفٍ، وَلَوْ قَالَ يَا طَالِقُ إِنْ شَاءَ اللهُ. وَقَعَ فِي الأَصَحِّ، أَوْ قَالَ أَنْتِ طَالِقٌ إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ اللهُ تَعَالَى. فَلاَ فِي الأَصَحِّ.
(فَصْلٌ) شَكَّ فِي طَلاَقٍ فَلاَ، أَوْ فِي عَدَدٍ فَالأَقَلُّ، وَلاَ يَخْفَى الْوَرَعُ،

---

به ژمارەوە، هەروەك لە (تحفة)دا ڕوون كراوەتەوەو لە سەرەتای باسەكەدا ڕابرا، بەلام ئەگەر مەبەستی هەلواسین نەبێ، بەلكو هەر بە سەر زوبانی‌دا هات، یان بۆ پیرۆزی وای‌گوت، یان نەزاندرا مەبەستی هەلواسین بوو، یان نا، یان هەر بە عادەت إن شاء الله ی دەگوت، ئەوە لەو حاڵەتانەدا تەلاقی دەكەوێ، هەروەك لە زۆریەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.
(وَكَذَا يَمْنَعُ) هەروەها ووشەی ان شاء الله قەدەغە دەكا: (انْعِقَادَ تَعْلِيقٍ) دامەزرانی هەلواسینی تەلاق: وەك تەلاقت كەوتبێ ئەگەر بچیتە ژوورەوە إن شاء الله، واتە: ئەگەر بشچیتە ژوورەوە تەلاقی ناكەوێ، هەم (وَعِتْقٍ وَيَمِينٍ وَنَذْرٍ) قەدەغە دەكا دامەزرانی ئازادكردنی كۆیلەو سوێندخواردن‌و نەزركردن: وەك ئەم كۆیلەیەم ئازاد كرد إن شاء الله، یان والله ئەم كارە دەكەم إن شاء الله، یان لە سەرم نەزر بێ بزنێك بكەمە خێر إن شاءالله.
هەم (وَكُلِّ تَصَرُّفٍ) قەدەغە دەكا هەر دەستكاریەكی‌تر دابمەزرێ: وەك فرۆشتمە تۆ إن شاء الله. واتە: نە ئازادكردن‌و نە سوێندو نە نەزرو نە مامڵەت هیچیان دانامەزرێن، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ حَلَفَ فَقَالَ إِنْ شَاءَ اللهُ فَلاَ حِنْثَ عَلَيْهِ﴾ رواه أحمد وصححه ابن حبان، هەر كەسێك سوێندی خواردو گوتی: إن شاء الله. سوێندی لێناكەوێ. واتە: حەدیسەكە تەلاق‌و ئەوانی‌تریش دەگرێتەوە.
(وَلَوْ قَالَ يَا طَالِقُ إِنْ شَاءَ اللهُ) ئەگەر گوتی: هۆ تەلاقكەوتوو إن شاء الله. ئەوە (وَقَعَ فِي الأَصَحِّ) تەلاقی دەكەوێ لە فەرموودەی ڕاستردا، چونكە بانگكردنەكە وادەگەیەنێ لەو كاتەدا تەلاقكەوتوو بێ (أَوْ قَالَ) یان گوتی (أَنْتِ طَالِقٌ إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ اللهُ تَعَالَى) تۆ تەلاقكەوتووی تەنها ئەگەر خوا حەز بكا، ئەوە (فَلاَ فِي الأَصَحِّ) تەلاقی ناكەوێ لە فەرموودەی ڕاستردا، چونكە وای لێدێ: تەنها ئەگەر خوا حەز بكا تەلاقت نەكەوێ، ئێمەش نازانین خوا حەز دەكا، یان نا.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی كەوتنە گومان لە تەلاقدا ﴾

(شَكَّ فِي طَلاَقٍ) هەر كاتێك پیاو كەوتە گومان لە خودی تەلاقدا: ئایا تەلاقدانی بە دەمدا هاتوە، یان نا، یان ئایا پێهەلواسراوەكە هاتۆتەجێ، یان نا، ئەوە (فَلاَ) تەلاقی ناكەوێ، بە (إجماع)ی زانایانی‌ئیسلام.
(أَوْ فِي عَدَدٍ) یان زانی تەلاقدانی بە دەمدا هاتوە، بەلام كەوتە گومان لە ژمارەی تەلاقدا: ئایا تەلاقێكی گوتوە، یان زیاتر، ئەوە (فَالأَقَلُّ) كەمترەكە لێدەگرێ، بەلام (وَلاَ يَخْفَى الْوَرَعُ) خۆپاراستنیش شاراوە نیە، واتە: وا باشە لە هەردوو وێنەی‌ڕابردوودا خراپترەكە بۆ

وَلَوْ قَالَ إنْ كَانَ ذَا الطَّائِرُ غُرَابًا فَأَنْت طَالِقٌ. وَقَالَ آخَرُ إنْ لَمْ يَكُنْهُ فَامْرَأَتِي طَـالِقٌ. وَجُهِلَ لَمْ يُحْكَمْ بِطَلَاقِ أَحَد، فَإِنْ قَالَهُمَا رَجُلٌ لِزَوْجَتَيْهِ طَلَقَتْ إحْدَاهُمَا وَلَزِمَهُ الْبَحْثُ وَالْبَيَانُ، وَلَوْ طَلَّقَ إحْدَاهُمَا بِعَيْنِهَا ثُمَّ جَهِلَهَا وُقِفَ حَتَّى يَذْكُرَ،

---

خۆی دابنێ، چونکه پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿دَعْ مَايَرِيبُكَ إلَىٰ ما لاَيَرِيبُكَ﴾ رواه الترمذي وصححه، واز لەو شتە بێنە کە گومانت لێپەیدا دەکا، ڕوو بکە ئەو لایەی گومانت لێپەیدا ناکا. کەواتە: لە وێنەیەکەمدا: یان بیگەڕێنێتەوە، یان سەرلەنوێ مارەی بکاتەوە، یان دەسبەجێ تەلاقی بدا، تاکو بتوانێ شوو بکاتەوە، لە وێنەیدووەمیشدا: تا مێرێکیتر نەکا ئەویش لە خۆی مارە نەکاتەوە، هەروەك لە زۆریەیسەرچاوەکاندا فەرموویانە.

ئینجا بزانە: ئەگەر سوێندێکی خواردبو، ئینجا سوێندەکەشی لێکەوت، بەڵام کەوتە گومان: ئایا سوێندەکە بە خوا بووە، یان بە تەلاق؟ ئەوە بڕیاری تەلاقکەوتنی نادرێ، بەڵام واجبە: خۆی لە ژنەکەی بپارێزێ تا ڕوون دەبێتەوە، هەروەك لە (الشرواني)دا گێراویەتیەوە.

(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر مێردەکە گوتی (إنْ كَانَ ذَا الطَّائِرُ غُرَابًا فَأَنْت طَالِقٌ) ئەگەر ئەم باڵندەیە قەلەڕەش بێ تۆ تەلاقکەوتووی (وَقَالَ آخَرُ إنْ لَمْ يَكُنْهُ فَامْرَأَتِي طَالِقٌ) پیاوێکیتریش گوتی: ئەگەر باڵندەکە قەلەڕەش نەبێ ژنی من تەلاقکەوتووە (وَجُهِلَ) نەشزاندرا باڵندەکە چی بوو، ئەوە (لَمْ يُحْكَمْ بِطَلَاقِ أَحَدٍ) بڕیار بە تەلاقکەوتنی هیچێکیان نادرێ، چونکە ئەگەر تەنها یەکێکیان تەلاقەکەی ئەوها هەڵواسیبا، بڕیاری کەتنی نەدەدرا؟ چونکە دەگونجێ باڵندەکە پێهەڵواسراوەکە نەبوبێ.

بەڵام (فَإِنْ قَالَهُمَا رَجُلٌ لِزَوْجَتَيْهِ) ئەگەر پیاوێك هەردوو ڕستەکەیڕابردووی بە هەردوو ژنەکانیخۆی گوتبێ، ئەوە (طَلَقَتْ إحْدَاهُمَا) بێگومان لە یەکێکیان تەلاقی دەکەوێ، کەوابو: (وَلَزِمَهُ الْبَحْثُ) لە سەری واجبە: هەوڵ بدا بزانێ باڵندەکە چی بووە، هەم (وَالْبَيَانُ) ڕوون بکاتەوە تەلاقدراوەکە کامەیانە، هەم واجبە: لەو ماوەیەشدا خۆی لە هەردوو ژنەکانی بپارێزێ، بەڵام ئەگەر نەگونجا بزانێ: باڵندەکە چی بوو؟ چونکە فڕیبو لە دیتنەوەشی بێئومێد بوو، ئەو کاتە واجب نیە هەوڵ بداو ڕوون بکاتەوە.

هەروەها ئەگەر تەلاقەکەش (رَجعي) بوو، لە سەری واجب نیە هەوڵ بداو ڕوون بکاتەوە، چونکە دەتوانێ بە (رجعة)کردن ژنەکانی بگەڕێنێتەوە بەڵام لەو حاڵەتانەشدا واجبە: بەردەام خۆی لە هەردوو ژنەکانی بپارێزێو نزیك هیچێکیان نەکەوێ، هەروەك لە (الشبراملسي)و (الشرواني)دا فەرموویانە.

(وَلَوْ طَلَّقَ إحْدَاهُمَا بِعَيْنِهَا ثُمَّ جَهِلَهَا) ئەگەر لە هەردوو ژنەکانی یەکێکیدیارکراوی تەلاق دا، ئینجا لە بیری چوو و نەیزانی کامەیان تەلاقدراوەکەیە (وُقِفَ حَتَّى يَذْكُرَ) کارەکەی ڕادەگیرێ تا دێتەوە بیری کامەیانە، لە ماوەی ڕاگیرانیشدا نابێ نزیك هیچێکیان بکەوێ،

وَلاَ يُطَالَبُ بِبَيَانٍ إِنْ صَدَّقَتَاهُ فِي الْجَهْلِ، وَلَوْ قَالَ لَهَا وَلأَجْنَبِيَّةٍ: إِحْدَاكُمَا طَالِقٌ. وَقَالَ قَصَدْتُ الأَجْنَبِيَّةَ. قُبِلَ فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ قَالَ: زَيْنَبُ طَالِقٌ. وَقَالَ: قَصَدْتُ أَجْنَبِيَّةً. فَلاَ عَلَى الصَّحِيحِ، وَلَوْ قَالَ لِزَوْجَتَيْهِ إِحْدَاكُمَا طَالِقٌ. وَقَصَدَ مُعَيَّنَةً طَلَقَتْ، وَإِلاَّ فَإِحْدَاهُمَا، وَيَلْزَمُهُ الْبَيَانُ فِي الْحَالَةِ الأُولَى وَالتَّعْيِينُ فِي الثَّانِيَةِ.

---

چونکە بێگومـان یـەکێکیانی لێحەرامـە، بـەڵام (وَلاَ يُطَالَبُ بِبَيَانٍ إِنْ صَدَّقَتَاهُ فِي الْجَهْلِ) لێرەدا داوای ڕوونکردنەوەی تەڵاقدراوەکەی لێناکرێ ئەگەر ژنەکان باوەڕی پێبکەن لەو نەزانینەدا.

(وَلَوْ قَالَ لَهَا وَلأَجْنَبِيَّةٍ إِحْدَاكُمَا طَالِقٌ) ئەگەر مێردەکە گوتیە ژنەکەیخۆیو ئافرەتێکی بێگانە: یەکێکتان تەڵاقکەوتووە، ئینجا (وَقَالَ قَصَدْتُ الأَجْنَبِيَّةَ) مێردەکە گوتی: مەبەستم بێگانەکە بوو، ئەوە (قُبِلَ فِي الأَصَحِّ) بە سوێندخواردن باوەڕی پێدەکرێو لێی قبوڵ دەکرێ، لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر مێردەکە گوتی (زَيْنَبُ طَالِقٌ) زێنەب تەڵاقکەوتووە، ژنەکەیخۆیشی ناوی زێنەب بوو، ئینجا (وَقَالَ قَصَدْتُ أَجْنَبِيَّةً) گوتی مەبەستم زێنەبێکی بێگانە بوو، ئەوە (فَلاَ) لە ئاشکراییدا بە سوێندخواردنیش باوەڕی پێناکرێ (عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست، بەڵام لە پەنهانیدا دەدرێتە دەست ئایینەکەی، واتە: ئەگەر ڕاست بکا، ئەوە لە نێوان خۆیو خوایگەورەدا تەڵاقی ناکەوێو زێنەبەکەیخۆی لێحەرام نابێ.

(وَلَوْ قَالَ لِزَوْجَتَيْهِ) ئەگەر مێردەکە گوتیە هەردوو ژنەکانیخۆی: (إِحْدَاكُمَا طَالِقٌ) یەکێکتان تەڵاقکەوتووە (وَقَصَدَ مُعَيَّنَةً) مەبەستیشی ژنێکیدیارکراو بوو، ئەوە (طَلَقَتْ) دیارکراوەکە تەڵاقی دەکەوێ (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر هیچ دیارکراوێکی مەبەست نەبو، بەڵکو یەکێکیانی بە دیارنەکراوی مەبەست بوو، یان هەردووکی مەبەست بون، ئەو کاتەش (فَإِحْدَاهُمَا) لە هەردوو ژنەکانی تەنها یەکێکیان تەڵاقی دەکەوێ، ئینجا (وَيَلْزَمُهُ الْبَيَانُ فِي الْحَالَةِ الأُولَى) لە حاڵەتی یەکەمدا –کە دیارکراوێکی مەبەست بوو– لە سەری واجبە ڕوون بکاتەوە: تەڵاقدراوەکە کامەیانە، هەم (وَالتَّعْيِينُ فِي الثَّانِيَةِ) لە حاڵەتی دووەمیشدا –کە هیچ دیارکراوێکی مەبەست نەبو– لە سەری واجبە یەکێکیان دیاری بکا بۆ تەڵاقکەوتن.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر سوێندی بە هەرسێك تەڵاق خواردو سوێندەکەشی لێکەوت، بەڵام دوو ژن، یان زیاتری هەبون، ئەو کاتەش بێگومان یەکێکیان سێ تەڵاقی دەکەوێ، کەوابو: ئەگەر لە دڵدا هیچیانی مەبەست نەبوبێ، واجبە: یەکێکیان ئێستا دیاری بکا تاکو سێ تەڵاقەکەی بکەوێ، هەروەها پێش سوێندلێکەوتنیش دروستە یەکێکیان دیاری بکا، ئینجا نە لە پێش سوێندلێکەوتنو نە لە دوای سوێندلێکەوتن بۆی دروست نیە لە

وَتُعْزَلاَنِ عَنْهُ إلَى الْبَيَانِ أَوِ التَّعْيِينِ، وَعَلَيْهِ الْبِدَارُ بِهِمَا وَنَفَقَتُهُمَا فِي الْحَالِ، وَيَقَعُ الطَّلاَقُ بِاللَّفْظِ، وَقِيلَ إنْ لَمْ يُعَيِّنْ فَعِنْدَ التَّعْيِينِ، وَالْوَطْءُ لَيْسَ بَيَانًا وَلاَ تَعْيِينًا، وَقِيلَ تَعْيِينٌ، وَلَوْ قَالَ مُشِيرًا إلَى وَاحِدَةٍ: هَذِهِ الْمُطَلَّقَةُ. فَبَيَانٌ، أَوْ أَرَدْتُ هَذِهِ وَهَذِهِ أَوْ هَذِهِ بَلْ هَذِهِ. حُكِمَ بِطَلاَقِهِمَا،

---

ديارکراوەکە پەشیمان ببێتەوە، هەم بۆی دروست نیە سێ تەلاقەکان یەکە یەکە بە سەر ژنەکانیدا بەش بکا، جا ئەگەر پێش دیاریکردن ژنێکیان مرد، یان بە (بائن)ی تەلاقیدا، ئەو کاتە دروستە ژنە مردووەکە، یان تەلاقدراوەکە بۆ کەوتنی هەرسێك تەلاقەکە دیاری بکا، بەو مەرجەی مردنەکەی، یان تەلاقدانەکەی لە دوای سوێندلێکەوتنەکە بێ، نەك پێش سوێندلێکەوتن، هەروەك لە (تحفة)و حاشیەکانیدا لێرەو لە (فصل)ی دەسەلاتی مێرد بە سەر شوێنیتەلاقدا ڕوون کراوەتەوە.

(وَتُعْزَلاَنِ عَنْهُ) لەو جۆرە مەسەلانەیڕابردوودا ژنەکان لە مێردەکە جیا دەکرێنەوەو نابێ نزیکیان بکەوێ (إلَى الْبَيَانِ أَوِالتَّعْيِينِ) تا ڕوون دەکاتەوە تەلاقدراوەکە کامەیانەو تا یەکێکیان بۆ تەلاقکەوتن دیاری دەکا، چونکە حەرامو حەلالی تێکەڵ بووە (وَعَلَيْهِ الْبِدَارُ بِهِمَا) لە سەری واجبە: پەلە بکا بۆ ڕوونکردنەوەو دیاریکردنەکە، هەم (وَنَفَقَتُهُمَا فِي الْحَالِ) بەخێوکردنی هەموو ژنەکانیشی لە سەر واجبە لە ئێستاوە تا دیاری دەکاو ڕوون دەکاتەوە، چونکە وەکو ژنەکان بەویەوە بەستراوەنەوە، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا (عِدَّة)ی دیارکراوەکە لە کاتی تەلاقدانەوە دەست پێدەکا، (عِدَّة)ی دیارنەکراوەکەش لە کاتی دیاریکردنەوە دەست پێدەکا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

بەلام (وَيَقَعُ الطَّلاَقُ بِاللَّفْظِ) خودیتەلاقەکە لە کاتیتەلاقدانەوە بە گوتنی ووشەی تەلاقەکە دەکەوێ، جا لە بەر ئەوەی ژنە تەلاقدراوەکە ڕوونو دیار نیە، بۆیێ مێردەکە داوای ڕوونکردنەوەو دیاریکردنی لێدەکرێو پێویستی بە دووبارەکردنەوەی ووشەی تەلاق نیە (وَقِيلَ إنْ لَمْ يُعَيِّنْ فَعِنْدَ التَّعْيِينِ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: ئەگەر لە دڵدا ژنێکی دیاری نەکردبێ، ئەوە لە کاتی دیاریکردنەوە تەلاقی دەکەوێ.

(وَالْوَطْءُ) جیماعکردن لەگەڵ ژنێك لە ژنەکانی (لَيْسَ بَيَانًا وَلاَتَعْيِينًا) نابێتە ڕوونکردنەوەو دیاریکردن بۆ ئەوەی ئەو ژنەی جیماعی لەگەڵ نەکراوە، ئەویان تەلاقدراو بێ (وَقِيلَ تَعْيِينٌ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا جیماعکردن دەبێتە دیاریکردن (وَلَوْ قَالَ مُشِيرًا إلَى وَاحِدَةٍ) ئەگەر مێردەکە ئاماژەی بۆ ژنێك لە ژنەکانی کردو گوتی: (هَذِهِ الْمُطَلَّقَةُ) ئەمەیان تەلاقدراوەکەیە (فَبَيَانٌ) ئەوە دەبێتە ڕوونکردنەوەی تەلاقدراوەکە (أَوْ) یان ئاماژەی بۆ هەردووکیان کردو گوتی (أَرَدْتُ هَذِهِ وَهَذِهِ) مەبەستم ئەمەو ئەمە بوو (أَوْ) یان گوتی (هَذِهِ بَلْ هَذِهِ) مەبەستم ئەمە بوو، نا، بەڵکو مەبەستم ئەمە بوو. ئەوە (حُكِمَ بِطَلاَقِهِمَا) لە

وَلَوْ مَاتَتَا أَوْ إِحْدَاهُمَا قَبْلَ بَيَان وَتَعْيِين بَقِيَتْ مُطَالَبَتُهُ لِبَيَان الإِرْث، وَلَوْ مَاتَ فَـالأَظْهَرُ قَبُولُ بَيَان وَارِثه لاَ تَعْيِينه، وَلَوْ قَالَ: إِنْ كَانَ غُرَابًا فَامْرَأَتِي طَالِقٌ وَإِلاَّ فَعَبْدِي حُرٌّ. وَجُهِلَ مُنِعَ مِنْهُمَا إِلَى الْبَيَان، فَإِنْ مَاتَ لَمْ يُقْبَل بَيَانُ الْوَارِث عَلَى الْمَذْهَب، بَلْ يُقْرَعُ بَيْنَ الْعَبْد وَالْمَرْأَة، فَإِنْ قَرَعَ عَتَقَ، أَوْ قَرَعَتْ لَمْ تَطْلُقْ، وَالأَصَحُّ أَنَّهُ لاَ يَرِقُّ.

---

ئاشكرایی‌دا له‌ هه‌ردووحاڵه‌تدا بڕیار به‌ ته‌ڵاقكه‌وتنی هه‌ردووكیان ده‌درێ، به‌ڵام له‌ په‌نهانی نێوان خۆی‌و خوادا: كامه‌یانی مه‌به‌ست بوبێ، ته‌ڵاقی ئه‌ویان ده‌كه‌وێ.

(وَلَوْ مَاتَتَا أَوْ إِحْدَاهُمَا قَبْلَ بَيَانٍ وَتَعْيِينٍ) ئه‌گه‌ر ته‌ڵاقدانه‌كه‌ی (بائن)بوو، ئینجا پێش ڕوونكردنه‌وه‌و دیاریكردن هه‌ردوو ژنه‌كان مردن، یان ته‌نها یه‌كێكیان مرد، ئه‌وه‌ (بَقِيَتْ مُطَالَبَتُهُ لِبَيَانِ الإِرْث) داوالێكردنه‌كه‌ی مێرده‌كه‌ هه‌رده‌مێنێ بۆ ڕوونكردنه‌وه‌ی میراتگرتن، كه‌واته‌: ئه‌گه‌ر ته‌ڵاقدانه‌كه‌ (رَجعي) بێ‌و له‌ (عِدَّة)دا مردبێ، داوا لێكردنه‌كه‌ له‌ سه‌ر مێرده‌كه‌ نامێنێ، چونكه‌ له‌و حاڵه‌ته‌دا میرات له‌ یه‌كتری ده‌گرن.

(وَلَوْ مَاتَ) ئه‌گه‌ر پێش ڕوونكردنه‌وه‌و دیاریكردن مێرده‌كه‌ مرد، ئه‌و كاته‌ (فَالأَظْهَرُ) به‌ فه‌رمووده‌ی به‌هێزتر (قَبُولُ بَيَانِ وَارِثِه لاَتَعْيِينِه) ڕوونكردنه‌وه‌ی میراتگری مێرده‌كه‌ قبوڵ ده‌كرێ، به‌ڵام دیاریكردنه‌كه‌ی قبوڵ ناكرێ، چونكه‌ ڕوونكردنه‌وه‌كه‌ خه‌به‌ردانێكه‌، به‌ڵام دیاریكردن هه‌ڵبژاردنی شه‌هوه‌تێكه‌و په‌یوه‌ندی به‌ میراتگره‌وه‌ نیه‌، به‌ڵام له‌ فه‌رمووده‌یه‌كی‌تردا: دیاریكردنه‌كه‌شی قبوڵ ده‌كرێ، هه‌روه‌ك له‌ زۆربه‌ی سه‌رچاوه‌كاندا فه‌رموویانه‌.

(وَلَوْ قَالَ) ئه‌گه‌ر گوتی (إِنْ كَانَ غُرَابًا فَامْرَأَتِي طَالِقٌ وَإِلاَّ فَعَبْدِي حُرٌّ) ئه‌گه‌ر ئه‌م باڵنده‌یه‌ قه‌له‌ڕه‌ش بێ ژنه‌كه‌م ته‌ڵاقكه‌وتووه‌، ئه‌گه‌ر نا: كۆیله‌كه‌م ئازاده‌ (وَجُهِلَ) نه‌شزاندرا باڵنده‌كه‌ چی‌بوو، ئه‌وه‌ (مُنِعَ مِنْهُمَا إِلَى الْبَيَانِ) له‌ هه‌ردووكیان قه‌ده‌غه‌ ده‌كرێ تا ڕوون ده‌بێته‌وه‌ (فَإِنْ مَاتَ) جا ئه‌گه‌ر پێش ڕوونكردنه‌وه‌ پیاوه‌كه‌ مرد (لَمْ يُقْبَل بَيَانُ الْوَارِثِ عَلَى الْمَذْهَبِ) ڕوونكردنه‌وه‌ی میراتگره‌كه‌ی قبوڵ ناكرێ، له‌ سه‌ر فه‌رمووده‌ی ڕاستی مه‌زهه‌ب (بَل يُقْرَعُ بَيْنَ الْعَبْدِ وَالْمَرْأَة) به‌ڵكو پشكه‌ ده‌كرێ له‌ نێوان كۆیله‌كه‌و ژنه‌كه‌دا (فَإِنْ قَرَعَ) جا ئه‌گه‌ر كۆیله‌كه‌ پشكه‌ی بۆ ده‌رچوو، ئه‌وه‌ (عَتَقَ) ئازاد ده‌بێ، به‌ڵام (أَوْ قَرَعَتْ) ئه‌گه‌ر ژنه‌كه‌ پشكه‌ی بۆ ده‌رچوو (لَمْ تَطْلُقْ) ته‌ڵاقی ناكه‌وێ، هه‌م (وَالأَصَحُّ أَنَّهُ لاَ يَرِقُّ) به‌ فه‌رمووده‌ی ڕاستتر: كۆیله‌كه‌ش به‌ كۆیله‌یی بۆ میراتگره‌كان نامێنێته‌وه‌، به‌ڵكو نه‌زانینه‌كه‌ هه‌ر به‌رده‌وام ده‌بێ‌و بژێوی كۆیله‌كه‌ش له‌ (بیت المال)، یان له‌ ماڵی ده‌وڵه‌مه‌نده‌كان ده‌درێ.

(فَصْلٌ) اَلطَّلاَقُ سُنِّيٌّ وَبِدْعِيٌّ، وَيَحْرُمُ الْبِدْعِيُّ، وَهُوَ ضَرْبَان: طَلاَقٌ فِي حَيْضٍ مَمْسُوسَة، وَقِيلَ إِنْ سَأَلَتْهُ لَمْ يَحْرُمْ، وَيَجُوزُ خُلْعُهَا فِيهِ لاَ أَجْنَبِيٍّ فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ قَالَ: أَنْتِ طَالِقٌ مَعَ آخِرِ حَيْضِك. فَسُنِّيٌّ فِي الأَصَحِّ، أَوْ مَعَ آخِرِ طُهْرٍ

---

﴿ فَصْلٌ: له باسى تەلاقى (سُنِّيٌّ)ى حەلاڵ و (بِدْعِيٌّ)ى حەرام ﴾

(اَلطَّلاَقُ) تەلاق دوو بەشە، يەكەم: (سُنِّيٌّ)يە، كە حەلاڵە. دووەم: (وَبِدْعِيٌّ)يە، كە حەرامە. (وَيَحْرُمُ الْبِدْعِيُّ) تەلاقى (بِدْعِي) حەرامە، چونكە زيانى تێدايە (وَهُوَ ضَرْبَانِ) تەلاقى (بِدْعِي) دوو جۆرە:

**يەكەميان:** (طَلاَقٌ فِي حَيْضٍ مَمْسُوسَةٍ) تەلاقدانى ژنێكە كە لە حەيز، يان لە نيفاسدا بێو جيماعيشى لەگەڵ كرابێ، چونكە ماوەى حەيز بە (عِدَّة) نازمێردرێو (عِدَّة)ى درێژ دەبێتەوە ﴿عن ابن عمر رضى الله عنهما: أَنَّهُ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ، فَسَأَلَ عُمَرُ رَسُولَ اللهِ ﷺ عَنْ ذَلِكَ؟ فَقَالَ: مُرْهُ فَلْيُرَاجِعْهَا ثُمَّ لْيُمْسِكْهَا حَتَّى تَطْهُرَ ثُمَّ تَحِيضَ ثُمَّ تَطْهُرَ، ثُمَّ إِنْ شَاءَ أَمْسَكَ وَإِنْ شَاءَ طَلَّقَ قَبْلَ أَنْ يَمَسَّ، فَتِلْكَ الْعِدَّةُ الَّتِي أَمَرَ أَنْ تُطَلَّقَ لَهَا النِّسَاءُ﴾ رواه الشيخان، (عبدالله)ى كوڕى ئيمامى (عمر) رضى الله عنهما ژنەكەى خۆى لە حەيزدا تەلاق دا، ئيمامى (عمر) پرسيارى لە پێغەمبەر ﷺ كرد؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووى: تۆ فەرمانى پێبكە: ژنەكەى بگەڕێنێتەوەو ڕايبگرێ تا پاك دەبێتەوە، ئينجا دەكەوێتە حەيز، ئينجا پاك دەبێتەوە، ئينجا ئەگەر حەزى كرد: با ڕاى بگرێو تەلاقى نەدا، ئەگەر حەزيشى كرد: با لەو پاكبوونەوەدا تەلاقى بدا پێش ئەوەى جيماعى لەگەڵ بكا، ئەوەيان ئەو كاتەيە كە خواى گەورە فەرمانى كردوە ژنى تێدا تەلاق بدرێن كە دەفەرموێ: ﴿فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾ هەر كاتێك ژنەكانتان تەلاق دان لە كاتى دەست پێكردنى (عِدَّة)كانيان تەلاقيان بدەن.

(وَقِيلَ إِنْ سَأَلَتْهُ لَمْ يَحْرُمْ) لە فەرموودەيەكى بێهێزدا: ئەگەر ژنەكە بەخۆى داواى لێبكا لە حەيزدا تەلاقى بدا، تەلاقدانەكە حەرام نابێ؟ چونكە بەخۆى بە درێژبوونەوەى (عِدَّة) ڕازىيە (وَيَجُوزُ خُلْعُهَا فِيهِ) دروستە: لە حەيزو نيفاسدا خولع لەگەڵ ژنەكە بكا، چونكە خواى گەورە دەفەرموێ: ﴿فَلاَجُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَاافْتَدَتْ بِهِ﴾ هيچ گوناهيان ناگاتێ لەوەى ژنەكە خۆى بە پارە لە مێردەكەى ڕزگار بكا. واتە: لەم ئايەتەدا باسى حەيزو خاوێنى نەكراوە (لاَ أَجْنَبِيٍّ) بەلام خولع لەگەڵ بێگانە لە حەيزدا حەلاڵ نيە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەى ڕاستتردا، بەلام ئەگەر ژنەكە ئيزنى بدا لە حەيزدا خولعى بۆ بكا، ئەو كاتە حەلاڵە، هەروەك لە (نهاية)و (مغني)دا فەرموويانە.

(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر مێردەكە گوتى (أَنْتِ طَالِقٌ مَعَ آخِرِ حَيْضِك) تۆ تەلاقكەوتووى لەگەڵ كۆتايى حەيزەكەتدا، ئەوە (فَسُنِّيٌّ فِي الأَصَحِّ) تەلاقەكە (سُنِّي)يە، لە فەرموودەى ڕاستتردا، چونكە ئەو كاتە دەست پێكردنى (عِدَّة)ى بە دوادا دێ (أَوْ) يان مێردەكە گوتى (مَعَ آخِرِ طُهْرٍ

لَمْ يَطَأْهَا فِيهِ فَبِدْعِيٌّ عَلَى الْمَذْهَبِ. وَطَلَاقٌ فِي طُهْرٍ وُطِئَ فِيهِ مَنْ قَدْ تَحْبَلُ وَلَمْ يَظْهَرْ حَمْلٌ، فَلَوْ وَطِئَ حَائِضًا وَطَهُرَتْ فَطَلَّقَهَا فَبِدْعِيٌّ فِي الْأَصَحِّ، وَيَحِلُّ خُلْعُهَا وَطَلَاقُ مَنْ ظَهَرَ حَمْلُهَا، وَمَنْ طَلَّقَ بِدْعِيًّا سُنَّ لَهُ الرَّجْعَةُ، ثُمَّ إِنْ شَاءَ طَلَّقَ بَعْدَ طُهْرٍ،

---

لَمْ يَطَأْهَا فِيهِ) تەڵاقت کەوتبێ لە کۆتایی ئەو پاکبوونەوەی کە جیماعی لەگەڵ نەکردبێ، ئەوە (فَبِدْعِيٌّ) تەڵاقی (بِدْعِي)یە (عَلَى الْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب، چونکە ئەو کاتە دەست پێکردنی (عِدَّة)ی بەدوادا نایێ، بەڵکو دەبێتە حەیز.

**دووەمیان:** (وَطَلَاقٌ فِي طُهْرٍ وُطِئَ فِيهِ) تەڵاقدانی ژنێکە: کە لە پاکبوونەوەدا بێو لەو پاکبوونەوەشدا جیماعی لەگەڵ کرابێ (مَنْ قَدْ تَحْبَلُ) ژنێکی وەهاش بێ: دەگونجا ئاوس بێو (وَلَمْ يَظْهَرْ حَمْلٌ) لە کاتی تەڵاقدانەکەش ئاوسیەکەی دەرنەکەوتبێ، چونکە وا دەبێ لە دوای تەڵاقدان ئاوسیەکەی دەر دەکەوێو پەشیمان دەبێتەوە، بۆیێ لە حەدیسەکەی ڕابردوودا فەرمووی: ﴿إِنْ شَاءَ أَمْسَكَ وَإِنْ شَاءَ طَلَّقَ قَبْلَ أَنْ يَمَسَّ﴾ ئەگەر حەزی کرد با لەو پاکبوونەوەیەدا پێش جیماع لەگەڵکردن تەڵاقی بدا.

کەواتە: ژنی نەبالغو ژنی لە حەیزکەوتوو تەڵاقدانیان: نە (سُنِّي)یەو نە (بِدْعِي)یە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(فَلَوْ وَطِئَ حَائِضًا وَطَهُرَتْ) ئەگەر جیماعی لەگەڵ ژنێکی حەیزدار کردو لە حەیزەکە پاك بۆوە (فَطَلَّقَهَا) ئینجا لە پاکبوونەوەکەدا تەڵاقیدا، ئەوەش (فَبِدْعِيٌّ فِي الْأَصَحِّ) تەڵاقی (بِدْعِي)یە لە فەرموودی ڕاستردا، چونکە دەگونجێ لەو جیماعە ئاوس ببێ.

(وَيَحِلُّ خُلْعُهَا) حەڵاڵە خولع لەگەڵ ئەوژنە بکا کە لە پاکبوونەوەدا جیماعی لەگەڵ کردوە، هەم (وَطَلَاقُ مَنْ ظَهَرَ حَمْلُهَا) حەڵاڵە ئەو ژنەش تەڵاق بدا کە ئاوسبوونەکەی دەرکەوتوە، چونکە ترسی پەشیمانی نەماوەو (عِدَّة)شی بە دانانی باری ناو زگەکەی تەواو دەبێ.

(وَمَنْ طَلَّقَ بِدْعِيًّا) هەرکەسێك بە (بِدْعِي) ژنەکەی تەڵاق دابێ (سُنَّ لَهُ الرَّجْعَةُ) بۆی سوننەتە هەر لە ماوەی (بِدْعِي)یەکەدا (رَجْعَة) بکا، واتە: ژنەکەی بگەڕێنێتەوە- بەو مەرجەی سێ‌بەسێ تەڵاقی نەدابێ- (ثُمَّ) ئینجا لە دوای گەڕاندنەوەکەش (إِنْ شَاءَ طَلَّقَ بَعْدَ طُهْرٍ) ئەگەر حەزی‌کرد لە دوای پاکبوونەوەیەك پێش جیماع لەگەڵکردن تەڵاقی دەدا، بەڵام وەها خێرترە: پاکبوونەوەکە تەواو بکاو بکەوێتەوە حەیز، ئینجا لە پاکبوونەوەی‌دووەمدا -ئەگەر حەزی‌کرد- پێش جیماع لەگەڵکردن تەڵاقی بدا؟ بە بەڵگەی حەدیسەکەی (إبن عمر)ی‌ڕابردوو.

ئینجا بزانە: لە حەدیسەکەدا دەفەرموێ: ﴿مُرْهُ فَلْيُرَاجِعْهَا﴾ تۆ فەرمانی پێبکە ژنەکەی بگەڕێنێتەوە. ئەوەش بەڵگەیە: کە تەڵاقی (بِدْعِي) دەکەوێ بەڵام تەڵاقدەرەکە گوناهبار دەبێ، جا بە گەڕاندنەوەی‌ژنەکەی گوناهەکەی لە سەر لادەچێ، ئینجا بۆیێ گەڕاندنەوەش واجب نیە، چونکە فەرمانی فەرمانکردن بە شتێك نابێتە فەرمان بە شتەکە،

وَلَوْ قَالَ لِحَائِضٍ أَنْتِ طَالِقٌ لِلْبِدْعَةِ وَقَعَ فِي الْحَالِ أَوْ لِلسُّنَّةِ فَحِينَ تَطْهُرُ، أَوْ لِمَنْ فِي طُهْرٍ لَمْ تُمَسَّ فِيهِ أَنْتِ طَالِقٌ لِلسُّنَّةِ وَقَعَ فِي الْحَالِ، وَإِنْ مُسَّتْ فِيهِ فَحِينَ تَطْهُرُ بَعْدَ حَيْضٍ، أَوْ لِلْبِدْعَةِ فَفِي الْحَالِ إِنْ مُسَّتْ فِيهِ، وَإِلاَّ فَحِينَ تَحِيضُ، وَلَوْ قَالَ: أَنْتِ طَالِقٌ طَلْقَةً حَسَنَةً أَوْ أَحْسَنَ الطَّلَاقِ أَوْ أَجْمَلَهُ. فَكَالسُّنَّةِ، أَوْ طَلْقَةً قَبِيحَةً أَوْ أَقْبَحَ الطَّلَاقِ أَوْ أَفْحَشَهُ. فَكَالْبِدْعَةِ، أَوْ سُنِّيَّةً بِدْعِيَّةً. أَوْ حَسَنَةً قَبِيحَةً. وَقَعَ فِي الْحَالِ، وَلاَ يَحْرُمُ جَمْعُ الطَّلَقَاتِ الثَّلاَثِ،

---

له حەدیسەکەشدا پێغەمبەرﷺ بەخۆی فەرمانی پێنەکرد بیگەڕێنێتەوە، بەڵکو فەرمووی: (تۆ فەرمانی پێبکە). هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَلَوْ قَالَ لِحَائِضٍ) ئەگەر مێردەکە بە ژنە حەیزدارەکەی گوت (أَنْتِ طَالِقٌ لِلْبِدْعَةِ) تۆ تەلاقکەوتووی بە (بِدْعِي). ئەوە (وَقَعَ فِي الْحَالِ) هەر ئەو دەم تەلاقی دەکەوێ (أَوْ لِلسُّنَّةِ) یان گوتی: تەلاقت کەوتبێ بە (سُنِّي). ئەوە (فَحِينَ تَطْهُرُ) لەو کاتەی لە حەیزەکەی پاك دەبێتەوە تەلاقی دەکەوێ (أَوْ لِمَنْ فِي طُهْرٍ لَمْ تُمَسَّ فِيهِ) یان گوتیە ئەو ژنەی لە پاکبوونەوەدایەو لەو پاکبوونەوەشدا جیماعی لەگەڵ نەکرابێ: (أَنْتِ طَالِقٌ لِلسُّنَّةِ) تۆ تەلاقکەوتووی بە (سُنِّي). ئەوە (وَقَعَ فِي الْحَالِ) هەر ئەو دەم تەلاقی دەکەوێ، بەڵام (وَإِنْ مُسَّتْ فِيهِ) ئەگەر لە پاکبوونەوەکەدا جیماعی لەگەڵ کرابێ، ئەوە (فَحِينَ تَطْهُرُ بَعْدَ حَيْضٍ) لەو کاتەی لە دوای حەیزیداهاتوو پاك دەبێتەوە تەلاقی دەکەێ (أَوْ لِلْبِدْعَةِ) یان گوتیە ئەو ژنەی لە پاکبوونەوەدایە: تەلاقت کەوتبێ بە (بِدْعِي). ئەوە (فَفِي الْحَالِ إِنْ مُسَّتْ فِيهِ) هەر ئەو دەم تەلاقی دەکەوێ، ئەگەر جیماعی لەگەڵ کرابێ (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر لە پاکبوونەکەدا جیماعی لەگەڵ نەکرابێ، ئەوە (فَحِينَ تَحِيضُ) لەو کاتەی دەکەوێتەحەیز تەلاقی دەکەوێ.

(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر گوتی (أَنْتِ طَالِقٌ طَلْقَةً حَسَنَةً) تۆ تەلاقکەوتووی بە تەلاقێکی جوان (أَوْ أَحْسَنَ الطَّلَاقِ أَوْ أَجْمَلَهُ) یان بە جوانترین تەلاق. ئەوە (فَكَالسُّنَّةِ) وەك ئەوەیە بڵێ: تەلاقت کەوتبێ بە (سُنِّي). لە گشت بڕیارەکانیڕابردوودا (أَوْ) یان گوتی (طَلْقَةً قَبِيحَةً) تەلاقت کەوتبێ بەتەلاقێکی ناشیرین (أَوْ أَقْبَحَ الطَّلَاقِ أَوْ أَفْحَشَهُ) یان بە ناشیرنترین تەلاق. ئەوەش (فَكَالْبِدْعَةِ)وەك ئەوەیە بڵێ: تەلاقت کەوتبێ بە (بِدْعِي). لە گشت بڕیارەکانیڕابردوودا (أَوْ) یان گوتی (سُنِّيَةً بِدْعِيَةً أَوْ حَسَنَةً قَبِيحَةً) تەلاقت کەوتبێ بە تەلاقێکی (سُنِّي)ی(بِدْعِي)، یان بە تەلاقێکی جوانی ناشیرین، ئەوەش (وَقَعَ فِي الْحَالِ) هەر ئەو دەم تەلاقەکەی دەکەوێ.

## ﴿ تەلاقی سێبەسێ ﴾

(وَلاَ يَحْرُمُ جَمْعُ الطَّلَقَاتِ الثَّلاَثِ) حەرام نیە: هەرسێك تەلاقەکان وێکڕا کۆ بکاتەوەو ژنەکەی سێبەسێ-بە یەك ووشە- تەلاق بدا ﴿عن سهل بن سعدﷺ فِي قِصَّةِ الْمُتَلاَعِنَيْنِ: لَمَّا فَرَغَا

مِنْ تَلاعُنِهِمَا، قَالَ: كَذَبْتُ عَلَيْهَا-يَارَسُولَ اللهِ- إِنْ أَمْسَكْتُهَا. فَطَلَّقَهَا ثَلاثاً قَبْلَ أَنْ يَأْمُرَهُ النَّبِيُّ ﷺ﴾ رواه الشيخان، كه ئەو ژنو مێردەی لەعنەتیان لە یەكتری كرد لەعنەتەكەیان تەواو كرد، مێردەكە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەگەر ژنەكەم ڕابگرمەوە دیارە درۆم بە سەردا هەڵبەستوە. ئینجا سێبەسێ تەڵاقیدا پێش ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێبكا.
واتە: ئەگەر تەڵاقدانی سێبەسێ وێكڕا حەڕام بووایە، پێغەمبەر ﷺ ڕەخنەی لێدەگرت تاكو خەڵكیتریش بزانێ حەڕامە.
جا لەگەڵ ئەوەش كە سێبەسێ حەڕام نیە، وەها سوننەتە: سێبەسێ وێكڕا تەڵاقی نەدا، تاكو شوێنێك بۆ پەشیمانی بمێنێتەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.
جا بزانە لە لای ئیمامی(حنفي)و ئیمام(مالك): تەڵاقدانی سێبەسێ حەڕامە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەرسێكیش دەكەون ﴿عن محمود بن لبيد رضي الله عنه: أُخْبِرَ النَّبِيُّ ﷺ عَنْ رَجُلٍ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ ثَلاثاً جَمِيعاً، فَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ غَضْبَانَ ثُمَّ قال: أَيُلْعَبُ بِكِتَابِ اللهِ وَأَنَا بَيْنَ أَظْهُرِكُمْ؟﴾ رواه النسائی ورواته ثقات، پیاوێك ژنەكەی خۆی سێبەسێ وێكڕا تەڵاق دا، ئینجا پێغەمبەر ﷺ بە توڕەیی هەڵساو فەرمووی: ئایا گاڵتە بە قورئانی خوا دەكرێو منیش لە ناو ئێوەمە؟.
واتە: توڕەبوونی پێغەمبەر ﷺ بەڵگەی حەڕامییە.
ئینجا بزانە: بەڵگەی كەوتنی تەڵاقی سێبەسێ بە جارێك: (اجماع)ی (صحابة)ی پێغەمبەرە ﷺ لە سەردەمی ئیمامی(عمر رضي الله عنه)، هەروەك لە (فتح الباری)و (شرح المُوَطَّأ)دا فەرموویانە ﴿عن ابن عباس رضي الله عنهما: كَانَ الطَّلَاقُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ وَأَبِي بَكْرٍ وَسَنَتَيْنِ مِنْ خِلافَةِ عُمَرَ طَلَاقُ الثَّلاثِ وَاحِدةً، فَقَالَ عُمَرُ: إِنَّ النَّاسَ قَدْ إِسْتَعْجَلُوا فِي أَمْرٍ كَانَ لَهُمْ فِيهِ أَنَاةٌ فَلَوْ أَمْضَيْنَاهُ عَلَيْهِم. فَأَمْضَاهُ عَلَيْهِمْ﴾ رواه مسلم، لە سەردەمی پێغەمبەرو ﷺ ئیمامی (أبوبكر)و دوو ساڵیش لە سەردەمی ئیمامی(عمر) تەڵاقی سێبەسێ یەكە یەكە تەڵاق دەدرا، جا ئیمامی(عمر) فەرمووی: ئەو خەڵكە پەلەیان كرد لە كارێكیوەهادا: كە مۆڵەتیان بۆ هەبو، دەبا ئەو پەلەكردنە لە سەریان جێبەجێ بكەین-واتە: كە ئێستا لە جیاتی یەكە یەكە، بە پەلە سێبەسێ بە جارێك تەڵاق دەدەن- جا ئیمامی(عمر) جێبەجێی كردو بڕیاریدا: تەڵاقی سێبەسێ بە جارێك بكەوێ.
واتە: (صحابة)ش بە بڕیاری ئیمامی(عمر رضي الله عنه) ڕازی بونو ڕەخنەیان نەگرتو بووە (إجماع)، جا هەر كەسێك لە دوای (إجماع)ی (صحابة) ڕای جیاواز بێ، ئەوە (إجماع)ی فڕێداوەو ڕایەكەی وی ڕەچاو ناكرێ، هەروەك لە (فتح الباری)دا فەرموویەتی.
ئینجا بە دوای (صحابە)شدا هەر لە سەردەمی (السَّلف الصَّالح)دا (إِجْمَاع)ی هەر چوار ئیمامەكانی سەرمەزهەبیش بەستراوە: لە سەر كەوتنی تەڵاقی سێبەسێ بە جارێك، هیچ

زانایەکی متمانەپێکراویش لەو مەسەلەیەدا دژایەتی (إجماع)ی نەکردوە، بۆیێ لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە: ئەوەی (فتوا)ی داوە: کە (تەڵاقی سێبەسێ بە جارێك ناکەوێ)، خوای گەورە گومڕای کردوە. واتە: چونکە جیماع کردن لەگەڵ تەڵاقکەوتووی سێبەسێ زینایەو واجبە: سزای زینا بدرێ، هەروەك لە باسی(مارە بەجاش)دا ڕابرا.

ئینجا بزانە: لە دوای شەشسەد ساڵ (إبن تیمیة) پەرژینی (إجماع)ی شکاندو لە (إِجْمَاعِ أَهْلِ السُّنَّةِ وَالْجَمَاعَةِ) لایداو بە مەزهەبی(شِیَعة) فتوای دا: کە (تەڵاقی سێبەسێ تەنها بە یەك تەڵاق دەژمێردرێ). هەر حەدیسەکەی (إبن عباس)ی ڕابردووشی کردە بەڵگەی خۆی، چەند کەسێکیش تا ئێستاش بونەتە هاوبیری (إبن تیمیة) لەو مەسەلەیەدا.

بەڵکو ئەگەر تەڵاقدانەکەش بە شێوەی سوێندخواردن بێ، ئەوە لە لای ئەوان هەر تەڵاقەکەی ناکەوێ، بەڵکو کەففارەتی سوێند واجب دەبێ. جا ئەم (بِدْعَة)یەش (إبن تیمیة) لە ئیسلامدا پەیدای کردوەو هیچ پێشەوایەکی ئایین ئەو قسەیەی نەکردوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

جا لە قسەکانی (إبن تیمیة)و هاوبیرانی وا دەردەکەوێ: (کە ئیمامی(عمرﷺ) دژ بە **بڕیاری پێغەمبەرﷺ بڕیاری داوەو بە هەڵەدا چووە، بەڵام (صحابە)ی پێغەمبەرﷺ زۆر لە ئیمامی(عمرﷺ) ترساون و نەوێراون ڕەخنە بگرن)!!!**. هەم بە چەند بەڵگەیەکی داهاتووش.

جا بزانە: چونکە (إبن تیمیة) ئەم زماندرێژیەی کردە سەر ئیمامی(عمرﷺ)، بۆیێ زانایانی هەر چوار مەزهەب- لەو سەردەمدا- کۆ بونەوەو بڕیاریان دا: (إبن تیمیة) بەند بکرێ، هەر لە بەندیخانەشدا مرد. جا ئێمەش ئێستا چەند بەڵگەیەکی (إبن تیمیة)و هاوبیرانی دێنین و لە لایەن (أهل السنة والجماعة)ش وەڵامیان دەدەینەوە.

**یەکەم**: ئەوان دەڵێن: تەڵاقی سێبەسێ لە سەردەمی پێغەمبەرداﷺ تەنها بە یەك تەڵاق ژمێردراوە، بە بەڵگەی حەدیسەکەی (إبن عباس)ی ڕابردوو، بەڵام ئیمامی(عمرﷺ) لەخۆیەوە بڕیاری کەوتنی تەڵاقی سێبەسێی داوە، ئیمامی(عمرﷺ) بە بێبەڵگە دژایەتی بڕیاری پێغەمبەریﷺ کردوە!.

**وەڵامی( أهل السنة )**: واتەی حەدیسەکە بەو ڕاو بۆچوونەی ئێوە نیە، بەڵکو واتەی حەدیسەکە ئەمەیە: خەڵکەکە لە سەردەمی پێغەمبەرداﷺ-بە ئەغلەبی- یەکە یەکە ژنی تەڵاق دەدا، بەڵام لە سەردەمی ئیمامی(عمر)دا عادەتی خەڵك گۆڕاو لە تەڵاقداندا پەلەیان دەکردو-بە ئەغلەبی-سێبەسێ بە جارێك تەڵاقیان دەدا، هەروەك ئیمامی (البیهقی بإسناد صحیح) گێڕاویەتیەوە. کەواتە: حەدیسەکەی (إبن عباس)ی ڕابردوو ئەوەمان پێڕادەگەیەنێ: کە لە سەردەمی ئیمامی(عمر)دا عادەتیخەڵك لە تەڵاقداندا گۆڕا: بە پەلە

سێبەسێ بە جارێك تەڵاقیان دەدا، ئیمامی(عمر)ش بڕیاری عادەتەگۆڕاوەکەی بە سەردا سەپاندن، نەك ئیمامی(عمر)-دژ بە پێغەمبەرﷺ- بڕیاری شەریعەتی ئیسلامی لە مەسەلەکەدا گۆڕیبێ، هەروەك ئیمامی (النواوی) لە (شرح مسلم)و (الحافظ العسقلاني) لە (فتح الباری)دا ئەوها ڕوونیان کردۆتەوە.

بێگومان ئەو سێ ئیمامانەش هەرسێکیان لە (إبن تیمیە) زاناترو شارەزاترن؟ چونکە هەرسێکیان زانای حەدیس و شەریعەتن و متمانەیان پێدەکرێ.

**دووەم**: ئەوان دەڵێن: ئەگەر یەکێك بڵێ: (سێ جار سبحان الله). ئەوە تەنها یەك (سبحان الله)ی بۆ دەنووسرێ، یان ئەگەر بڵێ: (سێ جار والله ئەم کارە ناکەم). ئەوە تەنها بە یەك سوێند دەژمێردرێ، کەوابو: ئەگەر بڵێ: (سێ تەڵاقت بکەوێ). ئەوەش یەك تەڵاقی دەکەوێ.

**وەڵامی (أهل السنة)**: سوێندخواردن و زیکری خوا-کە سبحان الله یە- هیچ سنورێکیان بۆ دانەندراوە، بەڵام تەڵاقدان سنورێکی هەیە: کە سێ تەڵاقە، کەوابو: (قیاس)کردنەکەتان بەتاڵ و پوچەڵە، هەروەك لە (فتح الباري)دا ڕوون کراوەتەوە.

واتە: تەڵاق زیاتر بە مامڵەتەکان دەچێ، چونکە سنورێکی هەیە: وەك یەکێك بڵێ: لە سێ دینارەکە گەردەنت ئازاد بێ. یان ئەم شتەم لێت کڕی بە سێ دینار. یان سێ دینارم لە سەر نەزر بێ. ئایا ئەمە بە یەك دینار دەژمێردرێ، یان بە سێ دینار؟.

**سێیەم**: ئەوان دەڵێن: ﴿طَلَّقَ رُكَانَةُ امْرَأَتَهُ ثَلاثاً فِي مَجْلِسٍ وَاحِدٍ فَقَالَ النَّبِيُّﷺ: راجِعْهَا إنَّهَا واحِــدَةٌ﴾ رواه أحمد وأبوداود بسند فیه مقال، (رُكانة) ژنەکەی خۆی لە یەك دانیشگەدا سێبەسێ تەڵاق دا، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ژنەکەت بگەڕێنەوە، تەنها یەك تەڵاقت کەوتوە.

**وەڵامی (أهل السنة)**: ئەم حەدیسە بە ووشەی (طَلَّقَ امْرَأَتَهُ ثَلاثاً) حەدیسێکی (ضَعیف)-بێهێزە، هەروەك ئیمامی (النواوي) لە (شرح مسلم)دا فەرموویەتی، بەڵکو (صَحیح) ڕاستەکەی ئەوهایە: ﴿طَلَّقَ رُكَانَةُ امْرَأَتَهُ الْبَتَّةَ، فَحَلَّفَهُ النَّبِيُّﷺ: وَاللهِ مَا أَرَدْتُ إلاَّ وَاحِدَةً. فَرَدَّهَا عَلَيْهِ﴾ حدیث صحیح رواه أبوداود وغیره، (رُكانة) ژنەکەی خۆی بە ووشەی (الْبَتَّة)- بڕاوەیی تەڵاق دا، جا پێغەمبەرﷺ سوێندی دا: کە مەبەستم تەنها یەك تەڵاق بوە. ئینجا ژنەکەی بۆ گەڕاندەوە.

واتە: (رُكانة) بە زمان سێ تەڵاقی نەگوتبو، بەڵام پێغەمبەرﷺ لە سەر نیەتەکەی سوێندی دا، نەوەك نیەتی سێ تەڵاقی هەبوبێ و سێ تەڵاقەکەی کەوتبێ، جا ئەگەر سێ تەڵاقەکە وێکڕا بە جارێك نەکەوتبان، بۆچی سوێندی داوەو سوێنددانەکە سودی چی بوو؟، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

**چوارەم**: ئەوان دەڵێن: لە حەدیسەکەی(محمود بن لبید)ی ڕابردوو، پێغەمبەرﷺ تووڕە بوو، چونکە پیاوەکە سێ بەسێی تەڵاق دابوو.

**وەڵامی (أهل السنة)**: خۆ حەدیسەکە باسی ئەوەی تێدا نەکراوە: ئایا پێغەمبەرﷺ بە یەك تەڵاقی ژماردوە، یان بە سێ تەڵاق، کەوابو: ئەو حەدیسە پەیوەندی بە مەسەلەی تەڵاقکەوتنەوە نیە، بەڵکو حەدیسەکە بەڵگەیە: کە تەڵاقی سێ بەسێ لە سەردەمی پێغەمبەرداﷺ ڕوی داوەوە، جا لە بەر ئەوەش کە تەڵاقی سێ بەسێ ناپەسندو خراپە، پێغەمبەرﷺ ڕقی بۆتەوەو تووڕە بووە.

بۆیێ -هەر بە بەڵگەی ئەم حەدیسەش- ئیمامی(عمرﷺ) ئەو کەسەی دارکاری دەکرد کە سێ بەسێ ژنەکەی تەڵاق دەدا، هەروەك (سعید بن منصور، بسندصحیح) لە (أنس) گێڕاویەتیەوەو، لە (فتح الباری)دا ڕوون کراوەتەوە.

ئیتر وا تێمەگە: ئیمامی(عمرﷺ) لە مەسەلەی تەڵاقی سێ بەسێ بێ ئاگا بووە، بەڵکو لە هەزارانی وەکو (إبن تیمیة)و هاوبیرانی زیاتر شارەزای ئایینی ئیسلام بووە، چونکە قوتابی و پەروەردەکراوی پێغەمبەرەﷺو، لە ڕاستیدا ئیمامی (عمر)ﷺ (شَیْخ الإسلام)ە، نەك (إبن تیمیة)!.

**پێنجەم**: ئەوان دەڵێن: ئیمامی(علی)و (إبن عباس)رضی‌الله عنهم بە پێچەوانەی ئیمامی(عمر) فتوایان داوەو (إجماع) بە تەواوی نەبەستراوە.

**وەڵامی (أهل السنة)**: ئەم قسەیە ڕاست نیەو لە هیچ ڕێگایەکی ڕاست نەهاتوە، بەڵکو پێچەوانەکەی ڕاستە: کە ﴿عن ابن عباس رضی‌الله عنهما: أَنَّهُ جَائَهُ رَجُلٌ طَلَّقَ إمْرَأَتَهُ ثَلَاثاً، فَقَالَ: يَنطَلِقُ أَحَدُكُمْ فَيَرْكَبُ الأُحْمُوقَةَ ثُمَّ يَقُولُ: يَا ابْنَ عَبَّاسٍ يا ابْنَ عَبَاسٍ. إنَّ اللهَ تَعَالَى قَالَ: (وَمَنْ يَتَّقِ اللهَ يَجْعَلْ لَهُ مَخْرَجاً). وَإِنَّكَ لَمْ تَتَّقِ اللهَ فَلاَ أَجِدُ لَكَ مَخْرَجاً، عَصَيْتَ رَبَّكَ وَبَانَتْ مِنْكَ إمْرَأَتُكَ﴾ رواه أبوداود بسند صحيح، پیاوێك گوتەیە (إبن عباس): من ژنەکەم سێ بەسێ تەڵاق داوە؟ (إبن عباس) فەرمووی: هەر یەکێکتان هەڵدەستێ خۆی توشی بێ عەقڵی دەکا، ئینجا دەڵێ: (ابن عباس، ابن عباس). خوای گەورەش دەفەرموێ: (هەرکەسێك لە خوا بترسێ، خوای گەورە لە تەنگانەدا ڕزگاربوونێکی دەداتێ). تۆ لە خوا نەترساوی، هیچ چارەتم پێ ناکرێ و ژنەکەشت بە (بائن)ی تەڵاقی کەوتوە.

جا کە ئێوە دەڵێن: (صحابة) لە ترسی ئیمامی(عمرﷺ) نەوێراون ڕەخنە بگرن. خۆ (ابن عباس) بە ماوەیەکی زۆر لە دوای ئیمامی(عمرﷺ) وەفاتی کردوە، تۆ بڵێی لە دوای وەفاتیشی هەر لێی ترسابێ؟! جگە لەمەش کە ئیمامی(عمرﷺ) ویستی سنورێك بۆ مارەیی ژنان دابنێ، ئافرەتێك ڕەخنەی لێگرت و گوتی: (تۆ ناتوانی دەست لەم کارە

بدەی). ئیمامی(عمرﷺ) بە قسەی ئەم ئافرەتە پەشیمان بۆوە. هەروەها (صحابة)یەك پێی گوت: (هۆ (عمر) ئەگەر تۆ خوار بیت، بەم شمشێرە ڕاستت دەکەینەوە).
تۆ بڵێی هەموو (صحابة)ی پێغەمبەر غیرەتی ئەم ئافرەتەو ئەم (صحابة)یان نەبوبێ، تاکو هەڵەی ئیمامی(عمرﷺ) لە تەڵاقی سێبەسێدا ڕاست بکەنەوە؟!.
جا ئەی موسوڵمانی ڕێزدار، وەرە با بە یەکەوە بچینە خزمەت پێغەمبەرﷺ کە دەفەرموێ: ﴿عَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِالْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ﴾ حديث صحيح رواه الترمذي، شوێن سوننەتی منو سوننەتی خەلیفەکانی من بکەون. خۆ لە سەردەمی ئیمامی(عمر)دا دوو خەلیفەکەیتریش-ئیمامی(عثمان)و ئیمامی(علي)رضی الله عنهما-مابون، جا توخودا ڕەوایە: واز لە هەرسێك خەلیفەکانو (صحابة)کانیتر بێنینو شوێن (ابن تيمية) بکەوین؟ ئەوەتە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ ﴿إقْتَدُوا بِاللَّذَيْنِ مِنْ بَعْدِي: أبِيبَكْرٍ وَعُمَرَ﴾ رواه الترمذي بسند حسن، ئێوە شوێن هەردوو جێنیشینەکەی دوای من بکەون؟ کە (أبوبكر و عمر)ن.
باشە: ئەگەر (إبن تيمية) بە لای تۆوە زاناتر بێ لە (صحابة)ی پێغەمبەروﷺ لە هەر چوار ئیمامەکەی سەر مەزهەب، فتوای ئەوت پێ ڕاستتر بێ لە بڕیارەکەی ئیمامی (عمرﷺ)، ئەدی چۆن وەڵامی پێغەمبەرﷺ دەدەیەوە کە دەفەرموێ: ﴿إنَّ اللهَ جَعَلَ الْحَقَّ عَلَى لِسَانِ عُمَرَ وَقَلْبِهِ﴾ رواه الترمذي بسند حسن، خوای گەورە ڕاستیی داناوەتە سەر زوبانو دڵی (عمر)؟.
کەوابو: ڕێگای ڕاستمان بۆ ڕۆن بۆوە، خوای گەورەش دەفەرموێ: ﴿فَمَاذَا بَعْدَ الْحَقِّ إلاَّ الضَّلالُ﴾ ئایا لە دوای ڕاستی-جگە لە گومڕابوون- هیچیتر هەیە؟.
جا لەم سەردەمەشدا گومڕابووی وەها هەیە: فتوا دەدا: کە تەڵاقی سێبەسێ بە یەك تەڵاق دەژمێردرێو ژنی بێتەڵاق دەنێرێتەوە لای مێردەکەیو تووشی زینایان دەکەن، جا هەر چەند تامو خۆشیی زینایەکە بۆ ژنو مێردەکەیە، بەڵام تاوانو ڕووڕەشیی قیامەتیش بۆ فتوادەری گومڕابووە.
خۆ ئەگەر (إبن تيمية) لە چینی (السلف الصالح) بووایەو (مجتهد)یش بووایە، ئەو کاتە نرخێك بۆ فتوایەکەی دادەندرا، بەڵام (إبن تيمية) لە چینی(خَلَف)ەو لە سەدەی حەفتەمو هەشتەمدا ژیاوەو نەشگەیوەتە پلەی (مجتهد)و هیچ زانایەکی باوەڕپێکراویشی لەگەڵدا نیە، بەڵام سەرجەم (صحابة)و (مجتهد)ەکانی (أهل السنة والجماعة) لەگەڵ ئیمامی (عمر)نﷺ، پێغەمبەریشﷺ دەفەرموێ: ﴿عَلَيْكُمْ بِالْجَمَاعَةِ وَإيَّاكُمْ وَالْفُرْقَةَ، فَإنَّ الشَّيْطانَ مَعَ الْواحِدِ وَهُوَ مِنَ الإثْنَيْنِ أبْعَدُ﴾ رواه الترمذي بسند صحيح، هەردەم ئێوە لەگەڵ کۆمەڵدا بنو پەرتەوازەو تاکڕەوەی مەکەن، چونکە شەیتان لەگەڵ کەسێکی تاکدایەو لە دوو کەسان دوورترە.

وَلَوْ قَالَ أَنتِ طَالِقٌ ثَلاَثًا أَوْ ثَلاَثًا لِلسُّنَّةِ. وَفَسَّرَ بِتَفْرِيقِهَا عَلَى أَقْرَاءٍ لَمْ يُقْبَل إِلاَّ مِمَّنْ يَعْتَقِدُ تَحْرِيمَ الْجَمْعِ، وَالأَصَحُّ أَنَّهُ يُدَيَّنُ، وَيُدَيَّنُ مَنْ قَالَ أَنتِ طَالِقٌ وَقَالَ أَرَدْتُ إِنْ دَخَلْتِ أَوْ إِنْ شَاءَ زَيْدٌ، وَلَوْ قَالَ نِسَائِي طَوَالِقُ أَوْ كُلُّ امْرَأَةٍ لِي طَالِقٌ، وَقَالَ أَرَدْتُ بَعْضَهُنَّ. فَالصَّحِيحُ أَنَّهُ لاَ يُقْبَلُ ظَاهِرًا إِلاَّ لِقَرِينَةٍ: بِأَنْ خَاصَمَتْهُ وَقَالَتْ تَزَوَّجْتَ. فَقَالَ: كُلُّ امْرَأَةٍ لِي طَالِقٌ،

---

(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر مێردەکە گوتی (أَنْتِ طَالِقٌ ثَلاَثًا) تۆ تەڵاقکەوتووی سێبەسێ (أَوْ) یان گوتی (ثَلاَثًا لِلسُّنَّةِ) تەڵاقت کەوتبێ سێبەسێ بە (سُنِّی). ئینجا (وَفَسَّرَ بِتَفْرِيقِهَا عَلَى أَقْرَاءٍ) لە هەردوو مەسەلەکەدا مێردەکە گوتی: مەبەستم پەرتکردنی سێ تەڵاقەکان بوو بەسەر پاکبوونەوەکاندا، ئەوە(لَمْ يُقْبَل) لە ئاشکراییدا لێی قبوڵ ناکرێ (إِلاَّ مِمَّنْ يَعْتَقِدُ تَحْرِيمَ الْجَمْعِ) تەنها لەو کەسە قبوڵ دەکرێ کە باوەڕی وابێ: کۆکردنەوەی سێ تەڵاق وێکڕا حەرامە، وەك (حنفی)و (مالکی).

جا هەرچەند بە ئاشکرایی لێی قبوڵ ناکرێ، بەڵام (وَالأَصَحُّ أَنَّهُ يُدَيَّنُ) بە فەرموودەی ڕاستتر: مێردەکە دەدرێتە دەست ئایینیخۆی، واتە: بە ژنەکەی دەڵێین: (لە ئاشکراییدا لە مێردەکەت حەرام بوی، بەڵام ئەگەر باوەڕت وایە ڕاست دەکا، خۆتی بدە دەست، ئەگەر نا: خۆتی مەدە دەست). هەم بە مێردەکەشی دەڵێین: (ئێمە باوەڕت پێناکەینو لە ئاشکراییدا هەرسێك تەڵاقت کەوتون، بەڵام ئەگەر ڕاست بکەی ئەوە لە نێوان خۆتو خوادا سێ تەڵاقت نەکەوتون).

جا ئەوە مەبەستی ئیمامی(الشافعی)یە کە دەفەرموێ: (لَهُ الطَّلَبُ وَعَلَيْهَا الْهَرَبُ) مێردەکە مافی داواکردنی جیماعی هەیەو ژنەکەش لە سەری واجبە ڕابکا. هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا گێڕاویەتیانەوە.

(وَ) هەروەها (يُدَيَّنُ مَنْ قَالَ أَنْتِ طَالِقٌ) ئەو مێردەش دەدرێتە دەست ئایینی خۆی کە بڵێ: تۆ تەڵاقکەوتووی. ئینجا (وَقَالَ أَرَدْتُ إِنْ دَخَلْتِ أَوْ إِنْ شَاءَ زَيْدٌ) مەبستم ئەوە بوو: ئەگەر بچیتە ناو خانوو، یان ئەگەر (زەید) حەز بکا تەڵاقی کەوتبێ.

(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر مێردەکە گوتی (نِسَائِي طَوَالِقُ) ژنەکانم تەڵاقکەوتوون (أَوْ) یان گوتی (كُلُّ امْرَأَةٍ لِي طَالِقٌ) گشت ژنێکی خۆم تەڵاقکەوتووە، ئینجا (وَقَالَ أَرَدْتُ بَعْضَهُنَّ) گوتی مەبەستم هەندێکیان بوو، نەك هەموویان، ئەوە (فَالصَّحِيحُ أَنَّهُ لاَ يُقْبَلُ ظَاهِرًا إِلاَّ لِقَرِينَةٍ) بە فەرموودەی ڕاستتر: لە ئاشکراییدا لێی قبوڵ ناکرێ تەنها بە نیشانەیەك نەبێ: (بِأَنْ خَاصَمَتْهُ وَقَالَتْ تَزَوَّجْتَ) وەك ژنەکەی ململانەی لەگەڵ بکاو بڵێ: ژنت بە سەر هێناوم (فَقَالَ) مێردەکەش لە وەڵامیدا بڵێ: (كُلُّ امْرَأَةٍ لِي طَالِقٌ) گشت ژنێکی من تەڵاقکەوتوو

وَقَـــــــالَ أَرَدْتُ غَـــــيْرَ الْــــمُـــخَاصَـــمَــــــةِ.

(فَصْلٌ) قَالَ أَنْتِ طَالِقٌ فِي شَهْرِ كَذَا أَوْ فِي غُرَّتِهِ أَوْ أَوَّلِهِ. وَقَعَ بِأَوَّلِ جُزْءٍ مِنْهُ، أَوْ فِـــي نَهَارِهِ أَوْ أَوَّلِ يَوْمٍ مِنْهُ فَبِفَجْرِ أَوَّلِ يَوْمٍ، أَوْ آخِرِهِ فَبِآخِرِ جُزْءٍ مِنَ الشَّهْرِ، وَقِيلَ بِـــأَوَّلِ النِّصْفِ الآخِرِ،

---

بێ، ئینجا (وَقَالَ أَرَدْتُ غَيْرَ الْمُخَاصِمَةِ) مێردەکە گوتی: مەبەستم ژنێکیتر بوو جگە لەو ژنەی ململانەی لەگەڵ کردم. ئەوە بە سوێندخواردن لێی قبوڵ دەکرێ.

هەروەها ئەگەر ژنەکەی بیەوێ بڕواتە شوێنێك، ئەویش بڵێ: ئەگەر ئەمشەو بچیتە دەرەوە تەلاقت کەوتبێ. ئینجا ژنەکە چووە شوێنێکیتری جگە لە شوێنە ناوبراوەکە، بەلام مێردەکە گوتی: تەنها مەبەستم ئەوە بوو: لە شوێنە ناوبراوەکە قەدەغەی بکەم. ئەوەش بە سوێندخواردن باوەڕی پێدەکرێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی هەڵواسینی تەلاق بە کاتەکان ﴾

(قَالَ) هەر کاتێك مێردەکە گوتی (أَنْتِ طَالِقٌ فِي شَهْرِ كَذَا) تۆ تەلاقکەوتووی لە فلانە مانگەدا (أَوْ فِي غُرَّتِهِ أَوْ أَوَّلِهِ) یان لە دەرکەوتنی، یان لە سەرەتای، یان لە سەری فلانە مانگەدا، ئەوە (وَقَعَ بِأَوَّلِ جُزْءٍ مِنْهُ) تەلاقی دەکەوێ لەگەڵ هاتنی یەکەم بەشی مانگەکە: کە سەرەتای شەوییەکەمی مانگەکەیە بەگوێرەی کاتی شوێنی هەڵواسینی تەلاقەکە، نەك کاتی شوێنێکیتر (أَوْ) یان گوتی (فِي نَهَارِهِ أَوْ أَوَّلِ يَوْمٍ مِنْهُ) تەلاقت کەوتبێ لە ڕۆژی فلانە مانگەدا، یان لە یەکەم ڕۆژی فلانە مانگەدا، ئەوە (فَبِفَجْرِ أَوَّلِ يَوْمٍ) تەلاقی دەکەوێ لەگەڵ بەیانیی یەکەم ڕۆژی مانگەکە (أَوْ) یان گوتی (آخِرِهِ) تەلاقت بکەوێ لە کۆتایی فلانە مانگەدا، ئەوە (فَبِآخِرِ جُزْءٍ مِنَ الشَّهْرِ) لەگەڵ دواترین بەشی مانگەکە تەلاقی دەکەوێ: کە ئاوابوونی ڕۆژی کۆتاییمانگەکەیە (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا (بِأَوَّلِ النِّصْفِ الآخِرِ) بە سەرەتای نیوەیدووەمی مانگەکە تەلاقی دەکەوێ .

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر بڵێ: تەلاقت کەوتبێ پێش مردنم بە چوار مانگو دە ڕۆژ. ئینجا زیاتر لە چوار مانگو دە ڕۆژ ژیا، ئینجا مرد، ئەوە ئاشکرا دەبێ: کە بە ماوەی چوار مانگو دە ڕۆژ پێش مردنی تەلاقی کەوتوە، جا ئەگەر تەلاقەکە (بائن)بێ، ئەو کاتە ژنەکە میراتی لێناگرێو هەم (عِدَّة)ی مێردمردنیشی لە سەر نیە، بەڵکو ئەگەر (عِدَّة)ی تەلاق تەواو نەبوبێ تەواوی دەکا. بەلام ئەگەر بڵێ: تەلاقت کەوتبێ لە ڕۆژی کۆتایی ژیانمدا. ئەو کاتە تەلاقی دەکەوێ لەگەڵ بەیانیی ئەو ڕۆژەی تێیدا دەمرێ، جا ئەگەر لە شەوێدا بمرێ، ئەو کاتەش هەر لە بەیانیی ڕۆژی پێش شەوەکەدا تەلاقی دەکەوێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا ڕوون کراوەتەوە.

وَلَوْ قَالَ لَيْلاً: إِذَا مَضَى يَوْمٌ. فَبِغُرُوبِ شَمْسِ غَدِهِ، أَوْ نَهَارًا: فَفِي مِثْلِ وَقْتِهِ مِنَ غَـدِهِ، أَوْ اَلْيَوْمُ: فَإِنْ قَالَهُ نَهَارًا فَبِغُرُوبِ شَمْسِهِ وَإِلاَّ لَغَا، وَبِهِ يُقَاسُ شَهْرٌ وَسَنَةٌ، أَوْ أَنْتِ طَالِقٌ أَمْسِ. وَقَصَدَ أَنْ يَقَعَ فِي الْحَالِ مُسْتَنِدًا إِلَيْهِ وَقَعَ فِي الْحَالِ، وَقِيلَ لَغْوٌ، أَوْ قَصَدَ أَنَّهُ طَلَّقَ أَمْسِ وَهِيَ الآنَ مُعْتَدَّةٌ صُدِّقَ بِيَمِينِهِ، أَوْ قَالَ طَلَّقْتُ فِي نِكَاحٍ آخَرَ،

---

جا بزانە: هەڵواسینی تەڵاق بە شوێنەکانیش دروست دەبێ، وەك بڵێ: لە فلانەخانووەدا تەڵاقت کەوتبێ. ئەوە هەر کاتێك ژنەکە بچێتە ناو خانووەکە تەڵاقی دەکەوێ، هەروەك لە (تحفة) لە باسی (ظهار)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَلَوْ قَالَ لَيْلاً) ئەگەر لە شەوێدا گوتی (إِذَا مَضَى يَوْمٌ) هەر کاتێك ڕۆژێك ڕۆیشت تەڵاقت کەوتبێ. ئەوە (فَبِغُرُوبِ شَمْسِ غَدِهِ) لەگەڵ ئاوابوونی ڕۆژی سبەینێی تەڵاقی دەکەوێ (أَوْ نَهَارًا) یان لە ڕۆژێدا گوتی: هەر کاتێك ڕۆژێك ڕۆیشت تەڵاقت کەوتبێ. ئەوە (فَفِي مِثْلِ وَقْتِهِ مِنَ غَدِهِ) لە سبەینێ لە وێنەی ئەو کاتەیدا تەڵاقی دەکەوێ (أَوْ اَلْيَوْمُ) یان گوتی: هەر کاتێك ئەمڕۆ ڕۆیشت تەڵاقت کەوتبێ. ئەوە تەماشا دەکەین: (فَإِنْ قَالَهُ نَهَارًا) ئەگەر لە ڕۆژێدا وایگوتبێ، ئەوە (فَبِغُرُوبِ شَمْسِهِ) بە ئاوابوونی ڕۆژەکەی ئەمڕۆ تەڵاقی دەکەوێ (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر لە شەوێدا وایگوتبێ (لَغَا) پوچەڵ دەبێو هیچ تەڵاقێکی ناکەوێ.

بەڵام ئەگەر بڵێ: ئەمڕۆ تەڵاقت کەوتبێ، یان ئەم مانگە، یان ئەم ساڵە تەڵاقت کەوتبێ، ئەوە لەو وێنانەدا جیاوازی نیە شەو بێ، یان ڕۆژ بێ: هەر ئەودەم تەڵاقی دەکەوێ، هەروەك لەزۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَبِهِ يُقَاسُ) هەر بە مەسەلەی ڕۆژەکەش قیاس دەکرێ (شَهْرٌ وَسَنَةٌ) مانگو ساڵ، کەواتە: ئەگەر بڵێ: هەرکاتێك ئەم مانگە تەواو بوو تەڵاقت کەوتبێ. ئەوە هەر کاتێك ئەو بەشەی لە مانگەکە ماوە کۆتایی هات تەڵاقی دەکەوێ، بەڵام ئەگەر بڵێ: هەر کاتێك مانگێك ڕۆیشت تەڵاقت کەوتبێ. ئەوە تەڵاقی دەکەوێ بە ڕۆیشتنی سی ڕۆژو ئەندازەی پێش هەڵواسینەکەش لە شەوەکەی سیویەکەم، یان لە ڕۆژەکەی سیویەکەم.

(أَوْ) یان مێردەکە گوتی (أَنْتِ طَالِقٌ أَمْسِ) تۆ دوێنێ تەڵاقکەوتووی، یان مانگیڕابردوو، یان ساڵیڕابردوو تەڵاقکەوتووی (وَقَصَدَ أَنْ يَقَعَ فِي الْحَالِ مُسْتَنِدًا إِلَيْهِ) مەبەستیشی ئەوە بوو: هەر ئەم دەمە تەڵاقی بکەوێو بیداتە پاڵ دوێنێو مانگو ساڵیڕابردوو، ئەوە (وَقَعَ فِي الْحَالِ) هەر ئەو دەم تەڵاقی دەکەوێو نیسبەتدانەکەشی بۆ دوێنێ پوچەڵ دەکرێ (وَقِيلَ لَغْوٌ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: تەڵاقدانەکەش پوچەڵەو ناکەوێ (أَوْ قَصَدَ أَنَّهُ طَلَّقَ أَمْسِ وَهِيَ الآنَ مُعْتَدَّةٌ) یان مەبەستی ئەوە بوو: دوێنێ تەڵاقی داوەو ئێستا لە (عِدَّة)دایە، ئەو کاتە (صُدِّقَ بِيَمِينِهِ) بە سوێندخواردن باوەڕی پێدەکرێ (أَوْ قَالَ طَلَّقْتُ فِي نِكَاحٍ آخَرَ) یان

فَإِنْ عُرِفَ صُدِّقَ بِيَمِينِه، وَإِلاَّ فَلاَ. وَأَدَوَاتُ التَّعْلِيقِ: مَنْ كَمَــنْ دَخَلَــتْ، وَإِنْ، وَإِذَا، وَمَتَى، وَمَتَىمَا، وَكُلَّمَا، وَأَيُّ كَأَيٍّ وَقْتٍ دَخَلْتِ، وَلاَ يَقْتَضِينَ فَوْرًا إِنْ عُلِّقَ بِإِثْبَاتٍ فِي غَيْرِ خُلْعٍ، إِلاَّ أَنْتِ طَالِقٌ إِنْ شِئْتِ، وَلاَ تَكْرَارًا إِلاَّ كُلَّمَا، وَلَوْ قَالَ: إِذَا طَلَّقْتُكِ فَأَنْــتِ طَالِقٌ. ثُمَّ طَلَّقَ أَوْ عَلَّقَ بِصِفَةٍ فَوُجِدَتْ

---

گوتی: مەبەستم ئەوە بوو: لە مارەبڕینێکیتردا تـەلاقم دابـو، ئـەو کاتـە (فَـإِنْ عُـرِفَ صُـدِّقَ بِيَمِينِهِ) ئەگەر زاندرا: لە مارەبڕینێکی پێشتردا تەلاقیداوە، ئەو کاتـەش بـە سـوێندخواردن باوەڕی پێدەکرێ (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر نەزاندرا مارەبڕینو تەلاقەکە هـەبوە، ئـەوە (فَـلاَ) بـە سوێندخواردنیش باوەڕی پێناکرێو هەر ئەو دەمیش تەلاقی دەکەوێ.

جا بزانە: ئەگەر بڵێ: لە نێوان شەوێو ڕۆژێدا تەلاقت کەوتبێ. ئەوە ئەگەر شەو بـێ، بـە هاتنی بەیان تەلاقی دەکەوێ، ئەگەر ڕۆژ بێ، بە ڕۆژئاوابوون تـەلاقی دەکـەوێ، هـەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

(وَأَدَوَاتُ التَّعْلِيقِ) ئەو ووشەو پیتانەی بۆ هەڵواسینی تەلاق بە کار دێن زۆرن: وەك (مَـنْ)، واتە: کێ (کَـ) وەك بڵێ: (مَنْ دَخَلَتْ) کێ لە ژنەکانم بچێتە ناو خانووەکە تـەلاقی کـەوتبێ (وَإِنْ): ئەگەر بچێتە ناو خانووەکە تەلاقت کەوتبێ (وَإِذَا) هەر کاتێ بڕۆی تەلاقت کـەوتبێ (وَمَتَى وَمَتَىمَا) هەرکاتێکیداهاتوو بچێتە ماڵیباوکت تەلاقت کەوتبێ (وَكُلَّمَـا) هـەرجارێك ژنێکی مـن بچێتە خانووەکـە تـەلاقی کـەوتبێ (وَأَيُّ كَأَيٍّ وَقْتٍ دَخَلْتِ) ج کاتێك بچیتە ژوورەوە تەلاقت کەوتبێ.

(وَلاَ يَقْتَضِـينَ فَـوْرًا إِنْ عُلِّـقَ بِإِثْبَـاتٍ) پیـتو ووشـەکانی هەڵواسـین هچـێکیان پەلـەکردن ناخوازن ئەگەر بە هەبوونێك هەڵواسرابێ: وەك ئەو وێنانەیڕابردوو، هەم (فِـي غَيْـرِ خُلْـعٍ) هەڵواسینەکەش لە (خولع)دا نەبێ، واتە: لە تەلاقی بە پارەدا نەبێ، چونکە لـە (خولـع)دا پیتی (ئەگەر)و (هەرکاتێ) بۆ پەلەکردنن، هەروەك ڕابرا.

بەڵام ئەگەر بە نەبوونێك هەڵیواسیبێ، ئەو کاتە-جگە لە پیتی (ئەگەر)- ئەوانیتر گشتی بۆ پەلەکردنن، هەروەك دێ، هەم (إِلاَّ أَنْـتِ طَـالِقٌ إِنْ شِـئْتِ) جگە لـە: تـۆ تەلاقکەوتووی ئەگەر، یان هەرکاتێ حەزت کرد. واتە: ئەمەش مەرجە حەزکردنەکە بە پەلەبێ .

(وَلاَ تَكْـرَاراً) هــەم هیچـێکیان دووبارەبوونــەوەش نـاخوازن (إِلاَّ كُلَّمَـا) تــەنها ووشــەی (هەرجارێك) دووبارە دەخوازێ.

(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر گوتیە ئەو ژنەی جیماعی لەگەڵ کردوە: (إِذَا طَلَّقْتُكِ فَأَنْتِ طَـالِقٌ) هـەرکاتێ تۆم تەلاق دا تۆ تەلاقکەوتووی، یان تەلاقت کەوتبێ (ثُمَّ طَلَّـقَ) ئینجـا ژنەکـەی بـە خـۆڕایی تەلاق دا (أَوْ عَلَّقَ بِصِفَةٍ فَوُجِدَتْ) یان تەلاقەکـەی بـە شـتێك هەڵواسیو شـتەکەش هاتـەجێ،

فَطلَقتَان، أَوْ كُلَّمَا وَقعَ طَلاَقِي. فَطلَّقَ فَثلاَثٌ فِي مَمْسُوسَةٍ وَفِي غَيْرِهَا طَلْقَةٌ، وَلَوْ قَالَ وَتَحتَهُ أَربَعٌ: إنْ طَلَّقتُ وَاحِدَةً فَعَبْدٌ حُرٌّ وَإنْ ثِنْتَيْنِ فَعَبْدَان وَإنْ ثَلاَثًا فَثَلاَثَةٌ وَإنْ أَرْبَعًا فَأَرْبَعَةٌ. فَطلَّقَ أَرْبَعًا مَعًا أَوْ مُرَتَّبًا عَتَقَ عَشرَةٌ، وَلَوْ عَلَّقَ بِكُلَّمَا فَخَمْسَةَعَشرَ عَلَىالصَّحِيحِ،

---

ئەوە (فَطَلْقَتَان) لە هەردوو حاڵەتدا دووتەڵاقی دەکەون: یەکێکیان جێبەجێو یەکێکیتریش بە هەڵواسین، بەڵام ئەگەر خولع لەگەڵ ژنەکە بکا، یان جیماعی لەگەڵ ژنەکە نەکردبێ، ئەو کاتە تەنها تەڵاقەکەی جێبەجێ دەکەوێو دەبێتە (بائن).

هەروەها (أَوْ) ئەگەر گوتی (كُلَّمَا وَقَعَ طَلاَقِي) هەرجارێك تەڵاقم لە تۆ کەوتبێ تۆ تەڵاقکەوتووی (فَطَلَّقَ) ئینجا ژنەکەی تەڵاق دا، ئەوە (فَثَلاَثٌ فِي مَمْسُوسَةٍ) سێ تەڵاقی دەکەون لەو ژنەی جیماعی لەگەڵ کردوە (وَفِي غَيْرِهَا طَلْقَةٌ) لەو ژنەش کە جیماعی لەگەڵ نەکردوە یەك تەڵاقی دەکەوێ، چونکە بە تەڵاقەکەی جێبەجێ دەبێتە (بائن).

بەڵام ئەگەر بڵێ: هەر جارێك تەڵاقم دای تەڵاقت کەوتبێ. ئینجا تەڵاقیدا، ئەو کاتە دوو تەڵاقی دەکەون، چونکە تەڵاقەکەیدووەم بە هەڵواسینەکە دەکەوێ نەك بە تەڵاقدانی مێردەکە، هەروەك لەزۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە .

﴿ ئاگاداری ﴾: هەر کاتێك گوتیە ژنەکەی: ئەگەر ئەم کارە بکەی، یان ئەگەر برایەکەت ئەم کارە بکا تۆ ژنی من نی، یان تۆ نابیەوە ژنی من. ئەوە ئەگەر مەبەستی تەڵاقدان بێ، هەر کاتێك پێهەڵواسراوەکە هاتەجێ تەڵاقی دەکەوێ، ئەگەر نا: ناکەوێ، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

کەوابو: ئەگەر سوێند بخواو بڵێ: هەرسێك تەڵاقم کەوتبێ ژنی خۆم ناوێتەوە. یان بڵێتە ژنەکەی: هەرسێك تەڵاقت کەوتبێ تۆم ناوێتەوە. ئەوە ئەگەر یەکسەر لە دوای سوێندەکە بە تەڵاقێك ژنەکەی تەڵاق نەدا، هەرسێك تەڵاقی دەکەون، هەروەك لە (تحفة)و (الشرواني) فەرموویانە، چونکە ئەگەر تەڵاقی نەدا، دیارە ژنەکەی دەوێتەوە.

(وَلَوْ قَالَ وَتَحْتَهُ أَرْبَعٌ) ئەگەر مێردەکە چوار ژنی هەبونو گوتی (إِنْ طَلَّقْتُ وَاحِدَةً فَعَبْدٌ حُرٌّ) ئەگەر ژنێك تەڵاق بدەم کۆیلەیەکم ئازاد بێ (وَإِنْ ثِنْتَيْنِ فَعَبْدَانِ) ئەگەر دوو ژن تەڵاق بدەم دوو کۆیلەم ئازاد بن (وَإِنْ ثَلاَثًا فَثَلاَثَةٌ) ئەگەر سێیان تەڵاق بدەم سێ کۆیلەم ئازاد بن (وَإِنْ أَرْبَعًا فَأَرْبَعَةٌ) ئەگەر چواران تەڵاق بدەم چوار کۆیلەم ئازاد بن (فَطَلَّقَ أَرْبَعًا مَعًا أَوْ مُرَتَّبًا) ئینجا چوار ژنی وێکڕا، یان یەك لە دوایەیەك تەڵاق دان، ئەوە (عَتَقَ عَشَرَةٌ) دە کۆیلە ئازاد دەبن: یەك بە یەکەمەکە+دوو بە دووەمەکە+سێ بە سێیەمەکە+چوار بە چوارەمەکە (وَلَوْ عَلَّقَ بِكُلَّمَا) ئەگەر بە هەرجارێکی هەڵواسیو گوتی: هەرجارێکی ژنێکم تەڵاق بدەم کۆیلەیەکم ئازادبێ، ئەوە (فَخَمْسَةَ عَشَرَ عَلَىالصَّحِيحِ) پانزە ئازاد دەبن

وَلَوْ عَلَّقَ بِنَفْيِ فِعْلٍ فَالْمَذْهَبُ أَنَّهُ إِنْ عَلَّقَ بِإِنْ كَإِنْ لَمْ تَدْخُلِي، وَقَعَ عِنْدَالْيَأْسِ مِنَ الدُّخُولِ، أَوْ بِغَيْرِهَا فَعِنْدَ مُضِيِّ زَمَنٍ يُمْكِنُ فِيهِ ذَلِكَ الْفِعْلُ،

---

له سەر فەرموودەی ڕاست، چونکە ووشەی هەرجارێك دووبارە دەخوازێ، کەوابو: یەك بە یەکەمەکە+سێ بە دووەمەکە+چوار بە سێیەمەکە+حەفت بە چوارەمەکە.

(وَلَوْ عَلَّقَ بِنَفْيِ فِعْلٍ) ئەگەر تەلاقەکەی هەڵواسی بە نەبوونی کارێك، ئەوە (فَالْمَذْهَبُ) بە فەرموودەی ڕاستی مەزهەب (أَنَّهُ إِنْ عَلَّقَ بِإِنْ) ئەگەر بە پیتی ئەگەر هەڵواسینەکەی کرد (ک)وەك بڵێ: (إِنْ لَمْ تَدْخُلِي) ئەگەر نەچیتە ناو خانووەکە تەلاقت کەوتبێ. یان ئەگەر لە فلانکەس نەدەم، یان نەیکوژم تەلاقم کەوتبێ. یان ئەگەر تەلاقت نەدەم تەلاقت کەوتبێ. ئەوە (وَقَعَ عِنْدَ الْيَأْسِ مِنَ الدُّخُولِ) هەرکاتێك بێئومێد بوو: لە چوونە ناوخانووەکەو لە لێدانەکەو لە کوشتنەکەو لە تەلاقدانەکە، تەلاقی دەکەوێ: وەك پێش ئەنجامدانی پێهەڵواسراوەکە ژنەکە، یان مێردەکە بمرێ، کەوابو: بە تۆزێك پێش مردن تەلاقی دەکەوێ، بەڵام ئەگەر نەمرێ، بەڵکو بە (بائن)ی تەلاقی بداو تا مردنیش لە خۆی مارە نەکاتەوە، ئەو تەلاقدانە نابێتە بێئومێدی، واتە: پێش تەلاقدانەکە تەلاقی ناکەوێ، هەرچەند پێش تەلاقدانەکەش گونجابێ کارەکە بکرێو بە قەسدی نەکرابێو لە دوای تەلاقدانیش هەر نەکرێ، هەروەك لە(تحفة)و (نهاية)دا ڕوون کراوەتەوە.

جا بزانە: ئەوەیڕابردوو لە حاڵەتێکدا بوو: کە مەبەستی ئەم کاتە نەبێ، ئەگینا: ئەگەر هەر ئەو کات کارەکە نەکرێ تەلاقی دەکەوێ: وەك لەکاتی چێشت خواردندا بڵێتە میوانەکەی: ئەگەر نانم لەگەڵ نەخوی تەلاقم کەوتبێ. ئەوە ئەگەر مەبەستی ئەم کاتە بێو هەر لەم کاتەشدا نانی لەگەڵ نەخوارد، ئەوە تەلاقی دەکەوێ، هەروەك لە (نهاية)دا فەرموویەتی.

جا بزانە: هەرکاتێك بڵێ: ئەگەر لەم شارە نەڕۆمە دەرەوە تەلاقم کەوتبێ. ئەوە ئەگەر بە ئەندازیەکی وەها لە سنووریشارەکە بڕواتە دەرەوە: کە لەوێوە بە ڕێبوار دابندرێو کورتکردنەوەینوێژی بۆ دروست بێ، تەلاقی ناکەوێ، هەر چەند هەر ئەو دەمیش بگەڕێتەوە، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

(أَوْ بِغَيْرِهَا) یان–جگە لە ئەگەر– بە ووشەکانیتر هەڵواسینەکەی کرد: وەك هەرکاتێ، یان هەرکاتێك نەچیتە ژوورەوە تەلاقت کەوتبێ. یان هەرکاتێك تەلاقت نەدەم تەلاقت کەوتبێ. ئەوە (فَعِنْدَ مُضِيِّ زَمَنٍ) ئەگەر ماوەیەکی ئەوها بڕوا: کە (يُمْكِنُ فِيهِ ذَلِكَ الْفِعْلُ) دەگونجا لەو ماوەیەدا ئەو کارە بکرێو بە قەسدیش نەیکرد، ئەو کاتە تەلاقی دەکەوێ.

بۆ وێنە: لە مەسەلەی (هەرکاتێك تەلاقت نەدەم تەلاقت کەوتبێ). ئەگەر لە دوای تەواوبوونی ڕستەکە بە پەلە تەلاقێکی نەدا، تەلاقە هەڵواسراوەکەی دەکەوێ، بەڵام ئەگەر بە هۆی زۆرلێکردنێك، یان لە بەر هەر هۆیەکیتر نەگونجا بە پەلە پێهەڵواسراوەکە بکا، ئەو کاتە تەلاقی ناکەوێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

وَلَوْ قَالَ أَنْتِ طَالِقٌ أَنْ دَخَلْتِ أَوْ أَنْ لَمْ تَدْخُلِي -بِفَتْحِ أَنْ- وَقَعَ فِي الْحَالِ، قُلْتُ: إِلاَّ فِي غَيْرِ نَحْوِيٍّ فَتَعْلِيقٌ فِي الأَصَحِّ وَاللهُ أَعْلَمُ.

(فَصْلٌ) عَلَّقَ بِحَمْلٍ فَإِنْ كَانَ حَمْلٌ ظَاهِرٌ وَقَعَ، وَإِلاَّ فَإِنْ وَلَدَتْ لِدُونِ سِتَّةِ أَشْهُرٍ مِنَ التَّعْلِيقِ بَانَ وُقُوعُهُ، أَوْ لأَكْثَرَ مِنْ أَرْبَعِ سِنِينَ أَوْ بَيْنَهُمَا وَوُطِئَتْ وَأَمْكَنَ حُدُوثُهُ بِهِ فَلاَ، وَإِلاَّ فَالأَصَحُّ وُقُوعُهُ، وَإِنْ قَالَ: إِنْ كُنْتِ حَامِلاً بِذَكَرٍ فَطَلْقَةً أَوْ أُنْثَى فَطَلْقَتَيْنِ. فَوَلَدَتْهُمَا وَقَعَ ثَلاَثٌ،

---

(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر مێردەکە گوتی (أَنْتِ طَالِقٌ أَنْ دَخَلْتِ أَوْ أَنْ لَمْ تَدْخُلِي) تۆ تەڵاقکەوتووی چونکە چویتە ناو خانوو. یان چونکە نەچویتە ناو خانوو (بِفَتْحِ أَنْ)، واتە: سەری دا هەمزەکەی (أَنْ)، ئەوە (وَقَعَ فِي الْحَالِ)هەر ئەم دەمە تەڵاقی دەکەوێ، چونکە واتەی (أَنْ): چونکەیە، بەڵام (قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) دەفەرموێ (إِلاَّ فِي غَيْرِ نَحْوِيٍّ فَتَعْلِيقٌ) تەنها بۆ کەسێك نەبێ: کە (نَحْو)زان نەبێ، بۆ وی دەبێتە هەڵواسین (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستردا (وَاللهُ أَعْلَمُ).

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی چەند جۆرێکی‌تری هەڵواسین ﴾

(عَلَّقَ بِحَمْلٍ) هەرکاتێك تەڵاقەکەی بە هەبوونی زگ هەڵواسی‌و گوتی: ئەگەر تۆ ئاوس بی، یان زگت هەبێ تەڵاقت کەوتبێ. ئەوە تەماشا دەکەین: (فَإِنْ كَانَ حَمْلٌ ظَاهِرٌ) ئەگەر لەو کاتدا بە ئاشکرایی ئاوس بێ: وەك دوو پیاو شاهیدی بدەن، یان هەر بەخۆی بڵێ: زگم هەیە. مێردەکەش باوەڕی پێ‌بکا، ئەوە (وَقَعَ) هەر ئەو دەم تەڵاقی دەکەوێ (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر بە ئاشکرایی زگی نەبێ، ئەوە (فَإِنْ وَلَدَتْ لِدُونِ سِتَّةِ أَشْهُرٍ مِنَ التَّعْلِيقِ) ئەگەر لە هەڵواسینەوە بە ماوەی کەمتر لە شەش مانگ منداڵی لێبو، ئەوە (بَانَ وُقُوعُهُ) ئاشکرا دەبێ: کە لە کاتی هەڵواسینەکە تەڵاقی کەوتوە (أَوْ لأَكْثَرَ مِنْ أَرْبَعِ سِنِينَ) یان لە ماوەی زیاتر لە چوار ساڵان منداڵی لێبو (أَوْ بَيْنَهُمَا) یان لە نێوان شەش مانگو چوارساڵ منداڵی لێبو (وَوُطِئَتْ وَأَمْكَنَ حُدُوثُهُ بِهِ) لە دوای هەڵواسینەکەش ژنەکە جیماعی لەگەڵ کرابو، دەشگونجا لەم جیماعە منداڵەکە پەیدا بوبێ، ئەوە (فَلاَ) تەڵاقی ناکەوێ، چونکە لە کاتی هەڵواسینەکەدا نەبوە (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر لە دوای هەڵواسینەکە جیماعی لەگەڵ نەکرابو، یان جیماعی لەگەڵ کرابو بەڵام لە ماوەی کەمتر لە شەش مانگ منداڵی لێبو، ئەوە (فَالأَصَحُّ وُقُوعُهُ)بە فەرموودەی ڕاستتر: تەڵاقی دەکەوێ، چونکە لە کاتی هەڵواسینەکەدا زگی هەبووە.

(وَإِنْ قَالَ) ئەگەر مێردەکە گوتی (إِنْ كُنْتِ حَامِلاً بِذَكَرٍ فَطَلْقَةً) ئەگەر تۆ بە نێرینە ئاوس بی، یان نێرینە لە زگتدا بێ تەڵاقێکت بکەوێ (أَوْ أُنْثَى فَطَلْقَتَيْنِ) ئەگەر بە مێینە ئاوس بی دوو تەڵاقت کەوتبێ (فَوَلَدَتْهُمَا) ئینجا ژنەکە نێرو مێی لێبو، ئەوە (وَقَعَ ثَلاَثٌ) سێ

أَوْ إِنْ كَانَ حَمْلُكِ ذَكَرًا فَطَلْقَةً أَوْ أُنْثَى فَطَلْقَتَيْنِ. فَوَلَدَتْهُمَا لَمْ يَقَعْ شَيْءٌ، أَوْ إِنْ وَلَدْتِ فَأَنْتِ طَالِقٌ. فَوَلَدَتْ اثْنَيْنِ مُرَتَّبًا طَلَقَتْ بِالأَوَّلِ وَانْقَضَتْ عِدَّتُهَا بِالثَّانِي، وَإِنْ قَالَ كُلَّمَا وَلَدْتِ. فَوَلَدَتْ ثَلاثَةً مِنْ حَمْلٍ وَقَعَ بِالأَوَّلَيْنِ طَلْقَتَانِ وَانْقَضَتْ بِالثَّالِثِ وَلاَ يَقَعُ بِهِ ثَالِثَةٌ عَلَى الصَّحِيحِ، وَلَوْ قَالَ لأَرْبَعٍ: كُلَّمَا وَلَدَتْ وَاحِدَةٌ فَصَوَاحِبُهَا طَوَالِقُ، فَوَلَدْنَ مَعًا طَلَقْنَ ثَلاثًا ثَلاثًا، أَوْ مُرَتَّبًا طَلَقَتِ الرَّابِعَةُ ثَلاثًا وَكَذَا الأُولَى إِنْ بَقِيَتْ عِدَّتُهَا وَالثَّانِيَةُ طَلْقَةً وَالثَّالِثَةُ طَلْقَتَيْنِ وَانْقَضَتْ عِدَّتُهُمَا بِوِلاَدَتِهِمَا،

---

تەلاقی دەكەون، بەلام ئەگەر تەنها نێری لێبو، ئەوە تەلاقێكی دەكەوێ، ئەگەر تەنها مێ بوو دوو تەلاقی دەكەون (أَوْ) یان گوتی: (إِنْ كَانَ حَمْلُكِ ذَكَرًا فَطَلْقَةً أَوْ أُنْثَى فَطَلْقَتَيْنِ) ئەگەر زگەكەت نێر بێ یەك تەلاقت كەوتبێ، ئەگەر مێ بێ دوو تەلاقت كەوتبن (فَوَلَدَتْهُمَا) ئینجا نێرو مێی لێبون، ئەوە (لَمْ يَقَعْ شَيْءٌ) هیچ تەلاقی ناكەوێ، چونكە زگەكەی تەنها نێرو تەنها مێ نیە.

(أَوْ) یان مێردەكە گوتی (إِنْ وَلَدْتِ فَأَنْتِ طَالِقٌ) ئەگەر مندالت لێبو تۆ تەلاقكەوتووی (فَوَلَدَتْ اثْنَيْنِ مُرَتَّبًا) ئینجا دوو مندالی لێبون یەك لە دوای یەك، ئەوە (طَلَقَتْ بِالأَوَّلِ وَانْقَضَتْ عِدَّتُهَا بِالثَّانِي) بە مندالەكەییەكەم تەلاقی دەكەوێو بە دووەمەكەش (عِدَّة)ی تەواو دەبێ (وَإِنْ قَالَ) ئەگەر گوتی (كُلَّمَا وَلَدْتِ) هەر جارێك مندالێكت لێبو تەلاقت كەوتبێ (فَوَلَدَتْ ثَلاثَةً مِنْ حَمْلٍ) ژنەكەش سێ مندالی لە زگێك بون، ئەوە (وَقَعَ بِالأَوَّلَيْنِ طَلْقَتَانِ وَانْقَضَتْ بِالثَّالِثِ) بە یەكەمەكەو دووەمەكە دوو تەلاقی دەكەونو بە سێیەمەكەش (عِدَّة)ی تەواو دەبێ، كەوابو (وَلاَ يَقَعُ بِهِ ثَالِثَةٌ) بە سێیەمەكە تەلاقی سێیەم ناكەوێ (عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست.

ئینجا بزانە: لەو مەسەلانەدا جیاوازی نیە مندالبوونەكە: لە ڕێگای عادەتیخۆیەوە بێ، یان زگی هەلبدرێو مندالەكەی لێدەربێ، هەروەك لە (إبن قاسم)دا فەرموویەتی.

(وَلَوْ قَالَ لأَرْبَعٍ) ئەگەر گوتیە چوار ژنی ئاوسی خۆی (كُلَّمَا وَلَدَتْ وَاحِدَةٌ فَصَوَاحِبُهَا طَوَالِقُ) هەر جارێك یەكێكتان مندالی لێبو هاوڕێكانی تەلاقكەوتوون (فَوَلَدْنَ مَعًا) ئینجا هەر چواریان وێكڕا مندالیان لێبو، ئەوە (طَلَقْنَ ثَلاثًا ثَلاثًا) هەر چواریان سێبەسێ تەلاقیان دەكەوێ (أَوْ مُرَتَّبًا) یان یەك بە دوای یەكدا مندالیان لێبو، ئەو كاتە (طَلَقَتِ الرَّابِعَةُ ثَلاثًا) چوارەمەكە سێبەسێ تەلاقی دەكەوێ بە مندالبوونی سێیەكانی پێشە خۆی، ئینجا بە مندالبوونی خۆیشی (عِدَّة)ی تەواو دەبێ (وَكَذَا الأُولَى إِنْ بَقِيَتْ عِدَّتُهَا) هەروەها یەكەمەكەش سێ تەلاقی دەكەون ئەگەر تا كاتی مندالبوونی چوارەمەكە (عِدَّة)ی مابێ، هەم (وَالثَّانِيَةُ طَلْقَةً) دووەمەكە تەلاقێكی دەكەوێ بە مندالبوونی یەكەمەكە، هەم (وَالثَّالِثَةُ طَلْقَتَيْنِ) سێیەمەكەش دوو تەلاقی دەكەون بە مندالبوونی یەكەمەكەو دووەمەكە (وَانْقَضَتْ عِدَّتُهُمَا بِوِلاَدَتِهِمَا) ئینجا (عِدَّة)ی

وَقِيلَ لاَ تَطْلُقُ الأُولَى وَتَطْلُقُ الْبَاقِيَاتُ طَلْقَةً طَلْقَةً، وَإِنْ وَلَدَتْ ثِنْتَانِ مَعًا ثُمَّ ثِنْتَانِ مَعًا طَلَقَتِ الأُولَيَانِ ثَلاَثًا ثَلاَثًا، وَقِيلَ طَلْقَةً، وَالأُخْرَيَانِ طَلْقَتَيْنِ طَلْقَتَيْنِ، وَتُصَدَّقُ بِيَمِينِهَا فِي حَيْضِهَا إِذَا عَلَّقَهُ بِهِ، لاَ فِي وِلاَدَتِهَا فِي الأَصَحِّ، وَلاَ تُصَدَّقُ فِيهِ فِي تَعْلِيقِ غَيْرِهَا، وَلَوْ قَالَ إِنْ حِضْتُمَا فَأَنْتُمَا طَالِقَانِ، فَزَعَمَتَاهُ وَكَذَّبَهُمَا صُدِّقَ بِيَمِينِهِ وَلَمْ يَقَعْ، وَإِنْ كَذَّبَ وَاحِدَةً طَلَقَتْ فَقَطْ،

---

دووەمەكەو سێیەمەكە بە منداڵبوونیخۆیان تەواو دەبێ (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەكی بێ هێزدا: (لاَ تَطْلُقُ الأُولَى وَتَطْلُقُ البَاقِيَاتُ طَلْقَةً طَلْقَةً) یەكەمەكە هیچ تەڵاقی ناكەوێو سێیەكانیتریش هەریەكەو تەڵاقێكی دەكەوێ.

(وَإِنْ وَلَدَتْ ثِنْتَانِ مَعًا ثُمَّ ثِنْتَانِ مَعًا) ئەگەر دوو ژن وێكڕا منداڵیان لێبو، ئینجا دووەكانیتریش وێكڕا بویان، ئەوە (طَلَقَتِ الأُولَيَانِ ثَلاَثًا ثَلاَثًا) دووەكانی یەكەمجار سێ سێ تەڵاقیان دەكەوێ؟ تەڵاقێك بە منداڵبوونی ئەو ژنەی لەگەڵیدایە، دوو تەڵاقیتریش بە دووەكانیتر (وَقِيلَ طَلْقَةً) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: یەك تەڵاقیان دەكەوێ (وَالأُخْرَيَانِ طَلْقَتَيْنِ طَلْقَتَيْنِ) دووەكانی دووەمجاریش دوو دوو تەڵاقیان دەكەوێ بە دووەكانی یەكەمجار، ئینجا بە منداڵبوونی خۆیشیان (عِدَّة)یان تەواو دەبێ.

(وَتُصَدَّقُ بِيَمِينِهَا فِي حَيْضِهَا) ژنەكە بە سوێندخواردنیخۆی باوەڕی پێدەكرێ لەبارەی حەیزیخۆی (إِذَا عَلَّقَهُ بِهِ) هەر كاتێك مێردەكەی تەڵاقی ژنەكەی بە حەیزی ژنەكەوە هەڵواسیبێ: وەك بڵێ: ئەگەر كەوتیە حەیز تەڵاقت كەوتبێ (لاَ فِي وِلاَدَتِهَا) بەڵام لە منداڵبوونیدا بە سوێند باوەڕی پێناكرێ: وەك بڵێ: ئەگەر منداڵت لێبو تەڵاقت كەوتبێ. ئەوە پێویستە شاهیدی هەبێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَ) هەروەها (لاَ تُصَدَّقُ فِيهِ فِي تَعْلِيقِ غَيْرِهَا) ژنەكە بە سوێند باوەڕی پێناكرێ لەبارەی حەیزیخۆی لە هەڵواسینی تەڵاقیژنێكیتردا: وەك ئەگەر كەوتیە حەیز هەوێیەكەت تەڵاقی كەوتبێ. بەڵكو لەم حاڵەتەدا بە سوێندخواردن باوەڕ بە مێردەكە دەكرێ.

كەوابو: (وَلَوْ قَالَ) ئەگەر گوتی (إِنْ حِضْتُمَا فَأَنْتُمَا طَالِقَانِ) ئەگەر هەردووكتان كەوتنە حەیز هەردووكتان تەڵاقكەوتوون (فَزَعَمَتَاهُ) ئینجا هەردوو ژنەكان گوتیان كەوتوینە حەیز (وَكَذَّبَهُمَا) مێردەكەش هەردووكیانی بە درۆ خستنەوەو گوتی: نەكەوتونە حەیز. ئەوە (صُدِّقَ بِيَمِينِهِ وَلَمْ يَقَعْ) مێردەكە بە سوێندخواردن باوەڕی پێدەكرێو تەڵاقی لە هیچێكیان ناكەوێ، بەڵام ئەگەر هەردوو ژنەكان شاهید بێنن، یان مێردەكە بە هەردووكیان باوەڕ بكا، ئەو كاتە تەڵاقی لە هەردووكیان دەكەوێ، هەم (وَإِنْ كَذَّبَ وَاحِدَةً) ئەگەر مێردەكە باوەڕی بە تەنها یەكێكیان نەكردو باوەڕی بەوەكەیتر كرد، ئەو كاتە (طَلَقَتْ فَقَطْ) تەنها باوەڕ پێنەكراوەكە تەڵاقی دەكەوێ ئەگەر سوێند بخوا كە بەخۆی كەوتۆتە حەیز.

وَلَوْ قَالَ: إنْ أَوْ إذَا أَوْ مَتى طَلَّقْتُك فَأَنْت طَالِقٌ قَبْلَهُ ثَلاثًا. فَطَلَّقَهَا وَقَعَ الْمُنَجَّزُ فَقَطْ، وَقِيلَ ثَلاثٌ وَقِيلَ لاَ شَيْءَ، وَلَوْ قَالَ: إنْ ظَاهَرْتُ مِنْك أَوْ آلَيْتُ أَوْ لاَعَنْتُ أَوْ فَسَخْتُ بِعَيْبِك فَأَنْت طَالِقٌ قَبْلَهُ ثَلاثًا. ثُمَّ وُجِدَالْمُعَلَّقُ بِهِ فَفِي صِحَّتِهِ الْخِلافُ، وَلَوْ قَالَ: إنْ وَطِئْتُك مُبَاحًا فَأَنْت طَالِقٌ قَبْلَهُ. ثُمَّ وَطِئَ

---

(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر مێردەکە گوتی (إنْ أَوْ إذَا أَوْ مَتى طَلَّقْتُك فَأَنْت طَالِقٌ قَبْلَهُ ثَلاثًا) ئەگەر، یان هەرکاتێ، یان هەرکاتێکیداهاتوو تۆم تەڵاق دا پێش تەڵاقدانەکە تۆ سێبەسێ تەڵاقکەوتووی. یان پێش تەڵاقدانەکە سێبەسێ تەڵاقت کەوتبێ (فَطَلَّقَهَا) ئینجا ژنەکەی تەڵاق دا، ئەوە (وَقَعَ الْمُنَجَّزُ فَقَطْ) تەنها تەڵاقەکەی جێبەجێ دەکەوێ: جا یەك تەڵاق بێ، یان زیاتر، واتە: هەڵواسراوەکە ناکەوێ، چونکە ئەگەر هەڵواسراوەکە سێبەسێ بکەوێ هیچ تەڵاقێك نامێنێتەوە بە جێبەجێیی بکەوێ، خۆ ئەگەر جێبەجێیەکەش نەکەوێ پێبەهەڵواسراوەکە نایەتەجێو هەڵواسراوەکە ناکەوێ.

(وَقِيلَ ثَلاثٌ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: سێ تەڵاقی دەکەون: یەکێکی جێبەجێو دووی هەڵواسراو، زۆر لە زانایانیش ئەم بێهێزەیان هەڵبژاردوە.

(وَقِيلَ لاَ شَيْءَ) لە بێهێزێکیتردا: هیچ تەڵاقێکی ناکەوێ؟ لە بەر خولانەوەکەیڕابردوو، واتە: ئەگەر جێبەجێیەکە بکەوێ دەبی هەڵواسراوەکە پێشتر کەوتبێ، جا هەر کاتێکیش هەڵواسراوەکە سێبەسێ کەوت هیچ تەڵاقێك نامێنێتەوە بە جێبەجێیی بکەوێ، خۆ ئەگەر جێبەجێیەکەش نەکەوێ هەڵواسراوەکەش ناکەوێ، چونکە پێبەهەڵواسراوەکە نەهاتوتەجێ ...هەر بەم جۆرە بڕیارەکە بە دەورەیخۆیدا دەخولێتەوە، جا ئەم مەسەلەیە بە (السُّرَيْجِيَّة) ناسراوە؟ چونکە (إبن سُرَيْج) دەریخستوە، زۆر لە زانایانیش بە ڕاستیان داناوە، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر مێردەکە گوتی: (إنْ ظَاهَرْتُ مِنْك أَوْ آلَيْتُ أَوْ لاَعَنْتُ أَوْ فَسَخْتُ بِعَيْبِك فَأَنْت طَالِقٌ قَبْلَهُ ثَلاثًا) ئەگەر زیهارم لەگەڵ کردی، یان سوێندی جیماع نەکردنم خوارد، یان لەعنەتی زینام لێکردی، یان بە هۆی عەیبێکت مارەبڕینەکەتم هەڵوەشاندەوە، پێش هەر یەکێك لەوانە تۆ سێبەسێ تەڵاقکەوتووی (ثُمَّ وُجِدَالْمُعَلَّقُ بِهِ) ئینجا پێبەهەڵواسراوەکە هاتە جێ: زیهار، یان سوێند، یان لەعنەت، یان هەڵوەشاندنەوە، ئەوە (فَفِي صِحَّتِهِ الْخِلافُ) لە بارەی دروستبوونی ئەو پێبەهەڵواسراوانە هەمان جیاوازیەکەیڕابردوو هەیە: لە فەرموودەی یەکەمی بەهێزدا: گشتیان دروست دەبنو تەڵاقەکە ناکەوێ، لە سێیەمەکەشدا: نە تەڵاقەکەو نە پێبەهەڵواسراوەکان هیچیان دروست نابن، بەڵام فەرموودەکەیدووەم لێرەدا نایێ.

(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر گوتی (إنْ وَطِئْتُك مُبَاحًا فَأَنْت طَالِقٌ قَبْلَهُ) ئەگەر جیماعێکی حەڵاڵم لەگەڵ کردی تۆ پێش جیماعەکە تەڵاقکەوتووی (ثُمَّ وَطِئَ) ئینجا جیماعی لەگەڵ کرد،

لَمْ يَقعْ قَطْعًا، وَلَوْ عَلَّقَهُ بمَشيئَتهَا خطَابًا اُشتُرِطَتْ عَلَى فَوْر، أَوْ غَيْبَةً أَوْ بمَشيئَة أَجْنَبيٍّ فَلاَ في الأَصَحِّ، وَلَوْ قَالَ الْمُعَلَّقُ بمَشيئَته: شئْتُ. كَارهًا بقَلْبه وَقَعَ، وَقيلَ لاَ يَقَعُ بَاطنًا، وَلاَ يَقَعُ بمَشيئَة صَبيَّة وَصَبيٍّ، وَقيلَ يَقَعُ بمُمَيِّز، وَلاَ رُجُوعَ لَهُ قَبْلَ الْمَشيئَة، وَلَوْ قَالَ أَنْت طَالقٌ ثَلاَثًا إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ زَيْدٌ طَلْقَةً. فَشَاءَ طَلْقَةً لَمْ تَطْلُقْ، وَقيلَ تَقَعُ طَلْقَةً،

---

ئەوە (لَمْ يَقَعْ قَطْعًا) تـەلاقی ناکـەوێ بـە فـەرموودەیـەکی بڕایـەوە؟ چونکە ئەگـەر پـێش جیماعەکە تەلاقی کەوتبێ جیماعەکە حەلاڵ نابێ‌و تەلاقەکە ناکەوێ.

(وَلَوْ عَلَّقَهُ بِمَشِيئَتِهَا) ئەگەر تەلاقەکەی هەڵواسی بە حەزکردنی ژنەکـە (خِطَابًا) بـە گوتـەی ڕوویـەڕوو: وەك تـەلاقت کـەوتبێ ئەگـەر حـەزت کـرد، یـان هـەرکاتێ حـەزت کـرد. ئـەوە (اُشْتُرِطَتْ عَلَىفَوْرٍ) بە مەرج داندراوە دەسبەجێ بە زوبان بڵێ: حەزم کرد (أَوْ غَيْبَةً) یا بـە گوتەی نادیار هەڵیواسی: وەك تەلاقی ژنەکەم کەوتبێ ئەگەر حەزیکرد (أَوْ بِمَشِيئَةِ أَجْنَبِيٍّ) یان بە حەزکردنی بێگانەیەکی هەڵواسی: وەك ئەگەر تۆ حەز بکەی ژنەکەم تەلاقی کەوتبێ. ئەوە (فَلاَ فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا: حەزکردنی دەسبەجێ مەرج نیە، بەڵکو هـەر کاتێك ژنەکە، یان بێگانەکە بڵێ: حەزم کرد. تەلاقی دەکەوێ.

(وَلَوْ قَالَ الْمُعَلَّقُ بِمَشِيئَتِهِ شِئْتُ) ئەگەر ئەو کەسەی تەلاقەکە بـە حـەزکردنی هەڵواسـراوە گوتی: حەزم کرد. بەڵام (كَارِهًا بِقَلْبِهِ) بە دڵیش تەلاقەکەی پێناخۆش بـوو، ئـەوە (وَقَـعَ) تەلاقەکە دەکەوێ، چونکە پێیهەڵواسراوەکە -گوتـەی(حـەزم کـرد)- هاتۆتـەجێ (وَقِيـلَ لاَ يَقَعُ بَاطِنًا) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا لە پەنهانیدا ناکەوێ.

(وَلاَ يَقَعُ بِمَشِيئَةِ صَبِيَّةٍ وَصَبِيٍّ) تەلاق ناکەوێ بە حەزکردنی کـوڕو کـیژی نـەبالغ و مرۆڤـی شێت: وەك ئەگەر ئەم منداڵە حەز بکا تەلاقت کەوتبێ. ئینجا منداڵەکەش بڵێ: حەزم کرد (وَقِيلَ يَقَعُ بِمُمَيِّزٍ) لە فەرموودەیەکیبێهێزدا بە حەزکردنی منداڵیفامیدە تـەلاق دەکـەوێ (وَلاَ رُجُوعَ لَهُ قَبْلَ الْمَشِيئَةِ) مێردەکە بۆی دروست نیە لـە هەڵواسینی بـە حەزکردنەکـەدا پەشیمان ببێتـەوە پـێش حـەزکردنی حەزکەرەکـە، هـەروەك لـە هەڵواسینەکانیتریشـدا دروست نەبو.

(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر مێردەکە گوتی (أَنْتِ طَالِقٌ ثَلاَثًا إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ زَيْدٌ طَلْقَـةً) تـۆ تەلاقکـەوتووی سێبەسێ تەنها ئەگەر زەید تەلاقێك حەز بکـا (فَشَـاءَ طَلْقَـةً) ئینجا زەیـد گـوتی: تـەلاقێکم حەز کرد. ئـەوە (لَـمْ تَطْلُـقْ) هـیچ تـەلاقێك ناکـەوێ، چونکە جیاکردنەوەکـە لـە بنچینەی تەلاقدانەکەیە (وَقِيلَ تَقَعُ طَلْقَةً) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: یەك تەلاق دەکەوێ.

## ﴿ سوێندخواردن بە تەلاق ﴾

بزانە: ووشەی تەلاق-بە پیتەکانیسوێند- سوێندی پێناخورێ، کەواتە: ئەگـەر بڵـێ: بـە تەلاقم ئەم کارە ناکـەم. سـوێندەکەی دانامـەزرێ، هـەروەك لـە ئاگاداریەکـەی سـەرەتای

تەلاقدا ڕابرا، بەلام تەلاقدانی هەلواسراو دەکرێتە سوێند: بۆ هاندان لە سەر کارکردنێك، یان قەدەغەکردن لە کارێك، یان لێکۆلینەوەی ڕاستی هەواڵێك.

جا ئەمە مەبەستی زانایانی شەریعەتە کە دەفەرموون: (سوێندخواردن بە تەلاق). هەروەك لە (فصل)ی داهاتوودا پێناسەی کراوە.

کەوابو: (وَلَوْ عَلَّقَ بِفِعْلِه) ئەگەر تەلاقدانەکەی هەلواسی بە کردارێکی خۆی، مەبەستیشی هاندانی خۆی بوو: وەك بلێ: ئەگەر لەم خانووە نەچمە دەرەوە تەلاقم کەوتبێ. یان مەبەستی قەدەغەکردنی خۆی بوو: وەك ئەگەر لەم خانووە بچمە دەرەوە تەلاقم کەوتبێ (فَفَعَلَ) ئینجا پێهەلواسراوەکەشی کرد؟ چونکە (نَاسِيًا لِلتَّعْلِيقِ) هەلواسینەکەی لە بیر چوبۆوە (أَوْ مُكْرَهًا) یان بە زۆرلێکردن پێهەلواسراوەکەی پێ‌کرا، یان نەیزانی ئەم کارە کارە پێهەلواسراوەکەیە: وەك سوێند بە تەلاق بخوا سواری وولاغی فلانکەس نەبێ. ئینجا سواری وولاغەکە ببێ‌و وای‌تێبگا وولاغی کەسێکی‌ترە، واتە: نەزانێ ئەوە سوێند لەسەر خوراوەکەیە، ئەوە (لَمْ تَطْلُقْ) لەو سێ حالەتانەدا تەلاقی ژنەکەی ناکەوێ (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی‌بەهێزتردا، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿رُفِعَ عَنْ أُمَّتِي الْخَطَأُ وَالنِّسْيَانُ وَمَااسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ﴾ حديث حسن رواه ابن ماجه، خوای‌گەورە لای‌داوە لە سەر ئوممەتی من بڕیارەکانی بەهەلەداچوون‌و لەبیرچوون‌و ئەوەی بە زۆر پێیان کراوە.

ئینجا بزانە: جیاوازی نیە لەبیرچوون‌و نەزانینەکە لە داهاتوودا بێ: وەك بە تەلاق سوێند بخوا: ئەم کارە نەکا. ئینجا سوێندەکەی لە بیری بچێتەوەو کارەکە بکا، یان نەزانێ ئەمە کارە سوێند لەسەرخوراوەکەیەو بیکا: وەك مەسەلەی وولاغەکەی‌ڕابردوو، یان لە ڕابردوودا بێ: وەك کارێکی کردبێ‌و لە بیری چوبێ کە کارەکەی کردوە، ئینجا بۆ ڕاستی هەواڵەکە بە تەلاق سوێند بخوا: کارەکەی نەکردوە. یان نەیزانیبێ ئەم کارە ڕوی‌داوە، ئینجا بۆ ڕاستی هەواڵەکە بە تەلاق سوێند بخوا: ئەم کارە ڕوی‌نەداوە. یان بە پێچەوانەوە: وەك شتەکە ڕوی‌نەدابێ، ئەویش بە تەلاق سوێند بخوا: شتەکە ڕوی‌داوە. ئەوە لە هیچ حالەتێکدا تەلاقی ناکەوێ؟ چونکە لە سەر باوەڕی‌خۆی سوێندی خواردوە، هەروەك لە زۆریەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

کەوابو: ئەگەر شێوەی ژنەکەی بگۆڕن‌و بلێن: ئەمە ژنی تۆیە. ئەویش بلێ: ئەمە ژنی من نیە. ئینجا بلێ: ئەگەر ئەمە ژنی من بێ تەلاقی کەوتبێ؟ چونکە وای‌تێدەگەیشت ئافرەتێکی‌ترە، ئەوە تەلاقی ناکەوێ، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

هەروەها ئەگەر سوێندی بە تەلاق خوارد ئەم کارە نەکا. ئینجا باوەڕپێکراوێکی‌خۆی فتوای بۆ دا: کە ئەگەر کارەکە بکا تەلاقی ناکەوێ. ئەویش پشتی بەو فتوایە بەست‌و کارەکەی

کرد، ئەوەش تەڵاقی ناکەوێ، هەرچەند شیاوی فتوادانیش نەبێ، چونکە سوێندخۆرەکە ئێستا بۆتە نەزانو عوزری هەیە، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا هێناویانە.

(أَوْ بِفعْلِ غَيْرِه) یان تەڵاقدانەکەی هەڵواسی بە کرداری کەسێکیتری جگە لە خۆی (مِمَّنْ يُبَالي بِتَعْلِيقِه) کەسەکەش لەوانە بوو: کە بایەخی بە سوێندخواردنەکەی وی دەدا، هەم (وَعَلِمَ بِهِ) سوێندخۆرەکەش مەبەستی بوو کەسەکە بزانێ: هاندانی، یان قەدەغەکردنی ئەوی مەبەستە بەو هەڵواسینە، هەرچەند لە ڕاستیشدا کەسەکە بە سوێندەکەی نەزانیبێ؟ چونکە نەگونجا ئاگاداری بکاتەوە، ئینجا بە زۆرلێکردن، یان بە هۆی لەبیرچوون، یان بە هۆی نەزانین کەسەکە کارەکەی کرد، ئەوەش (فَكَذَلِكَ) وەك کرداری خۆی تەڵاقی ناکەوێ.

(وَإِلَّا) بەڵام ئەگەر کەسەکە بایەخی بە سوێندەکەی وی نەدەدا: وەك سوێند بە تەڵاق بخوا نابێ کاریەدەست، یان حاجیەکان بێنەوە ئەم شارە. یان مەبەستی هاندانو قەدەغەکردنی کەسەکە نەبو، یان مەبەستی هاندانو قەدەغەکردنی کەسەکە بوو و بۆیشی گونجا کەسەکە ئاگادار بکاتەوەو بە قەسدی ئاگاداری نەکردەوە، جا کەسەکەش کارەکەی کرد، ئەوە (فَيَقَعُ قَطْعًا) لەو حاڵەتانەدا تەڵاقەکەی دەکەوێ، هەرچەند کەسەکەش بە زۆرلێکردنو نەزانینو لەبیرچون کارەکەی کردبێ.

هەروەها ئەگە گوتی: تەڵاقم کەوتبێ نابێ ئەم ئاژەڵە، یان ئەم شێتە، یان ئەم منداڵە بچێتە ناو ئەم خانووە. ئینجا یەکێك لەوانە بە خۆشیخۆی چووە ناو خانووەکە، ئەوە تەڵاقی دەکەوێ، چونکە ئەوانە بایەخ پێدەرنین، بەڵام ئەگەر بە زۆرلێکردن بیانبەنە ژوورەوە، تەڵاقی ناکەوێ، چونکە کرداری ئەوانە لە حاڵەتی زۆرلێکردندا بە کردار دانانرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

﴿ ئاگاداری ﴾: هەرچەند بە کرداری زۆرلێکراو و نەزانو لەبیرچوو تەڵاقەکە ناکەوێ، بەڵام سوێندەکەش هەڵناوەشێتەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، واتە: سوێندەکە وەك خۆی بە بەستراوی دەمێنێو ئەگەر جارێکیتر بە خۆشیخۆیو بە قەسدی کارەکە بکا تەڵاقەکەی دەکەوێ.

کەوابو: ئەگەر ژنەکەی لە ماڵیدایکی بوو، مێردەکەشی تووڕە بوو و سوێندی بە تەڵاق خوارد: نابێ ژنەکەم ئەمساڵ بێتەوە لام. ژنەکەش هەستی بە سوێندەکە نەکردو لە دوای سوێندەکە هاتەوە ماڵی مێردەکەی، ئەوە تەڵاقی ناکەوێو سوێندەکەش هەڵناوەشێتەوە، کەواتە: هەر کاتێك ژنەکە گەڕاوە ماڵیدایکی، ئینجا لە دوای زانینی سوێندەکە بە خۆشی خۆی جارێکیتر هاتەوە ماڵی مێردەکەی، ئەو کاتە تەڵاقی دەکەوێ، هەروەك (الشبراملسي) فەرموویەتی.

(فَصْلٌ) قَالَ أَنْت طَالِقٌ. وَأَشَارَ بِأُصْبُعَيْنِ أَوْ ثَلاَث لَمْ يَقَعْ عَدَدٌ إِلاَّ بِنِيَّة، فَإِنْ قَالَ مَعَ ذَلِكَ: هَكَذَا. طَلَقَتْ فِي أُصْبُعَيْنِ طَلْقَتَيْنِ وَفِي ثَلاَث ثَلاَثًا، فَإِنْ قَالَ أَرَدْت بِالإِشَارَةِ الْمَقْبُوضَتَيْنِ. صُدِّقَ بِيَمِينِه، وَلَوْ قَالَ عَبْدٌ إِذَا مَاتَ سَيِّدِي فَأَنْت طَالِقٌ طَلْقَتَيْنِ، وَقَالَ سَيِّدُهُ إِذَا مِتُّ فَأَنْتَ حُرٌّ فَعَتَقَ بِه فَالأَصَحُّ أَنَّهَا لاَ تَحْرُمُ بَلْ لَهُ الرَّجْعَةُ وَتَجْدِيدٌ قَبْلَ زَوْجٍ،

---

کەواتە: ئەگەر بە نەزانی زیاتر لە جارێکیش کردارەکە بکرێ تەلاق ناکەوێ: وەك سوێند بە تەلاق بخوا نابێ ژنەکەی بچێتە دەرەوە. ئینجا ژنەکەش لە بیری چوو و چووە دەرەوە، ئینجا وا تێگەیشت سوێندەکە هەڵوەشاوەتەوە، یان سوێندەکە تەنها جاری یەکەم دەگرێتەوە، بۆیێ ژنەکە دووبارە چووە دەرەوە، ئەوەش تەلاقی ناکەوێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهایة)دا فەرموویانە، چەند مەسەلەیەکی‌تری گرنگیش لە (تحفة)دا ڕوون کراونەوەو پێویستە لێیان ئاگادار بی؟ لە بەر زۆری نەمنووسین.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی ئاماژەکردن بۆ ژمارەی تەلاق ﴾

(قَالَ أَنْت طَالِقٌ) هەرکاتێك مێردەکە گوتیە ژنەکەی: تۆ تەلاقکەوتووی (وَأَشَارَ بِأُصْبُعَيْنِ أَوْ ثَلاَث) ئاماژەشی بە دوو، یان بە سێ پەنجە کرد، ئەوە (لَمْ يَقَعْ عَدَدٌ إِلاَّ بِنِيَّة) لە تەلاقێك زیاتر ناکەوێ تەنها بە نیەتی زیاترەکە نەبێ، چونکە ژمارەی تەلاقی‌کەوتوو: یان بە زوبانە، یان بە نیەتە، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی، کەواتە: ئەگەر سێ بەردی فڕێ‌دان‌و گوتی: تەلاقت کەوتبێ. ئەوە ئەگەر نیەتی سێ تەلاقی نەبێ‌و بە زوبانیش سێ تەلاقەکە نەڵێ، تەنها تەلاقێکی دەکەوێ.

بەلام (فَإِنْ قَالَ مَعَ ذَلِكَ: هَكَذَا) ئەگەر لەگەڵ ئاماژەکردنەکەدا گوتی: تۆ ئەوها تەلاقکەوتووی. یان ئەوها تەلاقت کەوتبێ. ئەو کاتە (طَلَقَتْ فِي أُصْبُعَيْنِ طَلْقَتَيْنِ وَفِي ثَلاَث ثَلاَثًا) لە ئاماژەی دوو پەنجەدا دوو تەلاقی دەکەون‌و لە ئاماژەی سێیاندا سێی دەکەون، بەلام (فَإِنْ قَالَ أَرَدْت بِالإِشَارَةِ الْمَقْبُوضَتَيْنِ) ئەگەر لە وێنەی سێ پەنجەکەدا گوتی: مەبەستم بە ئاماژەکە دوو پەنجە نوقاوەکان بوو، ئەوە (صُدِّقَ بِيَمِينِه) بە سوێندخواردن باوەڕی پێ‌دەکرێ‌و دوو تەلاقی دەکەون.

(وَلَوْ قَالَ عَبْدٌ) ئەگەر کۆیلەیەك گوتیە ژنەکەی خۆی: (إِذَا مَاتَ سَيِّدِي فَأَنْت طَالِقٌ طَلْقَتَيْنِ) هەرکاتێ گەورەکەم مرد تۆ تەلاقکەوتووی بە دوو تەلاق (وَقَالَ سَيِّدُهُ إِذَا مِتُّ فَأَنْتَ حُرٌّ) گەورەکەشی گوتی هەرکاتێ من مردم تۆ ئازادی (فَعَتَقَ بِه) کۆیلەکەش بە مردنی گەورەکەی ئازاد بوو، ئەوە (فَالأَصَحُّ أَنَّهَا لاَتَحْرُمُ) ژنەکەی بە (بائن)ی لێ‌حەرام نابێ (بَلْ لَهُ الرَّجْعَةُ) بەڵکو بۆی دورستە لە (عِدَّة)دا ژنەکەی بگەڕێنێتەوە، هەم (وَتَجْدِيدٌ قَبْلَ زَوْجٍ) لە دوای (عِدَّة)ش پێش مێردکردنێکی‌تر بۆی دروستە سەرلەنوێ مارەی بکاتەوە.

وَلَوْ نَادَى إِحْدَى زَوْجَتَيْهِ فَأَجَابَتْهُ الأُخْرَى فَقَالَ: أَنْتِ طَالِقٌ. وَهُوَ يَظُنُّهَا الْمُنَادَاةَ لَمْ تَطْلُقِ الْمُنَادَاةُ وَتَطْلُقُ الْمُجِيبَةُ فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ عَلَّقَ بِأَكْلِ رُمَّانَةٍ وَعَلَّقَ بِنِصْفٍ فَأَكَلَتْ رُمَّانَةً فَطَلْقَتَانِ، وَالْحَلِفُ بِالطَّلاَقِ: مَا تَعَلَّقَ بِهِ حَثٌّ أَوْ مَنْعٌ أَوْ تَحْقِيقُ خَبَرٍ، فَإِذَا قَالَ: إِنْ حَلَفْتُ بِطَلاَقٍ فَأَنْتِ طَالِقٌ. ثُمَّ قَالَ: إِنْ لَمْ تَخْرُجِي أَوْ إِنْ خَرَجْتِ أَوْ إِنْ لَمْ يَكُنْ الأَمْرُ كَمَا قُلْتُ فَأَنْتِ طَالِقٌ. وَقَعَ الْمُعَلَّقُ بِالْحَلِفِ وَيَقَعُ الآخَرُ إِنْ وُجِدَتْ صِفَتُهُ،

---

(وَلَوْ نَادَى إِحْدَى زَوْجَتَيْهِ) ئەگەر مێردەکە لە دوو ژنەکانی بانگی یەکێکیانی کرد (فَأَجَابَتْهُ الأُخْرَى) جا ئەوەکەیتر وەلامیداوە (فَقَالَ أَنْتِ طَالِقٌ) مێردەکەش گوتی: تۆ تەلاقکەوتووی (وَهُوَ يَظُنُّهَا الْمُنَادَاةَ) مێردەکە وایدەزانی ئەوەیان بانگکراوەکەیە، ئەوە (لَمْ تَطْلُقِ الْمُنَادَاةُ) بانگکراوەکە تەلاقی ناکەوێ چونکە گفتوگۆیتەلاقی لەگەڵ نەکراوە، بەلام (وَتَطْلُقُ الْمُجِيبَةُ) وەلامدەرەوەکە تەلاقی دەکەوێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە گفتوگۆی تەلاقەکە لەگەڵ ئەویاندا کراوە.

(وَلَوْ عَلَّقَ بِأَكْلِ رُمَّانَةٍ وَعَلَّقَ بِنِصْفٍ) ئەگەر تەلاقەکەی هەڵواسی بە خواردنی هەنارێكو بە خواردنی نیو هەنارێك: وەك ئەگەر هەنارێك بخۆی تەلاقت کەوتبێو ئەگەر نیو هەنار بخۆی تەلاقت کەوتبێ (فَأَكَلَتْ رُمَّانَةً) ژنەکەش هەنارێکی خوارد، ئەوە (فَطَلْقَتَانِ) دوو تەلاقی دەکەون، چونکە نیوە هەنارێکی خواردوەو هەم هەنارێکی خواردوە.

## ﴿ پێناسەی سوێند بە تەلاق ﴾

(وَالْحَلِفُ بِالطَّلاَقِ) سوێندخواردن بە تەلاق ئەوەیە: (مَا تَعَلَّقَ بِهِ) پێیەوە هەڵبواسرێ (حَثٌّ) هاندان لە سەر کارکردنێك (أَوْ مَنْعٌ) یان قەدەغەکردن لە کارکردنێك (أَوْ تَحْقِيقُ خَبَرٍ) یان لێکۆڵینەوەی ڕاستیی هەواڵێك.

کەوابو: (فَإِذَا قَالَ) هەرکاتێك مێردەکە گوتی (إِنْ حَلَفْتُ بِطَلاَقٍ فَأَنْتِ طَالِقٌ) ئەگەر سوێندم بە تەلاق خوارد تۆ تەلاقکەوتووی (ثُمَّ قَالَ) ئینجا مێردەکە بۆ هاندان سوێندی خواردو گوتی: (إِنْ لَمْ تَخْرُجِي) ئەگەر نەچیتە دەرەوە تەلاقت کەوتبێ (أَوْ) یان بۆ قەدەغەکردن سوێندی خواردو گوتی: (إِنْ خَرَجْتِ) ئەگەر بچیتە دەرەوە تەلاقت کەوتبێ (أَوْ) یان بۆ لێکۆڵینەوەی ڕاستیی هەواڵێك سوێندی خواردو گوتی: (إِنْ لَمْ يَكُنْ الأَمْرُ كَمَا قُلْتُ فَأَنْتِ طَالِقٌ) ئەگەر ئەو کارە وەك من گوتم ئەوها نەبێ تۆ تەلاقکەوتووی. ئەوە (وَقَعَ الْمُعَلَّقُ بِالْحَلِفِ) هەر ئەو دەمە ئەو تەلاقەی بە سوێندەکە هەڵواسراوە دەکەوێ، چونکە سوێندەکەی خوارد، هەم (وَيَقَعُ الآخَرُ إِنْ وُجِدَتْ صِفَتُهُ) تەلاقەکەیتریش دەکەوێ ئەگەر سیفەتە سوێند لەسەرخوراوەکە بێتە جێو ژنەکەش جیماعی لەگەڵ کرابێ، چونکە ئەگەر جیماعی لەگەڵ نەکردبێ، ئەو کاتە بە تەلاقکەوتنەکەی هەڵواسراو دەبێتە (بائن)، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.

وَلَوْ قَالَ: إذَا طَلَعَت الشَّمْسُ أَوْ جَاءَ الْحُجَّاجُ فَأَنْت طَالِقٌ. لَمْ يَقَعْ الْمُعَلَّقُ بِـالْحَلِف، وَلَوْ قِيلَ لَهُ اسْتِخْبَارًا: أَطَلَّقْتَهَا؟ فَقَالَ: نَعَمْ. فَإِقْرَارٌ، فَإِنْ قَالَ أَرَدْت مَاضِيًا وَرَاجَعْـت صُدِّقَ بِيَمِينِه، وَإِنْ قِيلَ ذَلِكَ إلْتِمَاسًا لأَنْشَاء فَقَالَ: نَعَـمْ. فَصَـرِيحٌ وَقِيـلَ كِنَايَـةٌ.
(فَصْلٌ) عَلَّقَ بِأَكْلِ رَغِيف أَوْ رُمَّانَة فَبَقِيَ لُبَابَةٌ أَوْ حَبَّةٌ

---

(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر ئەو پیاوەی تەلاقەکەی بە سوێندخواردنەکەی هەڵواسیوە گوتی: (إذَا طَلَعَتِ الشَّمْسُ أَوْ جَاءَ الْحُجَّاجُ فَأَنْتِ طَالِقٌ) هەر کاتێك ڕۆژ هەڵات، یان حاجیەکان هاتنەوە تۆ تەلاقکەوتووی، ئەو کاتە (لَمْ يَقَعْ الْمُعَلَّقُ بِالْحَلِفِ) ئەو تەلاقەی بە سوێندەکە هەڵواسراوە ناکەوێ؟ چونکە ئەم هەڵواسینە: نە هاندانو نە قەدەغەکردنو نە لێکۆڵینەوەی تێدا نیە.
(وَلَوْ قِيلَ لَهُ اسْتِخْبَارًا: أَطَلَّقْتَهَا؟) ئەگەر بە ناوی لێپرسین بە مێردەکە گوترا: ئایا ژنەکەت تەلاق دا؟ (فَقَالَ نَعَمْ) مێردەکەش گوتی: بەڵێ (فَإِقْرَارٌ) ئەوە دانپێداهێنانە بە تەلاقدانەکە، کەواتە: ئەگەر بە درۆ بەڵێی گوتبێ، لە پەنهانیدا تەلاقی ناکەوێ، بەڵام (فَإِنْ قَالَ أَرَدْتُ مَاضِيًا وَرَاجَعْتُ) ئەگەر گوتی: مەبەستم بە بەڵێ تەلاقدانێکیتریڕابردوو بوو و لە دوای ئەو تەلاقدانیش ژنەکەم گەڕاندبۆوە، ئەو کاتە (صُدِّقَ بِيَمِينِهِ) بە سوێندخواردن باوەڕی پێ دەکرێ (وَإِنْ قِيلَ ذَلِكَ إلْتِمَاسًا لأَنْشَاءٍ) ئەگەر بە ناوی داواکردنی تەلاقدان پێی گوترا: ئایا ژنەکەت تەلاق دا؟ (فَقَالَ نَعَمْ) ئەویش گوتی: بەڵێ. ئەوە (فَصَرِيحٌ) ووشەی ئاشکرای تەلاقدانە، ئەگەر نیەتیتەلاقدانیشی نەبێ تەلاقی دەکەوێ (وَقِيلَ كِنَايَةٌ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: نائاشکرایەو پێویستی بە نیەتی تەلاقدان هەیە.
﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر گوترا مێردەکە: ئەگەر ئەم کارەت کردبێ تەلاقت کەوتبێ؟ ئەویش بڵێ: بەڵێ. یان ئەگەر ژنت بە سەر ژنەکەت هێنا، یان ئەگەر فلانە شتە ڕوویدا تەلاقت کەوتبێ؟ ئەویش بڵێ: بەڵێ. ئەوە ئەگەر کارەکەشی کردبێ تەلاقی ناکەوێو ناشبێتە هەڵواسینی تەلاق، هەروەها ئەگەر بگوترێ: ئایا ژنەکەت سێ بەسێ تەلاق داوە؟ ئەویش بڵێ: هەندێك شتی وەها بووە. ئەوەش نابێتە دانپێداهێنانی تەلاقو تەلاقی ناکەوێ.
هەروەها ئەگەر بگوترێ: ئایا ژنت هەیە؟ ئەویش بڵێ: نا. یان بڵێ: بێژنم. ئەوەش تەلاقی ناکەوێ، هەرچەند نیەتی تەلاقدانیشی هەبێ؟ چونکە درۆیەکی ڕووتە، یان بڵێتە ژنەکەی خۆی: تۆ بۆ من هیچ نی. ئەوەش تەلاقی ناکەوێ، هەرچەند نیەتی تەلاقدانیشی هەبێ، هەروەك لە (تحفة)و(نهاية)و حاشیەکانیاندا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی چەند جۆرێکیتری هەڵواسین ﴾

(عَلَّقَ بِأَكْلِ رَغِيفٍ أَوْ رُمَّانَةٍ) هەرکاتێك تەلاقەکەی هەڵواسیو گوتی: ئەگەر کولێرەیەك، یان هەنارێك بخۆی تەلاقت کەوتبێ (فَبَقِيَ لُبَابَةٌ أَوْ حَبَّةٌ) ئینجا لە دوای خواردنەکە پارچە

لَمْ يَقَعْ، وَلَوْ أَكَلاَ تَمْرًا وَخَلَطَا نَوَاهُمَا فَقَالَ: إِنْ لَمْ تُمَيِّزِي نَوَاكِ فَأَنْتِ طَالِقٌ. فَجَعَلَتْ كُلَّ نَوَاةٍ وَحْدَهَا لَمْ يَقَعْ إِلاَّ أَنْ يَقْصِدَ تَعْيِينًا، وَلَوْ كَانَ بِفَمِهَا تَمْرَةٌ فَعَلَّقَ بِبَلْعِهَا ثُمَّ بِرَمْيِهَا ثُمَّ بِإِمْسَاكِهَا فَبَادَرَتْ مَعَ فَرَاغِهِ بِأَكْلِ بَعْضٍ وَرَمْيِ بَعْضٍ لَمْ يَقَعْ، وَلَوْ اتَّهَمَهَا بِسَرِقَةٍ فَقَالَ: إِنْ لَمْ تَصْدُقِينِي فَأَنْتِ طَالِقٌ. فَقَالَتْ: سَرَقْتُ مَا سَرَقْتُ. لَمْ تَطْلُقْ، وَلَوْ قَالَ: إِنْ لَمْ تُخْبِرِينِي بِعَدَدِ حَبِّ هَذِهِ الرُّمَّانَةِ قَبْلَ كَسْرِهَا. فَالْخَلاَصُ أَنْ تَذْكُرَ عَدَدًا يُعْلَمُ أَنَّهَا لاَ تَنْقُصُ عَنْهُ ثُمَّ تَزِيدَ وَاحِدًا وَاحِدًا حَتَّى تَبْلُغَ مَا يُعْلَمُ أَنَّهَا لاَ تَزِيدُ عَلَيْهِ،

---

کولێرەیەکی بچوك، یان دەنکە هەنارێك مایەوە (لَمْ يَقَعْ) تەلاقەکەی ناکەوێ، چونکە هەمووی نەخواردوە (وَلَوْ أَكَلاَ تَمْرًا وَخَلَطَا نَوَاهُمَا) ئەگەر ژن و مێردەکە قەسپیان خواردو دەنکە قەسپەکانیشیان تێکەڵ کردن (فَقَالَ إِنْ لَمْ تُمَيِّزِي نَوَاكِ فَأَنْتِ طَالِقٌ) مێردەکەش گوتیە ژنەکەی: ئەگەر دەنکە قەسپەکانی خۆت جیانەکەیەوە تۆ تەلاقکەوتووی (فَجَعَلَتْ كُلَّ نَوَاةٍ وَحْدَهَا) ژنەکەش هەر دەنکێکی بە تەنها دانا، ئەوە (لَمْ يَقَعْ) تەلاقی ناکەوێ (إِلاَّ أَنْ يَقْصِدَ تَعْيِينًا)مەگەر مەبەستی مێردەکە دیارکردنی دەنکەکان بێ، ئەو کاتە تەلاقی دەکەوێ، چونکە دیارکردنەکە مەحاڵە.

(وَلَوْ كَانَ بِفَمِهَا تَمْرَةٌ) ئەگەر ژنەکە قەسپێکی لەدەمدا بوو (فَعَلَّقَ بِبَلْعِهَا) مێردەکەش تەلاقەکەی بە قوتدانی قەسپەکە هەڵواسی (ثُمَّ بِرَمْيِهَا) ئینجا بە فرێدانی قەسپەکە (ثُمَّ بِإِمْسَاكِهَا) ئینجا بە ڕاگرتنی قەسپەکە، واتە: گوتی ئەگەر ئەم قەسپە قوت بدەی تەلاقت کەوتبێ، ئەگەر فڕێی بدەی تەلاقت کەوتبێ، ئەگەر لە دەمدا ڕاییگری تەلاقت کەوتبێ (فَبَادَرَتْ مَعَ فَرَاغِهِ بِأَكْلِ بَعْضٍ وَرَمْيِ بَعْضٍ) ژنەکەش لەگەڵ کۆتایی قسەی مێردەکە پەلەی کرد: بەشێکی قەسپەکەی خواردو بەشێکیشی فڕێدا (لَمْ يَقَعْ) تەلاقی ناکەوێ.

(وَلَوْ اتَّهَمَهَا بِسَرِقَةٍ) ئەگەر مێردەکە تۆمەتی دزیی بە ژنەکەی کرد (فَقَالَ إِنْ لَمْ تَصْدُقِينِي فَأَنْتِ طَالِقٌ) ئینجا مێردەکە گوتی: ئەگەر ڕاستیم پێ نەڵێی تۆ تەلاقکەوتووی (فَقَالَتْ سَرَقْتُ مَا سَرَقْتُ) ژنەکەش گوتی: دزیومە نەمدزیوە. ئەوە (لَمْ تَطْلُقْ) تەلاقی ناکەوێ، چونکە بێگومان لەو دوو ووشەیە لە یەکێکیاندا ڕاست دەکا.

(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر مێردەکە گوتیە ژنەکەی: (إِنْ لَمْ تُخْبِرِينِي بِعَدَدِ حَبِّ هَذِهِ الرُّمَّانَةِ قَبْلَ كَسْرِهَا) ئەگەر– پێش شکاندنی ئەم هەنارە– ژمارەی دەنکەکانیم پێ نەڵێی تەلاقت کەوتبێ. ئەوە (فَالْخَلاَصُ) ڕزگاربوون لە تەلاقکەوتن بەوە دەبێ: (أَنْ تَذْكُرَ عَدَدًا يُعْلَمُ أَنَّهَا لاَ تَنْقُصُ عَنْهُ) ژنەکە ژمارەیەکی ئەوها بڵێ: کە بزاندرێ هەنارەکە لەو ژمارەیە دەنکەکانی کەمتر نیە (ثُمَّ تَزِيدَ وَاحِدًا وَاحِدًا حَتَّى تَبْلُغَ مَا يُعْلَمُ أَنَّهَا لاَ تَزِيدُ عَلَيْهِ) ئینجا یەکە یەکە ژمارەی دەنکەکان زیاد بکا تا دەگاتە ژمارەیەکی ئەوها کە بزاندرێ دەنکەکانی لەو ژمارەیە زیاتر نابن.

وَالصُّورَتَانِ فِيمَنْ لَمْ يَقْصِدْ تَعْرِيفًا، وَلَوْ قَالَ لِثَلَاثٍ: مَنْ لَمْ تُخْبِرْنِي بِعَدَدِ رَكَعَاتِ فَرَائِضِ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَةِ، فَقَالَتْ وَاحِدَةٌ: سَبْعَ عَشْرَةَ. وَأُخْرَى: خَمْسَ عَشْرَةَ. أَيْ يَوْمَ جُمُعَةٍ، وَثَالِثَةٌ: إِحْدَى عَشْرَةَ. أَيْ لِمُسَافِرٍ، لَمْ يَقَعْ، وَلَوْ قَالَ: أَنْتِ طَالِقٌ إِلَى حِينٍ أَوْ زَمَانٍ أَوْ بَعْدَ حِينٍ. طَلَقَتْ بِمُضِيِّ لَحْظَةٍ، وَلَوْ عَلَّقَ بِرُؤْيَةِ زَيْدٍ أَوْ لَمْسِهِ أَوْ قَذْفِهِ تَنَاوَلَهُ حَيًّا وَمَيِّتًا، بِخِلَافِ ضَرْبِهِ،

---

(وَالصُّورَتَانِ) وێنەی دزیەکەو هەنارەکە (فِيمَنْ لَمْ يَقْصِدْ تَعْرِيفًا) لە بارەی ئەو کەسە بوو: کە دیارکردنی مەبەست نەبێ، ئەگینا: بەو ڕێگەیەڕابردوو ڕزگاری نابێ.

ئینجا بزانە: ئەگەر شتێکی لە شوێنێك دانا، ئینجا لێی بە سەهوو چوو، ژنەکەشی بە شتەکەی نەزانیبو، مێردەکەش گوتی: ئەگەر شتەکەم نەدەیتێ تەلاقت کەوتبێ. ئینجا مێردەکە شوێنەکەی هاتەوە بیرو دیتی شتەکە لە شوێنەکەدایە، ئەوە تەلاقی ناکەوێ، بەڵکو سوێندەکەش دانامەزرێ، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی، بەلام ئەگەر لەو مەسەلەیەدا بڵێ: هەر کاتێك شتەکەم نەدەیتێ تەلاقت کەوتبێ، ئەو کاتە تەلاقی دەکەوێ، هەروەك لە (نهاية)دا فەرموویەتی.

(وَلَوْ قَالَ لِثَلَاثٍ) ئەگەر بە سێ ژنەکانی خۆی گوت (مَنْ لَمْ تُخْبِرْنِي بِعَدَدِ رَكَعَاتِ فَرَائِضِ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَةِ) هەر کێتان ژمارەی ڕەکعەتەکانی نوێژە واجبەکانی ڕۆژێو شەوێم پێ نەڵێ تەلاقی کەوتبێ (فَقَالَتْ وَاحِدَةٌ سَبْعَ عَشْرَةَ) ژنێکیان گوتی: حەفدەنە (وَأُخْرَى خَمْسَ عَشْرَةَ: أَيْ يَوْمَ جُمُعَةٍ) یەکێکیش گوتی: پانزەنە. واتە: لە ڕۆژی هەینیدا (وَثَالِثَةٌ إِحْدَى عَشْرَةَ: أَيْ لِمُسَافِرٍ) سێیەمەکەش گوتی: پانزەنە. واتە: بۆ ڕێبوار، ئەوە (لَمْ يَقَعْ) تەلاقی ناکەوێ، چونکە گشتیان ڕاست دەکەن.

(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر مێردەکە گوتی (أَنْتِ طَالِقٌ إِلَى حِينٍ أَوْ زَمَانٍ أَوْ بَعْدَ حِينٍ) تۆ تەلاقکەوتووی تا کاتێك، یان تا ماوەیەك ، یان پاش ماوەیەك، ئەوە (طَلَقَتْ بِمُضِيِّ لَحْظَةٍ) تەلاقی دەکەوێ بە ڕابردنی ماوەی چاولێکردنێك، بەلام ئەگەر بڵێ: تەلاقم کەوتبێ تا ماوەیەك حەقەکەت دەدەمەوە. ئەوە تا بێئومێد نەبێ تەلاقی ناکەوێ، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی؟ چونکە ئەمە وەعدەپێدانە.

(وَلَوْ عَلَّقَ بِرُؤْيَةِ زَيْدٍ) ئەگەر تەلاقەکەی هەڵواسی بە دیتنی زەید (أَوْ لَمْسِهِ) یان بە دەست لێدانی (أَوْقَذْفِهِ) یان بە بوختان پێکردنی: وەك ئەگەر فلانکەست دیت، یان دەستت لێدا، یان بوختانت پێکرد تەلاقت کەوتبێ. ئەوە (تَنَاوَلَهُ حَيًّا وَمَيِّتًا) هەڵواسینەکەی هەرسێکیان لە حاڵەتی زیندوویی‌و مردوویی‌دا فلانکەسەکە دەگرێتەوە (بِخِلَافِ ضَرْبِهِ) بەلام لێدان ئەوها نیە: وەك ئەگەر لە فلانکەس بدەی تەلاقت کەوتبێ، ئەوە ئەگەر لە حاڵەتی زیندوویی‌دا لێی بدا تەلاقی دەکەوێ، ئەگەرنا: نا.

وَلَوْ خَاطَبَتْهُ بِمَكْرُوهٍ: كَيَا سَفِيهُ يَا خَسِيسُ، فَقَالَ: إِنْ كُنْتُ كَذَاكِ فَأَنْتِ طَالِقٌ. إِنْ أَرَادَ مُكَافَأَتَهَا بِإِسْمَاعِ مَا تَكْرَهُ طَلَقَتْ وَإِنْ لَمْ يَكُنْ سَفَهٌ، أَوِ التَّعْلِيقَ اُعْتُبِرَتِ الصِّفَةُ، وَكَذَا إِنْ لَمْ يَقْصِدْ فِي الأَصَحِّ، وَالسَّفَهُ مُنَافِي إِطْلاَقَ التَّصَرُّفِ، وَالْخَسِيسُ: قِيلَ مَنْ بَاعَ دِينَهُ بِدُنْيَاهُ، وَيُشْبِهُ أَنْ يُقَالَ: هُوَ مَنْ يَتَعَاطَى غَيْرَ لاَئِقٍ بِهِ بُخْلاً.

(كِتَابُ الرَّجْعَةِ)

شَرطُ الْمُرْتَجِعِ أَهْلِيَّةُ النِّكَاحِ بِنَفْسِهِ،

---

(وَلَوْ خَاطَبَتْهُ بِمَكْرُوهٍ) ئەگەر ژنەكە قسەیەكی ناخۆشی بە مێردەكەی گوت: (كَـ) وەك (يَا سَفِيهُ يَا خَسِيسُ) هەی ماڵبەفیڕۆدەر، هەی ڕەزیل (فَقَالَ إِنْ كُنْتُ كَذَاكِ فَأَنْتِ طَالِقٌ) مێردەكەش گوتی: ئەگەر من ئەوها بم تۆ تەڵاقكەوتووی. ئەوە (إِنْ أَرَادَ مُكَافَأَتَهَا بِإِسْمَاعِ مَا تَكْرَهُ) ئەگەر مێردەكەش مەبەستی ئەوە بێ تۆڵەی جنێوەكەی بكاتەوە بە قسەیەكی ئەوها كە ژنەكەی پێی ناخۆش بێ، ئەوە (طَلَقَتْ وَإِنْ لَمْ يَكُنْ سَفَهٌ) تەڵاقی دەكەوێ هەرچەند مێردەكەش بەفیڕۆدەرو ڕەزیل نەبێ (أَوِ التَّعْلِيقَ) یان ئەگەر مەبەستی هەڵواسین بێ، ئەوە (اُعْتُبِرَتِ الصِّفَةُ) مەرجە پێهەڵواسراوەكە بێتە جێ (وَكَذَا إِنْ لَمْ يَقْصِدْ) هەروەها ئەگەر هیچیشی مەبەست نەبێ، مەرجە: پێهەڵواسراوەكە بێتە جێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَالسَّفَهُ) ماڵ بەفیڕۆدان (مُنَافِي إِطْلاَقَ التَّصَرُّفِ) سیفەتێكە دژ بە سەربەخۆیی دەستكاریكردنی ملكو ماڵە، هەروەك لە باسیقەدەغەكردندا ڕابرا (وَالْخَسِيسُ) ڕەزیل (قِيلَ مَنْ بَاعَ دِينَهُ بِدُنْيَاهُ) ئەو كەسەیە ئایینی خۆی بە دونیایەكەی فرۆشتبێ (وَيُشْبِهُ أَنْ يُقَالَ) پێشدەچێ بگوترێ (هُوَ مَنْ يَتَعَاطَى غَيْرَ لاَئِقٍ بِهِ بُخْلاً) ڕەزیل ئەو كەسەیە لە بەر بەخیلی كاری وەها بكا: كە شیاوی خۆی نەبێ.

ئینجا بزانە: ئەگەر گوتی: تەڵاقم كەوتبێ ماڵی فلانكەس ناخۆم. ئینجا بووە مێوانی كەسەكەو بە مێوانداری خواردی، ئەوە تەڵاقی ناكەوێ، چونكە پێش قوتدان خواردنەكە دەبێتە ملكی میوانەكە، هەروەك لە (تحفة)و (الشروانی)دا فەرموویانە.

﴿ كِتَابُ الرَّجْعَةِ: پەرتوكی گەڕاندنەوەی ژن-چاككردنەوەی تەڵاق ﴾

واتە: ئەو ژنەی بە خۆڕایی بە تەڵاقێك، یان بە دوو تەڵاق تەڵاقیداوە، لە (عِدَّة)دا بیگەڕێنێتەوە ژێر مارەبڕینیخۆی، بێ مارەكردنەوەیەكینوێ، جا ئەم جۆرە تەڵاقدراوە پێی دەگوترێ: (رَجْعِيَّة) گەڕایەوەیی. هەروەك لە سەرەتای (خُلْع)دا ڕابرا.

(شَرطُ الْمُرْتَجِعِ) مەرجی ئەو كەسەی تەڵاقدراوی(رَجْعِيَّة) دەگەڕێنێتەوە ئەوەیە: (أَهْلِيَّةُ النِّكَاحِ بِنَفْسِهِ) شیاوی ئەوە بێ بەخۆی ژن لە خۆی مارە ببڕێ: وەك بالغو عاقڵ بێو

وَلَوْ طَلَّقَ فَجُنَّ فَلِلْوَلِيِّ اَلرَّجْعَةُ عَلَى الصَّحِيحِ حَيْثُ لَهُ اِبْتِدَاءُ النِّكَاحِ، وَتَحْصُلُ بِرَاجَعْتُكِ وَرَجَعْتُكِ وَارْتَجَعْتُكِ، وَالأَصَحُّ أَنَّ الرَّدَّ وَالإِمْسَاكَ صَرِيحَانِ، وَأَنَّ التَّزْوِيجَ وَالنِّكَاحَ كِنَايَتَانِ، وَلْيَقُلْ: رَدَدْتُهَا إِلَيَّ. أَوْ إِلَى نِكَاحِي. وَالْجَدِيدُ أَنَّهُ لاَ يُشْتَرَطُ الإِشْهَادُ، فَتَصِحُّ بِكِنَايَةٍ،

---

به خۆشی خۆی بێو کافربوو نەبێ، کەواتە: ژن گەڕاندنەوەی منداڵو شێتو زۆرلێکراو و کافربوو دروست نابێ.

بەڵام (وَلَوْ طَلَّقَ فَجُنَّ) ئەگەر ژنەکەی تەڵاق دا، ئینجا لە دوای تەڵاقدانەکە شێت بوو، ئەوە (فَلِلْوَلِيِّ الرَّجْعَةُ عَلَى الصَّحِيحِ) سەرپەرشتکارەکەی بۆی دروستە ژنەکەی بۆ بگەڕێنێتەوە، لە سەر فەرموودەی ڕاست، بەڵام (حَيْثُ لَهُ اِبْتِدَاءُ النِّكَاحِ) لەو حاڵەتەی کە بۆی دروست بێ لە سەرەتادا ژنێك لە شێتەکە مارەبکا: وەك شێتەکە پێویستی بە جیماعکردن بێ، کەواتە: سەرپەرشکارەکە دەڵێ: فلانە ژنی ئەم شێتەم گەڕاندەوە ژێر مارەبڕینی شێتەکە. کەوابو: وەکیلگرتنیش بۆ ژن گەڕاندنەوە دروستە.

ئینجا بزانە: ئەگەر میردەکە کەوتە گومان: ئایا تەڵاقی داوە، یان نا، ئینجا لە (عِدَّة)دا – بۆ پارێزکاری – ژنەکەی گەڕاندەوە، ئینجا ئاشکرا بوو تەڵاقیداوە، ئەوە گەڕاندنەوەکەی دروست بووە، هەروەك لە (تحفة)و (مغني)دا فەرموویانە.

(وَتَحْصُلُ) گەڕاندنەوەی تەڵاقدراوی(رَجْعِيَّة) دێتەجێ (بِـ) بە یەکێك لەو ووشانە: وەك (رَاجَعْتُكِ وَرَجَعْتُكِ وَارْتَجَعْتُكِ) ریجعەتم لەگەڵ تۆ کرد، تۆم گەڕاندەوە، قبوڵی گەڕاندنەوی تۆم کرد (وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر: (أَنَّ الرَّدَّ وَالإِمْسَاكَ صَرِيحَانِ) تۆم هێناوە= گەڕاندەوە، تۆم ڕاگرتەوە، هەردووکیان ووشەیئاشکرای گەڕاندنەوەن، چونکە هەردووکیان لە قورئاندا هاتون (وَ) هەر بە فەرموودەیڕاستتر (أَنَّ التَّزْوِيجَ وَالنِّكَاحَ كِنَايَتَانِ) کردمە جووت لەگەڵ خۆمو لەخۆم مارە کردەوە، هەردووکیان ووشەی نائاشکرانو پێویستە نیەتی گەڕاندنەوەیان لەگەڵدا بێ.

(وَلْيَقُلْ) ئەو کەسەی تەڵاقدراوەکە دەگەڕێنێتەوە با بڵێ: (رَدَدْتُهَا إِلَيَّ أَوْ إِلَى نِكَاحِي) ژنەکەم گەڕاندەوە لایخۆم. یان بڵێ: ژنەکەم گەڕاندەوە ژێر مارەبڕینیخۆم.

(وَالْجَدِيدُ) بە فەرموودەی نوێ (أَنَّهُ لاَيُشْتَرَطُ الإِشْهَادُ) بۆ دروستبوونی گەڕاندنەوەیژنەکە بە مەرج دانانرێ: شاهید بگرێ، بەڵکو شاهیدگرتنەکە سوننەتە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِنْكُمْ﴾ هەر کاتێك ژنە تەڵاقدراوەکان لە تەواوبوونی (عِدَّة) نزیك کەوتنەوە: یان بە یاسایشەرع ڕایان بگرنەوە، یان بە یاسایشەرع لێیان جیا ببنەوە، دوو پیاوی دادپەروەریش لە سەر ڕاگرتنەوەکە بکەنە شاهید. کەوابو: (فَتَصِحُّ بِكِنَايَةٍ) گەڕاندنەوەی ژنەکە بە ووشەی نائاشکراش دروست دەبێ، ئەگەر نیەتی لەگەڵدا بێ.

وَلاَ تَقْبَلُ تَعْلِيقًا، وَلاَ تَحْصُلُ بِفِعْلٍ: كَوَطْءٍ، وَتَخْتَصُّ الرَّجْعَةُ بِمَوْطُوءَةٍ طُلِّقَتْ بِلاَ عِوَضٍ لَمْ يُسْتَوْفَ عَدَدُ طَلاَقِهَا بَاقِيَةٍ فِي الْعِدَّةِ مَحَلٍّ لِحِلٍّ لاَ مُرْتَدَّةٍ،

---

﴿ئاگاداری﴾: بۆ دروستبوونی گەڕاندنەوەی ژن: ڕازیبوونی ژنەکەو سەرپەرشتکارەکەی مەرج نیە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِي ذَلِكَ﴾ مێردەکانیان لەپێشترن بۆ گەڕاندنەوەیان لە ماوەی (عدّة)دا.

(وَلاَ تَقْبَلُ تَعْلِيقًا) گەڕاندنەوەی ژن قبوڵی هەڵواسین ناکا: وەك تۆم گەڕاندەوە ئەگەر حەزت کرد (وَلاَ تَحْصُلُ بِفِعْلٍ: كَوَطْءٍ) گەڕاندنەوە نایەتە جێ بە کردارێك: وەك جیماعکردن، هەر چەند نیەتی گەڕاندنەوەشی هەبێ.

(وَتَخْتَصُّ الرَّجْعَةُ) گەڕاندنەوە تایبەتە بەو تەڵاقدراوەی ئەم مەرجانەی لێبێنەجێ:

یەکەم: (بِمَوْطُوءَةٍ) بەو ژنەی جیماعی لەگەڵ کراوە، یان (مَني)یە ڕێزدارەکەی مێردەکەی تێکراوە، چونکە ئەگەر جیماعی لەگەڵ نەکرابێو تەڵاق بدرێ، یەکسەر دەبێتە (بائن)و (عدّة)شی لە سەر نیە، ئایەتەکەیڕابردووش فەرمووی: لە ماوەی (عدّة)دا.

دووەم: (طُلِّقَتْ بِلاَ عِوَضٍ) ژنەکەش بە خۆڕایی تەڵاق درابێ، چونکە ئەگەر مارەبڕینی هەڵوەشێندرابێتەوە، یان بە پارە تەڵاق درابێ، ئەو کاتە بە مارەبڕینێکی نوێ نەبێ حەڵاڵ نابێتەوە.

سێیەم: (لَمْ يُسْتَوْفَ عَدَدُ طَلاَقِهَا) ژمارەی تەڵاقەکانیژنەکە تەواو نەبوبێ، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿الطَّلاقُ مَرَّتَانِ﴾ ئەو تەڵاقدانەی گەڕاندنەوەی بە دوادا دەبێ دوو جارە. کەواتە: ئەگەر سێ تەڵاقەکەی تەواو بوبن ئەوە بە مارە بەجاش نەبێ لێی حەڵاڵ نابێتەوە، هەروەك ڕابرا، هەم ﴿عَنْ ابن عمررضیالله عنهما—فِي جَوَابِ سائِلٍ—: أَمَّا أَنْتَ طَلَّقْتَ امْرَأَتَكَ مَرَّةً أَوْ مَرَّتَيْنِ فَإِنَّ رَسُولَ اللهِﷺ أَمَرَنِي بِهذا، وَإِنْ كُنْتَ طَلَّقْتَها ثَلاثاً فَقَدْ حَرُمَتْ عَلَيْكَ حَتَّى تَنْكِحَ زَوْجاً غَيْرَكَ﴾ رواه مسلم، ئەگەر ژنەکەت یەك، یان دوو تەڵاق داوە، ئەوە پێغەمبەرﷺ فەرمانی پێکردم بێگەڕێنمەوە، بەڵام ئەگەر سێبەسێ تەڵاقت دابێ، ئەوە ژنەکەت لێحەرام بووە تا مێردێکیتر دەکا.

چوارەم: (بَاقِيَةٍ فِي الْعِدَّةِ) ژنە تەڵاقدراوەکە لە (عِدّة)دا مابێ، چونکە ئەگەر (عِدّة)ی تەواو بوبێ، پێویستی بە مارەبڕینێکی سەرلەنوێیە.

پێنجەم: (مَحَلٍّ لِحِلٍّ) ژنە تەڵاقدراوەکە شیاوی حەڵاڵبوونیش بێ بۆ مێردەکەی، چونکە ئەگەر ژنەکە موسوڵمان بێو مێردەکەشی هەر کافر بێ، ئەو کاتە گەڕاندنەوەکەی دروست نابێ، هەم (لاَ مُرْتَدَّةٍ) ژنەکەش کافربوو نەبێ، چوکە ژنیکافربوو حەڵاڵ نیە.

وَإِذَا ادَّعَتْ انْقِضَاءَ عِدَّةِ أَشْهُرٍ وَأَنْكَرَ صُدِّقَ بِيَمِينِهِ، أَوْ وَضْعَ حَمْلٍ لِمُدَّةِ إِمْكَانٍ وَهِيَ مِمَّنْ تَحِيضُ لاَ آيِسَةٌ فَالأَصَحُّ تَصْدِيقُهَا بِيَمِينٍ، وَإِنْ ادَّعَتْ وِلاَدَةَ تَامٍّ فَإِمْكَانُهُ سِتَّةُ أَشْهُرٍ وَلَحْظَتَانِ مِنْ وَقْتِ النِّكَاحِ، أَوْ سِقْطٍ مُصَوَّرٍ فَمِائَةٌ وَعِشْرُونَ يَوْمًا وَلَحْظَتَانِ، أَوْ مُضْغَةٍ بِلاَ صُورَةٍ فَثَمَانُونَ يَوْمًا وَلَحْظَتَانِ، أَوْ انْقِضَاءَ أَقْرَاءٍ: فَإِنْ كَانَتْ حُرَّةً وَطُلِّقَتْ فِي طُهْرٍ فَأَقَلُّ الإِمْكَانِ اثْنَانِ وَثَلاَثُونَ يَوْمًا وَلَحْظَتَانِ،

---

(وَإِذَا ادَّعَتْ انْقِضَاءَ عِدَّةِ أَشْهُرٍ) هەرکاتێك ژنە تەڵاقدراوەکە گوتی: (عِدَّة)م تەواو بووە، (عِدَّة)کەشی بە مانگ بوو، چونکە لە حەیز وەستابو (وَأَنْكَرَ) مێردەکەش گوتی: ڕاست ناکاو (عِدَّة)ی تەواو نەبوە، ئەوە (صُدِّقَ بِيَمِينِهِ) بە سوێندخواردن باوەڕ بە مێردەکە دەکرێ.

(أَوْ وَضْعَ حَمْلٍ لِمُدَّةِ إِمْكَانٍ) یان ژنەکە گوتی: باری زگم داناوەو دەشگونجا لەو ماوەیەدا ئەو بارەی دانابێ (وَهِيَ مِمَّنْ تَحِيضُ لاَ آيِسَةٌ) ژنەکەش لەوانە بوو حەیزی دەدیت، نەك لە حەیز وەستابێ، ئەو کاتە (فَالأَصَحُّ تَصْدِيقُهَا بِيَمِينٍ) بە فەرموودەی ڕاستتر: بە سوێندخواردن باوەڕ بە ژنەکە دەکرێ، بەڵام ئەگەر نەبالغ بوو، یان لەحەیز وەستابو، ئەو کاتە بە سوێندخواردن باوەڕی پێناکرێ.

ئینجا (وَإِنْ ادَّعَتْ وِلاَدَةَ تَامٍّ) ئەگەر ژنەکە گوتی: منداڵێکی تەواوم لێبوە. ئەوە (فَإِمْكَانُهُ سِتَّةُ أَشْهُرٍ وَلَحْظَتَانِ مِنْ وَقْتِ النِّكَاحِ) لایکەمی گونجانی ئەو منداڵبوونەش شەش مانگو دوو چاوچوقانە لە کاتیمارەبڕینەوە: چاوچوقانێك بۆ جیماعو چاوچوقانێکیش بۆ منداڵبوون (أَوْ سِقْطٍ مُصَوَّرٍ) یان ژنەکە گوتی: کۆرپەیەکیلەبارچوویوێنەکراوم لێبوە. ئەوە (فَمِائَةٌ وَعِشْرُونَ يَوْمًا وَلَحْظَتَانِ) لایکەمی گونجانی ئەو کۆرپەیەش سەدو بیست ڕۆژو دوو چاوچوقانە (أَوْ مُضْغَةٍ بِلاَ صُورَةٍ) یان گوتی: پارچە گۆشتێکی لەبارچووی بێوێنەم لێبوە. ئەوەش (فَثَمَانُونَ يَوْمًا وَلَحْظَتَانِ) لایکەمیەکەی هەشتا ڕۆژو دوو چاوچوقانە، چونکە لە حەدیسی (صحیح)دا ئەو سێ قۆناغانە هاتونو بە هەر جۆرێکیش لەو سێ جۆرە منداڵبوونە (عِدَّة) تەواو دەبێ، هەروەك لە باسی (عِدَّة)دا ڕوون کراوەتەوە.

(أَوْ انْقِضَاءَ أَقْرَاءٍ) یان ژنەکە گوتی: (عِدَّة)م بە پاکبوونەوەیحەیز تەواو بووە. ئەوە: (فَإِنْ كَانَتْ حُرَّةً وَطُلِّقَتْ فِي طُهْرٍ) ئەگەر ژنەکە ئازاد بێو لە پاکبوونەوەشدا تەڵاق درابێ، ئەوە (فَأَقَلُّ الإِمْكَانِ) لایکەمی گونجانیتەواوبوونەکە (اثْنَانِ وَثَلاَثُونَ يَوْمًا وَلَحْظَتَانِ) سیو دوو ڕۆژو دوو چاوچوقانە: وەك لە پاکبوونەوەدا-بە چاوچوقانێك- پێش کەوتنە حەیز تەڵاق بدرێ، ئەمە پاکبوونەوەی یەکەمە، ئینجا ڕۆژێکو شەوێك بکەوێتە حەیز، ئینجا پانزە ڕۆژ پاك ببێتەوە، ئەمەش پاکبوونەوەی دووەمە، ئینجا ڕۆژێکو شەوێك بکەوێتە حەیز، ئینجا پانزە ڕۆژ پاك ببێتەوەو چاوچوقانێك دەست بە حەیزێکیتر بکا، ئەمەش پاکبوونەوەی سێیەمە.

أَوْ فِي حَيْضٍ فَسَبْعَةٌ وَأَرْبَعُونَ وَلَحْظَةٌ، أَوْ أَمَةٌ وَطُلِّقَتْ فِـي طُهْـرٍ فَسِتَّةَعَشَـرَ يَوْمًـا وَلَحْظَتَانِ، أَوْ فِي حَيْضٍ فَأَحَدٌ وَثَلاثُونَ وَلَحْظَةٌ، وَتُصَدَّقُ إِنْ لَمْ تُخَالِفْ عَادَةً دَائِـرَةً، وَكَذَا إِنْ خَالَفَتْ فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ وَطِئَ رَجْعِيَّةً وَاسْتَأْنَفَتِ الأَقْرَاءَ مِنْ وَقْـتِ الْـوَطْءِ رَاجَعَ فِيمَا كَانَ بَقِيَ،

---

(أَوْ فِي حَيْضٍ) يان تەلاقدراوە ئازادەكە لە حەيزدا تـەلاق درابو، ئـەوە (فَسَبْعَةٌ وَأَرْبَعُونَ وَلَحْظَـةٌ) لای كـەمی گونجانەكـەی چـلو حـەفت ڕۆژو چاوچـوقانێكە: وەك لـە كۆتـایی حەیزەكەیدا تەلاق بدرێ، ئینجا پانزە ڕۆژ پـاك ببێتـەوە، ئینجا ڕۆژێكو شـەوێك بكەوێتـە حەیز، ئینجا پانزە ڕۆژ پاك ببێتەوە، ئینجا ڕۆژێكو شەوێك بكەوێتە حەیز، ئینجا پـانزە ڕۆژ پاك ببێتەوەو بە چاوچوقانێك دەست بە حەیز بكاتەوە.

(أَوْ أَمَةٌ وَطُلِّقَتْ فِي طُهْرٍ) یان تەلاقدراوەكـە كۆیلـە بـوو و لـە پاكبوونـەوەدا تـەلاق درابو، ئەوە (فَسِتَّةَ عَشَرَ يَوْمًا وَلَحْظَتَانِ) لای كەمی شانزە ڕۆژو دوو چاوچوقانە (أَوْ فِـي حَـيْضٍ) یان ئەگەر لە حەیزدا تەلاق درابو، ئەوە (فَأَحَدٌ وَثَلاثُونَ وَلَحْظَةٌ) لای كەمی سیو یەك ڕۆژو چاوچوقانێكە، چونكە كۆیلە بە دوو پاكبوونەوە (عِدَّة)ی تەواو دەبێ.

(وَتُصَدَّقُ) ژنی تەلاقـدراو لـەبارەی حـەیزو پاكبوونـەوەی خـۆی بـاوەڕی پـێدەكرێ (إِنْ لَـمْ تُخَالِفْ عَادَةً دَائِرَةً) بەو مەرجەی دژ بە عادەتیمانگانەی نـەبێ (وَكَذَا إِنْ خَالَفَتْ فِي الأَصَحِّ) هەروەها ئەگەر دژ بە عادەتەكەشی بێ هەر بـاوەڕی پـێدەكرێ لـە فـەرموودەی ڕاسـتتردا، بەلام لە هەردوو حاڵەتدا ئەگەر مێردەكەی باوەڕی پێنەكا، دەبێ ژنەكـە سـوێند بخـوا، جا ئەگەر سوێندی نەخوارد، ئەو كاتە مێردەكە سوێند دەخواو مافی گەڕاندنەوەی دەبێ.

(وَلَوْ وَطِئَ رَجْعِيَّتَـهُ) ئەگـەر مێردەكـە جیمـاعی لەگـەڵ تەلاقـدراوە (رَجْعِيَّـة)كـەیخۆی كـرد (وَاسْتَأْنَفَتِ الأَقْرَاءَ مِنْ وَقْتِ الْوَطْءِ) ئینجا بە هۆی جیماعەكە ژنە تەلاقدراوەكـە سـەرلەبنیات لە كاتی جیماعەوە دەستی بە (عِدَّة) كردەوە، ئەوە (رَاجَعَ فِيمَاكَانَ بَقِيَ) مێردەكە ژنەكـەی دەگەڕێنێتەوە لەو بەشەی كە لە (عِدَّة)ی تەلاقەكەی پێش جیماعكردن مابو، نەك لـە(عِـدَّة) دەستپێكراوەكەی جیماع.

بـۆ وێنـە: لـە دوای دوو مـانگ، یـان دوو پاكبوونـەوە مێردەكـە جیمـاعی لەگـەڵ ژنـە تەلاقدراوەكەی كرد، ئـەوە لـە سـەر ژنەكـە واجبـە سـەرلەبنیات بـۆ ئـەو جیماعـە لـە كـاتی جیماعەكەوە دەست بە (عِدَّة)یەكیتر بكاتەوە، واتە: سێ مانگیتر، یان سـێ پاكبوونـەوەیتر چاوەڕوان بكـا، ئـەو مانگـەش، یـان ئـەو پاكبوونـەوەش كـە لـە (عِـدَّة)یتەلاقەكـەی مـابۆوە، دەچـێتە نـاو (عِـدَّة)یجیماعەكـە، بـەلام مێردەكـە بـۆی دروسـت نیـە لـە هـەموو (عِـدَّة)ی جیماعەكەدا ژنەكە بگەڕێنێتەوە، بەڵكو تەنها لە مانگەكەییەكەمدا، یـان لـە پاكبوونەوەكـەی یەكەمدا-كە پێش جیماع مابونەوە- مافی هەیەو لە دووەكەیتردا مافی نیە.

وَيَحْرُمُ الإِسْتِمْتَاعُ بِهَا، فَإِنْ وَطِئَ فَلاَ حَدَّ، وَلاَ يُعَزَّرُ إِلاَّ مُعْتَقِدُ تَحْرِيمِهِ، وَيَجِبُ مَهْرُمِثْلٍ إِنْ لَمْ يُرَاجِعْ، وَكَذَا إِنْ رَاجَعَ عَلَىالْمَذْهَبِ، وَيَصِحُّ إِيلاَءٌ وَظِهَارٌ وَطَلاَقٌ وَلِعَانٌ، وَيَتَوَارَثَانِ، وَإِذَا ادَّعَى-وَالْعِدَّةُ مُنْقَضِيَةٌ- رَجْعَةً فِيهَا فَأَنْكَرَتْ: فَإِنِ اتَّفَقَا عَلَى وَقْتِ الإِنْقِضَاءِ كَيَوْمِ الْجُمُعَةِ وَقَالَ: رَاجَعْتُ يَوْمَ الْخَمِيسِ،

---

جا بزانە: ئەوە لە حاڵەتێکدا بوو: کە تەڵاقدراوەکە ئاوس نەبێ، چونکە ئەگەر تەڵاقدراوەکە لە مێردەکەی ئاوس بوو، یان مێردەکەی بەو جیماعە ئاوسی کرد، ئەو کاتە پێویست بە بنیاتنانەوەی (عِدَّة) ناکاو تا زگەکەشی دادەنێ مێردەکە مافی گەڕاندنەوەی هەیە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَيَحْرُمُ الإِسْتِمْتَاعُ بِهَا) لە مێردەتەڵاقدەرەکە حەرامە لەزەت لەو ژنە وەربگرێ کە بە (رَجْعِي) تەڵاقیداوە، بەڵکو تەماشاکردنیشی حەرامە (فَإِنْ وَطِئَ) جا ئەگەر مێردەکە جیماعی لەگەڵ کرد (فَلاَ حَدَّ) سزای زینای لە سەر نیە، چونکە هەندێك لە زانایان بە حەڵاڵیان داناوە، کەوابو: (وَلاَ يُعَزَّرُ إِلاَّ مُعْتَقِدُ تَحْرِيمِهِ) لەزەتوەرگرەکە تەمبێش ناکرێ، هەرچەند جیماعیشی کردبێ، مەگەر باوەڕی وابێ حەرامە، وەك مەزهەبی (شافعی) بێ، ئەوە تەمبێ دەکرێ.

(وَيَجِبُ مَهْرُ مِثْلٍ إِنْ لَمْ يُرَاجِعْ) بە هۆی ئەم جیماعە مێردەکە مارەیی هاوێنەی لە سەر واجب دەبێ بۆ ژنە تەڵاقدراوەکە ئەگەر نەیگەڕێنێتەوە (وَكَذَا إِنْ رَاجَعَ عَلَىالْمَذْهَبِ) هەروەها ئەگەر بشیگەڕێنێتەوە مارەییەکەی هەر لە سەر واجب دەبێ، لە سەر فەرمودەی ڕاستی مەزهەب، چونکە جیماعەکە شوبهەی تێدایە، کەوابو: ئەو منداڵەی لەم جیماعە پەیدا دەبێ، هەر لە نەژادی مێردە جیماعکەرەکەیەو بیژی نیە.

(وَيَصِحُّ إِيلاَءٌ وَظِهَارٌ) سوێندی جیماع نەکردن‌و زیهارکردن لەو ژنەش دروست دەبن کە بە (رَجْعِي)تەڵاق دراوە، هەم (وَطَلاَقٌ) تەڵاقدانی‌تریشی دروست دەبێ: وەك لە دوای ئەم تەڵاقە-لە (عِدَّة)دا- بە تەڵاقێکی‌تر، یان بە دووەکەی‌تر تەڵاقی بدا: بە پارە، یان بە خۆڕایی، هەم (وَلِعَانٌ) لەعنەت لێکردنی زینایشی دروست دەبێ.

(وَيَتَوَارَثَانِ) ژن‌و مێرد لە (عِدَّة)ی تەڵاقی(رَجْعِي)دا میرات لە یەکتری دەگرن، هەروەك لە کۆتایی (دەسەڵاتی‌مێرد بە سەر شوێنی‌تەڵاقدا) ڕابرا.

(وَإِذَا ادَّعَى وَالْعِدَّةُ مُنْقَضِيَةٌ رَجْعَةً فِيهَا) هەر کاتێك لە دوای تەواوبوونی (عِدَّة) مێردەکە گوتی: لە (عِدَّة)دا ژنەکەم گەڕاندۆتەوە (فَأَنْكَرَتْ) ژنەکەش گوتی: ڕاست نیە. ئەوە تەماشا دەکەین: (فَإِنِ اتَّفَقَا عَلَى وَقْتِ الإِنْقِضَاءِ كَيَوْمِ الْجُمُعَةِ) ئەگەر ژنەکەو مێردەکە لە سەر کاتی کۆتایی (عِدَّة) ڕێك کەوتن: وەك هەردووکیان بڵێن: لە ڕۆژی هەینییەوە (عِدَّة)کە تەواو بووە (وَقَالَ رَاجَعْتُ يَوْمَ الْخَمِيسِ) مێردەکەش گوتی: لە ڕۆژی پێنج شەممە

فَقَالَتْ: بَل السَّبْت. صُدِّقَتْ بِيَمِينِهَا، أَوْ عَلَى وَقْت الرَّجْعَة كَيَوْمِ الْجُمُعَةِ وَقَالَتْ: انْقَضَت الْخَمِيسَ. وَقَالَ: السَّبْتَ. صُدِّقَ بِيَمِينِه، وَإِنْ تَنَازَعَا فِي السَّبْقِ بِلاَ اتِّفَاقٍ فَالأَصَحُّ تَرْجِيحُ سَبْقِ الدَّعْوَى: فَإِنْ ادَّعَتْ الإِنْقِضَاءَ ثُمَّ ادَّعَى رَجْعَةً قَبْلَهُ صُدِّقَتْ بِيَمِينِهَا، أَوْ ادَّعَاهَا قَبْلَ انْقِضَاء فَقَالَتْ: بَعْدَهُ. صُدِّقَ، قُلْتُ: فَإِنْ ادَّعَيَا مَعًا صُدِّقَتْ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَمَتَى ادَّعَاهَا وَالْعِدَّةُ بَاقِيَةٌ صُدِّقَ، وَمَتَى أَنْكَرَتْهَا وَصُدِّقَتْ ثُمَّ اعْتَرَفَتْ قُبِلَ اعْتِرَافُهَا،

---

گەڕاندمەوە (فَقَالَتْ: بَل السَّبْت) ژنەکەش گوتی: بەڵکو ڕۆژی شەممە گەڕاندمتەوە، ئەوە ئەگەر شاهید نەبن (صُدِّقَتْ بِيَمِينِهَا) بە سوێندخواردن باوەڕ بە ژنەکە دەکرێ کە نەیزانیوە لە پێنج شەممەدا گەڕاندویەتیەوە.

(أَوْ عَلَى وَقْت الرَّجْعَة كَيَوْمِ الْجُمُعَةِ) یان ژنەکەو مێردەکە لە سەر کاتی گەڕاندنەوەکە ڕێك کەوتن: وەك هەردووك بڵێن لە ڕۆژی جومعە گەڕاندنەوەکەی کردوە، بەڵام (وَقَالَتْ: انْقَضَت الْخَمِيسَ) ژنەکەش گوتی: لە پێنج شەممەوە (عِدَّة)م تەواو بووە (وَقَالَ السَّبْتَ) مێردەکەش گوتی: لە شەممەوە تەواو بووە، ئەوە ئەگەر شاهید نەبن (صُدِّقَ بِيَمِينِهِ) بە سوێندخواردن باوەڕ بە مێردەکە دەکرێ.

(وَإِنْ تَنَازَعَا فِي السَّبْقِ) ئەگەر ژنەکەو مێردەکە بووە کێشەیان لەوەدا: گەڕاندنەوەکە پێشتر بووە، یان تەواوبوونی(عِدَّة)؟ بەڵام (بِلاَ اتِّفَاقٍ) لە سەر کاتی هیچێك لەو دووانەش ڕێك نەکەوتن، ئەوە (فَالأَصَحُّ تَرْجِيحُ سَبْقِ الدَّعْوَى) بە فەرموودەی ڕاستتر: لای ئەوەیان بەهێز دەکرێ کە پێشدا داوایەکەی کردوە، بۆ وێنە: (فَإِنْ ادَّعَتْ الإِنْقِضَاءَ) ئەگەر پێشدا ژنەکە گوتی: (عِدَّة)م تەواو بووە (ثُمَّ ادَّعَى رَجْعَةً قَبْلَهُ) ئینجا مێردەکەش گوتی پێش تەواوبوونی (عِدَّة) گەڕاندمەوە. شاهیدیش نەبون، ئەوە (صُدِّقَتْ بِيَمِينِهَا) بە سوێندخواردن باوەڕ بە ژنەکە دەکرێ (أَوْ ادَّعَاهَا قَبْلَ انْقِضَاء) یان پێشدا مێردەکە گوتی: پێش تەواوبوونی(عِدَّة) گەڕاندمەوە (فَقَالَتْ بَعْدَهُ) ئینجا ژنەکەش گوتی: دوای تەواوبوونی (عِدَّة) گەڕاندمتەوە. ئەوە (صُدِّقَ) بە سوێندخواردن باوەڕ بە مێردەکە دەکرێ.

(قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) دەفەرموێ (فَإِنْ ادَّعَيَا مَعًا) ئەگەر ژنەکەو مێردەکە وێکڕا لە یەك کاتدا داوایەکەی خۆیان کرد (صُدِّقَتْ وَاللهُ أَعْلَمُ) بە سوێندخواردن باوەڕ بە ژنەکە دەکرێ.

(وَمَتَى ادَّعَاهَا وَالْعِدَّةُ بَاقِيَةٌ) هەر کاتێك -لەو حاڵەتەدا کە (عِدَّة)کە ماوە- مێردەکە بڵێ: ژنەکەم گەڕاندۆتەوە. شاهیدیشی نەبون، ئەوە (صُدِّقَ) بە سوێندخواردن باوەڕی پێ دەکرێ، چونکە ئێستاش دەتوانێ بیگەڕێنێتەوە.

(وَمَتَى أَنْكَرَتْهَا وَصُدِّقَتْ) هەر کاتێك ژنەکە گوتی: نەیگەڕاندومەوە. باوەڕیشی پێ کرا (ثُمَّ اعْتَرَفَتْ) ئینجا پەشیمان بۆوەو دانی پێدا هێناو گوتی: لە (عِدَّة)دا گەڕاندومیەوە. ئەوە (قُبِلَ اعْتِرَافُهَا) دانپێداهێنانەکەی قبوڵ دەکرێ.

وَإِذَا طَلَّقَ دُونَ ثَلاَثٍ وَقَالَ وَطِئْتُ فَلِي رَجْعَةٌ وَأَنْكَرَتْ صُدِّقَتْ بِيَمِينٍ وَهُوَ مُقِرٌّ لَهَا بِالْمَهْرِ، فَإِنْ قَبَضَتْهُ فَلاَ رُجُوعَ لَهُ، وَإِلاَّ فَلاَ تُطَالِبُهُ إِلاَّ بِنِصْفٍ.

## (كِتَابُ الإِيلاَءِ)

هُوَ حَلِفُ زَوْجٍ يَصِحُّ طَلاَقُهُ: لَيَمْتَنِعَنَّ مِنْ وَطْئِهَا مُطْلَقًا أَوْ فَوْقَ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ، وَالْجَدِيدُ أَنَّهُ لاَ يَخْتَصُّ بِالْحَلِفِ بِاللهِ تَعَالَى وَصِفَاتِهِ، بَلْ لَوْ عَلَّقَ بِهِ طَلاَقًا أَوْ عِتْقًا

---

(وَإِذَا طَلَّقَ دُونَ ثَلاَثٍ) هەرکاتێك مێردەکە بە تەلاقێك، یان بە دوو تەلاق ژنەکەی تەلاق دا، ئینجا (وَقَالَ وَطِئْتُ فَلِي رَجْعَةٌ) گوتی: جیماعم لەگەڵ ئەم ژنە تەلاقدراوەم کردوە، کەوابو: مافی گەڕاندنەوەیم هەیە (وَأَنْكَرَتْ) ژنەکەش گوتی: جیماعی لەگەڵ نەکردوم. ئەوە (صُدِّقَتْ بِيَمِينٍ) بە سوێندخواردن باوەڕ بە ژنەکە دەکرێ، بەلام (وَهُوَ مُقِرٌّ لَهَا بِالْمَهْرِ) مێردەکەش بەو داوایە دان بە تەواوی‌مارەییەکەدا دەهێنێ بۆ ژنەکە، چونکە دەڵێ جیماعم لەگەڵ کردوە. کەوابو: (فَإِنْ قَبَضَتْهُ) ئەگەر ژنەکە هەموو مارەییەکەی وەرگرتبو (فَلاَ رُجُوعَ لَهُ) مێردەکە مافی نیە هیچی لێوەربگرێتەوە (وَإِلاَّ) بەلام ئەگەر ژنەکە مارەییەکەی وەرنەگرتبو، ئەو کاتە (فَلاَ تُطَالِبُهُ إِلاَّ بِنِصْفٍ) نابێ جگە لە نیوەی مارەییەکەی داوای هیچی‌تر بکا، چونکە دەڵێ: جیماعی لەگەڵ نەکردوم.

## ﴿ كِتَابُ الإِيلاَءِ: پەرتوکی سوێندی جیماع نەکردن ﴾

(هُوَ) واتەی (الإِيلاَءِ) لە شەرعدا: (حَلِفُ زَوْجٍ يَصِحُّ طَلاَقُهُ) سوێندخواردنی مێردێکە کە تەلاقدانی دروست بێ، واتە: مندال‌و شێت‌و زۆرلێکراو نەبێ، ئینجا سوێندەکەش بۆ ئەوە بێ: کە (لَيَمْتَنِعَنَّ مِنْ وَطْئِهَا) خۆی قەدەغە بکا لە جیماعکردن لەگەڵ ژنەکەی (مُطْلَقًا) خۆقەدەغەکردنەکەشی بێ‌ماوەدانان بێ (أَوْ فَوْقَ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ) یان زیاتر لە چوار مانگ بێ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿لِلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِنْ نِسَائِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ فَإِنْ فَاءُوا فَإِنَّ اللهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ وَإِنْ عَزَمُوا الطَّلاَقَ فَإِنَّ اللهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ ئەوانەی سوێند دەخۆن: جیماع لەگەڵ ژنەکانی خۆیان نەکەن، تا ماوەی چوار مانگ مۆڵەتی چاوەڕوانکردنیان هەیە، جا ئەگەر گەڕانەوە بۆ کاری ژن‌و مێردایەتی–واتە: جیماعیان کردو کەففارەتی سوێندەکەیان دا– ئەوە خوا لێیان خۆش دەبێ‌و ڕەحیمان پێ‌دەکا، ئەگەر نەگەڕانەوەو ویستیان تەلاق بدەن خوای‌گەورە بیسەرو زانایە.

جا بزانە: ئایەتەکە بەڵگەشە: کە مێردەکە بەو سوێندخواردنە گوناهبار دەبێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَالْجَدِيدُ) بە فەرموودەی نوێ (أَنَّهُ لاَ يَخْتَصُّ بِالْحَلِفِ بِاللهِ تَعَالَى وَصِفَاتِهِ) سوێندی جیماع نەکردن تایبەت نیە بە سوێند بە خوای‌گەورەو سیفەتەکانی (بَلْ لَوْ عَلَّقَ بِهِ طَلاَقًا أَوْ عِتْقًا)

أَوْ قَالَ: إِنْ وَطِئْتُكَ فَلِلَّهِ عَلَيَّ صَلاَةٌ أَوْ صَوْمٌ أَوْ حَجٌّ أَوْ عِتْقٌ. كَانَ مُولِيًا، وَلَوْ حَلَفَ أَجْنَبِيٌّ عَلَيْهِ فَيَمِينٌ مَحْضَةٌ فَإِنْ نَكَحَهَا فَلاَ إِيلاَءَ، وَلَوْ آلَى مِنْ رَتْقَاءَ أَوْ قَرْنَاءَ أَوْ آلَى مَجْبُوبٌ لَمْ يَصِحَّ عَلَى الْمَذْهَبِ، وَلَوْ قَالَ: وَاللهِ لاَ وَطِئْتُكَ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ فَإِذَا مَضَتْ فَوَاللهِ لاَ وَطِئْتُكَ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ. وَهَكَذَا مِرَارًا فَلَيْسَ بِمُولٍ فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ قَالَ: وَاللهِ لاَ وَطِئْتُكَ خَمْسَةَ أَشْهُرٍ فَإِذَا مَضَتْ فَوَاللهِ لاَ وَطِئْتُكَ سَنَةً. فَإِيلاَءَانِ لِكُلٍّ حُكْمُهُ،

---

بەلكو ئەگەر تەلاقدانێك، یان ئازادكردنێكی بە جیماعەوە هەلواسی: وەك بلێ ئەگەر جیماعت لەگەلّ بكەم تەلاقم كەوتبێ (أَوْ قَالَ) یان بە نەزەركردنی خواپەرستیی هەلواسی‌و گوتی: (إِنْ وَطِئْتُكَ فَلِلَّهِ عَلَيَّ صَلاَةٌ أَوْ صَوْمٌ أَوْ حَجٌّ أَوْ عِتْقٌ) ئەگەر جیماعم لەگەلّ كردی لە سەرم واجب بێ بۆ خوا نوێژێك بكەم، یان ڕۆژوویێك بگرم، یان حەجێك بكەم، یان كۆیلەیەك ئازادبكەم. ئەوە (كَانَ مُولِيًا) لە گشت ئەو وێنانەشدا دەبێتە سوێندخۆری جیماع نەكردن.

(وَلَوْ حَلَفَ أَجْنَبِيٌّ عَلَيْهِ) ئەگەر بێگانەیەك سوێندی لە ئافرەتێكی بێگانە خوارد: جیماعی لەگەلّ نەكا، ئەوە (فَيَمِينٌ مَحْضَةٌ) سوێندێكی ڕووتە، واتە: ئەگەر زینای لەگەلّ كرد، یان مارەی كرد‌و جیماعی لەگەلّ كرد، ئەو كاتە واجبە: كەففارەتی سوێندەكە بدا، كەوابو: (فَإِنْ نَكَحَهَا فَلاَ إِيلاَءَ) ئەگەر ژنەكەی مارە كرد بڕیاری سوێندی جیماع نەكردنی بۆنادرێ، واتە: ماوەی چوار مانگەكەی بۆ دانانرێ، چونكە لە كاتی‌سوێندخواردنەكەدا ژنی‌خۆی نەبوە (وَلَوْ آلَى مِنْ رَتْقَاءَ أَوْ قَرْنَاءَ) ئەگەر سوێندی خوارد: جیماع لەگەلّ ئەو ژنەی نەكا: كە كونی جیماعی گیراوە (أَوْ آلَى مَجْبُوبٌ) یان مێردە سوێندخۆرەكە ئەندامی جیماعی هەموو لێكرابۆوە، ئەوە (لَمْ يَصِحَّ عَلَى الْمَذْهَبِ) ئەو سوێندخواردنە دروست نەبوە، لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب.

(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر مێردەكە گوتی (وَاللهِ لاَ وَطِئْتُكَ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ فَإِذَا مَضَتْ فَوَاللهِ لاَ وَطِئْتُكَ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ) والله ماوەی چوار مانگ جیماعت لەگەلّ ناكەم، جا هەر كاتێك ئەو چوار مانگەش ڕۆیشتن دیسان والله تا ماوەی چوار مانگ جیماعت لەگەلّ ناكەم (وَهَكَذَا مِرَارًا) ئەوها چەند جارێك سوێندەكەی خوارد (فَلَيْسَ بِمُولٍ فِي الأَصَحِّ) ئەوەش نابێتە سوێندخۆری جیماع نەكردن، لە فەرموودەی ڕاستتردا؟ چونكە هیچ سوێندێكی لە چوار مانگ زیاتر نیە.

(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر گوتی (وَاللهِ لاَ وَطِئْتُكَ خَمْسَةَ أَشْهُرٍ فَإِذَا مَضَتْ فَوَاللهِ لاَ وَطِئْتُكَ سَنَةً) والله ماوەی پێنج مانگ جیماعت لەگەلّ ناكەم، جا هەر كاتێك پێنج مانگەكە ڕۆیشت دیسان والله ماوەی سالّێك جیماعت لەگەلّ ناكەم. ئەوە (فَإِيلاَءَانِ لِكُلٍّ حُكْمُهُ) دوو سوێندی

وَلَوْ قَيَّدَ بِمُسْتَبْعَدِ الْحُصُولِ فِي الأَرْبَعَةِ كَنُزُولِ عِيسَى ﷺ فَمُولٍ، وَإِنْ ظَنَّ حُصُولَهُ قَبْلَهَا فَلاَ، وَكَذَا لَوْ شَكَّ فِي الأَصَحِّ، وَلَفْظُهُ صَرِيحٌ وَكِنَايَةٌ، فَمِنْ صَرِيحِهِ: تَغْيِيبُ ذَكَرٍ بِفَرْجٍ وَوَطْءٌ وَجِمَاعٌ وَافْتِضَاضُ بِكْرٍ، وَالْجَدِيدُ أَنَّ مُلاَمَسَةً وَمُبَاضَعَةً وَمُبَاشَرَةً وَإِتْيَانًا وَغَشَيَانًا وَقِرْبَانًا وَنَحْوَهَا كِنَايَاتٌ، وَلَوْ قَالَ إِنْ وَطِئْتُكِ فَعَبْدِي حُرٌّ. فَزَالَ مِلْكُهُ عَنْهُ زَالَ الإِيلاَءُ، وَلَوْ قَالَ فَعَبْدِي حُرٌّ عَنْ ظِهَارِي. وَكَانَ ظَاهَرَ فَمُولٍ، وَإِلاَّ

---

جیماع نەکردنن، هەر یەکەیان بڕیاری سەربەخۆی هەیە، واتە: لە دوای چوار مانگ تا مانگی پێنجەم تەواو دەبێ ژنەکە مافی هەیە داوای لێبکا: یان جیماع بکاو کەففارەتی سوێندەکەش بدا، یان تەلاقی بدا، ئنیجا لە دوای مانگی پێنجەمیش کە چوار مانگیتر تەواو بون —ئەگەر تەلاقی نەدابو— بە هەمان شێوە داوای لێدەکاتەوە.

(وَلَوْ قَيَّدَ بِمُسْتَبْعَدِ الْحُصُولِ فِي الأَرْبَعَةِ) ئەگەر سوێندەکەی بەستەوە بەشتێکی وەها: کە دوور بوو لە ماوەی ئەو چوار مانگەدا ڕوبدا: (كَنُزُولِ عِيسَى ﷺ) وەك بڵێ: والله تا حەزرەتی عیسی ﷺ دێتە خوارەوە جیماعت لەگەڵ ناکەم. ئەوەش (فَمُولٍ) سوێندخۆری جیماع نەکردنە، بەڵام (وَإِنْ ظَنَّ حُصُولَهُ قَبْلَهَا) ئەگەر دەیزانی پێبەستراوەکە پێش تەواوبوونی چوار مانگەکە دێتەجێ: وەك والله جیماعت لەگەڵ ناکەم تا باران دەبارێ. ئەوە (فَلاَ) نابێتە سوێندخۆر (وَكَذَا لَوْ شَكَّ) هەروەها ئەگەر کەوتە گومان: پێبەستراوەکە دەبێ، یان نابێ: وەك والله تا نەخۆش دەبم جیماعت لەگەڵ ناکەم، ئەوەش نابێتە سوێندخۆر (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَلَفْظُهُ) ووشەی بەکارهاتوو بۆ جیماع نەکردن: (صَرِيحٌ وَكِنَايَةٌ) ئاشکراو ناشکرایە (فَمِنْ صَرِيحِهِ) هەندێك لە ئاشکرایەکەی: وەك (تَغْيِيبُ ذَكَرٍ بِفَرْجٍ) والله (ذکر)ی خۆم دەناو (فرج)ی تۆ نانێم (وَوَطْءٌ وَجِمَاعٌ) والله جیماعت لەگەڵ ناکەم (وَافْتِضَاضُ بِكْرٍ) والله کچێنیت لانابەم—ئەگەر ژنەکە کچ بێ— کەواتە: ووشەی گان—بە هەر ڕستەیەك بێ— ئاشکرایە (وَالْجَدِيدُ) بە فەرموودەی نوێ (أَنَّ مُلاَمَسَةً وَمُبَاضَعَةً وَمُبَاشَرَةً وَإِتْيَانًا وَغَشَيَانًا وَقِرْبَانًا وَنَحْوَهَا كِنَايَاتٌ) ووشەی دەستلێدانو عەورەت بە عەورەتو خۆپێوەنانو هاتنەلاو خۆبەسەردادانو نزیکبوونو ئەو جۆرانە گشتی ووشەی ناشکرانو پێویستی بە نیەت هەیە.

(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر گوتی (إِنْ وَطِئْتُكِ فَعَبْدِي حُرٌّ) ئەگەر جیماعم لەگەڵ کردی کۆیلەکەم ئازاد بێ (فَزَالَ مِلْكُهُ عَنْهُ) ئنیجا کۆیلەکە لە ملکایەتی لاچوو (زَالَ الإِيلاَءُ) سوێندەکەش لادەچێ، بەڵام (وَلَوْ قَالَ) ئەگەر گوتی: (فَعَبْدِي حُرٌّ عَنْ ظِهَارِي) ئەگەر جیماعت لەگەڵ بکەم کۆیلەکەم لە کەففارەتی زیهارەکەم ئازاد بێ (وَكَانَ ظَاهَرَ) پێشداش زیهاری کردبو، ئەوە (فَمُولٍ) دەبێتە سوێندخۆری جیماع نەکردن (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر زیهاری نەکردبو، ئەوە

فَلاَ ظِهَارَ وَلاَ إِيلاَءَ بَاطِنًا، وَيُحْكَمُ بِهِمَا ظَاهِرًا، وَلَوْ قَالَ عَنْ ظِهَارِي إِنْ ظَاهَرْتُ. فَلَيْسَ بِمُولٍ حَتَّى يُظَاهِرَ، أَوْ إِنْ وَطِئْتُكِ فَضَرَّتُكِ طَالِقٌ. فَمُولٍ فَإِنْ وَطِئَ طَلَقَتِ الضَّرَّةُ وَزَالَ الإِيلاَءُ، وَالأَظْهَرُ أَنَّهُ لَوْ قَالَ لأَرْبَعٍ: وَاللهِ لاَ أُجَامِعُكُنَّ. فَلَيْسَ بِمُولٍ فِي الْحَالِ فَإِنْ جَامَعَ ثَلاَثًا فَمُولٍ مِنَ الرَّابِعَةِ، فَلَوْ مَاتَ بَعْضُهُنَّ قَبْلَ وَطْءٍ زَالَ الإِيلاَءُ،

---

(فَلاَ ظِهَارَ وَلاَ إِيلاَءَ بَاطِنًا) نه دەبێتە زیهارو نە دەبێتەسوێندخواردن لە نێوان خۆیو خوای گەورەدا، چونکە درۆی کردوە، بەلاَم (وَيُحْكَمُ بِهِمَا ظَاهِرًا) لە ئاشكراییدا بڕیاری زیهارو سویندەکەی بۆ دەدرێ، چونکە دانی پێدا هێناون.

(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر گوتی: (عَنْ ظِهَارِي إِنْ ظَاهَرْتُ) ئەگەر جیماعم لەگەڵت کرد کۆیلەکەم لە کەففارەتی زیهارەکەم ئازاد بێ ئەگەر لە مەودوا زیهارم کرد. ئەوە (فَلَيْسَ بِمُولٍ حَتَّى يُظَاهِرَ) لەو کاتدا نابێتە سوێندخۆر تا زیهارەکە دەکا، واتە: هەرکاتێك زیهارەکەی کرد دەبێتە سوێندخۆر (أَوْ) یان مێردەکە گوتی: (إِنْ وَطِئْتُكِ فَضَرَّتُكِ طَالِقٌ) ئەگەر جیماعم لەگەڵ کردی هەوێیەکەت تەلاقکەوتوو بێ (فَمُولٍ) ئەوەش سوێندخۆری جیماع نەکردنە، کەوابو: (فَإِنْ وَطِئَ طَلَقَتِ الضَّرَّةُ وَزَالَ الإِيلاَءُ) ئەگەر جیماعی لەگەڵ ژنەکە کرد، هەوێیەکەی تەلاقی دەکەوێو سوێندەکەش لادەچێ.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر سوێندەکەی بە تەلاقی سێبەسێ بوو: وەك ئەگەر جیماعت لەگەڵ بکەم هەر سێك تەلاقت کەوتبن. یان بڵێ: هەر سێك تەلاقی هەوێیەکەت کەوتبن. ئەوە ئەگەر خولع بکا-لە هەردوو مەسەلەدا- لە کەوتنی سێ تەلاقەکە ڕزگاری دەبێ، هەروەك لە باسی (دەسەلاتیمێرد بە سەر شوێنیتەلاقدا) ڕابرا.

بەلاَم ئەگەر-لە مەسەلەیەکەمدا- خولعی نەکردو جیماعی لەگەڵ ژنەکەی کرد، ئەوە هەر کاتێك سەری ئەندامەکەی بردە ژوورەوە، یەکسەر واجبە: بە پەلە لێیدەربێنێ، چونکە بەو جیماعە سێ تەلاقی دەکەون، بەلاَم ئەگەر سێبەسێ نەبو، ئەو کاتە: یان دەبێ لێیدەربێنێ، یان یەکسەر بێگەڕێنێتەوە ژێر مارەیخۆی، تاکو گوناهبار نەبێ، هەروەك لە (نهاية)و (مغنى)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَالأَظْهَرُ) بە فەرموودەی بەهێزتر: (أَنَّهُ لَوْ قَالَ لأَرْبَعٍ) ئەگەر مێردەکە گوتیە هەر چوار ژنەکانیخۆی: (وَاللهِ لاَ أُجَامِعُكُنَّ) واللە جیماعتان لەگەڵ ناکەم. ئەوە (فَلَيْسَ بِمُولٍ فِي الْحَالِ) ئەم دەمە نابێتە سوێندخۆر، چونکە ئەگەر جیماع لەگەڵ گشتیان نەکا سوێندی لێناکەوێ، کەوابو: (فَإِنْ جَامَعَ ثَلاَثًا فَمُولٍ مِنَ الرَّابِعَةِ) ئەگەر جیماعی لەگەڵ سێ ژنان کرد، ئەو کاتە دەبێتە سوێندخۆر لە چوارەمەکە، کەواتە: ئەگەر جیماع لەگەڵ چوارەمەکە بکا، کەففارەتی لە سەر واجب دەبێ (فَلَوْ مَاتَ بَعْضُهُنَّ قَبْلَ وَطْءٍ) ئەگەر لەو چوارانە یەکێکیان مرد پێش جیماع لەگەڵکردنی (زَالَ الإِيلاَءُ) سوێندەکە لادەچێ، چونکە تازە جیماع لەگەڵ چواران ناکا.

وَلَوْ قَالَ: لاَ أُجَامِعُ كُلَّ وَاحِدَةٍ مِنْكُنَّ. فَمُولٍ مِنْ كُلِّ وَاحِدَةٍ، وَلَوْ قَالَ: لاَ أُجَامِعُكِ إِلَى سَنَةٍ إِلاَّ مَرَّةً. فَلَيْسَ بِمُولٍ فِي الْحَالِ فِي الأَظْهَرِ، فَإِنْ وَطِئَ وَبَقِيَ مِنْهَا أَكْثَرُ مِنْ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ فَمُولٍ.
(فَصْلٌ) يُمْهَلُ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ مِنَ الإِيلاَءِ بِلاَ قَاضٍ، وَفِي رَجْعِيَّةٍ مِنَ الرَّجْعَةِ وَلَوِ ارْتَدَّ أَحَدُهُمَا بَعْدَ دُخُولٍ فِي الْمُدَّةِ انْقَطَعَتْ، فَإِذَا أَسْلَمَ اسْتُؤْنِفَتْ، وَمَا يَمْنَعُ الْوَطْءَ وَلَمْ يُخِلَّ بِنِكَاحٍ إِنْ وُجِدَ فِيهِ لَمْ يَمْنَعِ الْمُدَّةَ: كَصَوْمٍ وَإِحْرَامٍ وَمَرَضٍ وَجُنُونٍ، أَوْ فِيهَا وَهُوَ حِسِّيٌّ كَصِغَرٍ وَمَرَضٍ مَنَعَ، وَإِنْ حَدَثَ فِي الْمُدَّةِ

---

بەلام (وَلَوْ قَالَ: لاَ أُجَامِعُ كُلَّ وَاحِدَةٍ مِنْكُنَّ) ئەگەر گوتی: والله جیماع لەگەلّ هیچێکتان ناکەم. ئەو کاتە (فَمُولٍ مِنْ كُلِّ وَاحِدَةٍ) لە گشتیان دەبێتە سوێندخۆر: هەر یەکەیان سەریەخۆ.
(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر گوتی: (لاَ أُجَامِعُكِ إِلَى سَنَةٍ إِلاَّ مَرَّةً) والله تا سالێك جیماعت لەگەلّ ناکەم تەنها یەك جار نەبێ، ئەوە (فَلَيْسَ بِمُولٍ فِي الْحَالِ فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتر ئەو دەم نابێـەسوێندخۆر، بەلّكو (فَإِنْ وَطِئَ) ئەگەر جیماعی کردو (وَبَقِيَ مِنْهَا أَكْثَرُ مِنْ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ) سالّەکەش زیاتر لە چوار مانگی تێدا مابو، لەو کاتەوە (فَمُولٍ) دەبێتە سوێندخۆر.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی ماوە دانان بۆ سوێندخۆرەکە ﴾

(يُمْهَلُ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ مِنَ الإِيلاَءِ) واجبە: سوێندخۆرەکە مۆلّەتی چوار مانگی بدرێتێ لە کاتی سوێندخواردنەوە، بە بەلّگەی ئایەتەکەیڕابردوو (بِلاَ قَاضٍ) بێئەوەی ژنەکە بچێتە لای قازی (وَفِي رَجْعِيَّةٍ مِنَ الرَّجْعَةِ) لە تەلاقدراوی (رَجْعِية)دا–ئەگەر سوێندی جیماع نەکردنی لێخواردبو– لە کاتی گەڕاندنەوەیەوە مۆلّەتی چوار مانگەکە دادەندرێ.
(وَلَوِ ارْتَدَّ أَحَدُهُمَا بَعْدَ دُخُولٍ فِي الْمُدَّةِ) ئەگەر لە دوای جیماعکردن ژنەکە، یان مێردەکە لە ماوەی چوار مانگەکەدا کافر بوو، ئەوە (انْقَطَعَتْ) ماوەکە دەپچڕێ (فَإِذَا أَسْلَمَ اسْتُؤْنِفَتْ) جا هەر کاتێك کافربووەکە موسولّمان بۆوە، ماوەکە سەرلەبنیات دەستی پێدەکرێتەوە.
(وَمَا يَمْنَعُ الْوَطْءَ وَلَمْ يُخِلَّ بِنِكَاحٍ) هەر شتێك جیماعکردن قەدەغە بکا، بەلام زیان لە مارەبڕینەکە نەدا: (إِنْ وُجِدَ فِيهِ) ئەگەر لە مێردەکەدا بێتە جێ، ئەوە (لَمْ يَمْنَعِ الْمُدَّةَ) ماوەی سوێندەکە قەدەغە ناکاو نایپچڕێنێ: (كَصَوْمٍ وَإِحْرَامٍ وَمَرَضٍ وَجُنُونٍ) وەك بەڕۆژوبوونی مێردەکەو ئیحرام بەستنیو نەخۆشییو شێتبوونی.
(أَوْ فِيهَا وَهُوَ حِسِّيٌّ) یان قەدەغەکەری جیماعەکە لە ژنەکەدا هاتەجێو هەست پێکراویش بوو: (كَصِغَرٍ وَمَرَضٍ) وەك بچوکیو نەخۆشیی ژنەکە، ئەوە(مَنَعَ) دەست پێکردنی ماوەی سوێندەکە قەدەغە دەکا، کەوابو: (وَإِنْ حَدَثَ فِي الْمُدَّةِ) ئەگەر قەدەغەکەری جیماع لە ناو

قَطَعَهَا فَإِذَا زَالَ اُسْتُؤْنِفَتْ، وَقِيلَ تُبْنَى، أَوْ شَرْعِيٌّ: كَحَيْضٍ وَصَوْمِ نَفْلٍ فَلاَ، وَيَمْنَعُ فَرْضٌ فِي الأَصَحِّ فَإِنْ وَطِئَ فِي الْمُدَّةِ، وَإِلاَّ فَلَهَا مُطَالَبَتُهُ بِأَنْ يَفِيءَ أَوْ يُطَلِّقَ وَلَوْ تَرَكَتْ حَقَّهَا فَلَهَا الْمُطَالَبَةُ بَعْدَهُ، وَتَحْصُلُ الْفَيْئَةُ بِتَغْيِيبِ حَشَفَةٍ بِقُبُلٍ، وَلاَ مُطَالَبَةَ إِنْ كَانَ بِهَا مَانِعُ وَطْءٍ كَحَيْضٍ وَمَرَضٍ، وَإِنْ كَانَ فِيهِ مَانِعٌ طَبِيعِيٌّ كَمَرَضٍ طُولِبَ بِأَنْ يَقُولَ: إِذَا قَدَرْتُ فِئْتُ،

---

ماوەکەدا لە ژنەکە هاتەجێ: وەك (نَاشِزَة)بوونی ژنەکەو نەخۆشی‌ی، ئەوە (قَطَعَهَا) ماوەکە دەپچڕێنێ (فَإِذَا زَالَ اُسْتُؤْنِفَتْ) جا هەرکاتێك قەدەغەکەرەکە نەما، سەرلەبنیات دەست بە ماوەکە دەکرێتەوە (وَقِيلَ تُبْنَى) لە فەرموودەیەکی بۆهێزدا لە سەر ڕابردووەکە تەواودەکرێ (أَوْ شَرْعِيٌّ) یان قەدەغەکەرەکە شەرعی بوو: (كَحَيْضٍ وَصَوْمِ نَفْلٍ) وەکو حەیزو ڕۆژووی سوننەتی ژنەکە (فَلاَ) ماوەکە قەدەغە ناکاو نایپچڕێنێ، بەلام (وَيَمْنَعُ فَرْضٌ فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا: ڕۆژووی واجبی ژنەکە ماوەکە قەدەغە دەکاو دەیپچڕێنێ، چونکە مێردەکە بۆی ناگونجێ لە حاڵەتی بەڕۆژوبوونی ژنەکەدا جیماعی لەگەڵ بکا.

(فَإِنْ وَطِئَ فِي الْمُدَّةِ) جا ئەگەر لە ماوەی ئەو چوار مانگەدا مێردەکە جیماعی لەگەڵ ژنەکە کرد، ئەوە سوێندەکە هەڵدەوەشێتەوەو لادەچێ، مێردەکەش کەففارەتی سوێندەکەی لە سەر واجب دەبێ (وَإِلاَّ) بەلام ئەگەر لەو ماوەیەدا جیماعی لەگەڵ نەکرد، ئەو کاتە (فَلَهَا مُطَالَبَتُهُ) ژنەکە مافی‌هەیە داوا لە مێردەکە بکا: (بِأَنْ يَفِيءَ أَوْ يُطَلِّقَ) بۆ ئەوە: یان بگەڕێتەوە بۆ جیماعکردن‌و کەففارەت بدا، یان تەلاقی بدا، بە بەڵگەی ئایەتەکە (وَلَوْ تَرَكَتْ حَقَّهَا) ئەگەر ژنەکە وازی لە مافی‌خۆی هێناو داوایەکەی نەکرد، ئەوە (فَلَهَا الْمُطَالَبَةُ بَعْدَهُ) لە دوای وازهێنانەکەش مافی هەیە داوا لە مێردەکەی بکا: تاکو جیماعی لەگەڵ بکا، یان تەلاقی بدا، ئینجا (وَتَحْصُلُ الْفَيْئَةُ) گەڕانەوە بۆ جیماعکردن دێتە جێ (بِتَغْيِيبِ حَشَفَةٍ بِقُبُلٍ) بەوەی سەری ئەندامەکەی خۆی بە تەواوی دەناو کونی پێشەوەی ژنەکەی بنێ‌و ئەگەر کچ بێ کچێنیەکەی لاببا، واتە: مەبەستی جیماعکردن بەوەندە دێتەجێ‌و کەففارەتیشی لە سەر واجب دەبێ.

(وَلاَ مُطَالَبَةَ إِنْ كَانَ بِهَا مَانِعُ وَطْءٍ) ژنەکە مافی داواکردنەکەی نیە ئەگەر قەدەغەکەرێکی جیماعکردن بە خۆیەوە بێ (كَحَيْضٍ وَمَرَضٍ) وەکو حەیزو نەخۆشی‌و ئەو جۆرە شتانە.

بەلام (وَإِنْ كَانَ فِيهِ مَانِعٌ طَبِيعِيٌّ) ئەگەر قەدەغەکەرێکی سروشتی لە مێردەکەی‌دا بوو: (كَمَرَضٍ) وەك نەخۆشیەکی وەها کە جیماعی پێ‌نەکرێ، ئەو کاتە (طُولِبَ) داوای گەڕانەوەی بۆ جیماعکردن لێدەکرێ (بِأَنْ يَقُولَ) کە بە زوبان بڵێ: (إِذَا قَدَرْتُ فِئْتُ) هەر کاتێك توانام هەبوو جیماع دەکەم.

أَوْ شَرْعِيٌّ: كَإِحْرَام فَالْمَذْهَبُ أَنَّهُ يُطَالَبُ بِطَلَاقٍ، فَإِنْ عَصَى بِوَطْءٍ سَقَطَتِ الْمُطَالَبَةُ، وَإِنْ أَبَى الْفَيْئَةَ وَالطَّلَاقَ، فَالأَظْهَرُ أَنَّ الْقَاضِيَ يُطَلِّقُ عَلَيْهِ طَلْقَةً، وَأَنَّهُ لاَ يُمْهَلُ ثَلاَثَةً، وَأَنَّهُ إِذَا وَطِئَ بَعْدَ مُطَالَبَةٍ لَزِمَهُ كَفَّارَةُ يَمِينٍ.

(كِتَابُ الظِّهَارِ)

---

(أَوْ شَرْعِيٌّ) یان قەدەغەکەرێکی شەرعی لە مێردەکەدا بوو: (كَإِحْرَامٍ) وەك لە ژێر ئیحرامدا بێ، ئەو کاتە (فَالْمَذْهَبُ أَنَّهُ يُطَالَبُ بِطَلَاقٍ) بە فەرموودەی ڕاستی مەزهەب داوای تەلاقدانی ژنەکەی لێدەکرێ، واتە: داوای جیماعکردنی لێناکرێ، چونکە جیماع لە ئیحرامدا حەرامە، بەڵام ئەگەر ئیحرام شکاندنەکەی نزیك بوو، ئەو کاتە ماوەی سێ ڕۆژان چاوەڕوانی ئیحرام شکاندنەکەی دەکرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(فَإِنْ عَصَى بِوَطْءٍ) ئەگەر مێردەکە جیماعی کردو بە جیماعەکەکەش گوناهبار بوو: وەك لە حەیزدا جیماعی کردبێ، ئەوە (سَقَطَتِ الْمُطَالَبَةُ) ژنەکە مافی داواکردنی نامێنێو سوێندەکەش هەڵدەوەشێتەوەو کەففارەتیشی لە سەر واجب دەبێ.

بەڵام (وَإِنْ أَبَى الْفَيْئَةَ وَالطَّلَاقَ) ئەگەر مێردەکە جیماعی نەکردو ژنەکەشی تەڵاق نەدا، ئەو کاتە (فَالأَظْهَرُ) بە فەرموودەی بەهێزتر: (أَنَّ الْقَاضِيَ يُطَلِّقُ عَلَيْهِ طَلْقَةً) قازی لە دژی مێردەکە بە تەڵاقێك ژنەکە تەڵاق دەدا تاکو زیانەکە لە سەر ژنەکە لابچێ، واتە: دەڵێ: **(ئەم ژنەم لەجیاتی مێردەکەی بە تەڵاقێك تەڵاق دا)**. یان: **(تەڵاقێکی ئەم ژنەم خست لەجیاتی مێردەکەی)**.

جا ئەو تەڵاقەش بە (رَجْعِي) دەکەوێ، بەڵام ئەگەر مێردەکە تەنها تەڵاقێکی مابێ، یان جیماعی لەگەڵ ژنەکەی نەکردبێ، ئەو کاتە بەو تەڵاقە دەبێتە (بائن)ی گەورە، یان بچوك، هەروەك لە (تحفة)و (الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَأَنَّهُ لاَ يُمْهَلُ ثَلاَثَةً) بە فەرموودەی بەهێزتر: بۆ جیماعکردنو تەڵاقدانەکە مۆڵەتی سێ ڕۆژی نادرێتێ (وَأَنَّهُ إِذَا وَطِئَ بَعْدَ مُطَالَبَةٍ) هەر بە فەرموودەی بەهێزتر: هەر کاتێك مێردەکە لە دوای داوالێکردن، یان پێش داوالێکردن جیماعی کرد (لَزِمَهُ كَفَّارَةُ يَمِينٍ) لە هەردوو حاڵەتدا کەففارەتی سوێندی لە سەر واجب دەبێ، واتە: سەرپشکە لە کەففارەتەکە: کۆیلەیەك ئازاد بکا، یان دە مستە گەنم بداتە دە هەژاران، یان دە پارچە جلیان بداتێ، جا ئەگەر توانای هیچێکی لەو سێیانە نەبو، ئەو کاتە واجبە سێ ڕۆژان بەڕۆژوو بێ.

## ﴿ كِتَابُ الظِّهَارِ: **پەرتوکی زیهار** ﴾

واتە: مێردەکە ژنەکەی خۆی وەئافرەتێکی مەحرەمیخۆی بچوێنێ، وەك بڵێ: **(تۆ لە لای من وەك پشتیدایکمی)**. جا ئەم زیهارە لە سەردەمی(جَاهِلِيَّة)دا تەڵاقدان بوو، بەڵام شەریعەتیئیسلام ئەو بڕیارەی گۆڕیو بڕیاریدا: ژنەکە حەرام ببێو کەففارەتیداهاتووش لە سەر مێردەکە واجب بێ.

يَصِحُّ مِنْ كُلِّ زَوْجٍ مُكَلَّفٍ وَلَوْ ذِمِّيًّا وَخَصِيًّا، وَظِهَارُ سَكْرَانَ كَطَلاَقِهِ، وَصَرِيحُهُ أَنْ يَقُولَ لِزَوْجَتِهِ: أَنْتِ عَلَيَّ أَوْ مِنِّي أَوْ مَعِي أَوْ عِنْدِي كَظَهْرِ أُمِّي. وَكَذَا أَنْتِ كَظَهْرِ أُمِّي. صَرِيحٌ عَلَى الصَّحِيحِ، وَقَوْلُهُ: جِسْمُكِ أَوْ بَدَنُكِ أَوْ نَفْسُكِ كَبَدَنِ أُمِّي أَوْ جِسْمِهَا أَوْ جُمْلَتِهَا. صَرِيحٌ، وَالأَظْهَرُ أَنَّ قَوْلَهُ: كَيَدِهَا أَوْ بَطْنِهَا أَوْ صَدْرِهَا. ظِهَارٌ، وَكَذَا كَعَيْنِهَا

---

جا بزانە: زیهار حەرامەو لە گوناهە گەورەکانە بۆیێ کەففارەتێکیگەورە لە سەر مێردەکە واجب دەکا، هەروەك لە زۆربەیسەرچاوەکاندا فەرموویانە، چونکە خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِنكُمْ مِن نِّسَائِهِمْ مَا هُنَّ أُمَّهَاتِهِمْ إِنْ أُمَّهَاتُهُمْ إِلاَّ اللاَّئِي وَلَدْنَهُمْ وَإِنَّهُمْ لَيَقُولُونَ مُنكَراً مِّنَ الْقَوْلِ وَزُوراً﴾ ئەو پیاوانەی لە ئێوە زیهار لە ژنەکانیخۆیان دەکەنو وەدایکیخۆیان دەچوێنن، ئەو ژنانە دایکیئەوان نین، بەڵکو دایکیئەوان تەنها ئەو دایکانەن کە ئەوانیان لێبوونە، بە ڕاستی ئەو پیاوانە قسەیەکی بێشەرعیو درۆ دەڵێن.

(يَصِحُّ) زیهار دروست دەبێ، واتە: دادەمەزرێ (مِنْ كُلِّ زَوْجٍ مُكَلَّفٍ) لە گشت مێردێکی کە بالغو عاقڵو بە خۆشیخۆی بێ (وَلَوْ ذِمِّيًّا وَخَصِيًّا) هەر چەند مێردەکەش جولەکەو دیانو خەسێندراو بێ، بەڵام زیهاری بێگانەو مێردێکی منداڵو شێتو زۆرلێکراو دروست نابێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

کەواتە: زیهاری ژنەکەش دروست نابێ، وەك بڵێتە مێردەکەی: (تۆ وەك باوكو برای منی). بەڵکو ئەگەر مەبەستی ڕێزلێنانی مێردەکەی بێ گوناهباریش نابێ، بەڵام ئەگەر مەبەستی وێچواندن بێ، ئەو کاتە گوناهبار دەبێ، والله أعلم (وَظِهَارُ سَكْرَانَ كَطَلاَقِهِ) زیهارکردنی سەرخۆش وەکو تەلاقدانیەتیو دروست دەبێ.

(وَصَرِيحُهُ) ووشەی ئاشکرای زیهار (أَنْ يَقُولَ لِزَوْجَتِهِ) ئەوەیە مێردەکە بڵێتە ژنەکەی خۆی: (أَنْتِ عَلَيَّ أَوْ مِنِّي أَوْ مَعِي أَوْ عِنْدِي كَظَهْرِ أُمِّي) تۆ لە سەر من، یان تۆ لە من، یان تۆ لەگەڵ من، یان تۆ لە لای من، یان تۆ بۆ من وەك پشتیدایکمی. (وَكَذَا أَنْتِ كَظَهْرِ أُمِّي) هەروەها ئەگەر بڵێ: تۆ وەك پشتیدایکمی. ئەوەش (صَرِيحٌ عَلَى الصَّحِيحِ) ووشەیەکی ئاشکرایە، لە سەر فەرموودەی ڕاست.

هەم (وَقَوْلُهُ) گوتەی مێردەکە کە بڵێتە ژنەکەی: (جِسْمُكِ أَوْ بَدَنُكِ أَوْ نَفْسُكِ كَبَدَنِ أُمِّي أَوْ جِسْمِهَا أَوْ جُمْلَتِهَا) لاشەیتۆ، یان خودیتۆ، یان گشت ئەندامیتۆ وەك لاشەیدایکمە، یان وەك خودی دایکمە، یان وەك گشت ئەندامی دایکمە. ئەوەش (صَرِيحٌ) ووشەی ئاشکرای زیهارە (وَ) هەروەها (الأَظْهَرُ أَنَّ قَوْلَهُ) بە فەرموودەی بەهێزتر: گوتەی مێردەکە کە بڵێتە ژنەکەی: (كَيَدِهَا أَوْ بَطْنِهَا أَوْ صَدْرِهَا) تۆ وەك دەستیدایکمی، یان وەك زگیدایکمی، یان وەك سینگیدایکمی. ئەوەش (ظِهَارٌ) زیهارە (وَكَذَا) هەروەها بە ووشەی نائاشکراش زیهار دادەمەزرێ، وەك بڵێتە ژنەکەی: (كَعَيْنِهَا) تۆ وەك چاویدایکمی، یان تۆ وەك گیانیدایکمی،

إنْ قَصَدَ ظِهَارًا، وَإنْ قَصَدَ كَرَامَةً فَلاَ، وَكَذَا إنْ أَطْلَقَ فِي الأَصَحِّ، وَقَوْلُهُ: رَأْسُـكِ أَوْ ظَهْرُكِ أَوْ يَدُكِ عَلَيَّ كَظَهْرِ أُمِّي. ظِهَارٌ فِي الأَظْهَرِ. وَالتَّشْبِيهُ بِالْجَدَّةِ ظِهَارٌ، وَالْمَـذْهَبُ طَرْدُهُ فِي كُلِّ مَحْرَمٍ لَمْ يَطْرَأْ تَحْرِيمُهَا، لاَ مُرْضِعَةٍ وَزَوْجَةِ ابْنٍ، وَلَوْ شَبَّهَ بِأَجْنَبِيَّةٍ وَمُطَلَّقَةٍ وَأُخْتِ زَوْجَةٍ وَأَبٍ وَمُلاَعَنَةٍ

---

یان تۆ وەك دایكمی، واتە: ئەوانەش دەبنـە زیهـار (إنْ قَصَدَ ظِهَارًا) ئەگـەر مێردەكە بـە یەكێك لەو سێیانە مەبەستی زیهار بێ، بەڵام (وَإنْ قَصَدَ كَرَامَةً) ئەگەر مەبەستی ڕێزلێنانی ژنەكەی بێ (فَلاَ) نابێتـە زیهار.

(وَكَذَا إنْ أَطْلَقَ) هەروەها ئەگەر هیچ مەبەستێكی زیهارو ڕێزلێنانیشـی نـەبێ، هـەر نابێتـە زیهار (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونكە ئەو سێ ووشانە نائاشكرانە.

(وَقَوْلُهُ) گوتەی مێردەكە: (رَأْسُكِ أَوْ ظَهْرُكِ أَوْ يَدُكِ عَلَيَّ كَظَهْرِ أُمِّي) سەریتۆ، یان پشتیتۆ، یان دەستیتۆ، یان عەوڕەتیتۆ لە سەر من وەك پشتیدایكمە. ئـەوەش (ظِهَـارٌ فِي الأَظْهَـرِ) دەبێتە زیهار لە فەرموودەی بەهێزتردا.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر بڵێتە ژنەكەی: تۆ وەك دایكمی. یان بڵێ: تۆ لە سەر من حەڕام بی هەروەك دایكم حەڕام بووە. ئەوانـەش ووشـەی نائاشـكرای زیهـارو تـەڵاقن، واتـە: ئەگـەر نیەتی تەڵاقدان بێ تـەڵاقی دەكـەوێ، یـان ئەگـەر نیـەتی زیهـار بێ–واتـە: ژنەكـەی لـە حەڕامیدا وەك پشتیدایكی بێ– ئەوەش دەبێتە زیهار، بەڵام ئەگەر نە تەڵاقو نە زیهاری مەبەست نەبون، ئەو كاتە نابێتە تەڵاقدانو ناشبێتە زیهار، هـەوەك لـە (تحفة)و (نهايـة)و حاشیەكانیاندا ڕوون كراوەتەوە.

بەڵام–لەو حاڵەتەی مەبەستی تەڵاقو زیهار نیە– ئەگەر بڵێ: تـۆ لـە مـن حـەڕام بـی. جا مەبەستی حـەڕامكردنی ژنەكـەی بـێ، یـان هـیچ نیـەتێكی حـەڕامكردنی نـەبێ، ئـەوە لـە هەردوو حاڵەتدا كەففارەتێكیسوێندی لـە سـەر واجـب دەبـێ، هـەوەك لـە (كِنايـة)كـانی تەڵاقدا ڕوونمان كردەوە.

(وَالتَّشْبِيهُ بِالْجَدَّةِ ظِهَارٌ) وێچواندنیژنەكەی بـە داپیرەكـەی دەبێتـە زیهـار (وَالْمَـذْهَبُ) بـە فەرموودەی ڕاستیمەزهەب (طَرْدُهُ فِيكُلِّ مَحْرَمٍ لَمْ يَطْرَأْ تَحْرِيمُهَا) بڕیاری وێچواندنی زیهار دێتەجێ لە گشت ئەو ئافرەتانەدا كـە هەتاهـەتای لێی حـەڕامنو حەڕامبوونەكەشـیان لـە بنچینەوە بێ: وەك خوشكو كیژو برازاو خوشكەزاو...هتد.

(لاَ مُرْضِعَةٍ وَزَوْجَةِ ابْنٍ) نـەك حەڕامیەكـە لـە لایەكـەوە هاتبـێ: وەكـو دایكـە شـیریەكەیو ژنیكوڕەكەی، چونكە ئەوانە–پێش حەڕامبوون– لە كاتێكدا لێی حـەڵاڵ بـون (وَلَـوْ شَبَّهَ بِأَجْنَبِيَّةٍ وَمُطَلَّقَةٍ وَأُخْتِ زَوْجَةٍ وَأَبٍ وَمُلاَعَنَـةٍ) ئەگـەر ژنەكـەی بـە ژنێكـی بێگانـە چـواند، یـان

فَلَغوٌ، وَيَصحُّ تَعْلِيقُهُ كَقَوْلِه: إنْ ظَاهَرْتُ مِنْ زَوْجَتِيالأُخرَى فَأَنْت عَلَيَّ كَظَهْرِ أُمّي. فَظَاهَرَ صَارَ مُظَاهِرًا مِنهُمَا، وَلَوْ قَالَ: إنْ ظَاهَرْتُ مِنْ فُلاَنَةَ.-وَفُلاَنَةُ أجنَبِيَّةٌ- فَخَاطَبَهَا بِظِهَارٍ لَمْ يَصِرْ مُظَاهِرًا مِنْ زَوْجَتِه إلاَّ أَنْ يُرِيدَاللَّفظَ، فَلَوْ نَكَحَهَا وَظَاهَرَ مِنهَا صَارَ مُظَاهِرًا، وَلَوْ قَالَ مِنْ فُلاَنَةَالأَجنَبِيَّة. فَكَذَلِكَ، وَقِيلَ لاَ يَصِيرُ مُظَاهِرًا وَإنْ نَكَحَهَا وَظَاهَرَ، وَلَوْ قَالَ: إنْ ظَاهَرْتُ مِنهَا وَهِيَ أَجنَبِيَّةٌ، فَلَغوٌ، وَلَوْ قَالَ أَنْت طَالِقٌ كَظَهْرِ أُمّي. وَلَمْ يَنْوِ أَوْ نَوَىالطَّلاَقَ

---

بە تەلاقدراوێك، یان بە خوشكە ژنەكەی، یان بە باوكیخۆی، یان بە لەعنەت لێكراوێك، ئەوە (فَلَغوٌ) پوچەڵەو نابێتە زیهار.

(وَيَصحُّ تَعْلِيقُهُ) دروستە زیهارەكە هەڵبواسێ (كَقَوْلِه) وەك بڵێ: ئەگەر بچیتە ژوورەوە تۆ وەك پشتیدایكمی. یان هەر كاتێك فلانكەس هاتەوە تۆ وەك پشتیدایكمی. ئەوە هەر كاتێك پێهەڵواسراوەكە هاتە جێ دەبێتە زیهاركەر، هەم وەك بڵێ: (إنْ ظَاهَرْتُ مِنْ زَوْجَتِي الأُخرَى فَأَنْتِ عَلَيَّ كَظَهْرِ أُمّي) ئەگەر زیهارم لە ژنەكەیترم كرد تۆ لە سەرە من وەك پشتی دایكمی (فَظَاهَرَ) جا زیهاری لە ژنەكەیتر كرد، ئەو (صَارَ مُظَاهِرًا مِنهُمَا) دەبێتە زیهاركەر لە هەردوو ژنەكانی: یەكێكیان بە جێبەجێو یەكێكیش بە هەڵواسین.

(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر مێردەكە گوتی (إنْ ظَاهَرْتُ مِنْ فُلاَنَةَ وَفُلاَنَةُ أجنَبِيَّةٌ) ئەگەر زیهارم لە فلانە ژنە كرد، تۆ لە سەرەمن وەك پشتی دایكمی. لەو حاڵەتەشدا فلانەكە بێگانە بوو، ئینجا (فَخَاطَبَهَا بِظِهَارٍ) مێردەكە گفتوگۆی زیهاری لەگەڵ ژنەبێگانەكە كرد، ئەوە (لَمْ يَصِرْ مُظَاهِرًا مِنْ زَوْجَتِه) نابێتە زیهاركەر لە ژنەكەی خۆی، چونكە زیهار لە بێگانە دروست نابێ (إلاَّ أَنْ يُرِيدَ اللَّفظَ) مەگەر مەبەستی هەڵواسین بە گوتەی زیهارەكە بێ، ئەو كاتە دەبێتە زیهاركەر، هەروەها (فَلَوْ نَكَحَهَا وَظَاهَرَ مِنهَا) ئەگەر ژنە بێگانەكەی لە خۆی مارە كردو زیهاریشی لەگەڵ كرد، ئەو كاتەش (صَارَ مُظَاهِرًا) لە ژنەكەیەكەمیشی دەبێتە زیهاركەر، چونكە پێهەڵواسراوەكە بە دروستبوویی هاتۆتەجێ.

(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر گوتی (مِنْ فُلاَنَةَ الأَجنَبِيَّة) ئەگەر زیهارم لە فلانە ژنە بێگانەیە كرد تۆ لە سەر من وەك پشتی دایكمی (فَكَذَلِكَ) ئەمەش وەك ئەوەكەیتر ئەگەر مارەی بكاو زیهاری لێبكا، ئەو كاتە لە یەكەمەكەش دەبێتە زیهاركەر (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا (لاَ يَصِيرُ مُظَاهِرًا وَإنْ نَكَحَهَا وَظَاهَرَ) نابێتە زیهاركەر لە یەكەمەكە، هەرچەند بێگانەكەش مارە بكاو زیهاریشی لێبكا (وَلَوْ قَالَ) ئەگەر گوتی: (إنْ ظَاهَرْتُ مِنهَا وَهِيَ أَجنَبِيَّةٌ) ئەگەر لە حاڵەتی بێگانەییدا زیهارم لێكرد تۆ وەك پشتی دایكمی (فَلَغوٌ) ئەوە پوچەڵەو نابێتە زیهار.

(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر گوتی (أَنْتِ طَالِقٌ كَظَهْرِ أُمّي) تۆ تەلاقكەوتووی وەك پشتیدایكم (وَلَمْ يَنْوِ) هیچ نیەتێكیشی نەهێنابو (أَوْ نَوَىالطَّلاَقَ) یان بە هەموو ڕستەكە تەنها نیەتی

أَوِ الظِّهَارَ أَوْ هُمَا أَوِ الظِّهَارَ بِأَنْتِ طَالِقٌ وَالطَّلاَقَ بِكَظَهْرِ أُمِّي طَلَقَتْ وَلاَ ظِهَارَ، أَوِالطَّلاَقَ بِأَنْتِ طَالِقٌ وَالظِّهَارَ بِالْبَاقِي طَلَقَتْ وَحَصَلَ الظِّهَارُ إِنْ كَانَ طَلاَقَ رَجْعَةٍ. (فَصْلٌ) عَلَى الْمُظَاهِرِ كَفَّارَةٌ إِذَا عَادَ، وَهُوَ أَنْ يُمْسِكَهَا بَعْدَ ظِهَارِهِ زَمَنَ إِمْكَانِ فُرْقَةٍ،

---

تەلاقی هێنابو (أَوِالظِّهَارَ) یان تەنها نیەتی زیهاری هێنابو (أَوْ هُمَا) یان نیەتی تەلاقو زیهاری هێنابو (أَوِالظِّهَارَ بِأَنْتِ طَالِقٌ) یان بە ڕستەی تۆ تەلاقکەوتووی نیەتی زیهار بوو، هەم (وَالطَّلاَقَ بِكَظَهْرِ أُمِّي) بە ووشەی وەك پشتیدایكمی، نیەتی تەلاق بوو، ئەوە (طَلَقَتْ وَلاَ ظِهَارَ) لە هەر پێنج حاڵەتدا تەلاقی دەكەوێو نابێتە زیهار، چونكە ووشەی ئاشكرای تەلاقدانی گوتوە.

بەلام (أَوِ الطَّلاَقَ بِأَنْتِ طَالِقٌ) ئەگەر بە ڕستەی تۆ تەلاقكەوتووی نیەتی تەلاقدان بوو، هەم (وَالظِّهَارَ بِالْبَاقِي) بە وەك پشتیدایكمی، نیەتی زیهار بوو، ئەو كاتەش (طَلَقَتْ) تەلاقی دەكەوێ، هەم (وَحَصَلَ الظِّهَارُ إِنْ كَانَ طَلاَقَ رَجْعَةٍ) زیهارەكەش دادەمەزرێ ئەگەر تەلاقدانەكە (رَجْعِي) بێ، كەواتە: هەر كاتێك ژنەكەی گەڕاندەوە ژێر مارەیخۆی كەففارەتی زیهاری لە سەر واجب دەبێ، بەلام ئەگەر تەلاقدانەكە (بائن) بێ، ئەو كاتە زیهارەكە دانامەزرێ، چونكە تەلاقدراوی(بائن) بێگانەیە، هەروەك لە(مغنی)دا فەرموویەتی.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی بڕیارەكانی زیهار ﴾

(عَلَى الْمُظَاهِرِ كَفَّارَةٌ) مێردە زیهاركەرەكە كەففارەتی لە سەر واجب دەبێ (إِذَا عَادَ) هەر كاتێك لە زیهارەكەی گەڕاوە، واتە: حەرامكردنەكەی هەڵوەشاندەوە، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِنْ نِسَائِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَتَمَاسَّا ذَلِكُمْ تُوعَظُونَ بِهِ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَتَمَاسَّا فَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِيناً﴾ ئەو كەسانەی زیهار لە ژنەكانیخۆیان دەكەن، ئینجا لە زیهارەكەشیان دەگەڕێنەوەو ژنەكەیان دەوێتەوە، واجبە: كۆیلەیەك ئازاد بكەن پێش ئەوەی جیماع بكەن، بەم كەففارەتە ئێوە تەمبێ دەكرێنو خوایگەورە بەوەی دەیكەن خەبەردارە، جا ئەگەر كۆیلەی دەست نەكەوت واجبە: دوو مانگ بە دوای یەكتردا بەڕۆژوو ببێ، جا ئەگەر توانای نەبو واجبە: شەست گەداو هەژار خواردن بدا.

(وَهُوَ) گەڕانەوەی زیهار ئەمەیە: (أَنْ يُمْسِكَهَا بَعْدَ ظِهَارِهِ) لە دوای تەواوبوونی ڕستەی زیهارەكەی ژنەكەی بە ژنو مێردایەتی ڕابگرێو تەلاقی نەدا (زَمَنَ إِمْكَانِ فُرْقَةٍ) ماوەیەكی ئەوها: كە دەگونجا لەو ماوەیەدا تەلاقی بدا، واتە: هەر كەسێك ووشەی زیهاری بە ژنەكەیخۆی گوتو لە دوای تەواوبوونی ڕستەیزیهارەكەش یەكسەر بە پەلە ژنەكەی تەلاق نەدا، ئەوە دەردەكەوێ گەڕاوەتەوە بۆ ژنو مێردایەتیو

فَلَوْ اتَّصَلَتْ بِهِ فُرْقَةٌ بِمَوْتٍ أَوْ فَسْخٍ أَوْ طَلَاقٍ بَائِنٍ أَوْ رَجْعِيٍّ وَلَمْ يُرَاجِعْ أَوْ جُنَّ فَلَا عَوْدَ، وَكَذَا لَوْ مَلَكَهَا أَوْ لَاعَنَهَا فِي الْأَصَحِّ بِشَرْطِ سَبْقِ الْقَذْفِ ظِهَارَهُ فِي الْأَصَحِّ، وَلَوْ رَاجَعَ أَوْ ارْتَدَّ مُتَّصِلاً ثُمَّ أَسْلَمَ فَالْمَذْهَبُ أَنَّهُ عَائِدٌ بِالرَّجْعَةِ، لَا بِالْإِسْلَامِ بَلْ بَعْدَهُ،

---

**حەرامکردنەکەی هەڵوەشاندۆتەوە، کەوابو: یەکسەر کەففارەتی زیهاری لە سەر واجب دەبێ، هەرچەند نەشیزانیبێ ئەو ڕاگرتنە دەبێتە گەڕانەوە.**

بەڵام (فَلَوْ اتَّصَلَتْ بِهِ فُرْقَةٌ) ئەگەر لێکجیابوونەوەیەك بە زیهارەکەوە نوسا، واتە لە دوای تەواوبوونی ووشەی زیهارەکە یەکسەر ژنو مێردایەتیەکە نەما: (بِمَوْتٍ) بە هۆی مردنی یەکێکیان (أَوْ فَسْخٍ) یان بە هۆی هەڵوەشاندنەوەی مارەبڕینەکە (أَوْ طَلَاقٍ بَائِنٍ أَوْ رَجْعِيٍّ وَلَمْ يُرَاجِعْ) یان بە هۆی تەڵاقدانێکی(بائن)، یان تەڵاقدانێکی(رجعی)و ژنەکەشی نەگەڕاندەوە (أَوْ جُنَّ) یان مێردەکە شێت بوو، ئەوە لەو حاڵەتانەدا (فَلَا عَوْدَ) گەڕانەوەکە نایەتەجێو کەففارەتیش واجب نابێ، بەڵام ئەگەر بە (رجعی) تەڵاقیدا، ئینجا گەڕاندیەوە، ئەو کاتە مێردەکە دەبێتە گەڕاوەو کەففارەتیشی لە سەر واجب دەبێ، هەروەك لە دوای ئێرە ڕوون کراوەتەوە.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر زیهاری لە ژنێکی زەیسانی، یان حەیزدار کرد، ئەوە تا لە زەیسانیو حەیزدا بێ مێردەکە نابێتە گەڕاوەو کەففارەتی لە سەر واجب نابێ، هەرچەند نەشیزانیبێ لە زەیسانیو حەیزدانە، بەڵام هەر کاتێك پاك بونەوە، ئەگەر یەکسەر تەڵاقیان نەدا، ئەو کاتە دەبێتە گەڕاوەو کەففارەتی زیهاری دەکەوێتە سەر، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

(وَكَذَا لَوْ مَلَكَهَا أَوْ لَاعَنَهَا فِي الْأَصَحِّ) هەروەها مێردەکە نابێتە گەڕاوە ئەگەر لە دوای زیهارەکە ژنە کۆیلەکەی بکاتە ملکیخۆی ، یان لەعنەتی زینای لێبکا، لە فەرموودەی ڕاستتردا، بەڵام (بِشَرْطِ سَبْقِ الْقَذْفِ ظِهَارَهُ فِي الْأَصَحِّ)بەو مەرجەی جنێوی زینایەکە لە پێش زیهارەکەدا بێ، لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَلَوْ رَاجَعَ) ئەگەر مێردەکە لە دوای زیهارەکە ژنەتەڵاقدراوەکەی گەڕاندەوە ژێر مارەی خۆی (أَوْ ارْتَدَّ مُتَّصِلاً ثُمَّ أَسْلَمَ) یان یەکسەر بە دوای زیهارەکەدا مێردەکە کافر بوو، ئینجا موسوڵمان بۆوە، ئەوە (فَالْمَذْهَبُ) بە فەرموودەی ڕاستی مەزهەب: (أَنَّهُ عَائِدٌ بِالرَّجْعَةِ) بە گەڕاندنەوەی ژنە تەڵاقدراوەکە مێردەکە دەبێتە گەڕاوە، جیاوازی نیە: پێش تەڵاقدانەکە زیهاری لێکردبێ، یان لە دوای تەڵاقدانەکە، لە هەردوو حاڵەتدا هەر کاتێك ژنە تەڵاقدراوەکەی گەڕاندەوە، ئەوە لە زیهارەکەشی دەبێتەگەڕاوەو کەففارەتی زیهاری لە سەر واجب دەبێ (لَا بِالْإِسْلَامِ) بەڵام بەموسوڵمانبوونەوە نابێتەوە گەڕاوە (بَلْ بَعْدَهُ) بەڵکو

وَلاَ تَسْقُطُ الْكَفَّارَةُ بَعْدَالْعَوْدِ بِفُرْقَةٍ، وَيَحْرُمُ قَبْلَ التَّكْفِيرِ وَطْءٌ وَكَذَا لَمْسٌ وَنَحْوُهُ بِشَهْوَةٍ فِي الأَظْهَرِ، قُلْتُ: اَلأَظْهَرُ اَلْجَوَازُ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَيَصِحُّ الظِّهَارُ الْمُؤَقَّتُ مُؤَقَّتًا، وَفِي قَوْلٍ مُؤَبَّدًا، وَفِي قَوْلٍ لَغْوٌ، فَعَلَى الأَوَّلِ اَلأَصَحُّ أَنَّ عَوْدَهُ لاَ يَحْصُلُ بِإِمْسَاكٍ بَلْ بِوَطْءٍ فِي الْمُدَّةِ وَيَجِبُ النَّزْعُ بِمَغِيبِ الْحَشَفَةِ،

---

له دوای موسوڵمانبوونه‌وه– ئه‌گه‌ر یه‌كسه‌ر ته‌ڵاقی نه‌دا– ده‌بێته گه‌ڕاوه‌و كه‌ففاره‌تی له‌ سه‌ر واجب ده‌بێ.

(وَلاَ تَسْقُطُ الْكَفَّارَةُ بَعْدَالْعَوْدِ بِفُرْقَةٍ) له‌ دوای گه‌ڕانه‌وه‌ كه‌ففاره‌ته‌كه‌ له‌ سه‌ر مێرده‌كه‌ لاناچێ به‌ هۆی لێكجیابوونه‌وه‌: به‌ مردن، یان به‌ ته‌ڵاقدان، چونكه‌ وه‌كو قه‌رز له‌ سه‌ری جێگیر بووه‌، هه‌م (وَيَحْرُمُ قَبْلَ التَّكْفِيرِ وَطْءٌ) پێش كه‌ففاره‌تدانه‌كه‌ش حه‌رامه‌ جیماع له‌گه‌ڵ ژنه‌كه‌بكا، چونكه‌ له‌ ئایه‌ته‌كه‌دا فه‌رمووی: ﴿مِنْ قَبْلِ أَنْ يَتَمَاسَّا﴾ پێش ئه‌وه‌ی جیماع بكه‌ن. كه‌واته‌: ئه‌گه‌ر توانای هیچ جۆره‌ كه‌ففاره‌تێكی–له‌و سێیانه‌ی‌ڕابردوو– نه‌بو، ئه‌وه‌ كه‌ففاره‌ته‌كه‌ له‌ ئه‌ستۆی‌دا ده‌بێته‌ قه‌رزو نابێ جیماعیش له‌گه‌ڵ ژنه‌كه‌ی بكا تا توانای كه‌ففاره‌ته‌كه‌ی ده‌بێ‌و كه‌ففاره‌ته‌كه‌ ده‌دا، هه‌روه‌ك له‌ (مغني)و (الشبراملسي)دا فه‌رموویانه‌.

(وَكَذَا لَمْسٌ وَنَحْوُهُ بِشَهْوَةٍ فِي الأَظْهَرِ) هه‌روه‌ها ده‌ست لێدان‌و ماچ كردنیش به‌ شه‌هوه‌ت حه‌رامه‌ (قُلْتُ) ئیمامی (النواوي) ده‌فه‌رموێ (اَلأَظْهَرُ الْجَوَازُ) به‌ فه‌رمووده‌ی به‌هێزتر: له‌زه‌ت لێ‌دیتنی–جگه‌ له‌ نێوان ناوك‌و ئه‌ژنۆ– دروسته‌ (وَاللهُ أَعْلَمُ).

(وَيَصِحُّ الظِّهَارُ الْمُؤَقَّتُ) زیهاری كات بۆداندراویش دروست ده‌بێ، وه‌ك بڵێ: تۆ له‌ لای‌من ماوه‌ی مانگێك وه‌ك پشتی‌دایكمی (مُؤَقَّتًا) زیهاره‌كه‌ش به‌ شێوه‌یه‌كی‌كاتی دروست ده‌بێ، نه‌ك به‌ به‌رده‌وامی، واته‌: هه‌ر كاتێك ماوه‌كه‌ ته‌واو بوو، دروسته‌: جیماعی له‌گه‌ڵ بكاو كه‌ففاره‌تیشی ناكه‌وێته‌ سه‌ر (وَفِي قَوْلٍ مُؤَبَّدًا) له‌ فه‌رمووده‌یه‌كدا: به‌ به‌رده‌وامی دروست ده‌بێ (وَفِي قَوْلٍ لَغْوٌ) له‌ فه‌رمووده‌یه‌كدا: پوچه‌ڵ‌و دانه‌مه‌زراوه‌.

(فَعَلَى الأَوَّلِ) جا له‌ سه‌ر فه‌رمووده‌ی‌یه‌كه‌م كه‌ به‌ شێوه‌یه‌كی‌كاتی دروست ده‌بێ (اَلأَصَحُّ أَنَّ عَوْدَهُ لاَ يَحْصُلُ بِإِمْسَاكٍ) به‌ فه‌رمووده‌ی ڕاستتر: گه‌ڕانه‌وه‌ی مێرده‌كه‌ به‌ ڕاگرتنی ژنه‌كه‌ نایه‌ته‌جێ (بَلْ بِوَطْءٍ فِي الْمُدَّةِ) به‌ڵكو به‌ جیماعكردن له‌ ماوه‌ی زیهاره‌كه‌دا دێته‌ جێ، واته‌: هه‌ركاتێك پێش ته‌واوبوونی ماوه‌ی زیهاره‌كه‌ جیماعی‌كرد، ئه‌وه‌ ده‌بێته‌ گه‌ڕاوه‌و كه‌ففاره‌تی له‌ سه‌ر واجب ده‌بێ، كه‌وابو: (وَيَجِبُ النَّزْعُ بِمَغِيبِ الْحَشَفَةِ) هه‌ر كاتێ سه‌ری ئه‌ندامه‌كه‌ی برده‌ ناو (فَرْج)ی ژنه‌كه‌ی، واجبه‌: به‌ په‌له‌ لێی ده‌ربێنێ، چونكه‌ به‌م جیماعه‌ كه‌ففاره‌تی له‌ سه‌ر واجب ده‌بێ‌و نابێ به‌رده‌وام بێ، كه‌واته‌: تا كه‌ففاره‌ته‌كه‌ش نه‌دا،

وَلَوْ قَالَ لأَرْبَعٍ: أَنْتُنَّ عَلَيَّ كَظَهْرِ أُمِّي. فَمُظَاهِرٌ مِنْهُنَّ فَإِنْ أَمْسَكَهُنَّ فَأَرْبَعُ كَفَّارَاتٍ، وَفِي الْقَدِيمِ كَفَّارَةٌ، وَلَوْ ظَاهَرَ مِنْهُنَّ بِأَرْبَعِ كَلِمَاتٍ مُتَوَالِيَةٍ فَعَائِدٌ مِنَ الثَّلاَثِ الأُوَلِ، وَلَوْ كَرَّرَ فِي امْرَأَةٍ مُتَّصِلاً وَقَصَدَ تَأْكِيدًا فَظِهَارٌ وَاحِدٌ، أَوْ اسْتِئْنَافًا فَالأَظْهَرُ التَّعَدُّدُ، وَأَنَّهُ بِالْمَرَّةِ الثَّانِيَةِ عَائِدٌ فِي الأَوَّلِ.

(كِتَابُ الْكَفَّارَةِ)

يُشْتَرَطُ نِيَّتُهَا لاَ تَعْيِينُهَا،

---

حەرامە: لە ماوەی زیهارەکەدا هیچیتر جیماع بکا، جا ئەگەر ماوەی زیهارەکە تەواو بوو، ئەو کاتە کەففارەتەکە لە ئەستۆیدا دەبێتە قەرزو جیماعیشی بۆ حەڵاڵ دەبێ، هەر وەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَلَوْ قَالَ لأَرْبَعٍ) ئەگەر گوتیە هەر چوار ژنەکانی: (أَنْتُنَّ عَلَيَّ كَظَهْرِ أُمِّي) ئێوە لە سەر من وەك پشتی دایکمن. ئەوە (فَمُظَاهِرٌ مِنْهُنَّ) لە هەر چواریان زیهارکەرە، کەوابو: (فَإِنْ أَمْسَكَهُنَّ) ئەگەر هەر چواری ڕاگرتن‌و دەسبەجێ تەڵاقی نەدان (فَأَرْبَعُ كَفَّارَاتٍ) چوار کەففارەتی لە سەر واجب دەبن (وَفِي الْقَدِيمِ كَفَّارَةٌ) لە فەرموودەی کۆندا: تەنها یەك کەففارەتی لە سەر واجب دەبێ (وَلَوْ ظَاهَرَ مِنْهُنَّ بِأَرْبَعِ كَلِمَاتٍ مُتَوَالِيَةٍ) ئەگەر زیهاری لە هەر چواریان کرد بە چوار ووشەی بە دوای‌یەکتردا، ئەوە (فَعَائِدٌ مِنَ الثَّلاَثِ الأُوَلِ) لە سێ ژنەکەی سەرەتادا دەبێتەگەڕاوەو سێ کەففارەتی دەکەونە سەر، هەم ئەگەر چوارمەکەش دەسبەجێ تەڵاق نەدا، کەففارەتی چوارەمیشی دەکەوێتەسەر.

(وَلَوْ كَرَّرَ فِي امْرَأَةٍ مُتَّصِلاً وَقَصَدَ تَأْكِيدًا) ئەگەر چەند جارێك ووشەی زیهاری بە بێ‌نێوان دووبارە کردەوە، مەبەستیشی بەهێزکردن بوو، ئەوە (فَظِهَارٌ وَاحِدٌ) بە یەك زیهار دەژمێردرێ (أَوْ اسْتِئْنَافًا) یان مەبەستی بنیاتنان بوو، ئەوە (فَالأَظْهَرُ التَّعَدُّدُ) بە فەرموودەی بەهێزتر: بە گوێرەی ژمارەی ووشەکان زیهارەکەش دەبێتە ژمارە (وَأَنَّهُ بِالْمَرَّةِ الثَّانِيَةِ عَائِدٌ فِي الأَوَّلِ) هەر بە فەرموودەی بەهێزتر: بەگوتنی جاری‌دووەمی زیهارەکەش دەبێتە گەڕاوە لە جاری‌یەکەمداو کەففارەتی زیهاری‌یەکەمی لە سەر واجب دەبێ.

## ﴿ كِتَابُ الْكَفَّارَةِ: پەرتوکی کەففارەت ﴾

(يُشْتَرَطُ نِيَّتُهَا) بە مەرج دادەندرێ: نیەتی‌کەففارەتەکە بێنێ، وەك بڵێ: (ئەم کۆیلەم لە بری کەففارەتەکەم ئازاد کرد). یان: (نیەتمە سبەینێ لە بری کەففارەتەکەم بەڕۆژوو بم). یان: (ئەم دانەوێڵەم لە بری کەففارەتەکەم دا بەم هەژارە).

(لاَ تَعْيِينُهَا) بەڵام دیاری‌کردنی کەففارەتەکە مەرج نیەو پێویست ناکا بڵێ: لە بری کەففارەتی زیهارەکەم. یان کوشتنەکەم.

وَخِصَالُ كَفَّارَةِ الظِّهَارِ: عِتْقُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ بِلاَ عَيْبٍ يُخِلُّ بِالْعَمَلِ وَالْكَسْبِ، فَيُجْزِئُ صَغِيرٌ وَأَقْرَعُ وَأَعْرَجُ يُمْكِنُهُ تِبَاعُ مَشْيٍ، وَأَعْوَرُ وَأَصَمُّ وَأَخْرَسُ وَأَخْشَمُ، وَفَاقِدُ أَنْفِهِ وَأُذُنَيْهِ، وَأَصَابِعِ رِجْلَيْهِ، لاَ زَمِنٌ وَلاَ فَاقِدُ رِجْلٍ أَوْ خِنْصِرٍ وَبِنْصِرٍ مِنْ يَدٍ أَوْ أُنْمُلَتَيْنِ مِنْ غَيْرِهِمَا، قُلْتُ: أَوْ أُنْمُلَةِ إِبْهَامٍ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَلاَ هَرِمٌ عَاجِزٌ وَمَنْ أَكْثَرُ وَقْتِهِ مَجْنُونٌ وَمَرِيضٌ لاَ يُرْجَى، فَإِنْ بَرَأَ بَانَ الإِجْزَاءُ فِي الأَصَحِّ، وَلاَ يُجْزِئُ شِرَاءُ قَرِيبٍ بِنِيَّةِ كَفَّارَةٍ، وَلاَ أُمِّ وَلَدٍ وَذِي كِتَابَةٍ صَحِيحَةٍ، وَيُجْزِئُ مُدَبَّرٌ وَمُعَلَّقٌ بِصِفَةٍ، فَإِنْ أَرَادَ جَعْلَ الْعِتْقِ الْمُعَلَّقِ كَفَّارَةً لَمْ يُجْزِ، وَلَهُ تَعْلِيقُ عِتْقِ الْكَفَّارَةِ بِصِفَةٍ،

---

(وَخِصَالُ كَفَّارَةِ الظِّهَارِ) سیفەتەکانی کەففارەتی زیهار– بە بەڵگەی ئایەتەکەی ڕابردوو– سێنە:

**سیفەتی یەکەم:** (عِتْقُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ) یەکەمجار ئازادکردنی کۆیلەیەکی موسوڵمانە (بِلاَ عَيْبٍ يُخِلُّ بِالْعَمَلِ وَالْكَسْبِ) کۆیلەکەش عەیبێکی وەهای نەبێ: کە زیان لە کارو کاسبی بدا، کەوابو: (فَيُجْزِئُ صَغِيرٌ وَأَقْرَعُ وَأَعْرَجُ) کۆیلەی بچوکو کەچەڵو شەلە دروست دەبێ، کە (يُمْكِنُهُ تِبَاعُ مَشْيٍ) شەلەکە بتوانێ بە دوایەکدا بڕوا (وَأَعْوَرُ وَأَصَمُّ وَأَخْرَسُ وَأَخْشَمُ) کۆیلەی یەکچاو و کەڕو لاڵو بۆننەکەریش دروست دەبێ، هەم (وَفَاقِدُ أَنْفِهِ وَأُذُنَيْهِ وَأَصَابِعِ رِجْلَيْهِ) کۆیلەی بێلووتو بێگوێو بێپەنجەی قاچەکانی دروست دەبێ.

(لاَ زَمِنٌ) بەڵام کۆیلەی سەقەتی لەکارکەوتوو دروست نابێ، هەم (وَلاَ فَاقِدُ رِجْلٍ) کۆیلەی یەك قاچیش دروست نابێ (أَوْ خِنْصِرٍ وَبِنْصِرٍ مِنْ يَدٍ) یان پەنجەی قلیجەو مامەلیجەی لە دەستێك نەبێ (أَوْ أُنْمُلَتَيْنِ مِنْ غَيْرِهِمَا) یان دوو سەرەپەنجەی لە یەکێك لە سێ پەنجەکانی‌تر نەبێ (قُلْتُ) ئیمامی(النواوی) دەفەرموێ (أَوْ أُنْمُلَةِ إِبْهَامٍ) یان سەرە پەنجەکەی پەنجە گەورەکەی نەبێ، بە هۆی نەبوونی‌ئەوانەش هیچی دروست نابن (وَاللهُ أَعْلَمُ) چونکە زیان لە کارکردن دەدا (وَلاَ هَرِمٌ عَاجِزٌ) هەم پیری پەککەوتووش دروست نابێ، هەم (وَمَنْ أَكْثَرُ وَقْتِهِ مَجْنُونٌ وَمَرِيضٌ لاَ يُرْجَى) ئەوەی زۆرینەی کاتەکەیشی شێتە، یان نەخۆشێکی بەردەوامە (فَإِنْ بَرَأَ بَانَ الإِجْزَاءُ فِي الأَصَحِّ) ئەگەر نەخۆشە بەردەوامەکە لە دوای ئازادکردن چاك بۆوە، ئەو کاتە ئاشکرا دەبێ: کە دروست بووە.

(وَلاَ يُجْزِئُ شِرَاءُ قَرِيبٍ بِنِيَّةِ كَفَّارَةٍ) دروست نابێ کوڕەکانو باوکەکانی بکڕێ بە نیەتی کەففارەت، چونکە بە خودی کڕینەکە ئەوانە ئازاد دەبن (وَلاَ أُمِّ وَلَدٍ وَذِي كِتَابَةٍ صَحِيحَةٍ) هەم دروست نابێ دایکەمنداڵەکەیو نوسراوپێدراوەکەیشی لە کەففارەت ئازاد بکا، بەڵام (وَيُجْزِئُ مُدَبَّرٌ وَمُعَلَّقٌ بِصِفَةٍ) دروست دەبێ ئەو کۆیلەیە ئازاد بکا: کە ئازادکردنەکەی بە مردنی گەورەکەی، یان بە سیفەتێکی‌ترەوە هەڵواسراوە (فَإِنْ أَرَادَ جَعْلَ الْعِتْقِ الْمُعَلَّقِ كَفَّارَةً) جا ئەگەر ویستی ئازادکردنە هەڵواسراوەکەی بە هەڵواسراوی بکاتە کەففارەت، ئەوە (لَمْ يُجْزِ) دروست نیە، بەڵام (وَلَهُ تَعْلِيقُ عِتْقِ الْكَفَّارَةِ بِصِفَةٍ) بۆی دروستە ئازادکردنی کەففارەتەکە

وَإِعْتَاقُ عَبْدَيْهِ عَنْ كَفَّارَتَيْهِ عَنْ كُلٍّ نِصْفُ ذَا وَنِصْفُ ذَا، وَلَوْ أَعْتَقَ مُعْسِرٌ نِصْفَيْنِ عَنْ كَفَّارَةٍ فَالأَصَحُّ الإِجْزَاءُ إِنْ كَانَ بَاقِيهِمَا حُرًّا، وَلَوْ أَعْتَقَ بِعِوَضٍ لَمْ يَجْزْ عَـــنْ كَفَّـــارَةٍ، وَالإِعْتَاقُ بِمَالٍ كَطَلاَقٍ بِهِ، فَلَوْ قَالَ أَعْتِقْ أُمَّ وَلَدِكَ عَلَى أَلْفٍ فَأَعْتَقَ نَفَذَ وَلَزِمَهُ الْعِوَضُ، وَكَذَا لَوْ قَالَ أَعْتِقْ عَبْدَكَ عَلَى كَذَا فَأَعْتَقَ فِي الأَصَحِّ، وَإِنْ قَالَ أَعْتِقْهُ عَنِّـــي عَلَى كَـــذَا فَفَعَلَ عَتَقَ عَنِ الطَّالِبِ وَعَلَيْهِ الْعِوَضُ، وَالأَصَحُّ أَنَّهُ يَمْلِكُهُ عَقِبَ لَفْظِ الإِعْتَاقِ ثُمَّ يَعْتِقُ عَلَيْهِ، وَمَنْ مَلَكَ عَبْدًا أَوْ ثَمَنَهُ فَاضِلاً عَنْ كِفَايَةِ نَفْسِهِ وَعِيَالِهِ نَفَقَةً وَكِسْـــوَةً وَسُـــكْنَى وَأَثَاثًا لاَ بُدَّ مِنْهُ

---

به سیفەتێکەوە هەڵبواسێ: وەك هەر کاتێك چویە ناو خانووەکە تۆ لە بـری کەففارەتەکـەم ئازاد بی. ئەوە هەرکاتێك چووە خانووەکە لە بری کەففارەتەکەی ئازاد دەبێ.

(وَإِعْتَاقُ عَبْدَيْهِ عَنْ كَفَّارَتَيْهِ) هەم بۆی دروستە دوو کۆیلەی خۆی لـە بـری دوو کەففارەتـەکانی ئازاد بکا: (عَنْ كُلٍّ نِصْفُ ذَا وَنِصْفُ ذَا) لە بری هەر کەففارەتێك نیوەی ئەو کۆیلەیـەو نیـوەی ئەو کۆیلەیە (وَلَوْ أَعْتَقَ مُعْسِرٌ نِصْفَيْنِ عَنْ كَفَّارَةٍ) ئەگەر نەبوویەك دوو نیوەی لە دوو کۆیلەی لـە بری کەففارەتێك ئازاد کردن (فَالأَصَحُّ الإِجْزَاءُ إِنْ كَانَ بَاقِيهِمَا حُرًّا) بـە فـەرموودەی ڕاسـتتر: دروست دەبێ ئەگەر نیوەکەیتریشیان ئازاد بێ (وَلَوْ أَعْتَقَ بِعِوَضٍ لَمْ يَجُزْ عَنْ كَفَّارَةٍ) ئەگـەر کۆیلەکەی بە پارە ئازاد کرد بە بەر کەففارەت ناکەوێ.

(وَالإِعْتَاقُ بِمَالٍ كَطَلاَقٍ بِهِ) ئازادکردن بە ماڵ وەك تەلاقدان بە ماڵە، کەوابو: (فَلَوْ قَالَ أَعْتِـقْ أُمَّ وَلَدِكَ عَلَى أَلْفٍ) ئەگەر گوتی دایکەمنداڵەکەت لە سەر هەزار دینار ئازاد بکـە (فَـأَعْتَقَ) ئـەویش ئازادی کرد (نَفَذَ وَلَزِمَهُ الْعِوَضُ) ئازادکردنەکە جێبـەجێ دەبـێو هەزارەکـەش دەکەوێتـە سـەر داواکارەکە (وَكَذَا لَوْ قَـالَ أَعْتِـقْ عَبْـدَكَ عَلَـى كَذَا) هـەروەها ئەگـەر بڵـێ: کۆیلەکـەت لـە سـەر ئەوەندە ئازاد بکە (فَأَعْتَقَ فِي الأَصَحِّ) ئەویش ئازادی کرد، ئەو کاتەش ئازادکردنەکە جێبـەجێ دەبێو هەزارەکەش دەکەوێتەسەر داواکارەکە (وَإِنْ قَالَ أَعْتِقْـهُ عَنِّـي عَلَـى كَذَا) ئەگـەر گـوتی کۆیلەکەت لە بری من لە سەر ئەوەندە پارەیە ئازاد بکە. مەبەستیشی لە بری کەففارەتەکـەی خۆی بوو (فَفَعَلَ) خاوەنەکەش ئازادی کرد، ئەوە (عَتَقَ عَنِ الطَّالِبِ وَعَلَيْهِ الْعِوَضُ) لە بـری داوا کارەکە ئازاد دەبێو بە بەر کەففارەتەکەشی دەکەوێو نرخـە ناوبراوەکەشـی لـە سـەر واجـب دەبێ بۆ خاوەنەکە، چونکە (وَالأَصَحُّ أَنَّهُ يَمْلِكُهُ عَقِبَ لَفْظِ الإِعْتَـاقِ) بـە فـەرموودەی ڕاسـتتر: داواکارەکە دەبێتەخاوەنی کۆیلەکـە لـە دوای ووشـەی ئـازادکردن (ثُـمَّ يَعْتِـقُ عَلَيْـهِ) ئینجـا لـە سەری ئازاد دەبێ.

(وَمَنْ مَلَكَ عَبْدًا أَوْ ثَمَنَهُ) هەر کەسێك کۆیلەیەکی هەبوو، یـان پـارەی کۆیلەیـەکی هـەبوو: کە (فَاضِلاً عَنْ كِفَايَةِ نَفْسِهِ وَعِيَالِهِ نَفَقَةً وَكِسْوَةً وَسُكْنَى وَأَثَاثًا لاَبُدَّ مِنْهُ) زیاد بوو لە بەشـی بەخێوکردنی خۆیو ژنو منداڵەکانی: لە ڕووی بژێو و بـەرگو نیشـتەجێبوونو کەلوپـەلی

لَزِمَهُ الْعِتْقُ، وَلاَ يَجِبُ بَيْعُ ضَيْعَةٍ وَرَأْسِ مَالٍ لاَ يَفْضُلُ دَخْلُهُمَا عَنْ كِفَايَتِه، وَلاَ مَسْكَنٍ وَعَبْدٍ نَفِيسَيْنِ أَلِفَهُمَا فِي الأَصَحِّ، وَلاَ شِرَاءٌ بِغَبْنٍ، وَأَظْهَرُ الأَقْوَالِ اعْتِبَارُ الْيَسَارِ بِوَقْتِ الأَدَاءِ. فَإِنْ عَجَزَ عَنْ عِتْقٍ صَامَ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ بِالْهِلاَلِ بِنِيَّةِ كَفَّارَةٍ، وَلاَ يُشْتَرَطُ نِيَّةُ التَّتَابُعِ فِي الأَصَحِّ، فَإِنْ بَدَأَ فِي أَثْنَاءِ شَهْرٍ حُسِبَ الشَّهْرُ بَعْدَهُ بِالْهِلاَلِ وَأَتَمَّ الأَوَّلَ مِنَ الثَّالِثِ ثَلاَثِينَ،

---

پێویست، ئەوە (لَزِمَهُ الْعِتْقُ) واجبە کۆیلەیەك لە کەففارەتەکەی ئازاد بکا، بەڵام (وَلاَ يَجِبُ بَيْعُ ضَيْعَةٍ وَرَأْسِ مَالٍ لاَ يَفْضُلُ دَخْلُهُمَا عَنْ كِفَايَتِهِ) واجب نیە: باغو سەرمایەی بازرگانیی بفرۆشێ کە بەرهەمەکان لە پێویستیەکانی زیاتر نەبێ (وَلاَ مَسْكَنٍ وَعَبْدٍ نَفِيسَيْنِ أَلِفَهُمَا فِي الأَصَحِّ) هەم واجب نیە خانووە بە نرخەکەیو کۆیلە بە نرخەکەی بفرۆشێ کە لێیان ڕاهاتبێ، هەم (وَلاَ شِرَاءٌ بِغَبْنٍ) واجب نیە بە زەرەر کۆیلەکە بکڕێ (وَأَظْهَرُ الأَقْوَالِ اعْتِبَارُ الْيَسَارِ بِوَقْتِ الأَدَاءِ) بەهێزترینی فەرموودەکان: هەبوونی دەسەڵاتی کۆیلە ئازادکردن بە کاتی کەففارەتدانەکە ڕەچاو دەکرێ.

**سیفەتی دووەمی کەففارەت:** (فَإِنْ عَجَزَ عَنْ عِتْقٍ) جا ئەگەر کەففارەتدەرەکە توانای ئازادکردنی کۆیلەی نەبو (صَامَ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ) واجبە دوو مانگ بە دوای یەکتردا بەڕۆژوو بێ، بە بەڵگەی ئایاتەکە (بِالْهِلاَلِ) هەردوو مانگەکانیش بەگوێرەی دیتنی مانگی یەکشەوە بن، هەر چەند هەردووکیشیان کەممانگ بن.

ئینجا لەو دوو مانگەدا واجبە: لە گشت شەوێکدا (بِنِيَّةِ كَفَّارَةٍ) نیەت بێنێ: کە سبەینێ لە بری کەففارەتەکەی بەڕۆژوو دەبێ، بەڵام لە مەزهەبی ئیمام(مالك)دا: یەك نیەت لە شەوییەکەمدا بەسە بۆ هەردوو مانگەکان بەو مەرجەی بەدوایەکتریەکەی نەپچڕێ بە هۆی سەفەرو نەخۆشی، کەواتە: هەر کاتێك بەدوایەکتریەکەی پچڕا، ئینجا هۆی پچڕانەکەش نەما، ئەو کاتە مەرجە: نیەتێکیتر دووبارە بێنێتەوە بۆ ئەو ڕۆژووانەی ماون، هەروەك لە نیەتی ڕۆژوودا ڕوونمان کردەوە (وَلاَ يُشْتَرَطُ نِيَّةُ التَّتَابُعِ) بە مەرج دانانرێ نیەتی بەدوایەکتریدا بێنێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(فَإِنْ بَدَأَ فِي أَثْنَاءِ شَهْرٍ) جا ئەگەر لە ناو مانگێکدا دەستی بەڕۆژوو گرتن کرد، ئەوە کە ئەو مانگەی تەواو کرد (حُسِبَ الشَّهْرُ بَعْدَهُ بِالْهِلاَلِ) مانگەکەی دوای ئەم مانگە بە دیتنی مانگی یەکشەوە حیساب دەکرێ، ئینجا (وَأَتَمَّ الأَوَّلَ مِنَ الثَّالِثِ ثَلاَثِينَ) ئەوەندە ڕۆژەی لە یەکەمەکەش مابون لە مانگیسێیەم سی ڕۆژ تەواو دەکا، چونکە ناگونجێ لەو مانگەدا مانگی یەکشەوە ڕەچاو بکرێ، کەوابو: ئەگەر لە هیچ مانگێکا نەگونجا مانگی یەکشەوە ببینێ، ئەو کاتە واجبە شەست ڕۆژ بە دوای یەکتردا تەواو بکا.

وَيَزُولُ التَّتَابُعُ بِفَوَاتِ يَوْمٍ بِلاَ عُذْرٍ وَكَذَا بِمَرَضٍ فِي الْجَدِيد، لاَ بِحَيْضٍ وَكَذَا جُنُونٌ عَلَى الْمَذْهَبِ. فَإِنْ عَجَزَ عَنْ صَوْمٍ بِهَرَمٍ أَوْ مَرَضٍ -قَالَ الأَكْثَرُونَ- لاَ يُرْجَى زَوَالُهُ،

---

(وَيَزُولُ التَّتَابُعُ بِفَوَاتِ يَوْمٍ بِلاَ عُذْرٍ) بەدوایەکتریەکەی دوو مانگەکان لادەچێ‌و دەپچڕێ بە لەدەستچوونی تەنها ڕۆژوویێك بە بێ‌عوزر، هەرچەند ڕۆژووەکەی ئاخیریش بێ، یان نیەتی لە بیرچوو بێ، یان ڕەمەزان، یان جەژن بکەوێتە نێوان ڕۆژووەکان، واتە: هەر کاتێك بەدوایەکتریەکەی پچڕا، واجبە: سەرلەبنیات دەست بە دوو مانگەکان بکاتەوە.

کەوابو: ئەگەر کەففارەتدەرەکە لە ناو دوو مانگەکاندا مرد، دروست نیە یەکێکیتر لە سەر ڕابردووی ئەویەوە دوو مانگەکانی بۆ تەواو بکا، بەڵکو: یان دەبێ لە میراتەکەی هەموو کەففارەتەکەی بۆ بدرێ، یان سەرلەبنیات یەکێکیتر دوو مانگەکانی لەجیاتی بەڕۆژوو ببێ، بەڵام ئەو کەسەی لەجیاتیمردووەکە دوو مانگەکانی کەففارەت بەڕۆژوو دەبێ، لە سەر وی واجب نیە بەدوایەکتریدا بێ، هەروەك لە (الشبراملسي)و (الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَكَذَا) هەروەها ئەگەر لە دەستچونی ڕۆژووەکە بە عوزریش بێ: وەك (بِمَرَضٍ) بە هۆی نەخۆشی بەڕۆژوو نەبوبێ (فِي الْجَدِيدِ) لە فەرموودەی نوێدا، بەڵام لە فەرموودەی کۆندا: بەڕۆژوو نەبونی بە هۆی نەخۆشی بەدوایەکتریەکە ناپچڕێنێ، هەروەك لە (نهایة)و (مغني)دا فەرموویانە.

(لاَ بِحَيْضٍ) بەڵام بە هۆی حەیزو نیفاس بەدوایەکتریەکە ناپچڕێ؟ وەك ئافرەتێك لە کەففارەتی کوشتنێك بەڕۆژوو ببێ (وَكَذَا جُنُونٌ عَلَى الْمَذْهَبِ) هەروەها شێتبوونیش بەدوایەکتریەکە ناپچڕێنێ، لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب، کەواتە: هەر کاتێك حەیزو زەیسانیو شێتی نەمان، ئەوەندەی لە دوو مانگەکان ماوە، لە سەر ڕابردووەکەی تەواوی دەکا.

﴿ ئاگاداری ﴾: لە مەزهەبی ئیمام(أحمد)دا: ئەگەر مانگی ڕەمەزان بکەوێتە نێوان دوو مانگەکە، یان بە هۆی جەژن، یان بە هۆی حەیزو نیفاس، یان بە هۆی نەخۆشیەکی بە ترس، یان بە هۆی شێتی بەڕۆژوو نەبو، ئەوانە هیچیان بەدوایەکتریەکە ناپچڕێنن، کەواتە: هەر کاتێك ڕەمەزانو هۆیەکانیتر نەمان، ئەوەندەی لە دوو مانگەکان ماوە لە سەر ڕابردوو تەواوی دەکا، هەروەك لە (شرح المُقْنِع)دا ڕوون کراوەتەوە، کەوابو: دروستە کەففارەتدەرەکە خۆی (تَقْلِيد) بکا.

**سیفەتی سێیەمی کەففارەت**: (فَإِنْ عَجَزَ عَنْ صَوْمٍ) ئەگەر کەففارەتدەرەکە توانای بەڕۆژووبوونی نەبو: (بِهَرَمٍ أَوْ مَرَضٍ -قَالَ الأَكْثَرُونَ- لاَ يُرْجَى زَوَالُهُ) بە هۆی پیری، یان نەخۆشیەکی ئەوها کە ئومێدی چاکبوونەوەی نەبێ -وەك زۆریەیزانایان فەرموویانە-، یان

أَوْ لَحِقَهُ بِالصَّوْمِ مَشَقَّــةٌ شَدِيدَةٌ، أَوْ خَافَ زِيَادَةَ مَرَضٍ كَفَّرَ بِإِطْعَامِ سِتِّينَ مِسْــكِينًا أَوْ فَقِــيرًا، لاَ كَــافِرًا وَلاَ هَاشِــمِيًّا وَمُطَّلِبِيًّــا ســتِّينَ مُــدًّا مِمَّــا يَكُــونُ فِطْــرَةً.

(كِتَابُ اللِّعَانِ)

يَسْبِقُهُ قَذْفٌ، وَصَرِيحُهُ الزِّنَا كَقَوْلِه لِرَجُلٍ أَوْ امْرَأَة:

---

دوو مانگ بەردەوام بێ– وەك كەمتریزانایان فەرموویانە– (أَوْ لَحِقَهُ بِالصَّوْمِ مَشَقَّةٌ شَدِيدَةٌ) یان بە هۆی ڕۆژوو ئازارێکی زیاتر لە عادەتی دەگەیشتێ (أَوْ خَافَ زِيَادَةَ مَرَضٍ) یان ترسا نەخۆشیەکەی زیاد ببێ، ئەو کاتە (كَفَّرَ بِإِطْعَامِ سِتِّينَ مِسْكِينًا أَوْ فَقِيرًا) لە بری کەففارەتەکەی دانەوێڵەی ساغ دەداتە شەست گەداو هەژار بە بەڵگەی ئایەتەکە.

(لاَ كَافِرًا) نابێ گەداو هەژارەکە کافر بێ، هەم (وَلاَ هَاشِمِيًّا وَمُطَّلِبِيًّا) نابێ لە نەتەوەی (هاشم)و (المطلب) بێ: کە خزمەکانی پێغەمبەرنﷺ زەکاتیشیان لێحەرامە، کەواتە: سەیدەکانیش لە (بنی هاشم)ن و کەففارەتیان لێحەرامە.

(سِتِّينَ مُدًّا) کەففارەتەکەش شەست مست دانەوێڵەیە، هەر گەدایەك، یان هەر هەژارێك یەك مستی دەداتێ (مِمَّا يَكُونُ فِطْرَةً) لەو جۆرەی بۆ سەرفیترە دەبو، واتە: دانەوێڵەی ساغ لەو جۆرەی بە ئەغلەبی خەڵکی شوێنەکە دەیخوا، نەك چێشیتان دەرخوارد بدا.

﴿ ئاگاداری ﴾: لە مەزهەبی ئیمامی(حنفي)دا ئەندازەی کەففارەت بۆ هەر گەدایەك، یان هەژارێك: نیو ساعی گەنمە، کە دەکاتە: (١٨١٥)هەزارو هەشتسەدو پانزە غرام، واتە: نزیکەی دوو کیلۆ، هەم لە مەزهەبی ئیمامی(حنفي)دا دروستە: نرخی دانەوێڵەکەش لە کەففارەت بدا، کەوابو: ئەگەر کەففارتدەرەکە خۆی (تقلید)ی ئیمامی(حنفي) بکا نرخی –نزیکەی– دوو کیلو گەنم دەداتە هەر گەدایەك، یان هەژارێك، هەروەك لە (مجمع الأنهر)دا ڕوون کراوەتەوە.

جا بزانە: ئەگەر توانای هیچ سیفەتێکی کەففارەتی نەبو، ئەوە کەففارەتەکەی هەر لە ئەستۆیدا دەمێنێ و هەرکاتێك توانای سیفەتێکی هەبو، واجبە بیکا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

﴿ كِتَابُ اللِّعَانِ: پەرتوکی لەعنەت لێککردنی ژن و مێرد ﴾

واتە: لەو حاڵەتەی مێردەکە بە ژنەکەی دەڵێ: زینات کردوە و. هیچ شاهیدیشی نیە، بەو ڕستانەی داهاتوو–کە لە قورئانی پیرۆز داندراون– لەعنەت لە یەکتری دەکەن و هەتا هەتایی لێك جیا دەبنەوە.

کەوابو: (يَسْبِقُهُ قَذْفٌ) مەرجە: لەعنەت لێککردنەکە جنێودانێکی زینای لە پێشدا بێ (وَصَرِيحُهُ) ووشەی ئاشکرای جنێودانەکە: (اَلزِّنَا) ووشەی زینایە (كَقَوْلِهِ لِرَجُلٍ أَوْ امْرَأَةٍ)

زَنَيْتَ أَوْ زَنَيْتِ أَوْ يَا زَانِي أَوْ يَا زَانِيَةُ. وَالرَّمْيُ بِإِيلَاجِ حَشَفَةٍ فِي فَرْجٍ مَعَ وَصْفِهِ بِتَحْرِيمٍ أَوْ دُبُرٍ صَرِيحَانِ، وَزَنَأْتَ فِي الْجَبَلِ كِنَايَةٌ، وَكَذَا زَنَأْتَ فَقَطْ فِي الْأَصَحِّ، وَزَنَيْتَ فِي الْجَبَلِ صَرِيحٌ فِي الْأَصَحِّ، وَقَوْلُهُ: يَا فَاجِرُ يَا فَاسِقُ. وَلَهَا: يَا خَبِيثَةُ، وَأَنْتِ تُحِبِّينَ الْخَلْوَةَ. وَلِقُرَشِيٍّ: يَا نَبَطِيُّ. وَلِزَوْجَتِهِ لَمْ أَجِدْكِ عَذْرَاءَ. كِنَايَةٌ فَإِنْ أَنْكَرَ إِرَادَةَ قَذْفٍ صُدِّقَ بِيَمِينِهِ، وَقَوْلُهُ: يَا ابْنَ الْحَلَالِ وَأَمَّا أَنَا فَلَسْتُ بِزَانٍ وَنَحْوِهِ، تَعْرِيضٌ لَيْسَ بِقَذْفٍ وَإِنْ نَوَاهُ،

---

وەك بە مەبەستی ئابڕووبردن بڵێتە پیاوێك، یان ئافرەتێك: (زَنَيْتَ أَوْ زَنَيْتِ) زینات كردوە (أَوْ) یان بڵێ: (يَا زَانِي أَوْ يَا زَانِيَةُ) هۆ زیناكەر، یان قوندەر، قونگێ، قەحپە، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

بەڵام ئەگەر مەبەستی ئابڕووبردن نەبێ، بەڵكو مەبەستی شاهیدی لە سەردان بێ، یان مەبەستی لەكارخستنی شاهیدەكە بێ، یان بڵێ: فلانكەس گوتی: زینام كردوە. ئەو كاتە نابێتە جنێودانی زینا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَالرَّمْيُ بِإِيلَاجِ حَشَفَةٍ فِي فَرْجٍ مَعَ وَصْفِهِ بِتَحْرِيمٍ أَوْ دُبُرٍ) جنێودان بە ڕستەی: سەری ئەندامەكەت بە حەرامی دەناو (فرج)ێك ناوە، یان دەناو كونی پشتەوە ناوە (صَرِيحَانِ) هەردووكیان ووشەی ئاشكران، هەروەها بە حەرامی گانت داوە، یان بە حەرامی گانت كردوە، ئەوەش ووشەی ئاشكرایە (وَزَنَأْتَ فِي الْجَبَلِ كِنَايَةٌ، وَكَذَا زَنَأْتَ فَقَطْ فِي الْأَصَحِّ) ووشەی (زَنَأْت) كە لە عەرەبیدا بە واتەی سەركەوتنە، بۆ عەرەبزمانەكان ووشەیەكی نائاشكرای جنێوی زینایە، لە فەرموودەی ڕاستتردا، بەڵام (وَزَنَيْتَ فِي الْجَبَلِ) ووشەی زینات كردوە لە چیایەكەدا (صَرِيحٌ فِي الْأَصَحِّ ) ووشەیەكی ئاشكرای جنێودانەكەیە، لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَقَوْلُهُ) پیاوكە بڵێتە پیاوێك: (يَا فَاجِرُ) هۆ بێناموس=گوناهكار (يَا فَاسِقُ) هۆ فاسق (وَلَهَا) یان بڵێتە ئافرەتێك: (يَا خَبِيثَةُ) هۆ پیسێ، هەم (وَأَنْتِ تُحِبِّينَ الْخَلْوَةَ) تۆ پێت خۆشە بە تەنها لەگەڵ پیاواندا بی (وَلِقُرَشِيٍّ) یان بڵێتە پیاوێكی قوڕەیشی: (يَا نَبَطِيُّ) هۆ جوتیاری عەجەم (وَلِزَوْجَتِهِ لَمْ أَجِدْكِ عَذْرَاءَ) یان بڵێتە ژنەكەی خۆی: لە كاتی بەزاوابوونم تۆ كچ نەبوی، ئەوانە گشتی (كِنَايَةٌ) ووشەی نائاشكرای جنێودانن، كەوابو: (فَإِنْ أَنْكَرَ إِرَادَةَ قَذْفٍ) ئەگەر جنێودەرەكە گوتی: مەبەستم جنێوی زینا نەبو. ئەوە (صُدِّقَ بِيَمِينِهِ) بە سوێندخواردن باوەڕی پێدەكرێ.

(وَقَوْلُهُ) كە بڵێتە پیاوێك (يَا ابْنَ الْحَلَالِ وَأَمَّا أَنَا فَلَسْتُ بِزَانٍ) هۆ كوڕی حەڵاڵ بەڵام من زیناكەر نیم (وَنَحْوِهِ) هەم گوتەیتری ئەوەهاش: وەك دایكی من قاحپە نیە، من نێرباز نیم، ئەوانە (تَعْرِيضٌ) پێچو پەنایەو (لَيْسَ بِقَذْفٍ وَإِنْ نَوَاهُ) جنێودانی زینا نیە، هەر چەند

وَقَوْلُهُ: زَنَيْتُ بِك. إقْرَارٌ بِزِنًا وَقَذْفٌ، وَلَوْ قَالَ لِزَوْجَتِه: يَا زَانِيَةُ. فَقَالَتْ: زَنَيْتُ بِكَ أَوْ أَنْتَ أَزْنَى مِنِّي. فَقَاذِفٌ وَكَانِيَةٌ، فَلَوْ قَالَتْ: زَنَيْتُ وَأَنْتَ أَزْنَى مِنِّي. فَمُقِــرَّةٌ وَقَاذِفَــةٌ، وَقَوْلُهُ: زَنَى فَرْجُك أَوْ ذَكَرُك. قَذْفٌ، وَالْمَذْهَبُ أَنَّ قَوْلَهُ: يَدُك وَعَيْنُك، وَلِوَلَدِه لَسْتَ مِنِّي أَوْ لَسْتَ ابْنِي. كِنَايَةٌ، وَلِوَلَدِ غَيْرِهِ: لَسْتَ ابْنَ فُلَانٍ. صَرِيحٌ إلاَّ لِمَنْفِــيٍّ بِلِعَــانٍ، وَيُحَدُّ قَاذِفُ مُحْصَنٍ،

---

نیەتی جنێودانەکەشی هەبێ (وَقَوْلُهُ) کە جنێودەرەکە بڵێتە ئافرەتێك، یان پیاوێك: (زَنَيْتُ بِكِ) زینام لەگەڵ تۆ کردوە (إقْرَارٌ بِزِنًا وَقَذْفٌ) دان پێداهێنانی زیناکردنەو هەم جنێودانی زینایە، کەواتە: سزای زیناو جنێودانەکەی هەردووك دەکەونە سەر.
ئینجا بزانە: جنێودان بە زینای ئاژەڵەکان: وەك کەرگێ. یان هێسترت گاوە. نابێتە جنێودانی زینا، بەڵام واجبە: جنێودەرەکە تەمبێ بکرێ، هەروەك لە(نهاية)و(مغني)دا فەرمویانە.
(وَلَوْ قَالَ لِزَوْجَتِهِ) ئەگەر گوتیە ژنەکەی خۆی: (يَا زَانِيَةُ) هۆ زیناکەر (فَقَالَتْ زَنَيْتُ بِكَ) ژنەکەش گوتی زینام لەگەڵ تۆ کردوە (أَوْ أَنْتَ أَزْنَى مِنِّي) تۆ لە من زیناکەرتری، ئەوە (فَقَاذِفٌ) مێردەکە بە ئاشکرایی جنێودەری زینایە بە ژنەکەیو (وَكَانِيَةٌ) ژنەکەش بە نائاشکرا جنێودەرە بە مێردەکەی، واتە: ئەگەر ژنەکە سوێند بخوا پێی باوەڕ دەکرێ کە مەبەستی جنێوی زینا نەبوە (فَلَوْ قَالَتْ) ئەگەر ژنەکە گوتی (زَنَيْتُ وَأَنْتَ أَزْنَى مِنِّي) زینام کردوەو تۆش لە من زیناکەرتری، ئەوە (فَمُقِرَّةٌ وَقَاذِفَةٌ) ژنەکە دانهێنەرە بە زیناکردنی خۆی، هەم جنێودەری زیناشە بە مێردەکەی، کەواتە: سزای زیناو جنێودانەکەی هەردووك دەکەونە سەر.
(وَقَوْلُهُ) کە جنێودەرەکە بڵێ (زَنَى فَرْجُكِ أَوْ ذَكَرُكَ) قوزت زینای کردوە، یان کێرت زینای کردوە، ئەوەش (قَذْفٌ) جنێودانی زینایە، بەڵام (وَالْمَذْهَبُ) بە فەرموودەی ڕاستی مەزهەب: (أَنَّ قَوْلَهُ يَدُك وَعَيْنُك) ئەگەر بڵێ: دەستو چاوت زینای کردوە (وَلِوَلَدِهِ) یان ئەگەر بڵێتە منداڵەکەی خۆی: (لَسْتَ مِنِّي أَوْ لَسْتَ ابْنِي) تۆ لە من نی. یان تۆ کوڕی من نی. ئەوانەش (كِنَايَةٌ) ووشەی نائاشکرای جنێودانن، واتە: دووەمو سێیەمەکە بۆ دایکیکوڕەکە بە نائاشکرایی دەبنە جنێودانی زینا.
بەڵام (وَلِوَلَدِغَيْرِهِ) ئەگەر بڵێتە منداڵی کەسێکیتر: (لَسْتَ ابْنَ فُلَانٍ) تۆ کوڕی فڵانەکەس نی. ئەوە (صَرِيحٌ) ووشەی ئاشکرای جنێودانی زینای دایکیەتی (إلاَّ لِمَنْفِيٍّ بِلِعَانٍ) تەنها ئەو منداڵە نەبێ کە بە لەعنەتکردن لە نەژاد لابردرابێ.

## ﴿ سزای جنێودانی زینا ﴾

(وَيُحَدُّ قَاذِفُ مُحْصَنٍ) جنێودەری زینا بە یەکێکیداوێنپاك، واجبە: سزا بدرێ بە لێدانی هەشتا شوڕکەدار، هەرچەند جنێوپێدراوەکەش مردوو بێ، بەو مەرجانەی لە (باسی

وَيُعَزَّرُ غَيْرُهُ، وَالْمُحْصَنُ: مُكَلَّفٌ حُرٌّ مُسْلِمٌ عَفِيفٌ عَنْ وَطْءٍ يُحَدُّ بِهِ، وَتَبْطُلُ الْعِفَّةُ بِوَطْءِ مَحْرَمٍ مَمْلُوكَةٍ عَلَى الْمَذْهَبِ، لاَ زَوْجَتِهِ فِي عِدَّةِ شُبْهَةٍ وَأَمَةِ وَلَدِهِ وَمَنْكُوحَتِهِ بِلاَ وَلِيٍّ فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ زَنَى مَقْذُوفٌ سَقَطَ الْحَدُّ، أَوْ ارْتَدَّ فَلاَ، وَمَنْ زَنَى مَرَّةً ثُمَّ صَلَحَ لَمْ يَعُدْ مُحْصَنًا، وَحَدُّ الْقَذْفِ يُورَثُ وَيَسْقُطُ بِعَفْوٍ،

---

بوختانی زینا)دا بێنو لەوێدا ئەم باسە درێژتر ڕوون دەکەینەوە، إن شاءالله تعالى، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً﴾ ئەوانەی جنێوی زینا بە ئافرەتانیداوێنپاك دەدەن، ئینجا چوار شاهیدی زینا ناهێنن، ئەوانە هەشتا شوڕکەداریان لێبدەن.

بەڵام ئەگەر مێرد جنێوی زینا بە ژنەکەی خۆی بداو لەعنەتیش بکا، ئەو کاتە سزای جنێوی ژنەکەیو پیاوە زیناکارەکەشی لە سەر لادەچێ، بەو بەڵگەی لە باسی لەعنەتدا ڕوونی دەکەینەوە، إن شاءالله تعالى.(وَيُعَزَّرُ غَيْرُهُ) ئەوەی جنێوی زینا بە یەکێك دەدا کە داوێنپاك نیە، ئەویش تەمبێ دەکرێ.

(وَالْمُحْصَنُ) داوێنپاك لە پیاو و لە ئافرەت ئەو کەسەیە: (مُكَلَّفٌ) بالغ و عاقڵ بێو (حُرٌّ) ئازاد بێو (مُسْلِمٌ) موسڵمان بێو (عَفِيفٌ عَنْ وَطْءٍ يُحَدُّ بِهِ) داوێنیخۆی پاراستبێ لە جیماعێکی وەها کە پێی سزا بدرێ، کەوابو: (وَتَبْطُلُ الْعِفَّةُ) داوێنپاکی بەتاڵ دەبێتەوە (بِوَطْءِ مَحْرَمٍ مَمْلُوكَةٍ) بە جیماعکردن لەگەڵ (جاریە)کیخۆی کە مەحرەمیەتی (عَلَى الْمَذْهَبِ) لە سەر فەرمودەی ڕاستی مەزهەب (لاَ زَوْجَتِهِ فِي عِدَّةِ شُبْهَةٍ) بەڵام بە جیماعکردن لەگەڵ ژنیخۆی لە(عدّة)ی شوبهەداو هەم (وَأَمَةِ وَلَدِهِ) بە جیماعکردن لەگەڵ جاریەی کوڕی خۆیو هەم (وَمَنْكُوحَتِهِ بِلاَ وَلِيٍّ) بە جیماعکردن لەگەڵ مارەبڕاوەکەیخۆی بە بێسەرپەرشتکار، داوێنپاکیەکەی بەتاڵ نابێتەوە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَلَوْ زَنَى مَقْذُوفٌ) ئەگەر پێش سزادانیجنێودەرەکە جنێوپێدراوەکە زینای کرد (سَقَطَ الْحَدُّ) سزایەکە لە سەر جنێودەرەکە لادەچێ (أَوْ ارْتَدَّ) یان ئەگەر جنێوپێدراوەکە بووە کافر (فَلاَ) سزایەکە لە سەر جنێودەرەکەی لاناچێ.

(وَمَنْ زَنَى مَرَّةً) هەر کەسێك یەك جار زینای کردبێ (ثُمَّ صَلَحَ) ئینجا تۆبەی کردبێو بوبێتە پیاوێکی چاك (لَمْ يَعُدْ مُحْصَنًا) هەتا هەتایی لە دونیادا نابێتەوە داوێنپاك، جوێندەرەکەشی سزا نادرێ، بەڵکو تەمبێ دەکرێ، بەڵام لە بارەی ڕۆژی قیامەت بە تۆبەکردن گوناهەکەی لە سەر لادەچێ، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.

(وَحَدُّ الْقَذْفِ يُورَثُ) سزای جنێودانیزینا بە میرات دەگیرێو هەم (وَيَسْقُطُ بِعَفْوٍ) بە لێبوردن سزایەکە لە سەر جنێودەرەکە لادەچێ، بەڵام بە جنێوپێدانەوە لاناچێ، واتە: ئەگەر دوو

وَالأَصَحُّ أَنَّهُ يَرِثُهُ كُلُّ الْوَرَثَةِ، وَأَنَّهُ لَوْ عَفَا بَعْضُهُمْ فَلِلْبَاقِينَ كُلُّهُ.
(فَصْلٌ) لَهُ قَذْفُ زَوْجَةٍ عَلِمَ زِنَاهَا أَوْ ظَنَّهُ ظَنًّا مُؤَكَّدًا كَشَيَاعِ زِنَاهَا بِزَيْدٍ مَعَ قَرِينَةٍ: بِأَنْ رَآهُمَا فِي خَلْوَةٍ، وَلَوْ أَتَتْ بِوَلَدٍ وَعَلِمَ أَنَّهُ لَيْسَ مِنْهُ لَزِمَهُ نَفْيُهُ،

---

کەس جنێوی زینا بە یەکتری بدەن، ئەوە نابێتە تۆڵە سەندنەوە، ئەگەر لە یەکتری نەبورن سزایەکە لە سەر هیچێکیان لاناچێ، هەروەك لە (الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە.
(وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر: (أَنَّهُ يَرِثُهُ كُلُّ الْوَرَثَةِ) گشت میراتگرەکان هەموو سزایەکە بە میرات دەگرن، جیاوازی نیە مردووەکە: لە حاڵەتیمردندا جنێوی زینای پێدرابێ، یان لە زیندوویی‌دا ئینجا مردبێ، هەروەك لە (ابن قاسم)دا فەرموویەتی.
(وَأَنَّهُ) هەر بە فەرموودەیڕاستتر (لَوْ عَفَا بَعْضُهُمْ) ئەگەر میراتگرێك، یان زیاتر جنێودەرەکەی عەفوکرد، ئەوە (فَلِلْبَاقِينَ كُلُّهُ) میراتگرەکانیتر مافی هەموو سزایەکەیان هەیەو هەشتا دارەکەی بە تەواوی لێدەدرێ، کەوابو: گشت میراتگرێك مافی هەیە بە تەنها داوای سزادانی جنێودەرەکە بکا، هەر چەند ئەوانیتریش ڕازی نەبن، یان ئامادە نەبن، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی لەعنەتکردن بۆ لادانی منداڵەکە لە نەژادی خۆی ﴾

(لَهُ) بۆ مێردەکە دروستە (قَذْفُ زَوْجَةٍ عَلِمَ زِنَاهَا) جنێوی زینا بەو ژنەی بدا: کە بزانێ زینای کردوە (أَوْ ظَنَّهُ ظَنًّا مُؤَكَّدًا) یان بە گومانێکی بەهێز گومانی بۆ زیناکردنەکەی بچێ (كَشَيَاعِ زِنَاهَا بِزَيْدٍ) وەك لە ناو خەڵکدا بڵاو ببێتەوە: کە لەگەڵ فلانکەس زینای کردوە (مَعَ قَرِينَةٍ) نیشانەیەکی ڕاستیش هەبێ: (بِأَنْ رَآهُمَا فِي خَلْوَةٍ) وەك فلانکەسەکەو ژنەکەی لە شوێنێکی تەنهادا لەگەڵ یەکتریدا دیتبن، بەڵام وا باشترە ئەو عەیبە لە سەر ژنەکەی داپۆشێو ئەگەر دڵیشی لە سەر لاچوبێ با تەڵاقی بدا، بەو مەرجەی بە هۆی تەڵاقدانەکە خراپەو بێشەرعی ڕونەدا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.
جا ئەوەیڕابردووش لە حاڵەتێکدا بوو: کە ژنەکە منداڵی لەو زینایە نەبوبێ، چونکە (وَلَوْ أَتَتْ بِوَلَدٍ) ئەگەر ژنەکە منداڵێکی لێبو، یان ئاوس بوو (وَعَلِمَ أَنَّهُ لَيْسَ مِنْهُ) مێردەکەش زانی ئەو منداڵە لەوی نیە، یان گومانێکی بەهێزی هەبوو، ئەو کاتە (لَزِمَهُ نَفْيُهُ) لە سەری واجبە: منداڵەکە لە نەژادیخۆی لاباو بڵێ: ئەم منداڵە لە من نیە. چونکە ئەگەر بێدەنگ بێ، ئەوە بە بڕیاری سەرجێیی منداڵەکە دەبێتە منداڵیخۆی بە بەڵگەی حەدیسەکەی داهاتوو، ئەوەش لە گوناهە گەورەکانە: کە منداڵێك هی خۆی نەبێو بیکاتە منداڵی خۆی، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانەو لە (باسی دانپێداهێنانو منداڵیفڕێدراو)دا ڕوونمان کردەوە.

وَإِنَّمَا يَعْلَمُ إِذَا لَمْ يَطَأْ أَوْ وَلَدَتْهُ لِدُونِ سِتَّةِ أَشْهُرٍ مِنَ الْوَطْءِ أَوْ فَوْقَ أَرْبَعِ سِنِينَ، فَلَوْ وَلَدَتْهُ لِمَا بَيْنَهُمَا وَلَمْ يَسْتَبْرِئْ بِحَيْضَةٍ حَرُمَ النَّفْيُ، وَإِنْ وَلَدَتْهُ لِفَوْقِ سِتَّةِ أَشْهُرٍ مِنَ الإِسْتِبْرَاءِ حَلَّ النَّفْيُ فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ وَطِئَ وَعَزَلَ حَرُمَ عَلَى الصَّحِيحِ، وَلَوْ عَلِمَ زِنَاهَا وَاحْتَمَلَ كَوْنُ الْوَلَدِ مِنْهُ

---

(وَإِنَّمَا يَعْلَمُ) جا تەنها بەوە دەزانێ منداڵەکە لە خۆی نیە: (إِذَا لَمْ يَطَأْ) کە هیچ کاتێك جیماعی لەگەڵ ژنەکەی نەکردبێ‌و (مَنِي)ی خۆیشی دەناو ژنەکەی نەکرابێ- بگەڕێوە بۆ باسی منداڵی‌بیژی- (أَوْ) یان جیماعی لەگەڵ کردبێ، بەڵام (وَلَدَتْهُ لِدُونِ سِتَّةِ أَشْهُرٍ مِنَ الْوَطْءِ) لە جیماعکردنەوە بە ماوەی کەمتر لە شەش مانگ منداڵێکی تەواوی لێبو (أَوْ فَوْقَ أَرْبَعِ سِنِينَ) یان بە زیاتر لە چوار ساڵ لە جیماعکردنەوە، کەوابو: (فَلَوْ وَلَدَتْهُ لِمَا بَيْنَهُمَا) ئەگەر لە جیماعکردنەوە لە نێوان شەش مانگو چوار ساڵدا منداڵەکەی لێبو (وَلَمْ يَسْتَبْرِئْ بِحَيْضَةٍ) لە دوای جیماعکردنەکەش ژنەکە حەیزێکی نەدیتبو، ئەو کاتە (حَرُمَ النَّفْيُ) حەرامە منداڵەکە لە نەژادی خۆی لابدا، بەڵام (وَإِنْ وَلَدَتْهُ لِفَوْقِ سِتَّةِ أَشْهُرٍ مِنَ الإِسْتِبْرَاءِ) ئەگەر لە سەرەتای حەیزەکەوە لە ماوەی زیاتر لە شەش مانگ منداڵەکەی لێبو، ئەو کاتە (حَلَّ النَّفْيُ فِي الأَصَحِّ) حەڵاڵە لە نەژادی خۆی لایبدا، لە فەرموودەی ڕاسترتردا.

(وَلَوْ وَطِئَ وَعَزَلَ) ئەگەر جیماعی لەگەڵ ژنەکەی کردبو، بەڵام لە کاتی ڕەحەتبوون لێی دەرهێناو ئاوەکەی لە دەرەوە ڕژاند، ئەوە (حَرُمَ عَلَى الصَّحِيحِ) حەرامە منداڵەکە لە نەژادی خۆی لابدا، لە سەر فەرموودەی ڕاست، ئەوەك بێئاگاداری خۆی دڵۆپە ئاوێك ڕژابێتە ناو دامێنی ژنەکە.

﴿ئاگاداری﴾: پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿اَلْوَلَدُ لِلْفِرَاشِ وَلِلْعَاهِرِ الْحَجَرُ﴾ رواه الشيخان، منداڵ بۆ ئەو پیاوەیە کە بە حەڵاڵی سەرجێیی ژنەکەی کردوە، بۆ زیناکەرەکەش سەرشۆڕی‌و سزای زینا داندراوە.

جا بزانە: ژنەکە بەوە دەبێتە سەرجێیی مێردەکەی: کە (مَنِي)ی مێردەکەی دەناو دامێنی کرابێ، یان بکونجێ جیماعی لەگەڵ کردبێ: وەك لە شوێنێکی بە تەنهادا وێکڕا کۆ بوبنەوە، واتە: ئەگەر لە دوای ئەو کۆبوونەوە بە تەنهایە بە ماوەیەکی وەها منداڵێکی لێبو کە دەگونجا لە مێردەکەی بێ، ئەو منداڵە دەبێتە منداڵی مێردەکەی، هەروەك لە (مغنى) لە (باسی دڵنیاییکردنی جاریە)دا فەرموویەتی.

جا ئەگەر ژنەکە زینای کردبو، مێردەکەش دەیزانی منداڵەکە لە خۆی نیە، ئەو کاتە واجبە: بڕیاری سەرجێییەکە هەڵبوەشێنێتەوەو منداڵەکە لە نەژادیخۆی لابدا، هەروەك ڕابرا، بەڵام (وَلَوْ عَلِمَ زِنَاهَا) ئەگەر مێردەکە زانی ژنەکەی زینای کردوەو (وَاحْتَمَلَ كَوْنُ الْوَلَدِ مِنْهُ

وَمِـــنَ الزِّنَـــا حَـــرُمَ النَّفْـــيُ، وَكَذَاالْقَـــذْفُ وَاللِّعَـــانُ عَلَىالصَّـــحِيحِ.
(فَصْلٌ) اَللِّعَانُ قَوْلُهُ أَرْبَعَ مَرَّاتٍ: أَشْهَدُ بِاللهِ إِنِّي لَمِنَ الصَّادِقِينَ فِيمَا رَمَيْتُ بِهِ هَذِهِ مِـنَ الزِّنَا. فَإِنْ غَابَتْ سَمَّاهَا وَرَفَعَ نَسَبَهَا بِمَا يُمَيِّزُهَا، وَالْخَامِسَةَ: أَنَّ لَعْنَةَ اللهِ عَلَيْهِ إِنْ كَانَ مِنَ الْكَاذِبِينَ فِيمَا رَمَاهَا بِهِ مِنَ الزِّنَا. وَإِنْ كَانَ وَلَدٌ يَنْفِيهِ ذَكَرَهُ فِيالْكَلِمَاتِ فَقَالَ: وَإِنَّ الْوَلَدَالَّذِي وَلَدَتْهُ أَوْ هَذَاالْوَلَدَ مِنْ زِنًا لَيْسَ مِنِّي.

---

(وَمِنَ الزِّنَا) دەشكونجا منداڵەكە لە خۆی بێو دەشكونجا لـە زینـا بـێ، ئـەو كاتـەش (حَرُمَ النَّفْيُ) حەرامە منداڵەكە لە نەژادیخۆی لاببا، چونكە بـە بڕیـاری سـەرجێیی منداڵەكە هـی خۆیەتی، بە بەڵگەی حەدیسەكەیڕابردوو.

(وكَذَا الْقَذْفُ وَاللِّعَانُ) هەروەها جنێوی زیناو لەعنەت لێكردنیش حەرامـە (عَلَىالصَّحِيحِ) لـە سەر فەرموودەی ڕاست، چونكە منداڵەكە بووەتە منداڵی خۆیو دەشتوانێ بـە تەڵاقـدان لـە ژنەكەی جیاببێتەوە.

**﴿ فَصْلٌ: لە باسی چۆنیەتی لەعنەت لێككردنی ژن و مێرد ﴾**

(اَللِّعَانُ) لەعنەت لێككردنی زینا (قَوْلُهُ أَرْبَعَ مَرَّاتٍ) ئەوەیە مێردەكە چوار جار بڵێ: (أَشْهَدُ بِاللهِ إِنِّي لَمِنَ الصَّادِقِينَ فِيمَا رَمَيْتُ بِهِ هَذِهِ مِنَ الزِّنَا) شاهیدی ئەدەم سوێندم بە خوا: مـن ڕاستكۆم لەو جنێوەدا كە بەم ژنەی خۆم گوت زینات كردوە.

(فَإِنْ غَابَتْ) جا ئەگەر ژنەكە لە دانیشگەی لەعنەتكردنەكەدا نەبو، ئەو كاتە (سَمَّاهَا وَرَفَعَ نَسَبَهَا بِمَا يُمَيِّزُهَـا) ناوەكـەی دەڵـێو نەژادیشـی بـەرز دەكاتـەوە بـە جـۆرێكی وەهـا: لـە ژنێكیتر جیای بكاتەوە (وَالْخَامِسَةُ) هەم جاری پێنجەمیش بڵێ (أَنَّ لَعْنَةَ اللهِ عَلَيْهِ إِنْ كَـانَ مِنَ الْكَاذِبِينَ فِيمَا رَمَاهَا بِهِ مِنَ الزِّنَا) لەعنەتی خوام لە سەر بێ ئەگـەر مـن درۆزن بم لـەو جنێوەدا كە بەم ژنەی خۆم گوت زینات كردوە.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ شُهَدَاءُ إِلاَّ أَنْفُسُهُمْ فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَادَاتٍ بِاللهِ إِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ، وَالْخَامِسَةُ أَنَّ لَعْنَتَ اللهِ عَلَيْـهِ إِنْ كَـانَ مِـنَ الْكَاذِبِينَ﴾ ئەو پیاوانەی ئابڕووی ژنەكانیان دەبەنو پێیان دەڵـێن زینـات كـردوەو جگـە لـە خۆیان شاهیدیان نەبو، با پیاوەكە چوار جار بە خۆی شاهیدی بە خوا بـدا: كـە ڕاسـتكۆیە، جاری پێنجەمیش بڵێ: لەعنەتی خوام لە سەر بێ ئەگەر درۆزن بم.

(وَإِنْ كَانَ وَلَدٌ يَنْفِيهِ) ئەگەر لەو حاڵەتەشدا منـداڵێكی وەهـا هـەبو: كـە لـە نـەژادی خـۆی لایدەبرد، ئەوە (ذَكَرَهُ فِيالْكَلِمَاتِ) لە هەر پێنج شاهیدیەكاندا مێردەكە باسی منداڵەكەش دەكا (فَقَالَ) لە دوای تەواوبوونی گشت جارێك دەڵێ: (وَإِنَّ الْوَلَدَ الَّذِي وَلَدَتْهُ، أَوْ هَذَا الْوَلَـدَ مِنْ زِنًا لَيْسَ مِنِّي) ئەو منداڵەی ژنەكە بووەتی، یان ئەم منداڵە لە زینایەو لە من نیە.

وَتَقُولُ هِيَ: أَشْهَدُ بِاللهِ إِنَّهُ لَمِنَ الْكَاذِبِينَ فِيمَا رَمَانِي بِهِ مِنَ الزِّنَا. وَالْخَامِسَةُ: أَنَّ غَضَبَ اللهِ عَلَيْهَا إِنْ كَانَ مِنَ الصَّادِقِينَ فِيهِ. وَلَوْ بُدِّلَ لَفْظُ شَهَادَةٍ بِحَلِفٍ وَنَحْوِهِ أَوْ غَضَبٍ بِلَعْنٍ وَعَكْسِهِ أَوْ ذُكِرَا قَبْلَ تَمَامِ الشَّهَادَاتِ لَمْ يَصِحَّ فِي الأَصَحِّ، وَيُشْتَرَطُ فِيهِ أَمْرُ الْقَاضِي وَيُلَقِّنُ كَلِمَاتِهِ، وَأَنْ يَتَأَخَّرَ لِعَانُهَا عَنْ لِعَانِهِ، وَيُلاَعِنُ أَخْرَسُ بِإِشَارَةٍ مُفْهِمَةٍ أَوْ كِتَابَةٍ، وَيَصِحُّ بِالْعَجَمِيَّةِ، وَفِيمَنْ عَرَفَ الْعَرَبِيَّةَ وَجْهٌ،

---

(وَ) له دوای تەواوبوونی لەعنەتی مێردەکە (تَقُولُ هِيَ) ژنەکە دەڵێ: (أَشْهَدُ بِاللهِ إِنَّهُ لَمِنَ الْكَاذِبِينَ فِيمَا رَمَانِي بِهِ مِنَ الزِّنَا) شاهیدی ئەدەم سوێندم بە خوا: مێردەکەم -کە فلانکەسە- درۆزنە لەو جنێوەدا کە بە منی گوت زینات کردوە. (وَالْخَامِسَةُ) هەم جاری پێنجەمیش دەڵێ (أَنَّ غَضَبَ اللهِ عَلَيْهَا إِنْ كَانَ مِنَ الصَّادِقِينَ فِيهِ) غەزەبی خوام لە سەر بێ ئەگەر مێردەکەم ڕاستگۆ بێ لەو جنێوەدا کە بە منی گوت زینات کردوە.
خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَيَدْرَؤُا عَنْهَا الْعَذَابَ أَنْ تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللهِ إِنَّهُ لَمِنَ الْكَاذِبِينَ، وَالْخَامِسَةَ أَنَّ غَضَبَ اللهِ عَلَيْهَا إِنْ كَانَ مِنَ الصَّادِقِينَ﴾ سزای زینا لە سەر ژنەکە لادەدا کە چوار جار شاهیدی بە خوا بدا: کە مێردەکەی درۆزنە لەو جنێوەدا، جاری پێنجەمیش بڵێ: غەزەبی خوام لە سەر بێ ئەگەر مێردەکەم ڕاستگۆ بێ لەو جنێوەدا.
(وَلَوْ بُدِّلَ لَفْظُ شَهَادَةٍ بِحَلِفٍ وَنَحْوِهِ) ئەگەر ووشەی شایەدی دەدەم، بگۆڕدرێ بە ووشەی سوێند دەخۆم بە خوا (أَوْ غَضَبٍ بِلَعْنٍ) یان ووشەی غەزەبی خوام لە سەر بێ، بگۆڕدرێ بە ووشەی لەعنەتم لە سەر بێ (وَعَكْسِهِ) یان پێچەوانەکەی بە پێچەوانەکەی بگۆڕدرێ (أَوْ ذُكِرَا قَبْلَ تَمَامِ الشَّهَادَاتِ) یان ووشەی لەعنەتی پیاوەکەو غەزەبی ژنەکە پێش تەواوبوونی چوار جارەکانیان گوترا، ئەوە (لَمْ يَصِحَّ فِي الأَصَحِّ) ڕستەی لەعنەت لێککردنەکە دروست نابێ، لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە لە قورئاندا بەم ووشانە هاتوە.
(وَيُشْتَرَطُ فِيهِ أَمْرُ الْقَاضِي) بە مەرج دادەندرێ لە دروستبوونی لەعنەت لێککردندا: قازی، یان جێگری قازی فەرمان بە گوتنی لەعنەتەکان بکا، هەم (وَيُلَقِّنُ كَلِمَاتِهِ) هەر ئەویش ووشەکانی لەعنەت بە ژنەکەو بە مێردەکە بڵێ، هەم هەر پێنج جارەکەش بە تەواوی بە دوایەکتردا بن، هەم (وَأَنْ يَتَأَخَّرَ لِعَانُهَا عَنْ لِعَانِهِ) لەعنەتکردنی ژنەکە لە دوای لەعنەتکردنی مێردەکە بێ.
(وَيُلاَعِنُ أَخْرَسُ بِإِشَارَةٍ مُفْهِمَةٍ أَوْ كِتَابَةٍ) ئەوەی لاڵە بە ئاماژەکردنێکی تێگەیەنەر، یان بە نووسین لە عنەتەکە دەکا، هەم (وَيَصِحُّ بِالْعَجَمِيَّةِ) بە زمانێکیتری جگە لە عەرەبیش لەعنەتکردنەکە دروست دەبێ (وَفِيمَنْ عَرَفَ الْعَرَبِيَّةَ وَجْهٌ) لەبارەی کەسێك کە عەرەبی بزانێ، فەرموودەیەکی بێهێز هەیە: کە بۆ وی دروست نەبێ.

وَيُغَلَّظُ بِزَمَان وَهُوَ بَعْدَ عَصْرِجُمُعَة، وَمَكَان وَهُوَ أَشْرَفُ بَلَده: فَبِمَكَّةَ بَيْنَ الرُّكْنِ وَالْمَقَامِ، وَالْمَدِينَة عِنْدَالْمِنبَر، وَبَيْت الْمَقدسِ عِنْدَالصَّخْرَة، وَغَيْرهَا عِنْدَ مِنبَرِالْجَامِعِ، وَحَائِضٌ بِبَابِ الْمَسْجِد، وَذِمِّيٌّ فِي بِيعَة وَكَنِيسَة، وَكَذَا بَيْتُ نَار مَجُوسِيٍّ فِيالأَصَحِّ، لاَ بَيْتُ أَصْنَامِ وَثَنِيٍّ، وَجَمْعٍ أَقَلُّهُ أَرْبَعَةٌ، وَالتَّغْلِيظَاتُ سُنَّةٌ لاَ فَرْضٌ عَلَىالْمَذْهَبِ، وَيُسَنُّ لِلْقَاضِي وَعْظُهُمَا وَيُبَالِغُ عِنْدَالْخَامِسَة،

---

(وَيُغَلَّظُ بِزَمَانٍ) لەعنەت لێککردنەکە ئەستوور دەکرێ بە کاتی لەعنەتەکە: (وَهُوَ بَعْدَ عَصْرِ جُمُعَةٍ) کاتەکەش لە دوای عەسری ڕۆژی هەینی یە، جا ئەگەر داواکردنی لەعنەتەکە بە پەلە بوو، ئەو کاتە لە دوای عەسری هەر ڕۆژێکی بگونجێ، چونکە سوێندی بە درۆ لە دوای عەسر سزایەکەی ئەستورترە، هەروەك لە حەدیسی(بخاری و مسلم)دا گێڕدراوەتەوە.

هەم (وَمَكَانٍ) بە شوێنی لەعنەتەکەش ئەستوور دەکرێ (وَهُوَ أَشْرَفُ بَلَدِهِ) کە بەڕێزترین شوێنی شاری لەعنەتەکەیە: (فَبِمَكَّةَ بَيْنَ الرُّكْنِ وَالْمَقَامِ) لە شاری (مكة)دا لە نێوان (الْحَجَرِ الأَسْوَد)و (مَقام إِبْراهيمﷺ) لەعنەتەکە دەکەن (وَالْمَدِينَةِ عِنْدَ الْمِنْبَرِ) لە شاری (مَدينَة)شدا لە لای مینبەری مزگەوتی پێغەمبەرﷺ لەعنەتەکە دەکەن (وَبَيْتِ الْمَقْدِسِ عِنْدَ الصَّخْرَةِ) لە شاری (قودس)دا لەلای بەردە گەورەکە-کە پێی دەگوترێ: (صَخْرَة الله)- لەعنەتەکە دەکەن (وَغَيْرِهَا عِنْدَ مِنْبَرِ الْجَامِعِ) لە شوێنەکانیتری جگە لەو سێیانەش لە لای مینبەری ئەو مزگەوتەی کە جومعەی تێدا دەکرێ لەعنەتەکە دەکەن.

(وَحَائِضٌ بِبَابِ الْمَسْجِدِ) ئافرەتی حەیزداریش لە دەرگەی مزگەوتەوە لەعنەتەکە دەکا (وَذِمِّيٌّ فِي بِيعَةٍ وَكَنِيسَةٍ) جولەکەو دیان لە دێرو کەنیسەدا لەعنەت دەکەن (وَكَذَا بَيْتُ نَارِ مَجُوسِيٍّ فِيالأَصَحِّ) هەروەها ئاگرپەرستیش لە ئاگرخانەکەیدا لەعنەت دەکا (لاَ بَيْتُ أَصْنَامِ وَثَنِيٍّ) بەڵام لە بتخانەی بتپەرستەکاندا لەعنەتەکە ناکرێ، چونکە ڕێزی ئایینیی نیە.

(وَجَمْعٍ) هەروەها ئەستوور دەکرێ بە ئامادەبوونی کۆمەڵە پیاوماقوڵێکی دادپەروەر (أَقَلُّهُ أَرْبَعَةٌ) کە لایکەمی چوار پیاو بن (وَالتَّغْلِيظَاتُ سُنَّةٌ لاَ فَرْضٌ عَلَىالْمَذْهَبِ) ئەو ئەستوورکردنانەی ڕابردوو گشتی سوننەتن و هیچیان واجب نین، لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب (وَيُسَنُّ لِلْقَاضِي وَعْظُهُمَا) بۆ قازی، یان جێگرەکەی سوننەتە: ئامۆژگاری ژنەکەو مێردەکە بکاو بە عەزابی خوایگەورە بیانترسێنێو پێیان بڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿لێکۆڵینەوەتان لە ڕۆژی قیامەت لە سەر خوایگەورەیەو خوا دەزانێ یەکێکتان درۆ دەکا، ئایا کامەتان تۆبە دەکا؟﴾.

(وَيُبَالِغُ عِنْدَ الْخَامِسَةِ) بە تایبەتیش لە جاری پێنجەمدا زۆرتر ئامۆژگاریو ترساندن دەکاو فەرمان دەدا: یەکێك دەستی لە سەر دەمی لەعنەتکەرەکە دابنێو بڵێ: ئەم جارە تووشی

وَأَنْ يَتَلاَعَنَا قَائِمَيْنِ، وَشَرْطُهُ زَوْجٌ يَصِحُّ طَلاَقُهُ، وَلَوْ ارْتَدَّ بَعْدَ وَطْءٍ فَقَذَفَهَا وَأَسْلَمَ فِي الْعِدَّةِ لاَعَنَ، وَلَوْ لاَعَنَ ثُمَّ أَسْلَمَ فِيهَا صَحَّ، أَوْ أَصَرَّ صَادَفَ بَيْنُونَةً، وَيَتَعَلَّقُ بِلِعَانِهِ: فُرْقَةٌ، وَحُرْمَةٌ مُؤَبَّدَةٌ

---

غەزەبی خوای گەورەت دەکا (وَأَنْ يَتَلاَعَنَا قَائِمَيْنِ) سوننەتە هەر دووکیان بە پێوە لەعنەتەکە بکەن.

ئینجا بزانە: جنێودانی زینا ئەگەر بوختانو درۆ بێ، ئەوە لە گەورەترینی گوناهە گەورەکانە، هەروەك لە حەدیسی پێغەمبەرداﷺ هاتوەو لە (باسیسزای‌بوختان)دا ڕوونی دەکەینەوە،إن شاءالله تعالى، کەوابو: ئەگەر مێردەکە لەعنەتەکانی کردنو ئینجا خۆی بە درۆ خستەوە، ئەو کاتە —لەگەڵ گوناهی‌بوختانەکە— کەففارەتی سوێندێکیشی لە سەر واجب دەبێ؟ چونکە لەعنەتەکان لە ڕاستی‌دا سوێندن، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

(وَشَرْطُهُ) مەرجی دروستبوونی لەعنەت لێککردنەکە: (زَوْجٌ يَصِحُّ طَلاَقُهُ) لەعنەتکەرەکە مێردێکی وەها بێ: کە تەڵاقدانی دروست ببێ، کەواتە: لەعنەتکردنی بێگانەو مێردێکی منداڵو شێتو زۆرلێکراو دروست نابێ.

(وَلَوْ ارْتَدَّ بَعْدَ وَطْءٍ) ئەگەر مێردەکە لە دوای جیماعکردن بووە کافر (فَقَذَفَ) ئینجا لە حاڵەتی کافری‌دا جنێوی زینای بە ژنەکەی دا (وَأَسْلَمَ فِي الْعِدَّةِ) لە ماوەی (عِدَّة)شدا بۆوە موسڵمان، ئەوە (لاَعَنَ) لەعنەت دەکا، چونکە ژنو مێردایەتیەکە هەر بەردەوامە، کەوابو: (وَلَوْ لاَعَنَ) ئەگەر لە ماوەی کافربوونەکەشدا لەعنەتەکەی کرد (ثُمَّ أَسْلَمَ فِيهَا) ئینجا لە ماوەی (عِدَّة)دا بۆوە موسوڵمان، ئەوەش (صَحَّ) لەعنەتکردنەکە دروست بووە، چونکە لە حاڵەتی ژنو مێردایەتیدا بووە، بەڵام (أَوْ أَصَرَّ) ئەگەر سوڕ بوو لە سەر کافربوونەکەی تا (عِدَّة)ی تەواو بوو، ئەو کاتە (صَادَفَ بَيْنُونَةً) لەعنەتکردنەکەی کەوتۆتە حاڵەتی (بَيْنُونَة)، واتە: لێکجیابوونەوەی بە هۆی کافربوون، کەواتە: لەعنەتەکەی دروست نابێو لە سزای جنێوەکەش هەشتا داری لێ‌دەدرێ، چونکە ئاشکرا بوو لە حاڵەتی جنێوەکەدا مێردی ژنەکەی نیە، بەڵکو بێگانەیە.

بەڵام ئەگەر جنێوی زینای بە ژنەکەی دا، ئینجا سێ‌بەسێ تەڵاقی‌دا، ئەوە بۆی دروستە لەعنەت بکا، چونکە لە حاڵەتی جنێوەکەدا مێردی ژنەکەی بووە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَيَتَعَلَّقُ بِلِعَانِهِ) هەڵدەواسرێ بە لەعنەتی مێردەکە پێنج بڕیار، واتە: هەر کاتێك مێردەکە پێنج جارەکەی خۆی تەواو کردن پێنج بڕیاری شەرعی جێ‌بەجێ دەبن، یەکەم: (فُرْقَةٌ) مارەبڕینەکەی لەو ژنە هەڵدەوەشێتەوە. دووەم: (وَحُرْمَةٌ مُؤَبَّدَةٌ) هەتا هەتاییش ژنەکەی

وَإِنْ أَكْذَبَ نَفْسَهُ، وَسُقُوطُ الْحَدِّ عَنْهُ، وَوُجُوبُ حَدِّ زِنَاهَا، وَانْتِفَاءُ نَسَبٍ نَفَاهُ بِلِعَانِهِ، وَإِنَّمَا يَحْتَاجُ إِلَى نَفْيٍ مُمْكِنٍ مِنْهُ، فَإِنْ تَعَذَّرَ: بِأَنْ وَلَدَتْهُ لِسِتَّةِ أَشْهُرٍ مِنَ الْعَقْدِ أَوْ طَلَّقَ فِي مَجْلِسِهِ أَوْ نَكَحَ وَهُوَ بِالْمَشْرِقِ وَهِيَ بِالْمَغْرِبِ لَمْ يَلْحَقْهُ، وَلَهُ نَفْيُهُ مَيِّتًا، وَالنَّفْيُ عَلَى الْفَوْرِ فِي الْجَدِيدِ، وَيُعْذَرُ لِعُذْرٍ،

---

لێحەرام دەبێ، واتە: ئەگە مێردێکیتریش بکاو تەلاقی بدا، هەر لێی حەلاڵ نابێتەوە (وَإِنْ أَكْذَبَ نَفْسَهُ) هەر چەند خۆیشی بەدرۆ بخاتەوە ﴿عن سهل بن سعد‌ في حديث الْمُتَلَاعِنَيْنِ: مَضَتِ السُّنَّةُ فِي الْمُتَلَاعِنَيْنِ أَنْ يُفَرَّقَ بَيْنَهُمَا ثُمَّ لا يَجْتَمِعَانِ أَبَداً﴾ رواه أبوداود والبيهقي وأصله في الصحيحين، شەریعەتی پێغەمبەرﷺ بەو بڕیارە هاتوە: کە ژن و مێردی لەعنەتکەر لێك جیا بکرێنەوەو هەتا هەتایش کۆ نەبنەوە.

سێیەم: (وَسُقُوطُ الْحَدِّ عَنْهُ) سزای جنێوەکەی ژنەکە لە سەر مێردەکە لادەچێ، هەروەها سزای جنێوی ئەو پیاوە زیناکەرەشی لە سەر لادەچێ کە لە ڕستەی لەعنەتەکانیدا ناوی هێناوە، واتە: گوتویەتی: ڕاست دەکەم ژنەکەم زینای لەگەڵ فلانەپیاوە کردوە. هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا، فەرموویانە.

چوارەم: (وَوُجُوبُ حَدِّ زِنَاهَا) سزای زینایەکەش لە سەر ژنەکە واجب دەبێ، بەلام ئەگەر ژنەکەش پێنج جار لەعنەت بکا سزایەکەی لە سەر لادەچێ، بە بەلگەی ئایەتەکەیڕابردوو.

پێنجەم: (وَانْتِفَاءُ نَسَبٍ نَفَاهُ بِلِعَانِهِ) نەژادی ئەو منداڵەشی لێ لادەچێ کە لە پێنج ڕستەکانیدا لایبردوەو گوتویەتی: منداڵی من نیە ﴿عن سهل‌: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ فَرَّقَ بَيْنَ الْمُتَلَاعِنَيْنِ وَأَلْحَقَ الْوَلَدَ بِالْمَرْأَةِ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ ژن و مێردە لەعنەتکەرەکەی لێك جیا کردنەوەو منداڵەکەشی بە ژنەکەوە لکاند.

(وَإِنَّمَا يَحْتَاجُ إِلَى نَفْيٍ مُمْكِنٍ مِنْهُ) مێردەکە پێویستی بە لادانی تەنها ئەو منداڵە هەیە: کە بگونجێ لە خۆی بێ، کەوابو: (فَإِنْ تَعَذَّرَ) ئەگەر نەدەگونجا لە خۆی بێ: (بِأَنْ وَلَدَتْهُ لِسِتَّةِ أَشْهُرٍ مِنَ الْعَقْدِ) وەك ژنەکە منداڵەکەی لێببێ بە ماوەی شەش مانگ، یان کەمتر لە مارەبڕینەوە (أَوْ طَلَّقَ فِي مَجْلِسِهِ) یان هەر لە دانیشگەی مارەبڕینەکە تەلاقی دابو (أَوْ نَكَحَ وَهُوَ بِالْمَشْرِقِ وَهِيَ بِالْمَغْرِبِ) یان کە ژنەکەی مارە بڕیبو، بە خۆی لە ڕۆژهەلات بوو، ژنەکەش لە ڕۆژئاوا بوو، ماوەیەکی ئەوەهاش نەڕۆیشتبو: کە بگەنە یەکتری، ئەوە (لَمْ يَلْحَقْهُ) منداڵەکە ناگاتە نەژادی مێردەکە، چونکە مەحاڵە، کەواتە: پێویست نیە بە لەعنەتکردن لایبدا.

(وَلَهُ نَفْيُهُ مَيِّتًا) بۆ مێردەکە دروستە منداڵەکە بە مردوویش لە نەژادی خۆی لابدا (وَالنَّفْيُ عَلَى الْفَوْرِ فِي الْجَدِيدِ) لابردنی منداڵەکە دەسبەجێیە، لە فەرموودەی نوێدا، بە بەلگەی فەرموودەی ئیمامی (عمر)یداهاتوو، بەلام (وَيُعْذَرُ لِعُذْرٍ) ئەگەر عوزرێکی دواخستنی

وَلَهُ نَفْيُ حَمْلٍ وَانْتِظَارُ وَضْعِه، وَمَنْ أَخَّرَ وَقَالَ جَهِلْتُ الْوِلاَدَةَ صُدِّقَ بِيَمِينِه إِنْ كَانَ غَائِبًا، وَكَذَاالْحَاضِرُ فِي مُدَّة يُمْكِنُ جَهْلُهُ فِيهَا، وَلَوْ قِيلَ لَهُ: مُتِّعْتَ بِوَلَدك أَوْ جَعَلَهُ اللهُ لَكَ وَلَدًا صَالحًا. فَقَالَ: آمِينَ، أَوْ نَعَمْ. تَعَذَّرَ نَفْيُهُ، وَإِنْ قَالَ: جَزَاكَ اللهُ خَيْرًا أَوْ بَارَكَ عَلَيْك. فَلاَ، وَلَهُ اللِّعَانُ مَعَ إِمْكَان بَيِّنَة بِزِنَاهَا، وَلَهَا لِدَفْعِ حَدِّالزِّنَا.
(فَصْلٌ) لَهُ اللِّعَانُ لِنَفْيِ وَلَدٍ وَإِنْ عَفَتْ عَنَ الْحَدِّ وَزَالَ النِّكَاحُ،

---

هەبێ، ئەو کاتە عوزرەکەی قبول دەکرێ: وەك بەند کرابێ، یان نەخۆش بێ، بەلام لەحالەتی عوزردا واجبە: شاهید بگرێ، ئەگینا: مافی نامێنێ.
(وَلَهُ نَفْيُ حَمْلٍ) بۆ مێردەکە دروستە کۆرپەی ناو زگی ژنەکەش لە نەژادی خۆی لا ببا، هەم (وَانْتِظَارُ وَضْعِه) بۆیشی دروستە چاوەڕوانی دانانی بکاو-هەر کاتێك بوو- لە نەژادی خۆی لای ببا، بە بەلگەی حەدیسەکەی (بخاري)و (مسلم).
(وَمَنْ أَخَّرَ) هەر کەسێك لابردنی منداڵەکەی لە نەژادی خۆی دواخستو (وَقَالَ جَهِلْتُ الْوِلاَدَةَ) گوتی منداڵبوونەکەم نەزانیبو (صُدِّقَ بِيَمِينِه إِنْ كَانَ غَائِبًا) بە سوێندخواردن باوەڕی پێدەکرێ ئەگەر لە شوێنێکیتر بوبێ (وَكَذَا الْحَاضِرُ فِي مُدَّةٍ يُمْكِنُ جَهْلُهُ فِيهَا) هەروەها ئەگەر لە شوێنەکەش بوبێ بە سوێند باوەڕی پێدەکرێ لە ماوەیەکیوەهادا: کە بگونجێ نەیزانیبێ.
(وَلَوْ قِيلَ لَهُ) ئەگەر بە مێردەکە گوترا: (مُتِّعْتَ بِوَلَدك) خوا منداڵەکەت بۆ بهێڵێو خۆشیی لێببینی (أَوْ) یان گوترا: (جَعَلَهُ اللهُ لَكَ وَلَدًا صَالحًا) خوا بۆتی بکاتە منداڵێکی سالح (فَقَالَ: آمِينَ أَوْ نَعَمْ) مێردەکەش گوتی ئامین، یان بەلێ. ئەوە (تَعَذَّرَ نَفْيُهُ) زەحمەتەو ناگونجێ لە نەژادیخۆی لای ببا، چونکە وەلامەکەی ڕازیبوونی تێدایە، ئیمامی(عمر)ش ﷺ فەرموویەتی: ﴿مَنْ أَقَرَّ بِوَلَدِه طَرْفَةَ عَيْنٍ فَلَيْسَ لَهُ أَنْ يَنْفِيَهُ﴾ اثر حسن أخرجه البيهقي، هەر کەسێك چاوچوقانێك دان بە منداڵەکەی خۆیدا بێنێ، بۆی دروست نیە لە نەژادی خۆی لایببا. بەلام (وَإِنْ قَالَ) ئەگەر مێردەکە لە وەلامدا گوتی (جَزَاكَ اللهُ خَيْرًا) خوا پاداشتی چاکت بداتەوە (أَوْ بَارَكَ عَلَيْكَ) یان خوا بەرەکەتت بە سەردا برژێنێ (فَلاَ) لابردنی منداڵەکە زەحمەت نیە، چونکە وەلامی دوعایەکەی بە دوعا داوەتەوە.
(وَلَهُ اللِّعَانُ مَعَ إِمْكَانِ بَيِّنَةٍ بِزِنَاهَا) بۆ مێردەکە دروستە لەعنەتەکە بکا، هەر چەند بشگونجێ چوار شاهید لە سەر زینایژنەکە بێنێ، چونکە لەعنەتکردنو شاهید هەردووکیان بەلگەیەکی شەرعین، هەم (وَلَهَا لِدَفْعِ حَدِّ الزِّنَا) بۆ ژنەکەش دروستە لەعنەت بکا، تاکو سزای زینا لە سەر خۆی لابدا، هەروەك ڕوونمان کردەوە.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی لابردنی منداڵەکە لە نەژادی خۆی ﴾

(لَهُ اللِّعَانُ لِنَفْيِ وَلَدٍ) بۆ مێردەکە دروستە لەعنەت بکا بۆ لابردنی منداڵەکە لە نەژادی خۆی (وَإِنْ عَفَتْ عَنَ الْحَدِّ وَزَالَ النِّكَاحُ) هەر چەند ژنەکەش لە سزای جنێوەکە ببورێو

وَلدَفعِ حَدِّالْقَذْف وَإِنْ زَالَ النِّكَاحُ وَلاَ وَلَدَ، وَلتَعزيرِه، لاَ تَعزيرِ تَأديب لكَذب كَقَذْف طفْلَة لاَ تُوطَأ، وَلَوْ عَفتْ عَنِ الْحَدِّ أَوْ أَقَامَ بَيِّنَةً بزنَاهَا أَوْ صَدَّقَتْهُ وَلاَ وَلَدَ أَوْ سَكَتَتْ عَنْ طَلَب الْحَدِّ أَوْ جُنَّتْ بَعْدَ قَذْفه فَلاَ لعَانَ فيالأَصَحِّ، وَلَوْ أَبَانَهَا أَوْ مَاتَتْ ثُمَّ قَذَفَهَا بزنًا مُطْلَقٍ أَوْ مُضَاف إلَى مَا بَعْدَ النِّكَاحِ لاَعَنَ إنْ كَانَ وَلَدٌ يَلْحَقُهُ، فَإِنْ أَضَافَ إلَى مَا قَبْلَ نكَاحه فَلاَ لعَانَ إنْ لَمْ يَكُنْ وَلَدٌ وَكَذَا إنْ كَانَ فيالأَصَحِّ،

---

ژن‌و مێردایەتیەکەشیان نەمابێ: بە هۆی تەلاق، یان هۆیەکی‌تر، هەم (وَلدَفعِ حَدِّ القَذْفِ وَإِنْ زَالَ النِّكَاحُ وَلاَ وَلَدَ) بۆ مێردەکە دروستە لە عنەت بکا، تاکو سزای جنێوی زیناکەی لە سەر لابچێ، هەر چەند ژن‌و مێردایەتیش لاچوبێ‌و منداڵیشی نەبێ، هەم (وَلتَعزيرِه) بۆ ئەوەی تەمبێ‌کردنی جنێوەکەشی لە سەر لا بچێ دروستە لەعنەت بکا (لاَ تَعزيرِ تَأديبٍ لكَذبٍ) نەك بۆ ئەوەی تەمبێ‌کردنی درۆکردنی لە سەر لابچێ: (كَقَذْفِ طِفْلَةٍ لاَتُوطَأُ) وەك جنێوی زینای بە کیژۆڵەیەکی بچوك دابێ: کە جیماعی لەگەڵ نەکرێ.

(وَلَوْ عَفتْ عَنِ الْحَدِّ) ئەگەر ژنەکە لە سزای جنێوەکەی بورد (أَوْ أَقَامَ بَيِّنَةً بزنَاهَا) یان مێردەکە چوار شاهیدی زینای هێنان (أَوْ صَدَّقَتْهُ) یان ژنەکە گوتی: ڕاست دەکا زینام کردوە. بەلام (وَلاَ وَلَدَ) هیچ منداڵ و ئاوسیش نەبو (أَوْ سَكَتَتْ عَنْ طَلَبِ الْحَدِّ) یان ژنەکە بێ‌دەنگ بوو و داوای سزادانی مێردەکەی نەکرد (أَوْ جُنَّتْ بَعْدَ قَذْفِه) یان لە دوای جنێوی مێردەکە ژنەکە شێت بوو، ئەوە (فَلاَ لعَانَ فيالأَصَحِّ) لەو پێنج حاڵەتانەدا پێویست بە لەعنەتکردن نیە، بەلام ئەگەر منداڵ ، یان ئاوسی‌ی هەبێ، ئەو کاتە بۆ لابردنی منداڵەکە لەعنەت دەکا، هەروەك ڕابرا.

(وَلَوْ أَبَانَهَا) ئەگەر مێردەکە ژنەکەی بە (بائن) تەلاق دا (أَوْ مَاتَتْ) یان ژنەکە مرد (ثُمَّ قَذَفَهَا بزنًا مُطْلَقٍ) ئینجا مێردەکە جنێوی زینای بە ژنە مردووەکەی، یان بە تەلاقدراوەکەی دا، کاتی زینایەکەشی نەگوت (أَوْ مُضَافٍ إلَى مَا بَعْدَالنِّكَاحِ) یان گوتی پاش مارەبڕینەکەم زینای کردوە، ئەو کاتەش (لاَعَنَ إنْ كَانَ وَلَدٌ يَلْحَقُهُ) بۆ مێردەکە دروستە لەعنەت بکا ئەگەر منداڵێکی وەها هەبێ کە بگاتە نەژادی خۆی‌و بیەوێ لای‌ببا، بەلام ئەگەر نە منداڵ‌و نە ئاوسی‌ی نەبو، ئەو کاتە دروست نیە لەعنەت بکا، بەڵکو سزای جنێوەکەی هەشتا داری لێ‌دەدرێ، چونکە وەك بێگانەیە.

کەوابو: (فَإِنْ أَضَافَ إلَى مَا قَبْلَ نكَاحِه) ئەگەر گوتی: ژنە مردووەکە، یان تەلاقدراوەکە پێش مارەبڕینەکەم زینای کردوە، ئەو کاتەش (فَلاَ لعَانَ إنْ لَمْ يَكُنْ وَلَدٌ) دروست نیە لەعنەت بکا ئەگەر منداڵی نەبێ، چونکە پێویست ناکا، کەوابو: وەکو جنێودانی بێگانە هەشتا داری لێ‌دەدرێ، (وَكَذَا إنْ كَانَ فِي الأَصَحِّ) هەروەها ئەگەر منداڵیشی هەبێ، هەر دروست نیە لەعنەت بکا، لە فەرموودەی ڕاستردا.

لَكِـــنْ لَـــهُ إِنْشَـــاءُ قَـــذْفٍ وَيُلاَعِـــنُ، وَلاَ يَصِـــحُّ نَفْـــيُ أَحَـــدِ تَـــوْأَمَيْنِ.

## (كِتَابُ الْعِدَدِ)

عِدَّةُالنِّكاحِ ضَرْبانِ: اَلأَوَّلُ مُتعلِّقٌ بِفُرْقَةِ حَيٍّ بِطَلاقٍ أَوْ فَسْخٍ، وَإِنَّما تَجِبُ بَعْدَ وَطْءٍ أَوْ اسْتِدْخَالِ مَنِيِّه،

---

(لَكِنْ لَهُ إِنْشَاءُ قَذْفٍ وَيُلاَعِنُ) بەڵام بۆی دروستە: جنێودانێکیتر دابمەزرێنێو کاتەکەیشی نەڵێ، ئینجا بۆ لابردنی منداڵەکە لەعنەت بکا (وَلاَ يَصِحُّ نَفْيُ أَحَدِ تَوْأَمَيْنِ) دروست نیە لابردنی تەنها یەکێك لە جمکەکان، واتە: دوو منداڵی بە یەك زگ، چونکە دوو منداڵ لە (مَنِي)ی دوو پیاوان وێکڕا لە منداڵدانەدا کۆ نابنەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

## ﴿ كِتَابُ الْعِدَدِ: پەڕتوکی عیدەکان ﴾

(عِدَّة): ئەو ماوەیەیە کە خوای گەورە واجبی کردوە: ژن چاوەڕوان بکا، تاکو بزاندرێ هیچی لە منداڵدانەدا نیە، یان بۆ خواپەرستی، یان بۆ تازیەداری مێردمردنی. واتە: ئەگەر لە ماوەی ئەو چاوەڕوانکردنەدا ژنەکە لە پیاوێك مارە بکرێ، مارەبڕینەکەی دروست نابێو لە پیاوەکە حەڵاڵ نابێ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلا تَعْزِمُوا عُقْدَةَالنِّكَاحِ حَتَّــى يَبْلُغَ الْكِتَابُ أَجَلَهُ﴾ نەکەن لە (عِدَّة)دا ژن مارە ببڕن، تا ئەو چاوەڕوانکردنەی خوا لە سەر ژنەکەی نووسیوە دەگاتە کۆتاییخۆی.

جا بزانە: ئەوە لە حاڵەتێکدا بوو: کە ژنەکە لە (عِدَّة)ی پیاوێکیتردا بێ، چونکە ئەگەر ژنەکە هەر لە (عِدَّة)ی مێردیخۆیدا بێ: وەك بە پارە بە تەڵاقێك، یان بە دوو تەڵاقی دابێ، یان بە هەڵە، یان بە مارەبڕینێکی نادروست جیماعی لەگەڵ کردبێ، ئەوە لە مەزهەبی (شافعی)دا: بۆی دروستە: هەر لە (عِدَّة)یخۆیدا لە خۆی مارە بکاتەوە، چونکە خواپەرستیی بە (عِدَّة) تەنها بۆ پیاوێکیتری جگە لە خۆی داندراوە، هەروەك لە (مغني)و (بغية المسترشدين)دا فەرموویانە.

(عِـدَّةُ النِّكَـاحِ ضَـرْبانِ) ئـەو (عِـدَّة)یـەی بـە هـۆی مـارەبڕین واجـب دەبـێ، دوو بەشـن: (اَلأَوَّلُ) بەشـییەکەم: (مُتَعلِّقٌ بِفُرْقَةِ حَيٍّ) پەیوەندیی بە جیابوونـەوەی مێردێکیزینـدووەوە هەیـە، جیابوونەوەکـەش (بِطَـلاقٍ أَوْ فَسْـخٍ) بـە هـۆی تەڵاقـدان بـێ، یـان بـە هـۆی هەڵوەشاندنەوەی مارەبڕین بێ.

بەشیدووەم: پەیوەندی بە جیابوونەوەی مێردێکیمردووەوە هەیە: کە لە (باسی (عِدَّة)ی مێرد مردن)دا ڕوونی دەکەینەوە، إن شاء الله تعالى.

(وَإِنَّما تَجِبُ) جا (عِدَّة)ی بەشییەکەم-کە جیابوونـەوەی مێردێکیزینـدووە- واجب دەبێ تەنها (بَعْـدَ وَطْءٍ أَوْ اسْـتِدْخَالِ مَنِيِّـهِ) لـە دوای جیمـاع لەگـەڵکردن، یـان تێکردنـی (مَنِـي)ی

مێردەكە دەناو داميێنـی ژنەكە، جياوازی نيـە مارەبڕينەكـە دروستبوو بـێ، يان نـا، هـەم جياوازی نيە جيماعەكە حەڵاڵ بێ، يان حەرام بێ: وەك لە حاڵـەتی حـەيزدا، يان لـە كونی پشتەوەدا جيماعی لەگەڵ كردبێ.

(وَإِنْ تُيُقِّنَ بَرَاءةُ الـرَّحِمِ) هەرچـەند بێگومـان بشـزاندرێ هيچـی لـە نـاو منداڵدانـدا نيـە: وەك ژنەكە، يان مێردەكە منداڵێكی بچوك بێ، يان ئەندازەيەكی درێژ لێك دوور بن‌و ماوەی چەند ساڵێك جيماعی لەگەڵ نەكردبێ، يان بە ئامێری پزيشـكیی ئـەم سـەردەمە بزانـدرێ ئـاوس نيە؟ چونكە (عِدَّة) لايەنی خواپەرستيشی تێدايە، هەروەك ڕابرا.

(لاَ بِخَلْوَة) بەڵام بە لەگەڵدابوونی بە تەنها-كە جيماعی لەگـەڵ نـەكردبێ- (عِـدَّة) واجـب نابێ (فِي الْجَدِيد) لە فەرموودەی نوێدا، چونكە خوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿إِذَا نَكَحْـتُمُ الْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِنْ قَبْلِ أَنْ تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِـدَّةٍ تَعْتَـدُّونَهَا﴾ هـەر كاتێك ئافرەتانی ئيماندارانتان لە خۆ مارە كردن، ئينجا پـێش ئـەوەی جيماعيـان لەگـەڵ بكەن تەڵاقتان دان، ئەوە هيچ (عِدَّة) بۆ ئێوە لە سەر ئەوان نيە.

﴿ ئاگاداری ﴾ ئەگەر لە مارەبڕينێكی نادروستدا، يان بـە هەڵـە جيمـاعی لەگـەڵ ئافرەتێك كرد، ئەو جيماعەش (عِدَّة) لە سەر ژنەكە واجب دەكا: وەك (عِدَّة)ی‌جيابوونەوەی مێردێكی زيندوو-نەك مردوو- واتـە: ئەگـەر جيماعكەرەكـە بشـمرێ ئافرەتەكـە- تـەنها- وەك ژنـی تەڵاقدراو (عِدَّة)ی لە سەرە، بەڵام بـە هـۆی زينـا (عِـدَّة) واجب نابـێ، هـەروەك لـە زۆربـەی سەرچاوەكاندا ئەو دوو مەسەلەيە ڕوون كراونەوە، كەوابو: ئەگەر ئافرەتێك لـە زينـا ئـاوس بوو، ئەوە-ئەگەر لە (عِدَّة)ی كەسێكیتردا نـەبێ- دروسـتە بـە ئاوسـی مـارە ببڕێ‌و هـەم دروستە جيماعيشی لەگەڵ بكرێ، چونكە تۆوی زينا هيچ ڕێزێكی نيە، هەروەك لـە (نهايـە)و (مغنی)و لە (فتاوی ابن حجر)دا ڕوون كراوەتەوە.

(وَعِـدَّةُ حُـرَّةٍ ذَاتِ أَقْـرَاءٍ) تـەواوبوونی (عِـدَّة)ی ئـەو ژنـەی ئـازادەو خـاوەنی حـەيزو پاكبوونەوەكانەو لە مێردێكی زيندوو جيا بۆتـەوە: (ثَلاَثَـةٌ) سـێ (قُـرْء)ن (وَالْقُـرْءُ الطُّهْـرُ) مەبەستيش بە (قُرْء): پاكبوونەوەی نێوان دوو خوێنە، جا خوێنـەكان: هـەردووكی حـەيز بن، يان حەيزو نيفاس بـن، هەرچـەند بـە هـۆی دەرمـانيش خـوێنی حەيزەكـەی هێنابـێ، خوایگەورە فەرموويەتی: ﴿وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنْفُسِهِنَّ ثَلاَثَـةَ قُـرُوءٍ﴾ تەڵاقـدراوەكان ماوەی سێ پاكبوونەوە بەخۆيان چاوەڕوان دەبن.

**بەڵام ئاگاداريـە:** لـە مەزهـەبی(حنفـي)دا مەبەسـت بـە (قُـرْء): حـەيزە، هـەروەك لـە كتێبەكانياندا فەرموويانە، كەواتە: ئەگەر ژنێكی تەڵاقدراو بە مەزهەبی(حنفي) مـارە بكـرێ، مەرجە: سێ حەيزی بـە تـەواوی ديتبن، ئينجـا مارەبڕينەكـەی دروسـت دەبـێ، ئەگـەر نـا: دروست نابێ.

فَإِنْ طُلِّقَتْ طَاهِرًا انْقَضَتْ بِالطَّعْنِ فِي حَيْضَةٍ ثَالِثَةٍ، أَوْ حَائِضًا فَفِي رَابِعَةٍ، وَفِي قَوْلٍ يُشْتَرَطُ يَوْمٌ وَلَيْلَةٌ بَعْدَالطَّعْنِ، وَهَل يُحْسَبُ طُهْرُ مَنْ لَمْ تَحِضْ قَرْءاً؟ قَوْلَانِ، بِنَاءً عَلَى أَنَّ الْقَرْءَ انْتِقَالٌ مِنْ طُهْرٍ إِلَى حَيْضٍ أَمْ طُهْرٌ مُحْتَوَشٌ بِدَمَيْنِ؟ وَالثَّانِي أَظْهَرُ، وَعِدَّةُ مُسْتَحَاضَةٍ بِأَقْرَائِهَاالْمَرْدُودَةِ إِلَيْهَا، وَمُتَحَيِّرَةٍ بِثَلَاثَةِ أَشْهُرٍ فِي الْحَالِ،

---

ئینجا بزانه: ئەگەر ژنێك لە زینا ئاوس بوو، ئینجا تەلاق درا، یان لە (عِدَّة)دا بوو، ئینجا زینای کردو ئاوس بوو، ئەوە ئەگەر بە ئاوسیش خوێنی حەیزی دەهات، ئەوەش بە سێ پاکبوونەوە (عِدَّة)ی تەلاقی تەواو دەبێ، بەلاّم ئەگەر خوێنی نەدەهات، ئەو کاتە پێویستە کۆرپەی زینا دابنێ، ئینجا سێ پاکبوونەوەی (عِدَّة)ی تەلاقیش تەواو بکا، هەروەك لە (فتاوی إبن حجر)دا ڕوون کراوەتەوە.

(فَإِنْ طُلِّقَتْ طَاهِرًا) جا ئەگەر ژنەکە لەحاڵەتی پاکبوویی‌دا تەلاق درا (انْقَضَتْ بِالطَّعْنِ فِي حَيْضَةٍ ثَالِثَةٍ) ئەوە (عِدَّة)ی تەواو دەبێ بە کەوتنە حەیزێکی‌سێ‌یەم لە دوای تەلاقدانەکە، هەر چەند ئەو پاکیەی تێیدا تەلاق دراوە تەنها بە ئەندازەی چاوچوقانێکیش مابێ.

(أَوْ حَائِضًا) یان ئەگەر ژنەکە لە حاڵەتی حەیزداری‌دا تەلاقدا (فَفِي رَابِعَةٍ) ئەوە (عِدَّة)ی تەواو دەبێ بە کەوتنە حەیزێکی‌چوارەم لە دوای‌تەلاقدانەکە (وَفِي قَوْلٍ) لە فەرموودەیەکدا: (يُشْتَرَطُ يَوْمٌ وَلَيْلَةٌ بَعْدَالطَّعْنِ) بە مەرج دادەندرێ ڕۆژێكو شەوێکیش بڕۆن لە دوای کەوتنە حەیزەکەی مەسەلەی یەکەم و دووەم.

(وَهَلْ يُحْسَبُ طُهْرُ مَنْ لَمْ تَحِضْ قَرْءاً) ئایا پاکی‌ی ئەو ژنەی کە لە تەمەنی پێش تەلاقداندا نەکەوتۆتە حەیز–بەڵکو لە دوای‌تەلاقدان لە (عِدَّة)دا کەوتە حەیز– بە (قُرْء) دەژمێردرێو بەر (عِدَّة) دەکەوێ، یان نا؟ (قَوْلَانِ) دوو فەرمووودە هەنە: (بِنَاءً عَلَى أَنَّ الْقَرْءَ انْتِقَالٌ مِنْ طُهْرٍ إِلَى حَيْضٍ) بنیاتەکەیان لە سەر ئەو دوو فەرموودەیە: ئایا مەبەست بە (قُرْء): لاکەوتنی ژنەکەیە لە پاکیەوە بۆ حەیزداری (أَمْ طُهْرٌ مُحْتَوَشٌ بِدَمَيْنِ) یان پاکبوونەوەیەکی دەورەدراوە بە دوو خوێنی حەیز، یان حەیزو نیفاس؟ (وَالثَّانِي أَظْهَرُ) ئەم فەرموودە دووەمە بەهێزترە، کەواتە: پاکی‌ی ئەو ژنەی لە ژیانیا–پێش تەلاقدان–حەیزی نەبینیوە، بە (قُرْء) ناژمێردرێو بەر (عِدَّة) ناکەوێ، بەڵکو مەرجە: پاکیەکە بکەوێتە نێوان دوو خوێن.

(وَعِدَّةُ مُسْتَحَاضَةٍ) ئەو ژنەی خوێنچڕکەی تووش بووەو سەرلێشێواو نیە، (عِدَّة)ی تەواو دەبێ: (بِأَقْرَائِهَا الْمَرْدُودَةِ إِلَيْهَا) بەو پاکبوونەوانەی کە گەڕاندراوەتەوە لایان: بەگوێرەی عادەتی‌ڕابردووی، یان بەگوێرەی لێکجیاکردنەوەی خوێنەکان، بەو جۆرەی لە باسی (حەیز)دا ڕوونمان کردوە.

(وَمُتَحَيِّرَةٍ) هەم (عِدَّة)ی ئەو ژنەی خوێنچڕکەی تووش بوەو سەر لێشێواویشە تەواو دەبێ: (بِثَلَاثَةِأَشْهُرٍ) بە تەواوبوونی سێ مانگ (فِي الْحَالِ) هەر لە ئێستادا، واتە: لە کاتی‌تەلاقدانیەوە

وَقِيلَ بَعْدَ الْيَأْسِ، وَأُمُّ وَلَد وَمُكَاتَبَة وَمَنْ فِيهَا رِقٌّ بِقَرْأَيْنِ، وَإِنْ عَتَقَتْ فِي عِـدَّةِ رَجْعَـةٍ كَمَّلَتْ عِدَّةَ حُرَّةٍ فِي الأَظْهَرِ، أَوْ بَيْنُونَة فَأَمَة فِي الأَظْهَرِ، وَحُرَّة لَمْ تَحِـضْ أَوْ يَئِسَـتْ بِثَلاثَةِ أَشْهُرٍ، فَإِنْ طُلِّقَتْ فِي أَثْنَاءِ شَهْرٍ فَبَعْدَهُ هِلالانِ وَتُكَمِّلُ الْمُنْكَسِرَ ثَلاثِـينَ، فَـإِنْ حَاضَتْ فِيهَا وَجَبَتِ الأَقْرَاءُ،

---

سێ مانگەکە دەژمێردرێن، بەو مەرجەی ئەو مانگەی تیایدا تەڵاق دراوە، زیاتر لە پانزە ڕۆژی لێمابێ، واتە: ئەگەر مانگەکە پانزە ڕۆژ، یان کەمتری لێمابو، ئەوە بۆی بە (عِدَّة) ناژمێردرێ، بەڵکو کە مانگەکە تەواو بوو، لەو کاتەوە سێ مانگەکان دەست پێدەکا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە (وَقِيلَ بَعْدَ الْيَأْسِ) لە فەرمودەیەکی بێهێزدا: لە دوای تەمەنی لە حەیز وەستانەوە سێمانگەکان دەست پێدەکا.

(وَأُمُّ وَلَدٍ) جاریەی دایکەمنداڵێو هەم (وَمُكَاتَبَةٍ) نوسراوپێدراو، هەم (وَمَنْ فِيهَا رِقٌّ) ئەوەی بەشێکیشی کۆیلەیە، (عِدَّة)ی گشتیان: (بِقَرْأَيْنِ) بە دوو پاکبوونەوە تەواو دەبێ، بەڵام (وَإِنْ عَتَقَتْ فِي عِدَّةِ رَجْعَةٍ) ئەگەر جاریەکە لە (عِدَّة)ی (رَجْعِي)دا ئازاد بوو، ئەو کاتە (كَمَّلَتْ عِدَّةَ حُرَّةٍ فِي الأَظْهَرِ) دەبی (عِدَّة)ی ژنێکی ئازاد تەواو بکا (أَوْ بَيْنُونَةٍ) یان لە(عِدَّة)ی (بائن)دا ئازاد بوو، ئەوە (فَأَمَةٍ فِي الأَظْهَرِ) هەر (عِدَّة)ی کۆیلە تەواو دەکا.

(وَحُرَّةٍ لَمْ تَحِضْ) هەم (عِدَّة)ی ئەو ژنەی لە ژیانیدا هیچ حەیزێکی نەدیتوە؟ لە بەر بچوکی، یان لە بەر هۆیەکی سروشتی، هەرچەند منداڵیشی بوبێو خوێنی زەیسانیشی هاتبێ (أَوْ يَئِسَتْ) یان لە بەر پیری لە حەیز وەستاوەو بێئومێد بووە، (عِدَّة)ی هەردووکیان تەواو دەبێ (بِثَلاثَةِ أَشْهُرٍ) بە سێ مانگان، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَاللاَّئِـي يَئِسْـنَ مِـنَ الْمَحِيضِ مِنْ نِسَائِكُمْ إِنِ ارْتَبْتُمْ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلاثَةُ أَشْهُرٍ وَاللاَّئِي لَمْ يَحِضْنَ﴾ ئەو ژنانەی بێئومێد بونە لە حەیز، (عِدَّة)ی ئەوان سێ مانگن، هەم ئەوانەی هیچ کاتێك نەکەوتونە حەیز، (عِدَّة)ی ئەوانیش سێ مانگن.

جا بزانە: ئەو سێ مانگە لە تەڵاقدانەوە دەژمێردرێن، کەوابو: (فَإِنْ طُلِّقَتْ فِي أَثْنَاءِ شَهْرٍ) ئەگەر ژنەکە لە ناو مانگێکدا تەڵاق درا، ئەوە (فَبَعْدَهُ هِلالانِ) لە دوای تەواوبوونی مانگەکە دەبی دوو مانگ بە دیتنی مانگی یەکشەوە تەواو بکا، ئینجا (وَتُكَمِّلُ الْمُنْكَسِرَ ثَلاثِينَ) مانگە شکاوەکەی یەکەمیش لە مانگی چوارەم سی ڕۆژ تەواو بکا.

(فَإِنْ حَاضَتْ فِيهَا) جا ئەگەر لە ناو ئەو سێ مانگەدا کەوتە حەیز، ئەو کاتە (وَجَبَتِ الأَقْرَاءُ) واجبە (عِدَّة)ی بە سێ (قُرْء) تەواو بکا، بە (إجماع)ی زانایانی ئیسلام، جا لەو حاڵەتەدا: ئەگەر لە تەمەنی پێش ئەم حەیزەدا هیچ حەیزێکی تری نەدیتبو، ئەوە مانگەکانی ڕابردووی لە دەست دەچن و بۆی بە (عِدَّة) ناژمێردرێن، بەڵام ئەگەر حەیزی دیتبێ، ئەو کاتە هەموو مانگەکانی تەنها بە یەك (قرء) بۆ دەژمێردرێن، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية) فەرموویانە.

وَأَمَةٍ بِشَهْرٍ وَنِصْفٍ، وَفِي قَوْلٍ شَهْرَانِ، وَفِي قَوْلٍ ثَلَاثَةٌ، وَمَنْ انْقَطَعَ دَمُهَا لِعِلَّةٍ كَرَضَاعٍ وَمَرَضٍ تَصْبِرُ حَتَّى تَحِيضَ أَوْ تَيْأَسَ فَبِالْأَشْهُرِ، أَوْ لَا لِعِلَّةٍ فَكَذَا فِي الْجَدِيدِ، وَفِي الْقَدِيمِ تَتَرَبَّصُ تِسْعَةَ أَشْهُرٍ -وَفِي قَوْلٍ أَرْبَعَ سِنِينَ- ثُمَّ تَعْتَدُّ بِالْأَشْهُرِ، فَعَلَى الْجَدِيدِ لَوْ حَاضَتْ بَعْدَ الْيَأْسِ فِي الْأَشْهُرِ

---

جا ئەگەر لە ناو سێ مانگەکاندا نەکەوتە حەیز، بەڵکو لە دوای تەواوبوونی سێ مانگەکان کەوتە حەیز، ئەوە -ئەگەر بێئومێد نەبوبێ- کار لە (عِدَّة)ی ناکاو (عِدَّة)کەی بە دروستبوویی تەواو بووە، هەر وەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، بەڵام ئەگەر لە دوای بێئومێدبوون بکەوێتە حەیز، ئەوە (عِدَّة)کەی هەڵدەوەشێتەوە، هەر وەك لە دوای ئێرە ڕوون کراوەتەوە.

(وَأَمَةٍ) تەواوبوونی (عِدَّة)ی جاریەش (بِشَهْرٍ وَنِصْفٍ) بە مانگێكو نیوە (وَفِي قَوْلٍ شَهْرَانِ) لە فەرموودەیەکدا: دوو مانگن (وَفِي قَوْلٍ ثَلَاثَةٌ) لە فەرموودەیەکیتردا: سێ مانگن.

(وَمَنْ انْقَطَعَ دَمُهَا لِعِلَّةٍ) هەر ژنێك لە بەر هۆیەکیزانداراو خوێنیحەیزی بڕا: (كَرَضَاعٍ) وەك شیردانە مندالو هەم (وَمَرَضٍ) نەخۆشی، هەرچەند چاوەڕوانی چاکبوونەوەشی نەکرێ، ئەوە (تَصْبِرُ حَتَّى تَحِيضَ) دەبی خۆی ڕابگرێ تا دەکەوێتە حەیز، تاکو بە سێ (قُرْء)ی تەواو (عِدَّة) ببینێ (أَوْ تَيْأَسَ) یان تا لە بەر پیری لە حەیز دەوەستێ (فَبِالْأَشْهُرِ) ئینجا بە سێ مانگان (عِدَّة)ی تەواو بکا، هەرچەند ماوەیەکی زۆریشی پێبچێ؛ چونکە ئیمامی (عثمان)ﷺ ئەوها بڕیاری داوەو وەك (إجماع)ی (صحابة)یە.

(أَوْ لَا لِعِلَّةٍ) یان خوێنیحەیزی بڕا، بەڵام هۆیەکەی نەزاندرا، ئەوەش (فَكَذَا فِي الْجَدِيدِ) وەك ژنەکەی جۆرییەکەم خۆی ڕادەگرێ لە فەرموودەی نوێدا، بەڵام (وَفِي الْقَدِيمِ) لە فەرموودەی کۆنداو لە مەزهەبی ئیمام(مالك)و ئیمام(أحمد)دا: (تَتَرَبَّصُ تِسْعَةَ أَشْهُرٍ) ئەم جۆرە ژنەیدووەم ماوەی نۆ مانگان چاوەڕوان دەکا، ئینجا لە دوای نۆ مانگەکان بە سێ مانگیتریش (عِدَّة)کەی تەواو دەکا (وَفِي قَوْلٍ أَرْبَعَ سِنِينَ) لە فەرموودەیەکدا: چوار ساڵان چاوەڕوان دەکا (ثُمَّ تَعْتَدُّ بِالْأَشْهُرِ) ئینجا لە دوای چوار ساڵەکان بە سێ مانگیتریش (عِدَّة)کەی تەواو دەکا.

ئینجا بزانە :بەڵگەی فەرموودەی کۆن بڕیاری ئیمامی(عمر)ە ﷺ، هەروەك لە (تحفة)و (مغني) دا فەرموویانە، کەوابو: دروستە ژنەکە ڕەفتاری پێبکا.

هەروەها ئەو جۆرە ژنەی حەیزی بڕاوە، یان حەیزی دوا دەکەوێ، بۆی دروستە دەرمان بە کار بێنێ تاکو حەیز ببینێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

(فَعَلَى الْجَدِيدِ) جا لە سەر فەرموودەی نوێ (لَوْ حَاضَتْ بَعْدَ الْيَأْسِ فِي الْأَشْهُرِ) ئەگەر ژنەکە لە دوای تەمەنی بێئومێدبوونی لە حەیز، لە ناو سێ مانگەکاندا کەوتە حەیز، ئەو کاتە

وَجَبَت الأَقْرَاءُ، أَوْ بَعْدَهَا فَأَقْوَالٌ أَظْهَرُهَا: إنْ نُكِحَتْ فَلاَ شَيْءَ، وَإلاَّ فَالأَقْرَاءُ، وَالْمُعْتَبَرُ يَأْسُ عَشِيرَتِهَا، وَفِي قَوْلٍ كُلُّ النِّسَاءِ، قُلْتُ: ذَاالْقَوْلُ أَظْهَرُ وَاللهُ أَعْلَمُ.
(فَصْلٌ) عِدَّةُالْحَامِلِ بِوَضْعِهِ بِشَرْطِ نِسْبَتِهِ إلَى ذِيالْعِدَّةِ-وَلَوْ احْتِمَالاً كَمَنْفِيٍّ بِلِعَانٍ- وَانْفِصَالِ كُلِّهِ حَتَّى ثَانِي تَوْأَمَيْنِ، وَمَتَى تَخَلَّلَ دُونَ سِتَّةِ أَشْهُرٍ فَتَوْأَمَانِ،

---

(وَجَبَتِ الأَقْرَاءُ)واجبه: (عِدَّة)كەی بە سێ (قُرْء) تەواو بكا، بەڵام ئەم جۆرە ئافرەتە مانگەكانیڕابردووی تەنها بە یەك (قُرْء) بۆ دەژمێردرێن، هەروەك ڕوونمان كردەوە.
(أَوْ بَعْدَهَا) یان لە دوای تەواوبوونی سێ مانگەكان كەوتە حەیز، ئەوە (فَأَقْوَالٌ) سێ فەرموودە هەنە (أَظْهَرُهَا) بەهێزترەكەیان: (إنْ نُكِحَتْ) ئەگەر ژنەكە لە مێردێكیتر مارە كرابێ، ئەوە (فَلاَ شَيْءَ) هیچی لە سەر نیە، چونكە (عِدَّة)ی تەواو بووەو مارەبڕینەكەشی دروست بووە (وَإلاَّ فَالأَقْرَاءُ) بەڵام ئەگەر لە مێردێكیتر مارە نەكرابێ، ئەو كاتە واجبە: سەرلەبنیات (عِدَّة)ی بە سێ (قُرْء) تەواو بكا.
(وَالْمُعْتَبَرُ) ئەو تەمەنەی بۆ بێئومێدبوونی لە حەیز، ڕەچاو دەكرێ (يَأْسُ عَشِيرَتِهَا) تەمەنی بێئومێدبوونی ژنەكانی هۆزەكەیخۆیەتی (وَفِيقَوْلٍ: كُلُّ النِّسَاءِ) لە فەرموودەیەكدا: تەمەنی بێئومێدبوونی گشت ژنەكانە: كە بە تەمەنی شەستودوو ساڵی سنووریان بۆ داناوە (قُلْتُ) ئیمامی (النواوي) دەفەرموێ (ذَا الْقَوْلُ أَظْهَرُ) ئەم فەرموودە دووەمە بەهێزترە (وَاللهُ أَعْلَمُ).

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی (عِدَّة)ی بە منداڵبوون ﴾

(عِدَّةُ الْحَامِلِ) تەواوبوونی (عِدَّة)ی ژنی ئاوس (بِوَضْعِهِ) بە دانانی باری ناو زكیەتی، جیاوازی نیە ژنەكە: تەڵاق درابێ، یان مێردی مردبێ، یان بە هەڵە جیماعی لەگەڵ كرابێ، هەم جیاوازی نیە كۆرپەكە: لە دامێنی بێتە دەرەوە، یان زگی هەڵبدڕنو بیهێننە دەرەوە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَأُولاَتُ الأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَنْ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾ ژنەكانی ئاوس (عِدَّة)یان بەوە تەواو دەبێ: باری ناو زگیان دابنێن.
(بِشَرْطِ نِسْبَتِهِ إلَى ذِيالْعِدَّةِ) بەو مەرجەی كۆرپەكەی ناو زگ نەژادی بدرێتە پاڵ پیاوە خاوەن (عِدَّة)كە (وَلَوْ احْتِمَالاً كَمَنْفِيٍّ بِلِعَانٍ) هەرچەند بە ئیحتمالیشەوە بێ: وەك كۆرپەی لادراو بە هۆی لەعنەتكردن، هەم (وَانْفِصَالِ كُلِّهِ) بەو مەرجەش كۆرپەكە هەمووی لە ژنەكە جیا ببێتەوە (حَتَّى ثَانِيتَوْأَمَيْنِ) تا جیابوونەوەی جمكەی دووەمیش بە مەرج داندراوە، كەواتە: ئەگەر تەنها سەرە پەنجەیەكی كۆرپەكە لە ناو ژنەكەدا مابێتەوە، یان جمكەكەیتر نەهاتبوە دەرەوە، ئەوە (عِدَّة)ی تەواو نابێ.
(وَمَتَى تَخَلَّلَ دُونَ سِتَّةِ أَشْهُرٍ) هەركاتێك كەمتر لە شەش مانگان كەوتە نێوان دانانی هەردوو جمكەكان، ئەوە (فَتَوْأَمَانِ) دوو جمكەنو بە یەك زگ دەژمێردرێن، بەڵام ئەگەر

وَتَنْقَضِي بِمَيِّت، لاَ عَلَقَة، وَبِمُضْغَة فِيهَا صُورَةُآدَمِيٌّ خَفِيَّةٌ أَخْبَرَ بِهَاالْقَوَابِلُ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ صُورَةٌ وَقُلْنَ: هِيَ أَصْلُ آدَمِيٌّ. انْقَضَتْ عَلَىالْمَذْهَبِ، وَلَوْ ظَهَرَ فِي عِدَّة أَقْرَاء أَوْ أَشْهُرٍ حَمْلٌ لِلزَّوْجِ اعْتَدَّتْ بِوَضْعِهِ، وَلَوْ ارْتَابَتْ فِيهَا لَمْ تَنْكِحْ حَتَّى تَزُولَ الرِّيبَةُ،

---

شەش مانگ، یان زیاتر بکەوێتە نێوان دانانیان، ئەو کاتە جمکە نین، بەڵکو دوو زگن، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

ئینجا بزانە: ئەگەر نەزاندرا ئەو ژنە چۆن ئاوس بووەو کۆرپەکەی لە کام پیاوە، ئەوە–لە ڕووی (عِدَّة)وە– وەك کۆرپەی لە زینا دادەندرێ، واتە: (عِدَّة)ی پێ تەواو نابێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَتَنْقَضِي بِمَيِّتٍ) بە دانانی کۆرپەیەکی مردوو (عِدَّة) تەواو دەبێ (لاَ عَلَقَةٍ) بەڵام بە دانانی پارچە خوێنەکە (عِدَّة) تەواو نابێ (وَ) هەروەها (عِدَّة) تەواو دەبێ (بِمُضْغَةٍ) بە دانانی پارچە گۆشتەکە: کە (فِيهَا صُورَةُ آدَمِيٍّ خَفِيَّةٌ) وێنەی ئادەمیزادی شاراوەی تێدابێ: کە (أَخْبَرَ بِهَا الْقَوَابِلُ) مامانەکان بڵێن: وێنەی ئادەمیزادی تێدایە، هەرچەند یەك مامانیش بێ (فَإِنْ لَمْ يَكُنْ صُورَةٌ) جا ئەگەر پارچە گۆشتەکە وێنەی تێدا نەبو، بەڵام (وَقُلْنَ: هِيَ أَصْلُ آدَمِيٍّ) مامەنەکان گوتیان: ئەو پارچە گۆشتە بنچینەی ئادەمیزادییە ئەگەر لە منداڵدانەدا بمابایەوە دەبوە کۆرپە. ئەو کاتەش (انْقَضَتْ عَلَىالْمَذْهَبِ) لە سە فەرموودەی ڕاستی مەزهەب (عِدَّة)کەی بە دانانی ئەو پارچە گۆشتەش تەواو دەبێ.

ئینجا ئاگاداربە: مەسەلەی منداڵ لەباربردن لە (باسی تۆڵەی کۆرپەی ناو زگ) لە پەرتووکیکوشتندا ڕوون دەکەینەوە،إن شاء الله تعالى.

(وَلَوْ ظَهَرَ فِي عِدَّةِ أَقْرَاءٍ أَوْ أَشْهُرٍ حَمْلٌ) ئەگەر لە ناو (عِدَّة)ی بە پاکبوونەوەکاندا، یان لە ناو (عِدَّة)ی بە مانگەکاندا ئاوسیی ژنەکە ئاشکرا بوو و کۆرپەکەشی (لِلزَّوْجِ) لە مێردی خۆی بوو، ئەو کاتەش (اعْتَدَّتْ بِوَضْعِهِ) بە دانانی بارەکەی ناو زگی (عِدَّة)ی تەواو دەبێو پاکبوونەوەکانو مانگەکانیڕابردوو پوچەڵ دەبنەوە.

(وَلَوْ ارْتَابَتْ فِيهَا) ئەگەر ژنەکە لە ناو (عِدَّة)دا کەوتە گومان: ئایا ئاوسە، یان نا؟ چونکە گرانایی، یان جولەیەك لە زگیدا پەیدا بوو، ئەوە (لَمْ تَنْكِحْ حَتَّى تَزُولَ الرِّيبَةُ) نابێ لە دوای تەواوبوونی(عِدَّة)ش مێردێکیتر بکا، تا گومانەکەی لادەچێ، جا ئەگەر–لە دوای تەواوبوونی (عِدَّة)– بە گومانەوە مێردێکیتری کرد، ئەوە ئەگەر ئاشکرا ببێ لە کاتی مارەبڕینەکەدا ئاوسیی نەبوە، مارەبڕینەکەی دروست دەبێ، ئەگەرنا: دروست نابێ، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

أَوْ بَعْدَهَا وَبَعْدَ نِكَاحٍ اسْتَمَرَّ إلاَّ أَنْ تَلِدَ لِدُونِ سِتَّةِ أَشْهُرٍ مِنْ عَقْدِهِ، أَوْ بَعْدَهَا قَبْلَ نِكَاحٍ فَلْتَصْبِرْ لِتَزُولَ الرِّيبَةُ، فَإِنْ نَكَحَتْ فَالْمَذْهَبُ عَدَمُ إبْطَالِهِ فِي الْحَالِ، فَإِنْ عُلِمَ مُقْتَضِيهِ أَبْطَلْنَاهُ، وَلَوْ أَبَانَهَا فَوَلَدَتْ لِأَرْبَعِ سِنِينَ لَحِقَهُ، أَوْ لِأَكْثَرَ فَلاَ، وَلَوْ طَلَّقَ رَجْعِيًّا حُسِبَتِ الْمُدَّةُ مِنَ الطَّلاَقِ، وَفِي قَوْلٍ مِنْ انْصِرَامِ الْعِدَّةِ،

---

(أَوْ بَعْدَهَا وَبَعْدَ نِكَاحٍ) یان لە دوای تەواوبوونی(عِدَّة)و لـە دوای شـووکردن بـە پیـاوێکی‌تر، کەوتە گومان: ئایا ئاوسە، یان نا؟ ئەوە (اسْتَمَرَّ) مارەبڕینەکـەی هـەر بـەردەوام دەبـێ، چونکە دروست بووە (إلاَّ أَنْ تَلِدَ لِدُونِ سِتَّةِ أَشْهُرٍ مِنْ عَقْدِهِ) تـەنها ئەگـەر لـە مـارەبڕینی مێردەکەی‌دووەمەوە بە کەمتر لە شەش مانگان منـداڵی ببـێ، ئـەو کاتـە مارەبڕینەکـەی بەتاڵەو دروست نەبووە؟ چونکە ئاشـکرا بـوو: لـە کـاتی مارەبڕینەکەی‌دووەمـدا کۆرپـەی مێردەکەی‌یەکەمی لە زگدا بووە، بەڵام ئەگەر لە مارەبڕینی‌دووەمەوە بـە شـەش مانگـان، یان زیاتر منداڵی ببێ، ئەو کاتە منداڵەکە هی مێردەکەی‌دووەمەو مارەبڕینەکەش دروست بوە، هەروەك لە زۆریەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(أَوْ بَعْدَهَا قَبْلَ نِكَاحٍ)یان لـە دوای تـەواوبوونی(عِـدَّة) پـێش شووکردن کەوتـە گومـان: ئایـا ئاوسە، یان نا؟ ئەوە (فَلْتَصْبِرْ لِتَزُولَ الرِّيبَةُ) با خۆی ڕابگرێ تـا گومانەکـەی لادەچـێ (فَـإِنْ نَكَحَتْ) جا ئەگەر بە گومانەوە شووی بە پیاوێکی‌تر کرد، ئەوە (فَالْـمَذْهَبُ عَـدَمُ إبْطَالِـهِ فِـي الْحَالِ) بە فەرموودەی ڕاستی مەزهەب: ئێستا مارەبڕینەکەی بـەتاڵ ناکرێتـەوە، چـونکە لـە دوای تەواوبوونی(عِدَّة) کراوە، کەوابو: (فَإِنْ عُلِمَ مُقْتَضِيهِ) ئەگەر زاندرا هۆیـەکی بـەتاڵبوون هەیە: وەك لە مارەبڕینەوە بە کەمتر لە شـەش مانگـان منـداڵی ببـێ، ئـەو کاتـە (أَبْطَلْنَـاهُ) مارەبڕینەکەی بەتاڵ دەکەینەوە، چونکە دانەمەزراوە.

(وَلَوْ أَبَانَهَا) ئەگەر مێردەکە ژنەکەی‌خۆی بە (بائِن)ی تەڵاق دا (فَوَلَدَتْ لِأَرْبَعِ سِنِينَ) ئینجا ژنەکە بە ماوەی چوار ساڵان، یـان کـەمتر منـداڵی لێبـو، ئـەوە (لَحِقَـهُ) منداڵەکـە دەبێتـە منداڵی تەڵاقدەرەکە، بەو مەرجەی ژنەکە شووی بە پیـاوێکی‌تر نـەکردبێ، چـونکە ئەگـەر مێردێکی‌تری کردبێ‌و بگونجێ منداڵەکە لە مێردەکەی‌دووەم بێ، ئەو کاتە نابێتـە منـداڵی یەکەمەکە، بەڵکو بۆ دووەمەکەیە (أَوْ لِأَكْثَرَ) یان بـە زیـاتر لـە چـوار سـاڵان منـداڵی لێبـو (فَلاَ) منداڵەکە نابێتە منداڵی‌تەڵاقدەرەکە.

ئینجا بزانە: ماوەی چوار ساڵەکانیش لە کاتی گونجـانی جیمـاعکردنی پـێش تەڵاقدانـەوە حیساب دەکرێن، بەڵام (وَلَـوْ طَلَّـقَ رَجْعِيًّـا) ئەگـەر بـە (رجعی) تـەڵاقی دابـێ، ئـەو کاتـە (حُسِبَتِ الْمُدَّةُ مِنَ الطَّلاَقِ) چوار ساڵەکان لە تەڵاقدانەوە حیساب دەکـرێن (وَفِـي قَـوْلٍ مِـنْ انْصِرَامِ الْعِدَّةِ) لە فەرموودەیەکیشدا: لە تەواوبوونی (عِدَّة)وە حیساب دەکرێن.

وَلَوْ نَكَحَتْ بَعْدَالْعِدَّةِ فَوَلَدَتْ لِدُونِ سِتَّةِ أَشْهُرٍ فَكَأَنَّهَا لَمْ تَنْكِحْ، وَإِنْ كَانَ لِسِتَّةٍ فَالْوَلَدُ لِلثَّانِي، وَلَوْ نَكَحَتْ فِي الْعِدَّةِ فَاسِدًا فَوَلَدَتْ لِلْإِمْكَانِ مِنَ الْأَوَّلِ لَحِقَهُ وَانْقَضَتْ بِوَضْعِهِ ثُمَّ تَعْتَدُّ لِلثَّانِي، أَوْ لِلْأَمْكَانِ مِنَ الثَّانِي لَحِقَهُ، أَوْ مِنْهُمَا عُرِضَ عَلَى قَائِفٍ، فَإِنْ أَلْحَقَهُ بِأَحَدِهِمَا

---

(وَلَوْ نَكَحَتْ بَعْدَالْعِدَّةِ) ئەگەر لە دوای تەواوبوونی (عِدَّة) ژنەکە شووی بە پیاوێکیتر کرد (فَوَلَدَتْ لِدُونِ سِتَّةِ أَشْهُرٍ) ئینجا لە مارەبڕینەوە بە کەمتر لە شەش مانگان مندالّی لێبو، ئەوە (فَكَأَنَّهَا لَمْ تَنْكِحْ) وەك شووی نەکردبێ وەهایە، جا ئەم مندالّەش: ئەگەر بە چوار سالان، یان کەمتر لە تەلاقدانییەکەمەکەوە بوبێ، ئەوە بۆ یەکەمەکەیەو مارەبڕینەکەی دووەمیش بەتالّە، بەلام ئەگەر لە تەلاقدانەوە بە زیاتر لە چوار سالان بوبێ، ئەوە مندالّی هیچێکیان نیە، بەلّکو وەکو مندالّی زینا باوکی نازاندرێ، کەوابو: مارەبڕینەکەیدووەم دروست دەبێ، هەروەك لە (مغني)و (الشرواني)دا فەرموویانە.

بەلام (وَإِنْ كَانَ لِسِتَّةٍ) ئەگەر لە مارەبڕینەوە بە شەش مانگان، یان زیاتر مندالّی ببێ، ئەوە (فَالْوَلَدُ لِلثَّانِي) مندالّەکەی هی مێردەکەیدووەمە.

(وَلَوْ نَكَحَتْ فِي الْعِدَّةِ فَاسِدًا) ئەگەر ژنەکە –لە ناو (عِدَّة)دا– بە نادروستی شووی بە پیاوێکیتر کردو پیاوەکەش نەیدەزانی حەرامەو مارەبڕینەکە دروست نابێ؟ چونکە لە زانایانیئایینی دوور بوو، یان وایدەزانی (عِدَّة)ی تەواو بووە (فَوَلَدَتْ لِلْإِمْكَانِ مِنَ الْأَوَّلِ) جا ژنەکەش بە ماوەیەکی وەها مندالّی لێبو: کە تەنها دەگونجا لە مێردەکەییەکەمی بێ: وەك بە کەمتر لە شەش مانگان لە جیماعی مێردیدووەمەوە مندالّەکەی ببێو چوار سالّیش زیاتر نەبێ لە جیماعی پێش تەلاقدانییەکەمەکە، ئەوە (لَحِقَهُ) مندالّەکەی هی یەکەمەکەیەو (وَانْقَضَتْ بِوَضْعِهِ) بە دانانی ئەم مندالّە (عِدَّة)ییەکەمەکەی تەواو دەبێ (ثُمَّ تَعْتَدُّ لِلثَّانِي) ئینجا دووبارە (عِدَّة)یەکیتریش بۆ مێردەکەیدووەم دەست پێدەکا، چونکە جیماعی دووەمەکە بە (شُبْهَة)یە، واتە: بە هەلّەیە، بەلام ئەگەر زانیبی: لە (عِدَّة)دا مارەبڕین دروست نابێ، یان نەیدەزانی بەلام لە زانایانیئایینی نزیك بوو، ئەو کاتە پیاوەکە زیناکەرەو (عِدَّة)ی ناوێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(أَوْ لِلْأَمْكَانِ مِنَ الثَّانِي) بەلام ئەگەر ژنەکە بە ماوەیەکی وەها مندالّەکەی لێبو: کەتەنها دەگونجا لە مێردەکەیدووەم بێ: وەك بە شەش مانگان، یان زیاتر مندالّەکەی ببێو چوار سالّیش زیاتر بە سەر یەکەمەکەدا ڕابردبێ، ئەوە (لَحِقَهُ) دەبێتە هی دووەمەکە.

(أَوْ مِنْهُمَا) یان دەگونجا لە هەردووکیان بێ: وەك بە کەمتر لە چوار سالان لە تەلاقدانییەکەمەکەوەو بە شەش مانگان، یان زیاتر لە جیماعیدووەمەکە مندالّەکە ببێ، ئەو کاتە (عُرِضَ عَلَى قَائِفٍ) دەبردرێتە لای دروشمناس (فَإِنْ أَلْحَقَهُ بِأَحَدِهِمَا) جا ئەگەر

فَكَالإِمْكَـــــــــانِ مِنْـــــــــــهُ فَقَـــــــــــطْ.

(فَصْلٌ) لَزِمَهَا عِدَّتَا شَخْصٍ مِنْ جِنْسٍ بِأَنْ طَلَّقَ ثُمَّ وَطِئَ فِي عِدَّةِ أَقْرَاءٍ أَوْ أَشْهُرٍ جَـــاهِلاً أَوْ عَالِمًا فِي رَجْعِيَّةٍ تَدَاخَلَتَا، فَتَبْتَدِئُ عِدَّةً مِنَ الْوَطْءِ وَيَدْخُلُ فِيهَا بَقِيَّةُ عِدَّةِ الطَّلَاقِ، فَإِنْ كَانَتْ إِحْدَاهُمَا حَمْلاً وَالأُخْرَى أَقْرَاءً تَدَاخَلَتَا فِي الأَصَحِّ فَتَنْقَضِيَانِ بِوَضْعِهِ، وَيُرَاجِعُ قَبْلَهُ، وَقِيلَ:

---

دروشمناسەكە كردیە منداڵی یەكێكیان، ئەوە (فَكَالإِمْكَانِ مِنْهُ فَقَطْ)وەك ئەوەیە: كە بگونجێ منداڵەكە تەنها لە تۆوی ئەوی بێو دەبێتە منداڵی وی.

ئینجا ئاگاداربە: جیماعی بە (شبهة)، واتە: بە هەڵە-وەك وا تێبگا ژنیخۆیەتی- وەك مارەبڕینی نادروست بڕیاری بۆ دەدرێ: لەبارەی (عِدَّة)و واجببوونی مارەیی و كەیاندنی نەژادی منداڵەكە بە جیماعكەرەكە، بەو جۆرەی بە درێژی لەم باسەدا ڕوون كراوە، هەروەك لە (تحفة)و(نهاية) دا فەرموویانە.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی تێكهەڵكشانی دوو (عِدَّة)ی ژنێك ﴾

(لَزِمَهَا عِدَّتَا شَخْصٍ) هەركاتێك ژنەكە دوو (عِدَّة)ی یەك پیاوی لە سەر واجب بون (مِنْ جِنْسٍ) هەردووكیش یەك ڕەگەز بون: (بِأَنْ طَلَّقَ) وەك پیاوەكە ژنەكەی تەڵاق دابێ (ثُمَّ وَطِئَ فِي عِدَّةِ أَقْرَاءٍ أَوْ أَشْهُرٍ جَاهِلاً) ئینجا لە (عِدَّة)ی بە پاكبوونەوەكاندا، یان بە مانگەكاندا جیماعی لەگەڵ بكاو نەشزانێ جیماعكردن حەرامە؟ چونكە لە زانایانیئایینی دوور بوو، یان تازە موسوڵمان بوو (أَوْ عَالِمًا فِي رَجْعِيَّةٍ) یان دەیزانی حەرامە، بەڵام تەڵاقدانەكەی (رجعی) بوو، ئەوە (تَدَاخَلَتَا) هەردوو (عِدَّة)كەی تەڵاقو جیماعەكە دەچنە ناو یەكتری، كەوابو: (فَتَبْتَدِئُ عِدَّةً مِنَ الْوَطْءِ) لە كۆتایی جیماعكردنەكەوە دەست بە (عِدَّة)یەكیتر دەكاو (وَيَدْخُلُ فِيهَا بَقِيَّةُ عِدَّةِ الطَّلَاقِ) ئەو بەشە(عِدَّة)ی تەڵاقیش-كە مابو- دەچێتە ناو (عِدَّة)ی جیماعو نایەوێ دوو (عِدَّة)ی تەنها تەنها ببینێ.

بەڵام ئەگەر تەڵاقدانەكە (بائن) بوو و دەشیزانی جیماعكردن حەرامە، ئەو كاتە دەبێتە زینا، واتە: جیماعەكە (عِدَّة)ی ناوێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(فَإِنْ كَانَتْ إِحْدَاهُمَا حَمْلاً) جا ئەگەر هەردوو (عِدَّة)كانی پیاوەكە لە دوو ڕەگەز بون: وەك یەكێكیان بە دانانی كۆرپەی ناو زگ بوو (وَالأُخْرَى أَقْرَاءً) ئەوەكەیتریش بە پاكبوونەوەكان بوو: وەك بە ئاوسی تەڵاقی دابێ، ئینجا جیماعی لەگەڵ كردبێ، یان لە دوای تەڵاقدان جیماعی لەگەڵ بكاو ئاوس ببێ، ئەو كاتەش (تَدَاخَلَتَا فِي الأَصَحِّ) هەردوو (عِدَّة)كان دەچنە ناو یەكتری لە فەرموودەی ڕاستتردا، كەوابو: (فَتَنْقَضِيَانِ بِوَضْعِهِ) هەردوو (عِدَّة)كان بە دانانی زگەكە تەواو دەبن (وَ) ئەگەر تەڵاقەكەشی (رَجْعِي)بێ، ئەوە (يُرَاجِعُ قَبْلَهُ) پێش دانانیزگەكەی بۆ مێردەكەی دروستە بیگەڕێنێتەوە ژێر مارەیخۆی (وَقِيلَ) لە

إنْ كَانَ الْحَمْلُ مِنَ الْوَطْءِ فَلاَ، أَوْ لِشَخْصَيْنِ بِأَنْ كَانَتْ فِي عِدَّةِ زَوْجٍ أَوْ شُبْهَةٍ فَوُطِئَتْ بِشُبْهَةٍ أَوْ نِكَاحٍ فَاسِدٍ، أَوْ كَانَتْ زَوْجَةً مُعْتَدَّةً عَنْ شُبْهَةٍ فَطُلِّقَتْ فَلاَ تَدَاخُلَ، فَإِنْ كَانَ حَمْلٌ قُدِّمَتْ عِدَّتُهُ، وَإِلاَّ فَإِنْ سَبَقَ الطَّلاَقُ أَتَمَّتْ عِدَّتَهُ ثُمَّ اسْتَأْنَفَتِ الأُخْرَى، وَلَهُ الرَّجْعَةُ فِي عِدَّتِهِ، فَإِذَا رَاجَعَ انْقَضَتْ وَشَرَعَتْ فِي عِدَّةِ الشُّبْهَةِ،

---

فەرموودەیەکی بێهێزدا: (إِنْ كَانَ الْحَمْلُ مِنَ الْوَطْءِ فَلاَ) ئەگەر کۆرپەکە لە جیماعەکەی دوای تەڵاقدان بێ، بۆی دروست نیە بیگەڕێنێتەوە.

(أَوْ لِشَخْصَيْنِ) یان ژنەکە (عِدَّة)ی دوو پیاوانی کەوتنە سەر (بِأَنْ كَانَتْ فِي عِدَّةِ زَوْجٍ) وەك ژنەکە لە (عِدَّة)ی مێردیخۆیدا بێ: جا مردبێ، یان تەڵاقیدابێ (أَوْ شُبْهَةٍ) یان لە (عِدَّة)ی جیماعێکی بە هەڵەدا بێ (فَوُطِئَتْ بِشُبْهَةٍ أَوْ نِكَاحٍ فَاسِدٍ) ئینجا لە ناو (عِدَّة)دا: بە هەڵە، یان بە مارەبڕینێکی نادروست جیماعی لەگەڵ کرا (أَوْ كَانَتْ زَوْجَةً مُعْتَدَّةً عَنْ شُبْهَةٍ) یان ژنی مێردیخۆی بوو بەڵام لە (عِدَّة)ی جیماعێکی بە هەڵەدا بوو (فَطُلِّقَتْ) ئینجا لە ناو ئەو (عِدَّة)یەدا تەڵاق درا، ئەوە (فَلاَ تَدَاخُلَ) هیچ (عِدَّة)یەك ناچێتە ناو ئەوەکەیتر، چونکە خاوەنەکانیان لێك جیانە.

کەوابو: تەماشا دەکەین: (فَإِنْ كَانَ حَمْلٌ)ئەگەر لە یەکێك لەو دوو پیاوانە ئاوس بوبێ (قُدِّمَتْ عِدَّتُهُ) ئەوە (عِدَّة)ی ئاوسیەکە وەپێش دێخرێ، جیاوازی نیە: لە یەکەمەکە ئاوس بوبێ، یان لە دووەمەکە، چونکە (عِدَّة)ی ئاوسی دوا ناخسترێ:

**بۆوێنە**: ئەگەر ژنە تەڵاقدراوەکە لە مێردیخۆی ئاوس بێ، ئینجا لە دوای تەڵاقدان لە (عِدَّة)دا بە هەڵە جیماعی لەگەڵ بکرێ، ئەوە (عِدَّة)ی تەڵاقدانەکەی بە دانانی زگەکەی تەواو دەبێ، ئینجا لە دوای پاکبوونەوەیزەیسانی (عِدَّة)ی پیاوەکەیتریش بە سێ (قُرْء) تەواو دەکا، بەڵام ئەگەر بە پێچەوانەوە بوو: وەك ژنە تەڵاقدراوەکە لە (عِدَّة)دا بە جیماعی بە هەڵە ئاوس ببێ، ئەو کاتە (عِدَّة)ی تەڵاقدانەکەی ڕادەگرێ، تاکو (عِدَّة)ی جیماعەکەی بە هەڵە بە دانانی زگەکەی تەواو بکا، ئینجا لە دوای پاکبوونەوەیزەیسانی ئەوەندەی لە (عِدَّة)ی تەڵاق لە سەری مابو تەواوی دەکا.

(وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر لە هیچێکیان ئاوس نەبێ، ئەوە (فَإِنْ سَبَقَ الطَّلاَقُ) ئەگەر تەڵاقدانەکە پێش جیماعکردنەکەی بە هەڵە بێ (أَتَمَّتْ عِدَّتَهُ) یەکەمجار دەبی (عِدَّة)ی تەڵاقدانەکە تەواو بکا (ثُمَّ اسْتَأْنَفَتِ الأُخْرَى) ئینجا لە دوای تەواوبوونی (عِدَّة)ی تەڵاقەکە سەرلەبنیات دەست بە (عِدَّة)ی جیماعەکەش دەکا (وَلَهُ الرَّجْعَةُ فِي عِدَّتِهِ) مێردەکە بۆی دروستە لە (عِدَّة)ی تەڵاقدانیخۆیدا ژنەکەی بگەڕێنێتەوە، ئەگەر بە (رَجْعِي)تەڵاقی دابێ (فَإِذَا رَاجَعَ انْقَضَتْ) جا هەرکاتێك ژنەکەی گەڕاندەوە، ئەوە (عِدَّة)ی تەڵاقدانەکە دەبڕێو (وَشَرَعَتْ فِي عِدَّةِ الشُّبْهَةِ) ژنەکە دەست بە (عِدَّة)ی جیماعەکەی بە هەڵە دەکا.

وَلاَ يَسْتَمْتِعُ بِهَا حَتَّى تَقْضِيَهَا، وَإِنْ سَبَقَت الشُّبْهَةُ قُدِّمَتْ عِدَّةُالطَّلاَق، وَقِيلَ الشُّـبْهَة.
(فَصْلٌ) عَاشَرَهَا كَزَوْجٍ بِلاَ وَطْءٍ فِي عِدَّة أَقْرَاء أَوْ أَشْهُرٍ فَأَوْجُهٌ: أَصَحُّهَا إِنْ كَانَتْ بَائِنـًا انْقَضَتْ وَإِلاّ فَلاَ، وَلاَ رَجْعَةَ بَعْدَالأَقْرَاءِ وَالأَشْهُرِ، قُلْتُ: وَيَلْحَقُهَاالطَّلاَقُ إِلَى انْقِضَاءِالْعِدَّة،

---

(وَ) هەر کاتێك ژنێك بە هەڵە جیماعی لەگەڵ کرا، بەڵام تەڵاق نەدرا (لاَ يَسْتَمْتِعُ بِهَا حَتَّى تَقْضِيَهَا) حەرامەو نابێ مێردەکەی هیچ لەزەتێکی لێوەربگرێ تا (عِدَّة)ی جیماعەکە تەواو دەکا، واتە: لە ماوەی ئەو (عِدَّة)یەدا تەماشاکردنیشی حەرامە.
(وَ) هەروەها (إِنْ سَبَقَت الشُّبْهَة) ئەگەر جیماعی بە هەڵە پێش تەڵاقدانەکە بوو، ئەو کاتەش لە فەرموودەی ڕاسترتدا: (قُدِّمَتْ عِدَّةُ الطَّلاَق) هەر (عِدَّة)ی تەڵاقدانەکە وەپێش دێخرێ، جا هەر کاتێك (عِدَّة)ی تەڵاقدان تەواو بوو، دەست بە (عِدَّة)ی جیماعەکە دەکا (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا (الشُّبْهَة) دەبی جیماعەکە پێش بخسترێ.

**﴿ فَصْلٌ: لە باسی تێکەڵبوونی تەڵاقدەرەکە لەگەڵ تەڵاقدراوەکەی ﴾**

(عَاشَرَهَا كَزَوْجٍ بِلاَ وَطْءٍ) هەر کاتێك تەڵاقدەرەکە -وەکو مێردێك- بێجیماعکردن لەگەڵ تەڵاقدراوەکە خۆی تێکەڵ کرد: بە دەستبازیو وێکڕا نوستنو وێکڕا خواردنو...هتد (فِي عِدَّة أَقْرَاء أَوْ أَشْهُرٍ) تێکەڵبوونەکەش لە (عِدَّة)ی بە پاکبوونەوەکاندا، یان بە مانگەکاندا بوو (فَأَوْجُهٌ) سێ فەرموودە هەنە: (أَصَحُّهَا) ڕاسترەکەیان (إِنْ كَانَتْ بَائِنـًا انْقَضَتْ) ئەگەر تەڵاقدانەکەی (بائن) بێ، ئەوە (عِدَّة)کەی تەواو دەبێ، چونکە تێکەڵبوونەکە حەرامە، کەوابو: ئەگەر جیماعیش لەگەڵ تەڵاقدراوی (بائن) بکا، ئەوە بە زینا دادەندرێو کار لە (عِدَّة)ی ناکا، هەروەك لە(مغنی)دا فەرموویەتی.
(وَإِلاّ فَلاَ) بەڵام ئەگەر (بائن) نەبو، بەڵکو (رَجْعِي) بوو، ئەوە (عِدَّة)کەی دەپچڕێو تەواو نابێ هەرچەند ماوەیەکی زۆر درێژیش تێکەڵبوونەکە بەردەوام بێ، چونکە تێکەڵبوونی تەڵاقدراوی (رَجْعِيَّة) بە (شُبْهَة) دادەندرێ، تا (شُبْهَة)ش بەردەوام بێ (عِدَّة)ی تەواو نابێ، کەوابو: هەر کاتێك تەڵاقدەرەکە واز لە تێکەڵبوونەکە بێنێ، لەو کاتەوە ژنەکە -لە سەر پچڕانەکەیڕابردوو- (عِدَّة)کەیتەڵاق تەواو دەکا.
(وَلاَ رَجْعَةَ بَعْدَ الأَقْرَاءِ وَالأَشْهُرِ) لە دوای تەواوبوونی سێ پاکبوونەوەکان، یان سێ مانگەکان مێردەکە بۆی دروست نیە ژنەکە بگەڕێنێتەوە ژێر مارەیخۆی، هەرچەند -بە هۆی تێکەڵبوونەکە- (عِدَّة)شی تەواو نەبوە.
(قُلْتُ) ئیمامی(النواوی) دەفەرموێ (وَيَلْحَقُهَا الطَّلاَقُ إِلَى انْقِضَاءِ الْعِدَّة) ئەم تەڵاقدراوە (رَجْعِية) تەڵاقیتریشی دەکەوێ -ئەگەر تەڵاق بدرێ- تا ئەم (عِدَّة)یەی دوای وازهێنانی تێکەڵبوونەکە تەواو دەبێ، کەواتە: لە ماوەی ئەم (عِدَّة)یەدا میراتیش لە یەکتری دەگرن، هەروەك -بە پێچەوانەی (نهاية)- لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

وَلَوْ عَاشَرَهَا أَجْنَبِيٌّ انْقَضَتْ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَلَوْ نَكَحَ مُعْتَدَّةً بِظَنِّ الصِّحَّةِ وَوَطِئَ انْقَطَعَتْ مِنْ حِينِ وَطِئَ، وَفِي قَوْلٍ أَوْ وَجْهٍ مِنَ الْعَقْدِ، وَلَوْ رَاجَعَ حَائِلاً ثُمَّ طَلَّقَ اسْتَأْنَفَتْ، وَفِي الْقَدِيمِ تَبْنِي إِنْ لَمْ يَطَأْ، أَوْ حَامِلاً فَبِالْوَضْعِ، فَلَوْ وَضَعَتْ ثُمَّ طَلَّقَ اسْتَأْنَفَتْ، وَقِيلَ إِنْ لَمْ يَطَأْ بَعْدَ الْوَضْعِ فَلاَ عِدَّةَ،

---

(وَلَوْ عَاشَرَهَا أَجْنَبِيٌّ) بەڵام ئەگەر پیاوێکی بێگانە-بێ جیماعکردن- تێکەڵی ژنە تەڵاقدراوەکە بوو (إِنْقَضَتْ) ئەوە (عِدَّة)ی بە سێ پاکبوونەوە، یان بە سێ مانگان تەواو دەبێ (وَاللهُ أَعْلَمُ).

هەروەها ئەگەر بێگانەکە زیناش لەگەڵ ژنە تەڵاقدراوەکە بکا، زینایەکە کار لە تەواوبوونی (عِدَّة)ی ناکا، بەڵام ئەگەر بێگانەکە بە هەڵە جیماعی لەگەڵ بکا، ئەو کاتە (عِدَّة)یەکی تری لە سەر واجب دەبێ، هەروەها ئەگەر ژنە تەڵاقدراوەکە لە(عِدَّة)ی ئاوسیدا بێ، ئەو کاتەش تێکەڵبوونی مێردەکەو بێگانەکە کار لە (عِدَّة)کەی ناکاو بە دانانی زگەکە (عِدَّة)ی تەواو دەبێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلَوْ نَكَحَ مُعْتَدَّةً) ئەگەر پیاوێك ژنێکی (عِدَّة)گری لە (عِدَّة)دا لە خۆی مارە کرد (بِظَنِّ الصِّحَّةِ) وایدەزانی مارەبڕینی ژنی(عِدَّة)گر دروست دەبێو (وَوَطِئَ) جیماعیشی لەگەڵ کرد، ئەوە (إِنْقَطَعَتْ مِنْ حِينِ وَطِئَ) لەو کاتەوە کە جیماعی لەگەڵ کردوە (عِدَّة)ی ژنەکە دەپچڕێ، جیاوازی (عِدَّة)ی مردنو تەڵاق نیە، جا هەر کاتێك لێك جیا کرانەوە، لەو کاتەوە (عِدَّة)کەیەکەم تەواو دەکا، بەڵام ئەگەر بزانێ مارەبڕینەکە دروست نابێ، ئەو کاتە جیماعەکەی زینایەو کار لە (عِدَّة)ی ناکا، هەروەها ئەگەر جیماعی لەگەڵ نەکردبێ، (عِدَّة)کەی ناپچڕێو هەر بەردەوام دەبێ (وَفِي قَوْلٍ أَوْ وَجْهٍ مِنَ الْعَقْدِ) لە فەرموودەیەکدا: لە مارەبڕینەوە (عِدَّة)کەی دەپچڕێ.

(وَلَوْ رَاجَعَ حَائِلاً) ئەگەر مێردەکە تەڵاقدراوێکی (رجعی)ی لە (عِدَّة)دا گەڕاندەوەو ئاوسیش نەبو (ثُمَّ طَلَّقَ) ئینجا دووبارە تەڵاقی داوە، ئەوە (إِسْتَأْنَفَتْ) سەرلەبنیات دەست بە (عِدَّة)یەکیتر دەکا، جیاوازی نیە لە دوای گەڕاندنەوەش جیماعی لەگەڵ کردبێ، یان نا (وَفِي الْقَدِيمِ تَبْنِي إِنْ لَمْ يَطَأْ) لە فەرموودەیکۆندا: ئەگەر جیماعی لەگەڵ نەکردبێ لە سەر ڕابردووەکە (عِدَّة)کەی تەواو دەکا.

(أَوْ حَامِلاً) یان تەڵاقدراوێکی (رَجْعِية)ی ئاوسی گەڕاندوە، ئینجا دووبارە بە ئاوسی تەڵاقی داوە، ئەوە (فَبِالْوَضْعِ) بە دانانی زگەکەی (عِدَّة)ی تەڵاقدانیدووەمیش تەواو دەبێ، هەر چەند جیماعیشی لەگەڵ کردبێ، بەڵام (فَلَوْ وَضَعَتْ) ئەگەر لە دوای گەڕاندنەوە زگەکەی دانا (ثُمَّ طَلَّقَ) ئینجا تەڵاقی داوە، ئەو کاتە (اسْتَأْنَفَتْ) سەرلەبنیات دەست بە (عِدَّة) دەکاتەوە، هەر چەند جیماعیشی لەگەڵ نەکردبێ (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: (إِنْ لَمْ يَطَأْ بَعْدَ الْوَضْعِ فَلاَ عِدَّةَ) ئەگەر لە دوای دانانی زگەکەی جیماعی لەگەڵ نەکردبێ، (عِدَّة)ی لە سەر نیە.

وَلَوْ خَالَعَ مَوْطُوءَةً ثُمَّ نَكَحَهَا ثُمَّ وَطِئَ ثُمَّ طَلَّقَ اسْتَأْنَفَتْ وَدَخَلَ فِيهَاالْبَقِيَّةُ.
(فَصْلٌ) عِدَّةُ حُرَّةٍ حَائِلٍ لِوَفَاةٍ وَإِنْ لَمْ تُوطَأْ أَرْبَعَةُ أَشْهُرٍ وَعَشَرَةُ أَيَّامٍ بِلَيَالِيهَا، وَأَمَةٍ نِصْفُهَا، وَإِنْ مَاتَ عَنْ رَجْعِيَّةٍ انْتَقَلَتْ إِلَى وَفَاةٍ، أَوْ بَائِنٍ فَلَا، وَحَامِلٍ بِوَضْعِهِ

---

(وَلَوْ خَالَعَ مَوْطُوءَةً) ئەگەر خولعی لەگەڵ ئەو ژنەی کرد کە پێشدا جیماعی لەگەڵ کردبوو (ثُمَّ نَكَحَهَا) ئینجا لە (عِدَّة)دا لە خۆی مارە کردەوە (ثُمَّ وَطِئَ) ئینجا لە دوای مارەکردنەوەکەش جیماعی لەگەڵ کرد (ثُمَّ طَلَّقَ) ئینجا دووبارە تەلاقی داوە، ئەوە (اسْتَأْنَفَتْ) سەرلەبنیات دەست بە (عِدَّة) دەکاتەوەو (وَدَخَلَ فِيهَاالْبَقِيَّةُ) ئەوەی لە (عِدَّة)کەی‌یەکەمیش مابوی دەچێتە ناو (عِدَّة)کەی‌دووەم، چونکە هەردووکیان (عِدَّة)ی یەک کەسن.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی (عِدَّة)ی مێرد مردن ﴾

**کە** بەشی‌دووەمی (عِدَّة)یە: (عِدَّةُ حُرَّةٍ حَائِلٍ لِوَفَاةٍ) تەواوبوونی (عِدَّة)ی ئەو ژنەی ئازادەو لە مێردی‌خۆی ئاوس نیەو مێردەکەی مردوە (وَإِنْ لَمْ تُوطَأْ) هەر چەند جمیاعیشی لەگەڵ نەکرابێ (أَرْبَعَةُأَشْهُرٍ وَعَشَرَةُأَيَّامٍ بِلَيَالِيهَا) چوار مانگو دە ڕۆژە بە شەوەکانیانەوە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجاً يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْراً﴾ ئەو مێردانەی لە ئێوە دەمرن‌و ژنەکانیان بەجێ دەهێڵن، ژنەکانیان ماوەی چوار مانگو دە ڕۆژ بەخۆیان چاوەڕوان دەبن.

واتە بە تەنها مارەبڕین ئەگەر جیماعیشی لەگەڵ نەکرابێ‌و مێردەکەی بمرێ، (عِدَّة)ی لە سەر واجب دەبێ، هەروەك میراتیش لە یەکتری دەگرن، بە بەڵگەی حەدیسەکەی (علقمه)ی‌ڕابردوو لە (هۆیەکانی میرات)دا، جیاوازی نیە ژنەکەو مێردەکە: گەورە بن، یان هەردووکیان، یان یەکێکیان منداڵی ناو بێشکە بێ، چونکە (عِدَّة) لایەنی خواپەرستیشی تێدایە، هەروەك ڕابرا.

(وَأَمَةٍ نِصْفُهَا) تەواوبوونی (عِدَّة)ی جاریەی مێرد مردوو: دوو مانگو پێنج ڕۆژە.

(وَإِنْ مَاتَ عَنْ رَجْعِيَّةٍ) ئەگەر مێردێك مرد و تەلاقدراوێکی (رجعیة)ی لە پاش بەجێما، واتە: لە کاتی مردن هەر لە (عِدَّة)ی (رَجْعِي)دابو، ئەوە (انْتَقَلَتْ إِلَى وَفَاةٍ) لە (عِدَّة)ی (رَجْعِي)یەوە دەگوازێتەوە بۆ (عِدَّة)ی مێرد مردن‌و میراتیش لە مێردەکەی دەگرێ، کەواتە: (عِدَّة)ی‌تەلاقەکەی پوچەڵ دەبێتەوەو سەرلەبنیات لە ڕۆژی مردنی‌مێردەکەیەوە دەست بە (عِدَّة)ی مێرد مردن دەکا (أَوْ بَائِنٍ) یان ئەگەر لە (عِدَّة)ی (بائن)دابو: وەك بە پارە تەلاق درابێ، یان سێ‌بەسێ، ئەو کاتە (فَلَا) ناگوازێتەوە، بەڵکو (عِدَّة)ی تەلاقەکە تەواو دەکا، چونکە بەو تەلاقدانە بوەتە بێگانە.

(وَحَامِلٍ بِوَضْعِهِ) هەروەها ئەو ژنەی لە مێردی خۆی ئاوس بووەو مێردەکەی مردوە، (عِدَّة)ی بە دانانی زگەکەی تەواو دەبێ، بە بەڵگەی ئایەتی ﴿وَأُولَاتُ الْأَحْمَالِ﴾ی‌ڕابردوو

بِشَرْطِهِ السَّابِقِ، فَلَوْ مَاتَ صَبِيٌّ عَنْ حَامِلٍ فَبِالْأَشْهُرِ، وَكَذَا مَمْسُوحٌ إِذْ لَايَلْحَقُهُ عَلَى الْمَذْهَبِ، وَيَلْحَقُ مَجْبُوبًا بَقِيَ أُنْثَيَاهُ فَتَعْتَدُّ بِهِ، وَكَذَا مَسْلُولٌ بَقِيَ ذَكَرُهُ بِهِ عَلَى الْمَذْهَبِ، وَلَوْ طَلَّقَ إِحْدَى امْرَأَتَيْهِ وَمَاتَ قَبْلَ بَيَانٍ أَوْ تَعْيِينٍ فَإِنْ كَانَ لَمْ يَطَأْ اعْتَدَّتَا لِوَفَاةٍ، وَكَذَا إِنْ وَطِئَ وَهُمَا ذَوَاتَا أَشْهُرٍ أَوْ أَقْرَاءٍ وَالطَّلَاقُ رَجْعِيٌّ،

---

(بِشَرْطِهِ السَّابِقِ) بەو مەرجەیڕابردوو: کە کۆرپەکەی بە تەواوی لێ جیا ببێتەوەو نەژادیشی بدرێتە پاڵ خاوەنی(عِدَّة)کە.
کەوابو: (فَلَوْ مَاتَ صَبِيٌّ عَنْ حَامِلٍ) ئەگەر منداڵێکی وەها بمرێ کە نەگونجێ (مَنِي)ی بێتە خوارەوە: وەك نۆ ساڵ کەمتر بێ‌و ژنێکی ئاوسی لە پاش بەجێ بمێنێ، ئەو کاتە (فَبِالْأَشْهُرِ) دەبی بە چوار مانگو دە ڕۆژەکە (عِدَّة)ی تەواو بکا، چونکە بێگومان کۆرپەکە هی منداڵەکە نیە (وَكَذَا مَمْسُوحٌ) هەروەها ئەو مێردەش کە ئەندامی جیماع‌و هەردوو گونەکانی لێکراونەوە، ئەویش وەکو ئەو منداڵەیە (إِذْ لاَ يَلْحَقُهُ) چونکە ئەویش نەژادی کۆرپەکەی ناگاتێ (عَلَى الْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب.
جا لەو دوو حاڵەتانەدا: ئەگەر زاندرا کۆرپەکە لە جیماعێکی بە هەڵەیە، ئەوە لە دوای دانانی کۆرپەکە دەست بە چوار مانگو دە ڕۆژەکەی (عِدَّة)ی مێرد مردن دەکا، بەڵام ئەگەر نەزاندرا چۆن ئاوس بووە، یان لە زینا ئاوس بوو، ئەوە کار لە (عِدَّة)ی ناکاو هەر بە ئاوسی چوار مانگو دە ڕۆژەکەی (عِدَّة)ی مێرد مردن تەواو دەکا، هەروەك (الشبراملسی) فەرموویەتی‌و چەند جارێکیش ڕابرا.
(وَيَلْحَقُ مَجْبُوبًا) نەژادی کۆرپەکە دەگاتە ئەو پیاوەی کە ئەندامی جیماعکردنی لێکراوەتەوە، بەو مەرجەی (بَقِيَ أُنْثَيَاهُ) هەردوو گونەکانی مابن‌و بشگونجێ (مَنِي)یەکەی لە ناو ژنەکە کرابێ، کەوابو: (فَتَعْتَدُّ بِهِ) ژنی ئەو جۆرە پیاوانە بە دانانی زگەکەی (عِدَّة)ی تەواو دەبێ (وَكَذَا مَسْلُولٌ بَقِيَ ذَكَرُهُ) هەروەها ئەو پیاوەش کە هەردوو گونی دەرهێندراون‌و ئەندامی جیماعکردنیشی‌ماوە ژکەنەکەی ئەویش (بِهِ) بە دانانی زگەکەی (عِدَّة)ی تەواو دەبێ (عَلَى الْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب.
(وَلَوْ طَلَّقَ إِحْدَى امْرَأَتَيْهِ) ئەگەر لە دوو ژنەکانی یەکێکی تەڵاق دا (وَمَاتَ قَبْلَ بَيَانٍ أَوْ تَعْيِينٍ) ئینجا پێش ڕوونکردنەوەو دیاریکردنی تەڵاقدراوەکە مێردەکە مرد، ئەوە (فَإِنْ كَانَ لَمْ يَطَأْ) ئەگەر جیماعی لەگەڵ هیچیان نەکردبێ (اعْتَدَّتَا لِوَفَاةٍ) هەردووکیان –بۆ پارێزکاری– (عِدَّة)ی مێرد مردن تەواو دەکەن (وَكَذَا إِنْ وَطِئَ) هەروەها ئەگەر جیماعیشی لەگەڵ هەردووکیان کردبێ، بەڵام (وَهُمَا ذَوَاتَا أَشْهُرٍ أَوْ أَقْرَاءٍ) هەردووکیان خاوەنی (عِدَّة)ی سێ مانگی، یان سێ پاکبوونەوە بون‌و (وَالطَّلَاقُ رَجْعِيٌّ) تەڵاقدانەکەش (رجعی) بوو، ئەو کاتەش هەردووکیان (عِدَّة)ی مێرد مردن تەواو دەکەن.

فَإِنْ كَانَ بَائِنًا اعْتَدَّتْ كُلُّ وَاحِدَةٍ بِالأَكْثَرِ مِنْ عِدَّةِ وَفَاةٍ وَثَلاثَةٍ مِنْ أَقْرَائِهَا، وَعِدَّةُ الْوَفَاةِ مِنَ الْمَوْتِ، وَالأَقْرَاءُ مِنَ الطَّلاقِ. وَمَنْ غَابَ وَانْقَطَعَ خَبَرُهُ لَيْسَ لِزَوْجَتِهِ نِكَاحٌ حَتَّى يُتَيَقَّنَ مَوْتُهُ أَوْ طَلاقُهُ، وَفِي الْقَدِيمِ: تَرَبَّصُ أَرْبَعَ سِنِينَ ثُمَّ تَعْتَدُّ لِوَفَاةٍ وَتَنْكِحُ،

---

(فَإِنْ كَانَ بَائِنًا) جا ئەگەر تەلاقدانەكە (بائن) بوو، ئەو كاتە (اعْتَدَّتْ كُلُّ وَاحِدَةٍ بِالأَكْثَرِ) هەر یەكێكیان (عِدَّة)ی خۆی تەواو دەكا بە زۆرترەكە: (مِنْ عِدَّةِ وَفَاةٍ وَثَلاثَةٍ مِنْ أَقْرَائِهَا) لە (عِدَّة)ی مێرد مردنیو لە سێ پاكبوونەوەكەی، واتە: لەو دووانە كامەیان ماوەی زۆرتر بێ، بەو زۆرترە (عِدَّة)ی تەواو دەكا (وَعِدَّةُ الْوَفَاةِ مِنَ الْمَوْتِ) جا (عِدَّة) مێرد مردن لە مردنی مێردەكەوە دەست پێدەكرێو (وَالأَقْرَاءُ مِنَ الطَّلاقِ) پاكبوونەوەكانیش لە تەلاقدانەوە دەست پێدەكرێ.

## ﴿ ژنی مێرد ونبوو ﴾

(وَمَنْ غَابَ) هەر كەسێك گوم بوو و (وَانْقَطَعَ خَبَرُهُ) هەواڵی مانو نەمانیشی بڕا، واتە: نەزاندرا (لَيْسَ لِزَوْجَتِهِ نِكَاحٌ) بۆ ژنەكەی دروست نیە شوو بكا (حَتَّى يُتَيَقَّنَ مَوْتُهُ أَوْ طَلاقُهُ) تا بە بەڵگەیەكیشەرعی دەزاندرێ مێردەكەی مردوە، یان تەلاقی داوە، بەلام ئەگەر دادپەروەرێك، یان باوەڕپێكراوێكیخۆی پێی بڵێ: مێردەكەت مردوە، ئەوە لە نێوان خۆیو خوای گەورەدا بۆی دروستە: شوو بكا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَفِي الْقَدِيمِ) لە فەرموودەی كۆنی ئیمامی (الشافعي)و لە مەزهەبی ئیمام (مالك)و ئیمام (أحمد)دا: ژنی مێرد ونبوو دەچێتە لای (قازی)، ئینجا كە (قازی) بۆی ئاشكرابو: مێردەكەی ونبووە، ئەوە (تَرَبَّصُ أَرْبَعَ سِنِينَ) لەو كاتەوە بە دانانی (قازی) ماوەی چوار ساڵان چاوەڕوان دەكا، ئینجا لە دوای چوار ساڵەكانیش (قازی) بڕیاری مردنی مێردەكەیو لێكجیابوونەوەی بۆ دەدا (ثُمَّ تَعْتَدُّ لِوَفَاةٍ) ئینجا (عِدَّة)ی مێرد مردنیش تەواو دەكا، ئینجا (وَتَنْكِحُ) بۆی دروستە: شوو بە پیاوێكیتر بكا، هەر وەك بە هۆی نەمێردیو نەمانی ئەندامی جیماعی مێردەكەشی بۆی دروست بوو: مارەبڕینەكە هەڵبوەشێنێتەوە، چونكە لەزەتی ژنو مێردایەتیی نەماوە.

جا بزانە: لە فەرموودەی ڕاستتردا: چوار ساڵەكان لە كاتی دانانی (قازی)یەوە دەستیان پێدەكرێو ماوەی پێش چوونە لای (قازی) بە فیڕۆ دەڕواو ڕەچاو ناكرێ، بەلام لە فەرموودەی بێهێزدا: لە ونبوونەوە دەست پێدەكرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە ﴿عن عمر رضي الله عنه أَيُّمَا امْرَأَةٍ فَقَدَتْ زَوْجَهَا لَمْ تَدْرِ أَيْنَ هُوَ، فَإِنَّهَا تَنْتَظِرُ أَرْبَعَ سِنِينَ، ثُمَّ تَعْتَدُّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا، ثُمَّ تَحِلُّ﴾ رواه مالك والشافعي، وفي رواية عبدالرزاق: ﴿مِنْ حِينِ رَفَعَتْ أَمْرَهَا إِلَيْهِ﴾، هەر ژنێك مێردەكەی گوم بوو و نەیزانی لە كوێیە، با چوار ساڵان

فَلَوْ حَكَمَ بِالْقَدِيمِ قَاضٍ نُقِضَ عَلَى الْجَدِيدِ فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ نَكَحَتْ بَعْدَ التَّرَبُّصِ وَالْعِدَّةِ فَبَانَ مَيِّتاً صَحَّ عَلَى الْجَدِيدِ فِي الأَصَحِّ. وَيَجِبُ الإِحْدَادُ عَلَى مُعْتَدَّةِ وَفَاةٍ،

---

چاوەڕوان بکا-لەو کاتەوە کە کارەکەی بۆ لای کاربەدەست بەرز دەکاتەوە- ئینجا چوار مانگو دە ڕۆژ (عِدَّة)ی مێرد مردن تەواو بکا، ئینجا حەڵاڵە شوو بکا.

جا بزانە: لە ئاگادارییەکەی (باسی نەتوانینی بەخێوکردنی ژن)دا فەرموودەیەکی بێهێز هەیە: ژنەکە دەتوانێ سودی لێوەربگرێ، تەماشای بکە.

(فَلَوْ حَكَمَ بِالْقَدِيمِ قَاضٍ) جا ئەگەر (قازی)ێك بە فەرموودەی کۆن بڕیاریدا، ئەوە (نُقِضَ عَلَى الْجَدِيدِ) لە سەر فەرموودەی نوێ بڕیارەکەی هەڵدەوەشێندرێتەوە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، بەڵام لە (تحفە)دا فەرموودەکەیتری بەهێز کردوە: کە دەفەرموێ: بڕیارەکە هەڵناوەشێندرێتەوە، چونکە زیانێکی گەورە تووشی ژنەکە دەبێو جگە لە ڕەفتارکردن بە فەرموودەی کۆن بە هیچ ڕێگایەکیتر ناتوانێ ئەو زیانە گەوریە لە خۆی لابدا، جا ئیمامی (الإِسْنَوي) ئەوەشی بە ڕاست داناوە: کە بڕیاری (قازی)-بە فەرموودەی کۆن- لە ئاشکرایىو لە پەنهانیدا جێبەجێ دەبێ.

(وَلَوْ نَكَحَتْ بَعْدَ التَّرَبُّصِ وَالْعِدَّةِ) ئەگەر لە دوای چاوەڕوانکردنی چوار ساڵەکەو (عِدَّة)ی چوار مانگو دە ڕۆژەکە، ژنە مێرد ونبووەکە شووی کرد (فَبَانَ مَيِّتاً) ئینجا ئاشکرا بوو: پێش مارەبڕینەکە بە چوار مانگو دە ڕۆژ مێردەکەی مردوە، ئەوە (صَحَّ عَلَى الْجَدِيدِ) لەسەر فەرموودەی نوێش مارەبڕینەکەی دروست بووە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەیڕاستتردا، بەڵام ئەگەر ئاشکرا بوو: مێردەکەی لە کاتیمارەبڕینەکەدا زێندوو بووە، ئەوە هەر ژنی مێردەکەیەتیو مارەبڕینەکەیدووەم نادروستە، هەر چەند (قازی)ش بڕیاری دابێ.

جا ئەگەر دووەمەکە جیماعی لەگەڵ کردبو، ئینجا مێردە ونبووەکە هاتەوە لای ژنەکەی، ئەوە حەرامە: هیچ لەزەتێکی لێببینێ تا (عِدَّة)یدووەمەکەی تەواو دەکا، چونکە جیماعی دووەمەکە بە هەڵە بووە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

کەوابو: ئەگەر ژنەکە منداڵێکی ببێو بشگونجێ منداڵەکە لەو جیماعە بێ، ئەو کاتە منداڵەکەش دەبێتە هی دووەمەکە، هەروەك لە (مغنی)دا ڕوون کراوەتەو.

﴿ تازیەداری ژنی مێرد مردوو ﴾

(وَيَجِبُ الإِحْدَادُ عَلَى مُعْتَدَّةِ وَفَاةٍ) تازیەداری واجبە: لە سەر ئەو ژنەی لە (عِدَّة)ی مێرد مردندایە تا ماوەی (عِدَّة)کەی تەواو دەبێ، جیاوازی نیە: ئاوس بێ، یان نا، گەورە بێ، یان منداڵ بێ، هەرچەند لە مێردەکەشی تۆرابێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لاَ تُحِدُّ اِمْرَأَةٌ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلاَثٍ إلاَّ عَلَى زَوْجٍ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْراً: وَلاَ تَلْبَسُ ثَوْباً مَصْبُوغاً إلاَّ

لاَ رَجْعِيَّة، وَيُسْتَحَبُّ لِبَائِنٍ وَفِي قَوْلٍ يَجِبُ، وَهُوَ تَرْكُ لُبْسِ مَصْبُوغٍ لِزِينَة وَإِنْ خَشُنَ، وَقِيلَ يَحِلُّ مَا صُبِغَ غَزْلُهُ ثُمَّ نُسِجَ، وَيُبَاحُ غَيْرُ مَصْبُوغٍ مِنْ قُطْنٍ وَصُوف وَكَتَّان، وَكَذَا إِبْرِيسَمٌ فِيالأَصَحِّ، وَمَصْبُوغٌ لاَ يُقْصَدُ لِزِينَة، وَيَحْرُمُ حُلِيٌّ ذَهَب وَفِضَّة وَكَـذَا لُؤْلُـؤٌ فِيالأَصَحِّ، وَطِيبٌ فِي بَدَن وَثَوْب وَطَعَامٍ وَكُحْلٍ، وَاكْتِحَالٌ بِإِثْمِد إِلاَّ لِحَاجَة كَرَمَـد، وَإِسْفِيذَاجٌ وَدُمَامٌ، وَخِضَابُ حِنَّاءٍ وَنَحْوِهِ، وَيَحِلُّ تَجْمِيلُ فِرَاشٍ وَأَثَاث وَتَنْظِيفٌ بِغَسْلِ نَحْوِ رَأْسٍ وَقَلْمٍ وَإِزَالَة وَسَخٍ،

---

ثَوْبَ عَصْبٍ وَلاَ تَكْتَحِلُ وَ لاَ تَمَسُّ طِيباً...﴾ رواه الشيخان، دروست نيه هيچ ئافرەتێك لە سێ ڕۆژان بە سەرەوەتر تازيەدارى بكا لە سەر هيچ مردووێك، تەنها لە سـەر مێردىخـۆى چوار مانگو دە ڕۆژان تازيەدارى دەكا: جلى ڕەنگكراو دەبـەر ناكاو كل دەچـاوى ناكـاو بۆنى خۆش لە خۆى نادا.

(لاَ رَجْعِيَّةٍ) بەڵام لە سەر تەڵاقدراوى (رجعية) واجب نيه تازيەدارى بكا، بـەڵكو سـوننەتە، هەم (وَيُسْتَحَبُّ لِبَائِنٍ) بۆ تەڵاقدراوى (بائن)ش سوننەتە: تازيەدارى بكا (وَفِي قَـوْلٍ يَجِـبُ) لە فەرموودەيەكيشدا واجبە.

(وَهُوَ) تازيەدارى: (تَرْكُ لُبْسِ مَصْبُوغٍ لِزِينَةٍ) وازهێنانـە لـە دەبـەركردنى جلى ڕەنگكـراو بـە مەبەستى خۆڕازاندنەوە (وَإِنْ خَشُنَ) هەر چەند زبريش بـێ (وَقِيـلَ يَحِـلُّ مَـا صُبِغَ غَزْلُـهُ ثُـمَّ نُسِجَ) لە فەرموودەيەكى بێهێزدا: ئەو جلەى داوەكەى ڕەنگ كرابێ ئينجا چنرابێ، حەڵاڵـە دەبەر بكرێ (وَيُبَاحُ غَيْرُ مَصْبُوغٍ) جلى ڕەنگ نەكراو حەڵاڵە: (مِنْ قُطْنٍ وَصُـوفٍ وَكَتَّـانٍ) لـە لۆكەو خورىو كەتان (وَكَذَا إِبْرِيسَمٌ فِيالأَصَحِّ) هەروەها ئاوريشمىڕەنگ نـەكراويش حەڵاڵـە، لە فەرموودەى ڕاستتردا، هەم (وَمَصْبُوغٌ لاَ يُقْصَدُ لِزِينَةٍ) دەبـەركردنى ڕەنگكـراويش حەڵاڵـە كە بە مەبەستى خۆڕازاندنەوە نەبێ: وەك ڕەشو مۆر.

(وَيَحْرُمُ حُلِيُّ ذَهَبٍ وَفِضَّةٍ) هـەروەها دەبـەركردنى خشـڵى زێڕو زيويشـى لێحەڕامـە، هـەر چەند ئەنگوستيلەيەك، يان گوارەيەك بێ (وَكَذَا لُؤْلُؤٌ فِيالأَصَحِّ) هـەروەها خۆڕازاندنـەوەى بە گەوهەرو شتى وەهاش حەڕامە، هەم (وَطِيبٌ فِي بَدَنٍ وَثَوْبٍ وَطَعَامٍ وَكُحْلٍ) بەكارهێنانى بۆنى خۆش لە لاشەو لە جلو بەرگو لە خواردەمەنىو لە كلدا حەڕامە.

هەم (وَاكْتِحَالٌ بِإِثْمِدٍ) كل دەچاوكردنيش حەڕامە (إِلاَّ لِحَاجَةٍ) تەنها لە بەر پێويستى دروسـتە (كَرَمَـدٍ) وەك چـاو ئێشـە، هـەم (وَإِسْفِيذَاجٌ) سپياوىڕوخسـارو (وَدُمَـامٌ) سـۆراوىكوڵمەش حەڕامە، هەم (وَخِضَابُ حِنَّاءٍ وَنَحْوِهِ) خەنە لە خۆ دانو ڕەنگەنگەكانىتريش حەڕامە.

(وَيَحِلُّ تَجْمِيلُ فِرَاشٍ وَأَثَاثٍ) حەڵاڵە جوانكردنى ياتاغى خەوتنو كەلوپـەلى نـاو مـاڵ، هـەم (وَتَنْظِيفٌ) خۆ پاككردنەوەشى حەڵاڵە: (بِغَسْلِ نَحْوِ رَأْسٍ وَقَلْمٍ وَإِزَالَـةِ وَسَـخٍ) بـە شـۆردنى

قُلْتُ: وَيَحِلُّ امْتِشَاطٌ وَحَمَّامٌ إِنْ لَمْ يَكُنْ خُرُوجٌ مُحَرَّمٌ، وَلَوْ تَرَكَتِ الإِحْدَادَ عَصَتْ وَانْقَضَتِ العِدَّةُ كَمَا لَوْ فَارَقَتِ الْمَسْكَنَ، وَلَوْ بَلَغَتْهَاالْوَفَاةُ بَعْدَالْمُدَّةِ كَانَتْ مُنْقَضِيَةً، وَلَهَا إِحْدَادٌ عَلَى غَيْرِ زَوْجٍ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ، وَتَحْرُمُ الزِّيَادَةُ وَاللهُ أَعْلَمُ.
(فَصْلٌ) تَجِبُ سُكْنَى لِمُعْتَدَّةِطَلاَقٍ وَلَوْ بَائِنٍ إِلاَّ نَاشِزَةً، وَلِمُعْتَدَّةِوَفَاةٍ فِي الأَظْهَرِ،

---

سەرو لاشەو نینۆك كردن و لادانی چڵك و موو (قُلْتُ) ئیمامی (النـواوی) دەفـەرموێ (وَيَحِلُّ إِمْتِشَاطٌ وَحَمَّامٌ) حەڵاڵە سەری شانە بكاو بچێتە گـەرماو (إِنْ لَمْ يَكُنْ خُرُوجٌ مُحَرَّمٌ) بـەو مەرجەی لە ماڵ دەرچوونێكی حەرامی تێدا نەبێ.

(وَلَوْ تَرَكَتِ الإِحْدَادَ عَصَتْ) ئەگەر ژنـە مێرد مردووەكـە تازیـەداریی بـە تـەواوی نـەكرد، گوناهبار دەبێ، بەڵام (وَانْقَضَتِ العِدَّةُ) لەگەڵ گوناهباریشی (عِدَّة)ی تەواو دەبێ (كَمَا لَوْ فَارَقَتِ الْمَسْكَنَ) وەك ئەو ژنەی لـە (عِـدَّة)دا لـە مـاڵ دەچـێتە دەرەوە، ئـەویش گوناهبـار دەبێ بەڵام (عِدَّة)شی تەواو دەبێ (وَلَوْ بَلَغَتْهَا الْوَفَاةُ بَعْدَالْمُدَّةِ) ئەگەر لە دوای تـەواوبوونی ماوەی(عِدَّة)كە هـەواڵی مردنـی مێردەكـەی گەیشتێ (كَانَتْ مُنْقَضِيَةً) ئـەوە (عِـدَّة)كـەی تەواوبووە، نە تازیەداریی و نە (عِدَّة)یتری لە سەر نیە.

(وَلَهَا إِحْدَادٌ عَلَى غَيْرِ زَوْجٍ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ) بـۆ گشـت ئافرەتێـك دروسـتە مـاوەی سـێ ڕۆژان تازیەداریی بكا لە سەر خزمەكانی جگە لە مێردی خۆی، بەڵام (وَتَحْرُمُ الزِّيَادَةُ) زیاتر لـە سـێ ڕۆژان حەرامە، بە بەڵگەی حەدیسەكەیڕابردوو (وَاللهُ أَعْلَمُ).

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی مافی نیشتەجێكردنی ئەو ژنەی لە (عِدَّة)دایە ﴾

(تَجِبُ سُكْنَى لِمُعْتَدَّةِ طَلاَقٍ) مافی نیشتەجێكردن واجبە: بۆ ئەو ژنەی لە (عِدَّة)یتەڵاقدایە تا (عِدَّة)ی تەواو دەبێ، جیاوازی نیە: ئاوس بێ ، یان نا (وَلَوْ بَائِنٍ) هەرچەند بە (بَائِنٍ)ش تەڵاق درابێ: بە خولع، یان سێبەسێ، خوای گەورە دەفـەرموێ: ﴿أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنْتُمْ﴾ تەڵاقدراوەكان نیشتەجێ بكەن لەو شوێنەی بە خۆتان تێیدا نیشتەجێ دەبون.

(إِلاَّ نَاشِزَةً) تەنها نیشتەجێكردنی ئەو ژنە واجب نیە كە بە (ناشزة)یی تـەڵاق دراوە، یـان لە (عِدَّة)دا (ناشزة) دەبێ.

ئینجا بزانە: ئەگەر تەڵاقـدراوی(بـائِن) لـە مێردیخـۆی ئـاوس بـێ، ئـەو كاتـە بژێـو و جـلو بەرگیشی لە سەر مێردەكەی واجبە، بەڵام ژنی مێرد مـردوو مـافی بـژێوی نیـە، هـەر چـەند ئاوسیش بێ، هەروەك لە (پەڕتووكیبژێوەكان)دا ڕوونی دەكەینەوە، إن شاء الله تعالی.

(وَ) هەروەها (لِمُعْتَدَّةِ وَفَاةٍ) مافی نیشتەجێكردن بـۆ ئـەو ژنـەش واجبـە: كـە لـە (عِـدَّة)ی مێرد مردندایە، واتـە: ئـەركی نیشـتەجێكردنی لـە میراتیمێردەكـەی دەدرێ تـا (عِـدَّة)ی تەواو دەبێ (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، جیاوازی نیە ژنەكە ئاوس بێ، یان نـا،

وَفَسْخٍ عَلَى الْمَذْهَبِ، وَتُسْكَنُ فِي مَسْكَنٍ كَانَتْ فِيهِ عِنْدَ الْفُرْقَةِ، وَلَيْسَ لِلزَّوْجِ وَغَيْرِهِ إِخْرَاجُهَا، وَلاَ لَهَا خُرُوجٌ، قُلْتُ: وَلَهَا الْخُرُوجُ فِي عِدَّةِ وَفَاةٍ وَكَذَا بَائِنٍ فِي النَّهَارِ لِشِرَاءِ طَعَامٍ وَغَزْلٍ وَنَحْوِهِ، وَكَذَا لَيْلاً إِلَى دَارِ جَارَةٍ لِغَزْلٍ وَحَدِيثٍ وَنَحْوِهِمَا بِشَرْطِ أَنْ تَرْجِعَ وَتَبِيتَ فِي بَيْتِهَا، وَتَنْتَقِلُ مِنَ الْمَسْكَنِ لِخَوْفٍ مِنْ هَدْمٍ أَوْ غَرَقٍ أَوْ عَلَى نَفْسِهَا،

---

بەو مەرجەی (ناشیزة) نەبێ، ئەگینا: مافی نیشتەجێکردنی نیە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە ﴿عن فريعة رضي الله عنها لَمَّا قُتِلَ زَوْجُهَا: أَمَرَهَا النَّبِيُّ ﷺ أَنْ تَمْكُثَ فِي بَيْتِهَا حَتَّى يَبْلُغَ الْكِتَابُ أَجَلَهُ، قَالَتْ: فَاعْتَدَدْتُ فِيهِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْراً﴾ رواه أصحاب السنن بسند صحيح، کە (فورەیعە) مێردەکەی کوژرا، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دایێ: لە ماڵەکەی خۆیدا بمێنێتەوە تا (عِدَّة)ی تەواو دەبێ، ئینجا بە چوارمانگو دە ڕۆژان (عِدَّة)ی تەواو کرد.

(وَفَسْخٍ) هەم مافی نیشتەجێکردن بۆ ئەو ژنەش واجبە: کە مارەبڕینەکەی هەڵوەشاندۆتەوە، بەو مەرجەی (ناشیزة) نەبێ (عَلَى الْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب، بەڵام ئەو ژنەی لە (عِدَّة)ی جیماعی بە (شبهة)و مارەبڕینی نادروستدایە، مافی نیشتەجێکردنی نیە، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

(وَتُسْكَنُ) واجبە: ژنی (عِدَّة)گری تەلاقو مردن نیشتەجێ بکرێ (فِي مَسْكَنٍ كَانَتْ فِيهِ عِنْدَ الْفُرْقَةِ) لەو خانووەدا کە لە کاتی لێکجیابوونەوە تێیدا نیشتەجێ بووە، بە بەڵگەی ئایەتەکەو حەدیسەکە (وَلَيْسَ لِلزَّوْجِ وَغَيْرِهِ إِخْرَاجُهَا) دروست نیە: نە مێردەکەیو نە کەسێکیتر لەو ماڵە دەریبکاتە دەرەوە، هەم (وَلاَ لَهَا خُرُوجٌ) بۆ ژنەکەش دروست نیەو حەرامە: لە خۆیەوە بە بێ‌عوزر لە ماڵ بڕواتە دەرەوە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿لاَ تُخْرِجُوهُنَّ مِنْ بُيُوتِهِنَّ وَلاَ يَخْرُجْنَ﴾ ئەو ژنانەی لە (عِدَّة)دانە لە ماڵەکانیان دەریان مەکەنو نابێ بە خۆیشیان دەربچن.

(قُلْتُ) ئیمامی (النواوي) دەفەرموێ (وَلَهَا الْخُرُوجُ فِي عِدَّةِ وَفَاةٍ وَكَذَا بَائِنٍ فِي النَّهَارِ) بۆ ژنەکە دروستە لە (عِدَّة)ی مێرد مردنو تەلاقداندا لە ڕۆژیدا بڕواتە دەرەوە (لِشِرَاءِ طَعَامٍ) بۆ کڕینی خواردەمەنیو (وَغَزْلٍ وَنَحْوِهِ) بۆ کڕینو فرۆشتنی ڕستنو خوریو لۆکەو لێکردنەوەی میوەی باغەکەیو ئەو جۆرە شتانەی (وَكَذَا لَيْلاً إِلَى دَارِ جَارَةٍ) هەروەها دروستە لە شەوێشدا بڕواتە ماڵیدراوسێیەکەی (لِغَزْلٍ وَحَدِيثٍ وَنَحْوِهِمَا) بۆ تەشی ڕستنو قسەکردنو ئەو شتانە (بِشَرْطِ أَنْ تَرْجِعَ وَتَبِيتَ فِي بَيْتِهَا) بەو مەرجەی بگەڕێتەوەو شەوێ لە ماڵەکەی خۆی بخەوێ.

(وَتَنْتَقِلُ مِنَ الْمَسْكَنِ) بۆ ژنەکە دروستە لەم خانووە بگوازێتەوە بۆ خانووێکیتر (لِخَوْفٍ مِنْ هَدْمٍ أَوْ غَرَقٍ) لە ترسی فەوتانی ماڵیخۆی بە ڕوخانو لافاوو دزی (أَوْ عَلَى نَفْسِهَا) یان

أَوْ تَأَذَّتْ بِالْجِيرَانِ أَوْ هُمْ بِهَا أَذىً شَدِيدًا وَاللهُ أَعْلَمُ. وَلَوْ انْتَقَلَتْ إِلَى مَسْكَنٍ بِإِذْنِ الزَّوْجِ فَوَجَبَتِ الْعِدَّةُ قَبْلَ وُصُولِهَا إِلَيْهِ اعْتَدَّتْ فِيهِ عَلَى النَّصِّ، أَوْ بِغَيْرِ إِذْنٍ فَفِي الأَوَّلِ، وَكَذَا لَوْ أَذِنَ ثُمَّ وَجَبَتْ قَبْلَ الْخُرُوجِ، وَلَوْ أَذِنَ فِي الإِنْتِقَالِ إِلَى بَلَدٍ فَكَمَسْكَنٍ، أَوْ فِي سَفَرِ حَجٍّ أَوْ تِجَارَةٍ ثُمَّ وَجَبَتْ فِي الطَّرِيقِ فَلَهَا الرُّجُوعُ وَالْمُضِيُّ، فَإِنْ مَضَتْ أَقَامَتْ لِقَضَاءِ حَاجَتِهَا ثُمَّ يَجِبُ الرُّجُوعُ لِتَعْتَدَّ الْبَقِيَّةَ فِي الْمَسْكَنِ،

---

له ترسی خودی‌خۆی كه بێناموسی‌ی لەگەڵ بكرێ (أَوْ تَأَذَّتْ بِالْجِيرَانِ) یان بە هۆی دراوسێیەكانی توشی ئازارێكی بەهێز ببێ (أَوْ هُمْ بِهَا أَذىً شَدِيدًا) یان دراوسێیەكان بە هۆی ژنەكەوە توشی ئازارێكی بەهێز ببن (وَاللهُ أَعْلَمُ)، بەڵام ئەگەر هیچ عوزرێكی نەبێ، دروست نیه بگوازێتەوە.

(وَلَوْ انْتَقَلَتْ إِلَى مَسْكَنٍ بِإِذْنِ الزَّوْجِ) ئەگەر ژنەكە -پێش واجببوونی(عِدَّة)- بە ئیزنی مێردەكەی گواستیەوە خانووێكی‌تر (فَوَجَبَتِ الْعِدَّةُ قَبْلَ وُصُولِهَا إِلَيْهِ) ئینجا پێش ئەوەی بگاتە ناو خانووە دووەمەكە، (عِدَّة)ی لە سەر واجب بوو: بە هۆی مردن، یان تەڵاقدان، ئەوە (اعْتَدَّتْ فِيهِ عَلَى النَّصِّ) لە سەر دەققی‌فەرموودەی ئیمامی(الشافعي): هەر لە دووەمەكەدا (عِدَّة)ی تەواو دەكا (أَوْ بِغَيْرِ إِذْنٍ) بەڵام ئەگەر بە بێ‌ئیزنی‌مێردەكەی گواستیەوە، ئەوە (فَفِي الأَوَّلِ) دەگەڕێتەوەو لە یەكەمەكەدا (عِدَّة)ی تەواو دەكا (وَكَذَا لَوْ أَذِنَ) هەروەها ئەگەر مێردەكە ئیزنی‌دا (ثُمَّ وَجَبَتْ قَبْلَ الْخُرُوجِ) ئینجا پێش دەرچوون (عِدَّة)ی لە سەر واجب بوو، ئەو كاتەش هەر لە یەكەمەكەدا (عِدَّة)ی تەواو دەكا.

(وَلَوْ أَذِنَ فِي الإِنْتِقَالِ إِلَى بَلَدٍ) ئەگەر مێردەكە ژنەكەی ئیزن دا بگوازێتەوە شارێكی‌تر، ئینجا (عِدَّة)ی لە سەر واجب بوو (فَكَمَسْكَنٍ) ئەوەش وەك گواستنەوەیە لە خانووێك بۆ خانووێكی‌تر: لەو ڕوونكردنەوەی‌ڕابردوودا.

(أَوْ فِي سَفَرِ حَجٍّ أَوْ تِجَارَةٍ) یان ئەگەر مێردەكە ژنەكەی ئیزن دا بڕواتە سەفەری حەج، یان بازرگانی، یان سەردانی خزمەكانی، یان گوزارو غەم ڕەواندن (ثُمَّ وَجَبَتْ فِي الطَّرِيقِ) ئینجا لە ڕێگەدا (عِدَّة)ی لە سەر واجب بوو: بە تەڵاقدان، یان بە مێرد مردن، ئەوە (فَلَهَا الرُّجُوعُ) بۆی دروستە-بەڵكو وەهاخێرترە- واز لە سەفەرەكەی بێنێ‌و بگەڕێتەوە، هەم (وَالْمُضِيُّ) بۆیشی دروستە: لە سەفەرەكەی بەردەوام بێ (فَإِنْ مَضَتْ) جا ئەگەر بە سەفەرەكەیدا ڕۆیشت‌و بەردەوام بوو و گەیشتە شوێنی مەبەست، ئەوە (أَقَامَتْ لِقَضَاءِ حَاجَتِهَا) لە شوێنەكەدا دەمێنێتەوە بۆ پێكهێنانی پێویستیەكانی (ثُمَّ) ئینجا كە پێویستیەكانی تەواو بون (يَجِبُ الرُّجُوعُ) واجبە: یەكسەر بە پەلە بگەڕێتەوە (لِتَعْتَدَّ الْبَقِيَّةَ فِي الْمَسْكَنِ) تاكو ئەوەندە (عِدَّة)ی لە سەری ماوە لە ماڵەوەدا تەواوی بكا.

وَلَوْ خَرَجَتْ إِلَى غَيْرِالدَّارِالْمَأْلُوفَةِ فَطَلَّقَ وَقَالَ: مَا أَذِنْتُ فِيالْخُرُوجِ. صُدِّقَ بِيَمِينِهِ، وَلَوْ قَالَتْ: نَقَلْتَنِي. فَقَالَ: بَل أَذِنْتُ لِحَاجَةٍ. صُدِّقَ عَلَىالْمَذْهَبِ، وَمَنْزِلُ بَدَوِيَّةٍ وَبَيْتُهَا مِنْ شَعَرٍ كَمَنْزِلِ حَضَرِيَّةٍ، وَإِذَا كَانَ الْمَسْكَنُ لَهُ وَيَلِيقُ بِهَا تَعَيَّنَ، وَلاَ يَصِحُّ بَيْعُهُ إِلاَّ فِي عِدَّةِ ذَاتِ أَشْهُرٍ فَكَمُسْتَأْجَرٍ، وَقِيلَ بَاطِلٌ، أَوْ مُسْتَعَارًا لَزِمَتْهَا فِيهِ فَإِنْ رَجَعَ الْمُعِيرُ وَلَمْ يَرْضَ بِأُجْرَةٍ نُقِلَتْ،

---

ئینجا بزانە: ئەگەر پێش ئەوەی بۆ سەفەر بڕواتە دەرەوە (عِدَّة)ی لە سەر واجب بوو، ئەو کاتە-تا (عِدَّة)ی تەواو دەبێ- حەرامە: بۆ حەج کردنو بازرگانیو سەفەرەکانیتریش بڕواتە دەرەوە: وەك سەردانی دایكو باوكیو زیارەتی گۆڕستانو...هتد، هەروەك لە زۆریەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَلَوْ خَرَجَتْ إِلَى غَيْرِ الدَّارِالْمَأْلُوفَةِ) ئەگەر ژنەکە چووە دەرەوە بۆ خانووێکیتر کە ئولفەتی بە نیشتەجێبوونیەوە نەگرتبو (فَطَلَّقَ) ئینجا مێردەکەی تەلاقی دا (وَقَالَ مَا أَذِنْتُ فِيالْخُرُوجِ) مێردەکەی گوتی: من تۆم ئیزن نەداوە بڕۆیتە دەرەوە. ئەوە (صُدِّقَ بِيَمِينِهِ) بە سوێند باوەڕ بە مێردەکە دەکرێ (وَلَوْ قَالَتْ: نَقَلْتَنِي)ئەگەر ژنەکە گوتیە مێردەکەی: تۆ منت گواستۆتەوە (فَقَالَ بَل أَذِنْتُ لِحَاجَةٍ) مێردەکەش گوتی: بەڵکو بۆ کارێك ئیزنم دابوی نەك گواستنەوە. ئەوەش (صُدِّقَ عَلَىالْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب: بە سوێندخواردن باوەڕ بە مێردەکە دەکرێ.

(وَمَنْزِلُ بَدَوِيَّةٍ وَبَيْتُهَا مِنْ شَعَرٍ) کەپرو هەوارگەو ڕەشماڵی چۆڵ نشینەکان (كَمَنْزِلِ حَضَرِيَّةٍ) وەك ماڵو خانووی نیشتەجێی ئاوەدانییە لە گشت ئەو بڕیارانەیڕابردوودا، واتە: لە ناو کەپرو ڕەشماڵەکەیدا (عِدَّة)ی تەواو دەکا، بەڵام ئەگەر لەکاتی(عِدَّة)دا دانیشتووانی هۆبەکە، یان خزمو کەسەکانیخۆی لەو شوێنە باریان کرد، ئەو کاتە ئەویش لەگەڵیان بار دەکا، هەروەك لە زۆریەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَإِذَا كَانَ الْمَسْكَنُ لَهُ) هەرکاتێك شوێنی نیشتەجێکردنەکە ملکی مێردەکەی بوو (وَيَلِيقُ بِهَا) شیاوی ژنەکەش بوو، ئەوە (تَعَيَّنَ) هەر ئەو شوێنە دیاری دەکرێ بۆ نیشتەجێکردنی ژنەکە، کەوابو: (وَلاَ يَصِحُّ بَيْعُهُ) فرۆشتنی شوێنەکە دروست نابێ (إِلاَّ فِي عِدَّةِ ذَاتِ أَشْهُرٍ) تەنها لە (عِدَّة)ی ئەو ژنەدا دروست دەبێ کە خاوەنی(عِدَّة)ی بە مانگ بێ، جا لەو حاڵەتەدا (فَكَمُسْتَأْجَرٍ) وەك خانووی بەکرێدراو فرۆشتنی دروست دەبێ، واتە: سوودەکانی ماوەی (عِدَّة) نابنە ملکی کڕیارەکە (وَقِيلَ بَاطِلٌ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: فرۆشتنەکە بەتاڵە.

(أَوْ مُسْتَعَارًا) یان شوێنەکە بە خواستن وەرگیرابو، ئینجا (لَزِمَتْهَا فِيهِ)لەو شوێنەدا (عِدَّة)ی لە سەر واجب بوو، تەماشا دەکەین: (فَإِنْ رَجَعَ الْمُعِيرُ وَلَمْ يَرْضَ بِأُجْرَةٍ) ئەگەر بەخوازدەرەکە پەشیمان بۆوەو بە کرێش ڕازی نەبو، ئەوە (نُقِلَتْ) ژنەکە دەگوازرێتەوە

وَكَذَا مُستَأجرٌ انقَضَتْ مُدَّتُهُ، أَوْ لَهَا استَمرَّتْ وَطَلَبَت الأُجْرَةَ، فَإِنْ كَانَ مَسكَنُ النِّكَاحِ نَفيسًا فَلَهُ النَّقلُ إِلَى لائِقٍ بِهَا، أَوْ خَسيسًا فَلَهَا الإمْتنَاعُ، وَلَيسَ لَهُ مُسَاكَنَتُهَا وَلاَ مُدَاخَلَتُهَا، فَإِنْ كَانَ فِى الدَّارِ مَحرَمٌ لَهَا مُمَيِّزٌ ذَكَرٌ، أَوْ لَهُ أُنثَى أَوْ زَوْجَةٌ أُخرَى أَوْ أَمَةٌ أَوْ امرَأَةٌ أَجنَبِيَّةٌ جَازَ، وَلَوْ كَانَ فِى الدَّارِ حُجْرَةٌ فَسكَنَهَا أَحدُهُمَا وَالآخَرُ الأُخرَى فَإِنْ اتَّحَدَت الْمَرَافِقُ كَمَطْبَخٍ وَمُستَرَاحٍ اشترِطَ مَحرَمٌ،

---

بۆ شوێنێكیتر (وَكَذَا مُستَأجرٌ انقَضَتْ مُدَّتُهُ) هەروەها شوێنی بەكرێگیراویش ئەگەر ماوەی تەواو بوو، وەك شوێنی خواستراوە: ئەگەر بەكرێدەرەكە بەكرێدانەكەی نوێ نەكردەوە ژنەكە دەگوازرێتەوە.

(أَوْ لَهَا) یان ئەگەر شوێنەكە ملكی ژنەكە بوو، ئەوە (استَمرَّتْ) هەر لە شوێنی خۆیدا لە سەر نیشتەجێبوون بەردەوام دەبێو (وَطَلَبَت الأُجْرَةَ) داوای كرێی ماوەی (عِدَّة)ش دەكا: لە مێردەكەی، یان لە میراتی مێردەكەی (فَإِنْ كَانَ مَسكَنُ النِّكَاحِ نَفيسًا) جا ئەگەر شوێنی نیشتەجێبوونی ژنو مێردایەتی زۆر بەنرخ بوو و بۆ (عِدَّة)گرتن شیاوی ژنەكە نەبو، ئەوە (فَلَهُ النَّقلُ إِلَى لائِقٍ بِهَا) بۆ مێردەكە دروستە ژنەكەی بگوازێتەوە بۆ شوێنێكی شیاوی ژنەكە، تا (عِدَّة)ی تەواو دەبێ (أَوْ خَسيسًا) یان شوێنەكە زۆر ناڕێك بوو و شیاوی ژنەكە نەبو، ئەو كاتە (فَلَهَا الإمْتنَاعُ) ژنەكەش مافی هەیە بەو شوێنە ڕازی نەبێو داوای شوێنێكی شیاوی خۆی بكا، تا (عِدَّة)ی تەواو دەبێ.

(وَلَيسَ لَهُ) بۆ مێردەكە دروست نیەو حەرامە: (مُسَاكَنَتُهَا وَلاَ مُدَاخَلَتُهَا) لەگەڵ ژنە تەڵاقدراوەكەی نیشتەجێ ببێو هەم حەرامە هاتوچۆی ئەو شوێنەش بكا كە ژنەكەی تێدا نیشتەجێیە، جیاوازی نیە تەڵاقەكە: (بائن)بێ، یان (رجعی) بێ.

بەڵام (فَإِنْ كَانَ فِى الدَّارِ مَحرَمٌ لَهَا) ئەگەر لە ناو خانووەكەدا مەحرەمێكیژنەكە هەبوو: كە (مُمَيِّزٌ ذَكَرٌ) فامیدەو نێرینە بوو (أَوْ لَهُ) یان مەحرەمێكیمێردەكە هەبوو: كە (أُنثَى) فامیدەو مێینە بوو (أَوْ زَوْجَةٌ أُخرَى) یان ژنێكیتری مێردەكە لەوێدا بوو (أَوْ أَمَةٌ أَوْ امرَأَةٌ أَجنَبِيَّةٌ) یان (جاریة)، یان ژنێكیبێگانە لەوێدا بوو، ئەو كاتە (جَازَ) دروستە مێردەكەش لەو شوێنەدا نیشتەجێ ببێو هەم هاتوچۆش بكا.

(وَلَوْ كَانَ فِى الدَّارِ حُجْرَةٌ) ئەگەر لە خانووەكەدا ژوورێك هەبوو (فَسكَنَهَا أَحدُهُمَا) لە ژنو مێردەكە یەكێكیان لەو ژوورەدا نیشتەجێ بوو (وَالآخَرُ الأُخرَى) ئەوەكەیتریش لە ژوورێكیتری خانووەكەدا نیشتەجێ بوو، تەماشا دەكەین: (فَإِنْ اتَّحَدَت الْمَرَافِقُ) ئەگەر سودلێوەگیراوەكانی خانووەكە یەك بون: (كَمَطْبَخٍ) وەك شوێنی چێشت لێنانو (وَمُستَرَاحٍ) شوێنی حەسانەوەو پەیژەو ئاودەستخانەو سەرشۆرگە، ئەوە (اشترِطَ مَحرَمٌ) بە مەرج داندراوە: مەحرەمێكیيەكێكیان لەوێ هەبێ.

وَإِلاَّ فَـــلاَ، وَيَنْبَغِـــي أَنْ يُغْلَـــقَ مَـــا بَيْنَهُمَـــا مِـــنْ بَـــاب وَأَنْ لاَ يَكُـــونَ مَمَـــرُّ إِحْـــدَاهُمَا عَلَى الأُخْـــرَى، وَسُـــفْلٌ وَعُلُـــوٌّ كَـــدَارٍ وَحُجْـــرَة.

(بَابُ الإِسْتِبْرَاء)

يَجِبُ بِسَبَبَيْنِ: أَحَدُهُمَا: مِلْكُ أَمَة بِشِرَاء أَوْ إِرْث أَوْ هِبَة أَوْ سَـبْيٍ أَوْ رَدٍّ بِعَيْـب أَوْ تَحَالُف أَوْ إِقَالَة، وَسَوَاءٌ بِكْرٌ وَمَنْ اسْتَبْرَأَهَا الْبَائِعُ قَبْلَ الْبَيْعِ وَمُنْتَقِلَةٌ مِنْ صَبِيٍّ وَامْـرَأَة وَغَيْرُهَا، وَيَجِبُ فِي مُكَاتَبَة عُجِّزَتْ وَكَذَا مُرْتَدَّةٌ فِي الأَصَحِّ،

---

(وَإِلا) بەڵام ئەگەر ئەو شتانە یەك نەبونو لێك جیابون، ئەو كاتە (فَلاَ) هەبوونی مەحرەمێك مەرج نیە، بەڵام (وَيَنْبَغِي أَنْ يُغْلَقَ مَا بَيْنَهُمَا مِنْ بَابٍ) پێویستە ئەو دەرگەی كەوتۆتە نێوان ژنو مێردەكە كلیل بدرێو هەم (وَأَنْ لاَيَكُونَ مَمَرُّ إِحْدَاهُمَا عَلَى الأُخْرَى) نابێ شوێنی هاتوچۆی ئەم ژوورە بە سەر ژوورەكەیترەوە بێ (وَسُفْلٌ وَعُلُوٌّ) نهۆمی خوارەوەو سەرەوە (كَدَارٍ وَحُجْرَةٍ) وەكو خانووو ژوورەكەیە: لەو ڕوونكردنەوەیڕابردوودا.

﴿بَابُ الإِسْتِبْرَاءِ: **باسی دڵنیایی لە ئاوس نەبوونی** (جارِيَة)﴾

واتە: چاوەڕوانكردنی(جارية)، تا ماوەیەك بۆ ئەوەی بزاندرێ هیچی لە منداڵدانەدا نیە، یان بۆ خواپەرستی. (يَجِبُ بِسَبَبَيْنِ)ئەو دڵنیاكردنە واجب دەبێ بە دوو هۆ، تا ماوەی دڵنیاكردنەكەش تەواو نەبێ، حەڕامە: لەزەت لەو (جارية)یە وەربگیرێ.

(أَحَدُهُمَا) هۆی یەكەمیان: (مِلْكُ أَمَةٍ) وەدەستهێنانی ملكایەتی (جارية)یەكە: (بِشِرَاءٍ أَوْ إِرْثٍ أَوْ هِبَةٍ أَوْ سَبْيٍ) بە هۆی كڕین، یان میرات، یان بەخشین، یان تاڵان، یان وەسێت (أَوْ رَدٍّ بِعَيْبٍ أَوْ تَحَالُفٍ أَوْ إِقَالَةٍ) یان بە هۆی گەڕاندنەوەی (جارية) فرۆشراوەكە: بە هۆی عەیبداری، یان سوێندخواردن، یان هەڵوەشاندنەوەی مامڵەتەكە (وَسَوَاءٌ) لەو دڵنیاكردنەكەدا یەكسانە: (بِكْرٌ) ئەو (جارية)یەی كچەو هەم (وَمَنْ اسْتَبْرَأَهَا الْبَائِعُ قَبْلَ الْبَيْعِ) ئەو (جارية)یەی فرۆشیارەكە پێش فرۆشتن خۆی لێدڵنیا كردوەو هەم (وَمُنْتَقِلَةٌ مِنْ صَبِيٍّ وَامْرَأَةٍ وَغَيْرِهَا) ئەو (جارية)یەی لە منداڵێكەوە، یان لە ئافرەتێكەوە دەگوازرێتەوە بۆ ملكایەتی یەكێكیتر، یان لە حەیز وەستاوە، یان زۆر منداڵە ﴿عن أبي سعيد﴾: قال النَّبِيُّ ﷺ فِي سَبَايَا أَوْطَاسٍ: أَلاَ لاَ تُوطَأُ حَامِلٌ حَتَّى تَضَعَ وَلاَ غَيْرُ ذَاتِ حَمْلٍ حَتَّى تَحِيضَ حَيْضَةً﴾ صححه الحاكم على شرط مسلم، پێغەمبەرﷺ لەبارەی ئافرەتە دیلەكانی(ئەوتاس)—كە لە غەزای (حُنَيْن) گیرابون— فەرمووی ئاگادار بن: نابێ (جارية)ی ئاوس جیماعی لەگەڵ بكرێ تا زگەكەی دادەنێ، ئەوەی ئاوسیش نیە نابێ جیماعی لەگەڵ بكرێ تا حەیزێك دەبینێ.

(وَيَجِبُ فِي مُكَاتَبَةٍ عُجِّزَتْ) دڵنیایی واجبە: لەو (جارية)دا كە بێتوانا كراوە لە پارەهێنانی نوسراوپێدانەكەو (وَكَذَا مُرْتَدَّةٌ فِي الأَصَحِّ) هەروەها لەو (جارية)یەشدا كە بوەتە كافر،

لاَ مَنْ خَلَتْ مِنْ صَوْمٍ وَاعْتِكَافٍ وَإِحْرَامٍ، وَفِي الإِحْرَامِ وَجْهٌ، وَلَوْ اشْتَرَى زَوْجَتَهُ اُسْتُحِبَّ، وَقِيلَ يَجِبُ، وَلَوْ مَلَكَ مُزَوَّجَةً أَوْ مُعْتَدَّةً لَمْ يَجِبْ، فَإِنْ زَالاَ وَجَبَ فِي الأَظْهَرِ. اَلثَّانِي: زَوَالُ فِرَاشٍ عَنْ أَمَةٍ مَوْطُوءَةٍ أَوْ مُسْتَوْلَدَةٍ بِعِتْقٍ أَوْ مَوْتِ السَّيِّدِ، وَلَوْ مَضَتْ مُدَّةُ اسْتِبْرَاءٍ عَلَى مُسْتَوْلَدَةٍ ثُمَّ أَعْتَقَهَا أَوْ مَاتَ وَجَبَ فِي الأَصَحِّ، قُلْتُ: وَلَوْ اسْتَبْرَأَ أَمَةً مَوْطُوءَةً فَأَعْتَقَهَا لَمْ يَجِبْ وَتَتَزَوَّجُ فِي الْحَالِ إِذْ لاَ تُشْبِهُ مَنْكُوحَةً وَاللهُ أَعْلَمُ. وَيَحْرُمُ تَزْوِيجُ أَمَةٍ مَوْطُوءَةٍ وَمُسْتَوْلَدَةٍ قَبْلَ الإِسْتِبْرَاءِ لِئَلاَ يَخْتَلِطَ الْمَاءَانِ، وَلَوْ أَعْتَقَ مُسْتَوْلَدَتَهُ فَلَهُ نِكَاحُهَا بِلاَ اسْتِبْرَاءٍ فِي الأَصَحِّ،

---

ئینجا بۆتەوە موسوڵمان (لاَ مَنْ خَلَتْ مِنْ صَوْمٍ وَاعْتِكَافٍ وَإِحْرَامٍ) بەڵام لەو (جارية)یەدا واجب نیە: کە لە ڕۆژوو و ئیعتیکاف و ئیحرام دەرچوە (وَفِي الإِحْرَامِ وَجْهٌ) لەبارەی ئیحرام فەرموودەیەك هەیە: کە دڵنیایی واجبە.

(وَلَوْ اشْتَرَى زَوْجَتَهُ) ئەگەر مێردەکە ژنە کۆیلەکەی‌خۆی کڕی (اُسْتُحِبَّ) سوننەتە خۆی لێ‌دڵنیا بکا (وَقِيلَ يَجِبُ) لە فەرموودەیەکدا واجبە (وَلَوْ مَلَكَ مُزَوَّجَةً أَوْ مُعْتَدَّةً) ئەگەر پیاوێك (جارية)یەکی مارەبڕاو، یان (عِدَّة)گری کردە ملکی‌خۆی (لَمْ يَجِبْ) ئێستا واجب نیە: دڵنیایی بکا، بەڵام (فَإِنْ زَالاَ وَجَبَ فِي الأَظْهَرِ) ئەگەر مارەبڕینەکەو (عِدَّة)کە نەمان، ئەو کاتە واجبە: دڵنیایی بکا، ئینجا دروست دەبێ لەزەتی لێوەربگرێ.

(اَلثَّانِي) هۆی‌دووەمی دڵنیایی: (زَوَالُ فِرَاشٍ عَنْ أَمَةٍ مَوْطُوءَةٍ أَوْ مُسْتَوْلَدَةٍ) لاچوونی سەرجێ‌یی‌یە لەو (جارية)ی کە جیماعی لەگەڵ کراوە، یان دایکەمنداڵە، جا لاچوونەکەش: (بِعِتْقٍ أَوْ مَوْتِ السَّيِّدِ) بە هۆی ئازادبوونی بێ، یان بە هۆی مردنی گەورەکەی بێ، کەوابو: (وَلَوْ مَضَتْ مُدَّةُ اسْتِبْرَاءٍ عَلَى مُسْتَوْلَدَةٍ) ئەگەر ماوەی دڵنیایی بە سەر (جارية)یەکی دایکەمنداڵدا ڕۆیشت (ثُمَّ أَعْتَقَهَا أَوْ مَاتَ) ئینجا گەورەکەی ئازادی کرد، یان مرد (وَجَبَ فِي الأَصَحِّ) ئەو کاتەش دڵنیایی هەر واجبە.

(قُلْتُ) ئیمامی (النواوي) دەفەرموێ (وَلَوْ اسْتَبْرَأَ أَمَةً مَوْطُوءَةً) ئەگەر دڵنیایی‌ی(جارية)کی جیماع لەگەڵکراوی کرد (فَأَعْتَقَهَا) ئینجا ئازادی کرد، ئەوە (لَمْ يَجِبْ) دووبارە دڵنیایی واجب نیە، کەوابو: (وَتَتَزَوَّجُ فِي الْحَالِ) دەتوانێ لە دوای ئازادکردنی دەمودەست شوو بکا (إِذْ لاَ تُشْبِهُ مَنْكُوحَةً) چونکە ئەو (جارية)یە وەکو مارەبڕاونیە (وَاللهُ أَعْلَمُ).

(وَيَحْرُمُ) حەرامەو دروست نابێ (تَزْوِيجُ أَمَةٍ مَوْطُوءَةٍ) ئەو (جارية)یەی جیماعی لەگەڵ کردوە لە کەسێکی‌تری مارە بکا، هەم (وَمُسْتَوْلَدَةٍ) ئەو (جارية)ش کە دایکەمنداڵە حەرامە (قَبْلَ الإِسْتِبْرَاءِ) پێش دڵنیاکردن (لِئَلاَ يَخْتَلِطَ الْمَاءَانِ) نەوەك ئاوەکانی هەردوو پیاوەکان تێکەڵ ببن، بەڵام (وَلَوْ أَعْتَقَ مُسْتَوْلَدَتَهُ) ئەگەر (جارية) دایکەمنداڵەکەی خۆی ئازاد کرد (فَلَهُ نِكَاحُهَا بِلاَ اسْتِبْرَاءٍ فِي الأَصَحِّ) بۆی دروستە بێ دڵنیایی لە خۆی مارە بکا، چونکە

وَلَوْ أَعْتَقَهَا أَوْ مَاتَ، وَهِيَ مُزَوَّجَةٌ فَلاَ اسْتِبْرَاءَ، وَهُوَ بِقَرْءٍ وَهُوَ حَيْضَةٌ كَامِلَةٌ فِي الْجَدِيدِ، وَذَاتُ أَشْهُرٍ بِشَهْرٍ، وَفِي قَوْلٍ بِثَلاَثَةٍ، وَحَامِلٌ مَسْبِيَّةٌ أَوْ زَالَ عَنْهَا فِرَاشُ سَيِّدٍ بِوَضْعِهِ، وَإِنْ مُلِكَتْ بِشِرَاءٍ فَقَدْ سَبَقَ أَنْ لاَ اسْتِبْرَاءَ فِي الْحَالِ، قُلْتُ: يَحْصُلُ الإِسْتِبْرَاءُ بِوَضْعِ حَمْلِ زِنًا فِي الأَصَحِّ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَلَوْ مَضَى زَمَنُ اسْتِبْرَاءٍ بَعْدَ الْمِلْكِ وَقَبْلَ الْقَبْضِ حُسِبَ إِنْ مَلَكَ بِإِرْثٍ وَكَذَا شِرَاءٌ فِي الأَصَحِّ، لاَ هِبَةٍ، وَلَوْ اشْتَرَى مَجُوسِيَّةً فَحَاضَتْ ثُمَّ أَسْلَمَتْ لَمْ يَكْفِ، وَيَحْرُمُ الإِسْتِمْتَاعُ بِالْمُسْتَبْرَأَةِ إِلاَّ مَسْبِيَّةً فَيَحِلُّ غَيْرُ وَطْءٍ،

---

دوو ئاو تێکەڵ نابن (وَلَوْ أَعْتَقَهَا أَوْ مَاتَ وَهِيَ مُزَوَّجَةٌ) ئەگەر (جارية)یەکی مارەبڕاوی ئازاد کرد، یان گەورەکە مرد، (جارية)کەش مارەبڕاو بوو، ئەوە (فَلاَ اسْتِبْرَاءَ) هیچ دڵنیایی واجب نیە، چونکە گەورەکەی سەرجێیی نەکردوە.

(وَهُوَ) ئەندازەی دڵنیاکردن: (بِقَرْءٍ) بە یەك (قُرْء) دەبێ (وَهُوَ حَيْضَةٌ كَامِلَةٌ فِي الْجَدِيدِ) مەبەست بە (قُرْء)—لێرەدا—حەیزێکی تەواوە، بە بەڵگەی حەدیسەکەیڕابردوو (وَذَاتُ أَشْهُرٍ بِشَهْرٍ) ئەو (جارية)یەی خاوەن مانگە بە مانگێك دڵنیایی تەواو دەبێ (وَفِي قَوْلٍ بِثَلاَثَةٍ) لە فەرموودەیەکدا بە سێ مانگ تەواو دەبێ (وَحَامِلٌ مَسْبِيَّةٌ) ئەو (جارية)یەی ئاوسەو تاڵانکراوە (أَوْ زَالَ عَنْهَا فِرَاشُ سَيِّدٍ) یان ئاوسەو سەرجێیی گەورەکەی نەماوە (بِوَضْعِهِ) بە دانانی زگەکەی دڵنیایی تەواو دەبێ، بە بەڵگەی حەدیسەکەیڕابردوو.

(وَإِنْ مُلِكَتْ بِشِرَاءٍ) ئەگەر (جارية) ئاوسەکە بە کڕین کرابێتە ملکی کڕیارەکە (فَقَدْ سَبَقَ أَنْ لاَ اسْتِبْرَاءَ فِي الْحَالِ) لە پێش ئێرەدا ڕابرا: کە ئێستا دڵنیایی واجب نیە، بەڵکو لە دوای دانانی زگەکەی دڵنیایی واجب دەبێ (قُلْتُ) ئیمامی (النواوي) دەفەرموێ (يَحْصُلُ الإِسْتِبْرَاءُ بِوَضْعِ حَمْلِ زِنًا فِي الأَصَحِّ) دڵنیایی دێتەجێ بە دانانی کۆرپەی زینا (وَاللهُ أَعْلَمُ) چونکە دڵنیا دەبێ کە هیچی لەمنداڵدانەدا نیە.

(وَلَوْ مَضَى زَمَنُ اسْتِبْرَاءٍ بَعْدَ الْمِلْكِ وَقَبْلَ الْقَبْضِ) ئەگەر لە دوای بەملککردنی (جارية)کەو پێش وەرگرتنیی ماوەی دڵنیایی تەواو بوو، ئەوە (حُسِبَ إِنْ مَلَكَ بِإِرْثٍ) ماوەکەی بۆ حیساب دەکرێ ئەگەر بە میرات کرابێتە ملك (وَكَذَا شِرَاءٍ فِي الأَصَحِّ) هەروەها ئەگەر بە کڕینیش کرابێـە ملك حساب دەکرێ (لاَ هِبَةٍ) بەڵام ئەگەر بە بەخشین بێ، ماوەی پێش وەرگرتن حیساب ناکرێ (وَلَوْ اشْتَرَى مَجُوسِيَّةً) ئەگەر (جارية)یەکی ئاگرپەرست، یان بتپەرستی کڕی (فَحَاضَتْ) ئینجا لە دوای کڕین حەیزێکی بینی (ثُمَّ أَسْلَمَتْ) ئینجا موسوڵمان بوو، ئەوە (لَمْ يَكْفِ) ئەو حەیزە بەس نیەو بەر دڵنیایی ناکەوێ، چونکە حەڕامە جیماع لەگەڵ (جارية)ی بتپەرستو ئاگر پەرست بکرێ.

(وَيَحْرُمُ الإِسْتِمْتَاعُ بِالْمُسْتَبْرَأَةِ) لە ماوەی دڵنیاییدا حەڕامە لەزەت لەو (جارية)یە وەربگیرێ کە دڵنیایی لێدەکرێ (إِلاَّ مَسْبِيَّةً فَيَحِلُّ غَيْرُ وَطْءٍ) تەنها ئەو (جارية)یەی بە

وَقِيلَ لاَ، وَقِيلَ لاَ، وَإِذَا قَالَتْ: حِضْتُ. صُدِّقَتْ، وَلَوْ مَنَعَت السَّيِّدَ فَقَالَ: أَخْبَرْتِنِي بِتَمَامِ الإِسْتِبْرَاءِ. صُدِّقَ، وَلاَ تَصِيرُ أَمَةٌ فِرَاشًا إِلاَّ بِوَطْءٍ، فَإِذَا وَلَدَتْ لِلإِمْكَانِ مِنْ وَطْئِهِ لَحِقَهُ، وَلَوْ أَقَرَّ بِوَطْءٍ وَنَفَى الْوَلَدَ وَادَّعَى اسْتِبْرَاءً لَمْ يَلْحَقْهُ عَلَى الْمَذْهَبِ، فَإِنْ أَنْكَرَتِ الإِسْتِبْرَاءَ حَلَفَ أَنَّ الْوَلَدَ لَيْسَ مِنْهُ، وَقِيلَ: يَجِبُ تَعَرُّضُهُ لِلأَسْتِبْرَاءِ، وَلَوْ ادَّعَتْ اسْتِيلاَدًا فَأَنْكَرَ أَصْلَ الْوَطْءِ وَهُنَاكَ وَلَدٌ لَمْ يُحَلَّفْ عَلَى الصَّحِيحِ، وَلَوْ قَالَ: وَطِئْتُهَا وَعَزَلْتُ. لَحِقَهُ فِي الأَصَحِّ.

---

تالان گیراوه–جگه له جیماع– حه‌لاله: له‌زه‌تی لێوه‌ربگیرێ (وَقِيلَ لاَ) له فه‌رمووده‌یه‌کی بێهێزدا حه‌لاڵ نیه (وَإِذَا قَالَتْ: حِضْتُ) هه‌رکاتێك (جارية)که گوتی: که‌وتومه‌ته حه‌یز (صُدِّقَتْ) به بێسوێند باوه‌ڕی پێده‌کرێ، به‌لام (وَلَوْ مَنَعَتِ السَّيِّدَ) ئه‌گه‌ر (جارية)که رێگه‌ی نه‌دا گه‌وره‌که‌ی جیماعی له‌گه‌ڵ بکا (فَقَالَ: أَخْبَرْتِنِي بِتَمَامِ الإِسْتِبْرَاءِ) گه‌وره‌که‌ش گوتیه (جارية)که: تۆ به منت گوت: دڵنیاییم ته‌واو بوه. ئه‌و کاته (صُدِّقَ) به سوێند باوه‌ڕ به گه‌وره‌که‌ی ده‌کرێ.

(وَلاَ تَصِيرُ أَمَةٌ فِرَاشًا إِلاَّ بِوَطْءٍ) هیچ (جارية)یه‌ك نابێته سه‌رجێیگه‌وره‌که‌ی ته‌نها به جیماع له‌گه‌ڵکردن ده‌بێتێ، که‌وابو: (فَإِذَا وَلَدَتْ لِلإِمْكَانِ مِنْ وَطْئِهِ) ئه‌گه‌ر (جارية)که له کاتی جیماعیه‌وه به ماوه‌یه‌کی وه‌ها منداڵێکی لێبو: که ده‌گونجا له گه‌وره‌که‌ی بێ، ئه‌وه (لَحِقَهُ) نه‌ژادی منداڵه‌که ده‌گاته گه‌وره‌که‌یو ده‌بێته منداڵی وی.

(وَلَوْ أَقَرَّ بِوَطْءٍ) ئه‌گه‌ر گه‌وره‌که دانی به جیماعکردندا هێنا، به‌لام (وَنَفَى الْوَلَدَ وَادَّعَى اسْتِبْرَاءً) گوتی منداڵه‌که هی من نیه‌و پاش جیماعکردنه‌که‌م به حه‌یزێك دڵنیایم کردوه، ئه‌و کاته (لَمْ يَلْحَقْهُ عَلَى الْمَذْهَبِ) نه‌ژادی منداڵه‌که ناگاته گه‌وره‌که (فَإِنْ أَنْكَرَتِ الإِسْتِبْرَاءَ) جا ئه‌گه‌ر (جارية)که گوتی: ڕاست ناکا دڵنیایی نه‌کردوه. ئه‌و کاته (حَلَفَ أَنَّ الْوَلَدَ لَيْسَ مِنْهُ) گه‌وره‌که سوێند ده‌درێ که منداڵه‌که له‌وی نیه (وَقِيلَ: يَجِبُ تَعَرُّضُهُ لِلأَسْتِبْرَاءِ) له فه‌رمووده‌یه‌کی بێهێزدا: واجبه له سوێنده‌که‌یدا باسی دڵنیاییش بکا.

(وَلَوْ ادَّعَتْ اسْتِيلاَدًا) ئه‌گه‌ر (جارية)که گوتی: له گه‌وره‌که‌م بویمه دایکه‌منداڵ، واته: منداڵێکم لێی بووه (فَأَنْكَرَ أَصْلَ الْوَطْءِ) گه‌وره‌که‌ش گوتی ڕاست ناکاو هه‌ر جیماعم له‌گه‌ڵی نه‌کردوه (وَهُنَاكَ وَلَدٌ) له‌و حاڵه‌ته‌شدا منداڵێك هه‌بو، ئه‌وه (لَمْ يُحَلَّفْ عَلَى الصَّحِيحِ) گه‌وره‌که سوێند نادرێو منداڵه‌که‌ش نابێته منداڵی وی.

به‌لام (وَلَوْ قَالَ: وَطِئْتُهَا وَعَزَلْتُ) ئه‌گه‌ر گه‌وره‌که گوتی: جیماعم له‌گه‌ڵ کردوه، به‌لام ئاوه‌که‌م تێنه‌کردوه‌و له ده‌ره‌وه‌م ڕشتوه، ئه‌و کاته (لَحِقَهُ فِي الأَصَحِّ) نه‌ژادی منداڵه‌که‌ی ده‌گاتێو ده‌بێته منداڵی وی.

## (كِتَابُ الرَّضَاعِ)

إِنَّمَا يَثْبُتُ بِلَبَنِ امْرَأَة حَيَّة بَلَغَتْ تِسْعَ سِنِينَ، وَلَوْ حَلَبَتْ فَأُوجِرَ بَعْدَ مَوْتِهَا حَرُمَ فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ جُبِّنَ أَوْ نُزِعَ مِنْهُ زُبْدٌ حَرَّمَ، وَلَوْ خُلِطَ بِمَائِعٍ حَرَّمَ إِنْ غَلَبَ، فَإِنْ غُلِبَ وَشَرِبَ الْكُلَّ -قِيلَ أَوِ الْبَعْضَ- حَرَّمَ فِي الأَظْهَرِ، وَيُحَرِّمُ إِيجَارٌ وَكَذَا إِسْعَاطٌ عَلَى الْمَذْهَبِ، لاَ حُقْنَةٌ فِي الأَظْهَرِ،

---

### ﴿ كِتَابُ الرَّضَاعِ: پەڕتوكی شیرخواردن ﴾

بزانە: لە پەڕتووكی ژن هێناندا ڕابرا: كە (ئەو ئافرەتانەی بە هۆی نەژاد حەڕامن، بە هۆی شیرخواردنیش حەڕامن). كەوابو: لە سەر ئافرەتان واجبە: ئەو شیرخواردنەیان لەبیر بێ‌و بینوسن‌و ئاشكراشی بكەن، هەروەك لە (الشروانی)دا فەرموویەتی.

ئینجا (إِنَّمَا يَثْبُتُ) ئەو شیرخورادنەش تەنها بەوە جێگیر دەبێ: كە (بِلَبَنِ إِمْرَأَةٍ حَيَّةٍ) بە شیری ئافرەتێكی زیندوو بێ‌و هەم (بَلَغَتْ تِسْعَ سِنِينَ) تەمەنی ئافرەتەكەش گەیشتبێتە نۆ ساڵ، هەرچەند كچیش بێ‌و جیماعی لەگەڵ نەكرابێ، واتە: بە شیری پیاو و بە شیری ئاژەڵ‌و گیاو درەخت‌و بە شیری ئافرەتی‌مردوو حەڕامی جێگیر نابێ.

بەڵام (وَلَوْ حَلَبَتْ) ئەگەر ئافرەتێك بە زیندوویی شیری‌خۆی دۆشی (فَأُوجِرَ بَعْدَ مَوْتِهَا) ئینجا لە دوای مردنی‌ئافرەتەكە شیرەكەی پێنج جار درایە منداڵێك، ئەوە (حَرَّمَ فِي الأَصَحِّ) حەڕامی دەگەیەنێ‌و جێگیری دەكا، لە فەرموودەی ڕاستردا، چونكە لە حاڵەتی زیندووەتی‌دا شیرەكە لە ئافرەتەكە جیا بۆتەوە.

(وَلَوْ جُبِّنَ) ئەگەر شیری ئافرەتێك كرایە پەنیر، یان هەویری پێ شێلدرا (أَوْ نُزِعَ مِنْهُ زُبْدٌ) یان ڕونەكەی لێ جیا كراوە، ئینجا بەو شێوەیە درایە منداڵەكە، ئەوەش (حَرَّمَ) حەڕامی دەگەیەنێ (وَلَوْ خُلِطَ بِمَائِعٍ) ئەگەر شیری ئافرەتەكە تێكەڵی شلەیەكی وەكو ئاو كرا، ئەوە (حَرَّمَ إِنْ غَلَبَ) حەڕامی دەگەیەنێ ئەگەر شیرەكە زۆرتر بێ (فَإِنْ غُلِبَ) جا ئەگەر شیرەكە كەمتر بوو (وَشَرِبَ الْكُلَّ) منداڵەكەش هەموو تێكەڵكراوەكەی خواردەوە (قِيلَ أَوِ الْبَعْضَ) لە فەرموودەیەكی بێ‌هێزدا: یان بەشێكی خواردەوە، ئەوەش (حَرَّمَ) حەڕامی دەگەیەنێ (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا: چونكە هەموو شیرەكە گەیوەتە ناو هەناوی منداڵەكە.

(وَيُحَرِّمُ إِيجَارٌ) تێكردنی شیرەكە دەناو گەروی منداڵەكەدا حەڕامی دەگەیەنێ (وَكَذَا إِسْعَاطٌ) هەروەها دەناو لوتیشی‌دا حەڕامی دەگەیەنێ (عَلَى الْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب (لاَ حُقْنَةٌ فِي الأَظْهَرِ) بەڵام تێكردنی شیر دەكونەكانی خوارەوەدا حەڕامی ناگەیەنێ، لە فەرموودەی بەهێزتردا.

وَشَرْطُهُ: رَضِيعٌ حَيٌّ لَمْ يَبْلُغْ سَنَتَيْنِ وَخَمْسُ رَضَعَاتٍ، وَضَبْطُهُنَّ بِالْعُرْفِ، فَلَوْ قَطَعَ إِعْرَاضًا تَعَدَّدَ، أَوْ لِلَّهْوِ وَعَادَ فِي الْحَالِ أَوْ تَحَوَّلَ مِنْ ثَدْيٍ إِلَى ثَدْيٍ فَلاَ، وَلَوْ حُلِبَ مِنْهَا دَفْعَةً وَ أُوجِرَهُ خَمْسًا أَوْ عَكْسُهُ

---

(وَشَرْطُهُ) مەرجی ئەو شیرخواردنەی حەرامی دەگەیەنێ: (رَضِيعٌ حَيٌّ) منداڵە شیرخۆرەكە زیندوو بێو (لَمْ يَبْلُغْ سَنَتَيْنِ) تەمەنی نەگەیشتبێتە دوو ساڵان، واتە: ئەگەر لە كاتی شیرخواردنەكە تەمەنیشیرخۆرەكە گەیشتبوە دوو ساڵان، ئەوە حەرامی ناگەیەنێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لاَيُحَرِّمُ مِنَ الرَّضَاعِ إلاَّ مَا فَتَقَ الأَمْعاءَ وَكَانَ قَبْلَ الْفِطَامِ﴾ صححه الترمذي، هیچ شیرخواردنێك حەرامی ناگەیەنێ تەنها ئەو شیرەی چۆتە ناو ڕیخۆڵەكانو پێش لە شیركردنەوەی منداڵەكەش بووە -واتە: پێش دوو ساڵ- حەرامی دەگەیەنێ.

(وَ) هەروەها مەرجە: (خَمْسُ رَضَعَاتٍ) شیرخۆرەكە پێنج جار شیرەكە بخوا، واتە: كەمتر لە پێنج جار حەرامی ناگەیەنێ ﴿عن عائشةرضیالله عنها: كَانَ فِيمَا أُنْزِلَ مِنَ الْقُرآنِ (عَشْرُ رَضَعَاتٍ مَعْلُومَاتٍ يُحَرِّمْنَ). ثُمَّ نُسِخْنَ بِخَمْسٍ مَعْلُومَاتٍ، فَتُوُفِّيَ رَسُولُ اللهِﷺ وَهُنَّ فِيما يُقْرَأُ مِنَ الْقُرْآنِ﴾ رواه مسلم، لە سەرەتاوە لە قورئانی پیرۆزدا ئایەتێك هەبوو: كە (دە شیرخواردنی زاندراو حەرامی دەگەیەنن). ئینجا دە جارەكە (نَسْخ) بونەوە بە پێنج جاریزاندراو، ئینجا پێغەمبەرﷺ وەفاتی كردو هێشتا پێنج جارەكەش لە قورئاندا دەخوێندرانەوە. واتە: خوێندنەوەی پێنج جارەكەش (نَسْخ) بۆوە، بەڵام بڕیارەكەی هەر بەردەوامە.

جا بزانە: لە مەزهەبی ئیمام (أبیحنیفە)و ئیمام(مالك)دا: تەنها یەك جار شیرخورادن حەرامی دەگەیەنێ. هەروەك لە (مغنی)و (مجمع الأنهر)دا فەرموویانە، كەوابو: ئاگاداریە: لەو حاڵەتەدا مارەبڕین بە مەزهەبی (حنفی)و (مالكی) دروست نابێ، والله أعلم.

(وَضَبْطُهُنَّ بِالْعُرْفِ) دیاریكردنی پێنج جارەكە بەگوێرەی عادەتی شیردەرو شیرخۆرەكانە، كەوابو: (فَلَوْ قَطَعَ إِعْرَاضًا) ئەگەر شیرخۆرەكە بەخۆی دەمی لە مەمكیشیردەرەكە كردەوەو وازی لە شیرخواردن هێنا، ئەوە (تَعَدَّدَ) شیرخواردنەكە بەگوێرەی وازلێهێنانەكان دەژمێردرێ، هەرچەند شیرە مژراوەكەش زۆر كەم بێو شیرخۆرەكەش تێر نەبوبێ، چونكە تێرخواردن مەرج نیە.

(أَوْ لِلَّهْوِ وَعَادَ فِي الْحَالِ) یان ئەگەر لە بەر گەمەكردن، یان خەوتن، یان پشوودان منداڵەكە وازی لە مەمك مژین هێناو ئینجا هەر ئەو دەم گەڕاوە سەر مەمك مژینەكە (أَوْ تَحَوَّلَ مِنْ ثَدْيٍ إِلَى ثَدْيٍ) یان لە مەمكێكەوە چووە سەر مەمكەكەیتر، یان شیردەرەكە بۆ كارێكی خۆی شیرخۆرەكەی لە مەمكەكە كردەوەو ئینجا گەڕاوەو مەمكی دایێ، ئەوە (فَلاَ) لەو حاڵەتانەدا بە چەند جار ناژمێردرێ، بەڵكو تەنها بە یەك جار دادەندرێ.

(وَلَوْ حُلِبَ مِنْهَا دَفْعَةً) ئەگەر شیرەكە بە جارێك لە ژنەكە دۆشرا، ئینجا (وَأُوجِرَهُ خَمْسًا) بە پێنج جار درایە شیرخۆرەكە (أَوْ عَكْسُهُ) یان بە پێچەوانەكەی: بە پێنج جار دۆشراو بە یەك

فَرْضَعَةٌ، وَفِي قَوْلٍ خَمْسٌ، وَلَوْ شَكَّ هَلْ خَمْسًا أَمْ أَقَلَّ أَوْ هَلْ رَضَعَ فِي حَوْلَيْنِ أَمْ بَعْدُ؟ فَلاَ تَحْرِيمَ، وَفِي الثَّانِيَةِ قَوْلٌ أَوْ وَجْهٌ. وَتَصِيرُ الْمُرْضِعَةُ أُمَّهُ وَالَّذِي مِنْهُ اللَّبَنُ أَبَاهُ، وَتَسْرِي الْحُرْمَةُ إِلَى أَوْلاَدِهِ،

---

جار درابیێ، ئەوە (فَرَضْعَةٌ) لە هەردوو مەسەلەدا بە یەك جار دادەندرێ (وَفِي قَوْلٍ خَمْسٌ) لە فەرموودەیەکدا: پێنج جارە، بەڵام ئەگەر پێنج جار لە ژنەکە دۆشراو بە پێنج جاریش درایە شیرخۆرەکە، ئەوە بە پێنج جار دەژمێردرێ، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.

(وَلَوْ شَكَّ هَلْ خَمْسًا أَمْ أَقَلَّ) ئەگەر کەوتە گومان: ئایا پێنج جار شیری خواردوە، یان کەمتر (أَوْ هَلْ رَضَعَ فِي حَوْلَيْنِ أَمْ بَعْدُ؟) یان ئایا لە ناو دوو ساڵەکەدا شیری خواردوە، یان لە دوای تەواوبوونی دوو ساڵەکە؟ ئەوە لە هەردوو مەسەلەکەدا (فَلاَ تَحْرِيمَ) بەو شیرخواردنە هیچ حەرامکردنێك جێگیر نابێ، بەڵام (وَفِي الثَّانِيَةِ قَوْلٌ أَوْ وَجْهٌ) لە مەسەلەی دووەمدا: فەرموودەیەك هەیە: کە حەرامی دەگەیەنێ. کەوابو: وا باشە خۆپاراستن بکاو مەزهەبەکەی‌ڕابردووی ئیمام (أبی‌حنیفە)و ئیمام(مالك) ڕەچاو بکاو خۆی توشی ئەو گومانلێکراوە نەکا، چونکە ناپەسندە: ئەو جۆرە ئافرەتانە لە خۆی مارە بکا، هەروەك لە (تحفە)و (نهایە)دا فەرموویانە.

بەڵکو ئەگەر تەنها ئافرەتێکیش بڵێ: من شیرم داوەتێ. ئەو کاتەش سوننەتە: خۆپاراستن بکا، ناپەسندە: مارەی بکا ﴿عَنْ عُقْبَةَ﵁ تَزَوَّجْتُ امْرَأَةً، فَقَالَتْ إِمْرَأَةٌسَوْدَاءُ: قَدْ أَرْضَعْتُكُمَا. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: كَيْفَ بِهَا وَقَدْ زَعَمَتْ أَنَّهَا قَدْ أَرْضَعَتْكُمَا؟ دَعْهَا عَنْكَ﴾ رواه البخاری، ژنێکم لە خۆم مارەکرد، جا ئافرەتێکی‌ڕەش گوتی: من شیرم داوەتە ئێوە. جا پێغەمبەر ﷺ فەرموی: چی لێدەکەی، خۆ ئافرەتەکە گوتی: شیرم داونێ؟ وازی لێبێنە.

﴿ ئەوانەی بە شیرخواردن حەرامن ﴾

بزانە: لە باسی (ئەو ئافرەتانەی حەرامن پیاو لەخۆیان مارەبکا) باسی ئەو ئافرەتانەشمان کرد کە بە هۆی شیر حەرامن، بەڵام لێرەشدا بە (قَاعِدَة)وە ڕوونیان دەکەینەوەو دەڵێین: هەر کاتێك شیرخواردنەکە مەرجەکانی هاتنە جێ، ئەوە:

(وَتَصِيرُ الْمُرْضِعَةُ أُمَّهُ) ئافرەتە شیردەرەکە دەبێتە دایکی‌شیرخۆرەکە، هەم (وَالَّذِي مِنْهُ اللَّبَنُ أَبَاهُ) ئەو پیاوەی شیرەکەی وەژنەکە هێناوە دەبێتە باوکی‌شیرخۆرەکە، ئینجا (وَتَسْرِي الْحُرْمَةُ إِلَى أَوْلاَدِهِ) ئەو حەرامبوونەش لە شیرخۆرەکەوە‌—تەنها— پێدادەڕواتە لای منداڵەکانی‌و منداڵی‌منداڵەکانیشی، هەر چەند بەرەو خوار بن، واتە: گشتیان لە شیردەرەکەو لە مێردی شیردەرەکە حەرام دەبن:

کەوابو: ژنی‌شیرخۆرەکەو ژنی‌کوڕەکانیشی لە مێردی‌شیردەرەکە حەرام دەبن؟ چونکە مێردەکە دەبێتە خەزور، هەروەها مێردی‌شیرخۆرەکەو مێردی‌کیژەکانیشی لە شیردەرەکە

وَلَوْ كَانَ لِرَجُلٍ خَمْسٌ مُسْتَوْلَدَاتٌ أَوْ أَرْبَعُ نِسْوَةٍ وَأُمُّ وَلَدٍ فَرَضَعَ طِفْلٌ مِنْ كُلٍّ رَضْعَةً صَارَ ابْنَهُ فِي الأَصَحِّ فَيَحْرُمْنَ عَلَيْهِ لأَنَّهُنَّ مَوْطُوآتُ أَبِيهِ، وَلَوْ كَانَ بَدَلَ الْمُسْتَوْلَدَاتِ بَنَاتٌ أَوْ أَخَوَاتٌ فَلاَ حُرْمَةَ فِي الأَصَحِّ، وَآبَاءُ الْمُرْضِعَةِ مِنْ نَسَبٍ أَوْ رَضَاعٍ أَجْدَادٌ لِلرَّضِيعِ، وَأُمَّهَاتُهَا جَدَّاتُهُ،

---

حەرام دەبن؟ چونکە شیردەرەکە دەبێتە خەسوو، هەروەك لە باسی (ئافرەتەکانی حەرام)دا ڕوونمان کردەوە، بەڵام حەرامبوونەکە دایکو باوکی شیرخۆرەکەو خوشکو برایەکانی شیرخۆرەکەو مامو خاڵو پورەکانی ناگرێتەوە، جیاوازی نیە: خوشکو برایەکانی لە خۆی بچوکتر بن، یان گەورەتر بن، کەواتە: بۆ باوکو برایەکانی شیرخۆرەکە دروستە: شیردەرەکەو کیژەکانی شیردەرەکە لە خۆیان مارە بکەن، هەم بۆ مێردی شیردەرەکەش دروستە: دایکیشیرخۆرەکە، یان خوشکەکانیشیرخۆرەکە لە خۆی مارە بکا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلَوْ كَانَ لِرَجُلٍ خَمْسٌ مُسْتَوْلَدَاتٌ) ئەگەر پیاوێك پێنج (جارية)ی دایکەمنداڵی هەبن (أَوْ أَرْبَعُ نِسْوَةٍ وَأُمُّ وَلَدٍ) یان چوار ژنو دایکە منداڵێکی هەبن (فَرَضَعَ طِفْلٌ مِنْ كُلٍّ رَضْعَةً) ئینجا منداڵێك لە هەر یەکێکیان جارێك شیری خوارد، ئەوە (صَارَ إِبْنَهُ فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا: منداڵەکە دەبێتە کوڕی پیاوەکە، چونکە شیری (جارية)کانو ژنەکان لەویەوە هاتوە، کەوابو: (فَيَحْرُمْنَ عَلَيْهِ) ژنەکانو (جارية)کانیش لە شیرخۆرەکە حەرام دەبن؟ (لأَنَّهُنَّ مَوْطُوآتُ أَبِيهِ) چونکە گشتیان جیماع لەگەڵکراوی باوکە شیریەکەینی، هەرچەند یەکە یەکەش نەبونەتە دایکی، کەوابو: (وَلَوْ كَانَ بَدَلَ الْمُسْتَوْلَدَاتِ بَنَاتٌ أَوْ أَخَوَاتٌ) ئەگەر لەجیاتی پێنج (جارية)کان پێنج کیژیپیاوەکە، یان پێنج خوشکیپیاوەکە، هەر یەکەو جارێك شیر بدەنە منداڵێك، ئەوە (فَلاَ حُرْمَةَ فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا: هیچ حەرامی ناگەیەنێ، چونکە لەو پێنجانە هیچێکیان نەبوەتە دایکیشیرخۆرەکە، کەوابو: پیاوەکەش نابێتە باپیرەو ناشبێتە خاڵ.

ئینجا بزانە: پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿يَحْرُمُ مِنَ الرَّضَاعِ مَا يَحْرُمُ مِنَ النَّسَبِ﴾ رواه الشيخان، ئەو ئافرەتانەی بە هۆی خزمایەتی حەرام دەبن، بە هۆی شیرخواردنیش حەرام دەبن. کەوابو: حەرامبوونەکە لە دایکە شیردەرەکەوەو لە باوکە شیریەکەوە پێدا دەڕواتە لای دایکەکانیانو باوکەکانیانو لای کیژەکانیانو کوڕەکانیانو لای خوشکەکانیانو برایەکانیانو لای مامەکانیانو خاڵەکانیانو پورەکانیان:

کەواتە: (وَآبَاءُ الْمُرْضِعَةِ مِنْ نَسَبٍ أَوْ رَضَاعٍ) باوکەکانی دایکە شیردەرەکە لە نەژادو لە شیر (أَجْدَادٌ لِلرَّضِيعِ) گشتیان باپیرەی شیرخۆرەکەنەو (وَأُمَّهَاتُهَا جَدَّاتُهُ) دایکەکانی دایکە

وَأَوْلَادُهَا مِنْ نَسَبٍ أَوْ رَضَاعٍ إِخْوَتُهُ وَأَخَوَاتُهُ، وَإِخْوَتُهَا وَأَخَوَاتُهَا أَخْوَالُهُ وَخَالَاتُهُ، وَأَبُو ذِي اللَّبَنِ جَدُّهُ، وَأَخُوهُ عَمُّهُ وَكَذَا الْبَاقِي، وَاللَّبَنُ لِمَنْ نُسِبَ إِلَيْهِ وَلَدٌ نَزَلَ بِهِ بِنِكَاحٍ أَوْ وَطْءِ شُبْهَةٍ لَا زِنًا، وَلَوْ نَفَاهُ بِلِعَانٍ انْتَفَى اللَّبَنُ عَنْهُ، وَلَوْ وُطِئَتْ مَنْكُوحَةٌ بِشُبْهَةٍ أَوْ وَطِئَ اثْنَانِ بِشُبْهَةٍ فَوَلَدَتْ

---

شیردەرەکە لە نەژادو لە شیر گشتیان داپیرەی شیرخۆرەکەنەو (وَأَوْلَادُهَا مِنْ نَسَبٍ أَوْ رَضَاعٍ) کیژو کوڕەکانی دایکە شیردەرەکە لە نەژادو لە شیر (إِخْوَتُهُ وَأَخَوَاتُهُ) گشتیان خوشکو برای شیرخۆرەکەنە (وَإِخْوَتُهَا وَأَخَوَاتُهَا) براو خوشکەکانی دایکە شیردەرەکە لە نەژادو لە شیر (أَخْوَالُهُ وَخَالَاتُهُ) گشتیان خاڵو پوری شیرخۆرەکەنە.

(وَأَبُو ذِي اللَّبَنِ) باوکی خاوەن شیرەکە، واتە: باوکی باوکە شیریەکە (جَدُّهُ) باپیرەی شیرخۆرەکەیەو (وَأَخُوهُ عَمُّهُ) برای خاوەن شیرەکە مامی‌شیرخۆرەکەیە (وَكَذَا الْبَاقِي) خزمەکانی‌تریش ئەوهانە، واتە: دایکی خاوەن شیرەکە داپیرەی شیرخۆرەکەیە، کیژو کوڕەکانی خاوەن شیرەکە خوشکو برای شیرخۆرەکەنە، براو خوشکەکانی خاوەن شیرەکە مامو پوری شیرخۆرەکەنە.

**پێناسەی خاوەن شیر**، واتە: باوکە شیریەکە (وَاللَّبَنُ) شیری ژنەکە (لِمَنْ نُسِبَ إِلَيْهِ وَلَدٌ) بۆ ئەو پیاوەیە کە نەژادی منداڵێکی دەدرێتە پاڵی: کە (نَزَلَ بِهِ) بە هۆی ئەو منداڵە شیرەکە دابەزیوەتە مەمکی‌ژنەکە، جا نەژادەکەش (بِنِكَاحٍ أَوْ وَطْءِ شُبْهَةٍ) بە مارەبڕینێکی دروستبوو بێ، یان بە جیماعێکی بە هەڵە بێ.

جا بزانە: بە تەنها مارەبڕینو جیماعکردن پیاوەکە نابێتە خاوەنی شیرەکە، بەڵکو هەر کاتێك ژنەکە لە پیاوەکە ئاوس بوو، لەو کاتەوە پیاوەکە دەبێتە خاوەنی‌شیرەکە، هەرچەند ژنەکەش زگەکەی دانەنابێ، بەڵام بەو مەرجەی پێش ئاوسبوون شیری تێدا نەبوبێ، چونکە ئەگەر کچێك بە بێ‌جیماع شیری تێدا بوبێو ئینجا شووی کردبێو ئاوس بوبێ، ئەو شیرە بێ‌خاوەنەو شیرخۆرەکەش بێ‌باوکە، تا ئەو کاتەی ژنەکە کوڕیەکەی دەبێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)و حاشیەکانی ڕوون کراوەتەوە.

(لَا زِنًا) بەڵام ئەگەر بە زینا کوڕیەکە پەیدا بوبێ، زیناکارەکە نابێتە خاوەن شیر، چونکە تۆوی زینا هیچ ڕێزێکی نیە، واتە: بۆ لایەنی پیاوە زیناکارەکە هیچ حەرامی ناگەیەنێ، تەنها بۆ لایەنی دایکە زیناکارەکە حەرامی دەگەیەنێ، کەواتە: شیرخۆرەکە بێ‌باوکە.

(وَلَوْ نَفَاهُ بِلِعَانٍ) ئەگەر مێردەکە بە لەعنەتکردن نەژادی منداڵەکەی لە خۆی لادا، ئەوە (انْتَفَى اللَّبَنُ عَنْهُ) شیرەکەش لەوی لادەچێو بە خاوەنی شیرەکە دانانرێ.

(وَلَوْ وُطِئَتْ مَنْكُوحَةٌ بِشُبْهَةٍ) ئەگەر ژنێکی‌مارەبڕاو بە هەڵە جیماعی لەگەڵ کراو منداڵێکی لێبوو (أَوْ وَطِئَ اثْنَانِ بِشُبْهَةٍ فَوَلَدَتْ) یان دوو پیاو بە هەڵە جیماعیان لەگەڵ ژنێك کردو

فَاللَّبَنُ لِمَنْ لَحِقَهُ الْوَلَدُ بِقَائِفٍ أَوْ غَيْرِهِ، وَلاَ تَنْقَطِعُ نِسْبَةُاللَّبَنِ عَنْ زَوْجٍ مَاتَ أَوْ طَلَّقَ وَإِنْ طَالَتِ الْمُدَّةُ أَوْ انْقَطَعَ وَعَادَ، فَإِنْ نَكَحَتْ آخَرَ وَوَلَدَتْ مِنْهُ فَاللَّبَنُ بَعْدَالْوِلاَدَةِ لَهُ وَقَبْلَهَا لِلأَوَّلِ إِنْ لَمْ يَدْخُلْ وَقْتَ ظُهُورِ لَبَنِ حَمْلِ الثَّانِي، وَكَذَا إِنْ دَخَلَ، وَفِي قَوْلٍ لِلثَّانِي وَفِي قَوْلٍ لَهُمَا.
(فَصْلٌ) تَحْتَهُ صَغِيرَةٌ فَأَرْضَعَتْهَا أُمُّهُ أَوْ أُخْتُهُ أَوْ زَوْجَةٌ أُخْرَى

---

منداڵێکی لێبو، ئەوە (فَاللَّبَنُ لِمَنْ لَحِقَهُ الْوَلَدُ) شیری ژنەکە بۆ ئەوەیانە کە نەژادی منداڵەکەی دەگەیەندرێتێ (بِقَائِفٍ أَوْ غَيْرِهِ) بە هۆی دروشمناس، یان بە هۆی ئەوەی تەنها بگونجێ هی یەکێکیان بێ.
(وَلاَتَنْقَطِعُ نِسْبَةُاللَّبَنِ عَنْ زَوْجٍ مَاتَ أَوْ طَلَّقَ) نیسبەتیشیرەکە لەو مێردە ناپچڕێ: کە مردبێ، یان ژنەکەی تەلاق دابێ (وَإِنْ طَالَتِ الْمُدَّةُ) هەرچەند ماوەی لێکجیابوونەوەکەش زۆر درێژ بێ (أَوِ انْقَطَعَ وَعَادَ) یان لە دوای لێکجیابوونەوە شیرەکە ببڕێو بێتەوە ناو مەمکەکانی، هەرچەند لە دوای دە ساڵانیش شیرەکە لە مەمکەکانی پەیدا ببێتەوە هەر بە شیری مێردەکەی دادەندرێ، بەو مەرجەی بە هۆی پیاوێکیتر شیرەکە پەیدا نەبوبێتەوە.
کەوابو: (فَإِنْ نَكَحَتْ آخَرَ) ئەگەر ژنەکە شووی بە پیاوێکیتر کرد، یان بە هەڵە جیماعی لەگەڵ کرا (وَوَلَدَتْ مِنْهُ) جا لەو دووەمە منداڵێکیتەواوی بوو، ئەو کاتە (فَاللَّبَنُ بَعْدَالْوِلاَدَةِ لَهُ) شیرەکەی دوایمنداڵبوونەکە شیریدووەمەکەیە (وَقَبْلَهَا لِلأَوَّلِ) شیرەکەی پێش منداڵبوونەکەش شیرییەکەمەکەیە (إِنْ لَمْ يَدْخُلْ وَقْتَ ظُهُورِ لَبَنِ حَمْلِ الثَّانِي) ئەگەر کاتی ئاشکرابوونی شیری کۆرپەی ناو زگی دووەمەکە نەهاتبێ (وَكَذَا إِنْ دَخَلَ) هەروەها ئەگەر کاتی شیری کۆرپەی ناو زگی دووەمەکەش هاتبێ، شیرەکە هەر بۆ مێردەکەییەکەمە تا منداڵەکەی دەبێ؟ چونکە شیر نابێتە خۆراکی کۆرپەی ناو زگ (وَفِي قَوْلٍ لِلثَّانِي) لە فەرموودەیەکدا: بۆ دووەمەکەیە (وَفِي قَوْلٍ لَهُمَا) لە فەرموودەیەکیتردا: بۆ هەردووکیانە.
﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر ژنەکە لە زینا منداڵێکی بوو، ئەو کاتەش نیسبەتی شیرەکە لە مێردەکەی دەپچڕێو دەبێتە شیریزیناو بێخاوەنە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، ئینجا ئاگاداریە: ئەگەر ژنەکە منداڵێکیتەواوی دانەنا، بەڵکو پارچە خوێنەکە، یان پارچە گۆشتەکەی دانا، ئەو کاتە بە منداڵبوون دانانرێو شیرەکە هەر شیری یەکەمەکەیە، هەروەك لە (الشبراملسی)دا روون کراوەتەوە.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی هەڵوەشاندنەوەی مارەبڕین بە هۆی بەسەرداهاتنی شیرخواردن ﴾

(تَحْتَهُ صَغِيرَةٌ) ئەگەر پیاوێك مارەبڕاوێکی بچوکی لە دوو ساڵ کەمتری لە ژێردا بوو (فَأَرْضَعَتْهَا أُمُّهُ أَوْ أُخْتُهُ أَوْ زَوْجَةٌ أُخْرَى) ئینجا دایکیپیاوەکە، یان خوشکەکەی، یان

الفَسخَ نكَاحُهُ، وَللصَّغيرَة نصفُ مَهْرِهَا وَلَهُ عَلَى الْمُرْضعَة نصفُ مَهرمثْلِ وَفِي قَوْلِ كُلُّهُ، وَلَوْ رَضَعَتْ منْ نَائمَة فَلاَ غُرْمَ وَلاَ مَهْرَ للْمُرْتَضعَة، وَلَوْ كَانَ تَحْتَهُ كَـبيرَةٌ وَصَـغيرَةٌ فَأَرْضَعَتْ أُمُّ الْكَبيرَة الصَّغيرَةَ انْفَسَخَت الصَّغيرَةُ وَكَذَا الْكَبيرَةُ فِي الأَظْهَر، وَلَهُ نكَاحُ مَنْ شَاءَ منْهُمَا، وَحُكْمُ مَهْر الصَّغيرَة وَتَغْرِيمُهُ الْمُرْضعَةَ مَا سَبَقَ، وَكَذَا الْكَبيرَةُ إِنْ لَمْ تَكُـنْ مَوْطُوءَةً، فَإِنْ كَانَتْ مَوْطُوءَةً

---

ژنیکی‌تری پیاوەکە، یان ژنی‌باوکی، یان ژنی‌کوڕی، یان ژنی‌برای پێنج جار شیری دایە ئەو ژنە بچووکە، ئەوە (انْفَسَخَ نِكَاحُهُ) بە تەواوبوونی جاری‌پێنجەم مارەبڕینی‌پیاوەکە لەو ژنە بچوکە هەڵدەوەشێتەوەو هەتا هەتایی لێی حەرام دەبێ؟ چونکە: یان دەبێتە خوشکی لەدایکی‌ی، یان کیژی‌خوشکی، یان کیژی‌ژنی، یان خوشکی لەباوکی، یان کیژی کوڕی، یان کیژی‌برای.

هەروەها لە مەسەلەی سێیەمدا ژنە گەورەکەیشی هەتاهەتای لێحەرام دەبێ، چونکە بووەتە خەسووی، ئینجا (وَللصَّغيرَة نصفُ مَهْرِهَا) ژنە بچوکەکە نیوە مارەیی‌ی لە سەر مێردەکە واجبە (وَلَهُ عَلَى الْمُرْضعَة نصفُ مَهرمثْلِ) مێردەکەش نیوەی مارەیی هاوێنەی لە سەر شیردەرەکە بۆ واجب دەبێ لە تۆڵەی لە دەستدانی ژنەکەی (وَفِي قَوْلِ كُلُّهُ) لە فەرموودەیەکدا: هەموو مارەیی هاوێنە لە سەر شیردەرەکە واجب دەبێ.

بەڵام (وَلَوْ رَضَعَتْ منْ نَائمَة) ئەگەر ژنە بچوکەکە بەخۆی پێنج جار شیری لە ژنێکی خەوتوو خوارد، ئەو کاتە (فَلاَغُرْمَ) هیچ تۆڵە لە سەر ژنە خەوتووەکە نیە، هەم (وَلاَ مَهْرَ للْمُرْتَضعَة) هیچ نیوە مارەییش بۆ شیرخۆرە بچوکەکە لە سەر مێردەکەی واجب نابێ؟ چونکە بە کرداری‌خۆی مارەبڕینەکەی هەڵوەشاوەتەوە.

(وَلَوْ كَانَ تَحْتَهُ كَبيرَةٌ وَصَغيرَةٌ) ئەگەر پیاوەکە مارەبڕاوێکی گەورەو مارەبڕاوێکی‌بچوکی لە ژێردا بون (فَأَرْضَعَتْ أُمُّ الْكَبيرَة الصَّغيرَةَ) ئینجا دایکی ژنە گەورەکەی پێنج جار شیری دایە ژنە بچوکەکەی، ئەوە (انْفَسَخَت الصَّغيرَةُ وَكَذَا الْكَبيرَةُ فِي الأَظْهَر) مارەبڕینی بچوکەکەو هەم گەورەکەش هەڵدەوەشێتەوە؟ چونکە بونەتە خوشکی یەکتر، بەڵام (وَلَهُ نكَاحُ مَنْ شَاءَ منْهُمَا) لە دوای هەڵوەشانەوەکە بۆی دروستە: تەنها یەکێکیان -بە حەز لێبوونی خۆی- دوو بارە لەخۆی مارە بکاتەوە.

(وَحُكْمُ مَهْر الصَّغيرَة وَتَغْرِيمُهُ الْمُرْضعَةَ مَا سَبَقَ) بڕیاری واجببوونی نیوە مارەیی بچوکەکەو تۆڵە سەندنی مێردەکە لە شیردەرەکە: وەك مەسەلەکەی‌ڕابراوە (وَكَذَا الْكَبيرَةُ إِنْ لَمْ تَكُنْ مَوْطُوءَةً) هەروەها ژنە گەورەکەش -ئەگەر جیماعی لەگەڵ نەکردبێ- وەك بچوکەکە نیوە مارەیی‌ی لە سەر مێردەکە واجب دەبێ‌و مێردەکەش نیوە مارەیی هاوێنەی -لە تۆڵە- لە سەر دایکە شیردەرەکە واجب دەبێ، بەڵام (فَإِنْ كَانَتْ مَوْطُوءَةً) ئەگەر جیماعی لەگەڵ ژنە

فَلَهُ عَلَى الْمُرْضِعَةِ مَهْرُمِثْلٍ فِي الأَظْهَرِ، وَلَوْ أَرْضَعَتْ بِنْتُ الْكَبِيرَةِ الصَّغِيرَةَ حَرُمَتِ الْكَبِيرَةُ أَبَدًا وَكَذَا الصَّغِيرَةُ إِنْ كَانَتْ الْكَبِيرَةُ مَوْطُوءَةً، وَلَوْ كَانَ تَحْتَهُ صَغِيرَةٌ فَطَلَّقَهَا فَأَرْضَعَتْهَا امْرَأَةٌ صَارَتْ أُمَّ امْرَأَتِهِ، وَلَوْ نَكَحَتْ مُطَلَّقَتُهُ صَغِيرًا وَأَرْضَعَتْهُ بِلَبَنِهِ حَرُمَتْ عَلَى الْمُطَلِّقِ وَالصَّغِيرِ أَبَدًا، وَلَوْ زَوَّجَ أُمَّ وَلَدِهِ عَبْدَهُ الصَّغِيرَ فَأَرْضَعَتْهُ لَبَنَ السَّيِّدِ حَرُمَتْ عَلَيْهِ وَعَلَى السَّيِّدِ، وَلَوْ أَرْضَعَتْ مَوْطُوءَتُهُ الأَمَةُ صَغِيرَةً تَحْتَهُ بِلَبَنِهِ أَوْ لَبَنِ غَيْرِهِ حَرُمَتَا عَلَيْهِ،

---

گەورەکەی کردبێ، ئەو کاتە (فَلَهُ عَلَى الْمُرْضِعَةِ مَهْرُمِثْلٍ فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا: مێردەکە تەواوی مارەیی هاووێنەی-لە تۆڵە- لە سەر دایکە شیرەدەرەکە واجب دەبێ، چونکە ئەویش مارەییەکی تەواوی بۆ ئەو ژنە لە سەر واجب بووە.

(وَلَوْ أَرْضَعَتْ بِنْتُ الْكَبِيرَةِ الصَّغِيرَةَ) ئەگەر کیژێکی ژنە گەورەکەی پێنج جار شیری دایە ئەم ژنە بچوکەی، ئەوە (حَرُمَتِ الْكَبِيرَةُ أَبَدًا) ژنە گەورەکەی هەتا هەتایی لێحەرام دەبێ؟ چونکە بووەتە داپیرەی ژنەکەی (وَكَذَا الصَّغِيرَةُ إِنْ كَانَتْ الْكَبِيرَةُ مَوْطُوءَةً) هەروەها بچوکەکەشی هەتا هەتایی لێحەرام دەبێ ئەگەر جیماعی لەگەڵ ژنە گەورەکەی کردبێ؟ چونکە بووتە کیژە ژنی.

(وَلَوْ كَانَ تَحْتَهُ صَغِيرَةٌ فَطَلَّقَهَا) ئەگەر مارەبڕاوێکیبچوکی لە ژێردا بوو و تەڵاقیدا (فَأَرْضَعَتْهَا امْرَأَةٌ) ئینجا لە دوایتەڵاقدان ژنێك پێنج جار شیری دایە تەڵاقدراوەکە، ئەوە (صَارَتْ أُمَّ امْرَأَتِهِ) شیردەرەکە دەبێتە خەسوویو هەتا هەتایی لێیحەرامە لە خۆی مارەی بکا (وَلَوْ نَكَحَتْ مُطَلَّقَتُهُ صَغِيرًا) ئەگەر ژنێکیگەورەی تەڵاقدراویخۆی شووی بە منداڵێکی شیرخۆر کرد، ئینجا (وَأَرْضَعَتْهُ بِلَبَنِهِ) بە شیری تەڵاقدەرەکە شیری دایە ئەم مێردە شیرخۆرەی، ئەوە (حَرُمَتْ عَلَى الْمُطَلِّقِ وَالصَّغِيرِ أَبَدًا) ژنەکە هەتاهەتای لە تەڵاقدەرەوکەو لە شیرخۆرەکە حەرام دەبێ؟ چونکە بووەتە ژنە کوڕی تەڵاقدەرەکەو، دایکی شیرخۆرەکەو، هەم ژنی باوکیشی.

(وَلَوْ زَوَّجَ أُمَّ وَلَدِهِ عَبْدَهُ الصَّغِيرَ) ئەگەر (جارية) دایکە منداڵکەیی لە کۆیلە بچوکەکەی خۆی مارە کرد (فَأَرْضَعَتْهُ لَبَنَ السَّيِّدِ) دایکە منداڵەکەش شیری گەورەکەی دایە کۆیلەکە، ئەوە (حَرُمَتْ عَلَيْهِ وَعَلَى السَّيِّدِ) لە کۆیلەکەو لە گەورەکەی حەرام دەبێ، چونکە دەبێتە دایکی کۆیلەکەو، ژنی کوڕە شیریەکەی گەورەکە (وَلَوْ أَرْضَعَتْ مَوْطُوءَتُهُ الأَمَةُ صَغِيرَةً تَحْتَهُ) ئەگەر (جارية)یەکی جیماع لەگەڵکراویخۆی شیری دایە ژنێکیبچوکی وی (بِلَبَنِهِ أَوْ لَبَنِ غَيْرِهِ) بە شیری وی، یان بەشیری کەسێکیتر، ئەوە (حَرُمَتَا عَلَيْهِ) ژنە شیرخۆرەکەو (جارية) شیردەرەکە هەردووکیان لە خاوەن (جارية)کە بە یەکجاری حەرام دەبن؟ چونکە شیرخۆرەکە کیژی جیماع لەگەڵ کراوەکەیەتی، (جارية)کەش دایکی ژنەکەیەتی.

وَلَوْ كَانَ تَحْتَهُ صَغِيرَةٌ وَكَبِيرَةٌ فَأَرْضَعَتْهَا انْفَسَخَتَا وَحَرُمَتْ الْكَبِيرَةُ أَبَدًا وَكَذَاالصَّغِيرَةُ إِنْ كَانَ الإِرْضَاعُ بِلَبَنِهِ، وَإِلاَّ فَرَبِيبَةٌ، وَلَوْ كَانَ تَحْتَهُ كَبِيرَةٌ وَثَلاَثٌ صَغَائِرَ فَأَرْضَعَتْهُنَّ حَرُمَتْ أَبَدًا، وَكَذَاالصَّغَائِرُ إِنْ أَرْضَعَتْهُنَّ بِلَبَنِهِ أَوْ لَبَنِ غَيْرِهِ وَهِيَ مَوْطُوءَةٌ، وَإِلاَّ فَإِنْ أَرْضَعَتْهُنَّ مَعًا بِإِيجَارِهِنَّ الْخَامِسَةَ انْفَسَخْنَ وَلاَ يَحْرُمْنَ مُؤَبَّدًا، أَوْ مُرَتَّبًا لَمْ يَحْرُمْنَ وَتَنْفَسِخُ الأُولَى وَالثَّالِثَةُ،

---

(وَلَوْ كَانَ تَحْتَهُ صَغِيرَةٌ وَكَبِيرَةٌ) ئەگەر ژنێکیگەورەو ژنێکیبچوکی لە ژێردا بون (فَأَرْضَعَتْهَا) ئینجا ژنە گەورەکە پێنج جار شیری دایە ژنە بچوکەکە، ئەوە (انْفَسَخَتَا) مارەبڕینی هەردووکیان هەڵدەوەشێتەوە (وَحَرُمَتْ الْكَبِيرَةُ أَبَدًا) ژنەگەورەکەی هەتا هەتایی لێحەرام دەبێ؟ چونکە دایکیژنەکەیەتی (وَكَذَا الصَّغِيرَةُ) هەروەها بچوکەکەشی هەتا هەتایی لێحەرام دەبێ (إِنْ كَانَ الإِرْضَاعُ بِلَبَنِهِ) ئەگەر ژنە گەورەکە شیری مێردەکەی دابێتێ؟ چونکە دەبێتە کیژی خاوەنی شیرەکە (وَإِلاَّ فَرَبِيبَةٌ) بەڵام ئەگەر شیری مێردەکەی نەدابێتێ، ئەو کاتە دەبێتە کیژەژن، واتە: ئەگەر جیماعی لەگەڵ ژنە گەورەکەی کردبێ، ئەو کاتە بچوکەکەشی لێحەرام دەبێ، ئەگەر نا: حەرام نابێ.

(وَلَوْ كَانَ تَحْتَهُ كَبِيرَةٌ وَثَلاَثٌ صَغَائِرَ) ئەگەر ژنێکی گەورەو سێ ژنی بچوکی لە ژێردا بون (فَأَرْضَعَتْهُنَّ) ژنەگەورەکەش هەر یەکەو پێنج جار شیری دانێ، ئەوە (حَرُمَتْ أَبَدًا) گەورەکەی هەتا هەتایی لێحەرام دەبێ؟ چونکە دایکیژنەکانیەتی (وَكَذَا الصَّغَائِرُ إِنْ أَرْضَعَتْهُنَّ بِلَبَنِهِ) هەروەها هەرسێك بچوکەکانیشی لێحەرام دەبن ئەگەر شیری مێردەکەی دابنێ؟ چونکە دەبنە کیژی مێردەکە (أَوْ لَبَنِ غَيْرِهِ وَهِيَ مَوْطُوءَةٌ) یان شیری پیاوێکیتری دابنێ بەڵام جیماع لەگەڵکراوی مێردەکەی بێ؟ چونکە دەبنە کیژە ژنێکی جیماع لەگەڵکراو (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر مێردەکە جیماعی لەگەڵ گەورەکە نەکردبو و شیرەکەش هی پیاوێکیتر بوو، ئەو کاتەش گەورەکە هەتاهەتای حەرام دەبێ؟ چونکە دایکی ژنەکانیەتی، ئینجا تەماشا دەکەین:

(فَإِنْ أَرْضَعَتْهُنَّ مَعًا بِإِيجَارِهِنَّ الْخَامِسَةَ) ئەگەر گەورەکە وێکڕا شیری دابنێ: وەك جاری پێنجەم وێکڕا شیرەکەی دەگەروویان بکا، ئەوە (انْفَسَخْنَ) مارەی هەرسێکیان هەڵدەوەشێتەوە؟ چونکە بونەتە خوشکییەکتری، بەڵام (وَلاَ يَحْرُمْنَ مُؤَبَّدًا) هەتا هەتایی لێی حەرام نابن، چونکە جیماعی لەگەڵ دایکیان نەکردوە، کەواتە: تەنها تەنها هەرکامەیان حەز بکا لە خۆی مارە دەکاتەوە (أَوْ مُرَتَّبًا) یان یەك لە دوای یەك شیری دانێ، ئەو کاتەش (لَمْ يَحْرُمْنَ) هەتا هەتایی لێی حەرام نابن؟ چونکە جیماعی لەگەڵ دایکیان نەکردوە، بەڵام (وَتَنْفَسِخُ الأُولَى) مارەییەکەمەکە هەڵدەوەشێتەوە؟ چونکە لەگەڵ دایکەکەی لە ژێر مارەی یەك پیاودا کۆ بونەتەوە (وَالثَّالِثَةُ) مارەی سێیەمەکەش هەڵدەوەشێتەوە؟ چونکە

وَتَنْفَسِخُ الثَّانِيَةُ بِإِرْضَاعِ الثَّالِثَةِ، وَفِي قَوْلٍ لاَ يَنْفَسِخُ، وَيَجْرِي الْقَوْلاَنِ فِيمَنْ تَحْتَهُ صَغِيرَتَانِ أَرْضَعَتْهُمَا أَجْنَبِيَّةٌ مُرَتَّبًا أَيَنْفَسِخَانِ أَمِ الثَّانِيَةُ؟. (فَصْلٌ) قَالَ: هِنْدٌ بِنْتِي أَوْ أُخْتِي بِرَضَاعٍ. أَوْ قَالَتْ: هُوَ أَخِي. حَرُمَ تَنَاكُحُهُمَا، وَلَوْ قَالَ زَوْجَانِ: بَيْنَنَا رَضَاعٌ مُحَرِّمٌ. فُرِّقَ بَيْنَهُمَا وَسَقَطَ الْمُسَمَّى وَوَجَبَ مَهْرُمِثْلٍ إِنْ وَطِئَ،

---

بوەتە خوشکی دووەمەکە، کەوابو: (وَتَنْفَسِخُ الثَّانِيَةُ بِإِرْضَاعِ الثَّالِثَةِ) بە فەرموودەی بەهێزتر: مارەیدووەمەکەش بە شیردانی سێیەمەکە هەڵدەوەشێتەوە (وَفِي قَوْلٍ لاَ يَنْفَسِخُ) لە فەرموودەیەکدا: مارەیدووەمەکە هەڵناوەشێتەوە.

(وَيَجْرِي الْقَوْلاَنِ) ئەو دوو فەرموودە بەهێزو بێهێزە دێنەجێ: (فِيمَنْ تَحْتَهُ صَغِيرَتَانِ) لەو پیاوەدا: کە دوو ژنیبچوکی لە ژێردابن‌و (أَرْضَعَتْهُمَا أَجْنَبِيَّةٌ) ژنێکی بێگانە هەر یەکەو پێنج جار شیری دانێ (مُرَتَّبًا) یەك لە دوای یەك، ئەوە بێگانەکە دەبێتە دایکیژنەکانی، ئینجا (أَيَنْفَسِخَانِ أَمِ الثَّانِيَةُ؟) ئایا مارەی هەردوو ژنە بچوکەکانیش هەڵدەوەشێتەوە، یان تەنها دووەمەکە؟ بە فەرموودەی بەهێزتر: مارەی هەردووکیان هەڵدەوەشێتەوە؟ چونکە بونەتە خوشکی یەکتری، بەڵام هەتا هەتایی لێی حەرام نابن‌و کامەیان حەز دەکا لە خۆی مارە دەکاتەوە.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی ئاشکراکردنی شیرخواردن بە شاهیدو دانپێداهێنان ﴾

**یەکەم**: دانپێداهێنان (قَالَ: هِنْدٌ بِنْتِي أَوْ أُخْتِي بِرَضَاعٍ) ئەگەر پیاوێك گوتی: فلانە ژنە بە هۆی شیرخواردن کیژی منە. یان خوشکی منە. یان پوری منە (أَوْ قَالَتْ: هُوَ أَخِي) یان ژنێك گوتی: فلانە پیاوە بە هۆی شیرخواردن برای منە. یان کوڕی منە. یان خاڵی منە. یان مامی منە. ئەوە (حَرُمَ تَنَاكُحُهُمَا) هەتا هەتای لێك مارەکردنیان حەرامە، بەڵام نابنە مەحرەمی یەکتری ئەگەر ئەویتریش باوەڕی پێنەکا، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

(وَلَوْ قَالَ زَوْجَانِ: بَيْنَنَا رَضَاعٌ مُحَرِّمٌ) ئەگەر ژن‌و مێردەێك گوتیان: شیرخواردنێکی حەرامکەر لە نێوانماندا هەیە. ئەوە (فُرِّقَ بَيْنَهُمَا) واجبە: لێك جیا بکرێنەوە، چونکە بە قسەیخۆیان مارەبڕینەکەیان دروست نەبووە، کەوابو: (وَسَقَطَ الْمُسَمَّى) مارەییە ناوبراوەکە لادەکەوێ (وَوَجَبَ مَهْرُ مِثْلٍ إِنْ وَطِئَ) مارەییهاووێنە بۆ ئافرەتەکە لە سەر پیاوەکە واجب دەبێ، ئەگەر جیماعی لەگەڵ کردبێ، چونکە جیماعەکە بە هەڵە بووە، بەڵام ئەگەر جیماعی لەگەڵ نەکردبێ، هیچ مارەیی واجب نابێ.

هەروەها ئەگەر ژنەکە دەیزانی شیرخواردن لە نێوانیاندا هەیەو بە خۆشیخۆی ڕێگایدا جیماعی لەگەڵ بکا، ئەو کاتەش مافی مارەیی نیە، چونکە زینایە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

وَإِنْ ادَّعَى رَضَاعًا فَأَنْكَرَتْ انْفَسَخَ وَلَهَاالْمُسَمَّى إِنْ وَطِئَ وَإِلاَّ فَنِصْفُهُ، وَإِنْ ادَّعَتْهُ فَأَنْكَرَ صُدِّقَ بِيَمِينِهِ إِنْ زُوِّجَتْ بِرِضَاهَا، وَإِلاَّ فَالأَصَحُّ تَصْدِيقُهَا وَمَهْرُمِثْلٍ إِنْ وَطِئَ، وَإِلاَّ فَلاَ شَيْءَ لَهَا، وَيُحَلَّفُ مُنْكِرُ رَضَاعٍ عَلَى نَفْيِ عِلْمِهِ، وَمُدَّعِيهِ عَلَى بَتٍّ، وَيَثْبُتُ بِشَهَادَةِ رَجُلَيْنِ أَوْ رَجُلٍ وَامْرَأَتَيْنِ وَبِأَرْبَعِ نِسْوَةٍ، وَالإِقْرَارُ بِهِ شَرْطُهُ رَجُلاَنِ، وَتُقْبَلُ شَهَادَةُ الْمُرْضِعَةِ إِنْ لَمْ تَطْلُبْ أُجْرَةً وَلاَ ذَكَرَتْ فِعْلَهَا، وَكَذَا إِنْ ذَكَرَتْ فَقَالَتْ:

---

(وَإِنْ ادَّعَى رَضَاعًا فَأَنْكَرَتْ) ئەگەر مێردەکە گوتی: شیرخواردنێکی حەڕامکەر لە نێوانماندا هەیە. ژنەکەش گوتی: ڕاست ناکەی. ئەوە (انْفَسَخَ) مارەبڕینەکەیان هەڵدەوەشێتەوەو (وَلَهَا الْمُسَمَّى إِنْ وَطِئَ وَإِلاَّ فَنِصْفُهُ) ژنەکەش مارەیی هاوێنەی لە سەر مێردەکەی هەیە ئەگەر جیماعی لەگەڵ کردبێ، ئەگەر نا: نیوە مارەییی هەیە.

بەڵام (وَإِنْ ادَّعَتْهُ فَأَنْكَرَ) ئەگەر ژنەکە گوتی: شیرخواردنێکی حەڕامکەر لە نێوانماندایە. مێردەکە گوتی: ڕاست نیە. ئەو کاتە (صُدِّقَ بِيَمِينِهِ) بە سوێندخواردن باوەڕ بە مێردەکە دەکرێ (إِنْ زُوِّجَتْ بِرِضَاهَا) ئەگەر ژنەکە بە ڕەزامەندی خۆی لێی مارە کرابێ (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر ژنەکە بە ڕەزامەندی خۆی مارە نەکرابێ، ئەو کاتە (فَالأَصَحُّ تَصْدِيقُهَا) بە فەرموودەی ڕاستتر: بە سوێندخواردن باوەڕ بە ژنەکە دەکرێ، هەم (وَمَهْرُ مِثْلٍ إِنْ وَطِئَ) مارەیی هاوێنەشی لە سەر مێردەکە واجب دەبێ ئەگەر جیماعی لەگەڵ کردبێ (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر جیماعی لەگەڵ نەکردبێ (فَلاَ شَيْءَ لَهَا) مافی هیچ مارەییی نیە.

هەروەها ئەگەر لە کاتی جیماعکردن زانیبێتی شیرخواردنێکیحەڕامکەر لە نێوانیاندایەو بە خۆشیخۆی ڕێگای دابێ جیماعی لەگەڵ بکا، ئەو کاتەش مافی مارەییی نیە؟ چونکە زینایە، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

ئینجا بزانە: (وَيُحَلَّفُ مُنْكِرُ رَضَاعٍ عَلَى نَفْيِ عِلْمِهِ) ئەوەی دان بە شیرخواردندا ناهێنێ سوێند لە سەر نەزانین دەخواو دەڵێ: (واللە نەمزانیوە شیرخواردنێکیحەڕامکەر لە نێوانماندابێ).

هەم (وَمُدَّعِيهِ عَلَى بَتٍّ) داواکاریشیرەکەش لە سەر بڕاندنەوە سوێند دەخواو دەڵێ: (واللە شیرخواردنێکیحەڕامکەر لە نێوانماندا هەیە). چونکە کاری کەسێکیتر ئاشکرا دەکا.

**دووەم**: (وَيَثْبُتُ) شیرخواردن ئاشکرا دەبێ: (بِشَهَادَةِ رَجُلَيْنِ) بە شاهیدیی دوو پیاو (أَوْ رَجُلٍ وَامْرَأَتَيْنِ) یان پیاوێكو دوو ئافرەت (وَبِأَرْبَعِ نِسْوَةٍ) هەم بە چوار ئافرەتیش ئاشکرا دەبێ، بەڵام (وَالإِقْرَارُ بِهِ شَرْطُهُ رَجُلاَنِ) بۆ ئاشکرابوونی دانپێداهێنانیشیرخواردن مەرجە: دوو پیاو هەبن (وَتُقْبَلُ شَهَادَةُ الْمُرْضِعَةِ) شاهیدیی ئافرەتە شیردەرەکەش قبوڵ دەکرێ کە لە گەڵ شاهیدەکانیتردا شاهیدی بدا (إِنْ لَمْ تَطْلُبْ أُجْرَةً) بەو مەرجەی داوای کرێی شیردانەکە نەکاو هەم (وَلاَ ذَكَرَتْ فِعْلَهَا) باسی کرداری خۆیشی نەکا (وَكَذَا إِنْ ذَكَرَتْ فَقَالَتْ:

أَرْضَعْتُهُ. فِي الأَصَحِّ، وَالأَصَحُّ أَنَّهُ لاَ يَكْفِي: بَيْنَهُمَا رَضَاعٌ مُحَرِّمٌ. بَلْ يَجِبُ ذِكْرُ وَقْتٍ وَعَدَدٍ وَوُصُولِ اللَّبَنِ جَوْفَهُ، وَيُعْرَفُ ذَلِكَ بِمُشَاهَدَةِ حَلَبٍ وَإِيجَارٍ وَازْدِرَادٍ أَوْ قَرَائِنَ: كَالْتِقَامِ ثَدْيٍ وَمَصِّهِ وَحَرَكَةِ حَلْقِهِ بِتَجَرُّعٍ وَازْدِرَادٍ بَعْدَ عِلْمِهِ بِأَنَّهَا لَبُونٌ.

(كِتَابُ النَّفَقَاتِ)

عَلَى مُوسِرٍ لِزَوْجَتِهِ كُلَّ يَوْمٍ مُدَّا طَعَامٍ، وَمُعْسِرٍ مُدٌّ، وَمُتَوَسِّطٍ مُدٌّ وَنِصْفٌ، وَالْمُدُّ مِائَةٌ وَثَلاَثَةٌ وَسَبْعُونَ دِرْهَمًا وَثُلُثُ دِرْهَمٍ، قُلْتُ: اَلأَصَحُّ مِائَةٌ وَأَحَدٌ وَسَبْعُونَ وَثَلاَثَةُ أَسْبَاعِ دِرْهَمٍ وَاللهُ أَعْلَمُ.

---

أَرْضَعْتُهُ) هەروەها ئەگەر باسی کرداری خۆیشی بکاو بڵێ: من شیرم داوەتێ، هەر قبوڵ دەکرێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر: (أَنَّهُ لاَ يَكْفِي بَيْنَهُمَا رَضَاعٌ مُحَرِّمٌ) ئەوەندە بەس نیە شاهیدەکە بڵێ: شیرخواردنێکی حەرامکەر لە نێوانیاندایە (بَلْ يَجِبُ ذِكْرُ وَقْتٍ) بەڵکو واجبە: باسی کاتی شیردانەکە بکەن کە پێش تەمەنی دوو ساڵی بووە (وَعَدَدٍ) ژمارەکەشی بڵێن کە پێنج جاری جیا جیا بووە (وَوُصُولِ اللَّبَنِ جَوْفَهُ) هەم واجبە: بڵێن: شیرەکە گەیوەتە ناو هەناوی (وَيُعْرَفُ ذَلِكَ بِمُشَاهَدَةِ حَلَبٍ) شیر گەیشتنە هەناو بەوە دەزاندرێ: کە بیبینێ شیرەکە لە ژنەکە دۆشراوە (وَإِيجَارٍ) دەناو دەمی منداڵەکە کراوەو (وَازْدِرَادٍ) منداڵەکەش قوتی داوە (أَوْ قَرَائِنَ) یان چەند نیشانەیەکی تر: (كَالْتِقَامِ ثَدْيٍ) وەك منداڵەکە گۆی مەمکەکە دەناو دەمی خۆی بنێ و (وَمَصِّهِ) بیمژێو (وَحَرَكَةِ حَلْقِهِ) جولەی گەرویشی ببینێ (بِتَجَرُّعٍ وَازْدِرَادٍ) بە قوم لێدان و قوتدان (بَعْدَ عِلْمِهِ بِأَنَّهَا لَبُونٌ) پاش ئەوەی شاهیدەکە زانیبێتی شیردەرەکە شیری تێدایە.

﴿ كِتَابُ النَّفَقَاتِ: **پەرتوکی بژێوەکان** ﴾

واتە: بەخێوکردنی ژن و دایك و باوك و منداڵەکان و کۆیلەو ئاژەڵەکان.

(عَلَى مُوسِرٍ لِزَوْجَتِهِ) واجبە لە سەر مێردێکی هەبوویی بۆ ژنەکەی: (كُلَّ يَوْمٍ مُدَّا طَعَامٍ) هەموو ڕۆژێك دوو مستی دانەوێڵە (وَمُعْسِرٍ مُدٌّ) لە سەر مێردی نەبوویش هەموو ڕۆژێك مستێك واجبە (وَمُتَوَسِّطٍ مُدٌّ وَنِصْفٌ) لە سەر ناوەنجیش هەموو ڕۆژێك مستێك و نیو واجبە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿وَلَهُنَّ عَلَيْكُمْ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾ رواه مسلم، خواردەمەنی و بەرگی ژنەکانتان لە سەر ئێوە واجبە بەگوێرەی تواناتان.

(وَالْمُدُّ مِائَةٌ وَثَلاَثَةٌ وَسَبْعُونَ دِرْهَمًا وَثُلُثُ دِرْهَمٍ) ئەندازەی مستێك: سەدو حەفتاو سێ دیرهەمی زیو و سێیەکە دیرهەمێکە (قُلْتُ) ئیمامی (النواوي) دەفەرموێ (اَلأَصَحُّ مِائَةٌ وَأَحَدٌ وَسَبْعُونَ وَثَلاَثَةُ أَسْبَاعِ دِرْهَمٍ وَاللهُ أَعْلَمُ) بە فەرموودەی ڕاستتر: سەدو حەفتاو یەك دیرهەم و سێ حەفتێکی دیرهەمێکە، واتە: (٦٠٥)غرام.

وَمِسْكِينُ الزَّكَاةِ مُعْسِرٌ، وَمَنْ فَوْقَهُ إِنْ كَانَ لَوْ كُلِّفَ مُدَّيْنِ رَجَعَ مِسْكِينًا فَمُتَوَسِّطٌ وَإِلاَّ فَمُوسِرٌ، وَالْوَاجِبُ غَالِبُ قُوتِ الْبَلَدِ، قُلْتُ: فَإِنْ اخْتَلَفَ وَجَبَ لاَئِقٌ بِهِ، وَيُعْتَبَرُ الْيَسَارُ وَغَيْرُهُ طُلُوعَ الْفَجْرِ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَعَلَيْهِ تَمْلِيكُهَا حَبًّا، وَكَذَا طَحْنُهُ وَخَبْزُهُ فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ طَلَبَ أَحَدُهُمَا بَدَلَ الْحَبِّ لَمْ يُجْبَرِ الْمُمْتَنِعُ، فَإِنْ اعْتَاضَتْ جَازَ فِي الأَصَحِّ إِلاَّ خُبْزًا أَوْ دَقِيقًا عَلَى الْمَذْهَبِ، وَلَوْ أَكَلَتْ مَعَهُ عَلَى الْعَادَةِ سَقَطَتْ نَفَقَتُهَا فِي الأَصَحِّ،

---

(وَمِسْكِينُ الزَّكَاةِ مُعْسِرٌ) ئەو گەدایەی زەکاتی پێدەچێ -لێرەدا- بە نەبوویی دادەندرێ (وَمَنْ فَوْقَهُ) ئەوەی لە گەدا بە سەرەوەترە (إِنْ كَانَ لَوْ كُلِّفَ مُدَّيْنِ رَجَعَ مِسْكِينًا) ئەگەر هەموو ڕۆژێك داوای دوو مستی لێكرابایە دەبوە گەدا، ئەوە (فَمُتَوَسِّطٌ) ناوەنجییە (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر نەدەبوە گەدا، ئەوە (فَمُوسِرٌ) هەبوویییە، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿لِيُنْفِقْ ذُو سَعَةٍ مِنْ سَعَتِهِ وَمَنْ قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ فَلْيُنْفِقْ مِمَّا آتَاهُ اللهُ لا يُكَلِّفُ اللهُ نَفْساً إِلاَّ مَا آتَاهَا﴾ ئەو کەسەی زۆری هەیە با بەگوێرەی هەبوویی بژێو بدا، ئەوەی کەمیشی هەیە خوا چەندی داوەتێ با بەگوێرەی ئەوەندە بژێو بدا، خوای گەورە داوای بەخێوکردن لە هیچ کەسێك ناکا، تەنها بەگوێرەی ئەو توانایەی داویەتیێ داوای لێدەکا.

(وَالْوَاجِبُ غَالِبُ قُوتِ الْبَلَدِ) ئەو دانەوێڵەی واجبە، ئەوەیە: کە بە ئەغڵەبی خەڵکی ئەو شوێنە دەیخۆن (قُلْتُ) ئیمامی (النواوي) دەفەرموێ (فَإِنْ اخْتَلَفَ وَجَبَ لاَئِقٌ بِهِ) ئەگەر خواردەمەنییەکان لێك جیاواز بون، ئەو کاتە ئەوی شیاوی دەسەڵاتی مێردەکەیە، ئەویان واجب دەبێ (وَيُعْتَبَرُ الْيَسَارُ وَغَيْرُهُ طُلُوعَ الْفَجْرِ وَاللهُ أَعْلَمُ) هەموو ڕۆژێك هەبوویی و نەبوویی مێردەکە بە کاتی دەرکەوتنیبەیان ڕەچاو دەکرێ.

(وَعَلَيْهِ تَمْلِيكُهَا حَبًّا) لە سەر مێردەکە واجبە دەنكی ساغ بداتە ژنەکە (وَكَذَا طَحْنُهُ وَخَبْزُهُ فِي الأَصَحِّ) هەروەها لە سەر مێردەکە واجبە: دەنكەکە بهاڕێ و بۆیشی بکاتە نان، واتە: نان کردن لە سەر ژنەکە نیە (وَلَوْ طَلَبَ أَحَدُهُمَا بَدَلَ الْحَبِّ) ئەگەر ژنەکە، یان مێردەکە لەجیاتی دەنكەکە داوای شتێکیتری کرد: وەك پارەو ئەو شتانە، ئەوە (لَمْ يُجْبَرِ الْمُمْتَنِعُ) ئەوەی ڕازی نیە زۆری لێناکرێ، بەڵام (فَإِنْ اعْتَاضَتْ) ئەگەر ژنەکە بە ڕازیبوونی خۆی لەجیاتی دەنكەکە شتێکیتری لە مێردەکە وەرگرت، ئەوە (جَازَ فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا دروست دەبێ (إِلاَّ خُبْزًا أَوْ دَقِيقًا عَلَى الْمَذْهَبِ) تەنها نان و ئارد دروست نیە لەجیاتی دەنكێکی لە ڕەگەزی خۆی وەر بگیرێ، چونکە دەبێتە ڕیبا، لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب.

(وَلَوْ أَكَلَتْ مَعَهُ عَلَى الْعَادَةِ) ئەگەر ژنەکە -وەك عادەتی ئێستا- لەگەڵ مێردەکەی خواردەمەنیی خوارد، ئەوە (سَقَطَتْ نَفَقَتُهَا فِي الأَصَحِّ) بژێوەکەی لە سەر مێردەکەی لادەچێ

قُلْتُ: إلاَّ أنْ تَكُونَ غَيْرَرَشِيدَةَ وَلَمْ يَأْذَنْ وَلِيُّهَا وَاللهُ أعْلَمُ. وَيَجِبُ أُدْمُ غَالِبِ الْبَلَدِ كَزَيْتٍ وَسَمْنٍ وَجُبْنٍ وَتَمْرٍ، وَيَخْتَلِفُ بِالْفُصُولِ، وَيُقَدِّرُهُ قَاضٍ بِاجْتِهَادِهِ، وَيُفَاوِتُ بَيْنَ مُوسِرٍ وَغَيْرِهِ، وَلَحْمٌ يَلِيقُ بِيَسَارِهِ وَإعْسَارِهِ كَعَادَةِ الْبَلَدِ، وَلَوْ كَانَتْ تَأْكُلُ الْخُبْزَ وَحْدَهُ وَجَبَ الأُدْمُ، وَكِسْوَةٌ تَكْفِيهَا: فَيَجِبُ قَمِيصٌ وَسَرَاوِيلُ وَخِمَارٌ وَمِكْعَبٌ، وَيَزِيدُ فِي الشِّتَاءِ جُبَّةً، وَجِنْسُهَا قُطْنٌ،

---

له فەرموودەی ڕاستتردا (قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) دەفەرموێ (إلاّ أنْ تَكُونَ غَيْرَ رَشِيدَةٍ وَلَمْ يَأْذَنْ وَلِيُّهَا) تەنها ئەگەر ژنەكە بالغ و عاقل نەبێو سەرپەرشتكارەكەشی ئیزنی نەدابێ لەگەڵی بخوا، ئەو كاتە بژێوەكەی لە سەر مێردەكەی لاناكەوێ (وَاللهُ أعْلَمُ).

بەڵام ئیمامی(البلقینی) فتوای داوە: لەو حاڵەتەدا–ئەگەر سەرپەرشكارەكەشی ئیزنی نەدا– بژێوەكەی لە سەر مێردەكەی لادەكەوێ.

(وَيَجِبُ أُدْمُ غَالِبِ الْبَلَدِ) واجبە: مێردەكە ئەو پێخۆرەش بداتە ژنەكەی كە بە ئەغڵەبی لەو شارە دەیكەنە پێخۆر (كَزَيْتٍ وَسَمْنٍ وَجُبْنٍ وَتَمْرٍ) وەكو زەیتو ڕۆنو پەنیرو قەسپ (وَيَخْتَلِفُ بِالْفُصُولِ) پێخۆرەكەش بەگوێرەی چوار وەرزەكان دەگۆڕێو هەندێ جار میوە بە بەر پێخۆرەكە دەكەوێ، هەروەها واجبە چایەشی بداتێ، ئەگەر ژنەكە چایە بخواتەوە، هەم واجبە: كێكو گۆشتو شیرنایەتی هەر دوو جەژنەكانیشی بداتێ، هەروەك لە (إبن قاسم)دا ڕوون كراوەتەوە.

(وَيُقَدِّرُهُ قَاضٍ بِاجْتِهَادِهِ) ئەگەر بووە كێشەیان، ئەو كاتە قازی بە بۆچوونیخۆی ئەندازەی پێخۆرەكە دیاری دەكاو (وَيُفَاوِتُ بَيْنَ مُوسِرٍ وَغَيْرِهِ) جیاوازیش لە نێوان پێخۆری مرۆڤی هەبوویی‌و نەبوویی دەكا (وَ) هەروەها لە سەر مێردەكە واجبە (لَحْمٌ يَلِيقُ بِيَسَارِهِ وَإعْسَارِهِ) بە جۆرێكی وەها گۆشت بداتە ژنەكەی: كە شیاوی هەبوویی‌و نەبوویی خۆی بێ (كَعَادَةِ الْبَلَدِ) وەك عادەتی شاری مێردەكە (وَلَوْ كَانَتْ تَأْكُلُ الْخُبْزَ وَحْدَهُ) ئەگەر ژنەكە نانی بێ‌پێخۆر دەخوارد، ئەو كاتەش (وَجَبَ الأُدْمُ) پێخۆر لە سەر مێردەكە هەر واجبە.

## ﴿ جلو بەرگی ژنەكە ﴾

(وَ) هەر بە بەڵگەی حەدیسەكەیڕابردوو: لە سەر مێردەكە واجبە (كِسْوَةٌ) جلو بەرگێكی وەها بداتە ژنەكەی: كە (تَكْفِيهَا) بەشی بكا: بەگوێرەی گەورەو بچوكی لاشەكەی، ساردی‌و گەرمی شوێنەكەی، هەم دوورینی بەرگەكەش لە سەر مێردەكە واجبە، كەوابو: (فَيَجِبُ قَمِيصٌ) كراسێكی لە سەر واجبە كە هەموو لاشەی داپۆشێ، هەم (وَسَرَاوِيلُ) دەرپێش بە دۆخینەوە واجبەو (وَخِمَارٌ) پۆشاكێكیسەریشی واجبەو (وَمِكْعَبٌ) پێڵاوێكیش واجبە (وَيَزِيدُ فِي الشِّتَاءِ جُبَّةً) لە زستاندا واجبە كەوایەكی وەها زیاد بكا: كە لە سەرما بیپارێزێ (وَجِنْسُهَا قُطْنٌ) ڕەگەزی ئەو بەرگەی بۆ ژنەكە لە سەر مێردەكە واجبە، لۆكەیە،

فَإِنْ جَرَتْ عَادَةُ الْبَلَدِ لِمِثْلِه بِكَتَّانٍ أَوْ حَرِيرٍ وَجَبَ فِي الأَصَحِّ، وَيَجِبُ مَا تَقْعُدُ عَلَيْهِ كَزِلِّيَّةٍ أَوْ لِبْدٍ أَوْ حَصِيرٍ، وَكَذَا فِرَاشٌ لِلنَّوْمِ فِي الأَصَحِّ، وَمِخَدَّةٌ وَلِحَافٌ فِي الشِّتَاءِ، وَآلَةُ تَنْظِيفٍ كَمُشْطٍ وَدُهْنٍ وَمَا تُغْسَلُ بِهِ الرَّأْسَ، وَمَرْتَكٌ وَنَحْوُهُ لِدَفْعِ صُنَانٍ، لاَ كُحْلٌ وَخِضَابٌ وَمَا تَزَيَّنُ بِهِ وَدَوَاءُ مَرَضٍ وَأُجْرَةُ طَبِيبٍ وَحَاجِمٍ، وَلَهَا طَعَامُ أَيَّامِ الْمَرَضِ وَأُدْمُهَا وَالأَصَحُّ وُجُوبُ أُجْرَةِ حَمَّامٍ بِحَسَبِ الْعَادَةِ، وَثَمَنِ مَاءِ غُسْلِ جِمَاعٍ وَنِفَاسٍ فِي الأَصَحِّ، لاَ حَيْضٍ وَاحْتِلاَمٍ فِي الأَصَحِّ،

---

بەلام (فَإِنْ جَرَتْ عَادَةُ الْبَلَدِ لِمِثْلِهِ بِكَتَّانٍ أَوْ حَرِيرٍ) ئەگەر عادەتی وێنەی پیاوەکە لەو شارەدا بۆ ژنەکانیان بەرگی کەتان، یان ئاوریشم بوو، ئەو کاتە (وَجَبَ فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا: ئەو بەرگە عادەتیە واجب دەبێ.

(وَ) هەروەها (يَجِبُ مَا تَقْعُدُ عَلَيْهِ) لە سەری واجبە شتێکیش بداتە ژنەکەی کە لە سەری دابنیشێ (كَزِلِّيَّةٍ أَوْ لِبْدٍ أَوْ حَصِيرٍ) وەك بەڕەیەك، یان لبادێك، یان حەسیرێك (وَكَذَا فِرَاشٌ لِلنَّوْمِ فِي الأَصَحِّ) هەروەها ڕایەخێکی نەرمی خەوتنیشی لە سەر واجبە لە فەرموودی ڕاستتردا، هەم (وَمِخَدَّةٌ) سەرینێکیش (وَلِحَافٌ فِي الشِّتَاءِ) هەروەها لێفەیەکیشی لە زستاندا لە سەر واجبە.

(وَ) هەوەها (آلَةُ تَنْظِيفٍ) لە سەر مێردەکە واجبە: کەرستەی پاککردنەوەش بداتە ژنەکەی (كَمُشْطٍ وَدُهْنٍ) وەکو شانەو ڕون بۆ شانەکردنی سەر، هەم (وَمَا تُغْسَلُ بِهِ الرَّأْسَ) ئەو شتەی سەری پێ دەشوا: وەك سابوون، هەم (وَمَرْتَكٌ وَنَحْوُهُ لِدَفْعِ صُنَانٍ) مەرتەکو ئەو جۆرە دەرمانەی بۆنی بن هەنگڵ لادەبەن، ئەویشی لە سەر واجبە.

(لاَ كُحْلٌ وَخِضَابٌ وَمَا تَزَيَّنُ بِهِ) بەلام کلو خەنەو بۆنو ئەو شتەی خۆی پێ دەڕازێنێتەوە لە سەر مێردەکە واجب نیە، جا ئەگەر مێردەکە ئەو شتانەی بۆ ژنەکەی ئامادەکردن، ئەو کاتە واجبە ژنەکە بەکاریان بێنێ (وَ) هەروەها (دَوَاءُ مَرَضٍ وَأُجْرَةُ طَبِيبٍ وَحَاجِمٍ) دەرمانی نەخۆشیو کرێی پزیشكو کرێی خوێنگریش هیچیان لە سەر مێردەکە واجب نین، بەلام (وَلَهَا طَعَامُ أَيَّامِ الْمَرَضِ وَأُدْمُهَا) ژنەکە مافی خواردەمەنیو پێخۆری ڕۆژانی نەخۆشیەکەی هەیە.

(وَالأَصَحُّ وُجُوبُ أُجْرَةِ حَمَّامٍ بِحَسَبِ الْعَادَةِ) بە فەرموودەی ڕاستتر: کرێی گەرماوی ژنەکە –بەگوێرەی عادەت– لە سەر مێردەکە واجبە، وەك هەر مانگێك جارێك، بەلام ئەگەر عادەتی نەبو بچێتە گەرماو، ئەو کاتە واجب نیە (وَ) هەروەها (ثَمَنِ مَاءِ غُسْلِ جِمَاعٍ وَنِفَاسٍ) پارەی ئاوی غوسلی جیماعو منداڵبوونیشی لە سەر مێردەکە واجبە، چونکە هۆیەکە لەویەوەیە (لاَ حَيْضٍ وَاحْتِلاَمٍ فِي الأَصَحِّ) بەلام پارەی ئاوی غوسلی حەیزو ئیحتیلامی ژنەکە لە سەر مێردەکە واجب نیە، لە فەرموودی ڕاستتردا، چونکە هۆیەکە لەویەوە نیە.

وَلَهَا آلاَتُ أَكْلٍ وَشُرْبٍ وَطَبْخٍ كَقِدْرٍ وَقَصْعَةٍ وَكُوزٍ وَجَرَّةٍ وَنَحْوِهَا، وَمَسْكَنٌ يَلِيقُ بِهَا، وَلاَ يُشْتَرَطُ كَوْنُهُ مِلْكَهُ، وَعَلَيْهِ لِمَنْ لاَ يَلِيقُ بِهَا خِدْمَةُ نَفْسِهَا إِخْدَامُهَا بِحُرَّةٍ أَوْ أَمَةٍ لَـهُ أَوْ مُسْتَأْجَرَةٍ، أَوْ بِالإِنْفَاقِ عَلَى مَنْ صَحِبَتْهَا مِنْ حُرَّةٍ أَوْ أَمَةٍ لِخِدْمَةٍ، وَسَوَاءٌ فِي هَـذَا مُوسِرٌ وَمُعْسِرٌ وَعَبْدٌ، فَإِنْ أَخْدَمَهَا بِحُرَّةٍ أَوْ أَمَةٍ بِأُجْرَةٍ فَلَيْسَ عَلَيْهِ غَيْرُهَا،

---

(وَلَهَا آلاَتُ أَكْلٍ وَشُرْبٍ وَطَبْخٍ) هەروەها لە سەر مێردەکە واجبە: کەرستەی خواردن‌و خواردنەوە بداتە ژنەکەی (كَقِدْرٍ) وەك دیزەو مەنجەڵ‌و (وَقَصْعَةٍ) قاپ‌و (وَكُوزٍ وَجَرَّةٍ) گۆزەو کوپەو (وَنَحْوِهَا) ئەو جۆرە شتانە وەك تەشتی جل تێدا شوشتن .

## ﴿ مافی نیشتەجێکردنی ژنەکە ﴾

(وَ) هەروەها لە سەر مێردەکە واجبە: (مَسْكَنٌ يَلِيقُ بِهَا) شوێنێکی وەها بۆ نیشتەجێبوونی ژنەکەی ئامادە بکا: کە شیاوی ژنەکە بێ، چونکە ڕابرا: کە (بە فەرمانی قورئانی پیرۆز ژنی تەڵاقدراو مافی نیشتەجێکردنی هەبوو). کەواتە: ژنی ژێر مێردەکە زیاتر ئەو مافەی هەیە، بەڵام (وَلاَ يُشْتَرَطُ كَوْنُهُ مِلْكَهُ) بە مەرج دانانـدرێ شوێنەکە ملکیمێردەکەی بێ، بەڵکو دروستە لە شوێنی بەکرێگیراو و خواستراو و وقفکراودا نیشتەجێی بکا.

جا ئەگەر مێردەکە بە ئیزنی ژنەکە لە ماڵیژنەکەدا، یان لە ماڵی باوکیژنەکەدا بە ئیزنی باوکەکە لەگەڵ ژنەکەدا نیشتەجێ بوو و باسی کرێیشوێنەکەشیان نەکرد، ئەوە هیچ کرێی لە سەر واجب نابێ، هەروەك لە (تحفة) و(نهاية)دا فەرموویانە.

هەروەها ئەگەر مێردەکە ماوەیەك ژنەکەی نیشتەجێ نەکرد، ئەوە کرێی نیشتەجێکردنی ئەو ماوەیە لە ئەستۆی مێردەکەدا نابێتە قەرز، هەروەك لە (نهاية)دا فەرموویەتی.

ئینجا بزانە: مێردەکە مافی هەیە ژنەکەی لە شارو ئاوەدانیەوە بگوازێتەوە بۆ لادێ‌و دەرەوەی ئاوەدانی، هەرچەند ژیانەکەشی خۆش نەبێ، هەروەك لە(تحفة)دا فەرموویەتی.

## ﴿ خزمەتکردنی ژنەکە ﴾

(وَعَلَيْهِ) لە سەر مێردەکە واجبە (لِمَنْ لاَ يَلِيقُ بِهَا خِدْمَةُ نَفْسِهَا) بۆ ئەو ژنەی لێی نابێ بەخۆی خۆی خزمەت بکا (إِخْدَامُهَا بِحُرَّةٍ أَوْ أَمَةٍ) خزمەتکارێکی ئازاد، یان کۆیلەی بۆ ئامادە بکا (لَهُ أَوْ مُسْتَأْجَرَةٍ) جا کۆیلەکە هی خۆی بێ، یان بەکرێگیراو بێ (أَوْ بِالإِنْفَاقِ عَلَى مَنْ صَحِبَتْهَا) یان ئەو ئافرەتە بەخێو بکا: کە بە هاوڕێیی ژنەکە هاتوە: (مِنْ حُرَّةٍ أَوْ أَمَةٍ لِخِدْمَةٍ) جا ئازاد بێ، یان کۆیلە بێ: کە بۆ خزمەتکردنی ژنەکە لە ماڵی باوکیەوە لەگەڵی هاتوە.

(وَسَوَاءٌ فِي هَذَا) لەو خزمەتکردنەدا یەکسانە: (مُوسِرٌ وَمُعْسِرٌ وَعَبْدٌ) هەبوویی‌و نەبوویی‌و کۆیلە (فَإِنْ أَخْدَمَهَا بِحُرَّةٍ أَوْ أَمَةٍ بِأُجْرَةٍ) جا ئەگەر مێردەکە –بە کرێ– بە ئافرەتێکی ئازاد، یان کۆیلە خزمەتی ژنەکەی کرد، ئەوە (فَلَيْسَ عَلَيْهِ غَيْرُهَا) جگە لە کرێ هیچیتری لە سەر

أَوْ بِأَمَته أَنْفَقَ عَلَيْهَا بِالْملك، أَوْ بِمَنْ صَحِبَتْهَا لَزِمَهُ نَفَقَتُهَا، وَجِنْسُ طَعَامِهَا جِنْسُ طَعَامِ الزَّوْجَةِ: وَهُوَ مُدٌّ عَلَى مُعْسِرٍ وَكَذَا مُتَوَسِّطٌ فِي الصَّحِيحِ، وَمُوسِرٍ مُدٌّ وَثُلُثٌ، وَلَهَا كِسْوَةٌ تَلِيقُ بِحَالِهَا، وَكَذَا أُدْمٌ عَلَى الصَّحِيحِ، لاَ آلَةُ تَنْظِيفٍ فَإِنْ كَثُرَ وَسَخٌ وَتَأَذَّتْ بِقَمْلٍ وَجَبَ أَنْ تُرَفَّهَ، وَمَنْ تَخْدُمُ نَفْسَهَا فِي الْعَادَةِ إِنْ احْتَاجَتْ إِلَى خِدْمَةٍ لِمَرَضٍ أَوْ زَمَانَةٍ وَجَبَ إِخْدَامُهَا، وَلاَ إِخْدَامَ لِرَقِيقَةٍ، وَفِي الْجَمِيلَةِ وَجْهٌ، وَيَجِبُ فِي الْمَسْكَنِ إِمْتَاعٌ، وَمَا يُسْتَهْلَكُ كَطَعَامٍ تَمْلِيكٌ، وَتَتَصَرَّفُ فِيهِ، فَلَوْ قَتَّرَتْ بِمَا يَضُرُّهَا مَنَعَهَا،

---

نیه (أَوْ بِأَمَتِهِ أَنْفَقَ عَلَيْهَا بِالمِلكِ) یان ئەگەر بە (جارية)کەی خۆی خزمەتی دەکرد، ئەوە واجبە: (جارية)کەش بە مڵکایەتی بەخێو بکا (أَوْ بِمَنْ صَحِبَتْهَا) یان ئەگەر بەو ئافرەتە خزمەتی دەکرد کە بە هاوڕێیی ژنەکە هاتوە، ئەو کاتە (لَزِمَهُ نَفَقَتُهَا) واجبە: بژێوی ئەو ئافرەتەش بدا، بەڵام کرێی واجب نیە.

(وَجِنْسُ طَعَامِهَا جِنْسُ طَعَامِ الزَّوْجَةِ) ڕەگەزی ئەو خواردەمەنیەی دەدرێتە هاوڕێیەکە: هەر ڕەگەزی خواردەمەنی ژنەکەیە (وَهُوَ مُدٌّ عَلَى مُعْسِرٍ وَكَذَا مُتَوَسِّطٌ فِي الصَّحِيحِ) ئەندازەی خواردەمەنیەکەش مستێکە لە سەر مێردی نەبوویی و ناوەنجی لە فەرموودەی ڕاستدا (وَمُوسِرٍ مُدٌّ وَثُلُثٌ) لە سەر هەبوویش مستێکو سێیەکێکە (وَلَهَا كِسْوَةٌ تَلِيقُ بِحَالِهَا) هەروەها لە سەر مێردەکە واجبە: جلو بەرگێکی وەهاش بداتە هاوڕێیەکە: کە شیاوی حاڵیەتی (وَكَذَا أُدْمٌ) هەروەها واجبە پێخۆریشی بداتێ (عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست (لاَ آلَةُ تَنْظِيفٍ) بەڵام واجب نیە کەرستەی پاککردنەوەی بداتێ (فَإِنْ كَثُرَ وَسَخٌ وَتَأَذَّتْ بِقَمْلٍ) جا ئەگەر هاوڕێیەکە زۆر چڵکن بوو و بە هۆی ئەسپێ ئازاری گەیشتێ، ئەو کاتە (وَجَبَ أَنْ تُرَفَّهَ) واجبە دڵخۆش بکرێو کەرستەی پاککردنەوەی بدرێتێ.

(وَمَنْ تَخْدُمُ نَفْسَهَا فِي الْعَادَةِ) ئەو ژنەی لە عادەتی ئەو شوێنەدا بەخۆی خۆی خزمەت دەکا، واجب نیە خزمەتکاری بۆ بگرێ، بەڵام (إِنْ إِحْتَاجَتْ إِلَى خِدْمَةٍ لِمَرَضٍ أَوْ زَمَانَةٍ) ئەگەر بە هۆی نەخۆشی، یان پەککەوتن پێویستی بە خزمەت بوو، ئەو کاتە (وَجَبَ إِخْدَامُهَا) واجبە: خزمەتکارێکی بۆ بگرێ (وَلاَ إِخْدَامَ لِرَقِيقَةٍ) ژنی کۆیلە مافی خزمەتکردنی نیە (وَفِي الْجَمِيلَةِ وَجْهٌ) بەڵام لەبارەی کۆیلەیەکی جوان فەرموودەیەك هەیە: کە واجبە.

(وَيَجِبُ فِي الْمَسْكَنِ إِمْتَاعٌ) لەبارەی شوێنی نیشتەجێبوون سودپێگەیاندنێکی درێژخایەن واجبە، واتە: واجب نیە شوێنەکە بکاتە ملکیژنەکە، بەڵام (وَمَا يُسْتَهْلَكُ كَطَعَامٍ) ئەو شتەی لەناو دەچێ: وەك خواردەمەنی (تَمْلِيكٌ) واجبە: بیکاتە ملکی ژنەکە، کەوابو: (وَتَتَصَرَّفُ فِيهِ) ژنەکە دەتوانێ دەستکاری لەو ملکەدا بکا، بەڵام (فَلَوْ قَتَّرَتْ بِمَا يَضُرُّهَا) ئەگەر ژنەکە ڕەزیلی کردو خواردەمەنیەکەی نەدەخواردو نەخواردنەکەشی زیانی دەگەیاندێ، ئەو کاتە (مَنَعَهَا) مێردەکە ڕێگای لێدەگرێ.

وَمَا دَامَ نَفْعُهُ كَكِسْوَةٍ وَظُرُوفِ طَعَامٍ وَمُشْطٍ تَمْلِيكٌ، وَقِيلَ إِمْتَاعٌ، وَتُعْطَى الْكِسْوَةَ أَوَّلَ شِتَاءٍ وَصَيْفٍ، فَإِنْ تَلِفَتْ فِيهِ بِلاَ تَقْصِيرٍ لَمْ تُبْدَلْ إِنْ قُلْنَا تَمْلِيكٌ، فَإِنْ مَاتَتْ فِيهِ لَمْ تُرَدَّ، وَلَوْ لَمْ يَكْسُ مُدَّةً فَدَيْنٌ.

---

(وَمَا دَامَ نَفْعُهُ) ئەو شتەش کە سودەکەی بەردەوامە (كَكِسْوَةٍ وَظُرُوفِ طَعَامٍ وَمُشْطٍ) وەك جلو بەرگو ڕایەخو یاتاغی خەوتنو دانیشتنو کیسەکانی خواردەمەنیو ئاو و شانە، ئەوانەش (تَمْلِيكٌ) کردنەملکەو گشتی دەبێتە ملکیژنەکەو بۆی دروستە دەستکاریی تیدا بکا (وَقِيلَ إِمْتَاعٌ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: سودپێگەیاندنە.

(وَتُعْطَى الْكِسْوَةَ أَوَّلَ شِتَاءٍ وَصَيْفٍ)جلو بەرگ لە سەرەتای زستانو سەرەتای هاویندا دەدرێ، واتە: لە هەر شەش مانگێکدا دەستە جلێك واجبە، بەڵام ئەو شتەی ساڵێكو زیاتریش دەمێنێ: وەك ڕایەخو یاتاغی خەوتنو کەواو ئەو جۆرە شتانە، هەر کاتێك بەگوێرەی عادەت کەون بون، ئەو کاتە واجبە نوێ بکرێنەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(فَإِنْ تَلِفَتْ فِيهِ بِلاَ تَقْصِيرٍ) جا ئەگەر جلەکە لە وەرزەکەدا بێکەمتەرخەمی ژنەکەش بفەوتێ (لَمْ تُبْدَلْ إِنْ قُلْنَا تَمْلِيكٌ) ناگۆڕدرێتەوەو واجب نیە دووبارە بۆی بکڕێتەوە، ئەگەر بە فەرموودەی ڕاستتر بڵێین: جلو بەرگ دەبێتە ملکی ژنەکە، کەوابو: (فَإِنْ مَاتَتْ فِيهِ) ئەگەر ژنەکە لە ناو وەرزەکەدا مرد (لَمْ تُرَدَّ) جلو بەرگەکەی وەرزەکەو یاتاغو ڕایەخ وەرناگیرێنەوە، بەڵکو دەبێتەوە میرات بۆ میراتگرەکانی ژنەکە.

(وَلَوْ لَمْ يَكْسُ مُدَّةً) ئەگەر مێردەکە ماوەیەك بژێو و جلوبەرگی ژنەکەی نەدا، ئەوە (فَدَيْنٌ) بژێوەکەو جلوبەرگەکە دەبێتە قەرز لە ئەستۆیمێردەکەداو واجبە بیداتە ژنەکە، هەرچەند لە مەودواش تەڵاقی دابێ، جا ئەگەر ژنەکە مردبو، ئەو کاتە دەدرێتە میراتگرەکانی، بەڵام نیشتەجێکردن نابێتە قەرز، هەر وەك ڕابرا.

﴿ ئاگاداری ﴾ یەکەم: لە باسی (جلوبەرگی ژنەکە)دا ڕابرا: (کەرستەی ڕازاندنەوە لە سەر مێردەکە واجب نیە). کەوابو: ئەگەر مێردەکە خشڵی زێڕو زیوی کڕیو ژنەکەی پێ ڕازاندەوە، ئەو خشڵە نابێتە ملکی ژنەکە، بەڵکو خواستنەو بە ئەمانەت لە لایەتی، واتە: هەر ملکی مێردەکەیەو لە دوای مردنیشی دەبێتە میرات بۆ میراتگرەکانیمێردەکە، بەڵام ئەگەر مێردەکە ئەو خشڵەی–بە ووشەی بەخشین– بەخشیبێتە ژنەکەی، یان بە دیاری بۆی ناردبێ، ئەو کاتە دەبێتە ملکیژنەکە.

جا ئەگەر ژنەکەو مێردەکە، یان میراتگرەکانیان بووە کێشەیان: ئایا بە بەخشینو دیاری خشڵەکە کراوەتە ملکی ژنەکە، یان خواستنەو بە ئەمانەت بۆ ڕازاندنەوە لە لایەتی؟ ئەوە

(فَصْلٌ) اَلْجَديدُ أَنَّهَا تَجبُ بِالتَّمْكِينِ لاَالْعَقْد، فَإنْ اخْتَلَفَا فيه صُدِّقَ، فَإنْ لَــمْ تَعْــرِضْ عَلَيْه مُدَّةٌ فَلاَ نَفقَةَ فيهَا، وَإِنْ عَرَضَتْ وَجَبَتْ مِنْ بُلُوغِ الْخَبَرِ، فَإنْ غَابَ كَتَبَ الْحَاكِمُ لحَاكِمِ بَلَده لِيُعْلِمَهُ فَيَجِيءَ

---

–ئەگەر شاهید نەبێ– بە سوێندخواردن باوەڕ بە مێردەکەو میراتگرەکانیمێردەکە دەکرێ، هەروەك لە (تحفة)و (بغیةالمسترشدین)دا ڕوون کراوەتەوە.

دووەم: ئەگەر ژنەکە (ناشِزة) بوو، ئەوە جلوبەرگی ئەو وەرزەو بژێوی ماوەی (ناشِزة)بوونی لەدەست دەچێ، کەواتە: ئەگەر پێش (ناشِزة)بوون وەریگرتبون، بۆ مێردەکە دروستە لێی بستێنێتەوە، هەروەك لە (تحفة)و (نهایة)دا ڕوون کراوەتەوە.

بەڵام ئەگەر مێردەکە مەسرەفی بوکینیی دابوە ژنەکەو ژنەکەش بە ئیزنی مێردەکە سەرفی کردبو، ئینجا (ناشِزة) بوو، ئەو کاتە مێردەکە لە دەستی دەچێو بۆی دروست نیە تۆڵەی مەسەرەفەکە لە ژنەکە بستێنێ، هەروەك لە (تحفة)دا ڕوون کراوەتەوە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی کاتی واجیبوونی بژێوەکە ﴾

(اَلْجَدِيدُ أَنَّهَا تَجِبُ بِالتَّمْكِينِ) بە فەرموودەی نوێ: بژێوی ژنەکە لە سەر مێردەکە واجب دەبێ بە خۆ تەسلیمکردنی ژنەکە، وەك ژنەکە، یان سەرپەرشتکارەکەی بڵێ: (هەر کاتێك مارەییەکەت دامێ خۆمت تەسلیم دەکەم). واتە : لەو کاتەوە بژێوەکەی لە سەر مێردەکە واجب دەبێ، هەر چەند مێردەکە منداڵیش بێ (لاَ الْعَقْدِ) بەڵام بە تەنها مارەبڕین بژێوەکە واجب نابێ (فَإِنْ اِخْتَلَفَا فِيهِ) جا ئەگەر ژنەکەو مێردەکە بووە کێشەیان: لە تەسلیمبوونو تەسلیم نەبووندا، ئەوە ئەگەر شاهید نەبو (صُدِّقَ) بە سوێندخواردن باوەڕ بە مێردەکە دەکرێ: کە ژنەکە خۆی تەسلیم نەکردوە.

(فَإِنْ لَمْ تَعْرِضْ عَلَيْهِ مُدَّةٌ) جا ئەگەر لە دوایمارەبڕین ماوەیەك نە ژنەکەو نە سەرپەرشتکارەکەی ئامادەیی تەسلیمبوونی نیشانی مێردەکە نەداو مێردەکەش داوای نەکرد، ئەوە (فَلاَ نَفَقَةَ فِيهَا) لەو ماوەیەدا ژنەکە مافی هیچ بژێوی نیە، بەڵام (وَإِنْ عَرَضَتْ) ئەگەر ژنەکە، یان سەرپەرشتکارەکەی ئامادەبوونەکەی نیشانی مێردەکە داو گوتی: (من خۆم تەسلیمی تۆ دەکەم لە هەر شوێنێك تۆ هەڵیبژێری). ئەوە (وَجَبَتْ مِنْ بُلُوغِ الْخَبَرِ) لەو کاتەوە–کە هەواڵەکەی دەگاتێ– جلوبەرگو بژێوەکەی لە سەر مێردەکەی واجب دەبێ.

(فَإِنْ غَابَ) جا ئەگەر مێردەکە لەو شوێنە نەبو، ئەو کاتە ژنەکە ئامادەبوونەکەی بەرز دەکاتەوە بۆ دادگا، ئینجا (كَتَبَ الْحَاكِمُ لِحَاكِمِ بَلَدِهِ) دادوەرەکەش بۆ دادوەری شوێنی مێردەکە دەنووسێ (لِيُعْلِمَهُ فَيَجِيءَ) تاکو مێردەکە ئاگادار بکاتەوە: بێتەوە ژنەکەی

أَوْ يُوَكِّلَ، فَإِنْ لَمْ يَفْعَلِ وَمَضَى زَمَنُ وُصُولِهِ فَرَضَهَا الْقَاضِي، وَالْمُعْتَبَرُ فِي مَجْنُونَةٍ وَمُرَاهِقَةٍ عَرْضُ وَلِيٍّ، وَتَسْقُطُ بِنُشُوزٍ وَلَوْ بِمَنْعِ لَمْسٍ بِلاَ عُذْرٍ، وَعَبَالَةُ زَوْجٍ أَوْ مَرَضٌ يَضُرُّ مَعَهُ الْوَطْءُ عُذْرٌ، وَالْخُرُوجُ مِنْ بَيْتِهِ بِلاَ إِذْنٍ نُشُوزٌ

---

وەربگرێ (أَوْ يُوَكِّلَ) یان وەکیلێك بگرێ تاکو ژنەکەی بۆ وەربگرێ (فَإِنْ لَمْ يَفْعَل) جا ئەگەر مێردەکە بە بێعوزر هیچێکی لەو دووانە نەکردو (وَمَضَى زَمَنُ وُصُولِهِ) ماوەیەکی وەهاش ڕۆیشت کە دەگونجا لەو ماوەیەدا بگاتەوە جێ، ئەو کاتە (فَرَضَهَاالْقَاضِي) قازی بڕیاری بژێوەکە لە سەر مێردەکە دەداو، لەو کاتەوە وا دادەندرێ ژنەکەی وەرگرتوە، بەڵام ئەگەر بە هۆی عوزرێکیشەرعی نەگەڕابێتەوە، یان وەکیلی نەگرتبێ، ئەو کاتە نابێ قازی بڕیاری بژێوەکەی لە سەر بدا.

جا بزانە: ئەوەی ڕابردوو لەبارەی ژنێکی بالغو عاقڵ بوو، بەڵام (وَالْمُعْتَبَرُ فِي مَجْنُونَةٍ وَمُرَاهِقَةٍ عَرْضُ وَلِيٍّ) لەبارەی ژنێکی شێت، یان نەبالغی نزیك عەزەبیوون نیشاندانی ئامادەبوون لە لایەن سەرپەرشتکارەکەی ڕەچاو دەکرێ، جا بزانە: ئەگەر مێردەکە بالغو عاقڵ بێ، یان نزیك بلۆغبوون بێ، ئەوە بەخۆی ژنەکە وەردەگرێ، بەڵام ئەگەر نەبالغ، یان شێت بێ، مەرجە: سەرپەرشتکارەکەی ژنەکەی بۆ وەربگرێ، هەروەك لە (بجیرمی)دا فەرموویەتی.

## ﴿ ناشیزمبوونی ژنەکە ﴾

(وَتَسْقُطُ) واجبوونی بژێو و جلوبەرگو نیشتەجێکردن گشتی لە سەر مێردەکە لادەکەوێ (بِنُشُوزٍ) بە (ناشِزة)بوون، واتە: دەرچوونی ژنەکە لە گوێڕایەڵیمێردەکەی، هەرچەند زۆرلێکراویش بێ: وەك خزمو کەسەکانی بە زۆرلێکردن –بێئیزنیمێردەکەی– بیبەنەوە لای خۆیان، هەرچەند مەبەستیشیان بەرژەوەندی ژنەکە بێ، واتە: لەو حاڵەتەشدا بە (ناشِزة) دادەندرێ، هەرچەند مێردەکەش توانای هەبێ بیگەڕێنێتەوە ژێر گوێڕایەڵی خۆیو بە قەسدی نەیگەڕێنێتەوە، هەروەك لە (تحفة)و (نهایة)و حاشیەکانیاندا ڕوون کراوتەوە.

هەم (وَلَوْ بِمَنْعِ لَمْسٍ بِلاَعُذْرٍ) هەرچەند (ناشِزة)بوونەکەشی بەوە بێ: کە بە بێعوزر ڕێگا نەدا مێردەکەی دەستی لێبداو ماچی بکا، وەك ڕووی خۆی لێدابپۆشێ، یان پشتی تێبکا، هەرچەند ڕێگای جیماعیشی بدا، بەڵام (وَعَبَالَةُ زَوْجٍ) گەورەیی ئەندامی جیماعی مێردەکەی کە خۆی دەبەر نەگرێ (أَوْ مَرَضٌ يَضُرُّ مَعَهُ الْوَطْءُ) یان نەخۆشیەکی وەها: کە جیماعکردن لەگەڵ نەخۆشیەکەدا زیانی لێبدا، یان حەیزدار بێ، ئەوانە (عُذْرٌ) گشتی دەبنە عوزر، ئەگەر ڕێگای جیماعیشی نەداتێ نابێتە (ناشِزة).

(وَالْخُرُوجُ مِنْ بَيْتِهِ بِلاَ إِذْنٍ) دەرچوون بە بێئیزنیمێردەکەی لەو ماڵەی مێردەکە بۆی داناوە تێیدا نیشتەجێ ببێ (نُشُوزٌ) بە (ناشزة)بوون دادەندرێ، هەر چەند بۆ سەردانی نەخۆشو

إلاَّ أَنْ يُشْرِفَ عَلَى انْهِدَامٍ، وَسَفَرُهَا بِإِذْنِهِ مَعَهُ أَوْ لِحَاجَتِهِ لاَ يُسْقِطُ، وَلِحَاجَتِهَا يُسْقِطُ فِي الأَظْهَرِ، وَلَوْ نَشَزَتْ فَغَابَ فَأَطَاعَتْ لَمْ تَجِبْ فِي الأَصَحِّ وَطَرِيقُهَا أَنْ يَكْتُبَ الْحَاكِمُ كَمَا سَبَقَ، وَلَوْ خَرَجَتْ فِي غَيْبَتِهِ لِزِيَارَةٍ وَنَحْوِهَا لَمْ تَسْقُطْ، وَالأَظْهَرُ أَنْ لاَ نَفَقَةَ لِصَغِيرَةٍ وَأَنَّهَا تَجِبُ لِكَبِيرَةٍ عَلَى صَغِيرٍ، وَإِحْرَامُهَا بِحَجٍّ أَوْ عُمْرَةٍ بِلاَ إِذْنٍ نُشُوزٌ إِنْ لَمْ يَمْلِكْ تَحْلِيلَهَا، فَإِنْ مَلَكَ فَلاَ حَتَّى تَخْرُجَ

---

خواپەرستیش بێ: وەك حەج (إلاَّ أَنْ يُشْرِفَ عَلَى انْهِدَامٍ) مەگەر شوێنەکە خەریکی ڕوخان بێو لە ترسان بڕواتە دەرەوە، ئەو کاتە بە (ناشزة) دانانـدرێ (وَسَفَرُهَا بِإِذْنِهِ مَعَهُ أَوْ لِحَاجَتِهِ) بە سەفەرچوونی ژنەکە بە ئیزنیمێردەکەی: جا لەگەڵ مێردەکەدا بێ، یان بۆ کاروباری مێردەکەی بە تەنها بە سەفەر بچێ (لاَ يُسْقِطُ) بژێوەکەی لەدەست نادا، بەڵام (وَلِحَاجَتِهَا) ئەگەر ژنەکە بە ئیزنی مێردەکەی بۆ کاروباری خۆی بە سەفەر بچێ (يُسْقِطُ فِي الأَظْهَرِ) بژێو و جلوبەرگەکەی لە دەست دەدا، لە فەرموودەی بەهێزتردا.

(وَلَوْ نَشَزَتْ فَغَابَ) ئەگەر ژنەکە بووە (ناشزة)، ئینجا مێردەکەش لەو شوێنە ڕۆیشت (فَأَطَاعَتْ) ئینجا ژنەکە تۆبەی کردو گەڕاوە بۆ ماڵەکەی، ئەوە (لَمْ تَجِبْ فِي الأَصَحِّ) بژێوەکەی لە سەر مێردەکەی واجب نابێتەوە تا مێردەکەش دەگەڕێتەوە، لە فەرموودەی ڕاستتردا (وَطَرِيقُهَا) ڕێگای واجببوونەوەی بژێوەکە ئەوەیە: (أَنْ يَكْتُبَ الْحَاكِمُ كَمَا سَبَقَ) ژنەکە بچێتە دادگاو دادوەریش بۆ دادوەری شاری مێردەکە بنووسێ تاکو بگەڕێتەوە، هەروەك ڕابرا.

(وَلَوْ خَرَجَتْ فِي غَيْبَتِهِ) ئەگەر لەو حاڵەتەی مێردەکە لە سەفەرە، ژنەکە چووە دەرەوە (لِزِيَارَةٍ وَنَحْوِهَا) بۆ سەردانی خزمەکانیو تازیەو ئامادەبوونی جەنازەیباوکی (لَمْ تَسْقُطْ) بژێوەکەی لەدەست ناچێ، بەو مەرجەیپێش چوونە سەفەر پێی نەگوتبێ: نەچیە دەرەوە. ئەگینا: بە (ناشزة) دادەندرێ.

(وَالأَظْهَرُ) بە فەرموودەی بەهێزتر: (أَنْ لاَ نَفَقَةَ لِصَغِيرَةٍ) ژنێکی بچوك کە خۆی دەبەر جیماع نەگرێ مافی هیچ بژێو و جلوبەرگی نیە (وَ) هەر بەفەرموودەی بەهێزتر (أَنَّهَا تَجِبُ لِكَبِيرَةٍ عَلَى صَغِيرٍ) بژێوەکە واجبە بۆ ژنێکی گەورە لە سەر مێردە بچوکەکەی کە نەگونجێ جیماعی پێبکرێ، هەر کاتێك خۆی تەسلیم کرد.

(وَإِحْرَامُهَا بِحَجٍّ أَوْ عُمْرَةٍ بِلاَ إِذْنٍ) ئیحرام بەستنی ژنەکە بە بێئیزنی مێردەکەی: بە حەج، یان بە عومرە (نُشُوزٌ إِنْ لَمْ يَمْلِكْ تَحْلِيلَهَا) بە (ناشزة)بوون دادەندرێ، ئەگەر بە فەرموودەی بێهێز بڵێین: مێردەکە ناتوانێ ئیحرامی پێ بشکێنێ، بەڵام (فَإِنْ مَلَكَ) ئەگەر بە فەرموودەی بەهێزتر بڵێین: مێردەکە مافی هەیە ئیحرامی پێ بشکێنێ، ئەو کاتە (فَلاَ حَتَّى تَخْرُجَ) نابێتە (ناشزة) تا لە ماڵ دەڕواتە دەرەوە بۆ حەج کردنەکە، جا ئەو کاتە

فَمُسَافِرَةٌ لِحَاجَتِهَا، أَوْ بِإِذْنٍ فَفِي الأَصَحِّ لَهَا نَفَقَةٌ مَا لَمْ تَخْرُجْ، وَيَمْنَعُهَا صَوْمَ نَفْلٍ فَإِنْ أَبَتْ فَنَاشِزَةٌ فِي الأَظْهَرِ، وَالأَصَحُّ أَنَّ قَضَاءً لاَ يَتَضَيَّقُ كَنَفْلٍ فَيَمْنَعُهَا، وَأَنَّهُ لاَ مَنْعَ مِنْ تَعْجِيلِ مَكْتُوبَةٍ أَوَّلَ وَقْتٍ وَسُنَنٍ رَاتِبَةٍ، وَتَجِبُ لِرَجْعِيَّةٍ الْمُؤَنُ إِلاَّ مُؤْنَةَ تَنَظُّفٍ،

---

(فَمُسَافِرَةٌ لِحَاجَتِهَا) ژنەکە بۆ کاریخۆی بە سەفەر چوە، واتە: ئەگەر مێردەکەشی لەگەڵدا بێو ئیزنی بدا، مافی بژێوەکەی هەیە، ئەگینا: مافی نیە.

(أَوْ بِإِذْنٍ) یان ئەگەر بە ئیزنی مێردەکە ئیحرامی بەست، ئەوە (فَفِي الأَصَحِّ لَهَا نَفَقَةٌ مَا لَمْ تَخْرُجْ) مافی بژێوەکەی هەیە، تا ئەو کاتەی بۆ حەج کردن دەڕواتە دەرەوە، جا هەر کاتێك چووە دەرەوە، لەو کاتەوە بژێوەکەی لە سەر مێردەکەی لادەچێ.

جا بزانە: بۆ مێردەکە دروست نیە ژنەکەی لە ڕستنو دوورینو کارەکانیتری ناو ماڵ قەدەغە بکا، تەنها لەو حاڵەتەدا نەبێ: کە بەو کارکردنە گومانێکی خراپەی لێبکرێ: وەك کەسانێکی خراپ هاتوچۆی بکەن، هەروەك لە (تحفة) و(الشروانی)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَيَمْنَعُهَا صَوْمَ نَفْلٍ) بۆ مێردەکە دروستە ژنەکەی قەدەغە بکا لە بەڕۆژووبوونی سوننەت، هەم بۆیشی دروستە ڕۆژووی سوننەتیشی پێبشکێنێ (فَإِنْ أَبَتْ) جا ئەگەر ژنەکە بە قسەی مێردەکەی نەکردو ڕۆژووەکەی تەواو کرد، ئەوە (فَنَاشِزَةٌ فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا: بە (ناشزة) دادەندرێو بژێوەکەی لەدەست دەچێ.

جا بزانە: ژنەکە بۆی دروستە بێئیزنیمێردەکەی: (عَرَفَة)و (تَاسُوعَاء)و (عَاشُوراء) بەڕۆژوو بێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر: (أَنَّ قَضَاءً لاَ يَتَضَيَّقُ) ئەو نوێژو ڕۆژووانەی قەزاکردنەوەیان بەرتەنگ نیە (كَنَفْلٍ) وەکو سوننەتە، کەوابو: (فَيَمْنَعُهَا) بۆی دروستە ڕێگای قەزاکردنەوەیانی نەدا تا کاتەکە بەرتەنگ دەبێ: وەك تەنها بە ئەندازەی ڕۆژووەکان لە (شَعْبَان) بمێنێ (وَأَنَّهُ) هەر بە فەرموودەی ڕاستتر: (لاَ مَنْعَ مِنْ تَعْجِيلِ مَكْتُوبَةٍ أَوَّلَ وَقْتٍ) بۆ مێردەکە دروست نیە ژنەکەی قەدەغە بکا: لە بە پەلەکردنی نوێژە واجبەکان لە سەرەتای کاتەکانیانداو هەم (وَسُنَنٍ رَاتِبَةٍ) بۆی دروست نیە قەدەغەی بکا: لە سوننەتەکانی پێشو پاش نوێژەکانو لە نوێژی جەژنەکانو ڕۆژگیرانو مانگگیرانو تەراویح، بەو مەرجەی لە ماڵەوە بیانکا، واتە: بۆی دروستە ڕێگای نەدا بڕواتە دەرەوە لە مزگەوتدا بیانکا، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.

## ﴿ بەخێوکردنی ژنیتەڵاقدراو ﴾

(وَتَجِبُ لِرَجْعِيَّةٍ الْمُؤَنُ) بۆ تەڵاقدراوی(رَجْعِيَّة) گشت ئەرکەکانی بەخێوکردن- لە بژێو و جلوبەرگو شوێنی نیشتەجێکردن- لە سەر مێردەکەی واجبە (إِلاَّ مُؤْنَةَ تَنَظُّفٍ) تەنها ئەرکی پاککردنەوەی لە سەر واجب نیە، جیاوازی نیە (رَجْعِيَّة)کە: ئاوس بێ، یان نا

فَلَوْ ظُنَّتْ حَامِلاً فَأَنْفَقَ فَبَانَتْ حَائِلاً اسْتَرْجَعَ مَا دَفَعَ بَعْدَ عِدَّتِهَا، وَالْحَائِلُ الْبَائِنُ بِخُلْعٍ أَوْ ثَلاَثٍ لاَ نَفَقَةَ لَهَا وَلاَ كِسْوَةَ، وَيَجِبَانِ لِحَامِلٍ لَهَا، وَفِي قَوْلٍ لِلْحَمْلِ، فَعَلَى الأَوَّلِ لاَ تَجِبُ لِحَامِلٍ عَنْ شُبْهَةٍ أَوْ نِكَاحٍ فَاسِدٍ، قُلْتُ: وَلاَ نَفَقَةَ لِمُعْتَدَّةِ وَفَاةٍ وَإِنْ كَانَتْ حَامِلاً وَاللهُ أَعْلَمُ. وَنَفَقَةُ الْعِدَّةِ مُقَدَّرَةٌ كَزَمَنِ النِّكَاحِ، وَقِيلَ تَجِبُ الْكِفَايَةُ، وَلاَ يَجِبُ دَفْعُهَا قَبْلَ ظُهُورِ حَمْلٍ،

---

(فَلَوْ ظُنَّتْ حَامِلاً) جا ئەگەر وەها زاندرا تەلاقدراوەکە ئاوسە (فَأَنْفَقَ عَلَيْهَا) مێردەکەش بە ناوی ئاوسی بژێوی دایێ (فَبَانَتْ حَائِلاً) ئینجا ئاشکرا بوو: ئاوس نیە، ئەوە (اسْتَرْجَعَ مَا دَفَعَ بَعْدَ عِدَّتِهَا) ئەو بژێوەی لە دوای تەواوبوونی (عِدّة)ی (رَجعي) داویەتیێ لێی وەردەگرێتەوە، چونکە لە مافی خۆی زیاتری وەرگرتوە.

(وَالْحَائِلُ الْبَائِنُ بِخُلْعٍ أَوْ ثَلاَثٍ) ئەو ژنەی کە ئاوس نیەو بە (بائِن)ی خولع، یان سێبەسێ تەلاق دراوە (لاَ نَفَقَةَ لَهَا وَلاَ كِسْوَةَ) نە بژێوی دەدرێتێو نە جلو بەرگ ﴿عن فاطمة بنت قيس رضي‌الله عنها: طَلَّقَنِي زَوْجِي ثَلاَثاً فَلَمْ يَجْعَلْ لِي رَسُولُ اللهِﷺ سُكْنَى وَلاَ نَفَقَةً﴾ رواه مسلم وأبوداود، مێردەکەم سێبەسێ تەلاقیدام، جا پێغەمبەرﷺ نە مافی نیشتەجێکردنو نە بژێوی بۆ دانەنام. جا بزانە: بەپێچەوانەی ئەم حەدیسە- نیشتەجێکردنی(بائِن) بە ئایەتیقورئان واجب کراوە، هەروەك لە پەرتووکی(عدة)دا ڕابرا.

(وَيَجِبَانِ لِحَامِلٍ) بژێو و جلوبەرگ هەردووکی بۆ تەلاقدراوی ئاوسی(بائن) واجبن، هەروەك نیشتەجێکردنیشی واجب بوو، خوای گەورە فەدەرموێ: ﴿وَإِنْ كُنَّ أُولاتِ حَمْلٍ فَأَنْفِقُوا عَلَيْهِنَّ حَتَّى يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾ ئەگەر تەلاقدراوەکان ئاوس بوون بژێویان بدەنێ تا زگەکەیان دادەنێن. جا ئەو بژێوەش کەواجبە (لَهَا) بۆ خودی تەلاقدراوەکەیە بە هۆی زگەکەی (وَفِي قَوْلٍ لِلْحَمْلِ) لە فەرموودەیەکدا: بۆ کۆرپەکەی ناو زگیەتی (فَعَلَى الأَوَّلِ) جا لە سەر فەرموودەکەیەکەمی بەهێزتر: (لاَ تَجِبُ لِحَامِلٍ عَنْ شُبْهَةٍ أَوْ نِكَاحٍ فَاسِدٍ) بژێوەکە بۆ ئەو ژنە واجب نابێ: کە لە جیماعی بە هەڵە، یان بە مارەبڕینێکی نادروست ئاوس بووە.

(قُلْتُ) ئیمامی (النواوي) دەفەرموێ (وَلاَ نَفَقَةَ لِمُعْتَدَّةِ وَفَاةٍ وَإِنْ كَانَتْ حَامِلاً) ئەو ژنەی لە (عدة)ی مێرد مردندایە مافی هیچ بژێو و جلوبەرگی نیە، هەر چەند ئاوسیش بێ (وَاللهُ أَعْلَمُ)-بەلام مافی نیشتەجێکردنی هەیە، هەروەك لە (عدة)دا ڕابرا- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ لِلْحَامِلِ الْمُتَوَفَّى عَنْهَا زَوْجُهَا نَفَقَةٌ﴾ رواه الدارقطني والبيهقي باسناد صحيح، ژنی ئاوسی مێرد مردوو مافی بژێوی نیە.

(وَنَفَقَةُ الْعِدَّةِ مُقَدَّرَةٌ كَزَمَنِ النِّكَاحِ) بژێوی ماوەی (عِدّة) ئەندازەی بۆ داندراوە: وەك بژێوی سەردەمی ژنو مێردایەتییە (وَقِيلَ تَجِبُ الْكِفَايَةُ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: بەشی تێربوونی ژنەکە واجبە (وَلاَ يَجِبُ دَفْعُهَا قَبْلَ ظُهُورِ حَمْلٍ) واجب نیە بژێوەکە پێش

فَإِذَا ظَهَرَ وَجَبَ يَوْمًا بِيَوْمٍ، وَقِيلَ حَتَّى تَضَعَ، وَلاَ تَسْقُطُ بِمُضِيِّ الزَّمَانِ عَلَى الْمَـذْهَبِ.
(فَصْلٌ) أَعْسَرَ بِهَا فَإِنْ صَبَرَتْ صَارَتْ دَيْنًا عَلَيْهِ، وَإِلاَّ فَلَهَاالْفَسْخُ عَلَىالأَظْهَرِ، وَالأَصَحُّ أَنْ لاَفَسْخَ بِمَنْعِ مُوسِرٍ حَضَرَ أَوْ غَابَ،

---

ئاشكرابوونى ئاوسىى ژنـه تەلاقدراوەکه بدا، کەواتـه: (فَـإِذَا ظَهَـرَ) هـەرکاتێك زگەکەی ئاشـکرابو، لـەو کاتـەوە (وَجَبَ يَوْمًـا بِيَـوْمٍ) ڕۆژ بـەڕۆژ واجبە بژێوەکە بدا (وَقِيـلَ) لـە فەرموودەیەکی بێهێزدا: واجب نیە ڕۆژ بەڕۆژیش بیدا (حَتَّى تَضَعَ) تا زگەکەی دادەنـێ، جا ئەو کاتە هەموو بژێوەکەی وێکڕا دەداتێ.
(وَلاَ تَسْقُطُ بِمُضِيِّ الزَّمَانِ) بژێوی (عدّة)-ئەگەر نەدرابێ- بە بەسەرچوونی کاتی(عدّة) لـە سەر مێردەکە لاناچێ (عَلَىالْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب، بـەڵکو دەبێـتە قەرز لە ئەستۆی مێردەکەدا، هەروك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.
جا بزانە: لە مەزهەبی(حنفی)دا تەلاقدراوی سێبەسێش بـژێوی مـاوەی (عدّة)ی لـە سـەر مێردەکەی واجبە، هەرچەند ئاوسیش نەبێ، هەروەك لە (مجمع الأنهر)دا فەرموویەتی.
**﴿ فَصْلٌ: لە باسی (فَسْخ) هەڵوەشاندنەوەیمارەبڕین بە هۆی نەتوانینی بەخێوکردنی ژن ﴾**
(أَعْسَرَ بِهَا) هـەر کاتێـك مێردەکـە بـژێوی ژنەکـەی نـەبو و نـەیتوانی لـە ماوەیداهـاتوودا بەخێوی بکا، ئەوە تەماشا دەکەین: (فَإِنْ صَبَرَتْ صَارَتْ دَيْنًا عَلَيْهِ) ئەگـەر ژنەکە خۆی ڕاگرتو بەخۆی خـۆی بـەخێو کـرد، ئـەوە بژێوەکـەو جلوبەرگەکـە دەبێتـە قـەرز لـە سـەر مێردەکە، هەروەك ڕابرا.
(وَإِلاَّ) بەلام ئەگەر ژنەکە خۆی ڕانەگرت، ئەو کاتـە (فَلَهَاالْفَسْخُ) بـۆ ژنەکـە دروسـتە لـە لای قـازی مارەبڕینەکـەی هەڵبوەشـێنێتەوە: بـەو جۆرەیداهـاتوو (عَلَـى الأَظْهَـرِ) لـە سـەر فەرموودەیبەهێزتر ﴿عن سعيد بن الْمُسَيَّبِ رضي الله عنه فِيالرَّجُلِ الَّذِى لاَيَجِدُ مَـايُنْفِقُ عَلَىأَهْلِـهِ: يُفَرَّقُ بَيْنَهُمَا، وَقَالَ: إِنَّهُ سُنَّةٌ﴾ إسناده صحيح أخرجه سعيد بن منصور، وهذا مرسل قوي معمول به وأخرجه الدارقطني والبيهقي عن أبيهريرة رضي الله عنه مرفوعاً، (إبن المُسَيِّب) لەبارەی ئەو پیـاوەی هیچـی نیـە ژنەکـەی پـێ بـەخێو بکـا فـەرمووی: لێـك جیـا دەکرێنـەوە، ئـەو لێکجیاکردنەوەیەش ڕێبازی پێغەمبەرە ﷺ.
جا بزانە: ئەگەر مێردەکە توانای نەبو بژێوەکەی ماوەیڕابردوو بداتە ژنەکەی، ئـەو کاتـە هەر بە قـەرز لـە ئەسـتۆیدا دەمێنـێو ژنەکـە مـافی هەڵوەشـاندنەوەی نیـە، هـەروەك لـە (تحفة)و (مغنی)دا فەرموویانە.
(وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەیڕاستتر: (أَنْ لاَ فَسْخَ) ژنەکە مافی (فَسْخ)-هەڵوەشاندنەوەی نیە (بِمَنْـعِ مُوسِرٍ) بـە هـۆی بژێونـەدانی مێردێکیهـەبوویی، جیـاوازی نیـە: (حَضَـرَ أَوْ غَـابَ) مێردەکە لە ماڵەوە بێ، یان لە شوێنێکیتری نادیار بێ، چونکە دەتوانێ شکایەتی لێبکاو

وَلَوْ حَضَرَ وَغَابَ مَالُهُ: فَإِنْ كَانَ بِمَسَافَةِالْقَصْرِ فَلَهَاالْفَسْخُ وَإِلاَّ فَلاَ، وَيُؤْمَرُ بِالإِحْضَارِ، وَلَوْ تَبَرَّعَ رَجُلٌ بِهَا لَمْ يَلْزَمْهَا الْقَبُولُ،

---

به بڕیاری دادوەر بژێوەکەی لێبستێنێ ﴿عن عُمَرَ: أَنَّهُ كَتَبَ إِلَى أُمَرَاءِ الأَجْنَادِ فِي رِجَالٍ غَابُوا عَنْ نِسَائِهِمْ: أَنْ يَأْخُذُوهُمْ بِأَنْ يُنْفِقُوا أَوْ يُطَلِّقُوا، فَإِنْ طَلَّقُوا بَعَثُوا بِنَفَقَةِ مَا حَبَسُوا﴾ أخرجه الشافعي والبيهقي بإسنادحسن، ئیمامی(عمر) بۆ سەرکردەکانی لەشکرەکانی نووسی: ئەو پیاوانەی ژنەکانیان بەجێ هێشتون بیانگرن: بۆ ئەوەی بژێوی ژنەکانیان بنێرن، یان تەڵاقیان بدەن، جا ئەگەر تەڵاقیان دان دەبێ بژێوەکەی ماوەیڕابردوو-کە نەیانداوە- بۆ ژنەکانیان بنێرن. واتە: ئەگەر ژنەکانیان مافی هەڵوەشاندنەوەیان هەبووایە، فەرمانی تەڵاقدانی نەدەکرد.

﴿ ئاگاداری ﴾: زۆر لە زانایانیئایین ئەم فەرموودە بێهێزەیان هەڵبژاردوە: کە **(ئەگەر مێردەکە لە شوێنێکیتر بوو و نەدەتواندرا بژێویژنەکەی لێوەربگیرێ، ئەوە بۆ ژنەکەی دروستە: (فَسْخ)ی مارەبڕینەکەی بکا، واتە: هەڵیبوەشێنێتەوە)**. ئیمام (ابن الصلاح)ش ئەم فەرموودەیەی بەهێز کردوە، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتیو لە (فتح المعين)دا درێژتر ڕوون کراوەتەوە.

هەروەها بە فەرموودەیەکیتری بێهێز: **(ئەگەر مێردەکە بێسەروشوێن گوم بوو و هیچ هەواڵێکی مانو نەمانی نەبو و نەدەتواندرا بژێوەکەی لێوەربگیرێ، ئەو کاتەش بۆ ژنەکەی دروستە مارەبڕینەکەی هەڵبوەشێنێتەوە)**. هەروەك لە (شرح المنهج)و (تحفة)و (مغنى)دا گێڕاویەتیانەوە، کەواتە: ئەو ژنانەی مێردیان ون بووە، دەتوانن سود لەو فەرموودە بێهێزەش وەربگرن، هەروەك لە فەرموودەکەیکۆنیش سودیان وەردەگرتو لە باسی (عدَّة)دا ڕوونمان کردەوە.

(وَلَوْ حَضَرَ وَغَابَ مَالُهُ) ئەگەر مێردەکە بەخۆی لە شوێنی ژنەکەدا حازر بوو، بەڵام مڵكو ماڵی لە شوێنێکیتری نادیار بوو، ئەوە (فَإِنْ كَانَ بِمَسَافَةِ الْقَصْرِ) ئەگەر مڵكو ماڵەکەی بە ئەندازەی کورتکردنەوەینوێژ دوور بوو (فَلَهَاالْفَسْخُ) ژنەکە مافی هەڵوەشاندنەوی هەیە (وَإِلاَّ فَلاَ) بەڵام ئەگەر ئەوەندە دوور نەبو، ژنەکە مافیهەڵوەشاندنەوەی نیە، بەڵکو (وَيُؤْمَرُ بِالإِحْضَارِ) مێردەکە فەرمانی پێدەکرێ: ماڵەکەی ئامادە بکاو ژنەکەی پێ بەخێو بکا.

(وَلَوْ تَبَرَّعَ رَجُلٌ بِهَا) ئەگەر کەسێك بە خۆڕایی بژێوەکەی لەجیاتی مێردەکە دایە ژنەکە، ئەوە (لَمْ يَلْزَمْهَاالْقَبُولُ) لە سەر ژنەکە واجب نیە قبوڵی بکا، چونکە منەتی تێدایە.

کەوابو: ئەگەر کەسەکە بە خۆڕایی بژێوەکەی دایە مێردەکە، ئینجا مێردەکەش دایە ژنەکە، ئەو کاتە واجبە: ژنەکە وەریبگرێو نابێ مارەبڕینەکە هەڵبوەشێنێتەوە؟ چونکە ژنەکە منەتبار نابێ.

وَقُدْرَتُهُ عَلَى الْكَسْبِ كَالْمَالِ، وَإِنَّمَا يُفْسَخُ بِعَجْزِهِ عَنْ نَفَقَةِ مُعْسِرٍ، وَالإِعْسَارُ بِالْكِسْوَةِ كَهُوَ بِالنَّفَقَةِ، وَكَذَا بِالأُدْمِ وَالْمَسْكَنِ فِي الأَصَحِّ، قُلْتُ: الأَصَحُّ الْمَنْعُ فِي الأُدْمِ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَفِي إِعْسَارِهِ بِالْمَهْرِ أَقْوَالٌ: أَظْهَرُهَا تَفْسَخُ قَبْلَ وَطْءٍ لاَ بَعْدَهُ، وَلاَ فَسْخَ حَتَّى يَثْبُتَ عِنْدَ قَاضٍ إِعْسَارُهُ فَيَفْسَخُهُ أَوْ يَأْذَنُ لَهَا فِيهِ،

---

هەروەها ئەگەر باوكو باپیرەش بژێوی ژنیكوڕەكەیان بدەن، ئەو كاتەش واجبە ژنەكە وەریبگرێو نابێ مارەبڕینەكە هەڵبوەشێنێتەوە ئەگەر مێردەكەی لە ژێر سەرپەرشتكاریەتی بابەكەیو باپیرەكەیدا بێ، هەروەك لە زۆریەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَقُدْرَتُهُ عَلَى الْكَسْبِ) تواناو هێزی مێردەكە لە سەر كەسابەتكردن (كَالْمَالِ) وەك هەبوونی ملكو ماڵە، واتە: بە نەبوویی داناندرێو ژنەكە مافی هەڵوەشاندنەوەی مارەبڕینی نیە.

(وَإِنَّمَا يُفْسَخُ بِعَجْزِهِ عَنْ نَفَقَةِ مُعْسِرٍ) تەنها لەو حاڵەتەدا مارەبڕینەكە هەڵدەوەشێندرێتەوە: كە مێردەكە توانای نەبێ بژێوی پیاوێكینەبوویی بدا، نەك بژێویهەبوویيو ناوەنجی.

(وَالإِعْسَارُ بِالْكِسْوَةِ كَهُوَ بِالنَّفَقَةِ) نەتوانینی بەرگكرینیژنەكە بە هۆی نەبوویی، وەك نەتوانینی بژێودانەكەیەو دروستە مارەبڕینەكە هەڵبوەشێنێتەوە (وَكَذَا بِالأُدْمِ وَالْمَسْكَنِ فِي الأَصَحِّ) هەروەها ئەگەر توانای پێخورو نیشتەجێكردنیشی نەبێ دروستە هەڵبوەشێنێتەوە، بەلام (قُلْتُ) ئیمامی(النواوي) دەفەرموێ (الأَصَحُّ الْمَنْعُ فِي الأُدْمِ) بە فەرموودەی ڕاستتر: دروست نیە بە هۆی نەبوونی پێخۆر مارەبڕینەكە هەڵبوەشێنێتەوە (وَاللهُ أَعْلَمُ).

(وَفِي إِعْسَارِهِ بِالْمَهْرِ أَقْوَالٌ) لەبارەی نەبوونی مارەییحازر سێ فەرموودە هەنە: (أَظْهَرُهَا تَفْسَخُ قَبْلَ وَطْءٍ) بەهێزترەكەیان: پێش جیماعكردن دروستە ژنەكە مارەبڕینەكە هەڵبوەشێنێتەوە (لاَ بَعْدَهُ) بەلام لە دوایجیماعكردن بۆی دروست نیە، هەروەها ئەگەر مارەییەكە قەرز بێو كاتی دانی هاتبێو مێردەكە نەیبێ بیداتێ، ئەو كاتەش ژنەكە مافی هەڵوەشاندنەوەی نیە، هەروەك (الشبراملسي) فەرموویەتی.

## ﴿ چۆنیەتی هەڵوەشاندنەوەی مارەبڕینەكە ﴾

(وَلاَفَسْخَ) هەڵوەشاندنەوەیمارەبڕین بە هۆی نەتوانینی بەخێوكردن دروست نابێ (حَتَّى يَثْبُتَ عِنْدَ قَاضٍ إِعْسَارُهُ) تا لە لای قازی نەبوویيەكەی جێگیر دەبێ: بە شاهیدی دوو پیاو، یان بە دانپێداهێنانیخۆی، ئینجا كە نەبوویيەكەی جێگیر بوو، ئەو كاتە (فَيَفْسَخُهُ) قازی بەخۆی مارەبڕینەكەی هەڵدەوەشێنێتەوە (أَوْ يَأْذَنُ لَهَا فِيهِ) یان ئیزن دەدا ژنەكە بەخۆی هەڵیبوەشێنێتەوە.

جا ئەگەر لەو شوێنەدا قازی نەبو، یان ژنەكە نەدەگەیشتە لای قازی، یان بۆی هەڵنەدەوەشاندەوە، ئەو كاتە ژنەكە پیاوێكیدادپەروەر دەكاتە (مُحَكَّم)یخۆیو لە لای وی هەڵیدەوەشێنێتەوە، هەڵوەشاندنەوەكەشی لە ئاشكرایيو لە پەنهانیدا جێبەجێ

ثُمَّ فِي قَوْلٍ يُنَجِّزُ الْفَسْخَ، وَالأَظْهَرُ إِمْهَالُهُ ثَلاثَةَ أَيَّامٍ، وَلَهَا الْفَسْخُ صَبِيحَةَ الرَّابِعِ إِلاَّ أَنْ يُسَلِّمَ نَفَقَتَهُ، وَلَوْ مَضَى يَوْمَانِ بِلاَ نَفَقَةٍ وَأَنْفَقَ الثَّالِثَ وَعَجَزَ الرَّابِعَ بَنَتْ، وَقِيلَ تَسْتَأْنِفُ، وَلَهَا الْخُرُوجُ زَمَنَ الْمُهْلَةِ لِتَحْصِيلِ النَّفَقَةِ، وَعَلَيْهَا الرُّجُوعُ لَيْلاً، وَلَوْ رَضِيَتْ بِإِعْسَارِهِ أَوْ نَكَحَتْهُ عَالِمَةً بِإِعْسَارِهِ فَلَهَا الْفَسْخُ بَعْدَهُ، وَلَوْ رَضِيَتْ بِإِعْسَارِهِ بِالْمَهْرِ فَلاَ، وَلاَ فَسْخَ لِوَلِيِّ صَغِيرَةٍ وَمَجْنُونَةٍ بِإِعْسَارٍ بِمَهْرٍ وَنَفَقَةٍ،

---

دەبێ‌و (عدّة)شی لە کاتی‌هەڵوەشاندنەوەکەوە دەست پێ‌دەکا، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

(ثُمَّ فِي‌قَوْلٍ يُنَجِّزُ الْفَسْخَ) ئینجا لە فەرموودەیەکدا دەسبەجێ مارەبڕینەکە هەڵدەوەشێنێتەوە، بەڵام (وَالأَظْهَرُ إِمْهَالُهُ ثَلاثَةَ أَيَّامٍ) بە فەرموودەی‌بەهێزتر:ماوەی سێ ڕۆژان مێردەکە مۆڵەتی دەدرێتێ، ئینجا (وَلَهَا الْفَسْخُ صَبِيحَةَ الرَّابِعِ) ئەگەر لەو سێ ڕۆژەدا بژێوەکەی نەدا، ژنەکە بۆی دروستە: لە بەیانی‌ی ڕۆژی‌چوارەمدا مارەبڕینەکەی هەڵبوەشێنێتەوە (إِلاَّ أَنْ يُسَلِّمَ نَفَقَتَهُ) مەگەر مێردەکە بژێوەکەی ڕۆژی‌چوارەم تەسلیمی ژنەکە بکا، ئەو کاتە دروست نیە مارەبڕینەکە هەڵبوەشێنێتەوە.

(وَلَوْ مَضَى يَوْمَانِ بِلاَ نَفَقَةٍ) ئەگەر دوو ڕۆژ ڕۆیشتن‌و بژێوەکەی نەدا، بەڵام (وَأَنْفَقَ الثَّالِثَ وَعَجَزَ الرَّابِعَ) ڕۆژی‌سێ‌یەم بژێوەکەی‌دا، ڕۆژی‌چوارەمیش توانای نەبو بیدا، ئەو کاتە (بَنَتْ) ژنەکە لە سەر دوو ڕۆژەکەی‌ڕابردوو ماوەی سێ ڕۆژەکە تەواو دەکا (وَقِيلَ تَسْتَأْنِفُ) لە فەرموودەیەکی بێ‌هێزدا: سەرلەبنیات دەست بە سێ ڕۆژەکە دەکاتەوە (وَلَهَا الْخُرُوجُ زَمَنَ الْمُهْلَةِ لِتَحْصِيلِ النَّفَقَةِ) ژنەکە بۆی دروستە لە ماوەی‌مۆڵەتەکەدا بەڕۆژ بڕواتە دەرەوە تاکو بژێوەکە بۆ خۆی وەدەست بێنێ، بەڵام (وَعَلَيْهَا الرُّجُوعُ لَيْلاً) لە سەری واجبە شەوێ بگەڕێتەوە بۆ ماڵەکەی .

(وَلَوْ رَضِيَتْ بِإِعْسَارِهِ) ئەگەر ژنەکە بە نەبوویی مێردەکەی ڕازی بوو (أَوْ نَكَحَتْهُ عَالِمَةً بِإِعْسَارِهِ) یان لەو کاتەی شووی بە پیاوەکە کرد، دەیزانی نەبوویی‌و توانای بژێودانەکەی نیە، ئەوە لە هەردوو مەسەلەدا (فَلَهَا الْفَسْخُ بَعْدَهُ) بۆ ژنەکە دروستە لە دوای ڕازی‌بوونەکەش مارەبڕینەکەی هەڵبوەشێنێتەوە.

بەڵام (وَلَوْ رَضِيَتْ بِإِعْسَارِهِ بِالْمَهْرِ) ئەگەر بە نەبوویی‌مارەییەکەی ڕازی بوو، ئەو کاتە (فَلاَ) دروست نیە مارەبڕینەکەی هەڵبوەشێنێتەوە (وَلاَ فَسْخَ لِوَلِيِّ صَغِيرَةٍ وَمَجْنُونَةٍ) هەڵوەشاندنەوەی مارەبڕین دروست نیە: بۆ سەرپەرشتکاری ژنە بچوکەکەو ژنە شێتەکە (بِإِعْسَارٍ بِمَهْرٍ وَنَفَقَةٍ) بە هۆی ئەوەی مێردەکەیان توانای مارەیی‌و بژێوەکەیانی نەبێ، بەڵکو بە قەرزی سەر مێردەکەیان: خزمەکانیان، یان (بيت المال) بەخێویان دەکەن.

وَلَوْ أَعْسَرَ زَوْجُ أَمَـةٍ بِالنَّفَقَـةِ فَلَهَاالْفَسْـخُ، فَـإِنْ رَضِـيَتْ فَـلاَ فَسْـخَ لِلسَّـيِّدِ فِي الأَصَحِّ، وَلَهُ أَنْ يُلْجِئَهَا إِلَيْهِ بِأَنْ لاَ يُنفِقَ عَلَيْهَـا وَيَقُـولَ: افْسَـخِي أَوْ جُـوعِي. (فَصْلٌ) يَلْزَمُهُ نَفَقَةُالْوَالِدِ وَإِنْ عَلاَ، وَالْوَلَدِ وَإِنْ سَفَلَ وَإِنْ اخْتَلَفَ دِينُهُمَا، بِشَرْطِ يَسَارِ الْمُنفِقِ بِفَاضِلٍ عَنْ قُوتِهِ وَقُوتِ عِيَالِهِ فِي يَوْمِهِ، وَيُبَاعُ فِيهَا مَا يُبَاعُ فِي الدَّيْنِ،

---

(وَلَوْ أَعْسَرَ زَوْجُ أَمَةٍ بِالنَّفَقَةِ فَلَهَا الْفَسْخُ) ئەگەر مێردی (جارية)کەش توانای بژێوی نەبێ، (جارية)كە بۆی دروستە مارەبڕینەکە هەڵبوەشێنێتەوە (فَإِنْ رَضِيَتْ فَلاَ فَسْخَ لِلسَّيِّدِ فِي الأَصَحِّ) جا ئەگەر (جارية)كە بە نەبوویی مێردەکە ڕازی بێ، بۆ گەورەکەی دروست نیە هەڵیبوەشێنێتەوە، بەڵام (وَلَهُ أَنْ يُلْجِئَهَا إِلَيْهِ) بۆ گەورەکە دروستە: (جارية)كە ناچار بکا بۆ هەڵوەشاندنەوەکە: (بِأَنْ لاَ يُنفِقَ عَلَيْهَا) وەك بەخێوی نەکاو (وَيَقُولَ) پـێی بڵـێ: (افْسَخِي أَوْ جُوعِي) یان مارەبڕینەکەت هەڵبوەشێنەوە، یان برسی ببە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی بەخێوکردنی خزمو کەسەکان ﴾

بزانە: مەبەست بە بژێودان لە باسی خزمەکاندا: ئەرکی خواردەمەنیو پێخۆرو جلو بەرگو شوێنی نیشتەجێبوونو پارەی دەرمانی نەخۆشیو کرێی پزیشکە.

(يَلْزَمُهُ نَفَقَةُ الْوَالِدِ وَإِنْ عَلاَ) لە سەر کوڕو کیژ واجبە: بژێوی دایکو باوکو داپیرەو باپیرە بدەن، هەرچەند بەرەوسەرەوەش بن (وَالْوَلَدِ وَإِنْ سَفَلَ) لە سەر دایکو باوکیش واجبە: بژێوی کوڕو کیژو نەوەکانیان بدەن، هەرچەند بەرەوخواریش بن (وَإِنْ اخْتَلَفَ دِينُهُمَا) هەرچەند ئایینەکەشیان جیاواز بێ: وەك دایكو باوکەکان کافر بنو منداڵەکانیان موسوڵمان بن، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ جَاهَدَاكَ عَلَى أَنْ تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلاَ تُطِعْهُمَا وَصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنْيَا مَعْرُوفاً﴾ ئەگەر دایكو باوکت هەوڵیان لەگەڵ دای هاوبەشم بۆ دابنێی گوێڕایەڵیان مەبە، بەڵام لە دونیادا بە چاکی هاوڕێیەتیان بکە. واتە: بەخێوکردنیان بەشێکە لە هاوڕێیەتی چاك.

هەم دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾ ئەگەر ژنەکانتان شیریان دایە منداڵەکانتان ئێوەش کرێی شیردانەکەیان بدەنێ. واتە: چونکە بەخێوکردنی منداڵەکانتان لە سەر واجبە.

جا بزانە: جگە لە تیرەی سەرەوەو تیرەی خوارەوە بەخێوکردنی هیچ خزمێکیتر واجب نیە، بەڵام لە مەزهەبی ئیمامی(حنفی)دا: بەخێوکردنی گشت خزمێکیمەحرەم واجبە، بەو مەرجەی ئایینیان یەك بێ، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.

جا ئەو بەخێوکردنەش کە واجبە (بِشَرْطِ يَسَارِ الْمُنْفِقِ) بەو مەرجەیە: بژێودەرەکە هەبوویی بێ: (بِفَاضِلٍ عَنْ قُوتِهِ وَقُوتِ عِيَالِهِ فِي يَوْمِهِ) بەوەی زیدەی هەبێ لە بژێوی خۆیو ژنو منداڵەکانی لە ڕۆژو شەوەکەیدا (وَيُبَاعُ فِيهَا مَا يُبَاعُ فِي الدَّيْنِ) بۆ بەخێوکردنی

وَيَلْزَمُ كَسُوبًا كَسْبُهَا فِي الأَصَحِّ، وَلاَ تَجِبُ لِمَالِكِ كِفَايَتِهِ وَلاَ لِمُكْتَسِبِهَا، وَتَجِبُ لِفَقِيرٍ غَيْرِ مُكْتَسِبٍ إِنْ كَانَ زَمِنًا أَوْ صَغِيرًا أَوْ مَجْنُونًا وَإِلاَّ فَأَقْوَالٌ أَحْسَنُهَا: تَجِبُ، وَالثَّالِثُ لأَصْلٍ لاَ فَرْعٍ، قُلْتُ: اَلثَّالِثُ أَظْهَرُ وَاللهُ أَعْلَمُ.

---

دایكو باوكو منداڵەكانی واجبە: ئەو شتە بفرۆشرێ كە بۆ دانەوەی قەرز دەفرۆشرێ: وەك زەویو باغو ئەو جۆرە شتانەی لە باسی قەدەغەكردنیقەرزدا ڕابران.

هەم (وَيَلْزَمُ كَسُوبًا كَسْبُهَا) لە سەر كاسبكار واجبە: بە كەسابەتیخۆی ئەركی بەخێوكردنەكەیان پەیدا بكا (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەیڕاستتردا، بەڵام (وَلاَ تَجِبُ لِمَالِكِ كِفَايَتِهِ) بەخێوكردنی ئەو دایكو باوكو منداڵانە واجب نیە، كە بەشیخۆی مڵكو ماڵی هەیە، هەرچەند پەككەوتووش بێ، یان شێت بێ، یان بچوك بێ، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی، واتە: ئەگەر پەككەوتوو، یان شێت، یان منداڵ مڵكو ماڵی خۆی هەبێ، ئەو كاتە لە سەر حیسابیخۆی بەخێو دەكرێ (وَلاَ لِمُكْتَسِبِهَا) هەروەها بەخێوكردنی ئەو كەسەش واجب نیە كە بەشیخۆی كەسابەت دەكا.

(وَتَجِبُ لِفَقِيرٍ غَيْرِ مُكْتَسِبٍ) بەخێوكردنی ئەو جۆرە دایكو باوكو كوڕو كیژە واجبە: كە هەژارەو كەسابەتیشی پێناكرێ (إِنْ كَانَ زَمِنًا) ئەگەر پەككەوتوو بێ، یان كوێر بێ، یان نەخۆشێكی بەردەوام بێ (أَوْ صَغِيرًا أَوْ مَجْنُونًا) یان هەژارو بچوك بێ، یان هەژارو شێت بێ.

جا ئەگەر منداڵە بچوكەكە دەیتوانی كارێك بكا، بۆ سەرپەرشتكارەكەی دروستە: بە زۆرلێكردن كارەكەی پێبكاو لە بەرهەمیكارەكەی بەخێوی بكا هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

(وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر توانای كەسابەتی هەبو و بە قەسدی كەسابەتی نەدەكردو پەككەوتوو و شێتو منداڵیش نەبو، ئەو كاتە (فَأَقْوَالٌ) سێ فەرموودە هەنە:

(أَحْسَنُهَا تَجِبُ) جوانترەكەیان: لەو حاڵەتەشدا بەخێوكردنی تیرەی سەرەوەو خوارەوە واجبە (وَالثَّالِثُ) سێیەمەكەش دەفەرموێ: (لأَصْلٍ لاَ فَرْعٍ) بەخێوكردنی تیرەی سەرەوە واجبەو داوای كاركردنیان لێناكرێ، بەڵام بەخێوكردنی تیرەی خوارەوە واجب نیە، بەڵكو تیرەی خوارەوە داوای كاركردنیان لێ دەكرێ (قُلْتُ) ئیمامی (النواوي) دەفەرموێ (اَلثَّالِثُ أَظْهَرُ) ئەم فەرموودە سێیەمە بەهێزترە (وَاللهُ أَعْلَمُ) چونكە زۆر سفلەییو بێئەمەكییەو بە هاوڕێیەتیی باش دانانرێ كوڕو كیژ داوای كاركردن لە دایكو باوكیان بكەنو بەخێویان نەكەن.

جا بزانە: تا كوڕ بلۆغی دەبێو كیژ شوو دەكا بەخێوكردنیان واجبە، واتە: بە تەنها شووكردن بژێوی دایكو كیژ لادەكەوێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دروست نیە داوای شووكردنیان لێبكرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

وَهِيَ الْكِفَايَةُ، وَتَسْقُطُ بِفَوَاتِهَا، وَلاَ تَصِيرُ دَيْنًا عَلَيْهِ إلاَّ بِفَرْضِ قَاضٍ، أَوْ إذْنِهِ فِي اقْتِرَاضٍ لِغَيْبَةٍ أَوْ مَنْعٍ،

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر تیرەی سەرەوە، یان خوارەوە توانای کەسابەتێکی حەڕامی هەبوو، ئەوەش وەکو نەتوانین وایە، هەروەها ئەگەر کەسابەتەکەش شیاوی‌خۆی نەبێ، هەر بە نەبوون دادەندرێ، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی، واتە: با کەسابەتەکە نەکاو واجبە: بەخێو بکرێ، هەروەها ئەگەر خەریکی خوێندن بوو بۆیێ کەسابەتی پێنەدەکرا، ئەو کاتەش بەخێوکردنی واجبە، هەروەك لە (الشبراملسی)و (الشروانی)دا فەرموویانە.

(وَهِيَ) مەبەست بە بژێوی تیرەی سەرەوەو خوارەوە (اَلْكِفَايَةُ) ئەوەیە چەندی پێویستە ئەوەندی بداتێ: لە خواردن‌و جل‌و بەرگ‌و نیشتەجێ‌کردن‌و دەرمان‌و پزیشك‌و خزمەتکردن، بەلام (وَتَسْقُطُ بِفَوَاتِهَا) ئەو بژێوە بە لەدەستچوون لادەکەوێ، واتە: ئەگەر ماوەیەك بژێوەکە نەدرا، ئەوە لەدەست دەچێ‌و (وَلاَ تَصِيرُ دَيْنًا عَلَيْهِ) نابێتە قەرز لە ئەستۆی بژێودەرەکە (إلاَّ بِفَرْضِ قَاضٍ) تەنها بە دانانی قازی دەبێتە قەرز (أَوْ إذْنِهِ فِي اقْتِرَاضٍ) یان ئەگەر قازی ئیزنی بدا بژێوەکە قەرز بکا (لِغَيْبَةٍ أَوْ مَنْعٍ) لە بەر ئەوەی بژێودەرەکە لەو شوێنەدا حازر نیە، یان بە ڕقەکاری بژێوەکە نادا، لەو حالەتانەدا بژێوەکە دەبێتە قەرز.

﴿ ئاگاداریەکی‌تر ﴾: لەو حالەتەی بەخێوکردنی واجبەو بژێوەکەشی نادرێتێ‌و ناشتوانێ بە قازی لێ‌یوەربگرێ، دروستە خاوەن مافەکە ئەندازەی بژێوەکەی‌خۆی لە مالی بژێودەرەکە ببا، هەم بۆ باوك‌و باپیرە دروستە: بە ناوی‌سەرپەرشتکاریەتی بژێوی‌خۆیان لە مالی کوڕو کیژە بچوکەکانیان ببەن، بەلام ئەگەر دایك بژێوەکەی لە سەر کوڕو کیژە بچوکەکان بێ، نابێ بە بێ‌بڕیاری قازی ببیا، هەروەك لە (نهاية) و (مغنی)دا فەرموویانە.

جا ئەگەر دایکەکە سەروەسێت بوو لە سەر مندالە بچوکەکانی، ئەو کاتە پێویست بە ئیزنی قازی ناکا، هەروەك ئەگەر قازی نەبو و بژێودەرەکەش حازر نەبو، نەشگونجا لە مالی بژێودەرەکە بژێوەکە ببا، لەو حالەتەدا دروستە دایکەکە: بژێوی مندالەکانی قەرز بکا، یان لە مالی‌خۆی بژێوەکەیان بە قەرز بداتێ، بەلام لە هەردوو حالەتدا مەرجە: دوو شاهید بگرێ بۆ ئەوەی بتوانێ لە بژێودەرەکە وەری‌بگرێتەوە، هەروەك لە (تحفة)و (الشروانی)دا ڕوون کراوەتەوە، واتە: ئەگەر دەگونجا لە مالی بژێودەرەکە ببیا، ئەو کاتە نابێ قەرزی بکا.

جا بەلگەی ئەو مەسەلانە ئەم حەدیسەیە: ﴿عن عائشة رضی‌الله عنها: أَنَّ هند بنت عُتْبَة قَالَتْ: إِنَّ أَبَاسُفْيَانَ لاَيُعْطِينِي مَا يَكْفِينِي وَوَلَدِى إِلاَّ مَا أَخَذْتُ مِنْهُ وَهُوَ لاَيَعْلَمُ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: خُذِى مَا يَكْفِيكِ وَوَلَدَكِ بِالْمَعْرُوفِ﴾ رواه الشیخان، (أبوسفیان)ی‌مێردم بەشی خۆم‌و

وَعَلَيْهَا إرْضَاعُ وَلَدِهَا اللِّبَأَ، ثُمَّ بَعْدَهُ إنْ لَمْ يُوجَدْ إلاَّ هِيَ أَوْ أَجْنَبِيَّةٌ وَجَبَ إرْضَاعُهُ، وَإنْ وُجِدَتَا لَمْ تُجْبَرِ الأُمُّ، فَإنْ رَغِبَتْ وَهِيَ مَنْكُوحَةُ أَبِيهِ فَلَهُ مَنْعُهَا فِي الأَصَحِّ، قُلْتُ: الأَصَحُّ لَيْسَ لَهُ مَنْعُهَا وَصَحَّحَهُ الأَكْثَرُونَ وَاللهُ أَعْلَمُ. فَإنِ اتَّفَقَا وَطَلَبَتْ أُجْرَةَ مِثْلٍ أُجِيبَتْ،

---

منداڵەکەم بژێوم ناداتێ، مەگەر بە دزی لە ماڵەکەی ببەم؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەشی خۆت‌و منداڵەکەت لە ماڵی مێردەکەت ببە.

## ﴿ باسی شیردانی منداڵ ﴾

(وَعَلَيْهَا) لە سەر دایك واجبە (إرْضَاعُ وَلَدِهَا اللِّبَأَ) فرچك بداتە منداڵەکەی، واتە: شیری دوای منداڵبوون، بەڵام دروستە کرێی فرچکەکە وەربگرێ (ثُمَّ بَعْدَهُ) ئینجا لە دوای فرچکەکەش (إنْ لَمْ يُوجَدْ إلاَّ هِيَ أَوْ أَجْنَبِيَّةٌ) ئەگەر جگە لە دایکەکە، یان جگە لە ئافرەتێکی‌بێگانە هیچ ئافرەتێکی‌تر حازر نەبو، ئەو کاتە (وَجَبَ إرْضَاعُهُ) لە سەر حازرەکە واجبە شیری بداتێ، جا بۆ دایکەکەو بۆ بێگانەکە دروستە داوای کرێی شیردانەکەی لەو کەسە بکەن: کە بەخێوکردنی منداڵەکەی لە سەرە (وَإنْ وُجِدَتَا) ئەگەر دایکەکەو ژنە بێگانەکە هەردووکیان حازر بون، ئەو کاتە (لَمْ تُجْبَرِ الأُمُّ) دایکەکە زۆری لێناکرێ شیر بداتە منداڵەکەی، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإنْ تَعَاسَرْتُمْ فَسَتُرْضِعُ لَهُ أُخْرَى﴾ ئەگەر لەبارەی شیردانی منداڵ کەوتنە زەیقەتی‌و دایکەکە شیری نەدایێ، ئەوە ئافرەتێکی‌تر بۆی شیر دەدا. واتە: زۆر لە دایکەکە ناکرێ.

(فَإنْ رَغِبَتْ وَهِيَ مَنْكُوحَةُ أَبِيهِ) جا ئەگەر دایکەکە حەزی‌کرد شیر بداتە منداڵەکەی‌و هەر لە ژێر مارەی باوکی منداڵەکەشدا بوو، ئەوە (فَلَهُ مَنْعُهَا فِي الأَصَحِّ) باوکەکە بۆی هەیە رێگای نەدا (قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) دەفەرموێ (الأَصَحُّ لَيْسَ لَهُ مَنْعُهَا) بە فەرموودەی راستتر: باوکەکە بۆی دروست نیە دایکەکە قەدەغە بکا لە شیردانی‌منداڵەکەی (وَصَحَّحَهُ الأَكْثَرُونَ وَاللهُ أَعْلَمُ) زۆرترینی‌زانایانیش ئەم فەرموودەیان بە راست داناوە، چونکە دایك بە بەزەیی‌ترەو شیرەکەشی گونجاوترە، جا ئەگەر لە ئەندازەی ماوەی‌شیردانەکەدا بووە کێشەیان، ئەوە لە (باسی بەخێوکردنی‌کۆیلە)دا روونی دەکەینەوە، إن شاءالله تعالى.

(فَإنِ اتَّفَقَا) جا ئەگەر رێك کەوتن دایکەکە شیر بداتە منداڵەکەی‌و (وَطَلَبَتْ أُجْرَةَ مِثْلٍ) دایکەکەش داوای کرێی‌هاووێنەی کرد، ئەوە (أُجِيبَتْ) بە قسەی دایکەکە دەکرێ‌و واجبە کرێی‌شیردانەکەی بدرێتێ، خوای‌گەورە دەفەرموێ: ﴿فَإنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾ ئەگەر ژنەکانتان منداڵەکانیان بۆ شیردان کرێیەکەیان بدەنێ.

جا بزانە: ئەگەر دایکەکە شیری دایە منداڵەکەی‌و بێ‌دەنگ بوو و داوای کرێی نەکرد، ئەو کاتە مافی کرێی نیە، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

أَوْ فَوْقَهَا فَلاَ، وَكَذَا إِنْ تَبَرَّعَتْ أَجْنَبِيَّةٌ أَوْ رَضِيَتْ بِأَقَلَّ فِي الأَظْهَرِ، وَمَنْ اسْتَوَى فَرْعَاهُ أَنْفَقَا، وَإِلاَّ فَالأَصَحُّ أَقْرَبُهُمَا، فَإِنْ اسْتَوَى فَبِالإِرْثِ فِي الأَصَحِّ، وَالثَّانِي بِالإِرْثِ ثُمَّ الْقُرْبِ، وَالْوَارِثَانِ يَسْتَوِيَانِ أَمْ يُوَزَّعُ بِحَسَبِهِ؟ وَجْهَانِ،

---

(أَوْ فَوْقَهَا) یان ئەگەر دایکەکە لە کرێی هاوێنە زیاتری داوا کرد، ئەو کاتە (فَلاَ) بە قسەی ناکرێو شیردەرێکی بێگانەی بۆ دەگیرێ ( وَكَذَا إِنْ تَبَرَّعَتْ أَجْنَبِيَّةٌ) هەروەها بە قسەی دایکەکە ناکرێ ئەگەر ئافرەتێکی بێگانە بە خۆڕایی شیری بداتێ (أَوْ رَضِيَتْ بِأَقَلَّ) یان ئەگەر بە کەمتر لە کرێی دایکەکە ڕازی بێ، ئەو کاتەش بە قسەی دایکەکە ناکرێو بێگانەکە شیری دەداتێ (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەیبەهێزتردا، واتە: بەڵام ئەگەر دایکەکەش بە خۆڕایی شیری بداتێ، ئەو کاتە دروست نیە بدرێتە دەست بێگانە، والله أعلم.

## ﴿ هاوبەشی لە بەخێوکردندا ﴾

(وَمَنْ اسْتَوَى فَرْعَاهُ) هەر دایکو باوکێک کوڕەکانیان، یان کیژەکانیان یەکسان بون: لە نزیکیو میراتگرتندا: وەك دوو کوڕ بە یەکەوە، یان دوو کیژ بە یەکەوە، ئەوە (أَنْفَقَا) واجبە: بە یەکەوە بژێوی دایکو باوکەکەیان بدەن، هەرچەند یەکێکیشیان لەویتر دەوڵەمەندتر بێ (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر لە نزیکیدا وەکو یەکتری نەبون، ئەو کاتە (فَالأَصَحُّ أَقْرَبُهُمَا) بە فەرموودەیڕاستتر: بژێوەکە لە سەر نزیکترەکەیان واجبە، هەرچەند مێینەش بێو میراتگریش نەبێ: وەك کیژیکیژ و کوڕیکیژ، لەگەڵ کوڕیکوڕیکوڕ ﴿عن أبي هريرة ﷺ: قال رَجُلٌ مَنْ أَحَقُّ النَّاسِ بِحُسْنِ الصُّحْبَةِ؟ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: أُمُّكَ ثُمَّ أُمُّكَ ثُمَّ أُمُّكَ، ثُمَّ أَبُوكَ، ثُمَّ أَدْنَاكَ فَأَدْنَاكَ﴾ رواه مسلم، کێ شیاوترە بە جوانیی هاوڕێیەتی؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دایکت، دایکت، دایکت، ئینجا باوکت، ئینجا نزیکترت، نزیکترت.

(فَإِنْ اسْتَوَى) جا ئەگەر نزیکییان یەکسان بوو: وەك کیژیکوڕو کوڕیکیژ، ئەو کاتە (فَبِالإِرْثِ فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا: بە میراتگرتن بژێودانەکە ڕەچاو دەکرێ، کەواتە: لە سەر کیژەکوڕەکە واجبە، نەك لە سەر کوڕەکیژەکە (وَالثَّانِي) بە فەرموودەی دووەمی بێهێز: (بِالإِرْثِ) یەکەمجار بە میراتگرتن بژێودانەکە ڕەچاو دەکرێ، هەرچەند ئەوەکەیتریش نزیکتر بێ (ثُمَّ الْقُرْبِ) ئینجا نزیکی ڕەچاو دەکرێ، کەواتە: بەم فەرموودەیە: لە سەر کوڕیکوڕیکوڕەکە واجبە بژێوەکەی داپیرەو باپیرەکانی بداو لە سەر کیژیکیژو کوڕیکیژەکە واجب نیە؟ چونکە ئەو میراتگرەو ئەوانە میراتگر نین.

(وَالْوَارِثَانِ) دوو میراتگری لە یەك پلە: وەك کوڕێكو کیژێك (يَسْتَوِيَانِ أَمْ يُوَزَّعُ بِحَسَبِهِ؟) ئایا یەکسانن بۆ بژێودان، یان بەگوێرەی میراتگرتنەکەیان بە سەریاندا بەش دەکرێ؟ (وَجْهَانِ) دوو فەرموودە هەنە، بەهێزترەکەیان دەفەرموێ: بەگوێرەی میراتگرتن بە سەریاندابەش دەکرێ، کەواتە: کوڕەکە دوو بەشی بژێوەکەی دایکو باوکی دەدا، کیژەکەش بەشێکی دەدا...بەم جۆرە.

وَمَنْ لَهُ أَبوان فَعَلىالأَب، وَقيلَ عَلَيْهِمَا لبالغٍ، أَوْ أَجْدادٌ وَجدَّاتٌ إِنْ أَدْلَى بَعْضُهُمْ ببَعْض فالأَقْرَبُ، وَإلاَّ فَبالْقُرْب، وَقيلَ الإرْثُ، وَقيل بولاَيَةالْمَال، وَمَنْ لَهُ أَصْلٌ وَفَرْعٌ فَفي الأَصَحِّ عَلَى الْفَرْعِ وَإِنْ بَعُدَ، أَوْ مُحْتَاجُونَ يُقَدِّمُ زَوْجَتَهُ ثُمَّ الأَقْرَبَ،

---

(وَمَنْ لَهُ أَبَوَان) ئەو هەژارەی دایكو باوكی وێكڕا هەنە، ئەوە (فَعَلَىالأَب) بژێوەكەی تەنها لە سەر باوكیەتی، ئینجا لە سەر باپیرەیەتی، واتە: هەتا باوكو باپیرەو بە سەرەوەتر هەبن، بژێوی منداڵەكە: نە لە سەر دایكەكەیو نە لە سەر داپیرەكەی واجب نابێ، هەرچەند بلۆغیشی بوبێ، بەڵام ئەگەر منداڵەكە باوكو باپیرەی نەبو و هیچ ماڵیشی نەبو، ئەو كاتە بژێوەكەی لە سەر دایكیەتی، هەروەك لە (مەرجەكانی پەروەردەكەر)دا ڕوون كراوەتەوە (وَقيلَ عَلَيْهِمَا لِبَالِغٍ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: بژێوەكە لە سەر دایكو باوكەكەیە بۆ ئەو منداڵەی بلۆغی بووە بەگوێرەی میرات.

(أَوْ أَجْدَادٌ) یان تەنها باپیرەكانی دایكیو باوكی وێكڕا كۆ بونەوە (أَوجَدَّاتٌ) یان تەنها داپیرەكانی دایكیو باوكی وێكڕا كۆ بونەوە، ئەوە (إِنْ أَدْلَى بَعْضُهُمْ بِبَعْضٍ) ئەگەر باپیرەكان، یان داپیرەكان هەندێكیان بە هەندێكیان دەگەیشتنە منداڵەكە، ئەو كاتە (فَالأَقْرَبُ) كامەیان نزیكترە، واجبە: ئەویان بژێوەكە بدا (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر بە یەكتری نەدەگەیشتنە منداڵەكە، ئەو كاتەش (فَبِالْقُرْبِ) هەر بەنزیكی ڕەفتاردەكرێو كامەیان نزیكترە ئەویان بژێوەكە دەدا، بە بەڵگەی حەدیسەكەیڕابردوو (وَقِيلَ الإِرْثُ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: بەگوێرەی میراتگرتن ڕەفتار دەكرێ (وَقِيلَ بِوِلاَيَةِ الْمَالِ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: بە سەرپەرشتیی ماڵی ڕەفتار دەكرێ.

(وَمَنْ لَهُ أَصْلٌ وَفَرْعٌ) ئەو هەژارەی دایكو باوكو كوڕو كیژی هەنە (فَفِي الأَصَحِّ عَلَى الْفَرْعِ وَإِنْ بَعُدَ) لە فەرموودەی ڕاستتردا: بژێوەكەی لە سەر كوڕو كیژیەتی هەر چەند دووریش بن: وەك كوڕیكوڕو بەرەو خوارتر، كەواتە: تا تیرەی خوارەوە هەبێ، بژێوەكە لە سەر تیرەی سەرەوە واجب نابێ.

(أَوْ مُحْتَاجُونَ) یان ئەگەر كەسێك هەژارەكانی تیرەی سەرەوەو خوارەوەی وێكڕا هەبونو بژێوەكەش بەشی هەموانی نەدەكرد، ئەو كاتە (يُقَدِّمُ زَوْجَتَهُ) پێش هەموویان واجبە: بژێوی ژنەكەی بدا، چونكە بە هیچ جۆرێك بژێوەكەی لا ناكەوێو دەبێتە قەرز (ثُمَّ الأَقْرَبَ) ئینجا نزیكتر، جا نزیكترەكە وەپێش دێخێ، واتە: منداڵە بچوكەكانو شێتەكانی، ئینجا دایكی، ئینجا باوكی، ئینجا منداڵە بالغەكانی، ئینجا داپیرەكانی، ئینجا باپیرەكانی ﴿عن أبي هريرةﷺ: قال رَجُلٌ: يَارَسُولَ الله عندى دينارٌ؟ قالﷺ: أَنْفِقْهُ عَلَى نَفْسِكَ. قَالَ: عندى آخَرُ؟ قالﷺ: أَنْفِقْهُ عَلَى زَوْجَتِكَ. قَالَ: عندى آخَرُ؟ قالﷺ: أَنْفِقْهُ عَلَى وَلَدِكَ...﴾الحديث رواه النسائي واصله في صحيح مسلم، پیاوێك گوتی: ئەگەر دینارێكم هەبێ؟ پێغەمبەرﷺ

وَقيــــــــلَ: الْــــــــــوَارِثَ، وَقيــــــــلَ: الْـــــــوَلِيّ.
(فَصْلٌ) اَلْحضَانَةُ حفظُ مَنْ لاَ يَسْتَقِلُّ وَتَرْبِيَتُهُ. وَالإِنَاثُ أَلْيَقُ بهَا، وَأَوْلاَهُنَّ أُمٌّ ثُمَّ أُمَّهَاتٌ يُدْلِينَ بِإِنَاث يُقَدَّمُ أَقْرَبُهُنَّ، وَالْجَدِيدُ تُقَدَّمُ بَعْدَهُنَّ أُمُّ أَب ثُمَّ أُمَّهَاتُهَاالْمُدْلِيَاتُ بِإِنَاث ثُمَّ أُمُّ أَبِيأَب كَذَلكَ، ثُمَّ أُمُّ أَبِيجَدّ كَذَلكَ، وَالْقَديمُ: الأَخَوَاتُ وَالْخَالاَتُ عَلَيْهِنَّ،

---

فەرمووی: خۆتی پێ بژێینە، گوتی: دینارێکیترم هەبێ؟ فەرمووی: ژنەکەتی پێبژێینە، گوتی: دینارێکیترم هەبێ؟ فەرمووی: منداڵەکەت پێ بژێنە.
(وَقيلَ الْوَارِث) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: میراتگرەکە وەپێش دێخی (وَقيلَ الْوَلِيّ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: سەرپەرشتکارەکە وەپێش دێخێ.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی (اَلْحضَانَةُ): پاراستنو پەروەردەکردنی منداڵ ﴾

واتەی (اَلْحضَانَةُ) لە شەرعدا: (حِفْظُ مَنْ لاَ يَسْتَقِلُّ وَتَرْبِيَتُهُ) پاراستنو پەروەردەکردنی ئەو کەسەیە کە سەربەخۆ نیە: وەك منداڵو شێت، بەوەی لە خراپە بیپارێزێو جلو لاشەی بشۆرێ، خواردەمەنیی بۆ ئامادە بکرێو لە بێشکەدا بژێندرێ تاکو بخەوێ.
(وَالإِنَاثُ أَلْيَقُ بِهَا) ئافرەتان شیاوترن بەو کارە (وَأَوْلاَهُنَّ أُمٌّ) لە هەموویانیش لەپێشتر دایکیمنداڵەکەیە تا منداڵەکە فامیدە دەبێ، چونکە لە گشتیان بە بەزەییترە، ئینجا کە فامیدە بوو، بەو شێوەیداهاتوو دەکرێتە سەرپشك ﴿عن عبدالله بن عمرو رضي الله عنهما: أَنَّ امْرَأَةً قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنَّ ابْنِي هَذا كَانَ بَطْنِي لَهُ وِعَاءً وَثَدْيِي لَهُ سِقَاءً وَحجْرِي لَهُ حِوَاءً، وَإِنَّ أَبَاهُ طَلَّقَنِي وَأَرَادَ أَنْ يَنْتَزِعَهُ مِنِّي؟ فَقالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَنْتِ أَحَقُّ بِهِ مَـا لَمْ تَنْكِحِـي﴾ رواهأبوداود وأحمد وصححه الحاكم، ژنێکی تەڵاقدراو گوتی: ئەم کوڕەی من زگەکەم کیسەیئەو بوو، مەمکم کوندەی ئەو بوو، کۆشم یاتاغی ئەو بوو، باوکیشی منی تەڵاق داوەو دەیەوێ لە منی وەربگرێتەوە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: تۆ مافت زیاترە منداڵەکەت لە لا بێ، تا مێردێکیتر ناکەی.
(ثُمَّ) ئینجا لە دوای دایك (أُمَّهَاتٌ يُدْلِينَ بِإِنَاث) داپیرەکانی لەدایکی کە بە پوختەی مێینەکان بگەنەوە دایکەکە (يُقَدَّمُ أَقْرَبُهُنَّ) نزیکترەکەیان وەپێش دێخرێ بۆ پەروەردەی منداڵەکە، ئینجا (وَالْجَدِيدُ) بە فەرموودەینوێ (تُقَدَّمُ بَعْدَهُنَّ أُمُّ أَبٍ) لە دوای داپیرەکانی لەدایکی، دایکیباوك وەپێش دێخرێ (ثُمَّ أُمَّهَاتُهَا الْمُدْلِيَاتُ بِإِنَاث) ئینجا دایکی دایکیباوك کە بە پوختەی مێینەکان بگەنەوە دایکە باوکەکە (ثُمَّ أُمُّ أَبِي أَبٍ كَذَلِكَ) ئینجا دایکی باوکیباوك، ئینجا دایکەکانی دایکیباوکیباوك (ثُمَّ أُمُّ أَبِي جَدّ كَذَلِكَ) ئینجا دایکی باوکیباپیرەو دایکەکانی ئەو دایکەش (وَالْقَدِيمُ) بە فەرموودەی کۆن (الأَخَوَاتُ وَالْخَالاَتُ عَلَيْهِنَّ) خوشکەکانیمنداڵەکەو خوشکەکانیدایکیمنداڵەکە، وەپێش دایکەکانی باوكو باپیرە دێخرێن؟ چونکە خوشکەکانی لە زگو پشتی خۆیەتی، هەم پێغەمبەریشﷺ دەفەرموێ: ﴿اَلْخَالَةُ بِمَنْزِلَةِ الأُمِّ﴾ رواه البخاري، خوشکی دایك لە پلەی دایکە.

وَتُقَدَّمُ أُخْتٌ عَلَى خَالَةٍ وَخَالَةٌ عَلَى بِنْت أَخٍ وَأُخْت، وَبِنْتُ أَخٍ وَأُخْت عَلَى عَمَّة، وَأُخْتٌ مِنْ أَبَوَيْنِ عَلَى أُخْت مِنْ أَحَدهمَا، وَالأَصَحُّ تَقْديمُ أُخْت مِنْ أَب عَلَى أُخْت مِنْ أُمٍّ وَخَالَة وَعَمَّة لأَب عَلَيْهِمَا لأُمٍّ، وَسُقُوطُ كُلِّ جدَّة لاَ تَرِثُ دُونَ أُنْثى غَيْرِ مَحْرَم كَبِنْت خَالَــة، وَتَثْبُتُ لكُلِّ ذَكَرٍ مَحْرَم وَارِث عَلَى تَرْتِيبِ الإِرْث، وَكَذَا غَيْــرُ مَحْــرَم كَــابْنِ عَــمٍّ عَلَىالصَّحِيحِ، وَلَاَ تُسَلَّمُ إِلَيْهِ مُشْتَهَاةٌ بَلْ إِلَى ثقَة يُعَيِّنُهَا، فَإِنْ فُقدَالإِرْثُ وَالْمَحْرَمِيَّــةُ أَوْ الإِرْثُ فَلاَ فِيالأَصَحِّ، وَإِنْ اجْتَمعَ ذُكُورٌ وَإِنَاثٌ فَالأُمُّ ثُمَّ أُمَّهَاتُهَا ثُمَّ الأَبُ،

---

ئینجا (وَتُقَدَّمُ أُخْتٌ عَلَى خَالَةٍ) خوشك وەپێش خوشكیدایك دێخرێ، هەم (وَخَالَـةٌ عَلَى بِنْـتِ أَخٍ وَأُخْتٍ) خوشكیدایكیش وەپێش كیژیبراو كیژیخوشك دێخرێ، هـەم (وَبِنْـتُ أَخٍ وَأُخْتٍ عَلَى عَمَّةٍ) كیژیبراو كیژیخوشك وەپێش خوشكیباوك دێخرێن (وَأُخْتٌ مِنْ أَبَوَيْنِ عَلَـى أُخْـتٍ مِنْ أَحَدهمَا) خوشكی لەدایكوباوكی وەپێش خوشكی تەنها لەدایكیو تەنها لەباوكی دێخـرێ (وَالأَصَحُّ تَقْدِيمُ أُخْتٍ مِنْ أَبٍ عَلَى أُخْتٍ مِـنْ أُمٍّ) بـە فـەرموودەی ڕاستتر: خوشـكی لـەباوكی وەپـێش خوشـكی لـەدایكی دێخـرێ (وَخَالَـةٍ وَعَمَّـةٍ لأَبٍ عَلَيْهِمَـا لأُمٍّ) هـەم خوشـكیدایكو خوشكیباوك كە تەنها لەباوكی بن، وەپـێش ئـەو خوشـكەدایكو خوشكەباوكە دێخـرێن كـە تەنها لەدایكین، هەم (وَسُقُوطُ كُلِّ جدَّةٍ لاَ تَـرِثُ) بـە فـەرموودەی ڕاسـتتر: هـەر داپیرەیـەك میراتگر نەبێ مافی پەروەردەكەی نیە (دُونَ أُنْثَى غَيْرِمَحْرَمٍ كَبِنْتِ خَالَةٍ) بەڵام ئەو مێیینـەی مەحرەم نیە مافی هەیە: وك كیژە پورو كیژە مامو كیژە خاڵ.

(وَ) هەروەها (تَثْبُتُ) مافی پاراستنو پـەروەردەكردنی شـێتەكەو منداڵەكـە جێگیر دەبـێ (لِكُلِّ ذَكَرٍ مَحْرَمٍ وَارِثٍ) بۆ گشت نێرینەیەكی مەحرەمی میراتگر: وەك باوكو بـاپیرەو بـراو مام (عَلَىتَرتِيبِ الإِرْثِ) لە سەر ڕیزی میراتگرتن (وَكَذَا غَيْرُ مَحْرَمٍ كَابْنِ عَمٍّ) هەروەها ئەگەر میراتگرەكە مەحرەمیش نەبێ: وەكو كوڕەمام، هەر مـافی هەیـە (عَلَىالصَّحِيحِ) لـە سـەر فەرموودەی ڕاست، بەڵام ( وَلاَ تُسَلَّمُ إِلَيْهِ مُشْتَهَاةٌ) كیژێكی وەها كـە حـەزیلێبكرێ، نابێ تەسلیمی نامەحرەمەكە بكرێ (بَلْ إِلَى ثِقَةٍ) بەڵكو تەسلیمی ژنێكـی بـاوەڕپێكراو دەكرێ كە (يُعَيِّنُهَا) نامەحرەمەكە دیاریی دەكا (فَإِنْ فُقِدَ الإِرْثُ وَالْمَحْرَمِيَّةُ) جـا ئەگـەر نێرینەكـە میراتگرایەتیو مەحرەمیەتیی نـەبو: وەكـو كوڕەخـاڵو كوڕەپـور (أَوِ الإِرْثُ) یـان تـەنها میراتگریـەتیی نـەبو: وەكـو خـاڵو باوكیدایـك، ئـەو كاتـە (فَـلاَ فِىالأَصَحِّ) مـافی پەروەردەكردنەكەی نیە لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَإِنْ اجْتَمَعَ ذُكُورٌ وَإِنَـاثٌ) ئەگـەر نێرینـەكانو مێیینـەكان وێكڕا كۆ بونـەوە، ئـەو كاتـە (فَالأُمُّ) دایكەكە لە هەموویان لەپێشترە، بـە بەڵگـەی حـەدیسـەكەیڕابردوو (ثُـمَّ أُمَّهَاتُهَـا) ئینجا دایكەكانیدایك لەپێشترن (ثُمَّ الأَبُ) ئینجا باوك لەپێشترە، ئینجا دایكیباوك، ئینجا باوكیباوك، بەڵام ئەگەر شێتێك دایكو باوكی خۆی نەبو و كیژێكیخۆی هەبوو، ئەو كاتە

وَقِيلَ تُقَدَّمُ عَلَيْهِ الْخَالَةُ وَالأُخْتُ مِنَ الأُمِّ، وَيُقَدَّمُ الأَصْلُ عَلَى الْحَاشِيَةِ، فَإِنْ فُقِدَ فَالأَصَحُّ الأَقْرَبُ، وَإِلاَّ فَالأُنْثَى، وَإِلاَّ فَيُقْرَعُ، وَلاَ حَضَانَةَ لِرَقِيقٍ وَمَجْنُونٍ وَفَاسِقٍ وَكَافِرٍ عَلَى مُسْلِمٍ وَنَاكِحَةٍ غَيْرَ أَبِي الطِّفْلِ إِلاَّ عَمَّهُ وَابْنَ عَمِّهِ وَابْنَ أَخِيهِ فِي الأَصَحِّ، وَإِنْ كَانَ رَضِيعًا

---

کیژەکە لە داپیرەو باپیرە لەپێشترە، هەروەك لە (تحفة)دا ڕوون کراوەتەوە (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: (تُقَدَّمُ عَلَيْهِ الْخَالَةُ وَالأُخْتُ مِنَ الأُمِّ) خوشکی‌دایكو خوشکی لەدایکی وەپێش باوکیش دێخرێن.

(وَيُقَدَّمُ الأَصْلُ عَلَى الْحَاشِيَةِ) تیرەی سەرەوە –نێرو مێ– وەك دایكو باوكو بە سەرەوەتر، وەپێش خزمەکانی دەوروبەر دێخرێن: کە خوشكو براو مامو پورن، ئینجا (فَإِنْ فُقِدَ) ئەگەر لە تیرەی سەرەوە هیچ کەسێك نەبو، ئەو کاتە (فَالأَصَحُّ الأَقْرَبُ) بە فەرموودەی ڕاستتر: لە خزمەکانی دەوروبەر کامەیان نزیکترە، ئەویان وەپێش دێخرێ: جا نێر بێ، یان مێ (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر نزیکتر نەبو، بەڵکو گشتیان یەکسان بون: وکو خوشكو برا، ئەو کاتە (فَالأُنْثَى) مێیەکە وەپێش نێرەکە دێخرێ (وَإِلاَّ) ئەگەر نێرو مێ نەبون، بەڵکو گشتیان نێر، یان مێ بون (فَيُقْرَعُ) ئەو کاتە پشکە لە نێوانیاندا دەکرێ، تاکو کێشەکە ببڕێتەوە.

﴿ مەرجەکانی پەروەردەکەرەکە ﴾

(وَلاَ حَضَانَةَ لِرَقِيقٍ) مافی پەروەردەکردنی شێتو منداڵ بۆ کۆیلە نیە، هەم (وَمَجْنُونٍ) بۆ شێت نیە، هەم (وَفَاسِقٍ) بۆ فاسق نیە، هەم (وَكَافِرٍ عَلَى مُسْلِمٍ) بۆ کافریش لە سەر موسوڵمان نیە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَنْ يَجْعَلَ اللَّهُ لِلْكَافِرِينَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ سَبِيلاً﴾ خوای گەورە هیچ ڕێگایەکی بۆ کافران لە سەر موسوڵمانان دانەناوە. بەڵام دروستە کافر پەروەردەی کافر بکا.

(وَ) هەروەها (نَاكِحَةٍ غَيْرِ أَبِي الطِّفْلِ) ئەو ئافرەتەی شووی بە پیاوێکی‌تری جگە لە باوکی منداڵەکە کردوە، مافی پەروەردەکردنی منداڵەکەی نیە، هەرچەند مێردە نوێیەکەش ڕازی بێ، بە بەڵگەی حەدیسەکەی‌ڕابردوو، کەوابو: لەو حاڵەتەدا مافی پەروەردەکردنی منداڵەکە دەدرێتەدایکی‌دایکی، بەڵام ئەگەر مێردەکەو باوکی منداڵەکە هەردووك ڕازی بن، ئەو کاتە دایکەکە مافی هەر دەمێنێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(إِلاَّ عَمَّهُ وَابْنَ عَمِّهِ وَابْنَ أَخِيهِ) تەنها ئەگەر شووی بە مامی‌منداڵەکە، یان بە کوڕەمامی منداڵەکە، یان بە کوڕەبرای منداڵەکە کردبێ، ئەو کاتەش مافی پەروەردەکردنی دەمێنێ(فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە ئەوانەش مافی پەروەردەکردنیان هەیە، کەوابو: ئەو ئافرەتەی شووی بە باوکی منداڵەکە کردوە: وەك خوشکی‌دایکی منداڵەکە، ئەوە باشتر مافی پەروەردەی هەیە (وَإِنْ كَانَ رَضِيعًا) ئەگەر منداڵەکە

اُشْتُرِطَ أَنْ تُرْضِعَهُ عَلَى الصَّحِيحِ، فَإِنْ كَمُلَتْ نَاقِصَةٌ أَوْ طُلِّقَتْ مَنْكُوحَةٌ حَضَنَتْ، وَإِنْ غَابَتِ الأُمُّ أَوْ امْتَنَعَتْ فَلِلْجَدَّةِ عَلَى الصَّحِيحِ، هَذَا كُلُّهُ فِي غَيْرِ مُمَيِّزٍ، وَالْمُمَيِّزُ إِنِ افْتَرَقَ أَبَوَاهُ كَانَ عِنْدَ مَنِ اخْتَارَ مِنْهُمَا،

---

شیرخۆر بێ (اُشْتُرِطَ أَنْ تُرْضِعَهُ عَلَى الصَّحِيحِ) له سەر فەرموودەی ڕاست بە مەرج داندراوە: ژنەکە شیری‌خۆی بداتە منداڵەکە، بەڵام بۆی دروستە کرێی شیردانەکەش وەربگرێ، هەروەك بۆی دروستە کرێی پەروەردەکردنەکەش وەربگرێ، جا ئەگەر شیری تێدا بوو و شیری نەدایێ، مافی پەروەردەکردنی نامێنێ، بەڵام ئەگەر شیری تێدا نەبێ، ئەو کاتە مافی هەر دەمێنێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، هەم فەرموویانە مەرجە: پەروەردەکەرەکە نەخۆشیەکی پیسی بەردەوامی نەبێ: وەکو سیل‌و بەڵەکی‌و گرووەتی‌و شەلەپەتەیی، هەم گێلەکەو ماڵ بەفیڕۆدەر نەبێ‌و نەبالغیش نەبێ.

(فَإِنْ كَمُلَتْ نَاقِصَةٌ) جا ئەگەر ئافرەتێکی‌ناتەواو ناتەواویەکەی نەماو کامڵ بوو: وەك کافرەکە موسوڵمان ببێ، یان فاسقەکە تۆبە بکا، یان شێتەکە چاك ببێتەوە (أَوْ طُلِّقَتْ مَنْكُوحَةٌ) یان مارەبڕاوێکی پیاوێکی‌بێگانە تەڵاق درا، ئەوە لەو حاڵەتانەدا (حَضَنَتْ) پەروەردەی منداڵەکە دەکا، چونکە ڕێگرەکەی پەروەردەکردن نەماوە.

(وَإِنْ غَابَتِ الأُمُّ) ئەگەر دایکی‌منداڵەکە لەو شوێنە حازر نەبو (أَوْ امْتَنَعَتْ) یان پەروەردەی منداڵەکەی نەکرد، یان مرد، یان شێت بوو، لەو حاڵەتانەدا (فَلِلْجَدَّةِ عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست: مافی پەروەردەکردنی منداڵەکە بۆ دایکی‌دایکیەتی.

بەڵام ئەگەر منداڵەکە باوکو باپیرەو بە سەرەوەتری نەمابێ‌و هیچ ماڵیشی نەبێ، ئەو کاتە دایکەکە زۆری لێدەکرێ پەروەردەی بکاو بژێوەکەشی بدا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(هَذَا كُلُّهُ فِي غَيْرِ مُمَيِّزٍ) ئەوەی لە سەرەتای باسەکەوە تا ئێرە: لەبارەی شێت‌و منداڵێکی نەفام بوو تا فامیدە دەبێ، واتە: چاکەو خراپە بزانێ‌و بەخۆی خواردن بخواو تارەت بکا، ئینجا کە ئەو منداڵە فامیدە بوو، هەم (وَالْمُمَيِّزُ) ئەو منداڵەش کە لە کاتی لێکجیابوونەوەی دایکو باوکی فامیدەیە (إِنِ افْتَرَقَ أَبَوَاهُ) ئەگەر دایکو باوکی لێك جیابونەوە، ئەوە لە هەردوو حاڵەتدا دەکرێتە سەرپشك، ئینجا (كَانَ عِنْدَ مَنِ اخْتَارَ مِنْهُمَا) لە لای ئەوەیان دادەنرێ کە بە خۆی هەڵیدەبژێرێ لە دایکو باوکەکەی، جیاوازی کوڕو کیژ نیە ﴿عن أبي هريرةﷺ: أَنَّ النَّبِيَّﷺ قَالَ لِغُلَامٍ: يَا غُلَامُ هَذَا أَبُوكَ وَهَذِهِ أُمُّكَ فَخُذْ بِيَدِ أَيِّهِمَا شِئْتَ. فَأَخَذَ بِيَدِ أُمِّهِ فَانْطَلَقَتْ بِهِ﴾ رواه اصحاب السنن بسند صحيح، پێغەمبەرﷺ بە کوڕێکی فامیدەی فەرموو: ئەمە باوکتەو ئەمەش دایکتە، کامەیان پێت خۆشە دەستی بگرە. جا منداڵەکەش دەستی دایکی گرت‌و دایکەکەی لەگەڵ خۆیا بردی.

فَإِنْ كَانَ فِي أَحَدِهِمَا جُنُونٌ أَوْ كُفْرٌ أَوْ رِقٌّ أَوْ فِسْقٌ أَوْ نَكَحَتْ فَالْحَقُّ لِلآخَرِ، وَيُخَيَّرُ بَيْنَ أُمٍّ وَجَدٍّ، وَكَذَا أَخٌ أَوْ عَمٌّ أَوْ أَبٌ مَعَ أُخْتٍ أَوْ خَالَةٍ فِي الأَصَحِّ، فَإِنْ اخْتَارَ أَحَدَهُمَا ثُمَّ الآخَرَ حُوِّلَ إِلَيْهِ، فَإِنْ اخْتَارَ الأَبَ ذَكَرٌ لَمْ يَمْنَعْهُ زِيَارَةَ أُمِّهِ، وَيَمْنَعُ أُنْثَى، وَلاَ يَمْنَعُهَا دُخُولاً عَلَيْهِمَا زَائِرَةً، وَالزِّيَارَةُ مَرَّةً فِي أَيَّامٍ، فَإِنْ مَرِضَا فَالأُمُّ أَوْلَى بِتَمْرِيضِهِمَا، فَإِنْ رَضِيَ بِهِ فِي بَيْتِهِ، وَإِلاَّ فَفِي بَيْتِهَا، وَإِنْ اخْتَارَهَا ذَكَرٌ فَعِنْدَهَا لَيْلاً وَعِنْدَالأَبِ نَهَارًا، وَيُؤَدِّبُهُ

---

(فَإِنْ كَانَ فِي أَحَدِهِمَا جُنُونٌ أَوْ كُفْرٌ أَوْ رِقٌّ أَوْ فِسْقٌ) جا ئەگەر لە یەكێك لە دایكو باوكەكەدا شێتی، یان كافری، یان كۆیلەیی، یان فاسقی هەبێ (أَوْ نَكَحَتْ) یان ژنەكە شووی بە بێگانەیەك كرد، لەو حاڵەتانەدا (فَالْحَقُّ لِلآخَرِ) مافی لە لا داندرانی منداڵەكە بۆ ئەوەكەیترەو بە هەڵبژاردنی منداڵەكە ڕەفتار ناكرێ.

(وَ) هەروەها (يُخَيَّرُ بَيْنَ أُمٍّ وَجَدٍّ) منداڵەكە دەكرێتە سەرپشك لە نێوان دایكیو باپیرەیدا، هەروەها ئەگەر دایك نەبێ، ئەو كاتە دەكرێتە سەرپشك لە نێوان باوكیو دایكیدایكیدا، جا ئەگەر باوكیش نەبێ، ئەو كاتە دەكرێتە سەرپشك لە نێوان داپیرەو باپیرەیدا (وَكَذَا أَخٌ أَوْ عَمٌّ أَوْ أَبٌ) هەروەها منداڵ فامیدەكە دەكرێتە سەرپشك لە نێوان برا، یان مام، یان باوك (مَعَ أُخْتٍ أَوْ خَالَةٍ) كە لە گەڵ خوشكیخۆی ، یان خوشكی دایكیدا بن (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(فَإِنْ اخْتَارَ أَحَدَهُمَا) جا ئەگەر فامیدەكە یەكێكیانی هەڵبژارد: لە دایكو باوكی، یان لە خزمەكانیتر (ثُمَّ الآخَرَ) ئینجا پەشیمان بۆوەو ئەوەكەیتری هەڵبژارد، ئەو كاتە (حُوِّلَ إِلَيْهِ) دەگوازرێتەوە لای وی، بەڵام ئەگەر لەبەر كەم فامی ئەوەكەیتری هەڵبژاردبۆوە، ئەو كاتە هەر لە لای دایكی دادەندرێ، هەروەك لەزۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(فَإِنْ اخْتَارَ الأَبَ ذَكَرٌ) جا ئەگەر نێرینەیەكی فامیدە باوكەكەی هەڵبژارد، ئەوە (لَمْ يَمْنَعْهُ زِيَارَةَ أُمِّهِ) دروست نیە لە سەردانی دایكی قەدەغەی بكا، بەڵام (وَيَمْنَعُ أُنْثَى) بۆی دروستە مێیینە قەدەغە بكا لە سەردانیدایكی (وَلاَ يَمْنَعُهَا دُخُولاً عَلَيْهِمَا زَائِرَةً) هەروەها بۆ باوكەكە دروست نیە قەدەغە بكا: دایكەكە بێتە لای كوڕو كیژەكەی بۆ سەردانیان، بەڵام نابێ زۆر بمێنێتەوە، ئینجا (وَالزِّيَارَةُ مَرَّةً فِي أَيَّامٍ) سەردانیش جارێكە لە چەند ڕۆژێكدا.

(فَإِنْ مَرِضَا) جا ئەگەر كوڕو كیژەكە نەخۆش كەوتن، ئەوە (فَالأُمُّ أَوْلَى بِتَمْرِيضِهِمَا) دایكەكە لەپێشترە بۆ پەرستاری=ئاگالێبوونیان (فَإِنْ رَضِيَ بِهِ فِي بَيْتِهِ) جا ئەگەر باوكەكە ڕازی بوو، ئەوە هەر لە ماڵیباوكەكە خزمەتیان دەكا (وَإِلاَّ فَفِي بَيْتِهَا) ئەگەر ڕازیش نەبو، ئەو كاتە دایكەكە لە ماڵیخۆی خزمەتیان دەكا.

(وَإِنْ اخْتَارَهَا ذَكَرٌ) ئەگەر نێرینەیەكی فامیدە دایكەكەی هەڵبژارد، ئەوە (فَعِنْدَهَا لَيْلاً) شەوێ لە لای دایكی دەبێ (وَعِنْدَ الأَبِ نَهَارًا) ڕۆژیش لە لای باوكی دەبێ (وَيُؤَدِّبُهُ) واجبە:

وَيُسَلِّمُهُ لِمَكْتَبٍ أَوْ حِرْفَةٍ، أَوْ أُنْثَى فَعِنْدَهَا لَيْلاً وَنَهَـارًا وَيَزُورُهَـا الأَبُ عَلَى الْعَـادَةِ، وَإِنْ اخْتَارَهُمَا أَقْرِعَ، فَإِنْ لَمْ يَخْتَرْ فَالأُمُّ أَوْلَى، وَقِيلَ يُقْرَعُ، وَلَوْ أَرَادَ أَحَدُهُمَا سَفَرَ حَاجَةٍ كَـانَ الْوَلَدُ الْمُمَيِّزُ وَغَيْرُهُ مَعَ الْمُقِيمِ حَتَّى يَعُودَ، أَوْ سَفَرَ نُقْلَةٍ فَالأَبُ أَوْلَى بِشَرْطِ أَمْـنِ طَرِيقِـهِ وَالْبَلَدِ الْمَقْصُودِ، قِيلَ وَمَسَافَةُ قَصْرٍ، وَمَحَارِمُ الْعَصَبَةِ فِي هَذَا كَالأَبِ، وَكَذَا ابْنُ عَمٍّ لِذَكَرٍ

---

باوکەکە کوڕەکەی فێرە ڕەوشتی باش‌و کاروباری ئایینی بکاو هەم (وَيُسَلِّمُهُ لِمَكْتَبٍ) واجبە: بینێرێتە خوێندنگا بۆ خوێندن (أَوْ حِرْفَةٍ) یان بیداتە دەست خاوەن پیشەیەك تاکو لێی فێرە پیشەیەك ببێ: کە پیشەکە شیاوی بنەماڵەکەیان بێ، جا کرێی فێرکردنی خوێندن‌و پیشەکە لە ماڵی کوڕەکە دەدرێ، جا ئەگەر ماڵی نەبو، ئەو کاتە بژێوەکەی لە سەر کێیە، هەر ئەو کەسەش کرێیەکە دەدا.

(أَوْ أُنْثَى) یان ئەگەر مێیینە دایکەکەی هەڵبژارد، ئەوە (فَعِنْدَهَا لَيْلاً وَنَهَارًا) شەوێ‌و ڕۆژێ هەر لە لای دایکی دەبێ‌و (وَيَزُورُهَا الأَبُ عَلَى الْعَادَةِ) باوکەکەش بەگوێرەی عادەت سەردانی دەکا (وَإِنْ اخْتَارَهُمَا) ئەگەر منداڵێکی‌فامیدە –کوڕ، یان کیژ– دایك‌و باوکی وێکڕا هەڵبژاردن‌و گوتی: لە لای هەردووکیان دەبم. ئەو کاتە (أَقْرِعَ) پشکە لە نێوان دایك‌و باوکەکە دەکرێ (فَإِنْ لَمْ يَخْتَرْ) بەڵام ئەگەر هیچیانی هەڵنەبژارد، ئەو کاتە (فَالأُمُّ أَوْلَى) دایکەکە لەپێشترە (وَقِيلَ يُقْرَعُ) لە فەرموودەیەکی بێ‌هێزدا پشکە دەکرێ.

(وَلَوْ أَرَادَ أَحَدُهُمَا سَفَرَ حَاجَةٍ) ئەگەر دایکەکە، یان باوکەکە ویستی بۆ پێویستیەك بڕواتە سەفەر: وەك حەج‌و بازرگانی، ئەو کاتە (كَانَ الْوَلَدُ الْمُمَيِّزُ وَغَيْرُهُ مَعَ الْمُقِيمِ حَتَّى يَعُودَ) منداڵە فامیدەکەو منداڵە نەفامەکە لە لای ئەوەیان دەمێنێتەوە کە لە ماڵەوەیە تا بەسەفەرچووەکە دەگەڕێتەوە.

(أَوْ سَفَرَ نُقْلَةٍ) یان ئەگەر دایکەکە، یان باوکەکە ویستی ماڵی‌خۆی بگوازێتەوە بۆ شارێکی‌تر، یان گوندێکی‌تر، ئەو کاتە (فَالأَبُ أَوْلَى) باوکەکە لەپێشترە: منداڵەکەی لە لا دابندرێ‌و هەم لەگەڵ خۆیشیا بیباتە شوێنەکە (بِشَرْطِ أَمْنِ طَرِيقِهِ) بەو مەرجەی ڕێگایەکەی ئەمین بێ‌و هەم (وَالْبَلَدِ الْمَقْصُودِ) شوێنە مەبەستەکەش ئەمین بێ، واتە: لەو حاڵەتەدا لە لای‌دایکی داناندرێ، هەر چەند دایکەکە لە شوێنەکەشدا نیشتەجێ بێ، چونکە باوکەکان نەژادی منداڵەکانیان دەپارێزن (قِيلَ وَمَسَافَةُ قَصْرٍ) لە فەرموودەیەکی بێ‌هێزدا: مەرجە سەفەرەکە بە ئەندازەی کورتکردنەوەی نوێژ بێ.

(وَمَحَارِمُ الْعَصَبَةِ فِي هَذَا كَالأَبِ) پیاوە مەحرەمەکانی پشتێ: وەك باپیرەو براو مام کشتیان لە مەسەلەی ماڵگواستنەوەدا وەکو باوك بڕیاریان بۆ دەدرێ‌و لە دایکەکە لەپێشترن‌و منداڵەکە دەدرێتە ئەوان (وَكَذَا ابْنُ عَمٍّ لِذَكَرٍ) هەروەها کوڕەمامیش لەو

وَلاَ يُعْطَى أُنْثَى، فَإِنْ رَافَقَتْهُ بِنْتُهُ سُلِّمَ إِلَيْهَا.
(فَصْلٌ) عَلَيْهِ كِفَايَةُ رَقِيقِهِ نَفَقَةً وَكِسْوَةً وَإِنْ كَانَ أَعْمَى زَمِنًا وَمُدَبَّرًا وَمُسْتَوْلَدَةً مِنْ غَالِبِ قُوتِ رَقِيقِ الْبَلَدِ وَأُدْمِهِمْ وَكِسْوَتِهِمْ، وَلاَ يَكْفِي سَتْرُ الْعَوْرَةِ، وَسُنَّ أَنْ يُنَاوِلَهُ مِمَّا يَتَنَعَّمُ بِهِ مِنْ طَعَامٍ وَأُدْمٍ وَكِسْوَةٍ، وَتَسْقُطُ بِمُضِيِّ الزَّمَانِ، وَيَبِيعُ الْقَاضِي فِيهَا مَالَهُ، فَإِنْ فُقِدَ الْمَالُ أَمَرَهُ بِبَيْعِهِ أَوْ إِعْتَاقِهِ، وَيُجْبِرُ أَمَتَهُ عَلَى إِرْضَاعِ وَلَدِهَا، وَكَذَا غَيْرِهِ إِنْ فَضَلَ عَنْهُ، وَفَطْمِهِ قَبْلَ حَوْلَيْنِ إِنْ لَمْ يَضُرَّهُ،

---

مەسەلەیەدا وەکو باوکە بۆ نێرینە، بەڵام (وَلاَ يُعْطَى أُنْثَى) مێینەی حەزلێکراو نادرێتە دەستی، ئەوەك بێ شەرعی ڕوو بدا، کەوابو: (فَإِنْ رَافَقَتْهُ بِنْتُهُ) ئەگەر کوڕە مامەکە کیژێکی‌خۆی، یان خوشکێکی‌خۆی هاوڕێیەتی‌ی بکا، ئەو کاتە (سُلِّمَ إِلَيْهَا) مێینەکە دەدرێتە دەست ئەو ئافرەتە.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی بەخێوکردنی کۆیلەو ئاژەڵ ﴾

(عَلَيْهِ كِفَايَةُ رَقِيقِهِ) لە سەر گەورەکە واجبە: پێویستی کۆیلەکە چەندە ئەوەندەی بداتێ (نَفَقَةً وَكِسْوَةً) لە بژێو و پێخۆرو جلو بەرگو نیشتەجێکردن (وَإِنْ كَانَ أَعْمَى زَمِنًا) هەرچەند کۆیلەکە کوێرەو پەککەوتووش بێ‌و (وَمُدَبَّرًا وَمُسْتَوْلَدَةً) لە دوای مردن ئازادی‌ی درابێتی‌و دایکە منداڵیش بێ (مِنْ غَالِبِ قُوتِ رَقِيقِ الْبَلَدِ وَأُدْمِهِمْ) لەو خواردەمەنیەی بداتێ کە کۆیلەکانی شارەکە دەیکەنە بژێو و پێخۆر، هەم (وَكِسْوَتِهِمْ) لەو بەرگەش کە دەیکەنە بەرگ (وَلاَ يَكْفِي سَتْرُ الْعَوْرَةِ) داپۆشەری عەورەت بەس نیە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لِلْمَمْلُوكِ طَعَامُهُ وَكِسْوَتُهُ وَلاَ يُكَلَّفُ مِنَ الْعَمَلِ مَا لاَيُطِيقُ﴾ رواه مسلم، کۆیلە مافی خواردەمەنی‌و جلی خۆی هەیەو داوای ئەو کارەشی لێناکرێ کە ناتوانێ بیکا.
(وَسُنَّ أَنْ يُنَاوِلَهُ مِمَّا يَتَنَعَّمُ بِهِ) سوننەتە گەورەکە بداتە کۆیلەکەی لەو شتەی بەخۆی لەزەتی لێدەبینێ: (مِنْ طَعَامٍ وَأُدْمٍ وَكِسْوَةٍ) لە خواردەمەنی‌و پێخۆرو جلو بەرگ.
(وَتَسْقُطُ بِمُضِيِّ الزَّمَانِ) بە تێپەڕبوونی کات بژێوەکە لە سەر گەورەکە لادەکەوێو نابێتە قەرز لە سەری (وَيَبِيعُ الْقَاضِي فِيهَا مَالَهُ) قازی ماڵی‌گەورەکە دەفرۆشێ بۆ بەخێوکردنی کۆیلەکەی، ئەگەر گەورەکە بەخێوی نەکا، یان حازر نەبێ (فَإِنْ فُقِدَ الْمَالُ) جا ئەگەر گەورەکە هیچ ماڵی نەبو، ئەو کاتە (أَمَرَهُ بِبَيْعِهِ أَوْ إِعْتَاقِهِ) قازی فەرمانی دەداتێ: یان کۆیلەکە بفرۆشێ، یان ئازادی بکا، جا ئەگەر هیچ لایەکی نەکرد، ئەو کاتە قازی: یان دەیفرۆشێ، یان بەکرێ‌ی دەداو لە کرێیەکەی بەخێوی دەکا.
(وَيُجْبِرُ أَمَتَهُ عَلَى إِرْضَاعِ وَلَدِهَا) بۆ گەورەکە دروستە زۆر لە (جارية)کەی بکا بۆ ئەوەی شیر بداتە منداڵەکەی (وَكَذَا غَيْرِهِ إِنْ فَضَلَ عَنْهُ) هەروەها زۆری لێدەکا شیر بداتە منداڵی‌تریش ئەگەر لە منداڵەکەی‌خۆی زیاد بێ، هەم (وَفَطْمِهِ قَبْلَ حَوْلَيْنِ إِنْ لَمْ يَضُرَّهُ) دروستە زۆری

وَإِرْضَاعه بَعْدَهُمَا إِنْ لَمْ يَضُرَّهَا، وَلِلْحُرَّة حَقٌّ فِي التَّرْبِيَة: فَلَيْسَ لأَحَدهمَا فَطْمُـهُ قَبْـلَ حَوْلَيْن، وَلَهُمَا إِنْ لَمْ يَضُرَّهُ، وَلأَحَدهمَا بَعْدَ حَوْلَيْن، وَلَهُمَا الزِّيَادَةُ، وَلاَ يُكَلِّفُ رَقِيقَهُ إِلاَّ عَمَلاً يُطِيقُهُ، وَيَجُوزُ مُخَارَجَتُهُ بِشَرْطِ رِضَاهُمَا، وَهِيَ خَرَاجٌ يُؤَدِّيه كُلَّ يَوْمٍ أَوْ أُسْبُوعٍ، وَعَلَيْه عَلْفُ دَوَابِّه وَسَقْيُهَا، فَإِنْ امْتَنَعَ

---

لێبکا منداڵەکە لە شیر بکاتەوە پێش تەمەنی دوو ساڵی تەواو بکا، بەو مەرجەی زیان لە منداڵەکە نەدا، هەم (وَإِرْضَاعِه بَعْدَهُمَا إِنْ لَمْ يَضُرَّهَا) زۆری لێبکا لە دوای تەمەنی دوو ساڵیش شیر بداتە منداڵەکەی بەو مەرجەی زیان لە (جارية)کە نەدا.

(وَلِلْحُرَّةِ حَقٌّ فِي التَّرْبِيَةِ) ئافرەتیئازاد مافێکی لە پەروەردەی منداڵەکەیدا هەیە، کەوابو: (فَلَيْسَ لأَحَدِهِمَا فَطْمُهُ) بە تەنها نە بۆ دایکو نە بۆ باوك دروست نیە -بێ ڕازیبوونی ئەویتر- منداڵەکەی لە شیر بکاتەوە (قَبْلَ حَوْلَيْنِ) پێش ئەوەی تەمەنی دوو ساڵی تەواو بکا، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلاَدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَـنْ أَرَادَ أَنْ يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ﴾ دەبی دایکان دوو ساڵی تەواو شیر بدەنە منداڵەکانیان، ئەو فەرمانە بۆ ئەوکەسەیە کە بیەوێ شیردانەکە تەواو بکا.

(وَلَهُمَا إِنْ لَمْ يَضُرَّهُ) بۆ دایکو باوکەکە دروستە ڕێك بکەونو بە ڕازیبوونی هەردووکیان پێش تەواوبوونی دوو ساڵەکە منداڵەکە لە شیر بکەنەوە، بەو مەرجەی زیان لە منداڵەکە نەدا، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ أَرَادَا فِصَالاً عَنْ تَرَاضٍ مِنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ فَـلا جُنَـاحَ عَلَيْهِمَا﴾ ئەگەر دایکو باوکەکە ویستیان پێش دوو ساڵەکە منداڵەکەیان لە شیر بکەنەوە، بە ڕازیبوونی هەردووکیانو بە ڕاوێژکاری، ئەوە هیچ گوناهێکیان لە سەر نیە.

(وَلأَحَدِهِمَا بَعْدَ حَوْلَيْنِ) لە دوای تەواوبوونی دوو ساڵەکە بۆ تەنها یەکێکیشیان دروستە لە شیری بکاتەوە، هەم (وَلَهُمَا الزِّيَادَةُ) بۆ هەردووکیشیان دروستە بە ڕێککەوتن لە دوو ساڵەکە زیاتر شیری بدەنێ، بەو مەرجەی زیانی لێنەدا.

(وَلاَ يُكَلِّفُ رَقِيقَهُ إِلاَّ عَمَلاً يُطِيقُهُ) نابێ داوا لە کۆیلەکەیخۆی بکا تەنها ئەو کارە نەبێ کە لە توانایدایە، بە بەڵگەی حەدیسەکەیڕابردوو.

(وَيَجُوزُ مُخَارَجَتُهُ) دروستە مامڵەتیخەرجیەش لەگەڵ کۆیلەکەی بکاو ئیزنی بدا بۆ خۆی کەسابەت بکا (بِشَرْطِ رِضَاهُمَا) بەو مەرجەی گەورەکەو کۆیلەکە هەردووکیان ڕازی بن (وَهِيَ) خەرجیە ئەمەیە: (خَرَاجٌ يُؤَدِّيهِ كُلَّ يَوْمٍ أَوْ أُسْبُوعٍ) کۆیلەکە خەرجیەکی زانراو هەموو ڕۆژێك، یان گشت حەفتەیەك بداتە گەورەکەی لەو کەسابەتەی دەیکا، جا ئەوەی لە خەرجیەکەش زیادە بۆ کۆیلکە بێو بە دڵیخۆی دەستکاریی دەکا.

(وَعَلَيْهِ عَلْفُ دَوَابِّهِ وَسَقْيُهَا) لە سەر خاوەنەکە واجبە: ئالیك بداتە ئاژەڵەکانیو هەم ئاویشیان بدا، یان بەریانەهەڵبداتە نێو لەوەڕگەیەکیحەڵاڵ (فَإِنِ امْتَنَعَ) جا ئەگەر

أُجبِرَ فِي الْمَأْكُولِ عَلَى بَيْعٍ أَوْ عَلْفٍ أَوْ ذَبْحٍ، وَفِي غَيْرِهِ عَلَى بَيْعٍ أَوْ عَلْفٍ، وَلاَ يَحْلِبُ مَا ضَرَّ وَلَدَهَا، وَمَا لا رُوحَ لَهُ: كَقَنَاةٍ وَدَارٍ لا تَجِبُ عِمَارَتُهَا.

---

بەریهەڵنەدان و ئالیكشی نەدان و هیچ ماڵیشی نەبو، ئەو كاتە (أُجْبِرَ فِي الْمَأْكُولِ عَلَى بَيْعٍ أَوْ عَلْفٍ أَوْ ذَبْحٍ) لە بارەی ئاژەڵی گۆشت خوراو زۆری لێدەكرێ: یان بیفرۆشێ، یان ئالیكی بدا، یان سەری ببڕێ (وَفِي غَيْرِهِ عَلَى بَيْعٍ أَوْ عَلْفٍ) لە بارەی ئەوەش كە گۆشتی ناخورێ زۆری لێدەكرێ: یان بیفرۆشێ، یان ئالیكی بدا.

(وَلاَ يَحْلِبُ مَا ضَرَّ وَلَدَهَا) حەرامە بەو ئەندازەیە شیر لە ئاژەڵەكە بدۆشێ كە زیان لە بێچووەكەی بدا، بەڵكو ئەوەی لە بێچووەكە زیاد بێ، ئەوەندەی لێدەدۆشێ، تا فێرە لەوەڕ دەبێ.

(وَمَا لا رُوحَ لَهُ: كَقَنَاةٍ وَدَارٍ) ئەو ملكەی گیانلەبەر نیە: وەكو كارێزو جۆگەو خانوو و باغ (لا تَجِبُ عِمَارَتُهَا) لە سەر خاوەنەكەی واجب نیە خزمەتی بكاو لە خرابوون بیپارێزێ، هەرچەند هاویەشیش بێ، بەڵكو ناپەسندە وازی لێبێنێ تا خراپ دەبێ، بەڵام ئەگەر ملكەكە ملكی شێت و منداڵ و وەقفكراو بوو، ئەو كاتە لە سەر سەرپەرشتكارەكە واجبە: لە بەرهەمەكەیان خزمەتیان بكاو لەخرابوون بیانپارێزێ، هەروك لە (تحفة)و(نهاية)دا فەرموویانە...كۆتایی.

(اَلْحَمْدُ لله) لێرەدا-بە تەواوبوونی باسی (اَلْحَضَانَة)-بەرگی چوارەمی ﴿ڕووناكی (رَبِّ الْعَالَمِين) ڕوونكردنەوەی (مِنْهَاجِ الطَّالِبِين)﴾ كۆتایی هات لە ڕۆژی سێ شەممەی (١٢)ی (محرم)ی ساڵی (١٤٢٣)ی كۆچی، إن شاء الله بەرگی پێنجەمی بە دوادا دێ: كە بە (كتاب الجراح: پەڕتووكی بریندارکردنەكان و كوشتنەكان) دەست پێدەكا، لە خوایگەورە دەپاڕێمەوە هێزو توانام بداتێ بۆ تەواوكردنی ڕوونكردنەوەی هەموو (منهاج)ی ئیمامی(النواوي)رحمه الله تعالى. منیش بەندەی بێچارە: (عبدالله عبدالعزيز هەرتەلی)م، خودا لە خۆم و دایكم و باوكم و خۆشەویستانم خۆش ببێ، آمین، وَصَلَّى اللهُ وَسَلَّمَ عَلَى سَيِّدِنَا مُحَمَّدٍ وَآلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِينَ وَالْحَمْدُ للهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ الْعَلِيِّ الْعَظِيمِ.

هەولێر – كوردستان

١٢ی محرم – ١٤٢٣ی كۆچی

٦ی خاكەلیوە–٢٧٠٢ی كوردی

٢٦ی ئازاری–٢٠٠٢ی زایینی

## شارەزاكردن:

## ئەی خوێنەری بەڕێز، هەر كاتێك دانەر دەڵێ:

* رواه الشيخان، مەبەستی ئیمامی (البخاري و مسلم)ن.

*رواه اصحاب السنن، مەبەستی ئیمامی (أبوداود و النسائي و الترمذي)ن.

* هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە، یان ڕوون كراوەتەوە، مەبەستی ئەم چوار كتێبەنە:

١ –(المجموع: شرح المهذب) دانراوی (الإمام النواوي).

٢ –(تحفةالمحتاج: شرح المنهاج) دانراوی (الإمام إبن حجرالهيتمي).

٣ –(نهايةالمحتاج: شرح المنهاج ) دانراوی (الإمام محمدالرملي).

٤ –(مغنیالمحتاج : شرح المنهاج) دانراوی (الإمام محمد الخطيب الشربيني).

جا ئەگەر یەكێك لەو چوارانە لەگەڵدا نەبێ، ئەو كاتە دەڵێ: هەر وەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا...

## ئەی قوتابی‌ی خۆشەویست و ڕێزدار، تكایە:

**١– پێشەكیەكەلە بەرگی یەكەمدا بە بیرلێكردنەوەیەكی ورد بخوێنەوە.**

**٢– بۆ تێگەیشتنی ئەم كتێبە پشت مەبەستە بە تەنها زانستی‌خۆت، بەڵكو لە لای مامۆستای‌ئایینی بیخوێنە، چونكە چەند پێناسەو زاراوەیەكی شەرعی هەنە، لە لای مامۆستای ئایینی باشتر لێی تێدەگەی.**

## *دانراوەكانی‌تری دانەر:

**١ – هـۆنـراوەی ﴿ ئیمان و ئیسلام ﴾**

**٢ – ڕوونكردنەوەی ﴿ الأربعين النواوية ﴾**

**٣ – ﴿ عەقیدەی ئیسلامی ﴾**

**٤ – ڕوونكردنەوەی ﴿ العقيدةالطحاوية ﴾**

**٥ – چەند گوڵێك لە ﴿ گوڵزاری ئیسلام ﴾**

**٦ – ڕوونكردنەوەی ﴿ متن فتح القريب ﴾**

**٧ – ڕوونكردنەوەی ﴿ قطرالعارض فی علم الفرائض ﴾**

**٨ – چۆنیەتی ﴿ حەج و عومرە ﴾**

# ناوەڕۆکی بەرگی چوارەمی ﴿ ڕووناکی(رَبّ الْعالَمِين)﴾

# ناوەڕۆكی بەرگی چوارەمی ﴿ ڕووناكی(رَبِّ الْعالَمِين)﴾